یادەوەری

# گوڵەستێرەکان کوژانەوە



کەریم کاکە







دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
FAMpublication
بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری



چاپی دووەم - ٢٠٢١

# گوڵەستێرەکان کوژانەوە

نووسینی

کەریم کاکە

بابەت: یادەوەری

پێوانە

١٥*٢٣سم (٨٩٦) لاپەڕە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢٤٨٥)ی ساڵی ٢٠١٢ی پێ دراوە.

# ناوەڕۆك

## بەر لە خوێندنەوە، ئەو چەند دێرە بخوێنەوە

گوڵەستێرەکان کوژانەوە، یادەوەری پێشمەرگەیەکی سادەیە، پێشمەرگەیەکی نیوەی دووەمی هەشتاکانی سەدەی بیستەم، با بە خوێنەری خۆ بڵێم، ئەو سەرهاتانەی لێرە دەیانخوێنیتەوە نە زادەی خەیاڵن نە هەڵبەستراون، هەموویان بینراون و لە نزیکەوە بیستراون، کەسەکان یەک یەک لەو گۆڕەن و لە بەر چاون، ئەوە هەیە بە زمانی ئەدەب گێڕدراوەتەوە و پەنجەی هونەرکاریی بە شێوەیەکی وا گەیشتۆتێ، لە هەندێ جێ رەنگە بە رەنگی خەیاڵ خۆی پیشانی تۆی خوێنەر بدات.

گوڵەستێرەکان کوژانەوە، لە ناو خۆیدا بەش بەشە، هەر بەشەی لە بن ناونیشانێکی بەرفرە، هەندێ لەو ناونیشانانەش بە سەر بەشی لە خۆیان بەر تەسکتر... تایبەتمەندیەکی کتێبەکە ئەوەیە، تۆ لە هەر بەشێکەوە بەری لێبگریت، رەنگبێ هەست بە پسانەوە نەکەیت، واتە لە شێوەی چەپکێ کورتە چیرۆک، هەرچەندە بەشەکانیش بە سەرە داوێ بە یەکەوە بەستراون و دەکرێ وەک چۆن رۆمانێ دەخوێنیتەوە، وا بەری لێبگریت، لەو کاتەش هەستدەکەیت رستی بەستنەوە هەیە، جا تۆ ئەگەر دڵت خوێندنەوەی ویست، بیهاوێژە بەر دڵی خۆت، لە کوێوە دەست پێدەکەیت.

گوڵەستێرەکان کە لە سەت و نەوەت و دوو هەزار وشە پترە، بەری چەند ساڵان، بەری سێزدە چواردە ساڵی تەمەنە (١٩٩٨-٢٠١١) هێشتا بنی نەهاتووە، ئەگەر مەرگ نۆرەبڕی نەکات و زوو نەگات، لەگێنە بە دوایدا

بـێ، ئـاخر گوڵەسـتێرەکان بـۆ مـن ئەو داسـتانەیە، ئەگەر هەزار و یەک شەویش، هەر شەوەی هەزار و یەک لاپەڕەی لێبگێڕمەوە بنی نایە.

گوڵەسـتێرەکان کـوژانەوە بەر لەوەی لە سـاڵی ٢٠١٢ بەسـەریەکەوە چاپبکرێ، پێشتر لە سێ چوار بەرگی گچکە چـاپکرا بـوو، بەر لەوانـیش، لێرە و لەوێ، هەندێ بەشی لە گۆڤار و رۆژنامان، لە سایتان بڵاوکرابۆوە.

کافـــکاف

٢- ٢- ٢٠٢٠ هەولێر

## سپێدەی تەڕوار

نە نیگای تیژی کچە رەشتاڵەکە، نە فرمێسك و هەنسکی برا منداڵەکە، نە ئامۆژگاریی ئاسمانیانەی پیری سوارچاکان، هیچیان پەژیوانییان نەخستە ئەو هەرێیەی نازانم نە بە خۆمم دابوو نە بە نیشتمان، رەنگە هەرێ بە خۆدان بووبێت.

ئەرێ ئەو کچەی سێ ساڵ پتر و دواتریش، دنیا هەر ئەوی تێدا بوو، جگە لەو من چ کچیدیم نەدەدی، ئەو کچەی چیم بۆ نەکرد! خەوبینین هەر بەوەوە، خەوزڕان لە سۆنگەی ئەوەوە، تەماشا لە خۆ حەرامکردن، چیم نەکرد، خۆم و دنیام لە دەوری گێڕاو پێینەزانی، ئەو کچەی ساڵانێك هەموو چوار شەمووان نامەیەکی درێژ، درێژ وەك قژە خاوەکەی کە بە دنیادا، بە بینایمدا بەریدابۆوە، سەیری هەر لام دەکرد هەر قژی وی بوو.

ئا، هەموو چوارشەمووانێك نامەم بۆی دەنووسی و ئێستاش نامەیەکی لەو نامانە نەدی، ئەو کچەی چوارشەمە بوو کە لە یانەی کۆلێژ لە بەرانبەرم دانیشت، ئاگام لە خۆم بڕا، دڵم وەك چۆن پێ لە قەراخ دەخزێ، ئەوها خزی، رۆیشت، رۆیشتم، کەوتمە چاوەکانی و نوقمبووم، بزربووم، تەمەنێك بزربووم و نەبینرامەوە، لە چاوەکانی بزربووم، ئای چاوەکانی! ئەو کچەی هێندەی کۆلانێکی درێژی میللیی ژنانە قسەم بۆی کرد، قسەی دڵ و بە دڵ نەك زار، کەچی هیچی نەبیست، ئەو کچەی سێ ساڵ پتر دار و

دیواری کۆلیژ و سێتاقانم کردە گوێ و بۆیم هەڵخست، تەنها یەك رستەم لێی بیست:

نەیخۆیت تاڵە.

ئەو کچەی کچێکیدی تێدا دەدرەوشایەوە!

ئەرێ ئەگەر کچە چاو ئەلیزاییەکە لە جێی رستە تاڵەکە رستەیەکی چوکلێتی گوتبا، من بە چیا دەکەوتم! دەزانن رستەی چوکلێتی چ تام دەدا؟ هەر دەڵێی لە ماچی لێوی وی چنراوە، من لە خەونێك، خۆزگە ئەو خەونەم لە هەموو خەوێك دەدیتەوە، ماچی لێوی ئەو کچەم کردووە، ئەو ماچە خەونیە تامی ئەو چوکلێتەی دەدا کە جارێك لێیم دزی، لە جانتاکەیم دزی، نازانم بۆ کێی هەڵگرتبوو!

هەرچی بێت، من هەرێی خۆم بردە سەر و کەوتمە رێ، ئەوەتا جێیێکی گچکەی شەڕ لە هەولێرەوە بە ئاراستەی قەرەچووخ یەك تەقوهۆڕیەتی، هەر کێ تیچاوێکی لێبێ دەڵێ هەوکە نا دوای مۆزیکێتری جگەرە، رەنگە هەر پارچەیەکی بکەوێتە دەف کەستەکێکی ئەو ئاقارە دووکەڵاویە.

بەهارە، دەڵێی وەرزی زەردبوون گەیشتووە، هەندێك جێگەی زەوی زەرد دیارە، خۆ هێشتا جۆزەردان نەهاتووە، شەش حەفت رۆژە بە رۆژمێری چیا نەك دەشت مانگێك لە بەهار رۆیشتووە، ئاسمانی ئەو دەشتە، لە هەولێرەوە تا سەری قەرەچووخ، تۆ بێژە رەشی برباسان، تا چاو بڕدەکات، تۆ بڵێ تا دۆزەخ، هەر گێژەلووکەی دووکەڵە، نەمزانیبوو کوورەکان هێندە زیادیان کردووە، ئەو دەمەی من جاروبار رێم بەو رێیە دەکەوت، کوورەکان دەژمێردران، وەها لە بن یەکتر نەبوون، هەر یەکەو دووکەڵی خۆی بە تەنێ دەنارده ئاسمان و تێکەڵنەدەبوون، ئا، من دەمێکە رێم بەو رێیە مەخمووریە زوورگەزراویە قەرەچووخیە نەکەوتووە.

دوا جارم جوان لە بیرە، هێشتا نەگەیشتبوومە قۆناخی ئامادەیی، وا بزانم گەیشتبوومێ، هێمان لە بازگەکانی ئەو رێیە بە تەنیشت سەدامەوە

وێنەی ئەحمەد حەسەن بەکریش ترسی دەخستە دڵتەوە، سپێدەیەك هێشتا قەرەچووخ تیسکە گزنگێکی بەرنەکەوتبوو، بە بن سێبەری هەڵنەدراوی ئەو دوو سەرۆکە، پیکابێکی گچکەی پڕ لە کرێکار دوای پشکنین و وەرگرتنی ناسنامە لە بازگەی یەکەم دەرچووین، من بچووکترین کرێکاری ناو پیکابەکە بووم، ئەوەتا لە بن قەرەچووخ من چەمەنتۆکێشم و وەستا دەڵێی بە چەمەنتۆی گرتووە:

چەمەنتۆ، دەی چەمەنتۆ...

چەمەنتۆی لێ نەبڕاوە، کەچی هەر چەمەنتۆ چەمەنتۆیەتی، لێی پەستبوومە، ئەوها بڕوا، بێ چەمەنتۆکێش دەمێنێتەوە، چێشتانێکی درەنگە، ماندووم زۆر ماندووم، خوا خوامە وەستا چەمەنتۆیەکیدی بە دەمدا بێت، مەرج بێت هەتا دەستم تێدایە هەردوو پەقرەجی دەستم وەها تێهەڵدەم نەبیندرێتەوە، وەستا دەڵێی دەزانێ چیم لە دڵدایە، وشەی چەمەنتۆی لەبیر خۆی بردۆتەوە.

لە پڕ بووە مشتومڕ، ئەو کرێکارەی خەفتەی دەگرتەوە، پیاوێکی کورتەبنەی سمێڵ بابڕ بوو، خاکەناسەکەی تێهەڵدا و روو لە وەستا راوەستا:

+ لۆ بە مەت نەگۆ لە سەر خاکی کوردان خانی لۆ عارەبان قیتدەکەینەوە؟

- تۆ کرێکاری، خانوو بۆ هەرکێ دروستبکەی چ گرفتێکی تێدایە، ئیشی خۆت بکە و تەواو.

+ قسەی قۆڕ، هەر کەسێك ئیشی وا بکات ناپاکە، جاشە.

- ئاگات لە زارت بێ، نایکەیت، ئەوە رێ.

+ من رۆیشتم، ناپاکی ناکەم.

چووە لای بەرمیلەکە و دەست و چاوی شووشت و رۆیشت.

+ راوەستە منیش دێم، ناپاکی لەگەڵ کورد ناکەم.

ئەوە دەنگی گەنجێکی باریکەڵەی قۆزە، دواتر زانیم قوتابی کۆلێژ بوو لە زانکۆی بەغدا، منیش کە لە داخی چەمەنتۆ لە سەر رۆیشتن بووم، بە دەنگێکی گەورە:

راوەستن، منیش ناپاکی ناکەم.

وەستا حەپەسابوو، دیار بوو یەکەم جاری بوو تووشی کرێکاری ئەوها بێت.

هەرسێکمان رووەو جادەی سەرەکی خێرا خێرا هەنگاومان دەنا و دڵمان خۆش بوو، هەستمدەکرد شەڕێکی گەورەم بردۆتەوە، پیاوە خەفتەچیەکە دەیگوت:

دەزانن ئەو ریزە خانووە هەمووی لۆ عارەبی پێخواس درووستدەکەن، حەیف حەیف... ئەها هەردیتت رەوە حوشتر بە قەرەچووخ وەربوون، لۆ پێوەرنەبوونە! حەیف حەیف، دەزانن کەم میللەت هەیە هێندەی کورد ناپاکی تێدا بێت، حەیف حەیف.

قەلابەیەك بە خێرا خۆی رایگرت و خێرا خۆمان هەڵدایە ناوی، ئەوان چوونە پێشەوە و من بە تەنێ لە پشتەوە سوار بووم، بەو رێیەدا هاتمەوە کە ئێستا پێیدا دەرۆم و لەگینە گەڕانەوەم نەبێت...

رەنگە زرمەیەکی گەورە منی هێنابێتەوە ناو جێیەکە، دەنا وەها سواری قەلابەکە نەبووبووم دابەزم، بە شوفێرەکەم گوت:

ئەرێ لە کەنگێوە ئەو هەموو کوورەیە درووستبوونە، خۆ دنیا بۆتە دووکەڵی کوورە؟

شوفێر نیوە ئاوڕێکی دایەوە و بە پێکەنینەوە:

لۆ! وا دەزانی ئەو دنیا دووکەڵە هەمووی هی کوورەیە!

بە سەرسامیەوە گوتم:

ئەدی هی چیە؟

شوفێر گوتی:

نابینی گیاوگوڵ، پووشوپەلاش، تەڕ و وشك پێکەوە دەسووتێ، چما گوێت لەو هەموو رمب و هۆڕە نیە!

برادەرەکەم کە لە پێشەوە دانیشتبوو، ئەویش سووکە ئاوڕێکی لە من دایەوە و رووی کردە شوفێرەکە:

ئەریٚ ماڵــت خــراب نەبێــت لەبەر تەقوهــۆڕی جێــبەکەی تــۆ ئەگەر ئاسمانیش دارِمیٚ کەس گوێی لە هیچ دەبێت.

تێگەیشتم چ باسە لە بەر خۆمەوە گـوتم: دەشتی هەولێـر بەو تەڕیە وا ئاگر بگرێت، ئەگەر تەواو وشکبێتەوە داخوا چ دۆزەخێك دەنێتەوە.

لە ریٚــگە مەیـلەو سـەرەکیەکە لای داو بە لای چەپـدا ریٚچکەیەکـی گـرت کە چ بە ریٚـی تـرومبێلان نەدەچـوو، عەسـرانێکی درەنـگە، ئـا زۆر درەنگە، درەنگتـر داهـات، رۆژ لە سـەر ئـاوابوونە، گەیشـتینە گۆڕستانێکــ، گۆڕستانێکی کۆن زۆر کۆن، لە دیدی منەوە زۆر کۆن دیـار بـوو، گـوێم لە دەنگێــك بــوو، تــۆ بڵێــی گــوێم زرینگــابێتەوە، کە باســی کــۆنیی گۆڕستانەکەی دەکرد، منیش وەك بڵێی وەڵامی دەنگەکەم دابێتەوە:

ئەگەر ئەو گوندەی وا دەیگەیەنیٚ تەمەنی ئەو گۆڕسـتانەی هەبـیٚ، ئەوا بە بیری دێت کەنگیٚ هەولێر هاتۆتە دنیایێ.

برادەرەکەم مشتومڕی من و دەنگەکەی پساند:

+ چیە دەڵێی لە بەر خۆتەوە قسان دەکەیت!

- نا، چ نیە.

شوفێرەکە گوتی:

گەیشتین، ئەوە سۆربەشە، بڕۆنە ماڵی مام...

سەد حەیف، ناوی ئەو مامەم لە یاد نەماوە، دوای ئەو هەموو ساڵە مـام لە بیردەمێنن! من لێرە بە پیـاوی سۆربەشـی نـاوی دێـنم، هەرچەنـدە سـیٚ سۆربەش هەیە، بەڵام دیارە من مەبەستم کامیـانە ئەوەی کە گۆڕسـتانەکەی دەئاخفیٚ و سەربردەی خۆی دەگێڕێتەوە، کۆنیی خـۆی دەگێڕێتەوە..گونـد نیوە چۆلە، نیوە چۆلی چی! کورە بە خوا وا بزانم هەر چۆل چـۆلە، جـگە لە پیـاوی سۆربەشـی کیرمیـزی تێـدا نـابینیەوە، مێیینـەش هەر هـیچ، نا،نـا چـۆلەوانیش نـیە، ئـاوەدانیی تێـدایە، پیـاوی سۆربەشــی زۆر بە گەرمـی مێوانداریی کردین، وا بـزانم شـلە سـاوارمان خـوارد، ئەگەر پیـازی لەگەڵ بوویێت دڵنیام زۆر بە تام بووە، پیاوی سۆربەشی زوو زانی ئێمە دەمانەویٚ بەگەڵ چ لایەنێك بکەوین، گوتی:

دێن هەر بزانە گەیشتن، ئەگەر مـلازم هەژاریـش نێـت، ئەبـوو ئەحـرار سەرێك بێرەدا دەكات.

پیاوە سۆربەشیەكە دەیگوت:

كـورم مـن هەر هێنـدەم لەنگـۆ دەوێـت كە ناپـاكی نەكەن، ئەگەر مانـدووبوون و پێشـمەرگایەتیتان پێنەكـرا، پیـاوانە خۆتـان رادەسـتبكەنەوە، سـەری كەس لە قـوڕ مەنـێن، زمـان لە كەس مەدەن، نەڵـێن فـلان ئێـوارە گەیشتینە سۆربەش و لە ماڵی مـام... نانمـان خـوارد و ئەو بەڕێـی كـردین، مەبەستم هەر خۆم نیە خۆ تێدەگەن چ دەڵێم؟

ئێمەش وێكڕا دەمانگوت:

نا، نا ئێمە لەو كەسانە نین شتی وا بكەن.

پیاوی سۆربەشی هەناسەی قووڵی هەڵكێشا:

دەزانم ئێوە كوڕی باشن و لەو كەسانە نین خراپەتان لێبوەشێتەوە، بەڕێ هەر لە خۆوە دەترسم.

منـیش دەترسـم، ترسـی مـن لە نەهـاتنی پێشـمەرگەیە، ئەگەر ئەوشـەو دەستەیەك پێشمەرگە لەوانەی ئێمە بە دوایاندا عەوداڵین، سەر بە سۆربەشـدا نەكەن، ئـێمە دەمێنیـنەوە و دوور نـیە سـبەی جێـژ و جـاش پێـوەركەن و بمانپێچنەوەو دوو تفەنگمان بە ملەوە بكەن و رادەستی (ئەمن)مان بـكەن و بڵێن دوو پێشمەرگەمان گرت و نانێكی باشمان پێوە بخۆن، باشـە لە ئەمـن باوەڕیان پێدەكەن! ئەدی تەماشای سەر شانمان نـاكەن بـزانن جێـی تـاقمی فیشەك دیارە یان نا!

وا بـزانم دەمـی ماڵنووسـتنانە، لە سـەر ئـاو و ئـاگرین، دەی خـودایە درەنـگە، پـۆلێ پێشـمەرگە بە سۆربەشـێ وەركە، ئەبـوو ئەحـرارە، مـلازم هەژارە، نازانم كێ تیلاك خوارە، هەر كێ دێ با بێ،پیـاوی سۆربەشـی كە پێیەكی لە دەرێیە، پێیەكی لە ژوورێ، لە ئـێمە بە پەلەتـرە، هەواڵـی هاتنیـانی هێنا، چەند پێشمەرگەیەك بە مـاڵی پیـاوی سۆربەشـی وەربـوون، ئـێمەی بە ئەبوو ئەحرار ناساند، بە كوردیەكی گێڕ و عەرەبیەكی وێـڕ چاكوچۆنیمـان

کرد، ئەو شەوە چاوی من ئەبوو ئەحراری بە خڕکەلەیی و رەشتاڵەیی و زیت و وتو وریا وێنە گرت و هەوکەش لە چاوی من هەر بە شەوە سۆربەشیەکە خۆی نیشاندەدا.

تاریکەشەوێکە دەڵێی زەوی لە تەمەنی خۆی مانگی بە خۆیەوە نەدیوە، ئەستێرەیەکی بۆ هەڵنەهاتووە، تاریکستانێکە نەبووە و نابێتەوە، ماڵئاواییمان لە پیاوی سۆربەشی کرد، سواری ترومبێلێك بووین، لەوانەیە جێب بێت، تا دنیا رووناك نەبێتەوە نازانم چیە، چ دیار نیە، نازانم چەند کەسین، جێم تەسکە، زۆر تەسك رانم نەشکێ باشە، دەمەوێ هەستمەوە و بە پێوە راوەستم، ناوێرم، هەستدەکەم هەندێکیان بە پێوە راوەستاون.

ئیدی وا بە گەڵ کۆمۆنیستان کەوتم، لە تاریکترین شەودا بە گەڵ کۆمۆنیستان کەوتم، گوێم بە ئامۆژگاریی پیری سوارچاکان نەدا و چوومە رێزی پێشمەرگەی کۆمۆنیستانەوە، پیری سوارچاکان! باشم لە بیرە کە ئامۆژگاریت دەکردین:

کوڕم، من نالێم شیوعی ئەوهان و ئەوهان، بەڵام دەڵێم مەبنێ، کوڕەکانم مەبنە شیوعی.

من ئەو دەم چ نەمدەزانی شیوعی چ شتن و پیری سوارچاکان چ دەڵێ، بەڵام لە پێش هەموویان دەمگوت:

نابینێ، نابینێ شوعی سەگبابن.

پیری سوارچاکان دەستی بە سەرمدا دەهێنا:

نا، سەگباب نین، بەڵام من خۆشم ناوێن.

دواتر لە رێی بابمەوە تێگەیشتم پیری سوارچاکان بۆچی هێندە لە کۆمۆنیستەکان داخ لە دڵە، بابم دەیگێڕایەوە:

زوو زۆر زوو ماوەیەك هەرچی خەڵکە شیوعی بوون، مامت و خاڵەکانت و هەموو هەموو، لەو ناوە تەنها من و پیری سوارچاکان دابوومانە لاملی، پیری سوارچاکان دەیگوت:

بە خودای سەید مارفی باداوە، مەلا عەزیزی شاخەپیسکە ببنە شیوعی، من نابمێ، ئەوجا لێمگەڕێن، منەتیشتان نازانم.

دەزانی بۆچیش ئەوها بە رقدا چووبوو؟ دەیانویست بە زۆر بیکەنێ، دەنا رقی لە شیوعیەکان نەدەبۆوە، خاڵت و ئەوانە دەیانویست بە زۆر بیکەنێ، بۆیە ببووە شاخ، پیری سوارچاکان لە شوعیەکان پتر رقی لە ئاغاو زۆرداران دەبۆوە، دەزانی وەختایێك من و پیری سوارچاکان و نەنکت شەوان هەتا سبەینێ لە ترسی شوعیە خزمەکانمان ئێشکگریمان لە یەکتر دەگرت.

باشە بەو تاریك و نووتەکە، شوفێر بێ لایت چۆن رێ دەبینێ! چەند خێراش داژوا چەند خێرا، ((خودایە لەو ئاقاری تاریکستانە دەستمان بگرە و بمانپەڕێنەوە بەری رووناکی)) تۆ بڵێی پاڕاناوەیەکی وام بە دڵدا نەهاتبێت، دوور نیە، گەیشتینە کوێ؟ ئێرە کوێیە؟ بەو تاریکیە نیشانەیەك دیارە بۆ پێکەوتنەوەی جێگەیەك؟! هێندە دەزانم بە ئاراستەی رۆژهەڵاتدا بە ئاراستەی رێی هەولێر- قوشتەپە تاریکی دەبڕین، گوێم لە پێشمەرگەیەکە دەڵێ:

دەزانن دەبێت لە کوێ رۆژمان لێ هەڵبێت؟

بە (( پشتی بێستانە)) وەڵامیان دایەوە، بەڵام بە وەڵامەکە رازی نەبوو:

نەخێر، زۆر ئەولاتر، نزیك بەستی شەرغە، دەنا کۆپتەر...

بەستی شەرغە! بەستی هەنگوین!

جامە ئاوێکی ساردە و لەو تاریکستانە تینووە بە سەر دەممەوە کرد، هێشتا لە مەتارە ئاوم نەخواردبۆوە دەنا مەتارەم لە جێی جام دادەنا، ئای لەو دەمە تینووبووم، مەگەر دەشتی هەولێر لە وشکە ساڵیدا ئەو تینوێتیەی من دیتم دیتبێتی، رەنگە خواردنەکەی ماڵی پیاوی سۆربەشی لەو خواردنانە بووبێت کە ئاو زۆر دەکێشن.

بەستی شەرغە، ئەو بەستەی لە سەر شانی خۆی، شانی دیوی هەولێرێ، تەڕواری هەڵگرتووە، ئەو تەڕوارەی تەنها پیری سوارچاکان دەزانێ چ هەوارێکی تەڕە، هەر من دەزانم چ یادێکی فێنکە، بەستی شەرغە چەند وێنەیەکی منداڵیمی لە لێواری کەپکە شاخی خۆی، وێنەی وا وێنەی

ناوەکەی شیرینی لێ دەکەوێتەوە، لە سەر زیخ و وردە چەوی ناو چەمی خۆی، لە رووی گۆماوی هاوینیانەی خۆی نەخشاندووە و تا ئێستاش لە دیدەمدا پاراستوومن، هەر بە ناوهێنانی لە گۆماوەکەیم خواردەوە.

دنیا تا دێ تاریکتر دادێ، ئاسمان دەڵێی باخی رنراوە، ئەستێرەیەکی پێوە نەماوە، با لە هەر لایەکەوە هەڵدەکا بۆنی دووکەڵ دێنێ، کەچی مەشخەڵێك، بڵێسەیەك، کڵپەیەك لە هیچ لایەك چاو هەڵناهێنێ، دەنگیش هی باسکردن نیە، ناوە ناوە دەسرپێژێك، گرمەیەك دێتە گوێ، دوورە، گوێم لێیە:

لە جادە نزیك بووینەوە، ئاگادار بن.

من دەبێت ئاگاداری چی بم! ئەها، دەڵێی شۆڕبووینەوە کەندێك، وام هەستکرد شۆڕبووینەوە، بیرم هەر لای چاوی شوفێرەکەیە، تۆ بڵێی چاوی گورگی هەبێ، بەو تاریکیە چۆن رێ دەبینێ، شتێك هەیە من تێناگەم، خۆ تووشی شەوکوێری نەبوومە! جارێك بە منداڵی تووش بووم، ئەو ساڵەی لە هەولێر بەفرێکی ئەستوور کەوت، من تووش بووم و شەو کە عەرد و عاسمان یەك پارچە بەفر بوو، لە چاوی من بەردەمم لە بەرانپیلە رەشەکەی دایکم رەشتر خۆی دەنواند، دەمویست بپرسم:

ئەرێ دنیا لە چاوی ئێوەشەوە تاریکستانە؟

شەرممکرد و گێڕامەوە، برادەرەکەمم نەدیتەوە دەنا لێیم دەپرسی، لە ناو جێبەکە نەمزانی برادەرەکەم کەوتۆتە کوێوە، کەوتمە خەمی شەوکوێریی خۆمەوە، باشە ئەگەر تووش بووبم چ بکەم! ساڵی بەفرەکە بە دوو سێ دنکە حەبی ورد چاکبوومەوە، ئەدی ئێستا کە ساڵی دووکەڵە، بە چی چاکببمەوە؟ ئەوشەوە دووکەڵ هەناسەمی گرتبوو، بۆیە ساڵەکەشم ناونا ساڵی دووکەڵ، نا بڕوا ناکەم من شەوکوێر بم، شەوەکە خۆی تاریکە و دڵنیام هەمووان وەك منن، جگە لە شوفێرەکە، ئەویش بزانە دووربینێکی نائاسایی لایە، چاویلکەیەکی تایبەتی لە چاوە، چاوی گورگی لە چاوە، چوزانم، نا، هیچ بە دووری مەبینە، تووش بووبم، من لە داوی تووش

بوومە، تووش نەبوومە، با تـووش بـوومە، نـا تـووش نەبـوومە، ئاڵۆزکـام و خۆمم پێنەدەکرایەوە، تەقە و گیزە گیـز کردمیـانەوە و تێکەوتـین، کەوتیـنە بۆسەوە، دەنگێك:

بۆسەیە بۆسە.

دەنگێکیدی:

نا، مەترسن، دوورە، بۆسە نیە.

بۆسەیە بۆسە نیە، ئیدی تەقەیە لە هەموو لایەکەوە تەقەیە، گیزە گیـزی گـوللەیە، هەڵـدانی ئـاگر و کەوتـنەوەی ئـاگرە، نـازانم جێـبەکە چـی بە سەرهات، نابینم پێشمەرگەکان چۆنچۆنی پەرتبوون، سوپاس بۆ ئاگرەکـانی ئاسمان کە بایی ئۆندە بینایی بۆم گێڕاوە کە ئەو دوو پێشمەرگەیەی پێشـم ببینم و لە دوویان نەبمەوە، روو لە کام لا دەکەن خۆیان بە کوێدا دەکەن، بۆ من کێشەیەك نیە، کێشە ئەوەیە بزریان بکەم و تەنیا بمێنمەوە، لە ئاقـاری تاریکسـتاندا تەنیـا بمێـنمەوە، ترسـام زۆریـش ترسـام، سـەختە زۆر سـەختە بکەویە بۆسەوەو چەکیشت نەبێ، لە چەکیش نەزانیت، شەوکوێریش بیـت، قەوما خراپ لێم قەوما لە رێی کـۆیە بە دەسـتی جاشـەکانی کەریـم خـان تێدا نەچووم، لە رێی قوشتەپە ئـاوەو ئـاو دەچـم، بە دەسـتی خـۆم چیـم لە خۆم کردا چ دەبوو ئەگەر نیگای کچە رەشتاڵەکە تیژتر با، خـۆزگە تیژتـر با وەها لە دڵم دەچەقی بۆ هەتـایە لە جێگەی خـۆم نەدەبـزووتم، خولیـای پێشمەرگایەتیی لە سەرم دەردەکرد، پێشمەرگایەتیەك شەوی یەکەمی وەهـا تاریك و پـڕ تەقوتـۆق و هەڵات هەڵات بـێ، زەحـمەتە زۆر زەحـمەتە، لە ئاقـاری تاریکسـتاندا تەقوتـۆق و هەڵات هەڵات درێـژدەبێتەوە، درێـژ بە شەودا درێژدەبێتەوە.

ئای کچە رەشتارەکە، لە ئاست تۆ چەند بەرد بووم، دنیا بـۆ مـن بەرد بوو، منیش تەنهاو تەنهـا بـۆ تـۆ بـوومە بەرد، بەردبوونێـك هـیچ بە دووری مەبیـنە مەرگـی بە دواوە بێـت، هەر دیتـت لەو هەڵاتـهەڵاتە گـوللەیەکی گەرمم گرتەوە و بە رێوە ساردبوومەوە.

ئەو رۆژە هەر حەفتەیەك دەبێ لە حەوشەی پشتەوەی كۆلێژ، لە نزیك پەنجەرەی یانەكە چاوە گەشەكانی لە سەرم راگرتبوو، ئۆی هێندەی نەمابوو بە باڵ باڵ بگرم و لە پێشی بنیشمەوە، تەواو كەوتبوومە سێرەی چاوەكانیەوە، لەوەتەی خۆم ناسیوە شەو و رۆژم لە هاتنی ساتێكی وا كردۆتەوە، ساتێك كچێك وا تینوانە تێم بروانێ، ئەوە ئەو ساتە هات، بەڵام درەنگ داهات، كچە رەشتاركە دەبوو زووتر هاتبای، دەبوو كەمێك پەلەت كردبا، حەیف درەنگە زۆر درەنگە، من ئیدی لە سەر رۆیشتنم، رۆیشتنێك رەنگە هاتنەوەی نەبێت، ئەو كچە رەشتارە خوێن گەرم و شیرینە، پێشتریش چەند جارێك دەمدیت تیچاوم دەداتێ، بەڵام من بە تەماشاكردنی ئاسایی وەرمدەگرت، خۆم بە هەڵە دەبرد، وا بزانم نزیكبیوومەوە لەوەی كە من هی ئەوە نیم بچمە دڵی كچێكی جوانەوە، جگە لەوەش ئەو كچەی كە بە درێژایی شەو و رۆژەكانی سێ ساڵ و سێ مانگ منی دێوانە كردبوو، منی مەست و حەیران كردبوو، بە ژمار سی و سێ شیعری درێژ وەك پرچی خۆی درێژم بۆی نووسیبوو، ئەو كچە وەها بوونمی تەنی بوو جگە لەو چ كچیدیم نەدەدی، ئەویش هەوكەش پێوە وابزانم چی لەو شێتبوونەی من نەزانی.

ئای كچە رەشتارەكە، چۆن لە دەست خۆم دای، وا خەریكە لەو شەوە جەنگیە خۆشم لە دەست بدەم، خۆزگە نیگاكانت تیژتر دەبوون، خۆزگە هەر بە چاو نا بە لێوە هەنجیریەكانت رستەیەكی ئەوینیت دەهاویشت، ئۆی، لێوی كچە رەشتارەكە چەند لە هەنجیری مەیلەو رەش دەچوو كە لە لاوە كووزت كردبێت، ئای بۆ شیرینی هەنجیری رەش، كچە لێوە هەنجیریەكە، تۆ درەنگ هاتی یان من زوو رۆیشتم!

وەرن سوار بن.

خودا دەیزانێ، من وا تێگەیشتم كەوتووینەتە دەستی جاش و سەربازان و سواری زیلمان دەكەن، سواربووینەوە، وەك بیستم تەواوێك لە جادەی مەرگ دوور كەوتووینەتەوە، من دەمێك بوو ناوم لەو جادەیە نابوو

جادەی مەرگ، ئەگەر نازانن ئەو دەو جادەیە مەرگی چەند پێشمەرگەی دیوە، بڕۆن لە لە (قەرەچناخا) و (مووروتکە) و گۆڕستانی (گردەڕەشە) بپرسن، دواتر مەرگی شالاویشی دیت، ئەو کوڕە گوتبووی پێشمەرگایەتی دوایی نایە، بۆیە وا باشە ژن بێنم و هیچ نەبێ پێشمەرگەیەك بۆ دوا ڕۆژ بخەمەوە و وەجاخ کوێر نەبم، لە پێشمەرگایەتی ژنی مارەکرد، ئێوارەیەك لەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگە بە نیازی بووك بردن، هاتن هاتن، نزیك جادە بوونەوە، حەیف هەزار حەیف! بە سەر بۆسەدا کەوتن، ئەو بۆسەیە وەك بڵێی تایبەت بۆ زاوا دانرابێتەوە، تەنها زاوا شەهید بوو.

بڕۆ، بە تاریکیدا بێ لایت بڕۆ، تەقوتۆقیش هەیە، بایەکی سارد سارد دەڵێی لە بەفری سەفینەوە هەڵیکردووە، ئای شوفێری چاو گورگانی خۆزگە کەرتکە چاوێکی وەك تۆم دەبوو، لە ئاقاری تاریکستاندا تارمایی ناو لەپە عەردێکم دەدیت، ئەوەی لە تەنیشتم دانیشتبوو، هەواڵێکی شیرینی بەخۆڕایی دامێ:

بەس بزانم ئەو شوفێرە چۆن سەرەدەری لەو تاریکیە دەردەکا و ڕێگە دەبینێتەوە؟

کوڕێکیدی هەواڵەکەی شیرینتر کرد:

منیش تێناگەم.

هەواڵ لەوە شیرینتر! دڵنیابووم کە تووشی شەوکوێری نەبووم، ئەگەر ئەو دووانەش تووش بوونە قیرسی لە منیش.

دەڵێی دنیا ڕووناکیەکی کەوتێ، تارمایی زوورگ بە دیارکەوتن، ئا ئەوە زوورگەکانن، ئەو زوورگانەی دەتگەیەننە بەستی شەرغە، ئۆخەیش خەریکە لە دەشتایی دەردەچین، من نامەوێ پێشمەرگایەتی لە دەشتایی بکەم، جێگەیەکی نیە بۆ خۆ شاردنەوە، لە بیرمە لەبەر خۆمەوە گوتم:

ئەگەر لە ناو شاخ و داخ نەبێت، من پێشمەرگایەتی ناکەم.

دنیا باش ڕووناکبۆتەوە، تڕومبێلەکان جوان لێك جودا دەکرێنەوە، تڕومبێلەکەمان جێبەقوتەی ئەمریکیە، نازانم، لە خۆوە وا دەڵێم، ڕەنگە

ئەمریکی بێ، ڕێك دەڵێی ئەو جێبەیە کە بە منداڵی دیتم و ئەویش وەك هەوکە دارماڵ بوو پێشمەرگە، ئەگەر دۆڵە کەسکپۆشەکەی بەرانبەرمان لە چاومدا سپێدەی نەدابا، جێبەکەی سەردەمی منداڵی هەرگیز ئەوها لە بینایم قیتنەدەبۆوە، ئەو دۆڵەم دیوە، بە هەڵە نەچوومە، ئەوە (دۆڵەگاڕانە)، دۆڵی تاقە ڕەشماڵەکەیە، دۆڵی مەلا ڕەوەندەکەیە، ئەو مەلایەی کە لە کوێستانێ دەهاتەوە، لەو دۆڵە ڕەشماڵی هەڵدەدا، بابم دەیگوت:

لە ناو هەموو ڕەوەندانی دنیا یەك مەلا هەیە، ئەویش وا لە دۆڵەگاڕانێ ڕەشماڵی هەڵداوە.

دەڵێن پیری سوارچاکان جارێك بە مەلای دۆڵەگاڕانی گوتبوو:

وەرە بیە مەلای تەڕوارێ دوو هێندەت دەدەمێ کە لەو هەموو گۆزە گۆزە و گەرمیان و کوێستان کردنێ بە دەستتدەکەوێت.

مەلای کوێستانی و گەرمیانی گۆتبوویە پیری سوارچاکان:

مام قادر، بە خودای ئەگەر تەڕوارم بە هەموو بیر و کانیاوەکانیەوە بە باخچەی تەماتە و تووتنتەوە، بەو هەموو زەوی و زار و سەر بزن و بەرزە و ڕەشە وڵاختەوە دە قەبەرم کەیت، دەست لە گەرمیان و کوێستانی خۆم هەڵناگرم، دەزانی چ خۆشیەکت دەداتێ، خۆشیەك ئەگەر بزانم لە بەهەشتێ خۆشی ئەوها هەیە، نوێژ و ڕۆژیەکانم دوو قات دەکەمەوە.

(پیری سوارچاکان هەر لە منداڵیەوە مام قادر بووە لە تەسکەڕەش هەر مام قادرە)

چەتۆ سەرناس کە خۆی لەو دانیشتنە کەپریە ئامادە بووە، بۆی گێڕامەوە:

پیری سوارچاکان کە گوێی لەو قسەیەی مەلا بوو، هەستایەوە، پەلاماری دەستی مەلای ڕەوەندی دا- لە بیرت بێ پیری سوارچاکان لە تەمەنی خۆی دەستی کەس کەسی ماچ نەکردووە، نە شێخ نە ئاغا، نە هیچ، تەنها سەید مارفی باداوەی هەولێرێ نەبێ - ویستی دەستی ماچ بکات، مەلا نەیهێشت، پیری سوارچاکان گۆتیە مەلا:

لەوڕۆ بە دواوە لە کنە من تۆ مەلای تەواوی.

هەوە بە هەڵە نەچوومە، ئەو دۆڵەی بەرانبەرمان دۆڵەگارانە، لێ هەنکە بێ گارانە، سەردەمانێك لە گاران و مێگەل رەشدەچۆوە، ئەها لەو بەرزاییە سەرکەویت، ئەوەی لای چەپی ئەشکەوتەکە پێ دەنێیتە ئاقاری تەرواری پیری سوارچاکان، کەمێك برۆی گۆرستانی تەروار بە دیار دەکەوێت، تەرواریش لەو گوندانەیە گۆرستانیان لە سەر سەریان راگرتووە، پێش ئەوەی خۆیان بە دیار بخەن گۆرستانەکەیان نیشانی رێبواران دەدەن، کەمێکیتر برۆ دەگەیتە نێرگزەجارەکە، ساکەگۆرێکی گەورە یەك پارچە نێرگزە، لە وەرزی نێرگز ئەگەر کۆپتەر لێبگەرێ ، کچ و کور، گەورەو گچکە لە هەموو لایەکەوە روو لە نێرگزەجاری تەروار دەکەن.

هەوە دۆڵە گارانە، بەو سپێدەیە ئەو شنە بایە بۆنی تەروار دێنێ، بۆنی باخچەکەی پیری سوارچاکان دێنێ، بۆنی گۆرستانەکەی دێنێ، بۆنی نێرگز دێنێ، هی ئەو گولیلکە نیسانانە دێنێ کە لە سەر گۆرەکەی عوسمانی برام جوانیەکی جوانتریان بە بەهاری تەروار داوە، ئەو برایەی وا بزانم گورگ زراوی رژاند و مرد، ئەرێ گۆری ئەو برایەم بۆ کەوتە تەروار؟ ئا، پیری سوارچاکان گوتبووی:

نەوەکانی تەروار بە زیندوویی بۆ کوێ دەچن با بچن، بەڵام لە کاتی مردن هەر دەگەرێنەوە تەروار.

تەر گەرانەوە! دوای پیری سوارچاکان یەك مردووش نەگەرایەوە تەروار، بۆ پیری سوارچاکان گەرایەوە!

هەوە دۆڵ هەر ئەو دۆڵەیە کە بۆ یەکەم جار رێچکەیەکی ترومبێلی لە خۆی کردەوە، جێیێکی وەك ئەو جێیەی ئێمە گەیشتە تەروار، ئەوەتا ئێستا باریکە رێی ترومبێل دیارە، ئەوانەی دیتبوویان دەیانگێرایەوە، مامیشم دەیگێرایەوە:

چەند کەسێك بە قازمە و خاکەناس رێیان خۆشدەکرد، هەندێك لە هەندێك جێگە بەردیان دەخستە جۆگەوە و جێیان بۆ تایە خۆشدەکرد، هەندێك بە کەژی و گوریس جێبیان رادەکێشا، لە دۆڵە گارانیان بە سەر

خست، تا جێبیان نەگەیاندە سەر جۆخینانی تەڕوار وازیان نەهێنا، ئەوە یەکەم ترومبێل بوو کە تایە بنێتە تەڕوار و ئاقاری تەڕوارەوە، ترومبێلەکەش هی خدر چەمرگە بوو، ئەو پیاوەی وەختایێکی زۆر سەر لق بوو.

من وەك خەون دێتە بیرم لە سەر جۆخینان لە دەوری جێبەکەی خدر دەخولامەوە، لەگەڵ کوڕەکەی خدر کە کەمێك لە من باخۆشتر بوو سەرمان لە دووی یەك دەنا، گەمەمان دەکرد، منداڵە وردکەی گوند دەوری جێبیان دابوو، جێبیان پێ ئەو دەعبایە بوو کە خۆی بە کەس نیشانناداا، کەچی خۆی بەوان نیشانداوە، هەر منداڵانی گچکە نا، زۆر لە هەراشانیش جاری یەکەمیان بوو ترومبێل ببینن، تووشی سەرسوڕمان هاتبوون، منیش سەرم لەوە سوڕمابوو کە تەڕوار و ترومبێلیان نەگوتووە، پێمواوبو ترومبێل تایبەتە بە هەولێر، من ئێستا دەڵێم باش نەبوو ئەو ڕۆژە بە سەردان چووبووینە تەڕوار، دەنا یادەوەریم بێ جێب و بێ گەمەی دەوری جێب دەمایەوە.

لە بەرانبەری دۆڵەگاران دانیشتووین، ڕۆژ هەر بەژنێك لە زەویی تەڕوار بەرزبۆتەوە، بە مەزەندی خۆم ڕێك لە سەر تەڕواری، لە ناو باخچەکەی پیری سوارچاکان هەڵات، ئا ڕۆژ لە باخچەکەی پیری سوارچاکان لە ناو گوڵاوی تەماتە هەڵات، لە کەلێنی بڕکە تووتنەکانی پیری سوارچاکانەوە هەڵات و دنیای ڕووناك کردەوە، خودایە بە دۆڵەگاراندا سەرکەوین و سەرێك لە باخچەکەی پیری سوارچاکان بدەم، ئەو باخچەیەی ئا ئەوەتا ڕۆژی لێ هەڵاتووە.

لە ناو پێشمەرگان کوڕێك لە هەمووان پتر قسە دەکات، درۆی هەند جوان دەهۆنێتەوە وا دەکات پیاو حەزی بچێتە درۆ، ڕوو لە ئەبوو ئەحرار:

ئەو ڕۆژە خۆ بە چاوی خۆت دیت، ئەو دەمەی لە کولانکەی ماڵەکەوە تەماشات دەکرد، من چۆن دەبابەیەك لە تەنیشتەوە بۆم هات و یەك لە پشتەوە، خۆ ئەگەر دوو کلاشینکۆفم پێ نەدەبوو، لە ترپی سەی

دەچووم، دیتت خۆ، کوو دەبابەکان سەریان لێ شێوا و پشتاو پشت هەڵاتن، لۆیە قەت بە یەك کلاشینکۆفەوە مەچنە شەڕێ.

ئەبوو ئەحراریش دەیگۆت:

بەش من لە تۆ نەبی.

دیاربوو مەبەستی بوو بڵێ: بەشم تێدا نەبێ.

ئەو کوڕە گەنجە، مخابن ناویم لە یاد نیە، بەڵام رەنگە ناوێکی پڕ بە پێستی بۆ ببینمەوە، دوور نیە ناسیار بێت و بیناسمەوە، سپێدەی تەڕی ئاقاری تەڕوار چی لە یادەوەریم نەکردبێ، من ئەو کوڕە، ئەو کوڕە سمێڵ دەسکە گیاییە کە هەر لە گیای دەشتی هەولێر دەچێ، مەیلەو زەردە، دەناسمەوە، من ئەو گەنجەم بە پیری دیتووە، ئا بە پیری بە منداڵی نا، نا نا، پیری وا نا، تازە چووبووە تەمەنەوە، ئەو پیاوە بە تەمەنەی دەڵێم رێك ئەو کوڕە گەنجەیە، سمێڵی هەر ئەو سمێڵەیە درۆکانیشی هەر ئەو درۆیانەن، ئا دیتمەوە لە تەڕوار دیتمەوە، ئەو رۆژەی جێبەکەیان گەیاندە تەڕوار، ئەو پیاوە حەفتەیەك دەبوو گەیشتبوو، مام نووری ناوبوو، لە رەحیماوەی کەرکووکەوە پێشمەرگایەتی گەیاندبوویە تەڕوار، مام نووری رێك ئەو نووریەی ئێستایە من ناو لەو کوڕە گەنجە دەنێم کاك نووری، مام نووری و کاك نووری هەر یەکن، هەردووکیان فرچکیان بە درۆی خۆش گرتووە، مام نووری پێشمەرگەی عەزیز عارەب بوو، ئەو پیاوەی رقی دنیای لەو عەرەبانە دەبۆوە کە دەفەری قەراجیان داگیرکردبوو، کەچی نازانم چۆن ئەو عارەبەی پێوە نووسابوو، مام نووری دەیگێڕایەوە:

زستانێك نازانم چ ساڵێك بوو، لە سەر پردەکەی پردێ، لە پڕ دوو کۆپتەر گەیشتنە سەرمان، ئێمە شەش پێشمەرگە بووین، ئەو کاك عەزیزەشمان لەگەڵ بوو، ئەوکات هێشتا نەببووە سەرپەل، چ بکەین باشە، گوتم: براینە، دەست هەڵێنن، بە قسەیان کردم، بووە قرمەهوڕ، بینیم بەو چاوانەی خۆم بینیم، کۆپتەرەکان یەك لە دوای یەك چرە دووکەڵیان لێ بەرزبۆوە، سەراو سەر بەرەو زەوی هاتن، باش بوو زوو خۆمان لادا، وەرنا

باڵی کۆپتەر لە سینگمان دەچەقی، بەو گوێیانەی خۆم گوێم لێبوو، شوفێرێکیان دەیگوت: کوڕە مام نووری من کردم تۆ مەیکە، ئیدی کۆپتەرەکان باڵیان تێکئالا و کەوتنە سەر پردەکە و بە شێوەیەك لە ئاسنەکانی سەر پردەکە گیر بوون، لێنەدەبوونەوە، هەتا حەفتەیەك ڕێی هەولێر- کەرکوك گیرا، پردەییەکان ئەوبەر و ئەمبەری زێیان نەکرد.

عەزیز عارەبیش بە پێکەنینێکی شیرینەوە دەیگوت:

ماخرا، بە خودای ئەگەر بە خۆم لەگەڵت نەبام، باوەڕمدەکرد!

لە مەبەستی تێنەدەگەیشتم، مام نووری تەنها لە رووی پیری سوارچاکان رووی نەبوو روو لە درۆبکات، دەنا کەس نەبوو بە درۆ جوانەکانی وی لە سەر پشت نەکەوتبێت، یان ترس پێی لە سەر پێی راوینەنابێت، ئەدی درۆیەکی وی چەتۆ سەرناسی بە شاخان نەخست و نەیگەیاندە هێلانەی بازان! ئەو چەتۆیەی لە هەموو تەمەنی خۆی تێنەکەوتووە، هەر بە تێرامانێك لە ناو هەزار راستی درۆی زۆر وردیشی دەناسیەوە، کەچی درۆیەکی گەورەی مام نووری هێندەی نەمابوو بۆ هەتایە نازناوی سەرناسی لێوەرگرێتەوە و بازی لەجێ دانێ، ئەو نازناوەی بە راوێژی ریشسپیانی هەموو گوندەکانی هەردوو بەری بەستی شەرغە پێبەخشرابوو، سەربردەی بە شاخ کەوتنی چەتۆ سەرناس ئەوهایە: لە دەو بەستێ ڕێك لە ئاستی باسکە بەرازێ، مام نووری لەگەڵ پێشمەرگەیەکیدی دەگاتە چەتۆ سەرناس، هاوار دەکات:

کوڕە، هەی بەدبەخت، ئەوە کەری گوێت لەو تەقوتۆق و دنیا خراپبوونە نیە، ئەوەتا جاش و سەرباز لە پشت ئەو بستووەن، گەیشتنە سەر بەست، زوو خۆت دەربازکە، واز لە بزنەکانت بێنە.

چەتۆ سەرناس دوایی بۆ منی دەگێڕایەوە:

هەستمڕاگرت، هەستم لە گوێی خۆم راگرت، سەرەتا هیچم نەبیست، دوای جوانتر هەستڕاگرتن و دوای تیژ تێپەڕینی ئەو دوو پێشمەرگەیەی هەواڵەکەیان دامێ، گوێم پڕ بوو لە تەقەو هات و هاوار، یەك پێ رووەو

(باسکە بەراز) هەڵاتم و هەڵگەڕام، لەوێش خۆم بۆ نەگیرا، باسکە و باسك بە باز بازمەدا و خۆم گەیاندە ئەشکەوتە گەورەکەی (گەلی سۆر)، لە ئەشکەوت جێم نەبۆوە بەلای تەلانە سەختەکەدا بە چنگەڕنێ سەرکەوتم، کاتێکم زانی وا لە بن دوو هێلانەکەی سەری سەرەوەم، مەبەستم هێلانە بازە، ئەو جێیەی هەتا ئێستا جگە لە باز پێی کەس کەسی پێنەکەوتووە، پیری سوارچاکان نالێم.

بە چەتۆ سەرناسم گوت:

باشە نەتدەزانی مام نووری ئەوهایە؟

چەتۆ سەرناس گوتی:

نا، جاری یەکەم بوو بێتە بەستی شەرغە، هێشتا کەس ناویشی نەبیستبوو، بەڵام بۆ ئەوە نالێی پێشمەرگەکەی لەگەلی بوو، چۆن باوەڕی پێکردا دەڵێن گوتبووی:

من هیچم نەدیت، هیچم نەبیست، بەڵام مام نووری بە شێوەیەك باسی هاتنی جاش و سەربازی کرد، هەر بە راستی باوەڕم پێکرد.

گوێم لێیە، کاك نووری کە لە سەردەمی چەتۆ سەرناس ناوی مام نووری بوو، دەڵێ:

کوڕە هەستن بە رێکەوین، ئەها بە دووربین تەماشاکەن، بە ئاراستەی (بانە قەرات) بڕوانن، هەر بنە دارە وا هێور هێور لەو چەمەی بەردەممان هێورتر بەرەو ئێرە دێن، ئەها ناوە ناوە رادەوەستن، دەزانن ئەو دارانە پێناچێت جاش بن، هەبێ نەبێ مغاویرن، ئەوانەی بۆق و سەگ و پشیلەش دەخۆن، کوڕە با هەڵێین بە خودای ئەو دارە مغاویرانە ئێمەش دەخۆن.

هیچ درۆتان لە سەرم نیە، هێندەی نەمابوو، بە دەردی چەتۆی سەرناس بچم.

چەمەکەی بەردەممان لقێکی لە بەرزایی دۆڵەگاڕانەوە دێ، لە ئاقاری تەڕوارەوە، چ چەمێکی ناسکە، روونە، چەمێکە لە تەڕایی تەڕواردا دێ و بە کەسکایی بەهاردا رێدەکات و نازانم ئەو هەموو جوانیەی خۆی بۆ

کـوێ دەبـات، خـودایە، چەم ئەو هەمـوو وردە چەوە ڕەنگـاوڕەنگەی لە کوێ بوو، وردە چەوی چەم چەند لە ددانـی فریشـتە دەچـوو، مـن ددانـی فریشتانم نەدیوە، بەڵام بە گوتەی گوڵی کۆساران ئەو وردە چەوانە ددانی فریشتەن و بـزانە بـۆ چ مەبەسـتێك ڕژاونەتە ئەو چەمەوە، گـوڵی کۆسـاران دەیگوت:

ددانی فریشـتە وەك ددانـی مە، وەك ددانـی ئـاژەڵان سـپی نـین، ددانـی فریشتان ئاڵوواڵان، ددانی فریشتان هەر قلەی لە ڕەنگێکن، نازانم لە بـارەی ددانی فریشتانەوە چ بڵێم! کەسێك بیەوێ ددانی فریشتان بناسـێتەوە، دەبێـت زۆر لە وردە چەوی نـاو چەمـی بەهـاران وردبێـتەوە، لەوێ هەنـدێك لە ددانی فریشتان دەبینێتەوە.

ئای گوڵی کۆساران، دەزانم گۆڕەکەت لە گۆڕستانی بـانەقەراتە، ئەرێ لەوێ بوو! پێدەچێت ڕێمان بە بارەگاکەی ئەوێ بکەوێ، بەڵام گۆڕەکەت بە چی بناسمەوە، ئەگەر دەیبینمەوە، دێمە لای کێلەکەت و ڕەنگە کەمێـك دەمیش بجووڵێنم ئەوجا دەڵێم:

گـوڵی کۆسـاران، سووروسـپیترین ژنـی هەمـوو بەسـتی شـەرغە، هـی هەموو دیوی هەولێر و وراتی کۆیێ، هی نیوەی دنیـایێ، دیـتمەوە، ددانـی فریشـتانم دیـتەوە، لەو چەمەی لە بەرزاییەکـانی تەڕوارەوە بە بـن شـینایی ئاسمان بە ناو کەسکایی زەویدا بەو سپێدە لەو سـاتە ڕەنـگ پیـرۆزەییەدا، دیـاریی خوداوەنـدی بـارانە، دیـتمەوە، ددانـی ئەو فریشـتانەم دیـتەوە، ئەو ددانـانەی ڕەنـگە تـۆش بـۆ یەکەم جـار هەر لەو چەمەی بەر دەمـی مـن بینیبێـتن، ئەرێ گـوڵی کۆسـاران تـۆ بـۆچی گـۆڕەکەت نەکەوتە تەنیشـت پیری سوارچاکانەوە؟ خۆ وەك چـۆن تەڕوار باوەشـی لە بەسـتی شـەرغە و پیـری سـوارچاکان باوەشـی لە تەڕوار دابـوو، تـۆ تونـدتریش پیـری سوارچاکانت لە باوەش گرتبوو.

گـوڵی کۆسـاران لە دوا سـاڵەکانی تەمەنـی ڕووی قسـەی لە ئـێمەی منداڵ بوو:

لە هەموو بەستی شەرغە یەك مێر هەبوو گوێ بە نزای سەید و شێخان نەدا - سەید مارفی لێدەرچێ- و ژنی سەیدی سەیدان مارەبکاتەوە، ئەو پیاوەش پیری سوارچاکان بوو، مارەکردنەوەی ژنی شێخ و سەیدان پیاو نەبوو بوێرێ خۆی لێدا، کێ دەیوێرا؟ دەیانگوت، هەرکەسێ نزیکبکەوێتەوە لەکۆنە ژنی شێخ و سەیدان، بۆ هەتایە بێ بەری دەبێت لە خێر و خۆشیی ژیان، لە هەردوو دنیا دەبێت، بەڵام پیری سوارچاکان گوێی نەدایە گۆتەی خەڵکی، قسە و قسەڵۆکان، ئەگەر ئەو نەدەبوو، من ئەوها دەمامەوە.

تۆ، گوڵی کۆساراني جوان، گۆڕەکەت دەبوو لە گۆڕستانی سەید مارف بێت.

لەو ساتە، پیری سوارچاکان و گوڵی کۆساران لە شێوەی بای وەشت و نمەی باران ئاویزان بە یەکەوە لە یادەوەی من هەڵیانکردبوو، دایانکردبوو.

هووشەیەك کە هەر دەتگوت هەواڵی ئاسمان تێکچوونی بە زەویدا بڵاوکردەوە، لە چەمی پڕ لە ددانی فریشتەی کردم و گوڵی کۆساران و پیری سوارچاکانی بە دوورایی خۆیان دوورخستەوە، هووشەیەك، لوورەیەکیدی، چما دەنگی تۆپ ئەوهایە! ئەوە چ جۆرە تۆپێکە؟ لێرە دەبێ بڵێم بۆ زیندوو هێشتنەوەی سپێدەی تەڕواری، جاروبار وەك مەلی تۆراو لە پۆل، لەو پۆلە پێشمەرگەیە تەرە دەبم و تێکەڵ پۆلێکیتر دەبم، بەڵام هەر لە ئاقاری تەڕوار و هەر لە سپێدە دەمێنمەوە، زۆری نەبرد گڕەی فڕۆکەش هات، تۆی تۆپەکان رووە و تەڕوارن، فڕۆکەکانیش لە ئاسمانی ئاقاری تەڕوار دەسووڕێتەوە، دیارە وەرزی سووتانی تەڕوارە، کێ دەزانێ جاری چەندەمە تەڕوار دەسووتێ؟ پیری سوارچاکان بە چاوی خۆی حەفتی دیتبوو، بە پەنجەی خۆی حەفتی ژماردبوو، لە دوای کۆچی تەڕواری و کۆچی دوایی پیری سوارچاکان، تەڕوار هەر لە سووتان بووە، حەفت جار پیری سوارچاکان بە دەستەکانی خۆی تەڕواری کوژاندۆتەوە، لەو حەفت جار سووتانە، جارێکیان گوڵی کۆساران گوتەنی:

دەستی خودای تێدابووە، زستانێك برووسکێکی ناردووە، تەڕواری کردۆتە خۆڵەمێش.

پیری سوارچاکان گوتبووی:

ئاگری خودا و عارەب هەردووکیان لە ئاسمانەوە بە سەر تەڕواردا دەڕژێن، بەڵام ئاگری عارەب لە هی خودا گەرمترە.

هەموو جارێکیش یەکەم کەس بووە ئاوەدانی بە تەڕوار بداتەوە، بیر و کانیاوەکانی دەرداتەوە، جۆگەلە بۆ باخچەکانی راکێشێ و دیواری رووخاوی دیوەخانەکەی خۆی قیتبکاتەوە، لبادی درێژ درێژی لێ رابخاتەوە، دوای هەموو سووتانێك پیری سوارچاکان یەکەم تەڕواری بووە کە لە سەر تاتە نوێژەکەی (کانی پیاوان) نوێژی گەڕانەوەی دابەستووە، گوڵی کۆسارانیش هەر یەکەم ژن بووە کونەدەکەی لە کانی ژنان پڕ کردووە و یەکەم کەسیش بووە کە رایەخی مێوانداریی راخستووە، ئای گوڵی کۆساران، ئای پیری سوارچاکان، تەڕوار رەنگە ئێستا ئاگر بگرێت، کێ دەیکوژێنێتەوە؟ پیری سوارچاکان، دووکەڵ دووکەڵ.

لە ئاقاری تەڕوارەوە دووکەڵێکی باریك زۆر باریك بە ئاسماندا چوو، ئەها سەری لە خۆر سوو، خۆر تا ئێستا هەر لە سەر باخچەکەی پیری سوارچاکان راوەستاوە، دنیا هەر سپێدەیە، لە چاوی من سپێدەیە و بە سپێدەیی دەمێنێتەوە، دەبێ کام تەپرەك ئاگری گرتبێت، تەماشاکەن، سپێدەی تەڕوار جوانترین دووکەڵی لە خۆی نەخشاند، لە تەمەنم دووکەڵی هێندە جوان و ناسکم نەدیوە، جوانیی دووکەڵ هەر لە چاوی من نا لە چاوی پێشمەرگەکانیدیشی دا، پێشمەرگەیەکی رەشتارەی شیرنی ریشنی کەڵەگەت (ئەبوو رەشا)یان دەگۆتێ ، بە عەرەبی گوتی:

ئەو دووکەڵە جوانە دەبێت لە سووتانی چیەوە وا بە جوانی بۆ ئاسمان هەڵبکشێ؟

پێشمەرگەیەك سیمای جوان خۆنیشان نەداتەوە، عەلی سکی ناو بوو، ئا، ئا، سکی، هەر بە عەرەبی وای وەڵام دایەوە:

دڵنیام شتێکی جوان زۆر جوان ئاگری گرتووە.

کاك نووری کە ماوەیەك بوو دابوویە بێدەنگی، یان من چووبوومە خەیاڵەوە و ئاگام لێبڕابوو، گوتی:

نازانن چیە دەسووتێ؟ ئەوە جلك و پۆستاڵ و بێریەی هەزار سەربازەکەیە.

ئەبوو ئەحرار گۆتی:

هەزار سەربازی چی؟

کاك نووری زۆر بە هێمنی:

لە بیرت چوو؟ ئەو هەزار سەربازەی ئەو رۆژەی لە سەربازگەکەی دێگەڵە دیلمان کردن، ئەوە نەبوو بە فەرمانی ئێوە رووتوقوتمان کردنەوە و بە رووتی ناردمانەوە بۆ سەربازگە.

ئەبوو ئەحرار دووربینەکەی لە چاوی نزیککردەوە و سەری بادا و لەو هێمنتر گوتی:

وایە ، ئەها، بۆنی پۆستاڵی سوورکراوە دێ...

پێشمەرگەیەك، هەرچەندە هێندە رەشیش نەبوو بە هەڵە نەچووبم هەڵمەتە رەشی ناو بوو، پێدەچوو پۆستاڵی لێبووبێتە مریشك:

وەی مریشکی سوورکراوە چەند خۆشە.

هەر چەندە زگم قوڕەی دەهات، بەڵام جوانیی دووکەڵ نەیهێشت خەیاڵم بە لای مریشکی سوورکراوەدا بچێ، خەیاڵ بردمیەوە لای ئەو چەند تاڵە قژە رەشەی کچە رەشتاڵەکە کە بە روویدا بەریدابوونەوە و گەیشتبوونە نزیك درزی مەمکە قیتەکانی، ئۆی چەند قیتبوون مەمکەکانی، وای کیژە لە دەستچووەکە، بەردانەوەی قژت چەند جوان لێدەهات، ئای، دووکەڵی ئەو سپێدەیە چەند لە قژی کیژە رەشتاڵەکە دەکات، ئەرێ ئەو دووکەڵە تەڕواریە بۆچی هێندە ناسك و جوان بوو! چ پێناچێ دووکەڵ بووبێ، رەنگە چەند پەلە هەورێکی باریك بە سەر شانی یەکتردا هاتبنە خوارێ و بە پەیژەیەکی سپێدەیی ئاسمان و تەڕواریان بە

بەك گەیاندبێ، كاتێكیش تیچاوێكم دەدایە ئەبوو رەشا و جگەرەكەی، دووكەڵی ئاسمانی تەڕوارم لێ دەبووە دووكەڵی جگەرە، هەر دەتگوت تەڕوار گەڕەكێك ئەبوو رەشای تووتنی لە خۆی داگیرساندووە و لە خەمی دابڕانی پیری سوارچاكان مژ لە دارجگەرەی تەنیایی دەدا، ئەرێ سیمای ئەبوو رەشا بۆچی هێندە لە تووتنی رەشهەڵگەڕاو دەچوو! بەو سپێدەیە تەڕوار و ئەبوو رەشا لە پێشبڕكێن پێشبڕكێی دووكەڵ، ئەبوو رەشا چ جگەرەكێشێكی كوورەیی بوو، مەگەر پیری سوارچاكان دەنا كەسم نەدیت هێندەی وی دەم و لووت بە دووكەڵ، پیری سوارچاكان شەو و رۆژ سەد جگەرەی رێكی دەكێشا، گوڵی كۆساران دەیگوت:

پێشتر پتری دەكێشا

لە بەر خۆمەوە دەمگوت:

خودایە، ئەو دووكەڵە هەوریە قژیە لە سووتانی هیچ شتێكی جوانەوە نەهاتبێ.

هەر ئەو دەمە رستەیەكی بۆ ئەو دەم ترسناكی پیری سوارچاكانم بیركەوتەوە:

تەڕوار شتێكی نیە جوان نەبێ.

پێشمەرگە دانیشتنیان لێ خۆش هاتیە، ئەو چەند بنە دارە لەو دەم چەمە دەڵێی خوداوەندی درەخت و كەسكایی تایبەت بۆ پێشمەرگەی رواندوون، تا لە چاوی فڕۆكە و كۆپتەر، لە بەڵای ئاسمان بە دوور بن، جێبەكەش لە ترسی گێچەڵی ئاسمانێ خۆی لە بن لك و پەلكی داران شاردۆتەوە، چەند خۆشە دنیا تەقوتۆق و راوەدوونانی تێدا نەمێنێ، لەگەڵ دۆستان لەگەڵ یاران، هەموو بەهاران، بە بن هەور و باران، لە سبەینێ تا ئێوارێ، لێرە بمێنیەوە و سەرت پێشكێشی سێبەری ئەو درەختانە بكەیت و پێیەكانیشت بە یەكجاری ببەخشیتە ئاوی چەم و بە دەم بیرە هەڵدانەوە جاروبار ددانی فریشتان بخەیتە نیگاتەوە، ئەها لەو بەرزاییە كەپرێك چێبكەیت و خەیاڵ بەربدەیتە ئاسمانێ، لە بیرمە لەو خەیاڵە چەند دیرێكی

فۆلکلۆریم بۆ هات:

من کەپری خەیاڵ چێدەکەم
دارێك هەنار، دارێك مێو بێ
یەك پرتەقاڵ یەکێ سێو بێ
لە خەیاڵ کەپرێ چێدەکەم

---

گرەیەك نەیهێشت لە خەیاڵ کەپرەکە بۆ کچە رەشتاڵەکە چێبکەم ، من هەر دوو فرۆکەم دیت، بەڵام گوتیان شەش بوو، بووە گرموهۆڕ، بەڵام دوور، دوور کوێ؟ تەرِوار و ئاقاری، فرۆکەکان گەڕاندمیانەوە سەردەمانی کونە فرۆکەکان، ئەو کونانەی لە خەون پەرتتر خۆ نیشاندەدەنەوە، ساڵێك وا رێککەوت لە وەرزی بۆردماندا سەردانی ماڵی پیری سوارچاکان بکەم، منداڵ بووم منداڵتر لەو برایەم کە دوێنێ بە گریان بەجێمهێشت و نەیزانی بۆ کوێ رۆیشتم، تەرِوار دوو هێندەی ژمارەی خانووە تەپرەکیەکانی کونە فرۆکەی هەبوو، پیری سوارچاکان لە کەندی بەر ماڵان کونێکی لێدابوو، جێی هەموو تەرِواری لێدەبۆوە، وەختە بڵێم هێندەی دیوەخانەکەی دەبوو، ئەو دیوەخانەی گوڵی کۆساران دەیگوت:

لۆ چەند جغارەخۆرێکیش بێ مێوان نەبووە.

دەزانم لەمێژە دیوەخانی پیری سوارچاکان خشتێکی بە پێوە نەماوە، بەڵام تۆ بڵێی کونە فرۆکەکەی وەك خۆی مابێ، دوور نیە، دوای پیری سوارچاکان ئاساییە تەرِوار بێ دیوەخان هەڵبکات، بەڵام بێ کونە فرۆکە زەحمەتە تەمەن بکات.

لە ئاسمانی تەرِوار گرموهۆڕە، پیری سوارچاکان، گرموهۆڕە، من لەو سپێدەیە قەرداری بەهارم، ئەگەر دنیا هاوین با، تەرِوار وەك دۆزەخ ئاگری دەگرت، هەموو ئەو جوانیەی تەرِوار دەژاکا کە پیری سوارچاکان لە دیدی منداڵیمی نەخشاندبوو، ئێستاش ئەوەتا بە چاوی پیری سوارچاکان

تەماشای ئەو ئاقارە بەهەشتیە دەکەم، ئا، بە گۆتەی پیری سوارچاکان بێت تەڕوار پاوانێکە سەر بە ئاقاری بەهەشت، چەتۆی سەرناس دەیگوت:

لە سەر ئەو قسەیە پیری سوارچاکان لەگەڵ مەلایەك پیس تێکگیران، مەلا رووی لە پیری سوارچاکان کرد:

تەڕوار کە لە بن هەر بەردێکی گوویکی گەورە، تەپکە ریخێ هەیە چۆن دەڵێی بەشێکە لە بەهەشت؟

پیری سوارچاکان گۆتیە مەلا:

مەلا، هەرکەسێك بخوات، لە هەر جێگەیەك بێت، دەڕی، باش دەڕی، وەك تۆ دەڕی.

لەو سپێدە تەڕواریە سێوە لە رادیۆی پێشمەرگەیەکەوە هەڵیکردە سەحەرە و سپێدەی لە سەحەر گرت، ئەو سەحەرەی ئەوێ چ سەحەرێك بووا من هەر لە گچکەییەوە هۆگری دەنگی سێوەم، بەڵام هیچ کاتێك وەك ئەو سپێدەیە سەحەرەکەی ئەفسووناوی نەبووە، دەتگوت سێوە زیندوو بۆتەوە، گەنج بووەتەوە، سەحەرەکەی خۆی نوێ کردۆتەوە، سەحەری ئەو سپێدەیە پیری سوارچاکانی زیندووتر کردەوە و کەوتینە قسە، بۆ منداڵیمی گەڕاندمەوە، بە بیرمهاتەوە، پیری سوارچاکان هۆگری دەنگی حەسەن زیرەك و سێوە بوو، نازانم حەسەن زیرەك بۆچی رێی کەوتبووە تەڕوار، ئاخر کێ رێی بەوێ دەکەوێ! لەوێ لە دیوەخانی پیری سوارچاکان گۆرانی چڕیبوو، دەڵێن پیری سوارچاکان گوتبووی:

حەسەن کوڕم، تۆ هەر گوناهێکت کردبێ، خودا ناتباتە دۆزەخ، لە منی وەرگرە تۆ بەهەشتی، لە بەهەشتێ پێویستیان بەو دەنگەی تۆ دەبێ.

پیری سوارچاکان خۆی گوتەنی زۆر جار هەر بۆ دیتنی سێوە بۆ بیستنی دەنگی چووەتە کۆیە، چەتۆ سەرناس گوتەنی:

پیری سوارچاکان بلیتی چوونە بەهەشتی دابووە سێوەش.

لە بیرمە هەر کاتی لە رادیۆکەوە دەنگی سێوە دەهات، پیری سوارچاکان گۆچانەکەی توند لە دیوار دەدا، ئەو لە دیوار دانە واتای

بێدەنگبوونی دەدا، تا سێوە تەواو نەبا کەس بۆی نەبوو ورتەی لێوە بێ، جارێك گوتی:

خودایە وا خەریکە چاوم لێدەستێنیەوە، بەڵام تکادەکەم لە گوێم گەڕێ و لێممەستێنەوە، با لە سێوە بێ بەش نەبم.

خودا بە قسەی پیری سوارچاکانی کرد، تا ئەو ڕۆژەی مرد، گوێی لە گوێی من سووکتر بوو، سەحەرەکەی سێوە لەو سپێدەیەی ئاقاری تەڕوار، چ تەڕواری بوو، چ پیری سوارچاکانی بوو، چ یادەوەریی ئەفسانەیی و ئەفسوونیی بوو.

لە هەستاندا ئەبوو ڕەشا کە هەر دوو خولەك دەبوو جگەرەی کوژاندبۆوە، دیاربوو ئاگری نەمابوو، جگەرەیەکی دامێ و:

ڕەفیقل جەدید ئنتینی جداحە.

من لەو ڕستەیەی ئەبوو ڕەشاوە زانیم (جداحە)ی ئەوان چەرخی خۆمانە، ئەرێ بەو سپێدەیە چی وای کرد لە ناو ئەو چەند پێشمەرگەیە ئەبوو ڕەشا کەوتە دڵمەوە! جگەرەکەی؟ یان گۆرانیەکەی ماجیدە ڕۆمی؟ ئێوە نەتانبیست، کەس نەیبیست، کاتێ لەو دەم چەمە ئەبوو ڕەشا لەبەر خۆوە، بە ئەسپایی، نەرمتر لە ڕێکردنی چەمەکە گۆرانیەکی ماجیدە ڕۆمیی گوتەوە، من ئەودەم و ئێستاش بە دەنگی ماجیدە ڕۆمی دەتوامەوە و دەتوێمەوە، خۆزگە ئەو پیاوە ڕەنگ تووتنیە جگەرەکەی نەدەدامێ، خۆزگە گۆرانیەکەی ڕۆمیی نەدەگوتەوە، خۆزگە ئەبوو ڕەشا نەدەکەوتە دڵمەوە، ئەگەر وا نەبا دواتر هێندە بۆی نەدەگریام.

قوتە جێب بە بنەدارەوە ڕێدەکات، ببینن، بنەدار ڕێدەکات! لە ترسی کۆپتەر جێب درەختی لێڕوا، چەند چلە درەختێ بە دەستی چەند پێشمەرگەیەکەوە.. لە بن لێوانەوە گوتم:

ئەو درەختە جێبیە چەند جوان غاردەدا.

نەمزانی کاك نووری بیستی:

لەگەڵ هاتنی کۆپتەر جێب لە درەخت جوانتر لە جێی خۆی دەچەقێ.

لەوبەری چەمەکە ژنێـــك بە دەســـتێك لچکـــی بەرانپـــیلە تـــژی لە چیلکەوچواڵەکەی گرتبوو، بە دەستەکەیدی چلە دارێکی هێنـدەی بەژنـی خۆی، سوارێکم دیت، ئەویش وەك جێبەکە ببـووە درەخـت، بەو سـپێدەیە هەرچیم دەدیت لقە درەختێکی پـرچ پـڕی بە دەسـتەوە بـوو، بەو سـپێدەیە ترومبێل، مایین، پێشمەرگە، پیـاو، ژن، منـداڵ هەمـوو هەر هەمـوو تێکەڵـی کەسکایی درەخـت ببـوون، لە ترسـی فـڕۆکە و کـۆپتەر کـێ هەیە نەبێتە درەخت.

وەختی خۆی من و گوڵی کۆسارانیش بووینە درەخت، لە کاتی بوونە درەخت هەردووکمان یەك ڕەنگمان گرت، گوڵی کۆسـارانی سووروسـپی و منـی ڕەش و بـرش هەردووکمـان کەسـك هەڵگەڕایـن، کەسـکێکی خۆڵاوی، دێتە بیرم وەك ئێستا، وەك سپێدە درەختیەکەی تەڕوار دێتە بیـرم، هاوین بوو، ئا دەبێت هاوین بووبێت، مێوانی ماڵی گوڵی کۆساران و پیـری سوارچاکان بووم، سـپێدەیەك وەك ئەو سـپێدەیە گـوڵی کۆسـاران خولیـای سەردانی کچە ڕەشتاڵەکەی لە سەر گەڕا، ئەو کـچەی چەنـدم حەزدەکـرد پلکم با، باش بوو گوڵی کۆساران جگە لە من کەسـی دەسـتنەکەوت، ئەو ڕستەیەی گوڵی کۆساران چەند شیرین بوو، حەزدەکەم ئێستاش بیڵێتەوە:

کەریمە کوڕم دە تو وەرە لەگەڵ...

چۆن لەگەڵت نایەم، دەزانی ئەو ژنە ڕەشتاڵەیەی کە لە بەلاش نەببـووە پلکم چەندم خۆشدەویست، چەند جارێ هاتبووە ماڵمان، دایکم دەیگوت:

+ئەو ژنە زڕ خوشکی بابتە، بەڵام نە لە دایك نە لە باوك.

- کەواتە نابێتە پلکم؟

+ زەحمەتە.

لە ڕێێ، ڕێـی بـانەقەراتێ، لە کلکـایی باسـکە بەرازێ، لە دەو چەمـێ، دیـتم دەسـتی لە گیرفـانی کەوێ ڕەشـەکەی ڕاکـرد و قەڵەمبـڕە دەسـك کەسکەکەی دەرهێنا و دوو لقە داربیی بڕی و گوتی:

+ ئەگەر لە رووتەن کـۆپتەر گەیشـتنە سـەرمان، خۆمـان دەکەیـنە درەخت

- کوو دەبینە درەخت؟

+ کە کۆپتەر هات فێرت دەکەم، خودایە کۆپتەر دوای بڕێ و ئاسمان یەك کۆپتەر و فڕۆکەی پێوە نەمێنێ.

سەرەتا حەزمدەکرد هەرچی زووە ببمە درەخت!

قوتە جێب بە ڕێیەکدا ڕێدەکات، ڕێی کەر و بارە، چەپ و ڕاست هەمووی داروبارە، ڕێیەکە ڕێی بەهارە، گیا لە چۆکانە، چۆکی چی! لە سەر سینگ و ناو شانە، خەریکە بە جێبەوە لە گیا بزربین، پێدەچێت ئەو ڕێیە ڕێیەك بێت لە ڕێگاکانی بەهەشت، بۆنی بەهەشت دێ، بۆنی تەڕوار دێ، هەوە ئەو پێدەشتە ڕێ بەهەشتە، ئەها گەیشتینە زاری دۆڵێ، دۆڵاودۆڵ سەرکەوتین، ناوی ئەو دۆڵە، ئەو ڕێوبانەم لە یاد نەماوە، بەڵام دەزانم ڕێیەکە بە تەنیشت ڕێی دۆڵەگاڕانەوە، دەیناسمەوە، پیری سوارچاکان وەهای نەناساندووە، نەیناسمەوە، لە بیرمە پیری سوارچاکان باسی هەموو ئەو ڕێگایانەی دەکرد لە تەڕواریان دەکردەوە، پیری سوارچاکان بەو ڕێگایانەی دەگوت، ڕێی بەهەشت، ئەرێ پیری سوارچاکان دوای ئەو هەموو ساڵە منت بۆچی هێندە سەراسیمە و هۆگری تەڕوار کردووە، من چیم لە تەڕوار داوە، خۆ من تۆ نیم، تەڕوار بە من چی، چی بە من بەخشیوە، خۆ هێندە نایناسم، چەند جارێك بە مێوانداری هاتوومە و بڕایەوە، پیری سوارچاکان دەڵێی جادووی تەڕوارت لە من کردووە! لە تەڕوار چ بەهەشتێکت شاردۆتەوە! بەهەشتێك جادووی ڕاکێشانی نەوەکانتی لە خۆی کردووە، لە منی کردووە، ئەو ڕێیە ڕێی بەهەشتە، ئەگەر ئەو بەرزاییە ڕێی جێبی هەبێ، هەر سەرکەوین دەگەینێ، هەڵە نەبم بەهەشتی پیری سوارچاکان و نەوەکانی بەدیاردەکەوێت، ئەها، خوار ئەو گردۆلکەیەی دەڵێی لە ناو تەم دانیشتووە، سەر جۆخینانی بەهەشتە، ئۆی لەو ڕێوبانە گوڵزاریە، هەرچی گوڵی گوڵستانان هی کەژ و شاخان هەیە ئەوەتا بەو سپێدە بەهاریە لەو دەشت و دەرە، لە دەو ڕێ، هەردوو بەری ڕێ، دەڵێی لە پێشوازیدان، ناپرژێمە سەر تەماشاکردن،

یادەوەری ناهێڵێ بپرژێمە سەر روانینی گوڵانی رێی بەهەشت، لەبیرمە پیری سوارچاکان دەیگۆ:

ئەگەر دەتانەوێ بە چاوی خۆتان رێی بەهەشت ببینن، برۆن، لە بەهاردا برۆن، بە هەر رێیەکدا دەڕۆن برۆن، سەر لە تەڕوار بدەن.

با دووربینەکەی ئەبوو رەشا وەربگرم و تەماشایەکی بکەم، نا پێویست ناکات، ئێستا نزیك دەبینەوە و دەگەینێ، بەرگەی بەهەشتی پیری سوارچاکان ناگرم، چاوم دادەخەم، جێب پێچێکی کردەوە، دایەوە گەوەیەک، رەنگە پێچ و گەوەکەی پشت سەر جۆخینان بێت، ئا، بە چاوداخراوی لە بەهەشت دەسووڕێمەوە، دەبا لە بن چاوانەوە کەمێك لێی بروانم خۆ نامرم.

ئێرە کوێی تەڕوارە! تەڕواری چی! داخوا لە کەنگێوە پشتمان لە بەهەشتەکەی پیری سوارچاکانە، حەیف لامانداو نەگەیشتینێ، حەیف، پێش سڵاوکردن ماڵئاواییم لێیکرد، ئاوڕدەدەمەوە، ئاوڕدانەوەیەك مەگەر پیری سوارچاکان وەهای ئاوڕدابێتەوە، ئای، فرمێسکم دێ، خەمی دابڕان فرمێسکی هێنا، چ یارێکە تەڕوار! من ئاسایی نیم، دەڵێی پیری سوارچاکان لە مندا زیندووبۆتەوە و بە تەڕواردا هەڵدەڵێ، پیری سوارچاکان لە تەمەنی رەنگە سەد ساڵیدا بوویێت، ئەو دەمەی تەڕواریان فرۆشت، بە دارشتنی تازەوە ئەوهای بە تەڕواردا هەڵدەگوت:

بە ئارەقە و فرمێسك هیشکەوارم کردە تەڕوار، پێشە من کەنگێ تەڕوار هەبوو، کێ ئەو ئاقارە لاچەپەی دنیای دیتبوو! جگە لە بەراز کەس رێی بێرە نەکەوتبوو، هەموو ئەو بیر و کانی و چەم و دۆڵ و شاخ و گردۆلکە من ناوم ناون، جگە لە (باسکە بەراز) کە هی بەرازەکانە هەرچی شتی تەڕوار هەیە لە عەرد و بن عەرد و ئاسمان لە منەوە ناویان وەرگرتووە، یەکەم گۆڕ کە تەڕوار لە ئامێزی خۆی گرتبێت بە دەستی خۆم لێمداوە، بەر لە من تەڕوار گۆڕستانی نەبوو، لەو پیاوەی پێغەمبەر گەڕێ کە لە دوورەوە ئەها لە (کاولان)ەوە بە سەر تەڕواردا دەڕوانێ، ئەوەی خودا لێی

گۆڕی و گۆڕەکەشی بە گۆڕان ناچێ، لە بنی دنیاوە هات و سەری خۆی لە بەردەکانی (کەڵەکچی) داو ئەوەتا دوو گۆڕی هەیە، گۆڕێکی خڕ بۆ سەری و لاشەکەشی لە گۆڕێکی درێژکۆلە، هەندێك دەڵێن (بن زەین عابدین)ە، پێش من تەڕوار تەڕوار نەبوو، تەڕوار هەر نەبوو، سەر بە هیچ جێیەك نەبوو، کەس خاوەنی نەبوو، شێخەکان کێ بوون! تاپۆی ڕەش لە کوێ هات؟ خودای خواپێداوان، بەس سێ ڕۆژ جاحێڵم بکەوە، سێ ڕۆژ و بەس، ئای لە پیری چۆن دەتکاتە گاڵتەجاڕی شێخ و ڕەوەندان! جاحێڵم بکەوە سێ ڕۆژ و بەس، بۆ ئەو کەسانەم جاحێڵ بکەوە کە بە بەر چاوی خۆمەوە سەودا بە تەڕواری منەوە دەکەن.

جوان دێتەوە بیرم، خوشکە گەورەکەم بە دەنگێك پیری سوارچاکان گوێی لێنەبێ، گۆتیە بابم و وەڵامەکەی بابیشم لە بیرە:

+ ئەرێ ئەگەر خودا پیری سوارچاکان جاحێڵ بکاتەوە، چ دەقەومێنێ؟

- جا چ ناقەومێنێ، دنیا بە سەر یەکدا کاولدەکات، ئێوە ئەو پیاوەتان بە جاحێڵی ولە ساتی توورەبوون و شەڕدا نەدیوە، هەر من دەزانم چ میرغەزەبێکە، بە تاقی تەنێ دەچێتە شەڕی حکومەتێکەوە، دادەڕسێتە هەموو دنیا، من زۆر شەڕی ئەو پیاوەم دیتووە، وێنەی شەڕێکیان وەك گەمە خۆشەکانی منداڵی هەمیشە لە چاومدایە و ناسڕێتەوە، من لە سیلەی خانووێکەوە ئەو پیری سوارچاکانی ئێوەم دیتووە بە سەر ئەسپەکەیەوە شەڕی دەکرد، دەستێکی بە جڵەوە دەستێکی بە تفەنگەوە، لە سەر ئەسپەوە بە یەك دەست تەقەکردن هەر بە قسە خۆشە، لە دەست کێ دێ.

بە منداڵی وەك ئێستا نەبووم جار جارە لە شتان هەڵمدەدایێ، گۆتمە بابم:

بەڵام لە سینەما پیاوێکم دیت لە سەر ئەسپەوە بە دوو تفەنگ شەڕی دەکرد.

بابم گۆتی:

پیاوی سینەما جوایەزە، پیری سوارچاکان بچێتە ناو سینەما، بە حەفت تفەنگیش شەڕدەکات.

هەرچی خدر خەرمانە کە بە دوو سێ پشت دەگەڵ پیری سوارچاکان دەگەیشتنەوە یەک و خەرمانێك مێژووی ئەو بنەماڵەیەی لە بێرایی بە نایلۆن گیراوەکەی خۆی هەڵدابۆوە، دواتردەیگوت:

پیری سوارچاکان زۆر کەڵەگەتە، بۆوەی دەستان بگاتە شانی، دەبێت بچنە سەر منارەی چۆلی، ئەو پیاوە شەڕی تورکی کردووە، هی عەرەب و عەجەمی کردووە، سەنگەری لە رووس و ئینگلیز گرتووە، هێشتا کۆمۆنیست لە هیچ جێیەکی دنیایێ ناویان نەبووە، ئەو لە شێخ و ئاغایان راپەڕیوە هەر بە کەڵەگەتی ماوەتەوە و بۆ کۆمۆنیستەکانیش دانەچەمیوە، لە گرانیی گەورە تورك وەك کوللە بە گوندان وەردەبن، تەڕو وشك دەماشنەوە، دەگەنە ئاقاری پیری سوارچاکان، لێیان دێتە دەست و چل تورك لە خوێن دەگەوزێنێ، هەموویان بە بەستی شەرغەدا دادەداو دەڵێ:

وڵاتی کوردان جێی تورکان ناکاتەوە، نە زیندوو نە مردوو.

+ هاوڕێیان، کۆپتەر کۆپتەر.

ئەبوو ئەحرار وشەی (هاوڕێیان)ی بە شێوەیەك گۆکرد، کەس ناتوانێ ئەوهای گۆبکات، ئەوە هیچ کە دەنگی (ڕ)ەکەی لە هەموو(ر)ان سووکتر گۆ، دەنگەکانیدیش ئاسایی نەبوون.

+ چ نیە، ئاگای لە ئێمە نیە. -کاك نووری وای گۆ-

+ نا، ئەو دوو کۆپتەرە سەگانیە بۆنی جێیەکەیان کردووە -نازانم کێ بوو وای باگۆ دایەوە-

+ وایە، بۆنی پێشمەرگە تیژە، دەگاتە ئاسمانێ، ئەوە قسەی قەرەچووخیەکەیە، نازانم کێ قەرەچووخیان دەگوتێ، ئەو کوڕە لە قەراجەوە هاتبوو، لەوێوە راویاننابوو، ئەو راونراوە گۆتەیەکی هەبوو، ناوە ناوە دەیگوتەوە:

- وابزانم کەس شەڕەفی نەماوە.

- بەچی دەزانی؟
- شەڕەف واتە زێد، زێد کە داگیرکرا، شەڕەف...
- ئەگەر وابێ، وایە.
- لەو ڕۆژەوەی گوندەکەمیان سووتاند و دەریانکردین، من هێندەی پووشێك شەڕەفم نەماوە.

ئەو کوڕە قەراجیە قەرەچووخیە وەك پیری سوارچاکان قساندەکات، چەند لە پیری سوارچاکان دەچێت، کۆپتەر لێناگەڕێ پیری سوارچاکان لە منەوە بێتە قسە، بێتە گریان و تەمەنێك فرمێسك بە سەر تەڕوارەکەیدا هەڵوەرێنێ، کۆپتەر لێناگەڕێ، دیارە لە ئاسمانەوە بۆنی پێشمەرگەی کردووە، چەند نەوی دەسووڕێتەوە، نەوی، کوڕە قەراجیەکە لە بەر خۆیەوە بە مەیلەو گاڵتەوە ڕستەیەکی پیری سوارچاکانی گوتەوە:

هەرێ هات، عەرەب هات.

دیاربوو ئەو ڕستەیە سەر ڕستەی ئەو کوڕە بوو، زۆری گوتبۆوە و دەیگوتەوە، جارێکیدی بە دەنگێکی بلندتر گوتیەوە، ئەبوو ڕەشا بە گاڵتەی عەرەبیەوە گوتی:

لەوەو دوا دەبێ بڵێین:

هەڵێ هات، کورد هات.

کوڕە قەراجیەکە گوتی:

هەر ئەوە مابوو!

ئەبوو ڕەشا مژێکی قووڵتری لە جگەرەکەی دا و لە دەم و لووتیەوە هێندەی تۆپێك دووکەڵی هێنایەوە:

ئێ کاکە، ژمارەی جاش لە سەرباز زیاترە.

کاك نووری هەڵیدایێ:

بەوەی باشە کوردەکە هەر لە عەردەوە بۆ مان دێت، دەستی بە ئاسمان ڕانەگەیشتووە.

پیری سوارچاکان لە دوا ڕۆژەکانی ژیانی لە بەر خۆیەوە و لە سەرەخۆ دەیگوت و دەیگوتەوە:

هەریّ هات، عەرەب هات، هەریّ هەریّ تورك هات، نـا، نـا لێیانـدەن، مەپارێزن.

هەموو دەیانگوت:

تەواو شێت بوو، پیری سوارچاکان شێت بووە.

بەڵام خدر خەرمان بەرپەرچی هەمووانی دەدایەوە دەیگوت:

ئێوە مێژووی ئەو پیاوە نازانن، ئەگەر بتانزانیایە کوفری واتان نەدەکـرد، ئەو پیاوە هەموو تەمەنی راوراوانێ بووە لەگەڵ عەرەب و تـورك و فـارس، ئەو پیاوە بەو چەند وشەیە مێـژووی خـۆی دەگێـرێتەوە، مێژوویێکـی پـڕ لە کوشتار.

ئێرە جێیەکە، ئەو باسکە بەرازەی وەك تەم لێمەوە دیارە کە تاقە جێـی تەڕوار بوو، پیری سوارچاکان ناودێری نەکردبێ، ئەوێش چیـای (مشـکۆ)، ئەو چیایەی یەك ڕێی سـەرکەوتنی هەیە، چیـایەکە شـانی بە هـیچ چیـایەك نەداوە و تـاقی تەنیـا و خڕوخـڕ بە ئاسـماندا چـووە، کە دەگەیـتە سـەری دەشتێکە لە ئاسمان، بابم دەیگوت:

بڕۆ لە سەری مشـکۆ یەك عەربە گەنـم تـۆ دە، هێشـتا جێـی بێسـتانێکی باش دەمێنێتەوە.

نـا، ئێـرە، ئەو ئەشـکەوتە گچـکەیەی کە هەر لە دوورایـی گـوللەی دەمانچەیە، وا بزانم ئەو جێیەیە کە مام رەشید لێیەوە ژنبەتـاڵی لێکـرد، ئەو مام رەشیدەی بە پیریش نیو دارتێل بەژنی هەبوو، تەژە زەلامێ بوو رەنگـی نەبوو، بە جاحێڵی ژنێك هەڵدەگرێ، دێـن دێـن، لەو ئەشـکەوتە پشـوویەك دەدەن، لە هەستاندا گیزەی گوللەیەك دێ، رەنگە لەو دەمە خۆیان خستبێتە پەنای ئەها ئەو کەپکە شاخەی لە ناو گیـاوگۆلەوە دەڵێـی سـەری ئەسـپە و بۆنی ئاسمان دەکات، گوێیان لە دەنگە دەنگە، دەنـگ پـێ بە پـێ نزیکتـر دەبێتەوە، مـام رەشـید زوو دەنگەکـان دەناسـێتەوە، کەسـوکاری ژنەن و بە دوایانەوەن، قەوما لە کەس نەقەومـێ، مـام رەشـید لە ژنەکە پتـر دەترسـێ، سەرتان نەیەشێنم، مام رەشید دەڵێتە ژنە:

تۆ لە جێی دایکمی، لە جێی خوشکمی، من و تۆ هیچمان لە بەین نیە، دەستم بە دەستت نەکەوتووە، کچی چاك بە وازم لێبێنە و من دەڕۆم.

ژنە چەندی لێیدەپاڕێتەوە، بەلاشە، چەندی ناپیاوی دەکات، بەلاشترە، مام رەشید دەست بۆ بەرکی دەبات و دەڵێتە ژنە:

خوشکم سەودایەکمان کرد، ئەوە من پەژیوان بوومەوە، کەرانەکەی چەندە؟ بڵێ، تا بتدەمێ.

ژنە گەشکەیەکی لێدەگرێ، بە گریانەوە:

بڕۆ، ناکەس، خۆرەچەرەت لێکەوێ، خۆشیت نەیەتە رێ.

مام رەشید بەو باسکەدا وەك نێریە کێوی شۆڕدەبێتەوە، مام رەشید بە پیری لە کن پیری سوارچاکان گوتبووی:

لە بەدبەختی من کەسوکاری ژنە ژنەیان نەکوشت، ئەگەر بیانکوشتبا کەس بەو چیرۆکەی منی نەدەزانی، ئەو ژنە سووك و چرووکە چۆن منی کردە پەند و سۆدرەی دنیایێ.

مام رەشید تۆبەی لە ژن کردبوو، ژنی نەهێنا، بە دەردی گوڵی کۆساران گۆتەنی:

مرد و دنیای نەدیت و نیوەی ئیمانیشی لە قیس چوو!

هێ لەوەش ئازایەتی مام رەشید کەوتە زاری ورد و درشت، لە بیرمە ئەگەر منداڵێك خۆی گیف بکردایەتەوە، گەورەکان بە پێکەنینەوە دەیانگوت:

وەی بابە چەندە رەشیدە هەر دەڵێی مام رەشیدە.

دواتر منداڵان بە گەورەکانیان دەگوتەوە.

جێی جێب لە بن دوو بنەدار کە بڵندیان هەر دوو بەژن دەبێ و قژیان وەها تێکەڵی یەکتر کردووە بە باو رێژنەبارانی پایزیش لێکدی نابنەوە، لە ترسی کۆپتەر خۆی شاردۆتەوە، ئۆی دەڵێی تازە دەبینم، ئەو دەشت و دەرە، ئاقاری تەڕوار، یەك پارچە گوڵاڵە سوورەیە، حاجیلەیە، خەزێمەیە، کوڕە زۆنگاویەکە گۆتەنی:

چەند خۆشە بەرختێك بی و خۆت لەو سرووشتە جوانە بگەوزێنی.

ئەو کوڕە زۆنگاویە رووی تێمکرد:

+ چی وایکرد بێیتە ریزی کۆمۆنیستان؟

- بە دیاریکراوی نازانم، رەنگە...

+ رەنگە تۆش وەك من.

- تۆ چۆن؟

+ کە زۆنگاویان وشککرد، دنیا لە پێش چاوم تاریك داهات، تاریك تاریك، ئیدی وا بە دوای ترووسکاییەکدا دەگەڕێم.

پیری سوارچاکان هات و خۆی هاویشتە ناو قسانەوە، کوڕە زۆنگاویەکە بێدەنگی لێکرد، پیری سوارچاکان لە ناو دووکەڵی جگەرە سیمای خۆی بزردەکرد و بە دەنگی بەرز بە تەڕواری یاریدا هەڵدەگوت:

ئای تەڕواری من، بەهاری هیچ جێیێ لە بەهاری تۆ ناچێ، بۆنی گوڵێکی بەهاری تۆ، گوڵی هەموو دنیا دێنێ، نێرگزەجاڕی تۆ جوانیی دنیا دێنێ، کاتێ جۆی تۆ کەرویشکە دەکات، کەزیی هەموو حۆریەکانی بەهەشتی خودا دێنێ، زستانی کوێ وەك زستانی تۆیە؟ کلۆ بەفرێکی تۆ سپێتیی هەرچی بەفر هەیە، تێیدایە، هاوین ئای هاوینی تەڕوار، گوڵە گەنمێکی رەژگوڵی سەر جۆخینی تۆ لە سەرجەم جۆخینی دنیا جوانترە، ئەدی پایزی تۆ! خودایە لە پایزدا بمکوژە، با کفنەکەشم لە گەڵای پایزانەی ئەو داربیانە بێ کە بەو دەستانەی خۆم لە کەندی بەر مالان چاندوومن.

کوڕە قەراجیەکە بەرۆکی ئەبوو رەشای بەرنەدەدا، بە عەرەبیەك کە من بە ئاسانی تێیگەیشتم، لە بەرگی فشقیات گوتی:

هاوڕێ ئەبوو رەشا تۆش ئازاد نیت، چونکە من دەچەوسێنیتەوە.

ئەبوو رەشا دەستی بە ردێنیدا هێنا، تەماشای ئاسمانی کرد و بە کوردیەك هەر ئەوەتا تێیگەیشتم:

هاوڕێ، من تۆش نەچەوسێنمەوە هەر ئازاد نیم.

کوڕە قەراجیەکە:

نا، ئەگەر دەست لە چەوساندنەوەی من هەڵبگریت، ئازادت دەکەم.

ئەبوو ڕەشا:

تۆ لێکدانەوەی جوانت بۆ مارکسیەت هەیە!

کوڕە قەراجیەکە:

دە بزانم تۆ چۆن گوتەکە لێکدەدەیتەوە؟

پیری سوارچاکان نەیهێشت گوێ بۆ لێکدانەوەی ئەبوو ڕەشا هەڵخەم، هات و پیلی گرتم و بردمی و گەیاندمیەوە منداڵی، ئێرە (بەلاشاوە)یە، عەسرانێکی درەنگانی هاوینیە، ئەوەتا پیری سوارچاکان لە کۆڵانێ، لە سێبەری داربیەکە، دوو بالیفی لە بن شان و یەکیش لە بنەوەی چۆکی و بەردی پیرۆزیش لە تەنیشتیەوە، لەگەڵ عوسمان کۆمۆنیست نیوە تێکگیرانێك تێکگیراون، پێش ئەوەی تێکگیرانەکە نیشانبدەمەوە با بەردی پیرۆز بناسێنم، بەردێکی خڕی بازنەییە، تیرەکەی هێندەی تیرەی بنە سۆبەی عەلادین شتێك کەمتر دەبێ، ئەستووریی بەردی پیرۆزیش بە قەد قوتووی جگەرە لە باری درێژی کەمێك ئەستوورتر، واتە بەردی پیرۆز گوڵی کۆساران گوتەنی:

لە مادەکەی من دەچێ.

ڕەنگی بەردی پیرۆز زۆر لە ناولەپی پیری سوارچاکان دەچێ، چەتۆی سەرناس دەیگوت:

هێندەی دەست بەو بەردەدا هێناوە بە لەشی ژنەکانی دانەهێناوە، نابینن، بەرد و ناولەپ ڕەنگی یەکتریان گرتووە.

وا بوو، پیری سوارچاکان ناوە ناوە و بە نەرمی دەستی بە بەردی پیرۆزدا دەهێنا، هەمیشە لە تەنیشتیەوە بوو، چ لە ژووریێ چ لە حەوشە چ لە کۆڵانێ، بە زۆریش دۆلکەی ئاو و پەرداخێکی لە سەر بوو، یان چەرخ و قوتووی جگەرە و کیسەی تووتن، پیری سوارچاکان دەیگوت:

ئاو و بەردی پیرۆزم پێکەوە دیتەوە، کاتێ خەریکی هەڵکەندنی یەکەم

بیر بووم له کەندی بەرماڵان، له قووڵایی نیو بەژن پتر تووشم به تووشی بەردی پیرۆزەوە بوو، ئاو له بن ئەو بەردەوە هات، ئاوێك بیری دنیا وشك بكات بیری بەردی پیرۆز هەر به ئاوە، ئیدی من هۆگری ئەو بەردە بووم و پاراستم و هێشتمەوە، ئای، هەوکه له تەرِوار هەر ئەو بەردەم بۆ ماوەتەوە، پیرۆزە ئەو بەردە زۆر پیرۆزە، له تاتی نوێژ پیرۆزترە، دەبێت بپارێزرێ.

بەردی پیرۆز وەختبوو تێکگیرانەکەم له بیرباتەوە:

پیری سوارچاکان:

هەر میللەتێك داگیرکەر بێت، بەهەشتی نیە

عوسمان کۆمۆنیست:

حکومەتەکان داگیرکەرن نەك میللەتان.

پیری سوارچاکان:

ئەگەر میللەت نەبێت، حکومەت سەی کێندەرێیە؟

عوسمان کۆمۆنیست:

دەزانی شتەکە چۆنە؟

پیری سوارچاکان:

نە، نازانم، خۆ ئەو رۆژە خۆت قسەیەکی وەك ئەوەی منت کرد.

عوسمان کۆمۆنیست:

من! کام قسە؟

پیری سوارچاکان:

گەلێك، گەلێکیدی بچەوسێنێتەوە ئازاد نیە.

عوسمان کۆمۆنیست:

ئەو قسەیە جیاوازە له قسەکەی تۆ.

پیری سوارچاکان:

به موو لێکدی جوایەز نین.

من تێنەگەیشتم قسەی پیری سوارچاکان و کۆمۆنیستەکە جیاوازن یان

نا، بەڵام تێگەیشتم پیری سوارچاکان چەند لە عەرەب و تورك داخ لە دڵە، هەر لە سێبەری داربیەکە لە بیرمە پیری سوارچاکان ئەوها لە تورك و عەرەبان دەدوا:

لە هەر کۆلانێکی بەهەشتێ ماڵە تورکێك، ماڵە عەرەبێکت دیتەوە، ئەوە بزانە هەڵەیەك لە ئاسماندا هەیە.

ئەحمەد عەرەبێك هەبوو، زۆر برادەری بابم بوو، هەند لەمێژ بوو کەوتبووە هەولێرێ وەك دەیانگوت لە ڕێێ عەرەبێتی لێکەوتووە و هیچی بۆ نەماوەتەوە و وەك کوردی لێهاتووە، ئەو پیاوە مەیلەو کوردە، بە کوردیەکی ڕەوان لە بەرگی گاڵتە دەیگۆتە پیری سوارچاکان:

دەنا باش بزانە، کۆلانەکانی بەهەشت ئەو بەر و ئەم بەر ماڵە عەرەب و تورك و فارسن، ماڵە کورد ئەگەر کوو وەرنا نابینیەوە.

پیری سوارچاکان بە پێکەنینەوە:

ئەگەر وابێ، من پەشیمانم لەو هەموو نوێژ و ڕۆژیە، حەجەکەشم هەر بەو فڕۆکە دەنێرمەوە کە منی گەیاندە کابە.

پیری سوارچاکان سەری چووبا نوێژی نەدەچوو، لە شەڕی تورك و عەرەبانیش هەر بە ڕۆژی دەبوو، نەك هەر لە ماڵات و دانەوێڵەوە پارە و پوول ، وەك بابم دەیگوت لە عەردی بەیاریش لە پاوانیش زەکاتی دەدا، ژنی یەکەمی لە سەر کانی ژنان گۆتبووی:

پیری سوارچاکان لە کاتی سەرجێییش بە دەنگی بڵند ( ئەشهەد و ئەن لا ئیلاهە ئیلە لا..)ی هەڵدەدا.

پیری سوارچاکان وەکو پیاوچاکان ئایندار بوو، بەڵام کە دەهاتە سەر تورك و عەرەب، نە خوداو نە کەسی نەدەناسی، بە تایبەتیش تورك.

چێشتانێکی بەهاریە، سەرێکی هەر لە سپێدەدایە، سپێدە درێژدەبێتەوە، سپێدەی تەڕواری وا باڵ بە سەر شەو و ڕۆژدا دەگرێ، ڕەنگە هەمیشەیی بێ و نەبڕێتەوە، شۆڕبووینەوە، بۆ بەستی شەرغە شۆڕبووینەوە، ئێرە هەر ئاقاری تەڕوارە، ئەگەر لە بەستێوە بە لای چەپدا پێچبکەینەوە، واتە

سەربکەوینەوە و پێچەوانەی رووبار رێبکەین لە تەرِوار نزیکدەبینەوە، بەو سپێدەیە تەرِوار چی لە من کرد، پیری سوارچاکان چۆن تەرِواری لە یادەوەریم ورووژاندووە، باشە پیری سوارچاکان، بۆچی پێشتر پێش ئەوەی بە چیا بکەوم لە رێی خەونێکەوە، قسەیەکەوە تەرِوارت لێم نەورووژاند، تا سەردانی بکەم و بایی تێربوون، چاو تێربوون، دڵ تێربوون لێی بمێنمەوە، بۆچی ئێستا لەو رۆیشتنە کە رەنگە هاتنەوەی بە دوادا نەبێ، تەرِوارت بە دوا خستم، هەستدەکەم تەرِوار منداڵێکە و بە دوامەوەیە، دەگری بە کوڵ دەگری، بۆ من دەگری و گوێم لێیە دەڵێ:

بگەرِێوە، بەجێممەهێڵە.

هاتەوە بیرم پێش چەند ساڵێك ویستم سەردانی تەرِوار بکەم، بەڵام چەتۆی سەرناس ئامۆژگاریی کردم، لە ئاقارەکەشی نزیك نەکەومەوە، چەتۆ سەرناس گوتی:

مەچۆ، خەڵکەکەی ئەوێ بزانن نەوەی کێی، توورِەدەبن و دەڵێن ئەوە بۆ گێچەڵکردن هاتووە.

دەنگی فرِۆکەیە، دیسانەوە خۆمان و جێیەکەمان شاردەوە، نازانم وابوو یان چاوی من وای دیت، ئەوەتا کورِە قەرەچووخیەکە بۆ گەنم و جۆی قەراج دەگری، بۆ کەو و هەرکەو و مامزی ژەرەجووخ دەگری، کورِە زۆنگاویەکە بۆ زۆنگاوەکانی ئاقاری بەسرە دەگری، بۆ ماسی دەگری، پیری سوارچاکانیش لە منەوە بۆ تەرِوار دەگری، باشە بۆچی پیری سوارچاکان تەرِواری نەکرِیەوە! ئەگەر کریبای نە هەینێ ئەو هەموو تاڵاوەی دەچێشت و بە زگی دەدا، نە ئێستا لە چاوی منەوە فرمێسکی هەڵدەوەراند، ئا، پیری سوارچاکان لە چاوی منەوە وەك ئەو پەلە هەورە خەریکە دادەکات، ئەوەتا پەلە هەورێك نەوی بوو زۆر نەوی، دوو سێ پەلە هەوریتریش دابەزین و وا دەستی یەکتریان گرت، هێندەی من لە رێسای بارین بزانم ئێستا دادەکات، ئەوەش لە بابمەوە فێربوومە، ئەو تەماشای هەوری کردبا، دەیزانی چەند بارانی پێیە و بە سەر کوێشدا

دەبیارێنی، من دەڵێم ئەو پەلە هەورانە کەمێك بارانیان پێیەو کەمێك ئاقاری تەڕوار دەڕشێنن، هەر وەك چۆن دایکم نانی دەڕشاند، دایە، هەمووی شەوێکە بەجێمهێشتووی غەریبی دەست و نان رشاندنەکەت دەکەم، ئا، نەمگوت، ئەوەتا، ئەگەر دەنگم خۆش دەبوو، چۆن تێمهەڵدەکرد:

بەوێ درەنگانی بەهارێ

باران نم نم وا دەبارێ

پیری سوارچاکان ببینە

دەیدا لە ئاقاری تەڕوارێ

لێیکردەوە، چ نەبوو، هەر بایی نان تەڕکردنێ باری، چ نەبوو، من هیوام خواست هێند بیارێ هێند بیارێ رێ لە هاتنی فرۆکە بگرێ، نەیگرت، دەنگی فرۆکە هات، دەڵێی نایەڵێ وەڵام وەرگرمەوە، ئەوەی پیری سوارچاکان بۆچی، دێتە بیرم بەڵام نایەتەوە بیرم کێ بوو کە بە پیری سوارچاکانی گوت:

باشە بۆچی خۆت تەڕوارت هەڵنەگرتەوە؟ خۆ هەتا تۆ هەبای بە کەسیدیان نەدەفرۆشت.

پیری سوارچاکان کەمێك داما، بە دەم کۆخەوە گوتی:

پرسیاری سەیر دەکەیت، کەس ماڵی خۆی کڕیوەتەوە!

چەتۆی سەرناس بە خۆی نەوەستا و هەڵیدا لە قسان:

ئەگەر تەڕوار ماڵی خۆت بوو، ئەدی بۆچی لە کاتی جۆخینان فەردەی داخسۆری جۆ و جەواڵە گەنمی رەژگولت بۆیان دەنارد، کەمت بۆ (خ.خان) نارد!

پیری سوارچاکان بە تووڕەییەوە:

تۆ، تەڕەسازناس، لە هەمووان باشتر دەزانی من بۆچی بۆم دەناردن، ئاخر ئەو دەمەی من تەڕوارم ئاوەدانکردەوە، کردمە گوند، کردمە بەهەشت، ئەوان زۆر پیاوانە هاتنە پێش و گوتیان، ئێرە بە سەر ئاقاری تاپۆکراوی ئێمەوەیە، ئەگەر لە دەستت دەبێتەوە، ساڵانە شتێکمان بدێ،

ئەگەر نا هیچ، منیش پیاوەتیی ئەوانم لە بەر چاو گرت.

بەڵام دواتر بابم دەیگوت:

پیری سوارچاکان هیچی بە دەستەوە نەمابوو، ئەو دەمەی فرۆشتنی تەرەوار هاتە گۆڕێ، کەوتبووە سەر ساجی عەلی، دەنا تەرەواری هەڵدەگرتەوە و نەیدەهێشت بۆ کەس بێت.

جارێ دیار نیە بە لای چەپدا دەسووڕێینەوە یان لای چەپ، خودایە ڕێی لای ڕاست هەڵگیرابێ، لە سەر زەوی هەڵگیرا بێ، ئەگەر لای ڕاست بگرین وەك پیری سوارچاکان لە تەرەوار دووردەکەومەوە، دوورکەوتنەوەیەك لەو دوورکەوتنەوەیە نزیکە کە لە کچە چاو ئەلیزاییەکە دوورکەوتمەوە، ئای لە دوا دیتن، لە کەمێك دوورەوە وەهام تەماشاکرد، هەستمکرد لەرز گرتی و ڕووی وەرسووڕاند، ئاخر هەرگیز بەو شێوەیە، بەو تیژیە تێمنەڕوانیبوو.

ئەی! خۆ قوتە جێب لای ڕاستی گرت، ئای چەند دڵتەنگبووم، لە پیری سوارچاکان دڵتەنگتر، کەوتمە بارێکی وا، یان پەشیمانیەکی وا نەمزانی لە چیەوەیە، هەستمدەکرد لە دنیا دووردەکەومەوە، لە بیرمە خۆزگەم خواست گریانی برابچووکەکەم بە کوڵتر با، هێند بە کوڵ جوولەیان لە پێی ڕۆیشتنم بڕیبا و خولیای بە چیا کەوتنی لە سەرم نەهێشتبا، گرمەیەکی گەورە هات، هەر درەخت بوو لەرز گرتی و پۆل پۆل چۆلەکەی لە خۆی دەکردەوەو هەڵیدەدانە هەوا، مەل لە ترسا لە ئاسمانێ خۆیان بە یەکتر دادەدا، ئەرێ ئەو هەموو باڵندەیە لە کوێوە هاتن، وا دیارە درەخت لە گەڵا پتر مەل دەگرێ، ئەرێ ئەو بەستە ئەو هەموو مەلە ڕەنگاوڕەنگەی لە کوێ بوو، پیری سوارچاکان دەیگوت:

ئەگەر دەتانەوێ ژمارەی باڵندەکانی عەرد و ئاسمانی تەرەوار بزانن، بڕۆن گەڵای درەختە بێ بەر و بەرداری تەرەوار بژمێرن، ئەگەر ویستتان بزانن تەرەوار چەند جۆر باڵندەی هەیە، بڕۆن لە بەهارێ بڕۆنە تەرەوار و جۆری گوڵ و داروباری تەرەوار بژمێرن.

ئۆخەیش لای چەپمان گرت، بەست و بەست هەڵکشاین، ئەها ئێستا لە ئاقاری تەڕوارین، ئەها بەو دۆڵەدا هەڵبکشێیت، زۆر نابات پێ دەخەیتە باخچەکەی پیری سوارچاکانەوە، وەی چ فێنکاییەك لە یادەوەریەوە هەڵیکرد، چ موچڕکەیەك رژایە لەشمەوە، دەزانن لە چی دەچوو! ئەوەی بە سەری هاتبێت دەزانێ، تۆی کوڕ کچێکت خۆشویستبێ، تۆی کچ کوڕێکت خۆشویستبێت، تیر ماچ و دەسگەمەتان کردبێت، شتێك دێتە پێشێ و بۆ یەکتر نابن، ساڵە رێ لێکتر دووردەکەونەوە، رۆژێك رێکەوت لە جێگەیەك لە بەرانبەر یەکتر راتاندەگرێ، من و تەڕوار ئەوها بووین، ئەو لێکچواندنەش هەر هی پیری سوارچاکانە، بەڵام لە زاری سەرناسەوە:

ئەو دەمانەی بۆ شەڕ، یان بۆ گەڕان بۆ ماوەیەك تەڕوارم بەجێدەهێشت، لە ساتی گەڕانەوە، لە ساتی گەیشتنەوە بە ئاقاری تەڕوار سەد سووندت دەخوارد بووکە رازاوەتەوەو وا بە دەستی خۆم رووتیدەکەمەوە و لە باوەشمی دەگرم.

پیری سوارچاکان دەیگوت:

بڕوام پێبکەن کە دەبیستم تەڕوار فرۆشراوە وەك ئەوە وایە بەو چاوانەی خۆم بینم جەندرمەیەکی تورك دایکمی بەرزەفت کردووە و بە رووتی لە سەری راکشاوە.

ئێرە هەر ئەو دۆڵەیە کە پیری سوارچاکان ناوی نابوو دەروازە گەورەکەی بەهەشت، ئەو دەروازەیە کە راستەوخۆ دەتباتە ناو بەراوەکەی پیری سوارچاکان، دەتگەیەنێتەوە ئەو کانیەی هەموو بەراوی ئاو دەدا، ئەو دۆڵەیە ئاوی هەردوو کەند، کەندی بەرماڵان و پشت ماڵان تێدەکەنەوە، ئەوەتا ئێمە وا لەو جێیەین کە ئاوی بەهەشت وا لە بەستی شەرغە دەکاتەوە، دە با گۆلمێك لە ئاوی بەهەشت بخۆمەوە، خواردمەوە، بزانم ئەو تامە دەدا کە پیری سوارچاکان دەیگوت:

ئەو کانیەی بەراوەکەی منی ئاودەدا، ئاوێکە ئاوی وا روون، ئاوی وا شیرین لە هیچ کانیەکی دنیا نیە، ئاوی وا نیە، بەستی شەرغە لێرەوە لەو

جێیەی ئاوی تەڕوار تێیدەکاتەوە، تامی دەگۆڕێ، بەست تامی ئاوی بەهەشت دەگرێ، ئەو ئاوەی لە حەجێ خواردمەوە لە چاو ئاوی کانیی بەهەشت هەر هیچ نەبوو.

پیری سوارچاکان ناوی لە کانیەکەی نابوو کانیی بەهەشت، گۆلمێکم لە ئاوی چەمەکە خواردەوە، هەستم کرد چەند دڵۆپێك لە کانیەکەی بەهەشتی تێدایە، هەر پیری سوارچاکان نا، چەتۆی سەرناسیش پێیوابوو، بە تامترین ئاو، سووکترین ئاو کە تامی کردبێت ئاوی تەڕوارە.

دەنگی زەنگوڵە دێ، لە مێگەل نزیکبووینەتەوە، دەنگی زەنگوڵە نزیك دێ، دەنگێکی خۆشە، هەبێ نەبێ ئەو بزنەی زەنگوڵەی لە ملە جوان لەنجە دەکات، جوان زەنگوڵ لێدەدات، زەنگوڵ لێدەر بە دیارکەوت، بزنێك بوو، وا بزانم نێری نەبوو، هەند جوان و شۆخ، ئەبوو ڕەشا گوتی:

تەماشا تەماشا دەڵێی کچە بەغداییە ساز دەژەنێ.

بە راستی جوانی دەژەند، پیری سوارچاکان لەوەش قسەی هەبوو، دەیگوت:

بۆوەی دەنگی زەنگوڵە لە بەر دڵان بێ و گوێی کەس ئازار نەدا، دەبێ بزانی بە ملی کام نێریەوەی دەکەی، نێریەك لە هەڵاتن هیچ پیاوێك نەیگاتێ، لە لەنجەولاریش هیچ شۆڕەژنێك نەیگاتێ.

لێرە ئێمەماڵئاوایی لە قوتە جێب دەکەین، بە جێمانهێشت بە سێ پێشمەرگەوە بەجێمانهێشت، بەست و بەست هەڵکشاین، دەزانن دنیا لە چاوی من هەر سپێدەیە، سپێدەی تەڕواری، تەڕواری پیری سوارچاکان، ئێرە نزیکە لەو جێیەی سەرهاتێکی هەیە بە ناوی سەرهاتی بڕنۆ، بەڵام من تێژ دەڕۆم بە سەر بڕنۆ و گەشتە چیاییەکان و پێشمەرگایەتی و شۆڕش و ئەو شتانە بازدەدەم، بە سەر ساڵانێکدا بازدەدەم و دەگەڕێمەوە ئەو جێیەی دوێنێ ئێوارە بێ ماڵئاوایی بە جێمهێشت و بە دوایاندا دەگەڕێم، کە دوای ئەو چەند ساڵە هاتمەوە و بە ماڵ شادبوومەوە، دەبێت بڵێم، من کە لە بەهار بە چیا کەوتم، هاتنەوەشم کەوتە سەرەتای بەهار، یەکەم کەسێك کە بەدڵ بە دوایدا گەڕام:

کچە ڕەشتاڵەکە بوو، ئەو کچەی دڵیم شکاند، سۆراخمکرد، دیتمەوە، عەسرانێك لە کۆڵانێك دیتمەوە، منداڵێکی لە باوەش بوو، منداڵێك بە دەستیەوە، حەیف، چۆن لە دەستمچوو.

دواتر بە دوای کچە چاو ئەلیزاییەکە ئەوەی دنیایەك ڕستەم بۆی نووسیوە، زوو دیتمەوە، هەر کچ بوو لە ماڵە بابان بوو، لە ئاستم لە جاران ساردتربوو، ناچاری کردم زوو ڕووم لێیوەرگێڕم.

لە کچەکەی هاوڕێی منداڵیش گەڕێ!!

براگچکەکەم ئاخ برا گچکەکەم! گەورە ببوو، وێنەی هەند جوانی دەکێشا، هەموو چاوێکی ڕادەکێشا، زۆری نەبرد گەیشتە هونەرەجوانەکان، حەیف شەوی چوارشەمە لە سەر پێنجشەمەیەك من لە ماڵ نەبووم، یەکەم تەقەی برا بە سەری وی کەوت، کەوت و هەڵنەستایەوە، گۆڕەکەی وا بە تەنیشت گۆڕی پیری سوارچاکانەوە، من هەر هێندەم پێکرا لەو دەمەوە تا ئێستاش هیچ چوار شەمووانێك گەشت نەکەم، لە بیرمە خدر خەرمان گوتی:

براکوژی بە میرات بۆ ئێمە ماوەتەوە، دەزانن ڕێك پێش (١٠٨) ساڵ لەمەوپێش باپیرتان برایەکی خۆی کوشتووە.

من ئەوەم نەزانیبوو، بە خودای شتێکم بیستبوو، بەلام هەر بە گاڵتەم وەرگرتبوو، لە بەر خۆمەوە گوتم، باپیرە چما ئەوەشت کردووە!

چوومەوە گۆڕستانی سەید مارف، سەر گۆڕی پیری سوارچاکان، خوێندمەوە، بە دوای ناوەکەیەوە وشەی تەڕوار هەر ئەوەتا دەخوێندرایەوە.

درەنگ زۆر درەنگ، هەر بەو بەستەی دەمێدی لێیەوە هەڵفڕیم و ئەو هەموو ساڵەم بڕی، ڕێمبڕی و نیازم دیتنەوەی گۆڕی گوڵی کۆساران بوو، نەمدیتەوە، ئۆی ئێستاش هەر دەڵێی سپێدە تەڕواریەکەی ئەودەمانییە! لە گەڕانەوە، هەر لێرە کە ئاقاری تەڕوارە تووشی شوانێك بووم، هەر لە تەمەنی من دەبوو پرسیم:

+ خەڵکی کوێی؟

- تەڕوار.
+ لە چ تیرەیەکی؟
-....
+ لەمێژە لە تەڕوارن؟
- تاهوو، باپیرە گەورەشم خەڵکی ئێرەیە.
+ بەڵام مـن بە بیرمـدێ کەنگـێ هـاتوونەتە تەڕوار و بە چەندیشـتان کڕیوە.
- بە چەند؟
+ بە (١٠٠٠)دینار
- نەخێر وانەبوو، (٣٠٠٠)دینارمان پێداوە کە ئەودەم گەڕەکێکی لە شار پێدەهات.

نیـازی سـەردانی گۆڕسـتانەکەی تەڕوارم لە سـەر گەڕا و دەمویسـت گۆڕی بـرای زراو رژاوم ببینمەوە، ئەوە نەبـوو بـرایەکم گـورگ زراوی رژانـد و ئەویـدیش گـوللەی بـرا مێشـکی پژانـد، ئامۆژگـاریەکەی چەتـۆ سەرناسـم بیـر کەوتەوە پەشـیمانبوومەوە، ئـاوڕێکم لە تەڕوار دایەوە و قسەیەکی پیـری سـوارچاکانم بیـرکەوتەوە کە لە سـەر مـردن بـوو، چەتـۆ سەرناس گوتەنی تازە ((شۆڕش بە سەر کوردا ریا بوو)) پیری سوارچاکان کە زۆر پێیتێکچوو مەگەر بۆ تەڕوار وا تێکچووبێ گوتی:

تەواو، کەرکووکیش وەك تەڕوار لە دەستچوو.

ئەرێ پیری سوارچاکان لە سوێی کامەیان مـرد! دوای سـاڵانێکی زۆر بە قوونەوە نوێژکردن پیری سوارچاکان چۆوە لای خـودا، دەیـانگوت: لە سەرەمەرگ گوتوویەتی:

من ئیـدی بە بەژن و بـاڵای رێـکەوە دەچـمە دیـداری سـەید مـارف و لەگەڵ وی دەچینە لای خودا، لە ئەسپەکەشم دەبوورم.

پێش مردنی بە چەند رۆژێ بە دەم کۆخەکۆخەوە دەیگوت:

گـۆڕەکەم بـێ تەڕوار مەکەن، لە سـەر کێلـی لای سـەرم بە خەتێکـی

گەورە بنووسن تەڕوار، تکاتان لێدەکەم ناوی من لە بیر کەن، پارچە ئایەت لەبیربکەن، بەڵام تەڕوار لەبیرنەکەن، بینووسن.

بابم دواتر دەیگوت:

پیـری سـوارچاکان بـۆیە نەیویسـت گـۆڕەکەی لە تەڕوار بـێ، نەبـادا نەوەکانی تووشی کێشە بن.

هەر بابم دەیگوت:

پیری سوارچاکان لە ئەسپەکەی بووری، بەڵام من لێی نابوورم.

ئاخر هەر ئەو ئەسپەی پیری سوارچاکانی لە شاخان هەڵـدێرابوو، پشـتی لە حەفـت جـێ شـکاندبوو، هەتـا مـردیش پشـتی راسـتنەکردەوە، هەر بە قـوونەوەش نـوێژی دەکـرد، هەر ئەو ئەسـپە بابیشـمی هەڵدێرانـد، بەڵام هەڵـدێرانێکی سـووك، هەر دەسـتی شـکا و ئێستاشـی پێـوە دەسـت نەبـۆوە دەستێکی تەندرووسـت، لە بـارەی هەڵـدێرانی پیـری سـوارچاکان و پشـت شکانیەوە چەنـد قسـەیەك لە سـەر زاران بـوون، بەڵام هەموویـان لە گـوڵی کۆسارانیان دەکردەوە کە:

خودای سەیدان ئەسپی هارکرد و پیری سوارچاکانی هەڵدێران، وەرنا پیری سوارچاکان و کەوتنیـان گوتـووە! چمـا فشـەیە مـارەکردنەوەی ژنـی سەیدان!

بەڵام پیری سوارچاکان فشەی بەو قسانە دەهات و دەیگوت:

مـن گونـاهم زۆر کـردووە، بەڵام بە هـۆی مـارەکردنەوەی گـوڵی کۆساران خودا دەمباتە بەهەشت.

چی ما نەمگوتبێت! بەردی پیرۆز! نازانم چی بەسەرهات بەردی پیـرۆز، ئـا، بیسـتم تەڕوار پنتێکـی لە نەخشـەی هەولێـر گرتـووە، دیـتم بەڵام بە شێوەیەك چۆرێك تەڕایی پێوە نەمابوو، ئەگەر پیـری سـوارچاکانیش ببینـێ نایناسـێتەوە، تەڕوار ببـووە (تەلـوار!)، سەرناسـم دیـتەوە و تەلـوارم نیشـاندا، پەکووێکی کردو گوتی:

هەولێـر نەناسـان کـوو هەولێریـان ئەتککـرد، تەڕوار دەکەنە تەلـوار،

بنەسراوە دەکەنە بنەسڵاوە، کوڕە (پێروو)ی ئاسمانی هەولێریان کردە پێلوو، هەر دیتت هەولێریش بووە هەولێل.

ئا، شتێك مابوو بیڵێم، گوڵی کۆساران، گوڵە جوانەکەی هەردوو بەری بەستی شەرغە، هی هەولێرێ، ئەو ژنەی نازانم کێ بوو ناوی نابوو گوڵی کۆساران، زڕ نەنکی منە، پیری سوارچاکانیش، ئەو پیاوەی شەڕی زۆر جێیانی کردبوو، بابی بابم و باپیری هەقی من.

## جادەیەك دنیای كەرتدەكرد

لە تاریكیدا خۆمان خڕكردەوە، من هێ لە خۆم چیم هەیە تاكو كۆیكەمەوە! شەوی بەستی شەرغە تاریكستانێكە، باپیریشم كە تەمەنێك شەوی لێرە كردۆتەوە، نەكەوتۆتە شەوی وا تاریكەوە، ئەو شەوە ئێمە كەوتبووینە بەستی تاریكییەوە، ئەو پێشمەرگەیەی دوێنێ ناوی مام عجیل بوو، رەنگە ئەورۆ ناوێكیدی هەبێ، گوتی:

سەدام ئەستێرەشی لە سەر ئەو ئاقارە كوژاندۆتەوە.

روانیمە ئاسمان، بە هەموو لایەكی ئاسماندا ورد روانیم، روانینێك ئەستێرەناسانیش وەهایان لە ئاسمان نەڕوانیوە، لە دڵەوە هیواخوازبووم، ئەستێرەیەك، لەتە ئەستێرەیەك، لە ئاقاری تەڕوار و بەستی شەرغە هەڵبێ، ئەستێرەیەك بۆ ئەوە نا كە تروسكاییەك بخاتە دنیاوە، ئەستێرەیەك مام عجیل لە قسەی خۆی پەشیمانبكاتەوە، ئەستێرەیەك باپیرم بە درۆنەخاتەوە، بیرمە باپیرم دەیگوت:

ئاسمانی تەڕوار قەت بێ ئەستێرە نەبووە، نابێ، لە شەوانی تاریكەشەوێ، لە چلەی زستانێش لە كاتی بەفر و بارانێ، هەور لە لایێ رۆژهەڵاتێ كولانكەیەك لە خۆی دەكاتەوە و كەرتكە ئەستێرەیەك نیشانی ئەو ئاقارە دەدات.

ببوورە باپیرە، ئاسمان كەرتە ئەستێرەیەكی نیشانی ئەو ئاقارە نەدا، بەڵام هێشتا ئاودیوی دیوی ناهومێدی نەبوومە و چاوێكم هەر لە ئاسمانە، لە بەر خۆمەوە سێوە دەڵێمەوە:

گەلی برادەرینە، وە من ئەستێرەكم لێ هەراتیە لە لای رۆژهەراتێ

قەت لە دریّ من ئاوانابی...

وا دیارە سەدام دەستی بە سەر دوگمەکانی ئاسمانیشدا گرتووە و ئەستیرەکانی کوژاندۆتەوە، شەرغە تاریکە، بۆنی بەهار لە ترس و تاریکیدا بۆنێکە بە ئاستەم دەناسریتەوە، لە تاریکایدا کۆمەڵێك تارمایی بە بەری ولاتی کۆیەدا هەڵدەگەڕین، تارماییەك دەمێ لە شێوەی گەلەگورگ و دەمێك لە شێوەی رەوە مامز لە تاریکایی ئەو هەورازەی جاریّ نازانم دەمانباتەوە کویّ، لە هەڵبەز و دابەزدایە، کەسیّ نەبوو وێنەی ئەو شەوە بگریّ، تا دیاربا لە گورگی هەڵاتوو دەچین یان مامزی راونراو! دوای ساڵانێکی زۆر ئێوارە درەنگانێ لە نیوە مەستبوونێکدا ئەو شەوە بیّ ئەستیرەیە و گورگ و مامزم هێنایە سەر مێزی تژی لە پێك، مەستێك گوتی:

ئێوە ئەودەمەی بە هەورازەکەدا هەڵدەگەڕان، گەلە گورگ بوون.

مەستێکیدی گوتی:

نەخێر، ئێوە رەوە مامز بوون.

لەو مەستتر هەڵیدایێ:

من دەڵێم ئەو شەوە گورگ و مامز بە تەنیشت یەکەوە.

لە هەمووان مەستتر:

گورگ و مامز پێکەوە؟!

ئێرە، وام بیست بایزاغای ناوە، لە بەهار هەڵیداوە، نەدەبوو بایزەکە بیّ ئاغا با؟ لێم روون نیە بەلام دەبیّ پرسیارێکی وام کردبیّ، چونکیّ پێشمەرگەیەك نەمزانی ناوی چی بوو، دواتریش نەمدیتەوە، وەلامی دایەوە:

نا، دەبوو پێوەی بیّ.

بە من با ئێرە بایزەسە با، نە بایزاغا، بۆ هێندە لە ئاغایان داخ لە دڵ بووم! رەنگە دژە ئاغایی بۆماوەیی بیّ و لە باپیرمەوە بۆم مابێتەوە، هەموو ئەو شیعرانەی جگەرخوێن و قانعم لەبەر بوو کە لە تیلاکی ئاغایان دەدا.

بایزاغا لە ئاقاری تەڕوارەوە زۆر دوورە، چ زوو گەیشتینیّ! بارەگا

چەند غەرە بەردێکی سەر بە نازانم چی گیراوە، دیارە باران دەگێڕێتەوە، بارەگا لە دوو لاوە پەنایە و رەنگە تۆپ نەیگرێتەوە، خۆزگە دوو لاکەیتریش پەنا دەبوو، یان دنیا هەر دوو لای هەبا، ئەدی چ لە ئاسمان بکەین! مام عجیل دەیگوت:

خودایە، ئەو ئاسمانە وێرانبکەی و نە گیاندار نە بێ گیانی تێدا نەژی.

پێشمەرگەیەك:

خەمت نەبێ، ئاسمان وێرانیش بێ، بێ کۆپتەر نابێ.

لە هەر پێنج لای دنیاوە گرموهۆڕە، ئاسمان وێران نەبێ! بەڵام وێرانبوونی ئاسمان کار لە نانخواردن ناکات، هێشتا بەهاریشی نەژاکاندووە، پێشمەرگە دوو دوو لێرە و لەوێ لە کەسکایی بەهار لە سەر چیچکان دانیشتوون، شتێك دەخۆن نازانم چیە، خواردم و نەمزانی چیە، خواردنێك نازانم لە کوێ خڕیانکردبۆوە، خواردنێك نە بە کەوچك نە بە دەست خڕنەدەبۆوە و نەدەگەیشتە زار، خواردنێك ئەگەر برسێتی نەدەبوو کەر بۆنی کردبا هێڵنجی دەهاتێ، ئەرێ کەر کاتێ بۆنی تەرسی خۆی دەکات، بۆچی هێڵنج نادات؟! ئەها کەرە سپی لە نزیك کورتانەکەی تەرسێکی کرد، هەڵمی لێهەڵدەستێ و بە گەرمی بۆنێکی پێوەکرد و رووی کردە ئاسمان، پێدەچوو بۆنەکەی گەیشتبێتە لووتان، ئەوەتانێ ئەو کوڕەی بە مولازم هەژار بانگیانکرد، لووتی دەگرێ و دووردەکەوێتەوە، قسەیەکم پێیە بۆ ئەو مولازمە، بەڵام ناچمە لای، تا ورد لە کەرە سپی و خاوەنەکەی وردنەبمەوە، ئەرێ ئەو پیاوە بۆچی ناوی سۆفی کەریم بوو! ئەو ناوەی نەبا چ پێنەدەچوو لە یادەوەریی مندا جێیەك جێبهێڵێ، کەر سپی سپی، کەری وا سپیم نەدیتبوو، وەختە بڵێم سپێتی کەر لە سپێتی ردێتی سۆفی کەریم سپیترە، ئەو کەرە هەبێ نەبێ هەر ئەو کەرەیە کە باپیرم هێند باسی کردبوو، لە چاوم رەنگی گرتبوو، سۆفی کەریمیش هەر ئەو سۆفی کەریمەیە کە باپیرم منی بە ناوی ویەوە کردووە، هەوە پیاوێکی رەشتاڵەی کەڵەگەتی باریکەلەی چەنەگە درێژی لووت بەرانیی، گوپنی چاو کەمێك

قوولّی ردێن پڕی له بەفر سپیتر، هەوە ئەو پیاوە ئەو پیاوەیە کە باپیرم دەمێکە سیمای بە من ناساندووە، هەوە سوێنددەخۆم هەوە، هەمان کەر و کەریمە، ئەو پیاوە ئەو سۆفیەیە هەر زوو دەستبەرداری ئاوەدانی بووە، پشتی لە ئاوایی کێلەسپی کردووە، بە خۆو کەری سپیەوە بە کەند و لەندان کەوتووە، دەڵێن جارێك لە خەونێکدا کەرەکەی خۆی لە پشتێ کردووە، لە دوای ئەو خەونەوە بڕاییبڕ سواری پشتی کەرەکەی نەبووە، تەنها دێمکە ئاوێك و توورەگەیەك و جۆرکێکی لێ بارکردووە، ئەها، ئەوەتا دێمکەکە بە کورتانەکەوەیە، باپیرم دەیگوت:

سۆفی کەریمی بابم کەرەکەی لە خۆی خۆشترویستووە، هەرگیز برسی و تینووی نەکردووە، لە هەر جێیەکیش لای دابێت و بێنێکی دابێت، دەستی بە ئاوگەیاندبێت، دەستنوێژی هەلگرتبێت، تا کورتانی لە پشتی کەر نەکردبێتەوە، پێڵاوی لە پێی خۆی دانەکەندووە.

باپیرم و چەند پیرێکیدیش دەیانگێڕاوە:

سۆفی کەریم هەر لەو ڕۆژەوەی خۆی ناسیوە تا ڕۆژی مردنی کە مردنێکی زۆر کتوپڕ بووە، تەنها دوو نوێژی چووە، لە بری ئەو دوو نوێژە چووەش هەزار نوێژی پتر کردۆتەوە، بەڵام پێیوابووە نوێژی چوو بە چ نوێژان پڕ نابێتەوە.

لە بیرمە باپیرم جارێك بە منی گوت:

بابت زۆر لە بابم دەچێ، یاخوا تۆ پتر لەو بچی.

بابم سۆفی نیە، بەڵام پڕە لە سۆفیگەریێ، هەوە، ئەو سۆفی کەریمەی وا لە نزیك کورتانی کەرەکەی دانیشتووە، باپیری بابمە، بەڵام دوای حەفتا هەشتا ساڵێك چی بێرەی گەیاندووە! دۆناودۆنە! وەختە باوەڕ بە گیانگۆڕکێ بێنم! باپیرم بابی خۆی زۆر خۆشویستووە، نەنکم گۆتەنی ناوەکەی لە دڵی خۆی پاراستووە و نەیویستووە لە دەستبچێ، بە فیڕۆبچێ، هەڵیگرتووە، دڵی نەهاتووە یەکێ لە نەوەکانی بە ناویەوە بکات نەوەك بە تۆزی پێی نەگات و ئەو ناوە ئاسمانیە کە هەر لە بابی دێت، بە هەوەنتە

بڕوات، بە گۆتەی گۆتیاری: حەفت شەو پێشەوەی من لە دایکم بەربمەوە، سۆفی کەریم هاتۆتە خەونی باپیرم و پێیگوتووە:

کوڕم چیدی ناوەکەم لە ناو بالیفەکەت هەڵمەگرە و بیدە ئەو نەوەیەی وا لە ڕێیە.

باپیرم یەکسەر دەڵێتە دایکم:

ئەو کوڕەی ناو زگت ناوی کەریمە.

دایکم هۆپێك لە خۆی دەزانێ و دەڵێ:

مامە، تۆ چوزانی کوڕە! ئەگەر کوڕ نەبوو؟

باپیرم دەڵێ:

سۆفی کەریمی بابم بە زیندوویتی درۆی نەکردووە بە مردوویی دەیکات!؟

باپیرە، بۆ وات کرد! کەس نەما منت بە ناوی بابتەوە ناودێرکرد، خۆ من تا ئێستا سەت نوێژم نەکردووە.

با واز لە کەرە سپی و سۆفی کەریم بهێنم و بچمە لای مولازم هەژارەکە، کوڕێکی باریکەلەی وردیلەی قۆزە، جەمەدانیەکەی بە شێوەیەك بەستاوە، کەم کەس دەزانن جەمەدانی وا جوان ببەستن.

+ هاوڕێ کووی؟

- سوپاس، باشی، دەڵێی تازە لە شارەوە هاتوویت؟

+ بەڵێ، نامەیەکم بۆ هێنابوویت، بەڵام لە ڕێ فەوتا.

نامەکەم لە دڵشادێکەوە هێنابوو، دواتر حەیرانێکی بە خۆیەوە لکاند و حەیرانی گوت و بووە دڵشاد حەیران، ئەو نامەیە هەر ئەو نامەیە بوو کە لە ترسی جاشەکانی کەریم خان لە بەرزاییەکانی نزیك دێگەڵە خستمە بن بەردێك، بیست ساڵێك دواتر ڕێم بەو جێیە کەوتەوە، منداڵانە بە دوای نامەکەدا گەڕام، ئێوە دەزانن گەڕانی منداڵانە چ چێژێکت دەداتێ! گەڕام زۆر گەڕام بە دوای نامە چوکلێتیەکەدا گەڕام، نامەکە زۆر لە چوکلێت دەچوو، چوکلێتانە پێچرابوو، حەفدە ساڵێك دواتر ڕێم کەوتەوە ئەو ڕێیە

ر کتوریەش کە لە جادەکە دەبێتەوە، ئەو جادەیەی دنیای کەرتدەکرد، ئەو جادەیەی رەنگە ئەو شەو خۆ لێدەین، ئەو شەوەی لە نیوەڕۆی بایزاغاوە چاوەڕێی هاتنی دەکەین.

مالاوا بارەگای دیوی هەڵەتی بایزاغا، مالاوا کەرە سپی و سۆفی کەریمی نازانم کێ و لە کوێوە هاتووی بۆ کوێ چوو، مالاوا ئاقاری بەستی شەرغە، ئاقاری پڕ هەڵەت و هەڵدێر و باسکی پووزی و باسکی و گەردنی و خەناوکەیی و بازنی و خڕخاڵی و تێر لە زوورگی خەنەیی، تەماشاکەن لەو کەسکاییە بەهاریە، زوورگەکانی چەند خەنەیین، چەند لە قژی نەنکم دەچن، رێی پێشمەرگە چۆن چۆنییە! دەڵێی گێرە دەکەین، تا رۆیشتین، رۆیشتین! ئێستا وەك بڵێی بە رێی خۆمان یان بە رێیەك نزیك لە رێی خۆمان دەگەڕێینەوە! لەو بەرزاییەوە لە نزیك کێلێك کە لە ناو گیادا لاربۆتەوە و سەری بەقەدی بنەدارێکی کورتەبنە کردووە، وەك کێل راوەستاوم، دەڕوانمە ئاقاری گوڵگوڵی و خەنەیی بەستی شەرغە و تەڕوار، دەڵێی دڵم دەڵێ نایانبینمەوە.

بە سەراوردێکدا هاتین، ئێرە گۆڕستانێکە بە کێلەکانیەوە دیارە کۆنە، زۆر کۆن، دەستەیەك پێشمەرگە لە ترسی کۆپتەر خۆیان دەخیلی کێلی گۆڕەکان و ئەو بنەدارانە کردووە کە کەپرن بە سەر گۆڕەکانەوە، بیستم تا تاریك دادێ لێرە دەمێنینەوە، لەو دەستەیە پێشمەرگەیەك بە سیمای کتومت خۆیەوە تا ئێستا لە بیناییم ماوەتەوە، کوڕێکی رەشتاڵەی رەقەڵەی کورتیلەی دەموچاو کەمێك خواروخێچی خوێن شیرین، زۆر شیرین، من زۆر بە شیرینی دیتم، ئەو کوڕە دیدەوانی دەڵێنێ، هەندێك سەرهاتیان لێدەگێڕایەوە، هێندەی لە شۆخی و بۆ خۆشی دەکردەوە نیو هێندە بە لای راستیەوە نەدەچوو، دواتر پێکەوتم هەر رستەیەك لە بارەی دیدەوانەوە گوترابێت نە لێکردنەوە نە پێوەنانی پێوە نەبووە، سەر ئەو گۆڕستانە هەر جێی گێڕانەوەی یەك سەرهاتی دیدەوانی لێدەبێتەوە:

دەرۆزەکەرێکی جلکشڕی شەپڕەلێدراوی دەو خوار لە پێش دەرگای

دادگای هەولێر دەستەسرێکی ڕاخستووە، کەم کەس هەیە بە پێشیدا ڕابرێ و دەست نەخاتە گیرفانی، دەستەسرەکە دەبینن! ئەو هەموو خوردەیە، مووچەی حەفت پێشمەرگەی لێدە هێشتا دەمێنێتەوە، لە بیرمانێ ئەو دەمانێ دیدەوان لە پێشمەرگایەتی مانگی پێنج دیناری وەردەگرت، ئێ دەرۆزەکەر بە دەردی مام عجیل گۆتەنی لەقە لە دەستەسرێ پارە و بەخت دەدا، دەبینێ جادەی پێش دادگا مەیلەو چۆلە، ترومبێلێك دێ و رادەگرێ، دەرۆزەکەر دەیناسێتەوە، پێشتر چەند جارێکی دیوە، هەوە، بە هەڵە نەچووە، ئەمنەکەیە، دەرۆزەکەری شەپرەلێدراو پلنگ ئاسا پەلاماری دەدا و دەمانچە لە بن گوێی رادەگرێ، چەکی دەکات هەڵیدەداتە خوارێ و پێ لێدەنێ، لەو هەموو بازگەیە چۆن دەردەچێ! ئەوەش سەرەتای سەرهاتێکیترە.

لە لای قەرەچووخێ هەورێکی تیری هێنا، پێدەچێ بارانی پێبێ، بەهاری ئەوساڵ رەنگی چ ساڵان نیە، بەهارەکەی گەلەك بە بارانە، هەر پەلە هەورێك رووبارێك باران دەرژێنێ، هات دنیای تاریك کرد، لەو دەمە پێشمەرگەیەك تێیهەڵکردە گۆرانی:

هەورێکی هێنا بارانی پێیە
خودا نەبارێ یارم لە رێیە

خودا، دانەکاتە بارانێ، دەنا دایکم گوتەنی دەبینە جلە کەر، گەیشت، هەوری قەرەچووخ گەیشتە بەستی شەرغە، بنی روونکرد، نازانم کێ بوو نزای گیر بوو، هەورەکە رێی باواجی گرتەبەر، لێرە جوێتی جووتیارەکەی دەشتی هەولێرم بیرکەوتەوە کە بە هەوری دابوو، ئەها سێ چوار پەلە هەوری دوور لێکدی پەیدابوونەوە، پەلەم لێمەکەن تا نەزانم رووەو کوێ دەچن و چ دەکەن! جوونی جووتیاری ناگێرمەوە، چ زوو قژیان تێکدی ئالا! ئەوە چ دەستێکی جادوویە ئەو پەلە هەورانەی بە یەکتر گەیاند و بەری ئاسمانی گرت! ئەها دەپرووشێنێ، ئۆی چ بەهارییەکە ئەو دەشت و دەرە، باران نم نم بە سەر کەسکاییدا دادەکات، دنیا دەڵێی کەپرێکە لە

جـوانی و له بینـایی هه‌ڵـدراوه... ئه‌و ده‌مه‌ی له سـه‌ر به‌سـتی شـه‌رغه دانیشتبووین، مام عجیل ئه‌وها جوونه‌که‌ی گێڕایه‌وه:

جووتیاره‌که‌ی ده‌شتی هه‌ولێـر ده‌یـدیت، هه‌ر هه‌وره له قه‌ره‌چـووخه‌وه داده‌به‌زێ، نه‌وی نه‌وی خه‌ریـکه زگ له سـه‌ر زه‌ویه ته‌ریفه‌بـووه‌که‌ی وی ده‌خشێنێ، بێته‌وه‌ی برووسکه‌یه‌ك بدات، گرمه‌یه‌ك بکات، تنۆکه ئاوێکی له ده‌سـتبێته‌وه، زوو به‌رزده‌بێـته‌وه، هه‌ر له به‌سـتی شـه‌رغه ده‌په‌ڕێـته‌وه ده‌برووسـکێنێ و ده‌گرمێنـێ داده‌کـات، له‌و ده‌مه جووتیـاری تـووڕه له ئاسمان روو له هه‌وری سه‌رهه‌ڵگرتوو ده‌کات و ده‌ڵێ:

هه‌وری به‌دنـمه‌ك، بـڕۆ له‌وێ ببـارێنه، هه‌ی کیـری وراتـی کۆیێـت به قوونی.

هه‌وکه ئه‌گه‌ر مـام عجیـل لێره‌بـا، جـوونه‌که‌ی به تـامتر ده‌گێـڕایه‌وه، خـۆزگه له‌گه‌ڵمـان ده‌بـوو، حه‌زده‌که‌م سـه‌د مـام عجیلمـان له‌گه‌ڵ بێـت، ده‌ترسـێم، ئه‌و رێـیه ده‌مترسـێنێ، هه‌سـت به ته‌نیـایی و چـۆله‌وانی ده‌که‌م، ژماره‌مان که‌مه له چاوی منه‌وه که‌مه، دێده‌وان وه‌ك بڵێـی له چـاوم دڵمـی خوێندبێته‌وه، نازانم رووی له کێ بوو، گوتی:

چه‌ندی که‌م بین، په‌ڕینه‌وه ئاسانتره.

له دڵی خۆم گوتم: ره‌نگه وا بێ، به‌ڵام دڵی من وا ناڵێ.

ئه‌و گونده کاولبووه‌ی که‌وتـۆته به‌ری ئـێمه‌وه، (سماقشـیرین)ی نـاوه، سماق و شـیرین! له‌و به‌ریشـه‌وه گونـدێك هه‌یه، له‌و گه‌وه‌یه سـه‌رکه‌وی و بچیه سـه‌ر ئه‌و ته‌پـۆلکێهێ ره‌نـگه جـوان لێـته‌وه دیـار بـێ، (گۆمه‌تـاڵ)ی ده‌ڵێنـێ، ئه‌و تـاڵ و شـیرینه هێنـده لێکـدی دوور نـین، له نێـوان ئه‌و دوو گونده جاده‌یه‌ك هه‌یه، دنیـا ده‌کـات به دوو که‌رته‌وه، ئه‌وڕۆ له ئه‌ندێشـه‌ی مندا دنیا دوو که‌رته، که‌رتێـك له‌م به‌ر، به‌ری سـماق و که‌رتێـك له‌و به‌ر، به‌ری گـۆم، ئه‌هـا ئه‌و جـاده‌یه، به دووربـین جـوان دیـاره، دنیـای که‌رت کردووه -له بیرم بێ له به‌ری سـماقه‌که‌ش گۆمه‌تاڵێکـدی هه‌یه، به‌ڵام له‌و گه‌شـته ئـامه‌زرۆییه هـیچ رسـته‌یه‌ك رێـی به‌وێ ناکه‌وێـت- ده‌ڵێـی ده‌نگـی

کۆپتەر دێ، وابزانم کۆپتەرە، پێشمەرگە پەرتەیان لێکرد و هەریەکە خۆی دایە پەنا درەختێك، بەردێك، دەنگی تۆپیش دێ، لەکوێوە دێ! نازانم، ترسام، وابزانم ترسانەکەشم پتر لە بێ چەکییەوە بوو، بەڵام خۆ چەکیشم هەبێ نازانم بەکاریبێنم! ئای زوو شەو داهاتبا و لە جادەمان دابا، لەو چیایە ئاودیو باین، ئای ئەو دیوی چیا، داخۆ بتگەمێ! من زۆر لەو جادەیە دەترسم، جادەی هەولێر- کۆیە جادەی سەرهاتە ترسناکەکانە.

جادەی بۆسە و تەڵە و تەپکەیە، تازە جاشان لەو جادەیە مەشقی کوشتن دەکەن، جاشی کێ لەو جادەیە گوللەی بە پێشمەرگە و شوان و جووتیار و شێتەوە نەناوە! هەر لە جاشەکانی کەریمخانەوە بگرە تا دەگاتەوە جاشەکانی قاسماغا! ئەو هەموو وێنە کارەساتباویە چیە بەو سەر لە ئێوارەیە بە درێژایی ئەو جادە درێژە پڕ لە هەوراز و نشێوە پێچاوپێچە، بە بەر چاوەوە جارێ سەرەو سەرێ جارێ بەرەو خوارێ، بە دوای یەکدا دەڵێی ترومبێلی دوای دارەبازەن سەریان لە دوای یەکتر ناوە، تازەترین وێنە بەر لە چەند رۆژێ لەو خوارە، لێرەوە دیار نیە، گیرا، جاشەکانی کەریم خان ئەو وێنەیان گرت، وێنەکەم لە سەرهاتی ((بڕنۆ)) نیشانداوەتەوە، ئێستا با تەماشای کۆنترین وێنە بکەین:

منداڵ بووم، لەگەڵ بابم لەو نزیکانە خۆمان دابووە پەنا بەردێك، هەڵەم نەکردبێ، ئەها ئەوە بەردەکەیە، لە شێوەی خۆی ماوە، لە شوێنی خۆی هەڵنەکەنراوە، ئێستاش دەڕوانێتە جادە، هەوە، بەرد هەمان بەردە و نەگۆڕاوە، بەرد چ نەگۆڕە! بابم بە نیازی ئاژەڵ کڕین هاتبووە ئەو ناوە، دیتمان لەو خوارە نزیك جادە بەدیوی ئێمە، دیوی سماق، سماقی تاڵ نەوەك شیرین، من ئێستاش بە دەممدا نایە بەو گوندە بڵێم سماقشیرین، هەر دەڵێم سماقتاڵ، دەزانن چ تاڵیەکی رژاندۆتە یادەوەریی منەوە! کۆمەڵێك جاش دەوری دوو پیاویان دابوو، نەمانزانی چین، تفەنگیان لە سەر سینگ راگرتبوون، ئێستاش دەنگی تەقەی ئەو دەو جادەیە، تەقەی جاشەکانم لە گوێ ماوە، بەڵام بەربوونەوەی دوو پیاوەکەم بە چاوی خۆم نەدیت،

چونکێ لەو دەمە بابم دەستی خستە سەرچاوم و رووی وەرگێرام، لە بیرمە پرسیم:

+ بابە، کوشتیان؟!

-نا، ترساندنیان...

بابم دەستمی گرت و هەڵەت هەڵەت بە ئاراستەی بەستی شەرغە هەلاتین، لە شێوەی سەپسێنکە هەلاتین، دیتە بیرم لە بابم بەغارتر بووم، لە پێشە وی هەڵدەهاتم، هەنکەش دەنگی بابمم لە گوێیە کە لە ساتەکانی هەلاتنێ چەند جارێ لە بەر خۆیەوە دەیگوتەوە:

بەدبەختینە، هەر لە جادەکە ئاودیو بان، بە دیوی گۆمەتاڵدا واتان بە سەرنەدەهات.

خۆزی بابە وەك چۆن چاومت گرت، گوێیەکانیشمت دادەخست، بەو منداڵیە گوێم لە تەقەی جاشان نەدەبوو، چ تۆقێنەر بوو تەقەی تفەنگی جاشان، رەنگە هەر بە هۆی ئەو یادەوەریە تاڵەی منداڵیەوە بێ، ئێستاش هێندەی لە تەقەی جاش دەترسم، نیو هێندە لە هی سەرباز نا، من لەو دەمەوە لە قسەکەی بابم و دواتریش لە وێتەکانیترەوە پێموایە ئەو جادەیە دنیا کەرت دەکات، قسەکەی ئەنکیشم بیرناچێتەوە کە ئێستا لە هەموو کاتێ پتر لە گوێم دەزرینگێتەوە:

کە باپیرتیان راودەنا تا هەواڵ دەهات گەیشتۆتە ئاقاری گۆمەتاڵ، دەستم لە سەر دڵم بوو، لەوە بەدوا دڵم ئاوی دەخواردەوە، دەمزانی ئیدی هەرچی جەندرمەی دنیایە لە دووی بن، نایگەنێ.

کەرتی ترس و مەرگ کە کەرتی سماقەتاڵەکەیە، کەرتی ئارامی و ژیانیش کە کەرتی گۆمەکەیە ئەو گۆمەی بە هەڵە تاڵی پێوەی..

رۆژ لە سەر ئاوابوونە، چەندە پەلە هەورێ لە ئاسمانی هەولێرێ زەردەپەرێکی نازداریان بە دنیا بەخشیوە، بەلام حەیف ترسی پەرینەوە و وێنە کارەساتبارەکان رێنادەن رێی خەیاڵ بچێتەوە باوەشی جوانیی سرووشت و چێژی زەردەپەڕ و کەسکایی بەهار بەو هەموو رەنگ

وگـوڵەوە بـرژێتە دیـدەوە، لەو ئێـوارەیە ئێـوارەی پەڕیـنەوە، لەو جـادەیەی دنیای کەرت دەکرد، حەڤدە هەژدە وێنەی کارەسـاتاوی بە رەنگـاورەنگی و بە دەنگ و رەنگەوە بە بەر چـاومەوە دەهـاتن و دەچـوون، مـن لێـرە لە نێوان تازەترین و کۆنترین وێنە تەنها یەك وێنە نیشـاندەدەمەوە کە ئەویـش زۆر کۆنە و هی ساڵی بە چیاکەوتنەوەیە.

ئەو ساڵەی لە شەوێکدا کەم پیـاوی هەولێـر لە مـاڵەوە مـانەوە، هەمـوو رێی چیایان گرتەبەر، ئەو شـەوە مـن ئەگەر هەنـدێ هەراشـتر بـام، بەگەڵ پیاوان دەکەوتم، ئێ، هەواڵ بە کۆڵانەکانی بەلاشاوە بڵاوبۆوە، گەیشتە ماڵ ماڵ، دەستەیەك پێشمەرگە کەوتوونەتە کەمینەوە وکەسـیان دەرنەچـوونە، لە کوێ؟ لەو جادەیەی من ناوم نـاوە جـادەیەك دنیـای کەرت دەکـرد، بەڵام لێرە نا، لە نزیك سماق و گۆمەکە نا، لەولا، لە خوارێ، لە ئاقاری (باخچە) ئەو باخچەیەی بەهارەکەی لە هەموو جێیـان پتـر گـوڵ دەگرێـت، ژنەکەی سەعید دەیگوت:

ئەگەر تا حەفت سـاڵیش بـاران نەبـارێ، ئاقـاری بـاخچە چـۆرە ئاوێـك نەبینێ، بێ گوڵ نابێ، خوێنی مێردەکەی من کەسکایی دەبەخشێتە حەفـت بەهاری بێ باران، هەرچی گوڵ هەیە لە خوێنی مێردەکەمەوە دەڕوێ.

من بەوە زانیم سەعیدیش لەگەڵ دەسـتەی بە سـەر بۆسـەدا کەوتـووە، براکەی کە ماڵیان بە ماڵی ئێمەوە بوو، گوێم لە گریانی بـوو، مـن لە سـەر بـان لەگـژ کـۆتر هەڵـدان بـووم، ئەو لە حەوشـە رەنـگە لە بـن بێـراییەکە دانیشتبووبێ، دەگریا، بە کوڵ دەگریا، لە براڕۆی دابـوو، ئەوەشـم لە بیـرە ژنەکەی دەیگوت:

لـۆ خـاتری خـودا، دەنگـت نـزمبکەوە، خەڵـك گوێیـان لێـیە، تووشـی بەلایەك دەبی.

بە قسەی ژنەکەی تووشی سەرسامی نەبووم، چونکێ پێشـتر بیسـتبووم، نابێت کەس بۆ کوژرانی پێشمەرگە بگریێ، هەرکەسێ بگریێ، حکـومەت دەیگرێ، دوای چەند رۆژێ رێـدرا کە کەسـوکاری پێشـمەرگەکان بچـن

تەرمەکان بێنێنەوە، دواتر بیستم تەرمەکان وەها شێوێترابوون، کەم کەس توانیبووی کەسی خۆی بناسێتەوە، براکانی سەعید هیچیان براکەیان نەناسیبۆوە، ژنەکەی سەعید گوتبووی:

من ببەن، دەیناسمەوە.

ناسیبوویەوە، دایکی ئازاد بە جەمەدانیەکەی، سەعیدی ناسیبووەوەوە، گوتبووی:

چەند رۆژێ بەر لەوەی سەعید بچێتەوە چیا، دەستم بە گورینگرێژکردنی جەمەدانیەکەی کردبوو، دەستم بشکێ، جێ بستێکی مابوو بیچنم، لە سەری کرد و رۆیشت، دەمویست لە دەرفەتێك بگەمە لای و تەواوی بکەم، بینایم برژێتە بن پێم، تەرمەکەیم بە جەمەدانیەکەی ناسیەوە.

ئەدی ئەگەر ئەوشەو منیش بە دەردەکەی سەعید چووم، بە چی دەناسرێمەوە؟ کێ دەمناسێتەوە؟ خۆ ئێستا وەك ئەودەم نیە، تەرمی پێشمەرگە بە کەسوکار نادرێتەوە!

حەڤدە ساڵ دوای مەرگی سەعید، رێك لەو رۆژەی هەولێر رابوو، ئازادی کوڕی سەعید، هەڵمەتی بردە سەر بارەگایەکی ئەو حکومەتەی تەرمی بابیان شێواند و جەمەدانیەکەی نەبا نەدەناسرایەوە، لەوێ لە تۆڵەی بابی دەستی خۆی وەشاند، بریندار بوو، من سەردانیم کرد،ماڵیان هەر لە جێی جاران بوو.

دوای سی و حەفت ساڵ لە مەرگی سەعید رێم کەوتە ئەو جێگەیەی سەعید لێی کەوتە بۆسەوە و تیا چوو، خوشکی گەورەم (عەیشۆك) کە دەستە خوشکی ژنی سەعیدە، لەگەڵم بوو، زۆر بە وردی سەرهاتی جەمەدانیەکەی بۆم گێڕایەوە و دوا رستە لەو گێڕانەوەیە رایچڵەکاندم، راچڵەکینێك تا درەنگ بەری نەدام، دوا رستە:

دایکی ئازاد تا ئێستاش جەمەدانیە خوێناویەکەی پاراستووە!

ئەو جەمەدانیە تەمەن سی و حەفت ساڵە چیرۆکێکە گێڕانەوە و چنینەوەی لە توانای من نیە.

تاریکی بە نیشتن نیشتە سەر جادە، ئێستا دەمی پەڕینەوەیە لە کەرتێکی دنیاوە بۆ کەرتەکەیدی، چاو بە ئاسماندا دەگێڕم، بە دوای ئەستێرەکەی باپیرمدا دەگەڕێم، هەڵنەهاتووە، پێشمەرگەیەکی خڕکەڵە، هێشتا تاریکی خڕکەڵەیی و باریکەڵەیی پێشمەرگەکانی نەشاردبۆوە، فەرمانی دا:

کەس جغارە پێنەکات.

چ فەرمانێکی جەرگبڕ بوو! بە هەڵە نەچووبم، لەوێ لەگەڵ دەرچوونی ئەو فەرمانە نەختێ لە پێشمەرگایەتی ساردبوومەوە، هێشتا چەکم وەرنەگرتووە سارد دەبمەوە! ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە چەندی مێشکم دەگوشم و فەرمانە قورسەکانی پێشمەرگایەتی بیرخۆم دێنمەوە، فەرمان لەو فەرمانە قورستر نابینمەوە، لەوەیە ئەوە یەکەم فەرمانی راستەخۆ بێ لە ژیانی پێشمەرگایەتیم، بۆیە بیرناچێتەوە، کالنابێتەوە، رەنگە پتریش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، لە کاتی فەرمانەکە من دەستم لە پاکەتی جگەرەکەم بوو، دەمویست جگەرەیەك داگیرسێنم، ئاخر وێنەکانی دەو ئەو جادەیە ئەو وێنانەی بە دوای یەکدا وەك چۆن ئێستا ئێمە بەدوای یەکدا خەریکە هەنگاوی پەڕینەوە دەهاوێژین، ئەوها بە بەر چاومدا دێن و دەڕۆن، وێنەکان زۆریان ماندوو کردبووم، ویستم لە دووکەڵی جگەرەیەك پشوو بدەم، پێشمەرگە خڕکەڵەکە نەیهێشت.

یەك لە دوای یەك، ریزە میرانە، من وابزانم لەو زنجیرە نەپساوەیە کە دەنگی پێ بە یەکەوەی بەستووین، نەك رستی بینایی، زۆر لە دواوە نیم، لەو ریێە چاو رۆڵی نیە، لەو ریێە نابینایەك و چاوساخێك هاوڕێ بن، چاو ساخەکە نابیناکە پێش خۆی دەدات، هێشتا سەر لە ئێوارەیە ئەو تاریکیە لە کوێوە هات! ئای باپیرە، ئەستێرەکەت هەڵنەهات، چاو لە تاریکایی دا رووەو رۆژهەلات زۆر گەڕا، بەلام حەیف! وا دیارە قسەکەی مام عجیل راست گەڕا.

وێدەچێت لە جادە زۆر نزیکبووبینەوە، دوورنیە بەراییمان گەیشتبێتە رۆخ جادە، لەو پەڕینەوەیە زۆر دەترسم، من لەو دوو سێ شەوەی دەگەڵ

پێشمەرگان کەوتووم، ئەوە دووەم جادە و دووەم پەڕینەوەی پڕ ترسە، شەوی یەکەم لە جادەی مەیلەو باشوور کە لە (سپێدەی تەڕوار) ناوی جادەی مەرگم لێنا، بەڵام مەرگی راستەقینە رەنگە جادە رۆژهەڵاتیەکە بێ، ئەو جادەیەی دنیا کەرتدەکات، ئەو جادە کڕوکپەی ئەگەر چ نەقەومێ دوای چەند خولەکێ لە تاریکاییدا دەبێتە شوێنپێ و نابینینەوە.

ئەها! دەڵێی قەوما، چەند دەسرێژێ دڕی بە بێدەنگی و تاریکی دا، لەو ساتە هەستمکرد ئەو پێشمەرگەیەی لە پێشە من دەڕۆیشت، لە رۆیشتن کەوت و کەوت، سەرەتا وامزانی پێیکەوت و کەوت، گەیشتمە سەری، گوتی:

دانیشە، با گوللەیەکت پێنەکەوێ.

دانیشتم و تێگەیشتم هەموو دانیشتنە، نەمزانی دەسرێژەکان لە کێ لاوە هاتن، ئەگەر پێشمەرگەیەك نەیگوتبا:

لە جێی پەڕینەوە دەگرن.

نەمدەزانی گوللە گڕدارەکان لە کوێ دەکوژێتەوە و بێ گڕەکان لە کوێ دەکەونەوە، دەسرێژ، دەسرێژ، چەند دەسرێژێکیدی، گەڕاینەوە، وا بزانم بە پەرتی گەڕاینەوە، ماوەیەکی باش بێ جگەرە دانیشتین، تەقە نەما، چەند حەزم لە جگەرەیە، خەویشم دێ، نازانم نە لە خەفەتی جگەرەیە نە لە ترس خەوم دێ، پێدەچێت ترسەکە بێ، تاقیمکردۆتەوە لەو ساتانەی ترس دەورم دەدا، خەو هەوڕژم دێنێ، خەوەنووتکە دەبەمەوە، دەبێ خەوتبم، خۆ ئەوەی دیتم، زیندەخەون نەبوو! لە سەر هەڵدێرێکی هەزار بەهەزارم، باز نایگاتێ، پێم بڕوا، دەبمە هەزار پارچە، هەر پارچەیەکم لە پنچکێك لە بەردێك گیردەبێ، ئەها! پێم خزی، سوپاس بابە! گەیشتێ و گرتمیەوە، هێشتا دەستم لە دەستی بابم بوو، دەنگێك:

هەستن، دەپەڕینەوە.

وا خەریکە دەپەڕینەوە، شەو کەمێك رووناك بۆتەوە، دیارە مانگ هەڵاتووە، ئۆخەیش! بەری سماقمان بڕی و پێمان نایە بەری گۆمەکە،

گەیشتینە کەرتەکەیدی دنیا، شەو رووناکە، رووناك، چاوی تیژ گورگ و سەگ لێکدی جودا دەکاتەوە، بەڵام گورگ و ڕێوی ڕەنگە زەحمەت بێ، زانیم زەحمەتە، پێشمەرگە:

- ئەها ئەوە گورگە.

- مام گورگ لە جێیەکی خراپ تووشت بووم، دەزانی ناوێرم تەقە بکەم و...

- ئەوە کوا گورگە! ڕێویە.

- ڕێویە؟

منیش دیتم، بەڵام نەمناسیەوە، دوو سێ جاریش گورگم لە دووورەوە دیتبوو، ڕێویش هەر هیچ، کاتی خۆی چەند مانگێك لە ماڵێ ڕێویەکی مل بە زنجیرمان هەبوو، ڕێویە مل بە زنجیرەکە با هەر لە ماڵێ بێ، بەڵام ئەگەر قسەیەك لە ڕێویەکەی (ئەباڵە پیرە) نەکەم، ئاقاری گۆمەتاڵ جێناهێلم، بەری ساڵانێکی زۆر لەو گۆمەتاڵە، ئەباڵە پیرە لەگەڵ ڕێویەکی وەك ئەو ڕێویە، وای دانێن ڕێویە! تێکدەگیرێن، دەبێتە شەڕیان، شەڕێك وەك دەڵێن کەس شەڕی وای نەدیوە، نە شەڕی مرۆڤ نە شەڕی درندە و ئاژەڵ و پەلەوەران، برا گەورەکەم وای گێڕایەوە:

لە گۆمەتاڵێ شەوێك ڕێوی دەچێتە ماڵی ئەباڵە پیرە، حیزە حیزە ڕووەو ژووری مریشکان دەخزێ، مام ئەباڵ دەیبینێ و خوترمەیەکیشی لە دەستە، بەڵام ڕێوی ئەو نابینێ، هێشتا ڕێوی نیوەی لە دەرێیە، خوترمە کاری خۆی دەکات، بەڵام ڕێوی لەو ڕێویانە نیە بترسێ و هەڵێ، نا، دەستدەکاتەوە، پڕ دەداتە ئەباڵە پیرە، ددانەکانی لە ناو لە پی دەستی چەپی ختمدەکات، مام ئەباڵ دیارە وەك ڕێویەکە ئازایە، هاوار ناکات، بە بێدەنگی دەستی راستی دەنێتە قوڕگی ڕێوی، پەنجە نینۆکیەکانی دەچەقێنێتە قورگی ڕێویەوە، ئیدی شەڕی ددان و پەنجە درێژەی هەیە، تا ددان پتر ڕۆبچێ و لە ناو لەپ مشتتر بێ، پەنجە تیژتر دەچەقێتە قوڕگەوە، دیارە شەڕ لە نێوان پێیەکانیش بەرپابووە، جلکوبەرگی ئەباڵە پیرە خەریکە شیتال شیتال دەبێ،

تـ ریکە خوێن دیـار نـیە، بەڵام شـەڕی ریـوی و ئەبـالە پیـرە لە گەرمـایی خوێتەوە گەرمتر و گەرمترە، شەڕ گەرمە، ئەبالە پیرە ماندووە، شرە، ئێستا ئ ئێستا دەستی چەپی لە دەستدەدا و دەستی راستیشی هێواش هێـواش شـل دەبێ، وا بڕوات ریوی دەیباتەوە، هەر دیتت ئەبـالە پیـرە هەر جـووجکە و مریشـك نـا، دەستیشـی لە سـەر دانـا، نـا ئەبـالە پیـرە تـا ئێسـتا بـۆ کەسـی دانەهێناوە تا بۆ ریوی دابێنێ، هێشتا دیار نیە، شەڕەکە چۆن دەکەوێتەوە.

ئێ، درێژەی نەدەمـێ، ئەبـالە پیـرە هەسـتدەکات، رێـوی لە پەل و پـۆ کەوتـووە، بەڵام ددانـی لە کـار نەکەوتـووە، زۆر نابـا، رێـوی لە باوەشـی عەبالە پیرە گیان دەسپێرێ.

بابم هەڵیدایێ:

ئەوە جاری یەکەم و دوا جار بووە ئەباڵە پیرە خەنجەری لەبەر پشـتوێن نەبێت، لە کاتی نووستنێ، لە چوونە سـەر پێشـاوێ خەنـجەری هەر لە نـاو مشتی یان بەر پشتێنی بووە.

لە بارەی ئەباڵە پیرە و خەنجەرەکەی، بابم وای گێڕایەوە:

ئەباڵە پیرە ئەو پیـاوە! لە تەمەنـی لە بەر کەسـی دانەهێنـاوە، گێچەڵـی بە کەس نەکردووە و لە گێچەڵیش هەڵنەهاتووە، دنیـاش پـڕی گـێچەڵە، بـۆیە مەگەر بـابم هێنـدەی وی بە شـەڕ هـاتبێ، لە رێوبانێـك پیاوێـك دیـارە نایناسـێت، شـەڕی پـێ دەفرۆشـێت، ئەبـاڵە پیـرەش خەنـجەرەکەی هەڵدەکێشێت و لا رانێکی دەهێنێتە خوارێ، ئیدی ئەباڵە پیرە دەگیرێ و لە زینـدانی هەولێـری دەپەسـتن، لە نـاو زینـدانێ بەدبەختێـك، بەدبەختـر لەو پیـاوەی لا رانـی هـاتە خـوارێ و خـۆی چـووە خەسـتەخانە ئەبـالی نـاردە زیندانێ، گێچەڵ بە ئەباڵە پیرە دەکات، ئەباڵیش لەوانە نیە خۆی لە گێچەڵ لادا، خەنجەر هەڵدەکێشـێ و لە ورگـی کـابرای مشـت دەکـات و ناگـاتە خەستەخانە دەمرێ.

بـۆ ناپرسـن، خەنـجەر چـۆن گەیشـتە ژووری زینـدان؟ ئەبـاڵ دواتـر گێڕابوویەوە:

لەو ساتەی دەستگیریان کردم، بە بەر چاوی دوو پۆلیسەکەوە، بە تەردەستی خەنجەرەکەمم بە دۆخینەکەمەوە بەست وخستمە ناو شەرواڵەکەمم و بە بن گونمەوە شۆڕبووە، ئەو پۆلیسە گێلانە هەستیان پێنەکرد.

بابم چووە دووی:

ئەباڵە پیرە هێندە لە زیندان نەمایەوە، بە خۆ و بە خەنجەرەوە رۆیشتەوە ئاوایی، کەس تێنەگەیشت، ئەباڵ چۆن بەربووا بەڵام پۆلیسێك لە دەمی دەرچووبوو:

ئەباڵ لە دەرێ بێ باشترە، چونکێ تا ئێستا لە دەرێ کەسی نەکوشتووە، بەڵام هەر پێی نایە زیندان پیاوێکی کوشت، بۆیە بۆ حکومەت وا باشترە.

وا بە تەنیشت گۆمەتالی ئەباڵە پیرەدا هەڵدەگەڕێین، لەو دەمە دەبێت رووداوێك روویدابێت، بەڵام چەندی سەر دێنم و دەبەم چ نایەتەوە بیرم، بۆچی لێکدی دابڕاین و بزربووین؟ نازانم، ئێمە شەش حەفتێك لە وانیدی دابڕاین، باش بوو لە کەرتەکەی ئەو بەر بزر نەبووین، ئێ، پێشمەرگەیەك دڵی داینەوە:

مەترسن، من رێگە دەبینمەوە، پێشتر لێرەوە پەڕیومەتەوە، بەڵام نەکەن بانگبکەن، جاش هێندە لێمان دوور نین.

من لە هەر جێیەك بزربم دەترسم، بە تەنێ یان بە کۆمەڵ بزر بم، دەترسم، لە چۆلەوانی یان لە ئاوەدانی بزر بم دەترسم، بە منداڵی یان گەورەیی بزربووبم ترساوم، لە ناو قەیسەریی هەولێر یان لە چیای پێرس بزر بم دەترسم، لە (ئاسمان رژاوەتە پێرسەوە) ترسم نووسیوەتەوە، ترسی بزربوون، ترسی تیاچوون و بە دنیا نەکەوتنەوە، لێرە کاتم نیە بۆ ترس گێڕانەوە، ترس لەوەی جارێکیدی بکەومەوە دەستی جاشان، ترس لە بێ چەکی، کێ هەیە هێندەی پێشمەرگەی بێ چەك بترسێ! وەك چۆن لە بیرم نیە چی بوو بزری کردین و لێکدی دابڕاندین، لە بیریشم نیە چی بوو بە

یەکتری شادکردینەوە، ئەدی ئەو تراکتۆرە لە کوێوە هات، لەو بەری جادەوە دوور بە دووری لەگەڵمان بوو، یان لەم بەرەوە بۆمان هات! سوار بووین بە هەورازە ڕێیەکدا هەڵدەگەڕێین، دەبابەش پێیدا سەرناکەوێ، تراکتۆر بێ چاو بە تاریکیدا هەڵدەگەڕێ، وا بزانم خارە جەواد بوو دەیگوت:

بە ڕاستی تراکتۆرێکی نێرەکەرە ئەو هەموو بارە پێشمەرگەی هەڵگرتووە.

هەوکە لەو دەستە پێشمەرگەیە هەر ئەوانەم لە بیر ماوە، لە وانەی تازە بەگەڵ پێشمەرگە کەوتوونە و هێشتا چەکیان وەرنەگرتووە: (دیار، هەنگاو، خارە جەواد، خارە جەمیل) لە پێشمەرگەکانیش: (کانەبی گچکە، خەیام)، دێدەوان لەگەڵمان نەپەڕیەوە، خەیامەکە شوفێری تراکتۆرەکەیە زۆر شێتانە داژوا، ئێستا نا ئێستا لە کەندێمان دەکات، ناوە ناوە هەندێك دادەبەزن و سواردەبنەوە، من هێند ماندووم، وەها دەستم لێگیرکردووە و خۆم گرمۆڵە کردووە، وەریشگەڕێ لێنابمەوە، گرڕ گرڕ تەقتەقتەق، هەڵگەڕێ ڕاستوڕاست، پێچاوپێچ، هەڵگەڕێ، هەر هەڵگەڕێ، نازانم چەند هەڵگەڕاین، ئێستا لە شۆڕبوونەوەداین، خەیام بە فەتارەتمان دەدا، لە دوو جادەی مەرگ پەڕیمەوە و نەمردم، وەرە لە هیچوخۆڕا خەیام بتکوژێ، شارەزای ڕێیەکە بام، دادەبەزیم و بە پێیان دەڕۆیشتم، وەها بە سەر یەکتردا بەردەبووینەوە، مەڕو بزن وا بەسەر یەکتردا نەکەوتوون، دەنگێك هەوکەش لە گوێمە، دەبێت دەنگی کانەبی گچکە بووبێ:

خەیام، گووی سەی، لە کەندێمان نەکەی.

وا بڕوا لە کەندێمان دەکات و لە ترێ سەی دەچین، دیتم پێشمەرگەیەك جگەرەی داگیرساند، هەر خۆی گوتی:

ئاگری جگەرە بخەنە ناو دەستتان و بیشارنەوە.

خەنی بووم، لە بن ساقۆوە، جگەرەم داگیرساند و لای ئاگرم خستە نێو هەردوو لەپمەوە و مژێ هێند قووڵم لێدەدا کەس لە سەردەمی بێ

ئـاوی مـژی وای لە مـاتۆڕی ئـاو نەداوە، جگەرەیەکیـدیم بە جـگەرەکە پێکرد، ئاگام لە خەیام و تراکتۆر نەما.

هەوکە، نـازانم چ کـاتە، دوور نـیە بەیـانی دابـێ، گەیشـتینە گونـدێك گوتیان (سووسێ)یە، یەکەم جارمە سووسێ ببینم، بەڵام ناویم زۆر بیستووە و پێی ئاشنام، لە دڵەوە بە دیداری سووسێ خۆشحاڵ بووم، هەر زوو نـاوم لەو دیـــدارە نـــا (دیـــداری مێـــوژی) ئەگەر لەو ســـەروبەندە ســـەردانی کونەفلووسەشم کردبـا، نـاویم دەنـا دیـداری بەفـری، نـاوی سووسـێ منـی بـردەوە مەیـدانی کرێکـارانی بـن قەراتـی هەولێـرێ کە هەمـوو هاوینـان، سبەینان زوو، لەگەڵ دەنگـی دەروێـش برایمـی مزگەفتـی حـاجی قەرۆ لە خەو رادەبووم و دەگەیشتمە بەردەم چایخـانەی مەچکـۆ، لەوێ ئەو پیـاوی عارەبانەکەی لە ناو جادە راگرتبوو، ناوە ناوە بە دەنگێکی گڕ:

مێوژی سووسێ
بەفری کونەفلووسێ
ئەوەی بیخواتەوە
قەت چاوی نانووسێ.

مـن  کە دوای ئەو هەمـوو رێ رۆیشـتنەش هێشـتا خەو بەریـنەدەدام و چاوم نیوە نووساو بوو، دەچوومە لای و پەرداخێك ئاوی مێوژی پڕ بەفر و دوو سەموونی گەرمم بە پارەیەکی کەم دەخوارد، ئەو خۆشاوەی مێوژە چ تامێکی هەبوو خودایە! من لەو دەمەوە حەزم بە دیداری سووسێ کردووە، ئەوە لەو بەیانیە بێ دەروێش برایمیە، وا لە چـاوەیەکی لاچەپ، وێـدەچێ مزگەفت بێ، دەمەوێ سەرخەوێك بشکێنم، چەند تینووی مێوژی سووسـێ بە بەفری کونەفلووسـەوەم پتـر تینـووی چـۆڕێ خەوم، بەڵام خەوی چـی، بیستم ئێستا سەرەتایە بۆ رۆیشتن، وا دیارە سـەرەتای ژیـانێکە، هەمـوو هەر هەموو، خەو، پشوو، خواردن لە پێناوی رۆیشتنە، رۆیشتن هەمیشە رۆیشـتن ئیـدی پێشـمەرگایەتیە، پـێش بەرێکەوتـن تووشـی دەسـتەیەك پێشـمەرگە بووین، ناسیارێکی تێدا بوو، لە منداڵییەوە دەمناسی، زووناسیمەوە و زووتـر

ئاسیمیەوە، بەڵام رووی خۆی وەرگێرا، تێگەیشتم، منیش خۆم نەناس کرد، هەنگینیێ وا بوو کەس نەیدەویست کەس بیناسێتەوە، بەو سپێدە بەهاریە بە جوانی و بۆن و بەرامەی سووسێ، هەرچی گوڵ و گیاوگۆلێکت حەز لێیە، وەرە لە سووسێ ببینە و بۆنی بکە، باوی گوڵی سپی کردوو، دنیای داپۆشیوە، مەستم و دەستبەرداری نابم، حەیف وەرزی رەز نەبوو، وەرزی ترێ و مێوژ نەبوو، دەنا بێ پیاسەیەکی ناو رەزەکانی، سووسێم بەجێنەدەهێشت.

ئەرێ تراکتۆرەکە چی لێهات! وەك چۆن دوێ شەو لە نادیارەوە هات، بەو سپێدەیەش چۆوە نادیار، بە رێیەکدا دەڕۆین، هەر چۆن پێ دانێی گوڵاڵەیەك، پنچکە گیایەکی بەهەشتی پاندەبێتەوە، دڵت نایە پێیدا بڕۆی، لە بن ئاسمانێکین نازانم کێ بوو گوتی:

توخوا بە دووکەڵی جگەرە پیسی مەکەن.

پێڵاوەکەم بنی زۆر پان بوو، لە هەمووان پتر گیاوگوڵم پانکردۆتەوە، کەمێك بە پێم گەورە بوو، بەڵام بە توندیی قەیتانەکەی بە پێمەوە توند بوو، چەند رۆژێ پێش بە چیاکەوتنم برادەرێکم (ئازاد هاشم) پێی بەخشیم و گوتی:

ئەو پێڵاوە لە پێستی رێوی قایمترە، لە دار و بەردی بدەی حەفت ساڵان لە پێی بکە، هەر نوێیە.

بیستبووم بۆ پێشمەرگە پێڵاوی باش لە تفەنگی باش پێویسترە، من پێڵاوەکەم هەیە، تفەنگەکەشم هەبا، چیم دەویست! بڕۆ بڕۆ، زۆر رۆیشتین، لە سەر بستوویەك، کە چەند گابەردێکی لە سەر شانی خۆی هەڵگرتبوو، لە پەنای گابەردان پشووێکمان دا، جگەرە، جگەرە بە جگەرە، چەند جگەرەیێ، پێش هەستان، قەیتانی پێڵاوەکەم توندتر دەکەمەوە، ئای، ئەوە چیە، بنی هەڵزڕایە، ئەو پێڵاوەی دەبوو حەفت ساڵی لە پێ بکەم، حەفت رۆژیشی نەکرد، دەمزانی پێی من لەو پێیانەیە پێڵاو بەری ناگرێ، تا تۆ پێڵاوێك دەدڕێی من حەفتم دڕاندووە، بەڵام بەو شێوەیەش نا، ئەو پێڵاوە

له چەرم ڕێویە! هێندەی پێستی مریشکیش بەرگەی نەگرت، زۆر خەفەتم لە پێڵاوی دڕاو خوارد، بیرم لە لای تفەنگی باش بوو، پێڵاوی باشیشم لە سەر دانا، لەو دەمە دەستم بۆ گیرفانم برد، باشە وەك خۆیەتی، پارەی چەند پێڵاوێکی باشم هەیە، قسەی برادەرێکم (جەمال ڕەمەزان) بیرکەوتەوە، ڕۆژی پێش بە جیاکەوتنم، دە دیناری بە زۆر خستە گیرفانمەوە و گوتی:

زوو زوو پێڵاوی باشی پێبکڕە.

دە دیناری ئەودەمانێ هەند بوو، مووچەی دوو پێشمەرگە بوو، ئا، عەزیزی مەلای ڕەشییش بڕێ پارەی دامێ بە جوانیی بەهاردا ڕووەو سماقوڵی ڕێی پێچاوپێچمان گرتووە، هەرچی جوانی هەیە وەرە لە بەهاری ئەو دۆڵەدا بیچنەوە، لە پڕ دەنگی فڕۆکە هات، بووە زرموهۆڕ، فڕۆکە لە چەند لاوە بەهاریان بۆردوومانەکرد و سرووشتیان دەژاکاند، من وای تێگەیشتبووم لەم دیوەی چیا فڕۆکە ناوێرێ هێندە نزم بێتەوە، هەڵە بووم، درەنگە، پەلەمە، بگەمە جووتێ پێڵاوی باش و تفەنگێکی باش، کەمێکیتر دەگەمە ئەو بڕنۆیەی جوانیم تێیدا دیتەوە.

## له بڕنۆ جوانیم دیتەوە

ئەوڕۆ نیە سەردەمی بڕنۆ بەسەرچووە، وەلێ لە چیاو چۆلان تاقولۆق بڕنۆ بە شان دەبینرێن، من کەسێکم لە وانەی تاکو نهۆ لە سەردەمی بڕنۆ دەژین، تا دڵ حەز بکات حەزم لە بڕنۆیە، ئەوەتا لە کاتی خەوێ وەك ژن لەگەڵ خۆمی دەخەوێنم، چەند جوانە، چ بەژنێکی زراڤی هەیە، بڕواناکەم لە ژیانم حەزی پیاوکوشتن چووبێتە دڵمەوە، جا با پیاوەکە سەدام یان ئامۆزاکەشی بووبێت، قەت مەیلی راوی هیچ ئاژەڵ و باڵندەیەکیشم نەبووە، کەچی هەر حەزم لە بڕنۆیە، رەنگە ئەو حەزە بۆ منداڵیم بگەڕێتەوە، ئەو کاتەی لە گەڕەك بە کۆرس گۆرانیی (بڕنۆ)مان دەگوتەوە:

بڕنۆی رەقەم حەڤدەیە

نیشانەی پێشمەرگەیە.

دووریش نیە پەیوەندی بە بڕنۆکەی بابمەوە هەبێت، ئەو بڕنۆیەی قەت نەمدیتبوو، بەڵام هەمیشە لە ناو چاوم هەڵواسرابوو، ئاخر بابم شەوان، هەموو شەوان لە سەر خواستی ئێمە چیرۆکی بڕنۆکەی بە درودا وبۆمان دەگێڕایەوە، ئەو بڕنۆیەی لە ترسی جاشان لە (بەستی شەرغە) خستبوویە بن عەرد و دواییش بە جێیەکە نەکەوتبۆوە، هەموو ئەو بەر و ئەوبەری بەستی هەڵدڕیبوو بڕنۆی نەدیتەوە و نەدیتەوە، بابم دەیگۆت:

دیتە بیرم، لە بن گولەکێکی گەورە عەردم بۆی هەڵکەند.

بابم لە کاتی گێڕانەوەی چیرۆکی بڕنۆ هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا، وای لێهات من لەو قووڵتر هەناسەم هەڵدەکێشا، لە گێڕانەوەی چیرۆکی بڕنۆ جارێك لە بابمم پرسی:

+ بۆچی، جاشەکانت نەکوشت؟

- چەنـدیان بکـوژم، یەك، دوو، دە..؟ نیـوەی دنیـا جـاش بـوو، جـگە لەوەش من برنۆم بۆ ئەوە لە شـان نەبـوو تـا پیـاوی پـێ بکـوژم، تەنهـا بـۆ گورگ و دەعبا و بەس.

پێش چەنـد رۆژێ، کە لە دەو بەسـتی شـەرغە دانیشـتبووم، برنـۆکەی بابم بیرکەوتەوە، خولیـای گەڕان بە دوویـدا کەوتە سـەرم، گەڕام، لە بـن گولەکان لە دووی برنۆ دەگەڕام، دێتە بیرم پێشـمەرگەیەك ئەبـوو شـتێکیان دەگوتێ بە تێکەڵەیەك لە عەرەبی و کوردی پرسی:

+ ئەوە لە دووی چ دەگەڕێی؟

- بابم برنۆیەکی لێرە شاردبۆوە، بزانم نایبینمەوە.

+ کەی ؟

- بیست ساڵێك دەبێت.

سـەیرکردنێکی سـەیر سـەیریکردم، وەك ئەوەی بڵـێ بە خۆمـان گەلەك تەواوین هەر ئەتۆمان دەویست، راستی منیش پێکەنینم بە خۆم هات.

هەر بە منداڵی پێش ئەوەی بابم لە ترسی جاشـان برنـۆکەی بشـارێتەوە، چەند جارێك بە سەردان هاتوومەتە ئەو بەستەوە، ئەو گۆمـاوە دەناسـمەوە، پێش حەڤدە ساڵێك مەلەم تێدا کردووە، بەو دوو تاشە بەردە دەیناسـمەوە، بەهار کۆتایی بێت، جوانتر بە دیار دەکەون، من لە هاوینان لە هەولێـرەوە دەهاتمە ئێرە، ئەوەتا ئەو ئەشـکەوتە گچـکەیەش وەك خـۆی مـاوەتەوە، چ گۆڕانێـك بە سـەر ئەو دەوروبەرەدا نەهـاتووە، ئەوە گـردی کەزی زەرە، ئەوێهێ... هەر وا دەزانم دوێنێ بوو، کۆمەڵە پیاوێك لە بـن ئەو ئەشـکەوتە دانیشتبوون، بە برنۆ نیشانەیان دانابۆوە... ئەوەشم دێتەوە بیر، یەکیان گوتی: تەقوتۆق بەسە، هەوکە کۆپتەر دەردەکەوێت.

هاتنی فڕۆکە و کۆپتەریشم لە یـاد مـاوە، چەنـد جـار خـۆم لە بـن ئەو بەردانە حەشار داوە، باپیرم دەیگوت:

هەر گوێت لە دەنگی فڕۆکە بوو، خۆت لە بن بەردان بە عەردی دادە،

بەرد دەتپارێزێ، مەگەر خودا، دەنا هەر کەسێك خۆی دەخیلی بەرد بکات، ساچمەی پێناکەوێت.

نهاش هەر حەڤدە ساڵ لەمەوبەرە، چی گۆڕاوە! بەست هەر بەستی جارانە، ئەوە گۆماوی مەلەوانی، ئەوە ئەشکەوتی حەسانەوە، ئەوە بنە دارەکان، ئەوە باڵندەکان، ئەوەش ئەو باریکە ڕێیەی دەڕوا دەڕوا هەتا ناو گوند گیر نابێت،(تەڕوار) ئەو گوندە هەمیشە تەڕەی باپیرم لە سەرەمەرگدا بۆی دەگریا، ئەها لە بن ئەو لووتە شاخە، وا دەزانم دوێنێ بوو، هێلانەیەکی سووسکەم دیتەوە، پڕ پڕ لە هێلکە، ئێستاش سپێتیی هێلکەکان لە چاومدا دەدرەوشێنەوە... ئێستاش هەر ئەو دەمە، ئەوەتە لە ترسی فڕۆکە و کۆپتەر خۆم لە پەنای ئەو بەردانە شاردۆتەوە کە حەڤدە ساڵ پێش ئێستاش خۆم لە بنیان دەشاردەوە... هەینێش تفەنگم نەبوو، هەوکەش... جیاوازیەکە تەنها لە تەمەنە ئەودەمانێ منداڵ بووم، ئێستا گەورە، ئەودەمانێ لەگەڵ ئەو هەموو پرسیارەی لە بارەی هاتنی فڕۆکە و خۆشاردنەوەوە دەمکرد، کەس وەڵامێکی وای نەدامەوە، بەڵام ئێستا کەمێك لە گەمەی خۆمان و فڕۆکە تێدەگەم.

وا لەو دەو بەستە بەو نێرینەی بەهارێیە لە بن بنەدارێك دانیشتووم، بە قەڵەمبڕ خەریکی هەڵکۆڵینی دارم، دەمەوێ چەند وشەیەك لەو دارە بەجێبهێڵم، ئەو دارەی هەستدەکەم پێش حەڤدە ساڵێکیش لەمەوبەر هەر وەك ئێستا بووە و نەگۆڕاوە، دەنووسم:

دوای حەڤدە ساڵ تۆم دیتەوە.

+ ئەوە چ لەو دارە دەکەیت؟

- شتێکم لە سەری نووسی.

+ تاهوو وا هوو! ئەو بنەدارە زۆر بژی ناگاتە حەفتەیەك، ڕەنگە هەر ئێستا تۆپێك بێ و لە ڕەگەوە هەڵیکێشێ، دنیا ئاگری گرتووە، زەحمەتە درەختێك بە پێوە بمێنێ، ئەگەر دەشنووسی بنووسە ماڵئاوا.

ئەو پیاوە مام عجیلی ناوە، پیاوێکی بە تەمەنداچووی ڕەقەڵەیە، خاڵێکی

گەورە بە لا چـاویەوەیە نیـوەی چـاوی داپۆشـیوە، کلاشـینکۆفێکی بە شانەوەیە دەڵێی تازە لە کـارگەی رووسیەوە هـاتووە، بریسـکەی دێ، هەر زەیـنەتە تەماشـای بکەیـت، بە راسـتی ئەگەر کلاشـینکۆف توانـای پیاوکوشتنی نەبا، شتێکی جوان بوو، زۆر جـوان مەگەر برنـۆ هێنـدەی وی جوان با...

ئێرە سماقوڵی ناوە، دەڵێن لەو دۆڵە سێ گوند هەیە بەو ناوە، نا، چـوار، ئەوەی ئێمەی حەواندۆتەوە نازانم کامیـانە، هێنـدە دەزانـم کچێکـی جـوان جوان، کانیەکی روون روون، دوکانێکی خاوێن خـاوێنی هەیە، لە شـارەوە تا گەیشـتمە ئێـرە حەفـت شـەوی ویسـت، سـێ شـەو لەمەو بەر لە بەسـتی شەرغە بووم، شەش شەو لەمەوبەر لە دەشتی هەولێر، حەفت شەو لەمەوبەر لە ناوەندی هەولێرێ لە ماڵی خۆمان لە پرخەی خەوێ بووم، حەفـت رۆژە دنیـا بەرەواژ بـۆتەوە، بە رۆژ نووسـتن بە شـەو رۆیشـتن، بەرەواژیەکە لەوە دایە من بە رووناکی خەوم لێ ناکەوێت، بـۆ خەوتـن دەبێـت دنیـا تاریـك تاریـك بێـت، هەتـا ئەو شـەوانەی مانـگ بە دەرەوەیە و لە چـواردەیە و مانگەشەوێکی رووناکە، دەبێـت چـاوەڕێی ئـاوابوونی مانـگ بـکەم، دوای ئاوابوونی مانگ یاڵا خەوم لێدەکەوێت، بـالیف گـۆڕینیش سـەربار، بـۆیە درۆ نیە بڵێم حەفت شەو دەبێت بایی شەوێك نەنووستووم.

ئەو پیاوە خڕکەڵەیە کە جێگاکەی بە تەنیشت منەوەیە کانەبی گچکەی نـاوە، هێنـدە گچـکەش نـیە، گچکەیـیەکەی هـی ئەوە نـیە بە نـاوەکەیەوە بلکێ، دەرەنگ تێگەیشـتم کە بـۆ جیـاکردنەوە لە کانەبیەکانیـدی پێیـدەڵێن کـانەبی گچـکە، کـانەبیی وا هەیە بە قەت سـێ ئەو کـانەبیە دەبێـت، ئەو کانەبیە پیاوێکە هێند شیرن، هێند شیرن، ئەگەر ئەو کانەبیە گەورەیە نەبایە، دەبوایە ناوی کانەبی قەند بێت .

دەمی عەسرە چا بـوو، کەس نەبـوو چـای بە دەسـتەوە نەبێـت، چـایەی کەسـیش لە پیـاڵەدا نەبـوو، هەبـوو لە بـنە مەتـارە دەیخـواردەوە، هەبـوو لە شووشەی گەورەی ئاوەتەماتە، هەبوو لە قۆغەی دەورانـی کـۆنی منـداڵی، کانەبی پیلی گرتم و گوتی:

وەرە، گووی سەی.

پێشتر ئەو پیاوەم نەدەناسی، هەمووی چەند رۆژێکە ناویم بیستووە، گاڵتەم لەگەڵی نیە، لەگەڵ ئەوەش لەو (گووی سەی)ە توورە نەبووم، ئاخر کەس نیە رۆژانە چەندان جار لە لایەن ئەو پیاوەوە گووی سەی وەرنەگرێت، کەسیش لێی توورە نەدەبوو، بە پێچەوانەوە هەمووان حەزیان لەو (گووی سەی)ەی کانەبی گچکە دەکرد، ئاخر هەند جوانی دەگۆت، پیاو لێی دەبووە هەنگوین، بردمیە ژوورە گچکەڵەکە کە هەر جێگەی دوو سێ کانەبی گچکەی لێدەبۆوە، دەستی گەیاندە برنۆیەك کە بە دیوارەوە هەڵواسرابوو:

+ ئەو برنۆیە بۆ تۆ، بەڵام ئاگادار بە جاروبار چرووك دەکات.

- زۆر سوپاس

خەریکبوو بڵێم: من قەت تەقەم نەکردووە.

پەشیمان بوومەوە، نەمگوت.

ئێستا برنۆم هەیە، ئیدی لە دیلی دەرچووم و ترسم نەما، لە وڵاتێك کە کوشتارگەیەکی گەورەیە و لوولەی تفەنگەکان روو لە هەمووانن، لە وڵاتێك بۆ ئەوەی قسەیەکت هەبێت، هیچ چار نیە دەبێت ببمە هاورێی تفەنگ، لەوەتەی فامم کردووە هەستم بە دیلیش کردووە، شار بۆ من جگە لە بەندیخانەیەکی گەورە چیدی نەبووە، هەمیشە خەونم بە دەرچوون لەو بەندیخانەیە دیتووە...

ئەو رۆژەی شارم بەجێهێشت لە دەفتەری یادگاریی خۆم بە رۆژی هەڵاتن لە بەندیخانەی تۆمار دەکەم، تا ئەو برنۆیەشم وەرنەگرت وام هەستدەکرد لە دوومن و ئێستا نا ئێستا دەمگرنەوە و راپێچی زیندانم دەکەنەوە، ئێستا ئەو ترسەم نەما، لە دڵی خۆم دەمگوت، ئەگەر بابم ببینمەوە دەڵێم:

بابە، ئەو برنۆیەی لە ترسی جاشان شاردبووتەوە، دیتمەوە.

بە دەست خۆم نەبوو، وام هەستدەکرد برنەوەکەی بابمم دۆزیوەتەوە.

بارەگاکەی سماقولی کۆمەڵێك کتێب و بڵاوکراوەشی تێدا بوو، کانەبی گچکە ئەو پیاوەی برنۆی دامێ، منی بە بەرپرسی کتێبخانە دانا، منیش جوان رێکمخستن لە کۆلێژ فێرببووم کتێبخانە چۆن رێکدەخرێت، هەوڵم دا بەو شێوەیە رێکی بخەم، رێك وەك کتێبخانەکەی خۆم کە دڵم لەو دوورەوە بۆی لێدەدا، بە تەواوی لە رێکخستنی کتێبخانە نەبوومەوە، ماڵئاواییم لە سماقولی کرد، برۆ، برۆ بە رێیەکدا بۆ نازەنین شۆڕبووینەوە دەتگوت پێبلقەی شەیتانە، هەمیشە حەزمکردووە لە وەرزی هەناردا سەردانی نازەنین بکەم، بەڵام رێك نەکەوتووە، سەردانی ئەو جارەش نەکەوتە وەرزی هەنارەوە، شەوێ لەوێ ماینەوە، برنۆم لەگەڵ خۆم خەواند، سوورە کە لەگەڵمان بوو گۆتی:

تەماشا، تەماشا، دەڵێی لەگەڵ ژن راکشاوە.

منیش گۆتم:

دەمەوێت، ئەو برنۆیە، ببێتە ژن بۆ ئەوەی تووشی خوێنڕشتن نەبێت.

سوورە بێ وەستان، وەك ئەوەی پێشتر ئامادەی کردبێت، گۆتی:

برنۆ، نەك ژن بیکەیتە فریشتەش خوێنی خۆی هەر دەرێژێت.

لێتان ناشارمەوە لەو رستەیەی سوورە زۆر ترسام، ئەگەر لە سماقولی ئەو قسەیەی بکردایە، دوور نەبوو، برنۆکە بدەمەوە کانەبی، هەر لەو هەڵگەڕان و داگەڕانە، دیتەبیرم رێمان بە بن کونەفلووسەش کەوت، بەڵام بەفرەکەیم نەدیتەوە، ئەو بەفرەی لە مەیدانی کرێکاران بە مێوژی سووسێوە بەتامترین و ساردترین شەربەتی دەداینێ، ماڵئاواییمان لە بەهاری دۆڵی هیران و نازەنین کرد، بەهارێك لە چاوی منەوە دواتریش بە بەهاری مایەوە، پیرێکی گوندی فریز کە هەموو تەمەنی بەرەنگاری بوو، گۆتەکانیشی شیعرێتیان لێدەچۆڕا، دەیگوت:

بیابان بە بیابانایەتی خۆی نەیتوانی زەردایەتی بخاتە کەسکایی ئەو بەهارەوە.

بالیسان، بالیسان ئەو گوندە گچکەیەی شارێك یادەوەریی رژاندۆتە

سەرمەوە، تازە گەیشتووینەتە ئەو گوندە پڕ لە یادەوەرییە، ماندووم، لەبەر خەو ئاگام لە برسێتی نەماوە، نازانم نە شەوە نە رۆژ، ئەوەی لە بیرمە برنۆکەم لە بیر بوو، لەگەڵ خۆمم درێژ کرد، نووستم، کە هەستام برادەرێك گوتی:

حەڤدە دەمژمێری رێکە خەوتووی.

پیاوێکی قژ بەفری، تەمەنەکەشی هی ئەوە نەبوو وا بەفر سەری بگرێت، بە پێکەنینێکی زۆر شیرینەوە:

+ کاکی بابەی، ئەوە بۆ شەڕ هاتووی، یان بۆ خەو؟!

- بە خوا بۆ خەو.

ئەو پیاوە ناوی لەشکری بوو، بە مامۆستا لەشکری گازیاندەکرد، بە کوردیەکی هێند پەتی و پاراو دەئاخاوت، زۆر کەس لە زۆر وشە پێویستیان بە وەرگێڕ هەبوو، پیاوێك بوو حەزی لە کتێب بوو، کە زانی منیش دۆستی کتێبم و قوتابیی زانکۆم پتر لێم نزیك بۆوە، لەو دوو سێ رۆژەی یەکتر ناسیندا هەستم دەکرد دەمێکە ئەو پیاوە برادەرمە.

لە بێراییە گەورەکەی بارەگا لە کۆڕی گەرمی مامۆستا لەشکری دادەنیشتین، ئەو پیاوە هەر جارەی زاراوەیەکی ورد دەکردەوە، وەهای روونکردەوە کەس نەبوو تێنەگات، زۆر جاریش بۆ پێکەنین و خۆشی وشەیەکی دەدیتەوە و دەکەوتە گەمە لەگەڵی، بە نموونە وشەی (خڕ)ی دەهێنا و دەیپرسی:

چ شتێك خڕە؟

لە دنیادا چەند خڕ هەیە؟

ئەو پرسیارانەی بۆ ئەوە نەدەکرد تا وەڵامی چنگ بکەوێت، بەردەوام دەبوو:

دنیایەك خڕ هەیە، خڕکەڵە هەیە، خڕێ هەیە، خڕۆکە هەیە، خڕۆکە لە خوێتی خڕکەڵە و خڕێدا هەیە، دەزانن خڕکەڵە نێرینەیە و خڕێ مێیینەیە... دەزانن جیاوازی نێوان (خڕیکردەوە) لەگەڵ (خڕیکرد) چیە؟ ئەها چەندی

پێخۆشه ئه‌گەر به چرپه به خڕێ بڵێی: خڕێ، باشت خڕکردووه!
وشه‌ی ئه‌و جاره (چش) بوو که مامۆستا ده‌یگوت:
ریێك به‌رانبه‌ر وشه‌ی (سفر)ی عه‌ره‌بیه
ئه‌وه‌ی له‌و دانیشتنه و له باره‌ی ئه‌و وشه‌یه‌وه له بیرمه، ده‌یگوت :
چش ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ خۆی تێکه‌ولێکه‌ی پێبکه‌ی، چشخانه‌یه‌ك ده‌رده‌چێت، له هیچ چێشتخانه‌یه‌ك چشی وا ده‌سناکه‌وێت، بۆ نموونه:
چش له چش کەم بکه، ده‌کاته چش، چش کۆی چش بکه ده‌کاته چش، چش دابه‌شی چش بکه ده‌کاته چش، چش جارانی چش بکه هه‌ر ده‌کاته چش..ئه‌وه له‌و لا، ئه‌دی ئه‌گه‌ر چش له‌گه‌ڵ خۆی نا له‌گه‌ڵ خه‌ڵکیدی بیخه‌یته تێکه‌ولێکه‌وه، ئه‌وا گه‌وره‌یی چش به دیارده‌که‌وێت، ئه‌ها به‌رێ خۆ بدێ، یه‌ك برنۆت هه‌یه، وه‌ك ئه‌و برنۆیه‌ی له‌به‌ر چاوتانه، ئه‌گه‌ر یه‌ك چش له‌و لایه‌ی ئه‌و یه‌ك برنۆیه‌ی دانێی ده‌بێته ده برنۆ، ئه‌گه‌ر سێ چش له ته‌نیشت ئه‌و یه‌که‌ی دانێی ده‌کاته هه‌زار، ئه‌ها چش له‌گه‌ڵ خۆی چه‌ند چشه و له‌گه‌ڵ خه‌ڵکیدیش چه‌ند شته.
له‌و کاته‌ی مامۆستا له‌شکری گه‌مه‌ی چشی پێده‌کردین، ده‌نگی فڕۆکه هات، یه‌کێك هاواری کرد:
کوڕه، په‌رته‌ی لێبکه‌ن، وا بزانم دوو فڕۆکه‌که‌ی دوێنێن، به‌ڵام هه‌ر یه‌که‌ی دوو ((چش))یان له ته‌نیشتیه.
په‌رته‌مان لێکرد، هه‌ر یه‌که و به‌ره‌و بن به‌ردێك، دیوارێك، په‌نایه‌ك، من له پاڵ به‌ردێك خۆم دیته‌وه له سێبه‌ری دره‌ختێك راکشابوو، بووه زرم و هۆڕ، له ئاسمانه‌وه بۆ عه‌رد، له عه‌رده‌وه بۆ ئاسمان، پیره برنۆم سوارکرد، له دڵی خۆم گوتم، با هه‌ر بۆ تاقیکردنه‌وه گولله‌یه‌ك باوێم، بزانم ته‌قه کووه! فڕۆکه‌کان هێنده بڵند نه‌بوون، نه‌ده‌ترسان، به که‌یفی خۆیان بالیانیان داده‌بێژا، ته‌زره‌کوتیان ده‌کرد، نیشانه‌م له فڕۆکه‌یه‌ك گرت، په‌نجه‌م پێوه‌نا...
+ ده‌ستخۆش، جوانت هاویشتێ.
-به راست!

ئەوە مامۆستا لە شکری بوو، دەستخۆشی لێمکرد، تا گوێم لەو دەستخۆشیەی نەبوو، نەمزانیبوو لێم نزیکە، کەمێك لە سەرەوەی من خۆی دابووە بن لا دیوارێك، لەو کاتەی گوللەکەم بە فڕۆکەکەوە نا، دیتم بەرزبوونەوەیەك بەرز بۆوە، ئەگەر لەو کاتە ئەستێرەیەك لەو راستە بایە خۆی لێی دەدا، بە دەستخۆشیەکەی مامۆستا و بە قوچاندنی فڕۆکە کەیفم هات، هەستمکرد شتێکی گەورەم کردووە، رەنگە ئەو جۆرە هەستە پەیوەندی بەوەشەوە هەبووبێت کە ئەوە یەکەم تەقەی تەمەن بووبێت، چونکە دواتر لە زۆر کەسم بیست کە یەکەم تەقە خۆشیەکی زۆر دەبەخشێ، هەتا گوێم لە عیسا عەسکەر بوو، دەیگۆت:

جیاوازیەکی زۆر لە نێوان یەکەم تەقە و شەوی زاوایەتی نیە.

ئەوەشم لە بیرە بە عیسایان گۆت:

ئەوە تەقەی پیاو، ئەدی یەکەم تەقەی ژن وەك هی شەوی بووکێنیە؟!

عیسا بە پێکەنینەوە دەیگۆت:

ئا، بە مەرجێك لە سەرەوە بێت.

فڕۆکە وازیان لە بالیسان نەدەهێنا، ترسم لە فڕۆکە و تەقە شکا، لە هەوڵی ئەوە بووم، فڕۆکە بخەمە ناو سێرەی بڕنۆوە، فڕۆکە ئاسمانی دووکەڵاویی بالیسانیان چۆڵنەدەکرد، مامۆستا کە کلاشینکۆفێکی رووسی بە دەستەوە بوو، گوتی:

+ بە خودای ئەمن بزانم، ئەورۆ فڕۆکەیەك بەو بڕنۆیەی تۆ رۆژی هاتووە، دەنا ئەوە بووە چارەگێك، بۆردوومان بەس نیە، نا، رۆژیان هاتووە.

- ئەگەر خاوەن بڕنۆ رۆژی نەهاتبێت!

+ نە بابە، بە خودای خاوەن فڕۆکەش دەچێتە بن گڵ تۆ هەر بە پێوە دەمێنیت.

یەکێك لە نزیك مامۆستا، خۆی دابووە پەنا:

- مامۆستا، وا مەڵێ، فڕۆکەکان رووسین.

+ رووسین رووسی نین بە گونتەوە.

لەو کاتە مامۆستاش بە کلاشینکۆفە رووسیەکەی دەسرێژێکی بۆ فڕۆکە رووسیەکان هاویشت و گوتی:

مەبەستم سەدام حوسێن بوو، ئەو پیاوەی هەموو دنیای کەر کردووە بە رووسیاشەوە.

ئەو کەرکردنی دنیایە، زۆر بە لامەوە گرنگ بوو، لە دڵی خۆم گوتم، چەند خۆشە مرۆڤ ئەو توانایەی هەبێت کە هەموو دنیا کەر بکات، لەو کاتە فڕۆکەیەکیدی وەك ئەوەی رۆژی هاتبێت، هاتە ناو سێرەوە، هاویشتمێ، مامۆستا هاواری کرد:

+ زۆری نەمابوو، بە بن باڵیدا رۆیشت، مەرجی پیاوان سێ جارە، دڵنیام ئەتو کەتەکت لە چاودایە و بە بڕنۆ سیخۆ دێخی.

- جاری سێیەم چرووك دەکات.

فڕۆکەکان دەتگوت گوێیان لەو قسەیەی مامۆستا لەشکری بوو، دەتگوت لە بڕنەوەکەی من ترسان! لە چاو تروووکانێك نە دەنگیان ما نە رەنگ، لە دووی خۆیان لەو درەنگانی بەهارە دۆڵێك چڕە دووکەڵیان بەجێهێشت، ئیدی ئەو چەند رۆژەی لەوێ مامەوە فڕۆکەم نەدیتەوە، مامۆستا لە سەر نانخواردنێ دەیگۆ:

بێ ترس نانی خۆتان بخۆن، ئەمن بزانم هەتا ئەو بڕنۆیە لێرە بێت، فڕۆکە پێ نانێتە ئاسمانی بالیسانەوە.

ئەو رۆژەی ماڵئاواییم لە بالیسان کرد، مامۆستا بە دەم پێکەنینە جوانەکەیەوە رووی قسەی لە من بوو:

مەڕۆ بابم مەڕۆ، ئەگەر دەشڕۆی بڕنەوەکە مەبە، بە خودای فڕۆکەکان بزانن بڕنۆ لێرە نەمایە، بە خواردن دەمانخۆن!

گاڵتەکانی مامۆستا خۆشبوون.

بالیسان بمێنی بەخێر، لای ئێوەم خۆش.

سەردەستەمان پیاوێکە مام رەسوولی دەڵێنێ، کەمێك چۆتە تەمەنەوە، پیاوێکە خەمی هەموو دنیای لەبەرە، بەردی سەر رێیان لادەدا، دەڵێت:

ئەو کەسەی لە دووی ئێمە دێت با ساتمەی لێنەکات.

لە شوێنی داروبار ئەو لقە دارانە دەشکێنێتەوە کە دەڵێی بە ئەنقەست ڕێیان گرتووە، دەڵێت:

دەترسم ئەو کەسەی لە دووی منەوە دێت، بکەوێتە خەیاڵەوە و لقە داری لە چاو ڕاچێت.

بگاتە هەر کانیەك تا جوان دەری نەدات و خاوێنی نەکاتەوە دڵی داناکەوێت، دەڵێت:

بۆ ئەوەی هەمیشە چیا بە ئاوەدانی بمێنێتەوە، دەبێت کانیەکان خاوێن بن.

دەگاتە هەر بەراوێك تەماشا دەکات، بزانێت تینووە یان نا، تا ئاو بەرنەداتە بەراوی تینوو، لە سەریشی دەی ناڕوات، دەڵێت:

ئەو بەراوە بە تەنێ هی خاوەنەکەی نیە، بەشی ئێمەشی پێوەیە.

پیاوێکە کۆتر و کێشکەی نەخۆش هەڵدەگرێتەوە و جێیان بۆ دەدۆزێتەوە، تووشی سەگێك بووین، لاکە لاکی بوو، مام ڕەسووڵ چنگێ ورتکە نانی لە کۆڵپشتەکەی دەرهێنا و لە پێش سەگە برسیەکەی ڕوو کرد، من قەت پیاوی وام نەدیوە، ئەو چیاو چۆڵەی بە گیانلەبەر و بێ گیانەوە بەماڵی خۆی دەزانی، خۆی بە بەرپرس دەزانی لە ئاستیان، دەبوو خزمەتیان بکات.

ئەو مام ڕەسووڵە لە ڕۆیشتنێ کەس نایگاتێ، لە هەورازان هەتا تۆ دەگەیتە نیوەی هەورازێ، ئەو گەیشتۆتە سەری سەرێ و هاتۆتەوە خوارێ و جارێکیدی وا لە پێش تۆوە سەردەکەوێتەوە، ئەو پیاوە هەمیشە چاوێکی لە ئاسمانە و چاوێکی لە عەرد، چاوەکەی ئاسمانێی تایبەتە بۆ فڕۆکە و ڕووداوەکانی ئاسمانێ، چاوی سەر عەردیشی بۆ هەموو ئەو کێشە و ڕووداوانەی لە سەر عەرد ڕوودەدەن.

ڕۆژ تازە هەڵاتبوو کە گەیشتینە سەر بەنی هەریرێ، پشوو، پشوو، پشووێکی باشمان دا، مام ڕەسووڵ لە سەر بەردێك دانیشتووە، بە

دووربینەکەی تەماشای دنیایێ دەکات، منیش لە لاوە لە سیمای ئەو پیاوە ئەفسانەییە رامـاوم، ئەگەر کەسێك بیەوێت سەرهاتەکانی ئەو پیاوە بنووسێتەوە، دەبێت خاوەن خەیاڵێك بێت لە ئاسمان بێ سنوورتر، چونکە ئەو پیاوە هێندەی من تێیگەیشتم پتر بە دیوی خەیاڵدا دەکەوێتەوە، چوومەتە ناو ریشە ماش و برنجیەکەی مام رەسووڵ، لە ناو مووی رەش و سپی بزر بووم، رەنگە خەویشم لێکەوتبێت، وشەی برنۆ بە ئاگای هێنامەوە، مام رەسووڵ گۆتی:

وە بزانم ئەو برنۆیەی لە کنە تووە، وەختی خۆی لە کنە من بووە.

لێی وەرگرتم و هەڵگێڕ و وەرگێڕی دەکرد و لێی ورددەبۆوە:

ئـا، بە سەهوو نەچوومە، ئەوە برنەوەکەی منە، ئاگـات لێبێت زۆر نازدارە، تەنها ئەمن دەزانم ئەو برنۆیە چەند گوللەی هاویشتیە.

دەمەو ئێوارە گەیشتینە نزیك گوندێکی دەو زێ، ئێمە مەنزلمان بادینانە، دەبوو لە زێ بپەڕینەوە، لەوێ تووشی دوو پێشمەرگە بووین، یەکیانم ناسیەوە، رەنگوڕووی هەر وەك خۆی بوو، چ نەگۆڕابوو، تەنها لە موو نەبێت، ئەودەمانێ سمێڵێکی رەش رەش لە قەتران رەشتر، ئێستا سپی سپی داو داوی رەشی تێدا ماوە، برادەری بابم بوو، من منداڵ بووم دەهاتە ماڵمان، هەر جارێك بهاتایە چوکلێتی دەداینێ، رەنگە بە هۆی چوکلێتەوە بووبێت خۆشم دەویست، یان بە هۆی ئەو رستەیەی باوکمەوە کە لە ئایەت راستتر وەراست گەڕا:

+ وەخت نیە، کورد ببێتە شتێك و لە کۆڵی شەڕ و شۆڕ و وێرانی ببینەوە؟

- هێندەی نەماوە، من دەڵێم ساڵێك، تۆ بڵێ چەند مانگێك.

+ بە خودای من بزانم ئەو منداڵەش دەچێتە چیا، کورد هەر دەست لە گونان دەمێنێتەوە ( ئەو منداڵەی بابم ئاماژەی پێدا من بووم.)

دوو سێ جار ویستم خۆم ئاشکرا بکەم، نەمکرد، راستی ناوەکەیم لە بیرکردبوو، دەنا خۆم ئاشکرا دەکرد، ئێستا و ئێستاش ناوەکەیم بیرنەکەوتەوە.

ئیدی مام ڕەسووڵ گۆتی:

ئیشی من لەگەڵەنگۆ تەواو، ئێستا لەو گوندەوە جاشێکی باش دێ، هەرچی گۆت بە قسەی بکەن، مەترسن لە خۆمانە.

هێمان ڕووناك بوو، مام ڕەسووڵ هەر چوارمانی دایە دەستی جاشانی دەڤەری سورچیاتی و خۆی و ئەو پێشمەرگەیەی لەگەڵی بوو گەڕانەوە، پێشمەرگەکەی گەلی (دڵە)یان دەگۆتێ، وا بزانم کوڕی تۆفیق هەریری بوو، تەماشای مام ڕەسووڵم دەکرد، هەر بە فڕین دەفڕی، دیارە پێشتر خاتری ئێمەی گرتبوو، گۆتمە سوورە:

+باشە چ ڕێیدی نیە بۆ بادینان، تەنها ڕێی جاشان هەیە؟!

- هەیە، بەڵام ڕێی جاشان لە هەموو ڕێیەکانیدی کورتترە.

+ ئەدی ناڵێن دوور بڕۆ سەلامەت وەرەوە.

- ترست نەبێت ئێمە ڕێی نزیك دەگرین و بە سەلامەتیش دەگەینە جێ.

لە دڵی خۆم دەمگوت، تووشی چ بووین، بە چ حاڵ لە دەستی جاشەکانی کەریم خان قوتاربووین، ئێستا وا بە پێی خۆمان دەچینە ناو جاشەکانی سورچیاتی، هێندەی نەمابوو، بڵێم: من لەگەڵ ئێوە نایەم و لەگەڵ مام ڕەسووڵ دەگەڕێمەوە.

بە تاریکی و بە گۆرانە ڕێیەکدا شۆڕبووینەوە بەرەو گوندی جاشان، وەك دەشیانگۆت نزیك گوندەکە ڕەش دەچێتەوە لە سەربازان، نیمچە سەربازگەیەك بوو، بەراستی من زۆر دەترسام، بە دەست خۆم نەبوو لە جاش دەترسام، بەڵام کاتێك تەماشای بەژنی پیرە بڕنۆم دەکرد، ترسەکەم بڕەك دەڕەویەوە، وەك ئەوەی بڕنۆ فریادڕەس بێت، وەك ئەوەی هەر بڕنۆ ڕاکێشم هەرچی جاش و سەربازی دەوریان داوم دەستی خۆ بەدەستەوەدان بەرز دەکەنەوە، ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەش بە دەستی خۆم نەبوو، ماڵە جاشەکە خزمەتێکی چاکیان کردین، کوڕێکی قسە خۆش بوو، ژنەکەی زۆر مێواندۆست، هەرچی هەیانبوو لە پێشیان داناین، لە ژوورەکە

برنـۆیەکی دار شووشـەیی بە دیـوارەوە هەڵواسـرابوو، گەلەك جـوان بـوو، دەتگوت ژنی ناو جامخانەیە، لە هی مـن گەلەك جـوانتر، بەڵام هـی خـۆم هێند لام شیرین بوو، خاوەنەکەی داوای گۆڕینەوەشی بکردایە نەمـدەکرد، پیاوەکە هەر چوارمانی نارده سەر بانێ، گۆتی:

نەوەك مێـوان بـێن، بـا نەتـانبینن، سـەر بـان باشـترە، بەڵام ئاگـادار بـن ملەقوتێ نەکەن.

سـەربانێکی گەورە، سـتارەیەکی بەرز، خـانووەکە لە خـانووی جـارانی گوندی نەدەچوو، شاریانە درووسـتکرابوو، ئێسـتا دوو چەکـدار (سـوورە و من) و دوو بێ چەك (دیار و هەنگـاو) لە سـەر بـانی مـاڵە جاشـێکی بـاش راکشاوین، چاوەڕوانی رۆژبـوونەوەین تـا لە زێـی بادینـان بپەڕینەوە، ئـێمە هەر سێکمان جگە لە سوورە لە مێژ نیە ناومان گـۆڕاوە، لە بەسـتی شـەرغە لە سەر دەستی خارەخولە ناوی خۆمان گۆڕی، شوان بووە دیار، فواد بووە هەنگاو، من لە خۆشەویستیم بۆ (کافکا)ی نووسـەر و لە خۆشەویسـتیم بـۆ باوکیشـم، ویسـتم یەکەم پیتـی نـاوی بـاوکم و یەکەم پیتـی نـاوی خـۆم لێکبدەم(ك.ك) و نـاو لە خـۆم بنێم(کافکـاف)، بەڵام خـارە خـولە بەو نـاوە رازی نەبوو، گۆتی:

تاهوو! کافکاف چیە؟ بەستی شەرغە و ئەو ناوە ئینگلیزیەیان گۆتیە!

کوڕێك کاوە چاوشـینیان دەگـۆتی، دەتگـوت قەڵەمە چ گۆشـتی پێـوە نەبوو، ئەویش لەو رێوڕەسمەی ناوگۆڕینە بەشداربوو،هەڵیدایێ:

لێیگەڕێ، حەزی خۆیتی، چ ناوێك هەڵدەبژێرێ، با هەڵبژێرێ.

خارە خولە بە پێکەنینێکی جوانەوە:

ئەح! لەو حەزە تەڕەماشیە.

منـیش قسـەی خـارەخولەم نەشـکاند - خـارە خـولە ئەفسـانەیە، لێـرە نـاگێڕدرێتەوە- هەر لە جێـوە نـاوە کـۆنە فرێـدراوەکەی دیـارم بـۆ خـۆم هەڵگرتەوە و شتۆکەکی زیادەشم لێ گرێدا و ناو بـووە (شـوانە)، هەر ئەو گۆڕینی نـاوەش بەو شـێوەیە حەمە عەباسـی زۆر مانـدوو کـرد، دەشـت و

چیاو دۆڵی پڕ کردبوو لە بانگەوازی کافکاف، کەس کەسی بەو ناوە نەناسیبوو، پێشتر بە حەمەم گوتبوو، ئەگەر هاتیە چیا، بە کافکاف بمبینەوە.

لە ترسا خەوم لێنەدەکەوت، زراوم لە جاش چووبوو، ئاخر هەرچی خراپە هەیە لە جاشەوە سەری کردووە، رەنگە ترسەکەم پتریش لەو رووداوەوە هاتبێت کە لە کاتی بە چیاکەوتن روویدا، لەگەڵ ئەو هەنگاوەی کە ئێستا لە تەنیشتم پرخە پرخیەتی، کەوتینە دەستی جاشانەوە، لە نزیکی دێگەڵە دۆڵێك هەیە، لە سەر قسەی هەنگاو ئەویش لە سەر قسەی کەسێکیدی هەر کەسێك بگاتە ئەو دۆڵە وای دانێ گەیشتۆتە ئاقاری پێشمەرگە.

ئێمە گەیشتینە ئەوێ، هەر هێندەمان زانی لە بەرزاییەکەوە دوو چەکدار دەنگیان داین، تێگەیشتین کە جاشن، چونکە بەو نوێژی نیوەڕۆیە هی ئەوە نیە پێشمەرگە وا بێ منەت بسووڕێتەوە، هەتا گەیشتنە لامان من هەر هێندەم بۆ کرا، ئەو نامەیەی کە لە رێکخراوی شارەوە هێنابووم، بۆ ئەوەی باوەڕمان پێبکەن کە پیاو خراپ نین، خستمە بن بەردێکەوە، لە بەینی خۆشمان قسەیەکمان رێکخست کە بیلێینەوە، قسەکە فواد رێکی خست و گوتی:

من دەزانم ئەو جاشانە زۆر رقیان لە یەکێتی دەبێتەوە.

ئیدی راپێچیان کردین، یەکیان چووبووە تەمەنەوە بڕنۆی لە شانی بوو، وام هەستکرد بڕنۆکەی بابمە لە بن گولەکان دەریهێنایە، رەقەڵە بوو، دەتگوت نانی جاشایەتی لێناکەوێت، دەیگوت:

ئەها، داخوا چ کەتنێکتان کردووە و دەڕۆنە ناو جەلالیا، ئەو تەقانەی ئەو ماوەیە شەوان لە ناو هەولێرێ دەکرێ، ئەنگۆنە، باشە لە هەقتان دێین، ئێستا دەتاندەمە دەستی ئەمن.

سێ چوار جاشیدیش گەیشتن، هەر زراومان چوو، کاتێ تەماشای ناسنامەکەی منی کرد، پیشانی ئەویدی دا، بە خۆی دیار بوو خوێندەواری نەبوو:

ئەوە قوتابیی زانکۆشی! ئەو خۆ پیشاندانانە هەمووی لە بن سەری ئێوەیە، لە چاوت دیارە تۆ پیاوکوژەکی پیسی.

منیش بەستەزمانانە گوتم:

بە خودای لە تەمەنی خۆم تەقەیەکم نەکردووە.

خەریکبوو پەلامارم بدا:

ئەتو تەقەت نەکردووە! وەڵا ئەگەر دەستت دەگاتە ئەو کلاشینکۆفەی من، هەموومان کەلەپاچە دەکەیت!.. باشە باش ئەنگۆ ئەگەر ناچن بۆ ناو پێشمەرگەی خائین، بۆ ناو جەلالیا، ئەدی کێوە دەچن؟

ئێمەش بێ ئەوەی یەك وشەش پاش و پێش بکەین قسەی خۆمان دەگوتەوە:

ئامۆزایەکمان، کەوتیتە دەستی جەلالیەکان، دەچین بزانین، بۆ گرتوویانە، بە چی بەری دەدەن.

فشەیان بەو قسەیە دەهات، بەڵام ئێمە بەردەوام و بێ زمان تەتەڵە کردن دەمانگوتەوە.

ئێمەیان نزیکی جادە کردەوە، سووربوون لە سەر ئەوەی رادەستی ئەمنمان بکەن، ئیدی کەوتینە پاڕانەوە، هەرچی وشە هەیە کە پاڕانەوە دەگەیەنێت، دەمانخستە رستەی پاڕانەوەیی، ئەو جاشانە دڵیان نەرم نەدەبوو، نەدبوو، قەت نەکەوتبومە باری پاڕانەوە، هەمیشە رقم لە پاڕانەوە بووە، لە فیلمەکان کاتێ پیاوێکم دەدیت دەپاڕایەوە، لە دڵی خۆم هەزار قسەم پێی دەگوت، دەمگوت، پیاو بکوژرێ بەڵام نەپاڕێتەوە، کەچی ئەوەتا وا خۆم لە جاشی پوشت دەپاڕێمەوە، ئەو جاشانەی ئەگەر ئێستا لەو سەرەوە دوو تەقەیان لێبکرێ، کلکیان دەخەنە گەلۆزیان و هەڵدێن، لە بیرمە لە هونەری پاڕانەوە فواد لە من هونەرمەندتر بوو، پاڕانەوەکانی کاریگەرتر بوون، دیتم هەندێك لە ئێمەوە دوور کەوتنەوە و سەریان لە بن گوێی یەکتر نا، لە دڵی خۆم گوتم بە خودای لە ترێ سەی چووین، ئەوی مەیلەو بەختیارەکە گوتی:

ـشە لە راهی خودای بەرتان دەدەین، بەڵام دەبێت، نەگەڕێنەوە بچنە ـو پێشمەرگان.

ئێمە گۆتمان:

ناوەڵلا دەچینەوە ماڵێ.

ئەوان سووربوون لە سەر ئەوەی کە ئێمە دەبێت ڕێی پێشمەرگایەتی بگرینە بەر و ئێمەش سووربووین لە وەی بە ڕێی ماڵەوەدا بگەڕێینەوە، هەتا ئاخیری یەکیان بە تووڕەییەوە گۆتی:

دوو ڕێتان لە پێشە، یان ڕێی پێشمەرگان، یان ڕێی دایەرەی ئەمن.

من بە هێوری بە فوادم گۆت:

+ کوڕە دەبا سەرکەوین، بەڵکو بە راستیان بێت و وازمان لێبێنن!

- کوڕە، وس بە ئەوە نەڵێی، بە خودای وا بکەین دەمانکوژن.

ئەوان زۆریان گۆت و ئێمە زۆرتر، ئەنجام قسەی ئێمە سەر قسەی ئەوان کەوت، وەکو پیاوان لە سەر جادە ماشێنێکیشیان بۆمان راگرت و بەرەو هەولێر هاتینەوە، وا بزانم جاشی ماڵی کەریم خان بوون، راستی ئەوان دڵنیا بوون لەوەی ئێمە بە نیازی بوونە پێشمەرگە ئەو دۆڵەمان گرتبووە بەر، بەڵام لە پیاوەتی خۆیان بەریاندایین، ئیدی دوای دوو رۆژ بە ڕێیەکیدی بە چیا کەوتینەوە.

وەك لە بیرم بێت ئەو شەوە لە سەر بانی ئەو ماڵە جاشەی دەو زێ لە ترسا خەو نەچووە چاوم، لە سەر جێ هەر گینگلم دەدا، حەزمدەکرد، هەستم و هەندێ راوێچکەبکەم، نەدەوێرامك ئەو شەوە دەتگوت بە مەڕبەند بەستراومەتەوە.

دەمگوت ئێستا نا ئێستا دەورمان دەدەن، هەندێك دڵم بە بڕنۆ خۆش بوو، نزام دەکرد چرووك نەکات، ئاخر دامنابوو لەوکاتەی دەقەومێ خۆم رادەستیان نەکەم و تەقە بکەم، هەتا نەشقەومێ دیار نیە هەڵوێستەکە چۆن دەبێت، کێ ناڵێ وەك ((پاڕانەوەکە)) ناکەوێتەوە، رۆژ بۆوە، هیچ نەقەوما،

نان و ماستێکی زۆر بەتامیان خوارد، قەت چای وا خۆشم نەخواردبۆوە، رووی ژنەکە سوور بێت بە زۆری چای دەرخوارد دەداین.

مالاوا ئامۆکان، مالاوا مالە جاش.

با برۆین، هەر دوو خەریتەم بەست و برنۆم کردە شانی، بە خۆم نالێم، هەموو دەیانگۆت جوانت لێدێ، جاشەکەش وای گۆ، سواری ماشێنێك بووین، زراوم لەو جۆرە ماشێنانە چووبوو، (لاندکرۆزەر) من ئەوە جاری دووەممە پێ بخەمە ناو ئەو جۆر ماشێنەوە، جاری پێشی یەك دوو ساڵێك بەر لە ئێستا لەگەڵ ئەو کوڕەی ئێستا لەگەڵمە و ناوم بە ناوی ئەو کردۆتەوە، لە هەولێرێ، لە پێش یانەی مامۆستایان، لەو بەری، لە بن دارە گەورەکە لە سەر شۆستە بە نیازی پشوودانێکی کورت دانیشتبووین، ئەو دارە گەورەی دەڵێم لە هەموو جێیەکی هەولێرەوە دیار بوو، هیچ بەرزیەك لە شار هێندەی وی بەرز نەبوو، زۆر لە منارەی چۆلی بەرزتر خۆی نیشاندەدا، هێندەمان زانی ماشێنێکی وەك ئەو ماشێنەی وا جاشێك دەیهاژوا و ئێمەش وردتر بڵم من دەستم لە سەر دڵمە، لە بەر دەممان ئیستۆپێکی هێند توندی کرد نەك هەر من و دیار درەختی گەورەش هێندەی لە خۆ هەڵدا، دوو چەکداری جلك زەیتوونی غاریان داینێ و بێ چەند و چوون هەڵیاندراینە ناو ماشێنەوە، ئەو دوو پیاوە هێندە بە هێز و بە خۆوە بوون، دەتگوت دوو مریشکیان تێهەڵدا، برۆ برۆ، خۆمان لە ژوورێکی پۆلیس دیتەوە، دەیانویست هۆی دانیشتنی ئێمە بەو دەمەو نیوەڕۆیە لە بن ئەو دارە بزانن، ئەو دارەی زۆر جار پەڕە کاخەزی قاچاخی پێوە هەڵدەواسرا، ئێمەش بۆچی و چۆن بوو وامان گێڕایەوە:

لە بازاڕەوە دەگەڕاینەوە، ماندوو بووین، پشوومان دا...

باوەڕیان نەدەکرد، هەڕەشەیان کرد، ترسی گەورەیان نیشان داین، بەڵام ترس وای لێنەکردین درۆ بکەین، چیمان گوتبوو هەر ئەوەمان دەگۆتەوە، دوای هێشتنەوەیەکی باش، بەرەڵایان کردین، گوتیان:

جارێکیدی لە بن ئەو دارە و شوێنی ئەوهاتان نەبینینەوە.

هەتا ماوەیەکی زۆر نەك هەر دارەکە شەقامەکەش منی نەدیتەوە.

گەیشـتینە بـازگەی دەو زێ، نـازانم دڵـم لە چەنـدی لێـدەدا، کە چەکداری بازگەکە لە لای شوفێرەوە سەری بە ژووریدا کـرد، بـڕنەوەکەم خستە پەناوە، بۆ؟! لە جێی خـۆم وشـك بـووم، گـۆتم، تەواو، تـاهوو، وەه، بـرادەری شـوفێرە جاشـە خانەخوێکەمـان بـوو، جگەرەیـان پێشکەشـی یەك دەکـرد، لە سـەر ئـاوێ دابەزیـن، سـواری بەلەم بـووین، ماڵئاواییەکی زۆر گەرممان لە جاشەکە کرد.

لەو بەر جاشـێکیدی، نـاك دوو چاوەڕوانیـان دەکـردین، سـواری قەمەرەیەك بووین، بڕۆ بڕۆ، بە ڕێی خۆڵدا تۆزێ بکە، گەیشتینە گوندێکی بـن چیـا، لە مـاڵێکی لاپەڕگە دابەزیـن، دیـار بـوو نەیاندەویسـت کەس بمانبینن، نیوەڕۆیە ئەو ماڵەش جاش بوون، خواردنێکی باشیان داینێ، زۆر خزمەتیان کردین، ئێرە هەر دەڤەری سوورچیاتیە واتە لە دەستی جاشێکی سوورچی بۆ دەستی جاشێکی سوورچی، تا ئێـوارێ لەوێ مـاینەوە، سـەرم نایە بن گوێی سوورە:

+ بە من ناڵێی کەنگی لە ئاقاری جاشان دەردەچین؟

- هێشتا مایە، نزا بکە هەر دەرنەچین، لەو لا ئەو خواردنە خۆشە هەیە! کوڕە ترست نەبێت، ئەوانەی ئێمە دەستاودەست دەکەن هەر بە ناو جاشن، دەنا لە خۆمانن.

ترسم نەمابوو، خەویشم دەهات، ڕاکشام، لەگەڵ بڕنۆ نووستم، وەختـی ڕۆژئاوابوون بە ئاگایان هێنـام، نانمـان خـوارد و بەڕێکەوتـین، جاشـەکەش لەگەڵمـان هـات، لە هەورازەکە سـەرکەوتین و شـۆڕ بـووینەوە، بـڕۆ بـڕۆ، تووشی چەند ماڵێك بووین، ئەوانیش جاش بوون، سوورە سەبرۆکە بە منی گوت:

ئاقاری جاشان لە پشت ئەو ماڵانەوە کۆتایی دێت.

شەوەکەی لەوێ ماینەوە، هێشتا ڕۆژ لە هیچ جێیەکی چیا هەڵنەهاتبوو، بە چیـای کـۆرس هەڵگەڕایـن، ئـۆخەیش خـۆ لە مەملەکەتـی جاشـان

دەرچووین، گەیشتینە چیای پیرسیش، لە پشوویکدا نیشانەیەکم دانایەوە، بەردیکی رەش، زۆر گەورە نەبوو، تەواویك دووریش، هاویشتمێ، ئاگرم لە بەرد بەردا، زۆر کەیفم پیهات، چوومە سەری، بەرد قرنجانیکی جوان قرنجا بوو، ئەوە سییەم تەقەی من بوو، لە دووەکەیدی پتر چیژم لەوەیان وەرگرت، رەنگە ئەوە دوا تەقە بووبیت کە چیژی بە من بەخشی بیت، راستی لە چیاوچۆلان ژیان لەگەڵ برنۆ خۆشە، ئیستاش بۆم بلوێ ساڵی چەند هەفتەیەك برنۆ لە شان دەکەم و دەچمەوە چیا، دیارە جگە لە مار تەقە لە هیچ گیانلەبەریك ناکەم، بۆ خۆم نیشانان دادەنیمەوە و فیشەکان دەهاویم، حەزدەکەم نیشانەکەش جگەرە بیت.

تا لە پیرسەوە دەگەیتە گارە چەند گوند داتدەکات، چەند کانی ئاوت دەدات، چەند جۆگەلەی بەهاری ریت پیدەگریت، لە ترسی فرۆکە و کۆپتەر خۆت دەخەیتە پەنای چەند بەردەوە، هیندە سەرهاتەم لە سەرییە، بەڵام کەم، زۆر کەم برنۆ لەو سەرهاتانە خۆی دیاردەخات، بۆیە هەتا گارە راناوەستم، لەویش دەچمە ئەو بارەگایەی لە نزیك کانیەك هەڵیدا بوو، خەڵکی گوندی کافێ و یەکماڵە بەو کانییەیان دەگۆت (کانی توبە)، ئەو دەمەی بۆ یەکەم جار ئاوی کانی توبەمان خواردەوە، وەرزی کەپران بوو، من کەپرێکی گچکەم لە جیگەیەکی وەها چیکرد بە سەر هەموو کەپرەکانی دیدا دەیروانی، هەر دەنگی فرۆکەش دەهات یەکسەر برنۆم سوار دەکرد، بەڵام وا نەکەوتەوە بیهاویژمە فرۆکە.

رۆژیك عیسا عەسکەر، کە عیسایەکی خەڵکی عەنکاوە بوو، پیدەچوو لە هەموو عیراقیان عیراقیتر بیت، ناوی لە خۆی نابوو خەیری عیراقی، بەڵام کەم کەس بەو ناوە بانگیان دەکرد، هاتە بن کەپرێ، ئەو عیسایە بەرپرسی سەربازیی ئەو بارەگایە بوو، برنۆکەی لیوەرگرتم و گفتی دا کە کلاشینکۆفێکی باشم بداتێ، گفتەکەی خۆی بەجیهینا، یەکلاقیکی باشی دامێ، بەڵام من دڵم هەر لە کن برنۆ بوو، لە پاش برنۆ چاوم بە هیچ چەکیك هەڵنەدەهات. چەندی دەمکرد حەزم نەدەچووە کلاشینکۆفێ،

زۆرم خەم بۆ برنۆ خوارد، رەنگە بابیشم کە بە برنۆکەی نەکەوتەوە هەر هێندەی من سوێی لێبوو‌بێتەوە، لەوێ بڕیارم دا هەر کاتێك بابم دیتەوە، سەر هاتی برنۆکەی خۆمی بۆ بگێڕمەوە.

رۆژێك ئەو عیسایە هەر سێکمانی بردە دووری بارەگا تا هەندێك مەشقی چەکمان پێبکات، لە بیرمە بەر لەوەی بۆ بارەگا بگەڕێینەوە نیشانەمان دانایەوە، من لە هەمووان جوانتر هاویشتمە نیشانێ، خەیری عێراقی گوتی:

+ وا دیارە تۆ زۆرت تەقە کردووە و زۆرت نیشانە داناوەتەوە.

- لە تەمەنی خۆم سێ فیشەکم هاویشتووە، ئەویش بەو برنۆیەی تۆ لێت وەرگرتمەوە، دوویانم هاویشتە فڕۆکە، سێیەمیان بۆ بەردێکی رەش.

+ ئەو دەست و نیشانەیە هی دوو سێ فیشەك نیە.

- جاشەکەش باوەڕی نەدەکرد تەقەم نەکردووە.

+ جاشەکە کێیە؟

_ لەوەی تەنیشتت بپرسە.

هەوکە هەر لێرە دەبێ هەنگوین و ژەهرەکە تامبکەم، بەڵام بەر لەوە هەواڵێکی لە ژەهر تاڵترم پێیە، نازانم ساڵی چەند ولە کوێی ساڵ و لە کوێی ئەو جێگەیەی کە کانەبی گچکە بە گووی سەی بانگی کردم و برنەوێکی دامێ، خەریکی خاوێنکردنەوەی کلاشینکۆفەکەم بووم، هەواڵێکی تیژ هات تیژتر لە گوللەی برنۆ بە بن گوێمدا گڤەی کرد، کلاشینکۆفەکەم بە پیسی کردەوە شانم و یەك پێ بە دووی هەواڵەکە کەوتم:

دەستی غەدر و خیانەت گەیشتە گیانی کانەبی گچکە

پێشمەرگەیەك نازانم کێ شینەی دەڵێنێ، دەستی لەگەڵ حکومەت تێکەڵ کردووە، دەڵێتە حکومەت:

چت لۆ بینم بە دیاری؟

حکومەت دەڵێتە شینە:

ئەوجارە سەری کانەبی گچکەم دەوێ؟
شینە لە وەڵامدا دەڵێ:
لەوە ئاسانتر نیە، چونکە زۆر برادەرمە، تفەنگی لە سەر سەری رابگـرم هەر وا دەزانی گاڵتەی لەگەڵ دەکەم و دەڵێ:
گووی سەی، لایدە، ئەوە گووی گەمان نیە.
چۆنیەتی کوشتنەکەش چیرۆکێکە دەڵێن شینە بۆ کەسی نەگێڕاوەتەوە.
بە بیستنی مەرگـی کـانەبی گچـکە دڵـم تەپ تەپ بـۆ برنـۆ لێیـدەدا و گوتە ترسناکەکەی سوورەم بیرکەوتەوە ئەوەی لە بارەی برنۆوە کردی.

## پێکەنینیٚ ژەهر
## پێکەنینیٚ هەنگوین

دێرەش لەوەتەی هەیە خۆی لە بن گەردنی گارە شاردۆتەوە، تا دەیبینیەوە دەبێت پرسیار لە چەندان نیشانەی عەردی و ئاسمانی بکەیت، تا دەیگەیتیٚ سەدان هەوراز و نشێو بەرز و نزمت دەکەنەوە، هەزاران بنە دار و تیشە بەرد دێتە رێت، دەیان جۆگەلە و چەم رێت پێدەگرن، خۆ ئەگەر لە زستانیٚ رێت بە رێی دێرەش بکەوێت، بەفر کارێکت پێدەکات، خۆزگە بە برایمی مەلا زێتدینان بخوازیت، زستانی دێرەش زستانێکە لە زستانی هەموو جێیان سپیتر، لە هی هەموو جێیان ساردتر، ئەو رووسیا و سیبیریایەی یەکەمیان لە سپیتی و ساردی دووەمیان لە ساردی و ساردی لە کتێبان خوێندوومانەتەوە، سپیاتیی و ساردیی خۆیان دوو قاتیدیش سپی و ساردتر بکەنەوە، ناگەنە سپیاتی و ساردیی دێرەشی گارە، شەوانی زستانی دێرەش قەت تاریکایی بە خۆیەوە نەدیتووە، هەمیشە رووناك رووناك وەك چراخان رووناك، جگە لە زستانەکەی، بەهاری دێرەشیشم دیتووە، بەڵام کاری رێککەوت وا نەکەوتەوە پایز و هاوینەکەی ببینم، بەهاری دێرەش بەهارێکە هیچ کوێستانیٚ لە هیچ وەرزیٚ لە وەرزە کەسکەکانی خۆی ئەو کەسکاییەی نەپۆشیوە کە دێرەش لە بەهاراندا دەیپۆشیٚ، هیچ کوێستانیٚ ئەو تەڕیەی بە گیانی کۆچەریان نەپژاندووە کە بەهاری دێرەش چۆڕ چۆڕ رژاندوویەتیە گیانی منەوە و تا ئێستاش دوای رەتبوون بەو هەموو وشك و برینگیەی ژیان هێشتا بەهاری دێرەش لە گیانی من هەر تەڕە و چکی نەکردووە.

ئومێد، تاقانە براکەی چەند خوشکان لە بیرمە لە بارەی دێرەشەوە دنیایەك قسەی لە زاری بوو، جارێك هێشتا من دێرەشم نەدیتبوو، ناویشیم نەبیستبوو، بە وشەی کوردی بەڵام بە گرامەری نازانم چ زمانێك، عەرەبیش نەبوو، گوتی:

گوند، جوانترین لە دنیا، دێرەش، بەهار دێرەش جوان لە زستان، زستان جوانتر لە بەهار، هەموو جوان، هاوین، بایز، سپی لە کەسك جوان، کەسك سپیتر.

ئومێد بە عەشق عەشقی وەرزەکانی دێرەش بوو، لە هەر کات و جێگەیەك جوانیی جێیان بهاتایەتە ناو قسانەوە، ئومێد یەکسەر چوار وەرزەی دێرەشی دەکردە بووکی قسان و جوانیی دێرەش نموودی جوانیی هەموو جێیانی دەبرد، لە بیرمە (ئەبوو)یەکی کورد ناوەکەی وا لە سەر زارمە، قسەی هێنابووە سەر بەهاری گوندێگی رووسی، دیاربوو خراپ کەوتبووە ژێر کاریگەریی جوانیی گوندەکە و دەیویست هەرچی وشەی جوانی هەیە بۆ نیشاندانی گوند لە شێوەی شنەبای بەهاری ئەوێ بە گوێماندا بپژێنێ، کەچی چەندی دەیکرد ئەو شنەبای وشەیە لە زاریەوە هەڵنەدەکرد، ئومێد لەوە یارمەتیدا، گوتی:

گول(بلێ) وەك دێرەش.

زوو تێگەیشتم کە ئەو ئەبووەی جوانیی گوندەکەی رووسیا لێیدابوو سەبارەت بە کچە رووسیەکەوە بوو، بەڵام لە جوانیی دێرەشەکەی ئومێد چەندی گەڕام چ کچم نەدیتەوە، دووریش نیە کچە لە پێکەنینەکەی ئومێد خۆی شاردبووبێتەوە و نەهاتبێتە نیگای منەوە، جارێك لێیم پرسی:

هەبێ نەبێ لەو دێرەشە کچێکی چاو بەهاری و روومەت بەفری هەیە، وا نیە؟

پێکەنینێك پێکەنی، دێرەش و کچ و پرسیاری لە بیرمبردەوە، ئای ئومێد چ پێکەنینێکی ناسك و شیرینی هەبوو، لە ساتی ناشتنی ئازیزانیش لەو پێکەنینە زویر نەدەبوویت، حاجی جەمالێك هەبوو ساڵی چەند رۆژێك زۆر

بە جـوانی لە جـوانی دەدوا، رۆژێـك لەو رۆژە جوانـانەی سـاڵ رایەڵـی جوانیی گەیاندەوە پێکەنینەکەی ئومێد و گوتی:

خودا هەندێ جار ئیشی زۆر لەجێ دەکا، باش نەبوو ئەو ئومێـدەی بەو پێکەنیـنەوە بە کچـی نەهێنـایە ناومـان، دەنـا هەمومـان لەو دۆڵە شـێت و سەرگەردان دەسوورِاینەوە.

ئەو دۆڵەی حـاجی جەمـالی چەنـد رۆژێـك جوانـاس، لێیەوە عەشـقی خۆی بۆ پێکەنینەکەی ئومێد دەربڕی، کـانیەکی جـوان وەك پێکەنیـنەکەی ئومێـد جـوانی هەبـوو، ئـاوێکی لەبەر دەڕۆیشـت دەتگـوت پێکەنیـنەکەی ئومێدە، کانی بە (کانی توبە) ناسرابوو، کەوتبـووە نێـوان گونـدی کـافێ و یەکماڵە، لە یەکماڵەوەش دەبوایە چەند دەمژمێرێك بڕۆی ئۆجـا دەگەیشـتیە دێرەشی ئومێد، مـن درەنگـانی بەهارێـك ئومێـد و کـانی تـوبەم بە یەکەوە ناسی، لە تەنیشت یەکەوەم ناسین، بەڵام ئەوە دێرەشی سپیە بە درێژایی ئەو هەموو وەرزە سپی و زەرد و سەوز و رەشە ئومێدی بە سەوزی و ئاوداری لە یادەوەریمدا هێشتۆتەوە، ئومێدیشە دێرەشی بە کراسی سـپی بـووکێنیەوە لە ناو بینایيمدا داینیشـاندووە و تەمەنێـك لە دووکەڵ بـزری ناکـات، دوای ئەو هەموو ساڵە ئەوەتە ئومێد بەو پێکەنینەی کە لە هی کەس نەدەچوو، لە ناو دنیایەك پێکەنین دەناسرایەوە، دێ و دەستم دەگرێ و دەمبـاتەوە کـانی توبەی یەکتـر ناسـین و لەوێـوە بـۆ دێرەشـی سـپی و پەڕیـنەوە بە جـادەی مەرگ و گەیشتن بە (زارگەلی)ی پشوو، بڕۆ بڕۆ تا دەگەیتە ئەو چیایانەی کە جەندرمەی تورك دەهاتنە ناو دووربینەوە.

هەر وا دەزانـــم دوێنێـــیە دارەڕای کەپـــرم دەکـــرد، لە کەپـــرە تەواونەکـراوەکەی (ئەبـوو دڵشاد)یشـەوە مـحەمەد جەزا تێیهەڵکردبـووە گۆرانی، وا دەزانم ئێستایە گۆرانییەکە شیعری هێمن بوو ئەوەی دەڵێ:

لێرەش لە نێو ئەو لێڕ و شاخ و بەردە.

لێرەش لەگەڵ ئەو هەموو داخ و دەردە

........ .

لێرەش لە نێو زەبر و زەنگی زاڵمدا
لە نێو ساچمە و دووکەڵی ناپاڵمدا

---

لێرەش لە نێو شەپۆلی خوێن و کەفدا
لێرەش لە نێو مەتەریێزی شەڕەفدا
خۆشەویستم، لە بیرمناچی تاوێ
دەمفڕێنێ باڵی خەیاڵم تا وێ ...

ئەبوو دڵشاد شەو و ڕۆژ ئەو گۆرانییەی لێدەدا، زیندانییەك ناوی ئەحمەد بوو دەیگۆت، بە ئەبوو دڵشادی دەگۆت:

پارەی تۆ هەر بۆ پاترییە.

چەند جارێك بە چاوی خۆم چاوی پڕ لە فرمێسکی ئەبوو دڵشادم دیوە، بە دیار ئەو گۆرانیەوە ورد ورد فرمێسکی هەڵدەوەراند، گۆرانیەکە چەندان جار منیشی گریاندووە، جا کێی نەگریاندووە! بەردی دەخستە باری سۆزەوە، ئێ، لەو ساتانەی کە من سەرگەرمی دارەڕا بووم و کەوتبوومە ناو گۆرانیەکەشەوە، حەمە جەزا گۆرانیی دەگوت، ئەبوو دڵشادیش ڕەنگە لەو ساتە فرمێسکی باراندبێت، پێکەنینێ لە کاری کردم و لە گۆرانییەکەشی هێنامە دەرێ، کەس نیە گوێی لە چەندان پێکەنینی ناسك و خۆش نەبووبێت، منیش وەك تۆ و ئەو خەڵکە، بەڵام ئەو پێکەنینە جیایە لە هەموو ئەو پێکەنینانەی بیستبووم و دواتریش بیستمن و ئێستاش دەیانبیستم، زوو بووە برادەرم.

ئومێد دەموچاوی هەمیشە لە باری پێکەنیندا بوو، هەمیشە ئامادەبوو بۆ پێکەنین، چەندی تەماشام دەکرد لە سیمایدا منداڵێکم دەدیتەوە، ئەو کوڕە لە سیمایدا منداڵی وەك خۆی هێشتبۆوە و گەورەی نەکردبوو، سمێڵەکەشی لەدەستکرد دەچوو، خوێنەر بوو، زۆری دەخوێندەوە، زۆر حەزی لە گەڕان بوو، ئەگەر بڵێم گەڕۆکترین پێشمەرگە بوو مەڵێن درۆیە، بە بەرپرسی بارەگای گۆتبوو:

هەر دەرچوونێك هەبوو، من یەكەم كەسم.
دەیانگۆت گۆتبووی:
حەفتەیەك لە سەر یەك لە بارەگایەك بمێنمەوە، گوللەیەك دەنێم بە هەنیەی خۆمەوە.
هەر چەندە خەڵكی بارەگای كانی توبە بوو، بەڵام كەم بەوێ دەكەوتەوە، كەممان دەدیت، لە سەر هەندێ، من لە دڵی خۆم ناوم نابووك پایزە برا، هەر جارێكیش ئەو پایزە برایە، بهاتایەتەوە چەند كتێبێكی دەهێنا، لە بارەگاكانیدیكەوە دەیهێنا، چەندان جار كتێبی بۆ من هێناوە، ئەو كتێبگێڕە لە نێوان بارەگاكان كتێبی دەگێڕا، ئەگەر كتێبێكی دیاریكراو تەنها لە یەك بارەگا هەبایە، ئەو كتێبە لە ڕێی ئەو ئومێدەوە دەگەیشتە هەموو بارەگاكانیدی، هیچ خوێنەرێك لێی بێ بەش نەدەبوو، كۆڵەپشتەكەی ئومێد هەمیشە پڕ لە كتێب بوو، ئەو كۆڵەپشتەی هەموو گارە و دەڤەری گارە، هەموو مەتین و دەڤەری مەتین، هەموو خواكورك و ... هەموو چیاو چۆلی بادینانی دەكرد و لە پڕ دەگەیشتەوە كانی توبە و لە پێش هەمووان لە پێش من دەكرایەوە و بە دڵی خۆم كتێبم هەڵدەبژارد، جارێك رستەیەكی گوت، ئێستاشی لەگەڵ بێت ئازارم دەدات:
وا بزانم تۆ منت هەر بۆ كتێب دەوێت!
ناهەقی نەبوو ئەو قسەیە بكات، ئاخر هەر دەگەیشتەوە بارەگا، هێشتا ماندوویێتی نەحەسابۆوە، من پرسیاری كتێبم لێیدەكرد.
گەلێ گۆتەی ئومێد تا ئێستاش بە ئاوازەی خۆیەوە لە گوێمن و ناوە ناوە بە هۆی تەلی یادێكەوە دەزرینگێنەوە، پێش نیوەڕۆ بوو یەكێك لە زیندانیەكان وا بزانم حەمە ئەبوو شواربیان دەگۆتێ، لە كاتی ئێشكگریی ئومێد لە نزیك تەندوورەكە خەریكی دارشكاندن بوو، دەنگی تەورەكەی شاخە و شاخ دەڕۆیشت، دووكەڵی تەندوور گەیشتبووە ئاسمانێ و ئەبوو دڵشادیش هاواری لێ هەستابوو:
زوو ئەو دووكەڵە تەواوكەن، نەوەك فڕۆكە...

لەو کاتە دووکەڵاوی و تەوراوییە ئومێد بە کوردیە دووکەڵاوییەکەی گۆتی:

- دەزانی شەرم دەکەم ئێشکگری لەو پیاوە بگرم!

+ بۆچی؟

- تۆ نایناسی، ئەوە ئازاترین پێشمەرگە بوو، ئێستاش مەبەستی بێت، زیندان دەشکێنێ و دە چەك بەدەستی وەك من و تۆ قۆڵبەست دەکات، بداتە ملە فیلیش دەرۆستی نایێ.

+ لە سەر چی گیراوە؟

- وا بزانم هیچی لە سەر ساخ نەبۆتەوە، نازانم بۆ بەرەڵای ناکەن!

بەر لەو قسەیەی ئومێدیش ئەو پیاوە زیندانییە سەرنجی منی راکێشابوو، بە تایبەتی رۆیشتن و سەرهەڵبڕینەکەی، ئەو کاتانەی دەرگای زیندانیان لێدەکردەوە و دەهاتە دەرێ و رێیدەکرد، دەتگوت سەرکردەی سەرکردانە و کەس باوەڕی نەدەکرد ئەو پیاوە زیندانی بێت، بەردەوامیش بە بەرزاییدا دەیڕوانی، چاوی لە لووتکە بەرزەکان نەدەکردەوە، جارێك نەمدیت سەر نەوی بکات و تەماشای عەرد بکات، هەتا لە کاتی دارشکاندنیش هەر چاوی لە ئاسمانێ بوو، پیاوێکی ئاسمانی هەڵکەوتبوو، رێك لە هەڵۆی شاخان دەچوو، دەتگوت بۆ خاترانەش ئاشنایەتی لەگەڵ زەوی نیە، دەستێکی هەر بە سمێڵییەوە بوو، لێنەدەبۆوە، سمێڵیش چ سمێڵ! بە قەد سێ سمێڵی مەکسیم گۆرگی دەبوو، زۆر جار لە کاتی دارشکاندنیش دەستی لە سمێڵی نەدەکردەوە، بە یەك دەست تەوری رادەوەشاند، ئەو پیاوە کەڵەگەتە زۆر بەهێز دیاربوو، بە دەستێك چواری وەکو منی تێهەڵدەدا، من رۆژ بە رۆژ خەفەتم بۆ ئەو پیاوە زیندانیە دەخوارد، خەفەتم بۆ ئەو ئەسپە سەرکێشە! دەخوارد، هەر بە راستی هەندێ جار لە دیدی منەوە حەمە زیندانی لە شێوەی ئەسپێکی سەرکێش خۆی نمایشدەکرد، ئەسپێکی کێوی، ئەسپێکی یاخی، ئەسپێکی بە فرتوفێڵ گیراو، پیاوێك بوو

گران، زۆر گران، زۆر جیا بوو لە بەندیەکانیدی، ئەودەمانێ لەوێ چوار پێنج بەندی هەبوون: ئەحمەد عەوێنە، ئەبوو جەمیل، زەردە...

ئەو ئەسپە یاخیە ئەو هەڵۆ شاخیە، بڕیاریدابوو دەستەمۆ نەبێت، دەستەمۆ نەبوو، زیندان کەمۆی نەکرد، لە کەس نەدەترسا، منەتیشی بە کەس نەبوو، تا سێ جاریش سەلامت لێنەکردایە سەلامێکی لێنەدەکردی، وای لێهات من شەرمم لێدەکرد، لە ساتەکانی نۆبەتداری ئەگەر ئەو لە دەرێ با، نەمدەهێشت بە تفەنگەوە بمبینێ، وام نەدەکرد هەستبکات چاودێریی ئەو دەکەم، لە بیرمە ئەو ڕۆژەی ئازادیانکرد تووڕەیی لێدەباری، هێندەم گوێ لێبوو:

ئیدی تەواو، با وا بێت، ئەگەر ناپاکیم کردبا، وا نەدەبوو، قەیناکە...

لە بیرمە مەلا جەلال کە خەنافسی نزیک سمێڵە گەورەکانی کەوتبوونەوە، برادەری کۆنی حەمەش بوو، گۆتیە حەمە:

حەمە، ئەها حزب دڵی چەند فراوانە، مەمنوونی بە، وا ئازادی کردی.

وەڵامی حەمە چ بێت باشە! هیچی نەگۆت، بەڵام پێکەنینێکی هێند تاڵی بۆی کرد، هیچ جیاوازی نەبوو لەگەڵ جڕت.

بێ ماڵاوایی بارەگای بەجێهێشت، لە چاو ترووکانێک گەیشتە سەر ئەو بەرزاییەی کە لێیەوە بارەگا بزر دەبوو، بە دیاردەکەوت، زەردەشی لەگەڵ بوو، بە فڕین فڕیبوون، حەمە دەتگوت هەڵۆیە و زەردەی چۆلەکەشی بە دواوە، حەمە ئەبوو شوارب ڕۆیشت، بارەگای زیندانیی جێهێشت، وا بزانم کەس هێندەی من و ئومێد بە ئازادبوونی ئەو پیاوە هەڵۆییە، ئەو پیاوە ئەسپییە دڵخۆش نەبوون، ئەوەشم لە بیرە هێشتا هەڵۆ و چۆلەکەکە هەر لە ئاقاری کانی توبە و کافێ بوون، دوو سێ فڕۆکە گەیشتن، وا بزانم ئەو فڕۆکانە پیلاتۆزیان دەگۆتنێ و مەشقکاریان لە سەر بۆردومان و کوشتار دەکرد، مەلا جەلال بە پێکەنینەوە گۆتی:

خۆ بشارنەوە، حەمە فڕۆکەی بە سەرمان وەرکرد.

مەلا جەلال وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی، خۆی گەیاندە بن تیشە

بەردە گەورەکە، تیشە بەردێك لە قەدپاڵە سەختەکە لە باوەشی سێ دار بەرووی سەر قژنەوە ملەقوتێی لەگەڵ ئاسمان دەکرد، ئەو تیشە بەردە بە هەر سێ دار بەرووەکەشەوە مولکی مەلا جەلال بوون، زۆر جار دەیگوت:

لە دنیایێ پیاو هێندەشی هەبێت باشە.

مەلا جەلال لەگەڵ هاڕەی فڕۆکە دەگەیشتە تیشە بەردەکە و ئالیاری رادیۆ گچکە درێژکۆلەکەی بەرزدەکردەوە و دەیخستە سەر شەپۆلی (f m)، گوێی بۆ قسە و باسی ناو فڕۆکە هەڵدەخست، هەندێك جار منیش لێی نزیك دەکەوتمەوە و پێکەوە گوێمان دەدایێ، باسوخواسەکانیش کە بە عەرەبی بوون لە چەند رستەیەك دەخولانەوە:

لێیدە... چ نابینم... قەیناکە بیهاوێژە... چۆلەوانیە... وا بزانم ئاژەڵە، لێدە دەست مەپارێزە...

حەمە و زەردە ئازادبوون، ئەحمەد عەوێتە و ئەبوو جەمیل و... مانەوە، گەروویان گیان پڕ گریانە، گوێم لێبوو ئەحمەد عەوێتە دەیگوت:

حەمە گەلەك ئاوەدان بوو، ئێرەی چۆلکرد.

مەلا جەلال هەڵیدایێ:

پەلەت نەبێت، حزب وەك خوا بە بەزەییە، رۆژێك دێت تۆش ئازاد بکات و وەك زەردە و حەمە بە بەر چاومانەوە لەو چیایە ئاودیو بیت.

ئەحمەد عەوێتە مۆڕەیەکی لێکرد:

قسەی وا مەکە، من تا مردن حزب جێناهێلم.

ئومێدیش گوێی لەو مشتومڕەی نێوان ئەو دوو کۆنە برادەرە بوو، ئەو دوو برادەرەی ئێستا یەکیان زیندانیە و ئەویدیش ئێشکگری لێدەکات، ئومێد لە سەرەخۆ گۆتیە من:

+ چ پێناچێت، ئەحمەد عەوێتە تاوانبار بێت.

- لە سەر چی گرتوویانە؟

+ بە تەواویێ نازانم، بەڵام رەنگە پەیوەندی بە کێشەکەی مەمزوە

هەبێت، ئەوەی دارێکی وای لە کۆمۆنیستان دا، عارەب لە حووشتری نەداوە.

- باشە...

+ واز لەوە بێنە، چ کتێبکت لایە بۆم بێنەوە سبەی دەڕۆم، بە دێرەشدا دەڕۆم، رەنگە بچمە...

- کازانتزاکی، هەر رۆمانێکی کازانتزاکی بێت.

+ تۆ نە بە گولله نە بە کیمیاوی نامری، بەڵام رۆژێک ئەو کازانتزاکیە دەتکوژێ.

- ئەدی خۆت بە دەستی مارکیز ناکوژرێی!

ئومێد زۆر عەشقە مارکیز بوو، لە دە قسان دوو قسەی دەبردەوە سەر رۆمانەکانی مارکیز، بە تایبەتیش رۆمانی (خۆشەویستی لە سەردەمی کولێرا)، من ئەو رۆمانەم نەخوێندبۆوە، ئومێد دەیگوت:

هەر خوێنەرێک (خۆشەویستی لە سەردەمی کولێرا) نەخوێنێتەوە، خوێنەر نیە.

منیش بە گاڵتەوە دەمگۆت:

من خەریکە رۆمانێکی جوانتر لە (خۆشەویستی لە سەردەمی کۆلێرا) بنووسم بە ناوی (پێشمەرگایەتی لە سەردەمی خۆشەویستی)

ئومێد گۆتی:

ناونیشانێکی جوانە.

بۆ ئەو گاڵتەیە دەبێت بلێم، من ئەو کات رۆمانێک یان چیرۆکێکی درێژم بە دەستەوە بوو بەو ناونیشانە، ئەو کارەش هەر لە ژێر کاریگەریی گۆتەیەکی ئومێد بوو، بەڵام تەواوم نەکرد و بزریشم کرد.

ئومێد رۆیشت ، ئومێدی تاقە برای چەند خوشکان رۆیشت، خۆزگە قەت نەڕۆیشتبا، ئەو دەمەی ئومێد رۆیشت، ئاوێتەی یادەوەریم وەرزەکانی تێکەڵاوی یەکتر نەکردبێت، ساڵ لە کۆتایی هاوین یان سەرەتای پایز سالایەتی خۆی دەکرد.

تا به چاوی خۆم بەهار و زستانی دێرەش، ئەو دێرەشەی لە دیدی ئومێدەوە جوانترین گوندی دنیایێ بوو، نەبینم و هەندێ دیمەنی ئەو دوو کەژە نیشان نەدەمەوە، هەواڵی ئومێدم لێمەپرسن.

سەرەتای زستانە، ویدەچێت زستانی ئەمساڵ تووشترین زستانی ساڵان بێت، دەستەیەکی هەشت نۆ دە کەسین، ئاقاری کانی توبەمان بەجێهێشت، ئێستا پێمان خستە ئاقاری گوندی یەکماڵە، یەکماڵە چەند ماڵێکە، ئەوجارە رووبار رێی نەدا گوێ لە سەربوردەی یەکماڵە بگرم و پێبکەوم ئەو (یەك)ەی ئەو چەند ماڵە لە چیەوە هاتووە، پیاوێکی گوندی دەیویست یەکماڵەم لە نووکەوە بۆ بگێڕێتەوە، رووبار نەیهێشت، هەورەکان بە ئاماژە رایانگەیاند ئەگەر درەنگتان بەسەر دابێت، رووبار تووڕە دەبێت و بواری فیلیش نادات، جاری پێشی کە ساڵ لە نێرینەی بەهارێدا ساڵایەتی خۆی دەکرد رێم بێرە بە یەکماڵەی پڕ سەرهات، یەکماڵەی سەرەڕێی دێرەشی ئومێد، کەوت، بەڵام گوێم بۆ سەرهاتەکانی یەکماڵە رانەگرت، هەنگینێ لە گوندەکانی دەڤەری گارە تەنێ دێرەش لە کنە من گوند بوو، لە کنە من ئەو هەقایەتە بوو خۆشتر لە هەقایەتەکانی(مام رەزا) ئەو هەقایەتانەی لە دوای پێنجەمین نوێژەوە دەست بە گێڕانەوەی دەکرا و جاری وا هەبوو دەروێش برایم بە بانگی سپێدە هەموو هەولێری وەئاگادێنا، کەچی مام رەزا هێشتا نەگەیشتبووە (کلاشم دڕا هیچم پێنەبڕا)، مام رەزا پیرێکی تەمەن سەد و ئەوەندە ساڵە بوو، لە ریشیدا مووە رەشەکان لە سپییەکان زیاتر بوون، خۆیشی نەیدەزانی چەند ژنی هێناوە، دوا ژنی دەیگوت:

هێندەی من بزانم حەفتی هێناوە.

ئەو مام رەزایە دنیا زۆر گەڕا بوو، شار نەبوو، چیا نەبوو لە کوردسان نەیدیتبێت، دەیانگۆت یەکەم هەولێری بووە کە پێشمەرگایەتی بۆ شێخ مەحموود کردووە، بە پیری بەرەو پیری کۆماری مەهاباد چووبوو، نەگەیشتبووە سەردەشت، هەواڵی رووخانی کۆماری پێگەیشتبوو، دەڵێن گۆتبووی:

ئیدی بەشداری لە هیچ شۆڕشێك ناکەم، من سەرەخۆرەم.

بیرمە باشم لەبیرە، هەر ئەو بیرهاتنەوەیەش سەلماندیەوە کە بیری منداڵی زۆر تیژە، مام ڕەزای سەرەخۆرەی شۆڕش، کەرەتێ باسی چیای گارەی دەکرد، زۆر سەرسام بوو بە جوانیی گوندێك، ئەو دەم و دواتریش نەمزانی گوندەکە ناوی چی بوو، لێ ئێستێ کەوتمە گومانەوە و دەڵێم دوور نیە گوندە جوانەکەی مام ڕەزاش هەمان گوندەکەی ئومێد بێت، دێرەش ئەو دێرەشەی وا لە پێشمانە و ئەگەر ئەو سەرماوسۆڵەی زستانی گارە نەمانبەستێت و سەگەنازمان نەگاتێ، پشتی چەند دەمژمێرێکیدی دەیگەینێ.

ئێستا لە بەردەم بەردە کونکراوەکەین، بەردێکی گەورە زۆر گەورە لە دەو ڕێ بە تەلانێکەوە و بەشێکی بەدەرەوە بەشەکانیدیکەی لە بن عەردی، دەڵێی لە ترسان خۆی بە گڵ داپۆشیوە، ئەو بەردە هەڵکۆڵراوە، کونێکی گچکە بە حاڵ و بە هەزار خۆ خوارکردنەوە و نووشتانەوە پیاوی پێوە دەچێت، بەڵام کە لە کونەکە دەچیە ژوورەوە فراوان دەبێت، ئەگەر فڕۆکە لە ئاسمان بێت جێگەی هەموومانی لێدەبێتەوە، من جاری پێشی ئەو دەمەی دنیا کەسك کەسك دەچۆوە بە ترسەوە سەرم بەو کونەدا گرت، تاوێك بوومە مێوانی، ئومێد باسی ئەو کونەشی بۆ من کردبوو، دەیگوت:

جوانترین کونە فڕۆکە کە من دیتبێتم، کونەکەی ڕێگەی دێرەشە.

لەو کونەوە گەیشتمەوە زۆر کونە فڕۆکەیدی، زۆر سەرهاتی کونە فڕۆکە هاتنەوە ناو سەرم، منداڵ بووم، هێشتا وێنەی ئەو دارایەم نەدیتبوو کە دوو داری دیبوێ، نازانم بۆ تازیمانە بوو بۆ شایی بوو، ڕەنگە هەر سەردانێکی ئاساییش بووبێت، چووبووینەوە (تەڕوار)ی باپیرم، ئەو گوندەی وەك دەگێڕنەوە حەفت جار چۆڵ بووە، سووتاوە، پەرەتیرێکی لێدەرنەچوو، کاول بووە هیچ جارێکیشیان باپیرم بەجێینەهێشتووە، هەموو جارێکیش یەکەم کەس بووە ئاوەدانی کردۆتەوە، لە کن باپیرم تەڕوار جوانترین گوند بوو لە دنیایێ، کاتێ وەسفی وەرزەکانی ئەوێی دەکرد

دەتگوت قسە لە رازانەوەی بووکێ دەکات، کەسم نەدیتبوو وەکو باپیرم سەرسام بێت بە جوانیی جێگەیەك، مەگەر ئومێد، ئیێ، لەو سەردانەوەیەی گوند لە بیرمە بووە هاتو هاوار و هەڵات هەڵات و تێکهەڵقژانێك، بڕواناکەم کەس کەسی ناسیبێتەوە، من دایکمم نەدەناسیەوە، ئێستاش دەنگی باپیرمم لە گوێیە:

کونە تەیارە کونە تەیارە، بگەنە کونە تەیارە.

گوند کەوتبووە دەو کەندێك، ناو کەندێ چەند کونێکی لێبوو، هێندەم زانی من وا لە ناو کونێك لەو کونانەم و سەرم لە بن پیلی دایکمە، ئیدی بووە گرم و هۆڕ و تەپ و تۆز، لە کونەکەی تەنیشتمانەوە، هاوار بەرزبۆوە هاوارێك رەنگە ئێستاش لە ئاسمانێ دەنگبداتەوە.

چیە! چ بووە؟!

هەینێ هیچی تێنەگەیشتم، رەنگە ترس نەیهێشتبێت تێبگەم، دواتر لە گێڕانەوەی ئەم و ئەو کە هەزار جاریش پتر سەرهاتی هاتوهاواری کونەکەیان بۆ یەکتر و خەڵکیدی دەگێڕایەوە، ئەوها لە یادەوەریمدا تۆمارکرا:

دوایوەی هەموویان خۆدەپەستنە ناو کونێ، مارێکی رەش، رەشتر لە کراسەکەی پلکە خەجیج، دەفیشکێنێ، فیشکاندنێ رەنگە دەنگی فڕۆکەش ترسی وا نەخاتە دڵەوە، ئیدی کوننشینان لە ترسی دەنگی ناو کونێ، ترسی دەنگی ئاسمانێ لە بیردەکەن، چەند بە پرتاو خۆیان بە کونێدا کرد بە پرتاوتر لە کونێ هاتنە دەرێ، هەموو بە سەر یەکتردا بەربوونەوە و دەیانگوت مَنداڵێك لاقی وردبوو، ئێستا تاقە کەس لە کونێ و لە کنە ماری رەش مابێتەوە پلکە خەجیجە، ئەوەش لە ئازایەتی نەبوو، کەم کەس هەبوو هێندەی وی لە مار بترسێ، بەڵام کەسیش نەبوو وەك وی زراوی لە فڕۆکە چووبێت، کوڕەکەی بانگی کردبوو:

دایە، وەرە دەرێ، با پێوەت نەدا.

پلکە خەجیج گۆتبووی:

کورم، لێمگەڕێ، مار بمخوا خۆشترە لەوەی تەیارە بمسووتێنێ.

ئومێدیش سەرهاتێکی وەك ئەوەی پلکە خەجیجی هەیە، ئومێد وای بۆم گێڕایەوە:

لە چیای شیرین بە دیوی بارزان لە هیکڕا چەند کۆپتەرێکمان لێ پەیدا بوو، خۆم هاویشتە بن کەڤرێکی بە پووش و پەڵاش داپۆشراو، وەی وەی! هەر لە بن گوێم مار فیشکاندی، بەڵام دانم بە خۆمدا گرت و بەردم بەجێنەهێشت و لە دڵی خۆم گۆتم:

پێکهاتن و بەرە لەگەڵ مار دەکرێ بکرێ، بەڵام لەگەڵ بەعس و فڕۆکەکانی ئەستەمە.

هێشتا نەگەیشتبووینە ئەو پێچەی کە لە ڕۆیشتنێ کونە فڕۆکەکە بزردەبوو، لە هاتنەوەش دەهاتەوە ناو چاوت، سرووشت ئاگاداری کردینەوە کە هەورە بەفرییەکە لە سەر داکردنە، ئاگادارکردنەوەکەش بە هۆی کزە بایەکی بەفری بوو.

ئێستا لە بن پرووشەی بەفرێ تاوێ بە ئاراستەی با، تاوێ دژە با ئەو هەوراز و نشێو و پێچ و رووبارانە دەبڕین کە دوای چەند دەمژمێرێکیدی لەوەیە بمانگەیەنێتە دێرەش، ئەو دێرەشەی تا ئێستا لە خەیاڵی من کەسکپۆشە، بەهاری چووی بە کەسکایەتیەکەدا چووم و هەر بە کەسکایەتیەکەیدا هاتمەوە.

بەفر بەفر، دنیای سپی کرد بەفر، پێشمەرگەی سپیپۆش کرد بەفر، دەبێت دێرەشی لە چی هەڵکێشابێت بەفر! لە ناو پێشمەرگان ئەو کوڕەی قاسم مەهابادی ناوە لە چاوی من لە هەمووان بەفراویترە، وەك بڵێی پیاوێکە لە نسێ و پتر بەفر دەگرێ، ردێنی کە لەکاتی نانخواردنێ رێك دەگاتە سەر ناوکی، ئێستا لە درەختێکی سەرقژنی ژنانی پتر بەفری گرتووە.

هەنکە بە دۆڵێکدا کە هێمنترین رووباری لە خۆ گرتووە، رێدەکەین، دوور نیە بە پێچترین دۆڵی دنیا بێت، ناژمێردرێ چەند جار لە رووبارەکە

دوور دەکەوینەوە و دێینەوە سەری، لە بیریشم نیە چەند جار لە رووباری لە هەندێ جێ ناو بەفر و لە هەندێ جێش بن بەفر پەڕینەوە و ئەو بەر و ئەو بەرمان کرد، ئەو بازبازێنە هەندێ کەڕەت بە سەر کۆلکە داری گەورە و چاڵە کە جێدەستی گارەنشینانی پێوە دیار بوو، هەندێ کەڕەتیش بە سەر ئەو کەڤرانەی لە ناو ئاو خەوتبوون و شان و ملیان بە دەرەوە بوو، بەهاری چووی زۆر لەو بەردە خەوتووانە لە بن ئاو هەناسەیان دەدا، هەندێك دەیانگوت دانانی ئەو بەردەبازانە لەو جێگانە بە هەرەوەزی بووە، هەرەوەزی سرووشت و گارەنشینان، هەندێ کەڕەتیش بە بازدان چەپ و راستی رووبارمان دەکرد، لەو شوێنانە کەناری چەپ و کەناری راست وەك بلێی بەزەییان بە مرۆڤدا، بە پێشمەرگەدا هاتبێتەوە، لێکدی نزیك دەکەوتنەوە.

بەفر، بەفر، سپی سپی، تا دێ ڕێگەوبان سپیتر دەبێ، پێشمەرگە سپیتر، لە چاوی ئێستاوە چەند جوانە ئەو ساتانەی دنیا لە بەفر دەگیرێ، تا دێ کەنار لێکدی نزیك دەبنەوە، کەناری سپی، کەناری بەفری، بەڵام ئەو لێکنزیبوونەوەی کەنار، پەڕینەوە لە رووبار زەحمەتتر دەکات، چ لەوە جوانترە کاتێ دوو کەنار بە یارمەتی بەفر خەریکە وەك عاشقە و ماشقە تێکەڵی یەکدی بن! چی لەوەش ترسناکترە ڕێی تۆ بچێتەوە سەر ئەو تێکەڵبوونە! لەو ساتانەیە جوانییە ترسناکەکان خۆ نمایش دەکەن، خوا نەکردە ئەگەر دێرەشی ئومێد کەمێك دوورتر با، ئەوا دوور نەبوو جوانیی بەفر بۆ جوانترکردنی خۆی و بۆ بە یەکتر گەیاندنی دوو کەنار تێکەڵی خۆیمان بکات و تا بەهارێ نەبینرێینەوە، تا مردنیش قەرداری قاسمی رۆژهەڵاتیم، دوو دنکە قەسپەکەی ئەو نەبا، من تیا چووبووم، خەریکبوو دنیای سپی بە رەشی خۆی نیشان بدا و لە رەشیم هەڵکێشێ، لەوێ گرنگیی قەسپم بۆ دەرکەوت، زانیم تامی راستینەی قەسپ چۆنە! لە بەهای شاراوەی قەسپ گەیشتم.

چ سپێتیەك دەگاتە ئەو سپێتیەی کە لە دێرەشی سپیەوە دەڕژێتەوە

چاوەوە! ئەوەتا دێرەشی سپی، دێرەشی کپ، هەموو ڕەنگەکان لە سپێتی سپی بوونەتەوە، هەرچی جوولە هەیە لە کپیی دێرەش کپبوونەتەوە، تەنێ خرمە خرمی بەفرە لە بن پێی پێشمەرگە، هانکە هانکی پێشمەرگەیە بە سەر بەفردا، تەنێ ئەو دووکەڵەیە لە لوولەی سەربانەکانی دێرەشەوە بە کەڵێنی کلووە بەفردا بە ئاسماندا دەچێت، تەنێ ئەو بەفرماڵانەیە کە لەولاوە لە دەستی چەند پیاوێکی سپپۆش لە سپێتیدا لە جوولانەوەیەکی سپی دایە.

دوو دوو دابەشبووین بە سەر ماڵە سپیەکانی دێرەش، من و جیهاد بەگەڵ یەك کەوتین، کوڕێکی ڕەقەڵە بوو، پێدەچوو نەخۆشیەکی هەبێت، دەبنێسا و ڕۆژ بە ڕۆژ لە کورتی دەدا، جیهاد دنیایەك شیعری عەرەبی لەبەر بوو، سەعدی یوسفی بە پنت و وێرگوڵەوە ئەزبەرکردبوو، لە ڕێ ئەو کاتانەی بەیەکەوە دەڕۆیشتین، هێندەی شیعر بۆم خوێندەوە دەتگوت ڕکابەری هەور دەکات، ئەز کەوتبوومە بن بەفر و شیعرەوە.

خانەخوێمان ژن و پیاوێکی پیر و دوو کچی عازەب، هۆدەیەکی سۆبەیی دوو پێشمەرگەی سەرمابردەڵەی برسیی لە باوەش گرت، خەریکە خۆ بهاوینە ناو سۆبەوە، سۆبە سووربۆتەوە، دەڵێی دەندووکی کەوە، نێلە نێلیەتی، لە دەریا تەڕترین، ببینن، چ هەڵمێکمان لێ بەرزدەبێتەوە، ژنەکان چوونە چاوەکەیدی، نیوە ڕووتبوونەوەیەك خۆمان ڕووتکردەوە، جلکەکانمان وشکبوونەوە، یان مەیلەو وشك، هات، شلە ساوار بە پیازەوە هات، وەرگەڕاینە سەر ساوار، لەو ساتانە دەبێت خواردنێك هەبێت هێندەی ساوار خۆش و بە تام! چ هێرەیەکمان بە ساوار کرد! ئەدی چایە! جگەرەش لەوێ...

چاوەیەکی گەرم و گوڕ لە شەوی سپیی دێرەش، دوو چاوی بڵێم چۆنیش! تا ئەو دەمانێ جوانترین چاو کە لە چاومدا درەوشابێتەوە چاوی ئەو کچە دێرەشیە بوو کە هەموو جێگەیەکی لە خوشکەکەی دەچوو جگە لە چاوی، لە ڕوومەتیش نەختێ لەو بەفریتر بوو، چاوی لە چ چاوان

نەدەچوو، جوانیی هەموو چاوە جوانەکان لە چاوی ئەو کچە خانەخوێیە دەدرەوشانەوە، من تا گەرمنەبوومەوە تا تێر ساوارم نەخوارد، تا شەش حەوت چام بە سەر ساواردا نەکرد، تا چاوەکەم بە دووکەڵی جگەرە قانگ نەدا، ئەو چاوە جادووییانەم نەهاتە چاوەوە.

لەو شەوە لەوماڵە دنیایەك باسوخواس هاتنە گۆڕێ، بە باسی ئومێدیشەوە، بەڵام بڕواناکەم قسەیەکی ئەوتۆم کردبێت، چاوەکان نەیانهێشت چ بڵێم، ئەو چاوانە چ بوون خودایە! کەسك کەسك لە بەهاری دێرەش کەسکتر، ئەو بەهارەی دیتم و ڕەنگە چیدی نەیبینمەوە، ئەو بەهارەی ئومێد، کوردی و عەرەبیی تێکەڵاو دەکرد و هێشتا نەیدەتوانی لچکێك لە کەسکایەتیی نیشانبدات، بەهاری چووی ڕەنگە ئەو کچەم دیتبێت، ڕەنگە لە دوورەوە دیتبێتم، نا بڕوا ناکەم چاوم بە چاوی کەوتبێت، ئەو چاوانە هی ئەوە نین تا تەمەنیش تەواو دەبێت لە چاوتدا بکوژێتەوە، چ چرایەکی کەسکە ئەو چاوانە! ئەو چاوە چ چاوە! بەهاری دێرەش لە چاو ئەو چاوانە دەڵێی پایز لێیداوە.

جیهاد جار جارە بە ئاگای دەهێنامەوە، دەستمی دەگرت و لە ناو چاوەکان دەریدەهێنام، ئا من کەوتبوومە ناو چاوی کچە دێرەشیەکەوە، هاییم لە خۆم نەمابوو، چاوەکان لە چاوی جیهادیشیان دابوو، بەڵام ئەو لە من خۆڕاگرتر بوو، وەك من نەبوو، هۆشی لە دەستنەدابوو، جیهاد بە عەرەبی گۆتی:

هاییداربە، دەنا سەراو سەر دەکەویە ناوی و دەقەومێ.

بە عەرەبیەکی دووکەڵاوی وا بزانم گۆتم:

چ بکەم، خۆم لە دەستی خۆم نەماوم.

جیهاد لە سەری نەڕۆیشت، پیاوەکە زۆر حەزی دەکرد لەگەڵ جیهاد بدوێ، کەسیشیان زمانی ئەویدیان نەدەزانی، بە ناچاری دەبوو کاری وەرگێران بکەم، وەرگێڕانێکی چەوت و گێڕ، پیاوە دەیپرسی:

+ عارەبیش دەبنە پێشمەرگە! من لەوە تێناگەم.

نازانم پرسیارەکەم چۆن چۆنی بۆ جیهاد کردە عەرەبی، بەڵام وەڵامەکەی جیهادم بۆ خانەخوێ ئەوها کردە کوردی:

- سەدام کارێکی وەهای نەکردووە، وا بە ئاسانی لە شتەکان تێبگەین.

+ باشە ئەوە هەی مە دیارە، سەربەخۆییمان دەوێ، حوکمیزاتیمان دەوێ، بە من بڵێ ئەنگۆ چیتان دەوێ؟

- هی مەش دیارە، دەمانەوێ سەدام برووخێ.

+ ئێ، ئێ، ئێمەش دەمانەوێ برووخێ، قسەی من لەوەیە ئێوە بۆچی دەتانەوێ برووخێ؟

- چونکە زۆردارە.

+ تێگەیشتم.

قسە و باس زۆر کرا، زۆر بابەت هاتنە ناو قسانەوە بە کیمیاییشەوە، ئەوەی لە بیرمە خانەخوێ دەیگوت:

هیچ شتێك کوردی قڕنەکرد، بەڵام ئەو بەڵایە رەنگە قڕی بکات.

من گوتم:

نا نا ئەوەش قڕی ناکات، هێندە جێی مەترسی نیە.

خانەخوێ گوتی:

تو چ دبێژی برا، نەترسان ل کیمیا کەرایەتییە، خودێ کەرژی ل کیمیا دەترسی.

لە دڵی خۆم گوتم:

بە خودای دیارە من لە کەریش کەرترم.

تیچاوێکم هەر لەسەر چاوە بەهارییەکان بوو، ئەو بەهارەی لە زستانی دێرەشێ لە سەر بەفرێ لە چاوی من کەسك کەسك دەچۆوە، چاوەکان منیان داگیرکردبوو، راستە لەو دانیشتنە ئێوارەییە کاری وەرگێڕان بە من سپێردرابوو، بەڵام هێندە ئاگام لە وان نەبوو، رەنگە زۆر واتام بۆیان لنگاوقووچ کردبێتەوە، ئاخر سەرەڕای بزربوونم لە ناوە چاوە بەهاریەکان، نە عەرەبییەکەم باش بوو نە لە کوردیەکەی خانەخوێش باش تێدەگەیشتم.

چاوەکـان ئـای چاوەکـان! ئێسـتا هەمـوو لە شـیرنەی خەوێـن، دێـرەش خەوتووە، تەنها من و سـەگەکان بەئاگـاین، ئەوان رەنـگە بـۆنی گورگیـان کردبێــت، بــۆیە خەو نــاچێتە چاویــان، منــیش چــاوێ خەوی لە چــاوم تاراندووە، چاوێك وا لە چاوەکەی تەنیشتم رەنگە خەوتبێت، ئەو چـاوانەی هەر کەسێك بیانبینێ جگە لە جیهاد خەوی لێ تار دەبێت، باشە بـۆچی تـا ئێســتا کەس باســی ئەو کــچەی نەکــردووە، چــۆن نــاوی گونداوگونــد نەڕۆیشتووە، سەیرە، ئومێد چۆن باسی ئەو کـچەی بـۆ مـن نەکـردووە، نـا، هەبێت نەبێـت ئومێـد سـەبارەت بەو کـچە دێرەشـی خۆشویسـتووە، ئومێـد عاشــقی ئەو چــاوە بەهاریــانە و ئەو روومەتە بەفریــانە بــووە، ئەو کــچە جوانترین چوار وەرزەی ساڵە.

ئەو بەفرە چی بوو، چی بە مـن کـرد، ئەگەر نەباریبـا، ئـێمە لە دێـرەش نەدەماینەوە و لە جادە پەڕیبووینەوە، بەفر نەبا تووشی ئەو چاوانە نەدەبووم، خودایە لە داوی ئەو چاوانەم دەربـازکە، ئەو چـاوانەی دیوارێکمـان بەینـە، تاریکیمان بەینـە، کەچـی لە گلـۆپە گەشـەکانی ئامێـدی گەشـتر لە چـاوم دەدرەوشـێنەوە، ئەو ئامێـدیەی لەو پـێچە بسـووڕێیتەوە بە چراخـانی دێـتە چـاوتەوە، ئەو چـاوانە چـیم بەسـەر دێـنن، چ کەتنێکیـان لە چـاودایە ئەو چـاوانە! ئەو چـاوە کەسـکانە، ئەو شـەوە لە چـاوی مـن هەمـوو شـتێك بە بەفریشەوە کەسك دەنوێنێ، چ شەوێکی کەسـکە ئەو شـەوە، چ شـەوێکی ترسناکە، چ شـەوێکی ئارامبەخشـە ئەو شـەوە، ئەگەر بەفـر نەبـا ئەو شـەوە کەسکەم نەدەدی.

رەنگبێ زۆری نەمابێ بەیان بدات، دەمژمێرەکەشم لە ناو بەفـرێ ئـاوی دزی و وەستا، نازانم جاری چەندەمینە بێمە دەرێ و تەماشای بەفر بـکەم، خانەخوێشم هەراسـان کـردووە هێنـدەی دەنـگ لە دەرگـاوە بێـنم، بەوەی باشە ئەو وا تێگەیشتووە کە تووشی سکچوون هاتووم، نازانێ کێشەی مـن دڵچوونە نەك سکچوون.

دێرەش دوو دنیایە، شەوی دێرەش دوو شەوە، دنیـای دەرەوە، شـەوی

دەرەوە سپی سپی، سارد سارد، دنیای ژووریێ، شەوی ژووریێ کەسك کەسك، گەرم گەرم، ئەو شەوە هەر دەپاڕامەوە نازانم لە کێ دەپاڕامەوە کە خودا لەو کچە بگۆڕێ و بە تیچاوێ وەڵامی تیچاوێکی من بداتەوە، دەمویست بە هەر شێوەیەك بێت لەو کچە نزیك بکەومەوە، ئەگەر نەکەوتبمە باری زێدەڕۆییەوە، وا بزانمنزای ئەوەم دەکرد ئەو شەوە باوکی کچە لە هۆش بچێ و هەتا سبەی بە ئاگانەیەتەوە، دایك و خوشکەکەشی لەوە خراپتریان بەسەر بێت، بۆ ئەوەی خۆم بگەینمە چاوەکەیدی ئەو چاوەیەی مەسترین چاو، شەڕاویترین چاو، بەهاریترین چاوی لە خەو گرتووە.

نا، چ پێناچێ لەگەڵ ئەو کچە هیچ بە هیچ بکەم، ئاخر لە ئێوارەکەیەوە تا ماڵنووستنان من چاوم لە چاوی هەڵنەگرت، چ ئاماژەیەکی ئەوین نەما، بە ئامازە بایی و بارانیەکانەوە بۆی نەکەم، کەچی لە کنە وی نە با بوو نە باران، ئەو کچەی هەستمدەکرد هەرچی گەرمایی دنیایە لە لەشیدایە، ئەو خواگیرە! چەند ساردوسڕ بوو لە ئاستی من.

چاوە کەسکەکان خەوتوون، دێرەش خەوتووە، بەفریش خەوت، هەور خەوت، دنیا خەو بردیەوە هەر من و سەگێك بێدارین و خەو نامانباتەوە، سەگێك پاسەوانی لە من دەکات، هەر جارێك دەچمە دەرێ حەپەیەك دەکات، من ئەو حەپەیە وا لێك دەدەمەوە کە دەڵێ، سەگەکە بە من دەڵێ:

مەترسە، تەنیا نیت، من لەتەکتم.

باشە من بۆچی هێندە دەرێ و ژووریێ دەکەم؟ دواتر ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکرد، ئێستاش وەڵامێکی لەجێم دەستنەکەوت، تۆ بڵێی دەستپێکی ئەوین بووبێت! لە بیرمە نزای ئەویندارانەم دەخوێند و دەمگوت:

تا حەفتەیەکیدی هەر بەفر بێت و لێنەکاتەوە، هەرچی ڕێگە لە دێرەش دەبێتەوە، هەرچی ڕێگە لە دێرەش دەکاتەوە بە بەژن بەفری تێکات و

ڕێبەندانێ دنیا بگرێتەوە، بەڵکو من لەو ماڵە بمێنمەوە و بە تەواوی لە ناو چاوە کەسکەکان بتوێمەوە.

دەمگوت:

ئێ ئەوە خودایە، دڵی ئەو چاو بەهاریە نەرم بێت و جێیەك لەو بەهاری ژیانە با هێندەی جێپەنجەیەکیش بێت تام بکەم.

ئەو کچە ئومێدیە، ئومێدی لە بیربردمەوە، من دەمگوت بەس بگەمە دێرەش تا سەرێك لە ئومێد نەدەم، سەر بەهیچ کوێیەکدا ناکەم، بیر لە هیچ شتێك ناکەمەوە، جاری چووی لە دەستمچوو سەردانی بکەم، ئەگەر چەند خولیایەك، چەند دیمەنێکی ئەو شەوەم نەگێڕمەوە هەست بە هەڵاتن دەکەم، هەڵاتن لە خۆم، هەڵاتن لەو گێڕانەوەیەی کە دەبێت بیگێڕمەوە.

بە خۆم نەدەوەستام، چووم چووم، چوومە بەر دەرگا، ئێ ئەوە خوایە لە درزی دەرگاوە ببینم، چاو بەهاری لە خەوێدا ببینم، ژوور تاریك بوو، نا کەسك بوو، هیچم نەدیت، دەزانن من چ باوەڕم بەو بێ ئەمەکی و ناپاکیە نەبوو کە زۆر قسەی لێوە دەکرا، ئەوەی کە:

ئەگەر لە ماڵێك مێوان بوویت خزمەتیان کردی، نابێت، بە خراپ تەماشای کچەکانیان بکەیت!

لەو دەمە وشەی (خراپ) لەو رستەیە لای من رێك واتای ئەوینی دەدا، بۆیە زۆر ئاسایی بوو، زۆر بە خراپ تەماشای کچان بکەیت، من دەمویست لە درزی دەرگاوە بە خراپ تەماشای ئەو کچە چاو کەسکە بکەم، ئەو کچەی سەر لە ئێوارە تا چووە چاوەکەیدی، چاوم لە سەری هەڵنەدەگرت، ئەویش هیچ وەڵامێکی نەبوو، نە بە خراپ نە بە باش، هەر دەتگوت منی نەدیتووە.

بەفر دەمێکە لێکردۆتەوە، سپیترین شەو شەوی دێرەشە، کەسکترین شەو شەوی ئەو دیوەیە کە چاوکەسك لێی خەوتووە، دنیا هەمووی نووستووە، تەنها من و سەگێك بە ئاگاین، من دەڵێی ئەوشەو نۆبەتداری لە دێرەش دەکەم، دەڵێی سەگەکەش نۆبەتداری لە من دەکات، گوێم لە

دەنگی دەرگا بوو، لەو کاتە من لە سەر جێگاکەی خۆم جگەرەم دەکێشا، یەکسەر هاتمە لای دەرگا، نزامکرد چاو کەسك بێت، هەو بوو.

شەوی دێرەش روونـاکە، کەسـکایی دەناسـرێتەوە، کـچ دەناسـرێتەوە، دیار بوو ئیشی سەرئاوی هەبـوو، هەر دوو چـاوە خەوتبـوون، تەنهـا مـن و ئەو نەبێـت، چـوومە دەرێ، لە پـێش دەرگـای ئەوان، لە بەر بێـراییەکە راوەسـتام، هـاتەوە، نەمکـردە نـامەردی باوەشـم کـردەوە، باوەشـێك وام هەستکرد جێگەی کۆمەڵێك کچـی تێـدا دەبێتەوە، ئەهـا ئێسـتا ئەو کـچە بەهـاریە لەو شـەوە بەفـریە، دێـتە باوەشـم، لەو باوەشـگرتنە وەرزەکـان تێکەڵدەبن و ئەوەی ناشێت ببێـت، دەبێـت، پەنـجەم سـوارە بـۆ کـردنەوەی بەرکۆژەی، کچە هات هات، ئێستا هەر بستێکی ماوە بگـاتە نـاو باوەشـم، چ روویدا خودایە!

خۆی نەوی کرد، بە بن باڵمـدا ئـاودیوی دەرگـا بـوو، زۆر بە هێـدیش دەرگـاکەی داخسـت، مـن هەر وا لەوێـم، ئـامێزم کـردۆتەوە، رەنـگە ئەو خەویشی لێکەوتبێتەوە، ناتوانم ئەو سـاتانەی خـۆم بگێـڕمەوە، ئیـدی نـازانم چیم بەسەرداهات، دواتـر لەبەر خـۆمەوە دەمگـوت، ئەو کـچە چ کچێکە خودایە، خۆ هەر جوونێکیشی نەدا! لەوێ ژان ژاك رۆسۆم بیرکەوتەوە، لە یادەوەریەکانی خوێنـدبوومەوە، هەر کچێکـی ویستبا، دەسـتی دەگەیشـتێ، خۆزگە وەك رۆسۆ قۆز دەبووم، ئیدی هاتمەوە ژۆرێ، لە بیرمە گوتم:

سەگەکە بخەوە، منیش دەخەوم.

سەگ زانی درۆدەکەم، من چەند خەوتـم ئەویـش هێنـدە، لە هەمـووی سەیرتر بەیـانی کە هەسـتاین، کـچە لە ئێـوارەکەی ئاسـاییتر بـوو، چەنـدی تەماشامکرد، هیچ، هەر هیچ رووینەدابوو، لەبەر خۆمەوە گوتم:

ئەگەر ئەو کچە شـێت نەبێـت، مـن لە تەمەنـی خـۆم لە ژن تێنـاگەم و تەواو.

هێشـتا لە نـانی سـبەینێ نەبـووینەوە، بـاران دایکـرد، ئۆجـا وەرە لە تـوانەوەی بەفـر وردبەوە، هەسـتمدەکرد منـیش وەك بەفـرەکە دەتـوێمەوە،

زۆری نەبرد دنیا بووە لیتاو، دوای تاوێك باران لێیكردەوە، هەور نەما، ئاسمانێك بە دیاركەوت، روون روون وەك رووی كچە چاو كەسكەكە روون، من ئەو روونبوونەوەیەی ئاسمانم بە دڵ نەبوو، ئەو گۆڕانە كتوپڕەی بە سەر سرووشتی دێرەشدا هات بە دڵم نەبوو، دەمویست پتر لە دێرەش بمێنمەوە، مانەوە لە پێناوی سەردانی ئومێد نا، مانەوە بۆ مەبەستی گەیشتن بە كچە بەهارییەكە، ئەو كچەی دڵنیاش بووم كە نایگەمێ، بەڵام چ دەكەیت لەگەڵ دڵ، وای دەخواست.

پێم لە دوام نەدەهات، هەستمدەكرد لە دواوە رامدەكێشن، كچە دەتگۆت سواری كەمەندهاوێژە، كەمەندی هاویشتووە و لە ملی من ئاڵاوە و رامدەكێشی، ئەز لە دەستی خۆم دەرچووم، هێ لە نزای دەربازبوون هیچم لە دەست نایێ.

لە دێرەشەوە بە دیوی شۆڕبوونەوەدا شۆڕبووینەوە، ئاسمان روون روون، ئەوەی نیە هەورە، قەت لە زستانێ ئاسمانی وا روونم نەدیوە، زەویش یەك قوڕولیتەیە، كەر بە كەرایەتیی خۆی، خۆی لێنادا، بەڵام پێشمەرگە رێی داگرتووە و دەڕوا، شلپۆهۆڕە، پێڵاو دەڵێی تایەی تراكتۆرە قوڕ دەهاوێ، قاسم وەك چۆن دوێنێ لە هەمووماندا بەفراویتر بوو، ئەوڕۆش لە هەمووماندا قوڕاویترە، ریشی دوێنێ بەفری گرتبوو ئەمڕۆ قوڕ، حەیف! وێنەگرێك نەبوو، وێنەی پێشمەرگەی قوڕاوی بگرێت، لەو رێوبانە ئێمە قوڕاویترین پێشمەرگە بووین.

برۆ، برۆ، هەر برۆ، گەیشتینە رووبارەكە، رووبار چ رووبار! هاشە هاشە، نا، نازانم دەنگی ئەو رووبارە چۆن بوو، لە دەنگی رووبار نەدەچوو، راستی ناونانی دەنگی رووبار كارێكی نەكردەیە، هەر جارەی، یان لە هەر گوێڕاگرتنێكدا دەنگێك دەدا جیا لەوەی پێشوو، ئێ، لە دەنگ گەڕێ، بیرێك لە پەڕینەوە بكەوە، بەهاری چووی بە سانایی پەڕیمەوە، بەڵام ئێستا زستانە، دنیایەك بەفر باریوە و دەریایەك بارانیشی بەسەردا كردووە و هەموو ئەوانەش رژاونەتە ئەو رووبارەوە، دیتمانەوە ئەو پردە دارینەمان دیتەوە كە

جـگە لە پێشـمەرگە کەس نـیە متمـانەی پێبکـات، پـرد چ پـرد، هەر پێشمەرگەیە ناوی پردی لێناوە دەنا بەس پرد نیە، لە جێگەیکی رووبـار کە هەردوو کەنـار لە بەر خـاتری پێشـمەرگە کەمێـك لێکـدی نزیککەوتـوونەتەوە، دارێکـی ئەسـتووری درێـژ هەردوو کەنـاری بەیەك گەیاندووە، بۆتە چاڵەیێ بۆ پەڕینەوە، لە بن چـاڵەکەش لە دوو جێگە دوو گابەردی گەورە لە سـەر شـانی خۆیـان داریـان راگرتـووە، ئەوەتـا لە دەو رووبار بە دیار پردی ترسـەوە راوەسـتاوین، حەزمکـرد ئەو پـردە نـاو بنێم پردی ترس یان پردی پێشمەرگە، یان پـردی سیرات، بە راسـتی پردێکـی ترسـناکە، چـاڵەکە هەر ئەوەتە بە دەرەوەیە، دەزانـی چ ئاوێـك هەسـتاوە! چەندی بیری لێدەکەمەوە، ئەوە نیم بتوانم لێبیدەم.

یەکەم جـارمە تووشـی چـالە و پەڕینەوە و رووبـاری ئەوهـا بـم، باشـە دەبێت ئەوانیدیش وەك من بترسێن! تەماشـای سـیمایانم دەکـرد، چ ترسـم نەخوێنـدەوە، رەنگبـێ مانـدوویێتیش ترسـی شـاردبێتەوە، هەر هێنـدەم زانـی کنـدرێکی درێژیـان دەر هێنـا، سـەرێکیان تونـد لە سـینگ و پشـتی پێشمەرگەیەك بەست، ناوی ئەو پێشمەرگەیەم لەبیر نەمـاوە، سـەرەکەیدیش لای ئەوانیدی، ئێ، پێشمەرگە بە گاگۆڵە لێیدا لە پردی دا، هێـور هێـور بە سەر دارەکەدا دەڕۆیی، لە دواوەش کندرەکەیان لە دووی دەدا، ئۆخەیش گەیشـتە ئەو بەر، کنـدرەکەی لە خـۆی کـردەوە، نۆرەی یەکیـدی هـات، ئەویش پەڕیەوە، من وا بزانم چوارەم کەس بووم لە پردی ترسـم دا، ئـای ترسـام خـودایە، هەسـتمدەکرد وا لە سـەر پـردی (سـیرات) دەپەڕمەوە، هەوکەش تێنەگەیشتم چۆن نەکەوتـم، چـۆن پەڕیـمەوە، ئەوەی دوای مـن هات، هێشتا نەگەیشتبووە نیوەی رووبار، کەوتە ئاوەوە، بەڵام هێندەی بلێـی یەك و دوو رایانکێشایە دەرێ و هێنـدەی نەبـرد هـاتەوە سـەرە خـۆ و ئەو جـارە بە ئاسـانی پەڕیەوە، ئەو کـاتەی ئەو کـوڕە پێـی رۆیـی و کەوتە رووبارەوە، دوا پێشمەرگە خۆی خۆی بەستایەوە، سـەرەکەیدی لای ئێمە بوو، دوای پەڕینەوە بە بیرم هاتەوە کە ئومێد باسی کنـدر و پـرد و زستان

و پەڕینەوەی ئێرەی بۆم کردووە، بێتێکی باشمان دا، نان و خورمایەکی خۆشمان خوارد، بەڕێکەوە.

تا لە رووبار زۆر دوور نەکەوتووینەتەوە، هەندێ قسەی سەر رووبار یان هەندێ دالغە و بیرکردنەوەی رووباری هەن حەزم لە گێڕانەوەیانە، لە کاتی پەڕینەوە بە سەر پردی سیرات، یەکێك لە پێشمەرگەکان رازی نەبوو بەسترێتەوە و بێ کندڕ و هەر بە فشە پەڕیەوە، ئەو کوڕە لە چاوی منەوە چەند قارەمان بوو، ئەگەر ناویم لەیاد با، لەم گێڕانەوەیە قارەمانم بە ناوەکەیەوە دەلکاند، ئەو قارەمان بوو، بێ خۆبەستنەوە لە پردی سیرات پەڕیەوە، منیش ئەگەر هەبا بە سێ کندڕ خۆم دەبەستەوە، ئەنگۆ نازانن چ رووبار و پردێکی ترسناك بووا رەنگە ترسان بەو رادەیەش جێی قسە بێت، چونکێ دواترێ کاتێ گاف نا گافێ ئەو پرد و پەڕینەوەیە دەهاتە ناو قسانەوە، بەلای هەندێکەوە پەڕینەوەیەکی ئاسایی و ئاسان بوو، بەلام هەبوو دەیگۆت:

بە راستی ترسناکترین پەڕینەوە لە ژیان، پەڕینەوەی ئەو رۆژە بوو.

ئەوە لەوێ، کەمێك خوارتر لە پردی سیرات، بە دوورایی هەر نیو کاتژمێرێك، لە بیرمان بێت دوورابیەکان هەموو دوورابیەکان بە پێوانەی پێ نەك هی ئەسپسواری و ماشێن و پاپۆڕ و ئەو شتانە، پردێکی باش هەبوو، هەر مرۆڤ نا کەری بارهەڵگریش دەیوێرا خۆی لێدا، خۆ ئەگەر ئەو نیوکاتژمێرە بکەیتە یەك کاتژمێر، دەگەیتە پردێك زیلیشی بەسەردا دەڕوا، جادەی قیرتاوە، بەلام چ دەکەیت لەگەڵ مۆلگەی جاش و سەربازان! چ دەکەیت لەگەڵ پێشمەرگایەتی! نازانم کێ دایهێنا! بیرمە لەوێ، لە بەراوردکردنی نێوان ئەو پردانە تووشی نائومێدی و خۆخواردنەوەیەکی سەیر هاتم، رەشبینی لە خۆی هەڵکێشام، رەشبینیەك ئەلبێر کامۆش لە تەمەنی خۆی تووشی رەشبینیی لەو تەرزە نەهاتووە، فشەم هات، بە خۆم و بە پێشمەرگایەتی و بە دنیا، هەستمکرد ئەو رێگایەی من گرتوومە رێك رێگای کەرایەتییە، بیرمە گۆتەیەکی سارتەر یان هی

برادەرێکی سارتەرم بیرکەوتەوە، وا بزانم ئەوهایە یان نزیکە لەوە:
هەموو ڕێگاکان بە هەوادا دەڕۆن.

هەر ئەو گۆتەیە کە بە لای هەندێ کەسەوە رەشبینترین دەربڕینە، بۆ من پێچەوانە کەوتەوە و ورەی بەبەردامەوە، ڕێگەم گرتەوە.

بڕۆ، بڕۆ، بە بن تیرۆژی کزی ڕۆژ و بە ناو قوڕ و لیتەدا بڕۆ، تەواوێك لەرووبار دوورکەوتینەوە، جادەمان لێ بەدیار کەوت، وا بەرەو جادە هەیپەی لێدەکەین، ئەگەر ئامێدی نەبا، نەمدەزانی ئێرە کوێی دنیایە، لە پێشمان بە لای چەپ لەو بەرزاییەی کە کەس نازانێت چەند بەرزە، ئامێدی کەوتۆتە ئەوێ، لای ڕاستمان نازانم کێندەرێیە، پێشمان دوای پەڕینەوە لە جادە هەورازەیەك دێتە رێ، هەورازەیەکی سەخت، بەهاری چووی سەخت بوو، بڕینی ئەو هەورازەیە گەیشتن بە زارگەلیە، گوندێکی جوان جوان، گوندێکی کەسك کەسك، بەهاری چووی کەسك بوو، بەڵام نەدەگەیشتە کەسکایی دێرەش، من شەوێك لە زارگەلی ماومەتەوە.

دەمەو عەسرە، گردۆلکەکەی سەر جادە دیارکەوت، گردۆلکەی جاشان، پڕیەتی لە جاش، بەهاری چووی رێك لێرەوە بە دووربین تەماشای ئەو جاشانەم کرد، بە دەوری مۆلگەکە پەرتببوون و پێدەچوو تەماشای دنیا بکەن، پێش ئەوەی هیچ هەنگاوێکیدی بهاوێژم، دەبێت قسەیەکیش لە دووربین بکەم، بڕوا ناکەم لە دنیایێ هیچ منداڵێك هیچ پێشمەرگەیەك هیچ جاش و سەربازێك، هیچ قاچاخچییەك، هیچ گەڕۆکێك هێندەی من حەز لە دووربین بکات، هەر لەو ڕۆژەوەی بە شاخ کەوتم لە هەوڵی بەدەستخستنی دووربینێك بووم، دەمگوت ئەوڕۆ نا سبەی دەبمە خاوەن دووربینێك، هەزار ئەوڕۆ ڕۆیشت و هەزار سبەی هات من نەبوومە خاوەن دووربین و نەبوومێ و نەبوومێ، نەبێتە درۆ رۆژێك دووربینێکم پەیدا کرد، بەڵام نەگەیشتە ئێوارێ، هێشتا تەماشای هیچ جێگەیەکی دنیام پێنەکردبوو برادەرێك بردی و ئێستاش نەیهێناوە.

بەرە بەرە لە جاشان نزیك دەبینەوە، ترسمان نیە، ڕێککەوتنێك لە نێوان

ئێمەو ئەو جاشانە هەیە، ئەو ڕێککەوتنە کێ واژۆی کردووە ئاگادار نیم، من هەر هێندە دەزانم ئەو جاشانە تەقەمان لێناکەن، ئێمەش هەروەها، نە ئەوان هەقیان لە ئێمەیە نەئێمەش، بە تەنیشتیاندا دەڕۆین و سەری خۆمان شۆڕدەکەینەوە، ئەوانیش خۆیان بە شتێکەوە خەریك دەکەن، تەماشامان ناکەن، ئا، نە ئێمە ئەوان دەبینین نە ئەوان ئێمە دەبینن! ڕێککەوتنەکە ئەوهایە، چۆنی دەڵێم ئەوهایە، بەهاری چووی ئەوهابوو، هەوکەش دەبێت ئەوهابێت، چوونکە وەکو دەڵێن ڕێککەوتنەکە درێژەی هەیە، بۆیە بێ ترس بەرەو جادە و گردۆلکەی جاشان دەڕۆین، تەنێ دەستەی ئێمە نا، هەر دەستەیەکی پێشمەرگە ڕێی بەو ڕێیە بکەوێت، هەمان ڕێککەوتنی لەگەڵ ئەو جاشانە هەیە، لە یادم بێت دەستەکەی ئومێدیش هەیانبوو.

+دەزانن دەستەکەی ئەبوو تاڵیب لێرە لێیان قەوما؟

- دەزانم، منیش لەگەڵ بووم.

من لەگەڵ نەبووم، بەڵام ئێرەش دەناسمەوە، ئەو دوو پێشمەرگەیە لە بەینی خۆیان قسەیان دەکرد، یەکیان ئەوەی لەگەڵ قەومانەکە بوو، پێشتر بۆمی گێڕاوەتەوە، ئێرە باش دەناسمەوە، بەو سێ درەختەی وا ئەو کەڤرەیان لە باوەشی خۆیان شاردۆتەوە، دەناسمەوە، باشە بەفر ڕەشبۆتەوە، وەرنا تاقە بەرد و سێ درەختم نەدەناسیەوە، بەهاری چووی کە دنیا هێند کەسك بوو هێند کەسك دەتگوت چاوی کچە دێرەشیەکەیە، جوان تەماشای ئێرەم کرد، دوای تەمەنێکیش هەگەر بەفر بزری نەکات دەیناسمەوە، ئەنگۆ نازانن بەفر چۆن شت بزر دەکات! بەهاری چووی ڕێك لێرە وا بزانم هەر دەمەو عەسریش بوو، ئا دەمەو عەسر بوو، ئاخر ڕێککەوتنی نێوان جاش و پێشمەرگە ئەوهایە دەبێت دەمەوعەسران بگەینە ئێرە، پێشمەرگەیەك وەك ئەو پێشمەرگەیەی پێش کەمێك گوتی، ئەویش گوتی:

قەومانەکە لێرە بوو، ئەوەی ئەبوو تاڵیب.

ئای ئەبوو تاڵیب، چت لە من کرد! ئای پیاوی پێکەنین تاڵ، چت لە

من کردا دواتر زۆر دواتر، دوای ئەوەی بن بەرە هاتە سەر بەرە، لە بیرمە لە بەر خۆمەوە وەك ئەوەی ورێنە بکەم، نا، نابێت ورێنە بوو بێت، ورێنە لە بیردەچێتەوە، ئەوهام دەگوت:

ئەبوو تاڵیب، تەبەت یەدا ئەبوو تاڵیب، تۆ بزانە ئەگەر کۆمۆنیستەکانیش بەرانبەر تۆ هیچیان لە دڵ نەمێنێ، لە دڵی خۆیان ئەو نهێنیانە بە نهێنی بهێڵنەوە، کە دزەیان دەکرد و دەگەیشتنە ئەو رۆژنامانەی ئەو کات لە بەغدا نهێنیەکانیان بەگۆڕێ وەردەکرد، ئەبوو تاڵیب، ئەگەر بەعسیەکانیش بەرانبەر رابردووی تۆ، ئەو رابردووەی دەکەوێتە پێش ئەوکاتەی هێشتا سەدام قاوەیەکی بۆ بانگنەکردبووی، خۆ لە گێلی دەن، یان هەر لەبیری بکەن، ئەبوو تاڵیب ئەگەر هەر حەفت خوشکەکەش هیچیان لە دڵ نەمێنێ، ئەگەر دێرەشیش لێت ببوورێ، من لێت نابوورم، ئەگەر ئومێدیش لە پێکەنینە تاڵەکەی تۆ ببوورێ، ئەبوو تاڵیب من لەو پێکەنینەت نابوورم کە تاڵترین پێکەنین بوو، بە تام تامی پێکەنینەکەی تۆم کرد، چ تاڵ بوو خودایە، ئەبوو لەهەب قەت پێکەنینی ئەوها تاڵی نەبووە، ئەو پێکەنینە ناوەختەیەت لە کوێ هێنا ئەبوو تاڵیب، بۆچی بەو شێوە منت لە خۆت رەنجاند! من چی لە بارەی تۆوە نازانم، ئەوەی لەولا و لەملا دەگوترێ، با بگوترێن، من نازانم تا کوێ راستن، نازانم چەند پێوەنانیان پێوەیە، من لە پێکەنینەکەت تووڕەم و تەواو، لە پێکەنینەکەت خۆش نابم و تەواو، ئەو پێکەنینە تاڵەی لە ساتی تاڵترین هەواڵ، بە رووی مندا رژاندت، ئەبوو تاڵ، تۆ ئیدی ئەبوو تاڵی.

گەیشتینە سەر جادە، نێوانمان نزیکەی بیست سی شەقاوێ دەبوو، من لە دواوە دووەم کەس بووم، ئەبوو گێچەڵ لە دوای من بوو، ئاوڕدەدەمەوە، دەبینم ئەو کوڕە لە شوێنی خۆی چەقیوە و بە لەرزین دەلەرزێ، یەکەم جارمە پیاوێك ببینم بەو شێوەیە بلەرزێ، گوتم هەبێت نەبێت تووشی نەخۆشیەکی سەیر بووە، ئاخر من ئەوکات تێگەیشتنم وا بوو ئەگەر پیاو بۆ لەداردانیش ببەیت، چۆکی ئەوها نالەرزێ، بە تایبەتیش

پێشمەرگە، ئاخر ترسنۆکترین پێشمەرگەش دنیایەك ئازایەتیی تێدایە، یان هێندە ئازایەتیەی تێدایە کە بێئەوەی هیچ لە گۆڕێ بێت، هیچ نەبێت نەلەرزێ، ئەوەی پێش خۆم ئاگادار کردەوە و گەڕامەوە لای، دەستیم گرت:

+ ها چ بووە، بۆچی وا دەکەیت؟

- هیچ، لێمگەڕێ، نا بەجێممەهێڵە، پێم عەرد ناگرێت.

+ تۆ لە خۆتەوە خۆت دەترسێنیت، ئەوەتە جاشەکان وا دەمانبینن و تەقەش ناکەن، ئیدی لە چی دەترسیت! دەڵێی یەکەم جارتە بێرەدا بێیت!

- دەترسم، ئا یەکەم جارمە، من وەك ئێوە نیم، هەر بمگرن پارچە پارچەم دەکەن، من بەرگەی ئەشکەنجە ناگرم، ئەو جاشانە کورد ناگرن، بشیان گرن، بەرەڵایان دەکەن، تەنها عەرەب دەکوژن.

+ قسەی قۆڕ، ئەو رۆژە جاشەکان من و تۆیان گرت، منیان ئازادکرد و تۆشیان لە سێدارە دا! جیهادیش شایەدە.

لەو کاتە جیهادیش گەیشتە لامان، ئیدی بە هەردووکمان بن پیلمان گرت، پێی عەردی نەدەگرت، بە راکێش راکێش لە جادە دوورمان خستەوە، چەندی دوورتر دەکەوتەوە، پێی باشتر عەردی دەگرت، باشم لە بیرە جیهاد دەیگۆتی:

حەیف فەهد و سەلام عادل کۆمۆنیستی وەك تۆیان خستۆتەوە، کورە ئەتو بە مە ناڵێی لە چ دەترسێی!

جیهاد شرت و شۆی ئەبوو گێچەڵی شکاند...

ئەبوو گێچەڵ دەیگۆت:

ئەنگۆ نازانن بگیرێم چم لێدەکەن، کاکە بەرگەی ئەشکەنجە ناگرم، دان بە هەموو شتێکدا دێنم، هەرچی نهێنیی حزب هەیە بە گوڕێی وەردەکەم.

ئەمنیش نەمکردە نامەردی بە شرە عەرەبیەك کە وا بزانم بەس خۆم تێیگەیشتم گۆتم:

عەمری ئەو حزبە نەمێنێ کە نهێنیی خۆی لە دەستی تۆ دەنێ.

ئێمە لەو قسانە بووین سەردەستاڕیش گەیشتە لامان، بە کوردیە سنەییەکەی خۆی کۆڵێ گاڵتەی بە ئەبوو گێچەڵ کرد، سەردەستاڕ هەر لەوێ ناوی لە ئەبوو گێچەڵ نا ئەبوو ترسنۆك، زۆردواتریش ئەبوو گێچەڵ هەر بە ئەبوو ترسنۆك ناوی رۆیشتبوو، ئاگادار بن ئەبوو گێچەڵ ناوی خۆی نیە، بە خۆی ئەبوو شتێکیدی بوو، بەڵام من لای خۆمەوە دەمێك بوو ناویم نابوو ئەبوو گێچەڵ، هەندێ لە برادەرانیش بەو ناوەی من پێیم بەخشیبوو گازیان دەکرد، یەك لەو برادەرانە ئومێد، بەوەی باش بوو ئەبوو ترسنۆك لە قسەکانی سەردەستاڕ تێنەدەگەیشت، دەنا ئەگەر ئەوکاتیش نەبا دواتر شتێك دەقەوما، ئا، ئەبوو ترسنۆك لێی خۆش نەدەبوو، دوای دەرچوونمان لە ئاقاری جاشان ئەبوو ترسنۆك بە منی گرت، تا گەیشتینە زارگەلی و سەر سنوور و گەڕانەوەمان بۆ دێرەش وا بزانم بە ژمار یازدە سووکە شەڕمان کرد، لەگەڵ....هەر لە خۆوە گێچەڵی پێمدەکرد، لەگەڵ جیهادیش ئەوها بوو، شەڕێکی لەگەڵ سەردەستاڕیش کرد، دەتگوت شەیتان تیختیخەی دەدات، من درەنگتر تێگەیشتم بۆ وا دەکات، ئەویش جیهاد تێیگەیاندم، ئەو کوڕە پێشتر پێش ئەوەی لەو رێیەدا ببینە هاوڕێ، زۆر باسی ترسنۆکیی خەڵکی بۆم دەکرد، جیهاد گۆتی:

لێی مەگرە، ناهەقی نیە، ئاخر هەموو ئەو ترسنۆکیەی لە خەڵکیی دەدیتەوە و بە خەڵکیەوەی دەلکاند، ئەوە بە چاوی خۆمان لە خۆیمان دیتەوە، بۆیە وا دەکات.

من باوەڕم بەو لێکدانەوەیەی جیهاد هێنا، نازانم راست بووم یان نا، قسەیەکی ئومێدیشم لە بارەی ئەو کوڕەوە بیرکەوتەوە، ئومێد گوتی:

لەگەڵ شەیتان بەڕێدا برۆی، لێ رێت بە رێی(ئەبوو گێچەڵ) نەکەوێت، بە دەست خۆت نیە، یان دەبێت خۆت حیزبکەیتەوە، یانیش بە بەر قونداخە تفەنگی بدەیت و هەموو لەشی ورد ورد بکەیت، ئەو پیاوە دەڵێی شەیتان لە بن گوێی دەخوێنێ و تیختیخەی دەدات!

بۆ ئەوەی چیدی ئەو ئەبووە، نەیەتە ناو گێڕانەوە، یان کەمتر بێت باشترە، شەڕە گەورەکەی لەگەڵ بکەم، واتە دەبێت خۆم بگەیەنمەوە کات و شوێنێکیدی، دەبێت لەو کەسانەش دابڕێم کە لەگەڵمن، ئێ با دیمەنێك لە شەڕەکە نیشانبدەمەوە، هەمووومان لە هۆدەیەکی گەورە دانیشتبووین، هەر لە گوندەکانی دەوروبەری گارە ئەو هۆدەی دەیلێم ئەگەر سەرچیخ نەچووبم مزگەوت بوو، ئەبوو ترسنۆك لە خۆوە، بێ ئەوەی قسە قسە رابکێشێت، گۆتی:

کورد هەمووی ناپاک و جاشن، تەماشاکە چەند هەزار جاش هەنە!

هەندێك قسەیدیشی کرد، بە لای منەوە بریندارکەر بوون، کەس قسەی نەکرد، نە عەرەبەکان نە کوردەکان، ئاخر با ئەوە بدرکێنم هەموو ئەو (ئەبوو...)ەیان دەناسی، کەس خۆی لێنەدەدا، هەندێك قسەیدیشی کرد، من بە خۆم نەوەستام، بە تێکەڵەیەك لە کوردی و عەرەبی گۆتم:

نەخێر، عەرەب هەمووی جاشن، جاشی ئیسرائیل، تۆش بەعسی، پێویستە لێرە وەك سەگ پەتکت لە مل کەن.

هەستایەوە سەرپێ و گوتی:

تۆ جاشی، هەر بزانە سێ چوار کۆمۆنیستی وەك منت کوشت و خۆت رادەستی حکومەت کردەوە، من بەعسی نیم، من کوڕی فەهدم، کوڕی حازم و سارم و سەلام عادلم.

منیش لەگەڵ هەستانەوەی وی هەستامەوە و گۆتم:

ئەگەر فەهد و سەلام عادل کوڕی ترسنۆك و خوێڕیی وەك تۆیان هەبێت، بە یەك پوول نایانکڕم.

هاواری لێبەرزبۆوە:

ئەها، نەمگوت ئەو کوڕە فڕی بەسەر حزبەوە نیە، فڕی بەسەر مارکسیەتەوە نیە، خۆ بە گوێی خۆتان گوێتان لێبوو جوێن بە شەهید فەهد و ئەوان دەدا.

من دواتر لە بەر خۆمەوە دەمگوت:

باش نەبوو لەو ژوورە هەر دوو کەر هەبوون، خۆ ئەگەر ئەوانیدیش وەك من و ئەبووگێچەڵ کەر بان، شەڕی کورد و عەرەب بەرپادەبوو.

بە چ حاڵ لێکیانکردینەوە، دواتریش پێکهاتینەوەو موو بە بەینمانەوە نەدەچوو.

نازانم لە کوێی ئەو دۆڵەین کە دەمانباتەوە زار گەلی، هێشتا رۆژ ئاوا نەبووە، لە مەترسی دەرچووین، لە جادە زۆر دوورکەوتووینەتەوە، ئاسمان تا ئێستا هەر روونە، کێوەکان سپی سپی، بەڵام رێگەوبان، رێی ئێمە بەفری پێوە نەماوە، دەزانن چ بارانێك لێیدا! ماندوو، ماندوو، ماندوو مردوو، برسی، برسی، کەس هێزی قسەکردنی نەماوە، ئەبوو گێچەڵ کە بڕیار بوو چیدی نەیەتە ناو گێڕانەوە، هیچ گێچەڵێکی پێ نەماوە، من خەو دەمباتەوە، رەنگە ئەوانیدیش وەك من بن، زرمەی تۆپێك بە ئاگای هێنایەنەوە، لە خوارەوە کەمێك دوور لە ئێمە بە عەرد کەوت، هێشتا تۆپ بە عەرد نەکەوتبوو، سادق کە رێك لە پێش منەوە دەڕۆیشت، دەواودەو بە عەرد کەوت، زراوم چوو، خەریکبوو هاوار بکەم، دیتم یەك دووێکیدیش خۆیان بە عەردی دادا، تۆپێکیدیش، دیسانەوە سادق خۆی بەعەرد دادا، تۆپی دووەم لە هی یەکەم دوورتر کەوتەوە، بەڵام جیاوازیەك لە نێوان خۆ بەعەرد دانی یەکەم و دووەمی سادق نەبوو، هەر تۆپ دەهات سادقیش هەر خۆی بەعەردی دادەدا، بە منی دەگوت:

کورە خۆت بە عەرد دادە، ئەوەی تۆ ئازایەتی نیە، کە تۆپ دێت دەبێت خۆت بە عەرد دادەیت، ساچمە، ساچمە.

منیش دەمگوت:

چ نیە، تۆپەکان دوورن، دوور بە عەرد دەکەون.

سادق دەیگۆت:

تۆپەکان دوورن، بەڵام ساچمەکان نزیکن، ساچمەکان نزیك بە عەرد دەکەون.

من دەمگوت:

کـوا هەتـا هەوکە سـاچمەیەك لە تەنیشـتت کەوتـووە، بە بـن گویتـدا هاتووە!؟

ئەو دەیگوت:

لەگەڵ تـۆ هـیچ نـاگۆترێ، کـوڕە مـردن یەك جـارە، سـاچمە جارێـك دەتسمێ و دەتتۆپێنێ.

ئەو هەر گـۆتی و منـیش هەر گـۆتم، سـەبارەت بە تـۆپ و سـاچمە نەگەیشـتینە یەك، دوای دوورکەوتـنەوەو نەمـانی تـۆپ، سـادق لـێم نزیککەوتەوە:

با قسەیەکت پێبڵێم، بۆ تۆمە، یەك شت هەیە دەبێت بیزانیت، بەوە نیە لە کەیەوە پێشمەرگەیت، تۆ نابێـت فشـەت بە تـۆپ بێـت، ئەگەر لە خـۆت بێزاریت، ئەوە شتێکیدیکەیە، ئەگەر نا، دەبێـت خـۆت بپارێزیـت، بـا پێـت بڵێم.

نەمهێشت قسەکەی تەواو بکات:

کـاکە مـن لە خـۆم بێـزار نـیم، بەڵام تۆپەکـان زۆر دوور لە ئـێمە دەکەوتنەوە.

قۆڵی گرتم:

راوەستە، با قسەی خۆم تەواو بکەم، تۆپ کە دەتەقێتەوە دەبێتە ساچمە، ئەو ساچمانە زۆر دەڕۆن، من چەند بـرادەرم وا تێچـوون، بەو کەرایەتـیەی تۆ تیا چوون، کوڕە ئەتـو وای دانـێ، هەر بە راسـتی وا دانـێ، بـۆ نمـوونە ئەتو وا لە شاری سنەی، تۆپێك لە بەغداوە دێت، سـوور دەزانـی ئەو تـۆپە لە هەولێر بەعەرد دەکەوێت، ئەتو دەبێت چ بکەیت، ها چ دەکەیت؟

وەڵامیم دایەوە:

چ دەکەم! نـزا دەکەم، بە مـاڵی ئـێمە نەکەوێـت، بە مـاڵی کەس نەکەوێت، رێك بە ناو ئەمن بکەوێت.

تەماشایەکی کردم:

ئێ، نزایەکی باشە، بەڵام ئەو نزایە نابێت بە راوەستانەوە بکەیـت، پـێش

هەر شتێك خۆت بە عەردی دادەیت ئەوجا کەیفی خۆتە چ نزایەک دەکەیت، چونکە ئەگەر خۆت بەعەرد دانەدەیت، دوور نیە فریای نزاکردن نەکەویت، ساچمەیەك لەو تۆپە بتۆپێنێ.

گۆتم:

ئەو تۆپەی لە بەغداوە هەڵدەدرێ و لە هەولێرێ بە عەرد دەکەوێت، ساچمەکەی دەگاتە سنە و من دەتۆپێنێ؟

زۆر بە دڵنیاییەوە بە پێکەنینێکی جوانەوە گۆتی:

ئا، بە دووری مەبینە، ساچمە دەڕوات زۆر دوورتریش دەڕوات، کوڕە ئەتو تێناگەیت نا، واز لەو کێشە بێنە.

دواتر زۆر دواتر، تێگەیشتم سادق لە هەموومان ژیرتر و ژیاندۆستر بوو.

پێش ماڵنووستنان گەیشتینە ئەو گوندەی دەکەوتە بەرزایی دۆڵی زارگەلیەوە، ناویم لە یاد نیە، بەڵام پێمخۆشە گوندەکەش هەر ناوی زارگەلی بێت، جێگەیەکە بەهارەکەی لە زستانەکەی جوانتر، زستانەکەشی لە بەهارەکەی جوانتر، رەنگە وەرزەکانیدیش لە بەهار و زستانەکەی جوانتربن، زۆر جوانە زۆر، بەڵام ناگاتە دێرەش، من و سەردەستاڕ، ئەو سەردەستاڕە لە خۆشەویستیەوە ئەو ناوەم لێناوە، بە راستیش ناوەکەیم لە یادە نەماوە، بەر ماڵێك کەوتین، دەوڵەمەند دیاربوون، ماڵێکی تا بڵێی خاوێن، لە هیچ گوندێك ماڵی وا خاوێنم نەدیوە، جلکوبەرگی منداڵەکانیان لە منداڵی شاری نوێتر و پاکتر بوون، سەرەتا وام زانی ئەو منداڵانە مێوانن و لە شارەوە هاتوون، بەو نیوەشەوە شیویان لێنا، شیوێکی چاکیش، مریشکیان سەربڕی، خواردنێکیان دانێ، هەتا درەنگیش لە هەر شوێنێك خواردنێکی خۆشم بخواردایە، دەمگوت خواردنێکی زارگەلیانەم خوارد.

بە بادینی قسەی لەگەڵ ماڵەکە دەکرد، بەڵام چ بادینیەك! یەك دوو وشە و رستەیم لە بیر ماوە، بە ئاگری دەگوت (ئاڤر) ئاخر بە زاراوەی

خۆیان ئاگر ئاورە، واش تێگەیشتبوو، دەنگی (و) بگۆڕە بۆ دەنگی (ڤ) لە خۆوە وشەکە دەبێتە بادینی، گوێ لەو رستە بادینیەی بگرن (چیایەك لە سنە هەس ناڤا ئەڤ ئاڤیەرە) پیاوی ماڵەکە لە رێی ئەو بادینیەوە زۆر بووە برادەری، دواتر گۆتی:

کاکە تو ب زمانێ خۆ باخڤە ئەززی ب زمانێ خۆ داخڤم، هۆسا باشترە.

من هەڵم دایێ:

گەلەك باشترە، ئەو کات لە یەکتر تێگدەگەن.

کابرا گۆتی:

خودێ تو راست دبێژی.

سەردەستاڕ گۆتی:

دیارە من خڤار دەبێژم! ما برا، ڤا دیارە بادینی من نە خاسە، ها!

کابرا بە پێکەنینەوە گۆتی:

ئەز خولام، خودێ ئەز ب تنێ تو ناسدکەم، چ جارا من خاسە نەدیتیە.

ئیدی بووە پێکەنین، منداڵەکان خەنی بوون، منداڵەکانی خەنی کرد لە پێکەنین، منداڵناسێکی سەیر بوو، دەیزانی چۆن شەرمیان دەشکێنێ، لە ماوەیەکی کورت زۆر کورت شەرمنترین منداڵی دەخستە هەلەکەسەما، هەرچی یاری منداڵانە هەبوو لە دنیا دەیزانین، منداڵەکانی پڕکرد لە یاری، لە سەر خەوتن بووین کابرا پرسیارێکی کرد، خۆزگە نەیکردایە:

ئەرێ پێشمەرگەیەکی عەرەبتان هەبوو، ناوەکەی کوردی بوو، ناوێکی خۆش بوو، وا لە سەر زارمە، زۆر پێدەکەنی پێکەنینێکی خۆش، وەختانێك زۆر رێی دەکەوتە ئێرە، دەمێکە نایبینم، لە کوێیە؟

من قسەم نەکرد، سەردەستاڕ وەڵامی دایەوە، بەڵام کابرا چەندی دەیویست باوەڕ بە وەڵامەکەی سەردەستاڕ بهێنێ، باوەڕی نەدەهات، رەنگە ئێستاش باوەڕی نەهاتبێت، لە بیرمە ئەو شەوە لەوێ خەونم بە ئومێدەوە دیت، لەو خەوە یەك باوەش کتێبی بۆم هێنابوو، بەڵام نەمدەتوانی

ئێوەربگرم، رووبارێکمان بەین بوو، دەستمان نەدەگەیشتە یەك.

بەیانیەکەی پەنیرێکیان دانێ، تا ئەودەم پەنیری وا خۆشم نەخواردبوو، ئەو پەنیر و ئەستووکی گەرم و چایەی لەو ماڵە خواردمان، لەبیر ناچێتەوە، رۆیشتین، لە بری ئەو هەموو خزمەتەی ئەو ماڵە بە ئێمەیان کرد، ئێمە چیمان بۆیان بەجێهێشت! کۆڵێ ئەسپێ، لە دێرەشیش هەر ئەسپێ، هەر ئێمە نا پێشمەرگە جگە لە ئەسپێ چی بۆ خانەخوێ بەجێدێڵێ! بەڵام سەردەستار لە رێ دەیگوت:

نا من شتی بە نرخم بۆیان بەجێهێشت، هەندێ یاریم فێری منداڵەکانیان کرد، قەت لەبیری ناکەن، دوای بیست ساڵیدی، یادم دەکەنەوە.

ئەو قسەی سەردەستار چووە دڵمەوە، کە دەچیتە ماڵێك هیچ لەوە گرنگتر نیە کە دڵی منداڵەکانی ئەو ماڵە خۆش بکەیت، سەردەستار دڵیانی خۆشکرد.

ئاسمان روونە، چیاکان سپی سپی، رێگا قوڕ و لیتە، شەختە تاوایتەوە، نیوەڕۆیە، گەیشتینە چیایەك، گوتیان ناوی وی (بزنیك)ە یان ناوێکی نزیك لە بزنیك، هەورازەیەکی سەختە، رکە، پێ دەڕوا، خلیسکی وا دەبەین، مامز بیبا، خۆی پێناگیرێتەوە، پێشمەرگەیەك گوتی:

ئەوە بزنیك نیە بزنترێتەیە.

ئەویدی گوتی:

بزن بترێنێ، دەبێت ئێمە چ لێبکات!

یەکیدی گوتی:

با کەس لە دوای من نەڕوا، تۆباڵی خۆی لە ملی خۆی.

جیهاد گوتیە من:

وا بزانم ئەورۆ هەر پێماندەکرێ تری یەکدی بژمێرین.

منیش لەسەرەخۆ گوتمە جیهاد:

دەها جارێ ئەوە بگرەوە.

دەبێت لێرە تێهەڵکێشێك بکەم، تێهەڵکێشێکی یادەوەریانە، نەك

ڕەوانبێژیـانە، هەر لەو شـوێنە بەڵام لە کاتێکیـدی، لەگەڵ دەسـتەیەکیدی، واتە ئێسـتا لە سەردەسـتاڕ و جیهـاد و ئەبـوو گـێچەڵ و قاسـم و ئەوانە دادەبڕێم، دواتر دێمەوە لایان.

ئـێ، ئێـرە هەمـووی کەندولەنـدو دار و بەردە، گـابەردی وا بە پێـوە وەستاوە کۆپتەر دەتوانی خۆی لە پەنای بشارێتەوە، کەنـدڕی وا ڕاکشـاوە هۆزێک لە خۆی جێدەکاتەوە، ئەو دیمەنەی خەریکە نیشانیبدەمەوە حەزم بە نیشـاندانەوەی نەدەکـرد، مـن لە گێـڕانەوەی تەقوتـۆق لاڵەپـتم، لە گێڕانەوەی تەقوتۆق دەترسێم، جگە لەوەش خەڵکانێکی زۆر هەن، زمانیـان بە گێڕانەوەی تەقوتۆقەوە گرتووە، ئەوان لەگێڕانەوەی ئەو شتانە بێبەشـمان نـاکەن کە مـن خۆمیـان لێـدەپارێزم، بەڵام پێشـمەرگایەتی خـۆی زادەی تەقوتۆقە و بێ ئەوە لە واتاکەی خۆی کاڵدەبێتەوە، بۆیە لە ناچاریەوە لێـرە و لەوێ چەند ڕستەیەك لە تەقوتۆق دەگێڕمەوە.

ئەبوو ئایار هەر لە نیگارکێشـان نـا لە شـەڕی کـۆپتەریش دەسـتڕەنگین بوو، ئەگەر چەمکی دەستڕەنگینی لە شەڕەکاندا جێگەی ببێتەوە یـان شـەڕ جێگەیەکی بۆ بکاتەوە، ئەبوو ئایار دواتر لە جێگەیەکیتر بە مەرگـی خـۆی دوا تابلۆی خۆی بۆ ژیان نەخشاند، خۆی کردە گۆڕی وەڵات.

ملازم شێرزاد وا بـزانم تـاکە شـێرزاد بـوو مـن دیتبێـتم کە نـاوەکەی لەگەڵ خـۆی بێـتەوە، هەر بە ڕاسـتی دەتگـوت زادەی شـێرە، لە هـیچ مەترسـیەك نەدەگەڕایەوە، نەدەپرینگـایەوە، مـن ئەو شـێرزادەم لە تەنگـانە دیوە، لە ساتی گوللەبڕانێ ئەو سروودی خۆی هەر دەگوتەوە، سروودێکی لە سـەر زاری بـوو، مـن ئەو دەم و دواتـریش هەر ئەو نیـوە دێـڕەیم لەبەر بووە:

لە شاگردانی فەهدی قارەمانین، قارەمان...

شـێرزاد لە نـاو تەقە و لەگەڵ خوێنـدنی ئەو سـرووده و سـروودیدی، ئـاخر شـێرزاد سـروودی (ئەی ڕەقیب)یشـی دەخوێنـد، دەکەوتە بـاری حاڵگرتنەوە، ئا، وەك دەروێشـان حاڵیـدەگرت، مـن لەو کـوڕەوە گەیشـتمە

ئەو باوەڕەی مرۆڤ بۆ ئەوەی ئازابێت دەبێت حالگرتن بزانێت، چەندی کردم بە تەواوی فێری حالگرتن نەبووم، بۆیە رۆژێ لە رۆژان لە ئاقاری شەڕەکاندا ئەو ئازایەتیەم لە خۆمدا نەدیتەوە کە دەمویست، نەبوومە ئەو جانگۆریەی ویستم بوو، شێرزاد دەتگوت نانێکی لەگەڵ گیڤارا خواردووە، دەتگوت شان بەشانی گیڤارا شەڕی کردووە، ئەو گیڤارایەی من لە کتێبان خوێندبوومەوە، ئەو شێرزادەی لە کنە خۆم بوو، هەستمدەکرد لێکنزیکیەکی زۆر نزیك لە نێوان ئەو دووەدا هەیە، ئەگەر رۆژێك کەسێك لێمبپرسێ:

ئەرێ لە ناو پێشمەرگان ئەوانەی لە دوور و نزیکەوە دەتناسین، کێ هەژی ئەوەیە پێی بگوترێ گیڤارای کوردی؟

نازانم دادەمێنم یان نا، بەڵام وەڵامەکەم ئەوها دەبێت:

زۆر هەن، بەڵام ئێستا هەر ملازم شێرزادم لە یادە.

بەر لەوەی کۆپتەرەکان بگەن، دەبێت هەواڵی ناخۆش رابگەیەنم، دواتر زۆر دواتر، سیامەند ئای سیامەند، کۆپتەر زەفەری پێنەبردی، کیمیا زەفەری پێ نەبردی، مارێك لە نیوە شەودا رێی پێگرتی و پێتی گرت و پەرداخێك ژەهری رژاندە خوێنتەوە.

دواتر زۆر زۆر دواتر، ملازم شێرزاد لە شەڕی کەرکووك، شەڕی هەڵاتن، سروودی چڕی و حاڵی هاتێ و بەرسینگی لەشکری گرت و کۆتایی بە چیرۆکی ئەو جەنگاوەرە هات کە من لای خۆمەوە ناوم لێنابوو گیڤارای کورد، بەر لەوەی تەقە دەستپێبکات حەزم لێیە وێنەی یەکەم دیداری خۆم لەگەڵ شێرزاد نیشانبدەمەوە، لە دەڤەری گارە بووین، کۆمەڵە پێشمەرگەیەك هاتن، گوتیان:

ئەوانە لە دەرەوە دێنەوە، لە سوریا، لە یەمەن، لە سۆڤیەت...

لە ناویان کوڕێکی باریکەلەی درێژ زۆر درێژ ، گەنج هەر لە تەمەنی ئەوکاتی من بوو، زۆر بە گەرمی تۆقەی لەگەڵم کرد و ماچی کردم، من سەرەتا وام زانی دەمناسێت، سەرنجم دا هەر لەگەڵ من نا لەگەڵ هەمووان

ئەوها گەرمە، قسە قسەی راکێشا، ئەو کوڕەی لە چاکوچۆنی زۆر گەرم بوو، زوو زانیم ناوی ملازم شێرزادە، قسەی هێنایە سەر شیعر و شاعیران، تێگەیشتم کە شیعر دۆستە، بە پرسیارێکی من عەبدوڵا پەشێو هاتە ناو قسانەوە، شێرزاد گۆتی:

کەس هێندەی من عەشقی شیعرەکانی پەشێو نیە،(شەو نیە خەونتان پێوە نەبینم) بەردەوام لە ناو کۆڵە پشتم بوو، لە ناو جانتام بوو، بەڵام لەمێژە لام نەماوە.

بە خۆم نەوەستام، رێم لە قسەی گرت:

چی وای کرد لێی بتۆرێی؟

بە پێکەنینەوە:

من لێی بتۆرێم، نا بە تەواوی خەتمم کردووە، من لەم بارەیەوە لە هەموو مەلایەك مەلاترم، چەند مەلا سەرلەبەری قورئانی لەبەرە؟ دە، من هەرچی شیعری پەشێو هەیە لەبەرمە، پێویستم پێنیە ناملیکە شیعرەکانی لە کنم بن، بەڵام هەڵە تێمەگەن مەبەستم بەراورد لە نێوان قورئان و شیعر نیە.

گۆتم:

باشە ئەو شیعری (لە دەستم دێ).....

نەیهێشت رستەکەم تەواو بکەم:

لە حەمە جەزام جوانتر لەبەرە، گوێ بگرە:

لە دەستم دێ کاتژمێری کامەرانیت بوەستێنم

ئەلقەی پەنجەت پێ فڕێ دەم نامەی بەختت بسووتێنم....

ئەو رۆژە ملازم شێرزاد دوو ناملیکە شیعری پەشێوی بۆم خوێندەوە، دەیگوت:

دوای رووخانی رژێم، ئەگەر لە دەستم بێت و بە قسەم بکەن پەیکەرێکی پەشێو لە هەولێرێ و لە بەردەم باخی شار دادەنێم.

قەت نەمبیستبوو، نەمدیتبوو، ملازم هەبێت لە دنیا هێندە عەشقە شاعیر

بێت، ملازم شێرزاد کاتێ ڕێی کەوتبووە سۆڤیەت بۆ دیداری پەشێو چەندان شاری کردبوو، نەیگرتبوو، دەیگوت:

کورە دنیام لە دووی کرد، نەبوو، گۆتیان سەفەری لیبیای کردووە.

نازانم کێ بوو گۆتی:

- چ ئیشت پێی بوو وا لە دووی دەگەڕایت؟

+ هیچ، هەر حەزم دەکرد ببینم و وێنەیەکی لەگەڵ بگرم.

ملازم شێرزاد دەیگۆت لە سۆڤیەت بە دوای دوو کەسدا زۆر گەڕام بە دڵ حەزم دەکرد بیانبینم، یەکیان پەشێو ئەویدی کلاشینکۆف بە داخەوە هیچیانم نەدیت.

نازانم کێ بوو بە سەرسووڕمانەوە پرسی:

لە دووی کلاشینکۆف دەگەڕای!

ئا، ئەو کلاشینکۆفە نا کە لە شانی من و تۆیە، ئەو کلاشینکۆفەی ئەو کلاشینکۆفانەی درووستکردووە.

پێشمەرگەیەك وا بزانم ئەبوو حوسێنی ناو بوو لە بەرخۆیەوە وا بزانم تەنها من گوێم لێبوو گوتی:

کەر دایکت بگێت کلاشینکۆف، لەگەڵ شتی درووستت کردووە.

ملازم شێرزاد ڕێتادا کۆپتەرەکان بگەن، ڕێتادا سەرهاتی کۆپتەر بگێڕمەوە، ڕەنگە واش نەبێت، دوور نیە ترسی کۆپتەر، ترسی گێڕانەوەی بەزمی کۆپتەر، زراوچوون لە تەق تۆق، سەرهاتی شێرزاد درێژ و درێژ بکاتەوە، لە کۆپتەرم دووربخاتەوە، دڵنیام یان نزیکم لە دڵنیایی ئەوە ترس لە کۆپتەرە هەڵمدەگرێ، دەمبات دەمبات، لەو جێگایانە بە عەردم دادەدا کە شوێنپێی شێرزادیان پێوەیە، جا شوێنپێی شێرزاد بە کوێوە نیە، بستە زەویەك هەیە چ لە گەرمیان چ لە کوێستان نا ئاشنا بە ملازم شێرزاد.

من هەندێك کەسم دیتبوو لە سەر لێواری مەرگ بێ ترس سروودیان دەچڕی، یەکێك لەوانە شێرزاد بوو، سروودچڕینیش لەو ساتانە لە دەستی کەم کەس دێت، لە زۆر جێگەی مەرگاوی گوێم لە سروودی شێرزاد

بـووە، لە سـاتەکانی ڕاپەڕینـیّ لەو مۆڵگـانەی هێشـتا کەسـیان لـیّ نزیـك نەکەوتبۆوە، هێشتا هێـزی پاتـاڵ لە دوورەوەش نەیـدەوێرا سـەیری بکـات، شێرزاد لەویّ بوو، لەویّ سروودی دەگـۆت، شـێرزاد هێشـتا پێشـمەرگە لە خەویّ بوون ئەو گەیشـتە سـەری هەیـبەت سـوڵتان و هەیبەتـی قاسـماغای وردوخاشـکرد، هەمووتـان لەبیرتـانە ئەو سـاتانەی هەرچـی کـورد بـوو هەڵدەهات، بە چەکـدار و بێچەکەوە، بە سـەرکردەو بنکـردەوە، بە ورد و درشـتەوە، ئەدی کـیّ لە بیریەتـی تەنهـا چەنـد کەسـێك لە کەرکـووکیّ بەرسینگی سوپایان گرت! من پێتان بڵێم یەکێك لەو کەسانە ملازم شێرزاد بوو، لەویّ سروودی دەگوت، ئەو شێرزادە خەڵکی شاری ئایشەگوڵ بـوو، ئەگەر کەسێك ویستی بزانێت شاری ئایشەگوڵ کەوتۆتە کویّ، بـا ڕۆمـانی (خەوی پساوەی قەنـدیل) بخـوێنێتەوە، لەویّ ئایشـەگوڵێك هەیە ئاشـنایەتی لەگەڵ ئەو ئایشــەگوڵە هەیە، شــێرزاد خەڵکــی ئایشــەگوڵ بــوو، ئەجەل هەڵیگـرت و بـردیە بـابەگوڕگوڕ، شـێرزاد لێنـاگەڕیّ کۆپتەرەکـان بـگەن، لێناگەڕیّ گەشتە زستانی و بەهاریەکەم تەواو بکەم ئەو گەشـتەی لە کـانی تـوبەوە دەسـتپێدەکات، دەڕوا دەڕوا تـا دەگـاتە جەنـدرمەکانی تـرك و لەوێشەوە دێتەوە کانی توبە، وا بڕوا ئومێدیش لە بیـردەکەم، ئەو ئومێـدەی لەو گێڕانەوەیەدا سەرەداوی بزربـووی سـەرهاتە، دەبێـت بیبینـنەوە، باشـترە ماڵئاوایی لەو جێگایانە بکەم کە سیمای شێرزادیان بە کەتیرەی یادەوە پێوە نووساوە و دوای ئەو هەموو ساڵانە لێنابێتەوە.

کورە خۆ بشارنەوە.

ئەو هاوارە ئێستاش لە کـاتی دیتنـی کـۆپتەر دێـتە گـوێم، ئەوە دەنگـی سەردەستە بوو، کوڕێکی بەسـراویی ڕەنـگ کەمێـك خورمـایی ئەو جـۆرە خورمـایەی ڕەنگـی خـۆی بە لای ڕەشـیدا دەبـاتەوە نەك ڕەنگەکـانی دی، نازانم بۆچی ناویم لە یاد نەماوە، بە سیما لە ناو چاومە دوای تەمەنێکیدیش بیبینمەوە دەیناسمەوە، مێشکیش ئامێرێکی سەیرە هەر لە خۆوە هەنـدیّ نـاو لە خـۆی دەردەهـاوێژیّ و دەڵێـی قەت ئەو نـاوە میـوانی نەبـووە، هەنـدیّ

ناویش هەیە هەتا رۆژی پووکانەوە دەیهێڵێتەوە و فڕێینادا و نادا، ئەو کوڕە رەنگ خورماییە ئەورۆ نیە ناویم لە بیرچۆتەوە، لە زۆر کەسیشم پرسی:

ئەریّ کوڕێك هەبوو رەنگ خورمایی، بەژنیش هەر دار خورمایی، دەنگ رووباری، رۆیین شەپۆلی، ناوەکەیتان نایەتەوە یاد؟

زۆر نیشانەی ئەو کوڕەم هەڵدا کەسێك ناوەکەی هەڵنەدا....من بەر لەوەی چاو لە پەنایەك، کەندڕێك، بەردێك بگێرم چاوم لە ئاسمان گێڕا هیچم نەدیت، چاوم لە دەوروبەر گێڕا وەك فرفرۆکە بە دەوری خۆمدا سووڕامەوە هیچم نەدیت، کوڕە رەنگ رووباریەکە کە لە پێشەوە دەڕۆیشت و جێگەی وی لە هی ئێمە بەرزتر بوو بە هاوارێکی نزمتر هاواریکرد:

کۆپتەر کۆپتەر ئەوەتە لە دواوە...

کاتێ ئاوڕ دەدەمەوە، دەڵێم خۆزگە ئاوڕم نەدابایەتەوە، لە دواوە زۆر لە ئێمە نەویتر، لە بیرتان بێت ئێمە بە هەورازەیەکدا هەڵدەگەڕێین، ئەگەر لە چنگی کۆپتەر دەربچین و بگەینە سەری سەرێ، هیچ گومانم نیە سەرمان لە ئاسمانێ دەسووین، چیای ئەوها بەرزم لە دنیایێ نەدیتیە، دەبینم ئەوە دوو کۆپتەر لە دواوە نەرم نەرم بێ دەنگ بێ دەنگ، دۆلاودۆل بە دوای ئێمەوە هەڵدەگەڕێن، پێدەچوو هەورازی رك هەورازی بێ کۆتایی ئەوانیشی ماندوو کردبێت، نزیك نزیك هێندەی نەماوە بمانگەنێ، سەیر بوو لەو کشوماتیەی دنیا دەنگیان نەدەهات، نازانم نە ئەو کات بوو نە دواتر قسەیەکی ئومێدم هاتەوە بیر، رەنگە دواتر بوویێت چونکە بڕوا ناکەم ئەو کات لە ترساندا بیرم لە بارێکی وا بوویێت شتی بە بیربێتەوە، ئومێد دەیگوت:

کۆپتەر و ئەبوو گێچەڵ لە یەك شت زۆر بە یەك دەچن هەردووکیان کاتێك بەرە و رووت دێن، دەنگیان نیە، بەڵام کە لێت رەتبوون دەیکەنە دەنگە دەنگ.

خۆمان شاردەوە لە بن بەرد و ناو کەندڕ و بن تەڕاشان خۆمان

شاردەوە، من خۆم هاویشتە نێوان دوو تیشە بەرد، پێدەچوو پێشتر بەردێك بووبێت و بووبێتە دوو، ڕەنگە خوداوەندی دڵنەرمی بەرد زانیبێتی ڕۆژێك لە ڕۆژان پێشمەرگەیەك کۆپتەر ڕاوی دەنێ و جێ نیە خۆی لێبشارێتەوە، بۆیە ئەو بەردەی کەرت کردووە، یان دوو بەردی بە تەنیشت یەکەوە داناوە و کەلێنێکی هێشتۆتەوە کەلێنێك من بە کەمێك خۆ باریککردنەوە پێوەی دەچم.

لەو ڕۆژەوەی بە چیاوچۆڵان کەوتووم، هەمیشە نزامکردووە لە کۆپتەرم بە دوور بگریت، لە بیرمە زۆر جار لە ماڵان یان لە ڕێوبان کاتێ پیاوێکم دیتووە لە سەر بەرماڵ بە گاڵتەوە دەمگوت دوور نیە جۆرێك لە ڕاستیشی تێدا بووبێت:

توخوا کە نوێژەکەت تەواو بوو، بە زمانی منەوە ڕوو لە خوا بکە و بڵێ:

خودایە لە شەڕی کۆپتەرمان بە دوور بگرە .

کەرەتێ کابرایێ گوتی:

مادام ئەوە دەزانی، بۆچی خۆت نایەیتە سەر بەرماڵ و لێیپاڕێیتەوە و داوای لێ بکەیت.

هیچم نەبوو بۆ گوتن، وا بزانم گوتم:

لە تۆ باشتر تێدەگات.

کۆپتەر ترسناکە، ئەوانەی شەڕی کۆپتەریان دیتووە، لەوان بپرسە، ئەوان دەزانن چیە! شەڕی کۆپتەر هەر بە قسە بە خودای بە قسەش خۆش نیە، من لە فیلم زراوم لە کۆپتەر چووبوو، ئەوجا وەرە هەر بە ڕاستی و ڕاست و ڕاست کۆپتەر لە سەر سەرت بێت و داتبێژێ!... زرمەی یەکەم زرمەیەکە مردن لەبیربچێتەوە ئەو زرمەیە لە بیرناچێتەوە، چیا هیچ چیایەك گوێی لە زرمەی وانەبووە، تا دەرەنگ گوێم لە هیچ زرمەیەکیدی نەبوو، دواتر پێکەوتم کە وڕو کاس ببووم، دەنا زرمەکان پسانەوەیان نەبووە، لە عەرد و ئاسمان ئاسن، ساچمە بەر یەکتر دەکەوتن، دەنگی پیاوە دەنگ

ڕووباریە سیما خورماییەکەم ناسیەوە:

تەقە نەکەن، تەقە نەکەن...

تەقەی چی، دەویرم تەقە بکەم، وەها خۆم نەخستۆتە کەلێنی بەردانەوە دەستم بخەویتە تفەنگ و تەقە بکەم، دیتەوە بیرم وەرز وەرزی بارین بوو، بەڵام ئاسمان هەموو ئاسمان یەك تیلمە هەوری پێوە نەبوو، دنیا کەسك کەسك دواتر دوای ئەوەی چاوی کچە دێرەشیەکەم دیت جوانتر کەسکایی ئەو جێگەیە لە چاوم کەسکتر دەچۆوە، کۆپتەرەکان واز ناهێنن، دەڵێی ئێمەیان دیتووە، ئەو بۆردوومانە چڕ و وردە هی ئەوەیە کە هەستیان بە بوونی ئێمە کردبێت، لە بیرمە، باشم لەبیرە، خۆزگەم دەخواست لە پڕدا پەرجوویی هەورێکی تیر بەری ئاسمان بگرێت، عەرد و ئاسمان ببێتە ئاو، ئەوها نەبێت کۆپتەرەکان لە کۆڵمان نابنەوە، بە دزیەوە تەماشای ئاسمانم دەکرد بزانم خۆزگەکەم نزاکەم نەهاتۆتە دی، خۆزگەیەکیدی یان نزایەکیدی ئەوەبوو کە چەند فڕۆکەیەکی ئێرانی پەیدا بن و ئەو کۆپتەرانە راو بنێن، نزایەکیدی ئەو دوو کۆپتەرە لەو هەموو سووڕانەوەو بەرز و نزمبوونەوەدا خۆ لێکبدەن و لەو سەری دنیایێ بە عەرد بکەون، وا بزانم نزایەکی ئەوهاشم کرد:

ناکا دڵی هەردوو کۆپتەروانەکە لە ڕێی ڕێککەوتەوە لە لێدان بوەستن، وا دیارە نزاکان بڕ ناکەن و ناگەنە جێی مەبەست.

نازانم بێدەنگی و وەك دەڵێن سەرشۆڕکردنەوە و خۆ حیزکردنەوە چەندی پێچوو، تفەنگ شاردنەوە نەوەك بریسکەی بێت چەندی پێچوو، هێندە دەزانم پێشمەرگەیەك تەقەی کرد، ئەوجا ئەوە نازانم ئەو تەقەیە لە ئازایەتی بوو، لە کەرایەتی بوو، لە ترسان بوو یان لە ژیری، نازانم لە کامیانەوە بوو، لە بیرم بێت بیستبووم تەقەکردن ئەو چوار جۆرەی هەیە، ئیدی تەقە لە عەردیشەوە دەستپێکرد، لە پێشمەرگەشەوە دەستپێکرد، هەتا ئێستا هەر لە ئاسمانەوە بوو لە کۆپتەرەوە بوو، هەتا بە چاوی خۆت شەڕی کۆپتەر نەبینی، نازانی چەند بە سامە، نازانی کۆپتەر هێندە چوست و

لەشسووکە، ماسی چۆن لە ئاودا مەلە دەکاو تیژ دێ و دەچێ و کۆپتەریش لە ئاسمانێ لە هەوادا رێك وەك ماسیە، لە ماسی تیژتر مەلە دەکات تەنیشتان دەگۆڕێ، ستوونی بەرز و نزم دەبێتەوە، رێك ئەوەی ماسی دەیکات کۆپتەریش دەیکاتەوە بە زیادیشەوە، من دەترسام کۆپتەر بە دەست بمانگرن و فریای خۆکوشتنیش نەکەوین، ئاخر هەبووە بە دڵ لە باری ئەوها وەك ئەوەی ئێمە حەزی کردووە خۆی بکوژێت پێرانەگەیشتووە، بە خۆکوشتن رانەگەیشتووە، هەڵبژاردنی ساتی خۆ کوشتن بۆ پێشمەرگە وا ئاسان نیە، بڕیارێکی وا لەو ساتە دەدرێ کە دڵنیابیت سەد لە سەد دڵنیابیت کە رێگای دەربازبوون بەستراوە و نابێتەوە، ئەوەی لە پێشە رێگەی مەرگە، گەیشتن بەو دڵنیاییەش ئاسان نیە، رەنگە نەگەیشتن بەو دڵنیاییە لە ژیاندۆستیەوە هاتبێت، ئیدی رەنگە هەتا لەگەڵ خۆت ئەو کێشمەکێشمە یەکلادەکەیتەوە، بە دەست و پێ بەستراوی خۆت لە ناو کۆپتەر ببینیتەوە، من لەوە دە ترسام، من بیرم بۆ خۆ کوشتن چوو، با ئەوەش بڵێم لەوێوە تێگەیشتم بڕیاری خۆکوشتن هێندە سەخت نیە کە پێشتر لە لای من زۆر سەخت بوو، بۆ گاڵتەش نەمدەتوانی بیری لێبکەمەوە، لەوێ تێگەیشتم خۆکوشتن ئازایەتیەکی ئەوتۆی ناوێ، مادام لە کەشێکی حاڵگرتوودایت، تەنها چەند (حەی حەی)ێکی شۆڕشگێڕانەی دەوێت و تەواو، دیارە نزیکبوونەوە لە خۆکوشتن لە ترسی دیلیەوەیە، نەك سبەی رۆژێ بڵێن پێشمەرگەیەکی چەند بێ غیرەت بوو، کۆپتەر بە چەکەوە گرتی، من وا بووم نازانم ئەوانیدی، من گاڵتەم بەو قسانە دەهات، من لە دیلیەتی دەترسام و تەواو، حەمە رەشاشم بیردەکەوتەوە، ئەو پێشمەرگەیەی لە شەڕێك بە برینداری کەوتە دەستی دوژمن، فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو، دەیگوت دوو دەمژێر مابوو ملم بە پەتەوە بکرێت، سەدام حوسێن لێبوردنێکی دەرکردبوو، حەمەشی گرتەوە، من زۆر جار بە گاڵتە بە حەمەم دەگوت: سەدام حوسێن ئەو چاکەیەی لەگەڵ کردی کەچی دووبارە چەکیشت دژی هەڵگرتەوە! دەمگوت لە هەموو

هەورێك باران نیە ئەوەی بۆ حەمە رەشاش هاتە پێشێ پەرجوو بوو، پەرجووش هەموو رۆژێك روونادات.

لە بیرم نیە چەندەمین کەس بووم کە یەکەم دەسڕێژم هاویشتە ئاسمانێ، لە بیریشم نیە ئەو دەسڕێژە دەکەوتە کام خانەوە خانەی کەرایەتی، ژیری، ئازایەتی، ترس، بەڵام ئەوە دەزانم دوای ئەوەی چەند دەسڕێژێکم کرد هەستم کرد ئەو ترسەی هەموو گیانمی داگرتبوو رەویبۆوە، ئەوجا نازانم ئازایەتی جێی گرتبۆوە یان کەرایەتی، لە بیرمان بێت قسەیەك هەیە دەڵێت ئەو داوەی ئازایەتی و کەرایەتی لێك جیا دەکاتەوە زۆر باریکە، لەوێ بۆ یەکەم جار هەستمکرد کەمێك حاڵم گرتووە، پێشتر فشەم بە حاڵگرتن دەهات، بە لای منەوە زەحمەتترین شت لە شەڕێ جێ گۆڕینە بەرد گۆڕینە، تۆ کە دەزانیت کەوتوویتە ناو سێرەوە، جێت ئاشکرا بووە و گوللەکان ساچمەکان رێکاو رێك بۆ ناو چاوت دێن، هیچ چار نیە دەبێت چاو لە جێگەیەکیدی لە بن بەردێکیدی بگێری، بەڵام چۆن ئەو کارە دەکەیت؟ ئەوە پرسیارە سەربازیەکەیە، لە ساتەکانی جێگۆڕکێ، جێگۆڕین هونەرێکە لە هەموو هونەرانی شەڕ هونەرتر، من دەبوو ئەو بەردەی هەتا ئێستا خۆم دەخیلی کردووە بە بەردایەتی خۆی کە گرنگترە لە پیاوەتی لە گوللە و ساچمان پاراستوومی، دەبوو بە جێی بێڵم نیشانەکان دەیانگوت، تا زووە بڕۆ بن بەردێکیدی دەنا لە تڕێ سەی دەچیت، من کە هیچ ئاشنایەتیەکەم لەگەڵ خودا نەبوو، بەڵام هاوارم بۆی برد کە لە کۆپتەران بمپارێزێت، بمگەیەنێتە پەنایەك ئەوی ئاسنە نەیگرێتەوە، لەو لاوە بەردێك هەر بە بانگکردن بانگمی کرد، مەبەستمە بڵێم پەنایەکی چاك بوو، نزیکیش بوو پەلامیزەم هاویشتبا دەگەیشتێ، بەڵام گەلێك دووریش بوو، لەوتەقوتۆق و ئاسن بارینەدا لە چاوی منەوە گەلێك دوور بوو، هەستمدەکرد لە نێوان من ئەو بەردە دەریایەك هەیە دەریای ترس، لە نێوان من و ئەو بەردە بیابانێك هەیە بیابانی بزربوونی یەکجارەکی و نەدیتنەوە،

گوێشم لێبوو نازانم شێخ شوان بوو یان کەسێکیدی دەیگوت:
هەوڵدە جێت بگۆڕە، جێت خراپە.

جێگۆڕین لە شەڕێ لە چەند شتێکەوەیە من لێرە ئیشم بە دووانیان هەیە، یەکەمیان ترس دووەمیان لێزانین، ترس ئەوەیە تۆ لە ترسان لە شوێنی خۆت ئۆقرە ناگریت، ئەوجا جاری وا هەیە جێگەکەت قایمە بەڵام ترس لە شەڕ وات لێدەکات ئەوێ بەجێبهێڵیت، وا دەبینیت هەموو جێگاکانیدی لە جێگاکەی تۆ، لە بەردەکەی تۆ پەنادارتر وقایمتر و بێ مەترسیترە، هەرچی لێزانینەکەیە ئەوەیان دەکەوێتە خانەی هونەری شەڕەوە، تۆ کە جێگاکەت گوللە بگریتەوە، دەبێت چاو لە جێیەکیدی لە بەردێکیدی بگێڕیت، ئەگەر وا نەکەیت ئەوە کەرایەتیە، من دەمویست بەردەکە بە بەردێکیدی بگۆڕم، پێش ئەوەی داوای جێگۆڕینیشم لێبکەن من دەمویست بیگۆڕم، ئەوجا نازانم ئەوەی من لە ترسان بوو یان لێزانین.

بەرد گۆڕین دژوارە، لە کنە من گەلەك دژوارە، لە مێژووی شەڕەکاندا چ بە دووری نابینم نیوەی شەڕڤانان ئەوانەی کوژراون لە ساتی بەرد گۆڕین لە ساتی پەنا گۆڕین، بەردەکان بووبێتە کێلیان، ملازم شێرزاد جارێك بۆی گێڕامەوە، بەڵام باشم لەبیر نیە بە زمانی خۆیەوە قسەی دەکرد یان سەرهاتەکە لە سەر زمانی جەنگاوەرێکیدیەوە بوو، شێرزاد ئەوهای گێڕایەوە:

لە دەو چەمێك لە بن بەردێك سەنگەرم گرتبوو بەردەکە هەر چوار پێنج هێندەی سەری سەرۆك دەبوو- شێرزاد زۆر شتی بە سەری سەرۆك بەراورد دەکرد بەڵام کەس تێنەدەگەیشت ئەو سەرۆکە کێیە سەرۆکی چ دەوڵتێکە هی چ حزبێکە- جێگاکەم ئاشکرابوو، کەوتبوومە ناو سێرەی چەند کلاشینکۆفێکەوە، بە چڕی تەقەم لە سەر بوو، هاواریشم کرد تەقەم لەسەرە، بەلاش بوو دیارە برادەرانیش تەقەیان لە سەر بوو، نەمدەزانی چ بکەم، ئێستا نا ئێستا گوللەیەك بە پاشەلم دەکەوێت، لە سەرم نەدەترسام بەرد دەیپاراست، گەڕامەوە بۆ چیکۆسلۆفکیا بۆ یەمەن بۆ ئەو جێیانەی

خولی سەربازیم لێکردبوو، دەمویست لە ناو دەفتەری وانەکانم، هی تێبینیەکانم، قسەی ئەفسەرەکان شتێکم بیربکەوێتەوە کە بە کەڵکی ئێستام بێن، بەکەڵکی ئەو بارە بێن کە تێیکەوتووم، بەلاش بوو هیچم بیرنەکەوتەوە، یان لەو بارەوەیە هیچیان پێمان نەگوتبوو، نازانم، لەبەر خۆمەوە دەمگوت کورە ئێستا نا ئێستا شەهید دەبم، با بیر لە چارەیەك بکەمەوە چارەیەك کە لە دەفتەران نەنووسراوەتەوە، لە پڕدا بیرێکی برووسکەیی بە مێشکمدا هات و گرتم و نەمهێشت خۆ راپسکێنێت:

+ ئەتو بایت، چت دەکرد؟

- گووم دەکرد چیم دەکرد! یان گوللەیەکم لە سەری خۆم دەدا، یاخود سەری خۆم حیز دەکردەوە و دەمگوت، تەقە مەکەن من خۆم بە دەستەوە دەدەم.

+نەخێر، من هیچ لەم دووانەم نەکرد، هێواش هێواش بەردەکەم بەرەو لای چەمەکە غلۆر دەکردەوە خۆشم لەگەڵی وەك ئەوەی پێوەی بەسترامەوە غلۆر دەبوومەوە، بە سەری تۆ بە سەلامەتی گەیشتمە ناو چەمەکە.

شێرزاد دەیگۆت:

کاکە شەڕکردن ئەزموونە، بیرکردنەوەیە، هەندێك شت هەیە بەس لە ناو شەڕێ فێری دەبیت، هەزار خولی سەربازی بکەیت بەلاشە، ئاگادار بە، ئەو ملازمانەی هاتوونەتەوە وا مەزانە شەڕکەر و شەڕزانن، هەندێکیان دڵنیام تووشی شەڕێ بن تەفەنگ فڕێدەدەن و هەڵدێن.

لەو ئان و ساتە ناخۆشەدا ئەو سەرهاتەی شێرزادم بیرکەوتەوە، بەڵام چ لەو ئەزموونەی شێرزاد بکەم، ئەو بەردەی پەنای منی داوە نەك بە من و حەفتی وەك من غلۆر نابێتەوە بەو دوو کۆپتەرەش کە نازانم خودا لە کوێوە بۆ ئێمەی ناردن ناجوولێن و غلۆر نابنەوە، ئیدی تێگەیشتم نە خودا فریام دەکەوێت و نە ئەزموونەکەی ملازم شێرزادیش، دیارە دەبێت هەندێك بیرم کردبێتەوە دوور نیە خێریشم لە خۆم نەگرتبێت، لەو ساتانەی

کۆپتەرەکان بەرزتر دەبوونەوە دوورتر دەکەوتنەوە، هەلـم قۆستەوەو خـۆم گەیاندە بن ئەو بەردەی پەلامیزە دەگەیشتێ، بەڵام لە من هێنـدەی دووری کیشوەرێك دوور بوو، نەبێتە دزی ئەو کیشوەرە هی ئومێدە، ئومێد جارێك شــەڕێکی بــۆم گێــڕایەوە مــن هەر ئەوەی دەگێــڕمەوە کە پەیوەنــدی بە کیشوەرەوە هەیە ئومێد دەیگوت:

پــێش ئەوەی شــەڕ دەســتپێبکات بەردەکــان هەمــوو بەســەر یەکەوەن، تفێکـی تونـد بهـاوێژی پرووشـکی بە هەموویـان دەکەوێـت، بەڵام کـاتێ دەکەویتە ناو تەقەوەو ئەو بەردەی سـەنگەری تـۆیە دەکەوێـتە نـاو سێرەی دوژمـنەوە و تەقەی لە سـەر نـابڕێ، بەردەکانیـدی هەر یەکەیـان دەکەونە کیشوەرێك یەك ئوسترالیا، یەك ئەمریکا.

ئەبوو (خالید تەویل)ێك هەبوو نـازانم نە لەبەر درێژیـی خـۆی کە زۆر درێژبــوو ئەو (تەویل)ەیــان دابــووێ، نە بــۆ جیــاکردنەوە بــوو لە ئەبــوو خالیدێکی کـورت، ئەو تەویـلە کە بەسرایەکی زۆر رەسـەن بـوو، خـۆی دەیگوت:

یەکەم ماڵە عەرەب کە لە ئاقاری بەسرا هەڵیاندا، ماڵی باپیری مـن بـوو، کەچی ئێستاش هەر کرێچین.

ئەو عەرەبە بەسراییە رەسەنە کرێچییە، چاوم لێبوو باش حاڵی هـاتبووێ، وا بزانم هەرچی پێشـمەرگەی ئەوێ هەبـوو حاڵیـانگرتبوو، بەوە دیـار بـوو کۆپتەرەکان کە هەتا پێش یەکەم دەسرێژ کە نازانم کێ بـوو هاویشـتی بە فەرمانی کێ بوو، زگیان لە سەر عەردی بوو، نهـا بەرزن زۆر بەرز، زۆری نەبـرد نـزایەکەم ئەوەی یەکەم هـاتە دی هەورێکـی هێنـا ئەممـا هەور، لە پەڕجوو دەچوو ، هەر هێندەی دوو جارێك مەخزەنی فیشەك بگـۆڕی، ئەو ئاسمانە گەورەیە ئەو ئاسـمان روونە رەش هەڵـگەڕا، بـووە هەروە تریشـقە، باران دایکرد، کۆپتەرەکان بۆی دەرچوون، بەڵام هەورە تریشـقە نەیهێشـت ئۆخەی تەواو بکەم هەر وام دەزانی کۆپتەرە و بۆردومان دەکات.

سەردەستە گۆتی:

هەستدەکەم گەورەترین دەستکەوتمان بووە.

یەکێك بە پێکەنینەوە هەڵیدایێ:

ئا، ئا، دوو کۆپتەرمان خست.

سەردەستە ویستی شتێك بڵێ، یەکیدی قسەی پێبڕی:

بە راستی وایە، مادام لە شەڕێکی وا ناوەختە بە بێ زیان دەرچووین، ئەوە گەورەترین سەرکەوتنە، سەرکەوتن ئەوە نیە ژمارەی کوژراوەکانی دوژمن چەند بەرانبەری شەهیدانی ئێمە بن.

من قسەی ئەو پێشمەرگەیەم بەدڵ بوو، بەڵام یەکیدی گوتی:

من لەگەڵ ئەو بۆچوونە نیم، ئەگەر دوژمن لێی نەکوژرێ و ئێمە لێمان شەهید نەبێت...

قسە زۆر کرا شتێکی وام لە بیرنەماوە، لە بەر باران دەڕۆیشتین، خەریکبوو بشخنکێم لە تینوێتیدا، دەستم بۆ باران دەگرتەوە، بارانم دەخواردەوە، چ بە تامە باران! ماندووم هێندەی حەفت رۆژە رێ ماندووم، برسیم بایی تلیانەیێ نان برسیم، بۆ تینوێتیەکەش ئەوە دەوم بە هەورەوە ناوە، بەڵام باشە جگەرەکە هەیە، هەستمدەکرد لە شەڕی یەك ساڵە هاتوومەتەوە، هەمووشی درەنگتر زانیم کە سێزدە خولەك بووە، بەڵام لەو سێزدە خولەکە سێزدە هەزار ساچمە و گوللە لە سینگی چیا راچووە، یەك لەو ساچمانەش کە هەر هێندەی دنکە فاسۆلیایەك دەبوو لە سەر رانی من نیشتبۆوە، بە نیشتنەوە نیشتبۆوە، نیشتنەوەیەکی نەرم، ئاخر نیوەی پتری بە دەرەوە بوو کەمێکی رۆچووبووە گۆشتەوە لەگەڵ دەستلێدان هاتە دەرێ و هەتا چەند رۆژ هەر لە گیرفانم بوو کەسیش نەیزانی، ئەو رووداوە وا بزانم لە راگەیاندن باس نەکرا، وا بزانم هەر کەسیش باوەڕی نەکرد، ئاخر ئەو جێگەیە هی ئەوە نەبوو لەو بارودۆخەی ئەوکات کۆپتەر بیگاتێ یان خۆی پێوە ماندوو بکات، لە بیرمە دواتر خۆشمان لە رووداوی رووداوێکی وا کەوتینە گومانەوە، هەر یەکە لای خۆمانەوە دەمانگوت دەبێت خەونمان نەدیتبێت، من گوتم:

دەبێت بۆ ئەو خەونە بە کۆمەڵیە پرسیارێك لە فرۆید بکەین، ئەگەر ئەو شتێکمان پێبلێ.

با واز لە کۆپتەر بهێنین، نزا بکەین جارێکیدی تووشمان بە تووشیان نەبێتەوە، بەڵام کۆپتەر واز دەهێنێت! لەو گێرانەوەیەدا سوێند دەخۆم کۆپتەر نەهێنمە ناو سەرهاتەوە، با ئەو ئاسمانە پیس نەبێت کە دەڵێی چاوی منداڵە روون روون.

ئێستا دەگەڕێمەوە لای برادەرەکانیدی قاسم و سەردەستاڕ و جیهاد و ئەبوو گێچەڵ و.... لە سەر چیایەکین بەشی زۆری دنیای لێوە دیارە، دەڵێن ئەگەر شەوان لێرەوە تەماشای دنیا بکەیت رووناکایی شاران هەموو شاران دەبینی، مەگەر شارێك خۆی لەباوەشی چیایەك حەشار دابێت، بۆ ئەوەی لە یەك کاتدا دنیایەك چیا بێنە چاوتەوە، وەرنە ئەو جێگەیەی ئێستا ئێمە بۆ پشوو لێی دانیشتووین و پیاوێکی بە تەمەنیش وا گەیشتە لامان، پێدەچێت زاری پڕ لە قسەی خۆش بێت، باسی ژیانی خۆی و برایەکی دەکرد، لە گێڕانەوەی سەرهاتان لە هەندێکیان لێم تێکدەچوو خۆی دەگێڕێتەوە یان براکەی، باسی پەڕینەوەی لە ئاوی ئاراس دەکرد نەمزانی خۆی بوو یان براکەی، ئەو پیاوە دەیگوت:

من دەزانم حکومەتان چەند غەدار و دژ بە کوردن، ئەوە قسە هەڵناگرێت، بەڵام بە خودای شۆڕشی کوردیش غەدارە، ئەوەی کورد لەگەڵ کوردی دەکات، دوژمن لەگەڵ کوردی نەکردووە، ئەنگۆ هەکاریتان لە بیرە! ئەدی پشتئاشان! ئەدی... -پەنجا جێگەی لە دووی یەك گۆت، جێگەی کوشتوکوشتاری کورد بە دەستی کورد- کورد ئای کورد هەر هێندە دەستی خۆی دیت کەس ناناسێت، ئەنگۆش کە پێشمەرگەن ناتانناسێت.

ئەو پیاوە هەر قسەی دەکرد، گوێنەدەگرت، دەیگۆت:

با سەرۆکێ کوردان ئەگەر هەیە باش بزانێت، ئەگەر بە یەك تەقەی من بێتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، باش بزانێت ئەو تەقەیە ناکەم، ئەنگۆ بە

خەڵەت لە من تێمەگەن، من پیاوی حکومەت نیم، هیچ سەرۆکێکی کورد هێندەی من دوژمنی حکومەت نیە، ئەوان دێن دەست لە ناو دەستی حکومەت دەنێن، ما کەم جاریان ئەوها کردیە! بەڵام بە خودای حکومەت بڵێتە من بەس تۆقەکم لەگەڵ بکە هەموو سۆرا و بادینانت لە سەر تاپۆ دەکەم، نایکەم.

جیهاد سەری لە بن گوێم نا:

ئەرێ تێمگەیەنە ئەو پیاوە چ دەڵێت؟

گۆتمە جیهاد:

لێگەڕێ، دوایی، بەس ئەوە بزانە من و تۆ ئەگەر یەکی یەك بوتڵ عەرەقیش بخۆینەوە قسەی وا جوان ناکەین .

لە کاتی هەستانێ، ئەو پیاوەی کە وا بزانم لە ئاراسی دابوو گوتی:

ئەگەر خودا تەمەن بدات، رۆژێك دێت لە زۆر شت پەژیواندەبنەوە.

سادق نازانم نە بە گاڵتە بوو نە بەراستی:

کورە خالۆ ئەو رۆژە لەمێژە هاتووە، لە مێژە لە زۆر شت پەشیمانین، بەلام چ بکەین دەبێت رایکێشین.

کابرا بە پێکەنینەوە:

دە راکێشن، خودێ دگەل هەوە بت.

ئەبوو گێچەڵ گۆتی:

من دەترسم ئەو پیاوە حکومەت ناردبێتی، با بیهێلینەوە.

نازانم کێ بوو گوتی:

وایە لە لایەن خودی سەدام حوسێنەوە هاتووە، سەدام پێیگوتووە، بڕۆ سەری (ئەبوو...) بۆ بێنە، ئا، بۆ تۆی ناردووە، دە بڕۆ بیگرە، ئێمە هەقمان نیە.

بووە پێکەنین، ئەبوو گێچەڵ رەنگی قاوەیی هەڵگەڕا.

چیاکان هەر هەموو چیاکانی دنیا دیارن و هەمووشیان سپین، دەڵێی خوداوەندی چیا لە بیری چووە چیایەك بە رەنگێکیدی جگە لە سپی لە

سـەر زەوی هەڵبچنـێ، خـۆزی ئومێـدمان لەگەڵ دەبـوو، هەوکە یەك یەك ناوی هەموو چیاکانی هەڵدەدا، ئەو کوڕە لە چیـای قەرەچـووخەوە شـارەزا بـوو- قەرەچـووخی لە دوورەوە دیتبـوو- هەتـا چیـای قـاف، هەموویـانی دەناسیەوە، ناوی هەمووانی لەبەر بوو.

ئێستا دەمەو عەسرە، هەورێکی هێنا پێـدەچێت بەفـری پێبێـت، بەفرێکـی ئەسـتووریش، گەیشـتینە سـەر ئەو دۆڵەی کە ئەگەر رێـت پێنەکەوتبـێ، هەموو دنیا بڵێن رێی چوونە خوارەوەی هەیە باوەڕ ناکەیـت، مـن بەهـاری چووی بێـرەدا شـۆڕبوومەوە، کەچـی هەوکە بـاوەڕ نـاکەم و دەڵـێم ئەوەی جارێدی رەنگە خەون بووبێت، لە سـەرێ تەماشـای خـوارێ بـکە، دۆڵ لە مەنجەڵ دەچێت، مەنجەڵێك هەرچـی کـوژراوی کـورد و رۆژهەڵات هەیە لە سـەردەمی عـومەر و خالیـدەوە، لە سـەردەمی شـاعەباس و خەلیفەکـانی بەغـدا و سـولتانەکای ئەسـتەنبول و حەمە رەزاو ئەتـاتورك و سـەدام، بیـانخەیتە ئەو مەنـجەڵەوە پڕنـابێتەوە، هەر بەڕاسـتی ئەو دۆڵە لە مەنـجەڵ دەچوو، مەنجەڵی سرووشـت، مـن بـۆ یەکەم جـار نـاوی ئەو مەنـجەڵەم لە ئومێد بیست، بۆی باس کردبووم، زۆر جار دەیگوت:

ئەو جارەش چوومە ناو مەنجەڵەکەوە ئەو مەنجەڵەی بە پێی وەرزەکـان پلەی گەرمیی دەگۆڕێ، زستانان سارد سارد، لە مەنجەڵە ماستی ناو فرێزەر سـاردتر، هاوینـان گەرم گەرم لە دۆدانە دۆی بەر قـرچەی گەرمـایێ گەرمتر، بەهارانیش فێنك فێنك لە (بازاڕی کچان) / وا تێیگەم مەبەسـتی لە بازاڕێکی بەغدا بوو/ پایزانیش هیچ پلەیەکی دیاریکراوی نیە دەڵێی چـاوی یارە/ئەوەی لە شیعرێك وەرگرتبوو/

ئومێد ئەوها وەسپی ئەو دۆڵە مەنجەڵیەی دەکـرد کە ئێسـتا ئـێمە بـۆی شۆڕ دەبینەوە، بەو بەردە پێپلیکەییانەدا شۆڕدەبینەوە کە داخوا چەنـد سـاڵی ویستووە تا وا جوان و ئەندازەیی داندراون، من قەت نەچوومەتە ئاسـمانێ، لە لە ئاسمانیشەوە نەهاتوومەتەوە سـەر زەوی، بەڵام ئەو نشێوە، ئەو چیـایە، ئەو دۆڵە رێـك عەرد و ئاسـمانن، هەر کەسـێك رێـی بەو لێژبـوونەوە

کەوتبێت مافی خۆیەتی بڵێت من چوومە ئاسمان و سەراوسەریش هاتمەوە خوارێ، چ لێژ بوو خودایە! ئەوجا لە هەمووی خۆشتر دەیانگۆت ئەوە هەر ڕێی پێشمەرگە نا ڕێی وڵاخیشە ڕێی هێستریشە، من دیومە، هێسترم دیوە بە ڕێی وادا بە هەوراز و لێژی و تەلانی وەهادا ڕۆیوە، چەندان جار چاوم هەڵگلۆفتیە نەوەك خەون ببینم و ڕاست نەبێت، ئا، هێستر بە ڕێی وەها دەڕوا مەگەر تەنها پێشمەرگە بوێرێ لێبدا، بەڵام چەندی دەکەم ناتوانم باوەڕ بێنم ئەو ڕێیە هێستر بوێرێ لێیدا و شۆڕبێتەوە ناو ئەو مەنجەڵە، بەڵام دوایی بڕوام هێنا، بە چاوی خۆم نەمدیت، بەڵام گۆتم مادام پێشمەرگە بوێرێ، هێستریش دەوێرێ، خۆ هێستر هیچی لە پێشمەرگە کەمتر نیە.

دنیا خەریکە خۆی دەخاتە تاریکیەوە، بەفر پرووشەی دەکات، بەفر و شەو ترسیان بۆ پێشمەرگە هێنا، ئاخر ئەو ڕێیە هی ئەوە نیە بە شەو خۆتی لێدەی، هی ئەوە نیە بە بەفر خۆتی لێدەی، خۆ ئەگەر شەو و بەفر پێکەوە بێن، ئەوە مامز بە مامزایەتی خۆی و ئەگەر ڕەوە گورگیشی لە دوا بێت زاخ ناکات خۆ لێدات، هەر یەکە لە جێگەی خۆیەوە هاواری دەکرد:

پێ هەڵێنن درەنگە، شەو داهات، عەردی سپی کرد.

کامەشیان کە لە هەمووان بە دەنگی بەرزتر ئەو هاوارەی دەکرد، لە هەمووان هێورتر دەڕۆیشت، کەس نەبوو چەند جارێك خلیسك نەبات و نەکەوێت، ڕەنگە من لە هەمووان کەمتر کەوتبم، من لە ڕێی سەخت باکم نەبوو، وەك دەڵێن هەر کەسە و لە شتێك لێهاتووە، یەك لە دەستکردنەوە و شەڕکردن، یەك لە نەخەوتن، یەك لە هەڵاتن، یەك لە خۆڕاگری بەرانبەر برسێتی یان تینوێتی، یەك.. یەك.. منیش لە ڕۆیشتنی شوێنی سەخت و بەرنەبوونەوە، لە بیرمە زۆر جار لە هەڵدێر و تەلانان بە دوای بزندا دەڕۆیشتم، پێم لە جێی پێی بزن دەنا، تەماشام دەکرد چۆن چۆنی دەڕوا، چۆن پێی خۆی گیردەکات، منیش لاسایی ئەوم دەکردەوە، لە ڕۆیشتنێ لاسایی بزنم دەکردەوە، جارێك پێشمەرگەیەك ناوی وێ گوڵاڵە بوو،

نازانم تووده بوو سازمان بوو، هی دیوی رۆژهەلات بوو، کاتێ دیتمی بە مەبەستی چنینی نێرگز بە هەڵدێرێکدا هەڵگەڕام و داگەڕام، هەڵدێرێك کەم کەس دەوێرێ بگاتە ئەو جێگەیەی کە نێرگزی لێبوو، ئا لەو کاتە گوڵاڵە گوتی:

ببوورە، تووڕە مەبە ئەگەر بڵێم تۆ خزمایەتیەکی نزیکت لەگەڵ بزن هەیە.

بە چاوی ئێستا تەماشام مەکەن، پێشان کەی وەك هەوکە تەپە حورچە بووم! با ئەو گوڵاڵەیە لە بیر نەکەم،ساڵی چووی هەر لەو دۆڵەی ئێمە وا بەو تاریکیە بەفراویە بۆی شۆڕ دەبینەوە، ناوێکی وەك زێوەی هەیە، کەمێك لەولاتر بەر کیمیاوی کەوت، دواتر زۆر دواتر چەندان ساڵی بەسەردا رابورد بیستمەوە لە سادقم بیستەوە- خودا بکەم وا نەبێت بە هەڵە هەواڵەکە هاتبێت- کە گوڵاڵە بە هۆی کیمیاکەی عەلی کیمیاییەوە لە ئەورووپا، ئەورووپای داهێنەری کیمیا گیانی لە دەست دا، ئای گوڵاڵە چەند میهرەبان بووی ،چەند عەشقە حوسێن و ژیان بووی، حوسێن هاوسەری گوڵاڵە بوو.

بەفر تەواو رێگەو بانی سپیکرد، شەویش بە تەواوی گەیشت، ئەگەر سەرچێخ نەچووبم، بەفری ئەو شەوە هەر زیان نا کەڵکبەخشیش بوو، ئەگەر بەفر نەبا بەو تاریکە شەوە لەو لێژبوونەوە بێ رێیەدا قەت رێمان نەدەدیتەوە، وا بزانم چەند گوللەیەکی گڕدارمان هاویشت، گوللەی خۆمانە، گوللەی مێوانی، لە بارەگاشەوە هەر بەگڕدار گڕداری مێوانداری و بەخێرهاتن وەڵامیان داینەوە، ئیدی گەیشتینە بنی مەنجەڵێ، گەیشتینە بارەگا، پێشمەرگەیەك هێندەی بڵێی یەك و دوو، یەك سەبەتە هێلکەی کردە رۆنەوە، بخۆ هێلکە و رۆن بخۆ، لە بیرمە یەکەم پرسیار کە لە بارەی ئەو شوێنە مەنجەڵیەوە کردم، ئەوەی دەڵێم هی بەهاری رابردووە نەك هەوکە، پرسیارەکە ئەوها بوو:

ئەرێ خۆر لێرە هەڵدێت؟ ئێرە تیشکی خۆری بەردەکەوێت؟

پێشمەرگەیەك ناوێکی وەکو (ئەبوو نەبە)ی هەبوو وای باگوذامەوە:

هەتا شەش مانگ ئێرە هەر سێبەرە و یەك تیشکە خۆری ناگاتێ، ئەوە ڕێکەوتنی نێوان سێبەر و ڕۆژە، دوای ئەو شەش مانگەش ڕێکەوتنەکە ئۆتۆماتیکیانە نوێ دەبێتەوە.

کە قسەی ئەو ئەبووە قسە خۆشەم بیرکەوتەوە، لە دڵی خۆم گوتم:

ئەوە بەهارەکە ئەوها بوو، ئەدی بەو زستانە دەبێت چۆن بێت!

بۆ خەوتن کەوتمە تەنیشت پێشمەرگەیەکەوە، دەتگوت لە مەیدانی ماتۆڕانم، یەك پرخوهۆڕی بوو، چەند جارێك بە دەستی خۆم دەمخستە سەر تەنیشت و کەلەك گۆڕکێم پێیدەکرد، کەڵکی نەبوو، ئەگەر بە پێوەش نووستبا لە پرخەپرخی خۆی نەدەکەوت، لە هەمووی سەیرتر، من بە کەیفی خۆم هەڵگێڕو وەرگێڕم پێیدەکرد، ئەو پیاوە بە ئاگا نەدەهات، دیار بوو ئەبوو گێچەڵیش خەوی ڕۆیشتبوو، وا بزانم هەر ئەبوو گێچەڵ بوو ناوی لێنا ئەبوو ماتۆڕ، هەتا درەنگیش کە یادی ئەو پێشمەرگەیەمان دەکردەوە، بە ئەبوو ماتۆڕ ناومان دەبرد، بە جیهادم گوت:

کورد مەلا ماتۆڕی هەیە، با عەرەبیش ئەبوو ماتۆڕێکی هەبێت.

بۆ بەیانی چووینە بارەگایەکیدی هەر لەو دۆڵە، زوو گەیشتینێ، نزیك بوو، لەوێ دیار بوو هەندێ لە سەرکردە و مەرکردەشی لێبوو، باش بوو ڕۆژی گۆشت بوو، ئەودەم لە بارەگاکان خشتەی حەفتانەی نانخواردن هەبوو، ئەو خشتەیە لە هەموو بارەگاکان پەیڕەو دەکرا، بەس ئەوانە نەبێت کە لە بارودۆخێکی تایبەتیی سەربازیدا بوون، لە حەفتەیەك ڕۆژێك یان دوو گۆشت هەبوو، ئێمە بەخت یاوەرمان بوو بە نیوەڕۆ گۆشت گەیشتین، دەبێت ئەوەش بڵێم چ سەرکردە و چ بنکردە و چ ئەوانەی وەك من کە بنکردەش نەبووم، چ زیندانیەکانیش یەك خواردنیان هەبوو، ئەو جەمە بۆ نموونە کە من برنجە سوورەم دەخوارد، پیاوێکی سەرکردایەتی و پیاوێکی زیندانیش برنجە سۆرەیان دەخوارد، لە سەر چیچکانیش، لە رووی جلکوبەرگیشەوە جیاوازیەك لە نێواندا نەبوو، مەبەستم ئەوە نیە بڵێم لە ناو

شیوعیان جیاوازی و نایەکسانی نەبووە، با هەبووە، بەڵام لەو رووانەی باسی دەکەم و ئەوەی لەبەر چاوان بوو ئەوهابوو، من ئەوهام دیت، لە بیرمان بێت لە ناو لایەنەکانیدی ئەوها نەبوو، خواردنی سەرکردە و پێشمەرگە یەك نەبووە، من بە چاوی خۆم لە جێیەك دیتم، چووبووینە بارەگای حزبێك نیوەڕۆ بوو، تەماشا دەکەم دوو کابان هەبوو، یەکیان شیوی بۆ بەرپرسەکان لێدەنا، کە خواردنێکی تایبەت بوو، برنج لەبن گۆشت دیار نەبوو، ئەویدی کە بۆ پێشمەرگەی لێدەنا، ساواری رووت، بە شلەیەکەوە تامی چلکاوی دەدا، لەوەشیان خراپتر بۆ زیندانیەکان برد، وا بزانم لە ناویان پیاوێکی دیاریش هەبوو، بەڵام دواتر شیوعیەکان لە جیاوازی و نایەکسانی کەوتنە پێشبڕکێ لەگەڵ لایەنەکانیدی، ئەوەیان لێرە لەو سەرهاتە جێگەی نابێتەوە.

هەر لەو بارەگایە کیمیاویە، پێشتر کیمیای بەسەر وەرکرابوو، گوڵاڵەش لێرە بەرکەوتبوو، کۆمەڵێك زیندانیم دیت، ئۆف، زیندانی لە من نابڕن، بە من بێت هیچ زیندانیەك لە هیچ جێگەیەك نەبینم، یەك لەو زیندانیانەم دیتەوە، ناوەکەیشم لەبیرە، بەڵام حەز ناکەم برینی کەسوکاری بکولێتەوە، بۆیە ناوی ناڵێم، کوڕێکی گەنج زۆر گەنج، بە سیما جوان زۆر جوان، ناسیمەوە کاتی خۆی لە بارەگایەکیدی بوو، چەندان جار پاسەوانیم لێیکردووە، چەندان جار لە سەر تەندوور پێکەوە ئەو نانی پێوە داوە و من برژاندوومە، ناسیمەوە، سڵاوم لێیکرد، زۆر بە بێتاقەتی سڵاوەکەی وەرگرتەوە، لەو کاتە پێشمەرگەیەکی مندالکار کە ئێشکگری لێدەکرد، مۆڕەیەکی لێمکرد، منیش بە شێوەیەك تەماشامکرد، نیوە شەڕێك بوو، باش بوو قسەی نەکرد. دوو سێ شەو لەو بارەگایە ماینەوە، دوا شەو درەنگی شەو زۆر لە پێشمەرگەکان نووستبوون، هەندێکیشیان لە گڕ یاری کۆنکان بوون، من لە ژوورێك بووم نزیکەی یازدە پێشمەرگەی لە خۆی جێکردبۆوە، گوێم لە دەسرێژێك بوو، نزیك زۆر نزیك، بووە چپە چپ، دوایی بەردێکیان لە سەر داناو گوتیان چ نیە،

من هیچی تێنەگەیشتم، دواتر زۆر دواتر بیستمەوە کە ئەو دەسرێژە بۆ سەر و سینگی کوڕە زیندانیەکە بووە، ئەو کوڕەی دەیانگوت تاوانی گەورەی کردووە، بەڵام من ئێستاش نەمزانی تاوانەکەی چیە.

هەر لەو دۆڵە بەیانیەك شتی سەیرم دیت، دەبینم سەد کوڕە دوو سەد تۆ بڵێی زیاتریش، سەرباز بە دووی یەکدا لۆژە لۆژ لەو بەری رووبارەکەوە بە ئاراستەی ئاودا ملی رێیان گرتووە، پێشمەرگەش یەکێك لێرە یەك لەولا دوو لەولاتر بە تەنیشتیانەوە دەڕۆن، ئەوجا وەرە خەفەتخان مەبە، لە ناو ئەو هەموو زیندانیانە، خۆزگە سەرم بە بارەگایەکدا دەکرد زیندانی لێنەدەبوو، لەو بارودۆخی ئەوکات و لەو جێگایانە بارەگا هەبوو بێ زیندان و زیندانی! ئەو سەربازانە دوای دەمژمێرێك پتر هەر یەکە بە خۆو بە دارێکەوە کە لە سەر شانیان بوو گەڕانەوە، ئەو جارە زنجیرەی سەربازان درێژتر ببووەوە بە هۆی دارەکانی سەر شانیانەوە، برادەرێك گوتی:

ئەو سەربازانە دیلی پارتین لە شەڕی کانی ماسی- وا بزانم کانی ماسی گوت- گیراون.

ئەبوو گێچەڵ کە ئەو سەربازانەی دیت شێت و هار بوو، هاواری دەکرد:

ئەو سەربازانە گوناهن، چۆن دەبێت بەم سەرمایە داریان پێبێنن، پێویستە بەرەڵایان بکەن، خۆ جاش نین، ئەگەر جاش بان قەینا.

پێشمەرگەیەکیدی کە ئەویش هەر عەرەب بوو بە گاڵتەوە گوتی:

قسەی تۆیە، جاش بارووتت پێوە دەنێ، بەڵام سەرباز بە سۆندەی ئاوێ دەترشێنێت.

پێشمەرگەیەکیدی گوتی:

ئەبوو تەڕەماش زیاد قسە بکەیت ئەو هێلکەیەت لە ناو چاو دەدەم.

قسە نەما پێینەڵێ، شرتوشۆی شکاند، باش بوو ئەبوو گێچەڵ خۆی کڕ کرد و نقەی لێوە نەهات، ئەگینا باشی دادەپلۆسی، ئاخر ئەو پێشمەرگەیە زۆر هەڵەشە و دەستوەشێن بوو.

هێلکەیەکی نەکولاوی بە دەستەوە بوو، ئەبوو گێچەڵە چەندی هەوڵ دەدەم کەم بێتە ناو گێڕانەوە کەم سەری لە سەرهاتان قیتکاتەوە، سوودی نیە، دەڵێی مووی ناو لووتە لێت نابێتەوە، ئەبوو گێچەڵ راستە عومرێك بوو کۆمۆنیست بوو بەڵام عەرەبچیاتیەکی ترسناك لە گیانیدا وەك خوێن و تێکەڵ بە خوێن دەسووڕایەوە، ئەو گێچەڵە جارێك راست و رەوان گوتی:

لە عێراق مادام دەولەتێکی عەرەبیە و کورد کەمینەیەکی کەمە، راست نیە کوردێك سکرتێری حزب بێت، عەزیز محەمەد هەقە واز لە سکرتێری بێنێت.

جیهاد ئەوها وەڵامی دایەوە:

ئەتو بە هەڵە هاتوویتە ناو حزبی شیوعی، حزبی تۆ بەعسە.

پێشمەرگەیەکیدی گوتی:

وا بزانم ستالینیش رووس نەبوو.

ئەبوو گێچەڵ شێت و هار بوو، بەڵام زانی کە هەڵەیەکی گەورەی کردووە و ئەگەر لێی گەورە بکرێت رەنگە بانگی بکەن و بە جۆرێك سزا بدرێت، تووڕەیی خواردەوە و هەر هێندەش نا، داوای لێبوردنیشی کرد و گوتی:

من بە گاڵتەم بوو.

دەبێت بڕۆین، بچینە بارەگایەکیدی، بۆ؟ ئەگەر منیش لە رێی هەڵەوە ئەو پرسیارەم کرد، تۆ هەڵە مەکە و چاوەڕێی وەڵام مەبە، من بە چی بزانم بۆچی بارەگا و بارەگا دەکەین؟ بۆچی لە کانی توبەوە تا گەیشتوومەتە ئێرە کە خۆشم لێم تێکچووە چەند رۆژە رێیە، دەزانم نیازی چیمان هەیە! دوور نیە پۆستەچی بین، دوور نیە بە دوای کەسێکدا هاتبین و لەگەڵ خۆمانی ببەینەوە، یان کەسێکمان هێنابێت و بەجێیبهێلین و خۆمان بگەڕێینەوە، ئەو کەسە کێیە! هێندە دەزانم من نیم ، دەبێت داوای لێبووردن بکەم کە ئەو (بۆ؟)یەم خستە رستەوە، هەڵەی زمان بوو، دەبێت بڵێم پێشمەرگەی سادە و ناحیزبی، کەم زۆر کەم لە ئامانجی ئەو

گەڕانانەی دەزانی، بە تایبەتیش یەکێك خۆی لە شتان هەڵنەقورتاندبێت، منیش هێندە گوێم بەو شتانە نەدەدا، بڕۆ و تەواو، گەڕان خۆشە، هەر بە ڕاستی لە پێشمەرگایەتی حەزم لە گەڕان بوو، بەڵام سەدیەکی ئومێد نا، باشترە واز بێنین لە مەبەستی گەڕان، مەبەستی من گەڕانەکەیە نەك مەبەستی گەڕانەکە، ئێستا وەك بڵێی وا بە دەوری چیایەکدا دەسووڕێینەوە، ڕێگە لە هەندێك جێ بزنەڕێیە، لەولاتر کەرەڕێ، ئیدی ڕێ ڕێگەی پێشمەرگەیە، ڕۆژ هەڵاتووە، بەڵام ئەوها بڕوا چ پێناچێت ڕۆژ ببینین، ئێرە بڕواناکەم لەوەتەی هەیە تاڵێ ڕۆژی بەرکەوتبێت، ئاسمانی گچکە ڕوونە، نازانم هی گەورەش، ئاخر ئاسمانی ئێرە زۆر گچکەیە، گچکەتر لە دۆڵی مەنجەڵ، چەند پەلە هەورێکی سپی، سپی وەك بەرخی کوێستانێ لێرە و لەوێی ئاسمانێ دەبینرێن.. پێش ئەوەی بزانین تا کوێ بەدەوری ئەو چیایەدا دەسووڕێینەوە و دەگەینە کوێ، حەزم لێیە بچمەوە ئەو گەرماوە گەرمەی لە دۆڵی مەنجەڵ کردم، قسەیەك لە نهێنیی ناو گەرماو بکەم کە بڕواناکەم هیچ پێشمەرگەیەك هەر لە منەوە بگرە هەتا دەگاتە ئەوەی لە سەرۆکانیش خۆی پێ سەرۆکترە_ دووریش نیە سەرچیخ چووبم_ نهێنیی گەرماوی نەبێت، بەڵام یاداشتەکان ئەو نهێنیانە لە خۆ ناگرن، لە بیرمان بێت نهێنیی هێستریش هەیە بەڵام ئەمەیان با بۆ گێڕانەوەیەکیدی بێت.

ئێ گەرماوێکی گەرم بوو، مەنجەڵێك کە گچکەکراوەی بڵێم چەند جارەی دۆڵە مەنجەڵیەکە بوو، بڵق بڵق دەکوڵا، لە دەرەوە ئاگری دەدرا، دووکەڵ دزەی نەدەکرد، گەرماو گەرم زۆر گەرم لە هی گەرماوی ورمێش گەرمتر، _ئەوە دواتر دوای چەند ساڵێك ڕێم کەوتە ورمێ و چوومە گەرماو- لە گەرمەی خۆ شووشتنێ بووم، هەر هێندەم زانی کچە دێرەشیەکە، کچە چاو بەهاریەکە، ئەو چاوەی ئێستاش لەو چاوە جوانانەی دەیانبینم، دەیبیسنمەوە، دیتم بە ڕووت و قوتی هاتە ناو گەرماوێ، لەشولارێکی هێند سپی هەبوو، بەفری دێرەشیش هی هیچ کوێستانێك

هێنده سپی نەبوون، کچەی مەمک شکۆفەی سینە کەما راکشا و منیش ناوی خودام لێهێنا...

من لەوێ گەیشتمە ئەوەی زۆر جار خەیاڵی وا هەیە ئەگەر کۆپیی راستیشی بکەیتەوە ئەگەر کۆپیەکە رەنگاورەنگیش بێت هەر کۆپیەو شان لە شانی خەیاڵەکە نادات، لەوێ گوتم:

خودای خەیاڵ، ئەی ئەو خودایەی بە (کن فیکن)ێك لەو سەری شاخانەوە کچە چاو کەسکەکەت بۆ من هێنایە ناو گەرماو و لە چاو تروو کانێکیش گەڕاندتەوە ماڵی خۆیان، دێرەش، با ئەو بە یەکگەیشتنەی من و کچی چاو بەهار لە ئەوینم کەم نەکاتەوە>

بەڵام دواتر هەستمکرد، خودا بە قسەی منی نەکرد.

نازانم چ وەختی رۆژە، ئێمە هەر بە دەوری چیاکە دەسووڕێینەوە، هەستمدەکرد تەواف دەکەین، تەوافی چیا، زۆری نەماوە سووڕانەکە تەواو بێت و بگەینەوە جێگەی خۆمان، پرسیم:

ئەرێ من سەرم گێژ دەخوات، یان ئێمە گێرە دەکەین؟

پێشمەرگەیەك وای وەڵام دامەوە:

خەمت نەبێت گێرەکە تەواو ناکەین، کەمێك دەمێنێت.

پاشان تێگەیشتم ئێمە لە ترسی جەندرمان رێگەیەکی نیو کاتژمێریمان بە حەفت کاتژمێر و نیو گۆڕیوەتەوە، ئەو جەندرمە ئەتاتورکیانە مۆڵگەیان لە جێگەیەك بوو، دەبوو حەفت دەمژمێر ئێمە ماندوو بکەن، لە بیرمە چەندێ رقم لە ئەتاتورك و دەوڵەتی تورك و جەندرمەی تورك دەبۆوە رقەکەم حەفتجار بۆوە.

بە دووری نیو کاتژمێرێك لەو جێگەیەی کە تەوافکردنی چیا دەستپێیکرد و دوایی دێت، واتە نزیك لە رەبیەی جەندرمان کە لە دوورەوە بە دووربین جوان دیاربوون و جوولانەوەیان دیار بوو، لەوێ چەمەکە ناویم لە یاد نەماوە، بواری پەڕینەوەی دەدا، بە ئاسانی پەڕینەوە، بەڵام من بەردێك لە بن پێم رۆیی و کەوتمە ئاوەکەوە و بەو سەرمایە

خۆم لە ئاو هەڵکێشا، لەوبەرەوە چیایەك هاتە پێشێ چەندی سەرم هەڵبڕی سەریم نەدیت، هەڵگەڕێ، هەورازێکە دەڵێی ڕێی ئاسمانە، نازانم کێ بوو دەستی بە خوێندنەوەی شیعری هەورازی کوور کرد وا بزانم هی شێرکۆ بێکەسە، ئەوەی دەڵێت:

هەورازی کوور پشتی شاخێکی بە عومرە
بۆ پێشمەرگە دانەویوە...
من لێیم تێکدا، نەمهێشت تەواوی بکات:
هەورازی کوور پشتی شاخێکی نەفرەتیە
تری لە بزن و پێشمەرگە بڕیوە...

دەزانی چ هەورازەیەکی سەخت بوو، من لە هەورازان رقم لە هەوراز و وشەی هەوراز دەبۆوە، دەمگوت ئەگەر یەکێك وەك من هەورازناس بێت، قەت بە هەورازان هەڵنالێ، ناو لە دنیا ببڕێ ناوی هەوراز لە منداڵی خۆی نانێ، چۆن دەبێت شیعر بە هەورازەوە ناو بنرێ! جیهادیش دەستی بە خوێندنەوەی شیعر کرد، نازانم شیعری رەکابی بوو کێ بوو، ئەویش هەر لە هەورازان دەدوا، عەرەبیەکەم باش نەبوو دەنا شیعرەکەی ئەویشم بە دەردی شیعرە کوردیەکە دەبرد.

ئەو جیهادە زۆر حەزیدەکرد فێرە کوردی بێت و پێی بدوێ، لێ یەک دوو کەرەتێ خراپ تێکەوتبوو، بە شەرما کەوتبۆوە، ئیدی نەدەوێرا پەیڤێکی کوردی گۆبکات، یەک لەو تێکەوتنانە: لێیان پرسیبوو:

هاوڕێ کووی؟
لە باتی بڵێ: گفەم دێ
گوتبووی: گووم دێ
لێیان لە هەرا بابوو، ئەویش لە من شەرمنتر بوو، ئیدی...

هەڵگەڕێ سەرەو ئاسمانێ هەڵگەڕێ، ئومێد جارێك باسی هەورازەیەکی بۆم کرد، بە دووری نازانم ئەو هەورازەیە بێت کە ئێمە وەك کۆمەڵێك پێشمەرگەی لە دنیا تەریو بزن ئاسا پێیدا هەڵدەگەڕێین، ناشزانم

ئەو هەڵگەڕانە بۆچیە! ئومێد دەیگوت:

چ چیایەکی بەرز و هەورازێکی رك بوو خودایە، هەر هەڵگەڕاین و نەگەیشتینێ، چین چین هەورمان دەبڕی، هەوری رەش هی سپی هەوری مەیلە و دووکەڵی، هەر نەگەیشتینێ، هەستمکرد زۆر لە ئاسمان نزیك بووینەتەوە، دەمگوت، ئێستا نا ئێستا پاسەوانەکانی خوداوەند دەنگمان دەدەن.

بە ئومێدم گوت:

ئەوەت لە چ رۆمانێکی کازانتزاکی وەرگرتووە؟

ئومێد بە پێکەنینەوە، بە پێکەنینی لە هەنگوین شیرنترەوە گوتی:

کوڕە دەبڕۆ، نەك کازانتزاکی، مارکیزیش وێنەی ئەوهای نیە.

ئەبوو گێچەڵ لە هەموومان ماندووتر دیار بوو، نەخۆشیی گەدەشی هەبوو، گوێم لێبوو گوتی:

ریفاق بەسە سەرکەوتن، با تێکەڵی هەور نەبین، ببینە بەفر و بە سەر دنیادا دابکەین.

بە هەڵەدا نەچوویم سەردەستاڕ بوو، بەڵام نەمزانی چۆن ئەوجارە بە ئاسانی لە عەرەبیەکەی ئەبوو گێچەڵ تێگەیشت، گوتی:

ئەوجا سەیر دەبێت، بۆ یەکەم جار لە مێژووی بەفر، بەفری رەش بە سەر دنیادا دادەکات، هە هە ههاا!

کەس نیە لە دنیایێ هێندەی سەردەستاڕ بە قسەی خۆی پێبکەنێت، سەردەستاڕ لەو قسەیە پتر مەبەستی من و ئەبوو گێچەڵ بوو، چونکە بە سیما لە هەمووان رەش و برژتر بووین، گێچەڵ هەستیکرد سەردەستاڕ قسەی بەسەر قسەکەی ئەودا کردووە و بەو پێدەکەنێ، داوای لە من کرد بۆی وەربگێڕم، ئەوجا ئەوەی عەرەبی دەزانێت با گوێ لە وەرگێڕانەکەی من بگرێ و پێشنەکەنێ:

یگول رفیق رأس دەستاڕ یگول مادام ئەنا و ئەنتە قەسدی ئەناو ئەنتە

مو رأس دەستاڕ نحەول ئیلا سلج، یەسقوت فۆگ عالەم سەلج ئەسوەد، ئیفتەهەمت یا سەلج ئەسوەد؟

ئەبوو گێچەڵ هێند پێکەنی هێند پێکەنی، کەمێکیدی پێکەنیبا، پێکەنینم دەخستە شوێنی گێچەڵەوە، سەردەستاڕیش کە لە بەر پێکەنین دەوی نەدەگەیشتەوە یەك، هێندەی تێگەیشتم:

دەزانی عەرەبیەکەت باشە، کەمێك خۆت ماندوو بکەیت، دەگاتە بادینیەکەی من.

ئەبووێکیدی حەیدەر نەبوو، بەڵام نزیك بوو لەو ناوە، نازانم حاتەم بوو حەبەش بوو، حەیات بوو، حەنان یان حیرمان بوو، دڵنیام یەکەم دەنگی ناوەکەی دەنگی (ح) بوو، ئەو کوڕە هەرکاتێك بە چیایەکی زۆر بەرزدا هەڵدەگەڕا دەیگوت:

ئەوە قاتی یەکەممان بڕی گەیشتینە دوو وا لە سێ نزیك دەبینەوە، ئەها ئێرە نهۆمی شەشەمی ئاسمانە، خەریکە پێ دەنێینەوە حەفتەمەوە، بارەگای خودا، ئەوجا ئەوەی عەرەبی نازانێت، عەرەبیی قوڕەیشی هی بەغدایی و میسری و مووسڵی و ئەوانە فلسێك ناهێنن، قوڕەیشی و بەس، ئەوی قوڕەیشی نازانێ با بگەڕێتەوە، چونکە پرسیار و وەڵامەکان بە قوڕەیشین، ڕێ بە وەرگێڕیش نادەن، ئەوەی هێ لە قوڕەیشی بە هەر زاراوەیەکیدی یان بە هەر زمانێکیدی بئاخڤێ، لەوێوە پیلی دەگرن تێیهەڵدەدەن.

ئەو (ئەبوو .ح)یە یان ئەنتی قوڕەیشە خۆی عەرەب بوو، بەڵام نازانم بە هۆی چیەوە بوو، رقی دنیای لە شێوەزاری قوڕەیشیان بوو، زۆر جار دەیگوت:

ئەگەر شتێکم لە دەست بێت، قوڕەیشی لە حوشترێك باردەکەم و حوشتریش لە بیابانێك دەبەستمەوە، لە هەموو لایەکیشەوە ڕێی بیابان دەگرم، ناهێڵم ئەوەی گیانلەبەرە ڕێی بکەوێتە لای حوشتری بەستراوە، حوشتری بار قوڕەیشی.

ئەو کوڕە هێندە لە دڵەوە و ڕێك باسی گەیشتن بە بارەگای خودای

دەکرد، ئەگەر پێش چەند ساڵێك ڕێم بێرە بکەوتایە و گوێم لەو گۆتانەی ئەنتی قوڕەیش بایە، دڵنیام باوەڕم دەکرد کە زۆر لە خودا نزیکبووینەتەوە، ئاخر پێش چەند ساڵێك من خودا ناسێکی زۆرسادە بووم، بە شتی لەوە بەزمتریش باوەڕم دەهێنا، ئەبوو گێچەڵ زۆر بەو قسەیەی عەدو قوڕەیش تێکدەچوو، هەستیدەکرد بەو قسەیە ئومەی عەرەبی پەلاماردرایە، لە بیرم بێت لە لایەن ئەبوو گێچەڵەوە(ئەبوو. ح) بووە عەدو قوڕەیش، ئەبووێکیدی بۆ توورەکردنی هەردووکیان ناوی لە (ئەبوو.ح) نابوو (ئەبوو قوڕەیش) بەوە هەردووکیان توورە دەبوون.

بەر لەوەی بگەینە چینی حەفتەمی ئاسمان و خۆ فێری زمانی قوڕەیشیان بکەین، باش بوو لێژبووینەوە، لە ئاو تێژتر لێژبووینەوە، ئەوجا خۆ لێژبوونەوە و داگەڕان لە چیا بە لای منەوە زۆر زەحمەتترە لە هەڵگەڕان بە چیادا، دەمەو عەسرە، لە دوورەوە کۆمەڵێك چەکدار هاتنە ناو دووربینەوە، من دووربینم نەبوو، بەڵام بە هی برادەرێك تەماشام کردن، گوتیان:

- ئەوانە پێشمەرگەی پەکەکەن.
- چۆن دەزانن؟
- بە کۆڵەپشتیان.
- تێناگەم لەوە.
- تێبگە، پێشمەرگەی پەکەکە هێندەی حەفت پێشمەرگەی خۆمان شت هەڵدەگرن، یانی کۆڵەپشتی ئەوان حەفت هێندەی کۆڵەپشتی ئێمەیە.

وا بزانم عەدو قوڕەیش بوو گوتی:

کوڕە ئەوانە باری یەك هێستر هەڵدەگرن و دەگەنە چینی حەفتەمی ئاسمانیش.

منیش نازانم چۆن بوو هاتمە گۆ، تا ئەو کات دابوومە بێدەنگیەك تۆپی زەمانیش نەیدەتوانی بمهێنێتە گۆ، گۆتم:

خۆ ئەوانە عەرەبیی مێرگەسۆریش نازانن، هی قوڕەیش چۆن فێردەبن...

نەیهێشت ڕستەکە تەواو بکەم، بە پێکەنینەوە گوتی:

نا، لە ئاسمانێ ئەوانە ڕێزیان لێدەگیرێ، چونکە دژی تورك شەڕدەکەن، هەر کەسێك دژی دەوڵەتی تورك و ئەتاتورك شەڕ بکات، بێ لێپرسینەوە، بێ زمان زانین بەهەشتیە، چونکە ئەوان وەختی خۆی زمانی قورەیشیان بە پیتەکانیەوە لە حوشترێك بارکرد و ڕەوانەی ماڵی ئالسعودیان کردەوە.

وا بزانم سەردەستار بوو هەڵیدایێ :

مادام وایە منیش دوو سێ گوللە بە قوونی دەوڵەتی تورکەوە دەنێم.

لەو لێـژاییە و بەو دەمەو ئێـوارەیە بـووە یەك پێکەنـین، چیـا دەنگـی دەدایەوە.

لەزگە دنیا تاریك دادێت، دانیشتین، نان و قەسپێکی خۆشمان خـوارد، کات کاتی چایە نەبوو، بەڵام باش بوو نیوەڕۆ چامان خواردبۆوە، مـن دوو بنە مەتارەم خواردبۆوە، ئا، هەر کەسە و لە بنە مەتارەی خۆی چای لێـدەنا و دەیخواردەوە، لەوەش مەپرسە لە تەڕوتووشـی چۆن ئـاگر دەکـرێتەوە؟ پێشمەرگە کە خولیای ئاگرکردنەوەی کەوتە سەر، لە ناو بەفرێ چیلکە و چواڵان دەبینێتەوە، کە زەنگـی چایە لێـدا و کۆڵەپشـتیش بـۆنی شـەکر و چـای لێبێـت، ئەوەی لە ئاسـانانیش ئاسـانترە ئـاگرکردنەوەیە، بـێ هـیچ زێـدەڕۆییەك بە دنـکە شـخاتەیەکی هەر ئەوەتە گـۆگرد پێوەمـاو، کـۆلکە دارێکی لە ئاوهەڵکێشراو گڕدەدا.

هەر لێرە لەو دەڤەرەی کە وەختی خۆی لە نێوان عەرەب و تورك بووە ڕاکـێش ڕاکـێش و هەر یەکەیـان بـۆ خـۆی خـاکی ڕادەکێشـا، ئەنجـام خاکەکە لێرەدا پچڕا، ئەوانیش بەو کەرتبوونە ڕازی بـوون، کـوردیش بـۆ خۆی دەست لە گونان مایەوە، ئا، لێرە دەبێت تێهەڵکێشێکیدی بکەم:

دنیا سەر لە ئێوارەیە، گورگ و سەگ بە ئاستەم لێك جیا دەکـرێتەوە، بەڵام پێشمەرگە و جاش بە زەحـمەت، لە هێنـانەوەی ئەو چـوار شـتەش بە دڵنیاییەوە مەبەستم واتای خوازەیی نیە، مەبەسـتم بەراورد نـیە، لە نـزیکەوە دوو سێ دەستڕێژ ڕووە و ئێمە، خۆمان هاویشتە پەنایان، لێـرە دەبێـت بڵـێم

ئەوانەی شـارەزای چیـا نـین، ئەوانەی پێشـمەرگایەتی، جاشـایەتی، یـان سەربازی، راوچێتی، قاچاخچیێتی، یان... لە چیایان نەکردووە، با پرسیاریی ئەوە نەکەن بەو دەمودەستە پەنا لە کوێ پەیدا بوو، هەندێ چیا و جێگەی رووتەن نەبێت، دەنا ناو چیا هەموو پەنایە بۆ پێشمەرگە و جاش و...

پێدەچوو کەوتبینە بۆسەوە...

کـارزان وای گـۆت، ئەو کـارزانە وا بـزانم مـلازم بـوو، شێرزاد وای گوت، ئەبوو ئایار وای گوت، جا کێ وای نەگوت، جگە لە مـن، مـن چ بزانم، لە ساتی رۆیشتنێ لە زگ کۆپلەیەك شـیعر بـووم، رێکـنەدەکەوت و رێکـنەکەوت، بـا زوو لەو ئاقـارەی گێـڕانەوەیە دەربچـین کە سـەراپای تەقوتـۆقە، هەر هێنـدە دەڵـێم، لە دەسـتکردنەوە، لە شـەڕێ تەنـێ تەقەی یەکەم، دەسڕێژی یەکەم زەحمەتە، دوایی ئاو خواردنەوەیە، تەقەکردن زۆر ساناترە لە مەتارە بە سەر دەم نانەوە، گوللەکانیش بۆ کـوێ دەچـن، کـوێ نیشانەیە، ئەوە شتێکیدی، من بەو تاریکیە ئەو هەمـوو گـوللەیەم هاویشـت نەمدەزانی بە چـی دەکەون بە کـێ دەکەون! ئەوانیـدیش هەر ئەوهـا، زۆر جار گوللە بە تاریکیەوە بنێی باشە، ئەگەر وامان نەکردبـا، ئەوا ئـاوە و ئـاو چووبووین، لە بیرم چوو چەمێکی بچـووك بە تەنیشـتمان خـوڕەی دەکـرد، نازانم ئەو شەوە چەمی روون، چەمی سپی، دڵۆپە خوێنی رژایێ یان نـا، لە بەرەی ئێمەوە خوێن نەڕژا و ئەو جارەش وەك زۆر جاریـدی دەرچـووین، لە بیرمچـوو بڵـێم مـن یەك فیشـەك بتەقێـنم، سـەری دووەی دەبێـت دەم بە مەتارەوە بنێم، ئەوجا ئەو گوللەیە هیچ لە گۆڕێ نەبێت و هەر لە خۆوە لە ئاسمانی بگرم، بەردێك بکەمە نیشـانە، بە دزیەوە لە بـن بـاڵی فرۆکەیەکـی بگرم، ناوی کۆپتەر ناهێنم زۆر لێی دەترسم، من وامە، زوو تینووم دەبێت، جا چلەی هاوینێ بێت یان لە بەر رێژنە بارانی بەهارێ، ئومێـد زۆر جـاران دەیگۆ:

پێویستە ماوەیەك خۆت لای حوشتر بەستیتەوە، تا خەسڵەتی ئاوداکردن و بەرگەگرتنی تینوێتی بگری.

حاجی جەمالیش جارێك گوێی لەو قسەیەی ئومێد بوو، بە پێکەنینێکی تفاویەوە کە ئەگەر خۆت لانەدایە دەموچاوی سواخدەدایت، گوتی:

دە وەڵلاهی ئەگەر لە کن حوشتر بتبەستنەوە، هەموو خەسڵەتێکی ئەو وەردەگریت بەس ئەوەیان نا.

هەر لەو گەڕانە، مەبەستم گەڕانە تێهەڵکێشیەکەیە، واتە ئەو گەڕانەی کە لەو برادەرانە جیابوومەتەوە کە پێکەوە لە دێرەش بووین و من و جیهاد مێوانی ماڵی چاو بەهاری بووین و نیازم سەردانی ئومێد بوو، بەڵام کچە چاو بەهاری چی لە بیرهێشتم! ئێستا رۆژە، کەس نیە لە دنیایێ هێندەی ئێمە برسی، هێندەی ئێمە ماندوو، هێندەی ئێمە لە خۆ بێزار، رەنگە ئەگەر رەبیەکی سەربازان نزیك بایە خولیای خۆ بەدەستەوەدان لە سەری دابام، بەڵام مەرجیش نیە، چونکە زۆر جار لەو بارەی ئێستام، ئێستای ئەو دۆڵەی کە هەمووی نەگبەتی بوو، حاڵم خراپتربووە و مۆلگەش نزیك بووە، بەڵام خۆشم بە دەستەوە نەداوە، ئیدی نازانم چۆن دەبوو.

دەڕۆیشتین، لۆژە لۆژە دۆڵاو دۆڵ هەڵدەکشاین، لە هیکڕا دوو سێ تۆپ هەر لە بن دەست و پێمان کەوتنەوە و بووە ئاخر زەمان، بڕوا بکەن چیا بە چیایەتی خۆی هەرەس بێنێت، هێندە ترسناك نیە و هێندە دەنگی نایە، بووە تەپوتۆزێك دەتگوت بیابان باریوە، ئەو جارەی دەیڵێم دنیا وشك بوو، من هەتا درەنگیش باوەڕەم نەدەکرد، بە زیندوویتی مابم، گوتم رەنگە مردبم، چوزانم مردن چۆنە خۆ نەمدیوە، وام زانی وایە، دواتر گومانم کرد کە بە ساخی دەرچووبم، لە بیرمە دەستم لە خۆم دەگێڕا و پیشانی چاومم دەدا بزانم خوێن نابینم، کە نەمدەدیت، باوەڕم بە چاوی خۆم نەدەکرد، دەمگوت رەنگە چاوم تووشی نەخۆشیەکی وا بووبێت رەنگی سوور نەخوێنێتەوە، دیسانەوە دەستم لە لەشی خۆم دەگێڕا و پیشانی چاومم دەدایەوە، من هەتا درەنگیش باوەڕم نەدەکرد ئەندامەکانی لەشم هەموویان ساخ بن و لە جێی خۆیان مابنەوە، بەو دەستەم لە دووی ئەو دەستەم دەگەڕام بە دەستیدی لە دووی دەستەکەیدیم، ئەوجا بە هەردوو

دەستم لە دووی پێیەکانم دەگەڕام، ڕەنگە ئەو قسانە بە زیندەڕۆیی یان بۆ جوانکردنی ڕستان لێکبدەنەوە، بەڵام چۆنی دەڵێم ئەوهابوو، دوای ئەوەی کەمێك دڵنیا بووم کە خۆم زیندووم و نەمردووم، ئەوجا ویستم سۆراخی برادەرەکانم بکەم، من تا نەزانم خۆم ماوم یان نا چۆن دەکرێ سۆراخی کەسیدی بکەم؟ ئەوەش بڵێم لە کاتی تەنگانە خۆت لە برادەرانت شیرینتری، من ئەوها بووم نازانم خەڵکیدی!

لە بیرمان بێت تۆپەکان هەر دێن، بەڵام ئەو کاریگەریەی دوو سێ تۆپی یەکەم جاریان نیە، لەگەڵیان ڕاهاتم، پێشمەرگە ئاسان لەگەڵ تۆپەکان ڕادێ، لەگەڵ هەموو شتەکان ڕادێ، کیمیای لێدەرچێ، هەر چەندە وابزانم شاعیرێك لە شیعرێك دەڵێ لەگەڵ ئەویش ڕادێین، بەڵام من باوەڕم بەو ڕاهاتنە نەبوو، چاوم لێیان گێڕا یەك دووانێکیان هاتنە ناو چاوم، ئیدی هەر یەکەی لە شوێنی خۆیەوە دەیگوت:

من ساخم، ئەدی ئێوە؟

باش بوو هەموومان ساخ دەرچووین، بە کەلێنی تۆپەکان دەرچووین، ئەوجا لە ڕێ دوای دەرچوون، یەك دەیگوت:

+ ئەو تۆپانە تورکی بوون.

+ کوا، چۆنت زانی؟

+ ئێ لەو ئاراستەیەوە هاتن، ئەدی ئەوە تورکیا نیە!

+ کوڕە، ئەوە ئەولایە کوا تورکیایە؟

+ ئەدی ڕووسیایە!

+ نا حافز ئەسەد هاویشتی!

+ ناوەڵا عێراقە.

+ تەڕتان زانی، ڕێك ئێرانە.

+ نا، بابە، تورکی بوون، بە دەنگیان ڕادیاربوو

+ وا بوو، کە دەتەقینەوە بە تورکی پێدەکەنین.

+ نا وێنەی ئەتاتورکیان پێوە بوو...

ئیدی گاڵتە و ڕاستی بە شێوەیەك تێکەڵاوی یەکتر ببوون، کەس بۆی لێکجیانەدەکرانەوە، هێندە دەزانم من هەر بە ڕاستی ئاراستەکانی دنیام لێتێکچوو، نەمدەزانی لە کوێین، نەمدەزانی بەغدا و تاران و ئەنقەرە و دیمەشق کەوتوونەتە کوێ، نەمدەزانی ئێمە لە کوێی دنیاین، نەمدەزانی...

هەر ئێوە نا بە خۆشم هەستمکرد سەرهات زۆر درێژ بۆوە، درێژ وەك درێژیی ئەو ڕێگایانەی لە دۆڵێك دەبنەوە و دەگەنە دۆڵێکیدی، لەوێشەوە بۆ دۆڵ و ئیدی دۆڵاو دۆڵ، بە خۆشم هەستم بە گێژی کرد لەو هەموو گەڕان و سووڕان و تێهەڵکێشکردنی ڕووداوان، خەریکە لە گێڕانەوەدا هەڵیت و پەڵیت بکەم، باشترە بگەڕێمەوە لای دوا گەڕان، لای قاسم ڕۆژهەڵاتی و سادق و جیهاد و ئەبوو گیچەڵ و سەردەستاڕ و ئەوانە، خەریکە لە دۆڵی کیمیا بەرێدەکەوین، خۆم حەزمکرد ئەو ناوەی لێبنێم، دەکرێ ناوی دۆڵی گوڵاڵەش بێت، یان دۆڵی مەنجەڵ یان دۆڵی زیندانی، یان دۆڵی بەرگری، یان دۆڵی کتێب، هەر ناوێکی لێدەنێی لێیدێ، ڕەنگە دۆڵێك بە ناوی کتێب جێی پرسیار بێت.

لەوێ ئەو چەند ڕۆژەی مامەوە دەمدیت هەرچی پێشمەرگەیە کتێب دەخوێنێتەوە، لە هیچ بارەگایەك دیاردەی وام نەدیتبوو، زۆربەی پێشمەرگەکانی ئەو بارەگایەش هی بارەگاکەی نزیك ئەویش عەرەب بوون، زۆریشیان دەرچووی کۆلیژ بوون، یان گەیشتبوونە قۆناخی کۆلیژ، خوێنەری زۆر باشیش بوون جگە لە کتێبی هزری و رامیاری زۆر ڕۆمانیشیان دەخوێندەوە، من لەوێ بەشێکی زۆر لە کتێبێکی بلیخانۆفم خوێندەوە لە بیرم نیە کام کتێبی بوو، کتێبخانەی گەورەیان هەبوو، لەگەڵ ئەو پێشمەرگەیەی بەرپرسی کتێبخانەکە بوو، کەمێك قسەمان کرد، زانیم ئومێد لەو کتێبخانەشەوە کتێبی بۆ من هێناوە، هەستمکرد کتێبخانەکە بۆنی ئومێدی لێدەهات، بەرپرسی کتێبخانەکە بە شێوەیەك باسی ئومێدی بۆم دەکرد گریان گەرووی گرت، بەجێمهێشت بەرگەی ئەو قسانەم نەگرت.

ئێستا بە هەورازەیەك هەڵدەگەڕێین، بەو ڕێیە نا کە پێیدا بۆ ناو مەنجەڵی

شۆڕبووینەوە، باش بوو ڕێمان گۆڕی من ترسی دنیام لێنیشتبوو کە چۆن بەو هەورازە پێبلکەییە سەردەکەوینەوە، باش بوو ڕێمان بەوێ نەکەوتەوە، هەرچەندە وەك باس دەکەن ئەو ڕێیەی ئێستا چەند قاتی ئەویدیە بەڵام هەر باشە، بەڵام بۆ ڕێمان گۆڕی؟ لەبەر سەختی بوو؟ ئەوەم لە بیرنیە، هێندە نەبێت ڕۆژی پێشتر کەمێك بەفر کەوتبوو، با ئەوە دووبارە بکەمەوە، هێشتا وەرزی بەفر نەهاتبوو، بەڵام لە بەدبەختی ئێمە ئەو ساڵە ئاسمان خشتەی خۆی گۆڕیبوو، وەخت و ناوەخت چەند پەلە هەورێکی مەیلەو سپی لێکدەدا و بایەکی ساردیش هەر جارەی لە لایەکەوە هەڵیدەکرد و دایدەکردە بەفر، ڕەنگە لەبەر بەفر لەو ڕێیەمان نەدابێت، دووریش نیە ئیشمان بەو بارەگایە کەوتبێت کە دەکەوتە سەر ڕێی نوێ، ئەو بارەگایەش هێند بەرز بوو هێند بەرز، عەدو قورەیش گۆتەنی:

کەوتۆتە چینی پێنجەمی ئاسمان.

سووی گەلەک سارد بوو، هەر لە ڕێ بووین بەفر دایکرد، نەرم نەرم دایکرد، هەند جوان دەباری خەریك بوو چێژی لێوەربگرم، من پێش پێشمەرگایەتی و لە زۆر ساتەکانی پێشمەرگایەتیش دوای پێشمەرگایەتیش ئەو چێژەی لە بارینی بەفر وەریدەگرم جگە لە ژن لە هیچیدی وەرناگرم، بەڵام لە بیرت بێت کاتێ ماندوو مردوو لە ڕێی، بەفر دادەکات چارەنووست لە خۆیدا بزر دەکات، دوور نیە بتبەستێ و تا وەرزی توانەوە لە بن بەفرێ بمێنیتەوە، دوور نیە زریانێك هەڵبکات و بتبات بتبات لە ناو دۆزەخ داتنیشێنێ، لەو ساتانە بەفر لە کوێ چێژی هەیە، لە کوێی بەفر جوانی دەبینیتەوە! عەسرانێکی درەنگ گەیشتینە ئەوێ، نزیك بارەگا گوتیان ئا ئەوەتە، بەڵام من چیم نەدیت، چ ببینم دنیا سپی سپی، هەموو شت سپی، ئەو دووکەڵەشم نەدیت کە لە لوولەی سەربانەکانەوە تێکەڵی بەفر دەبوو، بارەگا چەند بەرز بوو، ئەوجا لەم تەنیشت و لەو تەنیشت دوو چیای هێند بەرز بە ئاسماندا چووبوون، بە قسەی عەدو قورەیش بێت، دەبێت چینی حەفتەمیشیان بڕیبێت، ئەو بارەگایەش پڕە لە کتێب، بەڵام

زۆربەی کتێبەکان فارسی بوون، زۆر لە پێشمەرگەکان هی تودە و سازمان و ئەوانە بوون، من لەوێ گوێم لە دەنگی ئەو ئەمیرە بوو کە خالقیەك بوو بۆ خۆی، لە سەرهاتێکیدی (ئەفسانەی کانی ژنان) سەردانی دەکەمەوە.

شەو ماینەوە، ئەو شەوە بە هەڵە بێت یان بە راست، زۆر شت لە بارەی ئێرانەوە فێر بووم، ئەو بارەگایەش ئومێدیان دەناسی، زۆریان دەیانناسی، یەکەم شتیش پێکەنینەکەی بوو، ئای ئومێد بەو پێکەنینە هەنگفینیە چۆن بارەگاکانت داگیرکردووە، دڵی هەمووانت پڕ لە میهر کردووە، بەڵام چ دەکەیت، لەولاوەش پێکەنینی ئەبوو تاڵیبی تاڵیش هەیە.

ئەو شەوە شەوێکی بە واتای بەفری، بەفراوی بوو، سارد سارد شەیتان لە ترسی بەستن نەدەهاتە دەرێ، ئەو گۆتەیە هی پیاوێك بوو خەڵکی گوندی (بانێ) ئەو بانێیە لە نزیك ئاسمانە، ئەوجا لە ساتە ساردەکانی زستانێ ئەو قسەیەی دەکرد، ئەوهای دەگوت:

ئەورۆ، ئەوشۆ زۆر ساردە، هیچ شەڕ و دەمەقرەیەك روونادا، چونکە شەیتان لە کونی ژوورەکەی خۆی، خۆی گرمۆڵە کردووە و نایەتە ناومان.

ئەوشەوە من خۆم بە گۆرانیەکانی ئەمیر گەرمدەکردەوە، بە فارسی و کوردی گۆرانیی دەچڕی، ئەو شەوە من خۆم بە شیعری فارسی کە کەمێکی کەمیش تێیدەگەیشتم خۆم گەرمدەکردەوە، خۆم بە شاملۆ گەرمدەکردەوە.

سپێدەی دابوو نەدابوو، هێشتا کەڵەشێری کوێستانان بانگی نەدابوو، هێشتا ئەو هەموو پیاوە رەبەنەی بارەگا لە ناو خەونێ خۆیان بە ژنانەوە دەنا، من لەو کاتانەی شەو خەونی ئەوهام زۆر دەدیت، لە زۆر پێشمەرگەشم بیستبوو کە زۆر کەڕەت لەو کاتانە خەونی ئەوها دەبینن، ئێ، بەو سپێدە زوقمی و شەختەییە بە دیوی ئەودیودا دابەز دابەز دابەزین، خلیسکی وەهاشمان دەبرد ئەگەر خۆمان نەدەگرتەوە لە بنەبانی زەوی خۆمان دەدیتەوە، لە بیرت بێت ئێمە وا لە ئاسمانەوە بۆ زەوی شۆڕدەبینەوە، من وام هەستدەکرد لە ئاسمانێم، دەزانن چەند بەرز بوو،

دەزانـن هەتـا لەودیـوەوە بە سـەر کەوتـین بەو بەفـر و سـەرمایە چەنـد عارەقەمان کرد، چەند مەتارە ئاومان خواردەوە، هەر دابەزە و نەدەگەیشتینە زەوی، مـن هێنـدە مانـدووبیووم، لە هەنـدێك جـێگە بە قوونەخشـكێ و خلیسکان لە سەر بەفر دەهاتمە خوارێ.

لە گەیشـتنمان بە سـەر زەوی، لە دەروازەی زەوی گونـدێك باوەشـی گەرمی بۆ ئێمەی سەرمابردەڵەی ئاسمانێ کـردەوە، گونـدێك نـاوەکەی لە نـاو لە بیرچـوونەوەدایە، نـاوێکی زۆر ناسـك و ژنـانەی هەبـوو، دوو دوو دابەشی سەر ماڵان بووین، من و گێچەڵ کەوتینە ماڵێك ژنێکی جوان زۆر بە جـوانی مێوانـداریی کـردین، ژنە تـا بڵێـی جـوان بـوو، لە تەمەن لە سەرەوەی چل دەچوو، بەڵام هەموو جوانیەکانی چواردەی لە سیمایدا وەك خۆی هێشتبۆوە، چاوێکی پێوە بوو دەتگوت چاوی ئایشەشانە، ژنێـك بـوو زۆر میهرەبـان، زۆر دایکـانە هەڵسـوکەوتی لەگەڵ دەکـردین، خـۆزگەم دەخواست ئەو ژنە دایکـی مـن بـوایە، زۆری نەبـرد خـواردنی ئامـادەکرد، پرسیاری خواردنەکەم لێمەکەن، هێندە دەزانم زۆر خۆش بوو، ئاخر ئەگەر نـان و پیـازی دەسـتی ئەو ژنە بخۆیـت هەر خۆشـە، هەر لە سـەرەتاوە دەمدیت ئەبوو گێچەڵ هەوڵیدەدا بە چاو گێچەڵ بەو ژنە بکات، ئەو ژنەی لە کنە من دایکێکی جوان بـوو، رەنـگە زۆر لە پێشـمەرگان کە دەچـوونە مـاڵان ئەگەر بۆیـان گونجابێـت هەوڵیـان داوە لەگەڵ کچـان، ژنـان چاوچاوانێ بکەن، من یەکلایەنە کەمم لەگەڵ کچە چاو بەهـاریەکە کـردا! بەڵام لەوەی ئەبـوو گـێچەڵ تووڕەبـووم، هەسـتمکرد گـێچەڵ بە دایکـم دەکات، نوقرچەیەکیشم لێدا، بەڵام کەڵکی نەبوو، دیاربوو بـاش لێـدرابوو، بەڵام ژنە هەتا هەستاشین هەر دایکانە رەفتـاری لەگەڵمـان کـرد، پیـاوی لە ماڵ نەبوو، دووسێ منداڵی سەرکەوبنکە لە دەورمـان دانیشـتبوون، وا بـزانم کۆڵەپشتەکەم کردەوە و یەکـی یەك دوو دانە قەسپم دانـێ، زۆر کەیفیـان هات، کـات بە کـاتی گونـدی هێشـتا مـابووی بـۆ نیـوەڕۆ، بەڵام بە کـاتی گەدە نیـوەڕۆیەکی درەنگـی نیشـاندەدا... ئەبـوو گـێچەڵ دەوی پرسـیاری

کردەوە، پرسیار لە ژنە، دەبوو منیش کاری وەرگێران بکەم، ئەوجا چ وەرگێرانێك، یەکێك لە پرسیارەکانی گێچەڵ ئەوەبوو:

ئێوە گەرماوتان هەیە؟ خەڵکی گوند چۆن و لە کوێ خۆیان دەشۆن؟

من شەرمم لە پرسیارەکە کرد گۆڕیم، ئەوهام بۆ ژنەکە کردە کوردی:

ئێوە چەند سەر بزنتان هەیە؟ بەو زستانە چۆن چۆنی بە خێویان دەکەن؟

نازانم وەڵامی ژنە چی بوو، بەڵام ئەبوو گێچەڵ هەستیکرد پرسیارەکەی ئەوم گۆڕیوە، گوتی:

تۆ چیت پێیگوت، ئەو بزنەت لە کوێ هێنا؟

منیش بێ خۆتێکدان گوتم:

بزن لە زمانی کوردی دوو واتای هەیە، یەکیان گەرماو ئەویدیش هەر بزن، ئەو بزنەی تۆ دەیناسیت و برادەرتە.

ئەبوو گێچەڵ لە نێوان باوەڕهێنان و نەهێنان بەو دوو واتایەی بزن تێدا مابوو، لە بیرنەکەم ئەو ئەبوو گێچەڵە کە حەفت ساڵ پتر بوو ببووە پێشمەرگە، بەڵام هەر حەفت وشەی کوردیی دەزانی وشەکانیش وا بزانم ئەمانە بوون (گۆشت، نان، کانی، ساوار، هێستر، پێشمەرگە، بزن)، وشەی بزن و ئەبوو گێچەڵیش سەرهاتێکی ناسکە، بەڵام جوانم لە بیرنیە بۆیە نایگێڕمەوە با هەر بە ناسکی بمێنێتەوە، ئەبوو گێچەڵ رستەیەکی کوردیشی دەزانی (تو کی زەلام) بڕوا ناکەم پێشمەرگەیەك هەبێت لەگەڵ ئەو رستەیە چیرۆکێك چ تاڵ چ شیرنی نەبێت، یادەوەریی هەر پێشمەرگەیەك بخوێنیتەوە ئەگەر ئەو رستەیەی بە چیرۆکەکەیەوە تێدا نەبوو، ئەوە دڵنیابە یادەوەریەکی ناتەواوە، من ئێستاشی لەگەڵ بێت لەگەڵ ئەو رستەیە رانەهاتم، شەرمدەکرد بیڵێم، بۆیە رەنگە بچمە خانەی نیوە پێشمەرگەوە، ئاخر نازانم کێ بوو دەیگوت:

هەر پێشمەرگەیەك ئەگەر نەیتواتنی بە توندی دەنگی کەسێك بدات ئەوە ئەگەر چل ساڵیش بێت پێشمەرگە بێت، هەر نیوە پێشمەرگەیە.

لێرە تەنها (تو کی زەلام) یکی ئەبوو گێچەڵ دەگێڕمەوە کە هەر لە نزیك ئەو گوندە ناو ژنانیە لە خۆوە فڕێدا:

بلێمە خوێتەرێ خۆ، لە گوندی دەهاتینە دەرێ، ئەبوو گێچەڵ لە پێشەوە دەڕۆیشت، لە ناو ئاوایی لە نزیك ئاوایی حەزی دەکرد لە پێشەوە بڕوا، لە پڕ بەو نوێژی نیوەڕۆیە گوێم لە هاواری ئەبوو گێچەڵ بوو:

+ تو کی زەلام؟

- ئەز ئەزم، بەلێ خویشکا من تو کی؟

هەموومان جەگە لە ئەبوو گێچەڵ خەریك بوو لە پێکەنین لە سەر پشت بکەوین، کەس قسەی بۆ نەکرا، کەس نەیتوانی داوای لێبوردن لەو ژنە بکات.

لە رێ هەتا گەیشتینەوە زارگەلی و دێرەش و کانی توبەش ئەو سەرهاتە بووە قسەی سەرە سەعاتان و بە بەهاراتەوە دەگێڕدرایەوە، ئەبوو گێچەڵ دەیگوت:

من چ بزانم دەبێت بلێم تو کی ژنك؟

هەر لەوێ وشەیەکیدیش فێر بوو، بە ئەبوو گێچەڵیان دەگوت:

کێشە ئەوەنیە تۆ زەلام یان ژنکت گوتیە، کەرایەتیەکەت لەوەیە، بەو نوێژی نیوەڕۆیە، کەسێك وا لە پێشتە چ پێویست دەکات تۆ دەنگی بدەی؟

ئەبوو گێچەڵ دەیگوت:

پێشمەرگە دەبێت وەك من بێت، ئەگەر بەردێکیشی دیت دەبێت دەنگی بدات و بلێت (تو کی زەلام؟)

گەیشتینە دوو گوند، زۆر لێکدی دوور نەبوون، هەردووك کەوتوونەتە سەر رێ، رێی ئەوجارەی ئێمە، دەنگی مەلا بێ بلندگۆ دەگەیشتە گوندە بێ مەلاکە، ئەو دوو گوندە یەکیان موسڵماننشین، ئەویدی مەسیحینشین، لە نێوان خۆمان کەوتینە بەراوردێکی نێوان ئەو دوو گوندە، لە چی وێک دەچن و لە چی جودان، هەر یەکەی جیاوازیەك یان وێکچوونێکی لە

نێوانیان دەدیتەوە، ئازادێکمان لەگەڵ بوو وا بزانم عەرەب بوو گوتی:
تەنها یەك جیاوازی هەیە ئەویش مەلا.
ملازم کارزان کە مەسیحی بوو گوتی:
با من پێتان بڵێم، هاوینی چووی لە هەردوو گوندەکە مێوان بوومە، لە بۆنی مەشکە، لە دۆ وەك یەکن، جیاوازیەکەش لە بۆنی شەرابدایە، ئەگەر باوەڕیش ناکەن با بچین بزانین لەوەیان بۆنی شەراب دێت یان نایەت.
بەراوردەکەی کارزان دوماهی هێنا بە بەراوردکاری لە نێوان گوندان، من لەوێ، لەو شوێنەی کارزان باسی بۆن و تامی دۆ و شەرابی کرد، قسەیەکی ئومێدم بیرهاتەوە، رێك وەك ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە چۆن بەبیرم هاتەوە، باشم لە بیرە ئومێد باسی ئەو گوندەی بۆم کردووە:
بەهار و هاوینان دیواری خانووەکانیان لە بن باداک بزرن.
دەیگۆ:
لە مانگی رەزبەرێ، پیاسەیەکی بن درەختەکانی بکە، هەرچی جۆری باوێژە هەیە لە زەوی هەڵیانگرەوە.
ئەو گوندەی ئۆمەتی عیسای تێدا دەژین، هەر لە رێی ئومێدیشەوە زانیم ئەو گوندە عیساییە ماڵە موحەمەدیشی تێدایە، چ پێشمەرگەیەك هەتا ئەوانەی خەڵکی ناوچەکەش بوون، هێندەی ئومێد شارەزای ئەو دەڤەرە و هەموو بادینان نەبوون، بادینان بە چیا و دۆڵ و پێدەشت و رووبار و کانی و گوند و گوندنشینانەوە، ئومێدی گەڕۆك بەشێکی زۆری تەمەنی لە گەڕانی چیاچۆلانی بادینان بەسەربردووە، کێ هەیە وەك وی شارەزا، جارێك بە گوێی خۆم گوێم لێبوو، راوچیەکی گوندی کافێ کە چەندان ساڵ پێشمەرگایەتیشی کردبوو، وا بزانم جاشایەتیشی کردبوو، بە ئومێدی گوت:
بە خودای من نیو هێندەی تۆ شارەزای ئەو شوێنانە نیم کە شوێنی خۆشمن.
ئومێد لە ئەستێرەی ساوەی دەکرد، تا نەڕژا، لە گەڕان نەکەوت.

با قسەکەی ئومێد لەبیرنەکەم، دەیگوت:

لەو گوندە دوو ماڵ هەن، دیواریان بە دیوارەوە، لە پشتەوە، ماڵێکیان رووی لە مەکە و مەدینەیە، ماڵێکیشیان رووی لە ئۆرشەلیمە، یەکیان پەیامبەرێکی هەیە و فێریشی کردبوو، ئەگەر کەسێك هەر کێ بێت، شەقازللەیەکی لە بن گوێت دا، وەهای لێدەوە وەهای لێدەوە بیتەزێنە، تەزاندنێك جارێکیدی زاخی ئەوە نەکات دەستت لێ بەرزبکاتەوە، وەهای چاوشکێن بکە هەتا مردن رووی نەیە سەر بەرزبکاتەوە و چاو لە چاوت ببڕێ، ماڵەکەیدی، پەیامبەرێکی هەیە و فێریشی کردبوو کە ئەگەر کەسێك هەر کێ بوو، لەبەر هەر هۆیەکیش بوو شەقازللەیەکی لە لای راستت دا، تۆ نەك هەر دەست مەکەوە بەڵکو لای چەپیشتی بۆ راگرە بۆ ئەوەی تەریقبێتەوە، بێتە ئاو و رۆبچێتە زەویەوە، بۆ ئەوەی جارێکیدی لە دەستی نێ دەست نە لە تۆ و نە لە کەسیدی بەرزبکاتەوە، ئەوجا با مەبەستی خۆم بڵێم، ئەو دوو ماڵە دوو پەیامبەر جیایە، بە شێوەیەك تێکەوڵاوی یەکتر ببوون، بڕوات بێت قەت شەکر و چایە ئەوها تێکەڵاوی یەکتر نابن، لە نێوانیان ئەوەی نەبوو جیاوازی بوو، بە گوێ خۆم گوێم لە یەکیان بوو دەیگوت:

مرۆڤ گرنگ ئەوەیە لە قسەی خودا دەرنەچێت، ئەگەر لە زۆر شتان بە قسەی پەیامبەریش نەکەیت، نە گرفتە.

ئومێد دەیگوت، مەبەستمە بڵێم:

ئەو تەباییەی لە نێوان ئەو دوو ماڵە پەیامبەر جیاوازە، ئایین جیاوازە، هەبوو، ئەگەر لە هەموو جێیەك چواریەکی ئەو تەباییە هەبا، هەبێت، ئەوا مێژووی مرۆڤایەتی قەت شەڕی ئایینی بە خۆیەوە نەدەدیت.

بیرمە بۆ جوانتر نیشاندانی گێڕانەوەکەی ئومێد منیش گوتم:

وەك دەڵێن ئەو سەردەمەی جوولەکەش لێرە هەبوون هەمان تەبایی هەبووە...

منیش قسەی پیرێکی پێرس نشینیم بۆ ئومێد گێڕایەوە، پیرێك خۆی

دەیگوت تەمەنی نزیکی سەد ساڵ بووەتەوە، ئەو پیاوە سەد ساڵەیە وای گێڕایەوە، من بە داڕشتنێکی جیاوە دەیگێڕمەوە:

حەیف و مخابن ئەو هەموو ماڵە جولەکە باشە ڕۆیشتن، بە خودای لە سەر سەرانە ئەوان زۆر لە ئێمە باشتر بوون، زیرەکتر بوون، ژیرتر بوون، جگە لە چاکە هیچیان لێنەدەوەشایەوە، لێرە لەو دۆڵە لە دۆڵەکانی ئەو دیو، لە سەر چیاکان، لە ڕۆخی ڕووبارەکان، موحەممەد و موساو عیساو پەیامبەرەکەی ئێزیدیانیش کە ناوی نازانم، پێکەوە نانیان دەخوارد، میوەیان دەخوارد ئاویان دەخواردەوە، پێکەوە دەچوونە سەر شایی، پێکەوە دەچوونە پرسە، مێوانداری یەکتریان دەکرد، پێکەوە لاوکیان دەگۆت، بە ژن و ژنخوازی تێکەڵبیوونەوە، بەڵام نازانم خودا ئەو دوژمنکاریەی لە کوێوە هێنا و لێکی کردین؟!

ئومێد حەزی لەو سەرهاتە هەبوو، ئەوەشم گۆت:

بەڵام پیرێکیدی لە وەڵامی ئەو پیرە دەزانی چی گۆت؟ گوتی:

من بەو نزایە ناڵێم ئامین، لەوەتەی هەیە قەت تەبایی لە نێوان دینان نەبووە، وەڵاهی بابم بۆمی دەگێڕایەوە بەردەوام لە ناو کوردان کێشە هەبووە لە نێوان ئایینەکان، ئەتو شەڕی موسڵمان و فەلانت نەبیستووە، تو نەتبیستووە وا بزانم پاشای ڕەواندزێ بوو یان هی جێیەکیدی چی لە ئێزیدیەکان کرد .

ئومێد بە وردی گوێی بۆ گێڕانەوەکەی من شلکردبوو، کە تەواو بووم بە پێکەنینە شیرنەکەی خۆیەوە گۆتی:

بە قسەی من دەکەیت چیرۆك بنووسە، ڕۆمان بنووسە، ئەو قسانە بنووسەوە ئەوانەی خۆت بیستوتن، ئەوانەی من بیستوومن، دڵنیابە دەبنە ڕۆمان، خۆ کازانتزاکیش هەر قسەی وای کردووە.

منیش ئەوهام وەڵامم دایەوە:

دەتەوێت گاڵتە بە پەیامبەرەکەی من بکەیت، ئەگەر هی ئەو ئەوها بێت، هی مارکیز لە هی ئەویش ئەوهاترن.

ئومێد:

کوره بە گاڵتەی وەرمەگرە، ڕۆمان چیە! هەر لە چەند ڕستەیەکی ئەوها پێکدێت، بەڵام هەندێ تەکنیکی پێویستە کە ئێمە کاتی فێربوونی ئەو تەکنیکانەمان نیە.

دەزانن کەوتمە ژێر کاریگەریی ئەو قسەیەی ئومێد، هەر ئەو ڕۆژە دەستم دایە قەڵەم و دەستم بە نووسینی شتێك کرد (پێشمەرگایەتی لە سەردەمی خۆشەویستی) بەڵام دوایی بووە فشە.

گەڕانەوە بە ڕێی ڕۆیشتندا ماندووم دەکات، ئەو سەرهاتانەی لەو گەڕانەوەیەشدا دێتەوە ناو یادەوەری گێڕانەوەیان گێژم دەکەن، زۆرن هێند زۆرن دەڵێی تاوە تەزرەن و دادەکەن و پێڕاناگەم هەڵیانبگرمەوە، با ئێستا لەوێ بن، ئەگەر لە یادەوەریمدا مانەوە و نەتوانەوە، لە گێڕانەوەیەکیدی لە تەزرە سپیتر نیشانیان دەدەمەوە..لەو گەڕانەوەیەدا هەر هێندە دەگێڕمەوە و تەواو، چەند دیمەنێك نیشاندەدەمەوە و تەواو، بەر لە گەیشتنەوەمان بە زارگەلی بە بەرزاییەکەدا بەرزدەبووینەوە، لە لای ڕاستمانەوە و لە دوورەوە چیای مەتین، مەتینی سپی، سپیاتیی خۆی لە چاومان دەدا، هەر کەسێکیش چاوی سپیاتیی مەتینی لێبینیشێ، جگە لە سپی چ ڕەنگیدی ناخوێنێتەوە، من وا بووم، جگە لەوە مەتین لە دیدی منەوە جیایە لە هەموو چیاکان، لە مەتین هێمنیەك هەیە کە لە هیچ چیایەك نایبینیەوە، ڕەنگە ئەو هێمنیەی من لە مەتینی دەبینمەوە، نهێنیەکی تێدا بێت، نهێنیەك نازانم چیە وەرنا بە گۆڕێم وەردەکرد، کاتێ گەیشتینە سەری بەرزایی پشوومان دا، نازانم پشووەکە پشووی چەند جگەرەیی بوو، پیاوێك بە کۆڵێ دارەوە بەرەو لای ئێمە دەهات، درۆ نیە ئەگەر بڵێم بارەکەی باری هێسترێك دەبوو، تەماشاکەن لە بنی کوورِ بۆتەوە، خەریکە لووتی دەگاتە زەوی، گۆپاڵێکیشی لە دەست بوو، سلاوێکی شیرنی کرد و کۆڵەکەی دانا و دانیشت، من کەمێك درەنگ پێکەوتم کە کووڕبوونەوەکەی هی بارەکە نیە هی پیریە، زۆر پیر بوو، کە قسە هاتە سەر تەمەن، گوتی:

به درووستی نازانم چەند ساڵم، بەڵام هێندە دەزانم چەند ساڵێك لە مەلا مستەفا گەورەترم، بە منداڵی دەمناسی، ئازا بوو، پیاوێکی ئازابوو.

ئەو پیاوە زۆری حەز لە قسە بوو، قسەکانیشی خۆش و شیرن بوون، هەموو گوێمان لێراگرتبوو، ئەبوو گێچەڵ کە هیچیشی تێنەدەگەیشت بەڵام وەها گوێی بۆ شلکردبوو، یەك نەیزانیبا رەنگە واتێگەیشتبا ئەوە خەریکە قسەکانی ئەزبەر دەکات، قسە هاتە سەر ژیان و مردن، پیرە گوتی:

نازانم نە ژیان هیچە نە مردن! نەبێتە قسەکردن لە قسەی خودا، بەڵام دەڵێم خودای گەورە کە ژیانی دانا نەدەبوو مردن دانێ، ئەدی وا نیە؟

هەموو بە یەك دەنگ:

قسەی تۆیە، بەڵام چ دەکەیت ئەوە ئەوهایە!

پیرە دەیگوت:

ئەنگۆ گەنجن، جارێ نازانن مردن چ ترسناکە، منیش کە لە تەمەنی ئێوە بووم، فشەم بە مردن دەهات، بەڵام ئێستا لێی دەترسم، زۆریشی لێ دەترسم، ئەو پیرانەی کە دەڵێن لە مردن ناترسێین درۆ دەکەن، وا نیە، کەر بە کەرایەتی خۆی لە مردن دەترسێت، باشە رێی تێدەچێت مرۆڤ لێی نەترسێت!

نازانم کێ بوو گوتی:

خاڵە مردن لە پێناوی نیشتمان و کێشەی رەوا خۆشە و لێشی ناترسێم...

پیرە بە خەفەتباریەوە گوتی:

تۆ راستدەکەیت، تۆ گەنجی، بە راستی حەیفم دێ ئێوە بەو تەمەنە جوانەوە وا عەشقە مردنن، بە هەر حاڵ من نامەوێ بمرم بە لای کەمی حەزدەکەم هەزار ساڵ بژیم، لە نوح پتر بژیم، دەزانن من کە ئەو بارە گەورەیە هەڵدەگرم دەمەوێت بە مردن بڵێم کە هێشتا گەنجم، بە توانام لێم نزیك مەکەوە... کاکە ژیان خۆشیە، دەبێت بە خۆشی بژیت لە شایی و زەماوەند ژیان بکەیت، نەك لە کوشتوکوشتار، خودا بەغدا نغرۆ بکات.

سەردەستاڕ سەری لە بن گوێم نا:

کوڕە ئەوە زۆربا نەبێت زیندووبووبێتەوە!

ئەو پیاوە زۆر سەرنجی منی ڕاکێشا، وا بزانم ناوی مەلا حەمەد بوو، قسەکانی بە هی پیرێکی نەخوێندەواری ئەو چیا و چۆلانە نەدەچوو، بەڵام هەر خۆشم دەمگوت با زۆر پیاوی نەخوێندەوار قسەی هەند جوانیان پێیە هیچ بیرمەندێك، ڕۆماننووسێك شاعیرێك قسەی وا جوانی نیە، لێیم پرسی:

خوێندەواریت هەیە؟

گوتی: ئا، لە فەقێیاتی فێربووم.

پرسیم: شیعری هیچ شاعیرێکت خوێندۆتەوە؟

وای وەڵام دامەوە: ئا، هی ئەحمەدی ناڵبەند و زۆریدی، شیعری مەلای جزیریش.

پیرە نازانم نە لە ئێمە تووڕە بوو نە لەخۆی، بارەکەی بە پشتی خۆیدا دا و ماڵئاواییەکی ساردی کرد، لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

ژیان هەنگوینە کەمێك ژەهریشی تێدایە، بەڵام مردن ژەهرە ژەهر.

ئێمەش هەر یەکەمان سەر کۆنەی ئەوانیدیمان دەکرد و دەمانگوت:

سووچی تۆ بوو، تووڕە بوو، نەدەبوو ئەو قسەیەت بکردایە، ئەو پرسیارەت بکردایە.

هاتین هاتین، لە گوندەکەی زارگەلی نانمان خوارد و هاتین هاتین گەیشتینەوە سەر جادە و بە بەردەمی جاشان پەڕینەوە، باش بوو ئەو جارە ئەبوو گێچەڵ لەرزی نەگرت، ئێستا کە دنیا لە سەر تاریکیە لەو جێگەیەین کە دەستەکەی ئەبوو تاڵ لێیان قەوما، ئەو دەستەیەی ئومێد چاو ساخیان بوو، بە فەرمانی ئەبوو تاڵ سەد مەترێك لە پێشەوەی دەستە دەڕۆیشت، ئەوە جاری چەندەمینە ڕێم بێرە دەکەوێتەوە و هەردوو پێکەنینشم بیردەکەوێتەوە، دوو پێکەنینی دژ بە یەك وەك مردن و ژیان دژ بەیەك، ئەو پێکەنینانەی دەڵێی لە کاسێتی سەرم تۆمار کراون و نازانم کێن بۆم لێدەدەنەوە.

ئەها ئێستا گەیشتینە دێرەشی ئومێد، رەنگە زۆری نەمابێت بەیان بدا، هی ئەوە نیە بە مالآن وەربین، چووینە مزگەفتەکە، کە تەنها دیوێکی کەمێك گەورە بوو، لە تەنیشتیشیەوە شوێنێ بۆ دەستنوێژ هەلگرتنو بۆ تارات کەوچکەیەکی گچکە و رێکی هەبوو.

بە ئاگرێکی دووکەلاوی خۆمان گەرم کردەوە، من دەبێت بە چیچکانەوە سەر خەوێکم شکاندبێت، بەوە دەزانم خەونم دیت، لەو خەوە لە ناو گۆڕستانێ پیاسەم دەکرد، رۆژ بۆوە بۆ نانخواردن بە مالآن وەربووین، وا بزانم من و سەردەستار چووینە مالێك ژنەکە هەتا چایەو ماستێکی داینێ هەر بۆلە بۆلی بوو، تێشنەدەگەیشتم چ دەلێت، بەلام لە چاوانی دیار بوو رقی دنیای لە ئێمە بێت، ناهەقی نەبوو، دەزانن دێرەش چ پێشمەرگەیەکی بەسەرەوە بوو، هێشتا دوا کەسی دەستەیەك پێشمەرگە پێی هەر لە ئاوایی بوو دەستەیەکیدی بە دیار دەکەوتن، نازانم بۆچی ئەو رۆژە هێندە مەیلی دیتنی کچە بەهاریەکەم نەبوو، بە تەنیشت مالیشیاندا رەتبووین، من ئەو رۆژە هەر لە خەیالی ئومێد بووم، دەبوو سەردانێکی بکەم، لەو پێشمەرگانەش کەسیان مالی ئومێدیان پێنەدەزانی، بەلام خەلکی دێرەش، لە هەر کێت پرسیبا گەورە یا گچکە، ئومێد لە کوێیە؟ دەستی دەگرتی و دەیبردیە لای ئومێد، پیاوێك چاوساخیی کردم، نزیك بوو هەر لە بن گوند، پیاوەکە لە رێ باسی جوانی و قسە خۆشیی ئومێدی بۆم دەکرد، هەولی دەدا ئومێدێکم پێ بناسێنێ کە من هێندەی ناناسم، پێش ئەوەی بگەینێ با قسەیەك لە ((داستان))ەکەی ئەبوو تالیب بکەین، ئەو داستانەی بە دەم گێرانەوەی تال تال لە گووزارك تالتر پێدەکەنی و بە عەرەبیەك کە زۆر باشیشی تێنەدەگەیشتم، دەیگوت:

بە راستی بەرێکەوت دەرچووین، هەر دەستەیەکیدی با لە جێگەی ئێمە کەسی لێدەرنەدەچوو... لە هەمووی گرنگتر بەجێنەهێشتنی تەرمی شەهیدە، بەجێمان نەهێشت، چۆن بەجێیدێلین ئەگەر هەمووشمان شەهید باین هەر دەرماندەچواند.

ئەبوو تاڵیب کاتێ ئەو داستانەی بۆمان دەگێڕایەوە، لە بن کەپرە گەورەکەی کانی توبە دەورمان دابوو، تازە لە داستان گەڕابوونەوە، ئەو داستانەیٚ لەوێ لەو جێگەیەی دەکەوتە نزیک مۆڵگەی جاشەکانی سەر جادە، ئەو جاشانەی رێککەوتنمان لەگەڵیان هەبوو، بە پێکەنینی تاڵەوە ئەو داستانەی دەگێڕایەوە کە بە هەمووی یەك فیشەکی تێدا تەقێنرا و فیشەکەکەش رێك بە دڵی پێشمەرگە چاوساخەکە کەوت و دەستبەجێ گیانی دەرچوو، هاوارێکیشی لە دوای خۆی بەجێنەهێشت، ئەبوو تاڵ وا لە داستان تێگەیشتبوو کە رووداوێکە خۆی بە سەلامەتی لێی دەربچێت، جا با ئەو رووداوە غلۆربوونەوەی تاوێرێك بێت، لووشکە هاویشتنی هێسترێکی چەمووش بێت، ئەو پیاوە پێکەنین تاڵە بە شێوەیەك رووداوەکەی دەگێڕایەوە دەتگوت سەدام حوسێنە و باسی سەرکەوتنەکانی خۆی دەکات، ئەبوو تاڵ کاتێ ئەو هەواڵە تاڵەی راگەیاند تاڵ تاڵ پێدەکەنی، کەس نەبوو نەتاسێ، دەڵێی ئێستایە، لە پێش چاومە، ئەوەتە ئەبوو خالیدی تەویل رۆندکی درشت دەبارێنێ و لە چۆکی خۆی دەدا، ئەو کوڕە لە هەمووومان پتر گریا، زۆر برادەری بوو، ئەو قسەیەی پێکەنین تاڵیشم لە گوێدا دەزرینگێتەوە کە بە ئەبوو تەویلی دەگوت:

هاوڕێ عەیبە مەگری کەس هەیە بۆ شەهید بگریت، پێبکەنە چونکە ئەو بە سەربەرزی سەری نایەوە، بە رێزەوەش ناشتمان ئیدی گریانی بۆ چیە.

ئەبوو تەویل بە گریانەوە دەیگوت:

کە رۆیشت دەیزانی هاتنەوەی نیە، بە منی گوت:

رەنگە یەکتر نەبینینەوە...

دڵنیام دڵی شتێکی پێگوتبوو.

دەمدیت دیاریش زۆر لە پێکەنینە تاڵەکە دەهەری ببوو، لە لاوە بە شێوەیەك تەماشای ئەبوو تاڵی دەکرد، وەك ئەوەی هەستی بە ناپاکیەکانی کردبێت، ئەو ناپاکیانەی زۆر دواتر دەیانگوت ئاشکرا بوون، ئەو قسەیەی

دیاریشم له بیر ناچێتەوه كه هەر ئەو رۆژه لەو بارەگایه تازەباره گوتی:

هیچوپووچ ئەبوو تاڵیب، تاڵترین هەواڵی بۆمان هێناوەتەوه و تاڵ تاڵیش پێدەكەنێ، ده ببینن كێ دەڕوا و كێش دەمێنێتەوه!

پێشمەرگەیەك كه لەگەڵ رووداوەكه بوو، دواتر گوتبووی:

كاتێ شەهیدی چاوساخ له پێشمانەوه به دوورایيەكی باش دەڕۆیشت و دنیاش له سەر تاریكبوون بوو، دەنگی فیشەكێك هات و ئەو بەربۆوه، لەو كاته ئەبوو تاڵیب فەرمانی پێداین كه تەقه نەكەین دەنا تێدەچین، ئیدی تەواو هەر ئەو تەقەیه بوو...

من تا درەنگیش نەمدەتوانی باوەڕ بەخۆ بهێنم ئومێد مردووه، له خەیاڵی من زیندوو بوو، تیچاوێكم لەو بستووه بوو كه زۆر كەڕەت ئومێدی لێ دەردەكەوت، دڵم هەمیشه سەیار بوو، دەمگۆ:

هەوكه ئومێد به كۆڵەپشتێ كتێب و گوپی پڕ پێكەنینەوه دێتەوه.

دێرەش سپیه زۆر سپی، له كفنیش سپیتر، ئەو كفنەی دەتگوت بۆ باڵای پێشمەرگه نابێت، كەم پێشمەرگه هەبوو له خستنه گۆڕێ كفنی پێ ببڕێ، هەموویان به جلكی خۆیانەوه نێژران، ئێستا وا له سەر گۆڕێكم سپی، هەستدەكەم پێدەكەنێ، ئومێد پێدەكەنێ، گۆڕی سپی پێدەكەنێ، چەند دڵۆپه فرمێسكێكم هەڵوەراندە سەر گۆڕه سپیەكەی ئومێدی تاقه برای چەند خوشكان، ئومێدی خوێنەره جوانەكەی ماركیز، ئومێدی چاوساخی رێوبانان، چاوساخی هەموو بادینان، ئومێدی كۆڵەپشت پڕ له كتێب و دڵ سەررپێژ له پێكەنینی هەنگوینی، ئومێدی ئەویندارى دێرەش به هەموو وەرزەكانیەوه، ئەو دێرەشەی بووه ئارامگەی هەمیشەیی ئومێد، له سەر گۆڕەكەی ئومێد رەنگه قسەیەكی وام كردبێت:

له بەلاش هێنده عەشقه دێرەش نەبووی، دەتزانی گۆڕەكەت دەكەوێته نێره!

ئومێد چوو، یادەوەریی منی شانه شانه پڕ له پێكەنینی هەنگوینی كرد، ئەبوو تاڵیب چوو، پێكەنینێكی ژەهریی رژانده یادەوەریی منەوه.

## گاره بەڵا، بەڵا

بۆ سوێندی بەهارانیش ڕێوبانان یەك چڵ کەسکاییان نیشانی بینایی ڕێبوارەکان نەدەدا، تا خوداوەندی وەرزی پووش حەزبکات، تا بینایی بردەکات، هەر پووش و پووش، ئاقاری گارە بە دیوی ڕۆژدا هەمووی پووش، هەر پووشە بە هەناسەی با دەشکێتەوەو بە پێیەکانی من کە جاروبار خەیاڵی قووڵ قووڵتر لەو دۆڵەی دەمێدی منی هەڵدایەوە سەر زەوی، دەپەڕێ و دەکەونە دەست با و نەمدەزانی ئەو پووشانە با بۆ کوێی دەبردن، هەر لەوەشەوە، لە پەڕینی پووشەوە، زانیم ساڵ لە مانگی پووشپەڕدا ڕێدەکات، بیرمە بەراوردێکم لە نێوان خۆم و پووشی دەم با کرد، چاوێکتان لێمبا، ئەودەمانێ چەند لە پووش دەچووم، پووشی دەم با.

هەوکە دەمەو نیوەڕۆیەکی پووشپەڕیی ساڵێکی هەڵەتاویە، من و هێسترێکی بۆز، ڕەنگی هێستر چەند لە ڕەنگی پووشی دەکرد، جا ئەو ڕۆژە ڕەنگ هەبوو ڕەنگی پووشی نەگرتبێ! خۆ جلکەکانی من هەر دەتگوت لە پووشی بەر تەپوتۆز چنراون، هێستری پووشاوی لە پێشەوە، منی پووشاوی بە دوویەوە، هێستر ئەژدیهاشی بێتە پێشێ ڕێ ناگۆڕێ، بەڵام من...

ڕەنگە هێستر خەیاڵی نەبێت، ئەگینا ئەویش جاروبارێ بە لاڕێدا دەچوو، باری هێستر قورسە، چەند قاتی باری منە، بەڵام من بە بارەوەش

بـبمه سـەرباری، له رۆینـی هێسـترانەی خـۆی ناکەوێـت، بـاری مـن کلاشینکۆفێکی رووسـی یەك لاق، به هـی سـەریەوە حەفـت فیشـەکدان، مەتـارەیەك له جـۆری گەورە، کۆڵەپشـتێك که چەنـد نـووردووە نانێـك و مـته قەسپێك و... باری هێستریش ئەوەی دیاره کلاشینکۆفێك و تاخمێـك، نادیارەکەش با جاریٚ هەرنادیاربیٚ.

مـن و هێسـتر هێشـتا له ئاقـاری گونـدی (یەکمـاڵە)ین، ئەو گونـدەی ئەگەر دواتر عەلی کیمیاویی له بڵندایی گارەوە تۆپ تـۆپ، مسـت مست ژەهری به سەردا نەڕژاندبا، ئێستا عەلی و فاتیمەکـانی نەوەیـان خسـتبۆوه و دەبووه هەزار ماڵە و زەماوەند زەماوەند، دەبووه گوندی زەماوەندان، دوور نەبوو زەماوەندی منیش بکەوێته گوندی یەکماڵەی هەزار ماڵەوە..

ئەها، لەسەرەوەی گوند، تـۆپیٚ نـازانم له کـیهە لاوە هـات، له تەنیشـت بەهاربەنـــدیٚ کەوتەوە، ئـــاگرێکی لـــیٚ کەوتەوە، بەڵام زۆری نەبـــرد دامرکایەوە، نزادەکەم، دووره بەڵا بین و تۆپ و ئاگریدی به دوودا نیٚ.

مـن و هێسـتر له هەورازەکەی پشـت یەکمـاڵە سـەرکەوتین و وا بەو دیودا، دیوی بارەگا شۆڕ بووینەوە، ئەگەر یەکیٚ و یەک پشی بـڕۆین و هیچ بەڵایەکی عەردی و ئاسمانی نەیەته ریٚ، بۆ نان و ئـالیکی ئێـواره مـن و هێسـتر لەدوڕ بارەگـاین، ئەریٚ پرسـیتان، ئەو چەك و تـاخمەی بـاری هێستره بۆزی قورسترکردووه خاوەنی هەبوو یان نا؟ ئا، هەتا هێستریشمان بارکرد خاوەنی هەبـوو، کـوڕێکی بـاریکەلەی کەم تەمەن، وا بـزانم نـاوی ســەربازیی نەهــاتبوو، ئەو تفەنــگ و تاخمەشــی جــوان لێــدەهات، لەو جێگەیەی که رۆژەرێیەك لێرەوە دووره، دەستبارمان گـرت و به یـارمەتیی یەك دووانێك بارەکەمان بارکرد و هەچەمان له هێسـتر کـرد، هەر هـاوڕێی ڕێیه ترسناکەکانی ئاقاری گاره بووین، ئەو ئاقارەی له هەر بسته زەویەکـی نه هەر نـاولەپه ئاسـمانێکی بەڵایەك چاوشـلکانێت لەگەڵ دەکـات، رەنگـی هەڵبزڕکابوو، نزیك له هەڵبزڕکانی شیر، قوڕگی خاوێندەکردەوە، دیار بـوو ڕسـتەیەکی قـورس عاسـیٚ بـووە و نـایەته دەریٚ، ویسـتم یارمەتییـدەم،

هەستمكرد رستە لە قورگی منیش عاسێ بووە، ئەو كورە دەبێت چی لە دڵ بێت! دەیەوێت چی بڵێت؟!

+ببوورە، تۆ بە تەنیا بڕۆوە بارەگا.

- ئەدی...

+ من، دەچمەوە، ماندوو بووم.

- بە قەستیتە، تۆ ماندوو نابیت.

+بە راستیمە زۆر ماندووم، بە ئەبوو عەلی بڵێ رۆیشتەوە، ماندوو بوو.

- ئەدی بۆچی لە بارەگا وات نەگوت؟

+نازانم، چەكەكەم لێوەرگرە و من دەچمەوە.

- چۆنە بە چەكەوە ناچیتەوە؟

+ ناپاكی ناكەم.

- كوا، لە كوێ خۆت رادەست دەكەیتەوە؟

+ لە خوارەوە لە نزیك جادە.

- ئێستا لێبووردن هەیە؟

+ هەیە...

هەبوو، لێبووردنێك بۆ بە چیاكەوتووەكان بۆ ئەشقیاكانی چیا هەبوو، كورە ماندووەكە بە دەستی خۆی خۆی چەك كرد، بە ماڵئاواییەكی شەرمنانە بەجێیهێشتم، ئەوەتە كورە ماندووەكە چەند ماندووانە، چەند نابەدڵانە شەقاوی خۆ رادەستكردنەوە دەهاوێ، هەر دەڵێی بۆ تیربارانكردنی دەبەن، پێیەكانی لە دووی نارۆن، ئەو پێیانەی پێشتر لەرۆیشتنێ پێ بە پێی با رێیان دەبڕی، كورە ماندووەكە رۆیشت، لێژبۆوە، بڕۆ لە بەڵای دەوڵەت بە دوور بیت، ئەی كوڕی ماندوو، من ئیدی ناوت دەنێم كوڕی ماندوو، بە هیچ ناوێكیدی ناتخەمە ناو سەرهاتانەوە، پیاوێكی ئاقاری گارە گوتی:

+ دەزانی بۆچی ئەنگۆی كۆمۆنیستی خودانەناسم خۆشدەوێ؟

- چونكێ هەندێكمان لە بنەوە خودا دەناسین! هەهە هە

+هاهاهاه...چونكێ كاتێك كەسێكتان خۆ رادەستی حكومەت

دەکاتەوە، نەك هەر هاوڕێ و هاوسەنگەرەکەی خۆی ناکوژێت، چەکەکەشی بەجێدێلێ.

قسەی پیاوە گارەییەکە ترساندمی، ترس دەهات و ترس ترس لێمدەنیشت، ترسی سەردەمانی منداڵیش گەیشت و نیشت، قسەی پیاوە گارەییەکە گەڕاندمیەوە ئەو ڕۆژەی کە هەواڵی قادر شۆڕەبی گەیشت، هێشتا کانەبی گچکە نەببووە سەرهاتی ترس، دەنا ئەویش دەهات و لە بینایمدا خۆی رادەخست، من ئێستا لە ترس ئاڵاوم ترسی ناپاکی، کوڕە ماندووەکە! کوڕی باش بە، پێ هەڵێنە، چەندی دوورتر بکەویتەوە ئاسوودەترم، چیدی ئاوڕ مەدەوە، با شەیتان نەیەتە بن کەلەکەت و پەژیوانی گەڕانەوەت بکاتەوە، دەزانم تۆ خیانەت بە خەیاڵتا نایەت، بەڵام دڵی من وا ناڵێت، لە دوای قسەی پیاوە گارەییەکەوە، گومان گومان، دەستی چەپم گومانی لە هی راستم هەیە، دەڵێ ئاگاداربە، تفەنگ لە سەر پێیە، گوللەی ناپاکی لە ڕێیە، خۆ من پێش قسە گارەییەکەش هەر کوڕی پانتایی ترس و ناپاکی بووم، بەڵام بەو قسەیە راچڵەکیم، توند راچڵەکیم، لە راچڵەکیندا هەرچی رستەی ناپاکیە لە بیستنمدا خۆیان لێکگرێدەدایەوە، ئەمەن چ رستەیەکی درێژی ترسئامێزە! پیاوە گارەییەکە گەڕاندمیەوە لای حاجی کەریم ئەو پیاوەی یاران و نەیارانی بە پیاوە بەوەجەکەی بەستی شەرغە ناویان دێنا، ئەو پیاوە خەڵکی گوندی حاجی وسووی دەو بەستی شەرغە بوو، برادەری بابم بوو، بیرمدێ شەوێك لە حەوشەیەکی هاوینیی سەیداوەیی لەگەڵ بابم سەبارەت ناپاکی مشتومڕیان بوو، پیاوی بەوەجی بەستی شەرغە گوتی:

لەهەر سێ پیاوی کورد پیاوێك خیانەتکارە.

بابم گوتی:

ئەگەر سێیەکە بکەیتە سی، ئەشهەدوت لۆ دەکەم.

پیاوە بەوەجەکەی بەستی شەرغە گوتی:

تووڕەتر بم، سێیەکە دەکەمە دوو.

بابم گوتی:

حـاجی لـێگەڕێ، لە سـێی راگـرە مەیـکە دوو، دەنـا تـۆش خـایەن دەردەچیت.

پیاوی بەوەجی بەستی شەرغە لە بەر خاتری بابم نەیکردە دوو.

دەیانگوت پیاوە بەوەجەکەی بەستی شـەرغە بە هـۆی کۆمۆنیسـتبوونەوە و لە سەر دەستی کەسوکار و پیـاوانی ئاغـا زۆر دەردی دیتـووە و ئـازاری چەشتووە، بۆیە وا لە سێیەکی پیاوی کورد بە رقـدا چـووە، زۆر سـەرچێخ رۆیشتووە، لە بیرمە بابم بە پێکەنینەوە دەیگوت:

هەتـا پیـاوە بەوەجەکەی بەسـتی شـەرغە لە کۆمۆنیسـتی وەرنەگەڕێ، سێیەکی پیاوی کورد بە خایەنی دەمێنێتەوە!

کاتێ سەرهاتی قادر شۆڕەبی لە سەرمدا سەرەتاتکێی لەگەڵ یـادەوەریم دەکرد، سیمای چەندان قادری شۆڕەبیم دەدیت، چۆڕ چـۆڕ خوێنیـان لێـوە دەچۆڕا، خـوێنی گـوللەی ناپـاکی، لەو هەمـوو سـیما خوێنـاویەوە ناپـاکی کەڵەکەی دەکرد، دەمگوت پیاوە بەوەجەکەی بەستی شەرغە چ راستیەکی گــووژارکیی رژانـدۆتە بەسـتی یـادەوەریمەوە، قـادری شـۆڕەبی یەکەم کوژراوی دەستی هاوسەنگەرەکەی خۆیەتی کە لە یادەوەریی منـدا جلـکە خاکیە خوێنـاویەکەی بە رستی یادەوەریمـدا هەڵواسـراوە و دڵـۆپ دڵـۆپ خوێن...

قادر شـۆڕەبی هەر لە تەمەنـی کـوڕە مانـدووەکە دەبـوو، ئەو کـوڕەی پێش کەمێك رووەو جادە بە ئاراستەی ئامێـدی بە پێـی کیسـەڵ شـۆڕبۆوە، ئەو ساڵەی هاوسەنگەرەکەی شۆڕەبی خوێن بەرچاوی گرت و لە شـیرنەی خەوێ شۆڕەبیی لە خوێن هەڵکێشا، من منداڵ بـووم، پێشـتر چەنـد جـارێ شۆڕەبیم دیتبـوو، بە قەد دنیـایەکی منـداڵی خۆشمویسـتبوو، ئەو ئێـوارەیەی هەواڵی مەرگی قادری شۆڕەبی گەیشـت، گەڕەك خەمـی دنیـای لێنیشـت، ئەو ئێوارەیە خەمگینترین منداڵی گەڕەك من بووم، خەمی دنیـام لە قـادری شۆڕەبی خوارد، قادری باب نەماوی تاقە برای دوو خوشکان.

له ئاقاری گارەوە بەژنی زراڤی قادری شۆڕەبی لە دوورەوە لە یادەوەریم دەشنایەوە، تا دەهات نزیکتر دەکەوتەوە، گوێم لە دەنگی بوو، قسەی دەکرد، شۆڕەبی گەیشتە لام و دەناورایەوە، چ ناورانەوەیەك خودایە، یوسف لێیەوە فێردەبوو، بە دەنگێك مەگەر کۆتری بریندار بکاریێ لاسایی بکاتەوە، گوتی:

متمانەی تەواو بە هێستر بکە، بەڵام گومانت هەبێ لە هاوڕێکەت، هاوسەنگەر لە مار خراپتر پێوەت دەدات.

هێشتا زاری وشەیتری تێدا مابوو، سەرمهەڵبڕی، شۆڕەبی نەمابوو، جارێکیدی من و هێستر تەنیا ماینەوە، بە راست شۆڕەبی چۆن گەیشتە گارە! بە دەم رێوە خەوم لێکەوتبوو؟!

ئێستا من و هێستر کەوتینە پێدەشتێکی پووشاوی، کەندێکی وشکی ئاونەدیتەش، لێرە و لەوێ بنەدارێکی تینوو بەری چەپ و راستی بە پێدەشتەکە بەخشیوە، ئاسمانیش وەك پێدەشتەکە پووشاویە، پێشان ئاسمان رەنگی شین بوو! ببینن چەکدارێك کزو مات بە دوای هێسترەوە، هاوڕێکەی بەجێهێشتووە، بەڵام دەبێت تا مردن لە چاکەی دەرنەچێت کە نەیکوشتووە، چەکدارێك دوای چەند دەمژمێرێك رەنگە بگاتەوە بارەگا، بارەگای پرسیار، پرسیار هەزار پرسیار، ها هاوڕێکەت چی لێهات؟ چەکەکەی بۆ لای تۆیە؟ ئەو جا ئەبوو عەلی شایب بە عەرەبی پرسیاران دەکات، منیش بە تێکەڵەیەك لە کوردی و عەرەبی باگۆی دەدەمەوە، رەنگە بە هۆی کێشەی زمانەوە وەڵامەکانم وا بکەونەوە تووشی کێشە بم، وەك باپیرم لە ختوخۆڕا بە هۆی زمانەوە تووش بم، باپیرم کە وەك خۆی دەیگوت:

یەکەم حاجیی فڕۆکەمە.

ئەوەش لەوەوە هات، بەگەڵ یەکەم دەستەی حاجیان کەوتبوو کە لە بەغداوە بۆ یەکەم جار بە فڕۆکە چووبوونە دیداری کابە و پێغەمبەر، باپیرم

دەیگێرایەوە:

لە حەجێ لە نزیك ماڵی خۆشەویست، هەر لە پێش دەرگایان، عارەبێك وەرگەڕایە سەر عارەبێك، لێکیان دا، خراپ لێکیان دا، یەکیان کەوت، وەك گا کەوتە زەوی و بۆڕاندی، ئەویدی لێیدا، بە عارەبی لێیدا، مارکوژی کرد، من ویستم ناوبژیان بکەم، بەڵام نەمکرد، لە دڵی خۆم گوتم، ئێوە هێند ناکەس و حەرامزادە بن، رێز لە خۆشەویستی خودا و خزمی خۆتان نەگرن، بە تکای منی بێگانەی بنی دنیا واز لێکدی دێنن! سەرتان نەیەشێنم، ئەوەی دەستی خۆی وەشاند، هەڵات، پۆلیس هات، منی بەدبەخت وەك دیدڤان لەوێ مابوومەوە، عارەبیەکەم بایی ئەوە بوو کە لە جیاتی بڵێم:

پیاوێك لێیدا و حیزانە هەڵات.

گوتبووم:

من لێم دا و هەڵنەهاتیشم تا نەڵێن حیزە.

باش بوو عارەبی لە عەرد راکشاو نەمرد و بە ئاگا هاتەوە و فریام کەوت، دەنا خۆشەویستی خوداش لە زیندانێ دەرینەدەهێنام.

باپیرم ئامۆژگاری دەکردین و دەیگوت:

کوڕینە ئەگەر عارەبی نازانن، لە کن شەڕی عارەبان رامەوەستن، ئەگەر چوونە حەجیش بە فڕۆکە بچن، فڕین بە ئاسماندا هەر دەڵێی رێی بەهەشتێیە.

نەنکم دەیگوت، بە باپیرمی دەگوت:

حاجی ئەدی کوو کاس نەبوون لە گڕە گڕ و هووشە هووش؟

باپیرم دەیگوت:

فڕۆکەی حەجێ خۆ وەکو ئەوانە نیە کە هەموو رۆژێ لە سەرمان دەسووڕێنەوە و ئاگر و ئاسنمان بە سەردا دەبارێنن، فڕۆکەی حەجێ هەندەی دەلینگی تۆش خشە و دەنگی نایە.

نەنکم دەیگوت:

به خـوداى نەك بـۆ حەجـێ، بـۆ نـاو بەهەشـتێش مـن پـێ نـاخەمە نـاو فرۆکەوە، فرۆکە هەر فرۆکەیە.

ئۆی، فرۆکە رەنگ و دەنگـی گـورگی هەیە، هەر نـاوی بێنیـت پەیـدا دەبێت، ئەوە دەنگی کۆپتەرە، نـزیکە، وەی وەی، چەنـد نەویـن، قەومـا لە کەس نەقەومـێ، لەو دەمە سـێ بـنە داری تـرس لێنیشـتوو، بە بـانگکردن بانگمیان کرد، جڵەوی هێسـترم راکێشـا، هێسـترم بەسـتەوە، بەسـتانەوەیەکی گورج، نازانم لە ئـازایەتی بـوو، یـان لەوپەڕی تـرس، چەك و تـاخمەکەی کوڕە ماندووەکەشم هەڵگرت و خـۆم گەیانـدە بـن دارێکیـدی، دەبـوو لە هێستر دوور بکەومەوە، هێسـتر جێگەی متمـانە نـیە، دەجـوولێ و کـۆپتەر دەبینـن، لە بـن دارەکە دوو بەردی گەورە پـووش و پەلاشـیان بە خۆیـان دادابوو، سەریان بەیەك کردبوو، خودا دەزانی لە کەنگێوە لێـرە خەوتـوون، ئەگەر ناپاڵمێك زرمەیان لێوە نەهێنێ، پێنـاچێ بەئاگـا بێـنەوە، کۆپتەرەکـان دووانن، نەوین زۆر نەوی، زگیان لە زەوی دەخشـێ، لمـووز بە درەخـتەوە دەنـێن، بـۆنی شـتێکیان کـردووە، بـۆنی هێسـترێك و پێشـمەرگەیەکیان کردووە، ئێستا نا ئێستا دەیانبیننەوە... بمبم..بم..بمبمب...، ئـۆی ئەوە بە چـی کەوت! ئاگر، ئاگر...

هێسـترەکە، پیـاو بەو تووشـم مەکە، مەجـوولێ، دەنگـت نـێ، دەنـا تیادەچین، لە ترێ تۆ و سەگ دەچین، ئارام بگرە، من لە تۆ پتر دەترسێم، بەڵام دەبێت ئارام بگرم، ژیان خۆشە، ژیان لە هەر جێگەیەك بێت لە مردن خۆشترە، تا مەرگ تیچاوت نەداتـێ، نـازانی ژیـان چەنـد نـازدارە، چەنـد نـاودار و مەزەدارە، ئەوەتە مەرگ لە پـێش چـاوە، خـودا دوو ئیزرائیلـی سواری دووکۆپتەر کردووە، یەکیان بۆ من یەك بۆ تۆ، هێسترەکەم، دیـدە راسـتەکەم، ئـارام بە، کـۆپتەر ئیزرائیلـی خـودایە بەو دەمەو عەسـرە بـۆ گیانکێشانی ئێمە هاتوون، نەکەی خۆتیان نیشانبدەیت، بمب بمب...

ئەو کۆپتەرانە زۆر لە هی سـەردەمی منـداڵی ترسـناکترن، ئەو دەمەی من و باوکم نازانم بۆ رێمان بەو زوورگانەی رۆژهەڵاتی هەولێر کەوتبوو،

ڕەنگە بۆ ماڵات کڕین بوویێت، بۆ چێڵ کڕین بوویێت، خۆ ساقۆیەکەی بابم ڕێك لەو ساقۆیانە بوو کە خەڵك لە بەر هەر کەسێکیان دیتبا دەیانگوت:

دەڵێی چێڵ کڕە.

دوو کۆپتەری وەك ئەو کۆپتەرانە گەیشتنە سەرمان، بابم ڕایکێشامە ناو کەندڕێك، خۆم هاویشتبووە بن ساقۆ درێژەکەی بابم، بابم گوتی:

لە منت نەکەویێ، مەترسێ، ئەوە نیە لە کن بابی خۆتی لە چی دەترسی؟

گۆتمە بابم:

دەترسم، تەقە دەکەن، دەمانکوژن.

بابم بە دەنگێکی سەرڕێژ لە دڵنیایی:

هیچ مەترسێ، لە باوەشی بابی خۆتی، کۆپتەری گوو خواردی چیە، ئەوان لە ئێمە دەترسێن، ئێستا هەڵدێن.

ترسم نەما، ساقۆیەکەی بابم سەنگەرێکی پتەو بوو، زۆر لە بەرد پتەوتر، گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە تەقەی کۆپتەر نایبڕێ، زۆری نەبرد، کۆپتەرەکان هەڵاتن، دواتر دەمگوتە بابم:

تۆ کۆپتەرەکانت ڕاونا؟ بە چی؟

بابم دەیگوت:

لە من زیاتر کێیە، کوا کەسیدی لەوێ بوو، هەر بە فوو ڕاوم نان.

بابە، وەرە بمگەیێ، پێویستم بە ساقۆی دڵنیاییت هەیە، بابە من بە تەنێ لە ئاقاری گارە لەگەڵ دوو کۆپتەری هار لە سەگی هار هارتر لێم قەومایە، بمگەیێ.

ئۆی، هێسترەکەیان دیوە، لە نزیکە وی بە عەرد کەوت.

خودایە، ئەگەر تۆ ئەو دوو کۆپتەرە ئیزرائیلیەت نەناردووە، فووێکیان لێبکە و بەرزیانبکەوە ئاسمان، هێند بەرز هێند بەرز، لە مەداری زەوی دەرچن و لە ئەستێرەیەکیدی بنیشنەوە، خودایە، چەپارەم بدە، ئەگەر ژیان

و مەرگ لە دەست تۆیە، مەمکوژە، حەزم لە ژیانە، ئەو کۆپتەرانەم لێ دوور خەوە، گوناهم نیە، هەموو گوناهم ئەوەیە کە لە دەوڵەتێکی عەرەبی یاخیم، دەوڵەتێك بە چاوی خۆم دیتوومە چەندان جار دیتوومە کە بەو کۆپتەرانە، بە فڕۆکە بە دەردی نەنکم گۆتەنی بەو فڕۆکەی باپیرم سواری بوو هاتە ماڵی پێغەمبەرەکەی تۆ، بە چاوی خۆم دیتوومە قورئانە عەرەبیەکەی تۆیان سووتاندووە، من لە ریزی کۆمۆنیستانم، بەڵام لە بیرم نیە سووکایەتیم بە کتێبەکانی تۆ کردبێت، چەندان جار گلەییم لە ستالین کردووە لە سەر ئەوەی ریزی تەواوی لە گوتەکانی تۆ یان ئەوانەی بە ناوی تۆوە هاتوون، نەگرتووە.

لە بیرمە قسەم لەگەڵ خودا کرد، بەڵام گوێم لە دەنگی نەبوو، هیچی نەگوت، بۆیە چیدی لێی نەپاڕامەوە و بیرم لە خۆم کردەوە.

دەبوو لە هێسترەکە دووربکەومەوە، ئەگەر تۆ دەتزانی باری هێستر چیە، لەمێژبوو بە دووری سەد بنە داری لێکدی زۆر دووریش لە هێستر دووردەکەوتیەوە، ئەگەر دەتزانی باری هێستر چیە، هەر زوو بە سێ دەنگان و بە شێوەزاری گارەییان دەتگوت:

کوڕۆ، دینۆ، مال خەرابۆ، رابە، چاڤێ خۆ ڤەکە، تو نزانی، ئەها...

ئەگەر هێستر دەیزانی چی لێ بار کراوە، رۆژەرێیەك پتر لە خۆی دووردەکەوتەوە، کۆپتەرەکان بۆنیان کردووە، ناوە ناوە جێگەیەك لە پێدەشتەکەی دەڤەری گارە ئاگر دەدەن، بەس نزابکەن هێستر نەتەقێتەوە، باری هێستر نەتەقێتەوە، باروت نەتەقێتەوە، بەهاری رێك بێرەدا هاتین، دەستەیەك پێشمەرگە کوڕە ماندووەکەشمان لەگەڵ بوو، بێرەدا هاتین، باری هێستر ئاردو شەکر بوو، ئەوجارە لە بەدبەختی من لە تەنیایی من باری هێستر بە سەربار و بن بارەوە فیشەکە، بە هەموو جۆرەکانەوە، دۆشکە، ئارپیجی، کلاشینکۆف، رەنگە فیشەکی دەمانچەشی تێدا بێت، نارنجۆك... ناهەقمە لە تەقینەوەی هێستر بترسێم! ئەگەر هێستر بتەقێتەوە، پرووشکی دەگاتە من و ئەو دوو بەردەی سەریان بە یەکتر کردووە و

منیان له چاوی کۆپتەر شاردۆتەوە، دەبنە کـێلم، کێلێـك نە دەبینـرێتەوە نە دەخوێندرێتەوە، من دەبێت ئەو بنە دارە بەجێهێلم، نامەوێت ئەو بەردانە ببنە کێلم، هەرچەندە لە سەر قسەی باپیرم زۆرم متمـانە بە بەرد هەبـوو، باپیرم دەیگوت: (بەرد بەرد، تەنیا بەرد)... سەرهاتی بەردو بەرد بەردەکەی پـاپیرم دەگێڕێتەوە.

ئەو هێسترە تا ئێستا زۆر بە هۆشە، دەڵێـی خوداوەنـدی ئـاژەڵان هۆشـی بێـدەنگیی لێکـردووە، ئەوەتـا لەگەڵ زرمەیەك پتـر خـۆی بەو دارەوە دەنووسێنێت کە لێی بەستراوەتەوە، گوێیەکانی فـیچ کـردۆتەوە، کلکـی لە ناو گەڵی ناوە، دەنگی لێوە نایە، بە راستی هێستر جێگەی متمانەیە، قـادری شۆڕەبی راستی گۆ، لە خەونێ، یان لە زینـدەخەوێ شـۆڕەبی راسـتی گـۆ: هێستر جێی متمانەیە.

بەڵام باری هێستر گەمە نیە، لە سەرمە لێی دوورکەومەوە، کاتی ئەوەم نیە هێستر لە بارەکەی دوورخەمەوە، بەڵام هەوڵدەدەم خۆم لە هەردووکیان دووربخەمەوە، کۆپتەرەکان وازناهێنن، بمب بمب، دووکەڵ، دووکەڵ...

لە سەر زگ، لە سـەر چـۆك، خشـکە خشـك بە قـوونە خشـکێ، خـۆم گەیانـدە کەنـدرێك، داربەڕووێـك سـێبەری لێکردبـوو، تیشـە بەردێـك بە دانیشـتن دانیشـتبوو، لە کۆنـدڕێ و لە پـاڵ تیشـە بەردێ و لە سێبەری دار بەرووێکی تۆزاوی وەك پشیلە خۆم گرمۆڵە کرد، ئێستا تەواوێك لە هێسـتر و بارە باررووت دوورم، ئەگەر بتەقێتەوەش مەترسیەکی وای لە سـەرم نـیە، تەماشاکەن پێشمەرگەیەکی تەنیـا چـۆن لە ترسـی دوو کـۆپتەری نـازانم لە کوێوە هەڵدراو چۆن بە بەرزایـی گـارەی لێـرەوە دیـار، ترسـی لێنیشـتووە، پێشـمەرگەیەك دوو تفەنگـی بە دەسـتەوەیە و هەتـا ئێسـتاش تەقەیەکـی نەکردووە، رەنگە هەر نەشیکات، ئەرێ لە ترسـەوەیە یـان لە هۆشـەوە تەقە ناکات؟! کەڵکی تەقەی نیە، کۆپتەر گەمە نیە، تەقە کردن لە کۆپتەر گەمە نیە، بەڵام گەمەی کـۆپتەر وگەمەی تەقەکـردن لە کـۆپتەریش گەمەیەکە، پێشمەرگە، زۆر پێشمەرگە چوونەتە نـاویەوە، منـیش پێشـتر چەنـد جارێـك

تووشــی ئەو گەمەیە بـوومە، قەتـیش وەك ئەمجـارە لە کـۆپتەر نەترسـاوم، رەنگە ترسەکەم لە تەنیاییەوە هاتبێـت، خـۆزگە کـورە مانـدووەکە مانـدوو نەدەبوو، ئەگەر ئەوم لەگەڵ با، ترسم کەمتر دەبوو، ئەگەر جێگەشم باشـتر با و کەڵکی تەقەی هەبا، ترس وەها وەك پووشی پووشپەڕێ داینەدەگرتم، تەقەکردن ترس دەڕەوێنێتەوە، ئەوە هەر قسەی من نیە، هەرکەسێ سـووکە شــەڕێکی کردبــێ ئەوە دەزانــێ، ئەو جــارەی لە دۆڵــی ئاکۆیــان، دوو کۆپتەری زۆر لەو دوو کۆپتەرە بە گڕەگڕتر، گوللە هـاوێژتر، دڕتـر، بەڵام کەمێك بڵندتر، بەری ئاسـمانیان لێگـرتین و چەپ و راسـت دایانـدەبێژاین، هێنـدەی ئەو جـارە نەیانترسـاندم، ئەوان کۆپتەرەکـان بە هەوەسـی خۆیـان دەیانکوتـاین، ئـێمەش بە دڵـی خۆمـان تێمانـدەگرتن، گەمەکەی دەڤەری مەتینیش هەر ئەوها، گەمەکەی ئەو دیوەی چیای سەفینیش، هی....

ئەو کۆپتەرانە کەتێنێکیان لە چاوە، دەڵێی سـۆزیان بە خۆیـان داوە، بـێ دەسکەوت ئەو پێدەشـتەی ئاقـاری گـارە بەجێنەهـێلن، وا بـڕوا دەمبینـنەوە، نەشمبیننەوە ساچمەیەك سـاردم دەکـاتەوە، گوێـتان لە گـڤەی سـاچمە نـیە! سەر دەکات، کورت دەکات، ئەوەتە داربەڕووەکە ساچمەیەکی بە تونـدی گرتەوە و بە نەرمی هەڵیدایەوە بەردەمی خۆی، تیشە بەردەکە ساچمەیەکی بە توندی گرتەوە و تونـدتر دوور هەڵیـدا و نەمـدیت لە کـوێ کەوتەوە، ئاگرێك لە نزیك هێسـترە بـارووتیەکە کەوتەوە، باشـە بـای نـایە، خەریـکە دەکوژێتەوە، کۆپتەریش نەمکوژێـت، تـرس دەمکوژێـت، خـۆزی ئـازایەتی یـان کەرایەتـی دەیگـرتم و دەسـرێژێکی مەردانەم دەهاویشـتە کـۆپتەران، دوای ئەوە چ دەبوو با ببێت، خۆ ترس دەڕەویەوە.

ئەرێ کۆپتەر ماندوو نابێ! پێناچێ، لە کەیەوە لە ئاسمانی مـن و هێسـتر دەسووڕێتەوە؟ کۆپتەر چەند لە ئاسمان دەمێنێتەوە؟ بایی چەند سـووتەمەنی هەڵـدەگرێت؟ تەقەمەنیـی زۆرە؟ بـۆ ئەو پرسـیارانە گەڕامەوە لای مـلازم ریاز، لە دانیشتنێکی شەوانەی زستانیی سپی سپی، بەفر بارەگای داپۆشیبوو، بارەگا لە قەدپاڵێك بوو، لە دوورەوە بە دووربین، ئەو دەمانەی بەفـر چیـای

بەجێدەهێشت، شانەدەر جوان دیار بوو، شانەدەر ئەو جێگەیەی کۆن زۆر کۆن جێژوانی نەنکە گەورە و باپیرە گەورەمان بوو، لەوێ یەکتریان راموسی و جووتبوون و ئێمەیان نازانم نە بۆ شەڕوشۆڕ خستەوە نە بۆ عەشقبازی، ملازم ریاز دیار بوو خولی سەربازیی زۆری دیبوو، کتێبی زۆری سەربازیی خوێندبۆوە، شەوێك باسی فڕۆکە و کۆپتەری کرد، هەر یەکەی توانای چەند مانەوەی لە ئاسمانی هەیە، دوای چەند پێویستی بە سووتەمەنی هەیە؟ هەمووی بە وردی بە ژمارەو بە خولەك دەگوت، حەیف هی کۆپتەرم لە یاد نەماوە، ئێستا چەند پێویستمە بزانم دوای چەندیدی ئەو کۆپتەرانە بە ناچاری دەڕۆن و لە مۆلگەی خۆیان دەنیشنەوە، بە راست دەبێت لە کوێ بنیشنەوە، تا جارێکیدی دێنەوە، دەبێت دەرفەتی هەلاتنم چنگکەوێت؟

من جگە لە چاوەڕوانی، چاوەڕوانیی دوا چرکەی ماوەی مانەوەی کۆپتەر لە ئاسمان چ چارەیەکیدیم نەبوو، چ ئومێدێکیدیم لە دڵ نەمابوو، خودایە ئەگەر لە توانات هەیە، ئەو دوو ئیزرائیلە، ئەو دوو کۆپتەرە هەڵکێشەوە، لە بەرزایی گارەوە هەڵیاندە ئەو دیوەوە، وا بزانم تکایەکی وام لە خودا کرد، نەمزانی چ خودایەك، خودایەکەی دایکم یان خودایەکیدی، بەڵام کوا خودا کاری ئەوها دەستوبرد دەکات! دایکم زۆر جار لە کاتی تووڕەبووندا دەیگوت:

خودا، بە قوربانی بم، قەت لە وادەی خۆی بە هاناتەوە نایەت، دوایش پێویستت پێی نامێنێ.

ئەرێ لەمێژە کۆپتەر بە ئاسمانەوەیە؟ لەمێژە لە سۆراخی من و هێستر سەراو سەر، تەنیشتاو تەنیشت، کلکاو کلك عەرد و ئاسمان دەکات، هێشتا خودا خودای نەنکم قەڵەمی دیتنەوەمانی لێنەداوە، نەنکم زۆر جار دەیگوت:

تۆ کە لە دەستی چەتە و زۆرداران خۆت بشاریەوە، تا خودا قەڵەمی دیتنەوەی لێنەدا ناتبیننەوە، دنیا هەڵگێڕو وەرگێڕ بکەن ناتبیننەوە.

خـودای نەنکـم قەڵەمـی لێمەدە...گەمەی دوو کـۆپتەر و هێـسترێك و پێشـمەرگەیەك چەنـد دەخایەنێـت؟ هێنـد لە پـڕ هـاتن و هێنـد شـلەژام لە بیرمچوو دەمژمێر بگـرمەوە، ئەوجـا بـا بشـمگرتابایەتەوە کە نەزانـم توانـای مانەوەیان چەندە لە ئاسمان، بە چی دەچێ.

ترسـی تەقینـەوەی هێستری بـارووتی دووکەڵ و نـاڕەویتەوە، خـودایە، خودای مـام چەتـۆ نەیتەقێنیـتەوە، چەتـۆ پیاوێـك بـوو بـاوەڕی بە خـودا لە ئاستێك بوو دەیگوت:

هیچ چەکێك بێ خواستی خودا تەقەی لێوە نایە، گوللەی لێوە دەرنایە.

ئەو پیاوە بایی سەرە دەرزیەك لە تفەنگ نەدەترسا، دەیگوت:

کـێ ئامـادەیە تەقەم لێبکـات بـا تفەنگـی سـواربکات، سینگم دەدەمە بەرێ، پەنجەی پێدا بێنە، تا خـودا پەنـجە بە پەلاپیتکەیـدا نەهێنـێ، بە هـیچ پەنجەیەك ناتەقێ.

خـودای مـام چەتـۆ، پەنـجە مەگەیەنە بـارە بـارووتی هێسـتر، هێسـتر بتەقێـتەوە، مـن دەبـمە خـۆڵەکەوە، گـوللەی هێسـتر، سـاچمەی هێسـتر نـامگرێتەوە، بەڵام بە تەقینـەوەی هێسـتر هەرچـی کـۆپتەری بەغـدا هەیە، ئاسمانم لێدەگرن و جاشـی پوشـت و سـەربازی سـەرحیز دەڕژێنە زەوی، هێزی نادیاری دنیادیتە، هێشتا چ دنیام نەدیتیە، با هێستر نەتەقێتەوە.

دووکەڵ، دووکەڵ لە زۆر لاوە دووکەڵ، پێدەشـــــتی پووشـــــاوی بە هەڵکردنی بایەك ڕەنگە گڕی دۆزەخی بگرێت، دەبێـت لە خوداوەنـدی بـا بپاڕێمەوە، دەرگـای بـا نەکـاتەوە، بیکـاتەوە، هێسـترە بـارووت بە ئاسـماندا دەچێت، من دەبمە قەلەڕەشکەی برژاو، قەلەڕەشکەیەك دوو کـۆپتەر باڵیـان بەستووە، خودای با هەڵنەکەیتە بـا، ئەگەر بە خۆشـت نەوەسـتایت، هەڵـکە بای شەماڵی، با ئاگر کە دەڵێی گایە زمـان دەردێنـێ، ڕووەو ئەولا بێتەوە، دوورتر بکەوێتەوە، تۆی ئەوە لەو لایەش ئـاگر کەوتەوە، خوداوەنـدی بـا، هەڵنەکەیتە بای شەماڵیش، با دنیا بێ با بمێنێتەوە، با بایی هەناسـەیەکیش بـا نەیە.

کـۆپتەر دەڵێـی سـوێندیخواردووە بمـانبینێتەوە، دەترسـم بنیشـنەوە، بـن پنچك بن پنچـك، بـن بەرد بـن بەرد بگەڕێن.کـۆپتەریش نەنیشـنەوە، بـاش هەڵنەکـات، ئـاگر دەمسـووتێنێ، تـا دێ ئـاگر پتـر دەکەوێـتەوە، دووکەڵ گەیشت، هەردیتت هێستر لە پـڕمەی دا، خـۆی راپسـکاند، پەتکـی پسـاند، تێیتەقانـد، هێسـتر بەرگەی گـڕە و تەقەی کـۆپتەری گـرت، بەڵام بەرگەی دووکەڵ ناگرێـت، کـێ بەرگەی دووکەڵ دەگرێـت، کـێ بەرگەی ئـاگر دەگرێت، ئـاگر وا دەگـات، مـن سـێ رێـگەم لە پێشـە، تەنهـا سـێ رێـگە دەبینم:

١- بە دەسرپێژێك خۆم لە کـۆپتەر ئاشـکرا بـکەم، ئاکامەکەیشـی چـی دەبێ با ببێ.

٢- بە ناو دووکەڵ و ئاگردا راکەم، کۆپتەریش دەمبینـێ، خـۆ چاویـان نەبەستراوە.

٣-گـوللەیەك بە دڵ یـان بە سـەری خـۆمەوە بنـێم و تەواو ئەو سـەر و دڵەی زەویەك نەخشە و ئاسمانێك حەزیان تێدایە.

با کەمێکیدی خۆ بگـرم، بڕیـاری پەلە نەدەم، کـام رێـگەیـان هەڵبژێـرم، خۆزی کوڕە ماندووەکەم لەگەڵ با، لەو سێڕیانە یـارمەتیمی دەدا، نـا بـاش بوو رۆیشت، ئێستا ئەویش بە دەردی مـن دەچـوو، ئەو زیـرەك بـوو، دڵـی ئاگـایی دابـوویێ، دڵـی تریوانـدبووی خـۆزگە منـیش وەك وی مانـدوو دەبووم، بەگەڵی دەکەوتم.

ها، دەڵێی، راسـتە! چ روویـدا؟ دەنـگ نەمـا! لە کۆنـدڕێ بـێمە دەرێ؟ کۆپتەرەکان ماندوو بوون! رۆیشتن، دەبێ زوو نەگەڕێنەوە؟ وا باشە هەڵێم، تا پێم تێـدایە هەڵـێم، لە بیـرمە یەکپـێ هەڵاتـم، رەخـت وتفەنگـی کـوڕە ماندووەکە و هێستری بارووتیم بەجێهێشت، رەنگە سـەدە هێسـترێك بە نـاو دووکەڵ و ئاگردا هەڵاتـبم، خـۆم گـرتەوە، لە هەڵاتـن پەژیـوان بـوومەوە، گەڕامەوە لای هێسـتری هەمیشـە هـاوڕێی چـاك، جێـی متمـانە، دیتمـی ناسیمیەوە، بۆنی پێوە کردم، خەریکبوو لە پڕمەی گریـان بـدا، تـۆ گریـانی

هێسترت دیوە؟+ تفەنگ و تاخمەکەشم هەڵگرتەوە، هەچەم لە هێستر کرد، هێستر لە من بەپەلەتر بوو لە بەجێهێشتنی ئاقاری دووکەڵ و ئاگر، نەیدەگەیشتمێ، ئەگەر زمانی هەبا، دڵنیام دەیگوت:

هاوڕێ، پێ هەڵێنە، نەوەك کۆپتەرەکان بێنەوە.

پێم هەڵێنا، دوورکەوتینەوە، تەواوێك دوورکەوتینەوە، چاوێکیشم هەر لە ئاسمان بوو، رەنگە هێستریش تەماشای ئاسمانی کردبێت، ئۆی چەندم تینووە، ترس مەتارەشی لەبیرم بردۆتەوە، نیو مەتارە ئاوی شیرتێنم خواردەوە، هێسترەکەش رەنگە تینووی بێت، دەی زۆر نەماوە، کانیەك لەو خوارە هەیە، جگەرە، جگەرە جگەرەیەکی مام بایزیم پێچایەوە، ئەو پیاوە جگەرەی ئەستوور و رێکی دەپێچایەوە، تووتنی دوو جگەرە پتری دەکردە جگەرەیەکەوە، هێند پتەویش هێند پتەو، لێرە لۆ ئێرێهێی هەڵدەدا هەڵنەدەوەشایەوە، لە دوای لە ترس دەرچوون چەند بە تامە جگەرەی مام بایزی.

ئەوەش کانی، من و هێستر پێکەوە ئاوی ساردمان خواردەوە، پشووێکمان دا، هێستر پشووی نەدا، بە باری بارووتیەوە پشووی چی بدا! هێستر تا کورتانی لێنەکەیتەوە و خۆ نەگەوزێنێ، پشوو نیە، نانێك و چەند قلە قەسپێکم خوارد، جگەرە جگەرە، چەند بە تامە دوای قەسپ و ئاوی کانی، دەبێت ئەوە بڵێم ئەو دەو کانیە، جێگەی خۆ شاردنەوەی زۆرە و مەترسی ئاگر کەوتنەوەشی کەمە، لە باتی دوو کۆپتەر دە کۆپتەریش بێنە ئاسمانێ، دەتوانیت خۆ بپارێزیت و لە بەڵای کۆپتەران دوور بیت، گابەردی وا سەریان بەیەك کردووە، نەشیری عەلی دەیبڕێ و نە مووشەکی حوسێنیش دەیلەقێنێ، کونە شاخ و بەردی وا ئامادەن داتبکەن، دەڵێی هێزی نادیار تایبەت بۆ خۆ شاردنەوە لە کۆپتەر و فڕۆکەی هەلکەنیون، تا هێستر بە بارەوە نەگەوزیوە، با بەرێکەوین.

لە رێێ شەیتان! ئەو شەیتانەش زۆر شەیتانە و شتی سەیر دێنێتە پێشێ، بۆ هێستر میزی نەکرد، هێستر میزی کرد، ئەو کەسەی میزکردنی هێستری

ماچەی نەدیتووە و ورد لێوردنەبۆتەوە، دەڵێ ئەوجا چیە هێستر میزی کرد، میزی هێستر چ تامێکی هەیە تا بێتە ناو سەرهاتەوە؟

بەڵام ئەگەر ئەو پرسیارە دەگاتەوە مام سوارە، ئەو پیاوەی لە دوورەوە بە مشکیی رەنگ مشکیی سەری دەناسرایەوە، بەر لەوەی زار بکاتەوە شەیتان شەرمی لێدەکرد، یەك شیرت لێبەردەدا، شیری حەفتاو حەفت هێستر لێك گرێبدەیتەوە، نە لە دەنگ نە لە درێژی ناگاتە شیرەکەی سوارە، ئەو پیاوە لە تەمەنی بابم بوو ئێستاش پێوە ژنی نەهێنا، دەیانگوت گوتوویەتی:

تا هێستری ماچە و مایین هەبێ، هەرامەکەم لە ژن خەسار ناکەم.

هەبوو ناویان لەو پیاوە نابوو هاوسەری هێستر، خۆیشی شانازی بەو نازناوە جوانەوە دەکرد، من لە میزکردنی هێسترەوە قسەکانی هاوسەری هێسترم بیردەکەوتەوە، بە منداڵی لە کۆڕی وی دانیشتوومە، تا هەوکەش گەلێ گۆتەی ویم لە گوێیە، دەیگوت:

هەر پیاوێك لە میزکردنی هێستر وردبێتەوە، ئەگەر پیاوەتیی هەڵنەستێ، پیاو نیە، دەزانی چ جوولانەوەیەك دەکات، چ نازێك دەکات، پیری نەوەد ساڵە ببینێ شەرواڵی تەڕدەکات.

من کە بە وردی لێوردبوومەوە، بە چاوی خۆم دیتم ئەو دینبەرە چ وەرزشێکی سێکسیانە، سەرجێییانە دەکات، هێندەی نەمابوو بچمە سەر ئایینی هاوسەری هێستر، لەو کاتە زەردە مارێکی سندانکوشتی هەر لە بەر دەمم تیژ لە رێ لە بەری چەپ پەڕیەوە بەری راستی رێ، ترسام، وەرزشی هەرامەی هێسترم لەبیرکرد، هێسترم راگرت و گۆتمە هێستر:

ناچمە سەر دینی هاوسەری هێستر، بەڵام دەبێت هەڵمگری و لە مارم بپارێزی، لە شەڕی کۆپتەر رزگارم بوو، نامەوێ لە شەڕی مار تیا بچم.

هێستر دەتگوت لە زمان تێگەیشت، لە تەنیشت بەردێك وەستا، خۆم هەڵدایە سەر پشتی، پێشتریش زانیبووم ئەو رێگەیە بە مارە، هەرچی جۆری مار هەیە لەو دەڤەرە بینراون، دواتر لە خۆم پرسی:

چۆن بوو هێسترەکە هەستی بە مارەکە نەکرد و نەڕەویەوەو ئاگاداری نەکردمەوە؟

هەبێ نەبێ ئاگاداری کردوومەتەوە بەڵام من بە هۆی سەرقاڵیم بە وەرزشی دامەنیەوە ئاگام لێی نەبووە، هەرچەندە هێستر باری قورسە و ماندووە، بەڵام بۆ وەی بە مار نەچم، لە سەر پشتی هێستر دەمێنمەوە و بۆ خۆم بە درووداو جگەران دەپێچمەوە، تازە شەوم بە سەردا دێت، هێشتا هەر رۆژە، بەڵام ڕێگە زۆری ماوە.

گەیشتینە هەورازەیەکی پڕ لە دارو دڕ، پووش و پەڵاشی حەفتا پووشپەڕ و هاوین لەو ڕێوبانە خڕبۆتەوە، نزابکەن لە کۆپتەر بە دوور بێت، ئێرە ئاگر بگرێت، ئەو هاوینە ئاگر بگرێت بە حەفتا زستان ناکوژێتەوە، ئێستا بە قونکە جغارەیەکی نەکوژاوە دەتوانم لێرەوە ئاگرێك بخەمە دنیاوە، ئاگرێك پاش کەمێکیتر کە تاریکی دادێت لە بەغداوە شەوقەکەی ببینرێت، باش نەبوو لێرە لەگەڵ کۆپتەر لێم نەقەوما، خۆ دەبوومە ماری برژاو، ماری برژاوت دیوە؟ بۆ ماری برژاو دەبێت ڕێی دوور ببڕم و بە دامێنی مەتین شۆڕ ببمەوە و ڕۆژەرێیەك پتر بڕۆم هەتا دەیگەمێ:

ڕۆژێك لە گوندی بناڤێ فڕۆکە خانوویەکی ئاگر دا، مارێك دیارە فریای هەڵاتن نەکەوتووە، فڕۆکە هێند بە دەستوبردە، ماریش سەری لێدەشێوێ، بەو چاوانەی خۆم مارم دیت، هێند برژابوو هێند برژا بوو، لە برژاندا سووتابوو، کەڵکی خواردنی نەمابوو، ئەو مارە سەردەمانێك بە مارە برژاوەکەی بناڤێ لە ناو ماران دەناسرایەوە، ماریش لە کۆپتەر و گورگ دەچێ، ناوی نەهێنرێ باشە، ئەوجا چ لە کۆپتەر ناچێ، هەرچی بەڵای پێوەیە خزمایەتی لەگەڵ کۆپتەر هەیە.

هێستر ماندوو دیارە، ئەگەر زمانی هەبا، دەیگوت:

هاوڕێ، بەزەییت بێ، پشتم شکا، وەرە خوارێ و وەك من بە پێی خۆت بڕۆ.

بەڵام لێم خۆش هاتبوو، جار جارە قلە قەسپێکم دەخستە دەممەوە،

جغارەیەکم دادەگیرساند، لێوم بە مەتارەوە دەنا، لە شەڕی مار دوورم و بۆ بە قسەی هێستر بکەم، خێرا ناڕوا قەیناکە، با هێور هێور لە کیسەڵیش هێورتر بڕوا، با نیوەی شەو بگەمەوە بارەگا، ئەگەر منیش ڕێم لێتێکچێ هێستر شارەزایە، سەد سێڕیان و حەفتڕیانیشی بێتە ڕێ، ڕێی بارەگا دەناسێتەوە، بۆیە گۆتمە هێستر:

هاوڕێ، ببوورە، لە سەر پشتت بم باشترە نەك لە دوات بڕۆم و لە دینی هاوسەری هێستر نزیك بکەومەوە.

دەڵێی لە زمانم تێگەیشت و تووڕە بوو، ئەوە بۆ پێ لە زەوی دەکوتێ و ناڕوا؟

مانی لە ڕۆیشتن گرت، دەنگێك لە لووتیەوە هات، نانووسرێتەوە، ناگوترێتەوە، ناگێڕدرێتەوە، سەری نەوی کرد، لووتی ڕەنگە گەیشتبێتە زەوی، پشتاو پشت دەگەڕێتەوە، تەس دەبێتەوە، تێگەیشتم هێستر لە من تووڕە نەبووە، هەڵوێستەکەی پەیوەندی بە قسەکەی منەوە نیە، کە سەر هەڵدەبڕم، بریا سەرمههەڵنەبڕیبا، چ ببینم باشە، ئەوەی من دیتم خودایە دوژمنیشم تەنها لە تەلەڤزیۆن ببینێت، ئەوەی دیتم یەك جار لە خەونێ دیتبووم، تەنێ لە خەونێ ئەژدیهای ئەوهام دیتبوو، ئەژدیهایەکی کتومت لەوەم دیتبوو، ئێستا نازانم کام ئەژدیها نیشانبدەمەوە ئەوەی ناو خەونەکە یان ئەوەی ئەوەتە لە پێشمانە، چەند لە یەك دەچن، ڕووداوی ناو خەون و ئێرە هەر دەڵێی یەك ڕووداون و دوو جار ڕوویانداوە، ئەو مارە نابێ پێبگوترێ مار، ئەژدیهایە ئەژدیها، ئەوەتا ڕێی لێگرتووین، سات لە دوای سات درێژتر، ئەستوورتر، سەر پانتر دەبێت، زەق زەق تەماشادەکات، ئەوەتە خۆی ڕێکدەخات بۆ پەلاماردان، دڵنیام دەکەومە ناو زگی ئەژدیها، هێسترەکە، ئەرێ لە ناو خەونەکە هێسترم لەگەڵ بوو؟! هێسترەکە دەیەوێ هەڵێت دەڵێی ناوێرێ وەرسووڕێ و تێتەقێنێ، ڕەنگە ترسی ئەوەی هەبێ لەگەڵ ڕوو وەرگێران پەلاماربدرێ، هێدی هێدی تەسدەبێتەوە، من تاساوم، قەت ئەوها نەتاساوم، ئەو ئەژدیهایە هەر گەورە دەبێت لە چاوی من

گەورە و گەورەتر دەبێت، وا دێتە پێشێ، نازانم کێ بە بیری هێنامەوە کە من تفەنگم لە دەستە و تەقەش دەکات، لە جیاتی تفەنگێکیش دوو، باشە تفەنگ ساتێکی ئەوها کەڵکی لێوەرنەگیرێت بۆ چیە، بە خۆم گوت، نەتوێرا تەقە لە کۆپتەر بکەیت، نەوێری تەقە لە ئەژدیها بکەیت، ئەدی سەگی سەگباب تفەنگت بۆچی هەڵگرتووە؟

سێرەم لە ئەژدیها گرت و پەنجەم پێوەنا، نازانم چەند گوللە رۆیشت، سێ، چوار، شەش... هێندەم زانی وا بە سەر پاشەلی هێستردا بەردەبمەوە، ئەوەشم لە بیرە چەنەگەی من و سمی هێستر، پێدەچوو سمی هێستر بێت، بەریەك کەوتن، بەریەك کەوتنێك گڕ لە چاوم هاتە دەرێ، ئیدی...

کاتێ بە ئاگاهاتمەوە، رەنگە دوو جغارە خۆرێك لە بێئاگایی مابمەوە، رۆژ لە سەر ئاوا بوون بوو، تفەنگەکەم لە تەنیشتم راکشابوو، خوێنێکی زۆر لە چەنەگەم هاتبوو، گوللەش هەر هێندە خوێنە دێنێ، کراسەکەم لە خوێن هەڵکێشرابوو، پارچەیەکم لە پشتێنەکەم بڕی و پێچام، هێستر ئای هێستر، تێمهەڵدەدەیت و چەنەگەم دەشکێنیت و بەجێشم ناهێڵیت، بارەکەشی هەر پێوە بوو، مانەوەی هێستر بە لامەوە سەیر بوو، دواتر بۆ زۆر کەسم گێڕاوەتەوە، کەمیان باوەڕیان کردووە، ئەژدیهاکە چی لێهات؟ دوو سێ دەسرێژم بەو ناوەوە نا، پێکەنینم بە کەرایەتی خۆم دەهات، ئاخر ئەگەر هێندەی کەریش مێشکم لە سەر با، لە سەر پشتی هێسترەوە تەقەم لە مار دەکرد!

ئیدی بەڕێکەوتین، گەیشتمە کانیەك بەو تاریکیە، نیوە خۆ شووشتنێك خۆم شووشت، جلکەکانم شووشت، هەندێك سۆتەکە جغارەم خستە سەر برینەکە و پەڕە کاخەزی جغارەم لە سەری داناو، پێچام، هەر چۆنم دەپێچا شێوەی قەڕاسەی وەردەگرت، هێستری سندانکوشتی برینی خستۆتە جێگەیەکی وا نابەستری، بڕۆ، بڕۆ، رێیەکی پڕ بەڵا بوو، خودای رێوبانان بەسە بەڵا، لە یەك رۆژ ئەو هەموو بەڵایە.

شەو درەنگە، خەمی بزربوونم نیە، هێستر رێ بزرناکات، هێستر بۆ من

وەک کـــوێرکێش وایە و دەمبـــاتەوە بارەگـــا، وا گەیشـــتم، لەو پـــێچە بسوورێمەوە، بارەگایە، دەزانن ئێستا خەمی من چیە؟ کوڕە ماندووەکە! نـا، ئەو خەم نیە، پرسیارەکانی ئەبوو عەلی شایب و ئەوانیدی لە بـارەی کـوڕە ماندووەکەوە خەم نیە، خەمی من برینی چەنەگەمە، خۆزگە برینەکە برینـی گولله دەبوو، هی ساچمە دەبـوو، هـی چ دەبـوو بـا بیـا، بەس هـی سـمی هێستر نا، خۆ بزانن هێستر لووشکەی لێداوم، دیـارە، لێکـدانەوەی لووشـکە دیارە، چ دەگەیەنێت، چەند شـەرمە، چەنـد شـەرم بـوو، ئەو کـات چەنـد شەرم بوو، پێشـمەرگە بە لووشـکەی هێسـتر برینـدار بـێ! خـۆزگە سـاچمە دەبوو نەك سم.

ئەوە چیە، گەیشـتوومەتە نـاو بارەگـا، چ هەستوخوسـت نـیە، تـۆ بڵێـی هێندە درەنگ بێ هەموو چووبنە خەوێ، ئەدی ئێشکگر بـۆ دەنگـی نەدام! ناسیمیەوە، بارەگا چۆل دیارە، تۆ بڵێی باریانکردبێ، ئای! ئـای! هاوڕێـیان، هاوڕێیان، لە کوێن؟ هاوڕێیااااااان..

## ئاسمان رژایە پێرسەوە

نە نیازی گەڕانەوەم بۆی هەبوو نە نیازی گێڕانەوەی پێرس، چوار پیاو هەر یەکەی پەلێکیان گرتم و تێیان هەڵدامەوە ئەوێ، چوار پیاو بە زۆر دەمهێننە قسە و چیرۆکی پێرسم پێدەگێڕنەوە، هەولێر لە گەرمەی شەڕی میرات بوو، دەمێك بوو خوێنی حاجی لەقلەقەکە رژابوو، شار لە سەردەمی ئەسکەندەریش گرانیی وای بە خۆیەوە نەدیتبوو، یەك لە دووی یەك تووشیان هاتم، وەك بۆسەیان بۆم دانابێتەوە وابوو.

**پیاوی یەکەم/**

لە کۆلانێکی ئەو سەری شێخەلا (پایزە)ی کتێبخانە هەیە، ئەو پایزەیە لە دوورەوە دیارە نامۆیە بە دابی شێخەللا، لەوێ پێ لە سەر پێ دانیشتووم، دوای نیوەڕۆیە، شەقام نە پڕە نە چۆل، لە بەردەمم قیت بۆوە، دەمانچەی لە نێکی بوو، بەلام بە رووتی نا:

+ کاك... چۆنی باشی...

- سوپاس، ببوورە ناتناسم و من ئەو ناوەشم نیە.

+ من ناناسیەوە! ئەدی لە پێرس پاسەوانی من نەبووی، ئەدی کەم جگەرەت دا پێم؟

- ببوورە برا، هەڵەی، من نازانم پێرس چیە و قەتیش نەمدیتووە.

+ با وا بێت، بەلام ها جگەرەیەکم لێ وەربگرە.

وەرمگرت و رۆیشت، ئۆخەی رۆیشت، ترسام، نەموێرا دان بەوەدا بنێم کە بەڵێ ئەوەی تۆ دەیڵێی بە زیادەوەش هەوم، ترسام لەوەی تۆڵەی

ئەوانەی ئازاریان دابوو لە منی بکاتەوە، ئاخر ئەو ڕۆژانەی شێخەڵڵا ڕۆژی تۆڵەکردنەوە و قەرد وەرگتنەوە بوون.

### پیاوی دووەم/

هەر لە شێخەڵڵا و لە بن دیواری باخی شار، ئەوەتا بەو بەژنە درێژەوە کە تەنها درەختەکانی باخەکە لەو درێژترن، بە دیار نانەوە ڕاوەستاوە، بە دەنگێکی کەمێك نووساوەوە:

نان، نان، وەرنە نانی گەرم.

چاوێکی لە سەر نانەکانە و چاوێکی تەرخانکردووە بۆ پۆلیسە سمێڵ دەسکە گیاییەکە، ئەو پۆلیسەی لەوەتەی دەوڵەتی عێراق هەیە بە خۆ و دارێکی ئەستوورەوە لەو جادەو بانە دەسووڕێتەوە و ئیشی ڕاونانی عارەبانچی و دەسگێڕەکانە، هێشتا قسەم لەگەڵی نەکردووە، پۆلیس گەیشت، بە پێیە زاڵمەکانی تێکەڵەیەکی لەو بازاڕە درووستکرد، کەس شتی خۆی نەناسیتەوە، تێکەڵەیەك لە نان، سابوون، تەماتە، مووس، پاکەتی جگەرە، ئاروو..... لەو ساتانە تەماشای ئەوم دەکرد، دیتم پێدەکەنی، بە خۆی و بە پۆلیس و بە دنیا پێدەکەنی، هەستم لێی ڕاگرت بزانم چی دەڵێت، هێندەم بیست لە بەر خۆیەوە زۆر بە هێواشی چەند جوونێکی مزری بە خۆی دا.

### پیاوی سێیەم/

لە چایخانەی مەچکۆ رووە و جادە دانیشتووم، هێشتا دەرگای ماشێنەکەی نەکردبۆوە، ناسیمەوە، هاتە ژووری، رێك بەرانبەرم دانیشت، ڕەنگە منی نەناسیبێتەوە، بە دەم جگەرە کێشانەوە تەواوێك لێی ڕامام، ئەویش جاروبار تیچاوێکی دەدامێ، بەڵام بە تی چاوی ناسینەوە نەدەچوو، پێنەدەچوو جگەرە بکێشێ، چەند جارێ ویستم بەخێرهاتنی لێ بکەم، جگەرەکەی پێرسم بیردەکەوتەوە و خۆم تێینەگەیاند.

**پیاوی چوارەم/**

بۆ ئیشی برادەرێك، هەرچۆن بوو گەیشتینە ژوورەکەی، بە سادەکراوی لە ژووری وەزیری دارایی دەچوو، توورە دیار بوو، بەخێرهاتنێکی کردین، بەخێرهاتن نەبوو، خوا خێری برادەرەکە بنووسێت قونجرکەیەکی لێدام، قونجرکەی (هەستە بڕۆین) بوو، هەستاین، لە دەرگا پاسەوانەکە کە ئەویش کۆنە برادەر بوو، لە سیمامان دڵشکاویمانی خوێندەوە، گوتی:

ئەوڕۆ توورەیە، کرێچیەکانی دەڵێی لە یەکتریان گرتۆتەوە یەك لە دووی یەك داوای لێدەکەن کرێی خانووەکانیان کەم بکاتەوە.

نەمزانیبوو مەلا ئەو هەموو خانووەی هەیە.

ئەو پیاوانە پێرسم پێ دەگێڕنەوە:

هێشتا لە ناو پایز دەڕۆیشتین، پێمان نەنابووە زستان، لەو پایزەدا لاماندایە بناری پێرس، بە دیوی شیرن، هەر ئەو جێیەی پێشتر لە بەهارێکدا بە قەد تەمەنی پەپوولەیەك لێی مابوومەوە، بە هیچ چیایەك نەکەومەوە، بە پێرس دەکەومەوە، رەنگە ئەو بیر روونیەشم بۆ دیتنەوەی پێرس لەو بزربوونەوە دیتبێتەوە کە پێرس ئەو هەموو وەختە لە دنیای شاردینەوە، شاردنەوەیەکی وەها من لای خۆمەوە دەستم لە دنیا شووشت و گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە جارێکیدی پێیناکەومەوە.

زێ هێندە لێمان دوور نەبوو، برنۆت هاویشتبا دەگەیشتێ، گوندێکی وێرانەمان ئاوەدان کردۆتەوە، پێدەچوو چەند پشتێ بە سەر وێرانەکەیدا تێپەڕیبێ، پایزی پێرس وەك دەڵێن لە زستانی جێیان دەچێت، زۆر تووشە، پیاوێکی خەڵکی سەیدان دەیگۆت:

خودا پایزی بە پێرس رەوا نەدیتیە، پایزەکەشی بە زستان کردیە.

هەر ئەو پیاوە دەیگۆت:

پێرس هی ئەوە نیە بە زستانان خۆتی لێدەی.

پێنج شەش ژووری نەوی نەوی، ژوورێك لەو ژوورانە بە تۆبزی جێگەی چوار کەسی لێ دەبۆوە، لەو چوار کەسە یەکیان شێخ شوان، ئەو

شێخە ئاشووری بوو خەڵکی عەنکاوە، بەڵام پێچەوانەی هەموو گەنجانی عەنکاوە زمانی کوردیەکەی لە عەرەبیەکەی باشتر بوو، هێ لە هەندێش، هێندەی تێکەڵاوی لەگەڵ موسڵمانان هەبوو هێندە تێکەڵی مەسیحیان نەدەبوو، من هەر بەشێخی عەنکاوە بانگم دەکرد، ئەو شێخە کوڕێکی قژ گروازە، موو زەرد وەك کارەبای زەرد، نێوچەوان پان، چاو گەورەی کەمێك زەق، کەپوو قەسپی، زۆر لەو یاوەرەی مەسیح دەچوو کە کازانتزاکی لە رۆمانێکیدا زۆر دەستڕەنگینانە وێنەی کێشاوە، کێشانێك هیچ کامێرایەك وا ورد و روونی ناکێشێت. ئەویدی عەرەبێکی بەغدایی بە ناوی عادل، ئەو کوڕە بە سیما دەتگوت لە سەر حەسەن توڕابی کۆپی کراوە، لە ریش بەردانەوەش لەوی دەکرد، سێیەمیان ئەبوو جاسم، حەمە سووریشیان دەگوتێ، ئەو ئەبوو جاسمە بە دڵنیاییەوە دەیگوت:

بە بیرم دێ دایك و باوکی بابم کە دەکەنە باپیرە و داپیرەی من ئەرمەن بوون.

بەڵام بە خۆی بە شێوەیەك بە عەرەبکرابوو، لێی تێکچووبوو سەر بە چ نەتەوەیەکە، دەیگوت:

من ناهەقم نیە نەزانم چیم، وا بابم نازانێ من چۆن بزانم.

لەو کوڕەوە باشتر لە ترسناکیی بە عەرەبکردن تێگەیشتم، ئەو کوڕە بە بنەچە ئەرمەنیە، یەکی سۆر و سپی، دەم و چاو پان، موو زەرد، بەژن و باڵا مامناوەندی، بەلای قەڵەویدا دەیشکاندەوە، چوارەمیشیان من، وا بزانم لەبەر خاتری من بوو ئەبوو جاسم رۆژانە چەند وشەیەکی کوردی فێردەبوو، بە کوردی لەگەڵ من قسەی دەکرد، شێخی عەنکاوە بە گاڵتەوە پێی دەگوت:

گەلەك خێرت لە بە عەرەبکراوی خۆت دیت، نۆرەی بە کوردکراویە!

ئەبوو جاسم ناوێکیدیشی هەبوو، کەوی کوێستان! ئاخر پێکەنینێکی هەبوو دەتگوت کەوە دەقاسپێنێ، جاری وا بوو بە دوو سێ کەس

دەیانگرت و قدیلانەیان دەکردەوە تا گوێیان لە پێکەنینەکەی بێت، خودایە پێکەنینێکی خۆشی هەبوو.

بارەگاکەی بناری پێرس خۆشیەکەی لەوەدا بوو، کتێبخانەیەکی پڕ کتێبی هەبوو، لەو پایزەی ئەوێ، جارێکیدی ڕۆمانی (براکوژی)م خوێندەوە، لەوێ سەعدی یوسفم خوێندەوە، حوسێن مەردانم خوێندەوە، عەبدولرەحمان مونیفم خوێندەوە، ئەو کتێبخانەیە پازدە بیست ڕۆمانێکی تێدا بوو، بەرنامەیەکی خوێندنەوەم بۆ خۆم دانا، نزام دەکرد ئەو زستانە لێرە بمێنینەوە، عادلیش زۆری دەخوێندەوە، لە سەر کتێب هەڵنەدەستا، جارێك بەو شڕە عەرەبیەی خۆم کە قسەم پێدەکرد - ئێستاش هەر فێر نەبووم بە عەرەبی قسە بکەم- لەگەڵ عادل لە بارەی سارتەرەوە کەوتینە گفتوگۆوە، من زۆر سەرسام بووم بە سارتەر، هەر سێ بەرگی (دروب الحریە)م بە خەتم کردبوو، وا بزانم هەر لە ڕێی سارتەریشەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ مارکس پەیدا کرد، لەو گفتوگۆیە یان مشتومڕە لە بیرمە ڕستەیەکم گۆت، وەهای گەیاند کە سارتەر پلەیەك لە سەرەوەی مارکسە، عادل یەکسەر پرسی:

باشە تۆ مارکسیت یان سارتەری؟

لە بیرمە وام وەڵام دایەوە:

من هیچیان نیم.

گوتی:

بە ڕاستی یان گاڵتە دەکەیت؟

گوتم:

ئەگەر باوەڕ دەکەیت نازانم بە گاڵتەمە یان بە ڕاستی!

گوتی:

تێگەیشتم.

لەوەوە من و عادل زۆر بووینە برادەر، بەڵام قەت سەری قسەمان نەدەبردەوە کن مارکس و سارتەر.

ئەو بارەگایە ئەوەشی خۆش بوو زیندانیی لێ نەبوو، چ لەوە ناخۆشتر نیە لە بارەگایەك بی، زیندانیی هەبێ، كە زیندانیت هەبوو واتە دوژمنی ناوەخۆت بۆ خۆت زیاد كرد، نەخاسمە لە دەمی ئێشكگری.

خۆشیەكیدیكەی بارەگاكەی بناری پێرس گەرماوەكەی بوو، لە هیچ بارەگایەك گەرماوی وا رێكوپێك و خاوێن و گەرمم نەدیبوو، بە شێوەیەك بە كەرتە تاتەبەرد بەردرێژ كرابوو، دەتگوت كاشیرێژە، دیوارەكانی جگە لە دیواری لای مەنجەڵەكە بە نایلۆنی ئەستووری گوڵگوڵی نایلۆنرێژ بوون، دیواری لای مەنجەڵیش بە تەنەكەی خاوێن ئاوێنەرێژ، لەو تەنەكانەوە خۆت بە روونی دەدیت، تراشت لەبەر ئەو تەنەكە ئاوێنەییە دەكرد، نیوە بەرمیلێكی گەورە بلق بلق دەكولا، لە دەرەوە ئاگرت دەدا بە بێ ئەوەی هێندەی دووكەڵی دنكە شخاتەیەك دووكەڵ دزەی ژووری بكات، ئاوی ساردیش لە سۆندەیەكەوە شوڕەی دەكرد كە لە كانیەكی دوورەوە راكێشرابوو...

ئەو گەرماوە بە هۆی خۆشیەكەیەوە گرفتی زۆری دەنایەوە، ئەوەی دەچووە ژوورێ نەدەهاتە دەرێ، خۆ كە نۆرەی مەلا دەهات، ئەوا هەموو دەستیان لە خۆشووشتن دەشووشت، ئەو پیاوە كە دەیانگوت بەرپرسێكی گەورەشە زوو تەواو بایە، دانە رۆژێكی پێدەچوو، ئەو مەلایە هەر لە خۆشووشتن نا لە قسەكردنیش زۆر خاو بوو، ئەگەر رستەیەكی درێژی گۆتبا، هەتا دوا وشە لە زاری دەهاتە دەرێ كەس وشەی یەكەمی رستەكەی لە بیر نەدەما، پیاوێك بوو نەرم و لەسەرەخۆ خۆی نیشاندەدا، بەڵام كە دەیگوت نا، ئەو نایەی دەگەیاندە سەر، پیاوێك بوو پێدەچوو زۆری خوێندبێتەوە، سێ چوار رستەی لینینی زۆر دەگوتەوە، تا رادەیەك ئاگاداریی لە ئەدەب هەبوو، حەزی بە شیعر دەكرد، نازانم كێ بوو ناوی نابوو برجنێفی كورد، لە سیماشدا بە تایبەتی لە باری دانیشتن، بە چاوپۆشین لە چاوی میر، رێك لە میری رەواندزی دەكرد، بۆیە میریش ناوێكیدیكەی ئەو مەلایە بوو، مەلای ئیسرائیلیش لەوێ بوەستێ.

له بارەگــا پێرســیەکە گــوێم لە مــوژدەی خۆشــیش دەبــوو، کوڕێــك رزگاری ناو بوو، وا بزانم بەرگری میللی بوو نەك پێشمەرگە، خەڵکی لای رۆست بوو، کەمێك لەو وێنەی مێرگەسۆریەکە یان رۆستێیەکە دەچوو کە من جارێك لە جێگەیەك دیتبووم، دواتر زانیم کەبرای ئەوە، ئەسپێکی سپی هەبــوو، لە برایەکــی خــۆی پتــری خۆشدەویســت، دەمــدیت کلــك و بــژی دادەهێنا، جیقی چاوی دەسڕی، حەفتەی جارێك جلی ئەســپی دەشووشــت، کەچی بە مانگیش جلکەکانی خۆی نەدەشووشت، جا بڵێم چی بــۆ ئەســپە سپی نەدەکرد، خۆشترین بۆنی لە ئەسپ دەدا، لەوەوە هەندێك ناویان نابوو ئەسپی بۆندار، خــاوەن ئەســپی بۆنــدار دیــار بــوو بەینــی لەگەڵ خــواردنەوە هەبوو، رۆژێك گفتی دامــێ کە دوای هەفتەیەکیــدی دوو بوتــڵ عەرەقــت دەگاتێ و پــارەکەش لە گیرفــانی وی، ئەو کــوڕە بەردەوام لەو گونــدانەی ئەو دەوروبەرە دەسووڕایەوە، هەمووانی بــاش دەناســی، هەنــدێك لەوانــیش هاتوچۆی شاریان دەکرد، لە گونــدی (ســەیدان) پیــاوێکی راسپاردبوو کە عەرەق بێنێ، من ئێستا چاوەڕێی گەیشتنی عارەقم، شێخی عەنکاوەشم لەوە ئاگــادار کــردۆتەوە، ئەو شــێخە لە مــن تــامەزرۆترە، خــولەك و دەمژمێــر دەژمێرێ، خەریکە لە ئێســتاوە مەزە چــێ بکــات، هەر نــزا دەکەم، خــودایە هەتا عارەق دەگات، چ نەقەومێ، دوایی خوای دەکرد نغرۆ دەبوو.

لەو بارەگــایە مــن شــتی خۆشــم لە پێشــە، دارا چاوشــین، ئەو کــوڕەی هێندەی یەك دنیام خۆشدەویست، ئەو کوڕە جارێك لە بناری گــارە ئاگــام لە خۆم بڕابوو، دەیانگۆت هەتا هاتمەوە هۆش، سەر سەری بەرنەدابــووم و هۆن هۆن فرمێسکی وەراندبوو، دارا دوو چــاوی دەریــایی هەبــوو، دڵێکــی زەریایی هەبوو، زەریایەکی روون و هــێمن، کــوڕێکی تــا دەســت هەڵبــڕی کەڵەگەت، لەوێوە ئەگەر رووت لە زنجیرە چیای پێــرس بکــردایە، بە لای دەستی چەپدا چیایەکی خری بڵنــد دەهــاتە نــاو چــاوتەوە، دارا گەیشــتبووە سەر ئەو چیایە، چی دیتبێ باشە؟! دارا دەیگۆت:

بە شەو لە سەر ترۆپکی ئەو چیایەوە یەك یەك گلۆپەکانی سەر قەڵاتی

هەولێر بژمێرە.

هەر جارێك باسی سەر ئەو چیایەو گلۆپەکانی هەولێری بۆم دەکرد، خەریك بوو باڵ بگرم و لە سەر چیا بنیشمەوە، وەك منداڵ ڕکەم دەگرت کە لەگەڵم بێتە سەر چیا، ئای تاسەی هەولێرم دەکرد، لەویێ تێگەیشتم هەولێریەکان تا لە هەولێر دوور نەکەونەوە، نازانن دووری لە هەولێر چ ئازارێکی پڕ لە سوێیە، ئەویش گفتی دامێ کە لەم زووانە، ڕۆژێك دنیا زۆر تەڕوتووش نەبێت، سەرێکی سەر چیا دەدەین و چاومان بە گلۆپەکانی هەولێر ڕووناك دەکەینەوە.

ئەو بارەگا پایزیە پێرسیە، پیاوی جوانی تێدا بوو، پیاوێك لە هەمووان جوانتر لە چاوی من جوانیی دەنواند، (حاجی دەهام)ی ناو بوو، پیاوێکی کەتەی درێژ، ڕەقەڵەی گوپ تێکقوپاوی موو قاوەییەکی کاڵ، ئەو پیاوە ئیداری بارەگا بوو، ئیداریش لە پێشمەرگایەتی وەك هەندێك لە بەرگی گاڵتە دەیانگوت هاوشانی وەزیری دارایی و ئابووریە، ئەو پیاوە خۆی و هێسترە ڕەشەکەی هەمیشە لە ڕێ بوون و خواردنیان دەکێشایەوە، ئەویش وەك خاوەن ئەسپی بۆندار خزمەتی هێسترەکەی دەکرد، بەڵام بۆنی لێ نەدەدا، هیچ ئیداریەك نەبووە و نیە ڕۆژی بە لای کەمی سێ جار تووڕە نەبێت، هەر جەمە خواردنێك تووڕەبوونێکی ویستووە، ئەگەر نا تووڕەبوونەکەی بۆ درەنگانی شەو هەڵگرتووە، ئەو دەمەی پێشمەرگە برسی دەبێتەوە و دەچێتە سەروگوێلاکی ئیداری و داوای تەحین و دۆشاو، گوێز، شتێکی لێدەکات، بەڵام کەس حاجی دەهامی بە تووڕە بوون نەدیتووە، ڕاستتر، کەس نەبووە لە حاجی دەهام تووڕە بێت، دەیانگوت:

ئاخر حاجی دەهام وا دڵی نایە سواری پشتی ئەو هێسترە بەرازیە بێت، چۆن دڵی دێت کەسێك تووڕە بکات!

دەمدیت زۆر جار سەرودڵی حاجی دەهامیان دەگرت، بەڵام بە سەر خۆی نەدەهێنا، قەت قسەیەکی وای نەدەکرد، جووڵانەوەیەکی وای نیشانەدەدا کە ببێتە هۆی تووڕەبوونی ئەویدی، با ئەویدیش ئەوی ئازار

بدایە، ئەو پیاوە تا ئەو دیوی ئارامی ئارام، باوەڕیشی بە تۆڵە نەبوو، دەتگوت خەڵکی سەر زەوی نیە، ئەو زەویەی لەوەتەی هەیە تۆڵەی لێ شیندەبێت، ئەو پیاوە ئەو کاتەی زۆر بێزار دەبوو، دەچووە پەنایەك، پشت لە ئاوەدانی روو لە چۆڵی، چەند قسەیەکی مزری بە خۆی دەگوت، جارێك پێیانگوت:

باشە تۆ ئەودەمانەی کە قسە بە خۆت دەڵێیت، بۆچی پشت لە خەڵکی دەکەیت؟

حاجی دەهام چ بڵێ باشە:!

نەوەك کەسێك وا لێکی بداتەوە، بە هەڵە تێبگات، کە لەگەڵ ئەومە.

هەبوو پێیدەگوت:

ئێ، کاکە، ئەگەر کەسێك سێ چوار قسەی پێگوتی، هەر هیچ نەبێت تۆ قسەیەکی پێبڵێوە.

حاجی دەهام چ بڵێ، باشە :

چما قسەیەکی رەق بە کەسێك بڵێم، حەفتەیەك خەوم لێدەکەوێت!

لە کازانتزاکیەوە تێگەیشتبووم کە عیسا پیاوێکی چەند نەرم و میهرەبان بووە، چەند لێبووردە بووە... بەڵام زۆر جار دەکەوتمە گومان لە کازانتزاکی و هەموو ئەو کەسانەی وێنەی وی، وێنەی مەسیحیان بۆ من کێشابوو، دەمگوت، زەحمەتە زەوی پیاوی وای بە خۆوە دیتبێ، بەڵام کە حاجی دەهامم ناسی، باوەڕم هێنا کە دەشێ عیساش وا بووبێ، دەمێك بوو ناوی حاجی دەهام لە سەر زاران بوو، کەس نەبوو نەیناسێ، هەتا وای لێهات وشەی (حاجی دەهام) واتایەکی نوێی وەرگرت، چۆن؟ هەبوو لە خۆی توورە دەبوو، لە باتی ئەوەی چەند جوونێکی مزر بە خۆی بدا، دەهات کورتی دەکردەوە و جوونەکانی پڕ واتاتر دەکرد و دەیگوت:

من حاجی دەهامم.

بارەگا دەو زنییەکەی بادینان سبەینان لە پێکەنینی دوو ژنە پێشمەرگە بە ئاگا دەهات، دوو ژنی پڕ لە پێکەنین، بارەگایان پێکەنینپڕێن دەکرد،

نادیە و تانیا ئەو دوو ژنەی هێند شیرن بوون، هێندە زیرەك و قسەزان بوون، کەسێکی عاقڵ نەبوو تا ئەوپەڕی ڕێز ڕێزیان نەگرێ، یەکێ دەیگێڕایەوە:

تانیا ئەو ساتانەی لە پشتئاشان لە سەر لێواری گرتنیش بوو، هەر پێدەکەنی، بە دیلیش گیرا هەر پێدەکەنی.

کاردۆیەك هەبوو وا بزانم لە پەڕگەترین گوندی دنیاوە هاتبوو، ئەوە جاری یەکەمی بوو لە نزیکەوە عەرەب ببینێ، کە گوێی لە پێکەنینی تانیا و نادیە دەبوو لە بن لێوانەوە دەیگوت:

ئای کوڕە خۆ وەکو ژنی لای خۆمان پێدەکەنن!

کاردۆ بەرۆکی تانیای گرتبوو کە فێرە عارەبی بکات، تانیاش دەیگوت:

ئاخر من کوردی نازانم چۆن دەتوانم تۆ فێرە عەرەبی بکەم؟

شێخی عەنکاوە رووی کردە کاردۆ:

ئەگەر لە سەگایەتیت نیە و دەتەوێت فێری عەرەبی بیت، من فێرت دەکەم...

کاردۆ منداڵانە پشتی لە شێخ دەکرد:

نا لە تۆ فێر نابم، تۆ عەرەبیەکەت تەواو نیە!

بارەگا رووە و زستانیەکەی پێرس، (ئەبوو وەحشێك)ی بێ زیانیشی لێبوو، پیاوێك بوو بڕیاری دابوو، پیر نەبێت، خۆی لە دووکەڵی جگەرە لادەدا، دەیگوت:

هیچ جیاوازیەك لە نێوان کیمیایی و جگەرە نیە، هەردووکیان دەتکوژن.

ئەو پیاوە چەندساڵێك جگەرەی کێشابوو، کە زانیبووی جگەرە تەمەن کورت دەکات، ئیدی فڕێدابوو، لە جگەرەکێش نزیك نەدەکەوتەوە، کە دەیدیت یەکێ جگەرەی بە دەستەوەیە، تفی رۆدەکردە عەردی، ئەو پیاوە زۆر سەرسام بوو بە حوسنی موبارەك و دەیگوت:

ئەنگۆ تەماشای حوسنی موبارەك بکەن، چ تەمەنێکی هەیە، کەچی

ئەوها گچکەش دیارە، منیش دەبێت وەك وی بم.
ئەو پیاوە لە ناو بەفریش با لە بن بیریش با، میوە، تەڕەیەکی پەیدا دەکرد، هێندە گرنگی بە خواردنی گۆشت نەدەدا، دەیانگوت بەهاران بە گژوگیا دەژی، تۆرکە، کەنگر، پیفۆك، ترشۆکە... ئەو شتانە دەخوات، بەیانیانیش سووکە وەرزشێکی دەکرد، ئەو پیاوە یەکبینە پێدەکەنی، رۆژیش نەبوو چەند کەسێك نەکاتە وەحش، هەر قسەیەکی بە دڵ نەبا، بە خاوەن قسەی دەگۆت:
دە لاکەوە، هەی وەحشی.
کەسم نەدیت لەو زارە پڕ وەحشیە تووڕە بێت، ناوەکەشی هەر لەوەوە هات، هێندە بە خەڵکی گوت، وەحشی، هێندە وشەی وەحشی لە زاری هاتە دەرێ، هەتا ناویان نا ئەبوو وەحش، دەنا ناوی خۆی ئەبوو شتێکیدی بوو، من لای خۆمەوە ناوم نابوو پیاوی سەرڕاست، زۆر بە راشکاوی قسەی دەکرد، شەرمی لە کەس نەدەکرد، منەتی کەسی هەڵنەدەگرت، سەرڕاستیش چەند رۆژێك بوو هێسترێکی پەیدا کردبوو، پێدەچوو سەفەرێکی دووری لە پێش بێت، کوڕە ئەرمەنیە بە عەرەبکراوەکە بە هێسترەکەی ئەبوو وەحشی دەگۆت، (ئوم وەحش) هەرچەندە ماچەش نەبوو.
سەرڕاستم بۆیە خۆشدەویست، قسەی زار و دڵی یەك بوو، بێ پێچ و پەنا قسەی خۆی دەکرد، ئەوجا قسەکە رەق با یا نەرم، ئەو وێنەیەم هەر لە چاوە، دەنگەکانیشم لە گوێ ماوەتەوە، کوڕێك بەختیاری ناو بوو، رووی کردە ئەبوو وەحش و یەك گوپ دووکەڵی پێدا کرد و گوتی:
هاوڕێ، دووکەڵی جگەرەی من زیانبەخش نیە، سۆمەرە.
ئەبوو وەحش هەستایەوە و کۆخەیەکی بۆ کرد:
هەی وەحشیی کوڕی وەحشی، میوەی بەهەشتێ دەوی تۆی پێبکەوێت، دەبێتە گوو، دووکەڵت پیس نیە؟!
بەختیار تێکچوو، (وەحشی)یەکی بە ئاسایی وەرگرت بەڵام لە (کوڕی

وەحشی)یەکە نیگەران بوو، بەختیار تاکە کەس بوو لەو بارەگایە جگەرەی سۆمەر جۆرە باشەکەی بکێشێ، ئێمە تووتنمان دەکێشا، یەك دووێکیدیش وا بزانم پاکەتی بەغدا جۆرە خراپەکەیان دەکێشا، ئا خاوەن ئەسپی بۆنداریش پاکەتی دەکێشا.

بەختیار باریکەیەك بوو کەمێك دەشەلی، هەمیشە نارەزایی پێوە دیار بوو، سیمای وای پێوە دیار بوو کە گرفتی گەورەی هەبێت، رەنگە واش نەبووبێت من وام خوێندبێتەوە، ئەو کورە رۆژی دوو پاکەت هەتا دوو و نیوی دەکێشا، خۆزگەم دەخواست منیش پارەم هەبا و لەو جگەرەیەی ئەوم دەکێشا، لە بیرمە هەموو سەرە مانگان پاکەتێك دووانم لەو سۆمەرە دەکڕی تەواو، پێنج دیناری مانگانەکە هەر بەشی تووتنی دەکرد.

پیاوێکیدی ئەویش دیار بوو کادیر بوو، دەیانگۆت رووسیەکەی فوولە، شتۆکەك کوردیشی دەزانی، بەردەوام باسی رۆژنامەی (پراڤدا)ی رووسی دەکرد، شێوەکەی چۆنە، لاپەڕەکانی چۆن دابەشکراون، چی بڵاودەکاتەوە، چەند کەس دەیخوێنێتەوە... رەنگە هەر بە هۆی سەرسامبوونی بەو رۆژنامەیەوەش ناوی لە خۆی نابێت (ئەبوو پراڤدا)، بەڵام کاردۆ نەیدەزانی ناوەکەی جوان گۆبکات، پێیدەگوت (ئەبووی پف دا)، ئەو پیاوە لە سیمادا بیابانیەکی رەسەنی دەنواند، زۆر بەهێز دیار بوو، پێشتریش دەمناسی، ئەو پیاوە ئیشەکەی وا بوو لێپرسینەوە لەگەڵ زیندانیان بکات، لە چەند زیندانیەکم بیستبوو کە توندە و رەفتاری توندە لەگەڵیان، لە بیرمە لە بارەگایەك (کانی توبە)یان دەگۆتێ، چەند زیندانیەکی لێبوو، بەرێکەوت ئەو کاتەی ئەو ئەبوو پراڤدایە لێپرسینەوەی لەگەڵ یەکێك لە زیندانیەکان دەکرد، من ئێشکگر بووم، لەو ساتەی زیندانیەکە لە ژوورەکەی ئەبوو پراڤدا هاتە دەرێ و من دەمویست بیبەمەوە ژووری زیندان، زیندانیەکە ئاورێکی لێی دایەوە قسەیەکی کرد، تێنەگەیشتم چی گۆ، بەڵام پێدەچوو قسەکەی وەڵامی قسەیەکی ئەو بووبێت، ئەبوو پراڤدا بە عەرەبی فەرمانی بە من دا کە لێیدەم، بەڵام من بە کوردی و بە

تەماشاكردنێكی پڕ لە پرسیارەوە گوتم:

ئەوە ئیشی من نیە.

زیندانیەكە دیار بوو باش گوێی لە فەرمانەكەی ئەبوو پرافدا نەبوو گوتی:

ئەوە چی گۆت؟ گۆتی لێیدە؟

من گوتم:

نا، گوتی بیكە ژوورەكەی خۆیەوە.

ئەبوو پرافدا، نازانم لە وەڵامە كوردیەكەی من گەیشت یان نا، بەڵام دڵنیام لە تەماشاكردنەكەم تێگەیشت، لە دڵی خۆم گوتم بە خودای شتێك دەقەومێ، ئێوارەكەی دیتم وا ئەبوو پرافدا بەرەو كەپرەكەی من دێت، نەمگوت دەقەومێ! سەرەتا باسی لینین و سۆڤیەت و پرافدای كرد، لە دڵی خۆم گوتم دیارە بە پێشەكیی درێژ دێتە سەر بابەتی سەرەكی، ئەوجا هاتە سەر فەهد و شەڕی چەكداری، دیسانەوە گوتم پێشەكیەكەی وا درێژ بێت، بابەتەكە هەتا سبەینێش تەواو نابێت، هاتە سەر باسی ئەدەب و شیعر، باسی گۆرانی شاعیری كرد، بە شێوەیەك كە زۆر سەرسام بوو پێی، دەیگوت:

من هەموو ئەو شیعرانەی گۆرانم خوێندۆتەوە كە كراون بە عەرەبی و رووسی، بە داخەوە كوردیەكەم هی ئەوە نیە گۆرانی پێبخوێنمەوە.

هەر قسەی كرد و نەهاتە سەر باسی زیندانیەكە، لە هەستاندا گوتی:

من گاڵتەیەكم لەگەڵ كردی، باش بوو تۆش هەر بە گاڵتە وەڵامی گاڵتەكەت دامەوە..

لەو رۆژەوە بە دەست خۆم نەبوو ئەو پیاوەم خۆشویست، ئەو پیاوەی لەوەتەی من دەیناسم، قەڵەم و كاخەزی بە دەستەوەیە و كەسیش نازانێت چ دەنووسێت و خەریكی چیە، دارا بە گاڵتەوە دەیگۆت:

دەزانی خەریكی چیە؟ ئەوە لە گژ ناوی زیندانیەكانە، كۆیاندەكاتەوە،

کەمیانـدەکات، سـاڵ و رۆژی گرتنیـان، هـی بەردانیـان، هـی رمیکردنیـان، خەریکی ئەو شتانەیە.

دواترلە شاهێنم بیست کە:

ئەبـوو پرافـدا کچێـك و کـوڕێکی هەیە، لە خۆشەویسـتیی رۆژنـامەی پرافـدا کـچەکەی نـاو نـاوە پرافـدا، سەرسـامبوونی بە گـۆرانی شـاعیریش کوڕەکەی بە ناوی ئەوەوە کردووە.

ئەو ئەبوو (پرافدا و گۆران)ە شیعری (برای عەرەبی چـاو رەشـم)ی بە عەرەبی زۆر دەگوتەوە، ئەو شاهێنەش یەکێك بـوو لەو مولازمـانەی کە لە وڵاتی یەمەن خوێنـدبوویان و خـولی سـەربازیان دیتبـوو، پلەی مولازمیـان بەدەست هێنابوو، بارەگـا چەنـد مـولازمێکی لێبـوو، لەوانە مـلازم ریـاز کە مێردی تانیا بوو، مولازم کارزان ئەویش لە سەر ئایینی شێخەکەی عەنکاوە بوو، خەڵکی شەقراوێ.

بارەگـا رووەو زسـتانیەکەی پێـرس نـزیکەی سـی پێشـمەرگەیەکی سـەرمابردەڵەی حەوانـدبۆوە، پێشـمەرگەی خوێنـدەوار و نەخوێنـدەوار، پێشمەرگەی هەمەڕەنگ لە نەتەوە و ئـایین، پێشـمەرگەی تێـدا بـوو هێشـتا هیچ شارێکی گچکەشی نەدیتبوو، تەمەنی لە چەند گوندێکی ئاقار بە سەر یەك بەسەر بردبوو، پێشمەرگەش هەبوو خوێندنی لە رووسیا تەواوکردبـوو، هەبوو مولازم بوو لە چیك و یەمەن دەورەی سەربازی کردبوو.

بە پێی ساڵژمێری چیا چەند رۆژێك بوو چووبووینە باوەشی زسـتانەوە، بەڵام بە ساڵژمێری پێرس کە لەگەڵ هیچ چیایەك تێکینەدەکـردەوە زسـتانی شەش مانگیمان بە نیوەش کردبوو، پێش نیوەڕۆ بوو، بەوە دەزانم ئەو کاتە بـوو، چـونکە ئەو رۆژە مـن کابـان بـووم و بـرنجم دەخسـتە سـەر ئـاگر، پیـاوێکی ریـش ماشـوبرنجیی دەروێشـیانە، پیـاوێکی رەنـگ روونـی چـاو گەش، پرچی درێژ بایە دەمگوت لە دەروێشەکانی شـێخ کـاکەیە، لایـدایە بارەگا، هێشتا دانەنیشـتبوو، مـن هەسـتمکرد کـۆپیەکی ئەو پیـاوەم دیـوە و ئاشـنامە، بەڵام نەدەهـاتەوە بیـرم کێـیە و لە کـوێ، دوای چـاکوچۆنیەکی گەرم:

من بابی هاوڕێیەکم دوو سێ مانگە هاتووە، وا بزانم لێرە ناوی ئارامە.

راستی بۆ چووم هەڵەم نەکرد، پێش مانگێك لە بارەگای کافێ ئەو ئارامەم دیت و زۆریش پێکەوە قسەمان کرد و وەك برادەرمان لێهات، ئارام تەمەنی حەڤدە هەژدە ساڵێك بوو، هەندێك جوولانەوەی دەکرد پێدەچوو دەورەی کاراتی کردبێت، هەڵمدایێ:

من دەیناسم، لە بارەگایەکیترە، لێرەوە زۆر دوورە.

زۆری پێنەچوو، یەکێك منی تیکردەوە:

کوڕە، ئەوە دەڵێن، ئارامی کوڕی ئەو پیاوە، ئێستا گیراوە، وا بزانم ئەمنی هەولێر ناردوویانە کە ... بکوژێت، بەڵام هێشتا بە تەواوی روون نەبۆتەوە.

نازانم چ ناوێکی گۆت.

ئیدی نانی نێوەڕیان دایە کابراو بەرێیانکرد و پێیانگوت:

کوڕەکەت ئێستا لە ناوچەی لۆلانە، ناتوانیت بیبینی، باشترە بگەڕێیتەوە ماڵ.

کابرا هێشتا نەگەیشتبووە دەو زێ، کوڕە زیندانیەکەی گەیشتە بارەگا، زۆر چاوم لە چاوی بڕی سەری بەرز نەکردەوە، دەمویست لە چاویدا تاوان یان بێ تاوانی بخوێنمەوە، هیچم بە هیچ نەکرد، لە بیرمە زۆرم خەفەت لەو گەنجە خوارد.

ئەوەی لێی دەترسام روویدا، چەند خۆش بوو بارەگای بێ زیندان و زیندانی، ئێستا زیندان هەیە و زیندانیەکەش ئاشنایەکی خۆم.

ئەرمەنیە بە عەرەبکراوەکە گۆتی:

خوا بۆ ئەبوو پراڤدای دا!

(دونی ئارام)م لە بن دەست بوو، چەند لاپەڕەیەکم لێخوێندبۆوە، شێخی عەنکاوە هەواڵی هێنا:

+ لەو رۆژانە، سبەی یا دوو سبەی بارەگا باردەکات.

- بۆ بالیسان؟

+ ئا بۆ ئەولا...

دەمزانــی بارکردنێکمــان لە پێشــە، بەڵام نەمــدەزانی وا بە زووی، بەو هەواڵە کەوتــمە دڵەڕاوکێـوە، لە زۆر سـەرەوە خـۆش بـوو، بەڵام سـەری ناخۆشیشی هەبـوو، ناخۆشـە، مـن ئەو چیـایەم دەچێـت کە دارا چـاو شـین قسەی داوە بچین و گلۆپەکانی هەولێر ببینین، ناخۆشە، ئەو بەرنـامەیەی بـۆ خوێنـدنەوەم دانـابوو، سـەراو لێـژ بـوو، دونـی ئارامیشـم بـۆ تەواو نـاکرێ، خەریك بوو خـۆم سـەرکۆنە دەکـرد لەوەی چەنـد جارێـك پێیـانگوتم کە بچــمە بەشــی راگەیانـدن ئیشـبکەم و بە قسـەم نەکـردن، ئەگەر چووبـام دەمتوانی لە تێری کتێب بخوێنمەوە، ئاسۆ کەریـم ئەو کـوڕەی لە رێگـای کوردستان ئیشی دەکرد دەیگۆت:

وەرە لەگەڵ ئێمە ئیش بکە، راگەیانـدن بـۆ تـۆ باشـترە، گـۆزە گـۆزی کەمترە، کات بۆ خوێندنەوە زۆرە.

بە قسـەم نەکـرد،هەر زوو لەو نیـازی سـەرکۆنەکردنەی خـۆم پەشیمان بوومەوە و گوتم، نا، لە دەرەوەی راگەیاندن ئازادترم، ناخۆشە بەوەی دوو شووشە عارەقی سەر مۆرم لە قیس دەچێت، ئەو عـارەقەی خـاوەن ئەسـپی بۆنـدار دەیگـۆت لەو رۆژانە دەگـات، جـگە لەوانەش راسـتە بـێ مـاڵترین کەس رەنگە پێشمەرگە بێت، بەڵام ئەویش کە چەند رۆژێك لە جێگەیەك مایەوە بێ ئەوەی بیەوێـت، بـێ ئەوەی بە دەسـت خـۆی بێـت بە جۆرێـك خووی پێوە دەگرێت، من وام، هەستدەکەم کە لێـرە دەڕۆم وەك ئەوە وایە کە سەردەمی منداڵیە، ماڵمان لە کۆڵانێکە، لە نکـاو بـاردەکەین، چەنـد بەو بارکردنەی سـەردەمی منـداڵی دڵتەنـگ دەبـووم، ئەو بـارکردنەی ئێسـتاش ئەگەر تۆزێکیش بێت خاڵی نیە لە دڵتەنگیە منداڵیەکە.

هەر ئەو رۆژە بارەگا لە گژ خـۆ تێکنـان بـوو، چەنـد تەشـتە هەویرێـك کرایە نان، هەر بابا بوو تفەنگی خاوێنـدەکردەوە، ئەوەی پـێڵاوی دڕا بـوو پینەی دەکرد، ئەوەی شەرواڵێك، شڕە جلکێکی لە خۆی زیاد بوو، دەیدایە ئەویدی، ئیدی...

بۆ ڕۆژی دواتر و ئێوارەکەی چاوەڕێی هەواڵی ئاوهەوا بووین، مەلا چەندێ بڕوای بەتەوی بە وتەکانی لینین هەبوو، لەوەش پتر بڕوای بە رادیۆی ئیسرائیل بوو لە بارەی پێشبینی ئاوهەواوە، هەر بۆیەش هەبوو ناوی لە مەلا نابوو، مەلای ئیسرائیلی، دەیگوت:

ئیسرائیل هەرگیز هەلە ناکات، کە گوتی ڕۆژ بەدەرەوەیە، بەدەرەوەیە، کە گوتیشی بارانە، قسە هەڵناگرێ بارانە.

لە دڵی خۆم دەمگوت: دە ئیسرائیل وا بزانم قەت پیاوەتیت لەگەڵ ئێمە نەکردووە، بەڵام ئەو جارە بیکە و بڵێ:

لەمڕۆوە هەتا حەفت ڕۆژیدی کەس لە ماڵ نەچێتە دەرێ، چونکە باووبۆرانێکی وا بەڕێوەیە، هەزار ساڵیش دەبێت عەرد و ئاسمان کاولبوونی وایان بە خۆیانەوە نەدیتووە.

ئەو داخوازیەشم لە ئیسرائیل هەر بۆ ئەوە بوو کە ئەو ڕۆمانەی دەستم بە خوێندنەوەی کردبوو، تەواوی بکەم، سەرێك لە سەری چیا خرەکەش بدەم و ڕووناکایی هەولێر ببینم، دوو بوتلە عەرەقەکەش بگات.

+ کا وس بن بزانین هەواڵی ئاوهەوا چیە؟

-ها چی گۆت؟

حاجی دەهام پرسیاری کرد، من نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە، شیخی عەنکاوە گۆتی:

دەڵێت: ئامادەی ڕۆیشتن بن، تا دوو ڕۆژیدی ڕۆژ بەدەرەوەیە، پەلە هەور لێرە و لەوێ بە ئاسمانەوە دەبینرێ، بەڵام چ نیە، بارانیان پێنیە.

یەکسەر جاڕی کۆبوونەوەدرا، ئەبوو پراڤدا ڕۆلەکانی دابەش دەکرد، فلان و فلان عایدی هێسترەکان بن، خواردن دابەشکردن لە سەر ئەو دووەیە، ئەوە لە دووی چاوساخ دەڕوات، ئەو چاودێریی چۆنیەتی ڕۆشتنەکە دەکات.... تا هاتە سەر من، چی بۆ من دیار بکات باشە؟ منی ڕاسپارد کە ئاگاداریی زیندانیەکە بم، نەبادا لە ڕێ هەڵبێت... دەمویست بڵێم ئەو ئیشە ناکەم و ئیشێکیدیم پێبسپێرن، شێخی عەنکاوە کە لە تەنیشتم

دانیشتبوو، لە نیازم تێگەیشت، نقورچێکی خێوانـدمێ، ئیـدی منـیش هـیچم نەگوت، دواییش لە بیرم چوو بە شێخ بڵێم بۆچی نەتهێشت.

هێشتا مەلای سبەینێ لە هیچ مەملەکەتێك بانگی نەدابـوو، بەڕێکەوتـین، چاوساخ پیـاوێکی ئەو دەوروبەرە بـوو، هەڵـگەڕێ بە پێرسـدا، داگەڕێ بە پێرسـدا... کـێ دەزانـێ پێـرس چەنـد هەڵـگەڕان و داگەڕانـی تێـدایە! لە هەڵگەڕان و داگەڕان پێرس لە ژیان دەچێت.

بۆچی دنیا رووناك نابێتەوە؟

ئەوە هەر پرسـیاری مـن نەبـوو، رەنـگە پرسـیاری ئەوانیـدیش بووبێـت، بەڵام لەوە دەچوو پرسیارێکی شەرماوی بووبێت و کەس زاخی نەکردبێت بیکات، وەك دیارە کـات لە بەرەبەیانیـدا وەسـتاوە و چ نیـازی نـیە بە لای هەڵاتنـــی رۆژدا جـــوولەیەك بکـــات. هەســـتدەکەم لە جیـــاتی رووەو روونـاکبوونەوە، دنیا بەرە و تاریکی و تاریکتر پێی لێناوە، تا چەنـد سـاتێك لەمەوپێش پیش خۆم روونتر دەدیت.

پێدەچێ پێشبینی ئیسرائیل وە راست گەڕێ و پیری گونـد بە سـەرچیخ چووبێ، هەر ئەو تەمومژە بڕەوێتەوە رۆژێکی خۆش دیارە.

پیاوە سەر راستەکە وای گۆ.

ئیسرائیل لەو بارەیەوە لە تەمەنی خۆی درۆیەکی لە دەو دەرنەچووە.

مەلای ئیسرائیلی ئەو پیاوەی لە سەر قسـەی ئیسـرائیل، ئێمەش لە سـەر قسەی ئەو هاتینە سەفەرێ، وای گۆ.

تەمتومانی زۆر چیا و دۆڵ و دەشتانم دیتووە، تەمتومانی هـیچ زسـتانێك هی هیچ جێگەیەك ناگاتە تەمتومانی پێرسێ، من جـاری یەکەمـمە شـتی وا ببینم، گوێم لێبـوو ئەوانیـدیش هەر ئەوهایـان دەگـوت، تەم چـڕ چـڕ، تەڕ تەڕ، دەستی خۆت نەدەدیت، لە هیچ سەرهاتێك، لە هیچ رۆمانێك لە هـیچ شیعرێك تەمومژی وام نەخوێندبۆوە، نەدیتبوو.

+ پێ هەڵێنن، دەبێت زوو لێرە رەتبین.

باشە ئەو تەمە چڕە هەر بینـایی لە کـار خسـتووە، بیسـتن هێشـتا ئیشـی خۆی دەکات.

ئێرە کوێی پێرسە؟ بۆچی دەبێت زوو لێرە... تۆ بڵێی ئەوان بزانن ئێرە کوێیە؟ بە چی دەناسنەوە، خۆ چاو چاو نابینێ، ئەو کوڕە زیندانیەی وا لە پێشم دەڕوا نایبینم، جاروبار قسەی لەگەڵ دەکەم بۆ ئەوەی گوێم لە دەنگی بێت و دڵنیابم لەوەی هەڵنەهاتووە، بەڵام تۆ بڵێی نیازی هەڵهاتنی لە دڵ بێت، ئاخر لەو کوێربوونەی دنیا کوێ پێدەزانێ، بە کوێ دەکەوێتەوە! بەڵام هێندەی من لێی بزانم دیل نیە لە دنیایێ نیازی هەڵاتنی لە دڵدا نەبێت.

هەوکە خەریکە کەم کەمە تەم دەڕەوێتەوە، ڕووناکایی کەوتە دنیاوە، هەوکە بە ڕوونی کوڕە زیندانیەکەم لێوە دیارە، ئەو ئارپێجیە بێ گوللەیەی وەك چۆن لە ناو بارەگا بە شانیدا دا هەر ئەوهایە، دەڵێی شانگۆڕکێی پێنەکردووە، هێسترەکان، هاوڕێکان، نەرم نەرم ڕێدەکەن، قەت هێندە هەستم بە ئاسوودەیی نەکردووە، وەك چۆن بینایی بۆ کوێرێك دەگەڕێتەوە ئەو هەستەم هەبوو، ئاخر دەزانن لە کەیەوە کوێرین و بە کوێری هەوراز و نشێوی پێرس دەبڕین، بە کوێری چاودێریی زیندانیەکی ترسناك دەکەم، بە کوێری و بە دەم ڕێوە جگەرە دەپێچمەوە، هەوکە کات لە یەکی نیوەڕۆ لای داوە، وا لە گۆڕاییەك کە دەروازەی هەورازەیەکی سەختە دانیشتووین و خەریکی نانخواردنین، عادل ئەو کوڕەی لە کوڕی حەسەن توڕابی دەچوو، خواردن دابەش دەکات، هەر یەکەی دوو نان و چەند پشکە گۆشتێك.

چاوساخ ئاسایی دیار نیە، پێدەچێت ڕێی هەڵە کردبێت، دەبێتە مقۆ مقۆ، پیاوە سەر ڕاستەکە بە تووڕەییەوە بە چاوساخ دەڵێت:

کوڕە هەی وەحشی، لێرە ئاودیو بین، دینارتەیە، دەی دەی، ڕادەستی جاشانمان بکە، باشە.

سەیر بوو ئەو پیاوە لە وەحشیەکە تووڕە نەبوو:

کوڕە برا، دینارتەی چی، دینارتە لێرەیە؟!

چاوساخ کە پیاوێکی زۆر بەتەمەن بوو، هەموو شەڕەکانی پێرسی لە

بیر بوو، شەڕەکانی سەردەمی مەلا مستەفا بارزانی و پێشتریش، لەگەڵ ئەو پیریەشی کەس لەگەڵی دەرنەدەچوو.

+ دە وەڵلاهی ئەو دیوە دینارتەیە، تۆ دەمانفەوتێنی.

- برا، لە سەرەخۆبە، من شەست ساڵ دەبێت چاوساخیی پێشمەرگان دەکەم، سەد جار لە تەمومژم دایە، هەتا ئێستا رێگەم لێ بزرنەبووە، هیچ پێشمەرگەیەکیشم بە فەتارەت نەدایە، بەڵام ئەگەر ئەوجارە رێ بزر بکەم، دیارە پیر بوومە و کەڵکی چاوساخیم نەمایە، ئەتو بەس کەمەك لەسەرخۆبە، با چاوەکی بە دنیادا بگێرم.

پیاوە سەر راستەکە سووربوو لەوەی کە لە دینارتە نزیکین و هەر بزانە جاش و سەرباز دەوری داین، چاوساخەکەش پێی وابوو، ئاقاری دینارتە لێرەوە گەلێك دوورە، ئیدی هەندێك دەیانگوت:

چاوساخ راست دەکات، ئەو چ دەڵێ وا دەکەین.

هەندێکیدی دەیانگوت:

چ راست دەکات! رێی بزرکردووە با بە قسەی نەکەین.

من رەنگە هیدیش وەك من هەبووبن، لەو نێوەندە حەپەسابووم، نەمدەزانی لە کوێی دنیام چ بزانم لە کوێی دینارتەم، ئێستاش نازانم دینارتە لە کوێیە، ئیدی مشتومڕە. پەلە هەورەکانی ئاسمانی پێرس دەڵێی گوێیان لە مشتومڕی ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیەیە، کۆمەڵێك پێشمەرگەی خوا لێگۆڕاو، ئەوەتا پەلە هەورە لێك دوورەکان لێکدی نزیك دەبنەوە، دەڵێی هەواڵی مشتومڕی سەر زەوی لە یەکتر دەپرسن، هەموو پەلە هەورەکانی پێرس بە بایەکی پێش بارانی یەکیان گرت، بەڵام ئێمە هێشتا زۆر لێکدی دوورین و رێگەیەك کۆماننا کاتەوە...

باران دایکرد، بە خوڕ دایکرد، لەگەڵ داکردنی باران ئێمەش کەوتینە رێ، چۆن دژەکان گەیشتنە یەك تێنەگەیشتم، ئەوەشم نەزانی بە رێی کێدا رێمانکرد، هەڵگەڕێ، بە بن لێزمەی باراندا سەرەو هەور هەڵگەڕێ، ئەو هەورازەیە بنی لە دەریایە، ئەو دۆڵەی وا بە جێیدێلین بە پانی و درێژی

ئاوە، بایی دەریایەك ئاوی كۆ كردۆتەوە، ئەو هەورازەیە رەنگە سەری لە هەور بێت، هەر بڕۆ نابڕێتەوە... باران باران، گرم و هۆڕی ترسناكی هەور، هاشوهووشی پڕ لە سامی ئاو و با، سەرما، سەرما، ماندوو، ماندوو... كەوت، بیگرەوە، هەستەوە، ئاگاداربن، پێتان نەڕوا، هێسترەكان، هێسترەكان، هەچە هەچە.... هەرایەكە لە ساتەكانی هەستانی لافاوەكەی نوحیش هەرای وا نەبووە...

پێدەچێت درەنگانی شەو بێت، ئێستا لە سەر چیایەكین هیچ شوێنێكی ئەو دنیایەی لێوە دیار نیە، هەور دەوری داوە، هەور لە باوەشی كردووە، هەور ئەوشەو خۆی دەڕژێنێتە پێرسەوە، باران لە رقی ئیسرائیل ئەوشەو لێناكاتەوە، لەو سەر چیایە هەر یەكەی خۆی داوەتە بن گابەردێكی گەورە، خۆی لە بن درەخت شاردۆتەوە، باران لێناكاتەوە، یەكی تیكە نانێكمان خوارد، ئاگر ئاگر! لە ناو ئاو، لەبەر باران ئاگرێكی گەورە كرایەوە، پێشمەرگە وێنەی ئاگرپەرست دەوری ئاگریان دا، تیشكی ئاگر لێدەداین، دەتگوت مریشكی ئاوەڕووتین، ئەو جۆرە ئاگركردنەوەیەش پەڕجووێكە تەنها لە دەستی پێشمەرگە دێت، پیاوە سەر راستەكە جارێك گۆتی:

پێشمەرگە بە ئاگركردنەوەی ناو بەفر، یان بەر باران دەناسرێتەوە، هەر پێشمەرگەیەك توانای ئەوەی نەبوو، ئەوە پێشمەرگە نیە.

باران هەر دەبارێ، بەڵام هێوری كردۆتەوە، نەرم نەرم دادەكات، گرفتی من جگەرەیە، چایەش گرفتێكی گەورەیە، بەڵام كە گرفتی جگەرە سەرهەڵدەدات، چایە بیردەچێتەوە، كیسەی تووتن ئاوی لێ دەچۆڕێ، لە پڕ كوڕە سۆمەركێشەكەم بیركەوتەوە، خەنی بووم، لە دڵی خۆم گوتم، جگەرەیەكی سۆمەر دەكێشم، لە نزیك منەوە راوەستا بوو، لەو كاتەی لێی نزیككەوتمەوە، كۆڵەپشتەكەی دەكردەوە، دیتم نیو پارچە پاكەتەكەی كە نایلۆنی لێپێچابوو، كردیەوە و پاكەتێكی دەرهێنا، دامنابوو، بە دیتنی من بێ ئەوەی داوای لێبكەم جگەرەیەكم بۆ راگرێ، جگەرەی خۆی داگیرساند

و پێشکەشی منی نەکرد، لە دڵی خۆم گـوتم، رەنـگە هەر ئاگاشـی لە مـن نەبێت کە لە تەنیشتی راوەستاوم، با خۆم داوای لێبکەم.

+ بێ زەحمەت جگەرەیەکم بدێ، تووتنەکەم تەڕ بووە.

- بە خودای یەکەکیدیش داوایکرد نەمدایێ، بە خـۆت دەزانـی، ئەگەر جگەرەم لێ ببڕێ، تووتنم بۆ ناکێشرێ.

نازانم چیدی گۆت، یەکسـەر کشـامەوە، شـەو و رۆژێـك بـوو ئاسـمان تەشتە ئاوی پێدا دەکردم، هێندەی ئەو پەقرەجە ئاوە تێکنەچووم کە هەستم کرد لەو وەلامەوە پێمدا پژا، قەت هێندە لە خۆم تووڕە نەبـوومە، باشـە ئەو پیاوە لەسەر جگەرەیەك بۆ وای لە من کرد؟ چەندی سـەرم دێـنا و دەبـرد سـەرم لە نەدانـی جـگەرەیەك دەرنەدەچـوو، جـگەرەیەك بـۆ ئەو هیچـی تێنەدەچوو، ئاخر بە لای کەمی پێنج پـاکەت لە نـاو کۆڵەپشـتەکەی بـوو، بەلام ئەو جگەرەیە بۆ مـن لەو سـاتانەی داوام لێکـرد، هەمـوو شـت بـوو، هیچ دیاریەك چێژی ئەو جگەرەیەی نیە کە جگەرە لێبڕاوێك لە دەسـتێکی وەردەگرێت، جا ئەو دەستە ناسیار بێ یـان نەناسـراو، نەمـدەزانی ئەو پیـاوە بخەمە جغزی کام پێناسەوە، ئەگەر پێناسەیەك هەبێت بـۆ مـرۆڤ، لە بیـرمە لەبەر خۆمەوە گوتم:

قوڕی پێرس بە سەر ئەو کەسەی لەگەڵ تۆ لێی دەقەومێ.

هێنـدەم داخ لەو وەلامە خـوارد، مانـدوویتی، سـەرما، بـێ چـایی، بـێ جگەرەیـی، رێ بزرکـردن... هـیچ لەوانەم لە بیـر نەمـابوو، دەبـوو قسـەیەك بکەم، خەریك بوو بتەقم، دەبوو بڕیارێك بـدەم، نەدەکـرا وا دەستەوەسـتان بمێنمەوە، تەواوێك بیرمکردەوە، بە دەنگێك رەنگە ئەوەی تەنیشتم بیسـتبێتی وام گۆ:

مەرج بێت بۆ هەتایە واز لە جگەرە بێنم.

دوا وشەی ئەو بڕیارە قورسە، لای من قورسترین بڕیار بـوو، هێشـتا لە سەر زارم بوو، دیتم خاوەن ئەسپی بۆندار پاکەتێکی بۆ راگرتووم:

+ ها، هاوڕێ بەغدا بکێشە، لە سۆمەرەکەی ئەو زۆر خۆشترە.

- سوپاس نامەوێ.

ئاگـام لەوە نەبـوو کە خـاوەن ئەسـپی بۆنـداریش ئاگـای لەو گـرفتەی جگەرەیە هەبوو، زۆرم هەوڵدا پاکەتەکە وەرنەگـرم، پێشـمگوت کە ئیـدی وازم لە جگەرە هێناوە، کەڵکی نەبوو بە تۆپزی خستیە باخەڵمەوە، بـاخەڵی پڕ ئاوی دیار ئاگر، پاکەتەکەم بە نەشکاوی خستە کۆلەپشتەکەمەوە.

چاوساخ وەك شێتان بە دەوری ئاگردا دەهات و دەچوو، پێنەدەچـوو لە هەموو تەمەنی خۆی سیما نـیگەران خـۆی نیشـاندابێت، لە چـۆ کی خـۆی دەدا و پەکو پەکوی بوو، جار جارە لە ئاگر دوور دەکەوتەوە سەیری ئەو لا و ئەولای دەکـرد، وەك بلێـی لەو تـاریکیە رێـی چـوونەوە سـەر رێ ببینێتەوە، دەمدیت دادەنیشت، هەستمدەکرد بۆن بە زەویەوە دەکات، رێـك وەك ئەو هێسترەی لە تاریکیدا لمـووز بە عەردەوە دەنـێ و رێ دەبینێـتەوە، جار و باریش دوو شەقاو تەس دەبێتەوە، بە دەنگێکی زۆر خەفەتاوی:

باوەڕتان هەبێت، ئەوە جاری یەکەممە رێ هەڵە بکەم، بەڵام مەترسن با هەندێك بێمەوە سەرەخۆ، رێ دەبینمەوە و بە سەلامەتیش دەگەینە جێ.

کەس قسەی نەکـرد، مـن تـا ئەو دانپێـدانانە راشـکاوانەی چاوسـاخم لە دەوی خۆیەوە نەبیست، هێندە مەترسـیی بزربـوونەکەم لا گەورە نەبـوو، بە دەست خۆم نەبوو، وام بیردەکردەوە کە ئێمە کۆمەڵێـك منـداڵین و لە دنیـا ونبووین و رەنگە نەبینرێینەوە، ئەوە جاری دووەمم بـوو وا بچـمە قـووڵایی بزربــوونەوە و مەترســیەکان بە چــڕی دەورم بــدەن و چــاوی دیتــنەوە نەمدینێت، جـاری یەکەم هێشـتا نەچووبـوومە قوتابخـانە، لە نـاو قەیسـەریی هەولێر نـازانم تێکەڵبـوون لەگەڵ چ یـاریەکی منـداڵانە، لچکـی عەبـاکەی دایکمی لە دەستم دەرهێنابوو، دزی بووی، ئاگاشم لێنەبوو، قەیسـەری هەر لە چاوی منداڵیی من نا لە هی زۆر لە منداڵانەوە، لەو سـاتانەی دەسـتت لە لچکی عەبا بەر دەبێ، شاری بێ دەرگا و بزربوونە، بیابانی پێنەکەوتنەوەیە، پێرسی ناو تەم و باووبۆرانە، لە بیرمە لەو کۆڵان بۆ ئەو کـۆڵان غارمـدەدا، هەر ژنێکی عەبا بەسەرم دەدیت، کە پڕ پڕ بـوو لە عەبـا بەسـەر دەچـوومە

پێشی، تەماشای دەموچاویم دەکرد، دایکم نەبوو، سەرەتا هەنسکم دەدا، دوای گەڕانێکی زۆر گریانی بە دەنگ، دواتر، گریانی هۆڕ هۆڕ، هەر کەسێکیش بانگمی دەکرد، وەڵامیم نەدەدایەوە، لە کنی رانەدەوەستام، وام دەزانی گەر کەمێك لە گەڕان، لە غاردان بوەستم ناگەمەوە دایکم، ئاخر وام هەستدەکرد ئەوە دایکم لە پێشە من وەك من غاردەدا، لە من خێراتر غاردەدا، دنیای قەیسەریم لە دووی دایکم کرد، نەمدیتەوە، رەنگە سەت کەرەت چووبمەوە سەر ئەو گۆڕە تاقانەیەی کە لە چەقی قەیسەری چوار وەرزەی ساڵ کەسکپۆشە، بەڵام گۆڕی کەسکپۆش بە من چی، نیشانەیەك نیە بۆ دنیا و بە دایك کەوتنەوە، دواتر مام حاجی میرزام بیرکەوتەوە کە دایکم چەند جارێك پێیگوتبووم:

+کورم ئەگەر لێم بزربووی، وەرەوە کن ئەو مام حاجیە من دەتبینمەوە.

- باشە باش، هەموو جارێ وە دەڵێی و بزریش نابم.

بەڵام حاجی میرزا لە کوێ ببینمەوە، لە چاوی من ئەوڕۆ نیوەی قەیسەری کەشیدەیان لە سەرە و هیچیشیان حاجی میرزا نین، ئەنجام لە پڕ قۆڵم کەوتە ناو دەستی حاجی میرزا:

ئەوە لە کوێی تۆ؟ ئەو دایکە قوڕبەسەرەت کوشت.

ئەو بزربوونەش وەك بزربوونی قەیسەری ترسناکە، دەبێت نزا بکەم، لەو پێرسە حاجی میرزایەکی پێرسیمان بۆ پەیدا بێت.

باران لێناکاتەوە، ئاسمان دەڵێی کون بووە، لە رێی ئەو کونەی ئاسمانەوە دەریا دەڕژێتە پێرسەوە، پێدەچێت درەنگانی شەو بێت، دوورنیە هێندەی نەمابێت بۆ بەرەبەیان، بە دەوری ئاگردا زنجیرەمان بەستووە... جگەرە جگەرە هەموو ئازای گیانم دەڵێ جگەرە، تۆ وەرە خەریکە شێت بم بۆ جگەرەیەك، پاکەتیش وا لە ناو کۆڵەپشتمە، کەچی جگەرەیەك داناگیرسێنم، ئای لەو لاملیە، وا بڕوا قسەی خۆم دەگەیەنمە جێ و ئیدی جگەرە خۆی بە لێوی منەوە نابینێ... دیتم کوڕە زیندانیەکە لە گڕ جگەرە

پێچـانەوەیە، بە پیـاوەتیەکەی خـاوەن ئەسـپی بۆنـدار پیـاوەتیەکم کـرد، جگەرەیەکم دایێ، لە کاتی هەڵپچڕینی پاکەت زۆری نەمابوو، جگەرەیەك بۆ خۆشم داگیرسێنم، دامنەگیرساند، پاکەتەکەم خستە کۆڵەپشتەوە و بە زیندانیەکەم گوت:

هەرکاتێك جگەرەت ویست، شەرم مەکە داوابکە.

دنیا رووناکبۆتەوە، باران نم نم دەبارێ، بنیشی تاریکە، هی ئەوە نیە خۆشی بکـات، لەو بەرزاییە بەرزەوە نـازانم بەرەو کـوێ شـۆڕدەبینەوە، رەنگە کەس نەزانێ بنی ئەو شۆڕبوونەوەیە لە کوێیە، باران بـاران، سـەرما، سەرما، هەر لێژایی و لێژبـوونەوە، پیـاوە سەرراستەکە کە لە نزیـك مەلای ئیسرائیلی دەڕۆیشت گوێم لێبوو پێیگوت:

+ مامۆسـتا، هەر بە قسـەی خـۆت کـرد، بە قسـەی ئەو ئیسـرائیلە وەحشـیەت کـرد، گوێـت لە پیـرەکە رانەگـرت، ئـاخر ئیسـرائیل چ لە ئاوهەوای پێرس دەزانێ؟ بزانە چیمان بە سـەرهات! ئـاخر کەس خێری لە ئیسرائیل دیتووە؟

- بـابە، ئەبـوو ... ، خـۆت هێنـدە شـێلوو مەکە، کەس نـیە لە دنیـایێ سـەرچیخ نەچێـت، وەکـی منـیش تێبگەم ئەوە جـاری یەکەمە لە بـارەی ئاوهەواوە ئیسرائیل سەرچیخ بڕوات..

جگەرەیەکیدیشـم دایە دیـلە کـاراتیەکە، پێـدەچێت پێـرس زۆر شـت بەرەواژ بکـاتەوە، بەرەواژ نیشـانبدات، یەك لەو شـتانە ئەوەتە سـەرم وەك فرفرۆکە بۆ جگەرەیەك بە ناو دووکەڵی جـگەرەی دیـلەکە دەسـووڕێتەوە، کەچی ئامادەش نیم مژێك لە جگەرە بدەم.

نازانم چ دەمە، نیـوەڕۆیە، عەسـرە! ئەگەر بە گـوێرەی کـاتژمێری گەدە بێت، زۆر درەنگە رەنگە چوار ژەمیشمان رەت دابێت، گەیشتووینەتە بنـی دۆڵێ، سێ چوار خانووی قوڕی جەزیری دیار کەوتن، تۆ بڵێی گوند بێت و ئاوەدان بێت؟ ئاسمان کەمێك رووناکە، یان زۆر تاریك نـیە، بە تـاریکی یـا بە روونـاکی لە بـارینی خـۆی ناکەوێـت، دوور لە خانووەکـان لە بـن

کۆمەڵە درەختێك کە لە ئێمە ئاوەڕووتترن، راوەستاوین، رەنگە لە چاوەڕێی کەسێك، هەواڵێکدا بین، یەك دووانێك بەرەو ئەوێ چوون، ئێرە دەڤەری سوورچیایەتیە، سوورچیایەتی ئەوبەری زێ، هاتنەوە، پیاوێکیشیان لەگەڵە، ئەها دیسان فسکەفسکە، رەنگە خەریکی پلانڕێژیی پەڕینەوە بن، بەو زستانە پەڕینەوە لە زێی بادینان تا خودا دەڵێ بەسە سەختە، بە قسەی پیرێکی ئاراسدیتە لە پەڕینەوەی ئاراسیش سەخترە.

لە سەر زێ جێگەیەك هەیە قەندیلی دەڵێنێ، لەوێ کەڵەکوانێك هەیە، ئیشی پێشمەرگە پەڕینەوەیە، کەم پێشمەرگە هەیە سۆران و بادینانی کردبێ و چارەنووسی خۆی نەدابێتە دەستی ئەو کەڵەکوانە، من جگە لەم جارە دوو کەرەتیدی ئیشم پێی کەوتووە، کەڵەکوان خاوەن کەڵەکێکە دەڵێی پەرجووە، بڕۆ سەر لێواری زێ، سواربە، چاو بنووقێنە، بیکەوە، لە لێوارەکەی ئەوبەری دابەزە، ئەو فسکەفسکە هەبێ نەبێ هەر پەیوەندی بە کەڵەکوانەوە هەیە، سەر و تیکە نانێکمان خوارد، چ نەبوو، هەر تامی زاری خۆش کرد.

عەسرانێکی درەنگە، ئاسمان رژ رژ دەڕژێ، دەڵێی دەیەوێ رادیۆکەی ئیسرائیل رووڕەشی دنیا و پەسلان بکات، لێناکاتەوە و لێناکاتەوە، بە کوێدا لێژبووینەوە وا بەوێدا سەردەکەوینەوە، بەو باوبۆرانە گەڕانەوە بە رێی خۆتدا چ وێرانەییەکی گیانیە.

کەڵەکوان لێیدراوە، کەڵەك شکاوە، رێگە ئاشکرابووە، بە جاش و سەرباز تەنراوە.

هەر پێشمەرگەیە و لە بەر خۆیەوە و بە شێوازی خۆی ئەوقسانە دەڵێتەوە.

کێ ئەو کارەی کرد؟

ئەو پرسیارە چەند جارێ بە دەنگی نزم و بەرز لە زاری من هاتە دەرێ، کەس نەبوو وەڵامێك بداتەوە.

سەرکەوە، سەرکەوە، هەر کاتێك زۆر حەزم دەچووە جگەرە،

جگەرەیەکم دەدایە کوڕە دیلەکە و دەمگوت:
دووکەڵەکەی بە فیڕۆمەدە، رووەو من هەڵیدە.
مانـدوویتیی حەفـت رۆژەڕێ ناگـاتە مانـدوویتیی حەفـت دەمژمێـری گەڕانەوە بە ڕێی خۆتدا، چ لەوە گیان پڕووکێنتر نیە، بەو تەڕوتووشـیە ئەو هەموو رێیە ببڕی، ئەوجا لۆژە لۆژ بە رێی خۆتدا بگەڕێیتەوە! سـات سـاتی تووڕەبـوونە، هـی جوونـدان و دنیـا بە نەفرەتکـردنە، هەنـکە بە چیـای (کۆرس)دا هەڵدەگەڕێین کە لەگەڵ پێرس شانیان دەگاتەوە یەك، پێشتر لە بەهـاری سـاڵێکدا رێـم بەو رێـیە کەوتـووە، لە بیـرمە ئەو کـات چێـژم لە سەرکەوتنی ئەو چیایە وەرگرت، ئێستاش...
ئاسمان هەر لە رژانە، بە سـەر گەڕانەوەمانـدا، بە سـە هەشبەسـەریماندا دەڕژێ، خلیسك لە دوای خلیسـك دەبەم، لە سـەری هـاتن خلیسـکێ چیە نەمبرد، بەڵام سـەری گەڕانەوە پـڕە لە خلیسـك و بەربـوونەوە، سـەرێکیان دەستی کـوڕە دیـلەکە نەبـا خـوا دەیزانـی لە کـوێی دۆڵـی دەریـایی خـۆم دەدیتەوە، کاتێ گرتمیەوە هەستم بە بەهێزیی ئەو کوڕە کرد، لێشی ترسام، لەوەی ئەگەر مەبەسـتی بێـت دەتوانێـت پەلامـار بـدات و دەسـتی بـاش بوەشێنێ.
ئەو هەورازە هەورازی پـێ رۆیشـتن و هـۆش رۆیشـتنە، هێسـترەکان، ئەسپەکە لە هەمووماه هێمنترن، نە خلیسك دەبەن، نە تووڕە دەبن. جاروبار ئاوڕێـك لە حـاجی دەهـام دەدەمەوە، ئێسـتا لە دواوەی مـن دەڕوا، هێسـترێکمان نێـوانە، هەسـتمکرد ئەویـش تـووڕەیە، بەڵام زۆر حەکیمـانە تـووڕەییەکەی دەشـارێتەوە، خەریـکە تاریـك دادێـت، هەورازی کـووڕ کۆتایی نایە، باران کەم کەم دەبارێ، جگەرەیەکیدیم دایە کـوڕە دیـلەکە، ئـۆقرەم نەمـا جگەرەیەکـم بە لێـوەوەیە، خەریـکە دایگیرسـێنم، پەشـیمان بوومەوە، خستمەوە پاکەتەکە، ئای لەو بڕیارە قورسەی دام، چ شێت بووم، ئاخر من پیاوی بڕیاری وام!
درەنگانی شەوە، لە دۆڵێکین من قەت دۆڵی وا بە سامم نەدیتـووە، هەر

بۆ ئەوە باشە فیلمی ترسناکی لێ دەربێنی، یەك هاش و هووشە، گرم و هۆڕە، هەراو هۆریایە شەیتان برادەرەکانی خۆی ناناسێتەوە، باران باران.

- باشترە چیدی نەڕۆین، دەفەوتێین.

- دابنیشین هەر فەوتاوین.

- ڕۆیشتن باشترە.

پیری چاوساخ هاتە قسە:

+ بە دەستی چەپ لە سەرەوە دوو ئەشکەوت هەن، ئەگەر بگەینێ باشە.

- ئەگەر زۆر لە سەرەوە نیە با هەڵگەڕێین.

هەڵگەڕێ، لە تاریکی هەڵگەڕێ، بە بن ئاو و بە سەر ئاودا هەڵگەڕێ، وڵاخەکانیان بەجێهێشت، گەیشتین، قسەی چاوساخ بوو، دوو ئەشکەوت کە بە تەنیشت یەکەوە بوون، باوەشی گەرمیان بۆمان کردەوە، باوەش گەرم نەبوو، بەڵام هێندەی بڵێی یەکو دوو گەرم بۆوە، ئاگر کرایەوە، تێنەگەیشتم ئەو هەموو کۆلکەدارە لە کوێوە هات، خۆمان لەبەر ئاگر ڕاخست، هەڵمێکی وامان لێ بەرز دەبۆوە، هیچ مەنجەڵە شیوێك، مەنجەڵە ساوارێ هەڵمی وای لێ بەرز نەبۆتەوە، ئای بۆ مەنجەڵێك شیو! هەر شیوێك بێت، من و کوڕە دیلەکە لە تەنیشت یەك هەڵتووتکابووین، نەموێرا دەست بۆ پاکەتەکەم ببەم و جگەرەیەکی بدەمێ، دڵنیا بووم بە خۆم نەدەوەستام و دامدەگیرساند...

دەبێت خەوتبم، چونکە دیتم دیلەکە رایکرد، بە بەرچاومەوە رایکرد و قسەشم نەکرد، کە ڕاپەڕیم دەبینم ئەو بەستەزمانە لە سەر تەنیشت خەوی لێکەوتووە و لە دەموچاویشی دیار بوو خەون دەبینێ، نەمزانی ئەویش خەونی بە منەوە دیت یان نا، تەماشادەکەم هەندێك خەوتوون، هەیە پیاسە دەکات، هەیە مژی وا لە جگەرە دەدا دەڵێی سێ شەو و ڕۆژە لەبەر بارانە و دەرفەتی پێچانەوەی جگەرەیەکی نەبووە، هەندێك باسی دنیایان دەکرد، قسە گەرم بوو، لەو قسانە ئەوەی لە بیرمە، باسی کەڵەکەوان بوو دەیانگوت:

ئا ئا پێشمەرگە بوو، کوو ناوت نەبیستووە، ناودارە، ئەو سەگبابە خۆی رادەستی حکومەت کردۆتەوە، چووە هەموو لەشی کەڵەکەوانی هەنجن هەنجن کردووە، رێگاکەی ئاشکرا کردووە، ئەدی! لۆیە ئێستا ئەو جێگەیەی پەڕینەوە هەمووی جاش و سەربازە. کوڕە دەڵێن چەند پێشمەرگەیەکیشی بە سەربڕین سەر بڕیوە و سەرەکانی دەستەو دیاری بۆ دایەرەی ئەمن بردووە.

بەڵام دواتر هەواڵەکە بە شێوەیەکیدی گەڕا:

ئەو پێشمەرگەیەی لە کەڵەکوانی داوە، هەر پێشمەرگەیە و خۆی رادەستنەکردۆتەوە و هیچ پەیوەندیەکیشی لەگەڵ ئەمن و مەمن نیە، هۆی لێدانەکەش گەڕایەوە بۆ کەڵەکەوان خۆی، ئەو پیاوە جیاوازی کردووە لە نێوان پێشمەرگان، بەوەی بۆ پەڕینەوەی هەندێ لایەن سەری پێوە نەبووە، بۆ هەندێکیش خۆی گنخاندووە، خۆی نەخۆش ئێخستووە و نەیویستووە بیانپەڕێنێتەوە.

جگەرەیەکم لە سەر سینگی کوڕە دیلەکە دانا، گوتم رەنگە من بخەوم ئەو کە هەستا، با بۆ خۆی بیکێشێ و بزانێت پاسەوانێکی چەند بە خەمی هەیە.

هێندەم لە خۆم هەڵدا، پرووشکە ئاگرێك بە ئاگای هێنام، دیلەکەش هەستا بوو، جگەرەکەی بە لێوەوە بوو داینەگیرساندبوو، دەیویست لە ئاگرەکە نزیك بێتەوە، سەری بۆ ئاگرەکە شۆڕکردەوە، بێ ئەوەی دەست بە کاربێنێ ،جگەرەکەی داگیرساند، ئەو جوولانەوەیە لە چاوی من نائاسایی کەوتەوە، لە دڵی خۆم گوتم باشە بۆچی دەستەکانی...

تاهوو! چ بینم باشە! هەردوو دەستی لە پشتەوە بە پشتێنەکەی خۆی توند شەتەکدراوە، دیارە ئەوەی وای لێکردبوو، دەبێت لە من بە هۆشتر بووبێت، چونکە وەك دەڵێن زیندانی بە تایبەتیش یەکێك تۆمەتێکی وا گەورەی لە پاڵ بێت جێگەی متمانە نیە، ئیدی دەستەکانیم کردەوە، لە خەونەکەشم ترسام بۆیە بە زیندانیە لە خەو راکردووەکەم گوت:

+ئاگاداربە، بیر لە هەڵاتن نەکەیتەوە، تازە لە خەومدا تۆ هەڵاتی، منیش نەمکردە نامەردی سی گوللەم پێوەنای، بیستونۆیانت پێکەوت.

- من و هەڵاتن!

بێگومان ترس وای لێمکرد، درۆ بە نیوەی خەونەکەمەوە بکەم، ئێ خۆ ناڵێم تۆ هەڵاتی و منیش زەق زەق تەماشای هەڵاتنەکەتم دەکرد!

بەرەبەیانە، ئاسمان ساماڵێکە دەڵێی ساڵێکە هەوری بە خۆیەوە نەدیتووە، دنیا روون روونە بە چاویلکەی شەیتانیش بگەڕێی گەردێك نابینیەوە، زەوی هێندە تێراوە بەشی ساڵێك ئاوی خواردۆتەوە، جۆگەلەکان نەرم نەرم لە رووباری گەورەی دۆڵ دەکەنەوە، جگە لە دەنگی رووبار دنیا چ دەنگێکی تێدا نیە... بیستم وڵاخەکان هەر لە جێگەی خۆیانن، لەبەر خۆمەوە گوتم:

زۆر جار چوارپێیەکان لە دوو پێیەکان میهرەبانترن.

پێش نیوەڕۆیە، وا دەچینە گوندێکی چەند ماڵە، گوند تەڕ تەڕ، لە سەرشۆرکی دنیاوە بە دامێنی پێرسەوە دەڵێی منداڵێکی رووتە بە باوەشی دایکیەوە، من و کوڕە زیندانیەکە و یەکیدی لاماندایە ماڵێك دوو ژن زۆر رووخۆشانە بەخێرهاتنیان کردین، کەم جار وا رێك دەکەوێت، ئەو گوندیانەی کە پێشمەرگەیان زۆر بە سەر زگەوەیە وا لە دڵەوە خۆشهاتن لە پێشمەرگە بکەن، دوای چاکوچۆنی ژنە گەنجەکە کە هەر سی ساڵێك دەبوو رووی لە من کرد:

+ تو خەلکی هەولێریت، نە ؟

- بە چیت زانی؟

+ بە (لۆ)... پێلاڤی هەولێریێ سەر سەریێ من، سەر چاڤێ من، خودێ هەتا مرنێ چ جارا مێراتیێ هەڤلێریا ژ بیر ناکەم.

ئەو ژنانە لە بارزانیەکانی قوشتەپە بوون، دوای ئەنفالکردنی پیاوەکانیان بە ماوەیەك خۆیان گەیاندبووە ئەوێ، کاتێ زانی هەولێریم زیاد لە پێویست خزمەتی کردم، وەك ئەوەی من چاکەیم لەگەڵ کردبێت،

دەیویست هەموو ئەو چاکەیەم بداتەوە کە هەولێریەکان لەگەڵ ئەویان کردبوو، ئەو ژنە بارزانیە یەك تەشتە نان و مەنجەڵێك ماست و قۆریەکی گەورەی چای لە پێش دانایین، بە قسە خۆشەکانی ئەو دوو ژنە بە خواردنە خۆشەکانی ئەو دوو ژنە هەموو ماندوویتی و برسێتی و سەرماوسۆلەی پێرسمان لە بیرچۆوە، لێ جگەرەیان لە بیرم نەبردەوە، جگەرەیەك بۆ کوڕە زیندانیەکە.

عەسرانێکی درەنگ وا دەگەینەوە بارەگا پێرسیەکە، پەلە هەورێك بە ئاسمانەوە نیە، لە رێ تووشی پیاوە سەیدانیەکە بووین، رووی کردە پیاوە سەرڕاستەکە:

+ نەمگوت، رۆژەکەی هی چوونە دەرێ نیە.

- خودا چاوی ئیسرائیل کوێر بکات، ئەو گوتی بڕۆن.

خەو خەو سێ شەو و رۆژ خەو، تەنها لە کاتی ژەمەکان و بۆ ئیشکگریی بە ئاگا دەهاتم دەنا هەر خەو، خەوی بێ خەون، رەنگە ئەو هەموو خەوە مردوویە لە خەفەتی جگەرە بووبێت، گەرماویشیان گەرمکرد، من خەو بەری نەدام و خۆم نەشووشت. نەمدەوێرا توخنی کتێب بکەومەوە، خوێندنەوە حەزی جگەرەی پتر دەکرد، چاوەڕێی گەیشتنی عەرەق بووم، ئێستا نا دەمێکیدی دەگات، خولیای سەری چیا هەر لە سەرمە، ئەو چیایەی دارا چاوشین دەیگۆت رووناکایی هەولێری لێوە دیارە.

دەمەو نیوەڕۆ بوو، باران نم نم دەباری، پیاوە سەرڕاستەکە بە هەڵەداوان گەیشتەوە بارەگا، لەگەڵ یەك دووانێکیدی چووبووە داران، زیندانیەکەشیان بردبوو، تووڕەیی لێدەباری، جونی دەدا، هاواری کرد:

+ هەر یەکەی بە لایەکدا، زوو، زوو، نابێت دەربچێت، دەی وەحشینە ئەو وەحشیە خۆی لێمان شاردەوە، هەڵات.

- ترحێو، تازە چۆن دەگیرێتەوە!

هەتا دەو زێ چوون، ئەو ئاقارەیان بست بە بست پشکنی، زیندانیەکە

نەبوو، بووە بەردی بن گۆمێ، خەونەکەم بیر کەوتەوە، ئەو خەونەی بە بەر چاومەوە زیندانیەکە هەڵات، وا بزانم لەو بارەگایە تەنها من بەو هەڵاتنە دڵخۆش بووم، ئۆخەی! زیندانیمان لە کۆڵ بۆوە.

هەر ئەو رۆژە بۆ شەوەکەی، میر یان ئەو پیاوەی لە میری رەواندز دەچوو، بە دوویدا ناردم، چوومە ژوورەکەیان ئەبوو پراڤداش لەگەڵ وی بوو، ژوورێکی خاوێن، رووناك، بنمیچ و دیوارەکانی بە نایلۆنی گوڵگوڵی جوان نایلۆنرێژ کرابوون، عەردەکە بەتانیرێژ کرابوو، لامپایەکی گەش بە دیوارەوە، سۆبە دارینەکە داگیرسابوو، مێزێکی نەوی پڕی سەری کتێب و کاخەز و قەڵەم، ئەبوو پراڤدا کتێبێکی دەمەونخوونی لە پێش بوو، من نەمدەزانی بۆچی بانگمیان کردووە، گوتم رەنگە لە بارەی زیندانیەکەوە بزانە چ قسەیەکیان هەیە، دوای پێشەکیەکی درێژ، کە تێنەگەیشتم باسی چی کرد، گوتی:

تازە هەتا بەهارێ، رەنگە لێرە بمێنینەوە، حەزدەکەم تۆش لەگەڵ ئەو یەك دوو برادەرە بچنە بارەگای کافێ، پێش ئەوەی بەرەو سۆران شۆڕبینەوە وا دەکەم تۆ بگەیتەوە ئێرە.

ئیدی بەیانیەکەی بێ ئەوەی عەرەقی کوڕە ئەسپ بۆندارەکە بگات، بێ ئەوەی سەرێك لە سەری چیا بدەم و گلۆپەکانی قەراتێ ببینم، بێ ئەوەی دونی ئارام تەواو بکەم،ماڵئاواییم لە بارەگا زستانیەکەی پێرس کرد، پێش ماڵاوایی دەبێ وێنەیەك لە ئاهەنگی سەری ساڵ بدەم، ئەوشەو ساڵ نوێدەبێتەوە، نادیە و تانیا و چەند پێشمەرگەیەکیدی سووربوون لە سەر گێڕانی سووکە ئاهەنگێ، هەندێك خواردنیان ئامادەکرد، مۆمیان داگیرساند، قسەکرا، مەلا گوتی:

هیواخوازین، ساڵی دادێ لە هەولێر و بەغدا ئاهەنگی سەری ساڵ بگێڕین.

گۆرانی گوترا، نادیە و تانیاش گۆرانیان گوت، ئەبوو پراڤدا و ملازم ریاز شتێکیان لە مۆسکۆ گێڕایەوە، شیعر خوێندرایەوە، عادل شیعری

سەعدی یوسفی خوێندەوە، هەر ئەویش سەرپەرشتی ئاهەنگەکەی دەکرد،نازانم کێ بوو ئەبوو گاتعی خوێندەوە، من شیعرێکی خۆم و شیعرێکی رەفیق سابیرم خوێندەوە، ئەوەی دەڵێ:

لە ناو زیلدا منداڵێك بۆ پێشمەرگایەتی لە دایكدەبێ.

ئەوە یەکەم ئاهەنگی سەری ساڵ بوو لە پێشمەرگایەتیم ببینم، ئێ، بەفر و بەفر رۆیشتم، ئەو رێیە دووره بەفریەش پڕه لە پرووشە چیرۆکان، هەر لەو رێیەش جگەرەم هەڵگرتەوە، هێشتا زۆری مابوو بۆ رێبەندان، گەیشتمە ژووره بەفرینیەکەی هەواری کافێی بن گاره.

## هۆدەیێ
## لە هەوارە بەفرینیەکەی کافێ

کـافێ ئەو هەوارە بـوو، بە تەماشـاکردنی گـارە نەبـا، نەمدەناسـیەوە، ئێستاش بۆ دیتنەوەی کـافێ هەر گـارە نیشـانەیە، نیشـانەیەك نە بەفـر بـزری دەکات، نە دووکەڵی شەڕ، نە پیریش، هەنگینـێ لەوێ دوو کـافێ هەبـوو، کافێی گوند، کافێی بارەگا، گوند پڕ بوو لە ژن و منداڵ و پیاو، بارەگاش پڕپڕ لە پیاو، چەند ژنێکیش.

نێوان ئەو دوو کـافێیە چەمێکـی بچـووك و بەرزاییەکـی نـزم، ئەگەر لە سـەر ئەو بەرزایـیەوە بە سـەر کـافێی ژن و منداڵـدا تەماشـای ئەو بەرت بکردایە، گارە دەهاتە ناو چاوت، گارەی زستانان جیـا بـوو لە هەمـوو ئەو چیایانەی لە نزیك و دوورەوە نیازی تەماشاکردنی گارەیان هەبوو، پیرێکی خەڵکی وێ دەڤەرێ زۆر جار دەیگۆت:

چیا نیە لە دنیایێ، هێندەی گارە بەفری لێبکەوێ.

ئەو گۆتەیە تا چەنـد ناڕاسـت بـوو، تـا چەنـد ناڕاسـتە، هێنـدە بە لایـدا مەچۆ، ئەوەی گرنگ بـوو، مـن بـاوەڕم پێیهەبـوو، هەر کەسـێك زسـتانێك بەزۆری زۆردارەکـی لە دەڤەری گـارە بهێڵـدرێتەوە، یـان لە ناچـاریەوە ل وێرێ بمێنێتەوە، بـاوەڕ بەوە دێنێـت کە زۆرتـرین بەفـری دنیـا بەر گـارە و دەڤەری گارە دەکەوێـت، زسـتانێکی تەڕ و تـووش بەسـە بـۆ ئەوەی بـایی تەمەنێك بەفر لە بیناییتدا دابکەیت.

زیندانیە بەتەمەنەکەش کە نەمدەزانی چ جۆرە زیندانیەکە، بە دەنگێکـی نێرانەی نووساوەوە دەیگوت:

تێیکە، چاوەکەم باشی تێکە، چیاو دۆلان تەخت کە.

ئەو زستانەی من قسەی لێوە دەکەم، زستانی پێش ئەو هاوینە بوو کە ئاگری ئەنفال لە هەموو لایەکەوە هەڵیکرد و کافێشی وەك هەموو جوانیەکانی گەرمیان و کوێستان بە هەموو جوانیەکانیەوە سووتاند، زستانێکی زگپڕ بوو، رێك ئەو زستانە بوو، هەڵەبجەی لە زگدا هەڵگرتبوو.

لە هۆڵە بزنێك بووین، بەوە دەزانم هی بزن بوو نەك پشتێری مانگا و بەرزە چوونکە زۆر نەوی بوو، ئەبوو حوسێن دەیگۆت:

ئەو کەسانەی ئەم هۆدەیان درووستکردووە، هەموویان کورتە بالا بوونە، پێیان وابووە کەس لە خۆیان درێژتر نیە و درێژترین پیاو لە دنیایێ ئەبوو خالیدە.

وابوو، لەو هۆدە بەس ئەبوو خالید سەری بە کاریتە نەدەکەوت، من کە بەژنێکی ئاساییم هەیە، دەبوو لە راستی کاریتە سەرم نەوی بکەم، بەڵام سەرم بە شەقرە نەدەکەوت، هەرچی ئەبوو حوسێنە دەبوو لە سەر چۆك بڕوا، ئەو کوڕە بەسراییە بەغدانشینە لەمێژ نەبوو هاتبوو، بەژنی درێژ درێژ زۆر درێژ، رەنگە درێژترین پیاو بوو بێت لە بەسرە، ئەبوو خالید گوتەنی:

تەماشا تەماشا هەر دەڵێی دار خورمایە.

ئەو ژوورە دوور و درێژە نەویە پڕ بوو لە پێشمەرگەی بالا بەرز و کورتە بالا، کورترینیان ئەبوو خالیدی بەرگدروو، هەر لە ناو ژوورەکە بە نایلۆن و بەتانی ژوورێکی بۆ خۆی جیاکردبۆوە و شەو و رۆژ خەریکی دوورینی کورتەك و شەرواڵ بوو بۆ پێشمەرگە، ئەو بەرگدرووە کوردی بەغدایی بوو، بالا بەرزترینیان ئەبوو حوسێنی شاعیر، بەردەوام شیعری دەنووسی.

ژوورەکە لە ناو ژوورەکانیدی بە ژووری ئەبوو خالید دەناسرایەوە، چونکە لە پێش دەرگاوە، لە دوورەوە، دەنگی مەکینەی دروومانی ئەبوو خالید دەهات.

بیهێنە بەر چاوی خۆت، جێگاکەی ئەبوو حوسێن بەرانبەر دەرگایە و

پێی دەگاتە سەر ئەو دەرگایەی کە لە ژوورە نایلۆنیەکەی ئەبوو خالید کراوەتەوە، منیش بە تەنیشت ئەبوو حوسێنەوە، نێوانمان تەپلەی دارماڵ لە قونکە جگەرە و شووشەی گەورەی پڕ لە چا، سۆبە دارینەکەش هێندە دوور نیە لە من، ئەو سۆبەی بە یەك زستان داروباری چیایەیەکی کردە خۆڵەمێش، شەو و رۆژ بێ پسانەوە، لیژنە لیژنە دارمان لە بن بەفری دەردەهینا و باوەش باوەش گزرە مان دەخستە سۆبەوە و بە نێلە نێل بە گژ بەفر ە بەستەڵەکدا دەچۆوە، ئەو پارچە جێیەی کە ئەبوو خالید بە خێرا خۆی هێشتبوویەوە و بەگەڵ ژوورەکەی خۆی نەدابوو، جێگەی پیاوێك بوو زۆر لە یاسر عەرەفاتی دەکرد، ناوەکەشی هەر ئەبوو عەمارە، رەنگە هەر لەبەر ئەویش ئەو ناوەی لە خۆی نابێت، دەتگوت کۆپیی سەر یەکترن، ئەگەر دەست مۆساد بکەوتایە، یەکسەر ئیسرائیل دەسگیرکردنی یاسر عەرەفاتی رادەگەیاند، ئەو پیاوە هەمیشە یەك دوو قوتووی شیری نیدۆ لە کن سەری بوو، بن بالیفەکەشی کە نازانم لە کوێی پەیدا دەکرد، پسکویتی لێ نەدەبڕا.

ئەو ژوورە بەو زستانە تووشە، ئەو ژوورە پڕ لە گێرمە و کێشە، منی لە نێوان ئاگر و شاعیرێك حەواندەوە، ژوور جیابوو لە هەموو ژوورەکانیدی، لە هۆدەکەی ئێمە بانگی هەر نەتەوەیەك و ئاینێکت بکردایە، کەسێك وەڵامی هەر دەدایتەوە، کورد هەبوو، عەرەب هەبوو، ئاشووری، کلدان، تورکمان، ئەرمەن، سابیئی، موسڵمان، مەسیحی، ئێزدی.... هەرچیت بویستایە هەبوو، لەم ژوورە ساپیتە نەویە زستانیە بە هەموو زمانێك قسە دەکرا، جیا لە هەموو ژوورەکانیدی لەو ژوورەدا زمانی عەرەبی زمانی فەرمی بوو، ئەگەر قسە بێتە سەر ئایین نە ئیسلام و نە هیچ ئاینێکیدی ئاینی فەرمیی ژوورەکەمان نەبوو، بە شاراوەیی نازانم چۆن بوو، بەڵام لە روو ((بێ ئایینی)) ئایینی بەرچاوان بوو.

ئەبوو حوسێن بۆیە بەر دەرگای هەڵبژاردبوو، هەتا زۆر سەر لە کاریتە نەدا، لەگەڵ ئەوەش رۆژ نەبوو چەند جارێك زرمەی لێوە هەڵنەستێنێ، هەر

جارێکیش سەری بە کاریتە دەکەوت، هەزار و یەك جوونی بۆ عەرد و ئاسمان دەنارد، قاسم کە لەو لاوە لە چاوەکەی ئەو لاوە گوێی لە جوونەکانی ئەبوو حوسێن دەبوو دەیگوت:

ئەوە شیعر دەخوێنێتەوە یان قورئان دەخوێنێ؟

ناهەقی نەبوو، سەر لە کاریتە دان، ئەبوو حوسێنیان فێرە جوێنی وا کردبوو، لە ناو عەرەبدا جوێنی وا نەبووە، لە ناو هەر رستەیەکی جوێناوی، وشەی (اللە) هەبوو، جوونەکان هەمووی سەروادار بوون، قاسم بە هەمووی سێ رستەی عەرەبی فێر ببوو، ئەویش بە شێوەیەك گۆی دەکردن هیچ عەرەبێك بە عەرەبی وڵاتی ئەمازیغیشەوە تێنەدەگەیشتن، ئەبوو حوسێن جگە لە گرفتی کاریتە گرفتی ئەبوو عەماریشی هەبوو، ئاخر رێی هاتوچۆی بە سەر سینگی ئەبوو حوسێندایە، ئەگەر لە چوونە دەرەوەش چ نەقەومابا ئەوا لە هاتنە ژوورەوەدا پێی ئەبوو عەمار بە جێیەکی ئەبوو حوسێن دەکەوت، زۆر جار هاواری لێ بەرزدەبۆوە، لەگەڵ هەر هاوارێکیش نزایەکی لە ئەبوو خالید دەکردو دەیگوت:

ئەگەر ئەو قوژبنەشت بە گەڵ ژوورەکەی خۆت بدایە، من بۆ تووشی ئەو پێیە تیژانەی ئەبوو عەمار دەبووم.

جارێك گوێم لێبوو بە ئەبوو عەماری دەگوت:

بەس پێ لە لووت و گونم مەنێ ئەوانیدی بۆ خۆت.

قاسم ئەگەر دنیاش نغرۆ با، ئاگای لە هێسترەکان نەدەبڕا، زۆر لە خەمیان بوو، پەنجە پەنجە لەشی ئەو هێسترانەی دەپشکنی، نەبادا جێیەکیان بریندار بێت، خۆی برسی بکردایە نەیدەهێشت ئەو هێسترانە برسی بن، نازانم کێ بوو بە قاسمی دەگوت:

تۆ دەبوو لە رێکخراوێکی ئاژەڵپارێزی ئیشت کردایە، نەك دژی کۆماری ئیسلامی چەکت هەڵگرتایە.

زیندانیە بە تەمەندا چووەکە بە قاسمی هێسترپارێزی دەگوت:

هاورێ، هێندەی لە خەمی هێسترەکانی نیو هێندە لە خەمی خۆت

بایت، وات بەسەر نەدەهات، تۆ خۆت دیوە، چیت لێهاتووە، دەڵێی لە سەر شارە مێرووستانیان بەستوویتەوە!

وا بوو، قاسم تا بڵێی لەڕ و لاواز بـوو، کەم کەس هەبـوو هێنـدەی وی ماندوو.

شاعیرە بەسراییە یان بەغـداییەکە بەردەوام شـیعری دەنووسـی، رکەی لەگەڵ بەفر دەکـرد، بەفـر هەر تێیـدەکرد و نەیدەهێشـت عەرد رەشـبێتەوە، هەر تێیدەکرد و دنیای سپی و سـپیتر دەکـرد، ئەویـش پەڕ لە دوای پەڕی رەشدەکردەوە و هیچ پەڕێکـی بە سـپێتی نەدەهێشـتەوە، ئەو زسـتانە شـەش حەوت دەفتەری گەورەی پڕ لە شیعر کرد، دیـار بـوو زۆر حەزی لە بەدر شاکر سەیاب دەکرد، شیعری وی هەمیشـە لە سـەر زاری بـوو، بە دەم چا خواردنەوە و مژ لە جگەرە دانەوە رووی تێم دەکرد:

+ بۆ ئەوەی ببیە شاعیر، دەبێت رۆژانە شیعر بنووسیت.

- من بیستوومە دەبێت رۆژانە شیعر بخوێنیتەوە.

+ بە هەڵەدا مەچۆ، شیعر پرۆسەیە، هەر بنووسە هەر بنووسە، لە ئەنجام شیعری جوان بەرهەم دێ، واتە دەبیە شاعیر، وەك چۆن هەر تەقە بکە هەر تەقە بکە دەبیە نیشانەشکێن، ئەوەش شتێکە لەو جۆرە.

- ئەدی خوێندنەوە؟

+ خۆ ناڵێم مەخوێنەوە، بەڵام نووسین هەمیشە نووسـین، ئەبـوو خالیـد ئەگەر بەردەوام جلکوبەرگی نەدووریایە، ئێستا نەدەبووە ئەو بەرگدرووە.

- واتە شیعر پیشەیە.

+ ئەتو گوێ بدە من، مەستمە بڵێم شیعر بەهرە و مەهرە نیە، بەردەوام بنووسە، رۆژی دەفتەرێك پڕ بکەوە، دڵنیابە دەبیە شاعیر.

- ئێ چۆن دەنووسرێ؟ ئەدی خوێندنەوە؟

+ ئەها، چونکە تۆ بەردەوام نانووسی، چ پرسیارێك دەکەیت؟

من و ئەبوو حوسێن جاروبار دەکەوتینە مشت و مڕ و لە بـارەی ئەدەب بە گشـتی و شـیعر بە تـایبەتی قسـەماندەکرد و شـەو و رۆژی بەفراویـی

کافێمان بەو قسانە لەیەك دەبەستایەوە و بەرێمان دەکردن، کەم دەچووینە مشتومڕ و دەمەقرەی سیاسیانەوە، هەرکاتێك قسە دەگەیشتە سیاسەت ئەو سێ رستەی هەبوو:

من نامەوێت ببمە کۆمۆنیست، من کەسێکی دیموکراسیم، دەمەوێت بچمە سوریا.

ئیدی مینا پیاوان دەیبڕیەوە، منیش پێم خۆش بوو باسی نەکات، لەو کاتانەی نیوە شەوان بۆ نۆبەتداریش گاسیان دەکرد چەند جارێك گوێم لێبووە لە بەر خۆیەوە دەیگۆت:

نەفرەت لە بابت سەدام ئەگەر ئەو شەڕ و سەربازیە نەبایە، من چ ئیشم هەبوو لەو گەوادیەی ئێرە.

ئەو کوڕە زۆر رقی لە ئێشکگری دەبۆوە، بەو بایە گوللەیەکت لە ناو چاوی بدایە، بەس لە خەوت نەکردایە، دێتە بیرم جارێك لە ئێشکگری ئەو لە دوای من بوو، دەبوو بە ئاگای بێنم، کاتێ بانگمکرد، چەند جارێك لە سەر یەك ئەمەی گوتەوە و نەیدەبڕیەوە:

دەی دەی گوللەیەك لە ناو چاوم بدە، بەس چیدی بانگم مەکە، دەی لێدە دەی.

گۆتمێ:

بەس بیبڕیەوە، شەرتبێت بانگت ناکەم، لە جیاتی تۆش دەیگرم.

خۆ ئەبوو عەماریش لە ئێشکگری لەو باشتر نەبوو، هەر جارێك ئێشکگریەکەی درەنگانی شەو بایە، بۆ بەیانیەکەی شەڕێکی کردبوو، راستیش کەم لە ئێشکگرییان دادەنا، داشیان نەنابا تووڕە دەبوو، ئەو دەمژمێرەی ئەو پیاوە دەبووە ئێشکگر، بارەگا پڕ دەبوو لە هات و هاوار، وات دەزانی ئەوە دوژمن بە سەر بارەگای داداوە، پیاوە زیندانیەکە دەیگۆت:

نازانم بۆچی ئەو شێت و شوورە لە ئێشکگری دادەنێن، هەموو سەرە خولەکێك سەر بەو کونەدا دەکا و یەك بەدەنگی خۆی هاوار دەکات:

نەکەن بیر لەدەرگا شکاندن بکەنەوە، من بە ئاگام ها!

ئەو کۆپیەی یاسر عەرەفات تا بلێی سەر بەگێچەڵ و شەڕانی بوو، ئەگەر شەڕکەر هەبا ئەوا شەو و ڕۆژ لە نێوان هەر دوو شەڕێك ئەبوو عەمار شەڕێکیدی رادەگەیاند، حەفتەی دوو شەڕی گەورەی ئەو پیاوە مسۆگەر بوو، یەکیان دەکەوتە ڕۆژی گەرماوکردنێ، ناوەکەیت دەخستە هەر کوێی لیستەکەوە، سەرەتا، ناوەڕاست، کۆتایی، هەر نارازی بوو، هەر لەو کاتەی لیستەکەی دەخوێندەوە، سووکە شەڕێکی لەگەڵ ئەو کەسە دەکرد کە لێیەوە نزیك بوو، کە دەچووە گەرماوەکە هاواری دەکرد:

ئاوی گەرم نەماوە، ئاوی سارد نیە، گەرماوەکە ساردبۆتەوە، زۆر گەرمە.

شەڕەکەیدی لەو ڕۆژەدا بوو کە پێیاندەگوت ڕۆژی گۆشت، ئەو ئەبوو عەمارە شێت و هار دەبوو، ناهەقی نەبوو هەر کێ لە جێگەی وی با، لەو خراپتری دەکرد، ئاخر گۆشتی لێ قەدەغە کرابوو، نەدەبوو بیخوا، ئیدی لە داخان بە دەوری مەنجەڵی گۆشتێ دەسووڕایەوە و جوونی دەدا، جوونی بە خۆی دەدا، بە ئاسمان و عەردی دەدا، وێنەی سۆندەی ئاوێ بە چواردەوری خۆیدا جوونی دەڕشاند، ئیدی کەس نەبوو پرووشکی جوونی پێنەکەوێ، ڕاستی ئەگەر زۆر بێ تامی نەکردبا، کەس لە گێچەڵ و تووڕەبوونەکانی ئەبوو عەمار تووڕە نەدەبوو، هەموو دڵیان رادەگرت، هەرچی گۆتبا و کردبا، کەس لێی نەدەگرت، ئەوەش دوو هۆی هەبوو:

نەخۆش بوو، ئەو پیاوە نەخۆشیی گەدەی هەبوو، دکتۆر پێیگۆتبوو، تەنها پسکویت و شیر بخوا، جگە لەوەش چەند ساڵێك بوو ژنەکەی لە بەغدا سرگومکرابوو، دەیانگۆت لە سێدارە دراوە.

پیاوە ژن لە سێدارەدراوەکە زوو تووڕە دەبوو، لە تووڕەبووندا بەعسی و کۆمۆنیستی تێکەڵاو دەکرد، کوڕێك وا بزانم هەڤالی ناوبوو، من بە قارداش بانگم دەکرد، نیوە تورکمانی بەری کەرکووکێ بوو، لە جێی عەمارەکە دەماری دانابوو، بانگی دەکرد:

ئەبوو دەمار.

ئەبوو عەمار بەو ناوگۆڕینە شێت و هار دەبوو، ناهەقی نەبوو ئەو خۆی بە باشترین ئاوەدانکار دادەنا کەچی ئەو قارداشە بە باوکی وێرانکار بانگی دەکرد، هەر هێندەش نا ئەو کوڕە بە ئەبوو عەماری دەگۆ:

تۆ وێرانکاری کوڕی وێرانکار و بابی وێرانکاری.

ئەبوو عەمار لەو کاتە ئەگەر بیوێرابا، مستێکی لە دوڕ دەوی دەدا، بەڵام نا، ئەو پیاوە دەستی نەدەوەشاند، شەڕەکانی هەر بە قسە بوون.

کوڕێك هەبوو، وادەزانم (ریاز)ی ناو بوو، هەر جارێك قوتووی شیر یان هەر شتێکیدی لە دوکانەکەی کافێ دەکڕی، پێش ئەوەی خۆی لێی بخوات، یان تامی بکات، دەهات کەمێکی دەرخواردی ئەبوو عەمار دەدا، دەترسا لەوەی نەوەك حکومەت ژەهراویی کردبێت، دەیگوت:

ئەنگۆش وەك من بکەن، ئەبوو عەمار بکەنە بەلاگێڕ...

کیفاح لە قاقای پێکەنینی دەدا و دەیگۆت:

دیارە ئەبوو عەمار مشکی تاقیکردنەوەیە!

ئەو کیفاحە بە کەیفی خۆی قسەی بە ئەبوو عەمار دەگۆت، نازانم کوو لێی توورە نەدبوو، هەموو پێیانوابوو نهێنیەك لەوەدا هەیە. کیفاح من ناوم نابوو توفاح، چونکە بۆنێکی لە خۆی دەدا رێك بۆنی سێوی لێدەهات، نەمدەزانی لە کوێ ئەو بۆنەی بۆ دێت، کیفاح ئێزدی بوو، کوردیەکەی زۆر پەتی و پاراو بوو، ئەو کوڕە ئێزدیە لە ناو قسان کە پێویستی بە سووند خواردن هەبا، سووندێکی تایبەتی هەبوو، سووندێك جگە لە ئەبوو عەمار هەمووومان لامان جوانترین سووند بوو:

بەو دەساڵ پێشمەرگایەتیەی کە ئەبوو عەماری بەڕێز تەقە لە تفەنگیەوە نەهاتووە.

ئەبوو عەماری رەشتارە بەو سووندە سۆر هەڵدەگەڕا و لە بن لێوانەوە دەیگۆت:

ئاخر کێ باوەڕ بە شەیتان دەکات؟ تۆ خزمی شەیتانی.

جارێك پیاوە زیندانیەکە بە کیفاحی گۆت:

چیدی ئەو سووندە مەخۆ، باش نیە، چونکە من بە چاوی خۆم دیتمە ئەبوو عەمار تەقەی کردووە، جاریك نیشانەی لە سووسکەیەك گرت، بەڵام زۆر سەری کرد، ریك بە بزنێك کەوت، ناچار بۆ شوانەکمان بژارد.

کاتێ قسەی زیندانیەکە گەیشتەوە ئەبوو عەمار دەیانگۆت گۆتبووی:

درۆیە، زیندانی بە دیدڤان ناچێت.

ئەبوو عەمار هەر چەندە کەس نەمابوو شەڕی لەگەڵ نەکات، بەڵام کەسیش رقی لێی نەدەبۆوە، ئەگەر لێشی تووڕە بان، ئەو تووڕەبوونە هەر دانە رۆژێکی دەخایاند.

سپی سپی، کافێ سپی لە هەموو سپیان سپیتر، بە رۆژ سپی، بە شەو سپی... بەفر بەفر، هەمیشە بەفر، بەفر بە هەموو بارین و تەرزی خۆیەوە: پارچە پەڕۆیە، کەڕەپووە، کەرەسیسەیە، کرێوەیە، گلێرەیە...ئەوەی نایەتە خوارێ بەفرخۆرکەیە، کاری هەمووان بەفر ماڵین، سەر بان ماڵین، کردنەوەی رێگەی نێوان ژوورەکان، لە دەو رێگاکان کە دەتگوت کۆلانی قەیسەری هەولێرە، بەفر بەژن و نیوێك هەتا دوو بەژن هەڵدرابۆوە، پیاوێکی بە تەمەنی کافێ کە بە مەبەستی دەرزیلێدان زوو زوو دەهاتە بارەگا دەیگوت:

لەمێژە زۆر لەمێژە بەفری وا لێرە نەباریوە، تەنها ساڵێك، ئەو ساڵەی حەرەس قەومی هاتنە سەر تەخت بەفرێکی ئەوها ئەستوور کەوت.

زیندانیە بەتەمەنەکە لە سەر پێشاو دەهاتەوە، بە دەم لەرزەوە، لەرزینێك مەگەر من وا هەڵلەرزیبم، بە نەرمی دەیگۆت:

ئاگاتان لە بانی هێسترەکان بێت، دەڕووخێت، بەفری زۆر لەسەرە.

ئەو زیندانیە زۆر بە خەم بوو، خەمی هەموو شتێکی لەبەر بوو، بانی هێستر و زیندانیەکان بە سەر یەکەوە بوو، لەوەیان نازانم خەمی رووخانی بانەکەی خۆیانی بوو یان هی هێسترەکان!

ئەبوو حوسێن سەرەتا زۆر حەزی لە بارینی بەفر بوو، منداڵانە دەچووە بەر بەفر و گەمەی لەگەڵ کلوو دەکرد، بە ناو لەپ دەیگرتنەوە، ئەو

کوڕە بە زستان وڵاتی بەفری نەدیتبوو، لای وی شتی ئەوها لە خەون دەچوو، گوێم لێبوو دەیگوت:

خۆزی لە بەسراش ئەوها بەفر دەباری!

ئەو شاعیرە بەسراییە بەفر کەم دیتیە، دەچووە دەرێ و دەهاتەوە ژووریێ، غاری دەدایە قەڵەم و کاغەز وشەی (سەلج) بەفری دەخستە رستەیەکی شیعریەوە، تەماشامدەکرد لاپەڕەی وا هەبوو حەڤدە وشەی (سلج)ی تێدا رەشدەچۆوە جار جارە پێم دەگوت:

هایبداربە رستەکانت لە بەفر نەخنکێن.

ئەو ساتانەی ئەبوو حوسێن دەهاتەوە ژووریێ، ئەبوو خالید پێی دەگۆ:

+ ها ئەبووسلج چ دەبارێ؟

- فریشتە دەبارێ، شیعر، کچ، جوانی... دەبارێ

ئیدی لە وەڵامدا هەرچی جوان بوو ریزی دەکرد بە جوانیشەوە، کۆپلە شیعرێکی خۆیشی لێ گریدەدا، ئەبوو خالیدیش بە دێرە شیعرێکی جەواهێری دەمکوتی دەکرد:

پەنجا ساڵیدیش شیعر بنووسی، دێرێکی وەك جەواهێریت بۆ نانووسرێ.

زۆری نەبرد ئەبوو حوسێن چوونە دەرێی کەم کردەوە، لە هاتنە ژۆرێش باس بارینی فریشتە و شیعر و ئەو شتانەی نەدەکرد، لە شیعرەکانیشیدا وشەی (سەلج)ی بەکارنەدەهێنا، ئەو شاعیرە هێندە لە ناو بەفر ئێشکگریی گرت، هێندە لە ناو بەفر داری شکاند، هێند پەنجەی رچی، لە بەفر بێزار بوو، رۆژێك شیعرێکی بۆم خوێندەوە، شتێکی لەو بابەتەی تێدا بوو:

هەر شتێ زۆر بێت و نەبڕێتەوە با ئەو شتە جوانییش بێت، دزێوە، بێجگە لە دار خورما.

ئەبوو حوسێن گەیشتە ئەوەی لە بەفر تووڕە بێت، کاتێ دەهاتە ژوورێ، لێیم دەپرسی:

+ ها ئەبوو سەلج چ دەبارێ؟

- من ئەبوو ریخم، ریخیش دەبارێ.

بیرمە پرسی:

کەنگێ بەفر دەتوێتەوە

گۆتم: لەگەڵ هەڵکردنی بای وادە، دەست بە توانەوە دەکات.

بـایەکەم بە کـوردی گـۆت، چەنـدی گەڕا ئەو بـایەی بە عـارەبی نەدۆزیەوە، ناچار بە کوردی خستیە شیعرێکەوە، لەو شیعرەدا لە شێوەی گۆدۆ باسی لە بای وادە و بای داراوس کردبوو.

بەفر هەموومانی لە دوڕ ژووری کردبـوو، هەموومـانی لە دەوری سۆبە دارینە ئاگرینەکە خڕکردبۆوە، خەمی گەورەمان کاتەکانی نۆبەتداری بـوو، خەمـی گەورەمـان رۆژی کابـانی بـوو، خەمـی گەورەمـان چـوونە داران، خەمـی گەورەمـان سـەربانماڵین و بـاگوردانگێڕان بـوو، خەمـی گەورەمـان ساتەکانی چوونە سەر پێشاو بوو، باش بوو نـوێژکردن نەبـوو، دەنـا خەمـی دەزنوێژهەڵگرتنیش دەهـاتە سـەر خەمەکانیـدی، ئەو کاتـانەی گلەییمـان لە بەرانبەر بەفر زیادی دەکرد، ئەبوو خالید فڕۆکەی بیردەخستینەوە:

باشە، بەفر باشە، با هەر بباریێ و لێ نەکاتەوە، بەفر لە فڕۆکە باشترە.

وا بـوو، بەفـر لە فـڕۆکە باشـتر بـوو، قەینـاکە بـا بەفـر هەر ببـارێ، بـا لێنەکاتەوە، فڕۆکە ترسناکە، هەر بە دیار بکەوێت کەتێتێك دەکـات، کەس نیە، هیچ شتێك نیە، بە فڕۆکە بوێرێ، رێ لە فڕۆکە بگـرێ، تەنهـا هەور و بەفـر و بـاران، کـاتێ بە وردی بیـرم لەو کارەسـاتانەی لە فـڕۆکەوە دەکەوتنەوە دەکـردەوە، کـاتێ ئەو وێـنە ترسـناکانەم دەهـاتنە بەر چـاو کە فڕۆکە لە دوای خۆی بۆمـانی بەجێدەهێشـت، لە دڵـی خـۆم دەمگـوت، بـا ببارێ، هەتا دنیا دنیایە با هەر بەفر ببارێ.

بەفر خڕمـانی لە کـونی ژووری بە دیـار سـۆبەوە خڕکردبـۆوە، ئەوەی گـوێی نەدەدایە بەفـر، ئەوەی منـداڵە لاسـارەکەی بارەگـا بـوو، لە ژووری دانەدەکەوت، خۆشناو بوو، ئەو کوڕەش خەڵکی رۆژهەڵاتە، وا بزانم کۆنە دیمـوکراتە، ئەویـش لەگەڵ زۆریـدی خەڵکـی هـۆدەکەی رزگـار بـوو،

ژوورێك لەو لاوە بە هۆدەی رزگار ناسرابوو، خۆشناو ژانە پشتیشی هەبوو، بەڵام لە پێناوی وەرگرتنی هەواڵێك بەو بەفرە بە بەرزاییدا هەڵدەگەڕا، رادیۆکەی دەخستە بن گوێی و بەفری ئەستوور بشكێنە و هەڵگەڕێ، بەو بەرزاییەدا هەڵدەگەڕا کە کەوتبووە پشت بارەگاوە، لە ناو ئەو چیا و چۆلە رادیۆ لە جێگەی بەرز وەریدەگرت، بۆ بیستنی هەواڵێك ئەو خۆشناوە ئامادەبوو دانە رۆژێ لە ناو بەفرێ بمێنێتەوە، ئەوانەی لەمێژ بوو دەیانناسی دەیانگوت:

ئەو خۆشناوە پێش ئەوەی چەك لە شان بكات، رادیۆی لە مل کردووە، لە ناو گەرمەی شەڕێش رادیۆی وی هەر ئیش دەکات.

هەواڵی دنیایێ لە کن ئەو خۆشناوە بوو، من چ گوێم نەدەدایە دەنگوباسان، لە سەر گۆرانی رامدەگرت، ئەگەر حەزم لە هەواڵ بایە، دەچوومە کن خۆشناو، لە بیرمە لە بارەگای ئێمە یەکەم کەس کە لە رادیۆوە گوێی لە کاولکردنی هەڵەبجە بوو ئەو خۆشناوە بوو.

ئەو زستانەی کافێ زۆر تووش بوو زۆر، رێی بە رێبوار نەدەدا، پێشمەرگەی لە کونێ کردبوو، گورگی بەستبوو، دوکانەکەی کافێش چی تێدا نەمابوو، ئەبوو حوسێن خەمی نەمانی دەفتەری کەوتبووە بەری، ئەبوو خالید جار جارە دەیگۆت:

بە فەرمانی خودا هەتا نەورۆزێ مەنع تەجەولە.

بەڵام کوڕەکەی بانێ گوێی بەو فەرمانە نەدەدا و دەیشکاند، ئەو کوڕە لە(بانێ)وە دەهات، بانێ گوندێکە زۆر دوورە لە کافێ، جگە لە دووریەکەشی کەوتۆتە نزیك ئاسمانێ، جێگاکەی زۆر بەرزە زۆر، دنیا وشکانیش بێ، هەتا دەیگەیتێ، دەبێت چەند جارێك دانیشی و پشووی باش بدەیت، جگە لەوانەش بانێ زۆر لە کافێ پتر بەفری لێدەکەوێت، هەر هەوری بەفری بێتە ئاسمانێ، لە بانێ بەفر باریوە و بە بەژنی من بەژنێکی تێکردووە، ئەوجا ئەو کوڕە ناوەکەیم لە بیر کردووە، بۆیە بە کوڕەکەی بانێ ناوی دێنم، لەوێوە بە دەفتەرێك شیعرەوە دەهاتە لام،

کوڕەکەی بانێ تەمەنی هەر پازدە شازدە ساڵ دەبوو، حەزی لێبوو قسە لە بارەی شیعرەکانیەوە بکەم و بۆچوونی خۆمی بۆ بنووسم، ئەویش وەك ئەبوو حوسێن زۆر شیعری دەنووسی، ناوە ناوە دەفتەرێکی پڕ دەکردەوە، بە بادینی دەینووسی، زۆرجار لە کاتی دەسکاریکردنی شیعرەکانی وشەیەك یان دەستەواژەیەکی سۆرانیم لە شیعرەکانی دەئاخنی، کوڕەکەی بانێ ئەوەی لا زۆر خۆش بوو، دەیگوت: لێرە، لەو گوندە بادینی و سۆرانی یەکدەگرن.

دەی هاوڕێیان دار دار، حەتەب حەتەب.

کاتێك زیندانیە بەتەمەنەکە گوێی لە دار و حەتەب دەبوو، دەمی دەهێنایە راستی کولانکەکە، من یەك دوو کەڕەت ئەوها دیتم، هاواریدەکرد:

ئەوانەی وەکی کیری سەی هەڵدەلەرزن، ئەوانیش دەبەنە داران؟!

مەبەستی لە خۆی بوو، نەیاندەبرد، دەیانگوت تۆ ئاگاداری ئێرە بە، دیار بوو لە هەندێك شت ئەو زیندانیە لەوانیدی جیادەکرایەوە.

لە رۆژێکی ئەوها چوونە داران مردنە، مەگەر ئەبوو حوسێن و زیندانیە بەتەمەنەکە هێندەی من لە چوونە داران بترسێن، بەو چیایەدا هەڵگەڕاین کە رۆژانە چەند جارێ خۆشناو پێیدا هەڵدەگەڕێ، سەرکەوە، ئۆجا بەفر بشکێنە و برۆ، تەواوێك برۆ...

من و رزگار پێکەوە دەرۆیشتین، رزگار تودەییەکی جوان بوو، زۆر برادەرم بوو، هەر سەرم ئێشابا دەگەیشتە سەرم، کەوتینە دار برین، رزگار لە کاتی داربڕینێ شتێکی هەبوو، رەنگە تەنها من هەستم پێکردبێ، ئەو کوڕە کاتێ تەورەکەی بەرز دەکردەوە چاوی دەنووقاند و وەیش وەیشی دەکرد، دەتگوت لە مرۆڤ دەدا، کوڕێکی زۆر نەرم و میهرەبان بوو، حەزی نەدەکرد درەخت ببڕێتەوە، دەگەڕا دەگەڕا لە دووی درەختی زۆر پیر دەگەڕا، دەیگوت:

هەر درەختێك ببڕیەوە باش نیە، بەڵام کە هەر دەبڕینەوە با هی زۆر پیر ببڕینەوە.

ئەو رزگـارە کـاتێ بەلای درەختێکـدا دەڕۆیشـت و دەیـدیت، بـاری لقێکـی بە بەفـر گـران بـووە و ئەگەری ئەوە هەیە بشـکێ، رادەوەسـتا و لقەکەی لە بەفر پاك دەکـردەوە، ئەو کـوڕە زۆر نەرم بـوو، لەگەڵ مـرۆڤ نەرم بوو، لەگەڵ ئاژەڵ و دارودرەخت نەرم بوو، هەموو جارێ دەیگوت:

ئەگەر خومەینی و سەدام تەنها رێدەن، تۆزێ بۆ خۆمان هەناسە بدەین و بژین، تخوا ئێمە هی چەك هەڵگرتنین! هـی ئەوەیـن زینـدانیمان هەبـێ و پاسەوانی لە زیندانیان بکەی، هی ئەوەین بە تەور بە ناو لێڕەوار بکەوین؟

رزگار لە شیولێنان هیچ ژنێك نەیدەگەیشتێ، چتۆ برنجی لێـدەنا! بـرنج دنك دنك رادەوەستا، شلەکەی لە برنجەکەی بەتامتر، کەس نەیدەزانی چی تێدەکات، دەیانگوت:

بەهاران و هاوینان دنیایەك گژ و گیای بە بۆن و بەرامە وشك دەکاتەوە و زستانان شیویان پێ خۆش دەکات.

رزگار بوو، ئەو ئیشانەی لە دەست دەهات، ئەو رۆژەی رزگار دەبـووە کابان هەموو خەنی دەبوون، رێك پـێچەوانەی ئەبـوو حوسـێن، ئەو رۆژەی نۆرەی ئەو شاعیرە دەهات بۆ کابانی، زیندانیە بەتەمەنەکە دەیگوت:

ئەوڕۆمان فت، دەبێت نان و چای بخۆین.

ئاخر دەستاوی گەلەک ناخۆش بوو، شیوی دەستی وی بێ خوێ نەبـا، سوێر بوو، هەندێ کەرەتیش سـوێرەلووک، هـێ لە هەنـدێش بـرنجەکەی، زیندانە بە تەمەنەکە گۆتەنی:

دەڵێی سەخۆرە، بۆ سەخۆرگە باشە، نەک گەدە.

زیندانیەکانیش وەك ئێمە داریان دێنا، بەڵام دەبـوو چاومـان لە سـەریان با، نەوەك هەڵبێن، یان کەتنێك بکەن.

ئەو سێ چوار زینـدانیەی کە لە بارەگـا بەفـرینیەکە لەگەڵمـان دەژیـان، ژوورەکەیان وەك ژوورەکانی ئێمە بوو، جیاوازیەکە لە چەند شتێکدا، هـی ئەوان تـۆپ و کلیلێکـی گەورەی پێوەبـوو، هەروابێـتەوە کـولانکەیەکی گچکەی تێدا بوو، لەوێوە نانیان وەردەگرت، لە بیرم نیە چەند جیـاوازی و

وێکچوون لە نێوان ژووری زیندانیەکان و ژوورەکانی ئێمەدا هەبوو، بەڵام ئەوەی منی دڵخۆش دەکرد، خواردن بوو، خواردنی ئەوان و ئێمە وەك یەك بوو، ئەوەی زۆر ئازاریشی دەدام، ئەوەبوو کە ئێمە ئازاد بووین و ئەوان زیندانی. زیندانیەکان بۆ ئێمە بەڵا بوون، ئەگەر ئەوان نەبان، رەنگبوو ئێشکگریەکەمان وا بە رێکی نەگرتایە، ناوە ناوە دەیانگوت:

زۆر ئاگاداری زیندانیەکان بن، دەرگاکە نەشکێنن.

ئیدی ئێمەش دەبوو بەو بەفر و سەهۆڵبەندانە لە کاتی ئێشکگری چاومان لە ژووری زیدانیەکان با و لە پێش دەرگاکە پیاسەمان بکردایە.

زیندانیە بە تەمەنداچووە بە قسەکە کاتێ لە کولانکەکەوە منی دەدیت لە ناو ئەو شەوە سپیەدا دەهاتم و دەچووم و لەرز لەرز هەڵدەرزیم، باوکانە دەیگوت:

کوڕم، بڕۆ خۆت گەرم کەوە، خەمی ئێرەت نەبێت، نایەلم دەرگا بشکێنن.

دەمگوت:

نا، قەیناکە، پیاسەی ناو بەفر خۆشە.

دەیگوت:

رەنگە وابێت، بەڵام بۆ من نەك بۆ تۆ.

ئەو گۆتەیەی زیندانیەکە زۆر ئازاری دەدام، نەمدەزانی گوناهی ئەو زیندانیانە چیە، یان شتێکی کەمم دەزانی، بەڵام خۆم بە گوناهبارێکی گەورە دادەنا، لە دڵی خۆم دەمگوت من بۆچی هاتم تووشی چی بووم، باشە من و پاسەوانیی زیندانیان گۆتیە! با بۆ کاتژمێرێکیش بێت، ئەوە ئیشی من نیە، زۆر جار نزیك دەبوومەوە لە کولانکەکە و گوێم دەدایە قسەی پیاوە زیندانیە بە تەمەنەکە، هەرچەندە یەك دوو جار گوتیان:

زۆر گوێ لە قسەی زیندانیان رامەگرن.

بەڵام من گوێم نەدایە ئەو قسەیە و بە دڵی خۆم گوێم بۆیان شل دەکرد، ئەو زیندانیە بە تەمەنە ((یەکێتی سۆڤیەت) ی دیتبوو، نەك هەر

دیتن شارەزای هەموو کون و کەلەبەرێکی بوو، ناوی هەموو پیاوە ناسراوەکانی ئەو وڵاتەی دەزانی، زۆر شتی لە بارەی هەموو سەرکردەکانی ئەو وڵاتە بە وردی دەزانی، دەیزانی ستالین چەند کەسی ناسراوی کوشتووە، ناوی هەموو نووسەرو شاعیرە ناسراوەکانی ئەو وڵاتەی لەبەر بوو، ناوی پاڵەوان و کەسەکانی ناو بەرهەمەکانی مەکسیم گۆرگی و جەنگیز ئیتماتۆڤ و ئەوانەی هەموو لەبەر بوو، هەرچی وتەی گرنگی لینین و ستالین هەیە لەبەری بوو، لە نێوان سێ چوار رستە گوتەیەکی یەك لەوانەی دەگوتەوە، جگە لەوە ناوی کۆمار و شار و گوند و رووبار و چیای یەکێتی سۆڤیەتی هەموو دەزانی، شارەزای جۆری خواردن و خواردنەوە و حەزی ژنەکانی ئەوێ بوو، هەموو، یان زۆر لەو شیعرانەی لەبەر بوو کە بە لینیندا هەڵگوترابوون، دەتگوت گوگلە هەر ناوێکی ناو یەکێتی سۆڤیەتت دەگوت، دوای کەمێك بیرکردنەوە پێی دەگوتی، بە راستیش دەیگوت، بە تاقیکردنەوە بە دیار کەوتبوو بە راستی دەیگوتن، بەڵام لە دەرێی سنووری یەکێتی سۆڤیەت کوڵەوار بوو.

ئەو لەو دیو من لەم دیو، نێوانمان دیوارێکی ئەستوور، کولانکەیەك پەیڤەکانی دەهێناو دەبردین، بەو نیوە شەوە بەفرینیانە کولانکەیەك زیندانیەك و ئێشککگرێکی پێکدی ئاشنا کردبوو، نازانم ئەو پیاوە بۆ نەدەنووست، بەو درەنگانی شەوە هەر بە ئاگا بوو، زیندانیەکانیدی پرخە پرخی خەویان بوو، هەرچی پێشمەرگەیە لە خەوێدا بوون، کێ بە ئاگا بوو؟ نۆبەتدارێکی گەنج و زیندانیەکی بە ساڵدا چوو، زیندانیەك خۆی گوتەنی ((بە هەڵە گیراوە))، زیندانیەك توانای ئەوەی هەبوو تا رۆژ دەبێتەوە لە بارەی (جەمیلە) و (دایك) و (دۆنی ئارام) و (ماڵاوا گوڵیساری) قسە بکات، زیندانیەك لە نیوەشەوێی دنیا تەزیودا شیعری مایکۆفسکی و رەفیق سابیری بۆ دەگوتم، زیندانیەك ئاخ بۆ دیتنی منداڵەکانی هەڵدەکێشێ و لە ناو ئەو ئاخەوە چاوەڕێیە پەرجووێك پێکێ ڤۆدگای رووسی بخاتە دەستیەوە...

ئێشکگرێکیش کاتێ بە چیا کەوت، نیازی شکاندن و خستنە سەر پشتی دەرگای هەموو زیندانەکانی دنیای لە دڵی بوو، ئێشکگرێك رۆژێك لە رۆژان بە خەیاڵی دانەهاتووە ببێتە زیندانەوانی هیچ زیندانیەك جا ئەو زیندانیە با پیاوکوژیش بێت، نۆبەتدارێک ئەگەر برادەرەکانی ئەوانەی لە ناو پۆلی کۆلیژ بێ ماڵئاوایی بەجێیهێشتن، بەوە بزاننەوە کە برادەرەکەیان وا زیندانەوانی زیندانیەکی بە هەڵە گیراوە، داخوا بیرکردنەوەیان بە کوێ دا رێ دەگرێت! نۆبەتدارێک خۆی بە دۆستی قەڵەم دەزانێت! نۆبەتدارێک بە دیار زیندانەوە، چاوێرێیە سرووش یان سەرۆی وێنەیەکی ناسکی شیعری بۆ دابەزێ!!

ئەو زیندانیە دەتگوت دەزانێت ئێشکگریەکەی من دەکەوێتە چ کات، دەتگوت حەز دەکات دوو بە دوو قسە بکەین، ئیدی لە بەختی ئەو یان لە بەدبەختی و ناوچەوانی من، ئەو زیندانیە هەمیشە بە ئاگا بوو، هەمیشە حەزی لە قسە بوو:

منی بە هەڵە گرتووە، بەڵام بەرانبەری هیچم لە دڵ نیە، لێی خۆش دەبم، ئاخر ئەو منی پێگەیاند، ئەو نەبا من چ بووم! ئەو نەبا دەبوو هەر لە دووی جۆتێ بم، ئەو منی ناردە بەهەشتی سەر دنیا، ئەو هەموو شار و جێیەم دیت، ئەو هەموو خەڵکەم ناسی، چاوم کرایەوە، فێرە شت بووم، هەرچیم لێبکات، بەجێی ناهێلم، وا نیە ئەدی؟

لەبەر دڵی وی دەمگوت:

وایە

بەڵام لە دڵی خۆ دەمگۆ:

ترحێو، بە خودێ ئەگەر دوو شەو من دەخەنە جێی تۆ، لە تەمەنی خۆی چاوی بە من ناکەوێتەوە.

ئەوی زیندانی دەیگوت:

پێویستە دوژمن و ناپاکان سەریان پان بکرێتەوە، وەك چۆن هاورێ ستالین سەری هەموویانی پان کردەوە، لێ من ناپاکیم نەکردووە، بە هەڵە بەند کراوم.

منی ئێشکگر دەمگوت:

باشە ڕێی تێناچێت، ستالین بە هەڵە سەری کۆمەڵێك کەسی پان کردبێتەوە؟

ئەوی زیندانی دەیگۆت:

ڕەنگە بە هەڵە چەند کەسێك بەر کەوتبن، بەڵام ئەوە ئاساییە، شتی وا هەر دەبێت.

هەستمدەکرد ئەو پیاوە ئەگەر لە دەرەوەی زیندان بێت و لێپرسراوێتی هەبێت، ڕەنگە پیاوێك بێت زۆر توند و تیژانە ڕەفتار بکات، ئەوەندە نەرمیەی کە تێیدایە هی زیندانە. لە خەفەتی ئەو زیندانیە نەرم و توندە و زیندانیەکانیدی خۆزگەم بە ئەبوو خالید دەخواست و دەمگۆت:

لە ئێوارێوە تا سبەی دروومان ، نەك یەك کاتژمێر ئێشکگری.

ئەبوو خالید لە بن جەمەدانیەکەیەوە دیار بوو، پرچێکی جوانی درێژی هەیە، هەرچەند تەماشایم دەکرد، خۆم لە بەرانبەر دەروێشێکی شێخی نەهری دەدیتەوە، پرچێك داوی سپی زۆر تێکەوتبوو، ڕۆژێ نا ڕۆژێ ریش و سمێڵی پاك دەتراشی، خزمەتی پرچیشی دەکرد، حەزمدەکرد نهێنیی ئەو پرچ هێشتنەوەی بزانم، نەمزانی، لە دڵی خۆم دەمگوت، ئەو پرچەت لە بن جەمەدانی شاردۆتەوە بۆ چیتە؟ پرچ بۆ ئەوەیە بە دەرەوە بێت، دەیانگوت:

هاوینانیش پرچی ئەبوو خالید هەر لە ژێر جەمەدانیە.

هەر کەسێك لە بارەی پرچیەوە پرسیاری لێبکردایە، هیچ وەڵامێکی دەسنەدەکەوت، قسەی بە ئاقارێکیدا دەبرد، ئەبوو خالید بە کوردیەکی خۆش قسەی دەکرد، تێکەڵ لە بادینی و سۆرانی، یەك دوو جار لە ئێشکگریان دانا، توورە بوو، خراپ توورە بوو، دەیگوت:

وەرە، شەو و ڕۆژ جلکوبەرگیان بۆ بدوورە، لە ئێشکگریشت دابنێن، ئاخر لەبەر من نەبێت هەمووتان بە قوون رووتی دەگەڕێن، حزبێك لەو شاخ و داخە دەبێت بە قوون رووتی بگەڕێت.

ئیدی تەواو، کەس ناوی ئەبوو خالیدی لە لیستی ئێشکگران نەدیتەوە، جارێکیدی ئەبوو خالیدم بە توورەیی دیتووە، بەڵام ئەو جارە ئێشکگری لە گۆڕێ نەبوو، توورەبوونێك بە کەس ئاشت نەدەبۆوە، بە عەرەبی و کوردی جوونی دەدا، جونی پیس پیس، لە هەموو جونە عەرەبیەکانی تێنەدەگەیشتم، بەڵام بە گوێرەی جونە کوردیەکانی دیار بوو عەرەبیەکانیشی لە کوردیەکانی پیسترن، توورەبوونەکەش لە سەر ئەوە بوو، لە بارەگایەکیدیکەوە بەرپرسێکی تەواوێك گەورە، نامەیەکی بۆ ئەبوو خالید نووسیوە، داوای لێکردووە، داواکەیشی تکای تێدا بووە نەك فەرمان کە بە زوویی کورتەك و شەرواڵێکی بۆ بدوورێ... ئەبوو خالید بەوە شێت و هار ببوو، چۆن دەبێت پەلەی لێبکەن. یەك بە دەنگی خۆی، بە عەرەبی هاواری دەکرد:

ئاخر تۆ چیت داوا لە من دەکەیت، جلکت بۆ بدوورم! ئەگەر لە بەغدا دوکانی بەرگدروویم بکردایەتەوە و بەگەڵ ئێوە نەکەوتمایە، ئێستا خاوەن خانووی بەرز و ماشێنی پان و ژنی جوان دەبووم، ئێستا منداڵم دەچوونە قوتابخانە.

بەفر خاتری کەسی نەگرت، هەورە بەفراویەکان هەتا کلوو بەفرێکیان لە کن مابوو بەسەر کافێیان داباراند، هەتا خۆشناو هەواڵی هەڵەبجەی نەداینێ هەر بەفر بوو، دوا شیعری کورەکەی بانێ کە خوێندمەوە لە بارەی مەرگی هەڵەبجەوە بوو، دوا شیعری شاعیرە بەغدایيەکە کە خوێندمەوەماڵئاوایی بوو لە بەفر، دوا کورتەك و شەرواڵ کە لە سەر مەکینەکەی ئەبوو خالید بوو، بۆ من بوو، دوا رستەی پیاوە زیندانیەکە کە من گوێم لێبوو:

پێویستە سۆفیەت لە سەر هەڵەبجە هەڵبداتێ.

دوا دیمەنی قاسم کە لە چاومدا مابێت، برینی سەر پشتی هێسترە بۆزی دەرمان دەکرد، دوا دیمەن و قسەی رزگاریش، کۆترێکی نەخۆشی بە دەستەوە بوو، وەك شێتان ئەو جێ و ئەو جێی پێدەکرد و وەك ئەوەی

هەڵەبجەی بە بەرچاوەوە بێت، بە دەستێك لە سەری خۆی دەدا:

ئەی هەوار، لە کوێی دانێم، تا پشیلە نەیخوات.

بەڵام چەنـدی دەکەم دوا شـەڕی ئەبـوو عەمـارم بیـر نـاکەوێتەوە، ئەو شەڕانەی ئێستا حەز بە بینین و بیستنیان دەکەم.

ئیدی من ماڵئاواییم لە کافێ کرد، ئەو سـاتانەی ئەنفـال هـاتبووە ئەوێ، مـن لە جێگەیەکیـدی لە بەر ئەنفـال هەڵـدەهاتم، کەسـم نەدیـتەوە کەس، هەموو پەرتەوازە بوون، هەر یەکەیان کەوتنە جێگەیەك لەو دنیایە، ئێستاش نەمزانی کوڕەکەی بـانێ چـی بەسـەر هـات، ئەوەی دیـتمەوە، سـاڵی دوای ساڵی ئەنفال، لە ناوزەنگی کەپری حەسانەوە، دەبینم پیاوێ لە سـەر بەردێ دانیشتووە، پێی لە سەر پێی داناوە، هەوە هەو نیە، کـوڕە بە خـودای هەوە، خۆیەتی، ئەوە مام ئەحمەدی زیندانیە، کە منی دیت هەستایەوە و گوتی:

نەمگوت منیان بە هەڵە گرتووە!

## گرتە، گرتە
## لە بنی گارەوە تا سەری هەورێ

-١-

سەردەمانێ با دەیگۆ:
**لە گەشتەکانم**
**هاوڕێم زۆرن**
**بەڵام بە هەمیشەیی دەستی تۆم لە دەستە.**
**منیش دەمگۆ:**
**دەستت بەرنادەم،**
**لە تۆ پتر حەزم لە گەشتە..**

بەهار لە سەر بارکردنە، تەڕی و کەسکایی خۆی دەپێچێتەوە، هاوین بە هەموو زەردی و وشکایەتی خۆیەوە لە رێیە، دەیەوێت بە پەلە لە جێی بەهاری ئەوێ هەڵبدا، بارەگاش مینا بەهار لە خۆ ئامادەکردنە، بەهار بۆ کوێ دەچێت؟ تا بەهارێکیدی وەڵام نیە، بەڵام بارەگا نیازی چوونە کەپرانی هەیە، پێشمەرگە نیە دڵی خۆشنەبێت بە هاتنی کەژی کەپر، ئاخر ژوورەکانی ئەو بارەگایە هێند نەوین هێند نەوین، بزنی شاخدار شاخی بە کاریتان دەکەوێت، ژوورەکان هێند تەنگن هێند تەنگن، هیچ سەگێکی بەرەڵڵا نەك وەرزێك حەفتەیەکیش تیایاندا ناحەوێتەوە، من لە دڵەوە حەزم دەکرد ئەو کەژەش، کەژی کەپران لەگەڵ ئەو دەستە پێشمەرگەیە لە نێو

کەپران بە سەربەم، ڕەنگە بە هۆی ئەو پەیوەندیە جوانەوە بووبێت کە لەمێژ نەبوو لەگەڵ هەندێك لە پێشمەرگەکانی ئەو بارەگایە بەستبووم کە زۆریان هی دیوی ڕۆژهەلات بوون، رزگار و سەعیدەش هی ئەو دیو بوون، برادەرایەتی من لەگەڵ ئەو دووە خەریك بوو زۆر بەهێز دەبوو.

سەعیدە ژنێك بوو بە واتای وشە ئێرانناس، سەری پڕ زانیاری بوو لە بارەی ئێرانەوە، لە هەر بوارێکەوە پرسیارت لێبکردایە، وەلامی جوانی هەبوو، لە بارەی شیعریشەوە دنیایەك شیعری فارسی لەبەر بوو، فەروغی هەموو لەبەر بوو، بە دەنگێکیش دەیخوێندەوە چ لە دەنگی مرۆڤ نەدەچوو، هەستدەکرد دەنگێکە لە جێگەیەکەوە، لە شتێکەوە دێت کە بە مرۆڤ ئاشنا نیە، ئەو دەنگە وەها سەراسیمەی دەکردیت، بزردەبوویت، لە خۆت، لە دنیا بزر دەبوویت، بە سەر چیاکاندا بە سەر دەریاکاندا دەیگێڕایت، دەیبردیە ئاسمانی، تێکەڵی بای دەکردیت، لە ناو ڕووباران دەیخەواندیت، مەستبوونێك مەستی دەکردیت، مەپرسە، رزگاریش جوان شیعری دەخوێندەوە، هێمنی خەتمکردبوو، کوڕێك بوو جوان زۆر جوان، دەمویست ئەو هاوینە لە بارەگای نیوە ژن بمێنمەوە، نیهادێك هەبوو، زۆر قسە خۆش و قسە لە ڕوو، زۆر جار دەیگوت:

بە ڕاستیتان پێبڵێم من لە پیاو بێزار بووم، لە هەستانی هەر پیاو لە دانیشتنی هەر پیاو، لە ڕۆیشتنی هەر پیاوە، لە هەموو کات و جێیەك هەر پیاو، هەر پیاو لە ناو چاوتە، ئیدی حەزناکەم ڕۆژانە یەك وشەی (رفیق) لە زاری منەوە بێتە دەرێ، یا بە (رفیقە) بانگی دەوروبەری خۆم بکەم، یا لە جیاتی(ئەنتە) هەر بڵێم (ئەنتی)...

ڕاستی لەو بارەیەوە منیش وەك نیهاد بیرمدەکردەوە، بەلام شەرمم دەکرد وا بڵێم، بۆیە حەزمدەکرد ئەو هاوینە لە جێگەیەك بەسەرببەم کە سەراپا پیاوستان نەبێت، جێگەیەکیش بهێڵێتەوە بۆ ژنستان.

رزگار و ئەز و یەك دووانێکیدی ڕۆیشتین جێگەیەك ببینینەوە بۆ بارەگا، بارەگای کەپری، دەبوو دوور لە بارەگا کەپر هەڵدەین، چونکە

دەمێك بوو کەوتبووینە سێرەی فڕۆکەوە، هەر فـڕۆکەیەك لە هەر لایەکەوە هاتبا، بە ناپاڵمێـك بە سـەریدەکردینەوە، دوور تەواوێـك دوور جێگەیەکـی باشمان دیتەوە، کانیشی هێندە لـێ دوور نەبـوو، بە چەنـد تـۆپە سـۆندەیەك ئاومـان دەگەیشـتێ، جێگـاکە بەرزایـی بـوو، دۆڵایـیش بـوو، لە رووی سەربازیەوە خراپ نەبـوو، هەمـووی دار و بـار بـوو، بـنە دار بەڕووی وای لێبوو تۆپ نەیدەبڕیەوە.

رزگار گوتی:

من و تۆ پێکەوە لەو بن دارە کەپرێك چێ دەکەین.

زۆرم پێخۆش بوو.

لە دوورەوە، زۆر دوور دەنگی تۆپ دێت، گـارە بەردی لێببـڕێ تـۆپی لێنابڕێ.

-٢-

**پێشمەرگەیەکی قژ گیابەندیی**

**چاو رەش رەش**

**لە بەر خۆیەوە دەیگوت:**

**ماڵئاوایی**

**هەر دەڵێی گوڵی ژاڵەیە،**

**تاڵ تاڵ.. گەش گەش...**

لە سەر ئەوەیـن کە دار بـۆ کەپـر ببـڕین، برووسـکەیەك هـات، داوا کرابوو، من و چەند پێشمەرگەیەك بەرەو بارەگایەکی پێرسی بەڕێبکەوین، بە بیرم هاتەوە، گفتێکم بیرکەوتەوە:

هەر کاتێك ویستمان بۆ بالیسان بچین، بە دواتدا دەنێرم.

بەو هەواڵە پێـیەکم کەوتە پێشـێ پێـیەك پاشـێ، کێشـە کەوتە نێـوان پێیەکـانم، هـاوڕەوتی و تەبـایی لە نێوانیـان نەمـا، پێـی گـارەییم غەزریبـوو نەدەجوولا، پێی پێرسیم، لە هەوابوو خەریك بوو باڵ بگرێت، لە نێـوان ئەو

دوو پێیە، ئەو دوو حەزە تێدا مابووم، ئاکام پێی پێرسی کە بالیسانی لە پێشبوو، پێی گارەیی لە دووی خۆی راکێشا، حەزی رۆیشتن سەرکەوت بە سەر حەزی مانەوە، کۆڵەپشتم تێکنا و کلاشینکۆفم خاوێنکردەوە و یەك دوو تەقەی هەوایم پێکرد، کێشەی نەبوو، وایە پێشمەرگە پێش ئەوەی بە رێبکەوێت دەبێت چەکەکەی تاقیبکاتەوە، بزانێت تەقە دەکات یان نا.

لە ساتی ماڵئاوایی چاوم پڕ لە گریان بوو، رزگار و سەعیدە لە دڵەوە هیوای دوورە بەلایان بۆم خواست، ئەوانیدیش بە هەمان شێوە، ئاخر گەڕانەوە بۆ ناوچەی بالیسان و خۆشناوەتی لەو کاتدا واتە گەڕانەوە بۆ ناو گەرمەی شەڕێ، رزگار زۆر ئامۆژگاریی کردم کە پەل نەبم و زۆر ئاگام لە خۆم بێت، سەعیدە دەیگوت:

هیوادارم یەکتر ببینینەوە.

بەلام ئیدی ئەو دووانەم نەدیتەوە، ئێستاش نازانم لە کوێی دنیا کەوتنەوە.

گارە، مالاوا...

دەنگی تۆپ دێ.

-٣-

**گوندێك دەیگوت**
**ئەگەر نیازی ئاسمانت لە دڵە،**
**دەستی لای من بگرە و**
**نوردووە نانێکیشم لێوەرگرە...**

هێشتا رووناکایی سپێدە بەر هیچ لووتکەیەکی گارە نەکەوتبوو، بەڕێکەوتین، هەوکە نازانم چ دەمی رۆژە، بەلام دەزانم وا گەیشتینە ئەو هەورازەیەی کە رێك ئەو پارچە زەویەی(بانێ)ی ئاسمانیی بە سەرەوەیە، لە جێگەیەکی ئەو هەورازەیە کە جارێکیدی لە هەمان جێ لە رادیۆکەی وشیارەوە، کە رادیۆیەکی گەلێك جوان بوو، هەواڵی مەرگی تایەر تۆفیقم

بیست، مەرگی وی لە کنە من مەرگی پیاوێکی ئاسمانی بوو، ئەو بانێیە گوندێکە کەوتۆتە نزیك ئاسمانێ، چ بڕواناکەم گوندێك هەبێت لەو دنیایە لە بڵندی بگاتە شانی بانێ، هەموو خەڵك دەیانگۆت:

بانێ لە ئاسمانێیە خۆ لە زەوی نیە.

دەیانگۆت:

خەڵکی بانێ ئاسمانیی هەڵکەوتوونە، خەسلەتی خەڵکی سەر زەویان تێدا نیە...

هەر لە بارەی بڵندیی بانێ دەبێت ساڵێك یان پتر بۆ دواوە بگەڕێمەوە، واتە ئێستا چەند بۆ دواوە گەڕاومەتەوە تۆ ساڵێك و تۆندەیدیکەشی بخە سەری:

ئێمە دەستەیەك پێشمەرگە لە لای کۆلەکانەوە رووەو بانێی ئاسمانی دەچووین، لە رێ تووشی پۆلێك پێشمەرگە بووین، دیاربوو رێمان یەك بوو، ئەو پۆلە لە پێشمەرگەی سێ پارتی قاچاخ پێکهاتبوون (گەل، ئاڵا، ئێتجای...) ئەو سێ پارتە هەر یەکەی لە پارتێکی گەورە قاچاخ بوون، لێیان جیاببوونەوە، ئیدی هەر چوار پارت وا بۆ ئاسمانێ هەڵدەکشێین، بۆ بانێ، هەر هەڵکشاین و هەر نەگەیشتینێ، لە بیرم بێت من جاری یەکەممبوو، لەو رێیە ئاسمانیە بدەم، لە رێێ پێشمەرگەیەك وا بزانم (حاجی مەمۆ)یان دەگۆتێ لە یەکەم دیتنیش نازانم بۆ خۆشمویست، دیاربوو ماندووببوو، گوتی:

ئەرێ دەبێت گوندێك هەبێت لەو دنیایە هێندەی بانێ بڵند و نزیك لە ئاسمانێ بێ؟!

پێشمەرگەیەك هەڵەم نەکردبێت ناوی بڵند بوو، بە بەژنیش بڵند بوو، ئەوها وەڵامی حاجیی دایەوە:

زۆر گوند هەیە لە بانێ بڵندتر، بانێش هێندە بڵند نیە، بەڵام ماندوویتی

وا بلّندی کردۆتەوە.

پێشمەرگەیەکیدی جەوهەری ناو بوو، لە هەمووانیش تیژتر دەڕۆیشت وەلامی بلّندی دایەوە:

دە ناوی یەك گوندم پێبلێ کە لە بانێ بلّندتر، مەگەر تەنها بە خۆت لەو بلّندتر بیت!

لەو هەورازە پرزەپرووکێنە لەو ماندوویێتیە پڕ تینوێتیە بووە یەك پێکەنین، بۆ چەند ساتێ تینوێتی و ماندوویێتیم لە بیر چۆوە.

با بێمەوە ئێستا، ئێستای ئەو گوندەی دەکەوێتە بن بانێ، نا بەر لەوەی بێمەوە بن بانێ، دەگەڕێمە گرانیی گەورەی دووەم، ئەو گرانیەی لە هەولێرێ کەپەکیش دەستنەدەکەوت، باوك هەبووە منداڵێکی خۆی فرۆشتووە تا منداڵەکانیتری بژین، چەند کەس بەرگەی برسێتی منداڵەکانی نەدەگرت و خۆی بە زیندا دەدا، مووچەی مانگانەی مامۆستایەك کیلۆ شەکرێکی پێنەدەهات، ئەو گرانیەی لە وشکەساڵی و شەڕی جیهانیەوە نەهات، ئەو گرانیەی ((پێشمەرگە)) هێنای، ئەو گرانیەی کەس بە کەس نەبوو، لەو گرانیەدا، حاجی مەمۆ لە بنی دنیاوە، ناوە ناوە دۆلاری دەناردەوە، چەند کەسێکی راسپاردبوو بە سەر نەدارانیدا دابەشی بکەن، من جارێك شتێکم بەرکەوت.

گوند مەیلەو چۆل بوو، ناوێکی نزیك لە چاربۆتی هەبوو، تاقولۆق خەڵکت دەدیت، هەر چۆنێك بوو مەنجەڵە ماستێکمان پەیداکرد، بە نانی خۆمانەوە خواردمان.

تۆپ، پێش ماوەیەك کە لە گوندە ئاسمانیەکە بووین، لە دڵی خۆم گوتم، تۆپ لە ئاسمانێ ئەوهامان لێبکاتن ئەدی ئەگەر بچینەوە سەر زەوی دەبێت چ بقەومێ!

-٤-

**زەوی ژنێکە زار پڕ لە گلەیی**
**دەڵێتە زێ: ئەگەر رێت کەوتە ئاسمان پێبێژە:**
**بیکە خاتری خواوەندی نەرمی**
**چاوێکت لێمبێ**
**هەموو گیانم ئاسنڕێژە.**

گەیشتینە گوندێك ناویم لە یاد نیە، لێ بیرمە لەوێوە بە دووربین رێـزان جوان دیـاربوو، داروبارەکـانی دیـاربوون،(هەڕنێ)ش هێنـدە دوور نـیە، ئەو گوندەش نیوە چۆلە، لە دامێنی گوند پشووێکمان دا، گۆمـاوێکی گەورەی لێبوو، لە لایەکیەوە ئـاوێکی کەم دەڕژایە گۆمـاوەکەوە، واتە گۆماوێـك لە دەو کانی، نەمدیت ئاوی لەبەر بڕوات، دیاربوو ئەو گۆماوە تایبەت بوو بە مەڕو ماڵات، پیس بوو، پـڕ لە ریـخ و قشـپل، دوو سـێ چـوار بـنە داری گەورەش گۆماوەکەیـان لە سێبەرێکی چـڕ گرتبـوو، ئێمەیـان لە سـێبەری خۆیان حەساندەوە.

جگەرەیەکم پێچابۆوە وا بزانم دامنەگیرساندبوو، ئـێمە و گۆمـاو و ئەو درەختـانەی سێبەریشـیان لێکردبـووین لە پـڕ هەموومـان کەوتـووینەتە بـن سێبەرێکی گەورەتر و چڕترەوە، سەرەتا وامزانی پەڵە هەورێکە و بەگرمەوە بەری رۆژی لێمان گرت، هاڕەیەك هات زەویی لەرزانـد، ئـۆی چ ببینـین، رەوە فڕۆکەیەك بەری ئاسمانیان گرتووە، ئاسن ئاسن، بە سـەرماندا ئاسـنیان بارانـد، دنیـا لە تەپوتـۆز گیـرا، لە خـوار ئـێمەوە دووکەڵ دەتگـوت لە دۆزەخەوە بەرزدەبێتەوە، من کەوتـمە چ بارێـك و چەنـد ترسـاوم، نـاتوانم ئەوکاتی خۆم نیشانبدەمەوە و بگێـڕمەوە، ئەوە نەبێـت، لە ماسـی سـووکتر خۆم فڕێـدایە نـاو گـۆمەکەوە ئەو گۆمـاوەی ریـخ دەتگـوت سـەرتوێیە و سەری گرتووە، ئاگام لەوەش هەبوو برادەرانیش جەمەدانیەکانیـان دەخسـتە

ناو ئاوەکەوە، لە بیرمان بێت سەردەمی کیمیا، سەردەمی سەدام و عەلی کیمیایی هەموو شتێکی پێدەکردی، من لە ترسی کیمیا وامکرد، دەیانگوت:

لە دنیایێ - دنیای کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیست لە کوردستانێ- تەنها سێ شت هەیە لە کیمیا بتپارێزێت:

١- بەرزایی تا بۆت دەکرێ بە بەرزایی هەڵگەڕێ.

٢- ئاگر، لە دەوروبەری خۆت ئاگر بکەوە.

٣- ئاو، خۆت تەڕ بکە.

من دەستم بە ئاوەکە راگەیشت، کاتێ فڕۆکەکان بزر بوون، یەك پێ بەرەو بەرزایی رامانکرد، فریا نەکەوتین دەنا ئاگریشمان دەکردەوە، لە هەلاتنێ لە هەواڵی یەکترمان دەپرسی، قسەمان لە رووداوەکە دەکرد، ئەوەی لە بیرمە:

+ ئەوە کیمیا نەبوو؟

+ نا، باوەڕناکەم.

+کێ دەڵێت هەو نەبوو؟

+ کوا هیچمان لێهاتووە!

+خۆ یەکسەر بە دیار ناکەوێت.

+لێمان دوور بوو.

+کەس چاوی ئاو ناکات، نازووریتەوە؟

+ ئای دەڵێی من چاوم دەزووریتەوە.

+ نا چ نیە تۆزی کەوتۆتێ.

+ نا، کیمیا نەبوو.

+بۆنی سێوت کرد؟

+ من دەڵێم هەوبوو، بەلام باش بوو زوو خۆمان رزگارکرد.

لە دوورەوە تەماشای جێگەی بۆردوومانەکەمان دەکرد، کە رێك دامێنی گوندەکەی گرتبۆوە، نازانم چۆن ئەو فڕۆکانە ئەو هەڵەیان کرد و

ناو گوندیان نەگرتەوە، رەنگە وایان دانابێت کە ئەو چەندماڵەی لەو گوندە ماونەتەوە، خۆیان لەو دۆڵاییە شاردبێتەوە.

دارا، زۆر جاریدیش دەیگوت:

هەموو ئەو دووکەڵانە دەناسمەوە کە کیمیایین، لە رەنگیان دیارە، هەموو ئەو بۆنانە دەناسمەوە کە کیمیا لە خۆیانی دەدات، هەتا دەنگی ئەو ناپاڵم و تۆپانەش دەناسمەوە کە کیمیایان هەڵگرتووە.

دارا، دەمگەڕێنێتەوە چەند ساڵێك دواتر، گرانیی گەورە لە سەر رەوینەوە بوو، ئەو کورە هەر لە خۆڕا کەوتە بەر پەلاماری خێڵێك لەو خێلانەی بە هەولێر وەرکرابوون، هەر کاتێك خێل دەستی دەدایە چەك و بە کۆڵان وەردەبوو، پۆلیس دیار نەدەما، دەرگای پۆلیسخانەیان لە سەر خۆیان دادەخست، تا تەقە دەبڕا، تا شەڕ دەوەستا، تا خێڵ دەگەڕایەوە ماڵ، پۆلیس نەدەهاتە گەڕەك، ئەو دەمەی پۆلیس هات دارا و چەند ژن و پیاوێ لە ناو خوێن دەگەوزین، بە گوللەی خێلی شاری گیانیان سپارد.

بە پێی ناسینەوەکانی دارا ئەوەی ئێمە گوێمان لێبوو، دیتمان، بۆنمانکرد، کیمیا نەبوو، بە تێکڕای دەنگ دەنگمان لەسەر ئەوە دا کە ئەوەی بوو کیمیا نەبوو.

لە رێێ هەموو بە من پێدەکەنین، بە ترسانی من پێدەکەنین، یەك گوتی:

ئەدی تۆ ناڵێیت، من مەلە نازانم، نەترسای بخنکێیت!

یەکیدی دەیگوت:

ماسیەکی جوان بوویت لە ناو گۆمێ.

یەك دەیگوت:

بە ئاوی حەفت زێ بۆنی ریخت لێنابڕێ.

یەکیدی لە بەرژەوەندی من قسەی کرد:

چ جەمەدانیت لە ریخاوێ هەڵبکێشی، چ هەموو جلکەکانت، چ جیاوازیەکیان نیە...

ئیدی وازیان لێمهێنا، هەستمدەکرد بۆنی ریخ گێژم دەکات، بۆنێك سەد قات لە بۆنی کیمیا ناخۆشتر، ئاخر دەیانگوت کیمیا بۆنی سێو و ئەو شتە خۆشانەی لێدێت.

لە لای راستمانەوە تۆپ، تۆپ...

-٥-

**پێشمەرگە سۆراو و سپیاوی ژیانی دزی و**
**بە ئاشکرا لە رووی مەرگی هەڵسوو**
**ژیان جوانترە لە جاران**
**مەرگ مەرگترە لە جاران و جوان نەبوو..**

هەوکە نازانم چ کاتە، رێمان کەوتەوە نزیك زێ، گوتیان:

ئیرێهێ (بلێ)یە.

بلێ چ بلێ ، خشتێکی بە پێوە نەماوە، دەتگوت لە سەردەمی سوڵتانەکانی ئۆسمانیەوە وێران بووە، تفەنگهاوێژێکیدی پتر رۆشتین، رێگە چۆوە سەر زێ، جێگەیەك هەموو داروبار بوو، لەوێ درەختی زۆر بە تەمەنم دیت، تەمەنیان لە شۆڕشی کورد کەمتر نەبوو، لە شکستی کورد کەمتر نەبوو، لە سەر درەختێك بە قەڵەمبڕەکەم نووسیم:

ئەوجارەش خەریکە دەردەچین.

بە ئاوی زێ تامی گۆماوەکەم لە خۆم سڕیەوە، لە بن ئەو درەختە بە تەمەنانە کە سێبەرێکی فێنکیان بە سەر کەناری زێدا هەڵخستبوو، دانیشتین و هەر یەکە قوتووە گۆشتی خۆمان گەرمکردەوە، بەڵام بە ئاگرێکی وا کە دووکەڵی زۆر بەرز نەبێتەوە، ئەوەش بڵێم ئەوە بۆ یەکەمجارە کۆڵەپشتی من لەو جۆرە گۆشتانەی تێدا بێت، ئەوانەی سەلکە چێڵە جوانەکەیان تێدایە، نەهاژی جاروبار بە یادی بن ئەو دارانەوە لەو جۆرە گۆشتە دەخۆم، بەڵام تامی ئەوێ لە کوێ هی ئێرە لەکوێ، چ تامێکی

هەبوو خودایە! چایەشمان لە بنە مەتارە لێنا، من تا بۆم کرابێت نەمهێشتووە کۆڵەپشتەکەم شەکر و چای لێبېڕێ، زۆر پێشمەرگەیدیش مینا من...

ئەو جێگایە گەلێک جوان بوو، دیمەنێکی دڵڕفێنیان لە چاوت دەنەخشاند، لەوێ بە دەست خۆت نەبوو دەبوویتە کەسێکی رۆمانسی، ئەویندار، حەزت دەکرد بە ئەوین جێگاکە جوانتر بکەیت، بە دەم شەپۆلی زێوە، بەدەم لەرینەوەی گەڵای دارەوە، بە دەم ئەو بایە فێنکەی دەتگوت لە عەشقستانەوە دێت تێکەڵی شەپۆل و شنە و لەرەی ئەوین بیت، من لەوێ بە خەیاڵ دەستی کچێکم گرت و لە کەناری زێ دانیشتین و بە دەم قسەی خۆشەوە پێمان دەخستە ئاوەکەوە، لە هیکرا دەنگی فرۆکەیەك کە لە بەرزایی زۆر بەرزەوە دەهات ئەو خەیاڵە جوانەی لە ئاوەکەدا دەخنکاند... پشتم بە درەختێك دا، دەبێت خەوم لێکەوتبێت، ئاخر خەونێکم دیت، خۆزگە لە هەر خەوتنێ سەد خەونی ئەوهام دەدیت.

ئەوەش هەر تۆپ بوو.

-٦-

**لە چارەی رەشی رەشماڵێ، وا نووسراوە:**
**لە خۆم چارەڕەشێ**
**دەبێت لە دنیا خۆم بپێچمەوە**
**ئاغا لە هەموو دنیا هەڵیداوە...**

لەزگ بوو رەشماڵ لە بیربکەم، بەر لە گێڕانەوەی خەون دەبێت بۆ ئەو رەشماڵە بگەڕێمەوە، ئەو رەشماڵەی لە نزیك ئەو گوندەی کە فرۆکەکان هەرچی پەلە ئاسنی رووسیا و ئەمریکا و دنیا هەبوو بە سەرمانیاندا باراند و من لە ترساندا خۆم هاویشتە گۆماوی ریخەوە، لەوێ کەمێك دوور لە رێ، رەشماڵێکی رەشکۆکە لە چۆلەوانی هەڵیدا بوو، رەنگە بۆ پڕکردنەوەی مەتارە بووبێت لاماندایە تاقە رەشماڵ، ژن و پیاوێك و دوو سێ منداڵی سەلکە و بنکە لە زاری رەشماڵێ دانیشتبوون، دە پازدە سەر

بـزنیش لە دەورەی رەشـماڵێ دەلەوەڕان، سـەگەکەش هەر بە دیتنـی ئـێمە دنیای تێگەیاندین، بەڵام بە بانگکردنێکی پیاوەکە کڕبـوو، کڕبوونێـك وەك ئەوەی رادیـۆ بکـوژێنیتەوە، هەتـا هەستاشـین گوێمـان لە دەنگـی سـەگ نەبۆوە، قسەیەك لەو قسەیەك لە ئێمە، بۆچی لەو دنیا ئاوەدانە بە تـاقی تەنـێ و لەو چۆلەوانیە هەڵیداوە؟ کابرا سوێندارانە سەرهاتی خۆی گێـڕایەوە، زۆر بە کورتی سەرهاتی تاقە رەشماڵ ئەوەیە:

ئەو ماڵە خەلکی ئەودیوی گوندە ئاسمانیەکە بـوون، گونـدێك نزیـك لە گونـدی کـافێ، لەگەڵ ئاغـای ئەو دەڤەرە دەبێـتە کێشـەیان، بە هەڵەدا نەچووبم ئاغا ناوێکی وەکو رەزای هەبوو، لە نـاو پێشـمەرگانیش پلەیەکـی گەورەی هەبوو، ئاغا گۆتبوویە ئەو پیاوە لە دنیا تەریوە:

ئەگەر پەشـیمان نەبیـتەوە لەو ئـیش و قسـەیەت، ئەوا دەڤەربەدەرت دەکەم.

کابراش دەیگۆت:

منیش ئەوها وەلامم بۆ ئاغا ناردەوە:

ئەگەر دنیابەدەریشم بکەیت، لە قسەی خۆم پەشیمان نـابمەوە، چـونکە من چ هەڵەیەکم نەکردووە.

ئیدی ئاغای پێشمەرگە بڕیار دەدات:

ئەگەر هەتـا سـێ رۆژان ئێـرە بەجێنەهێلیـت، ژنەکەت بێـوەژن و منداڵەکانت هەتیو دەکەم

ئاغا گوتبووی:

هەتا من لە ژیان بمێنم، هەتا کـوڕ و نەوەکـانم لە ژیـان بمێـنن، تـۆ و نەوەکانیشت پێیان بێرە ناکەوێتەوە.

پێش هەستانمان پیاوە لە ئاغا یاخیەکە گۆتی:

نازانم چ بکەم! ئەگەر سەریشم تێـدا بچێـت سـەر بـۆ ئاغـا شـۆڕناکەم، لێـرەش نـاحەوێمەوە، ئەورۆ نـا سـبەی بەر دەسـتی حکـومەت دەکەویـن، ناچارم خۆ رادەستی حکومەت بکەمەوە، لە ناو حکومەتیش لێم نـاگەڕێن

له ماڵی خۆم دانیشم، دەبێت چەك هەڵبگرم و ببمە جاش، كە بوومە جاشیش ئەوە دێمە شەڕی پێشمەرگان، دێمە شەڕی ئێوە.

چەندی سەرمان هێنا و برد، چ چارەیەكمان بۆ ئەو پیاوە نەدیتەوە، من بیرم كردەوە ئەو ئاغایەم دیوە و لە دڵی خۆمە گوتم: دەستخۆش دكتۆر مەحموود، هەر تۆ باشت ناسیبوو.

-٧-

**گوڵ لە هەموو پەنجەیەك زویرە**
**بە پەنجەی ئەوینداریشەوە**
**بەڵام منداڵ پێشی لێنێ**
**هەر گوڵە و پێدەكەنێ.**

دەڵێی خەونێكی شەرماویە، بۆیە هەر خۆم لە گێڕانەوەی دەپارێزم و بۆ ئەولاتر دەگەڕێمەوە، جارێك لەگەڵ دكتۆر مەحموود، مەبەستم دكتۆر مەحموودی بە راستی نیە، ئەو دكتۆرە خەڵكی رۆژهەڵات بوو، ژنەكەی خوشكی ئەو سەعیدەیە كە لە هەموو ئێرانیان ئێراناستر بوو، لە هەموو شاعیرانیش جوانتر شیعری دەخوێندەوە، ژنەكەی دكتۆر ناوی فیردەوس بوو، لە جوانیدا هیچ فیردەوسیەك نەیدەگەیشتێ، تا بڵێی بەرێز و ژیریش بوو، دكتۆر مەحموودیش زۆر جوان بوو، ئەو دوو جوانە كچێكی تەمەن سێ چوار ساڵەیان هەبوو، (سنوور) چ سنوور لە جوانیدا نە لە عەرد نە لە ئاسمانێ منداڵی ئەوها جوان كەس نەیبینیوە، كەس باوەڕی نەدەكرد ئەو منداڵە زادەی مرۆڤ بێت، هەتا دایك و باوكی لێی بە گومان كەوتبوون كە ئەو سنوورە لەوان بێت، هەر ئەو جوانیەشی وای لە هەندرێن كرد كە كاتی خۆی ئەو سنوورە جوانە بخاتە شیعرێكی جوانەوە.

ئەو دكتۆر مەحموودە كە نیوە دكتۆریش نەبوو، ناوی دەركردبوو، نەخۆش نەبوو بە دەرمانی وی چاك نەبێتەوە، زۆریش ماندوو بوو، لە

هەرجێگەیەك نەخۆشێك هەبایە و توانای هاتنی بۆ بارەگا نەبایە دەچوو، هەقی نەبوو دووره نزیکه، بەفره بارانه، شەوه رۆژه، چەند جارێك منیش لەگەڵی چوومەتە سەر نەخۆشان، گوێم لێبوو بە منیشیان دەگوت دکتۆر، خەڵکی ئەو گوندانە ئەوها بوون، ئەوەی لەگەڵ دکتۆریش بگەڕابا دەبووە دکتۆر، رۆژێك دوو پیاوی ئەو ئاغایە، بەهەڵەداوان هاتنە بارەگا و گوتیان:

ژنی ئاغا زۆر نەخۆشە.

من بەگەڵ دکتۆر کەوتم ، گوندی ماڵی ئاغا نزیك بوو، کە گەیشتینە گوند دکتۆر گۆتیە دوو پیاوەکەی ئاغا:

ئێوە بڕۆن، من خۆم دێم.

ئەوانی بەڕێکرد، لە پەرگەی گوند چووینە ماڵێك پیرێژنێکی زۆر پیر لە جێ کەوتبوو، بە دیتنی دکتۆر قیتبۆوە و گوتی:

ئەز حەیرانێ تەم، وەرە وەرە...

دکتۆر پشکنینێکی خێرای بۆ کرد و چەند دنکە حەبێکی دایێ...

لەو ماڵەوە چووە ماڵێکیدی، هەتا گەیشتینە ماڵی ئاغا، لێم نەبێتە درۆ شەش ماڵی کرد، ماڵی حەوتەم ماڵی ئاغایە، لە رێ گۆتمە دکتۆر:

بۆچی یەکسەر نەچوویە ماڵی ئاغا؟

گوتی:

با تێبگات کە من پێش ئەوەی چارەسەری ئاغایان بکەم، هی کرمانجان دەکەم.

گوتم:

بەڵکو نەخۆشەکەیان لە بارێکی ترسناك بێت و هەتا دەگەینێ بمرێت.

بە پێکەنینەوە کە کەس زار و ددانی نەدیوە، لەبەر سمێڵە گەورەکانی:

نا، دەزانم نەخۆشیەکەی هێندە ترسناك نیە.

هەر لە بارەی سمێڵی دکتۆرەوە جارێك برادەرێك بە فیردەوسی گوت:

ئەرێ تۆ دەمی دکتۆر مەحموودت دیوە؟!

کە گەیشتینە ماڵی ئاغا، دکتۆر سلاوێکی ساردی کرد و گوتی :

کوا نەخۆشەکە؟

چووه سەر نەخۆش و نازانم دەرزی لێدا، حەبی دایێ، زۆری نەبرد گوتیان نەخۆش حاڵی زۆر باشە، وا بزانم نەخۆشەکانی دەڤەری زێبارەتی هەر بە دیتنی دکتۆر مەحموود چاکدەبوونەوە.

دەمدیت دکتۆر زۆر ئاغایانە رەفتار دەکات، لێم تێکچووبوو رەزا ئاغایە یان مەحموود، ئاغا بە رێزەوە قسەی لەگەڵ دکتۆر دەکرد، بەڵام دکتۆر بە سەری لمووزەوە وەلامی دەدایەوە، ئاغا سوێندی خوارد کە نیوەڕۆ نابێت بڕۆین، چەندی کردمان بەلاش بوو، دکتۆر حەزی نەدەکرد لە ماڵیان بمێنێتەوە، بەڵام ئاغا نەیهێشت، لە کاتی دەستشووشتنێ، دەبینم دکتۆر مەحموود لە ئاغا ئاغاتر دەستی لە سەر دەستشۆرك راگرتووە و کەمەربەست ئاوی پێدا دەکات، من دەستمم نەشووشت، بە چرپە گۆتمە دکتۆر مەحموود:

مەحموود ئاغا، ئەز غولام، فەرمان بدە، چ شۆل نینە؟

مەحموود دایە یەك پێکەنین ئاغا بێ ئەوەی بزانێ چ باسە لەگەڵ مەحموود پێدەکەنی، هەر بە چرپە مەحموود ئاغا ئەوها وەڵامی دامەوە:

لێرە دەبێت ئەوها بکەیت، دەنا رێزت ناگرن، تووڕەم مەکە، دەنا لە دوای نانخواردنێ، دەبێت ئاغا بە دەستی خۆی ئاو بە دەستی مندا بکات.

کاتێ ماڵی ئاغامان بەجێهێشت، دکتۆر مەحموود ئاغا، گۆتی:

کوڕە تۆ ئەو ئاغایانە ناناسیت، نازانی چ لەو خەڵکە هەژارانە دەکەن.

دکتۆر دەنگی دابۆوە، بەڵام نەشتەرگەریەك هەر بە جارێك پلەی دکتۆری بردە ئاسمانێ، نە من نەکەس نەمانبیستبوو، دکتۆر نەشتەرگەریی گەورەی ئەنجام دابێت، بۆ خۆی لە هی گچکە دابوو! ژنێك چەند رۆژێك بوو بەژانەوە بوو، رزگاری نەدەبوو، دەستیشی بە هیچ شارێك، دکتۆرێك رانەدەگەیشت، ئەو ژنە بە خەزوو بە مێردەوە پێشمەرگەی پەکەکە بوون، وازیان لێیان هێنابوو، لە ترسی وازهێنان وا بزانم خۆیان خستبووە بارەگای(ئیتجای دیموکراتی)، هەواڵ گەیشتە دکتۆر مەحموود، گوتی:

بۆ منی لێبگەڕێن.

دواتر بۆمی گێڕایەوە:

کتێبێکم هەبوو لە سەر منداڵبوون و نەشتەرگەریی ژنان، بە خێرایی خوێندمەوە.

دکتۆر، تانیای بەگەڵ خۆیدا، ئەو تانیایەش شتێکی لە داو و دەرمان و برینپێچی دەزانی، دکتۆر کە تەماشای ژنەی کردبوو، گۆتبووی:

بەس نەشتەرگەریی گەورە چارەیە دەنا هیچ.

بە مێردی ژنەکەی گۆتبوو:

من بە ناچاری خۆم لەو کارە دەدەم، ئەگەر دەرچوو ئەوا دەیکەینە شایی، بەڵام ئەگەر دەرنەچوو نەمکوژی!

مێردە رازیبوو. دەیانگوت:

ماوەیەکی باشی پێچوو، هەر هێندەمان زانی گریانی ساوایەك مژدەیەکی دایە بارەگا، پاش ماوەیکیدی دکتۆر لە ژووری نەشتەرگەری، کە ژوورێکی گچکەی نەوی بوو، بە خۆ و بە سمێڵە گەورەکەیەوە سەری هێنابووە دەرێ و گۆتبوویە مێردەکەی:

شایی شایی.

ئیدی ئەو نەشتەرگەریە گەورەیە دکتۆر مەحموودی کردە ئەفسانە.

-٨-

**دەنگێك لە رووبارەوە دێ**

**ئەگەر خوداوەندیش نەبێ، لە هی وی دەچێ:**

**لە لانکەوە تا گۆڕ**

**هەیە و نیەی دنیا هەموو**

**جگە لە خەون، وای لە خەون**

**تەنێ خەون بەرزەفت نەبوو..**

من دەبوو زووتر بڵێم کە لەو دەستەیە ژنێکیشمان لەگەڵە، ژنێك دەمێکە

پێشمەرگەیە، من لەمێژە دەیناسم، ئەگەر خەونێکی وام نەدیتبا، بە ڕێزەوە ناویم دەهێنا، بەڵام چ لەو خەونە دەکەیت، یان نابێت بیگێڕمەوە، یان نابێت ناوی پێشمەرگە ژنەکە بە زارمدا بێ، ڕەنگە گێڕانەوەی خەونەکە لە ناوهێنانی ژنەکە خۆشتر بێت.

ڕوو لە زێ، پشتم بە درەختێك دابوو، ئەو درەختەی شتێکم لە سەری نووسی، نازانم کێ جلکەکانمی داکەند، ئەوەش نازانم چۆن بە رووتی لە دەو کەنارەکە ڕاکشاوم، لە پڕدا دیتم، تیتلەکناچەیێ بە سەرمەوە نەرم نەرم باڵەکانی لێکدەدات، وەک بڵێی باوەشێنەم بکات، هێندەی بڵێی یەک و دوو، تیتلەکناچە بووە ژن، ژنێك زۆر لەو ژنەی وا لەگەڵمانە دەچوو، لە چاو تروکانێك ئەویش خۆی رووتکردەوە، چ لەشولارێکی بەفرینی هەبوو خودایە! لە سەرڕا خۆی پێمدا دا، خەریکبوو پەراسووم بشکێ، بەڵام لە خۆشیدا قسەم نەکرد، لەو دەو زێیە کە بە لمێکی جوان ڕازابۆوە، لمێك هەر هی ئەوە بوو ئەوینی تێدا بکەیت، هەر هی ئەوە بوو کچێکی وەك ئەوەی وا لە باوەشی منە، لە باوەشت بێت و یەکتر بگەوزێنن، ئێمە واماندەکرد لە ناو لمێ یەکترمان دەگەوزاند، لە دوا گەوزدا من کەوتمە سەرەوە، ئەوکات بە جوانی لە دەموچاویم ڕوانی و دڵنیابووم کە ژنە پێشمەرگەکەیە، لەو ساتە دەنگێك لە گوێی من زۆر بەهێز بوو گوتی:

هەستە، هەستە...

چاو دەکەمەوە، هەموو لە سەر ڕۆیشتنن، ئەوەی بانگیشمی کرد ژنەکە بوو، یەك کەمی مابوو بڵێم:

کچێ خواگیر، لە خەونێش ڕێنادەی تامت بکەم.

لە ڕێ هەتا گەیشتینە جێ، دواتریش بە خەیاڵ دەمویست بەراوردێك لە نێوان ژنی خەونێ و ئەو ژنەی وا لەگەڵماندا بە جلکی پیاوانەوە دەڕوا بکەم، دەمویست هەر چۆنێك بێت شوێنێکی ناسکی ئەو ژنە بە ڕووتی ببینم، جار جارەش ڕقم لەم خولیایەی خۆم دەبۆوە و خۆم بە خۆمم دەگوت:

چەند پیسم، ئەو بە چاوی برایەك تەماشام دەكات، كەچی من...
دنیا دەنگی تۆپی لێنابڕێ

-٩-

**لە ڕێی شەویا**
**كزەیەك لە پەیامی سرووشت گەیشت:**
**لە مرۆڤ دەمدەمیترم نەدیوە**
**دەمێك نەفرەت دەنێرێ**
**دەمێك شاگەشكەی جوانیمە.**

بـڕۆ، هەر بـڕۆ هەر نەگەیشـتینێ، تاریكیمـان بەسـەردا هـات، تـاریكی ڕێگەوبانی داپۆشی، تاریكیەك چاو چاو نابینێ، من چم نەدەدیـت، نە عەرد نە ئاسمان، نە پێشمەرگە نە هیچ، نەمدەزانی ئەوەی پێشـەوە، چاوسـاخەكە، چۆن بەو تاریكیە كە هێسـتریش ڕێ نـابینێتەوە ئەو دەیبینێـتەوە، لە هەنـدێ جـێگەی چیاشـەوە ئـاگر بەرز دەبـۆوە، بەڵام ئەو ئـاگرە نەك هەر ڕێـگەی ئێمەی ڕووناك نەدەكـردەوە، بەڵكـو تـاریكی پتـری دەهێنـا، بینـایی نابینـاتر دەكرد، برۆ، شەش حەوت پێشـمەرگە تیـژ تیـژ تاریكیمـان دەبـڕی، نـازانم بۆچی ئەوها خێرا دەڕۆیشتین، چاو ساخ ناوە ناوە دەیگوت:
نەكەن، جگەرە داگیرسـێنن، ڕووناكـایی دنـكە شـخاتەیەك، یەكسـانە بە مردنمان.

خـودایە ئـێمە لە كـوێین، ئێـرە كـوێیە كە مـردن لەگەڵ هەڵكردنـی جگەرەیەك بگاتە سەرت، كوا مۆڵگەی جاش و سەربازان لە كوێیە؟

لە دۆڵایـیەك پشـوویكمان دا، لەو دۆڵایـیە جـگەرە پێكـردن قەدەغە نەبـوو، بەو تـاریكیە لەسـەریەك، دوو سـێ جـگەرەم پێچـایەوە، لە كـاتی حەسـانەوەش ژنەكەی نـاو خەون و دەرەوەی خەونەكەم بیـردەكەوتەوە، هەتا گەیشتینە ڕووناكی جارێكیدیش بێنێكمان دا... لە بەرزاییەك مانگمـان لێهەڵهـات، مانگێـك بە قەد ژمـارەی جـاش و سـەربازان ئەسـتێرەی لەگەڵ

خۆی هێنا، لە کاتی ماندووبوون و ترس و برسێتی و تینوێتی، کێ جوانی لە سرووشت دەبینێتەوە؟! من لەو بەرزاییە کە هێندەی دیرۆکێک ماندوو بووم، هێندەی گرانیەك برسی بووم، هێندەی بیابانێك تینوو بووم، هێندەی هەموو ئەو کارمامزانەی کە لە چیای شیرین، ئەو چیایەی بەو شەوە رووناکە وا لەو بەرەوە لێمان دیارە، کەوتوونەتە ناو تەقوتۆقەوە، ترساوم، چۆن چێژ لە تریفەی مانگەشەو وەرگرم، لە درەوشانەوەی ئەستێران وەرگرم، لەو بایە فێنکەش وەرگرم کە دوور نیە لە ئاقاری بەهەشتەوە هەڵیکردبێت!

لە جێگەیەکیدی لە دەو چەمێك لە ناو هەیوەشەوی هاوینی پشوویکمان دا، تێرمان ئاو خواردەوە، مەتارەکانمان پڕکردەوە، لە سەر برسێتی جگەرەمان داگیرساند، لە بیرمە، کەمێك جوانیم لە ئاسمان دیتەوە و خەونەکەی خۆشم بیرکەوتەوە...

ئەو جارە دامانە هەورازەیەك، رک و رژد دەتگوت بە گوندە ئاسمانیەکەدا هەڵدەگەڕێین، هەر سەرکەوتین و نەگەیشتینێ، لە دڵی خۆم هەزار جوێنم بە هەورازان داوە، جوێنم بە خۆم و بە دنیا داوە.

تۆپ خەوی نیە...

-١٠-

جارێ دنیام نەدیوە
بایی تەمەنێك پێڵاوم دڕاند
خوداوەند، زۆر ماندووم، ماندوو
زاری پڕ لە هاتوهاواری شەڕ بگرە
نیازمە کەپرێك هەڵدەم لە پشوو...

بەیانی نەدابوو، هێشتا جگە لە ئێشکگر پێشمەرگەی بارەگا هەموو لە خەوێ بوون، ئیشکگر دەنگی داین، وا بزانم شێخ شوان بوو، لە بن کەپرێکی گەورە دواتر زانیم جێگەی نانخواردنە، خۆمان بە عەردی دادا،

من کفت بووم، هەر بە برسێتی، نا، نا، نانێك دووانم هەر بە وشكی لـوول دا، بەڵام بـێ بیرکـردنەوە لە دنیـا و پەسـڵان، چـوومە خەوێ، نـازانم ئەوانیـدی، کـاتێ بە ئاگاهـاتمەوە چێشـتانێکی درەنـگ بـوو، پـێش ئەوەی چاکوچۆنی لە برادەران بکەم ،چوار پێنج هێلکەم تێکردە رۆنێ، وەرگەڕێ نازانم چەند نان و چایەم پێوە خوارد.

کۆمەڵێك پێشمەرگە کە پێشتر دەمناسین و مـاوەیەك بـوو نەمـدیتبوون، لەوێ دیتمـنەوە لەوانە(دیـار، هەنگـاو، شـێخ شـوان، ئەبـوو جاسـم، حـاجی دەهام، ئەبوو راستی، مەلا حەسـەن، ئەحـمەد شـاهێن، مەلا جەلال، نـادیە، مـژدە، پـۆلا، بەختیـار، ئەسـوەد، عـادل، عەونـی و سـەلامی کـوڕی...)، بە ناوهێنـانی مەلا جەلال قسـەیەکیم بیـرکەوتەوە کە لەو کاتـانەی بە ئـاوی گەرم زگاودەبووین و شادەمان بە نیو مەتارە ئاوی سـارد دەهێنـا، ئەو مەلا جەلالە دەیگوت:

ئای هەوکە لە هەولێرێ نەبیت، دەزانی لە کوێ؟ لە بن دیـواری یـانەی فەرمانبەران و لە پێش شەربەتفرۆشەکە، سێ چـوار شـەربەتی کەللەتەزێنـی تێکەی، ئەوجا...

هەر جارێك ئەو قسەیەی دەکرد منیش دەمگوت:

هاوڕێ، یانەی فەرمانبەران دەمێکە تێکدراوە، ئێستا ئەگەر عەردەکەشـی مابێت.

بەڵام مەلا جەلال گـوێی بەو هەواڵەی رووخـانی یـانەی فەرمـانبەران نەدەدا و قسەی خۆی نەدەگۆڕی، جارێك لەو جارانە گوتی:

تـۆ بە راسـتە یـانەی فەرمـانبەران نەمـاوە؟ ئەگەر واش بێـت، مـن باوەڕناکەم، تا بە چاوی خۆم نەیبینم باوەڕ ناکەم.

وا بزانم بە چاوی خۆیشی دیتبـای بـاوەڕی نەدەهێنـا بە رووخـانی، مەلا جەلال دەمێـك بـوو هەولێـری بەجێهێشـتبوو، سـەردەم سـەردەمی ئەحـمەد حەسەن بەکر بوو کە بە چیا کەوت.

بارەگـا چ بارەگـا، کـۆمەڵە کەپـرێکە بە تەلانـێکەوە، بە جـێگەیەك لە زنجیرە چیـای پێرسـەوە، جـگە لە کەپـر لێـرە و لەوێ قەرەوێڵە دەبینـرێن،

شوێنێکە مەیلەو رووتەنە داروباری کەمە، بەڵام کەپکە شاخ و گابەرد لە مشەنە، بۆ خۆ پاراستن لە ساچمەی تۆپ باشە، داروبار بە چ بمێنن، هەر لە سەردەمی سوڵتانەکانی عوسمانی و زووتریش ئێرە لە سووتانێکی هەمیشەییدا بووە، هێ لەوەش لەوەتەی پێشمەرگە هەیە تەوری بە دەستەوەیە و دار دەبڕێتەوە، پێشمەرگە بۆ خۆگەرمکردنەوە، بۆ ژیان دار دەبڕێتەوە، هەر پێشمەرگەیەك بگریت، چەند فیشەکی تەقاندووە دە هێندەش تەوری راوەشاندووە و داری بڕیوەتەوە، درەختی لە بەهار سەوزتری پەلەواژ کردۆتەوە، زۆر لادێیی هەبوون دەیانگوت:

ب خودێ هێندەی پێشمەرگە داری بڕیە، هێندە حکومەت داری نەسۆتاندیە.

جارێك ئەحمەد شاهێن قسەیەکی نزیك لەوەی کرد:

لە هەر کەسێك، لە هەر شتێك بپرسیت لە چی دەترسیت، ناوی شتێك دەڵێت، بەڵام ئەگەر لە دار بەڕوو بپرسیت لە چی دەترسیت؟ دەڵێت لە تەوری پێشمەرگە.

بارەگا کەپریەکە لە کانیەکی روون لە ئاوێنە روونتر ئاوی دەخواردەوە، کانیەکە تەواوێك دوور بوو لە بارەگا، ئەگەر ئاوێنەیەکی گەورەت روو لە رۆژێ بەرانبەر کانی راگرتبا، بە حاڵ ئەو درەختەت دەدی، ئەو درەختە کچانیەی کە بە پرچە ژاکاوەکەی سێبەری لە کانیەکە کردبوو، خۆی بۆ کردبووە سیفان، وەك ئەوەی لەو هاوینە دۆزەخیەدا نەهێڵێت گەرم بێت و هەمیشە بۆ ئێمەی پێشمەرگە بە ساردی بمێنێتەوە، نەیدەزانی ئەگەر پێویستی بکردایە دوور نەبوو ئەویش وەك درەختە خوشکەکانیدیکەی بە تەور ئاشنا بکەین، ئەو درەختە بە حاڵ دەکەوتە ناو تیشکدانەوە... ئەگەر کەسێك بیەوێت ئەو بارەگایە ببینێتەوە، با لە نێوان گوندی سەیدان و کۆلەکان رێك بەرەو چیا هەڵکشێ، هێند هەڵکشێ، هێند هەڵکشێ تا سەری لە پێرس دەخشێ، لەو بەریشەوە ئەشکەفتی شانەدەر بەرانبەری زار دەکاتەوە.

لێرە دەنگی تۆپ زۆر نزیکە...

نەمناسیەوە کێ بوو:
چیم لە تۆ ناوێ
نە بەهەشت نە دۆزەخ
نە تەمەنێکی لە خۆم درێژتریش،
ئەی هێزی دیوی نادیار،
حەزم لێیە بزانم
بکوژی من کێیە
سەر بە تیرەی مرۆڤە یان جانەوەر؟

هێمان هەر لە ڕێگەی بارەگا بووم، زانیم کە بارەگایەکی دووپشکاوی و مێشوولەییە، منیش لە دووپشك دەترسام، هێندەی لە دووپشـك دەترسـام، ترسم لە مار نەبوو، زانیبووم کە مـار تـا ئـازاری نەدەیـت ئـازارت نـادات، بەڵام دووپشك وا نیە، هەر بجوولێیتەوە چـزەت لێـوە دێنـێ، هەر ئەو ڕۆژە دەستم دا تەور و بە چیادا هەڵـگەڕام، بـایی قەرەوێـڵەیەك دارم بـڕی، لە لا چەپێکی بارەگا چوار داری گوێچکەداری هێندەی بەژنی خـۆمم لە چـوار قۆرتی قووڵ بە قەت چۆك چەقاند، لە باری درێژی بە دوو داری کەمێـك ئەستوور دوو داری گوێچکەدارم بەیەك گەیاند، دارەڕایەکی جوانم کـرد، بە گەڵا جـوان دامپۆشـی، چەنـد تەنەکە خـۆڵێکم لە سـەری رووکـرد، مـا قەرەوێـڵە درووسـتکردن هەر هێنـدە نـیە! لە بیـرم چـوو شـێخ شـوانیش هاریکاری کردم، پێش ئەوەی دەستپێبکەم گۆتیشی:

خۆت ماندوو مەکە، بەو زووانە بارگە تێکدەنێین.

گۆتم:

ئەوڕۆ دەڕۆین، یان شەو دەمێنینەوە؟

گوتی:

نا،نا ئەوها زووش ناڕۆین.

گوتم:

خۆم نەدۆزیوەتەوە، ئەوشەو دووپشك بمخۆن، بۆ شەوێکیش بێت درووستی دەکەم.

گوتی:

چەند بزنانە بیردەکەیتەوە!

گوتم:

دایکم دەیگوت:

لە ناو ئاژەڵان بزن لە هەمووان ژیرترە، چونکە بۆ شەوێك جێگەی خۆی خۆش دەکات.

بن پێچکی قەرەوێڵەشم شەوان دەکردە قوڕاو بۆ ئەوەی ئەگەر دووپشك هات، بچەقن و نەتوانن بە داردا هەڵبگەڕێن.

تۆپ، تۆپ، ناوە ناوەش چیایەك، جێگەیەك لە چیا ئاگر دەگرێت.

-١٢-

**لە جیاتی مێشوولە قسەمکرد:**
**تۆ، پێشمەرگە**
**لەو هەموو خوێنی لەشە**
**کە هەر بۆ بەخشین و رژانە**
**پیاڵەیەك بە من ببەخشە..**

بارەگا کەپریەکەی پێرس کەپری مێشوولەن، شەوی یەکەم بەو گەرمایە بەتانیم بە دەموچاومدا دابوو، بۆ شەوی دوایی پارچە کولەیەکم پەیدا کرد، پارچەیەك هەر بەشی لای سەرمی دەکرد، مێشوولەناسان ئەگەر بیانەوێت زانیاریی باش لە بارەی مێشوولەوە بە دەستبێنن، با بچەنە بارەگا هاوینیەکەی پێرس، لەوێ هەرچی جۆری مێشوولە هەیە، دەبینن و هەیە، هی ورد ورد، درشت درشت، خڕکەڵە، درێژکۆڵە...هەیانە ئەگەر کۆمەڵ کۆمەڵ و تۆپەڵ تۆپەڵ کە دەڵێی گەواڵە هەورن سێبەر بەسەرتەوە دەکەن،

ئەگەر ئەوها نەگەڕێن بە چاو نابینرێن، ئەوانە زۆر ترسناکن دێنە ناو خواردن و نابینرێن، دێنە ناو زار و گوێ و کونە لووتەوە، هەیانە خواوەندی مێشوولە لە شێوەی کۆپتەر بە دنیای وەرکردووە، شتێکی پێوەیە دەڵێی پەروانەی کۆپتەرە، شتێکی درێژ هەر رێك لە کلکی کۆپتەر دەچێت، ئەوجا ئەو کلکە درێژە وا بزانم دەندووکیەتی، چوونکە ئەو جۆرەیان لە سەر دوو بەتانیەوە تێتدەچەقێنێ و خوێنی خۆی دەبات، هەیانە بە کونی کولەوە دەچێت، بەڵام کە تێر خوێن بوو دەئاوسێ، بە خوێن ئاوس دەبێت، ئیدی رێی دەرچوونی دەگیرێ لە ناو کولە و عاسێ دەبێت و هەتا سبەینێ لە سەر خوێنی پێشمەرگە دەژی، قسەی دکتۆر لە بارەی ئەوەیانەوە بوو.

دکتۆرێکمان هەبوو غەفاری ناو بوو، پیاوێك بوو خاوێن خاوێن، هەر کاتێك بتدیتبا دەتگوت ئەوە تازە لە شارەوە گەیشتووە، لۆچێکت لە جلکی نەدەدیتەوە، دەتگوت رۆژانە ئوتووی دەکات، لە ناو ئەو تۆز و خۆڵەی چیا، لەکەیەکت بە جلکەکانیەوە نەدەدیت، رۆژانە تراشی دەکرد، زۆر لە خۆی دەخەفتی، ئەو دکتۆرە ئەگەر گوڕاحی هەبا لە خەستەخانە کە کەپرێکی لە هەموو کەپران جوانتر بوو دەهاتە دەرێ و قسەی خۆشی بۆمان دەکرد، بەڵام لە ساتەکانی بێ گوڕاحی کەڵکی ئەوەی نەبوو داوای دنکە حەبێکی لێبکەیت، دکتۆر کە کوللەیەکی لە هەموو کولان کون وردتریشی بە سەر قەرەوێڵەکەیدا هەڵدابوو، لەو جۆرە مێشوولەیان زۆر هەراسان ببوو، ئەوەی هەر رێ چوونە ژوورێی دەزانی، ئەوەی بە خوێن ئاوس دەبوو، دکتۆر غەفار دەیگوت:

ئەگەر هەر شەوەی سەد مێشوولەی ئەوها بێنە ناو کولەکەتەوە و دەو لە خوێنت کە دەڵێی سرنجە بژەنن، بێ ئەوەی تۆ هەست بە خۆت بکەیت ئەو شەوە پیاڵەیەك خوێنت بە مێشوولان بەخشیوە، ئەوجا تەماشاکە و لێوردبەوە و بزانە وەرزی مێشوولە چەند شەوە، تۆ بڵێ سەد شەو، دە سەد پیاڵە خوێن بکە بەرمیلێکەوە بزانە پڕنابێت، ئەوجا ئاگادار بن، هەر یەك لە

ئێمە هەر هاوینەی بەرمیلێك خوێن دەبەخشین و هەستیشی پێناکەین، بۆیە لە وەرزی مێشوولە دەبێت خواردنی باش بخۆن، مێوژ، نیسك، جەرگ...

گوێم لێبوو شێخ شوان گوتی :

خۆزگە ماریش جەرگی هەبوایە.

جارێ لە جاران دکتۆر کە بۆ جاری نازانم چەندەمین باسی ئەو پیاڵە خوێنانەی دەکرد، دیارە لێی بێزار نەدەبووین، چوونکە هەر جارەی بە شێوەیەك جیا لەوەی پێشتر دەیگێڕایەوە، پێشمەرگەیەك پرسی:

چ خواردنێك لە هەموو خواردنان بۆ زیادکردنی خوێن باشترە؟

پێش ئەوەی دکتۆر وەڵام بداتەوە، پێشمەرگەیەکیدی نازانم کێ بوو، رەنگە ئەسوەد بووبێت گوتی:

بە یارمەتی دکتۆر، با من پێتبڵێم، هەر خوێنەکەی خۆت.

دکتۆر گوتی:

مەبەستت چیە؟ تێناگەم.

پێشمەرگەگە گوتی:

هەر ئەو مێشوولانەی کە لە ناو کوللەکەن و لە بەر دەستن، ئەوانە باشترین خواردنن...

دکتۆر هێلنجی هاتێ و هەستا، وا بزانم چیدی باسی پیاڵەی خوێنی نەکرد.

تۆپەکانمان لە بیربێت...

-١٣-

**ئەگەر زەبری مرۆڤ**
**ماری هێنایە قسە،**
**دوور نیە یەکەم رستەی مار:**
**باش بوو مرۆڤ تەمەنی منی نەبوو، دەنا**
**هەموو دنیا دەبووە مارانگەستە..**

بارەگا کەپریە پێرسیەکە جگە لە دووپشك و مێشوولە بارەگای ماریش بوو، دیتنی مار لە دیتنی بۆق ئاساییتر بوو، زۆر جار بەبەر چاوانەوە غاری دەدا و دەیفیشکاند، کەم رۆژیش هەبوو بە دەست و تفەنگی شێخ شوان خویتی مارێك و پتریش نەرژێ، شێخ خەریك بوو قرانی دەخستە ماری ناو کەپرانەوە، بەو دوایە لە دەوروبەری بارەگا لە دوای ماران دەگەڕا، دوور دەڕۆیشت.

ئیدی شێخ ببووە شێخی مارکوژ، لە پاڵ مارکوژ مارگرێکیشمان هەبوو، ئەحمەد شاهێنی ناو بوو، مارگرێکی سەیر بوو، بە دەستی رووت ماری دەگرت، چەند جار بە چاوی خۆم دیتوومە پشتی ملی ماری لە ناو دەست بووە و دەستەکەیدیکەشی بە لە شولاری ماردا دەهێنا، زۆر جار کە مارێك دەچووە کەلێنی بەردێکەوە و شێخی مارکوژ بۆی نەدەکوژرا بۆ شاهێنی مارگری بەجێدەهێشت، ئەو دەچوو دەستی لە کەلێنی بەردان دەگێڕا و هەر هێندەت دەدیت ماری زیندوو وا بە دەستی شاهێنەوە.

شاهێن و شێخ لە بارەی مارەوە بۆچوونیان رێك پێچەوانەی یەك بوو، قەت نەدەگەیشتنە یەك، لەو بارەیەوە ئەبوو راستی دەیگوتە ئەو دوو دژە:

هێندەی ئێوە لە بارەی مارەوە دژ بەیەکن، شەیتان و خودا لە بارەی دنیاوە هێندە دژ نین.

مارگر دەیگوت:

مار جوانە زۆریش جوانە، بێ زیانە، باوەڕتان بێت بێ زیانە، بۆیە کوشتنی مار بە بۆچوونی من تاوانە، کاتێك مارێك بە کوژراوی دەبینم، ئەو شێخە سەیە هەندێکیدی تووڕەم بکات دەڵێم وەکو ئەوە وایە کە شەهیدێك ببینم.

مارکوژ دەیگوت:

من گوێ نادەمە ئەو شاهێنە سەیە، من هەر هێندە چاوم بە ماری زیندوو هەڵدێ، تا میلی کلاشینکۆفەکەم رادەکێشم، دوای ئەوە مانەوەی مار بە زیندوویتی، گوناهێکی گەورەیە، بە تایبەتیش ماری گەورە و ئەستوور.

لەو بارەگایە کەس لە بەرەی شاهێن نەبوو، هەمووممان لە بەرەی شێخ کۆببووینەوە، شێخی عەنکاوە، هەبوو دەیگوتێ (شێخی عەنکاوە)، ئاخر خەڵکی عەنکاوە بوو.

ئەوەی بە لای منەوە زۆر سەیر بوو، چۆن مار بە شاهێنیەوە نەدەدا، چەندی ویستم تێبگەم تێنەگەیشتم، نەك من کەس لەو نهێنیە نەگەیشت، هەبوو دەیگوت:

هەبێت نەبێت، ژێر بە ژێری رێککەوتنێکی قووڵ و ستراتیژی لە نێوان شاهێن و ماردا هەیە، ئەگەر وانیە چۆن پێوەینادا!

سەدی سەد لەگەڵ بۆچوونی شێخ بووم و پێموابوو مار مافی ژیانی نیە، بە ماری رەشیشەوە، بۆیە دەبێت هەموو چەکێکی دژ بەکار بێت بە کیمیاییشەوە، لە بیرم بێت لە ناو خەڵکی ئەو دەڤەرەی ئەوێ لە بارەی ماری رەشەوە بۆچوونێکی تایبەت هەبوو کە کوشتنی گوناهە، چونکە گوایە زیانی نیە و پێوە نادا، دەیانگوت:

کاتی خۆی شێخێکی گەورە فتوای داوە کە ئەوەی ماری رەش بکوژێت گوناهی دەگاتێ.

بەڵام شێخەکەی ئێمە هەقی لەوە نەبوو رەشە، زەردە، لای وی گرنگ ئەوە بوو مارە و گەورەیە، شاهێنیش لە رەنگی ماری نەدەپرسی، هەموو رەنگەکانی بە دەست دەگرت.

من درەنگتر تێگەیشتم شێخ لە کوشتنی مار مەبەستێکی زۆر تایبەتی هەیە کە من هەستمپێنەکردبوو، عەسرانێك کە هێشتا وەختی عەسرە چا نەهاتبوو، رەنگە زۆربەی پێشمەرگەکان خەوتبووبێتن، جگە لە من وشێخ، شێخ ئێشکگر بوو، منیش بە رۆژ ئەگەر چۆن دەنا خەوم نەبوو، بانگیکردم:

+ برسیت نیە؟

- بۆ، چتێ هەیە؟

+ وەرە گۆشتێکی خۆش هەیە.

بە سەرسوورمانەوە بەرەو لای ئەو غەرە بەردانە رۆیشتم کە جێگەی

شیولێنان بوو، مەنجەڵێکی گچکەی لە سەر ئاگرەکە داگرت و سەری هەڵدایەوە:

بخۆ، قەت گۆشتی وا خۆشت نەخواردووە.

سەرەتا وام زانی ملە مریشك و عەلەشیشە، دەستیشم بۆی برد:

ئای! شێخ ئەوە چیە، دەڵێی مارە!

بە پێکەنینەوە:

ئێ، مارە، خۆ مریشکی تورەهاتیش نیە، بخۆ، ئەوجا دەزانی تامی گۆشت چۆنە..

هەندێك دوورکەوتمەوە:

بشمخوات نایخۆم.

بە چێژەوە دەیخوارد:

لە دەستی خۆتی مەدە بخۆ، بۆ باداریش بەکەڵکە، ئەدی ناڵێت پێیەکانم کەمێك با دەگرن!

قسەیەك لەو دوو لە من، هەند بە چێژەوەش دەیخوارد، شەیتان بوو نازانم کێ دڵی نەرمکردم کە تامی بکەم، خواردم تەواوێکم خوارد، شەوەکەی خەوم لێنەدەکەوت، هەستمدەکرد مارێکی زیندوو وا لە ناو زگمە، تەنها ئەوە شەوە ئەوهابوو، منیش بوومە مارخۆر، ئیدی بۆ راوە مار منیش لەگەڵ شێخ دەردەچووم، شاهێن دوژمنێکیدیشی بۆ درووستبوو، منیش رێك گۆتەکانی شێخم دەکردەوە، ئەوەشم بۆی زیاد دەکرد:

ماری ئەستوور چەندی زووتر بکوژرێ، خێری پترە.

شێخ فێری چاککردنی ماریشی کردم و دەیگوت:

ئەها تەماشاکە، ئەوە لە لای سەریەوە بستێکمان فرێدا، لە لای کلکیشیەوە بستێك، ئەوەی دەمێنێتەوە لە گۆشتی بەرخ خاوێتر و حەلاڵترە.

شێخ ئەوها فێرە راوی ماری دەکردم:

تفەنگەکەت با لەسەر سەلیە بێت، قەت لە دوو گوللەی کەمتر

تیمەگرە، یەکیانی بەردەکەوێت، هیچ شتێك هێندەی مار لە گولله لادان هونەرمەندتر نیە، باوەڕ بەوە مەکە کە مار بەرەو گولله دێت، تا کاتێك گوللەکە بە عەرد دەکەوێت ئەوجا بۆی دێت.

زۆر کەرەت کە مارێکمان دەدیتەوە، دەیگوت:

با پێکەوە تەقەی لێبکەین، تۆ نیشانە لە سەری بگرە من لە ناو قەدی، یەکیانی بەردەکەوێت.

من دەمگوت:

سێ کەس بین باشە، گوللەیەکیش بۆ کلکی.

دەیگوت:

نا، دوو کەس بەسە، چونکە مار ئەوەی بەلایەوە گرنگ نەبێت کلکە، لای وایە کلك شتێکی زیادەیە پێوەی، دەزانی مار کلکیشی ببڕی، بێ کلك هێشتا پتر لە تەمەنی من و تۆ دەژی.

شێخ زۆر جار ماری بە سیرەوە دەخوارد، جارێك لەو زۆر جارە بە شێخم گوت:

تۆ دوو غەدر لە مار دەکەیت، وا بزانم غەدری دووەمیان لە هی یەکەمیان گەورەترە.

شێخ لەو کاتە پارووێکی گەورەی ماری لە زاری بوو پرسی:

غەدری چی؟

گوتم:

غەدری یەکەم ئەوەیە کە دەیکوژیت، غەدری دووەمیش بە سیرەوە دەیخۆیت، وەك دەڵێن مار رقی دنیای لە سیرە.

شێخ بە پێکەنینەوە:

دیارە گوێت لە راسپاردەی مار نەبووە! هەموو مارێك لە سەرەمەرگدا بە دەنگێك کە هەموو کەس نایبیستێ دەڵێت:

تکایە ئەگەر کوژرام هەر بە سیرەوە بمخۆن...

من و شێخ زۆربەی رۆژەکان جەمێکمان گۆشت بوو، زۆر جار هەر لە

دەرێی بارەگا مارمان لە شیشێ دەدا، لە بارەگا چەند کەسێ دەیانزانی ئێمە مار دەخۆین، مەیلەو بە دزی ئەو خواردنە خۆشەمان دەخوارد، چ لە تکەی مار خۆشتر هەیە، لەو کاتانەی مارمان لە تکە دەدا، دەمانگوت، من و شێخ وێکڕا دەمانگوت:

ئای بۆ یەك شووشە عەرەق!

لە تەمەنی خۆم هێندەی ئەو ماوە گۆشتم نەخواردبوو، من و شێخ هێندەی تەقەمان لە مار کردووە، ئەگەر هێندە تەقەمان لە جاش بکردایە و گوللەش بە زایە نەچووایە، هەشتیەکی ژنی کورد بێوەژن دەمانەوە، ڕۆژێك هەستمکرد تاخمەکەم سووکە تەماشادەکەم ، لە حەفت مەخزەنان حەفت فیشەکم نەمایە، باش بوو شێخ چوو لە چادرە گچکەکە کە تاقە چادری ناو کەپران بوو، پڕ فیشەکی کردمەوە.

ڕۆژێك شێخی مارکوژ بە شاهێنی مارگری گوت:

+ وەرە با سازشێك بکەین.

- چۆن؟

+ هەرچی تیرەمار و فەرخە مار هەیە بۆ تۆ، ماری گەورە و ئەستووریش بۆ من...

- باش تێتناگەم، سەیە، جوان قسە بکە.

+ سەیە، بۆ تێناگەیت، من هەر تیرەمارێك، حیزەمارێکم دیت، نایکوژم و بانگی تۆ دەکەم، تۆش هەر مارێکی گۆشتن، مارێکی مەردت گرت، لێگەڕێ با گوللەیەکی لێدەم.

شاهێن سەلماندی کە ماردۆستە، هۆسا باگۆیدایەوە:

لە سەیان سەتر، پێش هەموو شتێك لە دنیایێ ماری حیز نیە، هەموویان لە تۆ مەردترن، من قەت سازشی ئەوها ناکەم.

بەڵام دیار زوو گوتبووی:

لە ناو مەردان شێخ شوان لە هەمووان مەردترە، چونکە ئەگە ئەو لێرە نەبا لە مێژبوو مار خواردبووینی.

لە هەمووی خۆشتر ڕۆژێك شێخ بە گۆشتی مار شاهێنی مێوانداری کردبوو، بەڵام نایەتەوە بیرم خواردبووی یان نا.
دەنگی تۆپ پتر و نزیکتر...

-١٤-

**ئەوین لە بای دۆڵی**
**قووڵی هەزار پێچ دەچێ**
**کەس نازانێ لە کوێوە هەڵدەکا**
**ئەوە گۆتەی ئەویندارێك بوو.**

سەیدان، ئەو گوندە جوانەی بە هاژەی زێی گەورە دەخەوت و هەر بە هاژەی زێش بە ئاگادەهاتەوە، هێشتا ئاوەدانە، چەند ماڵێك ملە لەگەڵ عەرد و ئاسمان دەکەن و چۆلیناکەن، سوێندیانخواردووە وا بە سانایی چۆلینەکەن، لەو ماڵە لاملانە کچێك هەیە، هێندە جوان نیە، هێندە لەبەر چاوان نیە، بەڵام چ لەگەڵ دڵ دەکەیت، ڕەنگ نیە بە شتێکەوە بنووسێت، خۆ لێنابێتەوە، جا با ئەو شتە پیرێژنەکەی گوندی (...)یش بێت.

ئەوە لەو گوندەی ناوەکەیم نەگوت، پیرێژنێك زۆر پیر عەشقی پێشمەرگەیەك ببوو، پێشمەرگەکەش کە ملازمیش بوو، یەمەن و سۆڤیەت و چیك و میکیشی دیتبوو، وای دەزانی لەو دنیا پڕ لە ژنە یەك ژن هەیە ئەویش پیرێژنی گوندە، دەبوو هەموو ڕۆژێك ببینێ، ڕزگاری ڕۆستێش دەیگوت:

یەك کچ هەیە لە دنیایێ، ئەویش ئەوەتە لە سەیدانە.

ڕزگار فەرهادانە دینی ئەو کچە ببوو، نە خەوی مابوو نە خواردن، پێیەکی لە بارەگا بوو پێیەکی لە گوند، ئەبوو ڕاستی دەیگوت:

هەر کەسێك نازانێت حالۆری چۆنە با بە وردی لە ڕزگار وردبێتەوە.

بەڵام حەمە سوور شتێکیدی دەگوت:

من چەندی لێی وردەبمەوە ئەوین دەبینمەوە، بە راستی ئەو کورە ئەویندارێکی شێتە.

ئەبوو راستی ئەو لێوردبوونەوەی حەمە سووری بە دڵ نەبوو:

دە برۆ هەی وەحشی، گووی لێدەبینیەوە و گووێکی شێتیشە.

نازانم کێ بوو، هێشتا پێکەنین نەپسابۆوە:

ئەوە داهێنانە، گووی شێت!

پێکەنین درێژتر بۆوە...

هەر کەسێك لە نزیکەوە رزگاری بدواندایە دەگەیشتە ئەوەی کە حەمە سوور جوانی بۆ چووە و جوان لێی وردبۆتەوە، من تا رادەیەك لە رزگار نزیك بووم، زۆر جاریش لەگەڵی دەچوومە ناو گوند، دەیگوت:

رۆژی یەك جار لە دوورەوە، قەیناکە لە دوورەوە ببینم بەسمە.

ئەو کورە هەر لە گوند نزیکدەکەوتەوە گۆرانیی دەگوت، دەنگیشی ناخۆش نەبوو، بەردەوامیش (غەزال غەزال)ی محەمەد عارف جەزیریی دەگوتەوە، هەمووشی بۆ کچەکە بوو، مەبەستی بوو گوێی لە دەنگی بێت و خۆی بە دیار بخات و ببینێ، مەبەستی بوو بە گۆرانی دڵی راکێشێ، من درەنگ تێگەیشتم کچە ئاگای لە من بێت لەو نیە، رزگار یەك لایەنە شێت ببوو، عاشق ببوو، رزگار گوند و ئاقاری گوندی پڕکردبوو لە غەزال غەزال، هەستمدەکرد هاژەی زێ چیدی لە گوێی گوند خۆش نیە، ئیدی گوند بە غەزال غەزال دەخەوێت و هەر بەو گۆرانیەش بە ئاگادێتەوە، رزگار هێندە ئەو گۆرانیەی گوتبۆوە وەختە بڵێم لە جزیریی خۆشتری دەگوتەوە و هەر بە گۆرانیی رزگاریش ناسرابوو، کاتێ دەنگی هەڵدەبڕی:

غەزال غەزال هایێ هایێ هایێ هایێ ێ ێ

وەرە غەزال وەرە...

خەڵکی گوندین و جیرانا

دەستێ غەزالێ خۆ بگرم ببەم زۆزانا ژۆری...

که ئەوهای تێهەڵدەکرد، ئەگەر لە دەستم هاتبا، بە پێی خۆم دەچووم غەزالی گوندم بۆی دێنا، لە بیرم نیە کچەکە ناوی غەزال بوو یان ناوێکی نزیك لەو.

رزگار لە هەر جێگەیەك بۆنی کردبا کچەی لێیە، کچەی پێدا دەڕوا، تێیهەڵدەکردە غەزال غەزال، رۆژێك کۆمەڵە ژنێك لە خوار بارەگاوە لە گژ خڕکردنەوەی دارودڕ بوون، رزگار پێیوابوو کچەکەشیان لەگەڵە، کەمێك لە کەپرەکان دوورکەوتەوە و روو لەوان دەستی خستە بن گوێی و: غەزال، غە...

هێشتا (غەزال)ی دووەم هەر لە هەوکی بوو، کەرێك بە هەموو زەڕینی خۆی زەڕی، زەڕینێك دەنگی سەد رزگاری لە خۆیدا خنکاند، هەر لەو کاتە ئەحمەد شاهێن هەستایە سەر پێ و روویکردە رزگار:

ئـافەرین، مەوەسـتە، دەنگهەڵبـڕە، کەو ئەو کەوەیە بەرانـبەر کەوێ بخوێنێت.

رزگار بە شەرمدا کەوت، قەت رزگارم نەدیتبوو شەرم دایگرێ، ئەوجارە نەبێت.

دوای ئەوەی رزگار لە بەرانبەر زەڕینی کەر بەزی، بەرلەوەی تێهەڵکا لە غەزال غەزال، چاوێکی بە دەوروپشتی خۆیدا دەگێڕا، ئەگەر کەری دیتبا، کەمێك سڵیدەکردەوە.

تۆپ تۆپ، زەڕینیش لە ناو دەنگی تۆپدا دەخنکێ.

-١٥-

مەرگ وەی مەرگ
ئای بۆ ئەو رۆژەی
یان بەرۆکی ژیانت بەردەدا
یاخود ترست لە دڵی کەس کەس نەدەما
بە چۆلەکە و مێروولە و هێستریشەوە.

رۆژێك سێ هێستر و سێ پێشمەرگە بۆ هێنانی ئازووقە چووینە گوندێك، لە هاتنەوەدا هەورازەیەك دەهاتە پێشێ، هەورازەیەكی سەختی بەردەلانی زیخەلان، لەو هەورازانە بوو كە هێستر خۆشیی لێنەدەهات، سرووشتی هێستر وایە، هەوراز چەندێ ركی ستوونی بێت، چەندێ بلندی ئاسمانی بێت، چەندێ پێچاوپێچی ژیانی بێت، چەندێ قوڕ و لێتە یان شەختەبەندی بێت، چەندێ لە شەویش تاریكتر و شەوتر بێت، گوێی لێنیە، هێسترە و هێسترایەتی خۆی دەكات و سەردەكەوێت، جا با بارەكەی هەمووی چەك و فیشەك بێت، بەڵام رێگەی بەردەلان و چەوی وەك ئەو رێگەیەی كە ئێمە وا پێیدا هەڵدەگەڕێین، هێستر سلی لێدەكاتەوە، بەڵام ئەو سلكردنەوەیە ناگاتە ئەوەی هێستر خۆی لێنەدا، ئەوجا هێستر لە چ نادات، لە زێی بادینان نەترسێ و خۆی پێدا دا لەو هەورازەیە دەترسێت!

هەر یەكەو جڵەوی هێسترێكمان بە دەستەوە بوو، نەرم نەرم سەردەكەوتین، ئەو رێگەیە پێدەچوو لەمێژ بێت هاتوچۆی بە سەرەوە نەبووبێت، دووریش نیە هەر لە وەتەی هەیە جگە لە ئێمە پێی چ هێستر و پێشمەرگەیەكی نەدیتبێت، لەو گوندەوە بۆ بارەگا رێگایەكیدی هەبوو، رێگایەكی خۆش، بەڵام گوتیان تۆپبارانی لەسەرە، بۆیە بە ناچاری ئێرەمان كردە رێ، بەر لەوەی بگەینە بن هەورازە سەختەكە، من ترسام، ئاخر لە هاتنە خوارێدا تێگەیشتم تووشمان بە تووشی چیەوە بووە، لە هاتنە خوارێ و بێ بار هێستر چەندان جار پێی دەڕۆیی و دەیگرتەوە، هەر چەندە هێندەی هێسترم ناسیبێ، هێستر نشێوانی لە هەورازان لە قەلب ناخۆشترە، لەو شتە من زۆر لە هێستر نزیكم، بە من بێت قەت نشێویەكی سەختم نەیەتە رێ.

سەر كەوە سەركەوە، زوو زوو هێستر لە سەر وردە بەرد و چەوان پێیان دەڕۆیی، بەڵام وەها خۆیان دەگرتەوە، تەنها لە هێستر دەهات، هیچ پێشمەرگەیەك ئەگەر ئەوها پێی بڕوا خۆی پێناگیرێتەوە، من و هێسترە رەش لە دواوە دەڕۆیشتین، نێوان هێسترێك بۆ هێسترەكەیدی نیو سەدەیەك

دەبوو، مەبەستم سەدەی جووتی هێسترانە نەك سەدەی سالآن، ئەوەش بۆ خاتری ئەوەی ئەگەر هێسترێك هەڵدێرا ئەوەی دوای خۆیشی لەگەڵ خۆی غلۆر نەکاتەوە، لەگەڵ هەر پێ رۆیشتنێکی هێستر، دەستم لە سەر دڵم بوو، لە نزا شارەزا نەبووم، وەرنا هەزار و یەك نزام دەخوێند، نزای سم نەڕۆیشتنی هێستر و هەڵنەدێران، بەلآم لە بیرمە لەگەڵ هەر خلیسکێ دەمگوت (یا ئەللا) ، جارێك برادەرێك گوتی:

خودا هێندە گوێ لەو (یا)یانە ناگرێت، چونکە دەزانی لە دڵەوە نین و گۆتەی سەر زارن.

دوو هێسترەکەیدی هەردووك گەیشتنە سەرێ و ئاودیو بوون، ئەو جێگەیەی کە پێتی ئاودیو بوونە لە دیوی مەرگێکی هەڵدێری، من ئێستا وا گەیشتمە ئەوێ، ئەو جێگەیە ترسناکترین جێگەی ئەو هەورازەیە و دنیاشە، بەس پێت بڕوا، بە هەڵدێرێکدا هەڵدەدێرێی، لە دنیایێ هەڵدێری ئەوها نیە، ئەگەر هێسترە رەش لێرەوە هەڵدێرێ، گورگی بنی دۆڵێ کە کەس نازانێ چەند لە ئاستی دەریا نەویترە، چ سوودێك لەو هێسترە نابینن، چونکە بە شێوەیەك پارچە پارچە دەبێت، رەنگە گەورەترین پارچەی هێستر تاکە ددانێکی بێت.

لە بەدبەختی من رێك لەو جێگەیە، لەو بستە، ئەو بستەی دیوێکی مەرگە و دیوێکی ژیان، بۆ هێستر پێی نەڕۆیی، هەر هێندەم پێکرا پێم لە عەرد بچەقێنم، پێنەدەچوو جێ پێی من زیخەلآن بێت، دەنا دەڕۆیشت، بە هەموو هێزی دەستم جڵەوی هێسترم رادەکێشا، ئیدی بووە کێشمەکێشم لە نێوان دوو هێز، هێزی مەرگی هێستر کە لە هەڵدێرەوە بوو، هێزی ژیانی هێستر کە پێیەکانی من بوون، تۆ بزانە پێی هێستر، دەستی نا، ئەگەر یەك بست رێك یەك بست بە دوای هێزی هەڵدێرا رۆیشتبا، ئەوا دەبوو دەستبەجێ دەستم لە جڵەوی هێستر بکەمەوە، دەنا منیش بە دوای هێستردا دەڕۆیشتم و پرسەی پێشمەرگەیەك و هێسترێك تێکەڵدەبوونەوە، هێندەم زانی هێزی هەڵدێر بەزی، هەستم کرد هێزی هێستر ئەوەی پێشتر هەیبوو

هاته من، ئیدی من و هێستر خۆمان لە دیوی ژیان دیتەوە، دەبێت بڵێم من کەسێکی بەهێز نیم، لە دارهێنان داری سەر شانی من لە داری زۆربەی پێشمەرگەکان گچکتر بوو، بەڵام لە بەختی هێستر لەو ساتە هێزم هەبوو، لە بیرم بێت هەموو ئەو کێشمەکێشەی نێوان من و هەڵدێر ئەگەر خولەکێك تا خولەکێك و نیوی خایاندبێت، لە هەمووی جوانتر هەستمکرد هێسترەکە چاکەی منی لە چاوە، بەرێزەوە تەماشای دەکردم، زمانی نەبوو، ئەینا رەنگبوو بڵێت، سوپاس، دواتر لە چەند جێ ئەو سەرهاتەم گێڕاوەتەوە و دەمگوت:

من کە ئەو هێسترەم رزگارکرد وام هەستدەکرد کە پێشمەرگەیەکی بریندارم رزگارکردووە و نەمهێشتووە دەستی دوژمن بکەوێت.

بیرمە حاجی دەهام ئەو چالاکیەی منی جوان نرخاند، چونکە بە لای ئەوەوە هێستر زۆر گرنگ بوو، چی لە پێشمەرگە کەمتر نەبوو، زۆر جار دەیگوت:

هێستر، هێستر، هەر رێزی هێستر بگرن، ئەگەر هێستر نەبێت، ئەو هەموو ئازووقەیە کێ دەیگەیەنێتە ئێرە کە بە قەد شارێك دەخۆین.

-١٦-

**دنیادیتەیەك وای گوت:**
**سەری من لە دوو کاتدا**
**بیری مردنی تێدا نیە**
**پێکەنینی شاگەشکەیی**
**گانی ئاوێتەیی...**

بارەگا کەپریەکە چەند پێشمەرگەیەکی قسەخۆش و نوکتەبازی لێبوو، یەکیان کە ناوی لە خۆی نابوو خەیری عێراقی چەشنی هیچیان نەبوو، دەتگوت کانیەکەیە ئەوەی بارەگای ئاوەدا، چۆن کانی هەمیشە بە ئاو بوو، لەچ کەژان چکی نەدەکرد، خەیریش لە چ کاتان لە قسەی خۆش

نەدەکەوت، هەمیشە زاری پڕ لە قسەی خۆش بوو، هەمیشە جوولانەوەی جوان و نیگارڕاکێش بوو، پیاوێکی خڕکەڵەی کورتە بنەی کەمێك ورگن، لە هەمووی سەیرتر و جێی پرسیارتر ورگەکەی بوو، ئاخر کەس نەبوو هێندەی ئەو پیاوە بە جوولە، ئاو بوەستایە ئەو نەدەوەستا، تۆپ لە هاویشتن بکەوتبا، ئەو لە بازبازێنی ناو بارەگا کە لەسەر ئەو قەرەوێڵەوە بازی دەدایە سەر ئەویدی نەدەکەوت، بەردەوامیش جۆرێك وەرزشی دەکرد کە هەر لە خۆی دەهات، کەسیش نەیدەزانی وەك وی بکات، کەچی ئەو ورگەی گرتبووی داینەدەناو داینەدەنا، خۆی دەیگوت:

من زگم لە شەش مانگی ڕاگرتووە، دوای شەش سالیدیش هەر شەش مانگیە.

ئەو پیاوە لە چاوی منەوە لە هەموو ئەکتەرە کۆمیدیەکانی دنیا ئەکتەرتر بوو، لە پێکەنین داهێنەرێکی بێ وێنەبوو، بڕوا ناکەم ژنەکەی خۆیشی پێکەنینی ئەو پیاوەی ناسیبێتەوە و بیناسێتەوە، ئاخر سەد جۆر پێکەنینی هەبوو، هیچیان لەویدی نەدەچوو، دیار نەبوو کامەیان پێکەنینی ئاسایی خۆیەتی، خۆیشی نەیدەزانی کامیان پێکەنینی خۆیەتی و ئەوانیدی دەسکرد، ئەگەر لێتەوە دیار نەبایە بە تاقی تەنیا لە پەنایەك و بۆ سەرلێشێوان پێبکەنیبایە دەتگوت، ئەوە لەو پەنایە سەد کەس دانیشتوونە بە نۆبە پێدەکەنن، چ ئەکتەرێك هەیە ئەو توانایەی لە پێکەنین هەبێت!

دەمێك بوو ئەو خەیریەم دەناسی، لە بارەگایەکیدیش پێکەوە بووینە، ئەو کلاشینکۆفەی لە شانمە کاتی خۆی لە دەستی ئەوم وەرگرتووە، ئەو بڕنۆیەی لە کانەبی گچکەم وەرگرتبوو، ئەو خەیریە لێیوەرگرتمەوە و لە جیاتی بڕنەوەکە ئەو کلاشینکۆفەی دامێ، ئەو گۆڕینەوەیەش ئەو کات منی هەندێك زویرکرد، ئەوکاتیش وەك هەوکە بەرپرسی سەربازیی بارەگا بوو.

ئەو پیاوە لە هەر جێگایەك با، ئەگەر بە تەنێش با وات دەزانی ئاوەدانیەکی گەورە لەو شوێنە هەیە، بەردەوام هاتوهاواری بوو، قسەی

دەکرد، پێدەکەنی، گۆرانیی بە سێ چوار زمانان دەگوت، کەم کەسیش لێی بێزار دەبوو، ئەوانەی کەیفیشیان پێنەدەهات، ئەگەر رۆژێك خەیری لە بارەگا نەبایە، هەستیاندەکرد شتێکی گەورەیان بزرکردووە، غەریبیان دەکرد.

من کەمێك جوولانەوەی خەیریم لە چاودا ماوە، چەند رستەیەك لە گۆتەکانیم لە گوێدا دەزرینگێنەوە، ئاخر تەمەنێك لە نێوان ئێرە و بارەگا کەپریەکە هەیە، تەمەنێکی پڕ لە بیرچوونەوە، ئەو شەوانەی مێشوولە هەراسانیان دەکردین و خوداوەندی (با)ش، باش هەموو ئەو پەنجەرانەی دادەخست کە بایان لێوە دێ، هەناسەی هیچ بایەك نەدەگەیشتە بارەگا، لە نیوەی شەوێ خەیری عێراقی یەك بە دەنگی خۆی، ناخۆشیش نەبوو، مێشوولەی دەخستە گۆرانیەکی حەسەن زیرەکەوە:

خودا هەڵکەی بای شەماڵی

مێشوولەی خودای راماڵی

یان بانگی ئەو پێشمەرگەیەی دەکرد کە لە سەر بێتەل بوو، وا بزانم ناوی هاوکار بوو، دەیگوت:

هاوکار، کوڕە هاوڕێ رەفیق هاوکار، بە دزی مەلا حەسەن- مەلا حەسەنیش لە بن پاڵی بوو- پەیوەندیەك بە فڕۆکەیەکی عێراقیەوە بکە و بڵێ لە سەر داوای خەیری عێراقی یەك بەرمیلە کیمیا لەوەی چڕەکە ئەوەی مێشوولەش دەکوژێ، فڕێدە ناو کەپران، مێشوولە خواردینی.

ئەو خەیریە لە بارەگا حەزی بە چارەی پێشمەرگەیەك نەدەکرد، لە سەر چی؟ نازانم، هەر کاتێك لوورەی تۆپێك دەهات، هەردەستایەوە و دەستی بۆ لای کەپری پێشمەرگەگە درێژ دەکرد و دەیگوت:

بەرەو ئەوێ، بەرەو ئەوێ، لە ئێمە لادە...

جارێك بە شێخ شوانی گوت:

تۆ زۆر مارت کوشتووە، هەموو پێتدەڵێن شێخی مارکوژ و مار خۆر، بەڵام مارێك هەیە گەورە زۆر گەورە جێگاکەی پێدەزانم، ئەگەر توانیت

ئەو مارە بکوژی، منیش دانت پێدا دەنێم و دەڵێم بە راستی مارکوژی.
شیخ بە تامەزرۆییەوە:
کوا! لە کوێیە ئەو نیعمەتە؟ بەشی حەفتەیەك دەکات.
خەیری بە پێکەنینەوە گوتی:
ئەها ئەو کەپرەی سەرەوەت دیوە، ئەو لایەی کەپرەکەی مەلا حەسەن، لەوێ مارێکی گەورە راکشاوە، نابینی ئەها کلکی دیارە.
شێخ گوتی:
ئەوجا لۆ ئەوەشم پێناکەیت، من هیچ جاشێکم نەکوشتووە، پێشمەرگە بکوژم.
خەیری بە پێکەنینەوە:
کورە ئەوە پێشمەرگە نیە، مارە مار، لە مار خراپتر پێتەوەدەدا، ژەهری هەیە ژەهر، تۆ نازانی ئەوە چ زگ لە پێیەکە!
شێخ بە پێکەنینەوە:
بە شاهێن بڵێ با بە دەست بیگرێت و ددانی دەربێنێت.
خەیری:
شاهێن پیاوی ئەو مارە نیە.
ئێستاش نەمزانی خەیری بۆچی لەو پێشمەرگەیە وا بە رقدا چووبوو.
خەیری وەك دەڵێن دەوی زۆر پیس بوو، جوێتی بە زۆر کەس دەدا، بەڵام جوێنێك و بە شێوەیەك کەم کەس لێی تووڕە دەبوو، جوێنەکانی خەیری بۆ خۆشی بوون، هەر بە راستیش جوێن لە لای ئەو، ئەو واتایەی نەدەبەخشی کە لای هەموومان دەیبەخشێت، لە لای ئەو وشە جوێنیەکان لە وشە ئاساییەکان ئاساییتر و جوانتر و ناسکتر بوون، پێدەچوو ئەوەش لەوەوە هاتبێت کە زۆر جوێنی داوە و لێی راهاتووە، ئەو بە چێژ چێژی لە جوێندان وەردەگرت، خەیری دەیگوت:
من جوێن بە کەسێك دەدەم خۆشمبوێت، ئەگەر رقم لە کەسێك بێتەوە هەر دوو چاویشی دەرێت و بە زگیش بدات، نیو جوێنیشی پێنادەم.

لەوەیان ئەحمەد شاهێن پشتگیری خەیری دەکرد و دەیگوت:

بە راستی وایە، منیش حەزدەکەم لە جیاتی ئەوەی بڵێم هاوڕێ کووی، بڵێم ها سەیە کووی، ئەگە کەسێکم زۆر خۆشنەوێت، سەگ لە جێگەی هاوڕێکە دادەنێم.

خەیری تا بۆی بگونجایە جوێنی دەدا و خۆی لێنەدەبوارد، بەڵام خۆ ئەوەشی لەگەڵ هەموو کەسێك بۆ نەدەچووە سەر، بۆیە کەڵکی لە چوار زمان وەردەگرت و بۆ هەر کەسە و بە زمانێك جوێنی دەدا کە ئەو زمانە نەزانێت، بۆ نموونە بۆ عەرەبێکی کوردی نەزان جوێنێکی پەتیی کوردی هەڵدەبژارد، بۆ کوردێکی عەرەبی نەزان جوێنێکی قوڕەیشیی دەنارد کە کەم عەرەبیش تێدەگەیشتن، بۆ مەسیحیەك کە زۆریان هەر سێ زمانەکەیان دەزانی جوێنێکی ئینگلیزیی تێدەگرتن، دنیایەك جوێنی ئینگلیزیی لەبەر بوو، جارێك لە برادەرێکی ئینگلیزی زانیان پرسی:

+ ئەرێ خەیری ئینگلیزیەکەی چۆنە؟

- بێجگە لە کۆمەڵێك جوێن، یەك وشەی ئینگلیزی نازانێ.

خەیری خۆی فێرە هەندێ جوێنی تورکمانیش کردبوو.

جارێك مەلا جەلال گوتی :

ئەگەر حزب خەیری بنێرێتە سۆڤیەت بۆ دەورەی کادیری، تەنها جوێنی رووسی فێردەبێت و دێتەوە.

خەیری لە کاتی بۆرژانیش لە قسە نەدەکەوت، جوێنی خۆی دەنارد و قسەی خۆی دەکرد.

سەر لە ئێواران کە لە سەر قەرەوێڵەکەی لە سەر پشت رادەکشا، زۆر جار بە دەنگی بەرز دەیگوت:

خودایە ئێمە چیمان لە خەڵك کەمترە! دە وەك بۆ ئەوانت ناردووە بۆ ئێمەش بنێرە.

ئەو (خەڵك)ەی لەو داواکاریەی خەیریدا هەبوون، بەس رەبەنەکان دەیانزانی کێن، ئەوانەی ژنیان لەگەڵ بوو نەیاندەزانی ئەو خەڵکە کێن کە خۆیشیان بوون.

لە رۆژی گەرماوکردنێ دەیگوت:

من لە دوای پێشمەرگە ژنـدارەکان خـۆم دەشـۆم، چـونکە گەرمـاوەکە پیس ناکەن.

یـان کـاتێ پێشـمەرگەیەکی ژنـداری دەدیـت بە کەیـفە و پێـدەکەنێ، رووبەڕوو پێیدەگوت:

بۆ وا ناکەیت، لە چیت کەمە، زگ و بەرزگـت تێـرە، ئـێمەش دەبێـت نۆرە لە هێستر بگرین و بە مانگیش بەبەرمـان ناکەوێـت، ئەو کـاردۆیە ئەو کاردۆیە، یەك هێستری بە کچی نەهێشتۆتەوە.

زۆر جار قسەی دەهێنایەوە سەر شاهێن و شێخ، بە شێخی دەگوت:

بەس پێمبڵێ تۆ بۆچی خۆت رادەسـتی حکـومەت نـاکەیتەوە، باشـترین خەڵاتت دەکات، لە سەر کوشتنی ئەو هەمـوو مـارە، نیشـانەی ئـازایەتی و قارەمانیـت بە سـنگەوە دەکـات، تـۆ نـازانی بـێ ئەوەی هەسـت پێبکەیـت گەورەتـرین خزمەتـت بە سـەرباز و جـاش کـردووە، وازبێـنە بـرا واز لە مارکوشتن بێنە، هەر دیتت جاش و سـەرباز وەك مێشـوولە بێـرە وەربـوون، لێگەڕێ با هەندێکیان مار پێیانەوە بدا و بە دۆزەخ شاد بن، بـا مـاری ئێـرە رۆڵی دووپشکەکانی شارەزوور ببینن.

بیستبووی کە کاتێ لەشکری عەرەب لە سەردەمی سەرهەڵدانی ئیسـلام هێرشیان هێنابوو، دووپشکەکانی شارەزوور دنیـایەك ئەسـحابەیان لە پەلوپـۆ خستبوو.

بە شاهێنی دەگوت:

حزب ئەو هەموو خەرجیەی لێکردی دنیای پێکـردی، هەر بـۆ ئەوەبـوو کە فێـری مـارگرتن بیـت؟ ئـێ خـۆ ئەوە لێـرەش دەکـرا، دەمبـردیە لای شێخێك و تفێکی جوانی لە ناو دەمت دەکرد و تـۆش تـۆبەیەکی جوانـت دەکرد و وەك هەوکەش مارت دەگرت.

هەر لە بارەی جوێنەوە، ئەگەر تووشی بە تووشی پێشمەرگەی وا ببوایە کە نەیتوانیبا یان نەیوێرابا بە هـیچ زمانێـك لەو زمانـانەی کە دەیزانـی هـیچ

جوێنێکی پێبدا، دەهات بە هەردوو دەست روومەتی پێشمەرگەی دەگرت و سەد ماچی لێدەکرد، بۆیە دەستەواژەی (ماچی خەیری عێراقی) لە ئایەتی ئالۆزیش پتر لێکدانەوی هەڵدەگرت، یەك لەو لێکدانەوانە ئەوهابوو:

ئەگەر خەیری یەك ماچی لێکردی، واتە یەك جار دایکتی گا.

ئەو خەیریەی کە کەسی نەدەپاراست و جویێتی بە هەمووان دەدا، ئەگەر جوێنیشی نەدابا، ماچی دەکرد کە ماچەکە زۆر لە جوێنەکە جوێنتر بوو، لە ئاست مەلا جەلال فزەی نەدەکرد، زراوی لێچووبوو، مەلا جەلال هەرچی پێگوتبا، خەیری هیچی نەدەگوت، بە قسەش بهاتبا، ئەوە قسەکەی بوو:

راست دەکەیت، هاورێ تۆ راست دەکەیت، ئێمە هەمووان لە سەر هەڵەین.

زۆر کەس سەریان دەکردە سەر خەیری کە هۆی ئەو ترسە لە مەلا جەلال بزانن، بەڵام خەیری لەوەش دەترسا کە هۆی ترسەکە ئاشکرا بکات، رۆژێك زاخی دا بەرخۆی و درکاندی:

پێتاندەڵێم بە مەرجێك لە لای مەلا جەلال باسی نەکەن.

هەموو سوێندیان خوارد کە نهێنی بێت و نەیدرکێنن، خەیری بە هێواشی نەبادا مەلا جەلال کە زۆر دووریش بوو گوێی لێبێت، گوتی:

کورە ئەو مەلایە، ترسناکە ترسناك، ژەهرێکی هەیە لە هەموو ژەهران ژەهرتر، هەر تێت بکات، جێت دەکاتە ئەو جێ.

لەگەڵ ئەو قسەی خەیری هەموو بارەگا دایانە قاقای پێکەنین، ئەوانەی گوێشیان لێنەبوو، بە پێکەنینی ئەوانیدی پێدەکەنین، ئەوەی کە پێکەنینی لێوەنەهات مەلا جەلال بوو، ئەویش لەبەر ئەوەی هەستیکرد پێکەنینەکە بە هۆی قسەیەکی خەیریەوەیە، دنیا بە قسەی خەیری پێدەکەنی مەلا جەلال نەبێت.

خەیری بێژەرێکی باشیش بوو لە بێژەرەکەی رادیۆی مۆنتیکارلۆ هەواڵەکانی جوانتر دەخوێندەوە، رۆژانە پێش رۆژاوابوون ساتی

خوێندنەوەی هەواڵەکان بوو، هاوکار لە ڕێی بێتەلەوە هەواڵی وەردەگرت، دوای ئەوەی بە فلتەری مەلا حەسەندا تێدەپەڕی، دەگەیشتە دەست خەیری، خەیریش بە عەرەبی و کوردی دەیخوێندنەوە، هەندێك لەوانەشی بە کۆلەگەی بن کەپرە گەورەکەوە هەڵدەواسی، هەواڵەکان پتر چالاکیەکانی پێشمەرگە بوو، تاوانەکانی حکومەت بوو:

...دەستەیەك پێشمەرگە لە ناو هەولێر زەبرێکی کوشندەیان لێدان و ..کوژرا... لە ڕێی شەقڵاوە بۆسەیەکیان دانایەوە و.. لە بن کۆیە بووە شەڕ و کۆپتەر هەستا، لە قەرەچووخ تا تاریك داهات شەڕ گەرم بوو، لە شارەزوور مۆڵگەیەك گیرا.. لە ئامێدی.. لە ...دەستی بە ڕەشبگیری کرد... لە.. تیرباران کرد...

خەیری لە کاتی خوێندنەوەی چالاکی پێشمەرگە، لە بن لێوانەوە دەترسا مەلا حەسەن گوێی لێبێ، دەیگوت:

بە خودای هاوڕێیان نێرەکەرن!

بەڵام هەواڵێك ئەگەر شەهیدی تێدا با، چاوی پڕ دەبوو لە فرمێسك، خەیری دەشگریا.

تۆپەکان بە ئاگرەوە نزیکتر دەبنەوە...

-١٧-

**هەر دەچم**

**بە چی دەچم با بچم**

**بەس با بەو ئاوەدا**

**ئاوەو ئاو نەچم.**

بارەگا کەوتبووە دەڤەرێکی دنیاوە کە ئابلۆقەی هەموو دنیای لە سەر بوو، ئەمریکا کە بە دەوڵەتی ئابلۆقە ناسراوە، قەت نەیتوانیوە هیچ جێگەیەکی دنیا بخاتە ئابلۆقەیکی واوە کە بە دەوری دەڤەرەکەی ئێمەدا

درابوو، هەموو جۆرە ئابلۆقەیەکمان لەسەر بوو بە ئابلۆقەی(شەوبا)شەوە، ئەگەر شەوان کزەبایەکی هاتبا، ئەو هەموو پیاڵە خوێتەمان لێدەگیرا؟! ئابلۆقە ئابووریەکە کوشندە بوو، هەتا فەردە ئاردێك، دوو کیلۆ شەکر، چارەگە چایەك دەگەیەشتە بارەگا کەپریەکە، دەبوو هەزارویەك فێڵ و تەڵەکە ببینیەوە یاڵا یەکیان جێ بگرێت، دەبوو رایەڵی دۆستایەتی بۆ هەزارو یەك جاش درێژ بکەیت، یاڵا جاشێکیان دەیگرتەوە.

جاروبار ئازووقە دەهاتە ئەوبەری زێ، بەری سۆران، لە دەو زێیان دادەناو بزردەبوون، کێبوون ئەوانە، من هیچی لێنازانم، ئێمەش هێسترمان دەبرد و لەم بەرە، بەری بادینان بارمان دەکرد و دەمانهێنایە بارەگا و لرفمان دەکرد، بەڵام کێ لە زێ دەیپەڕاندەوە؟ قسەمان لەوەیە کە من کەمێك درەنگ زانیم چۆنە، بە خۆشتان دەزانن پەڕینەوە لە زێی گەورە، بە تایبەتی لەو جێگەیەی من دیتم، لە پەڕینەوە، لە دیجلە زەحمەتترە.

کوڕێك هەبوو، کاردۆی ناو بوو، ئەو کوڕە لە هەموو شت دەچوو لە بەلەموان نەبێت، کەچی هیچ شتێکی نەدەزانی جگە لە سەوڵلێدان، هەر ئیشێکت پێبکردایە، هەر شتێکت پێراسپاردایە پەشیماندەبوویتەوە، کەچی هەرچی ئازووقەیە ئەو بە بەلەمێکی گچکەی شڕی وا جگە لە خۆی کەس نەیدەوێرا پێ بخاتە ناویەوە، لەو زێیە تووشە دەیپەڕاندەوە، ئەوە هەمووی لە لایەك، ئەو کوڕە مەلەوانیشی نەدەزانی، ئەبوو جاسم دەیگوت:

لە هەموو دنیایێ یەك بەلەموان هەیە کە مەلەوانی نەزانێت، ئەویش کاردۆیە، حکومەت پێبزانێت خەڵاتی دەکات، بەڵام ئەوە پێشمەرگەیە کە نرخی کاردۆ نازانێت...

کاردۆ زۆر کەیفی بەو قسەیە دەهات، دەیگۆت:

بە مەلا حەسەن دەڵێم لە جیاتی ئەو کارەم هەر هیچ نەبێت با ژنێکم بۆ بێنێت.

بە کاردۆیان دەگوت:

بەس تێمانگەیەنە کە مەلەوانی نازانیت، چۆن دەوێریت بەو کەچە بەلەمە لەو زێیە بار بپەڕێنیەوە؟

کاردۆ زۆر سادە و ڕاستگۆیانە دەیگوت:

دە بەو خودایەی لە سەر سەرانە، کاتێ دەچمە ناو بەلەمەوە هەر وا دەزانم لە سەر زەویم و پایسکل داژۆم، چ ئاو و زێ نابینم، نا، پایسکل زەحمەترە، چونکە جارێك لە سەر پایسکل وەها کەوتم وەها کەوتم، سەرمیان لە سێ جێگە دووریەوە، جگە لەوەش خۆ من هەر دەبێت شەهید بم، پێشمەرگە هەیە هەتا سەر بمێنێ؟ جا با بە ئاوێ بچم نەك بە گوللە، من حەز دەکەم بخنکێم نەك بکوژرێم، چونکە کەمێك لە خوێن دەترسم، خۆ خوێنەکە خوێنی خۆم بێت هەر زراوم دەچێت.

ڕۆژێك من بە هێسترەوە چوومە دەو زێ، بۆ ئەوەی ئەو بارە بێنمەوە کە کاردۆ خەریکە لەو بەر بە بەلەم دەیپەڕێنێتەوە ئەمبەر، کە گەیشتمێ تازە دەگەیشتەوە کەنار، دیار بوو نیوەی پەڕاندبۆوە نیوەی مابوو، گوتی:

بۆ نایەیت لەگەڵم با فێرە سەوڵلێدانت بکەم و ترست لە ئاو بشکێ؟

منیش قەت ئەوها کەر نەبوومە، غیرەتی کەرایەتیم دایە بەرخۆم، بۆ سوار نەبم؟ تۆ بڵێیت هێندەی کاردۆش زاخم تێدا نەبێت؟ ئەگەر مەسەلە کەرایەتیش بێت با بۆ چەند ساتێك وەك کاردۆ کەربم، لەبەر خۆمەوە ئەو ڕستانە و زۆری لە شێوەی ئەوانەشم گۆتەوە و سوار بووم و کاردۆ سەولی لێدا، ڕەنگە هەر گوریسێك دوو لە کەنار دوور کەوتبینەوە، یەك بە زێ، لە شەپۆلەکانی بە گوڕتر، ترس هێرشی بۆم هێنا، هێرشێك بە هیچ شتێك بەرپەچنەدەدرایەوە، یەك بە دەنگی خۆم لە کاردۆم خوڕی؟

+ کوڕە بگەڕێوە، کوڕە بگەڕێوە من نایەم.

- شەرم ناکەیت دەترسیت، بە خۆشی دەڵێت پێشمەرگە، وەی لەو پێشمەرگەیە!

+ دەڵێم بگەڕێوەءءء...

کاردۆ پێدەکەنی و سەولی خۆی لێدەداو بە دەنگە ناخۆشەکەیشی گۆرانیی دەگوت، ئەوجارەش هاوارم بەسەریدا کرد:

بگەڕێوە، نەگەڕێیتەوە یەك گوللە دەنێم بەسەرتەوە.

کاردۆ چ بڵێت باشه:

ئـۆی لەو پیـاوکوژە بـێ ئەزمـوونە، ئەگەر دەشـمکوژی لە دەو کەنـار بمکوژە، چونکە کە من مردم تۆ نـازانی سـەوڵ لێبـدەیت و مردنـی تـۆش مسۆگەرە، زیندوویتی من زیندوویتی تۆشە.

تێگەیشـتم هەرەشــە فشــەیە، دەسـتم بە پـاڕانەوە کـرد، لەگەڵ دووەم رستەی پاڕانەوە، کاردۆ رووی بەلەمی وەرگێرا و گوتی:

دە ئەوها، ئەگەر نەدەپـاڕایتەوە، هەتـا نـاو خـاکی سـۆران ئـاوڕم لێـت نەدەدایەوە.

گوتم:

باشە باش تۆ بمگەیەنەوە کەنار.

کاتێ پێم لە سەر وشکانی دانا، دەتگوت لە ناو مردنـێ گەڕاومەتەوە و شاگەشکە بووم بە کەنـاری ژیـان، ئەوجـا دەسـتم بە جوێنـدان کـرد، سـێ چوار جوێنی مزرم بە کاردۆ دا، ئاوڕی لێمدایەوە و گوتی:

لە ناو بەلەم بۆ وا ئازا نەبوویت، کەنار وەك پێش دەرگا وایە، سـەگیش لە پێش دەرگای خۆی ئازایە.

تۆپەکان هەر لە وشکانی نا لە ناو زێش دەکەونەوە...

-١٨-

**سەردەمانێك ئەوها بوو**
**دنیا دەرگاکانی لە سەرمان داخستبوو**
**نە وشەیەك دەڕۆیشت**
**نە وشەیەك دەگەیشت**

رۆژێك ژنێك، کچێکی پارچەلەشی لەگەڵ بوو، گەیشتنە بارەگا، هێشـتا سـڵاویان نەکردبـوو زانیمـان شـارین، کـاتێ لەگەڵ پێشـمەرگە ژنەکـانم بەراورد دەکــردن کە جلکــی پیــاوانەی وەك منیــان لەبەر بــوو، هــیچ وێکچوونێکم لە نێوان ئەو دوو جۆرە ژنە نەدەیتەوە، هێند لێـك جودابـوون

هێنـد لێـك جودابـوون، ژن و پیـاویش بەو ئەنـدازەیە جیاوازیـان نەبـوو، درەنگتر پێکەوتم کە ئەو ژنە دایکی پێشمەرگەیەکە نـاوی پێشـمەرگایەتیی نا، ناوی خۆی ئارام بوو، باشم دەناسی لە قۆناخی ئامادەیی هاوپۆل بووین، هاتبوون بۆ دیـدەنی، نەیانـدیت چـونکە لەو کـاتە ئـارام لە بارەگایەکیـدی بوو، بارەگایەکی نازانم چەند رۆژە رێیـی، هەر شـەوی یەکەم مێشـوولە بە خـواردن خوشـکەکەی ئارامیـان خـوارد، دەموچـاوی دەتگـوت مێکـوتەی لێهاتووە، تۆقرەی لێهەڵگیرابـوو، پەلەی لە دایکـی دەکـرد زوو بگەڕێـنەوە، چەند شەوێك لە ناو مێشوولە و دووپشك و مار مانەوە.

کاتێ زانی کوڕەکەی لەمێژە دەناسم، ئیدی کەوتینە قسەو باس و باسی برادەرە شاریەکان، ئەوانەی بـرادەری هەردوو لا بـوون، نـاوی سـێ چـوار کەسم هەڵدا باشی دەناسین، یەك لەوانە ناوی موسلیح بوو، گوتی:

ئا، ئێستاش سەردانی ماڵمان دەکات و زوو زوو دەیبینین.

گوتم:

دە ئەگەر بازگەکـان زۆر تونـد نـین، نـامەیەکم هەیە بـۆم بـگەیەنە ئەو کوڕە.

گوتی:

بنووسە دەیگەیەنم، وەهای دەشارمەوە نەبینرێتەوە، هەر ئەوشەو بینووسـە رەنگە بەیانی بەڕێبکەوین.

باش بوو شەوەکەی مانگەشەو بوو، مانگەشەوێك، بە رووناکی پێتـی سـەر پێت دەدیت، لە سەر قەرەوێڵە بۆی دانیشتم، نـامەیەکی چڕوپڕ و جـوانم نووسـی، لە کـاتی نووسـینی نـامە، مێشـوولەکان خاتریـان گـرتم، چ هەستمنەکرد، ئازارم بدەن، ئەو نـامەیە زۆر پێویـستبوو بگـاتە مـاڵەوە لەمێـژ بوو ئاگامان لە یەکتر نەبوو، بە تەنیشت نامەکەی ماڵێ کورتیلە نامەیەکیشم بۆ موسلیح نووسی، لە بیرمە دوای هەواڵپرسین نووسیبووم:

تکـا دەکەم بە هەر رێـگەیەك بێـت مـاڵی ئـێمە ببیـنەوە و ئەو نامەیـان بگەیەنێ.

نەمدەزانی ماڵمان لە جێگەی پێشانە یان چەند گەڕەکیان گۆڕیوە، ئیدی نامەکەم لوول دا لـوول دا، رێـك هێنـدەی جگەرەیەکـی دیـاری لێمـایەوە، جـوان بە تێـپ پێچـامەوە، ئەو دیـارە جـگەرەی ئەسـتوور و نـاڕێکی دەپێچایەوە، ئەو کوڕە لە هەموو هونەرەکانی پێشمەرگایەتیی دەستڕەنگین ببوو، بەڵام لە هونەری جگەرەپێچانەوە چ شارەزاییەکی پەیدا نەکـرد، ئەو هونەرەش بۆ جگەرەکێش لە هونەری سەنگەرگرتن هونەرتربوو.

هەر ئەو شـەوە نـامەکەم دایە دایکـی ئـارام، لە سـەر جـێ راکشـام و بیرمـدەکردەوە، ئەهـا دەبـوو ئەو رستەیەش بنووسـم، ئۆی، لە بیـرم چـوو بڵێم.. .لە ناو تاوتوێکردنی نامەکەی خۆم خەوم لێکەوت.

بەیانی زوو جگە لە ئێشکگر هەمـوو بارەگـا لە شـیرنەی خەوێ بـوون، مـن بە ئاگـابووم، بە پەلە بـووم لە رۆیشـتنی دایـك و خوشـکی ئـارام، دەمویست هەرچـی زووە بەڕێبکەون و بـگەنە هەولێـر و موسـلیح ببیـنن و ئەویش ماڵی ئێمە ببینێتەوە و نامەکەم وەربگرن و بیخوێننەوە... رۆژهەڵات، هەموو هەستان، نان خورا، بووە چێشتان، هەر بەرێنەکەوتن، درەنگ زانیم، کە بەهۆی نەهاتنی چاوساخەوە، ئەوڕۆش دەمێننەوە، سبەی دەڕۆن.

رۆژی دواتر رۆیشتن، بە رۆیشـتنی ئەوان هێنـدە دڵخـۆش بـووم هێنـدە دڵخۆش، لە دوورەوە پێمەوە دیار بوو، ئەبوو جاسم گوتی:

سەیرە چ بووە، چ هەواڵێکی خۆشت پێگەیشتووە؟

چم نەگوت، من هەر بیرم لەو ساتانە دەکردەوە کە لە مـاڵەوە نـامەکەم دەخوێننەوە، بە سۆراخی من ماڵەکە پڕ لە پێکەنین و خۆشی دەبێت.

رۆژی دواتر لە بن کەپری گەورە لە سەر پشت راکشـابووم، بیـرم هەر لای نامەکە بوو، کاتێکم زانی حاجی دەهـام بەو بەژنە درێـژەیەوە لە سـەر سەرم راوەستاوە و هەستمکرد شتێکی لە ناو دەست دایە، گوتی:

ها، ئەو نامەیە وا بزانم هی تۆیە، لای گەرماوەکە کەوتبوو.

لێیم وەرگرت، ئای کوڕە خۆ ئەوە نامەکەی خۆمە، تەزینێك تەزیـم، بە چلەی زستانێ لە زێی بادینانیشیان هەڵکێشابام، ئەوها نەدەتەزیم.

له حەپەساوی خۆم له بیرم چوو لێبپرسم، چۆنت زانی هی منه، هیچم نەگوت، که ڕۆیشت، ئەوپرسیارەم کرد و سەد بارەشم کردەوە(چۆنت زانی هی منه) دەمویست بچمه لای حاجی دەهام ئەو پرسیارەی لێبکەم، شەرمم کرد، ڕەنگه به پێویستیشم نەزانیبێت... ئەو ژنه بۆ وای له من کرد؟ تۆ بڵێیت نەیوێرابێت بیبات و له ڕووشی نەهاتبێت له دەستی خۆیەوه بۆم بگەڕێنێتەوە، باشه بۆ سەرەتا گوتی ئاسانه و ئێستا وای کرد؟ ئەدی حاجی دەهام بۆچی گوتی لای گەرماوەکەم هەڵگرتەوە، کەواته کردوویەتیەوە و ئەگەر نا چۆن زانی هی منه؟ باشه بۆ لای گەرماوەکه بوو؟ ئایا ژنەکه لەوێ لێیکەوتووە، یان فڕێیداوە؟ به هەر لایەکدا دەمبرد نەدەگەیشتمه وەڵامێك که پێی ڕازیبم، هێندەم لەبیره زۆر لەو ژنه تووڕە بووم، ئەو ژنەی که ڕەنگه شتێکی وای نەکردبێت که بەشی تووڕەبوون بکات.

دڵم نەدەهات نامەکەم بدڕێنم، ڕەنگه بیست جار پتر له سەر یەك خوێندبێتمەوە، له خوێندنەوەی نامەکەدا شانۆگەریەکی دڵخۆشکەرەم بۆ خۆم ئامادەکردبوو، لەو شانۆگەریه ئەوەی نامەکەی دەخوێندەوە من نەبووم، کەسێکی ماڵەوەمان بوو، ئەوانیدیش هەموو دەوریان دابوو، به دەنگی بەرز دەیخوێندەوە، ناوه ناوه یەکێکیان دەیگوت:

توخوا، ئەو دێرەیان دووباره بکەوە.

یەکیدی دەیگوت:

خێرا خێرا بیخوێنەوە مەوەستە، تا کۆتایی.

یەکیدی دەیگوت:

زوو به، بیدە من تا خۆم نەیخوێنمەوە باوەڕ ناکەم...

ئەویدی دەیگوت:

بۆچی هێندە کەمی نووسیوە، کەم؟

دوایی پێکەوە دەیانگوت:

ئەرێ ئەو کوڕەی نامەکەی هێنا کێ بوو؟ چۆن بیبینینەوە؟

ئەو ڕۆژە وەکو شێتان له سەر سەر دەگەڕام، سڵاوی کەسم

وەرنەدەگرتەوە، وا بزانم هەر ئەو رۆژە بوو شەڕێکم کرد کە ئێستا نازانم لەگەڵ کێ و چۆن چۆنی بوو، ئەبوو جاسم چەندی هەوڵیدا بزانێت چ بووە، دەیگوت:

تێمبگەیەنە دوێنێ لە کوێ ئەمڕۆ لە کوێ! چ بووە؟

هیچم نەگوت.

تۆپێك بەرزاییەکی نزیك لە ئێمەی ئاگر دا.

-١٩-

**لە کچە قەرەجێکم بیست**
**پۆشکین شووشەیەك گوڵاوی**
**بە سەر خاکی رووس دا پژاندووە.**
**کەس نیە رێی بەو خاکە کەوتبێ و**
**بۆنی گوڵاوەکەی پۆشکینی نەگرتبێ.**

سبەینێیەك کەمێك درەنگتر لە رۆژان لە خەو هەستام، ناوە ناوە شەوان خەوم دەزڕا، بەرەبەیان خەوم لێدەکەوت، باش بوو دەتگوت بەو خەوزڕانەی من دەزانن بۆ نانخواردنێ لە خەویان نەدەکردم یان بانگمیان دەکرد و خۆم دەکردە مردوو، ئەو سبەینێیەی دەڵێم، کە چاوم کردەوە و تەماشای بن کەپری گەورەم کرد، هەستمکرد ژمارەمان زیادی کردووە، دیارە هاتنی مێوان بۆ ئەو بارەگایە وا ریکدەکەوێت بکەوێتە شەوێوە و کەم کەس ئاگای لەو هاتنە دەبێت، ئێمەش کاتی خۆی کە هاتین بەیانیی نەدابوو، لە ناو مێوانەکان پێشمەرگەیەکی هەندێ بە تەمەنی سمێڵ گەورەو پان هەبوو، بە ئەبوو مەحموود بانگیان دەکرد و پتر لە کەپرەکەی مەلا حەسەن دادەنیشت، دیار بوو کە ئەویش شتەك هەیە.

شێخ گوتی:

تۆ ئەبوو مەحموود ناناسی، نووسەرە، شت دەنووسێت.

گوتم:

شت دەنووسێت، ناوی خۆی چیە، بە چ ناوێك دەنووسێت؟

گوتی:

ناوەکەیم لە سەر زارە، ئا، جەلال دەباغ.

گوتم:

ئەوە جەلال دەباغە!

نازانم کێ بوو گوتی:

ئەرێوەڵلا ئەوە ماتریالیزمی دیالەکتیکە.

ئەو وێنەیەی جەلال دەباغ کە لە وێنای مندا بوو چ ئەوە نەبوو کە وا لە بن ئەو کەپرە دانیشتووە و گوێم لێیە قسان دەکات، دیتنی ئەو پیاوە منی گەڕاندەوە ساڵانێکی زوو، لای (ماتریالیزمی دیالەکتیك)، ئەو کتێبەی کە کوڕێك دەیگوت:

لە هەمــوو هەولێــر دوو دانەی هەیە، یەکیــان لە کتێبخــانەی گشــتیە، ئەویدیش لای منە و نایدەمە کەسیش نەوەك بزر بێت.

مـن جارێـك بە چ حـاڵ لێـیم وەرگـرت، هەتـا بـۆم بـردەوە، نیـوەی هەولێری تێمگەیاند.

درەنگتر لە گەرمەی پشتئاشانێ لە وەرامی ئەو قسەیە کوڕێك گوتی:

نا، سێ دانە هەیە، یەکێکیش لای جەلال دەباغ خۆیەتی.

وای وەڵام دایەوە:

ئەویان سووتا، لە پشتئاشان سووتا.

ئەو کــوڕەی ماتریــالیزمی دیــالەکتیکی نەدەدایە کەس، هەمــوو کەس ئەگەر لە نــزیکەوەش نــا لە دوورەوە دەیانناســی، ئەویــش بە ســاقۆکەی، هەموو ساڵێك مانگ و نیوێك دوای هەموو خەڵکی هەولێر ئەو جا ساقۆی فڕێدەدا و جلککی هـاوینەی لەبەر دەکـرد، سـاقۆیەکی درێـژ، ئەو کـوڕە لەگەڵ کاکە زیاد لادێیی تێکەڵ مەکەن، کـاکە زیـاد چـوار وەرزەی سـاڵ جلکــی زســتانەی لەبەر بــوو، ئەو دووە تەنهــا لەوە بە یەك دەچــوون کە هەردووکیان بەردەوام بن هەنگڵیان پڕ کتێب بـوو، ئەو کـوڕە بـن هەنگـڵ

پڕ کتێبە ناونیشانی گەلێك کتێبانی دەگوت بەڵام پێنەدەچوو هیچیانی خوێندبێتەوە، کاتێ لە بابەت ئەو کتێبانەوە پرسیارێکت لێی دەکرد، قسەی بە لاڕێدا دەبرد، بەلاڕێدابردنیش هونەرە و لە دەستی هەموو کەس نایەت، ئەگەر نەزانی چۆن ئەو کارە دەکەیت، دەتگرن و دەتهێننەوە سەر راستەڕێ و شەرمەزار دەبیت، بەڵام ئەو وا نەبوو، بە شێوەیەك خۆی لە وەڵامی پرسیارەکە لادەدا، تۆش لە بیرت دەچۆوە چ پرسیارێکت کردووە، حەزتدەکرد هەتا دوایی هەر بە ڕێی لاڕێدا بڕوا.

جارێك کوڕێك لێیپرسی:

+ بۆچی ماتریالیزمی دیالەکتیکت لە ماڵێ دەستبەسەر کردووە و نایدەیتە کەس بیخوێنێتەوە؟

- لەبەرخاتری دەروێش، خۆت دەزانی ماڵمان بە تەکیەی شێخەوەیە، رۆژێك دەروێشێکی برادەرم زۆر لێمپاڕایەوە کە ئەو کتێبە بە ناو خەڵکدا بڵاو نەکەمەوە، گوتی: هەر کتێبێك دیتی و دەبەیت، قەینا، بەس ئەوە نا، چونکە لەو دنیا لە سەر هیچ نا لە سەر ئەو کتێبە و چەند لاپەڕەیە هێندە ساڵەت لە دۆزەخ دەهێڵنەوە.

+ دەروێش لە کوێی زانی ئەو کتێبە خراپە؟

- جارێك هەندێکیم بۆی خوێندەوە، گوتم بزانم نایکەمە مارکسی.

+ ئەوجا بۆ بە قسەی دەروێش دەکەیت؟

- بۆ ئەو دنیا کەرە بۆ ئەو دنیا، ئەگەر قسەی دەروێش دەرچوو.

هەندێك کەس پێیانوابوو ئەو کوڕە دەروێشێکە لە دەروێشەکانی ماڵی شێخ کاکە.

ئەو کوڕە هێندە ناوی کتێبی (ماتریالیزمی دیالەکتیك)ی دەهێنا، هەتا ناوی بووە ماتریال، زۆر کەس بەو ناوە بانگیان دەکرد، ئەو ماتریالە رۆژ نەبوو بە یەك رستە کێشەیەکی سیاسی نەخاتە ناو هەوادارانی حزبەکانەوە و بۆ خۆیشی لە دوورەوە پێیانپێدەکەنی، کەس نەیدەزانی ئەو ماتریالە سەر بە چ حزبێکە، هەندێك دەیانگوت، سەر بەهیچ نیەو سەر بە هەمووانیشە، هەر

ڕۆژەی لە بەرژەوەندیی حزبێك قسەی دەكرد، كوڕێكی قسە خۆش بوو، هەمووان خۆشیان دەویست، لە بیرمە ڕۆژێك لە ناو كۆمەڵێك كۆمەڵە گوتی:

ئێوە هەمووتان هەر هەمووتان لە ماتریالیزمی دیالەكتیكی جەلال دەباغەوە فێری ماركسی بوونە، كەچی ئێستا لەو بن بەرد بۆ ئەو بن بەرد ڕاوی دەنێن.

كوڕێك خەسرەوی ناو بوو هەڵیدایێ:

من چ لەو كتێبەوە فێری ماركسی نەبوومە.

ماتریال ئەوها وەڵامی دایەوە:

ئەوجا تۆ كەی ماركسیت، تۆ مەترسیت!

ئەو خەسرەوە دواتر بووە (سەپان) و چووە ناو (ئاڵا) و بە ئاڵایی شەهید بوو.

لە بیرم چوو هەندێك كەس بەو كوڕەیان دەگوت فەتحی دەباغ.

ئێستا با بگەڕێمە ناو كەپران لای جەلال دەباغ، پیاوێكی قسە خۆش بوو، گاڵتەی جوانی دەكرد، لە هەندێ بابەت زۆر نەرم و شاعیرانە قسەی دەكرد، زۆر بە فەتحی دەباغ دەچوو، دەتگوت لە ماڵی جەنگیز ئیتماتۆفەوە هاتووە و سەردانێكی پۆشكینیشی كردووە، بۆنی پۆشكینی لێدەهات، بەڵام لە هەندێكیدی زۆر ترسناك بوو هەستمەدەكرد وتەبێژی فەرمیی ستالینە، بارەگاشم لە بیر بێت لەوێ و ئەودەمانێ كەس نەبوو یان من شكم نەدەكرد كەس هەبێت كە بڕێك خولیای ستالینی لە سەردا خول نەخوات، ئەوجا با ئەو بڕە بە قەد تاڵە مووێكی سمێڵی ستالینیش بێت، من بە دیتنی زۆر خۆشحاڵ بووم، هەستمدەكرد بە (ماتریالیزمی دیالەكتیك) من بە شێوەیەك قەرداری ئەوم.

زوو ڕۆیشتن هێندە نەمانەوە.

تۆپێك هەمووماان بەعەرد دادەدا، لە دۆڵاییەكی نزیك دووكەڵ بەرزبۆوە.

-٢٠-

## ژنێك رووی لە دەستە خوشكێكی بوو:
## كچێ گۆڕێكم بۆ هەڵكەنە

به دەستی خۆت بمنێژە
لە خۆم بەدەبەخت و چارەڕەشێ
تووشم بە تووشی كێوە بوو
مێردەكەم نە میرە، نە بەندبێژە.

لە دەمی نانی نیوەڕۆیێ ئەگەر چۆن دەنا هەموو دەهاتنە بن كەپری گەورە، نیوەڕۆیەكی ئەو تەمووزەی ئەوێ وا رێككەوت من و مەلا حەسەن بكەوینە سەر یەك لەگەن، لە پێشمەرگایەتی لە رۆژانی ئاسایی، پێشمەرگە دوو دوو نانیان دەخوارد، خۆ ئەگەر ژمارەی پێشمەرگە تاك بوایە، ئەو تاكەی دەمایەوە لە خۆی خەنی، بە تاقی تەنێ لە سەر نان دادەنیشت، ترسی نەبوو لەوەی بەگەڵ كەسێكی زۆرخۆر و گورگانی خۆر بكەوێت، هەتا ئەو كەوچێك بۆ دەوی دەبا ئەویدی چواری قووتدابێت، نانخواردنیش بە گشتی لە سەر چیچكان بوو، تفەنگیش لە تەنیشتت، مەلا لە سێ شت زۆر خاو بوو: نانخواردن، گەرماوكردن، قسەكردن.

لە بەرانبەر سێكوچكەی حەرام ناویان لەم سیانە نابوو سێكوچكەی مەلا، من قسەم لە بارەی سێیەمیانەوەیە، هەر دەڵێی ئێستایە كە گوتی:

هاوڕێ شوانە، بابە دوای چایە خواردنەوە ئەگەر لە قەلبت ناخۆش نەبوو، سەرێكم لێدە لە كەپرێ.

لە دەستمچوو لە یەكەم وشەوە كاتژمێر بگرمەوە، لە بیرمچوو، دەنا ئێستا بە دڵنیاییەوە دەمگوت گۆكردنی ئەو چەند وشەیە رێك یەك خولەكی خایاند، هەر لە بارەی قسە خاویەوە كەرەتێك لە كات و جێگەیەكیدی پێشمەرگەیەكی عەرەب ناوی (ئەبوو میلاد) بوو، بەڵام

هەنـدێ لە پێشـمەرگەی کـورد ناویـان نـابوو مـیلادە دۆم، پێشـمەرگەی عەرەبیش هەبوو بانگیانـدەکرد (ئەبـوو دۆم)، ئەو کـوڕە هەرچـی گـۆرانیی ((دۆمانە!))ی کوردی هەیە لەبەری بوو، بەنـدی وەهـای دەگـوت، بـای لە رەسووی نادری و ئەوانە بڕی بـوو، بەنـدبێژ بـوو نەك گەمە، هەر هێنـدەت دەدی ئەبوو میلاد تەنەکەیەکی کردۆتە دمبك و:

هاتم لە لای ئەولایە

تێکی بدەی خودایە

مزگەوت ماڵی مەلایە

ئێمەش جێمان چیایە

من لە هەورێ گوێم لە بەندێکی درێژی ئەبوو میلاد بوو، سـەرەتاکەی ئەوهابوو کە بیستتان، کەسێك ئەبوو میلادی نەناسیبا، بێ سێودوو دەیگوت خەڵکی سێتاقانی هەولێرە، نازانم ئەو کوردیە لە کوێ فێرببوو کە نەك هەر گۆرانیی پێبڵێ، بەندیش دابنێ، ئەگەر کەسێك بیەوێت قسە لە سەر بەنـد و بەنـدبێژانی کـورد بکـات، نابێـت ئەو پێشـمەرگە عەرەبە لەبیربکـات کە لە خۆشەویسـتی و رێــزەوە نــاونرابوو مــیلادەدۆم، بەنــد خەریــکە مەلام لەبیرببـاتەوە، ئەو ئەبـوو مـیلادە لە کـانی تەلانـی هەورێ، پێـدەچوو یەکەم جاری بێت لە کۆڕی مەلا حەسەن دانیشتبێت، دوای دانیشتنەکە گوتبووی:

ئەو مەلایە ئەگەر لە گانکردنیش ئەوها خاو بێت، ژن خەنی دەبێت.

دەیانگۆت بەندێکیشی لە سەر رێکخستبوو، بەڵام من گوێم لێنەبوو.

دوای چـا خـواردنەوە دوای ئەوەی مەلا چـۆوە کەپـرەکەی خـۆی، بە کەمتر لەو مـاوەیەی کە ئەو رستە بانگهێشـتەکەی هەڵـدا گەیشـتمە کەپـر، یەکەم جارمە پێ بنێمە ئەو کەپـرەوە، کەپـر خـۆی جیـا لە کەپرەکانیـدی نیشاندەدا، جیایی لە دانیشتن وگوێگرتن و قسەکردن، دەنا لە کەپرەکانیدی شڕتر بـوو، لە دیـدی مـنەوە کۆشـکی کۆمـاری بـوو، دەبـوو بـزانم چۆن دادەنیشم چۆن گوێ دەگرم، چۆن قسە دەکەم، نازانم بۆچی هێندە شەرمم لێیدەکرد، بڕوا ناکەم لەبەر ئەوەبووبێت کە بەرپرسێکی گەورەیە، چـوونکە

زۆری لەو گەورەترم دیتبوو، شەرمیش مێوانم نەبووە، رەنگە ئەو شەرمە لەوەوە هاتبێت کە ئەو زیاد لە پێویست رێزمی دەگرت و بە شێوەیەکی زۆر تایبەت قسەی لەگەڵم دەکرد، رێزگرتنێك کە خۆم لاموابووە پێویست ناکات، بە کورتی نە دەمزانی بۆچی هێندە رێزم لێدەگرێت، نە دەمزانی من بۆچی هێندە شەرمەی لێدەکەم، ئەوەش بڵێم لە دوای ئەو دانیشتنەوە شەرم نەما، بەڵام رێز تا سەر مایەوە، ئیدی بەو خاویەی کە هەر لە خۆی دەوەشایەوە گوتی:

ئەگەر خۆت حەزت لێبێت، من حەزم لێیە تۆ برۆیتە سەرێ بۆ کاری راگەیاندن و نەچیتە خوارەوە.

باش بوو، لە شەرمان نەمگوت باشە، گوتم:

من حەز لە راگەیاندن ناکەم، دەمەوێ بەرەو هەورێ ببمەوە.

بە رێزەوە گوتی:

باشە، هەوەسی خۆتە، بەس من حەزمدەکرد تۆ لە راگەیاندن کار بکەیت.

هەر لەو کەپرە کۆماریە گوتم لێگەرێ ئێستا دەڵێ :

کورتەك و شەرواڵێکت بۆ دەکرم.

نەیگوت، من هەینێ جلکەکانم زۆر شڕ بوون، لە چەند جێ شەرواڵەکەم دووریبۆوە، لە دوورەوە جێی درووماني درشت دیار بوو.

ئەو مەلا حەسەنە لە یادەوەریمدا و لە پێرسێکی زستانی نەك هاوینی ناوەکەی بە بێ ئەوەی هەڵەی چاپ بێت بۆتە میری رواندز.

بۆ بەیانیەکەی جوولەیەك کەوتە بارەگاوە، چەند پێشمەرگەیەك خەریکی خۆخڕکردنەوە بوون، خەیریش قسەی لە زاری گیر نەدەبوو لە بەر خۆوە دەیگوت:

دوورە زۆر دوورە، لە خۆت خەنی مەلا جەلال لە پێش چاوت بزر دەبم.

رەنگە رۆژی دواتر بوویێت، چەند کەپرێك چۆل بوو، رۆیشتن خەیری

و مەلا حەسەن بە کچ و زاواوە، هەنگاو، لە ژنەکان تەنها نادیە مایەوە، وا بزانم ئەگەر بە حەزی مەلا حەسەنم بکردایە منیش لەگەڵ ئەوان دەڕۆیشتم و دووریش نەبوو تووشم بە تووشی خوا کورکی شەڕەوە بایە، ئەو شەڕەی لە چاو زۆر شەڕان شایی بوو.

تۆپ، تۆپ، ئاگر لە دەوروبەری بارەگا دەکەوێتەوە، دەبێت لە سەر پێ بین بۆ ئاگر کوژاندنەوە.

-٢١-

**زەوی هەمووی ئاوە**
**لێرەو لەوێ ناولەپ ناولەپ وشکانی**
**ئەویش دوورگە دوورگە، دوورگەی ئاگر.**

خەیری چوو، هەرچی هاتوهاوار و گاڵتەوگەپ بوو خستیە کۆڵەپشتەکەیەوە و لەگەڵ خۆیدا بردی، بارەگا بە چوونی ئەو پیاوە لە چۆڵەوانی دەچوو، ئاشی ئاو لێبڕاو بوو، مەلا جەلالیش کە حەزی بە چارەی نەدەکرد، هەرچەندە نەیدەویست بەسەر خۆی بێنێت، بەڵام بێ خەیریی پێوە دیار بوو، ئەو پیاوە ئاوەدانترین پیاو بوو، نەمانی ئەو پیاوە لە بارەگا لەوە دەچوو کە لە گەڕەکێگ نەك کۆلانێك گەڕەکەکە هەمووی باریکردبێت، ئاگر تا دێت نزیك دەبێتەوە، خەیریش نەما بە کەوتنەوەی هەر ئاگرێك یەك بە دەنگی خۆی و بەو چلەی هاوینە گۆرانیی نەورۆز بڵێتەوە و کەمێك ترسی ئاگرمان لێدوور بخاتەوە، ئەویش نەما لەگەڵ لوورەی هەر تۆپێك بە پەنجە کەپرەکەی ئەو سەر نیشانبدا و ئەگەر بۆ ساتێك و هەر بۆ گاڵتەش بێت ترسی ترس لە دڵ بڕەوێنێتەوە.

ڕۆژ دوای ڕۆژ هەستمدەکرد ئەو جوگرافیایەی بارەگا لێی هەڵدابوو، پتر شێوەکەی دەگۆڕێ، بە بەر چاومەوە شێوەی دوورگەی ئاگری دەگرت، ئاگر، ئاگر... ئاگر لە گشت لاوە بەرزدەبۆوە، بارەگا لە ناو بڵێسەی ئاگر چاوی لێکدەنا، لە ناو دووکەڵ چاوی هەڵدەهێنا، لەوە

دەرچووبوو دڵ بە گۆڕینی ئاراستەی با خۆشبکەین، با لە هەر لایەکەوە هەڵیکردبا، ئاگر و دووکەڵی بۆ بارەگا دەهێنا، باوی ئەوەش نەما نیوە شەوان جاروبار سینگمان بۆ کزە بایەك بکەینەوە، تا کەمێك فێنکایی بەخشێتە جەستەی ئارەقاویمان، لەوە دەرچوو کاتژمێرێك ئێشکگری خۆت بگرە و ئیدی پشتی لێبکەوە، ئەو رۆژ و شەوانە لە ناو دوورگەی ئاگر هەموومان ئێشکگری هەمیشەیی بووین، دەبێت لە مار بە ئاگاتر بین، دەنا دەبینە ماری برژاو، من بە چاوی خۆم ماری برژاوم دیت، ئەو مارانە نا کە شێخ دەیکوشتن و چاکی دەکردن و ئاگری دەکردەوە و دەیبرژاندن و دەمانخوارد، نا، ماری دەرەوەی کۆنترۆڵی شێخ، مارم دەدیت دەکەوتە ناو ئاگری تۆپەکانەوە و فریای راکردن نەدەکەوت، وەها دەشێوا کونێکی دەرچوونی لەو زەویە کونکونیە نەدەدیتەوە، دەکەوتە ئاگرێکی واوە جلیتبازیی لە بیردەچۆوە، دوورگەی ئاگر ماری دەبرژاند، دووپشك و کیسەڵ و بۆقی دەبرژاند...

پێرس دەمێکە لە سووتانە، بەڵام سووتانی ئەمجارە جیایە، سووتانێکە هێند گەرم هێند گەرم بەرد دەتاوێنێتەوە، ژێری دەتاوێنێتەوە، چیا بیابانێکە لە خۆڵەکەوە، هەوکە پێشمەرگە کۆمەڵێك ئاگرکوژێنەوەیە بە دەوری بارەگا دەخولێنەوە و ئاگر دووردەخەنەوە، ئەو چەند جارەی بە هۆی تۆپێکەوە دووکەڵ لە جەرگەی بارەگاوە هەستا، خێرا خێراتر لەوەی لە پێشمەرگە چاوەڕێ دەکرێ دەمانکوژاندەوە، ئەو رۆژانە لە هەر چوار ئالی دنیاوە تۆپەکان رووەو پێرس دەهاتن، ئەو رۆژانە فڕۆکە و کۆپتەری دنیا لە سەر پێرس دەسووڕانەوە، ئەو رۆژانە بارەگا لە ناو سێرە بوو، شەوەکانی ئەو رۆژانە شەوی ئاگر بوون و دەسووتان، شەوانێك بوون ئاسمان بایی ئەستێرەیەکی دووریش جوانیی نەدەدرەوشاندەوە، ئاگر ئاگر، دووکەڵ دووکەڵ، دنیا پێکهاتەیەکە لە کۆکردنەوەی ئاگر و دووکەڵ، نە ئاو هەبوو، نە خاك، نە هەوا، هیچ هیچ هەر ئاگر و دووکەڵ.

بە ئەبوو جاسمم گوت:

ئەو ئـاگر و دووکەڵە هەمـووی لە پێنـاوی قڕکردنـی مێشـوولەیە، بـۆ خۆمان خەنی بووین.

بە پێکەنیـنەوە کە لە قاسـپەی کەو دەچـوو، نـاولەپێکی لە نێـوچەوانی خۆی دا و زرچەی هات:

هێشتا ماون، ئەو مێشوولانە نەمرن، لەوانەن کە(نەمروود) یان کوشت.

بە شەڕفرۆشتن بە ژیانیش، ژیـان لەو بارەگـایە نەمـاوە، بـۆچی هەرچـی زووە بە هەڵاتن هەڵنایەین؟ نازانم، دەبێت هۆیەك هەبووبێت بۆ مانەوە.

کۆپتەرەکان نزیکتر و نەویتر، ئێستا بارەگا لە ناو سێرەی کۆپتەرەکـانە، ئەوانیش لە ناو سێرەی بارەگان، دۆشکەی بارەگا بە ناچاری کەوتە ئـیش، کلاشینکۆفیش بە خـۆی ناوەستێ و جـار جـارە دەسـڕێژێ بە کـۆپتەرەوە دەنێ، دڵنیاشە کە گوللەکان زۆریان دەمێنێ بۆ کۆپتەر سـاردەبنەوە، بەڵام دەیانگوت:

کلاشینکۆف ئیش بکات باشە، هەر نا کۆپتەرەکان لەوە نەویتـر نـابنەوە و ترسیشمان لە دڵ نامێنێ.

دەیانگوت:

خۆشاردنەوەی بێ تەقە ترس لە خۆبارکردنە، بە تەقەیەك هەرچی ترسـە دەڕەوێتەوە.

وا بوو.

پێشـمەرگە لە ترسـی کـۆپتەر و تـۆپ، بە شـێوەی کەرویشـکی ترسـاو لانەولان دەکات.

تۆپ، ئاگر، کۆپتەر، تەقە تەقە...

-٢٢-

خۆڵ ڕووی قسەی لە ئاوە:
بەردی هاوڕێ کەمدووە
بەڵام هەر جارێ بێتە گۆ
کام ڕووبارت ڕێی زۆر دوورە
نیو هێندەی وی نەگوتووە.

نازانم چەند پێشمەرگە مابووینەوە، دەزانم بووینە دوو دەستە، دەستەیەك مەلا جەلال دەمڕاست و سەردەستە، دەستەیەکیش ئەبوو ڕاستی، من لەگەڵ هێسترەکەی هاوڕێم کەوتینە دەستەکەی ئەبوو ڕاستیەوە، لەو ڕۆژەوەی نەمهێشت هێستر لە هەڵدێر هەڵدێرێ، هەستمدەکرد وەك هاوڕێیەکی خۆی سەیرم دەکات، منیش بە هەمان چاو لە هێسترم دەڕوانی، پێشتر ئەو بارەگایە بە قەت حەفت بارەگا هێستری هەبوو، لەبەر ئەوەش هەندێك ناویان نابوو بارەگای هێستران، ئەگەر بە ڕێکی پێشمەرگەمان بە سەر هێسترەکاندا دابەش بکردایە، هەر چوار پێشمەرگە هێسترێکیان بۆ ڕازابۆوە، هێسترەکان هەموویان سەر بە کەرتی گشتی یان کەرتی حزب نەبوون، هی کەرتی تایبەتیشی تێدابوو، حەمە ڕیش هی خۆی هەبوو، سەردەستە هەیبوو، بەڵام لە بیرم نیە ئەو هەموو هێسترە چیان بەسەر هات، تۆپ بردنی، کۆپتەر هەڵیکێشان!...

ئێمە لە دوورگەی ئاگر ماینەوە، دەستەکەیدی ڕۆیشت، ئێستا لە ناو ئاگردا چاوەڕێی نامەیەکین، نامەیەك لە مەلا جەلالەوە و تێیدا هاتبێت:

وەرن ڕێ باشە، بەڕینەوە لە زێ مسۆگەرە.

زێ هەر ئەو زێیەیە کە ئەگەر لە دوورگەی ئاگرەوە بە دووربین تەماشایبکەیت شەپۆلەکانی لەو دوورەوە هەستدەکەم فێنکایی بەخشن، زێ هەر ئەوەیە کە کۆپتەر باشوکە ئاسا بە سەریدا سەرەو خوار دەکات و

خەریکە تایەکانی تەڕدەبێت، دەڵێی راوە ماسی دەکات، زێ هەر زێی گەورەیە، بەڵام پەڕینەوە لێرەوە تا لە جێگەیەك ناوی بە قەندیل رۆیشتووە.

لەو ئاگرستانە هێستر و پێشمەرگە جێمان پێ جێ نیە، وەك ئێمە لە کۆپتەر دەترسن، فێربوونە لە پێشمەرگە پێشمەرگانەتر خۆیان لە چاوی کۆپتەر بە دووربگرن، تۆپ، تۆپ، کۆپتەر کۆپتەر، ئاگر، ئاگر، تەقوتۆق و خۆشاردنەوە، خۆشاردنەوە لە بن بەرد، ئەو بەردانەی لەنزیکەوە زۆر نزیکەوە ئاگر دەڵێی زمانە گایە بە جوولەیەکی ئیزرائیلیەوە بۆیان دێت، ئەو بەردانەی هێند ساچمەیان پێکەوتووە هێند ساچمەیان پێکەوتووە، دەڵێی کەندۆخ و پەیکەرساز کاری کۆڵینیان لە سەریان کردووە، سەنگەربەندی پێشمەرگە، ترس و ئازایەتی پێشمەرگەی نەخشاندووە و نیشاندەدات، بەردی چ چیایەك وەك بەردەکانی بارەگا پێرسیەکە لەش پڕ ساچمە و بریندارن! باش بوو بەرد خوێنی نەبوو، دەنا بە خوێنی ئەو بارەگایە زێی گەورە حەفت ساڵ شەپۆلی خوێنینی دەدا و رەنگی خۆی نەدەگرتەوە.

نامە نەگەیشت، دەبوو بارەگا چۆلبکەین، خەمی ئاگرکەوتنەوە و کوژانەوە نەما، چونکە چیا یەك پارچە خۆڵەمێشە و چیلکەیەك بۆ ددان خاوێنکردنەوەش نەما ئاگر بگرێت، هێسترەکان خۆیان داوەتە بن کەندەلانان، هێستر بە ئەزموونە لە خۆشاردنەوە، کۆپتەرەکان هێندە بێ منەت دەسوورێنەوە، دەڵێم ئێستا نا ئێستا لە نێوان کەپران دەنیشنەوە و سوارمان دەکەن و دەمانبەن، بەڵام ئەو تاقولۆق تەقانەی کە پێدەچوو لە ترسەوە بتەقێنرێن نەك لە بوێری، کۆپتەرەکانیان لە نیازی نیشتنەوە پەشیمان دەکردەوە، بڕیاردرا نامە بگات و نەگات، دەڕۆین و ژیان لێرە کۆتایی هات.

دیتم چەکدارێك بە هەلەداوان دەتگوت تازە لە شەڕی (هەنارە) رزگاری بووە، بەرەو بارەگا دەهات، نامەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا، ئەبوو راستی هەر سیودوو ددانی بەکارهێنا ئەوجا کردیەوە، دیاربوو بۆی نەدەخوێندرایەوە، دایە شاهێن ئەویش هیچی لێهەڵنەکڕاند، ئەحمەد عەرەب

گوتی:

بیدەنە من، دیارە بە عەرەبی نووسیویەتی.

ئەبوو راستی گۆتیە ئەحمەد عەرەب:

بۆ دیارە ئێمە عەرەبی نازانین! بەڵام ئەوە بە هیچ زمانێك نیە.

ئیدی نامە دەستاو دەستی دەکرد و کەسیش دوو وشەی بۆ نەخوێندرایەوە، بایی ئەوەیان لێهەڵنەکڕاند ئایا بە ڕێکەوین یان نا، گرفتی نامە لە چیدا بوو؟ لەوە گەڕێ کەس دەستخەتی وا ناخۆشی نەدیتووە، لەوە گەڕێ خەتی وا خواروخێچ هەر نیە و هیچ پارچە کاخەزێك خەتی وای بە خۆیەوە نەدیتووە، خەتەکان هەموو یەکتربڕبوون، خەتی یەکەم نەك هی دوای خۆی هی چوارەمیشی بڕیبوو، لەوەش گەڕێ کە لە پیتی (گ، ك) سەر بە قوتابخانەی ئەمین زەکی بەگ بوو، هەندێ شت هەبوو لە هیچ ڕێنووسێك نەبوو، تایبەت بوو بە مەلا جەلال، (ك)ی سەرەتا و ناوەڕاست چوکلەی نەبوو، وەك(ل) نووسرابوو، بۆ نموونە وشەی چونکە بە چونلە نووسرابوو، ئەو پیتانەی کە خاڵیان هەیە لەو ڕێنووسەی مەلا جەلال بێ خاڵ بوون(ح، ج، خ) هەر (ح) بوون، بەڵام پیتی بێ خاڵ خاڵی بۆ دانرابوو، خاڵ لە سەر پیتی (م) هەبوو، ناچار پەنامان بۆ لە بریدانان برد، وەك چۆن ڕێنووسێکی کۆنی دۆزراوە دەخوێنێتەوە وامان کرد، ئەوجا هێندەی تێگەیشتین کە بە دوایاندا بڕۆین، ئەوەشی نووسیبوو، کە نامەکەی لە تاریکیدا نووسیوە، بۆیە ڕەنگە باش نەخوێندرێتەوە، نازانم کێ بوو گوتی:

لە بەر گڵۆپی سەدیش بینووسی، هەر ئەوهای دەنووسی، وا دەزانێ دەستخەتی ڕۆژیمان نەدیوە.

لە بیرمچوو بڵێم دەستەکەی ئێمە سێ سەر دەستەی هەبوو، ئەبوو راستی، ئەحمەد شاهێن، ئەحمەد عەرەب، گوێم لێبوو گوتیان:

سێ کەس باشترە لە یەك با دیکتاتۆر درووست نەبێت.

ئەوەش لە بەدبەختی ئەبوو راستی بوو، دەنا کەی شتی وا هەبووە!

کۆپتەر، کۆپتەر، زۆر نەوین زۆر.

-٢٣-

**گەڕیدەیەك لەبەر خۆیەوە:**
**بەهەشتیش بە ویتەی دۆزەخ**
**هەر لەتەی لە جێگەیەکی دنیایە.**

سپێدەیەك هێشتا هیچ دوندێکی خۆلەمێشی سپێدەی نەدابوو، دەستە سێ سەردەستەییەکە بارەگـای خۆلەمێشـیمان بە گەرمـی بـۆ کۆپتەرەکـان بەجێهێشـت، نـازانم ئەوان بەڵام مـن ئـاوڕم لێـدایەوە، بە نـاو خۆلەمێشـدا دەڕۆیشتین، هەتا لەو کەلەش ئاودیو بووین کە بـۆ یەکجـارەکی بارەگـای لێـوە ئـاوا دەبـوو، مـن لە هەر دوو سـێ هەنگـاوی بەجێهێشـتن ئـاوڕێکم دەدایەوە، ئاوڕ لە قەرەوێڵە، لەو دوو گابەردەی خوارەوە کە چەنـدان جـار من و شێخ لە پەنایاندا مارمان لە شیش داوە، ئاوڕ لەو گەرمـاوەی کە زۆر کەڕەت تێیدا خۆم خاوێن و بەتـاڵکردۆتەوە، هەر لە سـاتەکانی ئـاوڕدانەوە لە بارەگای خۆلەمێشی گـۆتەیەکی شـێخم بیـرکەوتەوە کە واتـایەکی وای دەدا:

تۆ پەیوەندیت بە شوێنەوە پەیوەندیەکی ئاژەڵانەیە، ئەو ئـاژەڵانەی زوو زۆر زوو ماڵی دەبن، تۆ لە هەموو ئاژەڵان پتر و زووتر خـدێ بە جـێگەوە دەگریت، ئەگەر وەرزێك لە دۆزەخ بمێنیتەوە، کاتێك دێن پیلت دەگرن و هەڵتدەدەنە بەهەشت، تۆ هەر چـاوت لە دۆزەخە و ناتەوێـت دەسـبەرداری بیت.

چێشتانێکی درەنگە، بە هەورازەیەکدا هەڵدەگەڕێین، هەورازەیەك لەمێـژ نیە خۆری گەرمـی تەمـووزی بەڕێکـردووە و چەنـد ڕۆژێـکە خـۆی لەبەر خۆری گەرمتر، خۆری ئاب ڕاخستـووە و قـرچ قـرچ هەڵـدەقرچێ، دڵنیـام جگە لە تەموز و ئاب ئەگەر سـاڵ مـانگێکی گەرمتـری هەبـا، یـان هەوراز ڕووە و ڕۆژئاوا هەڵکەوتبا، ئەوا لە چیای ئاگری ئاگراویتر دەبوو، ئۆی! چ

هەورازەیەکی گەرم بوو، لەوەتەی لە هەورازان تەمەن بە با دەدەم، ئەوە تاکە هەورازە بە جگەرەوە نەمبڕیبێت، قەت گوێم بە هەورازان نەدایە، جگەرەی خۆم هەر کێشایە، چەندی گوتوویانە:

لە هەورازان جگەرە مەکێشە زۆر خراپە، هەناسە خێرایە، دووکەڵ راست و راست بۆ سیەکانە.

هەر لەو هەورازەیە بۆ یەکەم جار بوو، هەورازەیەك مەتارەم چۆڕبڕ بکات، من لە هیچ کتێبێك لەوانەی باسی شەڕی چەکداری و پارتیزانی دەکەن بەوەی گیڤاراشەوە راستەوخۆ ئاگاداریەکی وام نەخوێندبۆوە:

ئاگادار بە هیچ هەورازەیەك ئەگەر سەری لە ئاسمانیش بێت، ئەگەر سەرتاپا ئاگریش بێت، نابێت مەتارەکەت پێ چۆڕبڕ بکات.

بەڵام ئەو رستەیەم بەردەوام لە بەرە خۆم دەگوتەوە، رەنگە هی کەسیش نەبێت، من باوەڕی تەواوم بەو ئاگاداریە هەبووە، قەت لەبیرخۆمم نەبردۆتەوە، من لە ئەزموونەوە بەوە گەیشتم هەر پێشمەرگەیەك لە هەورازەیەك مەتارەیەك ئاوی خواردەوە، ئەوە پێشمەرگە نیە، لەو هەورازەیە من پێشمەرگە نەبووم، مەتارەیەکم خواردەوە، هەبووە بە منی گوتووە:

تۆ لە بن بەردێك بە تینوێتی دەمریت، لە کاتێکیش مەتارەکەت نیوە نەبووە.

من کەسێك بووم زۆر دەستم بە مەتارەوە دەگرت، جاری وابووە، خەریك بووە بخنکێم، مەتارەشم ئاوی تێدابووە، لە پێشمانەوەش نزیك زۆر نزیك ئاو، کانی دەهاتە رێ، کەچی نەموێراوە لێو بنێم بە مەتارەوە لە دڵی خۆم گوتوومە باشە ئەگەر من مەتارەکەم بەتاڵ بوو، لەو کاتەش بەرێکەوت، کۆپتەرێك پەیدابوو، تووشی بۆسەیەك بووین و نەگەیشتینە کانیەکە، ئەودەم من چی بکەم!

خواوەندی گەرما کردی نەیسووتاندین و سەرکەوتین، شۆڕبووینەوە، گەیشتینە دۆڵێك، کاتیش نیوەڕۆیە، ئەگەر دەڵێم ئەو دۆڵە فێنکترین دۆڵی دنیایە، دەڵێن، چەند زێدەگۆیە لە گۆتنێ، هەر دار و درەختێکت دەوێ

لەو دۆڵە لە دوای بگەڕێ، من لە درەختە ناسراوەکان بەس دار خورما و مۆزم نەدیت، بەڵام سەیر بوو هیچ درەختێك لە درەختانی دۆڵ وەرزی بەری نەگەیشتبوو، میوە پێنەگەیشتبوو، هەر ئەوەش وایکرد بکەومە گومانەوە و چاوی خۆم هەلگلۆفم و بزانم خەون نابینم، ئەوەیان خەون نەبوو، بەڵام رەنگە گەرمای هەورازەکە ئەو هەورازەیەی دووکەڵی جگەرەی منی نەدیت، بەڵام مەتارەکەمی بە بە تاڵی دیت، ئەو دۆڵەی بەو شێوەیە لە دیدی من نەخشاندبێت...

ئاوێك بەو دۆڵەدا بە بن داراندا نەرم نەرم خوڕە دەکات، ناشزانم لە کوێوە دێت و بۆ کوێش دەچێت، من لە چ جێگەیەك، لە چ کتێبێك بە کتێبە پیرۆزەکانیشەوە ئاوی ئەوهام نەدیتووە، لە بیرمە لەو دۆڵە بەهاریە، خۆزگەم دەخواست کە پەیامبەرەکان بەر لە مردن رێیان بەو دۆڵە بکەوتایە بۆ ئەوەی وێنەی بەهەشتیان جوانتر، دڵگیرتر پیشانی مرۆڤ بدایە، لەو دۆڵە بەهەشتیە کە هیچ کام لە پەیامبەران نەیاندیتووە، دانیشتین و خۆمان و هێسترمان کردەوە، نانمان خوارد، گوێم لێبوو گوتیان:

تا عەسرانێکی درەنگ لێرە دەمێنینەوە.

خەنی بووم، هێستریش خەنی بوو، ئەوەتە دوای گەوزین، وا وەك ئێمە دەلەوەڕێ، لە بیرمان بێت گەوزینی هێستر یەکسانە بە خۆشووشتنی مرۆڤ، رەنگە لە خۆشووشتنیش پتر، هێستر هەتا خۆی نەگەوزێنێ، پشووی نەداوە، ئەگەر حەفت رۆژ بە بارەوە بەڕێوە بێت، هەر کاتێك کورتانت لێکردەوە و دووسێ جار لە ناو خۆڵێ خۆی گەوزاند، ماندوویتی لە بیردەکات، بۆیە زۆر جار گوتوومە، قسەی خۆم نیە منیش بیستوومە:

ئەگەر هێسترتان خۆشدەوێت، لە هەر جێگەیەك پشووتان دا، پشوویکی چەند خولەکیش بوو، کورتانیان لێکەنەوە، رووتیانکەنەوە با بگەوزن.

لە بیرمە، لە بیریشم ناچێت، پێم خستبووە ئاوەوە، ئەو پێیانەی لە ناو

پێڵاو بۆگەنی ببوون، بە جۆگەلەم بەخشیبوون، هەستمەکرد ماندوویتی وەرزێك، وەرزێکی دووکەڵاوی، شەڕاوی، ترساوی، لە ڕێی پێیەکانمەوە دەڕژێتە ئاوەوە و لەشم سووك سووك لە با سووکتر دەبم، لە سەر بۆرژان بووم، ئەبوو جاسم یان بە کوردیەکەی حەمە سوور کە وەرگێڕانێکی پیت بە پیتی عەرەبیەکەیە! گوتی:

دەزانی ئێستا لەو دەو ئاوە چ خۆشە؟

پێشمەرگەیەگ گوتی:

شفتی، شفتی، بیخەیتە ئەو ئاوەوە و بۆ خۆی شەق دەبات.

پێشمەرگەیەکیدی:

ماڵی ئەوەیە بەو ئاوە خۆشاوی پرتەقاڵ بگریتەوە.

من نەمهێشت پتر بێ تامی بکەن، هەڵمدایێ، کە قەتیش لە قسان هەڵمنەدەدایێ:

هی ئەوەیە حەفتا قوتوو بیرەی بخەیتە ناویەوە و گۆماوێك درووستبکەیت.

حەمە سوور پێدەچوو عەرەقخۆرێکی جوان بێت، گوتی:

دەمخۆش، بەڵام حەفت بوتڵ عەرەقت لەبیرکرد.

تۆپ تۆپ، لە بەهەشتیش دەنگی تۆپ و فڕۆکە دێ.

-٢٤-

**ئاو ماندوو دەبێ**

**با ماندوو دەبێ**

**بەرد ماندوو دەبێ**

**جگە لە شەڕ چ نیە ماندوو نەبێ .**

چیایەك بە ڕێچکەیەکی پێچاوپێچ لە ڕێی مار پێچاوپێچتر هەڵیکێشاین، لە هیکەوە بە لێژبوونەوەیەك لێژیکردینەوە و بە فڕێدان فڕێیداینە دۆڵێکەوە، دۆڵ وشك وشك هێند وشك پێنەدەچوو لە چلەی زستانێش تەڕایەتی بە

خۆیەوە دیتبێت، بڕواناکەم هیچ هەورێك هیچ پەلە هەورێك، بۆ تاوێک سێبەری لەو دۆڵە کردبێت، ئەو دۆڵە لەو دۆڵانەی دنیا بوو کە نازانن تامی باران چۆنە، دووریش نیە زستانان بەژنێك بەفری تێبکات، دۆڵێکی رووتەن بۆ سویتندیش بڕکە دارێکت نەدەدیتەوە، گەرم گەرم لە هەورازەکەی گۆرینێ زۆر گەرمتر، رێك پێچەوانەی دۆڵەکەی ئەودیو، ئەو دۆڵەی پێم خستبووە ئاوەکەیەوە و دەمویست سەرخەوێك بشکێنم، خەوێك بەشی خەونێکی رووباری بکات، تەماشاکە سرووشتی پێرس ئەوهایە، دوو دۆڵ بە تەنیشتی یەکەوە، کەلەکەیان بە کەلەکەی یەکەوەیە، کەچی جیاوازیی نێوانیان جیاوازیی دوو دنیایە، چیا مشتە لە نهێنی و راز، کێ تێدەگات!

ئەوەم لەبیرە نزام دەکرد کە هەتا لەو دۆڵە دەردەچین، لێمان نەقەومێ، دەنا هەر بە تینوێتی تیا دەچین، ئێستا وا لە سێبەردا دەڕۆین، بەڵام ئەو دۆڵە سێبەری سەر لە ئێوارەکەیشی هەر گەرمە، رەنگە رۆژ لە سەر ئاوابوون بێت، سێبەر هەر گەرمە و فێنکایی تێدا نیە، رەنگە ئەو دۆڵە لە شەویشدا تایبەتمەندیی خۆی هەبێت و لە تاریکیش وەك رووناکیەکەی هەر بە گەرمی بمێنێتەوە... دۆڵاودۆڵ بە دۆڵدا هێور هێور رەنگە یەکەم جار بێت وا بە هێوری رێبکەین، رێدەکەین، من درەنگتر بیستمەوە کە رۆژێك زووتر لەو وادەی خۆمان بارەگامان بەجێهێشتووە و دەبێت ئەو رۆژە لە هێوریدا بکوژین، دۆڵ دوایی نایە، رێی ئێمەش پێدەچێت هەر دۆڵاودۆڵ بێت، پێچەوانەی دۆڵەکەیدی هەر شۆڕبووینەوە و سەرکەوتینەوە، چەند کەم لەو دۆڵەی بەهەشتێ ماینەوە، چ لەگەڵ ئاودا نەڕۆیشتین.

شەو داهات، هەوکە، هەوکەی نووسینەوەی هەینێ، ئەو شەوە وەك خەونێکی پچڕ پچڕی تەماوی خۆ دەنوێنێ، گرتەیەکی ئەوتۆی ئەو شەوەم لە دیدەدا نەماوە، تا ئێستا نیشانی ئێستای خۆمی بدەمەوە، هێندەم لەبیرە لە ناو قەدی چیایەك بارمان خست و شتێکمان خوارد و پالکەوتین و نووستین.

نازانم چ کاتی رۆژە، دەزانم لە دۆلایيەکی چیای کۆریس دانیشتووین، نازانم چ پێشمەرگەیەك بوو رادیۆ تۆشیباکەی خستبووە بن گوێیەوە، هێندە دەزانم هاواریکرد:

شەڕ راوەستا، شەڕ راوەستا، خومەینی ژەهرەکەی خواردەوە.

یەکیدی گوتی:

تۆ پێم بڵێ، راوەستا یان کۆتایی هات؟

وای وەڵام دایەوە:

راوەستا، کۆتایی هات، تەواو تەواو.

بووە یەك مشتومڕ و هەرایەك کەس گوێی لە قسەی کەس نەدەبوو، دواتر کەمێك هێور بوونەوە:

+ راوەستانی شەڕ واتە مەرگی رژێم.

- نەخێر، تەمەنی درێژتر دەبێت.

+ گرنگ ئەوەیە راوەستێ.

لەو مشتومڕە دوو کەس رێك بۆچوونیان دژ بەیەك بوو، حەمە ریش دەیگوت:

ئەگەر حەزتان لێیە پێشمەرگە ببێتە ئاردی ناو دڕك، با شەڕ راوەستێ.

ئەبوو راستی دەیگوت:

برۆ وەحشی، تۆ چ لە دنیا دەزانی، هەر دیتت رژێم رووخا و ئێمەش چووینەوە شار.

حەمە ریش:

من بۆنی ئاشبەتاڵ دەکەم، لە حەفتاو پێنجیش ئاشبەتاڵتر.

ئەبوو راستی:

وەحشی تۆ چ دەڵێیت! ئەو هەموو حزبە ئاشبەتاڵ دەکەن، حزبی خۆمان ئاشبەتاڵ دەکات؟! دەزانی تۆ رێك دژ بە سیاسەتی حزب قسە دەکەیت.

حەمە ریش:

حزب چ دەڵێ با بڵێ، یەك ڕێگەمان لە پێشە، ڕێگەی ئاشبەتاڵ، بۆنی ئاشبەتاڵ دێ.

ئەبوو ڕاستی هەڵچوو، وەك شیری سەر ئاگری خۆش هەڵچوو، جوێنی ڕژاند، قەت ئەو پیاوەم ئەوها بە تووڕەیی نەدیتبوو، ئەو دەمەی لەگەڵ منیش کەوتە دەمەقرێ کە هێشتا هەر لە بارەگا بووین، ئەوها هەڵنەچوو، ئەو پیاوە لە دەسەڵاتی خۆی دەسەڵاتدارانەتر ڕەفتاری کرد و بە سەر حەمە ریشدا هاواری کرد:

تۆ لە خایەنیش خایەنتری، نابێت لەگەڵ ئێمە بێیت.

حەمە ریش ئەوها وەڵامی ئەبوو ڕاستیی دایەوە:

من ئامادە نیم لە دەستەیەك بم کە تۆ سەردەستەی بیت، من بە هەڵە هاتووم، وامزانی شاهێن سەردەستەیە.

زۆر هەوڵماندا پێکیان بێنینەوە، ئەبوو ڕاستی سارد بۆوە، بەڵام حەمە ریش لە کەلی شەیتان نەهاتە خوارەوە و نەگەڕایەوە، بەو ڕێیەدا گەڕایەوە کە پێیدا هاتبووین، تا لە چاویش ون بوو، ئاوڕی دەدایەوە و یەك بە هەوکی خۆی هاواری دەکرد:

ئاشبەتاڵ، ئاشبەتاڵ ئەبوو خوار ئاشبەتاڵ...

دەمێك بوو ئەو حەمە ریشەم دەناسی، سەردەمانێ ماڵی لە بارەگای کافێ بوو، ژنێکی هەبوو لە بەڕێزی شارێکی دیتنا، دوو منداڵی هەبوو منداڵی وا ڕێکم نەدیتبوو، ئەو حەمە ریشە لە یادەوەریی مندا زیندووە و لە زۆر جێگە وێنەی هەیە، گۆتەی هەیە، ئەگەر هێندە زوو ئاشبەتاڵی نەکردایە، وێنەکان هەمەڕەنگتر و گۆتەکان پڕ دەنگتر دەبوون، لێرەدا تەنها قسەم لە قسەیەکیتی کە حەمە زۆر جار دەیگوتەوە:

جوانەمایین لە ژن خۆشترە، لە خۆوە وا ناڵێم، ئەگەر باوەڕ ناکەن تاقییکەنەوە.

من دەستەواژەی مایین و ژنم زۆر بیستبوو، زۆر جار گوێم بۆ ئەو بەراوردە ناسکانە هەڵخستبوو کە لە نێوان مایین و ژنەوە دەهاتنە ناو

قسانەوە، بە تایبەتیش قسەکانی مستەفای سەید مینە کە لە کۆلیژ و لە ناو وانەی، ئەو کاتانەی لە تەنیشت یەکەوە دادەنیشتین، بە شێوەیەك وێنەی مایینی نیشاندەدا کە حەزت بچێتێ، کام کچ زۆر جوان بایە، کام کچ زۆر جوان لەنجەی بکردایە، کام کچ کە سمتی خڕو خەپان بایە، کام کچ لە هەمووان بالابەرزتر و جوانتر و شیرینتر بایە دەیگوت:

تەماشا تەماشا دەڵێی ماینە، تەماشا تەماشا لەو ماینە کچە، لەو ماینە ژنە.

لێچواندنەکەی ژن بە مایین یان بە پێچەوانەوەی مستەفا و ئەوانیدی کە لە رووی جوانی و نێسکە و لەنجەو پڕی لەشی ژنەوە بوو، بەڵام ئەوەی حەمە ریش جیا بوون، لە هەموو ئەو بەراوردو لێچواندنەی من بیستبووم، جیابوون، ئەوەی حەمە نوێ بوو لە رووی سەرجێییەوە بوو، بە هی سوارەی گۆرین دەچوو! ئەو خۆشتر نیشاندانەی مایین لە ژنەی حەمە ریش کە زۆر جوان نیشانی دەدایەوە، بێ کاریگەری نەبوو، وای کرد جارێك هەوڵی تاقیکردنەوە بدرێ، بەڵام ئەو هەوڵە سەرمەقولاتخواردووە لە گێڕانەوەیەکیدی کە رەنگە بە سەردێری سەرهاتی هێستر ناو بنرێ، ماینیش لەو سەرهاتە جێگەیەکی هەبێت، بە وردی و بێ پەڕاندنی هیچ گرتەیك دەگێڕمەوە.

تا ئێرە زیانی ئێمە پێشمەرگەیەك و هێسترێکە.

تا ماینەکەی حاجی بەختیاریش نیشانەدەمەوە، لە مایین دوور ناکەومەوە، مایین لە دیدی حاجی بەختیارەوە جیایە، نە ماینەکەی مستەفای سەید مینەیە، نە هی حەمە ریش، نە مایینی لێواو لێو لە نێسکە لەنجەولار و جوانی، نە مایینی سەرڕێژ لە چێژ، مایین لە چاوی حاجی بەختیارەوە یەك سم نیە، لە مێنگوین دوو سمترە، ئەنفال بە دەشت و دۆڵ و شاخان وەربووە، چنگ لە سەر شان راوی خەڵك و پێشمەرگە دەنێ، ئەنفال سوورەتێتی خۆی دەکات و لە هیچ ناپرینگێتەوە، دەستەیەك پێشمەرگە بە ناو ئاگر و ئاسندا لە هەوڵی گەیشتنە دۆڵی شەهیدانن، ئەو

دۆڵەی هەینێ لە بزنەڕێیەکەوە لەگێن بوو بگەیتەوە ئەو دیوی ئاقاری ئەنفال.

هەر ڕێیەك بۆ دەرچوون دەگرنە بەر دێتەوە جێی خۆیان، ئەنفال چوار دەوری گرتوون، پێشمەرگە برسین، برسێتیەك، هێزی شەڕ لە دەست دەستێنێ، هێزی ڕۆیشتنی لە پێ وەرگرتۆتەوە، خەریکە ئەو دەستە پێشمەرگەیە هێواش هێواش بە دوای یەکتر بچنە ڕیزی شەهیدانی دۆڵی شەهیدانەوە، بەڵام لە بیرمان بێ، حاجی بەختیاریان لەگەڵە، ئەو پیاوە بە دەستوبردترین پیاوە کە من دیتبێتم، پیاوێکە لە شاخی رووت نان دەردێنێ، پیاوێکە وەك دەڵێن لە ژیانی خۆی یەکی لە سەر هیچ نەکەوتووە، چی ویستووە، دەستیکەوتووە، کەس باوەڕ بەوە ناهێنێ کە دەستەیەك حاجی بەختیاریان لەگەڵ بێ و لە برسا بمرن، پیاوێکە دەمێکە بڕیاری داوە کە بە پێوە بمرێ، بێ واتایە ئێستا لە ئاست مەرگێکی لە سەرەخۆ، لە ئاست برسێتی دەست هەڵبڕێ و خۆی رادەستی ئاسمان بکات، نا، ئەوەتا، رامایە، دڵنیام بیر لە چارە دەکاتەوە، چاو دەگێڕێ، دەگەڕێ، بیری پەرتبووی خڕکردەوە، ئا، دیتیەوە، مایین دەبینێتەوە، سەرەتا بیرم بۆ چی چوو بێ، باشە!

رەنگە سواری مایین بێ و بچێ لە جێیەك هەر خۆی دەزانێ کوێیە، بە نۆردووە نانەوە بگەڕێتەوە و ژیان بە بەر پێشمەرگە بداتەوە، نا، تەماشاکان، سواری ملی مایین دەبێ، بای دەدا و بە زەوی دادەدا، ئەو پیاوە لە سەر ئەو برسێتیەش چەند بەهێزە، دەرۆستی دوو سێ مایین دێ، ئای، ئەوە چی دەکات! مایینی گۆشاوگۆش سەربڕی، پێشمەرگە هەیە چاوی خۆی دەگرێ، ئێ، بۆنی گۆشتی برژاو، گۆشتی مایین دۆڵ و چیای پڕکرد، رەنگە گەیشتبێتە لووتی سەرباز و جاشان، چونکێ پاش ماوەیەك گەیشتنە جێی ئاگر و تکە، بەڵام تا جاش و سەرباز هاتن، پێشمەرگە بۆی دەرچووبوون، بە زگی تێرەوە، بە شەڕ رێی دەرچوونیان کردەوە، ئەوەیە حاجی بەختیار! من ئەو پیاوەم لە قەندیل ناسی، دواتریش

قسەی خۆی گەیاندە سەر، بە پێوە مرد، دوای ئەنفالەکان چۆوە هەولێر، بەلام مەرد بوو، رێی نەدەدا کەس سووکایەتی پێبکات، هەولێر گەواهی ئەوە دەدات کە وەلامی تانەوتەشەری نەیارانی دەدایەوە، کاتێك نەیارێك دەیگوت:

+ئەگەر ئازا بای، خۆت رادەستەنەدەکردەوە.

- تۆ وای دەبینی کە خۆم رادەستکردۆتەوە.

حاجی بەختیار لە شاریش پێشمەرگایەتیی خۆی دەکرد و سەری بۆ جاشان شۆڕنەکرد، لە ئاست بەعس هەر حاجی بەختیارەکەی دۆڵ و شاخان بوو، ئەوە بوو سەری خوارد، زمانیان لێدا، بە پێوە مرد، لە سێدارە درا، مەریەمی خوشکیشی کە وەك خۆی مەرد بوو، ئەوەیش لە داردرا، وەك براکەی بە پێوە مرد، مەریەمیش بە پێوە مرد.

بە راوەستانی شەڕ تۆپەکان پڕ دەنگتر دەبن.

-٢٥-

**لە هەمووان بە تەمەنتر:**
**سەد ساڵیدیش لێرەبین نامرین**
**رەنگە ئێرە ژووری نەمری بێ**
**ناڵێم جاشێ شوێتپێمان هەڵگرێ**
**دەنا ئیزرائیل، شەیتانیش چاوساغیی بکا**
**بە دەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە لای خودا.**

مابووی بۆ نیوەڕۆ، مانگەشەوەکەی لە پێش نیوەڕۆی دەکرد، ئاواییەکی چەند ماڵە هاتە رێ، لە چاوی من لە ئاوەدانیەکی چۆڵەوان دەچوو، نە گریەی منداڵ دەهات، نە لایلایەی دایك، دوو سێ پیاو و چەند سەر بزنێك و سێ چوار سەگی ترسنۆکیش، کە وەڕینەکەشیان بە هی سەگ نەدەچوو، هێشتا نەگەیشتبووینە ناو خانووەکان، لە پڕ پیاوێك لە پەنا

دیوارێکەوە پەیدابوو رێك بەرەو رووممان هات، لەگەڵ سەردەستەکان کەوتنە سرت و خورت.

لەو کاتە هەستمکرد من جارێکیدی رێم بەو گوندە کەوتووە و ئەو چەکدارەشم دیوە، ئەوکات نا، دواتر بە بیرم هاتەوە کە لە بەهارێکدا لە ماڵی ئەو چەکدارە کە جاشێکی باشە سەرخەوێکم شکاندووە، ئیدی تێگەیشتین نابێت لەو گوندە بمێنینەوە، بە دۆڵاییەکەدا پێشمەرگە و هێستر کەوتنە دوای چەکدارەکە، لە رێ دەیگوت:

ئێرە کەڵکی نەمایە، لە دنیایێ لە جاش بێ رووتر نیە، ئەوەی جاش بە کوردی دەکات، سەربازی عەرەب پێیناکات.

گوێم لە ئەبوو راستی بوو:

باش نیە، قل قل جاشی باش مایە!

هەر برۆ، جاش هەر دەیگۆت:

برا، وەرن.

ئێمەش هەر چووین و نەگەیشتین، بۆ کوێ دەچین؟ تۆ چەند دەزانی منیش هەر هێندە، باش بوو رێگاکە کەمێك لێژ بوو، ئەو لێژاییە نا کە من زراوم لێی چووە، نا، لێژاییەکی خۆش، لە رۆیشتنێ پێویستی بە تەکان نیە، رەنگە بەری بەرەبەیان بێت، لە مەیلەو دۆڵاییەك کەبە سەر دەشتێکی گەورەدا دەیڕوانی، تاکە خانووێکی بێ دەرگا لە خۆیدا داینیشاندین، لە دڵی خۆم گوتم:

وەرە گەیشتن بە خانووێکی وا ئەو هەموو رۆیشتنەی بوێ!

خانوو چ خانوو، دەتگوت ماڵی قونجڕکەیە، هەتا درەنگ هەر قونجڕکەمان ماڵیوە، گەناوریشی کەم نەبوو، بە لاوونیو دانیشتن جێی هەموومانی تێدا بووەتەوە، چاوساخ پێش ئەوەی بڕوات کە دنیا هێشتا نەهاتبۆوە دیوی رووناکی، ئەوها دەستووری دا:

هایدار بن، دوو مۆڵگەی جاشتان بە سەرەوەیە، ئەها، دنیا رووناك بێتەوە، دیارن لێرە و لەوێن، زۆر نزیکن، بۆیە: جوولە جوول نەکەن، بە

دەنگی گەورە پێنەکەنن، ئاگرکردنەوە هەر کوفرە، تا بۆتان دەکرێ خۆتان لە دەست بە ئاوگەیاندن بە دوور بگرن، بەڵام ئەگەر زۆر تەنگاوی کردن، ئەها، لەو لایەوە هەتا دەگەنە ئەو کەندرە دەبێت لە سەر زگ بڕۆن، ئاگادار بن چەکەکانتان رۆژ لێنەدا، با بریسکەی نێ، رادیۆ رادیۆ دەنگی رادیۆ با نزم بێت، هێسترەکەش لەو دیوە بەدیوارەوە دەبەستینەوە، ئەگەر بشزۆڕێتی گرفت نیە، چونکە لەو دەوروبەرە وڵاخ هەنە، جاش بە هەندی هەر ناگرن، هیچیش مەترسن، ئێوە ئێستا لە ناو جەرگەی جاشانن، بۆیە ئەگەر ئەوانەی گۆتم جێبەجێی بکەن، کەس گومانی بۆ ئێرە ناچێت، پێش نیوەڕۆش من بە فێڵی شتێك دێمەوە لاتان، خواردنێك شتێکتان بۆ دێنم.

بەو دەستووردانەی پیاوی چەکدار من هەر زراوم چوو، گوتم ئەو رۆژەی تێدادەچین، ئەوڕۆیە... رۆژبۆوە، لە کونی دیوارەوە تەماشای جاشانمان دەکرد، کابرا چۆنی گوت ئەوهابوو، کابرا چ دەستوورێکی پێداین جێبەجێماندەکرد، دەبوو تا ئێوارە لێرە بمێنینەوە، من تینەگەیشتم ئێستاش هەر تێنەگەیشتم ئەو ژوورە بە تاقی تەنێ لەو ئاقارە و لەو دۆڵایە چ دەکات، جێگاکەی لە رووی سەربازییەوە جێی مۆڵگە نەبوو هەتا بڵێین مۆڵگەی جاشان بووە، ئەو زەوی وزارەی دەوروبەری وەها دیار بوو لەوەتەی هەیە هەر بەیار بوویێت کێڵانی بە خۆیەوە نەدیبێت، هەتا بڵێین بێستانەوان بۆ خۆی لە دیار بێستانەکەی خۆی خانووێکی قیت کردۆتەوە، دوایی خانووی بۆ چیە! بێستانەوان کەپرێ، کەوێلێ چێدەکا، چەندی سەری خۆم بە گەرخست، لە بارەی ئەو ژوورەوە نەگەیشتمە هیچ، ئەوانیدی هەرچیان دەگۆت، ئەو وەڵامە نەبوو کە جێگەی رەزامەندی من بێت، وەڵامێکی رەشبینانەم بۆ خۆم دیتەوە و وازم لە پرسیار هێنا، گوتم:

رەنگە ئەو ژوورە تایبەت بۆ ئەوە دروستکرابێت سەرلەسپێدەیەك کە هێشتا دنیا تاریکە، پۆلێك پێشمەرگە دابکات و پێش ئەوەی بگاتەوە تاریکی، کۆمەڵێك جاش دەوریان بدەن و هەر بە دەست مریشك ئاسا

بیانگرن، یان پێش ئەوەی جاشەکان بگەن هەر لە گەرماو لە ناو ئارەقەی خۆیان بخنکێن و ماندوویێتی بەبەر جاشەکان نەکەوێت.

دەزانی چ گەرمایەك بووا برکی لێهەڵدەستا، هیچ گەرماوێك ئارەقەی وای بە من دەرنەداوە، هەمووشی یەك مەتارە ئاو، مەتارەیەك بۆ ڕۆژێکی وا ئارەقاوی، کانی بە کانیایەتی خۆی ئەگەر هێندە ئاوەی لە بەر بڕوات کە لە بەر ئێمە ڕۆیشت، چکی دەکرد، نازانم چۆن چکمان نەکرد، دەبێت لەشی پێشمەرگە چەند تەنەکە ئاوی تێدا بێت! لە هەمووی خەفەتاویتر، لەو کەندڕەی کە جێگەی دەست بە ئاوگەیاندن بوو، من جارێك لە سەر زگ سەرێکم لێدا، بە چاوی خۆم نەمدیت، بەڵام حەمە سوور گوتی:

دیتم، زێی گەورەم دیت، لە دووربینەوە دیتم.

گوتم:

کەواتە تۆ فێنك بوویتەوە، زێ لە دوورەوەش فێنکایی هەیە.

حەمە سوور کە هێندە سوور بوو، وام هەستدەکرد ڕەنگی عارەقەشی سووریاو بێت، بە کوردیەکەی خۆی گوتی:

فێنك چی اگوو هەیە، گوو، مرد مرد من مرد...

لە بیرم نەچێت کابرای چەکدار دەمەو نیوەڕۆ بە سواری وڵاخێك گەیشتەوە لامان، مەنجەڵێك ماست و هەندێك نان و میوەشی بۆمان هێنا، بەڵام ئاوی لە بیرچووبوو، ئاخر ئاو هی ئەوەیە لە بیربچێت! ئەو پیاوە بە شێوەیەك لە ژوورەکە نزیك بۆوە و ئەو شتانەی دانا هەر لە خۆی دەهات، پێدەچوو لەوەتەی هەیە پیشەی ئەو جۆرە کارانە بوویێت، داینا و هەندێ قسەشی کرد و ڕۆیشت، دیتم بەرەو مۆڵگەی جاشەکان چوو، هەر چەندە گوێم لێبوو کە گوتی:

سەرێك لەوان دەدەم، بۆ ئەوەی هەست بە هیچ نەکەن.

بەڵام من ترسام، گوتم:

ئەگەر ناپاک دەرچوو، بۆ کەم پێشمەرگە خیانەتیان کردووە، پێشمەرگە بیکات جاش بۆ نەیکات.

نان و ماستێکی باشمان خوارد، لە باتی ئاو ماستمان دەخواردەوە، ماستی گەرم.

چ رۆژێکی ئاگراوی و ترسناکە ئێمەی تێکەوتووین، وەرە شەو وەرە، وەرە ئەی هەمیشە قەڵای مێران، ئاقاری جاشان داپۆشە، داپۆشینێك دەست و پێی خۆیان نەبینن، وەرە بە هەموو تاریکایی خۆتەوە وەرە، گیانی پۆلێك پێشمەرگە لە مەترسیدایە، ئەو جاوە لاچەپەی ناو هەتاوێ، زینداێکە لە هەموو زیندانان زیندانتر، وەرە ئازادیمان لە تاریکیی تۆ دایە...

دوورنیە ئەوانیدیش وەك من بانگی تاریکیان کردبێت، بەڵام هەر گوێم لە دەنگی بێدەنگی خۆم بوو.

بەرە بەری ئێوارەیە، خەریکە تاریکی ئازادی بگات، هێسترەکە لە بیرنەکەم، لە ئێمە جوانتر رێنماییەکانی پەیرەو کرد، بەرگەی تینوێتی گرت، دەنگی لێوە نەهات... ئۆخەیش ئەوجارەش ئێوارە داهات، ئەی لاچەپترین چاوەی دنیا، زیندانترین زیندان،ماڵئاوا، هیواخوازم هەر بە چۆڵی بمێنیتەوە، جگە لە جاش کەس رێی پێتنەکەوێت، ماڵئاوا ئەی ئەو چاوەیەی بە چککردن چکتکردین، پیاڵەیەك ئاو، نیو کەوچکی چا خوێت لە لەشمان نەهێشت، ماڵئاوا ئەی ئەو ژوورەی نەمزانی بۆ لێرەی.

بێ دەنگ زینداممان جێهێشت، هێستر لە ئێمە بێ دەنگتر، لە چاوی ئەو دوو مۆڵگەیە بزربووین کە بە سەرمانەوە بوون، لە پێچێك دەسووڕاینەوە، مۆڵگەیەکیدی نزیك بوو، جاشەکان ئێمەیان دیت، بێ ئەوەی سڵاویان لێبکەین سڵاویان وەرگرتەوە، هێندە و بەس، خۆیان تێنەگەیاندین، ئێمەش وەك ئەوەی نەماندیتبن، رێی خۆمان گرت، نازانم جاشەکان بۆ تەقەیان لێمان نەکرد، لە ترسان بوو یان لە پیاوەتی!

لە دوورەوە دەنگی تۆپ دێ...

**هەموو بە یەك دەنگ:**
**ئاو، ئاو**
**نوێژ لە ئاو، سێکس لە ئاو**
**ڕۆیشتن لە ئاو، نووستن لە ئاو**
**ژیان لە ئاو، مەرگ لە ئاو**
**هەیە و نیە هەمووی لە ئاو.**

تینوو تینوو، تەریفە بووین، چ بیابانێك هێندەی ئەو پۆلە پێشمەرگەیە تینووە! خوداوەندی ئاو، ئەگەر هێندەی دڵۆپە بارانێك بەزەیی تێدا با، مەتارەیەك ئاوی دەگەیاندمێ، نەینارد، ئێستا مەتارەکەم بایی لێو تەڕکردنێ تەڕایەتی تێدایە، ئەویش بۆ ساتەکانی سەرەمەرگە، من دەمێکە بڕیارم داوە پێش دوا هەناسە لێوم تەڕ کەم، دەڵێن سەرەمەرگ ئاوی دەوێت...

وا بە تاریکیدا بەرەو زێ ڕێدەکەین، بەڵام زێ لێرەیە! ئای چەند سەختە تینوێتی لە تاریکیدا بتکوژێت، هۆدە تەریکەکەی دنیا چۆن چۆڕپڕی کردین، سەرە مەتارەیەك میزیشی تێدا نەما، دە ئەی خوداوەندی تەڕایەتی ئەگەر ئاویش نیە، چۆڕێ میز، ڕامکێشە هێزی زێ ڕامکێشە، تینوێتی لە چۆکم ئاڵاوە، وشکانی پێیەکانی گرتووم، کێشم نەما، ڕامکێشە زێ، مەرگ خۆی بە ملمەوە هەڵواسیوە، خەریکە دەگەمە ساتەکانی سەرەمەرگ، هەر دیتت سەری مەتارەم کردەوە بە کەمێك لێو تەڕکردنەوە مەرگ گەیشت...

چ هەڵەیەکی سرووشتیە پێشمەرگە لە تینوێتیدا بمرێ، چ هەڵەیەکی گەورەیە پێشمەرگە نەکوژرێ، خوێن خوێن خوێن، ئەگەر دەشمرین با لە ناو خوێندا بمرین، لە ناو تەڕایی بمرین، خوداوەندی پەشیمانی، دە بمگێڕەوە ساتەکانی پێش پێشمەرگایەتی، من بەو مردنە ڕازی نیم.

تینوێتی پرزەی لێبڕین، ئەوەی هێزی ڕۆیشتنە لە پێ نەما، وا بڕوا،

ئەگەر تینویتیش نەمانکوژێت، مسۆگەر دەکەوینە دەستی جاشانەوە، ئاخر بەو ڕۆیشتنە ڕۆژیش دەبێتەوە ئێمە ناگەینە زێ، ئەم بەرەش سەراپای جاش و جێژە.

زێ، زێ تۆ بڵێی زێ ئاوی هەبێ، هێندە تینووم خەریکە لە بیرم بچێتەوە ئاو چیە و لە کوێ هەیە، تۆ بڵێی هەورێ هەبێ بارانی پێوە! دەریا، دەریا هەمووی ئاوە! مەتارەیەك هەیە لە دنیایێ پڕپڕ بێت لە ئاو! لەو دنیایە تەنها گومانم بۆ یەك جێ دەچوو کە ئاوی تێدا مابێت، ئەویش ناو بسەهۆڵانەکەی ماڵی خۆمان بوو، ئەو ساتانەم بیردەکەوتەوە کە جامە ئاوێکی تازە شەختە کردووم دەردەهێنا و دەوم پێوە دەنا، خوداوەندی شەختە بمبەوە ئەو ساتە شەختەییانە، دەمویست دەست بۆ مەتارەکەم ببەم کە بە قەد کەوچکە چایەك تەڕایی تێدابوو، گوێم لێبوو گوتیان:

ئێرە مێرگە، ڕەنگە ئاوی لێبێت.

(مێرگ، ئاو، بە ڕاستی، نا) لە بەر خۆمەوە قسەی ئاویم دەکرد.

نازانم ئەوانیدی چۆن چۆنی مێرگیان لە باوەش گرت، لە سەر زگ خۆم بە مێرگی نەرم دادا، دەوم خستە گۆمیلکەیەکەوە، بخۆوە ئاو بخۆوە، نەمدیت هێسترەکە چەند بخواتەوە، بەڵام دڵنیام هێندەی منی نەخواردۆتەوە، هەر لەو گۆمیلکەیە مەتارەکەشمم پڕکردەوە، لە بیرمە زگاو بووم، تێرم نەدەخواردەوە، نیتاق و پشتێنم شلکردەوە، لە سەر پشت ڕاکشام، نەمدەتوانی هەستمەوە، ئەوەشم لەبیرنەبوو کە لچکێ لە پشتێن یان جەمەدانی بە دەومەوە بنێم بۆ ڕێگەگرتن لە زیلوو، لە زیندەوەری ناو ئاو، لە تەنیشتم حەمە سوور خەریکی ددان شووشتن بوو، ئەوە کوڕە تفەنگی لەبیرکردایە، فلچەی ددانی لە بیرنەدەکرد، ددانی وی لە ددانی هەموو پێشمەرگان سپیتر بوو، گوێم لێبوو:

زۆری نەماوە بۆ دەو زێ.

لە دڵی خۆم گوتم: دەبێت بە مەتارەیەك ئاو بگەینێ؟ خۆزگە دوو مەتارەم دەبوو.

هەوکە هەیوەشـــەوە، ڕەنـــگە پێشـــتریش هەیوەشـــەو بوویێـــت، بەڵام تریفەکـــانی لە تینـــوێتیی منـــدا بزربـــووبن، تەواوێـــك لە مێـــرگ دوورکەوتوونەتەوە، وا ڕووەو زێ دەڕۆین.

ئەوە دیارە دەڵێ، بەوەی دوای خۆی دەڵێ:

+ مەتارەی من بۆنی ڕیخی لێدێ، هی تۆش وایە؟

- ڕاوەستە بزانم، کوڕە هی من دەڵێی وردە قشپلی تێدایە.

منیش لە مەتارەی خۆم کەوتمە گومـانەوە، بـۆنیم کـرد، هەسـتم بە چ نەکرد، خستمە سەر لێومەوە، تامیم کرد، ڕیخاوێـك بـوو بـۆ خـۆی، خویـا بوو کە هەموومـان ڕیخاومـان لە مەتـارە کـردووە، هەبـوو دەیڕژانـد، شـێخ گوتی:

باشـە ئەوە مەتـارەی قەدمـان ڕژانـد ئەدی مەتـارەی نـاو زگمـان چ لێبکەین؟

من مەتارەی خۆم نەڕژاند، ترسام لەوەی هێشتا زۆرمان مابێـت بـۆ زێ، جگە لەوەش من بڕیارم دابوو نابێت مەتارەی من ئاوی لێببڕێ، جـا خـوای دەکرد ئەو ئاوە نەك ڕیخ ژەهری تێدا دەبوو، ئەوەم لە بیرچوو، ئەو کاتەی لە سەر مێرگەکە ڕاکشابووم، دیـتم حەمەسـوور خـۆی ڕووتکـردەوە، نیـوە خۆشووشتنێك خۆی شووشت، بۆیە دوو سێ جار بە حەمە ڕیخاوی بانگیم کرد.

تۆپەکان لە دوورەوە، چیایەکیش ئاگری گرتووە، نازانم چ چیایەکە.

-٢٧-

له هەمووان گەنجتر:

بۆ دوژمنكاری هاتینه دنیا

مرۆڤ دوژمن

شەیتان دوژمن

خوداوەند دوژمن

ماریش دوژمنایەتیی خۆی راگەیاند

دنیا هەمووی دوژمن.

مانگەشەوێکە لە دوورەوە قشپل و دەنکە مۆری گەورە لێك جوداده‌كرێته‌وه، رووناك رووناك، زۆر رووناك لە دوورەوە گوریس و مار لێك جوداده‌كرێته‌وه، پێشمەرگەی پیس و جاشی خاوێن لێك جوداده‌كرێته‌وه، رووناك رووناك هی ئەوەیە ئەحمەد عەرەب نەینۆکە دەرەزبردووەکەی و مووکێشە ژەنگاویەکەی دەربێنێ، مووی روومەتی خۆی هەڵکێشێ، ئەو ئەحمەد عەرەبە هەمیشە لەگژ هەڵکێشانی مووی روومەت و بن چاوە بچووکەکانی بوو، ئەگەر مووکێشی نەبا ماتەڵ نەدەبوو، نینۆکی دوو پەنجەی دەهێشتەوە، دەیگوت:

ئەو دووپەنجە نینۆکیە بۆ ئەو کاتانەی مووکێشم نیە.

ئەو کورە هەمیشە لە خۆی دەخەفتی، زۆر به وشەی کۆنێ تێکدەچوو، کاتێ شاهێن پێیدەگۆ:

ها، کۆنێ، ئەوە چ دەکەی؟

لە خۆی هەڵدەدا، دەیگۆ: کوڵە من کا کۆنم...

ئەو ئەو وشەیە بە کۆن و پیر تێگەیشتبوو، کاتێ تێمگەیاند ئەو کۆنێیە کۆن نیە حیزە، خەنی بوو، بە پێکەنینەوە:

بە خودای قووندەر بی، باشترە لەوەی پیر بی.

چیدی بە کۆنێ توورە نەدەبوو.

ئەو کـوڕە لە قسـەکردنێ دەنگـی (ر) بە قەڵەو و لاوازیەوە و لە هەر کوێیەکی وشە با و بە هەر زمانێك قسەی بکـردایە، دەگـۆڕی بـۆ (ڵا)، بـا لەو مانگەشەوە لەو جێگەیەی پێدەشت لە رێیەکی گچکەمـان دەکـاتەوە و هەیە و نـیە ئەو رێـیە، چـونکە ئەو لاو ئەم لامـان مـۆڵگەی جـاش و سەربازانە، با گوێ مان لە ئەحمەد عەرەب بێت چ هەواڵێکیان دەداتێ:

+ کولە هاولێ ئەحمەد شاهێن مالە مال.

- ماری چی، زراوت چێ.

+ لیفاق ما تەسمەعون سۆتە؟ (هاوڕێیان، گوێتان لە دەنگی نیە؟)

کوڕە بە خودێ هەند باش گوێمان لێیەتی مار لەو سـەرە رێـیە هێنـد بە سام دەیفیشکاند، پیـاوم دەویسـت نەك هەر لێـی نزیـك بکەوێـتەوە، بەڵکـو گوێ لە دەنگیشی بگرێت، من زۆر جار گوێم لە فیشکاندنی مار بووە کە تابڵێی بە سامە، بەڵام فیشکاندنی ئەو مـارە بە قەد هەزار مـار بە سـام بـوو، پێدەچوو گەلێك گەورە بێت، ئەژدیهایەکە بۆ خۆی، هـی ئەوە نـیە شـاهێن بوێرێ خۆی لێبدا، ئەوە نیە دەرۆستی بێ، فیشکاندنی ئەو مارە رێك واتای ئەو رستەیەی دەگەیاند ((خۆت ئامادەکە مەرگ گەیشت)) من ئەوهـا لەو مارە تێگەیشتم.

مار ئامادەی شەڕ بوو، کەس نەبوو شەڕی لەگەڵ بکات، ئەبـوو راسـتی بە پێکەنینەوە گوتی:

جاشەکان خۆیان نەیانوێرا رێمان پێ بگرن، ماریان ناردە سەر رێمان.

شاهێن کە حەزی نەدەکرد بە گاڵتەش سووکایەتی بە مار بکرێت، وای باگۆی ئەبوو راستی دایەوە:

مار جاشایەتی ناکات، نابێتە پیاوی جاشانیش.

نازانم کێ بوو گوتی:

ئەدی بۆچی شەڕ بە پێشمەرگە دەفرۆشێ؟

شاهێن گوتی:

کوڕە هەی سەیە، ئەوە شەڕ نیە، گەمـانە گەمـان، بەڵام چ بـکەم ئێـوە نازانن گەمان لەگەڵ مار بکەن.

مار هەر دەیفیشکاند، بە تەواوی ئامادەی شەڕ بوو، ئێستا نا ئێستا خۆی بۆ دەموچاومان داوێ، من بیستبووم، مار لە شەڕێ خۆ داوێ، بەڵام نەمدیبوو.

ئەحمەد شاهێن گوتی:

ئێوە بکشێنەوە، بۆ منی لێگەڕێن.

شێخ شوانم دیت لە چۆکی خۆی دەدا و حەیفحەیفی دەکرد:

ئای جاشی گەواد، ئەگەر ئێوە نەدەبوون، ماری گەواد هی ئەوەیە رێ لە ئێمە بگرێت، بە قوربانی یەك گوللەم دەکرد و هەر بە شیشەکەی تفەنگیش لە شیشم دەدا، پێدەچێت مارێکی گەورە و گۆشتنیش بێت.

گوتمە شێخ:

خۆزگە کلاشینکۆفی بێدەنگ هەبوایە.

شیخ نائومێدانە گوتی:

کوا بۆ ئەو رۆژە، بڵێم بۆ ئەو شەوە، من خەفەت لەوە دەخۆم دەبێت چاومان لە دەستی شاهێن بێت، رێمان بۆ بکاتەوە.

من و شێخ لەو قسانە بووین، شاهێن گوتی:

وەرن مەترسن، تێپەڕن، سەری مار لە بن پێی منە.

هەموومان دەمانزانی شاهێن مارگرە و لەو بارەیەوە توانایەکی سۆپەرمانیی هەیە، لەگەڵ ئەوەش باوەڕمان بەو قسەیەی نەکرد، چۆن بەو شەوە بەو دەستوبردە، خۆی گەیاندە مار و گرتی، زانی گومانمان هەیە دووبارەی کردەوە:

وەرن، زراوڕژاینە وەرن، تێپەڕن سەری مار لە بن پێی منە، ئەگەر نێن بەری دەدەم.

لەو کاتەی تێپەڕین، من سەری مارم نەدیت لە کوێیە، بەڵام کلکیم دیت لە نزیك چۆکی شاهێن لە ناو تریفەی مانگەشەوێ سەمای دەکرد.

شێخ گۆتیە شاهێن:

بەرەڵلای مەکە ئیشمان پێیدەبێت.

شاهێن گوتی:

بەشی یەك گەڕەك گۆشتی هەیە، بەڵام ئازادیشی دەکەم، مار لە تۆ، لە منیش پتر مافی ژیانی هەیە.

دواتر چەندی داوامان لە شاهێن کرد، بۆمان روونبکاتەوە چۆن و بە چ فێڵێك و بە هۆی چ هێزێکی نادیارەوە سەری ئەو مارە گەورەیەی خستە بن پێیەوە؟ ئەدی لە کاتی بەردانی چۆن پێوەی نەدای؟ هیچی نەگۆت، بەڵام دیار گوتی:

ئەوە نهێنیی پیشەیە، لێی گەڕێن نایڵێ.

ناوە ناوە دەنگی تۆپ، چەند لووتکەیەك ئاگریان گرتووە.

-٢٨-

**جوامێرێك:**

**خوداوەند، کە وادەی مەرگم هات**

**لە ناو زێ نا**

**لە کەنارەکەی بمکوژە**

**تا هەتا هەتایە**

**لاشەکەم بۆنی جاترە بدات**

**ئەوەتا زێ...**

هاوین جگە لە هۆدەی ئارەقاوی، جگە لە مێرگی ریخاوی، جگە لە ماری شەڕاوی، زێی پڕ لە تریفەشی هەیە، زێ لەبەر تریفەی مانگدا جوانیەکی نەدیتراوە تێیدا دەدرەوشێتەوە، زێ، مانگ بە شێوەیەك پیاسەی تێدا دەکات، ناگیرێ و ناگیرێ، چەندی ویستم مانگی پەرتبووی ناو زێ، بۆ ساتێك لە ناو نیگام رابگرم، رانەوەستا، چەند جوانە ئەو ساتانەی مانگ راناوەستێ، بەر لە هەوڵی شێتانەی مانگ گرتن، بینم بە زێوە نا، ئەو جارە هێندەی هێسترەکەم نەخواردەوە، ئەو زۆری خواردەوە زۆر، پێدەچوو لە مێرگە ریخاویەکە بێزی نەهاتبێت بخواتەوە، لە ساتەکانی تینوێتی هێستر لە

پێشمەرگە پتر رەچاوی خاوێنی دەکات، مەتارەکەمم جوان بە ئاوی زێ خاوێنکردەوە و پڕم کردەوە، جلکەکانم کە بۆنی ریخی دەڤەری سورچیایەتیی ئەو بەریان لێدەهات، نیوە شووشتنێك شووشتمن، ئێستا سەرمایە لەو هاوینە ئاگراویە سەرمامە، سەرم لە سەرمادا خەریکە حەز لە ئاگر و دووکەڵ بکات، مرۆڤ لە نێوان سەرما و گەرما باش تێدا مایە، چ پێناچێ لەو نێوانە هیچ ئاژەڵێك وەکو مرۆڤی بەسەرهاتبێت، لە خۆمەوە قسە لەو بەراوردە دەکەم!

شڕە بەلەمێك دەتگوت بەلەمەکەی کاردۆیە، ئەوجا کێ دەڵێ هەر هەو نیە و دوای رۆیشتنی بە زێیدا دابێت و لەگەڵ ئێمە گەیشتبێتە ئێرە، لە بیرمان بێت ئاو هەر ئاوی ئەوێیە، ئاوی ناو دووربینی بارەگای پێرسی، هەر ئەو ئاوەشە کە دەچێتە بن کەلەکەی ئاسکی کەڵەك و لە من تەڕتر تەڕی دەکات و زۆر جار خەوی دەزڕێنێ، دەڵێن جاروبار دەشیترسێنێ، جارێك لەوێ لە خوار پردەکەی ئاسکی کەڵەك، کەوتمە زێ، ئەگەر فازیلی هاوڕێم نەبا کە لە دوورەوە چاوی لە سەر من بوو، دەیزانی مەلە نازانم، لە ئاسك خێراتر هات و رزگاریکردم، ئەو نەبا من بەو ئاوەدا ئاوەوئاو چووبووم، ئاوەوئاو چوونێك ئێستا مەگەر تەنها لە یادەوەریی دایك و باوك مابام، بەڵام دوای ئەو هەموو ساڵەش کە بەسەر شەڕی قەڵاسنجدا ساڵایەتی کردووە ئەو شەڕەی برا خوالێگۆڕاوەکان بە فەرمانی باوکە خواگیرەکان لە قرچەی گەرمایێ هەڵیانگیرساند، فازیل هێشتا لە یادەوەریمدا بە پێوەیە، لەو رۆژەوەی فازیل رێحانە ئەو کوڕەی لە وشکانی لە مامز و لە ئاویشدا لە ماسی دەچوو نەیهێشت بە ئاودا بچم، زراوم لە زێ چووە، پێشتریش لە ئاو دەترسام، چیرۆکی ترسانی من لە ئاو بە قەد زێیەك درێژە و زۆر لە پردەکەی ئاسکی کەڵەك کۆنترە و ناگێڕدرێتەوە، دەبێت لەو مانگەشەوە بەو شڕە بەلەمە لەو زێیە بە سامە بپەڕینەوە، ئەگەر رووداوەکەی بن پردی ئاسکی کەڵەکم بیرنەکەوتایەتەوە پێنەدەچوو هێندە ترسابام، لە بیرمە لەو سەروبەندە خۆزگەم دەخواست کە فازیل لە لام بایە،

ئەو فازیلەی ماسیش هەر هێندەی وی مەلەی دەزانی.

کاتێ ترسی جاش و سەرباز دەگات، بێ ئەوەی بزانی چۆن و بە کوێدا، ترسی زێ رادەکات، درەنگ بوو، دەبوو زوو بپەڕینەوە، هێشتا هەر پێیەکم گەیشتبووە ناو کەشتی هێسترم بیرکەوتەوە، لە چارەنووسی وی نیگەران بووم، لە ساتەکانی نیگەرانی، دەبینم وا لە تەنکایی تەنیشتمانەوە یەکێك رایدەکێشێت، دوو پێشمەرگەش لە دواوە بە پاڵدان پاڵی دەدەن، بۆ کوێ! رێك قووڵایی زێ، ئای ئەوە چی دەکەن! وا چاکەی هێستر دەدەنەوە! من هیچ گومانم لەوە نەبوو کە هێسترە رەش ئاوەوئاو دەچێ، ئەو شەو شەوی مەرگی هێسترە، مەرگێکی ئاوی و تریفەیی، مەرگی پڕ لە شلپوهۆڕ...

ئێستا بەلەم و هێستر بە تەنیشت یەکەوە زێ دەبڕن، هێستر لە کونە لووتەکانیەوە دەنگێك دێت لە هیچ دەنگان ناچێت، نە دەنگی رەشەبایە، نە دەنگی شەپۆلی تووڕە، نە ئەو دەنگانەش کە بەو دوو دەنگە ئاشنا دەبنەوە، بەوەی باشە تا دێ هێستر و بەلەم لێکدی دوور دەکەونەوە دەنا بەرگەی دەنگی هێسترم نەدەگرت، لە بیرم بێت، من لە هێسترەوە کەمێك ئازایەتیم وەرگرت، کە دیتم ئەو ئاو دەبڕێ هەندێك ترسم لە ئاو شکا، تا دێ لێکدی دووردەکەوینەوە کە لە کەنار بەرێکەوتین ئێمە کەوتبووینە لای چەپی هێسترەوە، کەچی ئێستا هێستر بە لای چەپی ئێمەوەیە، لە بیرم نەچێت زێ لە چەپەوە بەرەو راست دەڕوات، تا نەگەینە ئەو بەر گرنگیی ئەو چەپ و راستە و لێوەشاوەیی هێسترمان بۆ دەرناکەوێت، بەڵام تۆ بڵێی جارێکیدی کەنار ببینینەوە؟ سەد جار پتر ئەو پرسیارەم لە خۆم کردووە، لەو ساتانە خۆزگەی دنیام بۆ چووپێك دەخواست، ژیانم لە چووپێکدا دەدیتەوە، چووپ چووپ چووپێك و چیدی نا.

ئێمە کەمێك زووتر پێش هێستر گەیشتینە کەناری دیوی سۆران، سەرکەوتینەوە ئەو جێیەی کە هێستر لێیەوە دەگەیشتەوە کەنار، ئەو جێیە رێك بەرانبەر ئەو جێیەی کەناری ئەو بەرە کە لێیەوە سواری بەلەم بووین

که لێیەوە هێستریان بە ئـاودادا، بەڵەم زۆر لە خـوارتر بە کەنـار کەوتەوە، واتە بەڵەم تیواوتی زێـی بـڕی، بەڵام هێسـتر قەدبـڕو بـێ تیکـردنەوە، بەڵام تێنەگەیشـتم بـۆچی ئـێمە لە هێسـترمان بـردەوە! ئەوەتـا ئـێمە سـێ کەس چـاوەڕێی گەیشـتنی هێسـتر دەکەیـن، نزیـك کەوتەوە بەس لمـۆز و دوو گوێی کورت و تەختایی نێوچەوانی دیارە، هێستر یەك مشەمشیەتی دەڵێـی هەرچی دەنگی دنیا هەیە لە رێی لـووتی هێسترەوە لە ئـاوەوە بە وشـکانی وەردەبێت، هێستر لە زێـدا پـتر لە نەهەنـگ دەچـوو نەك هێسـتر، هێسـتر لە ئـاودا دەتگـوت لەوەتەی هەیە گیانـدارێکی ئـاویە و بە مێوانـداریش مـاڵی وشکانیی نەدیوە، سـەرم لە مەلەوانیـی هێسـتر سـوڕمابوو، کـاتێ بیسـتم کە دوور نیە ئەو هێسترە یەکەم جاری بێت لە ئاو بدا، خەریك بوو زۆر شـتی نـاو سـەرم ئـاوەژوو ببـنەوە، ئـاخر سـەرەتا دەمگـوت رەنـگە ئەوە جـاری سەدەمی بێـت لە زێ بـدات، وام بیردەکـردەوە هەر لە گچکەیـیەوە فێـری مەلە کرابێت، خوداوەندی مەلە چ دەبوو منیش لە ئاودا خزمی هێستر بام...

لە ساتە کورتەکانی پێشوازیدا، پێشوازی لە هێستر، بایی رۆمانێك بیـرم لە هێستر کردەوە، هێستر گەیشت، رووت رووت لە ئاو رووتتر، لە ئـاوەوە پەڕیەوە وشــکانی، ئــای مانــدوو بــوو، دەتگــوت لەو ســەری مێــژووی ماندوویتیەوە هاتووە، راوەشاندنێك خۆی راوەشاند سەرەتا وام زانـی رێـژنە بارانی هاوینی دایکرد، دڵۆپە ئاو تێکەڵی تریفە بوون، ئەو خـۆ راوەشـاندنە هی ماندوویتی دەرکردن بوو، هەسـتمکرد حەسـایەوە، وای نەکردبـا، سـاڵ وەردەسووڕایەوە هێشتا چۆڕ چۆڕ ماندوویتیی زێی لێوە دەچۆڕا.

لە بیرم نیە بەلەمەکە چەند کاروانی کرد، هەموومان پەڕینەوە، هێسترمان بارکردەوە، هێشتا مانگەشەوە، بایەکی فێنـك زۆر فێنـك دەتگـوت لە زێـوە هەڵیکردووە، گۆلم گۆلم بۆنی جاترەی دەپژانـد، تـا لە شـەوێکی وەك ئەو شەوەدا سەرێك لە کەناری زێی گەورە رێك ئەو جێیەی مـن هەناسـەم بـۆ بۆنی جاترە گرتبۆوە، نەدەیت، ئەسـتەمە بـاوەڕ بێنیـت کە جـاترە بـۆنێکی وای هەبێت، بۆنێك بتخاتە مەستیەکەوە شەرابی لەعلی رۆمانیش وا مەسـتت

نەکات، لەو شەوەوە جاترە بووە بۆنی من، هەوکە لە هەڵکشانداین.

تۆپ لێنـاگەڕێ بە دڵـی خـۆم بـۆنی جـاترە بـکەم، لە دەسـتی چەپمـان دوندێك ئاگری گرت، بڵێسەی گەیشتە ئاسمان.

-٢٩-

**شواتێك مەڕەکانی گوێیان لێگرتبوو:**

**خوداوەندی من،**

**دابەشکردن کەی وایە!**

**چی بۆمن نەما**

**سەگەکەم هەمووی هەڵگرتەوە**

**وەفا، وەفا**

**کەمێك وەفای لێوەرگرەوە.**

مانگ ئاوا بوو، تاریکیەکی تاریك تاریـك داهـات، تـا لە پـێش چـاوی خـۆت مانـگ ئـاوا نەبێـت، نازانیـت مانـگ چ روونـاکیەکی پێـیە، بـڕۆ بە تاریکیـدا بـڕۆ، وا بەیـانی دا، رووناکـایی کەوتە دنیـاوە، هەر بـڕۆ، رۆژ گەیشتە ئاسمانێ، ئێستا لە بن بەرزاییەکین، لە ناو بێستانێکی بەرەڵلا مرومۆ دەکەین، بڕك بڕك دەگەڕێین، دەسکەوتی مـن گنـدۆرەیەکی لاقـوزە بـوو، ئەو لاقوزەیەم جوان لە بیرە، ئەگەر پەنجەی بە بیرهێنانەوە چەند جارێك بە توندی لە سەری خۆم بدەم، رەنگە رەنگی گندۆرەکەش بێتەوە بەر چاوم، ئەو لاقـوزەیە بە هـۆی ئەبـوو جاسـمەوە لە یادەوەریمـدا وەك خـۆیەتی، لە بیرمە کاتێ دەمویست وشەی لاقـوزە لە ئەبوو جاسـم بگەیەنـم پێکەنینێـك پێکەنـی سـەگەکانی بـابە جیجکـی بە ئاگـا هێنـا، هێشـتا زۆری مـاوە بـۆ بابەجیجك دەبێت لەو بەرزاییە ئاودیو بـێن ئەوجـا بە دیـار دەکەوێـت، هەر لەگەڵ ئەو پێکەنینەش تۆپێك لوورەی هـات، نـازانم کـێ، دوور نـیە دیـار بوویێت گوتی:

پێکەنینی حەمە سوور هەر سەگ نا تۆپیشمان لێ بەئاگا دەهێنێ.

نازانم ئێستا، بەڵام هەینێ سەگی بابەجیجك ناوی هەبوو، سەگ نەبوو لە دنیایێ هێندەی سەگی بابە جیجك دڕ، سەگی هەموو دنیا لە لایەك هی بابەجیجك لە لایەك، ئەگەر هەرچی سەگی دنیا هەیە وەکو سەگی ئەو گونده ئازا و بە زاخ بان، ئێستا لە جیاتی مرۆڤ سەگ فەرمانڕەوایی دنیایان دەکرد، قسەیەك هەبوو لە بابەجیجك نزیك لەوە:

ئەگەر لە ڕێیان تووشتان بە تووشی شێر و پڵنگان بوو، گێچەڵیان پێتانکرد، مەترسن، بەس ناوی سەگی بابەجیجك بێنن، لەو ناوە نامێنن.

کەس نیە بە پێشمەرگە و جاش و سەربازەوە زراویان لە سەگی بابەجیجك نەچووبێت، دەگێڕنەوە جارێك بە دوو سەگ سێ پێشمەرگەیان چەك کردبوو، سەرت سوڕنەمێنێ چەککردنی پێشمەرگە لە لایەن سەگەوە هێندە زەحمەت نیە، ئاخر تۆ ئاگات لێنیە لە کوێوە دێن، هێندە دەزانی سەگی بابەجیجك وا خۆی هاویشتۆتە سەر شانت، سەگی ئەوێ خۆی هەڵداوەتە سەر دەبابە، کۆپتەر و فڕۆکەی لێدەرکە سەگی بابەجیجك ئامادەیە شەڕی هەموو شتێك بکات و سەرکەوتووش بێت، خۆ ئەگەر خاوەنەکەی کس کسی لێبکات، ئەوا تۆپیشی پێوە بنێێ ناگەڕێتەوە.

سەگی جێیان بە ئاسانی دەکەوێتە ناو سێرەی تفەنگەوە، بەڵام هی بابەجیجك گەمە نیە، لەو کاتەی لە سەر ئەوەی بیخەیتە ناو سێرەوە، دەبینیت شانێکت وا لە ناو کەڵپەی سەگێکە.

خوداوەندی ڕووداو و بەڵایان، هەرچی دەنێری بنێرە بەس لە بەڵای سەگی بابەجیجکمان بە دوور بێخە.

هەر من نا زۆر کەس بە بێ دەنگی و لە دڵەوە ئەو نزایەیان خوێندووە، چەندی لە بابەجیجك نزیکتر دەکەوتینەوە، نزاکەم خێراتر دەخوێندەوە، پێم دەلەرزی، دەتگوت بە ڕێی بۆسەدا دەڕۆم، لەویش ترسناکتر، ئەوانەی بە ڕێیەکدا ڕۆیشتوون و گومانیان هەبووە کە بۆسەیەك هەیە، دەزانن چەند ڕۆیشتنێکی ترسناکە، ڕەنگە ترسی من لە سەگ پەیوەندی بەو دوو

چیرۆکەی سەگیشەوە هەبێت کە لە منداڵیمدا تۆمار کراوە، منداڵ بووم، بە سەردان چووبوومەوە ماڵی باپیرم، سەگێك هەبوو بە (سە سمێل) ناوی رۆیشتبوو، هێندەم لە بیرە سە سمێل کەوتە دوام، پێیەکم کردە سێ پێ، بەڵام کێ هەبوو لە چنگی ئەو سەیە قوتاری بێت، لە بای غاریێ کەوتمە چاڵێکی کەمێك قووڵەوە، هێندەی بەژنی ئەو کاتم کەمێك قووڵتریش، سەگیش هاتە ناو چاڵێ، ئەگەر دەستەواژەی (لەگەڵ سەگ کەوتنە چاڵ) ئەوها بێت کە من کەوتمێ خودایە کەس لەگەڵ سەگ نەخەیتەوە چاڵەوە، ئەگەر هەر ویستیشت سەگ لە چاڵ بە تەنیا نەبێت، پێشمەرگەیەکی خایەنی بەگەڵ بدە، ئێ، هاوارێکم لێهەستا لە چاوترووکانێك هەموو گوند گەیشتنە سەرم، چۆن هاوارێکی وا نەکەم، سە سمێل کە کەڵبەکانی لە هی هەموو سەگێك گەورەتر و تیژتر بە سەگی بابەجیجکیشەوە، چەقاندیە سمتمەوە رێك ئەو جێگەیەی کە تایبەتە بە دەرزی، بەوە دەزانم ئێستاش کە جاروبار دەرزیەك لە خۆم دەدەم دەرزی لێدەر دەڵێت:

+ ئەو کونە چیە بە رانتەوە، دەڵێی جێ گوللەیە؟

- بریا هی گوللە با، نا، جێی ددانی سەیە..

جارێکیدی هەر لەوێ و هەر سە سمێلیش کەوتە دوام، بەڵام ئەو جارە ددانی نەگەیشتە گۆشت، تیلمێ لە شەرواڵەکەمی برد، تا لە بابەجیجك نزیکتر دەکەوتینەوە، کەڵبەکانی سە سمێل گەورەتر خۆیان نیشاندەدا، پێشتر یەك سە سمێل هەبوو، بەڵام ئێستا هەستدەکەم سەگەکانی بابەجیجك هەموویان لە سە سمێل سە سمێلترن...

ئێستا پێش نیوەڕۆیە، لە ئاوایی نزیککەوتووینەتەوە، دەنگی سەگ دێت، ئەوانەی ئاشنان بە سەگی بابەجیجك هیوا خوازن، پێش ئەوەی سەگەگان بگەن کەسێکی ئاوایی بگات و لە بەڵای سەگمان دوورخاتەوە.

ئێستا لە ناو ئاوایی بابەجیجکین کە مەیلەو چۆلە، باش بوو زوو کوڕێك لە سەگی پاراستین، درەنگ پێکەوتم کە هەندێك لە سەگە

ئازاکانیش به دەستی جاشان شەهید بوونە، ئەو جاشانەی نە زاخی سەگیان هەبوو نە ئەمەکی سەگ، سەگی بابە جیجك شەو و رۆژ ئێشکگریان لە بابەجیجك لە گوندەکەی خۆیان، لە ماڵی خۆیان دەگرت و دەیانپاراست، بەڵام جاش...

بە گۆتەی گۆتیاریش: بابەجیجک هەرگیز سەگی نارەسەنی لێهەڵنەکەوتووە، لەو گوندە گورگەمێش هەر ناویشی نیە.

من کە هەواڵی مەرگی سەگە ئازاکانم بیست، دڵم بۆ سەگ سووتا، لە بیرمە ئەو هەموو رقەی بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە بەرانبەر بە سە سمێڵ لە دڵم کەڵەکە ببوون، هەستمدەکرد وردە وردە دەتوێتەوە، وا بزانم هەر ئەو کاتیش بوو لە دڵەوە لە سە سمێڵ خۆش بووم و گەردنیم ئازادکرد... نان و ماستێکمان خوارد مەگەر هەولێر ماستی وا خۆشی هەبێت.

کۆپتەر نەوی نەوی زۆر نەوی...

-٣٠-

**مرۆڤ بێ ناسنامە**
**دێتە دنیا،**
**دەشمرێ نەناسرێتەوە...**

هەر ئەو کورەی لە هاتنێ لە سەگی پاراستین، لە رۆیشتنێش ئەرکی پاراستنی گرتە ئەستۆی خۆی، ماڵاوا بابەجیجك، ئەی ئەو گوندەی بە ئاوەدانیەوە جوان بوویت، بە سەگە بە زاخە بە ئەمەکەکانتەوە جوان بوویت، سوپاس بۆ ئەو نان و ماستە خۆشە، سوپاس بۆ پیاڵە پیاڵەی چایەت، ئەو پیاڵانەی هێندە هێوریان کردوومەتەوە خەریکە لای خۆمەوە لێبووردنێکی گشتی بۆ ئەو جاشانەش دەربکەم کە دەستیان بە خوێنی سەگی بابەجیجك سووربووە، ئێستا وەڕینی سەگەکانت لە گوێی من

شیرینن،جوانترین داکردن و بەڕێکردنن...

ڕۆیشتین ڕۆیشتین هەر ڕۆیشتین، گۆماوێکی وەستاومان هاتە ڕێ، زۆر دوور نەبوو لە ڕێ، گۆماوێك نە تێیدەکردەوە نە لە بەری دەڕۆیشت، ئێرە (گراو)ە، گۆماوێکی گۆگردی، دەیانگوت هەر کەسێك خورشتی هەبێت، گروو بێت، خۆی باوێتە ئەو گۆماوە بەڵای نامێنێت، من ئەو کات پێیەکم خورشتی هەبوو، هاتە سەرم لادەم و تاقیکەمەوە، نازانم بۆچی وام نەکرد.

سووڕاینەوە، ئێستا دەمەو عەسرانە لە بن ڕەزگەی عەلی ڕەزگە لە دەو چەمەکە لە پشـووێکی ئـاوی دایـن، لەقـووڵاییەکی چەم کە نیـو بەژنێـك دەبێـت، جلـك دەشـۆین، مەلە دەکەیـن، هێسـترە ڕەشـیش بە دڵـی خـۆی دەگەوزێ، نـــاوە ڕەوە فـــڕۆکەیەك لە شـــێوەی پەلە هەورێ بەری خۆرمــان لێــدەگرن، بەڵام ئەگەر ســەرچیخ نەچــووبم هێنــدە گرنگیمــان پێیانەدەدا...

دیتم حەمە سوور خەریکی ناسنامە دڕاندنە، کەمێك لێی چوومە پێش:

+ لێیان توورە بوویت؟ وایان لێدەکەیت!

- ئەورۆ نیە لێیان تووڕەم، بەڵام ئەورۆ هەستدەکەم مانەوەیـان لام دەبـنە سەرئێشەیەکی زۆر گەورە.

+لەوەی دواییان تێنەگەیشتم.

+ مـن بە ئاسـانی نـاکوژرێم، بەڵام ئەوە دنیـایە، دەبێـت کوشـتن و مردنیش لە بەر چاو بگرین، ئێ لەو کاتە ئەگەر ئەو بەڵگانە بکەونە دەست حکومەت، دەمناسنەوە و ماڵمان دەبیننەوە و ئەوانیش وەك مـن تیـا دەچـن، ئەوجـا بـۆ ئەوەی مـاڵەوە تووشـی بەڵا نەبـن، دەبێـت هەمـوو ئەو بەڵگـانە بسووتێن کە عێراقیبوونمان دەسەلمێنن، ئیدی من ئاگر لە عێراقیبوونی خۆم بەردەدەم.

تەسکەرە و دەفتەر عەسکەرییەکەی بە دنکە شخاتەیەك گڕدا

نازانم کێ بوو پرسی:

ئەو دووکەڵە چیە! ئاگادار بن، کۆپتەرمان لێ دوور نیە.

حەمە سوور گوتی:

چ نیە، عێراقیبوونی خۆم سووتاند.

منیش چاوم لە حەمە سوور کرد، دەفتەر عەسکەری و ناسنامەی قوتابێتیم کە هەر لە لام مابوو، سووتاند، بە سووتانی ئەوانە هەستمکرد ئیدی من هیچ پەیوەندیەکم بە عێراق و حکومەتەوە نەما، لەو ساتانە بە دیوێك هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد بە دیوێکیش نیگەرانی، ئێستا نایەتەوە یادم ئەو ئاسوودەیی و نیگەرانیە سەرچاوەکەیان لە کوێوە و لە چیەوە بوو، رەنگە ئەو کاتیش نەمزانیبێت، بە سووتانی عێراقیبوون ئەو پیاوە مەتیننشینەم بیرکەوتەوە کە شەست ساڵی رەبەق بە سەر شوانایەتیی تێپەڕیبوو لێی تێر نەبیوو دەیگوت:

چەند ژیاوم هێندەیدیش بژیم هەر شوان دەبم و بە شوانی دەمێنمەوە.

ئەو پیاوە_ حەیف ناوەکەیم لە یاد نەماوە_ نەیدەزانی تەسکەرەو مەسکەرە چیە، نەك هەر سەربازیی بۆ هیچ حکومەتێك نەکردبوو، هیچ حکومەتێکیشی نەدەناسی، ناوی لە هیچ فەرمانگەیەکی ئەو دنیایە نەبوو، ئەو پیاوە ئەگەر دواتر بەر چنگی ئەنفال نەکەوتبێت، ئەوە دڵنیام لە ناو بزنەکانی مردووە، مردنێك نە پێویست بە دەرهێنانی مەرگنامە دەکات و نەهیچ، من رەنگە زۆر کەڕەت ئیرەییم بەو پیاوە بردبێت، خۆزگەم پێی خواستبێت، لەو ساتانە دەمگوت خۆزی لە خۆزیداران منیش وەك ئەو شوانە مەتیننشینە ناوم لە فەرمانگەی هیچ حکومەتێك نەدەبوو.

من ئێستا چەند لەو شوانە بێ ناسنامەیە دەچم!

لەو دەو چەمە خۆمان جوان خاوێنکردەوە، لەشمان سووك بوو، ئەگەر چایەك هەبا ئێستا زۆر قسە و باسی ئەوێ دەهاتنە ناو گێڕانەوە، زۆر جار قسە لە چایەوە سەردەکا، بێ چایەیی قڕوقەپێکی رانەگەیەنراوە، شێخ شوان لە بارەی چایەوە گوتەیەکی سەرنجڕاکێشی هەبوو:

بۆ چایە گەوادیش بکەیت هیچی تێدا نیە.

بەرە بەری ئێوارەیە، خۆمان کۆکردەوە، لە رۆیشتنی حەمە سوور بە پێکەنینەوە:

ئیدی من و تۆ سەر بە هیچ دەوڵەتێك نین.
فڕۆکە فڕۆکە، کۆپتەر کۆپتەر، تۆپ تۆپ...

-٣١-

**پیرێکی سەگناس قسەی بۆ منداڵەکانی دەکرد:**
**بۆ ئەوەی تا سەر بە مرۆڤ بمێنینەوە**
**دەبێت زۆر چاو لە مرۆڤ نەکەین و**
**کەمێك لاسایی سەگ بکەینەوە...**

ئێرە رەزگەیە، ئەو گوندە لە ئێوارەی هاوینی جوانیەکی تایبەتی هەیە، لە چاوی منەوە وابوو، رەزگە و عەلی بە شێوەیەك پێکەوە لکاون، هیچ چەکێکی عەردی و ئاسمانی بە تۆپە دنیاهەژێن و کیمیاییشەوە لە توانایان نیە ئەو دووە لێك جودا بکەنەوە، زۆر کەس هەن بە ناوی گوندەکەیان دەناسرێنەوە، وەك عەلی دەبێت رەزگەکەشی لەگەڵ بڵێیت و بڵێیت (عەلی رەزگە) بەڵام یەك گوند هەیە هەتا ناوی پیاوە باڵابەرزەکەی نەڵێیت کەس نایناسێتەوە ئەویش رەزگەیە، هەر بڵێ رەزگە رەزگە سەدجار بیڵێوە، سەد نیشانەی هەڵبدە کەس نازانێ چیە و کەوتۆتە کوێ، بەڵام کە گوتت (رەزگەی مام عەلی) ئیدی تەواو کەس نیە نەیناسێتەوە بە پێشمەرگە و جاش و سەربازەوە، بە خەڵکی هەردوو بەری زێوە، دیار دەیگوت:

وا بزانم لە سەر نەخشە سەربازیەکانیش نووسراوە رەزگەی مام عەلی.

حەمە سووریش دەیگوت:

دوور نیە لە تەسکەرەکەیشی عەلی رەزگە نووسرابێت.

پێشتر رێم بە رەزگەی مام عەلی کەوتبوو، نازانم لە کوێ رەنگە لە بەری بادینان بووبێت عەلی رەزگەشم دیتبوو، دەمێکیش بوو لە دوورەوە دەمناسی، ئەو پیاوە سەرەوەختانێك بە بەرزەناسی ناوی دەرکردبوو، بەخێوکار و راهێنەرێکی سەیر و بە توانای بەرزەبوو، چەمووشترین بەرزە

هێستر، ئەسپ، مایینی لە ماوەیەکی هێند کورت باردەهێناو دەستەمۆی دەکرد لە خۆی دەهات و بەس، هەبوو، لە بارەی ئەو لێوەشاوەییەی عەلی رەزگەوە دەیگوت:

ئەگەر مام عەلی رەزگە لە ئەورووپا با، ئێستا لە هەموو دنیا ناوی هەبوو.

عەلی رەزگە وەك دەڵێن لەوەتەی هەیە پێشمەرگەیە، هەرگیزیش سەری لە رەزگە نەبڕیوە، عەلی و رەزگە لە ماسی و ئاو دەچن، هەندێك ئەو لێکچواندنەیەیان بە دڵ نەبوو، قسەیان لە ئاوەکە بوو، دەیانگوت:

ئاو بێ ماسی هەر ئاوە، بەڵام رەزگە بێ عەلی رەزگە نیە.

ئەو ئێوارەیە ئەو پیاوە لە هەموو شت کەڵەگەتە میوانداریەکی وای کردین، پێشمەرگایەتیم لە بیربچێتەوە، میوانداریەکەم لە بیرناچێتەوە، پیاوێکی کەمدوو بوو، بەڵام پیاو چێژی لەو کەمدوویيە وەردەگرت، هێشتا هەر لە رێ بووین، زۆرمان مابوو بۆ رەزگەی عەلی، دەمزانی دەبینە میوانیماڵی مام عەلی رەزگە، پێشمەرگە نیە ئەو پیاوە نەناسێت، پێشمەرگە نیە لە ماڵی ئەو نانی نەخواردبێت و نەحەسابێتەوە، با هەر خۆی لە ماڵ نەبووبێت، ماڵەکەی هەمیشە دەرگا واڵا بووە بۆ مێوان، لە رێێ کاتێ لە بێ چایەیی ژانەسەرمان دەگرت، ئەبوو راستی دەیگوت:

ئای ئێستا لە ماڵی مام عەلی دانەنیشی و حەفت چایەی رەزگەیی نەخۆیتەوە.

دەیگوت:

لە دنیایێ چایەی هیچ جێیەك تامی چایەی ماڵی مام عەلی رەزگە نادا، ئەوانەی تامیان نەکردووە، با تامی بکەن، ئەوجا تێدەگەن قسەکەی من چەند لە جێیە.

من تا تامم نەکرد، باوەڕم بە قسەکەی ئەبوو راستی نەهێنا، حەفتی چی، ئەگەر شەرمێ ناکەیت بە خودای حەڤدە چایەش دەخۆیتەوە و هێشتا پیاڵەش نخوون ناکەیتەوە.

ڕەزگەی مام عەلی تاقولۆق ماڵی تێدا ماوە، ئەوانیش لەبەر مام عەلی ماونەتەوە، دڵیان نایە بە تەنیای جێبهێڵن، ئەویش پێی لە ڕەزگە گیرکردووە، بە هیچ هێزێك ڕاناکێشرێ، ڕەزگە ڕاستوڕاست کەوتۆتە ناو سێرەی تۆپەوە، ئاسمانی ڕەزگە کۆپتەر و فڕۆکەی لێنابڕێ، ئاقاری ڕەزگە بە ئاقاری جاش و سەربازانەوەیە، ئەگەر بێن، هێندە نابا دەگەنە ناو ئاوایی، بەڵام لە چاوی کەس ترس ناخوێنمەوە، من بە منایەتی خۆم هیچ نەدەترسام، هۆی ئەو نەترسانە هیچ دوور نیە عەلی ڕەزگە خۆی بێت، ئەو پیاوە وەك دەیانگوت هەموو شتناسە بەس ترس نا، دوور و نزیك ئاشنایەتیی لەگەڵ ترس نەبوو، ئەوەی ماوەیەك لە تەنیشتیشی دابنیشێ، چەندی ترسنۆکیش بێت پڕ دەبێت لە ئازایەتی، ڕەزگەییەك گوتبووی:

هەر چاکە و نەخۆشیەك دەپەڕێنێ، مرازێك دێنێتە دی، مام عەلیش ئەگەر بمرێت دەبێتە ئەو چاکەی ترس دەپەڕێنێ و تەنها مرازی ئازایانیش دێنێتە دی.

بە خوا مام عەلی ڕەزگە بە زیندوویتی ترسان دەپەڕێنێ، دوور نیە بە مردوویتیش هەر وا بێت، گۆڕەکەی، ئەگەر ئەنفال دەستبەرداری بێ و گۆڕی پێببڕێ، چی لە گۆڕی پیاوچاکان کەمترە! ئەوەی عەلی ڕەزگە بۆ ڕەزگەییەکان و خەڵکیدی کردووە، پیاوچاکان هێندەیان نەکردووە.

من کە لەو پیاوە ورد دەبوومەوە هەستمدەکرد لە پاڵ چیایەك لە خۆڕاگری و بەرەنگاری دانیشتووم، خۆزگەم دەخواست منیش وەك وی بام، هەر من نا ئەوەی جارێك ئەو پیاوەی دیتبێت، یان لە بارەیەوە شتێکی بیستبێت، دڵنیام خۆزگەی پێخواستووە، ئەبوو ڕاستی دەیگوت:

ئەگەر هەر گوندەو عەلیەکی ڕەزگەیی هەبا، دنیا دنیایەکیدی دەبوو.

ئەو ئێوارەیە عەلی ڕەزگە بە ڕەزگەوە لە خزمەت ئێمە بوو، ئەو ئێوارەیە ئەو پیاوە ئێمەی پڕکردەوە لە وڕە کە من خەریك بوو لێی بەتاڵ دەبوومەوە، ئەو ڕۆژانە عەلی ڕەزگە بە کڵاشینکۆفێکی ڕووتەوە پارێزگاریی لە ڕەزگە دەکرد، بەرەنگاری فڕۆکە و کۆپتەر و دەبابە

دەبۆوە، کاتێ دەنگی تۆپێکی دنیاهەژێن دەهات، دەیگوت:
چ نیە حکومەت تری کرد، ئەنگۆ دەزانن، تری حکوومەت تۆپە، خۆ تێکمەدەن دێ و دەڕوا، لە بۆنەکەشی مەترسن، جەمەدانی تەڕ کەن و تەواو، بە راستی حکومەتێکی زۆر ترکەنە.
مەبەستی لە بۆنی تری حکومەت کیمیایی بوو.
ئەو پیاوەی کە پێیوابوو حکومەتی عێراق ترکەنترین حکومەتی دنیایە، خۆ دووریش نیە وا بووبێت، ئاخر کوا چ حکومەتێك هێندە تۆپەی بە دنیاوە ناوە، ئەگەر تەنها ئەو تۆپانە بژمێری کە بە رەزگەی مام عەلی کەوتووە، حکومەتی وا هەیە لە ماوەی حەفت ساڵی شەڕیش هێندە تۆپەی نەهاویشتووە، عەلی رەزگە گۆتەنی هێندە ترەی نەکردووە، ئەو پیاوە پێش ماڵاوایی قسەیەکی نزیك لەوەی کرد:
پیاو پێویستە هێندەی سەگێك بە زاخ و ئەمەکدار بێت، تەماشا کەن، سەگ چەند رشتە لە پاراستنی ماڵ و خاوەنەکەی، من چەندم کردبێت هێشتا هێندەی ئەو سەگەم نەکردووە.
لەو کاتە سەگەکەی مام عەلی کلکی بادەداو زەق زەق سەیری دەکردین، لە دەموچاوی شادیم خوێندەوە، خەریك بوو باوەڕبێنم کە لەو پیاهەڵدانەی خاوەنەکەی تێگەیشتووە.
ماڵاوا عەلی رەزگە، رەزگەی عەلی ماڵاوا، ماڵاوا پیاوی بەرەنگاری، هیواخوازم بەر تری حکومەت نەکەویت.
تڕ تڕ، تۆپ تۆپ...

-٣٢-

کچێك نەمزانی رووی لە کێ بوو:
بەتاڵ بەتاڵ
لە خۆم بەتاڵتر
ئەگەر پڕ لە تاڵیشم دەکەیت قەینا
بەس بە بەتاڵی جێممەهێڵە...

لە سەری مندا شەوێك بەتاڵ و ونە، چەندی وەك لیمۆ خۆم دەگوشم، وەك لالەی گەش چاوم دەکەمەوە هیچ نابینمەوە، لەو شەوەی ئەوێ هیچ نابینمەوە، هیچ نابیستمەوە، لەتە وێنەیەك، کەرتە قسەیەك هیچ هیچ، هەر هێندەم لەبیرە لە یادەوەریی مندا لە نزیك رەزگە یان کەمێك دوور شەوێکی ون هەیە، شەوێکی بەتاڵ بەتاڵ لە یادەوەری، سەیرە لە تۆیش بەتاڵە، بە ناچاری دەبێت بچمە ئەو بەیانیەوە کە بەسەر شەوە بەتاڵەکەدا هەڵهات.

هەندێ کەرەت دەڵێم خۆزگە هەموو شەوەکان هەموو رۆژەکانی نێوان گارە و هەورێ وەك ئەو شەوە ون و بەتاڵە دەبوون و لە هیچیانەوە نە دەنگی کۆپتەر نە فرۆکە نە تۆپ، دەنگی هیچ نەدەهات هیچ.

-٣٣-

لە بەرەی شەڕەوە
گوێمان لە بۆڵە بۆڵە
دەنگێك لە پەشیمانیەوە تێیهەڵکرد:
لە چیم پردەکەیت پڕکە
بەس بەتاڵمکەوە لە تۆڵە...

دنیا تەواو رووناك بۆتەوە، ئێستا نا ئێستا خۆری ئابی لە گردۆلکەکانی

دەورووبەری رەزگە هەڵدێ و تیشکی خۆی بە سەر پۆلێ پێشمەرگەی لە دنیا تەریو پەرتدەکا و دەیانخاتە سێرەی کۆپتەرەکانەوە، لەوان رۆژان خۆر لە بەرەی حکومەت بوو، چاوساخیی بۆ دەکرد، ئەوە هەڵهات...

ریگا هەمووی داروبارە، بنەداری وا دێتە ریمان حەفت ماڵ لە بنی هەڵدات، سێبەر بەشی هەمووان دەکات، پێی کەس خۆری پێناکەوێت، بنەداری پیر زۆر پیر لە عەلی رەزگەش پیرتر، خۆزگەم دەخواست هەموو ریگاکان ئەو ریگایانەی ریگای ئێمەن هەر وا پڕ داروبار بن، لە رێوبانێکی وا بەس بنەداری وا ئەگەر لە چاوی کۆپتەرت بشارنەوە، جگە لەوەش سێبەر سێبەر چ لەوە خۆشترە لە رۆژە هەرە گەرمەکانی مانگی گەلاوێژ، درەخت سێبەرت بۆ بکات، لەو بن درەختانە پشوویکمان دا یەك یەك دوو دوو، دوور لە یەك دانیشتبووین، حەمە سوور لە نزیکم بوو، جگەرەکێشەکان، جگەرەمان دەپێچایەوە، ئەوانیدیش نازانم چێژیان لە چی وەردەگرت، من وابووم، زۆر شتم لە پێناوی جگەرە بوو، بۆ چێژ وەرگرتن لە جگەرە بوو، چایە، پشوو، خواردن، هەستمکرد ژمارەمان زیادی کردووە، دوو سێ جار سەرژمێری خۆمانم کرد، یەکێك زیادی دەکرد، ئەگەر کەمی بکردایە دەمگوت خۆم لە بیر کردووە، گوتم رەنگە هێسترەکەشم لە رێزی خۆمان دانابێت، وا نەبوو بە هێسترەوە دوو زیادی دەکرد، خۆم رانەگرت، گوتمە حەمە سوور:

+ قسەیەك دەکەم نەڵێی شێتە.

- قەینا خاترت دەگرم وا ناڵێم.

+ پێشمەرگەیەکمان زیاد نەکردووە؟

- دوێنێ چەند بووین ئەورۆش هەر هێندە.

+ باوەڕناکەم.

- منیش خاترت ناگرم!

+ گاڵتە مەکە.

کە زانی بە راستیمە و گاڵتە ناکەم:

- وا بزانم حەزت لێیە پێتبڵێم شێت، وا نیە! لە پێرس هاتین ژمارەمان چەند بوو؟

+....

ژمارەکەم بە تەواوی گوت، ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە لەبیرم نەماوە.

- لە ڕەزگەش ئەو کوڕەمان بەگەڵ نەکەوت!

+ ئۆی، چما ئەوە لە ڕەزگەوە لەگەڵمانە!

- ناڵێم شێت، بەڵام تووڕە مەبە هەندێ کات هەندێ گێلایەتیت هەیە.

+ هەر هەندێك!

بێ خۆگێلکردن من ئاگام لەوە نیە ئەو کوڕە لە ڕەزگەوە لەگەڵمانە، کوڕێکی کەمێك سوورکەڵەی سەر گروازە، هەر لە تەمەنی من دەبوو، تۆ بڵێ ساڵێك گەورەتر، دیتم وا لەگەڵ ئەبوو راستی لە گفتوگۆی گەرمدان، بەڵام لێم دووربوون، تێنەگەیشتم لە بارەی چیەوەیە، بەڵام حەمە سوور گوتی:

- مەسەلەکە مارکسە.

+ بە چی زانیت؟

- دیارە ئیدی.

+ ناوی چیە؟

- کوڕی پلکی مارکس، دیار ئەو ناوەی لێناوە، چونکە هەموو قسەکانی لە بارەی مارکسەوەیە.

هەر لەوێ پێکەوتم ئەو کوڕەی پلکی مارکس پێشتر (ئالا) بووە، ماوەیەکە لە ڕەزگە دانیشتووە و ئێستاش وا بەگەڵ ئێمە کەوت، لەمێژیشە لەگەڵ ئەبوو راستی یەکتر دەناسن، ئەحمەد عەرەب دەیگوت:

ئەبوو لاستی بە تکەی خۆی هەستا حەمە لیشی دەلکرد، کولی پلکی مالکسی هێنا.

ئەو کوڕە زۆری حەز لە گفتوگۆ بوو، لە بارەی مارکس و

جوولانەوەی کۆمۆنیستی و ئەو شتانە، ماوەیەك بـوو چ ئاگامـان لەو جـۆرە قسانە نەمابوو، کوڕی پلکی مارکس تووشی کردینەوە، کوڕێـك بـوو زۆر لە مارکس چینانەتر بیریدەکردەوە، نەیارێکی سەرسەختی ئایینیش بوو، لەو شتانە بای لە هەموومـان بڕیبـوو، هەر زوو بە لە دەودانەوە رستـەیەکی بـۆم راست کردەوە، لە قسەیەکم گوتم:

بە خودای...

گوتی:

جارێ لە جێگەی خوداکە وشەیەکیدی دانێ.

لە دڵی خۆم گوتم کوڕە ئەو کوڕە زۆر ترسناکە.

ئەو کوڕە ترسناکە زۆری خوێندبۆوە، رەنگە لە هەموومان پتر مارکسی خوێندبووبێتەوە، شـیعر و رۆمـان و چیرۆکیشـی زۆر خوێنـدبۆوە، خۆیشـی شیعری دەنووسی، رەنگە ئەوکـات نـا دواتـر بووبێـت و لە جێگەیەکیـدی، داوایکرد شیعرێکی خۆمی بۆ بخـوێنمەوە، خوێنـدمەوە، بە پـانی و درێـژی قسەی لە بارەیەوە کرد، شتێکی کەمم لە قسەکانی لەبیرە:

+ ئەو شیعرە بۆنی خوردە بۆرژوازی لێدێ، مرۆڤی مارکسی نابێـت وا بنووسێت،

- بۆ من دەبێت.

+ چۆن؟

- رەنگە من مارکسیی تەواو نەبم.

هەر ئەو کات ئەویش شیعرێکی خۆی بۆم خوێندەوە، شیعرێکی درێـژ، داوایکرد ئەگەر بە دوو وشەش بێت قسەیەکی لە بارەوە بکەم، گوتم:

ئەوەی خوێندتەوە، مانیفێستی کۆمۆنیستـە، تـۆ کـێش و سـەروات بـۆی داناوە.

رەنـگە وا نەبووبێـت، بە دووری نـازانم ئەو قسـەیەم لە کـاردانەوەیەکی تونـدەوە هاتبێـت و ویسـتبم تـۆڵەی خـۆمی لێبکەمەوە، ئـاخر ئەو بە منـی گوت خوردە بۆرژوا، ئەودەمیش ئەو دەستەواژەیە جوێنێك بـوو لە هەمـوو جوێنان جوێنتر و خوێن دەڕژا.

کـوڕی پلکـی مـارکس دواتـر زۆر دواتـر نـاوەکەی گـۆڕا، بـووە شیعرهاویژ، ئەوە برادەرێك ئەو ناوەی بە سەردا بڕی، چونکە قسەی من نیە هـی ئەوە، ئەگەر دڵـی لە برادەرێکـی بشـکابا، شـیعرێکی تێـدەگرت، نامیلکەیەکی دەرکرد چەند تێگرتنێکی تێدایە.

کوڕی پلکی مارکس یان شیعرهاویژ کـوڕێکی سەرڕاسـت و کۆڕئـارا بوو، کوڕێك بوو خۆشمدەویست.

دەنگی کۆپتەر زۆر جار قسە دەپسێنێ بۆ لایەکیدی رادەکێشێ.

-٣٤-

**پیاوێك هەیە لەوێ**
**سەردانی ئیمام و ئەسحابان دەکا و**
**سروودی کۆمۆنیستانیش دەڵێ**
**پیاوێك هەرچی دەیڵێ دەیکا...**

هێشتا لە هیچ دۆڵێك نوێژی عەسر نەبـووە، گەیشـتینە دۆڵێکـی بە ئـاو، دۆڵ ئەگەر لە ئەنفالیش بکاتەوە، مادام ئاوی هەیە خۆشە، ئـاو لە دوورەوە دیارە، مەتارەکان دەمێکە چاوەڕوانی ئاوێکی وان، وەك دەڵێن ئەو دۆڵە پـڕ پڕ لە کانیە، ئـاوی کـانیش هەمیشـە ساردە، کـانی ئەگەر لە دۆزەخیشـەوە هەڵقـوڵێ هەر سـاردە، تەلانێکمـان هـاتە پێشـێ، بە ڕێچکەیەکـدا تیـواوتی شۆڕبووینەوە، کەم بزن دەیوێرا خۆی لێدا، سێ چەکـدار لە سـەر کـانیەکە لە گـژ دەسـتنوێژ شووشـتن بـوون، سـێ چەکـداری ریـش درێـژ، ئێمەش هەندێکمان ریشمان هەبـوو، بەڵام ریشـی ئەوان لە هـی ئێمەیـان نەدەکـرد، جـگە لەوەش سـمێڵیان بە شـێوەیەك هەڵقـاچی بـوو، نیشـانەیەکی دیـاری جیـاکردنەوە بـوو لە ئـێمە و لە هەمـوو پێشـمەرگەیەك، مـن لە خـۆوە وام هەسـتکرد ئەو سـێ چەکـدارە خزمایەتیـان لەگەڵ ئیمـامی هەمـزە هەبێـت، یەکیان هەر زۆر شێوەی لەو دەکرد، دەبێت بڵێم سیمای ئیمـامی هەمـزە بە

من ئاشنا بوو، وەختی خۆی نیوە مەلایەك هەبوو، هەموو ئیمامەکانی لە نزیکەوە دەناسی، وەهای باس دەکردن دەتگوت لەگەڵ یەکە یەکیان نانی خواردووە، باسی شێوە و سیمایانی دەکرد، ئەویان باڵا بەرز، ئەمیان کورتەبنە و خاڵێکی گەورە بە نزیك برۆیەوە، ئەویدی یەکی سۆروسپیی چوارشانەی کەتە، ئەوەیان ڕەشتاڵەی چاو و برۆ ڕەشی ڕەژگوڵی... ئەو ئیمام هەمزە پاڵەوانە بێ ڕەزایەی کە نیوە مەلاکە پیشانی منی دابوو، ڕێك ئەو چەکدارەیە کە لەو لاوە بێ دەنگ لێمان دەڕوانێ.

کاتێ زانیان ئێمە لە شاگردانی فەهدین _دەستەواژەی شاگردانی فەهد لە زاری ملازم شێرزاد گەلێك خۆش دەهات، هەر لەبەر ئەوەشە من لێرە دەیڵێمەوە_ خوا خوایان بوو زوو هەستن و بەجێمانبێڵن، بەڵام ئەبوو ڕاستی بە قسان رایگرتبوون نەیدەهێشت بڕۆن، پرسیاری قیامەتی لێیان دەکرد، ئەوانیش کە هەر یەکیان قسەی دەکرد و دووەکەیدی بێدەنگ دانیشتبوون، بە نابەدڵی وەڵامی دەدایەوە، پێدەچوو وا تێگەیشتبێت کە ئەبوو ڕاستی گاڵتەی پێدەکات، بەرە بەرە لە ئاوەکە دوور دەکەوتنەوە، لە لێو جوولانیان دیار بوو لە سەر یەك (ئەستەغفیروڵلا) گۆدەکەن، لەو کاتە کوڕی پلکی مارکسیش لێوی ناڕەزایی دەجوولا، بەڵام تێنەگەیشتم چی دەگوت، وەك چۆن مرۆڤی نوێژکەر خۆی لە سەگی تەڕ دوور دەخاتەوە، ئەوانیش ئەوها لە ئێمە دوور دەکەوتنەوە و دەترسان گلاو بن، بە ((شاگردانی فەهد))ی ملازم شێرزاد گلاو بن...

ئەو ملازم شێرزادە جگەی لەوەی بەردەوام سروودی((لە شاگردانی فەهدی قارەمانین)) دەگوتەوە، هەر کەسێکیش لێی بپرسیایە ئێوە پێشمەرگەی کێن؟ یەکسەر دەیگوت:((لە شاگردانی فەهدین))، ئەوجا هەبوو نەیدەزانی فەهد چیە، لەو وەڵامەی شێرزاد سەری سوڕدەما، شێرزادیش دەهات چارەگە ژیانێکی فەهدی بۆ کابرا دەگێڕایەوە، جارێك دوو دەمژمێری ڕێك فەهد و ژیانی فەهدی بۆ پیاوێك گێڕابۆوە، دەیانگوت کابرا لە کۆتایی گوتبووی:

باشە بۆچی لە سێدارە درا؟ تۆ بڵێی دەستی لەگەڵ چوار ئەفسەرە شەهیدەکە هەبوو بێت!

دەیانگوت شێرزاد زۆر لەو قسەیە تووڕەببوو، لە بەر خۆیەوە گوتبووی:

نا دەستی لەگەڵ هەر چوار پێیەکەی تۆ هەبوو.

من جاری یەکەمم بوو پێشمەرگەی ئیسلامی ببینم، ئەو سێ چەکدارە پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامی بوون، دوای رۆیشتنیان ئەبوو راستی گوتی:

هەر دەڵێن ئەسحابە نەماون، خۆ بە چاوی خۆتان ئەسحابەتان دیت.

ئەحمەد عەرەب هەڵیدایێ:

ئەسحابەی پێشمەلگە ها ها...

ئێمە تەواویێك دوای رۆیشتنی ئەسحابەکان بەڕێکەوتین، بەڵام بە ڕێی ئەوان نا، هێندەم ئاو خواردبۆوە مەگەر هێسترەکە هێندەی خواردبێتەوە، تەنگەم وەك تەنگەی وی لێهاتبوو، نازانم کێ بوو ناوی لەو دۆڵە نا دۆڵی سێ سەحابە، بەڵام من هەر بە دۆڵی تووتڕك ناوم هێناوە، دەزانی لەوێ چەند تووتڕکم خوارد، ئەوبەری چەم تووتڕکی رەش، بەرەکەیدی تووتڕکی سوور، پێدەچێت رەشەکەیم پتر خواردبێت، چونکە ئەحمەد عەرەب دەیگوت:

پێش ئەوەی توو بخۆیت، رەنگت روونتر بوو.

تۆپ هاشەی دێ، لوورەی دێ بە سەرماندا...

-٣٥-

کەسێك لە ناوسەرمدا دەیگوت:

شەوەکەی وابوو

بە دنکە شخاتەیەك

دنیا هەمووی بە تەڕ و وشکیەوە

ئاگری دەگرت و دەبووە سووتوو...

دەمێکە ئاقاری دۆڵی سێ ئەسحابەمان بڕیوە، هەوکە پێدەشتێك دەبڕین، هەرچی جاش و سەربازی سەدام هەیە چادری لێهەڵدەن پڕ نابێتەوە، پێدەشتێك لە چاوی منەوە لە دەشتی هەولێر بێ کۆتاییتر، خەریکە تاریکی دەگات و پێدەشت لوولماندەدا، بڕۆ هەر بڕۆ، کێ دەزانێت ئێستا چ کاتی شەوە! برسین، تینووین، ماندووین، لە سەریشمانە بڕۆین، سەرباری ئەوانەش جگەرە قەدەغەیە، دەڵێن ئەو بەر و ئەم بەرمان مۆڵگەی جاش و سەربازانە، دنکە شخاتەیەك ئاگری جگەرەیەك ڕێك یەکسانە بە مردن، لەوەیان ڕۆژ لە شەو خۆشترە، شەوی وا تاریك نەبووە و نابێتەوە، پەنجەیان بخستایەتە چاوتەوە نەتدەدیت.

چەند دەمژمێرە یەکێ و بێ پشوو بە ڕێوەین، هێند تەڕین هێند تەڕ، لە زێشمان هەڵکێشن وا تەڕ نابین، سەیرە لەشی مرۆڤ ئەو هەموو ئاوەی تێدایە، ئەو هەموو خوێیەی تێدایە، ئەوە لە کەیەوە ئاو و خوێ دەردەدەین، لەشمان چکی نەکرد، چ ئارەقەیەکم بەو ڕێیە پێدەشتیەدا ڕژاند، بەو شەوە گەلاوێژیەدا ڕژاند، ژوورە لاچەپەکەی دنیاش هێندە ئارەقەیەی لێم وەرنەگرت، چەند ماندووم، خوداوەندی ماندوویتی کەمێك ماندوویتیم لێوەرگرەوە، چەند تینووم، خوداوەندی ئاو، مەتارەیەك ئاو بنێرە، چەند برسیم، خوداوەندی نان، نان بدە، یەك نوردووە نان، جگەرە جگەرە، چایە چایە...

تا ئەوپەڕی بێزاری بێزارم، هەڵە بووم، پەشیمانم، من و پێشمەرگایەتیان نەگوتووە، بەس ئەو جارە تیانەچم، مەرج بێت چارەیەکی خۆم بکەم، بەرەو لایەك سەرهەڵدەگرم، لایەك نە پێی پێشمەرگەی بگاتێ نە هی جاش و سەرباز، تەواو دەبێت ئەو شەو دوا شەوی پێشمەرگایەتیم بێت، لە بیرمە ئەوها بیرمدەکردەوە، لەبەر خۆمەوە ئەو قسانەم دەگوتەوە، گوێم لێبوو گوتیان:

ئەوە ئاوە...

ئۆخەیش، جۆگەلەیەکی فێنك لە تاریکایی ژیان بە ناو ئەو هاوینە

گەرمەدا نەرم نەرم ڕێـدەکات، هەر بە سـەر پێـوە تـا مرپـووین لێمـان خـواردەوە و مەتارەمـان پڕکـرد، ئەگەر نـانێکیش دەبێـت پێشـمەرگایەتی ناخۆش نیە و پەشیمانم لە پەشیمانبوونەوەم، هەندێکیـدی ڕۆیشـتین، گـوێم لێبوو گوتیان:

ئێرە خراپ نیە بۆ پشوو.

ئۆخەیش، دانیشتین، جگەرەیەکم دەرهێنـا و بە دنـکە شـخاتەیەك گـڕم لەو تـاریکیە بەردا کە نـازانم لەکەیەوە ئـێمەی قووتـداوە و نامـانهێنێتەوە، هێشتا دنکە شـخاتە نەکوژابـۆوە، سـێ چـوار کەس دەتگـوت لە یەکتریـان گیراوەتەوە، هاواریانکرد:

کوڕە بکوژێنەوە ئاشکرا دەبین، ئەدی ئەوە ڕەبیە نیە لەو سەرە!

چ بزانم لەو سەرە ڕەبیە هەیە، من وا تێگەیشتم ئێـرە لاچەپە و دوور لە چاوانە و تایبەتە بە جگەرەکێشان، ترسام زۆریش ترسام، ڕەنگە ترسانەکەم پتـر لەوەو هاتبێـت کە بە هـۆی مـنەوە تووشـی بەڵایەك بـین، بە بێـدەنگی سەرکۆنەی خۆم کرد، هەر دەستبەجێ جێگەمان گۆڕی، باش بوو لە هـیچ لایەکەوە تەقە نەهات، هیچ ڕووینەدا، لە پاڵ چەند تیشە بەردێك پشووێکی باشـمان دا، چەنـد جگەرەیەکـم لە تـاریکی پێچـایەوە و ئەو چێـژەی ئەو شەوە من لە جگەرەم وەرگرت مەگەر ژن و پیاو لە یەکتریان وەرگرتبێت.

بـڕۆ بـڕۆ تـا شـەو شـەوە هەر بڕۆ..هێشـتا دنیـا ڕوونـاك نەبـۆتەوە، وا لە جادەیەك دەپەڕینەوە، نـازانم کـوێیە، ئەوەی دەیـزانم مەنزڵمـان جـێگەیەکە (بەرەکە)ی ناوە و ناشزانم لە کام بەرە، کەوتۆتە بەری چەپ، ڕاست...

لەو بەرەبەیانە لە دنیایێ تەنها تۆپ و پێشمەرگە بە ئاگان.

**شەڕ، شەڕ**
**لە کەلێنی شەڕەکانەوە**
**شەڕ شەڕ راودەنێ**
**شەڕ سواری سەری شەڕ دەبێ.**

حەمە سوور نوقڵانەی لێدابوو، دەبوو شەڕی سێیەم رووبدا، هەر لە یەکەم شەڕەوە گوتی:

لە منی وەرگرن، هەتا سێیەم تەواو نەکات، دڵی داناکەوێت.

پرسیان:

بە چی دەزانی؟

گوتی:

دەڵێی لەگەڵی نەژیاون، هەرکاتێک شەڕێك بکات، نایەڵێت حەفتە وەرسووڕێ، سێیەمیشی بەرپاکردووە.

حەمە سوور درۆی نەکردووە، هەر من تا ئەوانیدیش دوای بە بیرهێنانەوە گەیشتنە ئەوەی کە ئەو پیاوە یان شەڕ ناکات یان کە کردی سێ شەڕی لە سەر یەکدی لە یادەوەریمان تۆماردەکات، شەڕی یەکەم لەگەڵ من بوو کە ئێستا هیچیم لە یاد نیە و وەك گوتیشم رەنگە من لەو شەڕەدا دەستپێشخەر بووبم، شەڕی دووەم لەگەڵ حەمە ریش ئەو پیاوەی ئازایانە ئاشبەتاڵی راگەیاند، شەڕی سێیەمیش کە رەنگە حەفتە وەرنەسووڕابێتەوە وا ئەحمەد عەرەبی گرتەوە، بەو سبەینێیە کە وەك دەڵێن هێشتا خێر و شەڕ دابەشنەکراوە، ئەو دوو پیاوە وەها بە قسە تێکگیراون، هیچ رێیەکی ناوبژی لەوێ ناکاتەوە، خۆزی لەو شەڕەدا گوێتان لە قسەکانی ئەحمەد عەرەب دەبوو، خۆزگە لە سووچێکەوە تی چاوێکتان لێی دەبوو، کوردی و عەرەبیی بە شێوەیەك تێکەڵ کردووە، هیچ کام لەو دوو میللەتە زمانی خۆیان ناناسنەوە، ئەحمەد عەرەب شین و مۆر

هەڵگەڕاوە، ئەبوو راستی پتی لێدەی دەتەقێ و هەزار وەحشی لە دەو دەرچووە، گوێم لە ئەحمەد شاهێن بوو دەیگوت:

بێ قەزابیت، هەر هەندێکی لێبگرەوە لێ، دنیا پڕ لە وەحشی بوو.

ئەبوو راستی پڕتری دەکرد، باش بوو ئەحمەد عەرەب نەرمی کێشا، دەنا زۆر نەما بوو بگاتە چەك راکێشان، شەڕەکە لە سەر چی بوو؟ هی خۆمم زۆر لە بیرماوە هەتا هی ئەحمەدم لە بیر مابێ! بەڵام رەنگە ئەبوو راستی هەڵیگیرساندبێت، چونکە ئەحمەد عەرەب بێ گێچەڵ بوو، نەك هەر شەڕفرۆش نەبوو، لەبەر شەڕیش دۆلاودۆڵ هەڵدەهات، لەگەڵ ئەوەش دوور نیە من هەڵەبم و ئەبوو راستی گێچەڵی نەکردبێت و تووش بووبێت.

لە بیرم بێت شەڕی سێیەم هەر لە یەکەم (وەحشی)یەوە تا دوا (وەحشی) بە دەم رۆیشتنەوە بوو، جاروبار هەڵوەستەیەکی تێدەکەوت، دوای دامرکاندنەوەی شەڕ، حەمە سوور سەری نایە بن گوێم:

+ ئیدی شەڕ تەواو.

- یانی پشتی لێبکەینەوە؟

+ ئا ئا، سێی خۆی تەواو کرد.

- ئەدی ئەگەر گێچەڵی پێبکەین؟

+ هەرچی لێبکەیت شەڕناکات، تا قۆناخێکی نوێی شەڕ، شەڕ نەما.

تۆپ، ئای تۆپ چۆن تۆپتۆپانێ بە ئەندێشەمان دەکەیت...

-٣٧-

**پیاوێك پێدەچوو لە خەوزڕانەوە هاتبێ:**
**ئەو هەموو چاوگەرمکردنە لە ژیان جێگەی نابێتەوە**
**هەڵیگرە، هەڵیگرە**
**هەرچی خەوە بۆ مەرگ هەڵیگرە**
**لەوێ، لە مەرگ**
**هەرچی بێ خەوی هەیە لە بیرتدەچێتەوە.**

ئێره ئاقاری بەرەکەیە، لە دەو چەمێکی پڕ لە داروبار بارەگایەکی دە پازدە کەپری لە ئابی ساڵی ئەنفال هەڵیداوە، ئەو بارەگایە پێشمەرگەی لە سەر دەڕژێ، ئێمەش تێپژاین، چێشتانە وەرگەڕاوینەتە سەر هێلکەورون، باش بوو هێلکە لە مشە بوو، لەو لاوە پێشمەرگەیەکی نانەوا ئازا ئازا نانی پێوەدەدا، بەلام پێڕا نەدەگەیشت، چ نانەواخانەیەك بە پێشمەرگەی ماندوو رادەگات، لەو جەمە ناوەختە بە هەرمێنترین چایخانە بە درێژایی رۆژێکی ڕێك هێندە چایەی لێنەخوراوەتەوە، ئای چایەم خواردەوە..

ئاسمانی ئاقاری بەرەکە چۆلەکەی لێ دەبڕێ، بەلام فڕۆکەی لێ نابڕێ، رەوە رەوە دێن و دەڕۆن، هاتن و رۆیشتنێکی پڕ لە دەنگ پڕ لە ئاگر و دووکەڵ، هیچ فڕۆکەیەك نیە رێی بەو ئاسمانە کەوتبێت و زرمەیەکی لێوە نەهاتبێت، جووتیارێکی ئەو ناوە دەیگوت:

خاکی بەرەکە کەڵکی کێلانی نەماوە، هەمووی ناپاڵمە، هەمووی ئاسنرێژە.

ملازم وشیار دەیگوت:

کە دەڵێی بەرەکە، واتە بەرەی پێشەوەی شەڕ، بۆیە بیر لە خەوتن و خۆشووشتن مەکەنەوە.

ملازم کارزان رەنگە لە وەلامی ئەو قسەیە بووبێت، گوتبووی:

پێشمەرگە بە لوولەی تۆپیشەوە بەسترابێتەوە، ناتوانێت بیر لە خۆشووشتن و خەوتن نەکاتەوە.

بەلام مام رەسووی بناوێ جارێك بە گوێی خۆم گوێم لێبوو گوتی:

لەو رۆژەوەی دەبیتە پێشمەرگە، هەولدە خەوتن لە بیرخۆت ببەوە، خۆشووشتنیش بە هەند هەڵمەگرە، ئەگەر وا نەکەیت دڵنیابە نایگەیەنیتە سەر.

پێدەچوو بارەگا کەپریەکە نزیك بێت لە بەرەی پێشەوەی شەڕ، وەك دەیانگوت جاش و سەرباز هەر لە بن پاڵمانن، لە هەموو لایەکیشەوە، لە عەرد و ئاسمانەوە تۆپ دەهات، کۆپتەر لە سەر بەرزاییەکانەوە، لە

ئاسمانێ گەمەی دەکرد، خۆی دەهاویشتە سەر تەنیشتان، کلکی بڵند و نەوی دەکرد، لە جێی خۆی رادەوەستا، بەرز و نزم دەبۆوە، لەو ئاقاری شەڕە لە بەدبەختی خۆم، من لە دنیایێ حەزی دنیام لە دوو شت بوو، دوو ئارەزووم هەبوو، ئەوانیش خۆشووشتن و خەوتن...

ئای بۆ پەنایەك مەنجەڵە ئاوێکی گەورە بخەیتە سەر ئاگرەوە، پەنایەك لە هیچ لایەکی دنیاوە نەبینرێ، دووکەڵی نەبینرێ، ئای بۆ یەك سەلکە سابوون، تۆ وەرە لەو بارەگایە گەورە لەتە سابوونێك دەستنەکەوێ، تا چلکی حەفت رۆژەرێت لێداماڵێ، هەر چۆنێك بوو خۆم هاویشتە گۆماوێکەوە و چەند دەستێك قوڕە سوورەم لە خۆم دا، کەمێك لە باری لەشگرانیەوە هاتمە سەر باری لەشسووکی، ئای بۆ خەوێك، خەوێکی قووڵ، قووڵتر لەو دۆڵانەی لە گارەوە تا ئێرە هاتنە رێ، خەوێکی درێژ درێژ لێرەوە تا دەو زێ، بەڵام ئەو خەوە دوورترە لە خەونی کودەتا، کودەتا بە سەر بەغدا و شەڕ، رەوە فڕۆکە و کۆپتەر دێڵن چاو گەرم بکەیت، تۆپ تۆپ ئەو تۆپانەی مردوو لە گۆڕدا رادەچڵەکێنن، لێدەگەڕێن سەر خەوێك بشکێنم، لەگەڵ ئەوەش من بۆرژام، ئەگەر بە دزیی زرم و هۆڕی زەوی و ئاسمانیشەوە بووبێت تاوێك چوومە خەوەوە، خەوێك بایی کورتیلە خەونێك و تەواو، بەڵام کورتیلە خەونی من دیتم رۆمانێکی خەوناویی خستۆتە سەرمەوە، رۆمانێك رەنگە لە ساتەکانی خەرەفاوی بینووسمەوە، لەو کورتیلە خەونە، دیتم کەسێك لە سەر سەرمە بانگم دەکات:

شوانە، شوانە، ئەگەر چاو نەکەیتەوە نامبینیت، نامناسیتەوە من سیامەندم.

ئۆی سیامەند، دوای ئەو هەموو ساڵە، دەنگت، دەنگی ناو خەونەکە هەر لە گوێمە، لەو کاتەوە تا ئێستاش خەون بە خەونێکی واوە دەبینم، لەو کاتەوە تا ئێستا وێنەی ئەو راوەستانە هەر لە چاومە، راوەستانی ناو خەونەکە، سیمات لە بیناییم ناسڕێتەوە، بە هی ناو خەونەکەشەوە کە جیایە لەوانیدی، لە هەموویان پێکەنین دەبارێ، کێ هەیە سیامەندی دەرەوەی

پێکەنینی دیتبێت، سیامەندی دیتبێت بە گرژی، جگە لە من ئەویش لە خەونی بن کەپری دەو چەمەکەی ئاقاری بەرەکە، لەو خەونەدا سیمای سیامەند چەند ژاکا بوو، قەت قەت سیامەندم وا بە کزی نەدیتبوو.. .لەبەر خاتری سیامەند بەئاگاهاتم، تایبەت بۆ بینینی سیامەند چاوم کردەوە، دەنا وەها نەچووبوومە خەوێ وەها نەمردبووم بە بانگکردنێك زیندوو ببمەوە...

هەر ساڵ و شتێك دەبوو سیامەندم دەناسی، ساڵێکیش دەبوو نەمدیتبوو، بەڵام کو اقووڵبوونەوەی برادەرایەتی بە کاتەوە بەندە، کەس نیە هەر لە یەکەم دیدار و دانیشتنەوە سیامەندی نەچووبێتە دڵەوە، بەڵام رەنگە کەم کەس هەبووبێت بە وێنەی من سیامەندی خۆشویستبێت، سیامەند لە فەیلیەکانی بەغدا، بوو لە رقی ئەو (تەعریب)ەی وێرانی کردبوو، خۆی دەیگوت وێرانی کردووم، لە رقی ئەو وێرانیە خۆی فێرە کوردیەکی هەند ناسك کردبوو کەس نەبوو خۆزگەی پێنەخوازێ، راستی نازانم بۆچی سیامەندم خۆشدەویست.

چاوم کردەوە و هەستامەوە و گەڕام کەپر کەپر گەڕام لە دوای سیامەند دەگەڕام، نزیك لە دڵنیایی دڵنیابووم لەوەی سیامەند لەو بارەگایەیە، ئەو خەونە لە خۆڕا نیە، پرسیارم کرد، پێش خەونەکەش لە یەك دووانێك پرسیاری سیامەندم کرد، بەڵام وەڵامەکەیانم بە دڵ نەبوو، دوای خەونێ لە زۆرم پرسی:

+ کوا سیامەند، لە کوێیە سیامەند؟

- لێرەیە، ئەویش سەر بەو بارەگایەیە بەڵام دەرچووە، دێتەوە.

شەو و رۆژێك لە ئاقاری بەرەکە مامەوە، سیامەند نەهاتەوە، نەمدیتەوە، دواتر دەمگوت:

باش بوو نەمدیتەوە دەنا کەسەری گرانتر دەبوو.

حەفتەیەك بە سەر خەونەکەم نەسووڕایەوە، من لە کانی تەلان بووم، هەواڵ هات سیامەند شەهید بوو، بە ژەهری مار شەهید بوو، لە سەرهاتی ەرد و بەرد لە هەورێوە بۆ قەندیل) سەرهاتی سیامەند و مارم

گێـڕاوەتەوە، لە سـەد سـەرهاتیدیش بیگێـڕمەوە تەواو نابێـت و درێـژەی دەبێت.

تۆپ، فڕۆکە، کۆپتەر لە هەموو لایەکەوە ئاگر.

-٣٨-

با گوتی:
گەشتی ئەو لێژاییە سەختە
بەڵام تا سەر لەگەڵم بە
لە بیرت بێ گفتی خۆتە...

بەیانی دابوو نەدابوو هێشتا زۆری دنیا هەر لە خەودا بـوو، خۆمـان کـۆکردەوە، هـێ لە دەسـتە پێرسـیەکەی و ئەو کـوڕەی لە مـاڵی عەلـی رەزگەوە بەگەڵ کەوت، چەند پێشمەرگەیەکیدیش بەگەڵمان کەوتـن، بـێ ئەوەی سیامەند ببینم بارەگـا کەپـریەکەی ئاقـاری بەرەکەمـان بەجێهێشـت، ئێسـتا کە چێشـتانێکی درەنـگە وا بە هەورێـدا هەڵـدەگەڕێین، رۆژێکـی گەرمە، مەتارە خۆی راناگرێ، رێگەیەکی بێ ئاوە، وا بڕوا تینوێتی کـاری خـۆی دەکـات، ملـی هەورازەیەکمـان گرتـووە هێنـدە سـەخت نـیە، بەڵام پێناچێـت سـەری هەبێـت، لەو هەورازەیە گرتەیەکـی وام لە چاودا نەمـاوە حەز بە نیشاندانەوەی بـکەم، جـگە لە گـرتەیەك، ئەویـش مـلازم وشـیار و کەو نیشاندەداتەوە، ئەو ئاقارە کەوی زۆر بوو، وێدەچێ ئێرە کەوبوار بـێ، کەو بێرەدا گەرمیان و کویستانێ بکەن، وابزانم کابۆکیشیان تێدا بوو، پـۆل پۆل لە شەقەی باڵیان دەدا، ئەوجـا لە باڵـدانیان چ دەنگێکـی لێـوە دەهـات، ئەوانەی یەکەم جاریـانە گوێیـان لە شـەقەی بـاڵی کەو دەبێـت، قەت باوەڕناکەن لە باڵی باڵندەوە دەنگـی ئەوهـا هەیە، سـەیرە ئەو هەمـوو کەوە چۆن لەو ئاقارەی شەڕ دەحەوانەوە، ملازم وشیار، ئەبوو راستی گۆتەنی:

ئەوە هەر بۆ ئەوە بوو، ملازمایەتی خۆی نیشانبدا.

دەستڕێژێکی هاویشتە ئەو پۆلە کەوەی کە بە سەرمانەوە هەستمکرد بۆ ساتێك تەنکە سێبەرێکی جوانیان لێمانکرد، دیتم کەو لە ناو پۆلی کەوان کەو کەو بەردەبنەوە، یەك دوو، پێنجم ژمارد، لەو ساتانە نازانم بۆ دەتگوت پەنجەی هەڵوەریوی خۆم دەژمێرم، من بەو رادەیە باڵندە پەروەر نەبووم، هەتا لە ئاست مەرگی پێنج کەو وا خەم دامبگرێ و هەڵوەرینیان لە ئاسمانەوە بە هەڵوەرینی پەنجەکانی خۆم بچوێنم، بەڵام وا کەوتەوە، بەربوونەوەی یەك لە دوای یەکی کەوەکان منیان خستە بارێکی واوە، ئەگەر خۆشیم بە ملازم وشیار نەهاتایە دوور نەبوو تووکی مەیلەو مەحویانە بکەم:

هەر کەسێ کەو لە پۆلی کەوان هەڵدەوەرێنێ، خودایە یەك یەك پەنجەکانی هەڵوەرێنێ. ٠

بەڵام دڵم نەهات، نەك تووکی ئەوها زۆر سووکتریش لەوەی لێبکەم، من ئەو ملازمەم خۆشدەویست.

ئێرە سەری هەورێیە، دەڵێن لە وەرزی هەوران سەری هەورێ لە هەورە و یەك پارچە تەمە، من ئەو جارە لە وەرزێك گەیشتمە سەری هەورێ، هیچ جێگەیەکی ئاسمان هەوری پێوە نیە، ئای بۆ تیلمە هەورێك ئەگەر داشنەکات خۆ هەواڵی ئاوی پێیە، هەواڵێك دەڵێت: ئاوتان لەبیر نەچۆتەوە؟ ئای لەو هەورێ وشکە، قەت هەورێم بەو وشکیە نەدیتبوو، ئەو جێگەیەی هەورێ کە ئێمەی لێ کەوتبووینەوە، چ لە چیا نەدەچوو، بیابانیش هەر هێندە گەرم و بێ ئاوە، نا، نابێت ئەو گەرمیە هی هەورێ خۆی بێت، هەبێ نەبێ شتێك هەیە، کانیەکانی هەورێ هێندە لێکدی دوور نین، مەتارە تامی ئاو لە بیربکات، لەو خۆ گنخاندن و نەڕۆیشتنە شتێك هەیە، دەمێکە گیرۆدەی ئەو جێگەیەین و لێی نابینەوە...

هەورێ بە دیوی بالیساندا ئەو ئاخر زەمانەیە کە سەری قسە و بنی قسەی مەلاکانی هەولێرە، نازانم نە تەمە نە دووکەڵە لە دۆڵەوە بە بەژنی هەورێدا هەڵدەگەڕێ، دێ دێ سەری هەورێ دەگرێ، یەك زرم و هۆڕ و

هەرایە دەڵێی هەرچی بەردی چیای دنیا هەیە، لە ناو خۆیان کەوتوونەتە شەڕ و خۆ بە یەکدا دەدەن، ئەوە جاری چەندەمینە دۆڵی بالیسان بە مەرگ دەچێت، بالیسان رەنگە بە قەد سەد گوند گیانی هەبێت، هەر دەیکوژن و زیندووە، بە خنکان دەیخنکێنن و هەر زیندووە، ئای دۆڵی بالیسان تۆپی گرتۆتەوە، ناپاڵمی گرتۆتەوە، بەرمیلە کیمیای گرتۆتەوە، هیچ جێگەیەکی دنیا لە هیچ شەڕێکی هەرێمی و جیهانی بەو سەختیە بریندار نەبووە کە بالیسان بریندارە، لە بەر خۆمەوە دەمگوت:

دۆڵ خنکا، بالیسان خنکا، ژیان خنکا...

ملازم وشیار پێدەچوو گوێی لەو هەموو (خنکا)یەی من بووبێت، گوتی:

هەرچی کیمیای دنیایە لەو دۆڵەی رووکەن، بالیسان ناخنکێ، لەگەڵ کیمیا راهاتووە.

ئەبوو راستی هاتە ناو قسانەوە:

ناخنکێ چیە، بە خودای سەگەنازی دەگاتێ.

ئیدی هەموومان لەوە کۆك بووین کە بالیسان و دۆڵی بالیسان لە کیمیادا هەناسە وەردەگرن و دەدەنەوە، مەنزڵی ئێمەش جێگەیەکە لەو دۆڵە، لە بەرزایی ئەو دۆڵە، جێگەیەك (کانی تەلان)ی ناوە.. ئای گەرمە، ئێرەی هەورێ گەرمە، هەورێ هەرگیز هێندە گەرم نەبووە، رەنگە گەرماییەکە لە وشکیی مەتارەوە هاتبێ، کێ لە بیریەتی لە کەیەوە مەتارەی ئێمە بێ ئاوە، خودای ئاو، چۆڕێ تەڕایی، بایی لێو تەڕکردنێ، یان گەرمایی هەورێ لەو هەموو دووکەڵ و ئاگرەوە هاتبێت کە نازمێردرێ، ئەوڕۆ هەورێ، هەردوو دیوی هەورێ بە هەردوو دۆڵەوە بالیسان و هیران و نازەنینەوە لە چەند جێگە ئاگریان گرتووە و دووکەڵ بەری ئاسمانی گرتووە، بەری چاوی دنیای گرتووە و نایبینن، بەس ئەوجارە تینوێتی نەمکوژێت مەرج بێت هەمیشە سێ مەتارە ببەستم، لە بری مەخزەنی فیشەك مەتارە مەتارە.

لە بن چەند بنەدارێکی سووتاو دانیشتبووین، کز کز لە هەتیوەکانی دنیا کزتر، هەر هێندەم زانی بووە قڕەقڕ، کێ لەگەڵ کێ، یەکیان ئاشکرایە کێیە پرسی ناوێ ئەبوو راستیە، ئەویدیش ئەحمەد شاهێن، دەمەقرێیەکی گەرم، گەرمتر لە گەرمای هەورێی ناو ئاگر و دووکەڵ، بەڵام دەتگوت دەزانــن کەس نــاوبڕی ناکــات، پەلامــاری یەکتریــان نەدەدا، ئەگەر یەکتریشیان بکوشتایە کێ توانای ناوبژیکردنی مابوو، تینوێتی پرزەی لێ بڕیبووین، لە بیرمە لەو ساتانە بابی ئەوە تینی قسەم لە لێودا مابوو بە حەمە سوور بڵێم:

ئەدی نەتگوت، شەڕ تەواو، دیارە شەرتی پیاوان لە سێوە بۆتە چوار!

حەمە سوور کە لە تینوێتیدا لە سووریەوە گۆڕابوو بۆ قاوەیی، گوتی:

نــا، هەر تەواوکەری سـێیەمە، دیـارە شــاهێن و عەرەبــی هەر بە یەك ئەحمەد داناوە.

شەڕ لە سەر چیە؟ گوێم لێیە ئەبوو راستی دەڵێ:

کوڕە هەی وەحشی، بە چاوی خۆت دەبینی کیمیا لە هەمـوو لایەکەوە دادەکا، بچینە کوێ؟ خۆمان دیتیەوە.

ئەحمەد شاهێنیش دەڵێ:

لەوانەیە کیمیا بێت، بەڵام رۆیشتنمان لە مانەوەمان باشترە.

ئەبوو راستی لە چۆکی خۆی دەدا:

ئای لەو مـلازمە کەرە، خـۆ دەڵـێ لەوانەیە کیمیـا بێـت، بەڵام ناهەقـت ناگرم، خۆ لە یەمەن زانستی کیمیات نەخوێندووە.

لە بیرمان بێت ئەحـمەد شـاهێنیش مـلازم بـوو، مـلازم ئەحـمەد شـاهێن ئەوهای وەڵام دایەوە:

مــن نەمخوێنــدووە، بەڵام تــۆ دەرچــووی کــۆلێژی کیمیایــت، بەشــی خەردەل، وا نیە!

ئەبوو راستی هەندێك خۆی خواروخێچ کردەوە:

ئــاخر هەی وەحشــی هێســتر بە هێســترایەتی خــۆی دووکەڵــی کیمیــا دەناسێتەوە، تۆ نایناسیتەوە؟

ئەحمەد شاهێن ئەو کوڕەی لە گەرمەی شەڕ و دەمەقاڵێش ئەو ساتانەی وشەکان هەموویان سیمای جوێن دەگرن و بەرگی تووڕەیی دەپۆشن، ئەو هەندێ وشەی دەهێشتەوە بۆ خۆشی و گاڵتە، گوتی:

دە راوەستە با لەو هێسترە بپرسین، بزانین کیمیایە یان نا، بەڵام تۆ لێی بپرسە، لە زمانی ئێمە تێناگات.

ئەبوو راستی بەوە پتر تووڕە بوو:

وەحشی، ئەو هێسترە بەس لە زمانی ملازمان تێدەگات، چونکە ئێوەی ملازم لە هێستر هێسترترن...

شاهێن بە پێکەنینەوە:

دەی ملازم وشیار کاکە لێی بپرسە.

گرژی نەختێک خاو بۆوە، شاهێن گوتی:

من ناڵێم کیمیا نیە، هەوە هەو، بەڵام کامیان خۆشترە، مردن لە تینویێتی یان بە کیمیا؟! ئەوە ئەحمەد عەرەبیش لەگەڵ بۆچوونی منە کە بڕۆین، ئێمە هەرسێکمان لیژنە نین؟ ئێ، دوو دەنگ لە دەنگێك زۆرترە..

ئەبوو راستی بە تووڕەییەوە:

بە دوو ئەحمەد مێشکی مریشکێکتان نیە، کوڕە هەر هەرچی ئەحمەد هەیە...

رستەکەی تەواو نەکرد، دوایی پێکەوتم، بە بیری هاتبۆوە کە ناوی راستینەی خۆیشی ئەحمەد بوو، بۆیە رستە ترسناکەکەی گیرابۆوە.

لە هەمووی سەیرتر ئەو هەموو مشتومڕە بوو، ئەحمەد عەرەب دەنگی لێوە نەهات، ئیدی ئەحمەد شاهێن سووربوو لە سەر شۆڕبوونەوە، رۆیشتن بەرەو ئاقاری کیمیا، ئەبوو راستیش پێی لە سەری هەووری گیرکردبوو، نەدەبزوا..ئەو برۆین، نەڕۆینە زۆری کێشا، تینوێتیش خەریك بوو کاری خۆی بکات، ئەحمەد شاهێن هەلی تینوێتی قۆستەوە، رووی لە هەمووان کرد:

ئەگەر ناتانەوێت لە تینوێتی بخنکێن با برۆین.

ئەبوو راستی بە دەنگێکی لەو بەرزتر:

ئەگەر دەتانەوێ بکەونە ناو کیمیا و لە ترێ سەی بچن، بڕۆن بەگەڵ ئەو وەحشیە کەون.

ئەحمەد شاهێن بە دەنگێکی لە ئەویش بڵندتر:

دەیخەینە دەنگدانێکی ئاشکراوە، یالا کێ لەگەڵ من دێت بێتە ئەو لایە...

من وا بزانم یەکەم کەس بووم چوومە لای شاهێن، ئاخر رەنگە لە هەمووان تینووتر بووبم، دیتم یەك لە دوای یەك هەمووان هاتنە بەری شاهێن، ئەوەی لە بەری ئەبوو راستی مایەوە تەنها ئەبوو راستی بوو..

ئەبوو راستی سەری بادا و ناولەپێکی لە لا رانی خۆی دا زرچەی هات و گوتی:

هەی وەحشینە یانی بەس من ترسنۆکم، یالا بە دوام کەون، من بۆ ئێوەمە، دەڵێم بۆچی بە پێی خۆمان، خۆمان بخەینە ناو کیمیاوە، دەنا لە ئازایەتی خۆم بە کەس ناگۆڕمەوە، بە تایبەتی بە ملازمەکان...

ئیدی بەرەو دۆڵی کیمیا شۆڕبووینەوە و ئەبوو راستیش لە پێشەوەی هەموومان دەڕۆیشت، یەکپشی بە دوای یەکدا داگەڕاین، هاتین کانی تەلان هاتین.

## کانیەك لە تەلانی دۆزەخەوە

لە تەریفەیی چیا و مەتارە و خۆم، لە سەری هەوریێ، بە دیوی کانی تەلاندا، دیتم هەورێییەك تیچاوێکی لە سەرمانە و دەڵێ:

هەوریێ کوڕەکانی خۆی لە ئاویێ دەکات.

من خۆشیم لەو رستەیە هات، چونکێ تینوێتی وایکرد، رستەکە لە چێوەی ئیدیۆمەکەی دەرهاوێژم و بیخەمە گۆڕایی واتا ئاساییەکەی، دەزانن چەند تینووم! هیچ کەستەکێکی سەر مەچەکی هەوریێ، هیچ زەندۆڵ و قلیشێکی هاوینیانەی سەر شانی هەوریێ وەك من تینوو نیە، لە بەرزایی هەورێوە بە دەم ڕێوە خەون بە زێی گەورەوە دەبینم، ئەو زێیەی پێش چەند شەویێ بەو دوو هێسترەوە لە ئاو تەڕتر لێیپەڕینەوە، هەوکەش چەند هشکین! لە تاشەبەردی هەوریێ هیشکتر، لە هاوین هیشکتر، لە لێوی پیاوی هەورێیی هیشکتر، لە مەتارە هیشکتر، دەی خوداوەندی ئاو، چ لە کن تۆ لە بەری ئەستەم و نەکردەدا نیە، چ دەبێ ئەگەر بەو هاوینە، هاوینێك لە هەموو هاوینان هاوینتر، پەلە هەوریێ بنێری بۆ هەوریێ، بۆ هەوریێ هەر ڕێی هەور ماوە و دانەخراوە، ئای بۆ چۆڕێ تەڕایی بۆ مەتارە! پیاوی هەورێیی دەڵێ:

هەموو هەوریێ بە پەنجە بپشکنن، هێندەی جێ دندووکی پەڕەسێلکەیەك تەڕایی نابیننەوە، هەیە و نیە هەر کانیەکەی کانی تەلانە.

ئەو کانیەی کێ دەڵێ دەیگەیەنێ، وەك دەڵێن هێندە دوور نیە، لێ نزیك لە دڵنیایی دەڵێم لە بنی دنیایە، ئاخر سەرەڕای ترسی ڕێ، ئاگرباران و کیمیاباران، هەر شەقاوێك بە تینوێتی و لە تینوێتی ڕۆژە ڕێیەکە، شامە ڕێیە، پیاوی هەورێیی دەمنادەمێ بە ئاراستەی فریزدا روو وەردەگێڕێ، سەرەتا وام زانی روو دەکاتە رووگە، نا، رووگە کوا لەو لایەیە! ئا، ترس نا، تینوێتی ئەگەر ئاراستەکانی لە بینایمدا تێکەڵ و پێکەڵ نەکردبێ، پیاوی هەورێیی روو لە گوندی فریز قیت دەوستێ، چاو دادەخات، هەناسە لە خۆی دەبڕێ، پیاوێکی درێژ دەڵێی دارتێلە، دەبینم، جاروبار لێو دەجوولێنێ، وا هاتە بەر چاو نوێژ بۆ سەفین دەکات، سەفین بوو! فریز بوو! لە پیاوی هەورێییەوە فێری جۆرە نوێژێك بووم، پێشتر نەمدیتبوو، نەمبیستبوو، تینوێتی نەیهێشت، دەنا وێنەی نوێژەکەم جوانتر و روونتر و ئاوێنەییتر لە هزرم دەنەخشاند، ئەو پیاوە نائاشنا نیە، وێنای دەکەم و نایناسمەوە، پیاوی هەورێیم پێشتر دیتووە، لە کوێ؟ هەر دەبێ لە هەورێ بووبێ، هەورێییەکان هەر لە هەورێ بە هەورێیی دەمێننەوە و خۆ نیشاندەدەنەوە، من پێشتریش هەر بە هەورێیم دیتووە، پیاوی هەورێیی دەڵێ:

هەورێیی نە بە شۆفەر نە بە کیمیاوی لە هەورێ نابێتەوە.

وشەی (شۆفەر) سەرەداوی ناسینەوەیە، ئا، شۆفەڵ نەبا لە تینوێتی هەورێ پیاوی هەورێیم نەدەناسیەوە، ناسیمەوە، ساڵ و نیوێك کەمتر پتر دەبێ، ئەو هەورێییەم دیت لە بەرزایی فریز لە پاڵ بەردێ سەنگەری لە جاش و سەرباز گرتبوو، کە بە دەبابە و شۆفەرەوە سەرەو فریز سەردەکەوتن، شەڕی ئاسمانیشی دەکرد، ناسیمەوە پیاوە فریزیە هەورێییەکەم ناسیەوە، ئەو پیاوەی بۆ پاراستنی فریز شەڕی عەرد و عاسمانی دەکرد، تینوومە توانای گێڕانەوەی شەڕی فریزم نیە، پیاوی هەورێیی بەجێتدێلین، نازانم لە چیدا یەکتر دەبینینەوە، لە ئاو! لە ئاگر! مالاوا پیاوی هەورێیی، پیاوی فریزی.

تۆپبـــارانێکه هەورێ منـــداڵەکانی خـــۆی ناناســـێتەوە، بـــۆ هەر لا سـەرهەڵدەبڕی، دەنـــۆڕی، هەر دووکەڵە دەســـتی دووکەڵـــی لە دەســـتا، دونـدێك، گـردۆلکەیەك نـابینی دووکەڵ بە ئاسـماندا نەکـات، ئاسـمان، ئاسمان! هەرچی فڕۆکەی بەغدا هەیە بە ئاسمان وەربوونە، زنجیرەی چیـای هەورێ دەڵێی هێلی شەڕی جیهانیە، ناپسێتەوە، ناپسێتەوە و ناپسێتەوە، فڕۆکەی شەڕی لێناپسێتەوە، جگە لە سەفینی پێشان سـەر لە هەوری بەفـراوی و ئێسـتا بەژن لە دووکەڵـی شـەڕ، کەس نـازانێ ئەو ڕۆژانە هەورێ سـەری لە سـێبەری چەند فڕۆکە هەڵبڕیوە، چەنـد جـار دڵـی بە تـۆپ و ناپـاڵم ڕاچەنیـوە، هەر سەفین دەزانێ هەورێ لە چەند جێوە سـووتاوە، لە سـەری هەورێـوە کە بە بەژنی دووکەڵاویی سەفیندا دەمڕوانـی، هەورێ هەر لە زارۆی زارەترەکـی سەفین دەچوو، سەفین ئەو ڕۆژانە دایکێـك بـوو منـداڵەکانی بە بەر چـاوی خۆیەوە دووکەڵیان لێبەرزدەبۆوە، ئەو ڕۆژانە چیاکـانی دەوروبەری سـەفین لە چاوی منەوە منداڵی سەفین بوون، ئای بۆ (کانی شیلانە)ی سەفینێ!

ئێمە منداڵەکانی هەورێ، وا بە پێی خۆمان لێژ لێژ بە لێژایـی هەورێ بە دیوی دۆڵی کیمیا، دۆڵی بالیسان لێژدەبینەوە، تینوێتی، تینوێتی! کانی تەلان لە کوێی! دەستەیەك پێشمەرگە لە هیشکترین هاوینی هەورێ، لە گەرمترین هاوینی هەورێ، کانی تەلان، تینوێتی هەڵیگرتووین و هـاتین، نـاگەڕێینەوە، لە هیچ نـاپرینگێینەوە، لە کیمیـا، لە ئـاگر، لە گـوللە ناسـەنگرێینەوە، کـانی تەلان، ئەگەر کەوتبـیە تەلانـی دۆزەخیشـەوە، دێـین و دەتبینیـنەوە، کـانی تەلان، دەرکەوە، پێشمەرگە شایانی ئەوە نیە تینوێتی بیکوژێ، چ بەرەواژیە مەرگ لە تینوێتی، نا، نابێت تینوێتی بمکـوژێ، دێـم، کـانی تەلان، لە بـن بـاڵی کـۆپتەر و سیخۆشـدا بیـت، ڕێـك لە نـاو دووربینـی ئـامۆزاکەی سەدامیشـدا بیـت، ڕێـی تـۆم گرتـووە و نـاگەڕێمەوە، هـاتووم و گەرمـایی هاوینێکم ڕاگرتووە، ماندوویتی هەمـوو نشێو و هەوراز و ڕاز و باسـک و تەلان و هەڵـدێر و دۆڵ و کەنـدانم هەڵگرتـووە، بـایی هەورێـك ئـارەقەم ڕشتووە، تینوێتی هەورێم چەشتووە.

کـــانی تەلان، دەرکەوە، زارت بـــکەوە، هێشـــتا بـــۆ ئاســـمان نەنووشتاومەتەوە بۆ تۆ دەنووشتێمەوە، ئەوەتـا دەمـم هێنـا، هێنـدەی حەفـت هێستر دەخۆمەوە، زگاودەبم، دەکەوم، توانای جگەرەکێشانم نـامێنێ، ئێسـتا مردن هەقە و ناهەق نیە، با گوللەیەك بـێ و لە دەو ئـاو سـاردمبکاتەوە، بـا کیمیا بێ و لە دەو ئاو هەناسەم لێببڕێ.

وا بزانم کەوتبوومەوە باری وڕێنەوە، رەنگبێ هەر بە ڕێـوە خەوتـبم و خەونم دیتبێت، کانی تەلانی چی! هێشتا زۆر ماوە، رێی دوورمان لە پێشـە، رێی پڕ گێرمە و کێشە، کێشەی زەوی و ئاسمانی.

نازانم چەندی برد، نازانم گەرما و تینوێتی چیان پێمکرد، نـازانم چەنـد تۆپ لێـرە و لەوێ کەوتەوە، نـازانم لە چەنـد جـێ ئـاگر کەوتەوە، نـازانم بگرەوبەردەی پێشمەرگە چۆن کەوتەوە، دەزانم لە پڕ بە سەر کانی تەلاندا کەوتینەوە.

ئۆخەیش! ئەوە ئاوە، ئاو چ ئاو! لە قەندیلیش ئاوی وا شیرن و سـاردم نەخـواردۆتەوە، چ کـانیەکە کـانی تەلان، چ پەڕجـووێکە کـانی تەلان! لە دۆزەخی هەورێوە کانیەکی بەفراویی بەهەشتی بـۆ پێشـمەرگە هەڵـدەقوڵێ، کانی کەوتۆتە تەلانێـك هەر بـزن و پێشـمەرگە زاخـدەکەن خـۆی لێـدەن، کانی تەلان بە داروبارە، دار هەنجیرێك زوو جێیەکـی لە سـێبەرەکەی بـۆم کـــردەوە، ئێســـتا لە وەرزی هەنجیـــردا مێـــوانی دارهەنجیرێکـــی زڕم، نیوەڕۆیەکی درەنگ یان دەمەو عەسرانە، برنج و شلەیەکم خـوارد لە هـیچ چێشتخانەیەکی هەولێر چێشـتی وا بە تـامم نەخـواردووە، دایکیشـم برنجـی وای لێنەناوە، بخۆ بخـۆ لە تێـری بخـۆ، هێسـترەکەی عەلـی کوتـك هێنـدە ئالیکی نەخواردووە، ئەوەتا لە خوارەوە لە گۆڕاییەك کە هەر هێندەی جـێ کەپرێکی گچکە دەبێ جـۆڕکێکی گەورەی بە سـەرەوەیە، عەلـی کوتـك دەست بە یال و بژیدا دێنێ، نۆرەی چایە و جگەرەیە، ئێستا هـاتمەوە سـەر خۆ، ئێسـتا هەسـت بە مەترسـی فـڕۆکە و تەقە و ئـاگر دەکەم، لە عەرد و ئاسمان گرموهۆڕە، بارەگای کـانی تەلان پـڕە لە واتە وات و هـاتە هـات،

دارماڵە لە وردە سەرهات، سەرهاتی ئاوی، سەرهاتی ئاگری، مـن لە بـاری دەروونیی گرژەوە چەند رۆژێکی کەم لەو دەو کانیە مامەوە، بۆیە کەمێـك لە سەرهاتەکانی بن کەپر و بن درەخت و بن تاشەبەرد و رێـگە بزنیەکـان و ئاقاری کانی تەلانم دیت و بیست:

**بەزمی ددان**

عەلـی کوتـك لە کـاتی سـەرکەوتنەوە کە رێ بە سـەر هەڵـدێرەوەیە، هاواردەکات:

کوڕە بگەنێ، قەوما،

چ بوو، چ قەوما؟ ترسام شتێکی ترسناك قەوما بێـت، تەماشـادەکەین بە پێوەیە و نەکەوتووە، پێشمەرگەیەك گوتی:

+ ها، هاوڕێ  مام عەلی چ قەومایە؟

- ددان، ددانەکانم کەوتن و غلۆربوونەوە.

ددان! نەمزانیبوو، ددانەکانی مام عەلی هـی خـۆی نـین و تـاخمن، یەك دووانێك شۆڕبوونەوە، بە دوای ددانەکانی مام عەلیدا دەگەڕێن، پێنـاچێ لە ناو ئەو پووشوپەلاش و دڕکـوداڵە دیتـنەوەی ددان ئاسـان بـێ، مـام عەلـی دەڵێ:

کوڕە باش بگەڕێن، لۆم بیبنەوە دەنا لە برسان دەمرم.

زۆری پێچوو نەیاندیتەوە، مام عەلـی وا تێگەیشـت بـاش لە دوای ددانە بزربووەکانی ناگەڕێن، گوتی:

دەیبینەوە بیبینەوە، دەنا خۆم رادەست دەکەمەوە و جاش و سـەربازتان بە سەر وەردەکەم!

لە ناو تریقانەوەی پێکەنیندا ددانە خۆڵاویەکانیان بـۆی هێنـایەوە، جـوان شووشتی خستیە زاریەوە و گوتی:

نەمگوتبا حکومەتتان بە سەر وەردەکەم، نەتاندەدیتەوە.

بە زمی ددان بۆ ماوەیەك ترسی فـڕۆکەی لە بیربـردینەوە، بەزمـی ددان

یەکەم بەزمی بارەگاکەی کانی تەلانە کە لە یادەوەریی مندا مابێتەوە، بەزمی ددانی ئەو پیاوەی دەمێکە بە خۆ و چوار پێنج کوڕ و کوڕەزاوە، بە چەکەوە وا بە چیاوە...
بەزمی لووشکەش لە بیرناچێتەوە.

## لووشکەیێ لە پەنهانەوە

پێشمەرگەیەك باشە ناویم لە یاد نیە، دەنا پیتی یەکەمی ناوەکەیم دەنووسی، ئێوارە تا نووستیش هیچ بەڵای نەبوو، لە من قیتتر وجوانتر دەڕۆیشت، ڕۆژ بۆوە، لاقێکی لە دووی نەدەهات، شەلە شەل، شەلینەکەی لێنەدەهات، کەس نەبوو نەپرسێ:

+هاوڕێ، چی بوو؟ چیت بە سەرهات؟

- چ نیە، شەو لە ئێشکگری بە سەر تیشە بەردێکدا کەوتم.

گوێم لە مام عەلی بوو، بە پێکەنینەوە دەیگوت:

+ ئەو شەلینە بە هی تیشە بەرد ناچێ.

- ئەدی هی چیە؟

+ نازانم، قسەم پێمەکەن، گوناهبار دەبم.

شەلە بەو قسە و فشقیاتانە تێکدەچوو، سۆردەبۆوە، هیچیشی نەدەگوت، من سەرەتا چ تێنەدەگەیشتم، نەمدەزانی مام عەلی مەبەستی چیە و شەلەش بۆچی بەو قسانە پەست و گرژ دەبێ، نازانم بۆ بیرم بۆ لای هێسترە ماچە نەدەچوو، یەك دوو ڕۆژ دواتر لە بن دارهەنجیرەکە خەوتبووم، نا، خۆم خەواندبوو، پێشمەرگەیەك لە بن لێوان دەیگوت:

چا نەبوو، لووشکەکە بە گونی نەکەوت، دەنا جێی دەبووە ئەو جێ، ئای لەو کەرە، هێستر قات بوو، دەچیە گژ هێستری بەرەکە!

بەرەکە، گوندەکەی ئەو دیو، بارەگاکەی ئەو دیو، هێستری بەرەکە لە سەرانسەری هەورێ لە هەردوو دیوی هەورێ دەنگیدابۆوە، لە چەمووشی دەنگیدابۆوە، هێستری وا ڕەوەک و سەرکێش نەبووە و نابێتەوە، حەفتا

گورگی تێبەردە، هیچیان لەگەڵ پێنـاکرێ، لە دۆڵـی هیـران و نـازەنینێ، لە دۆڵی بالیسانێ چەندان سـەگی ددان شـکاو دەبینـی، هەموویـان لووشـکەی هێسـترە بەرەکەیـان خـواردووە، هێسـتری بەرەکە نەك هەر کەس نـاوێرێ حیزانە دەست بۆ دامەنی ببات! کێ زاخی ئەوە دەکات پیاوانە و لە پێشەوە لێی نزیکبکەوێتەوە، تا کورتانی دەکەیت، تا بارێکی لێ باردەکەیت دەبـیە سینەمای گوند و بارەگـا، دەبـیە سـۆدرەی دۆڵ و چیـا، تـا ئێسـتا کەس لە کاتی تەنگە و پارووش دەستی بە کللك و تەنیشت کلکی هێسـتری بەرەکە نەکەوتووە، هێستری بەرەکە بە هیچ نایەتە رایێ! بە هیچ کەمۆ نـابێ، نە بە فیکە فیك و دەست بە بژداهێنان و لاوانەوە، نە پەلکە نان و مستە جۆو ربە جۆ، نە بە هەڕەشە و لێدان، هێستری بەرەکە وەك دەڵێن وەرز دوای وەرز، ساڵ دوای ساڵ سەرکێشتر دەبێ و جوانتر جووتان دەوەشێنێ.

ئەو پێشمەرگە بەدبەختە دیارە نـاوی هێسـتری بەرەکەی نەبیسـتووە، نـا بیسـتوویەتی، بەڵام نەیزانیـوە ئەو هێسـترەی ئێسـتا ئـاوی کـانی تەلان دەخواتەوە هێسترەکەی بەرەکەیە، دەنـا ئەگەر بـن زگـی بە ئـاگر ئـاگری گرتبا، نەدەهاتە سەری بچێ لە بـن کلکـی هێسـتری بەرەکە بیکـوژێنێتەوە، پێشمەرگەیەك خەڵکی ئەودیوی زێی گچکە بوو بۆ پێکەنین دەیگوت:

لە سەرانسەری ئاقاری پێشمەرگە لە گەرمیان و کوێستانێ یەك هێستر بە کچی ماوەتەوە ئەویش هێستری بەرەکەیە.

بیستم ئەو چارێگە دکتـۆرەی سـەرەوەی چـۆکی بـۆ دەرمـان کردبـوو، گوتبووی:

چیە، ئەو لووشکەیە لە پەنهانەوە هات!

دواتر بیستمەوە ئەگەر ئەنفال بە هەورێدا هەڵنەگەڕابا، ئەوا پێشـمەرگەی بەر لووشـکە کەوتـوو، لە جـێ دەکەوت و سـەرپێ نەدەکەوتەوە، ترسـی ئەنفال پیاوی حەفتا ساڵە بە حەڤدە دەکاتەوە، رەوهانی بە بێ پـێ دەداتەوە، لە هەورێ ترســی ئەنفــال منــداڵی ســاوای ســەرپێ دەخســت، شــەلە چاکناکاتەوە!

شتێك هەیە لە سەرمە بیڵێم، نەیڵێم هێستری بەرەکە وەك ئەوەی کوڕی ئەو دیوی زێ گوتی، دەچێتە دیرۆکی پێشمەرگە و هێسترەوە، لەو شەوانە دوای نووسینەوەی کانی تەلان، واتە دوای ئەو هەموو ساڵە کە هێستری بەرەکە ئێسك و پرووسکیشی نەماوە، لەگەڵ سێ چوار کۆنە پێشمەرگە دانیشتبووین، لە سەر مێز قسە قسەی راکێشا و گەیشتەوە هێسترەکەی بەرەکە، گوتم:

بە گۆتەی کوڕەکەی ئەودیوی زێ بێ، هێستری بەرەکە دنیای نەدیت و مرد.

کۆنە پێشمەرگەیەکیان کە خەڵکی نێوان هەردوو زێیە، پێکەنی و گوتی:

نەخێر، ئەویش وەك هەموو هێسترەکانیدی دنیای دیت.

گوتم:

دەتوانی روونیبکەیتەوە؟

گوتی:

ئەگەر هەرێم دەدەیتێ، ناوم ناهێنی و نامخەیتە(گوڵەستێرەکان)ەوە، ئەوا کۆتایی ئەو سەرهاتەی تۆ لە بارەی هێسترەکەوە دەستپێکردووە لای منە.

گوتم:

هەرێ دەدەم.

گوتی:

لێت دەترسێم، تۆ لە گێڕانەوەی پێشمەرگایەتی زۆر بێ رووی هەموو شت دەگێڕییەوە، بە کۆخە و تڕیشەوە.

گوتم:

بەڵام مەترسە ناوت ناهێنم، دەڵێم هێسترگێیەك بۆی گێڕامەوە.

پێکەنی و بە دەم پێك هەڵدانەوە، وای گێڕایەوە:

پێویست ناکات باسی چەمووشی هێسترەکەی بەرەکە بکەم، هەموو دەزانن چ چەمووشێك بوو، چ پێناچێ ئەو هێسترە کچی کەر بووبێ،

بزانه دایکی له شەیتان چاکراوه، له چی! هێستریٚ بوو بـار نەداهـات، هـیٚ له هەندیٚ هەرچیت لێی دەویست، ئەو بەرەواژی دەکردەوه، پێتدەگۆت:

هەچە، هەچە...

لەجێی خۆی دەوستا له رۆشتنیٚ دەغەزری.

دەتگۆتیٚ:

هۆش، هۆش...

چوارپەلەی دەکرد و پێی پێوەدەنا.

دەتگۆت:

قورش، قورش...

له جێی خۆی تەس دەبۆوه، تەس تەسـت لێکردبـا، پتـر دەهـاته پـێش، کوڕیت لیٚ دەکرد، لێت دەهـاته سـەر پاشـوو، هەوڵـی دەدا ئامبـازت بـیٚ، ئیدی له چ هێستر بەرزەیەک نەدەچوو.

ئیٚ، دەستەیەك پێشمەرگه بووین، هێستری بەرەکەشمان به بارێکی زۆر قورسەوه لەگەڵ بوو، به هەورێدا هەڵگەڕاین، مـن له دووی دەڕۆیشـتم، له مێژ بوو مەرەقم لێیدا بوو، دەزانـی لەو هەورازە رکه بەو بـاره گـرانەوه که هەسـتیدەکرد له کلکـی نزیکبـوومەتەوه، لووشـکەی دەهاویشـت، ئـیٚ، چ بکەم باشه، خـۆ ئەگەر هێسـتریش له مانـدوویتی دەسـتەمۆ بـیٚ، له نـاو ئەو پێشمەرگانه هیچ ناکریٚ، هەڵـگەڕیٚ، به هەورێـدا هەڵـگەڕیٚ، ئـارەقه چـۆڕ چۆڕ دادەچۆڕیٚ، خەیـاڵی مـن هەر له بـن کلکـی هێسـتره، تـۆ نەتـدیتبوو چەند گچکه و تەسکۆکه و ناسک و جوان بوو؟

ئێستا له سەری هەورێین، وا به دیوی کانی تەلاندا شۆڕ دەبینەوه، مـن و هێستر له دواوەین، خـۆت رێگـاکەت دیـوه، پێچاوپێچه، هەردوو بەری ریٚ پڕه له بارەنگێو، له هەندیٚ جێگه وەك قادرمەی لێدیٚ، هێستر ماندووه، ئەوه یەکەم جارمه له ریٚ هێستر له پێش من ماندوو بـیٚ، هێسـتری بەرەکه لەوەتەی هەیه پێویستی به هەچه نەبووه، خۆی رۆیشتووه، ئێستا ئەگەر پێـی دەڵێی (هۆش) مەمنوونه وله جێـی خـۆی دەوەسـتیٚ، هێشـتا لێـی دەترسـم،

هەرچەنـد مانـدوو بـێ هێـزی لووشـکەیەکی تێـدا مـاوە، لێمـدا، جـگە لە ئابڕۆچوونەکە، ڕەنگە جنێەکیشم بشکێنێ، دەبێت وریـابم، بـزانم چ دەکەم، گەیشتە جنێەك، ئەو جنێە بوو کە دەمویست، ئێستا لە دواوە جـڵەوەکەی بە دەسـتمەوەیە، پاشـووی لە بەردە پەیـژەییەکە چـووە خـوارێ و جڵەویـم ڕاکێشـاو هۆشـم لێیکـرد، ڕاوەسـتا، ناترسـم ئەگەر لووشـکەش بـاوێ، لە بەردی دەدات و ناگاتە من، ئیدی (دەعەمەڵ)م هێنا، لەو دەمە برادەرەکـان لە پێشەوە بانگیاندەکردم:

+ چیە! بۆ دواکەوتی؟

- چ نیە، بڕۆن، بارەکە کەمێك خوارە ڕاستمکردەوە.

+ زوو وەرە، درەنگە.

- هەر تەواو بم! دێم، هاتم

ئیدی من بووم هێستری بەرەکەم بێ بن کردا.

## کەپرێ لە ماڵی تریفە

هەیوەشەوێکە، وەرە بە چاوی کزەوە دەرزیلەی تفەنگ لە سەر زەوی هەڵگرەوە، نیوە شەوە، نۆرەی نۆبەتداریی منە، هێشتا دووپشکەکە پێوەی نەداوم، لە گشت لاوە گرموهۆڕە، گرمە و برووسکە، لە سەر گابەردێك کە دەڵێی گایە رووی لە ئاسمان کردووە، هەڵنیشتووم، ئا، ناڵێم دانیشتووم، دەڵێم هەڵنیشتووم، ئەوە گۆتەی مام عەلی کوتکە، شەوێك گوێم لێبوو بە ئێشکگرێکی گوت کە لەو جێیە دانیشتبوو:

دەڵێی هەڵۆی لە سەر قۆچی گا هەڵنیشتووی.

لە سەر قۆچی گاکە هەڵنیشتبووم، جاروبارێش دەهاتمە خوارێ و گەڕانێکم بەو سەر و ئەو سەری بارەگادا دەکرد، کەپرێك کەوتبووە پەڕگەوە، بە رۆژ لەو کەپرە نزیك نەکەوتبوومەوە و نەمدەزانی کێی تێدایە، ئێ، دیتم پیاوێك بە پێدزە خۆی بە کەپرەکەدا کرد، پێنەدەچوو منی دیتبێ، لەو دەمە من خۆم دابووە پەنای گابەردێکی نزیك کەپرەکە، ئێ، وا روو لە دەرکی کەپرێم، کەپر روو لە مانگە، مانگ خەریکە دەچێتە ناو کەپرەوە، کەپر لە ناو تریفە هەڵدراوە، ژن و پیاوێك بە تریفەوە ئاوێزانی یەکترن، ئاوێزانێك تۆپیش لێکیان ناترازێنێ، پیاوەکەم ناسیەوە، بەڵام ژنەکە نا، بۆ چەند ساتێك لە دەنگی تۆپەکان دابڕام، چاوم لە کەپرە تریفەییە عەشقاویەکە بڕی، چێژم لە رووتبوونەوەی تریفەیی وەرگرت، چیدی بەرگەم نەگرت، کشامەوە، ژن و پیاوەکەم بە مانگ سپارد...

گەڕامەوە جێی خۆم، جێی هەڵۆیان، لەو دەمە چەند لە هەڵۆی برسی دەچووم، هێشتا سێ چوار خولەك لە کاتژمێری ئێشکگریم مابوو، زرمەیەك

هەورێی هەژاند، مانگی ترساند، تریفەی سووتاند، بارەگای لە رووناکیەکی ترسناکدا بەئاگاهێنا، تۆپەکە لە سەرەوەی بارەگا ئاگرێکی گەورەی لێکەوتەوە، بەو شەوە پێشمەرگە دەبوو رۆڵی ئاگرکوژێنەوە ببینن، ئەرێ ژن و پیاوەکەی کەپری تریفە گەیشتبوونە کوێ!

## سەردانێکی...

چێشتانێك دوو بەرپرس، مەلا حەسەن و ئەبووێك وا بزانم ئەبوو کەریمی ناوبوو، چوونە سەردانی بارەگای پارتێك، حەفت پێشمەرگەیان بەگەڵ خۆیان دا، من حەفتەمین بووم، بارەگا کەوتبووە دۆڵە گەورەکەی خوارەوە بەو بەرەوە، گەیشتین، ئەوان چوونە ژوورێکەوە لە ژووری گەوران دەچوو، ئێمەش لە نزیك نانەدێتەکە لە بن کەپرێك دانیشتین، کۆبوونەوە درێژەی کێشا، نیوەڕۆی بە سەر داهات، نان هات، ئەوەی جێی سەرسوڕمانی من بوو، دوو چێشتلێنەر و سێ جۆرە چێشتم دیت، چێشتێکیان تایبەت بوو بە بەرپرسەکان، کە برنج و گۆشت کراشەی دەکرد، چێشتی ئێمە برنجی بێ گۆشت، چێشتی زیندانیەکانیش، شلە ساوارێکە لە رەنگ و بۆنی دیارە بێ تامە و ناخورێ، لە پێشمەرگەیەکی بارەگاکەم پرسی:

+ ئێوە هەموو رۆژێك سێ جۆر چێشت لێدەنێن؟

- هەموو رۆژێك و هەر سێ جەمەکە سێ جۆر خواردنمان هەیە.

+ ئەوە چۆن دەبێ؟

- ئاساییە، لای ئێمە هەر وابووە.

+ بەڵام لە بارەگاکانی ئێمە یەك جۆر خواردن هەیە.

- باشیی ئێوە لەوەدایە، بەرپرستان سەرەتیان نیە.

+ چایەش سێ جۆرە؟

+ نا، بەرپرسی گەورە هەموو شتی تایبەتە، زیندانییش چایەی نیە.

بۆ نانی ئێوارە گەیشتینەوە کانی تەلان، من و مەلا حەسەن لە سەر

چیچکـان و له یه‌ك له‌گه‌ن بـرنجه سـۆره‌مان خـوارد، چایه‌شـمان له قـۆغه خــوارده‌وه، به‌ڵام چه‌نــدی گــوێم هه‌ڵخســت شــتێك له قســه و باســی کۆبوونه‌وه‌که‌یان ببیستم، نه‌مبیست، نه‌مزانی باسـی چۆنیه‌تی به‌رگریـی یـان هه‌ڵاتنیان له ئه‌نفال کردووه، قسـه‌ی پێشـمه‌رگه‌یه‌کی باره‌گـای سـێ جۆر چێشتم بیرکه‌وته‌وه، ده‌یگوت:

ئه‌و قسـه‌یه‌ی لای به‌رپرسـه‌کانی ئێـوه نهێنیـه و نـاگوترێ، لای ئێمه له سه‌ر زاری هه‌مووانه و زیندانیه‌کانیشمان ده‌یڵێنه‌وه.

جگه‌ره‌ی چاییم کێشابوو، جـگه‌ره‌ی دوای چـایه‌م ده‌پێچـایه‌وه، چه‌نـد تۆپێـك له چه‌نـد جێیه‌کـی ده‌وروبه‌ری باره‌گـا ئاگریـان خسـته‌وه، غـارده هه‌ورێ بکوژێته‌وه.

## شه‌رمی ناسینه‌وه

تازه گه‌یشتبوومه کانی ته‌لان، دوای کوژانه‌وه‌ی لچکێکی باره‌گـا که به هۆی تۆپێکی دۆزه‌خیه‌وه ئاگری گرتبوو، پێشـمه‌رگه‌یه‌ك زۆر ته‌ماشـای ده‌کردم، منـیش گـاف نـا گـاڤێ تیچـاوێکم ده‌دایـێ، وێتـام ده‌کـرد به‌ڵام نه‌مناسیه‌وه، له بن داره‌ه‌نجیره‌که دانیشتبووم، دیتم هات، ته‌وقه‌یه‌کی توندی له‌گه‌ڵم کرد و گوتی:

+ ببووره وه‌ختبوو نه‌تناسمه‌وه.

- ئه‌ها، به‌ڵام من هێشتا تۆم نه‌ناسیوه‌ته‌وه.

+ من..... کوڕی......م

حه‌یف ئێسـتا له سـاتی گێـڕانه‌وه‌ی ئه‌و سـه‌رهاته کـۆنه نه‌ك هه‌ر نـاوی باوکی هی خۆیشیم نایه‌ته‌وه یاد.

- ئه‌ها، به‌ڵام، من...

+ تۆ که‌ریمی کوڕی مام کاکه نیت؟

- نا، ره‌نگه هه‌ڵه بیت.

+ تۆ، ماڵتان له به‌لاشاوه به‌رانبه‌ر ماڵی مامت نیه؟

- بەلاشاوە! مامم! کێ؟
+ حاجی عەبدوڵلا.
- ناپناسم.
+ ببوورە، ناتناسم.

تەواو خۆم نەبان کرد، بە مەیلە وتووڕەیی هەستاو لە دارهەنجیرەکە دوورکەوتەوە، ڕۆژەکەی وا بوو، ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی خۆنەناسکردن بوو، بە تۆ با هیچ پێشمەرگەیەك ماڵ و کەسوکاری نەناسیبای، ترسی خۆڕادەستکردنەوە و زمانلێدان، ترسێك بوو لە دڵی هەمووان دەگەڕا، منیش لە ترسان دڵی ئەو پێشمەرگەیەم لە خۆم شکاند، دواتر دوای سەرهەڵدان و بە شارکەوتنەوە، لە چایخانەیەك پێشمەرگەی بن دارهەنجیرەکەم دیتەوە، بۆ چەند چاوترووکانێ چاومان لە چاوی یەکتر بڕی، ئەو زووتر رووی وەرگێڕا، خۆی نەناس نیشان دا، نەیویست بمناسێتەوە، منیش ئەو جارە لە ترسان نا، لە شەرمان نەمناسیەوە!

## ڕەشماڵێ لە شەماڵ هەڵیداوە

لە خوارەوە، لە سەر ئەو ڕێچکەیەی کەر وباری دەگەیاندەوە بالیسان، ڕەشماڵێك لە تەنیشت سێ تیشە بەردی لە شێوەی مایین داتاشراو و لە نێو چەند بنەدارێکی قژ ژنانی بە دیار دوو سێ چێڵ و چەند سەر بزنێکەوە هەڵیداوە، ئەز سێ جار ڕێم بەو ڕەشماڵە هاوینیە کەوت، ماست ئەو ڕەشماڵەی بە من ناساند، ماستی بارەگا لە سەر ئەو ڕەشماڵە بوو، جارێکیان، یەکەم جار، لەگەڵ (دڵشاد)ێك لە شاریش دەمناسی چووینە ڕەشماڵی ڕەشکۆکە، ڕێمان بە گلەیی بڕی، ئەو کوڕە گلەیی لە ئاسمان و عەرد هەبوو، گلەیی لە دار و بەرد هەبوو، گلەیی لە ورد و درشت هەبوو، لە هەموو شت هەبوو، ژنێکی سەرە و کچێکی عازەب لە زارکی ڕەشماڵێ دانیشتبوون، کچە لە گژ دروومان بوو، سێ چوار منداڵی سەرکە و بنکە لە بن درەختێك بە دەوری جۆلانە گوریسیەکەوە دەسووڕانەوە، لەگەڵ

سڵاوکردنمان پیاوێك لە پەنای رەشماڵەکەوە پەیدا بوو، دانیشتین، چایە دێمی دابوو، نەیهێشت هەستین، کیسەی تووتنی لە پێش داناین، من جگەرەیەکم پێچایەوە، تووتنەکەی خۆش بوو، چایەکە جگەرەکەی خۆشتر کرد، پیاوە پرسی:

دەبێ کەی ئەنفال بگاتە ئێرە؟

برادەرەکەم وای وەڵامدایەوە:

دیارنیە، کێ دەڵێ دەگاتە ئێرە؟!

پیاوە بە پەستیەوە:

ناگاتێ چیە! پێشمەرگە کەی ئەو دۆڵە چۆڵدەکەن؟

لە جیاتی برادەرەکەم گوتم:

نازانم کەنگێ چۆلیدەکەین، بەڵام ئێوە چەندی زووتر خۆتان رزگاربکەن باشترە.

پیاوی رەشماڵی کەمێك لێم راما، نیگای کچەش کەوتە سەرم، چاوی کچە دەتگوت بنپیاڵەکەی پێشمە، ئۆی چ چاوێك بوو! دەتگوت چاوە ئەلیزاییەکەیە، ئەو چاوەی ساڵانی کۆلیژ منی سەرگەردان کردبوو، کچێکی تا دڵ دەڵێ زێ، بەدەو و لەبەر دڵان و شل و مل، ئەگریجەشی بە کەژۆک دەچوو، روومەتی دەتگۆ سێوی سەرتایە، ئەدی دەست و پەنجەی ناسکی! خۆزیت دەخواست ببیە سەرتلی و بکەویە سەری پەنجەی بۆوەی دەرزی نەیئێشێنێ، ناوێکی نزیک لە مینای لێبوو، مینا چ مینا! مینا مینا بوو، گوتی:

تۆ راست دەڵێی، ژیانی دۆڵی بالیسان کۆتایی هات.

بیرمە بابی مینا لە مەڕ دەغڵ و دان وەک ئەوەی پەرەکاخەزێکی لە پێش بێت و بیخوێنێتەوە:

ئەوساڵەکێ کەس سوارەیەکی بە دەستی سەپانێکەوە نەدی، کەس تێلەکێش و پەریزی نەدی، کەس گەلاوێژێک، گیشەیەکی نەدی، شەغرە نەچووە سەر پشتی چوارپێ، جۆخینی چی! گەنم و جۆ هەموو بە

فەریکی سۆتا، خودایە، هەگەر گوێت لێمە، هەڵینەگری.

بە سەتلێکی گەورەی ماستەوە سەرە و بارەگا سەرکەوتینەوە، لە رێی برادەرەکەم دابەزیەوە سەر دنیا، کەوتەوە گلەیی و گازندە، بەڵام من خەیاڵم هەر لای رەشماڵەکە بوو، لە هەر شەش حەفت شەقاوێك ئاورمدەدایەوە، لە ئاورِدانەوەدا هەستمدەکرد شەماڵێك لە رەشماڵەوە هەڵدەکا و گیانم فێنکدەکاتەوە، ماندوویتیم دەحەسێنێتەوە، لەو دەمەدا لە بەرزایی هەورێوە دووکەڵ بەرزبۆوە، هێندەی نەبرد، بۆنی دووکەڵ گەیشت، بۆنێك دەتگوت لە دۆزەخەوەیە.

ئیدی بە من با، هەر منیان ناردبا بۆ ماست، رێی رەشماڵ بووە رێی مراز، رەشماڵ لە دۆڵی دۆزەخ و هەورێی دۆزەخ بای شەماڵە و شنە دەخاتە گیانەوە، ئەو رۆژەی ئەنفال گەیشتە هەورێ و هەرچی هەبوو بردی، نەمزانی رەشماڵ بەگەڵ کەوت، یان وەك ئێمە بە هەورازەی دەرەشیری دەربازبووندا سەرکەوت! کیژەی ئەگریجە کەژۆک، لەو وێرانبوونەی دنێ، لە ناو زاری ئەنفال کەوتیەوە، ئان لە پەنایەک خۆت بە پنچکێکی ژیان گرتەوە.

## وێنەیێ بە دیار کیسەڵەوە

پێشمەرگەیەك ناویم بیستبوو، نەمدیتبوو، لە یەکەم دیدار کە دوا دیدار بوو کەوتە دڵمەوە، لە بن دارهەنجیرەکە لە سەر شرِە بەرِەیەك لە سەر پشت راکشابووم، سەرم بە بەردێك کە شێوەی بالیفی هەبوو، کردبوو، نیگام لە ناو پەلکی دارهەنجیرەکە وەك بە دوای پەلکێکی جواندا بگەرِێ، دەگەرا، پەلکەکان لە ناو تۆز و خۆڵی هەورێ چ سیمای ژیانیان پێوە نەمابوو، خەیاڵ بە کەلێنی پەلکەکاندا بردبوومی، رۆیشتبووم، دەنگێك منی گەراندەوە بن دارهەنجیر:

+ هاورێ کووی؟

- سوپاس، باشی؟

+ من ئارام شاهێنم.

له دنیـــایێ زۆر كەس له ســیما له یەكــدی دەچـن، نــازانم نه چــاو هەڵەدەكات نه هەر وایه كه پێكچوونێك له نێوان هەندێ مـرۆڤ و ئـاژەڵ و باڵندان هەیه، لەوەش وێـوەتر زۆر جـار له چاوی مـنەوە تیشـه بەردێـك لووته شاخێك، پەله هەورێك، نەخشێك له مانگ زۆر له مـرۆڤ دەچێـت، بەڵام سیمای ئارام شاهێن كتومت له شەهێنی شـاخان دەچـوو، چاوی مـن وای دیت، ئەو شەهێنانەی له جوانیدا هەر له خۆیان دەچن، ئـارام هێنـدەی له شەهێن دەچوو نیو هێندە له براكەی نەدەچوو، ئەو برایەی لەمێژنەبـوو له دەرەوە به پـلەی مـولازم گەڕابـۆوە و كـامێرایەكی بـۆ بـراكەی به دیـاری هێنابوو، دیاربوو زۆر دڵی بەو دیـاریه خۆشبوو، ئەودەمـانێ كـێ كـامێرای هەبـــوو! خەڵــك بــۆی به ئاســماندا دەچـــوو، ئــارام شــاهێن لەگەڵ مـــن قسەیدەكرد و شەهێنانه دەیـڕوانیه كێـوە دووكەڵگرەكـانی ئەوبەر، له بیـرمه گوتی:

+ زۆر شەرم له دەستچوو.

- تێناگەم، مەبەستت چیه؟

+ ئەگەر پێشتر كامیرام هەبا، له شەڕەكان چەند وێنەیەكم دەگرت.

- نەچووە بچێ، شەڕ له پێشمانه.

لەو دەمه بەو رێچكەیەی لێژدەبۆوە بۆ ئاودەستەكە، كیسەڵێك كه جـگه له كیســەڵ له هــیچ نەدەچـــوو، وەك بڵێــی ترســی ئــاگری گەیشــتبێتێ، له خــوارەوە دووكەڵ بەرزبـۆوە، ســەرهەوراز رێـی داگرتبـوو، ئـارام شـاهێن دیتی، به پێكەنینەوە گوتی:

+ وەره له تەنیشــت ئەو كیســەڵە وێنەیەكــت بگــرم، تــا وەك كیســەڵ تەمەن درێژ بیت.

- ده جارێ خۆت تەمەن درێژبكە.

+ هەستە...

له هەســـتاندا تۆپێـــك زرمەی له كـــانی تەلان هەســـتاند، زرمەیەك به

شێوەیەك وێنە و کیسەڵ و تەمەنی لە بیربردینەوە، دوای ئاگرکوژانەوە و رەوینەوەی ترسیش نەچووینەوە سەر وێنەگرتن، هەر هێندە ئارام شاهێنم دیت، ئەنفال هات و لە کانی تەلان هەڵیکەندین و هەر یەکەمان لە دۆڵ و تەلانێك کەوتینەوە.

ئەو رۆژەی ئارام شاهێن لە بەری مەرگی ئەو جادەیەی من ناوم نابوو(جادەیەك دنیای کەرتدەکرد) لەو هەڵەت و باسکانە کەوتە بۆسەی جاشانەوە و شەهێنی گیانی بۆ یەکجارەکی هەڵفڕی، من لە سەری قەندیلێ لە بن تاشەبەردێ، تفەنگ لە سەر چۆك روو لە ئەنفال دانیشتبووم، کۆڵەپشتەکەم بە لووتمەوە نابوو، بۆنی ورتکەنانی لێدەهات.

## بۆسەیێ لە خەیاڵەوە

بۆسەکە خەیاڵ نیە، بەڵام کەس باوەڕی نەدەکرد، جاش لەو کاتە و لەو جێیە بۆسە دابنێنەوە، بۆیە ناوم لێنا بۆسەیەك لە خەیاڵەوە، لە هەورێ بە دیوی ئەو جێیەی نەمزانی بۆچی ناوی زینەتیرە، دەستەیەك پێشمەرگە لە بیرم نیە بۆچی رێمان کەوتە ئەوێ، لەو دەستەیە ئێستا هەر ناوی دوو سێ پێشمەرگەم لە یادە، ئەو کوڕە سەر و قەڵەم رەشە کارۆخە، وەختایەكماڵیان لە نزیك تاکە دارخورمایەکەی هەولێر بوو، ئەوەی کەوتبووە لای کەلاوەکەی مەلافەندی، ئەو کوڕە بەژن شووشەیيە دارایە، ئەوە ئەبووێکە لە نەجەفەوە هاتووە، زۆر بە حوسێن دەچێ، رەنگە ئەگەر پشتاوپشت بە دوایدا بچی، بچێتەوە سەر ئیمام عەلی، ئەوانیدی؟ حەیف!

ئی، بە دوای یەکدا لە تاریکایی تەنکی ئێوارە بە ئاراستەی کانی تەلان هەنگاوی پێشمەرگانەمان دەنا، هەنگاوی پێشمەرگانە ئەو هەنگاوەیە جگە لە خەڵکی چیا و قاچاخچی کەس توانای هەنگاونانی وای نیە، لەو ساتەی دەسرێژ لە تۆزو خۆڵی وەرداین، لە بیرمە مەتارەم بە سەر لێوەوە بوو، باش بوو نەڕژا و سەریم داخستەوە و خستمەوە جێی خۆی، بەوەی باش بوو جێگاکە رووتەن نەبوو، بەردەلانە، بەردی زۆر گەورەش لێرە و

لەویٚ دەڵێی خوداوەندی شاخ بۆ لێقەومانی پێشمەرگە لە چیاوە هەڵیداون و لێرە کەوتوونەتەوە، دەستمانکردەوە، لە پەنا بەردێکم ئەگەر ئێستا مابێ، رەنگە جێگەی سەد گوللەی پێوە مابێ، شەڕ گەرمە، دیار بوو، جاشەکان جێگەیەکی باشیان بۆ بۆسە هەڵنەبژاردبوو، بای پێشمەرگە بوو، جاش بەزین، تەق.. .تەق، هەڵاتن و نەکەوتینە دوایان، من وا بزانم ئەوە جاری دووەمم بوو بکەومە بۆسەوە، زرمەیەکی چیاهەژێن ئاگرێکی گەورەی لە کلکەی هەورێ خستەوە، هاتینەوە بە سەلامەتی هاتینەوە.

### خەونی بن دارهەنجیرەکە

شەوانی بن دارهەنجیر پڕ لە خەوی پچڕپچڕ و خەونی پڕ لە بەفر و ئاگر و پارەی خوردە و بەرانپیلی ونجڕونجڕ، لە دوو سێ شەوی کانی تەلان بایی تەمەنێک خەونم دیتووە، بەوەی باش بوو بۆ ئێشکگری بانگمیاندەکرد یان بۆ میز بەئاگادەهاتم، دەنا دەکەوتمە بن بەفری خەون و لە ناو خوردەی خەون بزردەبووم، لە کونی بەرانپیلەوە بەردەبوومەوە و دەکەوتمە ناو ئاگری خەون، شەو نەبوو چ پێش ئێشکگری چ دوای ئێشکگری بەفر چۆکێ، نیو بەژن نەکەوێ، زریان هەڵیدەکرد، دەیبردم، دۆڵاودۆڵ، کێو بە کێو دەیگێڕام، دنیای پێدەکردم، دەنگی ئێشکگرەکە، یان میز دەیهێنامەوە شەوی بن دارهەنجیرەکە.

دیسانەوە خەو، بەرانپیلێکی گەورەی باڵدار نازانم لە چ ئاسمانێکەوە دەهات، لە بەردەمم دەنیشتەوە، منیش دەبوو سوار بم، باشە بۆچی سواردەبووم! بەرانپیل هەڵیدەگرتم، دەفڕی، بە ئاسماناندا دەگەڕام، گەڕانێك پڕ ترس و لەرز، ترس لە بەربوونەوە، بەربوونەوە لە کونەکانی بەرانپیلەوە، ئەو کونانەی تا دەهاتن گەورەتر دەبوون، لە کونەکانەوە تەماشای خوارێم دەکرد، زەوی یەك پارچە ئاگر بوو، ئێستا نا ئێستا بەردەبمەوە و دەبمە چزیلك، جارێك بەربوومەوە، پشتاوپشت کەوتمە ئاگرەوە، ئێشکگرەکە بە (هاوڕێ، هەستە) رزگاری کردم.

ئەوجارە دەکەوتمە ناو پارەی ئاسنەوە، درهەمی، نیو درهەمی، دە فلسی، پێنج فلسی، دینار و نیو دیناریشی تێدا بوو، ئەو پارانە لە درەختێك بەردەبوونەوە زۆر لەو دارهەنجیرە دەچوو کە لە دارەتی بارەگای کانی تەلان هەر ئەوم هەبوو،ماڵی من بوو، ئیدی دەکەوتمە بن گەڵای ئاسنینی پارە، میز نەبا بە ئاگانەدەهاتم.

شەوێك خەونم بە کچە چاو ئەلیزاییەکەوەش دیت، ئەو کچەی هەستمدەکرد گیانی کچەکەی پێشوو، کچەکەی منداڵی، هەی یەکەم ئەوینی تێدا بوو، لە پێش دەرگای کۆلیژ ئەو لەو بەری جادە، من لەبەرەکەیدی، بەرانبەر یەکتر راوەستابووین، نیگام لە نیگای بڕیبوو، لە سەر ئەوەبووم، بچمە لای، یەك دوو شەقاویشم هاویشت، لە پڕ لەو سەری جادەکەوە جۆگەلە ئاوێك سەری کرد، زۆری نەبرد جادە بووە رووبار، رووبارێکی شێلوو، قوڕاو، نەگەیشتمێ، لە خەونیش نەگەیشتمە کچە چاو ئەلیزاییەکە، رووبار و ئێشکگرەکە نەیانهێشت بیگەمێ، دوای تەواوکردنی کاتژمێرەکەی ئێشکگری بە نیازی چوونەوە بۆ رووباری پێش کۆلیژەکە، سەرم خستەوە سەر سەرینە تاخم و بەردینەکە، خەونم دی، بەڵام بە بەرانپیل و ئاگرەوە.

### هەورێ ناکوژێتەوە

نایەتەوە بیرم لە هیچ وەرزێك لە وەرزان بەو وەرزەشەوە کە هەر رۆژێکی بە قەد ساڵێکە، بە رۆژ خەوم لێکەوتبێ، پاش نیوەڕۆیەك لە بن دارهەنجیرێ وەك بڵێی خەوم دەهات، جگەرەکەم تەواونەکرد، ترسام خەوم بڕەوێتەوە، راکشام، دەی خەوم لێکەوێت، رەنگە بۆرژابم، دەنگێك هات و خەوی برد:

هاوڕێیان، ئاگر هات، ئاگر...

بارەگا بە بەئاگا و بە خەوتووەوە راپەڕی، چ ببینم! لایەکی هەورێ ئاگرێکی گرتووە، ئاگری وای بە خۆیەوە نەدیتووە، دووکەڵ لایەکی

ئاسمانی داگرتووە، بایەك هەڵیکردووە، ئەگەر خوداوەندی با نەیگرێتەوە چڵە پووشێك بە هەورێوە نامێنێ، بارەگا دەبێتە مشکی، هەر پێشمەرگە بوو بە دارێکەوە، بە کلکە خاکەناسێکەوە رووەو ئاگر هەڵات، دەبێت پێش لە ئاگر بگرین، ئەوەتا لەو شوێنانەی رووتەنن و پووشوپەڵاشیان کەمە، ناوبڕەیەك دەخەینە بەری ئاگر و بەری بارەگاوە، ناوبڕەیەك لە خۆڵ، وا لە پووشوپەڵاش لە دارودڕ خاوێنیدەکەینەوە، بە بەرینایی چەند شەقاوێك تەنها خۆڵ و بەرد دەهێڵنەوە، ئیدی ئاگر وەك چۆن لە ئاو ناپەڕێتەوە نابێ لە خۆڵ و بەردی رووتیش بپەڕێتەوە، دێت ئاگر دێت و بە ناوبڕە دروستکردن راناگەین، بایەکە توندە، دەستی ئاگری لە دەستە و بە هەورێدا رادەکات، با لە چەند لاوە هەڵیکردووە! ئاگر خەریکە دەوری بارەگا دەدات، ئەو ئاگرە لە چ ئاگران ناچێ، ناکوژێتەوە، پێشی پێناگیرێ، هەورێ لە گشت لاوە ئاگری گرتووە، ئەو ئاگرە بۆ سووتانی هەورێ داگیرساوە، تا دار و بەردی هەورێ نەسووتێنێ ناکوژێتەوە، ئەو ئاگرە بە هەوری بەهاریش دانامرکێ، تا هەینێ نەمدەزانی هەورێ بایی ئەو ئاگرە گەورەیە سووتەمەنی پێوە ماوە، ئەوەی دەسووتێ هەر دار و دڕ و پووشوپەڵاشە! باوەڕناکەم، رەنگە خۆڵ و بەردیش گڕی گرتبێ، رەنگە کانیەکەی کانی تەلانیش ئاگر بگرێ، هەر دیتت ئاو سووتا، هەورێ یەك پارچە وا بە بەر چاوی ئاسمانەوە دەسووتێ، ئاگر ئابلۆقەی کانی تەلانی داوە، دوو فڕۆکەش لە بەرزایی بەرزەوە، لە پشت دووکەڵەوە ئەوسەر و ئەمسەری هەورێ دەکەن، پێدەچێت وێنەی سووتانی هەورێ بگرن، دوور نیە ئێستاش ئەو وێنانە لە ئەرشیفی گوناهەکانی بەغدا پارێزراو بن.

پێشمەرگە ماندووە، پێشمەرگە خەریکە دەستەپاچەبن لە کوژانەوەی هەورێ، با دەڵێی لەگەڵ بەغدا دەستی تێکەڵکردووە، پێچ بە ئاگر دەدا، گێژەلووکەی ئاگر وەختە کانی تەلان بە ئاسمان بێخێ، دەبێ رێگەیەك، کونێك لە ئاگر بۆ هەڵاتن لە دەست ئاگر ببینینەوە، کانی تەلان کەوتە دۆزەخەوە، پێشمەرگە لە جەرگەی دۆزەخەوە هێشتا لە هەوڵی کوژانەوەی

دۆزەخ نەکەوتوون، هێسترەکان لە دووکەڵدا دەپڕمێنن، بۆنی گۆشتی برژاو دێ، هەبێ نەبێ کیسەڵەکەیە، هەر دیتت ئاگر گەیشتە کەپرەکان، گەیشتە دار هەنجیرەکە، گەیشتە ئەو چادرەی پڕ لە فیشەك و گوللە ئارپێجیە، تا زووە... ئای! ئەوە کێ بوو کونی بای گرتەوە، بای لە کونێ کردەوە، بەڵام پاش چی، هەورێ سووتماکە، هەورێ لقە دارێك چڵە پووشێکی بۆ سووتان پێوەنەماوە، هەورێ خۆڵ و بەردی رەشهەڵگەڕاوە، هەورێ چیایەکە لە خۆڵەمێش، هەورێ گەرم گەرم، هەورێ تەلانێکە لە دۆزەخ، لەو تەلانە تەنها کانیەك ماوە فێنکایی بە پێشمەرگە بدا، هەناسە بداتەوە ژیان، تەماشاکەن، کانی تەلان کانیەکە بە تەلانی دۆزەخەوە.

## کەپرە شیعری ئابی هەورێ

تازە، چەند رۆژێ بوو، ئیمامی مەزن، ئیمامی هەموو ئیمامان، لە ژەهر پێکی هەڵدا بوو، ئەو ژەهرەی لەمێژبوو لێی دەترسا، نازانم ئیمام گەیشتبووە چەندەمین پێیلکەی مەستبوون! بەڵام باشم لە بیرە چیانشینان و ئەشقیاکانی ئازادی بە بۆنی پێکی ئیمامی مەزن گێژبوونێ گێژی گرتبوونی، چیا لە هەموو تەمەنی پڕ لە هەوراز و نشێوی خۆیدا، لە باوەشی وەرزە گوڵگوڵیەکانیدا، رێبوارانی وا گێژ و وێژی نەحەواندۆتەوە، گێژ و وێژیەکی ئەوتۆ، برژانگ، برژانگ سەوزایی بینایی هەڵدەوەراند، هەڵوەراندنێ کتومت لە وەرینی گەڵای چیای دەمەو پایزی دەچوو.

لەوان رۆژاندا، رۆژەکان سۆمای چاویان تنۆك، تنۆك دەڕژایە شەوی درێژ درێژ، درێژتر لە مانگی ئابی ساڵی ژەهر، درێژتر لە پشوو درێژیی هێستره دەزگیرانیەکان، ئەو هێسترانەی لە شەوی تۆفانیدا، لەو شەوانەی هەرچی گیانلەبەری چیایی هەیە، مجرۆ دەبوون، لەو شەوانەدا چاوساخییان دەکردین و دەیانبردینەوە ئەو دیوی مۆڵگەکانی مردن.

ئەوە چ بوو! خودا چ جادوویەکی لە هێستر کردا ئۆتە ئەو سەر و ئەو سەر دەکەن، عەرد و ئاسمان بۆن دەکەن، بە رێچکەکانی دیوی ژیان ناکەونەوە، ئەو رێچکانەی وەخت و ناوەخت بە پێیە پیرۆزەکانی هێستر، بە خەتی درشت دەنووسرانەوە و ئەشقیای هەمیشە لەخۆبایيش دێر دێر سەرکەوتنی تێدا دەخوێندنەوە، دواتریش هێستر لە یادەوەری ئەشقیادا دێرێ لە رەشبوونەوە بەجێدێڵێ و بە قەد مۆری جێپەنجەیێ نادرەوشێتەوە.

لەو شەوی ناشەویە ئابیەدا، لەو ئابی کوێربوونەدا، بە بەر چاوانەوە بێ ئەوەی چاو لەو ساتانەی کچانی رەوەندی بکات کە خەناوکەی بە

دەزگیرانبـــوون لە مـــل دەکەن، رووی خـــۆی وەرگێـــڕێ، چیـــا ژنـــانە ســـێکوچکەی بەتـــاڵبوونەوەی وەك خـــاچی کـــوفر بە گەردنـــی خـــۆیەوە هەڵواسی، خاچی سروود، خاچی سەنگەر، خاچی هێستر و ئەشقیا...

تۆش برادەری لە دووری دوور وەستاو
لە ساڵی بەتاڵبوونەوەی هەشتاوهەشت
بۆ ناسینەوەی ئابی ئەوێ، بۆ ناسینەوەی شەودرێژیی چیا
بڕۆ پەڕە ئابیەکانی هەشتاوهەشت رۆمان
لە ساتی پێش مەستی بە نیگای شەرابی پەڕ پەڕ هەڵدەوە
بە رۆمانی (کوێری) دەستپێکە و
با هەر بە (کوێری)ش کۆتا بێ...
من لە ساتەکانی بەدمەستیم برادەر، لە ساتەکانی بەدمەستی
لە رایەڵەکانی ئەوسای چیا پساوەترم، برادەر!
ببوورە حەکایەتی درێژم بۆ تۆ پێ نانووسرێتەوە.

ئەو رۆژانە، رۆژە ئیمامیەکان، ئێمە چەند دەستەیەك ئەشقیا بـووین و لە سەر شانی نەفرەت لێکراوی چیـای هەورێ بە دیـوی گـۆلمی (بالیسـان)، هەینێ بالیسان لە پارچە کـاغەزێکی گەچراوی لوولـدراو دەچـوو، پـارچە کاغەزێك لاوکێکی تا ئێستاش نەگوتراوی لە سەر نووسـرابۆوە، لەوێـوە لە سـەر شانی لەرزۆکی (هەورێ)وە، مندالانە فڕۆکەمـان دەژمـارد، ئەوە دوو، دە، پەنجـا... ئەو فڕۆکـانەی لەوێـوە، لە (بـاغی داد)ەوە پووشـکاخەزانە هەڵدەدران، نا، نا، دوور لە گەلا، ئەوە با بوو، پایزی باخی بەغدای بە سەر هەورێ دادەڕژاند... هێشتا لە خوێنـدنەوەی بەرگـی یەکەمـی کتێبـی سـاڵی جمکانەی ئەنفـال نەبـوومەوە، چەنـد لاپەڕەیەکیشـم لە کتێبـی هەڵەبـجەش هەڵـدابۆوە، ئیـدی تەواو!.. ئەوەتـا بالیسـان گۆڕسـتانێکە لە چیـای هەورێ، گۆڕستانی تژی تژی لەوانەی بە دەستی سەربازە ئەسحابەییەکان بەبێ ئیزنی خوداوەنـد گیانیـان لـێ سـەندرابۆوە، مـن لە گەمـژەییەوە لە هەمـوو ئەسحابەکان پتر لە بێباکیم خواردبۆوە، هێندەم بێباکی نـۆش کردبـوو، وەك

دارا شـێتی پـێش (کۆشـکی بـاکوور) بەلادا دەهـاتم، بەڵام تـا ئەو پەڕی ئاگـایی بەئاگـا بـووم، دەسـتڕەنگینانە بـۆ مەرگ خـۆم کـۆکردەوە، ئەو کەلـوپەلانەی بـۆ مەرگ پێویسـت بـوون خسـتمنە کۆڵەپشـتەکەمەوە، ئەو شیعرانەم ئەزبەرکردبوو کە گاڵتەئامێزانە ئـایەتی ئەنفالیـان ئەنـالیزە کردبـوو، ئیدی چاوەڕێ بووم، لە ئاسمانی تـۆزاوی، لە ئاسـمانی دووکەڵاویەوە دوو فرۆکە فریشتەییانە دابەزن و بن پیلم بگرن و لە هەورێوە فڕێمـدەنە گـۆڕی پڕ رووناهیی بالیسانەوە.

تۆ! برادەر،
ئەگەر لە دوورایی پەنجەیەکەوە
یاخود لە ناو پێکی پێش مەستبوونەوە
یا لە ئاوێتەی بە ئاگاهاتنەوەوە
سیمای مەرگت نەدیوە،
تکایە، برادەر، تا ئێرە مەخوێنەوە..

لەو سـاتە مەرگیـانە بـووم، مەرگ هەر پەنـجەیەك لـێم دوور بـوو، نامەیەك لە شێوەی دڵۆپە بـارانی درشـت رژایە نـاو لەپـم، تەنهـا باراناسـان دەزانـن ئەو دڵـۆپە درشـتە چ فێنکـاییەك دەبەخشـێتە گیـان، خـۆی بـوو، ناسیمەوە، حەمە عەباس، بـرادەری منـداڵی لەو سـاتانەدا سیمای لە هەوری تیـر دەچـێ و وەك بـاران زوو دەناسـرێتەوە، نـامەیەك لێوانلێـو لە پێکەنینـی (هەڵوێسـت)، پیاسـە ئێوارەییەکـانی دەوری قەڵاتـی هەولێـری لە چەشـنی شنەیەك لە ژیان خستبووە توێی هەناسـەیەکەوە، بـۆ ئەو پیاسـانە پرسـێك بە گەنجە هەشتاییەکانی لە سەربازی راکردوو بکە...

نامەیەك دانیشتنی دەمەو عەسرانی چایخـانەی (بـاکوور)ی لە رسـتەیەك پێچابوو، ئەو رستەیە رێك تـامی چـای دەدا، چـای پیـاڵە نەك هـی نـاو بـنە مەتارە، جیاوازی نێوان ئەو دوو چایە!! زانـیم حەمەش لە (هەورێ)یە، بەڵام بە دیـوی بالیسـان نـا بە دیـوی گـۆلمی (نـازەنین)، ئەویـش دیتبـووی، دیتبوومان:

ئەنفالکردنی دنك دنك هەناری دۆڵی هەنارستانمان دیتبوو.

حەمەش دەمێك بوو وەك من بە چیا کەوتبوو، بەڵام ئاگامان لێکدی نەبوو، نێوانمان چەندان دۆڵ و چیا و دەشت و پێدەشت بوو، ئەو حەمەیە دواتر لە کۆڵانەکانی ناو (( دیوارەکانی شێتخانە))ەوە و لە پەنای شیعرەوە ((هەناسەی بۆ با دەگرتەوە))... نامەکەی حەمە، حەمەی برادەری منداڵی بۆ چەند ساتێ چەند دۆڵێ دۆڵی بالیسانی گۆڕی، لە من دوور خستەوە.

لە چاوەڕێی دابەزینی فڕۆکەم، دابەزین بە ئایەتی ئەنفالەوە، لە تامەزرۆی ئایەتا دنك دنك وەك گوڵەبەڕۆژە کاتم دەقرتاند، ئاگرێك لە هەورێ کەوتبووەوە بە ئاوی دنیاش نەدەکوژایەوە، هەرچی ئەشقیایە چووبوونە پێشی، ئاگر بە پانایی هەورێ دەهات و گڵپەی دەکرد، بابەك نازانم دەستی کێ لە هەڵکردنیدا هەبوو، لە لای ئێمەوە، نا لە ناو کەپرانەوە، رووە و ئاگر، رووەو گشت لا، هەڵیکرد، کەمێك گەرمایی دوور خستەوە. لەو ئان و ساتەدا دیتم ئەشقیایەك عاشقانە چاوی دەگێڕا و هات هات لە پێش من راوەستا و تێڕوانیم:

+ تۆ...

-ئا، منم، تۆ...

+ئا، منم.

دوای پرژانی چەند رستەیەکی ئاوی لەو هەورێیە ئاگریە، بە بێ پەنا بردن بۆ هیچ کەرەستەیەکی زمان پێیم گوت:

تۆ هەندرێنی بەڵام بە کانیاو و سەوزاییەکانیەوە

نەك هەندرێنی تاشە بەرد و وشکانی...

دەتگوت لەو زمانە پەنهانیە تێگەیشت، تەماشایەکی وردی کردم و بزەیەکی هاتە سەر لێوی و قۆڵی لە قۆڵم هەڵکێشا و بەرەو کەپرێك هەڵکشاین، کەپرێك لەو کەپرانەی ماڵی ئەشقیا بوون، ئەو ئەشقیایانەی بە پێی لۆژیکی بزن بۆ تاقە شەوێك جێگەی خۆیان خۆشدەکرد و ماڵیان چێدەکرد.

پێشتر لە دوورەوە زۆر دوور، لە دوورایی چیاکانەوە هەندرێتم دەناسی، چەند شیعرێکی لە ناو کۆڵەپشتەکەم تێکەڵی وردکە نان ببوون، لەو شیعرانەی بۆ دۆزەخ بە کەڵکم دەهاتن، هەندرێتی دوورم لە دوو ڕێگەوە ناسی شیعر و کچێك، شیعر با لەوێ بێت، کچێك خەڵکی ئەو دیو بوو، دیوی ڕۆژهەڵات، کچە لە بن عەبای ئیمامی مەزنەوە رایکردبوو، ئەویش ئەشقیا بوو، پێش جمکە ساڵانەی ژەهر بارەگایەك بە زمانی چیا بە هەندرێتی ناساندبوو، کچە بە هەموو جوانی و ناسکیی خۆیەوە، جوانیی هەندرێتی لە دیدی من دەنەخشاند، بە هەموو شیعرێتیی خۆیەوە لە شاعیرێتی هەندرێن دەدوا، ئەو کچە ئەشقیایە ڕۆژهەڵاتییە چ عاشق بووا چ شاعیر بووا چ شیعر بووا ئەو کچە وشە هەناریە چەندان شیعری فەروغ و شاملۆی لەبەر بوو، ئەو کچە پرچ هەوریە پەنجەرەی ناسینی ئەو دوو شاعیرەی بە ڕووی مندا کردەوە، پەنجەرەیەك تا ئێرە درێژ بۆتەوە، لە کردنەوەی بە کوردیی شیعری ئەوانە، کاتێك گرفتی وشە لێوە ناسکەکانی دەگەستن، بە هێمای پەنجە شیعریەکانی، بە چاوە چیرۆکیەکانی، مەستی دەکردم لە تێگەیشتن، ئەو ساتانەی بە دەنگە بارانیەکەی فەروغی دەخوێندەوە هەستم دەکرد وا لە تەنیشت فەروغم و لە بن باڵی شنە بایێ بە سەر دەریادا دەفڕم، من چەندێ بەو کچە مەست دەبووم، ئەو هێندە سەرگەرمی هەندرێن بوو، جارێك بە دەم ترشۆکە کردنەوە، لە دەو ئەو جۆگەیەی بە تەنیشت بارەگادا خوڕەی بەهاریی دەکرد، لە بیرمە گوتی:

حەیف هەندرێتیش بەو شاعێرێتیەی خۆیەوەلە بن تاشەبەردان بە دیار تفەنگەوە خەساریی تەمەن دەکات.

منیش نەدەبوو ئەو قسەیەی لەمێژ بوو لە زارم بوو، چیدی بیهێڵمەوە:

تۆ هی ئەوەی جلکی ئەشقیا بپۆشی؟ هی ئەوەێ جلکی سمێڵ بابڕان بپۆشی؟ تۆ کوا کڵاشینکۆفت لێدێ! تۆی کەمانچە، هەر بە کەمانچەوە جوانی.

بە نازەوە زۆر بە نازەوە لێوە خونچەییەکانی هەڵقرچاند:

چی بکەین! ئەوە سەدام و ئیمامن چۆنیەتی ژیانی ئێمە دیار دەکەن، نەك خۆمان...

لە شەوانی بەفرینی چیای گارە لە شانی چەپی گوندی ( کافێ )ی گەرمبوونەوە چەندان شەوی لە بەفر سپیتر لەگەڵ کچە و پیاوەکەی و چەند ئەشقیایەکیدی لە ماڵە کۆلیتیەکە بە دەم خواردنی تەحین و دۆشاو و چا خواردنەوەوە، بە دیار سۆبە دارینەکەوە سەرما و سۆڵەی گارەییمان بە شیعر گەرم دەکردەوە، لە باسی سیاسەت و هزر لەگەڵ کچەی شاعیردا گەمژانە سەنگەرمان لێکدی دەگرت، دەمدیت برۆ باریکەکانی دەهێنایەوە یەك و بە تووڕەبوونێکی ناسکەوە دەیگۆت:

تۆ مارکسیستێکی لە شێوەی سارتەری.

نازانم چ گۆڕانێکیش بە سەر برۆ پڕەکانی منیشدا دەهات، بەڵام لە بیرمە دەمگوت:

تۆ کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕی رۆژهەڵاتیانەی.

قسەیەك لەو قسەیەك لە من، تا وای لێدەهات لە نێوانماندا چیایەك جیاوازی لە ناو هۆدە گچکەکە قیتدەبۆوە، لێ چیای جیاوازی هێندە تەمەنی نەدەکرد، بە خوێندنەوەی شیعرێك، لە جێی چیا جۆگەلەیەکی روونی چاو قرژالی هەردووکمانی تەڕ دەکردەوە و بەرەو تێکەڵبوونەوە دەچووین، ئەو کچە چەند جیا بوو لە کچەکانیدی، جیاتر لە جیایی نێوان دوو رەگەز، ئەوان تەنها زمانی هەڵدان بە باوکایەتی حزبیان دەزانی، بەڵام کچە هەمیشە بەهاریەکە ئاشنابوو بە زمانی شاملۆ، فەروغ، هێمن، هایدە، گوگوش، ماملێ... دەیزانی وەرزێك بێ پسانەوە بە زمانی موزیك قسە بکات، من لە بیری خۆمم بردۆتەوە، دەنا کچە موزیکیەکە زۆر شتی فێر کردووم، پێش نیوەڕۆیەکی بەهاری دوو بە دوو دیسانەوە بە دەم ترشۆکە کردنەوە بیرمە، وەك تامی ترشۆکە لە بیرمە، گوتی:

خۆشی ئەگەر بە کەوچکی چایەش بیپێوین، رەنگە لە هەموو جێگەیەك نامبکرێ! خۆشیی ئەم بارەگایە لەوەدایە کە کەسێك هەبێت شیعر بلێ،

کەسێك هەبێت گوێ بداتە شیعر، هەندرێن چوو، تۆهاتی.

ئەو کاتەی لە نزیکەوە هەندرێتم دیت و ناسیم لە بیرم چوو قسەی ئەو کچەی بۆ بگێڕمەوە.

ئەو کچە چەندێ ناسك بوو! رێواسی ناو بەفر زۆر لەو دەچوو، هەموو لاسکە ناسکەکانی رۆژهەڵاتی و ئێرانیم لەودا دەدیتەوە، لەو چڵە نێرگزانە دەچوو کە لە بەهارە عاسێیەکەی لووتکەی پشت بارەگاکە، پێلووی جوانییان دەکردەوە، ئەو لووتکەیەی چێشتانان بزناسا پێیدا هەڵدەگەڕام، دەگەیشتمە دیداری نێرگزەجاڕ و بە چەپکێ نێرگزەوە غلۆر دەبوومەوە، وا رێکەوتووە لە کەشێکی گورگەزێوە، چڵ، چڵ دابەشم دەکرد بەسەر کچە بە پیاوبووەکانی بارەگای ئامێز بۆ نێرگز ئاوەڵا، لە ناو چڵان ناسکترین چڵیش بۆ کچە شیعریەکە، ئەو کچەی زیاتر لە رێواس دەچوو نەك نێرگز! یادەوەریم دەڵێ، یەکەم پیتی ناوەکەی دوا پیتی رێواس بوو، من ناوم نابوو رێواس... جارێکیان بۆ ئەوەی من چیای جیایی بۆ جۆگەلەی روونی تێکەڵبوون شیعری (چڵێ نێرگز)م بۆی خوێندەوە، ئەو شیعرەی لە وەرزی وەرینی نێرگزدا نووسیبووم، کۆپلەی یەکەمم لە بیرە:

لە بەر دەرگایماڵتان
بە مەلوولی
دەستەکانت خستوونەتە
ژێر کەڵەکەی خەم
لە چاوەڕێی چڵێ نێرگز
نێرگزی چاوت سیس بووە...

دێتە بیرم وەك تەوانەوەی بەفری گارەم دێتەوە بیر، هێشتا لە خوێندنەوەی شیعرەکە نەبوومەوە، سەرم هەڵبڕی، دیتم، دڵۆپە فرمێسکی نێرگزیم لە سەر گۆنای دیت، لەوێوە لەو فرمێسکانەوە زانیم، گریانی رێواس واتە وەرینی گوڵگوڵی گوڵە نێرگز، ئەوەشم جوان لە بیرە، بارینی باران لە بیر بکەم ئەوەم لە بیر ناچێتەوە کە بە دەنگێك فرمێسك

شاردنەوەی پێوە دیار بوو، گوتی:

رەنگە کەسێکی زۆر ئازیزت جێهێشتبێ؟!

وشەی (رەنگە)ی هێند ناسك گۆ کرد، زمانی لە گۆ بردم و نەمتوانی قسەیەك لە (رەنگە)کەی ئەو بکەم، من زستانێك و سەرەتای بەهارێك لە شەربەتی دیداری پاکی کچەی رێواسیم خواردەوە، ئەو ژنە تەمەنی هەبوو، لێ سیما منداڵی بەجێنەهێشتبوو، دەتگوت جۆی بەژنکردووی بەهارێکی بە بارانە تازە دە کەپەنکە دایە، ئەو رۆژەی بە تەوقەیەك نازانم ناوی تەوقەی چ وەرزێکی لێنێم، بۆ هەتا هەتایە ماڵئاواییم لێی کرد، بە چاو پێیم گوت:

ئەگەر لە هەر بارەگایەك، هەر رێوبانێك کچێکی وەك تۆم لەگەڵ بێت، ئامادەم حەفتا زستان و بەهار بە ئەشقیایی بمێنمەوە.

ئەویش بە چاوە شەرمنەکانی شتێکی گوت، وا بزانم ئەوها بوو:

وا بزانە لەگەڵتایە!

لەو ساتانەی بە تەنیشت هەندرێنەوە بە سەر تاشەبەردە ئاگرینەکانەوە، سەرەو کەپرەکە هەڵدەکشاین، دیتم کچە بەهاریە شیعریەکە جۆگەلەیە و تاشە بەردەکان فێنك دەکاتەوە، بە کچی جۆگەلەییەوە گەیشتینە بن کەپرەکە، لە سەر تیشەبەردێکی بە جیقنە رەنگرێژ، لە رووی کتێبێك کە پری سەری وردە گەڵای مردوو بوو، وشەی (بۆدلێر) لە چاوم درەوشایەوە، زۆری نەبرد بۆنی (گوڵە بەدەکان) ئەو ناوەیان پڕ کرد و سەرمەستیان کردم، مەستبوونێ زۆر لەو مەستبوونە دەمەو عەسریە بەهاریانە دەچوو کە سالانی پێش بە چیا کەوتن و ئەشقیا بوون، دوای هەڵدانی یەك دوو بیرەی (فەریدە)، پەرستگای (سەمەرقەندم) جێدەهێلا و بە دوو سێ کتێبی مەیلەو قاچاخەوە، بە بن نەرمە بارانی بەهاری، بە بن دیواری قەراتێ هەڵدەکشام بەرەو (باتە)ی کچ لێ باریو، لەوێشەوە خۆ بە (قەیسەری) داکردن، ئەو قەیسەریەی لە خەیاڵی من لە هەر کۆلانێکی جامەیەکی جوان دەبینرایەوە، لە گوڵە بەدەکانەوە بۆنی رامبۆش بڵاوبۆوە،

بە ناو شاخ و دۆڵی پیاوکوژاندا خۆی گەیاندە کەپر، ئیدی چەپك چەپك گوڵە شیعریەکان بۆنیان دەڕژاندە کەپرەوە، هاتن هەموو ئەو شاعیرانە هاتن کە بۆنی گوڵە بەدەکانیان لێدەهات، کە بۆنی هەرچی گوڵ هەیە لێیان دەهات...

شەو داهات، شەوە بەفرینەکانی ژوورە تاقانەکەی گارەش بووە مێوانی کەپرە شیعر، ئەو شەوە کەپرەکەی هەندرێن چ ئاوەدان بوو! چ سەوز بوو! چ تەڕ بوو! چ مێوان بوو! چەند شیعر بوو کەپرەکەی هەندرێن! لەمێژ بوو نیو هێندە گوێم نەگرتبوو، لەمێژ بوو نیو هێندە قسەم نەکردبوو، ئەو شەوە کەپرەکەی هەورێ کەپری کودەتابوو بە سەر کەپرەکانیدی، کودەتای شیعر بە سەر شەڕ و سیاسەت و حزب و ئیمام و سەدام و... کودەتابوو بە سەر ئەو تاخمە فیشەکەی کە شانمانی وەك جێی پالووە هێسترە چاوساخەکان داخداخ کردبوو، کودەتابوو بە سەر کلاشینکۆفی بن رانمان کە بە سواری متەقی لە خۆی بڕیبوو.. .ئەو شەوە کەپری شیعر لە چیای (هەورێ)وە هەڵفڕی لە بن درەختێکی ئێوارەیی لە درەخت گیراوی (شەوانی هەولێر) نیشتەوە، ئەو شەوە نە هاڕەی فڕۆکە، نە لوورەی تۆپە چیا هەژێنەکان نەدەگەیشتنە گوێی کەپرە شیعر...ئەو شەوە چیایەك نەبوو بە ناوی هەورێ، گۆڕستانێ نەبوو ناوی بالیسان بێت، ئەو شەوە نە مانگی ئاب و نە ساڵی ژەهر خواردوو هیچیان نەبوون، لە سەر گۆی زەوی نە بەغدا هەبوو نە تاران.. ئەو گوڵە جوانانە کوو بەدمەستیان کردین!

هەندرێن دەبوو دوو سێ دەمژمێر بخەوێت، گەردوگولی بەیانی بەرەو سنوور بە رێدەکەوت، سووکە گفتی رووسیایان پێدابوو، ئەو شەوە چەند کورت بوو، کورتتر لە پێچانەوەی چەند جگەرەیەك بە دەفتەری نووسین و تووتنی گەڵای وشکی داربەڕوو، کورتتر لە خوێندنەوەی شیعری فەروغ بە دەنگی پڕ لە مۆسیقای کچە رێواسیەکە، سۆزی دا بۆ ماڵاوایی یەکجاری بە ئاگام بێنێ، ئەو بەردەی بن دار هەنجیرەکەشم نیشانی دا کە لە تەکیدا وەردەکەوتم، نووستم بە خەیاڵی دەنگی هەندرێن نووستم،

کەچی بە گەزەی گەرمای ئاب بەخەبەر هاتمەوە، چ ببینم! هەموو شیعریتی کەپری لەگەڵ خۆی بردبوو، لە کەپردا تاقە گەڵایەکی شیعرت نەدەدیتەوە، یەك پەلکە گوڵی شیعری لە دوای خۆی بەجێ نەهێشتبوو، کەپر لە چۆلەوانیی شیعر دەچوو.

هەندرێن فڕی، وەك ئەو کۆترانەی بە هەرزەیی هەڵمدەدان و نەدەهاتنەوە، وەك کچە ڕێواسیەکە چووە سەوزایی یادەوە، وێنەی سەمەرقەند و مەچکۆ و باکوور و شەوانی هەولێر و قسە گەرمەکانی کامەران موکریی ناو پۆلەوە خۆی بە لاسکە ناسکەکانی یادەوە هەڵواسی.

ئیدی بە ناو لوولەی تفەنگەکانەوە، چوومەوە ئەو خەلوەتگا کاتیەی لە پەنای تیشەبەردێکی چەند هەنگاو دوور لە کانیەکەی (کانی تەلان) مەلوولیمی دەشاردەوە... فڕۆکەکان گەیشتن! ساڵ هەر ئابی بوو، من وا بوومەتە بزنە کێوی، لە سەر دوو قاچ هەورازی بەزینم لە ڕێگە بزنیەکانی قەندیل دەبڕی و پووش و پەلاشی زەمەنم کاوێژ دەکرد، بە یادی بیرەوە میزم دەکردە مەتارەوە و لە تینوێتیدا لە چاوی نەیاراندا هەڵم دەدا.

دواتر نازانم ساڵی چی و لە کوێی ساڵدا وەك بەردەستێی هەڵدراو لە ناو بەردەکانی ناوزەنگ کەوتمەوە، ڕۆژێك فریشتەیەك نیو بوتڵ عارەقی لە ئاسمانەوە بۆم هێنا، گوێم لە زەنگی پێکدادانی یادەکان بوو، لە بیرمە نیگای برادەرە گیانیەکە ئەوەی لەم دێرانە جێی نەبۆوە! ژوورە کچانیەکەی گارە، کەپرەکەی هەندرێن، نامەکەی حەمە عەباس... دەنگیان لە ناو زنجیرەی نەپساوەی زەنگ دەهات، ئەو زەنگەی لەگەڵ ریتمی عارەق جوان دەهاتەوە... ئەو کاتەی ناوزەنگ لە مانگی ڕەمەزانی هەولێر دەچوو، لە بیرەوە بگرە تا عارەقی قاچاخ هەمووی قاچاخ بوون، هەرچەندە هەندێك بەرەلاییم بۆ خۆم بە دەست هێنابوو، بەڵام هەر دەبوو دوور لە چاوان بخۆیتەوە...

دەمەو عەسرانێ دوور لە بارەگا پایزیەکە لە پاڵ دوو گابەردی لە سەر یەك خەوتوو کە جۆگەلەیەکی قەت بێ ئاوی نەدیتی لایلایەی بۆ

دەکردن، لەو بەریشەوە مەمکەکیژە سپی سپی، ناسک ناسک، بە بای پایزی دەلەرینەوە، لە بەری منیشەوە باویلکە کەوتبوونە هەڵفڕین و نەدەنیشتنەوە، لەو کەشە ناسکە پایزیە، بە شووشەیەکی گەنجی عارەق و یەك دوو ئاارووی پیرەوە، ورێنەی رابردووم دەکردەوە، ئەشقیایەك لە دوورەوە بە گاڵتەی ناوزەنگیەوە:

+ نامەیەکت بۆ هاتووە، بەڵام بە پێکێ!

- ئەگەر لە شارەوە بێ، دە پێك بۆ تۆ...

نامەکە لە چوکلێتی گەورە یا لە دۆڵمەی گچکە دەچوو، پێش کردنەوەی بۆنی دۆخین و نیفۆی شەرواڵی دەدا، وەها پێچرابوو، ددانم نەبا نەدەکرایەوە، وشەکانی بۆنی شیعرێتی کەپرەکەی (هەورێ)یان پێمدا پژاند، شیعرێك بوو بەژن بەرزتر لە (مامەندە) ئەو چیایەی لە رۆخی جۆگەلە رۆندکیەکەی قاچاخانە عارەقی قاچاخم دەخواردەوە، ئەو چیایەی جوانترین دۆڕانی پێ نووسیمەوە.

لە ژێرەوەی نامەکە:

برات هەندرێن- تەلبەندی خووی

لە پەراوێزی نامەکە:

لە شەوی ماڵئاوایی،

بەردی جێ خەوتنتم نەدیتەوە

هەناسەم گیراوە بۆ شنە هەواڵی هەڵوێست

چاوم سیس بووە، برا، چلێ نێرگز

## بەرد و بەرد
## لە هەورێوە بۆ قەندیل

چێشتانێکی درەنگە لە سەر چیایەك پالکەوتووین، وەك هەمیشە بەردێکم لە پاڵە، یان من لە پاڵ بەردێکم، ئەو خووگرتنەم بە بەردەوە رەنگە لە باپیرمەوە بۆم مابێتەوە، باپیرم شەڕی عوسمانیەکانی کردبوو، شەڕی ئینگلیزی کردبوو، نازانم شەڕی کێیدیش، من تەنها ساتە زۆر پیریەکانی باپیری خۆمم لەبیرە، زۆر پیر بوو زۆر، بە مەزەندەی خۆم نزیکی سەد ساڵەی کردبۆوە، ئەو پیاوە پیرە بە ئێمەی منداڵی دەگوت:

ناڵێم چەك هەڵبگرن، بەلام ئەگەر هەڵتانگرت، هەمیشە هاوڕێی بەرد بن، لە دەشت و دەرا لە هەر جێگەیەك ویستتان پشوو بدەن، لە دووی بەردێك بگەڕێن و لە پاڵیدا پشوو بدەن، تۆ کە چەکداری ئەوە بزانە کە دوژمنت هەیە، کەسێك نیە لەو دنیایە چەك لە شان بێت و دوژمنی نەبێت، هەر هیچ دوژمنت نەبێت، کەسێك هەیە تەماحگیری تفەنگەکەت دەبێت، ئیدی ئەوە دوژمنێك پەیدا بوو.

من دەمگوت:

باپیرە بەردەکە لۆ چیە؟

باپیرە لە بن چاویلکەوە تیچاوێکی دەدامێ:

ئۆجا با بە کوڕی خۆم بڵێم، بەردەکە کەڵکی چی هەیە، لە کاتێك ئەو دوژمنەی باسمان کرد، لەولاوە لە دوورەوە، ویستی تەقەت لێبکات، تۆ بەکسەر خۆت دەخەیتە پاڵ بەردەکە و بێ منەت بە بەر گوللەی دەدەیت، ئەدی ئەگەر بەرد نەبوو، خۆت لە پەنای چی دەشاریتەوە؟

ئیدی من بمەوێ لە هەر جێگەیەك دانیشم سەر چیا بێت، ناو دۆڵ

بێت، دەشتایی بێت، بێ ئەوەی ئامۆژگاریەکەی باپیرشم بیرکەویتەوە، خۆم لە پاڵ بەردێك دەبینمەوە، ئەوە پتر لە بۆماوەیی دەچێت.

گوێم لێیە دەڵێن:

پشتمان دۆلی گولانە، پێشمان دۆلە رەقە.

منیش لە دلی خۆم دەڵێم:

قورمان بەسەرا گولانەکە ئەوها بوو، دەبێت رەقەکە چۆن بێت!

پێدەچێت ئەورۆ لە دوێنێش گەرمتر بێت، رەنگە شەوەکەشی لە دوێنێ شەو ساردتر بێت، هەندێك چیا هەیە هەزار و یەك رازی هەیە، ئەوەی من زۆر بیری لێدەکەمەوە، شەو و رۆژی چیایە لە هاویندا، رۆژەکەی گەرم گەرم، هێندە گەرم وای لە(نادیە) کرد بە تووڕەییەوە بڵێ:

ئێرە کەی کوێستانە؟ ئەگەر کوێستان ئەوهابێت بەغداش کوێستانە.

شەوەکەشی سووی ساردە، سارد سارد، هێندە سارد وای لە من کرد دوێ شەو کورتانێکم کردە دۆشەك و جلی بن کورتانیشم بە خۆم دادا، ئەوەتا ئێستاش بۆنی ئارەقەی پشتی هێسترم لێدێ.. بۆنێك رەنگە شەو و رۆژێك لە ناو زێ بمێنمەوە لێم نەبێتەوە، هەستدەکەم بۆنی پشتی هێستر تێکەڵی خوێن و گیانم بووە و لەگەڵ تەمەنە، دڵنیام ئەگەر بۆنی ژن نەبا، ئێستاش لێم نەدەبۆوە، ئەو منداڵەی مەتارەکەشمی چۆڕ بڕکرد، هەستی کردبوو بۆنی ئارەقەی هێسترم لێدێ، ناوە ناوە لووتی خۆی دەگرت، بڕێ جار دەیویست لە باوەشم دابەزێ، بەڵام هەورازی رك پەشیمانی دەکردەوە.

شەو درەنگانێ گەیشتینە ناوقەدی چیا، لەوێ گۆڕاییەك هەبوو، دیار بوو جێی رەشماڵی خێڵان بوو، پێدەچێ ئاقاری کوێستانی ساوسێوکە بێ، بۆیێ بەو هاوینە سەرما تاوت بۆ دێنێ.

سەردەستە کە کانەبی گەورەی ناو بوو، گۆتی:

هەتا بەرەبەیان لێرە دەمێنینەوە.

بە راستی مژدەیەکی خۆشە، بیانگۆتبا لە بەغدا کودەتا کراوە، هەر

هێندە دڵخۆش دەبووم، ئاخر کێ ئاگای لە دەردی منە! ئەو شەو چاو نەنێمە خەو، دەبێتە سێ شەو، ئەنگۆ بڵێن، پیاو سێ شەو خەو نەچێتە چاوی، چاوی چی لێدێت! سەری بە کام لادا دەسووڕێ! لە ڕۆیشتنێ پێی کوو کوویی دەهاوێ!

بایەکی ساردی دەهات، لە پەنای کەلەکە بەردێك پاڵکەوتم، نزامکرد خەوم لێبکەوێت، هەستمکرد، خەو ئامادەی هاتنە، وەك دوو شەوەکەیدی نیە، لە بەرم هەڵێ، چەند جارێك خەریك بوو دەبۆرژام، لەرز نەیدەهێشت، سارد بوو، سارد، ئەو هاوینە لە من ببووە پایز، هەستام بە ناو غەرە بەردان بگەڕێ، بگەڕێ دیتمەوە، کورتان و جلم دیتەوە، (بیهێنەو ناوی مەبە)ی حەسەنی قزلجیم بیرکەوتەوە.

هەنووکە جێگەم گەرمە کەس لەو چیایە جێگەیەکی ئەوها گەرمی نیە، لە دڵی خۆم گۆتم لۆ ئێشککگریش هەڵناستم، بانگیشم بکەن هەڵناستم، زۆری نەبرد بۆنێك هاتە ناو سەرم، قەت بۆنی ئەوها ناخۆشم نەکردووە، بە جەمەدانیەکەم دەم و لووتی خۆم لە جل و کورتان شاردەوە، بەڵام ئەو بۆنە تیژە هی ئەوە نەبوو لە جەمەدانی بگەڕێتەوە، زۆرم هەوڵدا لەگەڵ ئەو بۆنە رابێم، لۆ خۆم دەمگۆت:

ئەوە بۆنی سێوە، سێوی ناو ڕەزان، نەک هی ئاسمانێ! با وای دابنێین سێو ئەو بۆنەی دەدا، بای وای دابنێین ئەوە بۆنی دەرپێی ژنانە، بای وای دابنێین...

چەندی بە خەیاڵ کردم بۆنی کۆن و تازەی هێستر بکەمە بۆنێکی وا دژ نەکەوێتەوە لەگەڵ چاو گەرمکردنێ، کەڵکی نەبوو، باشبوو، لە ناو کورتان خەونم دیت، دەنا بەبێ ئەوەی مەبەستم درۆبێت دەبوو درۆ بکەم و بڵێم هێندە لە ناو کورتان مامەوە، کەچی چاوم نەچووە خەوێ، هەر بە ڕاستیش بڕوا ناکەم خەوم لێکەوتبێت، بەڵام چ دەکەی لەگەڵ ئەو خەونەی لە ناو کورتانەوە بە کۆپتەرەوە دیتم، خەونێکی درێژ زۆر درێژ، درێژتر لەو ڕێیانەی پێیدا هاتووم:

له دەشتاییەك بە تەنێ مابوومەوە، كۆپتەرێكم لێ پەیدا بوو، كەوتە دووم، نەوی بوو زۆر نەوی، سەرم نەوی نەكردبا بە تایەی دەكەوت، كۆپتەر هەموو دنیای پێكردم، سەیر بوو نە كۆپتەر تەقەی لێم دەكرد نە منیش زاخی ئەوەم دەكرد تەقەیەكی لێبكەم، هەتا بە ئاگا هاتمەوە هەر غارم دەدا.

رەنگە ئەوە جاری یەكەمم بێت لە سەر چیاوە بە هەموو لایەكدا بڕوانم، كەچی لە هیچ جێگەیەك هیچ جوانیەك نەبینمەوە، گەیشتمە ئەوەی ئیدی كۆتایی جوانیە و ژیان هێندەی بە بەرەوە نەماوە، خەونەكەی ناو كورتانیش بە جارێك زراوی بردبووم، زۆرم لە بارەی خەونەوە خوێندۆتەوە، هیچ لەوانە هیچیان پێ نەبەخشیم، پێناسەیەكی خەونیان نەدامێ، لە بارەی خەونەوە ناچار لە ئەزموونەوە قسە دەكەم، زۆر جار وا بووە ئەو شەو خەونێكم دیتووە، دوای چەند رۆژێك خەونەكە وەك خۆی یان بە تۆزێك دەسكاریەوە هاتۆتە دی، كاتێك خەونە وە راستگەڕاوەكانم دەهاتنەوە بیر، خەونی ناو كورتان لە پەلوپۆی دەخستم، دڵنیام ئەو شەویش وەك هەرسێ شەویدی فت، دوو شەو ژانی دەستم نەیهێشت خەو بچێتە چاوم، دوێ شەو كورتان بۆ بەدبەختی بایی خەونێك خەوی دامێ، خەونێك دەترسم دوا خەون بێت، ئەو شەویش چاوم ناچێتە خەو، بەڵام جارێ بە تەواوی هۆیەكەی روون نیە.

لە هەموو لایەكەوە هەر دووكەڵە، بە بەرچاوەوە دنیا دەسووتێ، تۆپ بە هەموو جۆرەكانیەوە، لە هەموو لایەكەوە لوورە لووریەتی، فڕۆكە و كۆپتەر وەك چاویەشە دەگەڕێن، پێدەچێت ئەوڕۆ كارەساتی گەورە بەڕێوە بێت، من زۆر جار ترساوم، بەڵام ترسی ئەوڕۆ جیایە لە ترسان، رەنگە ئەوانیدیش بترسێن، لە سەر ئەو بەردەی دانیشتووم، بەو ئاراستەیەدا دەڕوانم كە لێیەوە هاتین، بە ئاراستەی چیای هەورێ، وەك دەبینم ئاسمانی هەورێ لە ئاسمانی هەموو چیاكانی دنیا دووكەڵاویترە، هەورێ هەر ئەوڕۆ نا، لەوەتەی ئاشنایەتیم لەگەڵی پەیدا كردووە، هەر لە ناو دووكەڵدا دیتوومە،

بڕواناکەم چیای (ئاگری)ش هێندەی هەورێ ئاگری گرتبێت.

شەوێدی نا ئەویدی، ئەو دەستەیەی ئێستا وا خەریکە بەرەو دۆڵە رەقە شۆڕدەبینەوە، لە هەورێ بووین، لەوێ بە دیوی بالیساندا لە تەلاتێك کانیەکی جوان بارەگایەکی بە دەوری خۆی هەڵدا بوو، کانیەکە لە هەموو جێگەیەك بە (کانی تەلان) ناوی رۆیشتبوو، ئێمە لە کانی تەلانی هەورێوە دێین و هەوارمان پشتئاشانی قەندیلە.

درەنگانی عەسر، بووە فسکە فسك و سرتە سرت، دیتم هەر پێشمەرگە بوو بەرەو کەپرە گەورەکە کە کەوتبووە لای سەرەوەی بارەگا هەڵدەکشان، چاوم گێڕا، هەمووی سێ چوار کەس ماینەوە، جگە لە من ئەوانیدی مندالکار بوون، تەمەنیان نەدەگەیشتە هەژدە، یەکیان خۆزگە ناویم لە یاد دەما، لێم نزیك بۆوە:

+هاوڕێ، تۆش هەو نیت؟!

- نەخێر هەو نیم.

+ لەبەر چی؟ ناتکەنێ؟

- دەمکەنێ، بەڵام بە خۆم حەزناکەم.

+ پێچەوانەی من، من حەزدەکەم بەڵام نامکەنێ، باشە تۆ بۆ حەز ناکەیت، ببیتە ئەندام؟ بەڵام بڕواناکەم هەو نەبیت، وا بزانم لەبەر ژانی دەستت وازی چوونە کۆبوونەوەت نەبوو؟

- نا پەیوەندی بە دەستمەوە نیە، باوەڕبکە من هەو نیم.

وا بزانم، باوەڕی نەکرد کە من ئەندام نیم، هەر تەماشای دەستمی دەکرد:

+ باشە دووپشك ئەوها دەیەشێنێ؟

- لە بەدبەختی منە، دەنا هەیە دووپشك پێوەی دەدا، تەقەی سەری دێ.

شەوی پێشتر هەر لەو جێگەیەی لەگەڵ ئەو کوڕە گەنجە گفتوگۆمان لە بارەی پارت و دووپشکەوە کرد، واتە هەر لە بن ئەو دار هەنجیرەی کە جێگەی شەش حەوت کەسی لێ دەبۆوە بۆ خەوتن، لە پاڵ ئەو بەردەی

وەها رۆچووبووە زەوی، هەرچی تۆپی بەغدا هەیە پێی کەوتبا، نەدەبزوا، لە سەر پشت راکشابووم، بۆرژابووم و نەبۆرژابووم، هەستمکرد شتێك لە سەر نێوچەوانم پیاسە دەکات، وای بۆ چووم فەرخە بۆق بێت، هەر هێندەم لە دەست هات، بە هەموو هێزی خۆم بە نیازی فڕێدانی، دەستم گەیاندێ، فڕێمدا، گوێم لە تەپەشی بوو لەولاوە بە عەرد کەوت، بەڵام ئەو هێشتا وا بزانم هەر لە ئاسمانێ بوو، ئاگری جگەرەیان بە پەنجەمەوە نا، ئاگری چی! خۆزگە ئاگر دەبوو، ئەوانەی لەوێ نووستبوون هەستان:

چیە! چیە؟

ئیدی لایتیان لێدا، دیتیانەوە، کوشتیان، دووپشك، چ دووپشك، چەند گەورە بوو، چاوی من گەورەتری دەبینی... ژان لە پەنجە رانەوەستا، رۆیشت بەرەو ناو لەپ و پشتە دەست، بەوێش نەوەستا، هەڵکشا بەرەو باسك و قۆڵ، ئیدی دەستی راستم لە سەری پەنجەوە تا دەگاتە دەماری ملم ئاگری گرت، دەیتریواند، هەمووی دەرزی رێژ بوو، ئۆقرەم لێ هەڵگیرا...

هەڵکشام بۆ کەپرە گچکەکەی سەرێ، شەو رووناکە، شەوانی هەورێ نازانم دوو وەرزەکەیدی بەڵام هاوین و پایزان هەمیشە رووناکە، شەوی هەورێ بێ مانگ رووناکە، هەورێ هەمیشە لە چەند لایەکەوە دەسووتێ، رووناهیی ئاگر دەگاتەوە ئاگر، خۆم گەیاندە ئەحمەد عەرەب، ئەو کوڕەی لە خولێکی پازدە رۆژی ببووە دکتۆرێك چەپ و راست دەرزی رادەوەشاند، پەسیوت گرتبا، دەرزی قوتاری نەدەکردی، دەیانگوت:

نەشتەرگەریی کچکە لای وی ئاو خواردنەوەیە، کەمێك تووڕەی بکەیت، نەشتەرگەریی گەورەش ئەنجام دەدات...

دکتۆر ئەحمەد هەر بە چاوی خەواڵووەوە دوو دەرزی خێواندمێ، گۆتی:

ئێستا بەسە، سبەی زووش دەرزیەك، ئەگەر ئەوانیش لێرەبان هەر ئەو دەرزیەیان لێدەدای.

ئەوان، ئەو دوو دکتۆرەی لەمێژ نەبوو لە رووسیاوە گەڕابوونەوە، لە دوێنێوە بە هاواری سیامەندەوە بۆ دیوی نازەنین چووبوون، سیامەند زۆر برادەرم بوو، دەمێك بوو دەمناسی، لە گارەش سەروەختانێك بەیەکەوە بووین، پێکەنینێکی هەبوو خودایی، مندالی، لەو پێکەنیانە بوو کە نەخۆشی چاکدەکردەوە، لە بیرمە هەرچی نزای جوان بوو بۆ سیامەندم دەخوێند کە چی لێ نەیەت...

ئەو شەوە لە ژانی دەستم هەر هاوارم کرد، شەوی دواتریش هەر وەك شەوی پێشوو، ئێستاش وا دەگەینە دۆلە رەقە هێشتا کەمێك ژانی ماوە.

دوای کۆبوونەوە، یەکێك پێمی گوت کە خۆم کۆبکەمەوە بەر لە بەیانیدان دەڕۆین، بۆ کوێ؟ وەلام نەبوو، ئیدی تفەنگم خاوێنکردەوە، کۆلەپشتیش ئامادەیە.

دەمەو خۆرئاوابوونە، هەوالێك گەیشت، لە بیرمە تاسانێك تاسام کەم جار وا تاساوم، سیامەند...

هێشتا لە هیچ چیایەك بەیانی نەدابوو، شۆڕبووینەوە، بە دەست و دلی پڕ ژانەوە، شۆڕبوومەوە، دەستم ژەهری دووپشك و دلیشم ژەهری هەوالی مەرگی سیامەند، لە رێ زۆر دەترسام، لە رۆیشتن دەترسام، بە ترسەوە پێم لە عەرد دادەنا، نەرم دامدەنا، نەمدەهێشت ئەو زەویە ئازاری پێبگات کە رەنگە بەرێکەوت مارێك لەو بەری رێگەوە بیەوێ بپەڕێتەوە بەرەکەیدی، پێ لە مار نان واتە مردنێکی پڕ لە هاوار، هاوارێك دۆلاودۆل شاخەو شاخ لە با تیژتر دەڕوا، بە بیرم نایە هێندە لە رۆیشتنێ ترسابم، رێك پێم لە شوێن پێی ئەو پێشمەرگەیە دادەنا کە لە پێش منەوە دەڕۆیشت، کاتێ گەیشتینە نزیک جادە، تازە هەتاو کەوتبوو، گوتیان:

ئاگاداربن، دەست لە هیچ شتێك نەدەن، رەنگە....

پێش دوو سێ رۆژ بۆ جاری نازانم چەندەمین دووکەلی زەرد و سپی دووکەلی رەنگاوڕەنگ بەرز بۆوە، لە کانی تەلانەوە لێم دیار بوو، گوتیان کیمایە، دۆل نیە لە دنیایێ هێندەی دۆلی بالیسان باوەشی بۆ کیمیا

گرتبێتەوە، عەلی کوتك کە لە بارەی کوتکی ناوەکەیەوە یازدە چیرۆکی جیا جیا لە سەر زاران بوو دەیگۆت:

ئیدی کەس نەڵێت دۆڵی بالیسان، ئەم دۆڵە لە ساڵی پارەوە ناوی گۆڕاوە بۆ دۆڵی کیمیا.

هەر ئەو عەلی یازدە کوتکە دەیگۆت:

فڕۆکەکان هەر جارێك بە نیازی خنکاندنی دۆڵێك، چیایەك، گوندێك، کیمیایی لە خۆ باردەکەن و بەرێدەکەون، شوفێرەکە لەوەی تەنیشتی دەپرسێ:

ولەك ئەگولەك بەشی بالیسانمان لەبیر نەکرد؟

ئا، بیرم کەوتەوە، ئێمە هێشتا لە بەری هەورێ بووین، دوو سێ فڕۆکە ئەو دۆڵەیان دابێژا، کەمێ کیمیاشیان پێداکرد، گوندە کاولبووەکەی دەو جادە، دیدڤانە بە سەر ئەو سپێدە کیمیاییەوە، لە دوورەوە بۆن هات، بۆنی(سێوەکە)ی سەدام هات، بۆ خۆلادان لەو سێوی مەرگە، ئەگەر پێرابگەیت، سێ چوار رێت لە پێشە، من پێشتر وێنەی ناوی چوارینی خۆم ئەزبەرم کردبوون: ئاو، ئاور، هەڵاتن دژە باو و هەڵگەڕان بۆ جێی بەرز...

دەستم بە ئاوەکە راگەیشت و نیوەی مەتارەکەم بە جەمەدانیەکەمدا کرد و خۆم دەمامک دا، لەو رێیە مەرگی دارستانێ، تۆ بڵێ ئاسمانێ، مەلم دی، کەو و کەڤۆک، کۆتر و باشووکە، قەتێ و سۆفیلکە، هەوێردە و کێشکە... مەل لە سەر زەوی باڵێکی راخستبوو، باڵێکی بە خۆی دادابوو، دندووکی...

هەر زوو هەندێ پێشمەرگە، چاویان سوور هەڵگەڕا و کەوتنە کۆخە کۆخ، هەستمکرد هێسترێکیش بۆنەکەی هەندێ بۆنکردووە، ریز ریز وردە رۆندکانی دەباراند.

هەورازەیەك هاتە پێش، ناوەکەی دوو وشە بوو (دەرە)ی لەگەڵ بوو، وشەکەیدی یان (دار)ە یان (شیر)ە جا لەو دەرە دارە یان دەرە شیرە بە سەردەکەوتین، ئا، دەرە شیر بوو، گوێم لێبوو باسی (پشتئاشان) یان

دەکرد، پێشمەرگەیەك هەر لەو هەورازە زانیم ناوی مام سالحە، وا بە سەرپشتی هێسترێکەوە، کەمێك نەخۆشی پێوە دیارە، سێوەکەشی بۆنکردبوو، بەڵام لە قسەی خۆش ناکەوێت، لەوەوە بیستم و پێکەوتم کە هەواری ئێمە پشتئاشانە، هەر لەو هەورازەیە لە جاران روونتر بۆم روونبۆوە کە هەندێك شت هەیە لە (( پیازەکە)) بێ بەهاترە، کەچی دەکرێتە نهێنی و بەس حزب دەیزانێ! هەر لەو هەورازەیە جارێکیدیش وەك جاری تاین بیرمکردەوە بۆ ئەوەی هەندێ مافی زۆر سادەت نەسووتێ، ئەگەر بە نابەدڵیش بێت پێویستە ببیە ئەندام، بەڵام هەر زوو وەك جارەکەیدی لەو بیرۆکەیە پەژیوان بوومەوە.

هەورازەی دەرەشیر زۆر رک و سەختە، پەیژەی بەردە، هەمووی دەستکردە، بە بەرد چێکراوە و هەڵنراوە، هێستر نکەنکی پێدەکەوێ، پێشمەرگە تا سەر دەکەوێ، هیچ نەبێ مەتارە ئاوێکی دەوێ، باش بوو، لە نیوەی رێ، یان کەمێ سەرترێ، ئاوێ پەیدا بوو، ئاوە شیری دەڵێنێ، ئەو کانیاوەك پێدەچێ خوداوەندی خێرۆمەندی ئاو، بە دەستی خۆی بۆ رێبوارانی خۆی لەوێی هەڵقولاندبێ!

ئەو هەورازە و زۆر هەورازەیدیشمان بڕی، ئێ، ئێرە دۆڵی مەلەکانە، ئەو مەلەکانەی گوێزەکەی لە گوێزی هەورەمان بە تامترە، لێ شکانی تۆزێ زەحمەتترە، ئەو مەلەکانەی هێندەی پەلکی دار و باری مەل و باڵداری هەیە، ئەها، لەگەڵ تۆپە چیا هەژێتەکان پۆل پۆل لە درەختی سووتاو دەبنەوە و خۆ بە درەختێکیتردا دەدەن، لە عەرد و عاسمان شوێنێ نابیننەوە بۆ تاوێ هەسانەوە، گوێزیش، قل قل، بە شینی بەردەبنەوە!

لە شۆڕبوونەوەیەکدا لە پشووێکی چەند جگەرەیی نانێکمان خوارد، رەنگە نانی نیوەڕۆ بووبێت، چیمان خوارد؟ بەس چایەکەم لە بیرە، لە چیا هەموو شتێك لە بیر بچێتەوە تامی چایە هەر لە زارە، بە دەم چا خواردنەوە و جگەرە کێشانەوە بە ناوی گفتوگۆوە بووە شەڕەقسە، دەمەقڕە، هەموو قسەکانیش لە دەوری ئەو ژەهرەدا تێکهەڵدەقژان کە ئیمام خومەینی لەمێژ نەبوو نۆشی گیانی کردبوو:

- شەڕ راوەستێ! شەڕ راوەستێ! ئەوە راوەستا، دە بیخۆن دەی!
- گرنگ ئەوەیە راوەستا، گرنگ نیە ئێمە چیمان بە سەر دێت.
- ئەوە ئەتو شێت بوویت؟ کوو گرنگ نیە ئێمە چیمان بەسەر دێت، من خۆم پێ گرنگە تێگەیشتی؟!
- قسەی قۆڕ، نابێت بەرژەوەندیی خەڵك لە سەرەوەی بەرژەوەندیی خۆمان دابنێین.
- ئەمن لەمێژە گوتوومە شەڕی بەغدا و تاران راوەستێ، یەك پێشمەرگە لەو دیوی قەندیلیش نابینیەوە، دەبینە ئاردی ناو دڕکان، ئەوەتانێ بە چاوی خۆشتان دەبینن.
- من وای دەبینم بە راوەستانی شەڕەکە خەڵك رادەپەڕن و حکومەت دەڕووخێ.
- تڕحێوا ئەوەت لە کێ زانی؟
- بۆ دیارە تۆ ئاگات لە سیاسەتێ...
هەموو دایانە بێدەنگی، ئەوانەی بە ئاراستەکەیدی قسەیان کردبوو، وەك بڵێی هەستیان کرد زمان درێژییان کردووە.. .بەڵام لە کۆتایی قسەکان کوڕێك کە ناوی هەردی بوو بە خۆی نەوەستا، لە بەرگێکی گاڵتەئامێزی گوتی:
کوو ئەو حزبە داکی مەی گایە، ناوێری بە دڵی خۆت قسەك بکەی، رێك قسەکی پێچەوانەی تۆی هەیە.
ئیدی بە پێکەنینەوە بەڕێکەوتن، بڕۆ بڕۆ، هەر بڕۆ، لێرە و لەوێ دەستە دەستە پێشمەرگەمان دەدی بە ئاراستەی ئێمەدا هەڵدەکشان، عەسرێکی درەنگە، لە سەر چیایەك دانیشتبووین، پشت لە رۆژ، پشتم بە بەردێك داوە، چاوەڕوانی ئاوابوونی رۆژمان دەکرد، هەر ئاوا بێت ئێمەش ئاوابین، دەیانگوت:
زۆر جوولە جوول مەکەن، ملە قوتێ مەکەن، با نەبینرێین.
هێژ رۆژ چەند باڵێکی ماوە، وا دیارە ئەوجارەش وەك زۆر جاریدی

زەردەپەڕ نەبینم یان چێژی لێوەرنەگرم، ئاسمان سەرانسەر دووکەڵە، چیا نیە، دۆڵ نیە ئاگری تێبەرنەبوویێت، ڕۆژ دەڵێی جووجکەی پشت بە تەنیە، لە هەموو لایەکەوە تۆپبارانە، ئاسمان فڕۆکەی لێ نابڕێ... مشتومر و دەمەقرێیە، هەرایە، کەس قسەی خۆی ناناسێتەوە، وا بزانم ئەوەی لەو هەرایە دوورە و لە هیچ هەڵناداتێ منم، نادیەش ورتەی لێوە نایەت...

ئەو کچە بەردەوام خەریکی قەیتانی پێڵاوەکەیەتی، شلی دەکاتەوە، توندی دەکاتەوە، دیسانەوە شلکردنەوە، ئەو جارە و دەیان جاریدیش توندکردنەوە، چەند جارێ دەمویست پێبڵێم:

بۆچی پەنجەکانی دەستی لە قەیتانی پێڵاوەکانی نابنەوە؟!

پەژیوان دەبوومەوە هەستم دەکرد ئەو پرسیارە خۆ تێهەڵقورتاندنە لە کاروباری تایبەتی.

بە بەر چاومەوە ڕۆژی دووکەڵاوی لە بەرزایی چیایەکەوە ئەو چیایە نازانم هەورێ بوو یان چیایەکی وەك وی، ئاودیوی ئەو دیو بوو، بێ ئەوەی بایی تیسکە تیشکێ جوانیی تێدا ببینمەوە، دووکەڵ هەموو جوانیە سرووشتیەکانی داپۆشیبوو، بە ئاوابوونی ڕۆژ، لە گشت لایەکەوە ڕووناکی بەرز بۆوە، بە ئاوابوونی ڕۆژ ئەوجا تێگەیشتم سەراپای ولاتێك، بە چیاو ، دەشتیەوەم وا گڕ گڕ دەسووتێ، بە ئاوابوونی ڕۆژ دیتم ئەو بەشەی دنیا بە بەر چاوی دنیاوە ئاگری گرتووە، ئاگرێکی ئەوتۆ مەگەر پەڕجوویەك هەورێکی هیزی نادیار بنێرێ و بیکوژێنێتەوە، دەنا تا دنیا دنیایە هەر دەسووتێ و سووتانێکی دۆزەخی.

ئێستا، پشتمان وەک بیستم دەڤەری زینی ستێرۆکانە، پێشمان نشێوێکە، کەس ڕێی پێنەکەوێ.

شۆڕبووینەوە، نشێوێکی زۆر سەخت بوو، من ڕێك لە دووی هێسترە ڕەش دەڕۆیشتم، جار جارە هێستر پێی دەڕۆیشت، دەمگوت ئەو جارە لە بنی دۆڵێ دەیبینینەوە، بەڵام جار لە دوای جار جوانتر خۆی دەگرتەوە، هێستر لە نشێوان لە پێشمەرگە باشتر خۆی دەگرێتەوە، لە چەند شتێك ئیرەییم بە هێسترە ڕەش دەبرد:

یەك: خلیسکی پیسی دەبرد و جوان خۆی دەگرتەوە، ئەگەر من خلیسکی وام ببردایە کەس بە سەرم رانەدەگەیشت.

دوو: پێڵاوی ئەو نوێ بوو هی من کەون، تازە ناڵ کرابوو.

سێ: دەمزانی ئەگەر بکەوینە بۆسەوە و لێکدی دابڕێین من بە رێ ناکەومەوە، بەڵام هێستره رەش بە ئاسانی رێی خۆی دەبینێتەوە ئەگەر دنیا ئەنگوستە چاویش بێت.

نازانم چەندی پێچوو، گەیشتینە دەو رێگەیەکی تەخت، نازانم نە جادە بوو نە لە جادە دەچوو، گوێم لێبوو گوتیان:

ئێرە گولانە.

دیتم هەندێك روویان لە خانووچکەیێ کرد، منیش لێی نزیك بوومەوە، دووکان بوو، ویستم بچمە ژووری، باش بوو گیرفانم بیر کەوتەوە، لە جێگەی خۆم وەستام و پشتاو پشت گەڕامەوە، دەمدیت هەر بابایە پسکویت دەکڕێ، بەڵام من نەمکڕی، بە چی بکڕم! گیرفانێکی بەتاڵ، لەو پێش دووکانە باشتر لەوە گەیشتم کە وەك چۆن لە ناو قەیسەریی هەولێر پێویستە گیرفانت شتێکی تێدا بێت، لە پێشمەرگایەتیش نابێت گیرفانت بەتاڵ بێت، هێشتا چەند رۆژێکی مابوو بۆ وەرگرتنی ئەو (١٠) دینارەی کە مانگانە بە ناوی یارمەتی وەرمان دەگرت، تازەش ببووە (١٠) دەنا هەر (٥) دینار بوو، ئەوەش هەر بەشی تووتن و دەفتەر جگەرەی دەکرد.

زۆر خێرا لە رێگە بەرینەکە پەڕینەوە ئەو بەر، ئیدی هەورازەیەك لە نشێوە سەختەکە وەریگرتین و بەو شەوە بە هەناسەبڕکێوە هەڵکێشاین، دەو رێی هەورازەکە پێچەوانەی نشێوەکە هەمووی پووش و پەڵاش بوو، بۆیە زۆر بە ترسەوە پێم لە سەر عەرد دادەنا، ترسی پێ لە مار نان رێی لە ماندووبوونم گرتبوو، ماڵنووستنانە، شەو لە هەموو لایەکەوە نووری لێ بەرز دەبێتەوە، نووری ئەنفال!

بازۆ، بازۆ، تا گەیشتینە ئەو جێگەیەی کورتان مێواندارییی کردم، کوێستانی ساوەسێوکە...

لە چیـــاوە لیـــژدەبینەوە، دۆڵە رەقەی رەق و تەق، بە رەقـــی گاسماندەکات، یان من وا هەستدەکەم بانگکردنەکە بە رەقیە، دڵـم دەڵـێ، دۆڵە رەقە دۆڵی نادیاریە و لە گینە لەو دۆڵە بزربین و نەبینرێینەوە... تـا ئەو سەری برسێتی برسیم، تا ئەو بەری تینوێتیش تینووم، لە یەك کاتدا برسـێتی و تینوێتی!...

نـادیە لە پێشـە مـن دەڕۆیشـت، هەڵوەسـتەیەکی کـرد، کۆڵەپشـتەکەی کردەوە، لەو ساتە گەیشتمە تەنیشتی، ویستم لێی رەت بم، دیـتم پسـکویتی بۆم راگرت:

- سوپاس ناخۆم.

+ خۆت پێتە؟

- نا، بەڵام...

+ بگرە، من زۆرم پێیە.

- ناخۆم، بەڵام ئەگەر مەتارەکەت ئاوی تێدایە.

کەمێك ئاوی کردە مەتارەکەمەوە، ئێستاش کە بیر لەو کـاتە دەکەمەوە، هەستدەکەم تامی ئاو و پسـکویتەکەی نـادیەم لە زاردایە، ئـای بە تـام بـوو خودایە! ئێمە بە رێچکەیەکدا شۆڕدەبووینەوە تەنها خۆمان بووین، کاروانی خەڵك، کاروانی ژن و منداڵان بە رێچکەیەکی هەندێك رێتـر رێیانـدەکرد، ئەو منداڵەی مەتارەکەمی چۆڕبڕ کرد، ئەویش لەگەڵ کاروانەکە بـوو، ئەو کاروانەی وا بزانم رێـی ئەنفالیـان گرتبـوو، مـن هەر خەمـی ناسـکم بـوو، منداڵەکە ناسکی ناو بوو، لە دڵێ خۆ دەمگۆ:

ئەدی لە هەورازەیەکیدی کێ لە باوەشـی بکـات؟ ئەدی ئەو جـارە لە مەتارەی کێ ئاو بخواتەوە؟

خەفەتـم لەوە دەخـوارد ئەو کـاتەی لە هەورازەکە لە باوەشـم بـوو، پسکویتێکم نەبوو تا بیدەمێ و دڵی خۆش بکەم، ئەو منـداڵە نـزیکەی سـێ چارەگ هەتا دەمژمێرێك لە دەست و باوەشی من بوو، بەڵام ئێستا کە لـێم جیا بۆتەوە، هەسـتدەکەم دەمـێکە دەیناسـم، وا هەسـتدەکەم نزیکـایەتیەکی

زۆر نزیکم لەگەڵ ئەو ناسکە هەیە، ئەو ناسکەی زۆر نازیمۆک دیار بوو.

بڕۆ، بڕۆ، نشێو دەیدایە نشێو، بەلای هەندێك کەسەوە نشێوەڕێ ناخۆشترە لە هەورازەڕێ، من یەکێکم لە وانە بە من بێت بە دە هەورازی ئاسمانیم هەڵگەڕێتن، نەك بە نشێوێکی سەختدا نشێوم بکەنەوە، دووکەڵ، دووکەڵ لە هەموو لایەکەوە دووکەڵ، تۆپ، تۆپ لە هەموو دنیاوە تۆپ، فڕۆکە هەمیشە فڕۆکە، ترس، ترس، ترس لە عەرد و ئاسمانەوە ترس...

ئەو ڕێیە بۆ من زۆر ترسناك بوو، هەر شۆڕببەوە و ناگەیتە هیچ، بە من بێت هەر بەرەو بەرزایی بەرەو لووتکە سەربکەوم و قەتاوقەت دۆڵم نەیەتە ڕێ، من لە هەموو شوێنێکی نەوی دەترسێم با ئەو شوێنە بەهەشتیش بێت، بۆ یەکەم جار بالیسان منی لە جێگەی نەوی ترساند، ئەو فڕۆکانە منیان ترساند کە بەهاری چووی نا بەهارەکەیدی هەرچی گەڵا و گوڵی بالیسان هەبوو، هەرچی گیانلەبەری زەوی و ئاسمانی هەبوو، هەموویان خستە وەرزی وەرین و ژاکان و سیسبوونەوە، دووکەڵی زەرد و سەوز منیان زراوبردی کرد، بۆنی سێوی ناوەختە گیانی منی لە جێگەی نەویان تاراند.

لە جێگەی بەرز کاریگەریی کەمە، دەنیشێ، هەڵگەڕێ هەر هەڵگەڕێ.

ئەو گوتەیە هی لە بیرچوونەوە نیە، ناوی گۆڕاوی خۆم لە بیر بکەم، ئەوە لە بیر ناکەم، نهێنیی شەو لە بیربکەم، مەتارەی ئاو لە بیربکەم ئەوە لە بیر ناکەم، ئای لەو بەدبەختیە، ئێمە هەروا شۆڕدەبینەوە، ئەگەر ئێستا گوێی شەیتان کەڕ بێت، یەکێك لەو فڕۆکانەی وا لە بەرزایی ئاسمانە، چنگێ ژەهر بڕژێنێتە ئەو دۆڵەوە! خۆ مەتارەکەشم تەڕایەتیەکی وای تێدا نیە، پشتێنەکەمی پێ تەڕ بکەم و دەموچاومی پێ بشارمەوە، خراپ قەوماوە، لەوقوولایی دنیایە و چۆرە ئاوێکیش شك نەبەیت، ئەوجا کیمیاش دابکات! دڵی خۆم بە ئاگر دەداوە، بیستبووم ئاگرکردنەوە کیمیا دەکوژێت، لەو دۆڵەش هیچ شتێك هێندەی دەست گەیشتن بە ئاگر ئاسان نیە.

کەمێك پشوو، پشووێکی وشکی بێ ئاو، بیستویەك مەتارەی وشك لە دۆڵ وشکتر، ئێرە کوێیە؟ گوێم لێبوو یەکێ دەیگوت:

ئێرە دۆڵە ڕەقەیە.

ئەویدی دەیگوت:

نا نا، ئەو دیوە دۆڵە ڕەقەیە.

وا بزانم کانەبیی سەردەستە بوو هەڵیدایێ:

ڕەنگە قسەی هەردووکتان ڕاست بێت، وا بزانم دۆڵە ڕەقە دۆڵێکی زۆر گەورەیە، لە ناویدا چەندان دۆڵی گچکە هەن.

من هەر لە خۆوە و بێ ئەوەی پێشتر دیتبێتم یان شتێکی لێوە بزانم گومانم نەبوو کە دۆڵە ڕەقەیە، مام سابیر کە گەرمیانیەکی ڕەسەن بوو، بەژنی هەر بە قەد برنۆیەکی شۆڕشی کۆن دەبوو، دیتم بە زمان لێوە سیسەکانی تەڕدەکردەوە:

کوڕینە دنیایەك دۆڵ و شیوی دنیام بینیوە، بەڵام دۆڵی وەك ئەم دۆڵە گەرم و ڕەق و وشکەم نەدیوە.

مامێکیدی خۆی پێنەگیرا:

- تۆ کوێت دیوە؟ وا لە خۆتەوە... لە حەمرینەوە هەتا ئێرەت دیوە.

+ دیسان قسەت لە قسەم کرد، هەی...

- ببوورە نەمزانی تۆ بوویت!

بە ڕاستی گەرم بوو، ڕەنگە گەرمترین دۆڵ بووبێت لە دنیا.

بە زگی برسی بە قوڕگی تینوو، بە چاوی خەو لێ تەریو، لە بن خۆری دۆزەخیی دۆڵە ڕەقە بڕۆ بڕۆ...

من لە ڕۆیشتنێ ئێرەییم بە دوو سێ کەس دەبرد، یەکیان(چەتۆ درێژ)یان دەگۆتێ، ئەویدی هەردی، چەتۆ زۆر درێژ بوو کەس نەبوو لەو درێژتر، ئەوەش بڵێم باری سووک بووك نە تفەنگ نە فیشەکدان، تەنێ دەمانچەیێ، هەردیش هێندە لەو کورتتر نەبوو، ئەو دووە هەر شەقاوێکیان بە قەد سێ شەقاوی زەلامان بوو، لە ڕۆیشتنێ کەس پێی ئەوانەی

نەدەدیت، هەمیشە لە دەستەی پێشەوە دەڕۆیشتن، خۆزگەم دەخواست منیش دوو پێی درێژی وەك چەتۆ درێژم دەبوو، وەکی چەتۆش نا وەکی هەردی، کەسی سێیەم شەماڵی ناو بوو، وا تێبگەم (وەستا)یەکیشی پێوە بوو، ئەو شەماڵە هەر بەژنی بڕنۆیەکی هەبوو، وا تێبگەم پێڵاوی بای لە پێ بوو، وەستانی نەبوو، لە ڕۆیینێ مامز نەیدەگەیشتێ، جێی وی پێشی پێشەوە بوو، ڕێوان بوو، دەتگۆ پەلیکە، لە شێوەی تیر دەردەچوو.

لە دوورەوە لە دووریی نازانم چەندەوە، دوو ڕشماڵی ڕەشکۆکە بە دیار کەوتن، ئۆخەیش! لە دڵی خۆم دەمگوت:

هاتم، جامە ئاو و کۆتکە دۆ هاتم، نان و ماست و چایە هاتم، هاتم هاتم هاتین...

پێش گەیشتن بە ڕەشماڵی خێڵان کەسکاییەکی گچکەمان دیت، وەك بزنە گەل غارمان دا، چ پەڕجووێکە خودایە! دۆڵە ڕەقە کانیی هەیە! هێندەمان ئاو خواردەوە زگاو بووین، لەوێ لە دەو کانیەکە ئەو کاروانەم بیر کەوتەوە کە ناسك سەر قەتاری بوو، من ئەوم بە سەر قەتار دانابوو، دەمگوت داخوا ڕوویان لە چ دۆڵێکی بێ کانی کردووە، دەمگوت ئێستا ناسك بۆ ئاو دەگری، هێندەم مەتارەی بەتاڵ هەلگرتبوو، حەزم دەکرد دوو مەتارەم هەبا.

- دەڵێی ئەو ڕەشماڵانە چۆلن؟

+ کوڕە، وامەڵێ!

هەواری خاڵی بوو، دیار بوو لەمێژ نەبوو خێل بارگەی تێکنابوو، بارگە تێکنانێکی نائاسایی، ناوەخت، بە هەموو شتیش ڕانەگەیشتبوون، هەر ئەو دوو ڕەشماڵە نا کە بە پێوە بە جێمابوون، زۆر کەلوپەلیدیش هی ئەوە نەبوون بە جێبمێنن، بە جێمابوون، قوونکە گونیەیەك ئارد و چنگێ خوێ و هەندێ ڕۆنمان دیتەوە، قاپ و قاچاخیشی لێبوو، ئێمە خەریکی ناوسێری بووین، پیاوێ پەیدا بوو، دیار بوو یەکێ بوو لە ڕەشماڵنشینەکان و گەڕابۆوە هەندێك شت ببات، هێندە تێگەیشتین ئەو دەفەرە دەفەری

جاشانە و مۆڵەتی چۆلکردن هەتا ئێوارێیە، دوای ئەوە هەر کەسێك لەو ناوە بگیرێ، بێ سێ و دوو، دوو سێ گوللەی بە سەریەوە دەنێن، هەر ئەو پیاوەش گۆتی:

ئەگەر ئەو شەو لێرە دەرنەچن، ئەوا دەرچوون زەحمەتە.

لەولاوە لە نێوان سێ چوار کەسان بووە فسکە فسکە، دواتر بیستم کە هەبوو گۆتبووی:

نابێت ئەو پیاوە ئیزن بدەین، نەوەك پیاو خراپ بێت و جاش و عەسکەرمان بەسەر وەرکات.

ئەویدی گۆتبووی:

نە بابە، با بڕوات بە پیاو خراپان ناچێت.

لە بن رەشماڵ بەردێکی قیت دەتگوت بە دەست لەوێیان لە عەردی چەقاندبوو، لە تەنیشت بەردە قیتێ تاخمەکەم کردبووە بالیف، نازانم لە کێ دەپاڕامەوە کە بۆ ماوەی چەند جگەرەکێشانێك بمخاتە باوەشی خەوەوە، لە پاڕانەوەدا بووم، یەکێ هاواری کرد:

+ هاورێینە ئاگر هات.

- ئاگر!

تەماشا دەکەین بە پانایيەکی زۆر ئاگر لە سەر چنگان وا بەرەو رەشماڵ و تانۆکان دێت، هیچ شتێك وەك ئاو و ئاگر بە غار نین، کاتێ دایانە غار، ناو لە لێژایی و ئاگریش کە دەستی با بگرێت، هەر هێندەمان بۆکرا، خۆمان کۆبکەینەوە بەولایەدا دژە با ببینەوە، لەوێ، لە ناو هەوێزێ، خۆدیکێکم دیتەوە، چێوەکەی چەند دنکە مێخەکێکی پێوە بوو، دڵم نەهات بیخەمە بەرکمەوە، لە سەر کەفرێکم دانا، گوتم داخوا لە چ شەنگەبێریەک کەوتووە، بەلکوو بۆی بگەڕێتەوە.

هەوکە دەمەو عەسرانێکی درەنگە، لە جێگەیەکین نازانم کێندەرێی دۆڵە رەقەیە، بە ئاستەم گوێم لێیە دەڵێن:

هەر چوار دەوری ئەو دۆڵ و دەڤەرە جاشرێژ و جێژرێژە.

لە دڵـی خـۆم گـوتم ئەو رۆژەی تێـدەچین ئەوڕۆیە، دڵـی خـۆم بەوە دەدایەوە کە بە هەڵە لەو قسەیە گەیشتبم.

سەردەستە هاتە قسە:

هەتا تاریك دادێ لێـرە دەمێنینـەوە، ئەوجـا دەپەڕینەوە، خەمتـان نەبێـت پەڕینەوەمان ئاسانە.

جێگاکە داروباری زۆر بـوو، لەو کـاتەدا ئەگەر یـادەوەریم سـەرچیخی نەبردم، نە تینووم بوو نە برسی، جگەرەم بە جگەرە پێدەکرد، ئیدی لە بـن دارێـك کە لە نێـوان دوو تیشـە بەرد روابـوو، بە نیـازی خەوتـن راکشـام، نازانم خەوم لێکەوتبوو یان بۆرژابووم، ئۆندەم لە خۆم هەڵدا، زرمەکە هـی گەمان نەبوو، جێی بە گابەرد لەق دەکرد، لە سـبەینێوە هەر تۆپبـاران بـوو، بەڵام ئەوە تۆپی یەکەم بوو وا نزیك بکەویتەوە...

ئیـدی خەوم لێـنەکەوتەوە، قەڵەمبـڕەکەم دەرهێنـاو کەوتـمە کـوڵینی درەختەکە، ئەو درەختەی خەوی پێنەدام یان دای و تۆپ بـردی، درەخـت کۆڵین پیشەی خۆم بوو، لە بـن هەر درەختێـك دانیشـتبم و کـاتی کـوڵینم هەبـووبێ، شـتێکم لێـی نووسـیوە، لە بیـرمە شـتێکی وام لە قەدی درەخـتە بەتەمەنەکە هەڵکەنـد، بـۆیە باشـم لە بیـرە چـونکە دواتـر جارێکیـدیش خوێندمەوە:

ماندووم درەخت ماندووم، کەمێك خەو، خەو...

خەریـکە دووکەڵ ونـدا دەبێـت و ئـاگر بە دیـار دەکەوێـت، تۆپەکـان مانـدوو نـابن، رەنـگە فڕۆکەکـان چـووبن پشـوویەك بـدەن، ئیـدی کـاتی رۆیشتنە، دیسانەوە نشێو، نشێو، هەر نشێو، چ ترسـناکە رۆیشـتن بە لێژایـی، چ جیـاوازیەکی لە لێژبـوونەوە بەرەو گـۆڕ هەیە! چ ترسـناکە شـەو رۆیـی ئەگەر رێگاکە رووتەن نەبێت و هەمووی پووشـوپەڵاش بێـت، ئەو رێـیەی لێی دەترسام ئەو رێیەیە وا مـن لەگەڵ بیسـت کەسـدا بەو شـەوە ئـاگراویە پێیدا بەرەو دۆزەخ دەچین، وا هەستدەکەم هەرچەندی بستێك لە دوورایـی ئاسمان دوورکەویـتەوە هێنـدە لە دۆزەخ نزیـك دەبیـتەوە، خـۆزگە هەمـوو

ڕێگاکان لە لووتکەیان دەکردەوە بێ ئەوەی سەر بە دۆڵێکدا بکەن، نزام دەخوێند کە لە مار بە دوورمان بگری، بە پێیەکانی خۆم دەگوت:

کوێر نەبن، بە سەر چ دەکەون گرنگ نیە، بەس مار نا، پێ لە مار نان واتە کۆتایی ژیان، واتە سیامەند.

دەڵێن مار ئەگەر ئازاری نەدەی، بێ ئازارترین گیانلەبەری دنیایە، ئەوە قسەی زۆر کەسان بوو، چەندان جار لە زاری بابیشمەوە بیستبووم، ئەوە قسەی پیاوێکی بەتەمەن بوو، ساڵێك لە ساڵانی بە چیاکەوتن لە بن چیای مەتین بە دڵ و داو باسی بێ گوناهیی ماری بۆ دەکردم، باسی ئەو هەموو غەدرەی دەکرد کە مرۆڤ لە ماری کردووە و دەیکات، ئەو پیاوە وەها وێنەی ماری نیشان دەدا خەریك بوو ببمە ماردۆست، ئەو پیاوە دەیگوت:

پێی لێ مەنێ، گێچەڵی پێ مەکە، بڕۆ لەگەڵی بخەوە لە سەر من، بەڵام بزانە مار نە لە هەڵە خۆش دەبێت، نە گاڵتە وەردەگرێت، ئەوجا ئەو گاڵتەیە لە لایەن منداڵێکی شیرەخۆرەشەوە بێت.

خۆزگە مار جاروبار گاڵتەی دەکرد، خۆزگە مار لە هەڵە هیچ نەبێت لە هەڵەی شەوان خۆش دەبوو، ئاخر گوناهی من چیە ئەگەر لەو ڕێوبانە و لەو تاریکیە پێڵاوەکەم بە جێگەیەکی لەشی کەوت، ئای ماری بەدفەڕ تۆ بە ئەنقەست دێی بەبەردەممدا تێدەپەڕی بۆ ئەوەی هەڵەبکەم و پێ لە سەر پشتت یان کلکت بنێم و تۆش هەموو ئەو ژەهرەی کە داخوا چەند ساڵە بۆ منت هەڵگرتووە، بڕژێنیتە لەشمەوە و بە دەردەکەی سیامەندم ببەیت.

نازانم تازە یان لەمێژە گەیشتووینەتە ڕاستەڕێ، ئەو گۆڕاییە بە قووڵایی دنیا دەچێت، ڕەنگەقووڵترین جێگەی دنیایێ بێت، ئاخر کێ بە بیری دێت ئێمە لە لێژاییدا لێژ دەبینەوە، لە سەر ئەو چیایەی لە کاروانی ناسك دابڕاین، هەر لە شۆڕبوونەوەداین، مەتارەکەم یەك چۆڕ ئاوی تێدا مایە، ئەو چۆڕەی بۆ سەرەمەرگمم هەڵگرتووە، دەمێکە تینوومە و نایخۆمەوە، لە هەمولایەکەوە دەنگی تۆپە، لە هەموو لایەکەوە ئاگرە، ئەوەی نیە ئاوە، ڕۆیشتن لە شەوی ئاگراوی جیاوازیەکی ئەوتۆی نیە لەوەی کە شەوکوێر

بیت، ئاگرەکان بینابیت پەرتدەکەن و نازانیت پێ لە کوێ دابنێیت.

- ئەوە ئاوە، پشوو، بەڵام بەبێ دەنگی و ئاگاشتان لە ئـاگری جـگەرە بێت.

+ ئاو!

گۆماوێکی گچکە لە بیرم نیە کانی بوو، یان لە کانیەوە بـۆی دەهـات، پێنەدەچوو زۆر خاوێن بێت، بەڵام لە تینوێتی شەوی هاوینی کـێ لە پـاکی و پیسی ئاو دەپرسێت، لە بیـرمە بە سـەر گۆمـاودا نووشـتامەوە، رێـك وەك ئەو هێسترەی کە دەچێتە سەر ئاوێك لە بەر قوولی ئـاوەکە دەوی ناگـاتێ، ناچـار دەسـتەکانی دەنووشـتێنێتەوە، مـن رێـك وەك ئەو هێسـترانەم کـرد، هێندەی هێسـترێکم ئـاو خـواردەوە، نـادیە پسکویتێکیتریشـی دامـێ، ئەگەر دوای ئەو هەموو ساڵەش ئەو کچە ببینمەوە پێیدەڵێم:

نادیە خان، یان هاوڕێ نادیە، زۆر سوپاس بـۆ پسـکویتەکە کە وێـنەی نانۆکەی سەردەمی منداڵی چێژەکەی هەر وا لە زارمە.

دیسان فسکە فسك، هیچی تێنەگەیشتم، دوای دەمژمێرێك کەمتر زیـاتر، بەڕێکەوتین، بۆ کوێ نازانم، هێندە نەبێت کە پێشتر دەمزانـی جادەیەکمـان لە پێشە، دەبێت ببڕین، ئەوەشم دەزانی پەڕینەوە لەو جادەیە پەڕینـەوەیە لە مەترسی، ئێرە وێدەچێ ئاقار یان رێی سلێ و بۆلێ بێ برۆ بڕۆ...

ئێستا لە بنەبانی دنیاوە خەریکە سـەردەکەوینەوە، هەوراز هەوراز، دڵـم بە هەورازەڕێ خۆشە، رێ زۆر بەو رێیە دەچوو کە پێیـدا هـاتینە خـوارێ، هەمـووی درك و داڵ و پـووش و پەڵاش بـوو، زۆر بەو رێـیە دەچـوو کە سیامەند پێیدا رۆیشتبوو، ئەو رێیەی لە نیوە شـەوێکی وەك ئەو نیوەشـەوەی وا ئێمەی هەڵگرتووە و دەمانبا، سیامەند دەڕۆیشت مارێـك خـۆی هاویشـتە بن پێی، سیامەندیش چ بزانێ داوێـك لە گـۆڕێیە، چ بزانـێ مارێـك وا لەو بەری رێ دەپەڕێتەوە ئەو بەر، ئیـدی سـیامەند هـاواری لێهەسـتا، هاوارێـك هیچ گوللەیەك نەیدەتوانی هاواری وا لە سـیامەند بەرزبکـاتەوە، دەگێـڕنەوە ئەو سیامەندە کە هەموو تەمەنـی پێکەنـین بـوو، سـێ شـەو و رۆژی رێـك

بەس هاواری کردبوو، دۆڵی هیران و نازەنینی پڕکردبوو لە هاوار، رەنگە ئێستاش ئەگەر لە رۆخ ئەو چەمەی کە بەو دیوەی (بەرەکە)دا خوڕە کات، کەمێك دانیشی و گوێ هەڵبخەی، هاواری هاوینیانەی سیامەند ببیستی...

من بە درێژایی رێ لە خەیاڵی مار و سیامەند، لە خەیاڵی خۆم و مار بووم، هەوراز ماندووی کردین، برسی کردین، تینووی کردین، خەریکە شەو خۆی دەپێچێتەوە، خەریکە جاش و پێشمەرگە لێکدی جیا دەکرێنەوە، من هەر بە تەمای گەیشتن بە جادە و پەڕینەوەم.

دەنگی تۆپەکان رۆژیان نەترساند، دیتم لە ناو دووکەڵی شاخەکان بە دیار کەوت، لە جێگەیەکین هەمووی داروبارە، دەڵی ئەو جێگەیەم پێشتر دیوە، لەو چیاو چۆلانە زۆر چەم و کانی زۆر چیاو دۆڵ، رێچکە و گۆڕایی زۆر... ئەگەر کەمێکیش بێت لە یەك دەچن و زۆر جاران چاو بە هەڵە دەبەن، بەڵام ئەو جارە بڕواناکەم چاوی من بە هەڵەدا چوویێت، من پێشتر ئێرەم دیوە، بەڵام کەی نازانم ، کوێیە، نازانم... ئای ئای! تۆ بڵێی من خەون نەبینم! باوەڕ ناکەم، کوڕە ئەوە درەختەکە نیە؟! با بچم بزانم.

ماندووم، درەخت ماندووم، کەمێك خەو، خەو.

خەریکبوو شێت بم، نەشمویست بە کەس بڵێم، دڵنیابووم بە شێتیان دادەنام، دوای قسە و باس دوای پێکەوتن بە دەرنەچوون و گەڕانەوە، بە دزیەوە بە خۆم پێدەکەنیم، هەندێ جاریش لە سەر ئەوە بووم بگریم، تۆ وەرە بە کوێدا رۆیشتی بەوێدا بگەڕێیتەوە، ئەو رێیە دوور و درێژەش، ئەوجا هەستی پێنەکەیت، دەمگوت ئەوە چ گێلایەتی و کەرایەتیەکە! نزیکەی نۆ دەمژمێری رێك، یەکپشی و یەکپێ رۆیشتن، کەچی هەر لەو جێگەیەشین کە یەکەم هەنگاومان لێیەوە هەڵهێنا، بەوە دەگوترێ تەرسی خۆ گێرەکردن.

ئەوەی زۆر لام سەیر بوو، من هەستمدەکرد ئەو شەوە خەونم دیتووە، ئێستاش دەڵێم رەنگە بە دەم رێوە خەوتبم، جارێك دوو جار و دە جار

خەوتبم، من بیری خۆم دەهێنایەوە کە لەو شەوەدا ئەو شەوەی هەموویمان لە ڕۆیشتن بەڕێ کردووە، گەلێك خەونم دیتووە، لەوەوە قسەیەکی نەنکمم بیر دەکەوتەوە کە هەزار جاریش پتر بۆی گێڕاومەتەوە و قەتیش لە گێڕانەوەکەی بێزار نەدەبووم، نەنکم دەیگوت:

کەس نیە لە دنیایێ هێندەی عەبدە خەوە حەزی لە خەو بێت، هیچ منداڵێك هێندەی وی وا بە زوویی خەوی لێ ناکەوێت، هەر بلێ وا دەخەوم خەوی لێکەوتووە، ئەنگۆ دەزانن ئەو پیاوە چۆن دەخەوێت؟ خەوی ئەو عەبدە خەوە بە پێچەوانەی خەوی هەموو بنیادەمەکە، تووڕەم بکەن دەڵێم بە عەکسی خەوی هەموو تەیر و تواڵ و دڕندە و ماڵاتێکە، ئاخر کەستان دیتیە بە پێوە خەوی لێکەوێت؟ وا کەسی واشتان دیت، ئەدی دیتانە بە دەم ڕۆیشتنەوە بخەوێت؟ دە ئەو عەبدە خەوە لە ڕۆیشتنێ دەخەوێت، بە خوای زۆر کەس لە ڕێ لەگەڵی بوونە، بە سەعات بە دەم ڕێوە خەوتیە و خەوی خۆشیشی دیتیە.

لەوێ دەمگوت ئەگەر ئەو جارە نەنکم ببینمەوە پێی دەڵێم:

نەنە کەسێکیدیش هەیە ڕێك وەك عەبدە خەوە دەخەوێت.

قەڵەمبڕەکەم دەرهێناو ئەوەشم زیاد کرد:

درەختەکە خەو، بێ خەوی کەری کردم.

تەماشامکرد هەموو لە پەلوپۆ کەوتبوون، نەمپرسی بە تەمای چنە و چ دەکەن، ڕاکشام، ڕاکشانێك بە نیازی خەوێکی درێژ زۆر درێژ.

- هەستە خۆ نەمردووی، هەستە...

+ چ چ چ؟؟!

پێشمەرگەیەك ناوەکەیم لە یاد نیە، دیار بوو دەمێك بوو بانگی دەکردم، پێمەوە ماندوو ببوو... چ ببینم باشە، لە ئاسمانی دۆڵە ڕەقە کۆپتەر کەپرۆکەیان کردووە، فڕۆکە ڕەوە ڕەوە دەهاتن و دەچوون، گڕو هۆڕێکە خوا گوێی لە هاواری بەندەکانی خۆی نیە، گوێم لێبوو:

هایدار بن، کەلکی تەقەی نیە، تەقە نەکەن.

پەرتەمان لێکرد دوو دوو، سێ سێ بە لایەکدا خۆمان حەشاردا، لە کەلێنی گابەرد و ناو کەندڕان خۆمان شاردەوە، لە سەر زگ و تەنیشت و پشتان لە سەر عەرد پاڵکەوتین، من و نادیە و مێردەکەی - ناوەکەی لە سەر زارمە_ کەوتینە ئەو بەری چەمەکەوە، ئەو چەمەی پێنەدەچوو لە تەمەنی خۆی تەڕایەتی بە خۆیەوە دیتبێت، من خۆم خزاندە نێوان بەردێکی گەورە و تەڕاشێك، باش بوو بنە دارێك سێبەری لێم کردبوو، بەڵام لەو دۆڵە ڕەقەیە بەر سێبەریش وەك بەر هەتاوە و هەڵمی ئاگرە...

هەردوو هێسترەکە هەر لەوێ لە بن ئەو دوو درەختەی کە قژیان تێکەڵی یەکتر کردبوو، بێ جوولە ڕاوەستابوون و تەماشای دنیایان دەکرد، سەیر بوو، مێشەکەرانە دەوریانی دابوو، کەچی نە گوێ لەقانێ، نە کلك ڕاوەشانێ، پێدەچوو ئەوانیش پێشتر زەبری کۆپتەریان دیتبێ، بۆیە لە ئێمە بێدەنگتر و بێ جووڵەتر بوون، کۆپتەرەکان زۆر نەوی بوون، هێندەی نەمابوو زگیان لە عەرد بخشێ، من جاری یەکەمم بوو وا لە نزیکەوە کۆپتەر ببینم، بموێرابایە هەر بە بەرد سەری شوفێری کۆپتەرێکم دەشکاند، باش بوو مەتارەکەم ئاوی تێدا مابوو، ناوە ناوە دەمم تەڕ دەکرد، تۆ لە بیرت بێت، گەرمای ئابی دۆڵە ڕەقە کانی دەکوڵێنێ، ئەدی دەبێت پلەی گەرمیی مەتارە گەیشتبێتە کوێ! ئەوەی لە کنە من جێگەی سەرسوڕمان بوو ئەوە بوو کە تێنەگەیشتم چۆن هێسترەکانیان نەدیت، تۆ بڵێی دیتبێتیانن، تەقەیان نەکردبێت! ئەوەیان نابێت! ڕەنگە، بۆ؟! ڕەنگە گوتبێتیان ئەوانە دەسکەوتی سەرباز و جاشەکانن بۆچی تەقەیان لێبکەین، ڕەنگە پێڕەویان لە ئایەتەکە کردبێت، دوا ڕۆژەکانی مانگی ئابە، عەرد و ئاسمان لە کوڵان و جۆشدایە، دەبوو خۆمان بگەیەنینە ئەو دۆڵاییەی کە پڕ لە داروبارە، جێگەیەکی قایم دیارە، ئیدی ئەو کاتانەی کۆپتەرەکان کەمێك بەرزتر یان دوورتر دەکەوتنەوە، ئێمە لە سەر زگ و بە خشان، یان لە سەر چۆکان بەرەو جێگەی مەبەست دەخشاین، زۆری پێچوو تاگەیشتین...

ئێستا عەسرانێکی درەنگە، لە بن کۆمەڵێك درەختی بەساڵداچووی

سەرو بڕ خۆڵاوی کە سێبەریان لە کانیەکی دەمەو پایزی کردووە، دوو دوو سێ سێ زۆر لە یەکتر دوور نا، دانیشتووین... کۆپتەرەکان کەم کەم کەمبوونەوە، نەمان، رەنگە لەوە ترسابن، تاریکیان بە سەردا دابێت... ئێمە لێرە تووشی دەستەیەکی زۆر پێشمەرگەیدی هاتین، من دەڵێم چل، تۆ بڵێ پەنجا پێشمەرگە پتر دەبوون، هەندێ لە پێشمەرگەی دەستەکەی ئێمە لەگەڵ هەندێك لە دەستەکەیدی باش یەکتریان دەناسی، ناوی یەکتریان وەك ناوی خۆیان لەبەر بوو، هەر بە ناوهێنانی ((پشتئاشان)) ئەوانە بە یەکتر ئاشنادەبوونەوە، بە تایبەتی هەردوو سەردەستەکە هی ئێمە و هی ئەوان باش یەکتریان دەناسی و لە شەڕگەکانی براکوژیەوە یەکتریان دەناسی، لە هەموو پشتئاشانەکان سەنگەریان لێکدی گرتبوو، کەچی ئێستا شانبەشانی یەکتر دانیشتوون و سەریان لە بن گوێی یەکتر ناوە و پلانی پەڕینەوە دادەڕێژن، پەڕینەوە لە ئاقاری ئەنفال، من کەسم لە دەستەکەیدی نەدەناسی، یەك سەردەستەکەیانم یەك دوو جاریدی لە رێوبانان دیتبوو ناوەکەیم دەزانی لە بیرم چوو، وا بزانم کاوانی بە ناوەکەیەوە بوو، ئەوان چەند سەردەستەیەکیان هەبوو، یەکیان مامۆستا بوو (سەیف)ی پێبوو سەیفەکەش (دین)ی پێوە بوو! لە دەستەکەی خۆشمان تەنها نادیە و مێردەکەیم، ناوی ئەویشم لە یاد نیە، باش دەناسی، ئەوانیدی ناسینێکی سەرپێیی دەمناسین، کانەبیشم باش دەناسی، بەڵام ئەو دەتگوت باش نامناسیتەوە.

هەر ئەوەش وایکردبوو، ترسم پتر بێت، ئاخر نەمدەزانی ئەوانە چەندیان پێشمەرگەی تەنگانەن و تا سەر لەگەڵتن و بەجێت ناهێلن، لە پێشمەرگایەتیش برادەرایەتی و ئاشنایەتی زۆر جار لە کرینەوە و گەڕانەوەی ژیان و گیان رۆڵی زۆر دەبینن.

ئەو دەمەو عەسرەی دۆڵە رەقە دەمەو عەسرێکی ترسناك و سامدار بوو، کەس نەبوو برسی نەبێت، رێی هات و نەهاتیشمان لە پێش بوو، دەبوو لە جادەیەکی پڕاوپڕ لە جاش و جێڕ بپەڕینەوە، من نە ئەودەم و نە دوایش

تێنەگەیشتم بۆچی لەو کاتەی لە کانی تەلان بەڕێکەوتین، بۆچی لە تێری نان و خواردنیان نەهێنا، بۆچی هێندە شەکر و چایان نەهێنا کە لە ڕێگە لە تێری چا بخۆینەوە، خۆ دوو هێسترمان پێبوو بایی یەك مانگ خواردنیان پێ هەڵدەگیرا، ئایا لە بارەگای کانی تەلانیش خواردن و شەکر و چا کەمبوو؟ یان وا تێگەیشتبوون لە ڕێ ئاوەدانی هەیە و لە هیچ پەکمان ناکەوێ؟! تێنەگەیشتم... وەك خەون لە بەر چاومە، دوو پیاوی هەندێك بە تەمەن پەیدا بوون، دیار بوو خەڵکی ئەو ناوە بوون و لە گژ گواستنەوەی شتمەکی خۆیان بوون، ئەوەی باشم لە بیرە تەنەکە هەنگوینێکیان داینێ لە بری ئەوە دوو هێسترەکەیان برد، ئیدی نازانم کێ ئەو سەودایەی کرد، دەستەکەیدیش سەودایەکی لەو بابەتەیان کردبوو، چەند کلاشینکۆفێکیان بە بڕێك نان و هەنگوین گۆڕیبۆوە، بەرەبەری ڕۆژئاوابوون بوو گوتیان:

هەتا دەکرێ بارتان سووك بکەن، ڕێگایەکمان لە پێشە غاردان و خێرا ڕۆیشتنی دەوێ.

ئیدی هەر بابا بوو کۆڵەپشتی دەکردەوە و دەگەڕا چی فڕێ بدات، کۆڵەپشتی من لە هەمووان پڕتر ڕەنگە گرانتریش بووبێت، چی تێدا بوو! کراسێك و دەرپێ قوتەیەك، تاخم تراش و نینۆکبڕێکی ژەنگاوی، مووکێش و نەینۆکێکی لە لاوە شکاو، کەرتە سابوونێ، تەماشای هی ئەوانیدیم دەکرد جیا بوون لە هی من، ئەوەی لە کۆڵپشتی من دەستدەکەوت لە هی ئەوان نەبوو، یان من نەمدەدیت، کۆمەڵێ کتێبی تێدا بوو، لە بیرمە هێمن و پەشێوی تێدابوو لە بیرمە سیزیفەکەی ئەلبێر کامۆشی تێدا بوو، لە بیرمە هەر لە بن ئەو بەردەی پالکەوتبووم، چاڵێکم بۆیان هەڵکەند و کتێبەکانم یەك یەك دەناشت، کاتێ دەستم برد بۆ (ناڵەی جودایی)، وەك بڵێی گوێم لە ناڵەیەك بوو، تێگەیشتم کە ناڵەی جودایی هی ئەوە نیە لێم جودا بێتەوە، خستمەوە ناو کۆڵەپشتەکەوە، ئەوانیدیم لە بن بەردەکە شاردەوە، ئێستاش ڕێم بکەوێتەوە دۆڵە ڕەقە، ئەگەر ئەنفال بەردەکەی لە جێگەی خۆی نەجوولاندبێت، کتێبەکانم دەبینمەوە، ئەو

ساتەی کۆڵەپشتەکەم سووککرد، پێشمەرگەیەك سەید عەلیان دەگوت، زەرفێکی گەورەی پێچراوەی لە دەست بوو، زۆر گەورە بوو:

تۆ بارت سووکە و خورتی دەتوانی ئەوانەم بۆ هەڵگری؟!

نەمزانی چ بڵێم، منی کەمڕوو، لە رووتەنکی خۆم لێیم وەرگرت، لە بەر خۆشمەوە بە خۆمم دەگوت:

هەی کەرە، شتی خۆت فڕێدەدەی و هی خەڵك هەڵدەگری، زۆری نەبرد، هەر لە بەر خۆمەوە گۆتم: دەی چ بووە!

شەو بوو گەیشتینە نزیك ئەو جادەی دەبوو لێی بپەڕینەوە، ئەو جادەی ماشێنی سەربازیی نەدەپساندەوە، یەك بزر نەدەبوو یەکیدی بە دیار دەکەوت، جگە لە ئاگری ماشێنەکانیش ناوە ناوە تۆپەڵە ئاگرێکیان دەهاویشتە ئاسمان و ئەو دۆڵەی دەکردە نوێژی نیوەڕۆ، ئەوە جگە لەوەی شەوقی سووتانی شاخ و دۆڵان لە چاوانی دەدا...

ئەو جادەیەی مۆلگەکانی هێندە لێکدی دوور نەبوون، سەربازەکان لە شەوی کپ و بێدەنگیدا گوێیان لە ترپ و کۆخەی یەکتر دەبوو، نێوان دوو مۆلگەیان دەستنیشان کرد بۆ پەڕینەوە، دەبوو لەو کاتە کەمەی دەکەوتە نێوان رەتبوونی ماشێنێك و هاتنی یەکیدی بە غاردان لە جادەکە بپەڕینەوە، بە لای کەمی دەبوو بۆ ماوەی نزیکەی دە خولەکێك یەك پێ و بە پێی با غار بدەی، لەوێ بیستم ئەو چیایەی بەرانبەرمان کونەکۆترە، گەیشتن بەوێ واتە دەرچوون لە ئاقاری ترس و مەرگ، دەرچوون لە ئاقاری ئەنفال.

+ ئاگادار بن هەرچی روویدا لە خۆوە تەقە نەکەن.

+ نهێنیی شەویش (قەندیل)ە.

ئیدی دوو دوو بە غاردان لە جادەکە دەپەڕاینەوە، لە بیرم نەچێت، پێش پەڕینەوە چوار پێشمەرگەیان راسپارد کە لە دەو جادەکە راوەستن و بنە رێوان، بۆئەوەی ئەگەر ترومبێلێ دەرکەوت ئەوانیدی ئاگاداربکەنەوە، ئەگەر شتێك روویدا ئەوان زووتر دەستبکەنەوە، دوو لەو پێشمەرگانە لە

دەستەکەی ئێمە بوون، چەتۆ و هەردی، دووانیش لە دەستەکەیدی یەکیان حەیف ناویم لە یاد نیە، بەڵام ئەویدیان بە هۆی کەتەیی و ریشە زەردە درێژەکەیەوە کە گەیشتبووە سەر ناوکی بە ناوەوە لە یادەوەریمە، دڵشاد باویانی.

من و ئەوەی لەگەڵم بوو هێشتا پێمان هەر لە سەر جادە بوو، لایتی ماشێنی سەربازی لە دەموچاوی داین، یەک دوو دارتێل مابوو بمانگاتێ، نازانم چۆن نەیبینین، لەگوینە بە تامایمان تێگەیشتبێ، هەر لە تەنیشت جادەکە کە کەمێك کەندڕ بوو، وەك مردوو راکشاین، لە سەر پشت، خۆم لە گەز دا، لە بیرمە خێرێکم لە خۆم گرت، لێ نازانم چ بوو، وەك دەڵێن خوا چاویانی کوێر کرد و نەیاندیتین، لەگەڵ نەمانی رووناکیەکە، یەك پێ غارمان دا، گەیشتبووینە بن بەرزاییەکەی ئەو بەریش هەر غارم دەدا.

نابێت چاوساخەکەش لەبیربکەم، ئەگەر ئەو نەبا، لەو بەر کێ رێی دەدیتەوە؟ چاوساخەکە خەڵکی ئەو گوندەیە کە لە جێی پەڕینەوە نزیکە، ئەو شەوە چاوساخ لە هەمووان قارەمانتر بوو، ئێمە لە ناچاریەوە بەڵام ئەو بە پێی خۆی هاتە ناو مەترسیەوە، هاتە باوەشی مەرگە، ئەو پیاوە هەزار حەیف ناویم نەزانی، ئەو شەوە پێشمەرگەی هەڵەتەبووی راستەڕێ کردەوە، وەك گوڵەستێرە کەوتبووە پێش پێشمەرگە، دوای پەڕینەوە دێتە بیرم سەردەستەکان ویستیان پاداشتی بدەنەوە، دەمانچە و کڵاشینکۆفیان پێشکێش کرد، بەڵام چاوساخی چاوتێری قارەمان وەرینەگرت و بە رستەیەك ماڵاوی کرد:

ئەگەر پیاو مابێت، تاریکەشەو هەیە!

} ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە ئەگەر شتێکم لە دەست با، لە شوێنی پەڕینەوە، لەو دەو جادە، پەیکەرێك دادەنێم لە سەر سینگی دەنووسم:

پیاوێك لە تاریکەشەودا بووە گوڵەستێرە{

لەوێ بەو شەوە مەیلەو رووناکە هەموو گەیشتینەوە یەك، وا بزانم درەنگانی شەو بوو گوتیان:

هەرچۆنێـك بێـت دەبێـت پـێش ڕوونـاكبوونەوە ئەو چیـایە ببـڕین و ئاودیوی ئەو دیو بین، مانەوەمان لەم دیوە واتە...

ئیـدی تێگەیشـتین كە ئەو شـەو دەبێـت بە قەد سـێ شـەو بـڕۆین، هەڵگەڕێ، هەڵگەڕێ، بە زگی برسی، بە گەرووی وشـك، مانـدوو مـردوو بە شاخی كونە كۆتردا هەڵگەڕێ...

+ ها زۆری ماوە؟

+ جارێ، چ ڕۆیشتووی!

+ نا نا، چی وا نەماوە.

نەتدەزانی باوەڕ بە كامیان بكەی، بەڵام من قسەی یەكەمیانم وەرگرت، هێـدی هێـدی دەبـووە ژاوە ژاو، هەبـوو كـوفری دەكـرد، جـوونی دەدا، جوونی بۆ عەرد و ئاسـمان دەنـارد، بـۆ سـەركردە و شـۆڕش دەنـارد، جـا جوون بە چ نەدەدرا، هەرچی جوونی پیسی دنیـا هەیە، بە ئەو هەورازەیەدا پێ بە پێی پێشمەرگەی ماندوو، پێشمەرگەی برسـی و تینـوو، پێشـمەرگەی ترساو هەڵدەگەڕا.

+ ئەو سـەگبابانە بـۆ خۆیـان لە ئێـران و هەنـدەران پیاسـە دەكەن و ئێمەشیان بەو دەردە برد.

+هەر گۆتتـان بـا شـەڕ ڕاوەسـتێ ، شـەڕ ڕاوەسـتێ، ئەوە ڕاوەسـتا، بە قوزی دایكتانەوە.

مەبەست لە شەڕی ئێران و عێراق بوو

+ ئەدی ئێستا پاسدارەكان لە كوێن؟ بۆ نایەن یارمەتیمان بدەن!

+ بەس ئەو جـارە دەربچـم، شـەرتبێت لەگەڵ یەكەم لێـووردن تێـی بكەمەوە.

+ ئەگەر ئەو جـارە دەردەچـم، چەك بـۆ شـەیتان هەڵبگـرم بـۆ ئێـوەی هەڵناگرم.

+ داكت بگێم سەدام، داكت بگێم ئەنفال، داكت...

+ ئەو قـاحپە داكـانە ئەگەر زوو پێیانگۆتبـاین، زوو خۆمـان قوتـار دەكرد، بۆ ئەوهامان بە سەر دەهات؟

+ ئەوە چیە ئەو کوفر و جوونانە، دیارە ئەنگۆ کوڕی تەنگانە نین! ورەتان بەرز بێت بە سەلامەتی دەرباز دەبین.

+ دەرچوونی چی، من ئیدی پێم لە دووم نایە.

ئەو شەوە لەو هەورازە سەختە، پێشمەرگە راست و رەوان دەدوان، شەوی راستگۆیی و گەیشتنە سەر ساخە بوو، وەك چۆن لە سەر مێزی خواردنەوە ئەو کاتەی دەگەیتە پلەی مەستی، ئەوەی لە دڵتە لە زارتە، ئەوەی تا ساتەکانی پێش مەستی نهێنیی خۆت بوون، ئێستا بە گۆڕێیان وەردەکەیت، شەوی ئەو هەورازەیەش رێك وەك سەر مێزی مەستی بوو، پێشمەرگە درۆی نەدەزانی، راستگۆیانە جوونی دەدا، راستگۆیانە کوفری دەکرد، راستگۆیانە لە خۆی دەدوا، هەموو ئەو قسانەی رۆژێك لە رۆژان ویستوویەتی بیکات، یان ویستوویەتی بیری لێبکاتەوە دواتر ترساوە، یان شەرمی کردووە بیانکات و پەشیمان بۆتەوە، کەچی ئەوشەو بێ ترس و شەرم بێ ئەوەی کەسێك داوای قسەی لێبکات، وەك ئارەقە لەو هەورازە هەڵیاندەڕێژێ، ئەگەر ئەو هەورازەی کونەکۆتر نەبا کە ئەنفال لە دواوە نزیك زۆر نزیك تەماشای دەکرد، بەڵام دیار بوو باشی نەدەدیت، ئەگەر هەورازەیەکی وا نەبا، پێشمەرگە قەت ئەو هەموو جوونەی نەدەدا، ئەو هەموو کوفرەی نەدەکرد، ئەو هەموو تفەی بۆ عەرد و ئاسمان نەدەنارد، نا قەت بەو شێوەیە سەرکردەکانی خۆی سووك و چرووك نەدەکرد، ئەگەر شەوێکی وا نەبا، پێشمەرگە هەرگیز نەیدەتوانی لەگەڵ خۆی هێندە راستگۆ بێت، ئەو شەوە من بۆ جاری یەکەمم بوو، لە نزیکەوە شاراوەیی پێشمەرگە ببینم، لە نزیکەوە قسەی دڵی پێشمەرگە ببیستم، لەو شەوەدا جگە لە راستگۆیی پێشمەرگە چیدیم نەبیست.

ئاگام لێبوو، گوێم لێبوو، فیشەکدانیان لە خۆیان دەکردەوە و فڕێیان دەدا، دەنگی غلۆربوونەوەی حەفتاوپێنجی دەهات، هەبوو بەس مەخزەنی سەر تفەنگەکەی هێشتبۆوە، لەوەش هێوەتر رۆیشت، هەبوو تفەنگەکەشی فڕێدەدا و بە دوویدا یەك دەسرێژ جوونی دەنارد، ئەو شەوە شەوێکی

ترسناك بوو، شەوی فڕیدانی چەك و فیشەك، شەوی جووندان بە هەموو شتێك، شەوی رووخان، شەوێك بوو ئەنفال لە سەر چنگان بۆی دەهات، بیهێنە بەر چاوی خۆت، نزیکەی حەفتا پێشمەرگەیەك لە شەوێکی هاوینی ئارەقاوی بە هەورازێکی سەختدا هەڵدەگەڕێن و ئەگەر هەمووشیان نەبێت یەکێ نا یەکێکیان ناوە ناوە لە جێگەی خۆیەوە مەخزەنێکی فیشەك تێهەڵدەدا و هەر یەکێ لەو مەخزەنانەش بە چەند بەردێك دەکەوێ و هەر بەردەش چەند بەردێکیدی بەگەڵ خۆی دەدا، بیهێنە بەر چاوی خۆت پێشمەرگە ماندووە برسیە تینووە تووڕەکان یەك بە دەنگی خۆیان جوونیان بۆ دنیا دەنارد، دەبێت چ هەرایەك بخەنە ئەو شاخەوە، دیارە دەنگی تۆپە دوورهاوێژەکان زاڵ بوون بە سەر هەموو دەنگەکانیدی، دەنا جاش و سەربازەکانی خوارەوە گوێیان لێدەبوو، ئەوکات بە چەند تۆپێك، بە چەند دەسڕێژێك هەموومانیان قیرەبڕ دەکرد، گوێم لێبوو یەکێ گوتی:

+ مام سالح ناتوانێت بڕوات.

من هەر لە خۆوە هەستێکی وام لا درووست بوو کە ئەرکی سەرشانمە نابێت بە جێی بهێڵم، هەر لەو جێگەیەی هەواڵەکەم بیست، لە رێچکەکە لام داو دانیشتم، چاوەڕێی مام سالحم کرد، ئەوانەی بە تەنیشتم تێدەپەڕین، وایان دەزانی توانای رۆیشتنم نەماوە:

وره بدە بەر خۆت، دوایی بەجێدەمێنیت.

هەر نەگەیشت، هاتمەوە خوارێ، دەبینم ئەوە کوڕەکەی لە کۆڵی کردووە، ئیدی منیش لە دواوە قاچەکانیم بلند کرد، بەو نیازەی کەمێك قورسایی لە سەر عەلی کەم بکەمەوە، مام سالح تەمەنی هەر پەنجا ساڵێك دەبوو، بەڵام نەخۆش بوو، لە هەورێوە تا ئەو بەری جادەکە تا ئەو شوێنەی هێسترەکەمان بە هەنگوین گۆڕیەوە هەر لە سەر پشتی هێستر بوو، دەنگێکیدی زۆر بەرز:

هاوڕێ کانەبی، هیمداد بە جێماوە.

لەسەرەوە، تەواوێك لە سەرەوە، وەڵامی دایەوە:

ئێ باشە چی لێبکەین!

لە دڵی خۆم گوتم، یەك کەسمان پێ قورتار ناکرێت، ئەوە بووە دووش، ئێستا من و عەلی هەر یەکەو بن پیلێکی مام سالحمان گرتووە، بەڵام سەیرە ئەو پیاوە پێی عەرد ناگرێ، پێدەچێت هەردوو پێی مردبن، ئەوەتا بە راکێشان رای دەکێشین، زۆری نەبرد دەنگێکیدی بەرز بۆوە:

... بە جێماوە

تێنەگەیشتم چ ناوێکی گوت، سەردەستەکەی ئێمە نا ئەویدی گوتی:

- لە کوێ بە جێماوە؟

+ لە خواری خوارەوە و دەڵێ تەواو ماندووم.

- ئاخر بڵێ کەری کەر، ئێستا وەختی ماندووبوونە، لێیگەڕێن با بەجێ بمێنێ، ئەو قاح...

بە خۆم نەوەستام گوتم:

ئەگەر ئێستا کاتی ماندووبوون نەبێت، ئەدی کەنگێ هی ماندووبوونە!

بەڵام پێنەدەچوو گوێی لەو قسەیەی من بووبێت.

ماندووبوون لەگەڵ مام سالح خەریکبوو هیمداد لە بیر بباتەوە، گەیشتینە ئەوەی کە با پشوویەکی باش بدەین، ئێ ئەوە خوایە کەمێك هێز، هێزی رۆیشتن بگەڕێتەوە پێی مام سالح، لە پڕ هەستم بە بێدەنگیەکی سامناك کرد، دیار بوو عەلیش هەستی کردبوو:

+ دەڵێی کەس نەما هەموو رۆیشتوون؟

-وا بزانم بە جێیان هێشتین.

مام سالح، تەواو نەترەی بەردا و بە دەنگێکی غەمگین هاتە قسە:

+ دەی زوو کەن، بڕۆن، خۆتان رزگار بکەن، دەی من بە جێ بێڵن، بەڵام ئەگەر ئاوتان لایە، چۆڕێکم بۆ لە مەتارەکەم بکەن، پێش ئەوەی عەلیی کوڕی وەڵامی بداتەوە من گوتم:

- تکایە قسەی ئەوها مەکە، ئێمە لەگەڵ تۆین.

عەلی هاتە بن گوێی من:

+ تکات لێدەکەم تۆ بڕۆ، من لای دەمێنمەوە بەسە، من باوکمە ناتوانم بە جێی بهێلم، با هەر دوو کەس بفەوتێ بۆ ببێتە سێ؟

ـ بە راستی منیش تازە ناتوانم بەجێتان بهێلم.

کەمێکیدی هەڵمانگرت، کەلکی نەبوو، هێند شەکەت ببووین ئەو پیاوەمان پێ هەڵنەگیرا، ئیدی لای خۆمان بڕیارمان دا، ئەگەر هەر جارەی سێ شەقاویش بڕۆین لە رۆیشتن نەکەوین، هەندێکیدی رۆیشتین، دیتمان لە سەر رێچکەکە پێشمەرگەیەك بە خۆی راکشاوە، وا بزانم خەویشی لێکەوتبوو، بانگمان کرد، ناوی (هەندرێن) بوو لە دەستەکەی خۆمان، لە پەلوپۆ کەوتبوو، کەمێکیدی لە سەرەوە دوو پێشمەرگەیدی دانیشتبوون، ئەو دووە پێشمەرگەی دەستەکەیدی بوون، بە بینینی ئەوانە لە باتی خەفەت دڵم خۆش بوو، تۆ ناوی چی لەو دڵخۆشبوونە دەنێی گرنگ نیە، رەنگە تۆش لە جێگەی من بای دڵت خۆش دەبوو، دڵم خۆش بوو بەوەی ژمارەمان زیادی کرد، لە تەنگانەی ئەوهادا ژمارە گرنگە، لەولاترەوە دەبینین سەردەستە وا لە سەر بەردێك دانیشتووە، بەو شەوە چاو و برۆ پرەکەی دیار بوو، بە بینینی ئەو پیاوە هێند دڵخۆشبووم، وام زانی چیامان بڕیوە و ئاودیوی ئەو دیوەی مەترسی بووینە، رووی کردە مام سالح و گۆتی:

نەمتوانی بە جێتانبهێلم.

من بە تەواوی تێنەگەیشتم داخوا سەردەستە پەکی کەوتووە، یان لە چاوەڕێی ئێمە دانیشتووە، هێندە دیارە، ماندوویێتی پێوە دیارە، ئەو پیاوەی دەوڵەتێ باشاری ناکات، ئەوەتا لێرە دانیشتووە، لە هەورازەی کونەکۆترێ هەناسەبڕکێی پێکەوتووە.

ژمارەمان بووە حەفت، چوار پەککەوتە و تۆ بڵێ سێ ساخ، سەردەستە گۆتی:

رێگاکە زۆری ماوە، وا خەریکە بەیانیش بدا، هەندێکیدیش بڕۆین، جێگەی خۆشاردنەوەمان نابێ، من شارەزای رێگام، باشترین جێگە بۆ

خۆشاردنەوەی ڕۆژێ، ئێرەیە، بۆیە لێرە بمێنینەوە باشە، هەتا سبەی شەو بزانین چ دەبێت، لەو نزیکانەش کانیەك هەیە نابێت وشکی کردبێت، لەو کاتەیساڵ درەنگتریش ئاوم لێی خواردۆتەوە.

کەس قەسەی لە قسەی نەکرد، ئاخر جگە لەو کەسمان پێشتر ئەو ڕێگەیەمان نەدیتبوو، کانیش خۆشترین هەواڵی ئەو کات بوو، کانی، کانی، چیای بێ کانی چ بیابانێکی دۆزەخیە، دەمویست بیر لەوە بکەمەوە کە مادام ژمارەیان زۆر بوو، با من بڕۆم و دەربچم، بەڵام هەر زوو بیرکردنەوەی مانەوە جێگەی بیرکردنەوەی ڕۆیشتنی گرتەوە، لە دڵی خۆ گوتم:

ئەز لە سەرمە سۆزی هاوڕێتیم ببەمە سەر و هاوڕێم بەجێنەهێلم و سۆزڤان بمێنمەوە، ژیان و مردنمان بە یەکەوە.

حەفت پێشمەرگە माینەوە و ئەوانیدی هەڵگەران و ئاوڕیان نەدایەوە.

ئیدی بیرمان لەو دوو پێشمەرگەیە کردەوە کە لە خوارەوە بەجێمابوون، من و عەلی بە دوایاندا شۆڕبووینەوە، گاسمان کردن وەڵام نەبوو، ماندوو بووین، بە دەستی بەتاڵ سەرکەوتینەوە، دنیا لە ڕووناکبوونەوەدا بوو، هەژی گۆتنێیە، تا بەیان ئەنگوت، ئەز چاوەڕێ بووم، چەند هاوڕێیەک سۆزی هاوڕێیەتیان بجوولێ و سۆزی هاوڕێیەتیان بیربکەوێتەوە، بگەڕێتەوە، یاری من و عەلی بدەن و ئەو چوار پێنج لە پێ کەوتووە، دەربازکەین و بۆ ئەنفالیان بەجێنەهێلین، حەیف...

گەڕاین، کانیەکەمان دیتەوە، بایی حەفتا تینوو ئاوی تێدابوو، ئەوجا بە حاڵ بەشی حەوت کەسی کرد، ئای ئاوم خواردەوە، هیچ هێسترێك ئەو هێسترەی بە هەنگوینیشمان گۆڕیەوە، هێندەی من ئاوی نەخواردۆتەوە، هەتا درەنگیش قایشی فیشەکدان دانەدەخرا، دنیا تەواو ڕووناك بۆوە، مەتارەکانمان پڕکرد و بەرەو گابەردێکی گەورە هەڵکشاین کە دەکەوتە لای ڕاستی ڕێگاکەوە، ئەو گابەردە بە قەد سێ گا گەورە دەبوو، سەردەستە گوتی:

باشترین جێگە بن ئەو بەردەیە، تۆپیشی پێبکەوێت رەنگە نەجوولێت.

دیاربوو پێش ئێمە زۆر کەسیدی رێی بەو بن بەردە کەوتبوو، ورتکە نان و قونکە جگەرەی قامیشی لێبوو، ئاگردانێکی چکۆڵەی لێبوو، من بۆنی چایم لێی کرد، رەنگە پێش ئەوەی ئەنفال لێرە نزیك بکەوێتەوە، شوان یان کاروانچی چەندان جار لایان دابێتە بن ئەو بەردەوە و چایان لێنابێت، شیریان لێرە کولاندبێت، چوزانم چایە و ماستیان بە ئەستووکی گەورە گەورەوە خواردبێت، وەختابوو شێت بم بۆ نانێك، بۆ چایە، دەزانن لە کەیەوە چام نەخواردۆتەوە! خەریکە تام و رەنگی لە بیر بکەم، باسی برسێتی کرا، ئەو دوو پێشمەرگەیەی کە نەمدەناسین و لەگەڵ ئێمە نەبوون، گوتیان:

نانمان زۆر پێیە.

باوەڕم نەکرد، وام زانی گاڵتە دەکەن، ئاخر لە کوێیان بوو، کۆڵەپشتیان کردەوە، پڕ لە ورتکە نان، هەر یەکەی دوو چەنگی گەورەمان بەر کەوت، بخۆ ورتکە نان بخۆ، چ تامێکی هەبوو خودایە، بەس من، بەس ئەوانەی لەوێ بوون، بەس کەسانی سەردەمی ورتکە نان دەزانن چ تامێکی هەیە ورتکە نان، ئەو گەسە زۆرخۆش بوو لە سەر برسێتی کە زۆر جاران لە گەسفرۆشەکەی تەنیشت دەرگای سینەما سەلاحەدین دەمکڕی و بە دیار فیلمێکی هیندیەوە هێدی هێدی دەمخوارد، بەڵام تامی ئەو گەسە قەت نەدەگەیشتە ئەو ورتکە نانەی لە بن ئەو گابەردە خواردم کە بە سینگی کونەکۆترەوە خۆی هەڵواسی بوو، من تامی شفتەکەی پلکمم قەت لە زار دەر ناچێت کە لە تەمەنی هەرزەکاری رۆژی هەینیان لە هەولێرەوە بۆ شفتە و چیدی نا، تا کوێێ گیر نەدەبووم، هێژ نەدەگەیشتمە پێش دەرگایماڵیان بۆنی شفتە بانگی دەکردم، بەڵام بە داوای لێبووردن لە پلکم تامی شفتەکەی وی هێندەی ئەو ورتکە نانە خۆش نەبوو کە لە ناو کۆڵەپشتی دوو پێشمەرگەدا بوون، ئەو دوو پێشمەرگەیەی ناویانم لە بیر نەماوە، دەنا لە تەنیشت هەر وشەیەکی ورتکە نان ناوی ئەوانم دەنووسی.

تێر نەبووم، بێگومان نابێت تێر بوویم، بەوە دەزانم ئەگەر تێر بوویام رەنگە تامەکەی هێشتا لە دەمم نەمابایە، بەڵام تینم هاتەوە بەر، ئێستا دیارە ئێستای ئەوێ مەبەستە، چا، نۆرەی چایە، بەر لە جگەرە، یان هەر لەگەڵ جگەرەکە چا، چا! بەڵام... دڵنیام ئەگەر بە دوای ورتکە ناندا چایەك هەبایە، زۆر شتیدی خۆیان دەخزاندە ناو یادەوەریەوە، دەی، خۆ بێ چایەش جگەرە تامی جگەرە دەدات، بێ چاش خەو هەر خەوە، دەبوو بنووم، دەهاتەوە بیرم کە من کەم خەوتووم، خەو قەرداری منە، بن گابەردەکە کە جوان خۆشکرابوو، بن بەردەکەش تەواوێك هەڵکەنرابوو، رێك لە بێرایەکی گچکە دەچوو، ئاسایی جێگەی راکشانی حەفت کەس زیاتریشی لێدەبۆوە، ئیدی هێندە جگەرەم کێشا هێندەی نەمابوو هەناسەم بوەستێ، بە نیازی خەوتن راکشام، تۆپەکان دەنگیان دەهات، بەڵام هی ئەوە نەبوون رێی رووەو خەوی من بەرەو لایەکیدی ببەن، ئاگام لێبوو نەرم نەرم دەچوومە خەوێ، ئاگاشم لەوە هەبوو کەم کەم تۆپەکان نزیکتر دەکەوتنەوە، زۆرتر و زۆرتر دەبن، خەریکە لە نێوان دەنگی دوو تۆپ دەنگی تۆپێکیدی دێ، ئیدی تۆپ تۆپ، تۆپ ناپسێتەوە، تۆپ ئەو رایەڵەی پساندەوە کە برژانگمی بە خەوەوە دەبەستەوە، گوتم لێگەرێ ئەورۆ رۆژی خەوە و خەوێکی باش دەکەم، نەیانهێشت، تۆپە چیا هەژێنەکان نەیانهێشت، چێشتانێکی درەنگە، بەڵام هێشتا بەردەکە، ئەو بەردەی رەنگە هەتا ئێوارێ ماڵی ئێمە بێت، هەر لە ئاقاری سێبەرە و هەتاوی نەگەیشتۆتێ، بە وردی هەستمان لە تۆپەکان رادەگرت تا بزانین لە کوێوە و بۆ کوێ دەهاوێژرێن، تێگەیشتین لەوەی کە ئەورۆ تۆپەکان هەموویان رووەو کونە کۆترن، رووەو بەرزایی کونەکۆتر، بەڵام هەندێ لەو تۆپانە کورتدێتن، لە دەوروبەری ئەو گابەردە دەکەونەوە کە حەفت پێشمەرگەی پەنا داوە:

- هەبێت نەبێت پێشمەرگەیەکی زۆر بەسەر ئەو چیایەوەن...

- هەر وایە، ئەو تۆپبارانە بەلاش نیە.

- بۆیە ئێرە جێی مەترسی نیە.
-چۆن؟
- یانی جارێ ئێرە ڕێی هێرش هێنان نیە.
- تا شەو؟
- ڕەنگە.
- هەندێك جار چەندی لە دوژمن نزیکتر بیت، سەلامەتتری.
- بەڵام ئەو تۆپانە...
- ترسی ناوێ، جێمان قایمە، نابینی لە پەنای چ بەردێکین؟
- ئەگەر یەکێك لەو تۆپانەی پێدەکەوێت، خۆت دەبینیەوە!
- ئیدی هەرچی بێت، لەو بن بەردەمان باشتر دەست ناکەوێت، ئەوەتە لە پێش چاویانین، جوولەیەك بەسە بۆ لە ناوچوونمان.

لە ناو دووربینەوە سوپای ئەنفال بە جاش و سەربازەوە جوان جوان دیارن.

هەر یەکەی قسەیەکی دەکرد، وا بزانم تەنها من بەشداریم نەکرد، هەر لەبیری ئەوە بووم تۆپەکان ئەگەر بە خاترانەش بێت، کەمێك دەنگیان نزم بکەنەوە و چاوێك گەرم بکەم، چەند جار لە سەر ئەوەبوو بوورژێم، زرمەیەك بستێك لە زەویی بەرز دەکردمەوە، ئەنگۆ نەتانـدیتیە، ئەو دەمەی کە چیا تۆپباران دەکرێ، ئەو دەمەی هێشتا تۆپێك بەعەرد نەکەوتووە، تۆپێکیدی لە دوویەتی، ئەو دەمەی تۆپ بە بەردێك دەکەوێ و ئەو بەردەش لەگەڵ خۆی چەند بەردێکیدی غلۆر دەکاتەوە، دەڵێی چیا کونی ڕژانی تێبووە و سەرلەبەری دەڕژێتە دۆڵەوە.

بەردی ماڵ، بەردی پەسارگە هێندە دوور نەبوو لە جادە، قەناسێکت لە دەست با، بە مەرجێکیش گوێت بە ترس نەدابا، ئەوا قل قل جاش و سەربازت تەختی جادە دەکرد، هەرچی جاشی کوردەواری و سەربازی ئومەی عەرەبی هەیە بە نیازی ئەنفالکردن خڕبوونەتەوە، بە نیازی گرتنی کونە کۆتر لەو دۆڵە خڕببوونەوە، بە دووربین تەماشای درێژایی جادە و

بەرزاییەکانی ئەوبەرمان دەکرد، ئەو جێگەیەی تێیدا هێسترمان بە تەنەکەی هەنگوین گۆڕیەوە و کتێبەکانم لە بن بەردێك شاردەوە، لە جاش و سەر باز رەش دەچوونەوە.

- چما ئەو هەموو جاشە هەیە؟
- هێشتا چت دیتیە!
- وا بزانم نیوەی پیاوی کورد جاشە.
- نیوەکەیدیشی سەرباز.
- نا نا، حەفت پێشمەرگەشی هەیە، هە هە هە...
- هەهە هە هە هە...

چەند رۆژ دەبوو هێندە پێنەکەنیبووین، لە بیرمە رادیۆی بەغدامان کردبۆوە، چاوپێکەوتن لەگەڵ جاشان هەبوو، هەرچی جوونی پیس هەبوو بە ئێمەی دەدا، دوای جوونەکانیش گۆرانیی بەفرەباری بۆ خستینە سەرێ، دەتگوت دەزانێ ئێمە وا لە بن ئەو بەردە وەك پشکە گۆشتی سەر سێرێ چزەمان دێ، بە بەفری گۆرانی فێنکایی بۆ دەناردین.

ئێستا ماڵمان لە بەر هەتاوە، بەرد لە هەتاوی نیوەڕۆی مانگی هەشتی ساڵی هەشتا و هەشت سووربۆتەوە، گۆشتی بخە سەر دەیبرژێنێ، ئێمە لە سێبەری بەردەکە دانیشتووین، بەڵام سێبەری چی، رێك وەك ئەوە وایە کە لە سێبەری ئاگر دابنیشی، دەبێت دەست بەو مەتارە ئاوەشەوە بگرین کە بەیانیەکەی لە کانیەکەی ئەو لاوە پڕمان کرد، دەبێت هەتا تاریك دادێت بەشمان بکات.

کونەکۆتر کەوتۆتە بەر غەزەبی عەرد و ئاسمان، فڕۆکەشی هاتە سەرێ، لە بەرزایی زۆر بەرزەوە کونەکۆتر دەکوتن، قەدپاڵی کونەکۆتر دەکوتن، گابەردی ماڵ ئەگەر لە غەزەبی عەردیش بمانپارێزێ، رەنگە بەرانبەر غەزەبی ئاسمان هیچی لە دەست نەیەت، دنیا سەراپا دووکەڵە، قەت هاوینی وا دووکەڵاویم نەدیتووە، ئەو چڕە دووکەڵەی لە ئاقاری کونەکۆتر و دۆڵە رەقە دیتم، مەگەر لە هەورێ دووکەڵاوی دیتبێتم.

دەمەو عەسرە، گابەرد بەردێکە لە دۆزەخەوە، ئاسنی لە سەر دانێی دەیتاوێنێتەوە، رووە سێبەرەکەی لە رووی هەتاوی گەرمترە، کێ دەوێرێ دەست بگەیەنێتە چەکەکەی! چاوێك نەبوو تەماشای ئەو حەوت پێشمەرگەیە بکات، ئاویان لەبەر دەڕۆیشت، بایی تەمەنێك عارەقەیان دەرداوە، مسقالە خوێنەکیان لە لەشدا نەماوە... حەفت پێشمەرگەی بەجێماو چاوەڕێی هیدایەتی تۆپێکن، تۆپەکان پڕتر و نزیکتر دەبنەوە، گابەرد بێ منەت سینگی بۆ ساچمەکان گرتۆتەوە، تۆ ئەو دەنگەت بیستووە کە لەبە یەککەوتنی بەرد و ساچمە بەرز دەبێتەوە؟! یەك دووانێك بە حەربەکانیان لە گڕ کۆڵینی بن بەردەکە بوون، بۆ ئەوەی کەمێك لەو مەرگە دوورکەوینەوە کە لە رێی ساچمەکانەوە بەڕێوە بوون، من سەیری رۆژ دەکەم بزانم لە کوێیە، زۆری ماوە بۆ ئاوابوون، پێناچێت ئەوڕۆ رۆژ ئاوابێت.

- زۆری هەڵمەکۆڵن با دانەڕووخێ و پانمان کاتەوە.
- قەیناکە لە مردنی بە ساچمە خۆشترە.
- بەڵام مردنی بە ساچمە لە هی کەوتنە بن بەرد شەهیدترە.
- من خۆشترم دەوێ، ئیشم بە شەهیدتر نیە.

لە بیرمە لەو ساتانەش کە باشترە بە ساتەکانی سەرەمەرگ ناوی بێنم، گابەرد گاڵتە و پێکەنینی لێ نەبڕا...

نازانم ئەوانیدی، بەڵام من هەر بە عارەقەی لەشم دەستم لە ژیان شووشت، مردن زۆر نزیك بوو زۆر، لە بن گابەردەکە لەگەڵمان بوو، لە سەر ئەوە وەستابوو، وەسیەت بکەین، بنووسین، قەڵەم و کاخەزم دەرهێنا، شوێنەکەم پەڕگە بوو، پشتم لەوان کرد.

- شیعری بۆ هات.
- بیستمە کە شیعر لە کاتی ناخۆشی و خۆشی دێت، دیارە...
- ناو لە شیعرەکە بنێ بەردێك لە دۆزەخەوە.
- دە لێی گەڕێن با بنووسێت.

وا دیاربوو دەیانزانی من دەو لە شیعر دەدەم، تاهوو واهوو! وەك كەر و كونـدەكەی لێهـات، ئیـدی ئەو قسـانە لە وەسـیەت نووسـین پەشـیمانیان كردمەوە، بەڵام وەك بڵێی نەدەكـرا ئەو پەڕە كـاخەزەی لە دەسـتم بـوو بە سپێتی هەڵیگـرمەوە رەنـگە هەر بە ناچـاری، یـان هەر بـۆ گاڵتەیـان زۆر بە خۆشی و پەرۆشیەوە بە هەر هۆیەك بوویێت نووسیم:

بەردێك لە دۆزەخەوە...

لەوەتەی هەم وا نەكەوتوومەتە ئەندێشەی مەرگەوە، تـا نزیـك دڵنیـایی دڵنیا بووم كە لە بن ئەو بەردە لە ناو ئەو تەپكەیە ژیان كۆتایی دێـت، ئەو بەردەی كونە كـۆتر چەنـد لە تەپكە دەچوو، تەپـكەیەك لە بەر خـاتری هاوڕێیەتی بە پێی خـۆم، خـۆم خسـتە نـاوی، چـاودەنێ، هەوكە چەنـد لە سوێسكەی ناو تەپكە دەچم.

دەمویست بیر لەو ساتانە بـكەمەوە كە بڕیـاری هـاتنە چیـام دا، حەزی سەركۆنەكردنی خۆم كەوتبووە سەرم، دەمویست بیر لەو شێتایەتیەی خـۆم بكەمەوە كە لەگەڵ ئەوانیدی نەڕۆیشتم و لێرە مامەوە، لە بیـرمە زۆر پەرت بـــووم زۆر، هەزار و یەك بیرکـــردنەوە بە ســـەرمدا وەك تەلەزمە ســـاچمە گڤەیان دەهات، مەرگ هێندە نزیـك كەوتەوە، بـواری ئەوەش نەبـوو بڵـێم ئەگەر ئەوجـارە نەمـرم مەرج بێـتماڵئـاوایی لە چیـا بـكەم، ئـارەقەیەكم كردووە، دڵنیـام جوانـاوە، نزیـك بـوو زۆر نزیـك، مەرگ نزیكتـر لە بـای هەناسە.

لە بەر خۆمەوە:

لە بەلاش خۆم فەوتاند، دەبوو خۆم دەربازبكەم، ئەوانە هەر ئـاوە و ئـاو چـوون، بە مـن نـاگەڕێنەوە، نەدەبـوو بمێـنمەوە، خـۆزی تـۆزێ ئەزئەزی دەبووم.

خۆم لە قەوچەی خۆ دەدایەوە:

تۆ چی دەڵێی! چۆن دەبێت هاوڕێی خۆت بۆ مەرگ بەجێبهێلیت، ژیان و مەرگ پێكەوە، باشم كرد مامەوە، لە سەرم بوو بمێنمەوە.

به لاقرتێوەش گۆتەی کادیرەکەم بۆ خۆم دەگوتەوە، ئەوەی لەو بەری جادە، بەر لە پەڕینەوە، بە دەنگێکی حێل وتاری بۆ داین، وا تێبگەم ناوی عوسمان بوو، شتێکی وەکوو (دەشتی)یشی پێوە بوو، دەیگۆ:

پەڕیـــنەوە مەرگ و ژیـــانە......رێ ســـەختە.... کەس لە قســـەی سەردەستەکەی دەرنچێ.....کوڕی گەڕناس ئەوشۆ دەردەکەوێ، لە شەڕدا دەستوەکەر بێ.....گیانمـان بەختـی برادەرەکانمـان بکەیـن، کەس کەس جێنەهێلێ......

تەڕ، بەجێیاننەهێشتین!

خەریکە ڕۆژ بەری ئاسمان بەردەدا، نای لەمێژە لە ئاسمان وەستاوە و جوولە ناکات، بەس ئەو جارە شەو دابێت، نا زەحمەتە جارێکیدی بەو چاوانەم تاریکی ببینمەوە، ئیدی وا دیارە بۆ یەکجاری دەچمە تاریکیەوە، ئەوەتا تۆپەکان لە بن لووتمان بە عەرد دەکەون، ئەوەتا دەنگی دۆشکەش دێت، ئەو دەنگە جیایە لە هەموو ئەو دەنگانەی ئەمڕۆ هاتوونەتە ناو سەری منەوە، ئەو دەنگانە نە لە ئاسمانەوە دەڕژێنە بەرزایی کونەکۆترەوە، نە لە خوارەوەش بە کونەکۆتردا هەڵدەگەڕێن، نا لە هیچ چیایەکیدی رووەو کونەکۆتر نایەن، ئەو دەنگانە لە لووتکەی کونەکۆترەوە بە سەر ئێمەدا ڕێك ڕێی سینگی ئەو جاش و سەربازانەیان گرتووە کە لە خوارەوە نیازی گرتنی کونەکۆتریان لە سەریە، ئەو دەنگانە دەنگی چەکی پێشمەرگەن، خۆزگەم دەخواست منیش لە بەرزایی کونەکۆتر بام و بێ منەت بێ خۆ شاردنەوە، تەقەم لەو دنیایە بکردایە، ئەو دنیایەی وا دەبینم کە سەراپای جاش و سەربازە، هەر زوو بزەیەکی تاڵم بۆ ئەو خۆزگەیە کرد، ئاخر ئێمە خەریکە، نا، خەریکە نا، هەر تەواو وا کەوتینە نێوان دوو بەرداشەوە، بیرم لەوە دەکردەوە، داخوا تەرمەکەم دەناسرێتەوە یان نا، دەترسم جاشێکی کۆڵانەکەی خۆمان بمناسێتەوە، ڕەنگە بە هۆی لێك عاجزیەك کە لە کاتی منداڵیدا لە نێوانمان پەیدا بووبێت، کە من لە بیریشم نەماوە، یان بە هەر هۆیەك و بۆ هەر مەبەستێك بێت ئاشکرام بکات، ئەو کات یەکسەر

کۆمەڵێـك میـرغەزەب دەورەی ماڵمـان دەگـرن و چـی روو دەدا! لەوەش گەڕێ داماننا تەرمەکەم گورگ خواردی، داڵ خواردی، ئەدی ئەو کاتەی هەواڵی مەرگم دەگاتە ماڵێ! کـێ دەڵـێ بە مەرگـم دەزانـن، رەنـگە هەتـا هەتایێ لە چاوەڕێی هاتنەوەم بن، من خەریکی باسوخواسی مەرگـی خـۆم بووم، کەم کەم دەگەیشتم، دەگەیشتمە مەرگی بن بەردێك، هەر بە راست خۆم ئامـادە کـرد بـۆ بەخێرهـاتنی عیزرائیـل، چـاوم لە سـەر یەك دانـابوو، دەمگوت با بە چاوی داخراوەوە گیانم بکێشێ.

ها، ئەوە خەوتی؟

هێندەم لە خۆم هەڵدا، چما عیزرائیـل پرسـیاری ئەوهـاش دەکـات! هەر بە راستی من وام زانی عیزرائیلە.

هەستە دەڕۆین.

تەماشادەکەم دنیا لە سەر تاریکبوونە، دەنگی تەقە نایە، ناوە ناوە دەنگی تۆپێك دێت، ئەویش دوور زۆر دوور لە سەرایی کونەکـۆتر دەکەوێـتەوە، چووبـووینە سـەر کـانیەکەش مـن هەر وام دەزانـی عیزرائیـل لە تەنیشـتمە، تێگەیشـتم ترسـی مەرگ خستبوومیە خەیـاڵێکی ئەوتـۆ، دابڕانـی تەواو لە گـابەردی ئاقـاری کونەکـۆترێ دابڕابـووم.. بەڵام تـرس بەریـنەدام، ئـاخر خوپایە تەقە وەستان واتە هێرشهێنان، بەڵام لە کوێوە! ئیـدی بە لای راسـتی چیادا تیواوتی بڕۆ، رۆیشـتنێکی لە سـەرەخۆ، لەبەر مـام سـالح نەمانـدەوێرا خێرا بڕۆین، دەترساین دیسان پەکـی بکەوێـت، ئەو رێگـایەی گرتبوومـانە بەر سەردەستە دەیگۆت:

هەورازی سەختمان لە پێش نیە، چونکە مەیلەو سووڕانەوەیە بە دەوری چیا، رێگایەکی نزیکتر هەیە رێك دەچێـتە سـەرێ، بەڵام ئەوەیـان کەڵکـی ئێمەی نیە.

مام سالح دەیگۆت:

ئا ئا، بە قوربان نەمانخەیتە رێگەی سەختەوە.

بڕۆ بڕۆ، بە گشتی کونەکۆتر ئەو ماوەیە مەیلە و کپە، تۆپی بۆ نـایە، لە

هیچ لاوە تەقەی لێناکرێ، جاروبار لە سەری سەرەوە دەنگی دەسرێژێ، چەند دەسرێژێ دێ.

چەندی زوو دەرچین هەر درەنگە، نەخۆ لە لای ئێمەوە هێرش بێنن.

ئێ، بەڵام چ بکەین، لە کوێ دوو پێی تیژڕۆ بۆ مام سالح بێنین، هەر ئەو نا ئەوانیدیش توانای ئەو ڕۆیشتنەیان نەبوو کە ئەو شەوە لێی دەویستین، ئەوەی لە ڕۆیشتن نەکەوتبوو من و عەلی بووین، سەردەستەش باش دەڕۆیشت، بڕۆ بڕۆ، شەوێکە نە زۆر تاریك نە هێندە ڕووناك، شەوێکە هەرچی چیاوچۆل هەیە ئاگری گرتووە، کونەکۆتر بایی گەسکێك پووشی پێوە نەمایە، بۆیە ئیدی ئاگر ناگرێت، یەك پارچە خۆڵەمێشە، هەرچی چیا هەیە لەو شەوەدا باوەشیان بۆ تەقینەوەی تۆپەکان کردۆتەوە، بەڵام ئەو شەو ئەوەی تۆپە ڕوو لە کونەکۆتر ناکات، شتێکی ترسناکی لە چاو دایە ئەو بێ تۆپیە!

- کا وس بن، دەڵێی دەنگە دەنگە؟

- ئا منیش گوێم لێیە.

- هیچ نیە، گوێتان دەنگ دەداتەوە.

ئەو کوڕەی هەندرێنی ناو بوو بە دڵنیاییەوە گۆتی:

کوڕە ئەوە بە عەرەبی قسەدەکەن!

هەموومان کە لە نزیك یەك ڕاوەستابووین، بە گوێ هەڵخستن تێگەیشتین کە هەندرێن ڕاستی گۆ، مام سالح هەڵیدایێ:

دە بە خوا ئەمانە هاوڕێیانی عەرەبن، با بیانگەینێ.

نازانم کام بوو، گوتی:

بڕواناکەم هاوڕێیان بن، پەلە مەکەن.

دەنگە دەنگەکە لە پێش ئێمەوە لە لای خوارەوە دەهات، من و عەلیان ڕاسپارد بۆ سووسەکردن، کە بچینە پێش بۆ ئەوەی پێبکەوین، تەواوێك ڕۆیشتین، دەنگەکانیش تەواو نزیك بوونەوە، ئەوەت لەبیر بێت، لەو شەوەدا لە دووریی شەش حەوت هەنگاوێ کەمتر زیاتر چاو جوولەی

دەدیــت، هەر لەدەو ڕێگــاکە لە پەنــای بەردێــك وەك ســەی دەسکیســی هەڵتووتکاین، ئێستا دەنگەکان روونن، خــاوەن دەنگەکــان لە بەر دەممــانن، بە کــوردی و عەرەبــی قســە دەکەن، لە نــاو هەر دوو رســتەیان چ رســتە کوردیەکان چ رستە عەرەبیەکان وشەی ( موخەریــب) دەبیســترا، بــێ ئاگــا لەوەی حەفت (موخەریب)ی ماندوو وا لە بەر دەستیانن، من ئەگەر هەموو دنیاش بڵێی ئۆی لەو درۆیە، دەڵێم لە نــاو دەنــگە کوردیەکــان دەنگــێکم ناسیەوە، کەس هێندەی من گوێی لە دەنگــی ئەو پیــاوە نەبــووە، ئەو پیــاوە خــاوەن دەنگێــك بــوو، هەمــوو گەڕەك لە نــاو هەزار دەنــگ دەیانناسـیەوە، دەنگێکی زۆر تایبەتی هەبوو، دەنگی لە دەنگی کەس نەدەچوو، ئەو پیــاوە لە دوای ســـاڵی حەفتـــاو پێـــنجەوە یەکەم کەس بـــوو کە لە گەڕەکـــی بەلاشاوەی هەولێر بوویێتە جاش، ئــا ئەو شــەوە ئەو یەکەم جاشــەی گەڕەك بە بەردەمی مندا بە چیای کونەکۆتردا هەڵدەگەڕا، دڵنیام ئەگەر بەڕێکەوت کەسێك بە دەنگی بەرز ئەو چەند دێڕە بخوێنێتەوە، هەر بە ڕێکەوتیش ئەو پیاوە گوێی لێ بێت ئەوە گومانی تێدا نیە دەڵێ:

ئۆی لەو سەگبابە ئەوە کو دەنگی منی ناسیەوە!

هەر هێندەش نا، دەڵێت:

ئەگەر دەمزانی لە بن ئەو بەردەی کوو یەك حەفتاو پێنجیم لە مێشــکت بەتاڵ دەکرد و ئێستا ئەو گووانەت نەدەخوارد.

ئیــدی بە بەر چــاوانەوە کۆمەڵێــك جــاش و ســەرباز ســەرەو ســەرێ هەڵدەگەڕان، گەڕاینــەوە لای بــرادەران و تیمانگەیانــدن چ باســە، جــاش و سەرباز کونەکۆتر کێوماڵ دەکەن، ئیدی هەموومــان کــۆك بــووین لە ســەر ئەوەی جــگە لە ڕۆیشــتن بەو ڕێــگەیە چارێکیترمــان نــیە، دیســانەوە مــن و عەلی پێشکەوتین، وا ڕێککەوتین کە تەواوێك لە پێش ئەوانەوە بڕۆین لەو کــاتەی زانیمــان ڕێــگە بــێ مەترســیە یەکمــان لەوێ بمێنینــەوە و ئەویــدی بگەڕێتەوە برادەران بهێنێ، ئیدی بەو شێوەیە...

جاش و سەرباز دەســتە دەســتە قەدبڕ ســەردەکەوتن، ئێمەش بە ڕێــی

خۆماندا، دڵنیام ئێمەشیان دیتووە، بەڵام هەر وایان زانیوە جاشین و لەگەڵ ئەوانین، لە بیرمە جارێکیان کە بۆ لای برادەران دەگەڕامەوە، هەر هێندەم زانی سێ چوار جاش گەیشتنە بەردەمم، نازانم کوو زراوم نەچوو، چم لە دەست نەهات، ئەوە نەبێت رێی خۆم گۆڕی و رێی جاشانم گرتە بەر، واتە وەك ئەوان رووم لە چیا کرد، تەواوێك رۆیشتم، باش بوو بەردێکی گەورە هاتە پێشم، خۆم دا پەنایێ کە ئەوان دوور کەوتنەوە هاتمەوە سەر رێی پێشمەرگە، ئیدی ئێستاش نازانم کوو لە ناو ئەو هەموو جاش و سەربازانە دەرچووین، ئەوەشم لە بیرە جاشەکان هەولێری بوون، سلێمانی بوون، کەرکووکی و دهۆکی بوون، ئاخر لە قسەیانرا دیار بوو، من باش گوێم لە قسەیان دەبوو، ئەو جوونانەشم لە بیرە کە بەو شەوە هاوینیە بۆ دایك و خوشکی پێشمەرگەیان دەنارد، جاشێکیان دەوی زۆر پیس بوو، هەتا گەیشتە بن لووتکەش هەر جوونی دەدا، عەلی بە هێمنی و بە گاڵتەوە گۆتی:

+ لێی مەگرە، ئەوە شێتە.

- نا نا، خۆ لەگەڵ ئێمەی نیە.

بڕۆ، بڕۆ، وا بزانم شەو زۆر درەنگە، ئێمە رەنگە لە مەترسی دەرچووبین، هەورازەیەکمان هاتە پێشێ، هەردووکمان سەرکەوتین، ئیدی ئەودیو لێژایی بوو، بە گوێرەی ئەو تاریفەی سەردەستە بۆ ئێمەی کردبوو، لێرە شۆڕبینەوە لە ئاقاری کونەکۆتر دەردەچین، ئەوانیش گەیشتن، ئۆخەیش ئەوجارەش دەرچووین...

لە سەر پشت راکشابووم، لە هەموو راکشان و دانیشتنێك پێویست ناکات ناوی بەردیش بێنم، ئەو بەردەی لە باپیرمەوە بە بۆماوەیی بۆم ماوەتەوە، حەزم دەکرد سەد جار بڵێم ئۆخەی، تێر ئۆخەیم نەکرد، تێخوڕینی عەلی قیتیکردمەوە، دەبینم روو لە سینگی چەکدارێك تفەنگی راگرتووە:

کێی؟ نەجوولێی؟ دەتکوژم.

ئێمەش تفەنگمان لە کابرا راکێشا، من کە زانیم بە تەنێیە هێندە گرنگیم پێنەدا، ئەو پیاوە هیچ قسەی بۆ نەدەکرا، ناهەقی نەبوو، هەر کێ با لە جێگەی وی، بەو بەرەبەیانە حەفت زەلامی چەکدار دەوری بدەن، زراوی دەچوو، باش بوو نەکوژرا، پێشمەرگە بوو، لە سەر لووتکەی کونە کۆترەوە دەهاتە خوارێ تا بچێتە بارەگاکەی ئەودیو، نان بۆ برادەرەکانی ببا، لە رێی ئەو پێشمەرگەوە زانیمان لەو دیو بارەگایەك هەیە، پڕ پڕ خواردن، چایەشی لێیە، بە غاردان شۆڕبووینەوە، هێشتا رۆژ هەڵنەهاتبوو، گەیشتینە کۆمەڵە بەردێکی زۆر گەورە، هەر بەردەی بە قەت خانووێك بوو، لە هیچ جێگەیەکیدی دیمەنی وام نەدیتبوو، وا بزانم ژمارەی بەردەکان حەفت بەرد بوون، هەر بەردەی شەش حەفت شەقاوێ لێکدی دوور، گەورەیی شێوەشیان زۆر لێکدی نزیك بوو، ئەو بەردانە لە گۆڕاییەك قیت قیت راوەستابوون، باوەڕم نەکرد کە لە رێگەی کاری رێکەوتەوە ئەو بەردانە بووبنە دراوسێی یەکدی.

لە دواوە دەڕۆیشتم هەر هێندەمان زانی لە پەنای دوا بەرد لەو حەفت بەردە چەکدارێك لێمان دەرپەڕی، بە هەموو هێزی خۆی هاواری کرد و تفەنگی راکێشا، هاواری دەکرد و تێنەدەگەیشتم چی دەڵێت، خۆم خستە پەنای بەردێکەوە گوێم لە سەردەستە بوو دەیگوت:

رووی لەولاکە، برا رووی لەولاکە، ئێمەش پێشمەرگەین.

ئەو هەر هاواری دەکرد، هێندەی تێگەیشتم:

دەتانکوژم نێنە پێش، ئێوە جاشن.

توندتر هاواری کرد، دەتگوت تووشی هستریا بووە:

کوڕە لەگەڵەنگۆمە، بگەڕێنەوە، تەقە دەکەم.

پیاوێکی ترسناك بوو، دەنگی جیڕەی ددانی دەهات، چاوەڕێ بووم زرمەی لێوە بێنێ، چاوەڕێی بەربوونەوەی سەردەستە بووم، دیتم سەردەستە بە لەرزین لەرزی گرت و بەرەو دواوە کشاوە، هەرکەسێك لە جێی وی با، زراوی دەڕژا، گرفتەکە لەوە بوو ئێمە دەستمان نەدەچووە تەقەکردن،

چۆن تەقە بکەین! دەزانین ئەو پێشمەرگەیە، بەڵام لە بەدبەختیمان ئەو ئێمە بە جاش دادەنێ، گوێم لە دەنگی سەردەستە بوو:

باشە، کاکە دەگەڕێینەوە، بەس ئەتو تەقە مەکە.

ئیدی تا تێمانگەیاند جاش نین، سەد پێشمەرگە بوونە جاش! دوایی تێگەیشتین کە لە خەو راپەڕیوە و خەونیشی دیتووە، لەو خەونەدا جاش بەسەریاندا داوە، ئیدی خەون و راستی و ئەو شتانەی لێ تێکەڵاو ببوو...

بارەگاکە بن بەردێك بوو، بە هەمووشی دوو پێشمەرگەی لێبوو، ئیشی ئەوانە ناوسێریکردن بوو، بۆ ئەو پێشمەرگانەی لە سەر سەری کونە کۆتر وا شەڕی جاش و سەربازان دەکەن، دیارە هێشتا ئێمە نەگەیشتبووینە بارەگای ناوسێری، شەڕ لە کونەکۆترگەرم داهاتبوو، باش بوو هەر یەکەی چەند پارچە ناوسێریەکی ساردمان خوارد، چایەشیان نەمابوو، ئارد و رۆنیشیان چی وا نەمابوو، یەکیان گۆتی:

ئاخر ئەو شەڕە گەورەیە چۆن بێ نان دەکرێ؟

نازانم کێ بوو گۆتی:

شەڕ سێ شتی دەوێ، فیشەك، نان، چایە...

منیش هەڵمدایێ:

دەبوو چایەکەت یەکەم جار گۆتبا..

ئەو ساتەی ئەوێمان بەجێهێشت و پشتمان لە کونەکۆتری داگیرساو کرد، لە خۆوە هەستم بە نائاسوودەیی ویژدان کرد، لە دڵی خۆم دەمگوت:

ئەوان وا شەڕ دەکەن و ئێمەش خۆ قوتار دەکەین.

بەڵام زوو وازم لەو بیرکردنەوەیە هێناو گوتم:

کورە هەی کەرە، دەتەوێت لە ترِی سەی بچیت.

برۆ برۆ، هێور هێور بە پێی کیسەڵ برۆ، ماندوو و مردوو برسی و تینوو، نا، لەوێ کێشەی ئاومان نەما، لە نێوان دوو کانی کانیەکی چاو قرژاڵی هەڵدەقوڵا، گەیشتینە کانیەك ئاوێکی باشی لەبەر دەڕۆیشت، من

نیوە خۆشووشتنێك خۆم لەبەری شووشت، دەزانی چ ئارەقەیەكم كردبوو، بۆنی كورتانیش هەر مابوو، جلكەكانمان رەنگیان گۆڕابوو هەموو خەت و ماكی سپی، كراسەكەمم گۆڕی، كراسە پیسەكە و گۆریەكەمم شووشت، بیرمە كراسەكەمم بە لوولەی تفەنگەوە هەڵخست، دەتگوت ئاڵای سوپایەكی دۆڕاوە، پێم رەنگێكی سەیری گرتبوو، چەندی لێیان ورد دەبوومەوە نەمدەناسینەوە، گومانم هەبوو ئەو پێیانە هی من بن، هەندرێن و مام سالح نەیاندەتوانی بڕۆن، هەندرێن لە سەر گازەرەی پشت راكشا، گوتی:

تەواو، ئیدی هێزی رۆیشتنم نەما، شنگ و تینم لە بەر برا.

ویستمان هەڵی بگرین، بە چار كەسان پێمان بڵند نەكرا، ئاخر لەو دەمە، لەو دەمەی ماندوویتیی رێی دوور، ماراسا لە پێی هەموومان ئاڵا بوو، بۆ ئەو دەمەی ئێمە، ئەو هەندرێنە هێندەی تاشەبەردێكی گەورەی چیای هەندرێن گران بوو، بە كێ هەڵدەگیرا، بن پیلمان دەگرت، پێی عەردی نەدەگرت، چ بكەین خودایە، دەڵێی تووك ونزا لە پێی كراوە...

دنیا لە هەموو لایەكەوە دەسووتێ، لە هەموو لاوە تۆپبارانە، ئاسمانیش فڕۆكەی لێ نابڕێ، سەری كونەكۆتریش هەر ئاخر زەمانە، كێ بوو گوتی:

هەر لە كونەكۆتر ئاودیو بین، ئیدی مەترسی نامێنێ.

ئەو گۆتەیە درۆ دەرچوو، لەو رۆژانە هیچ چیایەك، هیچ دۆڵێك نیە تۆزێك ئارامیت بداتێ، هەمووی لە ناو سێرەی تۆپ و فڕۆكەی ئەنفالە، هەندرێن لە خۆی بێزار بوو، بە بێزاریەوە گوتی:

بڕۆن، گوللەیەكم لێدەن و بەجێمبێلن.

من هەستمكرد لە بنی دڵەوە وا دەڵێ، دەیەوێ بە تەنیا بمرێ، نایەوێ لە سۆنگەی ئەوەوە هاوڕێكانی تووشی بەلا بن.

ئەز لەو ساتە هەندێ گرتەی ناو فیلم و هەندێ دێری ناو كتێبانم بیركەوتەوە، ئەوانەی لە بارەی جەنگاوەری و پارتیزانیەوە، ئەها، ئەو

جەنگاوەرە دەمێ ئومێدبڕ دەبێ لە دەربازکردنی هاوڕێ بریندارەکەی، دێ لە سەر خواستی بریندارەکە بە دەستی خۆی دەیکوژێ، تا نەکەوێتە دەستی دوژمنان.

هەندرێتی ئیمەش لە دڵەوە وای خواست، لە دڵێ خۆ گۆتم:

داخوا گرتەی ناو فیلم و کتێبان، لەو رێیە قەندیلیە بە بەر چاومەوە خۆ نیشاندەدەنەوە و منیش دەبمە دیدڤانێ بە سەر گرتەیەکی وا، ئەگەر نەمردم و مام، سبەی رۆژێ ئەو سەربردە دەگێڕمەوە؟!

بیرمە نزامکرد، دووربین لە سەربردەی لەو شێوە.

ئێ، هەندرێن پەرتەکی برا، کەوت و پەلەکی برا، چارە؟!

بەر لە دیتنەوەی رێی چارە، هەژی گۆتنێیە، ئەز درەنگتر پێکەوتم، هەر کێ لە جێی ئەو هەندرێتەی قەرەچووخ با، نەیدەتوانی ئەو رێیە شامەڕێیە ببڕێ، نەیدەتوانی بەرگەی ئەو هەموو تینوێتی و برسێتیە بگرێ، ئەو هەندرێتە ئەگەر چیای هەندرێتیش با، لە بن هاتبوو، ئەگەر زێی بادینانیش با، چکی کردبوو، ئاخر ئەنگۆ نازانن بە چ برینێکەوە رێی قەندیلی گرتبوو، برینێکی تەڕ تەڕ، برینی دەستی شینەی گەڵ و گەڵفرۆش، ئەو چەتەیەی لوولەی چەکەکەی هەمیشە روو لە کۆمۆنیستان بوو، بیرتانە کانەبی گچکەش هەر بە دەستی ئەو شینە جاشە چوو؟

هەر لەو هاوینەی ئەنفالێ، ئەو هەندرێتەی وا بە قەندیلەوەیە و چاوەڕێیە لە لوولەی تفەنگی هاوڕێیەکیەوە گوللەیەکی گەرم بێت و ساردیبکاتەوە، تا بۆ خۆی پشووی هەمیشەیی بدات و هاوڕێکانیشی بە هۆی ئەوەوە درەنگ نەکەون و نەکەونە چنگی ئەنفالەوە، ل وێرێ، لە دەشتی کاکی بە کاکی مرکێی هەولێرێ، دەگەڵ پۆلێ هاوڕێ دەکەونە بۆسەی جاشەکانی شینەوە، خوێن دەهێتە رژانێ، یەک دووانی وەکات گەشمردە دەبن، هەندرێتیش دەستڕێژێ دەگرێتەوە، دوو سێ گوللە ناو قەدی کوناودەر دەکەن، گوللەیی لە ناو پشتی دەمێنێتەوە، هەوکە هەندرێتێ بەو گوللە و برینەوە، برینی دەستی دەستەی شینەوە، چاوەڕێی مەرگە.

کانەبی گەورەی سەردەستە من و عەلیی راسپارد کە لە پێشەوە بڕۆین و وڵاخێك دووان پەیدا بکەین، تاریفی جێگەیەکی بۆ کردین کە رەنگە هێستری لێ دەستبکەوێت، ئیدی هەردووکمان وەك باشووکە بۆی دەرچووین، خۆزگە چاوی کامێرایەکمان لە سەر دەبوو، ئەو کات روون دەبۆوە چەند تیژڕۆ بووین، بڕۆ بڕۆ، زۆر رۆیشتین، هەستمکرد لەگەڵ عەلی دەرناچم، منیش زۆر خۆش دەڕۆیشتم، بەڵام ئەو لە من خۆشتر دەڕۆیشت، تا ئەو کات وام دەزانی لە رۆیشتنێ جگە لە دوو پیاوە درێژەکە و ئەوی کورتەکە، جگە لە نادیەش کە وەك پەلیك دەردەپەڕی، کەس لەگەڵ من دەرناچێ، بەڵام ئەو عەلیە منی بەزاند، گەیشتینە سەر بەرزاییەك ئەو جێگەیەی سەردەستە گۆتبووی و گوایە هێستری لێیە، تەواو لێی نزیك کەوتبووینەوە، هەستی بە ماندووبوونی من کردبوو، بۆیە گوتی تۆ لێرە دانیشە، من دەچم هێستر دێنم، دانیشتم، لە بن درەختێك کە سێبەری لە تاشەبەردێك کرد بوو، رووە و لووتکە بەرزەکانی قەندیل دانیشتم، عەسرانێکی درەنگە، دنیا فێنکە، هەر چەندە لەولا و لەولا دووکەڵ بەرزدەبێتەوە، گرم و هۆڕە، بەڵام من هەستدەکەم هەوایەکی خاوێن و بێگەرد هەڵدەمژم، لە بیرمە جگەرەم زۆر کێشا.. هەتا عەلی بە هێسترەوە گەیشت برادەرانیش گەیشتن، ئەوانیش تووشی کاروان ببوون و هەڵیان گرتبوون، عەلی یەکێك لەو پێشمەرگانەی لەگەڵ بوو کە لە کونەکۆتر بە جێیان هێشتین، ئیدی تەواوێك لەوێ دانیشتین، بەلای دەستی راستدا نزمایی و دۆڵایی بوو، گوتیان:

ئەها ئێرێهێ پشتاشانە، ئەها دیارە ئەو دەوروبەرە لە ژێر تۆپبارانێکی قورسدایە.

بەلای چەپدا بەرزایی بوو، سەردەستە پەنجەی بۆ لووتکەیەکی زۆر بەرز درێژکرد و گوتی:

دیتانە ئەو لووتکەتان دیتیە، ئێمە دەبێت سەرکەوینە ئەوێ، وەك لەو کاروانچیانەم بیست جگە لەو رێیە هیچ رێگەیەکیدی دەرچوونمان نیە،

هەموو ڕێگاکان بە جاش و سەرباز گیراون، ئیدی دەبێت ئەو شەو بیبڕین.

بڕۆ بڕۆ گەیشتینە گۆڕاییەك، جێی ڕەشماڵی خێلان بوو، دیار بوو لە ترسی تۆپباران بە پەلەپرووزێ بارگەیان تێکنابوو، نەپرژابوونە سەر خۆخڕکردنەوە، هەندێ هیربال و دانەوێلە و جاجم و نیمدەرەیان بەجێمابوو، لەوێ پارچە شاخێکی تەختی لووس لووسم دی، هێندەی ناو ماڵێکی گەورە، بلندیشی هەر چۆکێ دەبوو، لە سەری لە سێ چوار جێ چەند پتە خوێیەکم دی، نازانم کێ بوو گوتی:

ئێرە خوێڕسکە.

وا دیارە، تۆپی ئەنفال نەیهێشتووە، بزن خوێیەکەی بخوات.

حەزمچووێ بزن ئاسا بە لێو ئەو پتە خوێیانە هەڵبگرمەوە، ئاخر ئەو چەند ڕۆژە هێندە ئارەقەم دەرداوە، لەشم بۆ تامیش سوێراتی تێدا نەماوە.

ئێرە ناوێکی نزیک لە کۆترەڵی هەیە.

ئەوەتا برادەرانیش لێرەن، بە یەکودوو شادبووینەوە، دیار بوو لەوێ چاوەڕوانی هەواڵێکی ئێمەی بەجێماویان دەکرد، لە چاوی هەندێکیانەوە چاوبەرەژێریم خوێندەوە، ئاخر لە پێشمەرگایەتی، پێشمەرگە بەجێهێشتن شەرمەزاری بوو، هەرچەندە لە شەوێکی ئەوها، لە هەورازەیەکی ئەوها، لە کەشێکی وا ئەنفالاوی، هی ئەوە نیە کەس گلەیی لە کەس بکات، سەید عەلی بە شەرمەوە نامەکانی لێم وەرگرتەوە، نادیە بە بینینی من زۆر خۆشحاڵ بوو، خۆشحاڵبوونێکی خوشکانە، لەوێ هەستمکرد خوشکێکی تا بڵێی بەسۆزم هەیە و ناوی نادیەیە، چ خۆشە لە ڕۆژگارێکی ئەوهادا خوشکێك ببینیەوە، نادیەی خوشك بە تێکەڵەیەك لە عەرەبی و کوردی گۆتی:

دەزانی هەتا چیایەکەشمان بڕی نەمزانیبوو تۆ بەجێماوی، هەر وام دەزانی لە پێشەوەی.

پسکویتێکی دەرهێنا، دیار بوو هەر ئەو دانەشی لا بوو:

ئەوە دەمویست لە هەورازەکەی کونەکۆتر بتدەمێ، بەڵام بە بەرچاوم

نەکەوتیت، دواییش.

زۆرم هەوڵدا وەرینەگرم، بەزۆری زۆردارەکی دایمێ.

دیار بوو دوای ئەوەی سەردەستە لەگەڵ ئێمە بەجێمابوو، ئەوان دوای ئاودیوبوون لە کونەکۆتری مەترسی و مەرگ لە ناو خۆیان بە بە زۆرینەی دەنگ (چەتۆ)یان بە سەردەستە دانابوو، هەژی گۆتنێیە لەو شوینەوە تا ئەودیوێ قەندیلێ سەردەستە هێندە پێویست نیە، دەستە تەنێ چاوساخی پێویستە، بۆیە ئەو دەستەیە شەماڵەکەیان بەس بوو، ئەو کوڕەی دەتگوت بای شەماڵە لەو چیاوچۆلە هەموو کون و بن بەردێکی پێدەزانی.

ئیدی کانەبیش وەك سەردەستەیەك بە تەنیشت خۆیەوە تەماشای ئەو کوڕەی دەکرد.

لەو گۆڕاییەی بن چیا، جێی چۆلی رەشماڵی خێلان، تۆ بلێێ هەواری خاڵی! کز و مەلوول، بە دیار نادیاریی خۆمانەوە دانیشتین...

هێندەم لە بیرە بەو پێش رۆژئاوابوونە، دەستکرا بە ناوسێری کردن، بخۆ ناوسێری بخۆ، بە دەم خواردنیشەوە گوێ لە لوورەی تۆپ راگرە، کوێ تۆپباران بکرێ باشە؟ رێك ئەو رێیەی کە دەبوو پێیدا سەربکەوین، تەماشامان دەکرد رێك رێیەکەیان دەکوتیەوە، نازانم لەو دوورەوە چۆن نیشانیان دەپێکا، ئیدی خۆمان لە پەنای بەردەکان نابوو، ساچمە گڤەی دەهات، زۆر نزیك لە ئێمە، تۆپ بە عەردی دەکەوت، لەگەڵ لوورەی تۆپەکان خۆمان لە پەنای بەردەکان دەنا، تۆپ پێش ئەوەی بە عەرد بکەوێت، بە چەند چرکەیەك، لوورەی دێت، هەر ئەوەش وای لە کوڕێک کرد بڵێت:

+ دەزانن ئەو تۆپانە دەڵێی دەستێکیان لەگەڵ ئێمەدا هەیە!

- کوو؟

+ ئەوە نیە پێش ئەوەی بە عەرد بکەون، هاوار دەکەن خۆتان بە عەردی دادەن وا هاتین!

تۆپ، تۆپ، دیسان تۆپ، بەڵام مادام ناوسێری هەیە، تۆپ فشەیە،

خۆ ئەگەر چایەش هەبا، کیمیاییش بە عەلی حەسن مەجیدەوەش هەر فشە بوو، هەر لەوێ بۆ یەکەم جار گوێم لە (عەلی کیمیاوی) بوو، نازانم کێ بوو گوتی:

دەزانن کیمیاوی لەگەڵ ئەو عەلیە پەیدا بوو، بۆیە هەقە ناوی بنرێ عەلی کیمیاوی.

من لەوێ بیستم جا نازانم ئەو خۆی ئەو ناوەی داهێنا یان ئەویش لە کەسێکیدی بیستبوو، دووریش نیە لە یەك کاتدا چەند کەسێك بێ ئاگا لە یەکتر ئەو نازناوەیان بۆ ئەو پیاوە هەڵبژاردبێت.

سەرەتا وام دەزانی ئێمە زۆر لە جاش و سەربازەوە دووریـن، بەڵام کە گوێم لە قسەو باسان بوو، ئەوجا تێگەیشتم تاهوو من لە کوێم.

- هەتا تەواو تاریك دانێت، نابێت بە رێ بکەوین.

+ ئا ئا، خۆ بە دوورین باشمان دەبینن.

- باشترە درەنگی شەو بەڕێکەوین، لۆ بەرەبەیان بگەینە سەرێ.

هەندێ رەشماڵ بە پێوە مابوون، هێشتا بۆنی ئاوەدانیان لێدەهات، شەوەکەی سارد، زۆر سارد بوو، کەچە لبادێکم دیتەوە، لە خۆمم ئاڵاند، دەبێت نووستبم، چوونکە خەونم دیت، بەڵام هەر لەگەڵ بەئاگاهاتنەوە هیچم لە بیر نەما، تۆپەکان دەڵێی کەمێك ماندووبوون، ناوە ناوە لوورەی تۆپێك دێت، سەرکەوە، ئەها تۆپەکان زیادیان کرد، زۆر نزیك لە تەنیشتمان لە بەردەممان بە عەرد دەکەون، ئەوەتا لەگەڵ لوورەی تۆپ دەماودەم خۆمان بە عەرد دادەدەین، ساچمە گڤەی دێ، گیزەی دێ، راستی رەنگە کەس نەزانێ دەنگی ساچمە دەستنیشانبکات چ دەنگێکە، بە دەنگی چی دەچێت، دەنگی ساچمەیە و تەواو، ئەو شەو شەوی تیاچوونە، خێرێکیدیشم لە خۆم گرت، هات تۆپ هات، خۆ بە عەرد دادە، کەس سووندی لە سەرم نیە، سەد جار پتریش خۆم بەعەرد دادایەو هەستاومەتەوە، سەرکەوە، شەوێکە بایەکی فێنك فێنك، سەرکەوە سەرکەوە، شەوێکە بایەکی سارد سارد، ئەو بایە قەت لە بای هاوینی

ناچێت، هێشتا بەیانی نەدابوو، یان دابووی و نەیدابوو، نا، ڕەنگە نوتڕیان بووبێ، گەیشتینە ناو زستانی قەندیلێ، بەفر بەفر، هەرچۆنێك بوو هەندێك وردە دار و چیلکە و چوال و گوێتیمان مان خڕکردەوە، ئاگرمان کردەوە، بە دەوری ئاگردا هەڵدەلەرزین، من پشتم تیشە بەردێکە تیژ، لمووزی بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوە، پێشیشم ئاگر، ئاگرەکە بە بڵێسەکانی دەیویست لاسایی تیشە بەردەکە بکاتەوە، ئای بۆ چایەك! دنیا ڕووناك بۆوە، گوێم لێبوو سەردەستە دەیگۆت:

نەدەبوو مام سالح بە جێبێلم، کوو دەبوو، ئەدی چیم بە برادەرانێ سەرەوە گوتبا؟!

لەزگبوو بڵێم:

ئەدی بۆچی هیمدادمان بەجێهێشت؟

نازانم بۆ ئەو پرسیارەم نەکرد، لەبەر خۆمەوە گۆتم باشە دەبێت چ جیاوازیەك لە نێوان ئەو دووانە هەبێت، ئەوەی من دەیبینم ئەویان گەنج بوو زۆر گەنج، ئەمیان هەندێك چۆتە تەمەنەوە، هەر ئەو جیاوازیەم لە نێوان ئەو دووانە دەبینی...

ئێ، قسە لە قسە، قسە قسەی ڕاکێشا، تێگەیشتم کە مام سالح کادیرە، کادیرێکی گەورەشە، من تا ئەوکات نەمزانیبوو، بە چ بزانم جاری یەکەمم بوو ئەو پیاوە ببینم، لە بیرمە لە بن لێوانەوە کە بە زەحمەت خۆشم گوێم لێبوو گوتم:

باش بوو، لەوێ نەمزانی کادیری دەنا دوور نەبوو، بەجێمهێشتبایت!

لەوەوە ئەو قسەیەم کرد، زۆر حەزم لە چارەی کادیر و بەرپرسان نەدەهات، ئەوەشم لە بیرە هەر زوو لەو قسەیەی خۆم، قسەی بن لێوان پەشیمانبوومەوە و لە دڵەوە گوتم:

نا هەڵەیە نابێت مرۆڤ وا بیر بکاتەوە، نا، بشمزانیبا نەدەبوو بەجێیبهێڵم.

مام سالح ناوە ناوە، چاکەی منی بۆ برادەران دەگێڕایەوە، ئەو چاکەیەی هێندە گێڕایەوە، نەمدەوێرا لێی نزیك ببمەوە، شەرمم دەکرد.

بەڵام شـتێکم لە دڵە، نەیڵـێم بە زگـدەدەم، دواتـر، لە گـرانیەکە، ئەو گـرانیەی لەگەڵ پێوەربـوونی پێشـمەرگە ولاتـی گـرتەوە، ئەودەمەی پێشـمەرگە بـوونە دوو بەرە، بەرەیەك هەڵکشـان بـۆ ئاسـمان ودنیایـان بـۆ خۆیـان بـرد، بەرەیەك بە قـوڕدا چـوونە خـوارەوە، تێـر بە زگـی خۆیـان نەخوارد و بوونە جێی گاڵتەی جاشان، لەو گرانیە لە شێخەڵلا لەگەڵ حەمە عەبـاس کتێبخـانەیەکی گچکەمـان هەبـوو، پتـر لە بـن بەردێکـی گەورە دەچوو، هاوینان گەرم گەرم وەك بەردەکەی کـونە کـۆتر، زستانان سـارد سارد دەتگوت بەفری قەندیلی پێوە، کتێبخانە (پـایزە)ی نـاوبوو، ئەو پـایزە ببووە ناونیشانێکی دیار بۆ چـوار پێـنج پێشـمەرگە لەو پێشـمەرگانەی دوای ئەنفـال گەیشـتنە رووسـیا و لەوێـوە بە دنیـادا پەرتبـوون، لە رێـی ئەو ناونیشانەوە، پارەیان بۆ کەسوکار دەناردەوە، یەکێـك لەوانە سـورخی بـوو، پێش نیوەڕۆیەك مام سالح لە پێش پایزە پەیدابوو، گوتی:

+ سورخی چەند دۆلارێکـی بـۆ مـاڵی خۆیـان نـاردووە، تـۆ دەتـوانی بیگەیەنی؟

- ئا، دەتوانم، جاری یەکەمم نیە.

+ باشە، ها، ئەوە دوو سەد دۆلار، بەڵام شتێکم بۆ بنووسە.

- چی بنووسم؟

پێنووس و کاخەزم لە دەستە، گوتی: بنووسە:

من شوانە، بڕی دووسەد دۆلارم لە مام سـالح وەرگـرت کە بـیگەیەنمە ماڵی سورخی لە کەرکوك لە رێکەوتی .../.../ ..١٩٩

رۆژ و مانگ و ساڵەکەم لە بیرنیە، نووسیم و واژۆم کرد، هـۆیێکم لە خۆم زانی، ئەوە جـاری یەکەمـم بـوو کە لە وەرگرتنـی پـارە واژۆ بـکەم، ئیدی دنیایە! دەی، با بگەمەوە قەندیل.

دەیانگوت:

ئێرە، لە دوندە هەرە بەرزەکانی قەندیلە.

ئێرە نێوان دوو دوندە، دوو دونـدەکە لە کـن ئـێمەوە هێنـدە بەرز نـین،

بەڵام ئەگەر لە عەردەوە لە خـــوار ئەو جـــێگەیەی دوو پێشـــمەرگەمان بەجێهێشت و دەرخـواردی ئەنفالمـان دان، بە چـاوی خەیـاڵ تەماشـای ئەو دوندانەت کردبا، دەتدیت سەریان لە ئاسمانێیە، ئاخر ئێمە لە ترسی ئەنفالێ هێندە هەڵکشابووین، نزیك ئاسمانێ کەوتبووینەوە.

ئەو دوندەی دەستی راست، دوندی نـاو شیعرەکەیە، شـیعری شـاعیری ناڵەی جودایی، ئەوەی وا لە ناو کۆڵەپشتەکەمە:

**بۆت نووسیوم بۆت بنووسم ئەمن چیم**
**دوندی قەندیل، گۆڕەپانی هەڵگورد نیم**
**بەرە و بەرزی دەچم، گەرچی وردم**

---

لەوێ لەو نزیك ئاسمانە لە خۆوە کەوتـمە بەراوردێکـی نێـوان هەردوو سەردەســتە، ئەو دوو سەردەســتەیەی لە هەورازەی کونەکـۆتر هەر یەکەو پێشـمەرگەیەکیان بەجێهێشـت، بە زۆر لا لە هەمـوو دیـوێکەوە بەراوردم دەکردن، ماندووبووم، لە بیرم نیە گەیشتمە چ ئەنجامێك.

ئێـرە، ئەو نزیـک ئاسـمانە، شـێخ شـەرۆی دەڵێنـێ، ئەو شـێخە چـۆن گەیشتۆتە ئێرە! شەرۆ سپی سپی بەو هاوینە لێـرە رێبەنـدانە، بەفـر و بەفـر و بەفر...

خەریکـی شـۆڕبوونەوە بـووین بەو دیـودا، ئەوجـا وەرە لە ئاسـمانێ بگەڕێوە سەر عەردی، دەبینم دەستەبەرەیەك لە دەستی پێنج شەش کەسدا، ژنێکی جحێڵیش بە دوای دەستەبەرەوە، تەماشامکرد چاوەکانی دوو گۆمی خوێن بوون، دیار بوو زۆر گریا بوو، دیار بـوو بە قەد ئەو دڵـۆپە خوێنـانە دڵۆپە فرمێسکی باراندبوو کە لە پیاوی نـاو دەستەبەرەکەوە رژابـوونە سـەر زەوی، ببینە ئەو دڵـۆپە خـوێن و فرمێسـکانە ببیـنە کە دەڕژێـنە سـەر بەفـر، گوتیان:

ئەو بریندارە ناوی ئازاد هەورامیە.

دیارە ژنەکەش خێزانی بوو، هەستمکرد ئەو ناوە ناناشنا نیە، ئیدی ئـێمە

چوار پێنجێك دەستەبەرەکەمان لەوان وەرگرت و شۆڕبووینەوە، دەستم بە دەستەبەرەوە، بیریشم هەر لای ناوەکە، ئازاد، ئازاد، هەورامی ، هەورامی! گەیشتمەوە هەولێر چوومەوە قوناخی ناوەندی، مامۆستایەکمان ناوی وا بزانم هۆشمەند بوو یەکی کەڵەگەتی سوور و سپی، ئێ! نازانم بە هۆی چییەوە بوو لە ناو مامۆستایان بەس ئەو مامۆستایەم خۆشدەویست، لە دەرەوەی پۆل دوو سێ جارێك گوێم لێدەبوو:

برایەکی ئەو مامۆستایە پێشمەرگەیە ناوی(.......)ە

لە بیرم نەمابوو ناوی برا پێشمەرگەکەی چیە، بەڵام ئێستا لە ناو بەفری قەندیلێ و دەست بە دەستەبەرەوە، هەر لە خۆوە دەڵێم ناوی ئازاد بووە.

ئیدی نازانم ئەو ئازاد هەورامیەی وا لە ناو ئەو دەستەبەرەیە و کەس نازانێت چەند گوللەی بەرکەوتووە، برای ئەو مامۆستایەیە کە کاتی خۆی وانەی بە من گوتووە، یان ئازادێکیدیە، نا، بە هەڵەداچوون، تۆ بڵێ بە خەیاڵداچوونێ بوو؟

لەو دیوی قەندیل لە شوێنێك ئیدی نە جاش نە سەرباز لە بەر ڕێزیان بۆ پاسدار نایگەنێ، دانیشتووین، ئێرەش شێخی پێوەیە پێدەچێ خوشکی شێخ شەرۆ بێ! بە شێخ ئایش ناوی دێنن.

. شێخ ئایش دنیایەك پێشمەرگەی لە باوەشێیە، دوو پێشمەرگەکەی لەگەڵ ئێمە کە لە کونە کۆتر بەجێمابوون، چوونەوە لای برادەرەکانی خۆیان، دیسانەوە ناوسێری، ناوسێریم بە دەستەوە بوو، گوێم لێبوو گوتیان پیاوی ناو دەستەبەرەکە گیانی دا، نازانم بۆ زۆر خەمم لێی خوارد، ڕەنگە لە بەر ژنەکە بووبێت، بیرم کردەوە داخوا ئێستا ئەو ژنە چۆن لە سنگی خۆی دەدا و دەست لە قژی خۆی دەنێ، یان لەبەر مامۆستاکەم بووبێت، ئەو کاتەی هەواڵی مەرگی براکەی دەبیستێ، ئەگەر برای ئەو بێت، چۆن وانە دەڵێتەوە! ئا، برای بوو، دواتر بیرمکەوتەوە، لە شار ڕەنگوڕوو، لە قەندیلێش بەفر و خوێن کردبوویە برای ئازاد هەورامی!

بڕۆ، بڕۆ، وا بزانم ئەوە جاری یەکەممە وا بەوردی تەماشای

شـەلینەکەی سەردەسـتە دەکەم، شـەلینێکی جـوان دەشـەلی، ئەو پیـاوە کەڵەگەتە چاو و بـرۆ ڕەش و پـڕە، پێیەکـی پـڕ لە پلاتـین بـوو، وا بـزانم شـەڕی سـێ دەوڵەتـی کردبـوو، شـەڕی جەنـدرمەی ترکـی کردبـوو، ئەو کاتەی ئیمام خومەینی فەتوای بە کـافربوونی دیمـوکراتی دا، ئەو پیـاوە لە مەهابادێ شەڕێکی باشـی کردبـوو، لەگەڵ بەغـداش ئەوە لەوەتەی هەیە لە شـەڕێدایە، مـن لە شـەلینەکەی ورد دەبـوومەوە، ئیـرەییم بە ڕۆیشـتنەکەی دەبرد، چەند جارێ ویستم لاسایی شەلینەکەی بـکەمەوە، نەمتـوانی، ڕەنـگە پاڵەوانێکی ناو ڕۆمـانی(( خەوی پسـاوەی قەنـدیل)) کە ئیمـامەی پسـاوەی ناوە، خزمایەتیی لەگەڵ ئەو سەردەستەیەمان هەبێت.

دەڵێن ئەو چیای قەندیلە لە زۆر شتان دوو قەندیلە، ئەوەی مـن لە دوو قەندیلیی قەندیل دیتم، ئەو دیوەی کە لە ژێر تۆپەکانی ئەنفال بـوو بە ڕۆژ گەرم گەرم، بەڵام دیوەکەیدی با پێیبڵێین دیوی نسێ، بەو دەمەو نیـوەڕۆیە کزەبایەکی دێ دەڵێی لە چلەی زسـتانەوە هەڵیکـردووە، دیـوی نسـێ بەفـر گرتـوویەتی، ئەوانەی لە گەرمەی هـاوینێ بەفریـان نەدیتبـوو، لە سـیمایان تاساوی دەبینرا، ئەوەتا بە سەر پردی بەفـردا شـەقاوی هـاوینی دەهـاوێژین، بـن ئەو پـردە جۆگەلەی ئـاوە، ئـاو چ ئـاو کـوڕم دەوێ بـۆ مـاوەی یەك خولەك دەستی لە ناو ڕاگرێ، مەتارەکان لەوەتەی هەنە ئـاوی وا تەزیویـان بە خۆیانەوە نەدیتـووە، ئەوەتـا لە نـاو بەفـرێ تـۆزێ دەکەیـن، بەفـر لە بـن هەتاوی هاوینی دەڵێی خوێیە، دەڵێی چ ساردایەتی بەفری تێدا نیە، دۆڵایی وا هەیە کەس نازانێ بە بەفری چەنـد سـاڵە پـڕ بـۆتەوە، لە بـارەی کـۆنیی بەفرەوە پرسیارم لە کۆچەریەك کرد، گۆتی:

- دەو قەندیلەی ئەگەر ورد بگەڕێی، یەکەم بەفر و دوا بەفر دەبینیەوە.

+ تێناگەم چ دەڵێی؟

- بە کوردی قسە دەکەم نە بە عەرەبی نە بە فارسی، باشـە چەنـد سـاڵە بەفر دەبارێ؟

+ لەوەتەی هەور هەیە.

- دەمخۆش، دە لەو کاتەوەی یەکەم بەفر کەوتۆتە سەر ئەو قەندیلە، پێش ئەوەی بتاوێتەوە، بەفرێکیدی بەسەردا باریوە، ئیدی بەفر لەسەر بەفر، ئەها تەماشای ئەو دۆڵاییە بکە بە خودای بەفری پێش هاتنی... ئەسحابەشی لێ مایە.

ناوی ئەسحابەیەکی گوت، هەر لەوێ ناوەکەیم لە بیر کرد، لە گەرمای بەردەکەی کونەکۆتر هێندەم گەرما هەڵمژیبوو، لە ساردی تێر نەدەبووم، هەندێك چوومە بن پردی بەفرەوە، رێك دەتگوت ناو بەفرگرە، ئاوێك خوڕەی دەکرد نەتدەتوانی گۆڵمێکی لێ بخۆیتەوە، پێشمەرگەیەك بە دەنگی بەرز گوتی:

قەندیلی ئەو دیو لە کوێ هی ئێرە لەکوێ! گوناهە بە هەردوو دیو بڵێین قەندیل، چیا دەبێت ئەوها بێت، دیوێکی هاوینی دیوەکەیدی زستانە.

برۆ، برۆ قەندیل و قەندیل برۆ، لە بەفر دوور کەوتینەوە، دنیا گەرمە ئارەقە دەستی بە چۆڕانەوە کرد، کات نێوان نیوەڕۆ و عەسرە، گەیشتینە چەمێکی گەورە، بەڵام یەك بە گەورەیی خۆی ئاوی پێدا نەدەڕۆیشت، نا، لە لایەکی چەمەکەوە جۆگەلەیەکی باریك بە نازەوە رێی گرتبوو، لێرەو لەوێش گۆماوی گەورە و گچکە بایی خۆیان ئاویان لە جۆگەکە وەردەگرت و زیادەکەشیان بۆ گۆماوەکەی دوای خۆیان دەنارد، گۆماوی واش هەبوو دوور لە جۆگە، دەتگوت مانیان لە ئاوی جۆگە گرتبوو، وەریان نەدەگرت، لە چاویان دیار بوو چاوەڕێی چکبوونی خۆیان دەکرد...

لاماندا دەو چەم، من بێ ئەوەی بزانم پشووەکەمان کورتە درێژە، بەشی چ دەکات! چوومە سەر گۆمێك کە خۆی لە پەنایەك نابوو، جلکەکانم شووشت و بەسەر درەختە کورتەباڵاکاندا هەڵمخستن، تەماشام کرد، ئەو لەتە سابوونەی لە کۆڵە پشتەکەم بوو یاڵا بەشی دەستێکی باشی سەرم بکات، ئیدی سەرم بە سابوون شووشت، بۆ لەشیشم لم و قوڕەسوورەم بەکار هێنا، چەپکە گیایەکی دەو چەمەکەش باشترین لیفکە،

خۆ شووشتن بە لـم و قـوڕە سـۆر ئەگەر لەگەڵـی رابێـی وەك ئەوە وایە بە شـامپۆ خـۆت بشـۆی، دیـتم چەنـد پێشـمەرگەیەكیدیش وا لەگـژن بە لـم خۆیان دەشۆن، یەكیانم دیت سەریشی بە قوڕە سـوورە دەشووشـت. ئێسـتا لەشم سووكە، پرچم خـاوێن، خـۆ لە پیسـیدا نەمـدەوێرا دەسـتی بـۆ بـبەم، جلكەكانم كزر بیوونەوە، بەڕێكەوتین.

دەمەو ئێوارەیە، بە دیوی ئێمەدا قەنـدیل ئـارامە، لە دیـوی ئەو دیـویش پێـدەچێت هەر ئـاخر زەمـان بێـت، تۆپەكـان نـاوە دەنگیـان دێ، لە دۆلاییەك رەشماڵی خێڵان بە دیار كەوت، ئۆی چـایە! مـن لە سـەر زگـی برسـیەوە بەس بیـرم لە چـایە دەكـردەوە، دەمگـوت بەس بـگەمە ئەو رەشماڵانە، بە ژنەكە دەڵێم:

پووری، دادە، بەس چایە و هیچیدی.

تا گەیشتینێ دنیا لە سەر تـاریكبوون بـوو، نـزیكەی پـازدە رەشـماڵێك دەبوون، دیاربوو هەشت نۆ دە پێشـەرگەیدیش لەوێ بـوون، وا بـزانم دوو دوو دابەش بـووین، مـن و كـارزان كەوتیـنە رەشـماڵێك پیـاوێكی هەنـدێ بەتەمەن و ژنێكی جحێـل و دوو منـداڵی گچـكەلە، كـارزان زۆری برسـی بوو، بە خۆی نەوەستا:

+ بە خودای زۆرمان برسیە.

- باشە، سەر چاو پەلە مەكەن، ئێستا دەگات.

ژنەكە هێند بە نەرمی وەلامی دایەوە، من لە جێی خـۆم خەریـك بـوو بتـاوێمەوە، بەلام كـارزان لە بەر برسـێتی خەریكبـوو جارێكیـدیش داوای پەلەكردنی لێبكاتەوە، قونجرکەیەکم خێواندێ، ئۆندەی لە خۆی هەڵـدا، لە شەوی پێشووەوە لەگەڵ ئەو كـارزانە زۆر بـووینەتە بـرادەر، لە رێ هەر بە یەكەوە دەڕۆیشتین، خەڵكی هەولێر بوو، ئەوەی لە یەكتری نزیككـردینەوە رۆمان بوو، دیـار بـوو خـوێنەرێكی باشـی رۆمـان بـوو، بە تـایبەتی كـاری رۆماننووسـە میسـریەكانی زۆر خوێنـدبووەوە، ئیـدی بە دەو رێـوە باسـی پـاڵەوانی ئەو رۆمانانەمـان دەكـرد كە خوێنـدبومانەوە، مـن زیـاتر باسـی

سارتەر و ئەلبێر کامۆ و یەشار کەمال و کازانتزاکی و مەکسیم گۆرکیم بۆی دەکرد، ئەویش زۆر لە نەجیب مەحفووز و ئەوانە دەدوا، کارزان ناوە ناوە ناوی بەرپرسێکی بەسەر زاریدا دەهات و سەدو یەك جوونی پێدەدا، ئەو بەرپرسە ببووە مۆتەکەی کارزان و لێی نەدەبۆوە، چەندی هەوڵم لەگەڵی دەدا لە بیری بکات، بەلاش بوو، پتر ناوی دەهێنا، مەسەلەکەش چ بوو! گوایە رۆژێك لە دەو بەستی شەرغە ئەو بەرپرسە خەریکی خاوێنکردنەوەی تفەنگەکەی دەبێت، گوللەیەك دەردەچێت، بۆ بە نێوچەوانی پێشمەرگەیەك ناکەوێ و جێی ناکاتە ئەوجێ، کارزان دەیگوت:

ئەوە قەیناکە لە دەستدەرچوون بوو، بەلام دەزانی دوایی، ماڵی کوڕە ویستبوویان بە دووی رووداوەکەدا بچن، کەچی ئەو بەرپرسە بێ منەتی کردبوون، هەڕەشەی لێیان کردبوو، پێیانی گوتبوو:

بەردێك لە سەر ئەو ئارێشەیە دانێن و باسی نەکەن!

زۆری برد یان زۆری نەبرد، هێندەمان زانی یەك لەگەنی گەورە، هات، کەوتینە سەر ساوار بە تەماتە، بتاندیتبا چۆن نانمان پێدا دەدا، هێشتا پاروویێك لە زاری بوو پاروویێکیدی لە رێی زاری، کارزان بە هەردوو دەست پارووی لە دەوی دەنا، رەنگە منیش وامکردبێت، بەلام من ئەوم دەدیت، خەریکی دەستهەڵگرتن بووم، ئەوجا سەلکە پیازم دیت، لەبەر خاتری پیاز چەند پاروویێکیدیشم...

ئێ، نۆرەی چایە، بە داخەوە چایەکانم نەژمارد، کتریەکی گەورە، دیار بوو، ئاگردانەکە نزیك زاری رەشماڵ بوو، دەمدیت ژنە قوڕ بە سەرەکە ناوە ناوە ئاوی تێدەکردەوە، دیتم تۆچاشی تێکردەوە، ئەو چایەی لە بن ئەو رەشماڵە و بەو ئێوارە درەنگەی هاوینی قەندیلیە خواردمەوە لە هیچ جێگەیەك لە هیچ چایخانەیەکی هەولێر چای وا بە تامم نەخواردۆتەو.

گیان، ئەوجا نۆرەی جگەرەیە، وام وێنا کرد ئەو رەشماڵانە بە لای کەمی ئەو رەشماڵەی وا من لێی مێوانم پێشمەرگەی کەم بە سەرەوە

بووبێت، چونکە زۆر مێواندۆستانە خزمەتیان دەکردین، نە لە سیمای ژنە نە لە هی پیاوە هیچ بێزاریەکم نەخوێندەوە، پیاوەکە زۆر حەزی لە قسە بوو، بەو با هەتا سبەینێ دانیشین و قسان بکەین، یان راستتر بڵێم گوێ لە قسەکانی ئەو بگرین، ئاخر ئێمە لە سەر ئەو ماندووبوونە قسەیەکمان نەبوو بۆ گۆتن، هەشبا توانای کردنیمان نەبوو، خەوەنووتکەمان دەبردەوە.

ئەوجا نۆرەی خەوێیە، خەو لەسەر رایەخ، خەو لەسەر بالیف، رەشماڵەکان لێکدی دوور نەبوون، هەر لە دەوروبەری رەشماڵی خێلان، جێیەك لەوێ یەك لەولاتر ئەویدی نزیك لەو، ئیدی چوومە سەر تەشکەبەرەی خۆم و بەتانیم بە خۆمدا دا، کارزان قەیاسێك لە من دوور بوو، خەریك بوو بنووم، بەردێکی گەورە سەرنجی راکێشام کە چەند هەنگاوێ لێم دوور بوو، نزام کرد خوایە دیوی ئەو بەردە جێگەی کەس نەبێت، جێگاکەم هەڵگرت چووم، باش بوو چۆل بوو، دلم داکەوت، جێگام راخست، ئۆخەیەش هەتاو بە ئاگام ناهێنێ، بەردەکە سێبەرم لێدەکات، من کە بیرم لە چێشتە خەو دەکردەوە بە بێ ئەوەی بزانم چ وەختی سبەی بەرێدەکەوین، ئاگام لە ئێشکگریش نەبوو، بەلام نزام کرد کە ناوی منیان لەبیر کردبێت، رەنگە چوونە پەنای ئەو بەردە هێ لە سێبەرەکەی بۆ چێشتەخەوێ، دوور نیە پەیوەندی بە قسەکەی باپیریشمەوە هەبووبێت، شەو تاریکە هێشتا مانگ هەڵنەهاتووە، رەنگە هەڵیش نەیەت، وا دەچمە خەوێ، دەبێت تۆڵەی ئەو هەموو شەو و رۆژە بێ خەویە بکەمەوە، هەرچەندە دنیا ساردیش بوو، بەلام ترسی دووپشك بەرمی نەدەدا.

وەك خەون دێتەوە بیرم، لە سەر مەچەکم هەستم بە شتێکی گران کرد، بێ بیرکردنەوە زانیم دووپشکە، زراوم چوو، ئەحمەد عەرەب و دەرزیم بیرکەوتەوە، خۆ ئەویش لێرە نیە، خۆم گرت، لە ترسی ژانی دوایی هەستوخوستم لە خۆم بڕی، وەك ئەوەی هەر بەئاگا نەهاتبم، بیستبووم ئەگەر نەجوولێی با دووپشك بە سەر هەموو لەشتدا پیاسە بکات پێوەت

نادا، بەڵام کەمترین جووڵە واتە رازیبوون بە پێوەدان، ئەو قسەیە چەند درۆیە چەند راستە، نازانم، بەڵام کورم دەوێ دووپشك بە لەشیەوە بێت و جووڵەش نەکات، خۆ جاریدیش ئەو قسەیەم بیستبوو کەچی بە خۆم نەوەستام و پشتە دەستێکی توندم لە دووپشك دا و ئەویش کاری خۆی کرد، تا جارێدی نەمزانی دووپشکە، بە هەر حاڵ پێدەچێت ئەو جارە خۆ راگربم، ئای ئەوە چ دووپشکێکە!

خۆ وا دەستم رادەوەشێنی، چیە، دەیەوێ بە زۆر بمجووڵێنێ تا رەوایی پێوەدان بەدەستبێنێ! بانگمیکرد! ئای دووپشك قسەش دەکات! وەك خەونی ناو خەونیش لە بیرمە دەنگێکی ژنانە بانگمی دەکرد، بەڵام بە ناوێك ناوی من نەبوو، گوتم رەنگە نادیە بێت گاسم بکات بۆ نۆبەتداری، بۆ نا، ناوی منیان لە دوای ناوی وی داناوە، بەڵام بۆچی بە ناوێکیدی بانگم دەکات، ئەو ناوەی هەر ئەوکات لە بیرم چۆوە، راستتر تێنەگەیشتم چ ناوێکی گوت، خەریکی چاو هەڵگلۆفتن بووم، دەمویست هەستمەوە، ئای، ئەوە چ دەکات!

هاتە بن بە تانیەکە، ئەو ژنە کێیە؟! تاریکە دەموچاوی دیار نیە، چاوم هەندێکیدی هەڵگلۆفت، بزانم خەون نیە، هەبێت نەبێت من خەون دەبینم، لە تەنیشتم راکشا، خوایە ئەوە چیە! دەمویست شادە و ئیمان بێنم، گوتم رەنگە ئیزارئیل یان جندۆکە، یان هەر شتێکیدی ئاسمانی بێت، بە نەرمی گۆتی:

ئۆی خەوت چەند گرانە، هەر وەئاگا نەهاتی!

ئەو رستەیە دڵنیای کردمەوە کە خەون نابینم، تێگەیشتم کە بەو نیوە شەوە دیاریی خودا بۆم هاتۆتە بن ئەو بەردە، ئیدی منیش ناوی خوام لێنا، ژنێکی کەڵەگەت بوو، بەوە دەزانم کە لە تەنیشتم راکشا بوو، پەنجەی پێی لە پەنجەی پێم دەخشاند و لێویشی لە سەر لێوم بوو، هەرچی چێژی خوا لە جەستەی ژن شاردوویەتیەوە، من لەو ژنەم چەشت، نەرمتر لە جاری پێشوو، نەرمتر لە خۆی گۆتی:

ئەها، هاتم درۆم، نەکرد.

هیچ قسەم نەکرد، قسەی چ بکەم چی تێنەگەیشتم، درۆنەکردنی چی، لە کاتی هەستانەوە دەستم لە خەناوکەکەی گیر بوو، رەنگە ویستبێتم جارێ نەڕوات، لە بیرم نیە چۆن بوو، خەناوکە پساوە، لەو تاریکیە بە بێ قسە هەردووکمان بە دوای مۆری، دەستمان لە عەرد دەگێڕا، ماوەیەکی باش خەریکی مۆری خڕکردنەوە بووین.

ژنە رۆیشت، من سەر دێنم و دەبەم تێناگەم، هێشتا هەر وام دەزانی خەونە، ئاخر خەونی لەو بابەتەم دیوە، خەونێك کە هەتا چەند رۆژیش هەر وام زانیوە راستیە، دەمویست ئەو ناوە بیر خۆم بێنمەوە کە منی پێ بانگکرد بە بیرم نەدەهاتەوە، بێگومان هەرچی بکەم بە بیرم نایەتەوە، چوونکە تێنەگەیشتم چ ناوێکی لە زار دەرچوو، دەمگوت هەبێت نەبێت بۆ کن کەسێکیدی هاتووە، بەڵام لە جێگا هەڵەی کردووە، دەمگوت رەنگە ئەو کەسە ژوانی بن ئەو بەردەی دابێتێ، بەڵام کە بینویەتی من لێرەم، گەڕاوەتەوە و فریاش نەکەوتبێت جێژوانێکیدی بۆ دیاری بکات، ئیدی بە زۆر لادا لێکم دایەوە نەگەیشتمە هیچ ، یان پێویستم نەبوو بگەمە شتێك، ئەو شتەی لە ناو ئەو چیاو چۆلە لە خەونێش نەیدەگەیشتمێ، وا بە ئاسانی گەیشتمێ، ئیدی ئەوانیدی گرفتی من نین.

خەوم لێنەدەکەوتەوە، دەمگوت ناکا ئەو جارەش بێتەوە، بەردی بەخێر، کەوتە ناو هەتاویشەوە من هەر بە ئاگام و چاوەڕێی ئەو ژنەم کە ئەو شەو ئەگەر بە هەڵەش بێت منی خەنی کرد، لە کاتی هەستانەوەم سێ دنکە مۆری گەورە کە هەریەکەیان بە قەت چاوێك تۆ بڵێی کەلا شووشەیەك دەبوون، هاتنە ناو چاومەوە، چاوم گێڕا بە دوای مۆریدی، بەڵام لەو سێیە پترم نەدیتەوە، مۆریەکان رێك وەك خاڵخاڵۆکە حەفت خاڵیان تێدا بوو، خاڵی رەش، هەر رێك لە خاڵخاڵۆکە دەچوون، بەڵام گەورەتر، گوتم، ئەگەر بمەوێ، دەتوانم لە رێی ئەو مۆریانەوە ئەو ژنەی ئەو شەو ببینمەوە، ئەو ژنەی لە رێی هەڵەوە ئەو شەو خۆشیی ژنی بە من

بەخشی، دەشمگوت تۆ بلێی چەند خەناوکەیەکی لەو خەناوکەیە هەبێت، هەریەکەی بە ملی ژنێکەوە، نا باوەڕناکەم، بەڵام چۆن بە ناو رەشماڵان بگەڕێم و سەیری ملی ژنان بکەم، حەزمدەکرد ئەو ژنە ببینمەوە، ئاخر لەگەڵ ژنێك جووتبی و نەشتدیتبێ و نەشیبینی سەیرە، ئەدی سەیر نیە! نازانم، هێندە دەزانم زۆر تامەزرۆی بینینی ئەو ژنەم، ئەگەر نەیبینم رەنگە... نازانم چی دەبێت...

ئێستا وا لەگەڵ کارزان لە بەر زاری رەشماڵێ، رەشماڵی خانە خوێ، راوەستاوین، بەردەکەشم لێ دیارە، ئەو بەردەی لە هەرچی بەردی چیا هەیە جیایە، بەردەکانیدی جگە لە گەرما و سەرما، جگە لە ترس و وڕێنە، بەردەکانیدی جگە لە عارەقە و خوێن، جگە لە تینوێتی و برسێتی، جگە لە تەقە و زرمە، هێ لە کوێ نەگبەتیەکانی دنیا چیدیان بە من نەبەخشیوە، بەڵام ئەو بەردە چێژێکی دامێ کە بەلای منەوە هیچ چێژێکی دنیا و قیامەت ناگاتە ئەو چێژە، ئەو بەردە ژنێکی دامێ هەر چەندە زۆر کەم لە باوەشم مایەوە، بەڵام ماندوویێتی تەمەنێکی لە سیما وگیانم تەکاند، ژنێك بە هەڵە هات، بەڵام بە راستی بوو... ئەو بەردەی وا تەماشای دەکەم جیایە لە هەموو بەردەکانیدی، بەردەکان هەموویان رەقن، بەڵام ئەو بەردە نەرم نەرم، وەك لە شی ژن نەرم.

لە هەستان بووین چاوم کەوتە سەر ژنێکی کەڵەگەت زۆر کەڵەگەت، جوان زۆر جوان، سۆر و سپی، روومەتەکانی دەتگوت سێوی بەروارین، چاو و برۆ رەش، پێشینان گوتەنی دەتگوت ژێر پیاڵەن، لە دڵی خۆم گۆتم، ژنەکەی شەوێ نەبێ، هەر بە خۆم جرتێکم لە خۆم هەڵکێشا و گوتم لە رێی هەڵەوەش ئەو ژنە نایەتە باوەشی تۆ هەی گەمژە، خودایە ئەو ژنە! ئای ئەوە بۆ کوێ چوو! ئای ئای، خودایە هەو نەبێت! کوڕە ئەوە لە کن ئەو بەردە لە دووی چ دەگەڕێ! مۆریەکان! کچێ ئەگەر لە دووی سێ مۆریەکە دەگەڕێی ئەوەتا لە گیرفانی منن، وەرە بە داوای لێبووردنەوە، داوای لێبووردن لەوەی ئەو شەو بە هەڵە روویدا بتدەمەوە،

هەستێکی وام لا درووست بوو کە من گوناهێکم بەرانبەر ئەو ژنە کردووە، یان دەمگوت بەس لە ڕێی هەڵەوە ئەو ژنە ئەگەر هاتبێتە باوەشم، دەنا ئەستەمە دەستیشی بە دەستم بکەوێت، تەواوێك لە دەوری بەردەکە گەڕا، ژنە خانەخوێ کە ژنێکی چاو گەورەی ڕەنگ گەوری دەنگ نەرم بوو، وا بزانم ستێی وی بوو، گاسیکرد:

... لە دووی چ دەگەڕێی؟

ناوێکی گۆت، هەر لەوێ سووندم خوارد ئەو ناوە بە نهێنی لای من بمێنێتەوە، تا ئێستاش هەر نهێنیە.

کچێ چوزانم لە دووی خۆم دەگەڕێم.

بە پێکەنینێکی وا ئەوەی گۆت کەس شکی بۆ هیچ شتێك نەدەچوو.

ئەگەر دەڵێم وەرە ئەوەی تۆ لە دووی دەگەڕێی وا لە گیرفانی منە نابێت، هێشتا باوەڕی تەواوم نەهێناوە کە ئەو ژنەی وا لە کن ئەو بەردە چاو لە عەرد دەگێڕێ ئەو ژنە بێت کە ئەو شەو هاتە باوەشی من، هێشتا هەر لە پێش زاری ڕەشماڵێ ڕاوەستاوین و من خۆم بە پێڵاو و تاخمی پشتێ گنخاندووە، دیتم ژنە بەرە و ڕەشماڵ هات، منیش بە دزیەوە سەیری سینگیم کرد، خودایە چم دیت!

خەناوکەکەی لەو مۆریە بوو کە سێ دانەیان وا لای منن، کەدڵنیا بووم هەوە جوانتر تەماشام کرد، بەڵام ئەو زۆر بە ئاسایی تەماشای دەکردین، لەوەوە تەواو دڵنیا بوومەوە کە شەو بە هەڵە هاتە بن ئەو بەردە، ئیدی نەمدەزانی چۆن چۆنی مۆریەکانی بدەمەوە، سەرم هێناو سەر م برد، چ ڕێگەیەکی وام نەدیتەوە کە پێیدا مۆریەکانی بۆ بنێرمەوە، گۆتم دەچم لە کن بەردەکەیان دادەنێمەوە، بیرم کردەوە ڕەنگە ئەو ژنە جارێکیدی نەچێتەوە کن بەردەکە، لە ڕۆیشتنێ بووین، ژنەش دیار بوو بۆ ئەو ڕەشماڵە دەچۆوە کە پێدەچوو ماڵی خۆیان بێت، ڕێ ئێمەش بە کن ماڵی ئەواندا بوو، کە گەیشتمە نزیك ڕەشماڵی جوانترین ژنی خێڵێ، دوور لە چاوان هەر سێ مۆریەکەم فڕێدایە پێش ڕەشماڵێ، ئیدی هەڵیگرتەوە، هەڵینەگرتەوە، نازانم.

هێشتا هەر لە نزیك ڕەشماڵی خەناوکە پساوە بووین، لە رادیۆیەکەوە گۆرانیی (لە ناو ڕەشماڵی خێلان) بەرز بۆوە، ئەو گۆرانیە کوو منی تاواندەوە، ئێستاش کە گوێم لەو گۆرانیە دەبێت، بێ گوێدانە کات خۆم دەگەیەنمەوە بن بەردە نەرمەکە.

تا لەو بەرزاییەش ئاودیوبووین کە ڕەشماڵەکانی بۆ یەکجاری لە چاوم ئاوا کرد، هەر ئاوڕم دەدایەوە، چەندی پتر دووردەکەوتینەوە هێندە بۆنی ژنی بن بەردەکە پتر دەڕژایە گیانمەوە.

بەر لە گەیشتنە بەرزاییەکە، دیمەنێکی سەیر هەیە، بۆنی ژنەی بن بەردێ هێندەی نەمابوو لەبیرمباتەوە:

ئێمە نەرم نەرم، من خەیاڵ خەیاڵ دەو ئاو و ئاو دەهاتین، جۆگەیەکی روون روون، مینا چاوی قرژاڵ، سارد سارد، دامیاو و کاوێ بوو بۆ خۆی، لە هیکەوە وەک ئەوەی لە خەونەوە بەربیبێتەوە، جۆگە نەما، ئەو باوەشە ئاوە چی بەسەرهات! ئاسمان هەڵینەکێشا، هەر دەبێ زەوی قووتی دابێ، بەڵام چۆن و لە کوێوە؟ نە کونێ دیارە نە گۆمێ نە رێژگە و گێژەنێ، هێندە دیارە، جۆگەی ئاوێ لە کەلێنی چەند کەفرێ، ئاو وندا دەبێ، ئەولا ئاو، ئەم لا ئاو، ئاو نیە، تا ئێرەیە و تەواو.

درەنگتر، پژدەریەک سەربردەی بزربوونی ئاوی وا بۆم گێڕایەوە:

ئەو جۆگەیە لەو جێگەیەی قەندیلێ خۆی لە چاوان وندا دەکات و دەبێتە بەردی بن گۆمێ، لەوێوە بن زەوی و زەوی دێ، دێ و لە چ جێ خۆی پیشانی رۆژ و ئاسمان و چاوان نادا، تا کێوەڕەشیش دەبڕێ هەر بە بن عەردا دێ، دەزانی لە کوێ سەردەردەهێنێ و چاودەکاتەوە؟

ـ قولەی رانیە نەبێ!

+دەمخۆش، رانیە لەو جۆگە بەفراویەی قەندیلێ دەخواتەوە.

ـ باشە، چۆن دەیسەلمێنی؟

+سەلیم دە فستێ سەلماندن با، سەلمێندراوە.

ئێ، لە ئاوی بزربوو گەڕێ، سەکەوتین و لێژبووینەوە، هەوکە نیوەڕۆیە،

لە دەو چەمێکین، ئەوبەر و ئەم بەر چەند رەشماڵێك دوور دیارن، لەو بەر چەمێ رێگەیەکی بەرین دەگاتە سەر چەمێ، جێ تایەی ماشێنی بە سەرەوە دیارە، مگێزم لە ناو رەشماڵانە، نازانم بۆ نەچووین، من هەر هێندەم لە بیرە گیسکێکی قەڵەوی گەورەیان کوشتەوە، خوێیان لە کوێ پەیدا کرد، ئەوانە نازانم، ئەوەی دێتەوە بیرم، چەند کۆلکەدارێك بوونە پشکۆ، شیشکەی تفەنگمان دەرهێنا و بخۆ تکە بخۆ... ئەوەشم لە بیرە هەر لەدەو چەمەکە لە سەر ئەو رێیەی کە رێی ماشێن بوو، کەپرێکی گچکە دیار بوو، گوێم لێبوو گوتیان:

دوکانە، بیبسی هەیە.

لە دڵی خۆم گۆتم:

ئەوجا بە من چی!

من بیرم لە بیبسی و بەرکی خۆم دەکردەوە، سەردەستە گۆتی:

بیبسیشتان لۆ دەکرم.

لە خۆشیدا باوەرم نەدەکرد، ئاخر لە بیرم نیە بیبسیم خواردبێتەوە، ئەوجا لە دووی گۆشتیش.

بیست بیبسیان هێنا، کردی بیست دینار، بۆ ئەوکات گەلێك زۆر بوو، وا بزانم سەردەستە بیزانیبا وا گرانە نەیدەکری، بیبسیم تەواو نەکردبوو، ژمارەی ( بیست) سەر و دڵمی گرت، ئەگەر بیست و یەك با ئاسایی دەبوو، بەڵام ئەو یەکە لە کوێیە؟ نازانم ئەوانیدی، بەڵام من بزربوونی هیمداد نەیهێشت تام لە بیبسیەکەم بکەم...

ئای ئێستا پێش داگیرسانی ئەو جگەرەیە چایەکم فرکردبا، لە ناو قسان گوێم لە وشەی (ناوزەنگ) بوو ئەو ناوەم زۆر بیستبوو، بەڵام نەمدەزانی کەوتۆتە کوێی ئەو شوێنەی وا لێیەوە باسی ناوزەنگ دەکرێ، گوێم لێبوو:

- وا بزانم هەتا ناوزەنگ نابێت گیر بین، هەر ئەوێش نەگیرابێت.

+ نا ئەوێ ناگیرێت.

سەیر بوو، بۆنی ئەو ژنە بەرینەدەدام، وەك چۆن بۆنی كورتان گرتبوومی، بۆنی ژنەكەش ئەوها، من ئێستا لە ناو بۆنێ هەناسە دەدەم، ئەو بۆنەی لەو ژنە دەهات رێك بۆنی ئەو كچە بوو كە هەر جارێك دەهاتە یانەی كۆلیژەوە هەرچی كوڕ هەیە بە بۆنی وی مەست دەبوون، نازانم چ بۆنێكی لە خۆی دەدا، كچەكان چەندی هەولیان لەگەڵ دەدا ئەو بۆنەیان پێ بناسێنێ كەلكی نەبوو، بە كەسی نەدەگوت، من ئەو بۆنەی ئەو شەوە لە پەنای بەردەكە لە سینگ و مەمكی ژنە رەشماڵنشینەكە تێكەڵی گیانم بوو، رێك بۆنی كچەكەی كۆلیژ بوو، ئەو بۆنە نەبا هەرگیز بۆنی كورتانم لێ نەدەبۆوە، لە رێێ یەكە یەكە سەیری چاوی پێشمەرگەكانم دەكرد، دەمویست بیبینمەوە، ئەو پیاوە ببینمەوە كە ژوانی لەگەڵ ژنەكە بەستبوو، كەچی جێژوان هەڵەیەكی تێكەوت، تەماشای دوڕ چاویانم دەكرد، لە دووی بێ خەویی دەگەڕام، بزانم كێ ئەو شەو خەو نەچۆتە چاوی، ئاخر دڵنیام كەسێك ژوانی لەگەڵ ژنێكی وا هەبێت، ئەستەمە خەو بچێتە چاویەوە، من ژوانی وام هەبێت، ئامادەم بە حەفتە و دوو حەفتە چاو لێك نەنێم، نەمدەدیتەوە ئەو پیاوەم نەدەدیتەوە، هەندێك جار دەهاتە سەرم بە دەنگی بەرز هاوار بكەم:

ئەرێ ئەو شەو كێ ژوانی لەگەڵ جوانترین كچی ناو رەشماڵ بەستبوو؟

پەشیمان دەبوومەوە، دەمگوت رەنگە ئەو پیاوەی من لە دووی دەگەڕێم لە ناو دەستەكەیدی بێت، ئاخر بێجگە لە ئێمە دەستەیەكیدیش ئەو شەوە لە رەشماڵ بوو. ناوە ناوە هەستم بە پەستیەكی زۆر دەكرد، رقم لە خۆم دەبۆوە، وام دەزانی ئیشێكی زۆر قۆڕم كردووە، ئەدی لەوە قۆڕتر؟ بە خۆمم دەگوت، چ شەرمەزاریەكە ژنێك بۆ ژوانی پیاوێكیدی هاتبێت، تاریكی شەو بە هەڵەی ببا و بیهێنێتە باوەشی تۆ، بێ دەنگیی تۆ لە خشتەی ببا و هەر وا بزانێ دۆستەكەی خۆیەتی، بۆت رووتبێتەوە و تۆش وەك ئەوەی بە تایبەت بۆتۆ خۆی رووتكردبێتەوە و ئیشی خۆتی لەگەڵ

بکەیت، شەرمەزاری لەوە پترا دەمگوت دەبوو پێی بڵێم:

مـن ئەو پیـاوە نـیم کە ژوانـت لەگەڵـی بەسـتووە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ منیش دەخەویـت، ئەوە لێـرەوە هەتـا ئەو دنیـا مەمنـوونتم، ئەگەر رازی بـا شـتێکیدی بـوو، جـار جـارەش پێکەنیـنم بە لێکـدانەوەی خـۆم دەهـات، دەمگوت:

باشە خۆ هەتا خەناوکەکەش پساوە، هەتا چەند مۆریەکیشمان دیتەوە، هەتا هەستاو لەو شەوەشدا ون بوو، مـن هەر تاسـا بـووم، هەر وام دەزانـی خەونە، من کە لە بارێکی وا بم، چۆن دەمتوانی ئەو قسانەی پێبڵێم.

خەوم دێ، بــێ خەوی منـــی کوشــــت، ئەوە چەنـــد شـــەو و رۆژە نەخەوتووم، مەگەر لێرە و لەوێ گورگەخەوێکم کردبێ، شەوی چووی لە ناو رەشماڵی خێڵان دەمویست بـاش بـخەوم ئەویـش کیـژە کـوردی چـاو جوان، لە بیرمە بە تووڕەییەوە بە خۆم گوت:

ئەوە چ دەڵێی! خوا بکەم هەموو شەوێك خەنـاوکە لە ملێکـی وا دێ، ئامادەم بۆ هەتـایە چـاو نەنـێمە خەو، خەو چـیە! ئیـدی دۆڵاودۆڵ شـاخە و شاخ دەڕۆیشتین، تا ئەوسەری دنیا لە رەشماڵی خێڵان دوورکەوتبـووینەوە، کەچی من هەر لە بن بەردەکە لە دووی مۆری دەگەڕام، ئامۆژگـاریەکەی باپیرمم بیرکەوتەوە، ئەو ئامۆژگاریەی بۆ من بۆماوەیی بوو، گوتم تۆ بڵێـی باپیریشم خێری وای لە بن بەردان نەدیتبێ!

لە نێوان ئێرە و ناوزەنگ زۆر چیرۆکیـدی هەیە، چیرۆکـی چەکـوچ و سەری سادر، چیرۆکی دۆڵە کۆگە و ئەو دۆڵەی دەکەوتە پشـتی وی، لەو نێـوانە زۆر چیــاو دۆڵیـــدی پــڕ چیــرۆك هەن کە بە حەفـتە و مانــگ لە گێڕانەوەیان نابمەوە، بەڵام ئێستا هەرچی زووە، هەر بە فـڕین، هەڵـدەفڕم و خۆم دەگەیەنمە ناوزەنگ بۆ ئەوەی بزانم هەواڵی هیمداد چیە، بزانم شتێك لە چیرۆکـی گــرتن و کوشــتنەکەی خـۆی و ئەو کـوڕەی لە ئاقـاری وی بەجێما نابیستم، هەرچەندە من تەواو لێی هۆبڕاوم.

ئەوەتا لە ناوزەنگ، لە پایزی ناوزەنـگ پشـتم بە بەردێك داوە و پـێم

خستۆته ناو ئەو جۆگەلەیەی کە بە نازی پایزانە خورەی دێ، لەگەڵ جۆگە یان رەنگە پێچەوانەی وی رۆیشتبم، هەندێك جار کە خەیاڵ دەڕوا ئاو بگەڕێتەوە ئەو ناگەڕێتەوە، من ئەوها رۆیشتبووم، دەنگێك، یان هاوارێك گێرامیەوە، سەرەتا وام زانی خەونە:

هیمداد، هیمداد، هیمداد هاتەوە...

یەکسەر ئەو بیبسیەم بیرکەوتەوە کە تامم لێی نەکرد،

چۆنیەتی رزگاربوونی هیمدادیش رەنگە لە چیرۆکێکیدیکە خۆی بگێڕێتەوە، بەڵام لێرە لە زاری خۆیەوە و بە دارشتنی خۆمەوە دەیخەمە سێ چوار رستەوە:

هیمدادی ماندووی کەنەفتی کەوتوی خەوتوو، لە نزیک گۆڕستان رۆژی لێ هەڵدێ، چاو دەگێڕێ، دنیا جاش و سەربازە، هەر چۆنێ بێ، خۆی دەگەیەنێتە بن بنەدارێکی گەورە، وێنەی سمۆرە پێدا هەڵدەگەڕێ، لە ناو لق و پۆپان خۆی دەشارێتەوە، لە کەلێنی پەلکانەوە، دەبینێ، جاش و سەرباز دێنە بن درەختەکە و ئەو هەموو جوێنە تەڕ و مزرانەش دەبیستێ کە لە زاریانەوە بۆ داک و خوشکی پێشمەرگە دەچێ.

هیمداد، سێ رۆژ وەک هەڵۆیەکی باڵ شکاو لە سەر داربەڕووەکە دەمێنێتەوە، شەوانیش دێتە خوارێ، هەندێ مرومۆ دەکات، ئەو سێ شەو و رۆژە چروو دەخوات، میزی خۆی دەخواتەوە.

هیمداد بەرگەی نەما، شەوی چوارەم مل دەنێ، خۆیشی نازانێ رووی لە کوێ و بە نیازی چی، خواوراستان تووشی بارەگای دیمۆکراتی قاسملوو دەبێ، خۆی دەناسێنێ، ئەوانیش وەک پیشەی خۆیان، بە رێی تایبەتی خۆیان دەیهێننەوە ناوزەنگ و بە ئێمەی شاد دەکەنەوە.

لە بیرمە هەر لە دەو جۆگەلە پایزیەکە شیعرێکی مەیلەو خەناوکەییم نووسی، ناویشم نا سێ دنکە مۆری، بەڵام ئێستا لەو خەناوکە شیعریە هەر هێندەی سێ مۆریم لە یاد ماوە:

خودایە! ئەگەر لە بیرت ماوم و نوێژت لێم دەوێ

ئەو بەردەم نیشاندەوە کە لە تاریکیدا کردتە ماڵی پیاوێکی عاشق و ژنێکی لەو عاشقتریش نازانم تۆ ناردت یان بە هەڵە ڕێی کەوتە ئەوێ خودایە، نوێژت لێم بوێ !

## قەندیل سێبەر و سێبەر

دەمەو ئێوارەیە، خۆری دووکەڵاوی، خۆری روو بە تەنی شەکەت دیارە، خەریکە دادەبەزێتە سەر ئەو زنجیرە چیایەی، هێند سووتاوە هێند سووتاوە، چیلکەیەکی بۆ سووتان پێوە نەماوە، بیست پێشمەرگەی هەڵاتووش بە سەری قەندیلدا بەرانبەری خۆری دووکەڵاوی خۆش خۆش رێدەکەن، ئەگەر چاو بە ئاراستەکاندا هەڵە وهەڵە نەچووبێ، لای چەپیان ئاوابوونی خۆرە، هەڵاتنی خۆر ئەگەر جارێکیدی هەڵبێ، دەکەوێتە لای راستیان، رەنگە ئەو ئێوارەیە ئەو پۆلە پێشمەرگەیە رۆیشتنیان رووەو باشووربێ، بە دووری مەبینە هەر لەگەڵ ئاوابوونی خۆر ئاراستەی رۆیشتنیش بگۆڕێ،

مەتارەکان خۆ راناگرن، بەوەی باشە لەو دەڤەرەی قەندیلێ ئەوەی زۆرە کانیە، دەنا تینوێتی پەکیدەخستین، دەیکوشتین، نیوەڕۆکەی هەر یەکەی بایی ساڵێك گۆشتمان خواردووە، وا دیارە گۆشت و رۆیشتنی هاوینە، مەتارە لە دوای مەتارە چۆڕپڕدەکات، باشە هاوینی قەندیلێ هێندە گەرم نیە، دەنا لە نێوان دوو کانی لە تینوێتی چاومان سپی دەبوو، سپی وەکو ئەو پەلە بەفرانەی لێرەو لەوێ دەڵێی هەوری بەفراوین بە چیاوە.

+ زۆری ماوە بۆ ناوزەنگ؟

- ناوزەنگ لێرەیە!

+ کەوابوو ناگەینێ.

- گەیشتنی چی!

+ ئەدی بۆچی دەڕۆین و خۆمان ماندوودەکەین؟

- جارێ ناچینە ناوزەنگێ.

+ ئەدی کوێ؟

- وا بزانم گوێژێ.

+گوێژێ ێ...

پێ هەڵێنە، شاخە و شاخ پێ هەڵێنە، بە دیار خۆری دووکەڵاویەوە پێ هەڵێنە، بە ناو دەنگی تۆپە قەندیلهەژێنەکانەوە پێ هەڵێنە و بڕۆ، هەر بڕۆ، بە بەرزایی دنیادا بڕۆ، لەو چەمەی نیوەڕۆکەی لە کەناری دانیشتین و گۆشتمان لە شیش داو تا مڕ بووین خواردمان، لەوێوە تا گەیشتینە ئێرە، ڕێی ئاسمانیش هەر ئەوهایە، وەختە بڵێم ئێرە ئاسمانە، ئێرە زۆر بەرزە، لە چاو زۆر جێیان هەر دۆڵ و چەم نا لە چاو زۆر چیاش ئاسمانە، من چەندی چاو دەگێڕم چیایەك لە خۆمان بەرزتر نابینمەوە، پێشمەرگە زۆر بە ڕێی ئاسماندا هەڵگەڕاون.

+ ئەرێ نەگەیشتینە ئاسمان؟

+ چەند شەقاوێکی ماوە.

+ هەتا ئەستێرە هەڵێن، دیار نیە گەیشتووینێ، یان نا.

+ من دەڵێم ئەستێرەکان لە خوار ئێمەوە هەڵدێن.

+ شوێنی ئەستێرانیش...

+ من دەڵێم نزا بکەن ئەو شەو ئەستێرەکان خۆ خویا نەکەن.

+ چوونکێ سەرمان پێیاندەکەوێ!

بڕۆ چیاو چیا بڕۆ، هێشتا ڕۆژ چەند باڵێکی ماوە، بڕۆ لەگەڵ سێبەرە بزۆزەکاندا، بڕۆ لەگەڵ سێبەرە درێژەکاندا، ئەو سێبەرانەی لەو بەرەوە بە چیاکەی ئەو بەرەوە سەمادەکەن، هەر سەمادەکەن و ماندوو نابن، من دەمێکە تێکەڵی سێبەرەکان بووم، هێندە پەیوەندیم بیرەوە نەماوە، جاروبار تەماشای بەردەمی خۆم دەکەم، یان سووکە ئاوڕێك لە خۆری دووکەڵاوی لە خۆری سەر ئاوابوون دەدەمەوە، هەر هێندە پەیوەندیم بیرە ماوە کە قسە دێتەوە سەر چارەنووس، چارەنووسی زۆر نادیارتر لەو

چارەنووسەی جارێك لە كتێبێك خوێندوومەتەوە كە نادیارترین چارەنووسی مرۆڤ بوو، باشە ناوی كتێبەكەم لەبیرنەماوە، دەنا پتر لە سەری دەڕۆیشتم و دوور نەبوو لە سێبەرەكانی خۆمان دوورم بخاتەوە.

+ پێ هەڵێنن، با شەومان بە سەردا نەیە.

+ بۆ ئەگەر شەو داهات، چی دەبێت؟

+ ترسناكە.

+ چی ترسناكە؟

+ ڕێیەكی هەڵدێرمان لە پێشە، ئەگەر مانگ لە دەرەوە نەبێ، گورگیش بە شەو ناوێرێ خۆی لێبدا.

+ ئەمشەو مانگ زوو هەڵنایە؟

+ لێم تێكچووە، نازانم، ئەرێ كەس نازانێت، مانگ چ وەخت هەڵدێ؟

+ خەمت، نەبێ سەر لە ئێوارە.

+ دەی، وا دەكەین، پێش تاریكی هەڵدێرەكە ببڕین، زۆرمان نەماوە بگەینێ.

نازانم چەندمان ماوە بۆ ئەو هەڵدێرەی سەردەستە زراوی لێچووە و زراوی هەمووانیشی برد، بەڵام هەمووانیش سوپاسیان كرد بۆ ئەو ئاگاداركردنەوەیە، بۆ ئەو زانیارەی لە بارەی ڕێگاوە بە گوڕێی وەركرد.

من لە سێبەرەكان نابمەوە، هێشتا هەر لە سەمادان، هەستمدەكرد سێبەرەكان لە خۆمان زیندووترن، من بە خەیاڵ دەچوومە ناو سێبەرەكانی خۆمان، دەبوومە سێبەر، بە دەست خۆم نەبوو من دەبوومە سێبەر و سێبەر دەبووە من، نزام دەكرد سێبەرەكان هەر بمێنن، مانەوەی سێبەرەكان مانەوەی ئێمە بوون، زیندوویتی خۆمانم لە سێبەرەكانەوە دەدیتەوە.

خۆر لە سەر ئاوابوونە، ئەها ئاوابوو، ئای سێبەرەكان، مرۆڤە زیندووەكان، ئەو مرۆڤانەی لە سەمای هەمیشەییدا بوون، بۆ كوێ هەڵدران، لە كوێ بتانبینمەوە، بە نەمانی خۆر و ئاوابوونی سێبەرەكان تەزوویەكی

تەزی بە لەشمدا هات، هەستم بە رەشبوونەوە و ئاوابوونی خۆمان کرد، ئەوانەی وا بەبەر چاومەوە وەك سوێس رێدەکەن، هەر بە راستی سوێسن، سێتاڤن، سێبەرن، ئەوانەی پێش کەمێك لە چیاکەی ئەو بەرەوە بزر بوون، ئەوان ئێمە بوون، ئەوان بیست پێشمەرگەی لە ئەنفال هەڵاتوو بوون.

بە ئاوا بوونی سێبەرەکان دڵم گیرا، نا، (هیمداد)تر بووم، هیچ نەما خۆمی پێوە خەریك بکەم، باش بوو زوو گەڕامەوە شەوی پێشوو، شەوی ناو رەشماڵان، شەوی بن بەردەکە، شەوی باوەشی ژنەکە، ئەو ژنەی تا لە رۆمانێکدا ناو لە خۆی نەنێ (ژنی بن بەردە نەرمەکە) لە هەموو سەرهاتێك ئەگەر بە رستەیەکیش بێت دێتە قسە، ئەگەر بۆ چاو تروو کانێکیش بێ، خۆی بە رووتی نیشان دەداتەوە.

+ زۆری ماوە بۆ هەڵدێرەکە؟

+ ئەوەتە گەیشتینێ.

+ باشە مانگ بە دەرەوەیە.

سەردەستە ناهەقی نەبوو زراوی لەو هەڵدێرە بچێ، بزن بە رۆژیش ناوێرێ خۆی لێدا، پێشمەرگە وا بە شەو پێیدا لێژ دەبێتەوە، کەس نەبوو چەند جارێ پێی نەڕوا، نەخزێ، نەڵێ:

+ ئای دەستم.

+ وەی بابە پشتم.

+ وا بزانم چەنەگەم شکا.

+ ئەی چۆکم.

+ قوونەجۆرەم شکا.

ئێستا ماندوو ماندووین، تینوو تینووین، برسی برسین، بە پشوویکی باش ماندوویتیمان تارومارکرد، ئەدی چ لە تینوێتی و برسێتی بکەین، چ هێزێك هەیە برسێتی و تینوێتی لە بیرباتەوە! بایەکی فێنك فێنك هەڵیکردبوو، بای کوێستانێ، باش بوو تینوێتیەکەی لە جێگەی خۆی راگرت و پتری نەکرد، بەڵام برسێتی تاوی سەند، ئای بۆ نووردووە نانێك، ئێستا لوولی دەی، ئای

برسين، ئای بۆ... هەر خواردنێك، ئەو شەوەی من باسی دەکەم، هەر شتێك لە بەرد نەرمتر با پێشمەرگە دەیخوارد، گوێزێ بە گوێزەکانتەوە لە کوێی؟

گوێم لە وشەی (تاتی دۆ) بوو، بریا لە(تات)کە دوو پنت ئاو دەیبرد و (نان)دەمایەوە، وای بۆ نووردووە نانێک و کۆتکە دۆیێ! ئای لە برسێتی، لە وشەوەش نان دەبینێ، دیارە ئێرەش سەختیەکی قەندیلە و تاتی دۆی ناوە.

## قەندیل
## گێژەلووکە، گێژەلووکە

ئەو گوێزنیەی دەمگوت، ئێرەیە، دۆڵێکە دەڵێی بە مەبەست سێگۆشەیی هەڵکەوتووە، تا ئاسمان بە سێگۆشەیش خۆی نیشانمان دا، گوێزێ دوورە، ئەگەر لە بنی دنیاش نەبێت لە نیوەیەتی، من تا گەیشتمە گوێزێ، بەرد و بەرد تا ئەو سەری قەندیل و لەو سەریشەوە تا ئەو سەرەی هەر بەرد و بەرد هاتم، ڕێگەی بەرد و بەردیش پێچ پێچ و پێچان پێچان، ڕێک پێچانەوەی تەمەنە، نازانم خەڵکیدی بەڵام من لە ڕێ کاتێ گوێم لە وشەی (گوێزێ) بوو، نیگام پڕ بوو لە گوێز، گوێزی ناسک ناسک بە لێو دەشکا، ئەوجا با بە لێویش نەشکێ ئەدی ددان بۆچیە، ئەگەر لە ساتەکانی مەگیرانی گوێزی پێنەشکێنی! دەزانن من لە کەیەوە گوێزم نەخواردووە، لە بیرم نیە، هەر بە بیستنی گوێزێ خەریکبوو خەویش بمباتەوە.

ئەوە کەسەی خەوی بن دارگوێزی کردبێت، تێدەگات چ مردنێکی کاتیە خەوی سێبەری چڕی دارگوێز، دێتە بیرم ڕۆژێك بە نیازی حەسانەوە نەك خەوتن، ئاخر من بە ڕۆژ خەوم نەبوو، لە سێبەری دارگوێزێك سەرم خستە سەر پێڵاوەکانم و کلاشینکۆفەکەشم لە تەنیشتم و قایشەکەیم لە مەچەکی خۆم ئاڵاندبوو، ئەو دارگوێزەی دەیڵێم وابزانم لە ئاقاری چیای پیرس تایبەت بۆ خەو ڕوابوو، ئەگەر ئاقارەکە پیرسیش نەبووبێت، هەر لە پیرس دەچوو، ئەو خەوەی لە بن دارگوێزەکە کردم، هەر مردنێك بوو بۆ خۆی، قورس قورس، قورسترین تۆپ ئەگەر لە بن سەریشت چاڵێکی حەفت بەژنی بخستایەتە عەردەوە، جوولەی نەدەخستە خەوەکەی منەوە،

ئەوجا چۆن بە گرەی کۆپتەر بە ئاگا بێم، لەو بن دارگوێزە دوای ئەوەی بە زللە و پێلەقە بە ئاگایان هێنام، بە ژمار حەفت کۆپتەرم لە ئاسمانێ ژمارد، هیچیشیان لە دوورایی ئارپێچی بەرزتر نەبوون، ئەوە جاری یەکەمم بوو بە رۆژ بخەوم، خۆزی لێرەش، لە گویزێ، دارگویزێ، خوداوەندی داروبار دارگوێزێکی لەبەر خاتری من دەرواند، مەگەر هەر ئەو بزانێ چەند پێویستم بە خەوە.

گویزێ نەك هەر ئاشنایەتی لەگەڵ دارگویز نیە، پێناچێت سیمای دار بەرووشی دیتبێت، پێناچێت رۆژێك لە رۆژان هیچ درەختێکی ناسیبێت، دۆلێکی رووت رووت، خەریکە باوەڕ بە قسەی حاجی رەشماڵنشینەکە بێنم، ئەو حاجیە بە تەمەنە کە بە گەنجی، خۆی گوتەنی:

تاقە کەسم لە هەموو کوێستانێ کە بە گەنجی لە ماڵی خودا شەیتانم بەردباران کردبێت.

ئەو حاجیە بیابان دیتیە دەیگوت:

- لە هاوینان دۆلی گویزێ لەگەڵ ئەو بیابانەی کەوتۆتە نزیك ماڵی خودا جیاوازیەکەیان تەنها لە کانی دایە.

+ ئەدی لە زستانان؟

- لە زستانان ماڵی خودام نەدیوە، ئەگەر ئەنفال رێبدا، حەجی دووەمم دەخەمە زستانێ.

ژنەکەی کە بەو تەمەنەوەش روومەتەکانی دەتگوت بەفری کوێستانێن، هەڵیدایێ:

من قەت بیابانم نەدیوە، یاخودا قەتیش نەیبینم، بەڵام ئێرە زستانان هێندی تێدەکات هێندی تێدەکات، دۆڵ شان لە دوندان دەخشێنێ، بیابان کوا بەفری لێدەکەوێت، من قەت باوەڕ بەوە ناهێنم وێکچوونێك لە نێوان چیا و بیابان هەبێت، ئەو دووە بە خوێی چێشتیش خزمی ئێکدی نابنەوە، ئەدی وە نیە؟

ویستم بڵێم وایە، بەڵام پیاوی بیاباندیتە لە قسە لە من سوارتر بوو:

کچێ تۆ ئاگات لە چیە، بە خودای کاکی برا ئەها ئەو تۆز و خۆڵەی دەیبینی، لە بیابانیش هەر ئەوهایە، جگە لەوەش دە تەماشاکە، دە سەرانسەری ئەو دۆڵە بگەڕێ، بڕکە دارێك کە بە داران بچێت دەبینیەوە! ئەوەی هەیە بنەگوێتی و ئەو شتانەیە، لە هەندێ جێگەی بیابانیش حوشترالووك هەنە، چ جیاوازیەك هەیە!

حاجی جگەرەیەکی بۆم پێچایەوە، هەتا درەنگیش تام و بۆی ئەو جگەرەیەم لێنەبۆوە، توتن بوو نەك گەمە، جگەرەی سۆمەریش ئەوەی لە کنە من خۆشترین جگەرە بوو لە دنیایێ نەخاسمە لە مەیخانان و بە دەم هەڵدانی بیرەوە، مژی وەهام لێدەدا هیچ ساوایەك مژی وای لە مەمکی دایکی نەداوە، هیچ پیاوێکیش بەو تامەزرۆییەوە لێوی ژنی نەمژیوە، نەدەگەیشتە ئەو جگەرەیەی بن رەشماڵێ، دوور نیە ئێستاش دووکەڵەکەی بەری رەشماڵەکەی گرتبێ و بەرینەدابێ..

گوتم:

لەوێ لەبەر گەرما و بێ ئاوی رووەك ناڕوێن، لێرەش لەبەر بەفر و ساردی بۆیە...

ژنەی دژە بیابان نەیهێشت مەبەستەکەم بگەیەنم گوتی:

بزانە بیابان و چیا چەند لێکدی دوورن و ناگەنە یەکتر، ئەها...

پیاوی بیابان دیتە قسەی پێبڕی و بە تووڕەییەوە:

وێکچوون لەوە پتر لەوێش دار نیە لێرەش...

ترسام تێکبگیرێن، بە پرسیارێکم قسە بە لایەکیدیدا رۆیشت:

باشە ئێوە لە بەفرانبارێ یان رێبەندانێ رێتان بەو دۆڵە کەوتووە؟

ژنە ئاخێکی هەڵکێشا، پیاوەش وەك بڵێی زگی پێیسووتا بە چاو تێیگەیاند کە ئەو وەڵام بداتەوە، ژنە ئاخێکی قووڵتری هەڵکێشا:

حاجی لە زستانان زۆر رێی بێرە کەوتووە، بەڵام من یەکجار بە دوای کوڕەکەماندا، ئای دایکت کوێر بێت، وازی لێبێنە لە شەڕی براکوژی شەهید بوو، ئەو مەلعوونانە کوڕەکەی منیان بە کوشت داو ئێستاش وا پێکەوە...

گریان گرتی و نەیهێشت چیدی بڵێ، چاوی حاجیش پڕ لە فرمێسك بوو، لەبەر خۆوە سەرکۆنەی خۆم کرد بەوەی قسەم بەلایەکی ترسناکتردا راکێشاوە، خۆ تێکگیران خۆشترە لە گریان، من بەرگەی گریان ناگرم، شتێك نەکەم دەبێت منیش وەك ئەو ژن و پیاوە بگریم و کەسیش لێرە نیە گیرمان بکاتەوە، بە نیازی راگرتنی فرمێسك لە چاوان ئەو پرسیارەم هاویشت:

+ ئێوە بە من بڵێن ئێرە ئێرانە یان ئێراق؟

- هەتا ئێراهێ هەر ئێراقە، وا نیە پیاوەکە!

- با، لێرێهێوە دەبێتە ئێران.

+ سوپای ئێران نایەنە ئێرە؟

- نا، لەوەتەی شەڕ راوەستاوە جگە لە پێشمەرگە و قاچاخچی کەس نایەتە ئێرە.

ئۆخەیش! خۆ بەری گریان گیرا، ئەرێ من بۆچی چووبوومە رەشماڵێ! خەریکبوو لە بیرمبچێتەوە، ئا، بە نیازی پرسیار لە گوێزێ و وشەی گوێزێ، بۆوەی بزانم ئەو گوێزێیە چ گوێزێکە کە پێناچێت نەك هەر لە تەمەنی خۆی گوێزێکی گرتبێت، رەنگە گوێزخۆرێکیش رێی بێرە نەکەوتبێ و گوێزێکی نەشکاندبێت، لە هەستاندا پرسیم:

باشە، لێرە چ بنە دارگوێز هەیە!

نازانم کامیان وای وەلام دایەوە:

ئا، لە خوارەوە، لەو پێچە دەسووڕێتەوە، تەواوێك دەڕۆی، چەند دارگوێزێك بە پێوەن و گوێزیش دەگرن، ئێستا گرتوویانە بەلام پێنەگەیون.

بڕواناکەم چوونم بۆ رەشماڵ هەر بە مەبەستی گوێزێ و گوێزە نادیارەکانی بووبێت، یادەوەریم دەڵێ شتی گرنگتر هەیە لە سۆراخی گوێز، با جارێ ئەو شتە گرنگە هەر لای رەشماڵ بمێنێتەوە، لە بیریشمچوو لە ژنە بپرسم:

تۆ بۆچی هێندە لە بیابان کۆڵداری؟

دەی، ئەگەر ڕێم بە ڕەشماڵ کەوتەوە لێیدەپرسم، ئێستا با بگەڕێمەوە بارەگا، بەڵام پێش گەڕانەوە کیسە تووتنەکەم لە بیر نەکەم، نا، چما تفەنگ لە بیربکەم، تووتنم لە بیردەچێ، حاجیی تووتنخۆش کیسەکەمی پڕ لە تووتنی خۆش کرد، هەر بە خەنیوون خەنی بووم، چووبمە هەر جێگەیەك قەت و قەت بە دەسکەوتی وا پڕ بەهاوە نەگەڕاومەتەوە، لە بیرم بێت، تووتنم لە سەر بڕان بوو، یەك درهەمیشم نەبوو، نەمدەزانی چ بکەم، هەموو دەرگاکانی گەیشتن بە تووتن داخرابوون، باش بوو دەرگای ڕەشماڵم بە ڕوودا کرایەوە، لە لایەکیدیش نازانم چ دەستێك بوو چەند دەفتەرێکی جگەرەی بۆم هەڵدا.

بارەگا چەند شڕە چادرێکی وا کە هیچ قەرەجێك بیشیکوژی سەری پێداناکات، بارەگا چەند غەرە بەردێکی پەتوو بە سەردا دراوی وا کە لە دەوری گۆڕیشی چێ بکەیت و بە سەری دادەیت، پێی ڕازی نابێت و دێتە دەنگ، بارەگایەکی شەپڕێوی وا هیچ بزووتنەوەیەکی چەکداری دنیا و لە هیچ هەلومەرجێکی دنیا و لە هیچ جێگەیەکی دنیا بارەگای وای هەڵنەداوە، نە نان بە بەردەکەوێت نە چایە، کەسیش نیە هێندەی پێشمەرگە حەزی لە نان و چایە بێت، جێگەیەك نیە بۆ چاو گەرمکردن، کێ هەیە هێندەی پێشمەرگە چاو پڕ لە وەنەوز، جێگەیەکی واش نیە بۆ خۆشووشتن، چلکی تەمەنێك وا بە پێشمەرگەوە، جێگەیەك نیە بۆ پیاسەیەکی دالغاوی، ئەگەر چۆکت بە تیشە بەردێکیش نەکەوێت، ئەوا شانت بە پێشمەرگەیەکی وەك خۆت دەکەوێت، لەو ڕۆژانەش دالغە لە نان و ئاو و خەو و خۆشووشتن پێویسترە.

بارەگا گوێزێنیەکە گێژەلووکەی دنیا دەگرێتەوە، ڕەنگە گێژەلووکەی دنیاش لێیەوە هەڵبکات، بارەگا گوێزێنیەکە جیایە لە گشت بارەگایان، کەشی بارەگا دوور نیە لە کەشی چیای جود بکات، لەو کاتەی کەشتیەك بە سەرۆکایەتی نوح لێی نیشتەوە، جیاوازیی گوێزێ لە کەشتیی نوح لە بێ نووحی دایە، لە گوێزێ نووح نابینم، هەرچەندە مام قادرێك هەبوو زۆر

کەس پێیانوابوو نزیکایەتیەکی زۆر لە نێوان ئەو و نووحدا هەیە، هەبوو دەیگوت:

جیاوازی نێوان نووح و مام قادر هەر لە مامەکەدایە.

هەشبوو، ناوی لە مام قادر نابوو قادر نووح، یادەوەریم پڕ پڕە لەو قادر نووحە، بەڵام نامەوێ بکەوێتە ناو (( گێژەڵووکەی گوێزێ))، ئەو گێژەڵووکەیە پڕ پڕ لە پیاوی پڕ سەرهات و سەرهاتکورت و تەمەن کورتە، پیاوە نووحیەکان، پیاوە سەرهات رووباریەکان یەکیان نەبێ لێرە جێگەیان نابێتەوە، ئەگەر خوداوەندی نووح تەمەنێکی هێندەی مام قادری دامێ، ئەوە کتێبێکی هەزار لاپەڕەیی یان هەزار قادری لە رێیە.

ئەو رۆژەی لە گوێزێ کەوتینەوە، گێژەڵووکە هەڵیکردبوو، هەر گێژەڵووکەش منی گەیاندە گوێزێ، ئەوانەی پێش منیش گەیشتبوون، لە رێی گێژەڵووکەوە هاتبوون، ئەوانەی دواییش هاتن بە گێژەڵووکەدا هاتن، خارە خولە ئەو ساڵەی بە ساڵی گێژەڵووکە ناو نا، دەیگوت:

گێژەڵووکەی ئەو ساڵ جیایە لە هی هەموو جار و ساڵ و زەمانان، ئەو گێژەڵووکەیە جێگە بە هەموو شتێك دەگۆڕێت بە چیاو رووباریشەوە.

من نازانم نە لە کالفامیم بوو نە لە پێچەوانەی کالیەوە باوەڕم بە قسەکەی خارە خولە هێنابوو، دووریش نیە هەر لە خۆشەویستیەوە بووبێت، ئاخر من نازانم بۆچی ئەو پیاوە وا کەوتبووە دڵمەوە و لێی داکوتابوو، بەجێینەدەهێشت، کەس نەبوو رقی لە خارە خولە بێت، بەڵام رەنگە کەم کەس هەبووبێت هێندەی من پێی سەرسام بووبێت، سەرسامیەك ئێستاش نەمزانی بە دیاریکراوی لە چیەوەیە، دەمێك بوو ئەو پیاوەم دەناسی، دەمێکیش بوو نەمدیتبوو، لە بەستی (شەرغە) دیتم و ئیدی نەمدیتەوە، ئەو گێژەڵووکە نەبا کێ دەڵێ دەمدیتەوە، گێژەڵووکە گێژەڵووکەی خڕکردنەوەیە، لە بنی دنیاوە پێشمەرگە دێنێ و لێرە لەو گوێزێ بەردەلانیە بە عەردی دادەدا، منی لە (هەورێ) وە هەڵگرت و دەماودەم لێرەی بە بەردا دام، خارە خولەی لە دەشتی هەولێرەوە هەڵگرت، هەر

پێشمەرگەیەکی لە جێیەکی چیاو دەشتانەوە هێناو دەهێنێ و هەمووان لە گوێزێی خڕبوونەوە خڕدەکاتەوە، ئەوەی لێرەیە جگە لەو چەند رەشماڵە رەشکۆکە، هەمووی هەر هەمووی بە پێ و باڵی گێژەلووکە گەیشتۆتە گوێزێ، ئەوانەی لە رێگاشن دەڵێن زۆریدی بە رێوەن، ئەوانیش لە گێژی گێژەلووکە گێژدەخۆن.

ئێستای گوێزێ بە ساڵژمێری نەورۆز هێشتا هاوینە و پایز دانەهاتووە، بۆیە هەڵکردنی گێژەلووکەی پایزی جێگەی پرسیارە، بەڵام خارەخولە زوو وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە:

گێژانە گێژەلووکەی سەدام و سرووشت پێکەوە هەڵیانکرد.

مامۆستا لەشکریش کە گێژەلووکە لە نزیک نازەنینی سەفینەوە بە هەڵگرتن هەڵیگرتبوو، خۆی گوتەنی بە ئەسپایی لە گوێزێی قەندیلی دانیشاندبوو، لە وەڵامی ئەو وەڵامەی خارەخولە گوتبووی:

دوور نیە سەدام ئاسمانیشی هەڵنەخەڵەتاندبێ.

کوڕێك ناوی لە خۆی نابوو خەیام و چ ئاشنایەتیەکیشی لەگەڵ خەیام نەبوو، بۆ پشتڕاستکردنەوەی گاڵتەکەی مامۆستا لەشکری گۆتیان گۆتبووی:

ئەوجا سەدام رووسیا هەڵبخەڵەتێنێ، ئاسمان هەڵناخەڵەتێنێ!

ئەو قسەیەی خەیام دوور نیە هەر لە قسەیەکی مامۆستا لەشکری خۆیەوە وەرگیرابێت، دێتەوە بیرم وەرزی بەهاربوو، گیا لە چۆکان، مامۆستا لەشکری ناوی لە بەهار نابوو وەرزی نێرەکەر، چونکە پێیوابوو هیچ گیانلەبەرێك لە حوشترەوە بگرە تا دەگاتە مێرووله بە مرۆڤیشەوە، هێندەی نێرەکەر چێژ لە بەهار وەرناگرێت، لەو وەرزە نێرەکەریە مامۆستا لەشکری رستەیەکی نزیك لەوە ((سەدام رووسیای کەر کردووە)) لە لێویەوە رژا و هەڵیشینەگرتەوە.

لەو کۆتایی هاوینە گێژەلووکەییەی گوێزێ دەبێت کەسێك هەبێت هێندەی من دژوون! ئارەقەی هەموو ئەو نشێو و هەورازانەی دەکەونە

کانی تەلانی هەورێ و گوێزێی قەندیلەوە، ئەو ڕێوبانانەی دەکەونە ئاقاری ئەنفالەوە وا بە گیانی منەوە وشکبوونەتەوە، ڕشکیش هەر دەڵێی سەرە دەرزیی ئەنفالە دەچەقێتە لەشەوە، لەگەڵ ئەوەش حەز بە گەرماوکردن ناکەم، نازانم کێ بوو گوتی:

بۆچی خۆت ناشۆیت؟ دەزانی بۆنی کەری تۆپیوت لێدێت!

حەزمدەکرد پێیگوتبام کەر، کەری تۆپیو، بەڵام بۆنی کەری تۆپیوم لێنەهاتبا، ڕاستە هەرچی ئارەقەی ڕێی لە بن نەهاتووی بەرد و بەردە لە مندا بە قەد ژمارەی بەردەکانی ڕێ وشکبوونەتەوە و تەڕبوونەتەوە، ها بە چاوی خۆتان ببینن هەمووی ماکماکە، دەڵێی بەرزایی قەندیلی دیوی نسێی هاوینە کە لێرە و لەوێ ڕەشبۆتەوە، ڕاستە ڕەنگە بۆنی ئارەقە لە منەوە لەو بوتڵە عەرەقە -خوداوەندی مەی بە کوفر لە سەرم نەنووسێ- تیژتر خێراتر و ڕاستەوراستر دەگەیشتە کونە لووتان کە دواتر زۆر دواتر نزیکەی بیست ساڵێك دواتر بە هۆی هەڵەی دانانەوە، زرم بە عەرد کەوت، هەر هێندەی سێ جار چاو بجووقێنی و هەڵبێنێی بۆنی عەرەق گەیشتە هەموو کورسیەکانی چایخانەی مەچکۆ، سورخیش ئەو کوڕەی ماسیەکانی بە پێکەنین ئێخست و مەچکۆی بە عەرەق مەست کرد، خەریکبوو بە لەپ عەرەق لە سەر کاشی هەڵگرێتەوە، ڕاستە من پیستر بووم لەو حەمە شێتەی ناو قەیسەریی هەولێر کە زۆر کەس دەیانگوت:

ئەو پیاوە لە هەموو تەمەنی خۆی یەك جار خۆشووشتنی دیوە ئەویش ئەو ڕۆژەی کە بە هەڵە هاتە دنیا.

هەبوو دەیگوت:

ئەگەر لە کاتی مردنێش بیشۆن، باشە دەبێتە دوو جار.

من لەو حەمە شێتە پیستر بووم، ئەو حەمەیەی زۆر کەس پێیانوابوو وەلیە، هەندێك لە شوفێر تەکسیەکانیش ئەوانەی لە ڕێی هەولێر- موسڵ ئیشیاندەکرد سوێندیان دەخوارد:

بە فشەی وەرمەگرن، ئەو حەمەیە توانای فڕینی هەیە و لە پێش ئێمە دەگاتە موسڵ و لە پێش ئێمەوەش دێتەوە.

زۆر لە ژنـان دەیـانگوت لە چـاوی ئـێمەوە حەمە پـیس دیـارە، دەنـا خاوێنە زۆریش خاوێنە، لە هەموومان خاوێنترە، ئێمە کامەمـان لە هەمـووان خاوێنترە لە ڕۆژی گەرماوێش هێندەی حەمە خاوێن نابین، مەگەر پیاوچاك و فریشتان هێندەی حەمە خاوێن بن.

پیاوی واش هەبوو دەیگوت:

هەتـــا ئەو (شـــێت)ە لە حەمە نەکەنەوەو (حەمە)کەش نەگـــۆڕن بە (موحەمەد)، ئەو هەولێرە خێر لە خۆی نابینێت، ئاخر چۆن دەبێت بەو پیاوە خودایی و نوورانیە بڵێن شێت و ناوەکەیشی بە سووکی بێنن.

هەبوو نووری ئەو موحەمەدە نوورانیەشی دیتبوو:

ئەگەر باوەڕناکەن، شەو درەنگان، بڕۆنە ناو قەیسەری، بە چاوی خۆتان نووری خودا لە حەمەوە دەبینن، من بەو چـاوانەی خـۆم دیتـوومە، چەپـك چەپك نوور لەو پیاوە خوداییە هەستاوە.

ئاگـام لە خـۆم نەبێـت حەمە لە گـوێزێم دووردەخـاتەوە و لە نـاو قەیسـەریی هەولێـرم دەکـاتەوە، سـەرهاتیش لە سـەر سـەردەکاو بـۆم نـاگیرێتەوە، لە جـێگەش سـەردەکاو مەبەسـت نـاپێکێ، بـا بگەڕێـمەوە دژوونیی خۆم، من نە حەمەی پیاوچاکم و نە هیچ، بەڵام هەست دەکەم لە چاوی خەڵکەوە لە لووتی خەڵکەوە پیس دیارم بۆنی ناخۆشم لێـدێ، دەنـا لە پیاوچاکان خـاوێنتر و لە هەمـووانیش بۆنخۆشـترم، وەرن بە لـووتی مـن بۆنی من بکەن، بزانن کام گوڵاوی فەڕەنسی ئەو بۆنە خۆشە دەدا، سـینە و مەمکی کام ژنـی خێـڵ و ڕەشـماڵان بەو گـوڵاوە مەسـتت دەکـات کە لە مندایەو سات دوای سات مەست و مەستترم دەکات، لە بیرتانە لە ((بەرد و بەرد لە هەورێوە تا قەندیل) لە ڕێیێ لە شەوێکی تاریك تاریك تـاریکتر لە ڕەشماڵ و لە پرچی ژنانی ڕەشماڵنشین، شەوێك لە نـاو ڕەشـماڵان مـامەوە، لە بن بەردێك خەوتـم، چاوتـان لێبـوو! لەو تـاریکیی شـەوە ژنێـك بە هەڵە هات و هەرچی بۆنی ژنانە هەیە، لە شووشەیەکی گوڵاوی کرد و بە منیدا پژانـد! ئێسـتاش هەر لە نـاو ئەو شووشـە گـوڵاوەم، پیسـی و ئـارەقەی

تەمەنێکیش کار لەو گوڵاوە ناکەن، تا هەتایە گوڵاوی ژنی بن بەردەکە لێم نابێتەوە، دەبێت پارێزی لەو بۆنە بکەم، من پێموایە بە خۆشووشتن و جلك شووشتن ئیدی گوڵاوی ژن بە ئاودا دەچێ، لەگەڵ بە ئاوداچوونی گوڵاویش لە گوێژنی گێژەلووکەیی چی هەیە تۆزقاڵێك چێژبەخش بێت، هەستدەکەم لە رێی دیاریەکەی خودا ئەوەی بن بەردێ، نوورانیشم.

- نا، خۆم ناشۆم، لێمگەڕێن.

+ کوڕە، رشك و ئەسپێ دەتخۆن، خۆت بشۆ.

چی دەمخوات، با بمخوات، لە گیانی خۆش، من لە ناو گوڵاوی ژندا ژیان دەکەم، چی دەڵێن با بیڵێن گەردنیان ئازاد، من لە خۆمەوە لەو جلکە ماکماکانەی خۆمەوە گوێم بۆ شنەی هەناسەی ژنی بن بەردەکە هەڵخستووە و لەو شنەیە بترازێ چیدی نابیستم، بە راستی لە ناو گێژەلووکەی گوێژێ سێ شت هەبوو، من دەستیان پێوە بگرم و دەستم بگرن و نەهێڵن سەراوسەر بەربمەوە ناو نائومێدی:

١-شەوی بن بەردەکە، ئەو بەردەی ئێستاش وا دەزانم بەردێکە لە لۆکە و ژنە باڵا بەرزەکە لە بەردەوە کردیە لۆکە و لە مێژووی بەرد بەردێکی نەرم هاتە دنیا.

٢-ناڵەی جودایی، ئای ناڵەی جودایی، خودایە، بۆ هێمنت وا زوو کوشت!

٣- قسە و گاڵتەکانی خارە خولە کە بزەی دەخستە سەر لێوی هەشبەسەریشەوە، پیاوێك بوو فشەی بەو گێژەلووکەیە دەکرد کە پێشمەرگەی پەرتدەکردو خرپیدەکردنەوە و تێکی دەئاڵۆزکاندن،ئەو پیاوە بۆ هەموو بابەتێك قسەی خۆی هەبوو، کە بە قسەی خارە خولەیی ناویان دەبرد، زۆر لەوانەی ئەوێ بە بەرپرسە گەورەکەشەوە پێیانوابوو، ئیدی لەو قۆناخە پێشمەرگە کۆتایی هات و با هەر کەسە بچێتە ماڵی خۆی، خارە خولە لە وەڵامی ئەوانە گوتی:

وا نیە، تا جگەرە مابێت، پێشمەرگە دەمێنێت.

گوتیان:

چایەت لە بیرچوو.

خارە گوتی:

کەس هێندەی من عاشقە چا نیە، بەڵام پێشمەرگایەتی بێ چایەش دەکرێ.

گوتیان:

باشە ئەگەر جگەرە نەما.

خارە گوتی:

ئەوجا ئەگەر جگەرە نەما، پێشمەرگە سەی کێندەڕێیە.

گوتیان:

خارە، خۆ بە گوێی خۆت گوێت لە قسەکانی هاوڕێ باڤێ فاریقی بوو.

خارە گوتی:

کەس ڕێی لەو نەگرتووە، قسەم پێمەکەن، با قسە نەکەم.

باشترە پێکەوە گوێمان لە چەند رستەیەکی باڤێ فاریقی بێت، با ئەوەش بڵێم باڤێ فاریقی بە کوردیکراوی ناوێکی عەرەبی بوو، ئەوە کامەران ئامێدیەك هەبوو ئەوهای کردبووە کوردی، ئەو ناوەی زۆر شیرین لە زاری دەهات، هەر لەبەر هەندێ منیش وەکو وی ناوی دێنم، وا بزانم سەر لە بەیانی بوو، هەرچی پێشمەرگەی دۆڵی گێژەلووکەیە کە گەلێك زۆر بوون، خڕبوونەوە، بە دانیشتنەوە نیوە بازنەیەکیان بە دەوری باڤێ فاریقی بەست، لە پاڵ بەرد و لە سەر بەرد دانشتبووین، کەس دەنگی لێوە نەدەهات، قەت پێشمەرگەم وا بە قروقەپی نەدیتبوو، دەنگ لە بەردەوە دەهات لە پێشمەرگەوە نەدەهات، کەس پێشمەرگەو بەردی لێکدی جودانەدەکردەوە، ناهەقیان نەبوو، دەمێك بوو چاوەڕێی بەرپرسێك بووین بێ و قسەیەك بکات، شتێك بڵێت، بزانین لە دنیای دەرەوەی گوێژێ چ باسە، خارەخولە گۆتەنی: (( گفتوگۆیەکی ژێربەژێری لەگەڵ

حکومەت!))، هەر شتێك لە چنگی گێژەلووکەی گوێزێمان دەربێنێ، جا لە کوێ بەرەڵامان دەکات گرنگ نیە، بەس باوەشی حکومەت نەبێت، خۆ مردین لە برسان، دەی هاوڕێ شەکرێك بشکێنە:

هاوڕێیان، سەرەتا خۆشحاڵم کە بە زیندوویتی گەیشتنە ئێرە، هیوادارم هاوڕێیانیتریشمان سەلامەت بن، بە راشکاوی پێتانبڵێم ئێمە لە رووی سەربازیەوە شکستمان خوارد، پێشمەرگە شکستی خوارد.

**دەنگ لە بەردەوە دێ ورتە لە پێشمەرگەوە نایە.**

...حزبی ئێمە لەگەڵ ئێران بەینی خۆش نیە، بۆیە ئێران هیچ هاوکاریەکەمان ناکات، نایەڵێت، یەك فەردە ئارد نیو تەنەکە روون، کیسەیەك خوێ.. ئاودیوی ئێمە بێت، ئامادە نیە برینداریکی ئێمە، نەخۆشیکی ئێمە بگریتە خۆی.

**دەنگ لە بەردەوە دێ ورتە لە پێشمەرگە نایە.**

(...) هەرێی داینێ شتێکمان بۆ بکات، لە رێی ئەوانەوە ئازووقەمان بۆ بێت، بە ناوی ئەوانەوە ئاودیو بین و هاتوچۆمان هەبێت، تا ئێستا چ دیار نیە، هەر دەڵێ ئەوڕۆ نا سبەی.

**دەنگ لە بەردەوەو دێ ورتە لە پێشمەرگە نایە.**

**بەڵام دووکەڵی جگەرە دەتگوت پەلە هەورە بە سەر سەرانەوە.**

هاوڕێیان بۆرژوازی و حزبی بۆرژوازی بەر و پشتی نیە، قەحپەنە، قەحپە.

**دەنگ لە بەردەوە دێ ورتە لە پێشمەرگە نایە.**

من لەو ( قەحپەیە) تووڕە بووم، لەگەڵ ئەوە نەبووم شتی خراپ و دووڕوو بە قەحپە بچوێندرێ، ئاخر دوژمنایەتیەکم لەگەڵ هیچ قەحپەیەك نەبوو، باشە قەحپە چۆتە سەر ماڵی کێ؟ رێی لە کێ گرتووە؟ گیرفانی کێی بڕیوە؟ قەحپە چ جۆرە زێدەباییەك لرفەدەکات؟ خۆ قەحپە شەریفەکەی سارتەرم هەر زۆر خۆشدەویست، نازانم بۆچی ئەو پیاوە بەو شێوە قاحپەی سووك و چرووك کرد.

... هاوڕێیان لێتان ناشارمەوە و لە ئێوەش شاراوە نیە، ئێمە لە بارودۆخێکی زۆر خراپدا دەژین، ناتوانین خۆمان بژێنین، هاوڕێیان، ئێوە دەزانن خەباتکردن چەندان شێوازی هەیە... ئیدی ئەوە حکومەتیش لێبووردنی گشتی دەرکردووە، بە ناوی حزبەوە قسە دەکەم و دەڵێم ئاساییە کە خۆ رادەستی حکومەت بکەنەوە، بچنەوە شارەکان.. حزب لەو بارودۆخە ناتوانێ ئەو هەموو پێشمەرگەیە بەخێو بکات.

لەگەڵ راگەیاندنی ئاشبەتاڵ بە دەنگی زولالی باقێ فاریقی بووە غەلبە غەلب، هەر پێشمەرگە تا بەردەکانیش وەقسە هاتن، هەندێك لەو قسانە تا ئێستاش لە گوێمن و دەگوترێتەوە:

- وەڵا قسەی کرد و لێبۆوە!

- با هەر وا بڵێ، من قەت ناچمەوە.

- با خۆی خۆی رادەستی حکومەت بکاتەوە.

- قەت نەمدەزانی حزب ئەوها بێ وەفایە، کە ئیشی پێتنەما ئەوها بەرەڵات دەکات.

- دەیانەوێ ئێمە بنێرنە ناو دەمی حەزیا و خۆیشیان بچنە مۆسکۆ بۆ قاحپەگایین.

- مادام وای لێهات، گوو بەو حزبە هەر ئێستا دەڕۆمەوە.

- هەموو حزبیش بچێتەوە من دەمێنمەوە، دەبێت ببمە حەمەدۆك.

- منیش لەگەڵتم، کوڕە یاڵا با بۆ خۆمان دەستەیەك درووست بکەین و سەربەخۆبی..

- ئەگەر وای لێهات وا دەکەین.

باقێ فاریقی کە لەوێ و تا ماوەیەکی زۆر بووە باقێ ئاشبەتاڵ، بە تەواوی خوێنی خۆی تاڵ کرد، پێشمەرگە هەبوو ئەگەر لە دەستی بهاتایە دوور نەبوو گوللەیەك بنێ بە تەختی نێوچەوانیەوە، هەستی بە تووڕەبوونی پێشمەرگە کرد، رەنگە هەر لەبەر ئەوەش بووبێت خۆی بزرکرد، بەڵام بزربوونی یەکجارەکی نەبوو دوایی دیتمەوە، ئەو پیاوەی لە بارەگا

بەردەلانیەکەی گوێزێ دنیایەك وشەی لە بەرد ڕەقتری هەڵدا، نازانم کێ بوو گوتی:

بەردیش ئەگەر بێتە قسە، قسەی لەوە ڕەقتر ناکات.

ئەو پیاوە دواتر کەمێك لە نزیکەوە ناسیم، ڕەنگە پێشی سەرسام بووبم، ئەو پیاوە بە تەمەنداچووە تایبەتمەندیی سەرنجڕاکێشی هەبوو:

١-بە کاتژمێر وتاری دەدا بێئەوەی هەناسەبدات، بێئەوەی لە هیچ ئەندامێکی لەشیەوە جووڵەیەك ببینی جگە لە لێوی ئەویش بە نەرمی، چاویشی لە سەر خاڵێکی دیاریکراو رادەگرت کە کەس ئەو خاڵەی نەدەدیتەوە، هەرگیز هەڵەی زمانی نەکردووە، دەتگوت لە پێشی نووسراوەتەوە و دەیخوێنێتەوە، جارێك خارە خولە سوێندی خوارد کە باقێ فاریقی:

لە کاتی وتاردان دەستێ هەیە کاخەزی نووسراوی بۆ ڕاگرتووە، بەڵام ئێمە ئەو کاخەز و دەستە غەیبیە نابینین.

٢- ئەگەر ئازابوویت چایەکەت لە پێشی دادەنا، یان جامە ئاوێکت بۆ رادەگرت، یان هەر سووکە یارمەتیەکی تایبەتی، وەهای تەریقدەکردیەوە بۆ حەفت پشتیش تۆبەت بکردایە، دەیگوت:

بۆ! خۆم شەلم، گۆجم، چاوم نیە چیت لە من زیاتر و کەمترە، جارێکیدی شتی وا نەکەیت، باشە!

خێزانەکەیشی کە زۆر گەنج بوو ئەویشی بە سەر خۆیدا دەشکاندەوە، نەیدەوێرا سووکە یارمەتیەکی بدا.

٣-بە چاوی خۆم نەمدیت بەڵام دەیانگوت:

باشترین سەختەکاری ناسنامە و شتی وایە، لە پارچەیەك لاستیك مۆری سەرۆك کۆماری درووستدەکرد، دەیانگوت:

مۆری هەموو فەرمانگە و دامودەزگاکانی حکومەتی لا دەستدەکەوت.

٤-ئەو پیاوە پێیەکی لە شاخ بوو پێیەك لە شار، نازانم چۆن نەدەگیرا، خارە خولە دەیگوت:

ئەوە بگیرێ! پەنجا ناسنامەی لە بەرکیە، یەکیان هەر دەیخوا.

٥-دوژمنی سەرسەختی پارە بوو، ئەگەر چەند دینارێکی لە گیرفان با، هەستیدەکرد قونجرکەیان بۆی تێکردووە، ئەسپێی لە باخەڵە، زەنگەزۆرەی تێناڵاون، چوزانم رەنگە وای زانیبێ پۆلووی ئاگری پێوەدەنێن.

دواتریش دوای ئەوەی پێشمەرگە لە چاخی بەردپەرستیەوە پەڕیەوە چاخی پوولپەرستی و کۆڵەپشتەکەشی لە بەری بەرد بەجێهێشت، ئەو پیاوە ئەوانەی دەیانناسی دەیانگوت:

هەر بە ئەنتی پارە ماوەتەوە.

ئیدی بووە یەك ژاوەژاو کەس نەبوو گوێ لە کەس بگرێ، هەموو قسەکەر بوون، کەسیش نەیدەزانی قسە بۆ کێ دەکات، هێشتا بیستو چوار دەمژمێر بە سەر راگەیاندنی ئاشبەتاڵ نەسووڕابۆوە، چەند پێشمەرگەیەك تیانکردەوە، رەنگە تیانکردبێتەوە، لە بارەگا نەمان، لە دڵی خۆم گوتم ئەوها بڕوا هەتا سێ چوار رۆژیدی بارەگا چۆل دەمێنێتەوە، چۆلیەکی وا برۆ کەری تێدا... بەڵام رۆژی دواتر پێچەوانە بۆوە، کۆمەڵێك پێشمەرگە گەیشتنە بارەگا، گێژەلووکە لە بنی دنیاوە هێنابوونی، یەك دوو رۆژ رابورد، پێشمەرگە نە لە کەمی دەدا نە زیادیش دەبوو، دیتم بەرپرسەکان قل قل پێشمەرگان بانگدەکەنە پەنایێ، لە دۆڵی گوێژێ، دۆڵی گێژەلووکە، دوو بارەگا هەبوو کە پێچێك نێوانیان بوو، لەو دوو بارەگایە یەك دوو ملازم و دوو سێ مام و سێ چوار مامۆستا و کۆمەڵێك ئەبوو بەرپرس بوون، لە مامۆستایەکان ( م. لەشکری) و لە مامەکان (م. سالح) و لە ئەبووەکان (ا. دڵشاد)، لە ملازمەکانیش نازانم بۆ ناوی کەسیانم لە یاد نیە، ئەوانەی بانگدەکرێن نازانم چیان پێدەڵێن و چ رێیەکیان نیشاندەدەن، ئەوانەی بانگیشدەکران چ قسانیان نەدەکرد، بەڵام دیار بوو لە سیمایانەوە دیار بوو کە دڵیان گوشراوە، خراپیش گوشراوە، لێم بووە مەراق، چۆن نابێتە مەراق، سەگبابەك پێینەدەگۆتم مەسەلە چیە، رووی پرسیارم کردە یەك دووانێك لەوانەی بانگکرانە پەنایێ، چیان نەگۆت، منگەمنگێکی هەند

حیزانەیان لێوە هات، سوێندمخوارد ئیدی پرسیار لە کەس نەکەم، پرسیارم لە کەس نەکرد، حەزمدەکرد زوو منیش بانگبکەنە پەنایێ و بزانم ئەو دڵگوشرانە بەرئەنجامی چیە، لە دڵی خۆم دەمگوت، چ دەبێت با ببێت، بەس بانگمبکەن و تێبگەم، بانگمیان نەدەکرد، خەریکبوو خۆم بچم و بڵێم:

ئەرێ دەڵێی منتان لەبیرکردووە، بۆچی بانگمناکەنە پەنایێ؟

پێشمەرگەش بەردەوام بە دەم گێژەڵووکەوە دەگەیشتنە دۆڵی گێژەڵووکە، هەستمدەکرد هەندێ دەموچاو بزردەبن و نابینرێنەوە، لە بارێکی وا بووم، گێژەڵووکە بە شێوەیەك لە سەرمدا گێژیدەدا، بیرم بۆ کۆنەدەکرایەوە و دوور نیە لەوان رۆژان بە هارە هارەم لێهاتبێ.. دیتم کارزانیشیان بانگکردە پەنایێ، ئەو کارزانە ئەو شەوەی من لە بن بەردەکە لە تاریکیدا تووشی ((زینا)) بووم، ئەو دیدڤانێکی خەوتوو بوو، زۆری نەبرد کارزان هاتەوە، ئاگر لە چاوی دەباری، چ پێکەنینی پێنەمابوو، لە بیرمان بێت ئەو کوڕە بە هەموو شتێك پێدەکەنی شتی سەیر و ئاسایی شتی خۆش و ناخۆش، من سوێندمخواردبوو چ پرسیارەك لەوانە نەکەم کە بانگیاندەکەنە پەنایێ، کارزان هات، لە تەنیشتم دانیشت، شانی راتەکاندم:

- بۆچی پرسیار ناکەیت، بۆچی بانگمیان کرد؟

+ پرسیار ناکەم.

- دیارە دەزانی مەسەلە چیە؟

+ تەڕەساز دەزانم.

- گوێبگرە ئەو هیچوپووچە دەزانی چ بە من دەڵێ؟

+ هیچوپووچ کێیە؟

-...

+ ئێ

- دەڵێ بڕۆوە خۆت رادەستی حکومەت بکەوە.

+ ئێ؟

- دەزانی چیم گوت! راستوڕەوان پێیم گوت:

من لە تۆ هەر لە تۆ نا لە هەمووتان کۆمۆنیستترم، مـن خـورتم بەرگەی هەموو ناخۆشیەك دەگرم، بەڵام تۆ تەواوێـك چوویتە تەمەنەوە تـۆ بـڕۆوە، تۆ پێویستت بە پشووە.

+ ئێ؟

- سەگباب دەڵێ:

چەکـداری تەواو، حـزب لە نـاو شـار ئیشـی بە تـۆیە و کـاری ڕێکخراوەیی بکە، ناسراو نیت و ئاشکرا نابیت.

+ئێ؟

- گوتم:

تۆ خۆت بە چی دەزانی! لە هەولێر مـن لە تـۆ ناسـراوترم، نـاچمەوە و تەواو.

+ ئێ؟

- ئێ، ئێ...

ئێی، با کارزان جێبهێلم و بێمەوە ناو تەنیایی خۆم، ئەو تەنیـاییەی جـگە لە مـن لە دەسـتی کـێ دەهـات لە نـاو گێژەلـووکە پـڕ لە هەراو هۆریـای گوێژێ بە دەستیبێنێ! تەنیایی لە ناو گێژەلووکە هونەرێکە کارزان گوتەنی: لە ناو مرۆڤان هەر لە تۆ دێ.

لە هەموو دارەتی دنیایێ مـن تەنـێ کتێبـێکم هەبـوو بە نـاوی ( نـاڵەی جودایی)، لە هێمنم زەفتکردبوو، نـاوی هێمـنم لە سـەری ڕەشـکردبۆوە، بە خەتێك نزیك لە خەتـی نـاوەکەی وی نـاوی خـۆمم لە سـەری نووسـیبوو، شیعرەکانی ناڵەی جودایم هێنـد خوێنـدبۆوە، هێنـد خوێنـدبۆوە، هەمـوویم لەبەر بـوو، هـیچ قورئانخوێنێـك قورئـانی وا خەتـم نەکردبـوو، لە بیـرمە لە گەڕەکـی بەلاشـاوەی هەولێـرێ نزیـك گۆڕسـتانی سـەید مـارفێ، مەلایەك هەبـوو زۆر کەس بە مەلا شـێتۆکە بانگیانـدەکرد، بە گـوتەی گۆتیـاری، سـوێندی بە درۆی خـواردووە و وەکـات سـوێندگربووە و وای بە سەرهاتووە، دەیانگوت:

چ ئەسحابەیە ویتەی وی، هەموو قورئانی لەبەر نیە.

کاتێ سوورەتێکی دەخوێندەوە، وەها لەگەڵی تێکەڵ دەبوو، ماستی مەڕ وەها تێکەڵی ئاوی کانی نەبووە، مەلا شێتۆکە بە گوێی خۆم گوێم لێبوو دەیگوت:

کەس وەك من قورئانی خۆشناوێت، کەس وەك من تێکەڵی قورئان نەبووە، قورئان هی خۆمە خودا چ مافێکی بە سەرەوە نیە، جگە لە خۆم کەس مافی بە سەریەوە نیە.

منیش لە ئاست (ناڵەی جودایی) وەك مەلا شێتۆکەم لێهاتبوو، مافی هێمن و کەسی بە سەرەوە نەمابوو، هی خۆم بوو، خۆم دامنابوو، دۆڵەرەقەی ماندوویتی و تینوێتی و برسێتی و ترسیش لە ناڵەی جودایی جیانەکردمەوە، ئیدی لە گێژەلووکەی پڕ لە هاواری گوێزێ من بە بێدەنگی دەچوومە ناو دەنگە جیایەکانی ناڵەی جودایی، لە بن تیشەبەردەکانی بارەگا کە دەتگوت بەرانن روویان لە ئاسمان کردووە، لە بەر خۆمەوە دێر دێر ناڵەی جوداییم لە ناو دووکەڵی جگەرە بۆ خۆم دەخوێندەوە.

لە هەموو دارەتی گوێزێ یەك شڕە بەتانیم هەبوو، نیوەیم رادەخست و نیوەیەکیدیم بە خۆمدا دادەدا، ئەگەر لە چلەی هاوینێش رێتان کەوتە گوێزێ و شەو مانەوە لە بیرتان بێت، نوێن لەگەڵ خۆتان ببەن، ساردە، شەوەکەی ساردە، بەتانیەك لە حەمە شێت دزراوە، لەگەڵ ئەوەش شوکرانەبژێریم دەکرد، لە زمانی خارەخولەوە پێشینان گۆتەنی (خودا ساردتران نەدا)، لە کنە من ساردترەکە بانگکردنە پەنایێیە، دوای ئەوەی کارزانیان بردە پەنایێ و ئەوەی بیستی و گوتی بۆی گوتمەوە، نزام دەخوێند ئەوەی پێشمەرگەیە بانگنەکرێتە پەنایان، وەڵامی من وەك کارزان نابێت، هەر بڵێن بڕۆوە دەڕۆم، بەڵام دەچمە کوێ؟ چەندی سەردێتم و دەبەم نازانم دوای بانگکردنە پەنایێ چ جێیەك جێم دەکاتەوە، خۆم دەناسم کە دامە لاملی دایکم گوتەنی:

لە بەرد رەقتری و ملە لەگەڵ شاخ دەکەیت، هەر شاخی شاخ.

دوور نیە بە شاخیی بمێنمەوە، لە ئاست لێبووردنە تایبەتی و گشتیەکان هەر بە شاخی بمێنمەوە، ئەگەر بارەگا چۆلیش بێت، من لەو رووەوە هەر شاخەکەی ناو هزر و نیگای دایکم بم، نازانم وا دەمێنمەوە یان نا، بەڵام ئێستا بڕیاری دوایی خۆم داوە کە خۆم رادەستی حکومەت نەکەمەوە، هەندێ پێشمەرگەیدیش لە من شاختر خۆیان نیشاندەدا، یەکیان گوتی:

حەمەدۆك چی لە ئێمە زیاتر نەبوو!

ئەوە جاری دووەمە ئەو کوڕە ناوی حەمەدۆك دێنێ.

لام سەیر بوو ئەو کوڕە حەمەدۆك لە کوێ دەناسێت، نەك هەر هیچ کتێبێکی نەخوێندبۆوە، خوێندەواریشی نەبوو، دواتر وای بۆ چووم کە رەنگە مەبەستی حەمەدۆکێکیدی بێت، حەمەدۆکێك لە دەرەوەی کتێب، حەمەدۆکێکی راستینە و دوور نیە هەر لەو دەوروبەرەش بێت، دەمویست لێی بپرسم ئەرێ:

حەمەدۆکی تۆش هەر ئەوەی منە، ئەوەی لە دەوڵەتی تورك یاخی بوو و یەشار کەمالی بە دنیا ناساند، یان...

راستی لە بیرمچوو بپرسم، دەبوو پرسیبام.

ناوە ناوە پێشمەرگەیان بانگدەکردە پەنایێ، بەڵام پێشمەرگە نەك هەر لە کەمی نەدەدا بگرە رۆژ دوای رۆژ خارەخولە گۆتەنی:

پێشمەرگە بەرەکەتی کەوتۆتێ، زاوزێ دەکات.

دیاربوو ئەو گێژەلووکەی هەڵیکردبوو چەندی هەڵیدەگرت و دەیبرد، دوو هێندەی دەهێناو بە عەردی دادەدان..خەفەت وەهای داگرتبووم دەتگوت دنیا لە سەرەمەرگە و بە دیاریەوە دانیشتووم، لە هیچ شتێك جوولەیەکی جوانیم بەدینەدەکرد، ناڵەی جوداییش جوان نەمابوو، شتێك نەبوو بۆ گاڵتەش تامێکی هەبێ، جگەرەش هیچ، هەتا یادی ژنەکەی بن رەشماڵیش لە سەر کالبوونەوە بوو، کاڵ کاڵ، نە چێژی دەما نە جوانی...

نای ئەو رۆژانە چەند دەستبەتاڵ بووم، هەر دەست جا لە چی بەتاڵ

نەبووم! تەنهاو تەنها چاوەڕێی سووکە ئاماژەیەك بووم تا بچمە پەنایێ و ئیدی...

سپێدان کە لە خەو هەڵدەستام چاوم دەگێڕا بزانم گێژەلووکە کێی هێناوە، تا نیوەڕۆیێش بە دوای ئەوانە دەگەڕام کە گێژەلووکە بردبوونی، بە تەمای دیتنەوەیان، لە بن تیشە بەردەکانی گوێزێ لە دوایان دەگەڕام، سپێدەیەك کوڕێکم دیت بابی ناوی حەسەن بوو، ناویشی لە خۆی نابوو ئاسۆ، ساڵ و شتێك بوو دەمناسی، درەنگانی بەهارێك لە دەفەری گارە ناسیم، لە ناو کتێبان ناسیم، لە بارەگایەگ ژوورێکی گچکە هەبوو پڕ لە کتێب، من ئەو ئاسۆیەم لەو ژووورە ناسی، لە راگەیاندنی پارتێك کاری دەکرد ناهێتە بیرم ئەو کات چ ناوێکی هەبوو، بەڵام دواتر بە زەحمەتکێش ناودێرکرا، ئەو ئاسۆیە چیرۆکانی دەنووسی، دواتر (ئەو پێشمەرگەیەی بووە قاچاخچی)ی بڵاو کردەوە، ئەودەم لە ناو پێشمەرگان تەواوێك دەنگیدایەوە، لە دوای بڵاوبوونەوەی ئەو چیرۆکە زۆری نەبرد، خاوەن چیرۆك، نازانم لە چی تووڕە بوو، کێ تووڕەی کرد، بۆ؟ خۆی رادەستی حکومەت کردەوە، ئیدی ئەوانەی چیرۆکەکەیان خوێندبۆوە، ناونیشانی چیرۆکەکەیان گۆڕی بۆ ((ئەو پێشمەرگەیەی تێکردەوە))...

ئاسۆش بە دەم گێژەلووکەوە گەیشت، گێژەلووکە سێ دەوڵەتی پێکردبوو تا گەیاندیە گوێزێی قەندیل، گوتی:

+ بە چی خەریکی؟

- چاوەڕوانی.

+ چاوەڕوانیی چی؟

- نازانم..

+ ئەدی لەو ماوەیە چیت نەنووسیوە؟

- لە بارێکی وا نیم بتوانم یەك وشەش بنووسم.

+ وایە، بەڵام کەشێك بۆ خۆت درووستبکە کە بتوانی...

- زەحمەتە، ئەدی تۆ هیچت نووسیوە؟

+ شتێکی درێژم بە دەستەوەیە، هەندێکیم لێی نووسیوە، دەمەوێ ئەو کارەساتە هونەریانە بنووسمەوە.

دەفتەرێکی هێنا، چەند دێرێکی بۆم خوێندەوە، شیعر بوو، لە سەرەتای داستانێکی قارەمانێتی دەچوو، لە بیرم نیە لە بارەی ئەو سەرەتایەی داستان چیم بە ئاسۆ گوت، رەنگە هیچم نەگوتبێت، بەڵام لە بیرمە ئیرەییم پێبرد، کە لە ناو گێژەلووکەیەکی وا کاری نووسین دەکات، ئاخر من خوێندنەوە و نووسینەوەم لە بیرچووبۆوە، زۆری نەبرد ئاسۆ ئاودیوی دیوی ئێران بوو، بە رۆیشتنی وی پتر و پتر دڵتەنگ بووم.

چێشتانێك، کۆمەڵێك پێشمەرگە دەوری خارە خولەیان دابوو، جا کەی دەوری ئەو پیاوە چۆلبووە! دەتگوت هەنگوینی رژاوە، هەموو دەوریان دەدا، منیش نزیکبوومەوە، گوێم لێبوو خارە هەنگوینانە رۆڵی دابەشدەکرد، هەر لە سکرتێرەوە تا دەگاتەوە خۆی پلەو پایە و ئیشوکاری بۆ هەمووان دیاریکرد، مژی قوولی لە جگەرە دەدا، زۆر لە سەرەخۆ و بە شێنەیی دەیگوت:

ئێ، دوای ئەوەی حکومەت رووخا و چووینەوە، هەرکەسە و شوێنی خۆی دەگرێت.

گوتیان:

+ خۆت لە بیرکرد، ئیشی تۆ چی دەبێت؟

- چی بێت باشە!

کوڕێکی هەرمۆتەیی هەبوو ناویم لە یاد نیە، گوتی:

تۆ دەکەنە جێگری وەزیری بەرگری.

خارە ئحمێکی کرد:

ها، سەی ناو گەنم، لە کێت بیست! من نایکەم، ئەو ئیشە ناکەم، با پێتان بڵێم حزب چ کارێك بە من دەس...

وا بزانم چەتۆ بوو هەڵیدایێ و قسەی بە خارە خولە بڕی:

ئەگەر بیکەنە بەرێوەبەری پۆلیسی هەولێر، رەنگە بیکات.

خاره سەی ناو گەنمێکی لەویش بەردا، ئەوجا سەیە ناو گەنمەکەی خاره خوله پەلاماری کێی نەدایە، دڵی هەر قسەیەکی نەگرتبا، بە خاوەن قسەی دەگوت:

دەڵێی سەی ناو گەنمی.

+ دەی خۆت بیڵێ.

- من هەر بەو کلاشینکۆفەی وا بە دەستمەوە لە پێش بارەگایەکی لاچەپ دادەنێن و دەڵێن:

هاوڕێ، پاسەوانی لە تۆ باشترمان دەستناکەوێ.

+ئەوجا بەوە رازی دەبیت؟

- تۆش سەی ناو گەنمی، ئەدی رازی نەبم چیم لە دەست دێ!

دژوونم بە هەڵکران خۆم هەڵدەکرێتم، سەگی گرووش هەر هێندەی من بە خورشتە، ئەوڕۆ رۆژی گەرماوکردنە، سەرشۆرك چوار دار و چەند گونیەیەکی لە چەند جێوە کون کون، مەنجەڵێکی کەمێك گەورەش شەقاوێك دوور لە دەرگای بێ دەرگای سەرشۆرك لە ناو دووکەڵی جاروبار بە دیار دەکەوێت، دەڵێی سەرەدیقانێ لەگەڵ ئەو پێشمەرگانە دەکات کە نۆرەی خۆشووشتنیان گرتووە، ناوی منیش لە ریزی ناوانە، تەشتێك و چەند تەنەکەیەکیش، ئەدی ئاو لە کوێوە دەهات؟ لە یادەوەریمدا چ سۆندە دیار نیە، بەڵام هەر دەبێت بە هۆی چەند تۆپێك سۆندەوە و لە کانیەکی دوورەوە ئاو گەیشتبێتە سەرشۆرکەکەی گوێزێ، ئەگەر کانیەك لە نزیك سەرشۆرك هەبا ئێستاش لە یادەوەریمدا لە بەری دەرۆیشت و چکی نەدەکرد، نابێت ئەو چەند بنە دارە کورتە بنەیەش بزر بن، دەبێت نیشانیان بدەمەوە کە بە دەوری سەرشۆرك رستێکی جوانیان درووستکردبوو، جلکی پێشمەرگەیان دابووە هەتاوێ، هەر لەبەر ئەوەش بە زیندوویتی مابوونەوە و تەوری پێشمەرگە نەیخستبوونە بن مەنجەڵی کوڵێ، هەتا باوەشێ داروردڕ و چیلکەوچوالم پەیداکرد، بایی حەفت خۆشووشتن ئارەقم دەردا، دەزانی چەند بە هەورازان هەڵگەڕام و بە نشێوان داگەڕام!

ئیدی ئێستا نۆرەی منە خۆم و جلکەکانم بشۆم، بە نابەدڵیش بێت، چنگە تایتێك و سەلکە سابوونێکم وەرگرت، خەریکبوو خۆم رووتدەکردەوە، وا بزانم رووتبیوومەوە، ئا ئا رووت بووم، بەڵام هێشتا نە جلکەکام نە لەشم ئاویان پێنەکەوتبوو، لە چیاکەی پشت بارەگا ئەو چیایەی پێش ماوەیەك بە باوەشێك دارەوە بە غار لێی هاتمە خوارەوە، بووە یەك تەقوهۆڕ و رمبە رمب، گومانم نەبوو کە بەسەردادانە.

هاوڕێیان، خۆببەستن خۆببەستن، هێرشە هێرش.

دەنگی ئەو هاوڕێیەی لە ناو هەراوهۆریا هاواری لە هاوڕێیان کرد ئێستاش لە گوێمە بەڵام نایناسمەوە، نازانم چۆن جلکەکانم لەبەرکردەوە و چۆن دەستم بە تفەنگ راگەیشت، کۆمەڵێك پێشمەرگە بە چیاکەدا هەڵگەڕان، من یەکێك بووم لەوانە، زوو پێکەوتین شەڕ لە نێوان براکانە، کوڕەکانی قازی محەمەد لە نێو خۆیان تێکبەربوون، خارە خولە گوتی:

کەرایەتیەکەی ئێمە ئەوانیشی گرتەوە.

شەڕ گەرم بوو، وەها خوێن بەرچاوی گرتبوون، واتایەك بۆ ناوبژی نەمابۆوە، چیمان لە دەست نەهات، بەوە رازیبووین بەس لە بارەگای ئێمە نزیکتر نەبنەوە، دوور لە ئێمە با یەکتر کەلوکلۆم کەن، با بگەڕێمەوە گەرماوێ، بەڵام گوللەکەم لەبیر نەچێت، گوللەیەك نازانم لە کام لاوە هات و ملیوانی کراسەکەمی گرپدا، هەتا درەنگیش لە ناو گوێم گیزەی دەهات، لە خۆشیی ئەوەی نەبوومە بەڵاگێڕی براکان، لە بیرمچوو لە کن کەس باسی بکەم، رەنگە گوللە و ملیوانم بۆ کەس نەگێڕابێتەوە، من بۆ خۆم دەچمەوە سەرشۆرکێ با کوڕەکانی ئەودیویش لە دیوی قەندیلێ تووی یەکتر ببڕنەوە، باش بوو لە ترێ سەی نەچووم.

گەیشتمەوە سەرشۆرك، جگە لە کراسێکی شڕ، ئەویش پیس لە جلکەکانی بەرم زیتر چیدیم نیە، تەماشای نیفۆ و جێی دروومانان دەکەم سپی دەچنەوە، کراس و شەرواڵ و کورتەك لە رشکان سپی دەچنەوە و لە پشتێنیشی داوە، لەوەتەی پێشمەرگەم خۆم ئەوها نەدیتووە، ئەوهام

بەسەرنەهاتووە، وەها رشك و ئەسپێم تێنەکەوتووە، بیستبووم جلك کە رشکی لێدا رێگە چارە تەنها کولانە، ئەگەر نا ئاگرێکی تێبەردە و تەواو، قسەیەکی دایکمم بیرکەوتەوە کە دەیگوت:

جلکی ناو رشکان یان بۆ سووتان یان بۆ کولان.

باش دێتەوە بیرم، منداڵ بووم، زۆر منداڵ، ماڵمان وەکو کاروانسەرا وابوو، هەر خزمێك و ناسیارێك وەلا خەلکی لایدەش لە گوندەوە سەردانی شاری دەکرد، ئەگەر بۆ پشووێکی کورتیش با، سەرێکی بە ماڵی ئێمەدا دادەگرت، ماڵمان لە لاپەڕی شار و لە سەرەڕێ بوو، زۆر جار باپیرم دەیگوت:

ئێوە جێی ماڵی مەلافەندیتان گرتۆتەوە، بەس مەلیك ماوە بێتە ماڵتان.

باپیرم برادەری مەلافەندی بوو، هاتووچۆی ماڵیانی کردبوو.

ئێ، با لە دایکم دوور نەکەومەوە، ئەو مێوانانەی نیازی مانەوەیان هەبوو کە زۆربەیان شەو لامان دەمانەوە، دایکم هێشتا چاکوچۆنی لەگەڵ نەکردبوون، پەلەمێزە دەنگ گەورەکەی ئاگردەدا، هێشتا ئاوی نەدابوونێ، دەیناردنە سەرشۆرکە گچکە سەر بە چینکۆ گیراوەکە و جوان خۆیان دەشووشت و هەندێك جلکی پیاوانە و ژنانە و منداڵانەی تایبەتیش هەبوون بۆ مێوانانی گەرماو، پێشیدەگوتن:

جلکەکانی خۆتان لە لایەك دانێن، با رشك و ئەسپێ بەو ناوە وەرنەبن، دەیانکوڵێنم.

با منیش دەستپێبکەم، لە جیاتی پەمپلێدانی پەلەمێز دار بخەمە بن مەنجەڵەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئاگرەکە خۆش بکەمەوە، حەزم لێیە جارێکیدیش بچمەوە لای دایکم و گڕەگڕی پەلەمێزێ، چ دەنگێکی هەبوو خودایە، هەر هێندەمان خۆش بوو ئاگری گەورەی پەلەمێز کە دەگەیشتە سابیتەی خانوو، کپدەبۆوە، دەبووە یەك هاڕەهاڕە دەتگوت حەفتا فڕۆکە لە سەر سەرتە و حەفت کۆپتەریش بۆردومانت دەکەن، یەك دەنگی هەبوو ئەگەر دەروێش برایم کە دەنگی لەو سەری شارەوە

دەگەیشتە ئەوسەر و بەرە و گوندەکانیش دەچوو، لە دورِ ماڵێ بانگییدایە، کەس گوێی لە بانگ نەدەبوو، ئەو هارِە و هووشەیەی لەو پەلەمێزەوە دەهات، مەگەر لە ئاشەکەی مامم شتی وا هەبا، دەنگی ئاشەکەش وا بوو کە پێت دەنایە ناو ئاشەوە، بە خۆت حەیرانت بۆ خۆت بگوتایە گوێت لە دەنگی خۆت نەدەبوو، بە نابەدڵیش بێت، هەر دەبێت گەرماوێ بکەم، دیمەنی جلککولێنی دایکمم لە چاوم نەپاراستووە، بەڵام هەر وەك منی کردووە، ئەوەتا مەنجەڵ بلقبلق دەکولێ، جلکەکانم خستە ناویەوە و بە دارێکی درێژ هەڵگێرو وەرگێریان دەکەم، هەندێك تایتیشم تێکرد، تێکردنی تایت لە داهێنانی خۆم بوو! ئەوهاتان لێدەکەم خۆ منتان خوارد، دەرمهێنان و گوشیمن و هەڵمخستن، حەزمدەکرد سەریشم وەك جلکەکان بخەمە ناو مەنجەڵەکەوە و بیکولێنم، زۆری نەمابوو پێڵاوەکانیشم بکولێنم، ئاوی مەنجەڵم گۆڕی، ئاگرەکەم خۆشکردەوە، جامە ئاوی هێند گەرمم بە سەرمدا دەکرد، هەر سەری من بەرگەی دەگرت، پارچە گوشێکم کردە لیفکە.

لە خەیاڵێکی جوانی رەشماڵی ژنی بن بەردە نەرمەکە هاتە ناو سەرشۆرکێ و بە دەستی خۆی لە سەر ئەو دوو تاتە بەردەی کە دەتگوت تاتی نوێژن و بۆ من و وی لە سەرشۆرکێ دانراون، ئاوی پێمدا دەکرد و نەرم نەرم پشتمی دەشووشت، تا لێبوومەوە ژنی بن بەرد بە رووتی لە تەنیشتم لە سەر تات راکشابوو، هەتا ساڵانێکی زۆریش هەر کاتێك دەچوومە گەرماوەوە هەستمدەکرد ژنێك بە رووتی لەگەڵمە... گۆتم پارچە گوشێکم کردە لیفکە، لەو کاتەی گوشم بە لەشی خۆمدا دادەهێنا، نازانم کێ بوو رێی کەوتە لای سەرشۆرك، دیاربوو دیتبووی بە گوش خۆم هەڵدەکرێتم، گوتی:

+ بە گوش سپی نابیتەوە، کلکی هێستر کلکی هێستر.
- بە هی حوشتریش سپی نابێتەوە.

دەبێت قسەیەك لە کلکی هێستر بکەم، پێشمەرگەیەك هەبوو، زۆر کەس

پێیانوابوو کەمێك تامگێلە، منداڵکاریش بوو، ئەو سەرهاتەی دەیگێڕمەوە شوێنەکە دەڤەری چیای مەتین، کاتیش هێندە لەمێژ نیە، ئەو پێشمەرگە منداڵکارە تامگێلە، لە رووخسار وەك من بە لای شەویدا شکاندبۆوە، ئەو پێشمەرگە رەشتاڵەیە هەموو حەزی ئەوە بوو کە کەمێك سپی بێتەوە، رۆژێك پێشمەرگەیەکیدی ئەویش هەر رەشتاڵە دەبێت، رێی بۆ دادەنێ کە چۆن خۆی سپی کاتەوە، دەڵێ:

+ ئەگەر دەتەوێ، دەموچاوت لە بەفریش سپیتر بێت، بۆ ماوەی مانگێك دەموچاوی خۆت جوان جوان بە کلکی ماین و سابوون بشۆ.

- ئەدی بۆچی تۆ خۆت وا ناکەیت؟ خۆ تۆش وەك من رەشی.

+ من حەز ناکەم سپی بم، حەزم لە رەشیە.

تا ئێرە پێشمەرگە تامگێلەکە تامی گێلایەتی نادا، ئەگەر گێل با، وای وەڵام نەدەدایەوە، بەڵام دوای چەند رۆژێك دوای ئەو ئامۆژگاری و رێدانانە، دەبینن کلکی ماینەکەی بارەگا هەڵقاچراوە، دەیانگۆ لە ناو کۆڵەپشتی کوڕە تامگێلەکەشیان دۆزیبۆوە، من ئێستاش ناوی ئەو کوڕەم لە یادە، ئەوەی کلکی ماینی بڕی و سپیش نەبۆوە، دەنگی (...) لە ناوەکەیدا هەیە، تۆ بڵێی ئەو ناوە لە هەر کێ بنێی وا گێلۆکە دەرچێ! من چەند کەسێك دەناسم بەو ناوە هەموویان کەم و زۆر تامی گێلایەتیان تێدایە، ئەو قسەیەم بۆکرد! ناچارم گوێزێی قەندیل و مەتین و پێشمەرگایەتی بەجێبهێلم و ساڵە و ساڵ بگەڕێمەوە دواوە، سەرێك لە بەلاشاوەی هەولێرێ بدەم، ئەو گەڕەکەی هێندەی حەفت شار سەرهاتی هەیە.

کوڕێك هەبوو بە (ئەنۆ) ناسرابوو، ئەو ئەنۆیە زۆر کەس دەیانگوت: عەدنان قەیسیش ناوێرێ خۆی لێدا.

هەبوو بە (ئەنۆ قەیسی) ناوی دێنا، زۆر بەهێز بوو زۆر، بەو منداڵکاریە دەستی هەر زەلامێکی راگوشیبا، هاواری منداڵانەی لێ بەرزدەبۆوە، بەڵام من قسە لە هێز و قەیسیایەتیەکەی ئەنۆ ناکەم، قسەم لە دارلاستیکەکەشی نیە کە نازانم لاستیکەکەی لە چوویی چی بوو، بە زێدەگۆیی تێمەگەن

بەردی دارلاستیکی ئەنۆ قەیسی بە کەر بکەوتایە بە لای کەمی حەفت تری دەکرد، گوتم باس لە دارلاستیکەکەشی ناکەم، ئەنۆ قەیسی دواتر بووە پێشمەرگە، نازانم ساڵی چەند چووە هەندەران، زۆری پێنەچوو بە نەخۆشییەك مرد، هیچ دکتۆرەك نەیزانی چییە، ئۆی! خەریکبوو لە بیرمبچێتەوە ناوی ئەنۆ بۆچی هاتە ناو ناوان، تا ئەنۆ راینەکێشاوم بە لایەکیدی با بێمە سەر سەرهاتەکە، ئەوەی لە کلکی ماینەوە هاتەوە سەرم، کوڕێك هەبوو وەك گوتم ناوی ئەو کوڕەی لێبوو کە کلکی ماینی کردە لیفکە و سپیش نەبۆوە، ئەو کوڕە بەلاشاوەییە کە رەنگە لە تەمەنی دوازدە سێزدە ساڵیدا بووبێت، حەزی دنیای لە گۆرانی گوتن بوو، پتر گۆرانیی مامڵێی دەگوتەوە لەوەش پتر حەزی لێبوو پێبڵێن:

ئەڵلا دەنگت چەند خۆشە! حەسەن زیرەك کێیە! هەر دەڵێی مامڵێیە! بەڵام حەیف، کەس ئەڵلایەکی بۆ نەکرد.

ئاخر، چ دەنگی نەبوو، رەنگە دەنگی من لە هی وی خۆشتربووبێتەو کوڕە دەیویست بە هەر رێگەیەك بێت دەنگخۆشی بەدەستبێنێ، داوای لە دایکی کردبوو کە بچێتە سەر شێخ و مەشایەخان، کە نزا بکات، خودای گەورە دەنگخۆشیی بداتێ، ئەگەر هێندەی مامڵێشی نەداتێ با هێندەی حەسەن زیرەکی بداتێ، لای ئەو کوڕە دەنگ نەبوو بگاتە مامڵێ، ئەو رۆژانە کێشەیەکی گەورە کەوتبووە نێوان بەرەی مامڵێ و بەرەی زیرەك، ئەنۆ قەیسیش بە پەرستن حەسەن زیرەکی دەپەرست، هەموو گۆرانیەکانیی لەبەر بوو، دەنگیشی ناخۆش نەبوو، هەر کەسێك بیگوتبا:

فلانە گۆرانبێژ دەنگی لە حەسەن زیرەك خۆشترە.

ئەگەر بە کوتانیش نەیکوتیبا، بە پەندێکی دەبرد، بیرایبیڕ لە بیر نەکرابا، نابینن ئەو کوڕەی چی لێکرد! دوای ئەو هەموو ساڵە وا دەمەوێ بۆتان بگێڕمەوە بە چ پەندێکی برد، بەر لەوەی سەرهاتەکە بگێڕمەوە، حەزم لێیە بڵێم بەینی من و ئەنۆ مووی پێوە نەدەچوو، ئەویش بە هۆی حەسەن زیرەکەوە، مەگەر ئەنۆ هێندەی من حەزی لە دەنگی حەسەن زیرەك

بوویێت، ڕۆژێك ئەنۆ بە کوڕە دەڵێ:

+ دەتەوێ دەنگت وەکو مامڵێ خۆش بێت؟

- بە چی؟

+ تۆ هەقت بە سەرەوە نەبێ، ناتەوێ؟

- گەمە دەکەیت یان بە ڕاستە؟

+ خوشك حیز، قسەی جوان بکە، مـن کەنگـێ گەمەم لەگەڵ قـاحپە داکەکی وەکی تو هەبووە!

- ئەوجا لۆ جوون دەدەی؟

+ ئاخر، قسەی حیز دەکەیت، من دەمەوێ دەنگت خۆش بکەم.

- باشە، چۆن؟

+ ڕاوەسـتە بـا گـۆرانیەکی حەسـەن بـۆ بلـێم بـزانە دەنگـم لە جـاران خۆشترە یان نا..

ئەنۆ تێهەڵدەکاتە:

هەر کەسێ دەکا هەوری لار

بەینی من و تۆ

لە ماڵی بمرێ هەوری لار

بە هەشت و بە نۆ

ئای دەسماڵ کەتانی

کاری ئەمن و تۆ هەوری لار

پاك دونیا زانی

هەی پاك دونیا زانیـــــی

+ ها دەنگم کوو بوو؟

- بە ڕاستی دەنگت زۆر خۆش بووە..

+ دەتەوێ دەنگت وەك هی من و حەسەن زیرەکی لێبێ؟

- با، بەڵام دەڵێم ناکرێ وەکو هی مامڵێ؟

+ نا، تووڕەت کردم، بەس حەسەن زیرەکمان هەیە.

- باشە، قەینا...

+ بەڵام ئەوەی پێتدەڵێم، بە هەر کەسێکی بڵێی، زناحم لەگەڵ دایکی خۆم کردبێ، یەك دارلاستیقت لێدەدەم لە کەری مەلارۆکم نەدابێت.

مەلارۆك کوڕێك بوو هەمیشە رەوەیێ کەری هەبوو.

- رازیم.

ئەنۆ ئەوها وانەی دەنگخۆشیی فێرە کوڕە کردبوو:

بۆ ماوەی بیست و یەك رۆژ، هەموو سەر لە سبەینانێك، دەچیە ئەو ئاقارە/ دەست بۆ لای گۆڕستانی سەید مارف درێژ دەکات/ دەزانی چ لەگەڵ خۆت دەبەیت؟

توورەگەك مستە جۆیەکی تێدا بێت..

دەزانی چ لەو توورەگە جۆیە دەکەیت؟

سەرتی دەخەیتە ناویەوە.

دەزانی بۆ ماوەی چەند سەرت لەو توورەگەیە دەرناهێنی؟

لە بیرنەکەیت یەك چارەگی رێك.

دەزانی لە ماوەی ئەو چارەگە چ دەڵێی؟

یەك بە دەنگی خۆت گۆرانیی حەسەن زیرەك دەڵێی.

ئەوەشت پێبڵێم هەموو رۆژێ یەك گۆرانیی زیرەك نالێیتەوە.

- تۆش ئەوها دەنگت خۆش بوو؟

+ ئەرێ بە سەری...

- ئەدی کوو بزانم چارەگێك کەمتر یان زیاتر.

+ سێ گۆرانیی بڵێ چارەگێکی تەواوە..

من ئەگەر بە چاوی خۆم کوڕێکم نەدیتبا، لە پەنای کێلێك لە کێلەکانی گۆڕستان وا سەری خستۆتە ناو توورەگەیەکی سپی و هاتو هاوار دەکات، قەت باوەڕم نەدەکرد، کەسێك هەبێت، ئەو رێدانانەی ئەنۆ وەك خۆی جێبەجێبکات.

کلکی مایین و توورەگەی جۆ زۆریان لە سەرشۆرکەکەی گوێزێ

دوورخستمەوە، با بە خۆ و بەتانیە شڕەکەم بگەڕێمەوە زارکی سەرشۆرکێ، شڕە بەتانیەکەم لە خۆم پێچاو کەمێك دوور لە سەرشۆرك لە سەر بەردێك هەلکورمام، لەو کاتە پەلە هەورێك دەتگوت فێریانکردووە، رێك بەری رۆژی لێمگرت، لەگەڵ ئەوەی سوویکی ساردی لەگەڵ خۆی هێنا، بەلام من سوپاسی پەلە هەورم کرد، بە قسە قسەم لەگەلی کرد:

سوپاس، لە کاتی خۆی گەیشتی، تۆش هەر بەتانی بەلام لە ئاسمانەوە..

هەولمدا ئەو پەلە هەورە بکەمە شیعر یان بیخەمە شیعرەوە، دەتگوت هەستی بە نیاز خراپیی من کرد، بە هەلاتن هەلات و لە دەستمچوو، جگەرەیەکم پێچایەوە..

لەو سەر بەردە، ئەگەر وێنەیەکم گیرابا، دوور نیە زۆر کەس بە بینینی بیانگوتبا:

ئای سەگێکی چەند بەستەزمانە، ئەو بەتانیەیان بۆ پێداداوە! ئای سەگ جگەرەش دەکێشێت!

دوای نازانم چەند لە بەتانی هاتمە دەرێ، چوومەوە ناو جلکەکانم، دیتم شەرواڵەکەم کورتبۆتەوە، سەرەتا وام هەستکرد زۆر هەورازم بەستووە، تەماشادەکەم نا، ئاساییە و لە سەر ناوکە، گوتم، نا هەلەم کردووە و شەروالی پێشمەرگەیەکیدیم لەبەر کردووە، نا هی خۆمە، ئای خۆ کورتەك و کراسەکەشم بە بەرم تەنگن، سەیرە، ها! بە پەندچوون ئەوها نەبێت ئەدی چۆنە، جلکەکانمم بە پەند بردبوو، لەوانیشەوە خۆم، کورژبیوونەوە، ببینن وەها لۆچلۆچن، بە هیچ ئوتوویەك چانابنەوە، ئەها پشتێنەکەم هێند باریك بۆتەوە، هەر دەلێی کەژیە، دەلێی کلکی هێسترە، جەمەدانیەکەم هێندەی ملپێچێکی باریکی لێ ماوەتەوە.

بارەگا هاتنە سەیرانی جلکەکانی من، حەفت جارم شووشتن نەبوونەوە جلك، لە بیرمە ئەبوو دلشاد گوتی:

- خۆ نابێت جلك بخرێتە ئاوی زۆر زۆر گەرمەوە، ئاوەکە زۆر گەرم بوو ها؟

+ هەر گەرم، وەك ساوار كوڵاندمن.
خەیام ناوێك گوتی:
-كوڕە بە خودا منیش دەمویست جلكەكانم بكوڵێنم، یانی نابێت.
خەیام ئەو كوڕەی خورشتی جوێتی هەبوو، بێ جوێن هەڵینەدەكرد، حەزی لێبوو هەموو دنیا جوێتبارانی بكەن، زۆر جار ڕێی لە خەڵك گرتووە، ئیزنی نەداوە تا جوێتڕێژی نەكردووە، خۆشیەكەش لەوە بوو، خۆیشی جوێتی بە كەس نەدەدا.
+ باش بوو، جلكەكانی من بوونە بەڵاگێڕی هی تۆ و ئەوانەش دەیانویست وەك من بیانكوڵێنن.
كوڕێك وا بزانم ناوی عەلی بوو بە پێكەنینەوە گوتی:
- دەزانی بەو جلكانەوە لە چی دەچیت؟
+لە ژووژك.
- نا نا، لە سەگێكی تووكن كە نیگرۆ كرابێت.
پێدەچوو عەلی باشی بۆ چووبێت، تا لە بیرم نەچووە با سەرهاتەكە بۆ دایكم بگێڕمەوە، دواتر نازانم چەند دواتر، جارێك بە دڵوداو بۆ دایكم گێڕایەوە، پێكەنینێ گرتی، هەرچیم دەكرد بەرینەدەدا، پێكەنین نەیهێشت بپرسم تۆ چۆنچۆنی جلكەكانت دەكوڵاند، چیدیش نەموێرا سەرهاتی شەرواڵی بۆ بگێڕمەوە ترسام پێكەنین هەناسەی لێببڕێ.
من زۆرم خەفەت لە جلكەكانم خوارد، لە لای من خۆشەویست بوون، بۆنی ژنیان لێدەهات، دوای كوڵانیش هەر بۆنی ژنی بن بەردی نەرمیان لێدەهات، حەیف بۆ ئەو كورتەك و شەرواڵە نازدارە بەو دەردە چوو، گەلەك جوان بوو، بە مەرەزی خۆی نیشاندەدا، لە كەمێك دوورەوە لە چاوان لە رانكوچۆخەی مەرەزی دەچوو، ئەوەی دەیدیت، مگێزی دەچووێ، ئەو كورتەك و شەرواڵە تایبەت بوو، لە هی پێشمەرگان نەدەچوو، نە لە رەنگ نە لە دووریـن، نا دەستی ئەبوو خالید خەیاتی پێنەكەوتبوو، ئەو ئەبوو خالیدەی زۆر جار دەیگوت:

ئەگەر من نابم، بە سەری خۆم نا بە سەری بابم، حزبێك بە ژن و پیاوەوە لەو چیاچۆلە بە قوون رووتی دەگەڕێن.

وا بوو ئەشەدو بیلا وا بوو، قاتی دوو لە سێی پێشمەرگەی سۆران و بادینان بە دەست و مەکینەی وی دروابوو، منیش تەنها ئەو قاتەم بە دەستی رەنگینی ئەبوو خالید نەبڕابوو، قاتەکە لە شارەوە هاتبوو، من بە قاتێکی ئەبوو خالیدەوە لە گارەوە چوومە مەتین، لە مەتینەوە هاتمەوە گارە، لە گارەوە چوومە پێرس لەوێوە بۆ هەورێ، هەر بە قاتە خاکیەکەی ئەبوو خالید نیوەی سۆران و بادینانم کرد، قات هەڵا هەڵا ببوو، لە سەد جێ جێی دوورینەوە دیار بوو، نیوەی دنیای پێبکەیت چۆن هەڵا هەل نابێت، بە ناو درك و دالی دنیادا تێپەڕی، باشە کە بە بەرتەوە گیردەبێت، بەرپرسی بارەگاکەی هەورێ نازانم بۆچی، قاتێکی بۆم نەدەکڕی، تۆ بڵێی چاوی منی نەدیبێ! لەوێ لە هەورێ، کوڕێك لە خۆوە بووە برادەرم، ناوەڵڵا لە خۆوە نەبوو، لە منەوە هەواڵی برایەکی خۆی زانی، دەمێك بوو نەیبینی بوو، چ هەواڵێکیشی لێی نەدەزانی، لە ڕێی منەوە سۆراخێکی چنگ کەوت، ئا براکەی پێشمەرگە بوو لە دەڤەری بادینان، من دەمناسی، دوا جار کە لە جێیەکی گارە دیتم لەمێژ نەبوو، ئێ، ئەو کوڕە کە ناوی دڵنیا بوو، ئێوارەیەك دیاریەکی دامێ، کە لەبیرناچێتەوە، بە منداڵیش لە بەرەبەری جەژنان و لە رۆژی جەژنێش دیاریی وام نەدراوەتێ.

جا من بەو قاتە بە پەندچووە کە بە دەستی خۆم بە پەندم برد، رووم بێ روو لە کوێ بکەم، ئەگەر بانگمیانکردە پەنایێ روو لە کوێ بکەم، رووم نایە بچمە رەشماڵەکەش و لە ژنە بپرسم:

ئەرێ تۆ بۆچی هێندە لە بیابان دەهری؟

حەزم لە ناو رەشماڵانە، رەشماڵێك سەد بارەگا دێنێ، بە من بێت بۆ هەمیشە مێوانی رەشماڵ بم، دیاریە خودایەکان لە رەشماڵەوە، لەوێوە دەکرێنە دیاری، خوداوەندی نیوەشەوی کوێستانان، بمگەڕێنەوە بن بەردەکەی ناو رەشمالان، لە تاریکایی شەو بمگەڕێنەوە، با جارێکیدیش لە

ڕێی هەڵەوە شۆڕە ژنێك بێ و بەرد و دنیا نەرمبکاتەوە، خوداوەندی زگورتیان، ئەگەر پێشمەرگەشت بە نەفرەتکردووە و سوێندت بە خۆت خواردووە ئاوڕیان لێنەدەیتەوە، سوێندت بە بەرد خواردووە، بەرد دڵی بۆ ئاو نەرم بێ، دڵی تۆ بۆ پێشمەرگە نەرم نەبێ، خوداوەندی زگورتیان، بەزەییت بە ژنانی پێشمەرگە بێتەوە، ئەوانەی بێوەژنانە کەلەکان دەگۆڕن و ناکەونە جێ، بەزەییت بەو کچانە بێتەوە کە سوێندیان بە پاکیزەیی خۆیان خواردووە جگە لە پێشمەرگە سەرجێیی لەگەڵ هیچ کوڕێك نەکەن.

من بە یادی دیاریە خوداییەکەی بن بەردی ناو ڕەشماڵەکان، فەرامۆشیم بە هەموو ڕەشماڵێك دەهات، خۆم چۆن بە پەند برد، وا نەبا، ئێستا سەرێکم لە ناو ڕەشماڵان دەدا و دووردەکەوتمەوە لە هەوای ژەهراویی بارەگا، وام هەستدەکرد بارەگا ژەهراوی بووە، ژەهراویەك کیمیاش هەروەها دەشت و دۆڵان ژەهراوی دەکات..

- لەو ڕۆژانە دەچمەوە شار.

+ دەچیەوە یان دەتنێرنەوە؟

- دەمنێرنەوە..

+ بۆچی گوتت دەچمەوە نەتگوت دەمنێرنەوە!

- دەبوو بڵێم دەمنێرنەوە نەك دەچمەوە.

+ بۆچی؟

- چونکێ ناردنەوە سەد قاتی چوونەوە باشترە.

+ من لە کێشەی چوونەوە و ناردنەوە سەد لە سەد پێچەوانەی تۆم.

- کێشەی خۆتە.

+ هەر کەسە و کێشەی خۆی.

- بەڵام وەك من تێبگەم تۆ بە وردی لە کێشەی چوونەوە و ناردنەوە وردنەبوویتیەوە.

+ لەوە پتر لێی وردبمەوە تێکدەئاڵۆزکێن.

- زۆرت ئاڵۆزکرد وا نیە؟

+ ڕەنگە
- دەتەوێت قسەیەك لەجیاوازی نێوان چوونەوە و ناردنەوە بکەم؟
+ بۆ نا!
- چوونەوە واتە دۆڕان، بەزین...
+ ئەدی ناردنەوە؟
- ڕاوەستە، ناردنەوە بێ کەم و زیاد واتە تێکۆشان.
+ دەزانی هەقی شاباشێکت هەیە بە ترڕ.
- دیسان داتەوە قۆڕی.
+ دەزانی تۆ پێشان باشتر بوویت.
- دەزانی پێچەوانەی تۆم؟
+ دەبێت وا بێت.
- مەبەستمە بڵێم پێشان تۆ زۆر لە من مارکسیتر بوویت، بەڵام ئێستا من...
+ ڕەنگە وا بێت.
- بە ڕاستی تۆ وەك ئەلبێر کامۆ بیردەکەیتەوە؟
+ ئەلبێر کامۆ ئەوها بیردەکاتەوە؟ چی ئەوت خوێندۆتەوە؟
- هیچ، بەڵام بۆمیان باس کردووە.
+ بیخوێنەوە ئەوجا قسەی لێبکە.
- تۆ زۆر لە خۆباییانە قسەدەکەیت.
+ ئەلبێر کامۆش وا قسەی دەکرد؟
- ئەرێوەڵڵا ئەوها قسەی دەکرد.
+ئا، شتیت نەخوێندۆتەوە، بەڵام قاوەت لەگەڵی خواردۆتەوە.
- نەتهێشت جیاوازی نێوان چوونەوە و ناردنەوەت بۆ ڕوونبکەمەوە.
+ با ڕوونتکردەوە
- نا، نەتهێشت...
+ دەی

- ناردنەوە واتە حزب بۆ کاری حزبی دەتنێریتەوە و ئەو کارانەی پێتدەسپێرێت زۆر لە پێشمەرگایەتی پیرۆزترن، واتە هەر بە شۆڕشگێری دەمێنیتیەوە، بەڵام چوونەوە چیە؟ دەچیەوە بۆ خۆت خەریکی کار و کاسبیەك دەبی و فرت بە سەر شۆڕششگێڕیەوە نامێنێ.

+ ئەوها!

- بە فشەی تێدەگەیت؟

+ نا

- کاکە دنیا زۆر گۆڕایە زۆر.

+ لە ماوەی مانگێك چ زوو وا زۆر گۆڕا؟

- تۆ ئاگات لە چیە!

+ هەردووکمان لە گێژەلووکەی گوێژێ گێژانە گێژ دەخۆین، بۆچی تۆ ئاگاداری من ئاگادار نیم، رادیۆ حیزەکە نیە، منیش گوێی لێدەگرم.

- لە خۆت هێڕ و هوڕێ.

+ تۆ لە من بە مێشکتری؟

- قسە هەڵناگرێ

+ بەڵام گوو هەڵدەگرێ!

- تۆ قسەت لەگەڵ ناکرێ.

+ باشە دەی بۆم روونبکەوە کە تۆ لە من بە مێشکتری..

- باشە تۆ ئەندامی؟

+ پرسیاری ناوێ، خۆت لە من باشتر دەزانی.

- پرسیارەکەم بۆ ئەوەیە وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە.

+ باشە، ئەندام نیم.

- کە ئەندام نەبوویت چی لە سیاسەتی حزب دەزانیت؟

+ زۆری لێدەزانم.

- تەڕەماشی لێدەزانیت.

+ لە سیاسەتی حزب تەڕەماشیش هەیە؟

- ئەوجا فشە بەویش مەکە.
+ ئێ سیاسەتەکە چیە کە من نایزانم؟
- ئەوجا وەرە جێی من و..
+ جێی تۆ لە هی من باشترە؟
- گوتم قسەت لەگەڵ ناکرێ.
+ کاکە بە گوێی خۆت گوێت لێبوو، باقێ فاریقی هەموو ئەو سیاسەتەی لە کنە تو نهێنیە بە گۆڕێی وەرکرد.
- ترحێو.
+ فسحێو.
- فسحێویش هەیە؟
+ سیاسەت ئەگەر تری هەبێت فسیشی هەیە.
- لەگەڵ تۆ فشەیە.
+ نا، قسە بکە.
- قسەم نەما.
+ بە دڵی خۆت بکە.
- چیت هەیە بە ماڵەوەتانی بڵێم؟
+ ئەگەر بینیتن پێیانبڵێ، کوڕەکەتان ساغە لە گوێزی ساغ ساغترە، پێیانبڵێ دڵ بە لێبووردنە گشتیەکان خۆش مەکەن، کوڕەکەتان نایەتەوە، پێیانبڵێ هەرچیان بەسەرهاتووە و دێ دەزانم لە نێوچەوانی منەوەیە، پێیانبڵێ لە قەندیلەوە تا هەولێر شەرمەزاری ئەوانم، نایەمەوە.
- ئەگەر ئەندام بای، حزبیش گوتبای بڕۆوە نەدەڕۆیشتیەوە! دەزانی تۆ نانێرنەوە.
+ ئەگەر بەو شێوەیە بێت کە تۆ دەیڵێیت، ئەندام نەبوون بۆ من سەربەرزیە، برادەر.
- باشە پێیاندەڵێم کوڕەکەتان بۆتە حەمەدۆك! سەلا لە عەقڵت برادەر.
+ سەلا لە سیاسەت برادەر.

- بەڵام خەمــت نەبێــت، هەرێــت دەدەمــێ کە هەواڵــت بە ماڵەوەتــان بگەیەنم.

+ سوپاس، هێندە بۆ من هەموو شتە لە بیرنەکەیت.

من و ئەو برادەرەی کە نەمویست ناوی بێنم مشتومڕێکی باشمان کـرد، یەك دوو پێشمەرگەیدیش بەشداریان لەو مشتومڕە کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی دوای ئەو هەموو ساڵە کە بە سەر ساڵی مشتومڕدا تێپەڕیوە، قسەکانی خـۆم نەوانیــدیش بە روونــی ناناســمەوە، بـۆیە بەو شــێوەیە دامڕشــتنەوە کە وا دەزانــرێ تەنهــا دوو کەس تێکگیــراون، لەوانەی بەشــداریان لەو مشــتومڕە کرد جگە لە خۆم تەنها ئەو برادەرە دەناسمەوەو ناویم لە بیـرە کە دەمێـك بوو دەمناسی و ماڵی ئێمەشـی پێـدەزانی، دواتـر زۆر داخیشـم لەوە خـوارد کە چ هەواڵێکی منی بە ماڵمان نەگەیاندبوو، گفتی خـۆی نەبـردە سـەرێ، ئەوجا کێ گفتی خۆی بردە سەرێ!

ئێستا خەوخۆش و بۆنخۆش و لەشسووکم، ئێستا لە پێشتر پتر بۆنی ژنی بن بەردم لێدێ، بمزانیبا وایە زووتر زۆر زووتر گەرماوم دەکرد، باشتریش جلکەکانم دەکوڵاند، با جلکەکـانم هەر رووی چـوونە نـاو خەڵکوخوایـان نەبێت، جا بۆ روویان نیە!

بارەگــا چۆڵنەدەبــوو چۆڵنەدەبــوو، ئاشــبەتاڵ ســەری لە بەرد دا، ئەو پێشــمەرگانەی لە شــاریان کــردەوە لە چــاو ئەوانەی لە پــاڵ بەردەکــانی گـوێزێ مـانەوە بە پەنـجەی دەسـت و پـێ دەژمێـردران، لەوێ خەریکبـوو بگەمە ئەو باوەڕەی کە پێشمەرگە لە توخمی بەردە، گێژەلووکەی گوێزێ، گێژەلـووکەیەك بـوو، دەبـوو پێشـمەرگە بە ئاسـمانێ بێخـێ، بەڵام لە بەرد بەردتـر مـانەوە، لە نـاو گێژەلـووکەی ئاشـبەتاڵ بە بەردی مـانەوە، بە دیـار بەردەوە بەردایەتیی خۆیان نیشانی یەکتر دەدا، برسێتی، بێ جلوبەرگی، بـێ هەواڵیـی کەسـوکار، نادیـاریی چـارەنووس، لەقبـوونی نەخسـتە بەردایەتـی پێشمەرگەوە.

لە دەفەری قەنــدیلێ قســەیەك لە ســەر زاران بــوو، دەڵــێن لە زۆر

دەڤەریدیش لە سەر زارانە، بەڵام من بۆ یەکەم جار لە رەشماڵنشینانی قەندیلێ بیستم، هەر لەبەر هەندێ لە کنە من قسەکە قسەیەکی قەندیلیە، رەنگە تۆ وا بزانی قسەیەکی سەفینیە، ئەویش سوێندبخوات، مەتینی یان مامەندەییە:

دوو کەس هەنە لە دنیایێ قەت قەت رێیان لێناگیرێ، لە سەر سەری هەورێ بێ، لە بن بنی رووبارێ بێ، لە بەینی بەفری ئەستوور و عەردی بێ، رێی خۆیان دەکەنەوە، ئەو دوو کەسە یەکیان ناوی پێشمەرگەیە، ناوی ئەویدش قاچاخچی.

هەر کەسێك گومانی لەو قسە قەندیلیە هەیە با هاورێیەتی یەکێك لەو دووە بکات، من لە گوێزێ تێگەیشتم، گیانی گیانبازی لە قاچاخچیدا چی لە پێشمەرگە کەمتر نیە، ئەگەر پتریش نەبێت، بە چاوپۆشین لە ئامانجی گیانبازیەکە، کام تەلبەند و جاشبەند و سەربازبەندی حکومەتان توانی رێ لە هاتوچۆی سوارانی قاچاخچیانی سنووران بگرێ، کە لە تاریکایی شەوان بە ناو چیاوچۆل و هەڵدێران، سەروەریی دەوڵەتانیان دەخستە بن سمی ئەسپ و هێسترەکانیانەوە، پێشمەرگە قەندیلیەکان لە ساڵە ئەنفالیەکان بۆ ماوەیەك لە رێی قاچاخچیە گیانبازەکانەوە خۆراکیان دەگەیشتێ، هەرچیت بویستایە لە ناو باری قاچاخچیان دەستدەکەوت، بە تووتنیشەوە، خارە گوتەنی:

بە بەنزینی شۆڕشیشەوە.

وەختانێك ئەو ناوەی لە تووتن نابوو، پارەت هەبا، هەموو شت هەبوو، ئای پارە! ئەو باقێ فاریقە بەدبەختە بۆچی هێندە ئەنتی پارە بوو! خارە خولە لە سەر کێشی:

ئەگەر دز و خاوەن ماڵ یەك بن گا لە سەر دیوارێ ئاودیودەکەن.

دەیگوت:

ئەگەر قاچاخچی و پێشمەرگە یەك بن حکومەت لە سنوورێ ئاودیودەکەن.

ناوە ناوەش لە دڵەوە گوتە دژە ئاشبەتاڵیەکەی خۆی دەگوتەوە:
تا جگەرە مابێت، پێشمەرگە دەمێنێ.
منیش لەبەر خۆمەوە نزای دووکەڵاویم دەخوێند:
خوداوەندی دووکەڵ، گوێزێ پڕپڕ بکە لە تووتن و پەڕی جگەرە، با جگەرە هەر بمێنێ، کە جگەرە ما، خارە خولەش لێرە دەمێنێ، ئەویش لێرە ما، منیش دەمێنمەوە..
خارە خولە مژی وای لە جگەرە دەدا، کەس نەیدەزانی دووکەڵ دەچێتە کوێ، دیار نەدەما، ئەگەر من یان هەرکەسێك مژی وای لە جگەرە دابا، لە سەر سەران دووکەڵێك بەرزدەبۆوە، کەپریکیش ئاگری گرتبا هەر هێندە دووکەڵەی دەبوو، بەڵام خارە بێ دووکەڵ بوو، دووکەڵ بزر دەبوو، دوای ماوەیەکی باش تەنکە دووکەڵێك کە هەر لە هەڵمی دەم دەچوو، بە شەرمەوە خۆی نیشاندەدا، خارە خولە زۆر بە چێژەوە جگەرەی دەکێشا، بە شێوەیەك ئەوانەی رقی دنیایان لە جگەرە دەبۆوە، حەزی جگەرەیان دەچووە دڵی، جارێك ژنێك گوتبووی:
کەس هێندەی من دوژمنی جگەرە نیە، هەشت جار تۆراوم و چوومەتەوە ماڵە بابان، حەفت جاریان لە سەر جگەرە بوو، دەمویست پیاوەکەم واز لە جگەرە بێنێ، وازی نەهێنا و نەهێنا، دەیگوت: حەفتا جاریش بتۆریی و واز لە تۆ و لە دنیاش بێنم واز لە جگەرە ناهێنم، وازی نەهێنا.. جارێك پێشمەرگەیەك لایدا ماڵمان، هێند بە چێژ جگەرەی دەکێشا، حەزم چووە جگەرە، لەو رۆژەوە منیش بوومە جگەرەکێش و کێشەی من و پیاوەکەم کۆتایی هات و ئیدی نەتۆرام، پێشمەرگەکەش ناوی خارە خولە بوو.
دەمەو عەسرانێك خارە خولەم بە کزی دیت، کز کز زۆر کز کەس نەك هەر خارە خولە کەسی وا بە کزی نەدیبوو، هەر من نا هەموو بارەگا هەستیان بە کزیی خارە خولە کرد، دیتم دەوریان دا، دەوری دووکەڵیان دا، سەیر بوو، جگەرەی بە با دەکرد، دووکەڵی قوتنەدەدا، ئەوە گۆڕانێك

بوو له خاره خوله، گۆڕانێکی له ناکاوی پرسیاراوی، جگەرەی بە جگەرە دادەگیرساند، پرسیان:

- چ بووە؟ بۆچی وا خەفەتباری؟

+...

- قسە بکە چ بووە، چ قەوماوە؟

+...

- دڵمان تەقی قسەیەك بکە

+...

- نابڵێی!

+...

بەرد هاتە قسە، ورتەیەك لە خارە خولە نەهات، هەر جگەرەی دەپێچایەوە و بە بای دەکرد، ناچار لێی دوورکەوتنەوە، وا بزانم رۆژی دواتر بوو، ئەوهایان بۆم گێڕایەوە:

خارە خولەش بانگدەکەنە پەنایێ:

+ حزب پێی باشە کە تۆ خۆت رادەستی حکومەت بکەیتەوە و بچیەوە شار.

- بە حزب بڵێ من ناچمەوە، با خۆی بچێتەوە

+ ئاخر...

خارە گوێی لە ئاخر و ماخر نەگرتبوو.

خارە خولە گاڵتەکانی جارانی نەما، بەڵام بەردەوام گوتە دژە ئاشبەتاڵەکەی خۆی دەگوتەوە:

تا جگەرە مابێت پێشمەرگە دەمێنێ.

دوو ساڵێك دوای ئەوە، خارە لە چیا تۆرا، نەمزانی بۆ، دوازدە ساڵیش دوای ئەوە، خارەم لە بارەگای ئەو حزبە دیتەوە کە پێیگوتبوو:

من ناچمەوە تۆ بچۆوە.

دیتمەوە، کلاشینکۆفێکی لە شان بوو، وا بزانم هەر ئەوەی چیا بوو، لە

جاران جوانتر جگەرەی بە با دەدا، لێیم پرسی:

کەی جگەرە دوایی دێ؟

کەمێك وەستا، جگەرەیەکی دامێ، تەماشایەکی بارەگاکەی کرد و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا:

تا حزب بمێنێ جگەرەش دەمێنێ!

## قەندیل وەرز، وەرز

ئێرەش قەندیلە، جا کوێ قەندیل نیە! گۆتەیەک هەیە:

قەندیل زنجیرەیەکە سەرێکی وا لە سەری دنیا، سەرێکی لە بنی.

رەنگە ئەو گۆتەیە لە زاری منەوە کەوتبێتە سەر چەند زارێ، دوای لە بیرچوونەوە لە زاری ئەوانم بیستبێتەوە، هەر کەسێ لە سالانی شووم بە چاوێك، ئاشنا بە چاوی من وەرزەکانی قەندیلی دیبێ، هەر کەسێ لە وەرزەکانی ئەنفال بە پێ و پێلاوی وەك منەوە هەورازە ئاسمانی و نشێوە لە ئاسمان بەربۆوەکانی قەندیلی کردبێ، ئەگەر بەزۆری زۆردارەکیش بێ، باوەڕ بەو زنجیرە بێ سەر و بنەی قەندیل دێنێ.

هیچ رێیەك هێندەی رێیە قەندیلیەکان ئارەقەیان پێنەڕشتم، هیچ چیایەك وەك قەندیل بە هەڵدان هەڵێنەداومەتە ئاسمان و لە ئاسمانیشەوە بە فڕێدان فڕێنەداومەتەوە زەوی، چیاکان جیان، چیاکان جیان، زۆر جیان لە قەندیل، لە خۆوە وا ناڵێم، لە قەرەچووغەوە پێدا هاتم، زۆر لەو سەفینە لە بن بۆردومان و بۆ پەلاماردان و هەڵاتن مامەوە کە سێبەرەکەی بە سەر ماڵە دیانان دەڕوانێ، لە هەموو کانیەکانی (هەورێ)ش لە ترسی کیمیا جەمەدانیەکەم تەڕکردووە و خۆم لە پەنای هەموو گابەردەکانی شاردۆتەوە، زۆر جاریش لە پێرس و کۆرس رێم بزرکردووە و بە چ حاڵ بە دنیا کەوتوومەتەوە و کۆپتەریش راوی ناوم، لە شیرینیش جارێك کەوتمە بۆسەی جاشان و لە ئاسك سووکتر هەڵاتم، ئەدی (گارە)! دیدڤان بووم بە سەر سووتانی هەموو بنە داربەڕوو و جەفتەکانیەوە، لەوێ بووم بە دیاریەوە، بە دیار سووتانی چوار

وەرزەی گارەوە، لە گارەوە بپەڕەوە مەتین، ئەو چیایەی وەختانێك تۆپی دنیا رووی لەویێ بوو، بەڵام هەر هێمن مایەوە، تاکە چیایە، بۆ هەمیشە هێمن بێ، کێ لەو هێمنیەی مەتین تێدەگات، تا بە پێڵاوی دڕاوەوە سێ شەو و رۆژە رێ بە سپیاتیی مەتین هەڵنەگەڕام و دانەگەڕام، تا لە زستانی مەتین لە بەفر کپتر نەنووستم، هێندەی کلووە بەفرێك لە ئارامیی مەتین تێنەگەیشتم، لە مەتین مەوەستە هەر بەفر و بەفر و بە بەرگی سپیەوە بڕۆ بڕۆ، تا حەفت پێڵاو دەدڕێتی چیا و چیا هەڵکشێ و داکشێ، بەڵام سەختیی هیچ لەو چیایانەی هەڵیاندەدام و دەیانگرتمەوە، سەختیی خۆیان سەد قات سەختریش بکەنەوە، لە سەختی ناگەنە قەندیل، بە قسەی حەسەن بێت – پیاوێکی بەژن بڵندی پڕدەری بوو- من تازە بوومەتە پێشمەرگە و زۆر پێشمەرگەیدیش ئەگەر حەفت ساڵیش بە سەر پێشمەرگایەتیان تێپەڕیبێ، هێشتا نەبوونەتە پێشمەرگە، دەزانن پیاوی بەژن بڵندی پڕدەری چی دەگوت:

هەر پێشمەرگەیەك با یەکەم تەقەی ئەیلوولیش ئەو کردبێتی و تا ئێستاش هەر پێشمەرگە بێ، ئەگەر رێی بە زستانی قەندیل نەکەوتبێ، پێشمەرگەی تەواو نیە، با هەر بە خۆی بڵێ پێشمەرگە.

یەکێك لە پیاوی بەژن بڵندی پڕدەری دەپرسێ:

مەرجە هەر رێی زستانە بێت، خاترمان بگرە با رێی قەندیل بە هەموو وەرزەکانیەوە...

پیاوی بەژن بڵندی پڕدەری دەڵێ:

بۆ ئەوەیە کە بە شان بەفر بشکێنی، بە خاترانەوە با وەرزی بەهاریشی لەگەڵ بێ، کوڕە، دەی هەر رێی بە قەندیل کەوتبێ، پایز و هاوینیش.

من لە زۆر لاوە و زۆر جێگەی قەندیلم دیوە، هەر لە گۆماوە شەختەییەکەی سەری سەرەوە کە ئاوێنەیەکی ناوازەیە، ئاوێنەیەك سەد سوێند دەخۆی خوداوەندی جوانی تایبەت بۆ مانگی راگرتووە، تا لە مانگەشەویە قەندیلیەکان تریفەی خۆی تێدا ببینێ، هەر مانگ نا ئەو

ئاوێنە تریفەییە پڕپڕە لە ئەستێرە، بڕۆ هەرچی جوانیی ئاسمان هەیە لەو گۆماوی جوانیە بیچنەوە، ئەگەر بە چاوی خۆم نەمدیبا، لە ڕێی وێنەی زیندووشەوە قەت باوەڕم نەدەکرد، ئەو بەرزاییەی ئاسمان دەریاچەیەك کە بچووككراوەی جوانیەکانی هەرچی دەریاچەی دنیایە. لە باوەشی خۆی گرتبێ، ئەو جێیەی دەیڵێم لە چلەی هاوینێ، کۆچەریەکی پشت گۆچانیی برۆ بەفری دەیگوت:

ئێرە، بێکۆدیان ساردترین جێگەی دنیایە، ئەوە هەر قسەی من نا، هی باپیریشمە، باپیرم لێرەوە تا کێوەکانی قاف لە هاوینی هەموو چیاکان ڕەشماڵی هەڵداوە.

بە کۆچەریەکەم گوت:

هاوینەکەی وەها سارد بێت، داخوا زستانەکەی چۆنە!

وەڵامی کۆچەریەکە ئەوهابوو:

+ دەبێت لە مردووان بپرسین.

- مردوو!

+ ئا، مردوو.

- ج تێناگەم.

+ زستانی ئێرە! عیزرائیلیش نازانێت چۆنە، چوونکێ هەر کەسێ لە زستانێ ڕێی بێرە کەوتبێ، عیزرائیلیش بە سەری ڕانەگەیشتووە.

خەریکە بە دیار دەریاچە ئاوێنەییەکەی سەری قەندیلێ دانیشم و خۆم و ئێرە لەبیربکەم، ڕەنگە ویستبێتم بڵێم هەر ئێرە نا لە زۆر جێگەی قەندیلێ سەرهاتم هەیە، هەقایەتم هەیە، گەلێك دیمەنی قەندیلم بە ڕەنگاوڕەنگی لە چاوم پاراستووە، لە سەر زۆر لە لووتکە هەورگرەکانی قەندیل تەقەم لە عەرد و ئاسمان کردووە، ترساوم، هەڵاتووم، پاڵکەوتووم، چاوم گەرمکردووە، خەونم دیتووە.

ئێستا لەو سەرەی قەندیلم، دوو دوند شانیان بە شانی یەك داوە، چەکوچ و سادریان ناوە، دەمێکە پێشمەرگە لێیان داکوتاوە، داکوتانێك

هەرچی تۆپی بەغدا هەیە، رووی لەو دوو دوندەیە، پێشمەرگە هەڵناقەنێ و هەڵناقەنێ، با جارێ گوێی خۆمان لە ئاست تۆپەکان کەڕبکەین، خۆ لە شەڕەکانیش دوور بێخمەوە، وا نەکەم ناتوانم لە هەر وەرزێ لە وەرزەکانی قەندیل ئەو وێنانەی لە چاومن نیشانبدەمەوە و ئەو سەرهاتانەی لە سەرمن بگێڕمەوە:

**بارەگای ئاسمانی**

جێی بارەگا جێیەکە پێناچێ لە هیچ لایەکی قەڵەمڕەوی ئەنفالەوە تۆپ بیگرێتەوە، نا هیچ جۆرە تۆپێکی بەغدا کە قەندیل بە هەموویان ئاشنایە، بارەگای ئێمە ناگرێتەوە، ئەوە نالێم پێشمەرگەیەکی خایەن یان قاچاخچییەکی خواگیر خۆی لە تۆپەکە بپێچێ و بێ و بمانبینێتەوە! بارەگا دوو ژووری لە ناو یەك و بێراییەك، لەو لاوەش ناندینێك، رەنگە جێی بیست پێشمەرگەیەك بکەنەوە، دیوارەکانی من دەڵێم باڵێك تۆ بڵێ دوو باڵ پانن، پژدەریەك دەیگوت:

نەك مووشەکی حوسێن هی عەلیش نایبڕێت.

بانەکەشی من دەڵێم چۆکێك، تۆ بێ دوودڵی بڵێ دوو چۆك خۆڵی لە سەرە، گەرمیانیەك دەیگوت:

کۆپتەر لە بانی بنیشێ قلیش نابا.

ژوورەکان نەوی بوون، بەژنت چەندێ کورت با، دەبوو لە راست کاریتە ئەستوورەکان سەری بەرزت نەوی بکەیت، عەرەبێکی بەسراوی کە لە بەژن لە دارخورمات جیا نەدەکردەوە، ناویم لە یاد نیە، جارێك خراپ سەری لە کاریتە دا، لە هەموو جارێك خراپتر هەڵچوو، چەند جوێنێکی زۆر مزری بۆ عەرد و ئاسمان نارد، دوای هێور بوونەوە گوتی:

پێشتر بە باڵابەرزیی خۆم زۆر سەر بەرزبووم، بەڵام ئەو ژوورە هێند کووڕی کردمەوە، لە دڵەوە خۆزگە دەخوازم کە شەموولە بام.

کەمێك دوور هۆدەکان ناندینێك هەبوو، دیواری ناندین کەمێك بڵندترە لە هۆدەکان، بارەگا هێندە دوور نیە لەو رێیەی کە لەو دەڤەرە تاقە رێی

کۆچەریان و قاچاخچیانە، لە بارەگاوە بە دووربین ئاقاری قەڵادزێ جوان دیار بوو، قاچاخچیەك دەیگوت:

قەڵادزێ، نازانم دارتێل بەڵام دیوار، یەك لا دیواریشی بە پێوە نەماوە.

لە بارەگاوە کێوەڕەش و هەموو ئەو کێوانە دیار بوون کە دەکەوتنە دوورایی بینینەوە، لە بارەگاوە کوێ دیار نەبوو! دەزانن چەند لە ئاسمان نزیك کەوتبووینەوە! یەك دوند هەبوو لە ئێمەش لە ئاسمان نزیکتر بوو، هێندە لێمان دوور نەبوو، هەر ئەو دوندە بەرزەش لە بینینی ئەولایەی قەندیلی کردبووین، ئەو دوندەی دەڵێم رەنگە لە دوندە هەرە بەرزەکانی قەندیل بێ، مام جوامێرێکی جوامێر هەبوو، جارێك گوتی:

ئەها ئەو دوندە دەبینن چۆن رووەو ئاسمان هەڵکشاوە، ئەو دوندە بڵندترین دوندی قەندیلە.

لە چاوی مام جوامێرەوە ئەو دوندەی بەرانبەرمان بڵندترین دوندی قەندیل بوو، بەڵام دوور نیە بڵندترین دوندی دنیاش بێت، لە دیدی منەوە جگە لەو دوندەی بەرانبەرمان چ دوندێك هێندەی ئەو دوندە بڵند نیە کە بارەگای ئێمە دەڵێی هێلانەی پەڕەسێلکەیە پێیەوە هەڵواسراوە، هەر بە راستیش هەموو کات نا، هەندێ کات هەستمدەکرد ئێمە پۆلێ پەڕەسێلکەی بەستەزمانین.

لەو دوندەی پەنای ئێمەی دابوو، لە تۆپی ئەنفالی پاراستبووین، رۆژ زوو هەڵدەهات، هێشتا هیچ جێیەکی دنیا تالە گزنگێکی نەگەیشتبووێ، بارەگای ئێمە بەر هەتاو کەوتبوو، لە ئاوابوونی رۆژیش وا بوو، دنیا هەموو دنیا لە بولێڵ بوو، لە بارەگای ئێمە هێشتا چەند تالە زەردەپەڕێ دەستبەرداری بارەگا نەدەبوون، ئەدی مانگ! خەریکبوو لە سەر بانی بارەگا بنیشێتەوە، شەوێك لەو شەوانەی مانگ لە سەر نیشتنەوە بوو، بە کوڕە باڵا دارخورماییە بەسراییەکەم گوت:

+ خۆزی دار خورمایەك لێرە با.

- تا وەك داربەڕوو گڕی تێبەردەی؟

+ نا.

- ئەدی؟

+ بۆ ئەوەی تۆ پێیدا هەڵبگەڕێی.

- تا خورمات بۆ لێبکەمەوە.

+ نا، تا مانگم بۆ دابگری.

- مانگ!

+ نابینی چەند نەوییە؟

- شاعیرانە قسەدەکەیت.

+......

- وای دانێ مانگم بۆت هێنا.

ئەی با! لە هیچ جێگەیێ، لە هیچ دەریایێ بایێ نیە هەڵیکردبێ و جیرەیەکی لە دەرگا تەنەکە لە نایلۆن گیراوەکەی ژوورەکەی بارەگا نەهێنابێ، کوڕە شارەزووریەك کە پێدەچوو خزمایەتیەکی لەگەڵ نالی هەبێ، لە ساتی نۆبەتداری ئەوهای تێهەڵدەکردە گۆرانی:

**قوربانی پرووشەی ڕێتم**

**ئەی شنەبای قەندیلێ**

**وەی پەیکی شارەزا بە هەموو چیاو دەریای دنیایێ**

---

حەزم لێیە بڵێم ئەو کوڕە شارەزووریە لە منەوە فێر بوو دەسکاری شیعری نالی بکات، یان بڵێین بیشێوێنێ، بەڵام من لە کێ فێری ئەو بەزمە بووم، نایەتەوە بیرم، لە بیرمە کاتی خۆی یەخەی شیعرێکی نالیم گرتبوو، بەرمنەدەداو بەرمنەدەدا، تا ئەوهام بەسەر نەهێنا وازم لێنەهێنا:

**پێمدەلێن:**

**حەبیبە لاڵەپتە و**

**ئاوازەی وشە تێکـــــــــدەدا**

**لاڵەپتە!**

**یا تەلی نازی**

**نەختێ توند لێکـــــــــدەدا.**

ئەو نـالی شـێواندنە یـان خـۆم گـوتەنی نـالی جـوانکردنە، سـەرهاتێکی ناسـکی هەیە، رەنـگە خـۆی بخـاتە رۆمـانێکەوە، بـۆیە حەز لە گێـڕانەوەی ناکەم، هێندە نەبێ، لە کۆلێژ بۆ کچێك لێدرابووم، کەمێك زمانی دەگرت، جارێك لە سەر تەختەڕەشەکە بە خەتێکی گەورە نووسیمەوە و لە بـنەوەش نووسیم (نالی هەولێری)

بەفر بەفر، بەفـر بـۆ نـاڵێی! بەفـر لە پـاش قەنـدیل حەرامە، پیـاوی بەژن بڵندی پژدەری دەیگوت:

هێشتا هەوری بەفری لە ئاسـمانێ خـۆی رێکنەخـستووە بـۆ بـارینێ، لە سەر ئێرە رێك ئەو شوێنەی وا لێی راوەستاوین، پرووشەی دەکات.

نـــازانم پیـــاوی بەژن بڵنـــدی پـــژدەری چەنـــدی پێوەنـــا بـــوو، بەڵام قاچاخچیەکی ویسکی و تریاك، بە دەم نیوە مەستیەوە دەیگوت:

+ خودای بەخشندە سێ دیـاریی جـوانی بە مـرۆڤ بەخشـیوە و بـۆی دابەزاندووە، دەبێت زۆر رێزیان لێبگرین.

- چی و چی؟

+ ویسکی، تریاك، بەفر.

- بە چی دیارە ئەو دیاریانە لە خوداوە دابەزیون؟

قاچاخچی فرێکی جوانتری لە ویسکی دا و مەستانەتر هاتە گۆ:

+ شوێنی دابەزینی دیاریەکانیش پێدەزانم، دەی لێم بپرسن.

- ویسکی لە کوێ دابەزی؟

+ یەکەم پێکی ویسکی هەڵدرا لە مەیخانەیەکی کەرکووکێ بوو.

- چۆن دەزانی؟

+ خۆم پێکەکەم هەڵدا!

- ئێ، تریاك لە کوێ دابەزی؟

+ یەکەم مژی تریاك لە کۆڵانێکی کرمانشا.

- خۆت...

+ نا، برادەرێکم مژی یەکەمی لێدا، حەیف پێش چەند مانگێك لەو خوارە، لوغمێك لە بن پێی تەقیەوە، هەر پارچەیەکی چووە ئاسمانێك.

- بەفرەکە؟

+ یەکەم کلوو بەفریش کە خودا هەناردی ئەلێرە کەوت، ئەو جێگەیەی کە من و تۆ لێی وەستاوین.

- بەفرەکە کێ دیتی؟

+ ئەوەتا، خۆت...

ئیشم بەو قاچاخچیە ماوە، ئەگەر لەبیرنەکەم دەچمە سەر رێی.

بارەگا گیرۆدەی گرفتێکە چ چارەی نیە، ئاو گرفتێکی گەورەیە، بەڵام کاری لە ئاوەدانیش نەکردووە، خوداوەندی کانی و ئاو، وێدەچێ لەبیری کردبێت کە زاری کانیەك لەو ئاقارە بکاتەوە، بۆ ئاو دەبوو بە لێژاییەکی لێوڕێژ لە تیشە بەردی تیژ تیژ لێژ ببینەوە و هەوراز بینەوە، لەوێ لەو دوورە کانیەك هەبوو، لە چلەی هاوینێش باوەشێ ئاوی هەبوو، لەو کانیەوە بە هێستر و تێرکە، نا وازیان لە تێرکە هێنابوو، جلیکان هەبوو، ئاومان دەکێشا و بارەگامان ئاودەدا، باش بوو رێی کانیش دوور بوو لە چاوی ئەنفال، من هەموو وەرزەکانی ئەو بارەگایەم دیوە، بەڵام بە درێژایی وەرزەکان نا، لە هەر وەرزەی چارەگە وەرزێ، پتر کەمتر.

گرفتێکیتری بارەگا دارە، ئەو بارەگایەی پێویستی بە لێرەوارێك دار هەبوو، چ داری نەبوو، دارای ناو (خوێندنەوەی ...)یش چاوی تیژی بەو سەر و ئەو سەری بارەگادا گێڕابا، دوو دار نا دارێکیشی نەدەدی، ئێرە هێ لەوەی بە سرووشتی خۆی داروباری کەمە، چونکە لە کوێستانیش کوێستانترە، سەهۆڵبەندانیکە بۆ خۆی، خۆ ئەگەر هەمووی دارستانیش بێت، دارستانی بۆڕ، بە چەند زستانێك وەك بەری دەستی لێدێ، مەگەر نەتاندیتووە، تەوری پێشمەرگە چۆن دەکەوێتە وێزەی درەخت، چ هێرەیەک بە درەخت دەکات! سۆبەی بارەگا هاوینەکەی نالێم، دەنا لە

هەمــوو وەرزەکــان داگیرســاوە و بە قەد حەفتــا کــوورە لە لــوولەکەیەوە دووکەڵی ناردووەتە ئاسمانێ.

ئەو بارەگــایە ئاســمانیە لەوەتەی پێشــمەرگە هەیە، هەر ئــاوەدانە و چۆڵنەبووە، جارێك نەبێ، ئەو بارەگا ئاسمانیە لەوەتەی پێشمەرگەی تێدایە، تۆپی بۆ دێ، تەقەی لە سەرە، جاش و سەرباز چاویان بڕیوەتێ.

ئەگەر کەســێ ویســتی بــۆ کــارێکی پێویســت، بە نیــازێکی پــاك نەك سووسەکردن و شتی وا، سەردانی بارەگا دوندیەکە بدات، با سـەردانەکەی بخاتە هاوینان، سەرەتای پایزان و دوا ڕۆژەکانی بەهارانیش خراپ نیە، من دەڵێم لە گوێڕێوە بۆی بچێت باشە، هەورازێکـی سـەختی دێتە پێشــێ، کە ئەوی بڕی، نشێوێکی تووش نشێوی دەکـاتەوە، هەورازەیەکـی سـەختری دێتە پێشێ، دوای حەفت هەشت پشووێك دەگاتێ.

ڕێیەکیــدی لە لای دونـــدی جاسووســـانەوەیە، بە دۆڵە کـــۆگەدا تێــدەپەڕێ، بەڵام ئەو ڕێــیە کەم کەس هەیە بــوێرێ خــۆی لێــدا، مەگەر قاچــاخچی و پێشـــمەرگە، ڕێــگەی ســێیەم لە بـــن ئەو دونـــدەوە دێ کە بڵنــدترین دونـدی دنیـایە، ڕێـی چـوارەم و پێـنجەم و..لە ئاقـاری جـاش و سەربازانەوەیە، ئەها لەو دۆڵەقووڵ و هەڵدێرانەوە دێ، کەمێکیدی هەڵکشێم ڕەزگەی رووخاو دێتە ناو دووربینەوە، لە بیرتـان بێـت، لە هەمـوو ئاقـاری ئەنفال لەو سەری تا ئەو سەری بە پانی و درێژی تەنها دوو دوند بارەگای دژە ئەنفالیان پێوە ماوە، ئەوانیش ئەو دوو دوندەن.

دوای ئەو هەموو ساڵە شیرن و تاڵە، زۆر وێتە لە وەرزەکانی قەندیلم بە ڕەنگ و دەنـگەوە لە خەیـاڵە، نـازانم لە کـام وەرزیەوە خـۆم بگەیەنـمەوە بارەگـا، لە زسـتان تووشـتر و سـپیتر، لە بەهـار تەڕتـر و کەسـکتر، لە پـایز ڕەنگ زەردتر و بە بۆڵەبۆڵتر، لە هاوینیش هەتاویتر، بەڵام تاوی بێ تین.

## ئێشکگری

ئێشکگری وەرزی نیە وەك چۆن لە زۆر جێگەی قەندیلێ، دیوی نسێ، ناپرسێ چ وەرزی ساڵە، هەمیشە بەفر هەیە، ئێشکگریش ئەوهایە لە پێشمەرگە نابێتەوە، نە شەو نە ڕۆژ چوار وەرزەی ساڵ ئێشکگری لەو بارەگایە نابێتەوە، زۆر کات بارەگا بە یەك ئێشکگر دڵی ئاو ناخواتەوە، لە شەوان دوو ئێشکگر بە دەوری خۆیدا بە ماتە مات دەخولێنێتەوە، شەوی وا هەیە لە دووش پتری دەوێ، بۆیە قەت ئۆخەی بێ ئێشکگریم هەڵنەکێشاوە، نەبووە بڵێم ئۆخەی، ئەوشەو لە تێری و بە ئارامی دەخەوم، کێ هەیە خۆشی لە ئێشکگری بێ، نەخاسمە لە وەرزی سەرماوسۆلە، تایبەتریش ئەگەر ئێشکگریەکە کەوتە درەنگانی شەو یان ساتە ناسکەکانی شەو.

سەرهاتی ساتەکانی ئێشکگری زۆرن، هێند زۆر نە من کاتم هەیە بۆ گێڕانەوە و نە کەسیش بۆ گوێگرتن، زۆرن زۆر، لە شەوە سایەقە و سامالیەکان لە چاومدا چەند جار مانگ هەڵهاتووە و ئاوابووە، چەند گزنگ هاتووە و چەند زەردەپەڕ ڕۆیشتووە، لە ڕۆژە پایزیەکان چەند پەلە هەوری لە دەست با هەڵاتوو لە بای غارێ سێبەریان بە سەر بارەگا دوندیەکەدا جێهێشتووە، لە بەفرانبار و ڕێبەندانێ چەند زریانی قەندیلی هەڵیکردووە، چەند پێشمەرگە و قاچاخچی ڕێیان بە وەرزەکانی قەندیل کەوتووە، چەند گورگ و تۆپەکانی ئەنفال لە نزیك و دوورەوە لوورەیان هاتووە، چەند جار بۆ ئێشکگری لەخەوی قووڵ وخەونی شیرنیان کردووم، هێندە سەرهاتی ساتەکانی ئێشکگریم لە سەردایە.

لێرە تەنها چوار سەرە سەرهات لەو کتێبەی ئەگەر نهێنی شەو هەڵنەهێنێ ڕەنگە بە ناوی ((هەزارو یەك سەرهاتی ساتەکانی ئێشکگری)) خۆی ناودێربکات، دەگێڕمەوە، ئێستا هەر سەرهاتەی لە وەرزێکەوە:

سەرهاتێ لە زستانەوە/

تاریك دانەهاتبوو، بەفر دایكرد، بەفر رێی لە هاتنی تاریكی گرت، بەفر باری و باری، هەتا چوومە باوەشی خەویش شەو هەر سپی بوو، رووناك رووناك، نۆرەی منیش هات، تاریكی هەر دانەهات، تاریكی رووی هاتنە بەر بەفری نیە، لەو شەوە بەفراویە نۆبەتداری كەوتبووە ئەو ساتانەی شەو بڕواناكەم گورگیش بێدار بێ، بەفر چۆكێ كەوتبوو، لێنەدەكردەوە، هەتا سبەی ئەوها بیارێ، دەیگەیەنێتە بن ناوك، نۆبەتدارەكەی پێش من گوتی:

لەمێژنیە بەفری بانەكەم ماڵیوە، پێش تەوابوونت بیماڵەوە.

هەڵدەلەرزیم، وەك كیری سەگ هەڵدەلەرزیم، چەندی هەڵبەز و دابەزم دەكرد، بەلاش بوو، خۆم لە بن بێراییەكە رانەگرت، سەرما رۆچووبووە ناو یەكە یەكەی ئێسكەكانی لەشمەوە، بەفرم شكاند و چوومە نانەدینەكە، ئاگردان پۆلووی تێدا مابوو، دیاربوو ئەوانەی پێش من نەیانهێنشتبوو بكوژێتەوە، منیش ئاگردانم ئاگرداوە، ئاگرێكی گەورە نا، خەریكبوو بچمە ناویەوە، لە شەوە بەفراویەكانیش ئاگر بە كێش كێشی ناو خەوت دەكات، من وا بووم.

**لە گەرمان خەوم لێنەدەكەوت، جلكم لە بەر خۆم داكەند، تەنها دەرپێ قوتەم لە پێ مابوو، كەلكی نەبوو، شەوەكەی زۆر گەرم بوو، چۆڕچۆڕ ئارەقەم دەردەدا، هەستام لە سەر بان هاتمە خوارێ، چوومە لای سەهۆڵانەكە، جامە بووزێكم دەرهێنا، چوومەوە سەر جێگاكەم، هەر هێندەم دیت بابم لە سەر سەرمە:**

**+ بە تەمای چی بكەیت؟**

**- دەمەوێ بووز بە لەشی خۆم دابێنم.**

**+ كاری وا نەكەیت، سەرمات دەبێت.**

**- سەرمای چی من سووتام.**

**جامە بووزەكەم بۆ سەر سینگم هێنا، لە هێكرا بابم پڕی دایە جامەكە،**

یەك بە دەنگی خۆیشی هاواری کرد...

هێندەم لە خۆم هەڵدا، وەختبوو دەماودەم بکەومە ئاگردانەکەوە، چ ببینم باشە، لچکی ساقۆیەکەم ئاگری گرتبوو، باش بوو نەشێوام، غارمدایە ناو بەفرەکە و ساقۆ کوژایەوە، نزیکەی بستێك چوارگۆشە لە ساقۆیەکەم کردە قوربانیی چەند خولەکێ خەو، بەڵام خەمم لێی نەخوارد، چونکە بابمم دیتەوە کە دەمێك بوو نەمدیتبوو.

+ ئەو ساقۆیەت بۆ سووتاوە؟

- دارم دەخستە سۆبەوە دارێك لچکی ساقۆکەمی راکێشایە ناو سۆبەکەوە

+ دەبێت ئاگامان لە خۆمان بێت، دار لە جیاتی خۆی نەمانخاتە ناو سۆبەوە!

- دەڵێی باوەڕ ناکەن؟

چەندی پرسیان، ئێستا و ئێستا هۆی سووتانەکەم ئاشکرا نەکرد.

سەرهاتێ لە بەهارەوە/

شەوێکە شەڕ کەوتۆتە ئاسمانێ، گرم و هۆڕ و برووسك هاویشتنێکە، دەڵێی هەرچی مردوو هەیە خودا لە ئاسمانێ زیندووی کردوونەتەوە و بە شیر و تیر بە ناو یەکتر وەربوونە، بارانێکە ئەگەر بارانی وا لە دەشتایی بیارێ، ئاوەدانیەك بە پێوە نامێنێ، گوند و شاران نغرۆ دەبن، چ بارانێکە خودایە، ئەو هەورە لە چ دەریایەکەوە پەیدا بووە، چ بایەك بۆ قەندیلی هێناوە، ئەو شەو دەریاکان بە سەر قەندیلدا قلپ بوونەتەو. چ باوبۆرانێك بوو خودایە، بەر بێراییەکە کەڵکی راوەستانی نەبوو، باران بایەکی هێند توندی لەگەڵ بوو، سەری بە هەموو کەلێنێکدا دەکرد، دیواری دەبڕی، من پشتم بە دیوارەوە نووساندبوو، ناوە ناوەش دەچوومە ژوورەوە و خۆم دەدایە سۆبەکە کە نێڵەنێڵی بوو، فانۆسەکەش کە بە دیوارەوە هەڵواسرابوو، پرتەپرتی بوو، رووی ئەو پێشمەرگانەیکە نزیك فانۆسەکە بوون و رووی

خۆیان دانەپۆشیبوو، لە بەر فانۆس دیمەنێکی سەرنجڕاکێشیان نیشاندەدا، بە تایبەتی رووی ئەو پێشمەرگەیەی کە لە کاتی ئاسایی لە سیما زۆر لە نازم غەزالی دەکرد، وا بزانم خزمیشی دەبۆوە، لە دەنگیش دەمەلاسکەی وی دەکردەوە، ئەو خزمەی غەزالی هەموو گۆرانیەکانی وی لەبەر بوو، زۆر جار لە سەر داوای من تێیهەڵدەکردە:

گولی یا حلو مێن ئەڵلا جابەك

خەزەن جەرح گەلبی مین عەزابەك..

گولی...

کاتی ئێشکگریم لە تەواو بووندا بوو، لە خزمەکەی نازم غەزالی نزیك بوومەوە، چوومە سەر سەری، لە سەر چیچکانم، هەستمکرد سەر و سیمای لە جوولەیەکی سەیردایە، لێویشی دەجوولا، دەنگێکی وەك مرەی پشیلەشی لێوە دەهات، تێگەیشتم خەون دەبینێ، بەڵام لەوە نەگەیشتم خەونی خۆشە یان ناخۆش، بەڵام لەو گرموهۆڕە لەو وێرانبوونەی دنیا، بە دیار رووناکیی ترسناکی فانۆس، رێتێدەچێت کەسێك خەونی خۆش ببینێت! لەگەڵ ئەوەش دڵم نەهات بە ئاگای بێنمەوە، بە نیازی هەستانەوە دەستەکانم خستنە سەر چۆکم، نازانم جوولەم کرد یان نا، لە هیکرا پەلاماری دام و دەنگێکی لێوە هات، دەنگی شێر بوو، دەنگی شێر ئەوهایە جارێك لە باخچەی ئاژەڵان شێرێك لە بن گوێم نەڕاندی، رێك ئەو دەنگەی هەبوو، نازانم چیم بەسەر هات، رەنگە منیش وەك وی هاوارم کردبێت، ئەوەی لەبیرمە هەردوو دەستم لە ناو دەستی خزمەکەی نازم غەزالیە، ئەو کوڕەی لە خەوێ دەنگی پشیلەی هەبوو، لە پەلاماردانیش دەنگی شێر، ئەوەشم لە بیرە چەند پێشمەرگەیەك غاریان داینێ:

+ چ بووە، بۆ شەڕ دەکەن؟

-...

من حەپەسابووم و ئەویش هەر رایدەتەکاندم و مرە مری بوو.

+ چیە بۆ وا دەکەن؟

باش بوو زمانم بۆوە:

- نازانم، دەڵێی شێت بووە.

بە کوردیەك کە فانۆسەکەش ئەوها پرتەپرتی دەکرد:

- عەفو کەم، دیت، خەون، هات...

+ چ نیە، چ نیە، ئاو بخۆوە.

حەزمدەکرد بزانم چ خەونێکی دیتـووە، نەیـدەگێڕایەوە، وابـزانم ڕۆژی دواتر بوو، بە نیازی گێڕانەوەی خەون سەری خستە بن گوێم:

- لە کۆڵانمـان کچێـك هەبـوو، هـیچ کـوڕێکی گەڕەك نەبـوو مـاچی نەکردبێ، چۆن کەسێك نان دەکاتە خێر، هیچ ماڵێك پازنـادا، ئەو کـچەش ئەوها بوو، جگە لە من هەر کوڕێ لە پەنایان پێیگەیشتبا، بێ مـاچ بە ڕێـی نەکردووە.

+ بۆچی ماچی نەدەدایە تۆ؟

- بابم و بابی سووکە دوژمنایەتیەکی کۆنیان هەبوو.

+ لە سەر ئەوە ماچی نەدەدایتێ؟

- ئەو دەیدا، من نەمدەوێرا ماچی بکەم

+ بۆچی؟

- بابم سوێندی لێمان خواردبوو، کە هیچ کـام لە ئێمە نابێـت لەو مـاڵە نزیك ببینەوە، هەر نزیکبوونەوەیەك واتە بە کوشتن کوشتن، بـابم گاڵتەشـی نەدەزانی.

- خەونەکە لە بیرمەکە.

+ لێـرەوە دەسـتپێدەکات، ڕۆژێـك ماڵمـان چۆلبـوو، دیـتم کـچەی مـاچبەخش هـات، هەر لە دەرگـاوە خـۆی ڕووتکـردەوە، منیش نەك هەر بابم، دنیا و قیامەتیشم لەبیرکرد، نەمکردە نامەردی غارمدایێ و گەوزانـدم، لەپڕدا بـابم بە دەمـانچەوە هـاتە سـەر سـەرمان و ڕووی دەمـانچەی لە مـن کرد، من هەر هێندەم بۆ کرا پەلاماری چۆکی بدەم.

- دەتویست تۆڵەی بابت لە من بکەیتەوە!

+ هەهەهاها

**سەرهاتێ لە هاوینەوە/**

چلەی هاوینە، دەزانن بە چ دەزانم چلەیە! چوونکێ ئەگەر دوو سێ بەتانی لە خۆت ئالێنی، یان خۆت لە کیسەی خەوێ بشاخنی، دەتوانی لە دەرێ خەوی خۆت بکەیت، ئاخر قەندیل وایە، هەمیشە شەوەکانی ساردە، خۆشیەکەی لەوەیە دووپشکی نیە، مێشولەی نیە، مێشولە حەدی چیە لە بەر بای کوێستانێ باڵەکانی لێکبکاتەوە.

شەوێك لەو شەوە ساردە هاوینیەی بارەگا نۆبەتداریم کەوتبووە دەمی ماڵنووستنانەوە، بەڵام لە بارەگا هێشتا هەندێ پێشمەرگە نەچووبوونە خەوێ، مانگەشەوێکیش بوو لە دوورەوە زۆر لە دوورەوە سەرو جەمەدانیی پێشمەرگە لە سەروسەکوتی هێستر لێکدی جیا دەکرایەوە، لە خوار نانەدینەکەوە کە هەمووی کەلەکە بەرد و قووچەک بوو، هەردوو هێسترەکەی بارەگا لە ناو ئەو بەردانە دەبەسترانەوە، من لە نێوان دوو گابەرد کە هەر گوریسێك لێکدی دوور رۆچووبوونە زەویەوە، راوێچکەم دەکرد، رەنگە چووبێتمە خەیاڵەوەش، ئێشکگری بێ دالغە چۆن تەواو دەبێت، دیتم رێك لە لای هێسترەکان کەسێك ملەقوتێ دەکات، منیش نازانم لە کێوە غیرەتم وەرگرت، کلاشینکۆفم لێی راکێشا، لە راکێشاندا خۆم هاویشتە پەنای گابەرد و (کێی زەلام)ێکی وام تێگرت، قەت کێی زەلامی وا توند لە زاری منەوە دەرنەچووە، هەمیشە شەرمم لەو (کێی زەلام)ە کردووە و تا بۆم کرابێت خۆم لێی لاداوە، بەڵام ئەو جارە رەنگە لە ترسی خوێنڕشتن شەرم نەیگرتبم، چ دەنگ نەبوو، هێسترەکان لمووزیان کردە ئاسمانێ و گوێیان فیچکردەوە، بارەگا بە ئاگاهاتن و بووە راکێشراکێشی چەك.

+ ها، چیە؟

- زەلامێك لەناو ئەو کەڵەکە بەردانەیە، لای هێسترەکان.

+ زەلام!

بەو نیوە شەوە مانگەشەویە، پێشمەرگە پەرتبوون و ئەو ناوەیان بست بە بست پشکنی، چ زەلام نەبوو.

+ زەلامی چی، چاوت ڕیشکە و پیشکەی کردووە.

- باوەڕتان بێت، زەلام بوو.

+ ترساوی، زەلامی چی!

- زەلام بوو.

+ هەندێ جار لە مانگەشەودا سەری هێستر شێوەی سەری زەلام دەگرێ.

- من هەر دەڵێم زەلام بوو.

+ باشە ئەگەر زەلامیش بوو تەقەی لێ مەکە، دوایی دەبیە هێسترکوژ.

تۆ بڵێی هێستر وەك زەلامیش خۆی نیشانبدا! ئێستاش هەر دەڵێم ئەوەی ملەقوتێی کرد، هێستر نەبوو زەلام بوو، بەڵام کێ بوو، چی دەکرد لە ناو هێستران، چی بە سەرهات؟!

**لە پایزەوە سەرهاتێ/**

لە پەلە هەورەکانەوە دیار بوو ساڵ لە پایزە، پەلە هەورەکان بە دەستی باوە بە پەند چووبوون، لە ئاسمانێ تەڕاتێنێی پێدەکردن و ماندووش نەدەبوون، ڕۆژیش لە کەلێنی پەلە هەوران بە نازەوە خۆی نیشانی قەندیل دەدا و بزردەبۆوە، سەد سوێندت دەخوارد کچە منداڵکارێکە و سەرەدیقانێ دەکات، یەك دوو ڕەشماڵ دیاربوو درەنگیان بەسەردا هاتبوو، لە پێچانەوەی بارگە و بنە دەستیان تێکدەئاڵا، دەنگی تۆپیش دەتگوت گرمەی هەورە، قەندیل قەت دەنگی تۆپی لێنەبڕاوە، دوای نیوەڕۆیە، لەمێژنیە چای دوای نان خوراوەتەوە، بەڵام کتریە گەورەکە چای تێدا ماوە، گەرمم کردەوە، ئێستا پەرداخێك چام بە دەستەوە لە نێوان دوو گابەرد کە بە چ حاڵ جێی منیان کردبۆوە، لە سەر بەردێك کە دەتگوت کورسیە و تایبەت بۆ من دانراوە، مژی قووڵ لە جگەرە دەدەم و فری

گچـکەش لە چـای بە رەنـگ و شـیرین، کلاشینکۆفیشـم لە نـاو هەردوو ئەژنـۆی خـۆم دانـاوە، رەنـگە بڵێـی ئێشـکگری بـۆ ناخۆشـە، لێـرە قسـەی پێشمەرگەیەکم بیرکەوتەوە، ناوی حاجی بەختیار بوو، لە بیـرمە قسـە هـاتە سەرئێشکگری، هەر یەکە و بە جۆرێك لە ئێشکگری دەدوا:

- ئێشکگری ئەگەر بارەگا مەترسی لە سەر نەبێ بۆ ناخۆشە!

- سەرما و سۆلە نەبێت ئێشکگری فشەیە.

- ئەگەر سەر لە ئێواران یان لە دوادواییەکـانی شـەو بێـت، ئێشـکگری چ نیە.

- بەس چایە و جگەرەم هەبێـت بـۆ خـۆم و بـۆ دووانـی دوای خۆشـم ئێشکگری دەگرم

- ئێشکگریی رۆژ چ نیە بەڵام هی شەو خۆش نیە.

- تێر خەو بیت، بۆ خۆی دەڕوات.

- ئەگەر رادیۆ...

کە هەموو لە قسەی خۆیان بوونەوە حاجی بەختیارگوتی:

دە بە خـودای ئەگەر لەو دەسـتەت کچێـك لەم دەسـتەت کچێـك لە پێشیشت کچێك سەما بکات، مادام ناوی ئێشکگریە هەر ناخۆشە.

من ئەشهەدوێکم بۆی کرد.

ئێستاش کە لە نێوان ئەو دوو گابەردە لە سـەر ئەو بەردە، بە دەم چـایە و جـگەرەوە لە ژێـر ئەو پەلە هەورانەی دەڵێـی گەمەی منـداڵانم لەگەڵ دەکەن، تاوێ بەری تیشکی رۆژم لێدەگرن و تاوێ بەریـدەدەن، لەو کەوە رۆژە، کات دەڵێی بە بەردەکانەوە بەستراوەتەوە، ناڕوا، جوولە ناکات، دێتە بیـرم گەمەی رۆژ و هەور و بـا بردمیـانە خەیـاڵەوە، پێنـووس و کـاخەزم دەرهێنا، لەگژ بوو ئەو گەمەیە بخەمە چەند رستەیەکەوە، بـاش بـوو کەس نەیـدیت، چتـۆیی لە خـۆمم هەڵـدا و پشتاوپشـت بە دیـوی گـوللەدا بەربوومەوە، دەستم لە لەشی خۆم گێڕا، چ خـوێنم نەدیـت، بەڵام بـاوەڕم بە چـاوی خـۆم نەدەکـرد، قەت نابێـت ئەو گـوللەی هـات و ئـاگری لە

بەردەکەی بنم بەردا، خوێتی نەڕژاندبێ، بارەگا خۆی بەست و هەستایە سەرپێ، رووە و ئاراستەی گوللە پێشمەرگانە پێشڕەوییان کرد، ئاقاری بارەگایان بست بست پشکنی، بە دەستی بەتاڵ گەڕاینەوە.

- باشە ئەو گوللەیە لە کوێوە هات!

- سەیرە، لە نزیکەوەش هاوێژرا.

- نابێت بە هەند وەرنەگیرێت.

-جگە لەوانە، نە کۆچەریەك دیارە نە قاچاخچیەك...

- ئەدی چی!

- دەی باش نەبوو جێی نەکردە ئەوجێ.

منیش قسەیەکەم هەڵدایە ناو قسانەوە:

من بزانم لە پەنهانەوە هات، گوللەی پەنهانی بوو.

خێرێکم لە سەر بوو، بەڵام کردمە چاوقایمی و نەمکرد، گوللەی لە غەیبەوە هاتوو ئەگەر سێ چوار پەنجە سەری دەکرد، نەشمردبام، بێ کلێنجە دەمامەوە، هەتا درەنگیش نەمدەوێرا لە سەر بەرد دابنیشم، دەنگێك لە ناوەوە دەیگوت:

لە سەر بەرد دامەنیشە، هەموو بەردێك گوللەی بۆ دێ.

ئەو گوللەیە منی زۆر ترساند، زۆر جاریدی گوللە لێم نزیکبۆتەوە، بەڵام سەدیەکی ئەو جارە نەترساوم، رەنگە هۆی ترسانکە بۆ خەیاڵە شیعریەکە بگەڕێتەوە، ئاخر من لە خەیاڵێکی ناسکی پایزانە بووم، خەیاڵێك لە ژیان و مردن دابڕابوو، لە کاتێکی ئەوهادا گوللەیەکی ئەوهات بۆ بێت، چۆن زراوت ناڕژێ، باش نەبوو نەڕژا، لەو کاتە نەنکم بیرکەوتەوە، وەك فیلم هاتەوە پێش چاوم، ژنانە دانیشتبوو، قسەی بۆ چەند ژنێك دەکرد، نازانم چۆنم لە بیرماوە، خەریکە گومان لە خۆم پەیدا بکەم، نەنکم دەیگوت:

خۆشووشتن لە سێ کات زۆر پێویستە، وەك نوێژ و رۆژی و مێردکردن پێویستە:

١-دوای سەرجێیکردن.

٢-دوای هەستانەوە لە نەخۆشی.
٣-دوای ترسانێکی زۆر...
بارەگا ئەگەر سەرشۆرکی هەبا، بێ یەکودوو دەچووم ئاگردانم ئاگر دەدا.

**سەرشۆرك**

حەزم چووە سەرشۆرکێ، بۆیە لە هاوینەوە قسەدەکەم، چوونەوەم بۆ هاوین لە ناچاریەوەیە، لە بارەگا ئاسمانیەکە تەنها لە هاوینان سەرشۆرك دێتە ناو قسانەوە، کە بارەگا لە ئاسمان بێت تا لە زەویەوە دەیگەیتێ، بایی تەمەنێك ئارەقە دەردەدەیت، بە تایبەتی لە هاوینێ، لە بیرمان بێت لە هاوینان هەندێ رێگەی قەندیلێ ئەگەر بە رۆژ رێت پێبکەوێت، وەك ئەوەیە لە گەرمایی بیابان رێبکەیت، بۆیە هەر جارێك رێت بە رێیەك لەو رێیانە بکەوێت، لەگەڵ گەیشتن بە بارەگا ئاسمانیەکە، چەندێ کەمڕووش بیت، پێش چاکوچۆنی پرسیاری سەرشۆرك دەکەیت، من جارێك بە هەناسەبڕکێوە پرسیم:
- سەرشۆرك لە کوێیە؟
+ ئەها بەو رێیەدا تا لێژ دەبیەوە هەرلێژبەوە، دەیگەیتێ.
- ئەگەر وا بێت، ناچم.
+ بۆ؟
- تا سەر دەکەومەوە وەك خۆم لێدێتەوە.
+ ئەو رێیە رێی بایە فێنکەکانە، رێیەك یەك تکە ئارەقەی نەدیوە...

لێژبـوومەوە، هەر لێـژ بـوومەوە، پەشـیمانبوومەوە لە لێژبـوونەوە، خەریکبوو هەورازبیمەوە، دیتمەوە، لە سەر ئەو کانیەی کە لە رێی هێستر و جلیکانەوە بارەگای ئاودەدا، دوو گابەرد شانیان دابووە یەك، پەنایەکی سێگۆشەییان دروستکردبوو، لە پێش پەناکەش سێ بنە داری کورتەبنە، تۆ بڵێ پنچکی گەورە، پەناکەیان پەناتر کردبوو، تاتە بەردێکی زۆر جوان و رێکیش کە هیچ گومانی تێدا نەبوو خوداوەند بۆ نوێژی بەندەکانی

خـۆی تاشـی بـووی، لەو پەنـایە دانرابـوو، هەر مـن نـا زۆر کەس وای دەگـوت، گـابەرد و بنەدارەکـان جێدەسـتی خوداوەنـدیان پێـوە دیـاربوو، نەمزانی بۆ چ مەبەستێك لەوێی دانابوو، بەڵام دانانی تاتەکە دەستی پیـاوی بەژن بڵنـدی پژدەریـی تێـدا بـوو نەك خوداوەنـدی دار و بەرد، فەیلیەکـی بەغدایی وا بزانم ناوی کەریم بوو، بە تیزەوە دەیگۆ:

خودا ئەو بەردەی ئەها لێرێهێ راخستبوو تا رێبوار و کۆچەریان نـوێژی لە سەر بکەن، کەچی حەسەن دایە بەر تەقلان و هێنایە ئێرە، تا پێشـمەرگە خۆی لە سەر بشۆن و ... لە سەر لێبدەن.

مەنجەڵێکـی گێـڕ و دوو تەنەکەی لە چەنـد جـێ کـون و تەشـتێکی لە لایەکەوە بێ تەنیشـت و جـامێکی قوپـاو کە وا بـزانم هێسـتر پێـی لێنـابوو، ئەگەر سەلکە سابوونێك و گۆلمە تایتێك هەبێ، هێندە دەمێنێ باوەشـێ دار و چیلکەوچوال پەیدا بکەو ئاگر بکەوە، بەڵام نەکەی چڕە دووکەڵ بچێـتە ئاسمانێ، هەرچەندە تا بڵێی شوێنەکە نەوی و لاچەپە، بەڵام لە بیرت بێـت، ئەنفال چاوی تیژە با تاتەکە نەبێتە تاتی...

ببینن، مەنجەڵـم خسـتە سـەر ئـاگردانێ، ئەهـا ئـاگردانم ئـاگردا، زۆری نەبرد ئاو دەستی بە مێرووولەکردن کرد کە لە دیدی منەوە جوولەیەکی پـڕ لە ئیستاتیکا و واتایە، لە جلکان بەس دەرپێ قوتە و کراسەکەمم شووشت، کزە بایەکی گەڵێك سارد هەڵیکردووە، سوێند بخۆیت ئەو بایە لە زستانەوە دێ، سوێندت لێناکەوێت، ئاگرەکەم خۆشترکرد، هەڵمی ئاگر دەگاتە سەر تاتەکە، بەڵام هەر واردە ناوێرم ئاو بە خۆمـدا بـکەم، بـاش بـوو قسـەکانی پیـــاوی بەژن بڵنـــدی پـــژدەریم بیـــر کەوتەوە، کە رۆژێـــك پێشـــمەرگە دەوریاندابوو، ئەویش بە دەنگە پژدەریانەکەی وتـاری سەرشـۆرکیانەی بـۆ دەدان و هەندێ پێشمەرگەش قسەیان لە قسەی دەکرد:

+ئەگەر دەتەوێت لەو سەرشۆرکە خۆت بشـۆیت و رەقهەڵنێین، چۆن دەڵێم وا بکەن.

- دەی بیلێ

+ سەرەتا بەس شەروال فڕێدە.

- دەرپێ قوتە نا!

+ فشەی مەکە.

- فشە نیە، تۆ وا نالێی؟

+ نا، نەمگوتووە، دەرپێ قووتەت لە پێ بێ.

- چیدی قسەناکەم، سەرەتا تا کوێت رووت بێت؟

+ پەلە مەکە، سەرەتا لە ناوکت بۆ خوارەوە رووتبکەوە، با کراس و کورتەکت لە بەر بێ.

- ئێ، ئەوە قوونمان رووت کرد، ئاوی پێدابکەین؟

+ زووە قوونت تەڕنەکەیت.

- ئەدی بۆ رووتم کردووە؟ خۆا..

+تۆش پەلەتە! ناهێلی.

- باشە، دەی...

+ سەرەتا لە چۆکت بۆ خوارەوە جوان دەشۆیت.

- شووشتم، لێبوومەوە، ئێستا چ بکەم؟

+ ئەوجا لە چۆکتەوە تا بن گونت بشۆ.

- دەبا گونەکەشی لەگەڵ بێت!

+ بەگەڵی دە.

- قوونت لە بیرکرد.

+ نا، قوونی تۆم لەبیرنەکردووە، قوونت.

- هەهەهەهاهاااااااا، تەواوی بکە.

+ کە لە ناوکت بۆ خوارەوە شووشت، ئەوجا خۆت تەواو رووتبکەوە.

- لە سەرەوەی ناوکەوە لە کوێوە دەستپێبکەین؟

+ دەستت تا ئانیشك، دوای ئەوە بەس زگت، ئەوجا سینگ و هەردوو قۆڵت.

- ئەوەی تۆ دەیڵێیت، ئەینووسینەوە لە بیریدەکەین
+ ئەوجا بەشی خوارەوەی پشتت، ئەوجا نۆرەی کوێ دێ؟
- بەشی سەرەوەی پشتت
+ نا، سەرەوەی پشت قارەیە.
- ئێ، کوا، کوێ ماوە؟
+ بێ سەر، سەرت لە بیرکرد، بە فشەی تێمەگەن، ئەوها نەکەن سەرماتان دەبێت.

من وا هەنگاو هەنگاو ڕێنماییەکانی پیاوی بەژن بڵندی پڕدەری پێڕەو دەکەم، هێشتا نۆرەی قارە نەهاتبوو، سەرم سابوونی پێوە بوو، زرمەیەک کەفی سابوونی بڕی و لە گوێمدا دەتگوت گابەردە دەتەقێتەوە، بە پەلەپرووزێ جلکەکانم لەبەرکردەوە، زرمەیتری بە دواوە نەهات، ئەو تۆپە لە کوێوە هات! نەمزانی لە ئاراستەی بەغداوە هات یان تاران.

گەیشتمە ئەوەی کە زۆر جارخۆشووشتن لە من نایە، ئەو بەڵایانەی بە سەرم هاتوونە زۆریان لە ناو گەرماوێ یان ڕێی گەرماوێ بووە، مانگی وا هەبوو هەر نیازی خۆشووشتن هاتبێتە سەرم، شتێك هاتۆتە پێشێ، ڕووداوەکانی ناو گەرماو زۆرن، سبەینانێك لە گەرماوێکی ناو بازاڕێ هێشتا ئاوم بە خۆمدا نەکردبوو، بووە زرم هۆڕ خەریکبوو بە قوون ڕووتی دەرپەڕێم:

+ چ بووە، چیە ئەوە!
- نابینی، فڕۆکەی تاران هەولێر بۆردومان دەکەن!

ڕۆژێك دوای چەند ساڵ دابڕان لە شار و گەرماوی شار، ڕەنگە تایبەت بە گەرماو سەردانی شاری ورمێم کردبێ، هەر پێشمەرگەیێ لەوێ دەهاتەوە باسی خۆشی و گەرمی و خاوێنی گەرماوەکانی ئەو شارەی دەکرد، عەسرانێك گەیشتمە ورمێ، پێش ئەوەی مێوانخانە دابێنبکەم چوومە گەرماو، گەرماو بوو نەك گەمە، من دەڵێم پەنجا دەست تۆ بڵێ حەفتا، دەست سابوونم لە خۆم دا، تێر نەدەبووم لەو گەرماوە، لە

هیکـڕا شـەقەیەکی گەورە هـات و لە بەری ژنـانەوە بـووە قیـژە و هەرا، لەوێش زۆری نەمابوو بە قوون رووتی دەرپەڕم:

+ چیە چیە؟

- بەرق، بەرق..

تێگەیشتم بە هۆی کارەباوە ئاگر کەوتۆتەوە.

پێشمەرگایەتی و منداڵیشم پڕپڕن لە هەواڵی سەرشۆرکی.

نەنکم زۆر جار دەیگوت:

دەبێت بزانین چ رۆژێك باش نیە بۆ سـەردانی جێیـان، چ رۆژێـك بـۆ تێکەولێکە، چ رۆژێك بۆ کۆرکردن، چ رۆژێك...

جارێگ گۆتمە نەنکم:

من لە هەر رۆژێك خۆم دەشۆم شتێك دەقەومێ.

نەنکم نیگایەکی پڕ لە گومان و پرسیاری تێگرتم و گوتی:

دوور بێ لە تۆ، دیارە هەندێك کەس خۆشووشتنیان لێ نایە.

ئیدی من گەیشتمە ئەوەی کە خۆشووشتنم لێ نـایە، بەڵام خـۆ دەسـت لە خۆشووشتنیش ناشۆم، دیسانەوە خۆم رووتکردەوە، ریتماییەکانی پیـاوی بەژن بڵندی پژدەریم لەبیر نەما، خـۆم جـوان جـوان شووشـت، هێشـتا هەر رووتبووم، زرمەیەکیدی رێك لە زرمەی پێشـوو دەچـوو، خێراتـر خسـتمیە نـاو جلکەکـانمەوە، هەڵـگەڕێ، هەڵـگەڕێ، گەیشـتمەوە بارەگـا، دیـاربوو خۆشووشتنم پێوە دیار نەمابوو:

- دەڵێی خۆت نەشووشت.

+...

- تۆپەکان نەیانهێشت؟

-...

+ هەنـدێ کەس ئەگەر  بە سـابوونی فەڕەنسـی و تـووکی بەرازیـش خۆیان بشۆن پێیانەوە دیار نیە.

-...

له سەر پشتم بووە یەك تەپوتۆز نەبێتەوە، بەڵام بۆ وەی خۆم باڵادەست نیشانبدەم، ورتەم لێوە نەهات، یەك دووانێك زۆر گاڵتەچی بوون، زۆری نەمابوو بەهۆی بێدەنگیەکەی منەوە شەق ببەن! نانم خوارد، بە پەرداخێ چایەوە چوومە پاڵ گابەردێ کە بە نوێژی نیوەڕۆیێ سێبەرەکەی بەژنێك دەبوو، بە دەم جگەرە و چایەوە زۆری نەمابوو خەو بمباتەوە، حەیف خەوم لێنەکەوت، رایەڵی خەیاڵم بۆهەموو لایەك هەڵدا، بە باڵی خەیاڵ دنیام کرد، خەو نەهات و نەهات، بۆ وەی منیش وەك ئەو خەڵکە ئەگەر بۆ چەند ساتێکیش بێت، لە رۆژە درێژەکانی هاوین چاو گەرم بکەم، بە هەر نرخێك بێت لە سێبەری ئەو بەردە بچمە باوەشی خەوەوە، لە سەرمە هەر لە هاوین بمێنمەوە.

### خــــەو

رەنگە رۆژێك هەبوویێ لە رۆژانی هاوین، رۆژێکی کپ کپ، رۆژێك بە هەڵەش تۆپێك رووە و قەندیل نەهاوێژرابێ، قەندیل فیشەکی تێدا نەتەقێنرابێ، ئەو هاوینەی رۆژەکانی هەند درێژبوون هەند درێژ، بەشی چوونە حەج و هاتنەوەی دەکرد، ئەویش قسەی بە تەمەنێکی پشتاشانی بوو، جارێك لە جێگەیەکی قەندیلێ تووشمان بوو، ئەو پیاوە لە پەراوێزی گێڕانەوەی هەقایەتی دڵۆپە خوێنەکانی پشتاشانەوە گوتی:

کاکی برا، هەندێك رۆژی ساڵ هەن زۆر درێژن زۆر درێژ، دەچیە حەج و دێیەوە هێشتا مەلای عەسر بانگی نەداوە.

گوتم:

ئەو رۆژانە دەکەونە کام وەرزەوە؟ دەکەونە...

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا:

لە وەرزەکان گەڕێ، بەڵام ساڵی واش هەیە هێند کورتە هێند کورتە، لە دەستنوێژهەڵگرتنێ نەبوویتەوە، دەبینی ساڵ وەرسووڕایتەوە.

گوتم:

زۆر شاعیرانە قسە دەکەیت.

گوتی:

کاتم نیە بۆ قسە.

ئەو چەند رۆژە هاوینیەی بارەگا ئاسمانیەکە رەنگە لەو رۆژە درێژانە بووبن کە ناگەیتە عەسر و ناگەیتێ، ئەو چەند رۆژەی خەو لە چاوی من تۆرابوو، تۆرانێك بە هیچ ئاشت نەدەبۆوە، من و خەو زوو زوو لێکدی دەتۆراین، جار هەبووە بە شەو و رۆژ، بە دوو شەو و رۆژ چاوی من بایی کورتیلە خەونێکیش نەچۆتە خەوێ، تۆرانی ئەو جارە درێژەی کێشا، سێ شەو و سێ رۆژی رێکە خەو تۆراوە، لەگەڵ تۆرانی خەویش، هۆش دەتۆرێ، کاتێ هۆشیش تۆرا، چ ناتۆرێ!

+ چارەیەکم بکەن، بێخەوی کوشتمی.

- چایە کەم بکەوە چایە.

+ تۆش هێندەی من چایە دەخۆیتەوە.

- من لێم دەکەوێت.

- بێ تام جگەرە دەکێشی، جگەرەش بۆ خەو باش نیە.

+ تۆش خەوت نەبێ لە من پتر جگەرە دەکێشی.

- باشە بۆچی هێندە بیردەکەیتەوە؟

- کوا، هێندەی هێسترێکیش بیرناکەمەوە.

بەلاش بوو، چارەی بێخەوی لە لای کێ هەیە! چایەشم کەمکردەوە، جگەرەشم بە جگەرە دانەدەگیرساند، هەموو بیرکردنەوەشم لە خەو و بێخەوی کۆکردەوە، خەو نەهات و نەهات..

لە ناو بارەگا وەك هێڕوهوڕان دەسووڕامەوە، ئێشکگرێکی هەمیشەیی بووم، دەمگوت:

لیستی ئێشکگری بە من پڕبکەنەوە، بیست و چوار جار ناوی من بنووسنەوە.

دەیانگوت:

نا، تۆ ئێشکگری لە ئێشکگرەکان بگرە.

هەر بە راستی بوومە ئێشکگری ئێشکگران، بە شەو و بە رۆژ بە ئاگا بووم، هەبوو دەیگوت:

ترسمان نیە، ئێشکگری هەمیشەییمان هەیە، قەت بە دەست ناگیرێین، خۆزگە لە هەموو بارەگایەك بێخەوێکی هەمیشەییمان دەبوو.

کوڕێك هەبوو، ناوی ببووە دۆستی هێستر، ئەگەر سەرچێغ نەچووبم، ئەویش پژدەری بوو، دەیگوت:

من حەز لەو بارەگایە ناکەم کە ئێشکگری هەمیشەیی هەیە؟

لێیانپرسی:

لەبەرچی حەز ناکەیت؟

دۆستی هێستر پێدەکەنی و نەیدەگوت.

کوڕێك (شۆڕشی کۆیێ)ی ناو بوو، گوتی:

من دەزانم بۆچی حەز لە...

دۆستی هێستر تەماشایەکی کرد و گوتی:

دڵنیام نازانی، بەڵام ئەگەر دەزانی مەیڵێ.

شۆڕشی کۆیێ گوتی:

دەیزانم و دەیڵێم، با پێتانبڵێم.

دۆستی هێستر پەلاماری دایێ و دەستی خستە سەر زاری، بە یەك دووانێك دووریانخستەوە.

شۆڕش:

هەر دەیڵێم.

دۆستی هێستر:

مەیڵێ.

پێشمەرگەیەگ:

لێیگەڕێ مەیڵێ.

پێشمەرگەیەك:

بۆ نەیلێ، وەڵڵا بیلێ.
دۆستی هێستر:
بیڵێی هەتا هەتایە قسەت لەگەڵ ناکەم.
شۆڕش:
هەر دەیڵێم و دەبێت قسەشم لەگەڵ بکەیت.
دۆستی هێستر:
کە ئەوهای لێهات، تۆ مەیلێ من خۆم دەیڵێم.
شۆڕش:
دەی ئەگەر درۆت کرد بۆت راست دەکەمەوە
دۆستی هێستر:
چونکە هێستر حەز لە ئێشکگری هەمیشەیی ناکات، درۆم کرد؟!

حەزنەکردنی هێستر لە ئێشکگری هەمیشەیی، لەو نیوەڕۆ هاوینیەی بارەگا ئاسمانیەکەی قەندیل رەنگە چیرۆکێکی لە چا شیرینتر بووبێت کە بە دەم چا خواردنەوە هەر پێشمەرگەی دیمەنێکی دەگێڕایەوە، لە چیرۆکی هێستر راستی و گاڵتە بە شێوەیەك تێکەڵاوی یەکتر ببوون، لە توانای کەس نەبوو لێکدیان جیابکاتەوە، توانایەکی وا مەگەر لە پێشمەرگەناس و هێسترناس ببینرێتەوە، رەنگە چیرۆکێکی پڕ تام بووبێت، بەڵام بۆ من، منی خەو لە چاو تۆراو چ تامی نەبوو، هەر لەبەر هەندێش دیمەنێکی وام لە چاودا نەماوە، لە دڵی خۆم دەمگوت:

خۆزگەم بە خۆتان، ئێستا دوای چا خواردنەوە، دەچن پاڵدەدەنەوە و دەخەون.

ئەوەتا، هەندێکیان لە بن گابەردەکانی بارەگا خەویان لێکەوت، ئیرەیی بە پرخەپرخی پیاوی بەژن بڵندی پڕدەری دەبەم، پرخەپرخی قەندیل و قەندیل دەڕوا، وام لێهاتبوو، گومان لە خەوی خەڵك پەیدا بکەم، باوەڕم نەدەهات ئەوانە نووستبن، دەمگوت:

رەنگە خۆ وا نیشانبدەن کە خەوتوون، دەنا لە من بەئاگاترن، ئەو

پرخەپـرخەش هەر بـۆ چاوبەسـتەگیە، بـۆ ئەوەیە بە مـن بلـێن هـا ئـێمە خەوتووین، تۆش بخەوە.

من وام لێهاتبوو، لە خەو کەوتبوومە گومـانەوە، تـۆ بلێـی خەو هەبـێ! لەو سەری تەمەنەوە تـا ئەو سـەری دەهـاتم و دەچـووم خەوم نەدەدیـتەوە، سەراپای بێ خەوی بوو، هەموو وێنەکانی خەوزڕان دەهـاتنەوە بەر دیـدەم، هەموو ئەو قسانەی لە بارەی بێخەویەوە بیستبوومن، لە گوێمدا لێدەدرانەوە، وا پیاسـە لە رابـردووم دەکەم، رابـردووی بـێخەوی، گەیشـتمەوە شـەوانی منـداڵی، هێشـتا هەر لە قۆنـاغی سـەرەتایی بـووم، هەمووامـان لە ژوورێـك دەنووستین، دێتە بیرم، شەو هەبووە هەموو دەچـوونە خەوێـوە، هەر مـن لە تەنیایی بێداری دەماوە:

+ دایە، دایە...

- ها، کوڕم چیە؟

+ خەوم نایە.

- دیسان بەزمەکەیە.

لەو غەڵبە غەڵبە بابیشم خەبەری دەبۆوە، لە بیرمە دەمپرسی:

چ بکەم، تا خەوم لێبکەوێت، ئێوە چۆن دەخەون؟

ئەوەشم لە بیرە، بابم دە یگوت:

منیش بە منداڵی هەندێك شەو وەك تۆ خەوم دەزڕا.

بە تامەزرۆییەوە دەمگوت:

ئەدی کو خەوت لێدەکەوت؟ چت دەکرد؟

بابم بە دەم باوێشکەوە دەیگوت:

نوێژم دەکرد، بیست نوێژم لە سەر یەك دەکرد، خەوم لێدەکەوت.

دایکم بە تووڕەییەوە:

دەی کوڕەکە شێت بکە شـێت، خـۆ هەتـا بیسـت نـوێژ دەکـات، شـەو کۆتایی دێ رۆژ دەبێتەوە.

مـــن نـــوێژم نەدەزانـــی و حەزم لێنەبـــوو، بەڵام لەبەر خـــاتری خەو

ئامادەبووم، بەو شەوە خۆم فێربکەم و نوێژ دابەستم، دەمگوتە بابم:
دە فێرم بکە.
بابم دەیگوت:
دە هەستە بچین دەزنوێژ هەڵبگرین، بەڵام دەبێت لە دڵەوە نوێژبکەیت.
ئەو لە دڵەوەیە هەڵوەستەیەکی پێمکرد، بەڵام دایکم زوو فریا کەوت:
نا، کوڕم نوێژی ناوێ، بزانە چت پێدەڵێم بە قسەی من بکە، خەوت لێدەکەوێ...
خەریکبوو بچمە ناو دەمی دایکمەوە:
دە بڵێ چ بکەم؟
دەستی بە سەرم داهێنا:
لە یەکەوە هەتا بیست بژمێرە، پێنج جار لە یەکەوە هەتا بیست بژمێرە.
بابم تۆڵەی خۆی کردەوە:
بیست نوێژیش هەر هێندەی پێنج جار هەتا بیست..
من بە قسەی دایکم کرد، پێنج بیستەکەم ژمارد و خەو نەهات، گوتمە دایکم:
- تەواو، نەهات، چ بکەم؟
+ بیستێکیدیش، بەڵام لەسەرەخۆ بژمێرە.
نایەتە بیرم شەشەم بیستم تەواوکرد یان نا، بەڵام جوان دێتەبیرم کە بە ئاگاهاتم، دەمێك بوو هەتاو کەوتبوو، ئێستاش لەو بارەگا ئاسمانیە خەو زڕاوە، سەد لە یەکەوە هەتا بیست دەژمێرم بەلاشە، گوێت لێمە دایە! ئێستا حەزم لێیە بە قسەی بابم بکەم و دەزنوێژهەڵبگرم، بەڵام ڕەنگە لە دڵەوە نەبێت، بۆیە...
جارێك لە ناو پۆلی مامۆستای فیزیا، نازانم لە چیەوە قسەی هێنایە سەر خەوزڕان، قوتابیەك پرسی:
ئەگەر خەومان زڕا چ بکەین؟
مامۆستا گوتی:

خوێندنەوە، کتێب بخوێننەوە، بەڵام دەزانن چ جۆرە کتێبێك؟

قوتابیەکیدی گوتی:

چیرۆکی خۆش و ئەو شتانە.

مامۆستا:

نا، کتێبی زۆر قورس کە تێنەگەیت، بۆ نموونە قوتابیەك کە لە فیزیا تەمبەڵە و حەزی پێناکات، کاتێك خەوی زڕا بیخوێنێتەوە خەوی لێدەکەوێت..

من لە کاتی خەوزڕانێ، بە قسەی ئەو مامۆستایەم کردووە، هاتووم ڕێزمانی عەرەبیم خوێندۆتەوە، خەوم لێکەوتووە، لێرەش لەو بارەگا ئاسمانیە خەو لە چاو تۆراوە، قسەی مامۆستاکە تاقیدەکەمەوە، بارەگا چەند کتێبێکی لێیە، دەگەڕێم، دڵنیام کتێبێك دەبینمەوە کە قورس بێت یان من لێی تەمبەڵ بم، دیتمەوە، ئەو کتێبەم دیتەوە کە ئەگەر هەزار جاریش تاقیکردنەوەی لێبکەم لێی دەرناچم، ئەویش (پەیڕەوی ناوەخۆی حزب)ە خوێندمەوە، چی لێتێنەگیشتم، بەڵام بەلاش بوو، خەوی نەهێنا، گوێت لێمە مامۆستای فیزیا!

هەر لە پۆل، مامۆستایەکی زۆر عاشق هەبوو، لە پەنجەرەی پۆلەوە کە جوان بە سەرماڵێکدا دەیڕوانی، ئەو مامۆستا عاشقە، لەگەڵ ژنێك چاوچاوێێ و هێما هێماییێنیان دەکرد، کەس نەبوو بەو چاوچاوێتەی مامۆستا نەزانێ، لە سەر دیوارەکانی قوتابخانە لە سەد جێ پتر بە خەتی گەورە و گچکە بە خەتی خۆش و ناخۆش نووسرابوو (....عاشق) لە بیرمە ئەو عاشقە کە مامۆستای عەرەبیش بوو، جارێك لە ڕێی دێڕە شیعرێکی عەرەبیەوە قسەی هێنایە سەر خەوزڕان، پێدەچوو خۆی زوو زوو تووشی خەوزڕان بێ، پرسی، یەکە یەکە لە قوتابیەکانی دەپرسی:

+ هەر کێ ڕاست وەڵام بداتەوە سێ نمرەی دەدەمێ، ئەگەر لە شەوان تووشی خەوزڕان هاتیت چی دەکەیت؟

- شەربەت دەخۆمەوە.

- پسکویت دەخۆم.
- کتێب دەخوێنمەوە.
-هەر تەنیشتان دەگورم.
- هەموو ماڵێ بەئاگادێنم.
- گۆرانی دەڵێم.
چاوم لە سەر شتێك رادەگرم.
- دەڵێم خودایە، بمخەوێنە.
- هیچ، با هەر بزڕێ.
- لە پەنجەرەوە تەماشای ماڵان دەکەم!

ترساین مامۆستا لە پەنجەرەوە ئەو قوتابیە فڕێداتە خوارەوە، کە لە کاتی خەوزڕانێ لە پەنجەرەوە تەماشای مالان دەکات، بەڵام مامۆستای عاشق بەسەر خۆی نەهێنا و بەردەوام بوو لە پرسیاری خۆی و یەك یەك قوتابیانی بۆ وەڵام هەڵدەستانەوە، نۆرە گەیشتە من و گوتم:

پێنج جارلە یەکەوە هەتا بیست دەژمێرم، ئەگەر خەوم لێنەکەوت، بیستێکیدیش...

لە بیرمە دوای ئەوەی یەکەیەکەی قوتابیان قسەی خۆیان کرد، مامۆستای عاشق وا کۆتایی بە خەوزڕان هێنا:

وەڵامی هیچتان راست نەبوو، با من پێتان بڵێم، ئەگەر خەوتان زڕا، دالغەی خۆش لێبدەن، یەك، دوو، دە دالغە، ئەگەر زانیتان کەڵکی نیە، پێچەوانەی بکەنەوە، وەرگەڕێنە سەر دالغەی ناخۆش، لە خۆش و ناخۆش یەکیان دەیگرێ و تەخت دەبن.

ئەوەتا لە بارەگا ئاسمانیەکەی قەندیل، هەزار و یەك دالغەی خۆش هەزار و یەکی ناخۆش لێدەدەم و بەلاشە، گوێت لێمە مامۆستای عاشق!

هەر بۆ چارەی خەو زڕان با سەرێك لە کۆلێژ بدەمەوە، کوڕێکمان لەگەڵ بوو، کوردی موسڵاوی، بە ناوی یاسین، ئەو یاسینە هەمیشە ساقۆی لەبەر بوو، هەقی نەبوو دنیا فێنکە گەرمە، درەنگ پێکەوتم کە

حیکمەتی ساقۆیەکەی یاسین لە گیرفانەکەیدایە، ئەو گیرفانە لە ناو پۆلێش چارەگە عەرەقی تێدا بوو، زۆر جار یاسین و عەبدولایەك ئەویش موسڵاوی بوو لە ناو پۆلیّ فڕیان لە عەرەق و ویسکی دەدا، بە تایبەتی لە وانەی (د. عەلی) مامۆستایەکی زۆر بە تەمەن بوو، مێژوناس بوو، دەیانگوت زۆر لە پێش فەهدیشەوە کۆمۆنیستە، ئەو پیاوە لە ناو کوردان بەس خۆشیی لە یەك کورد نەدەهات دەیگوت:

تۆفیق وەهبی، پیاوی ئینگلیز بوو، ئینگلیز.

ئێ، ئەو دکتۆر عەلی کۆمۆنیستە، لە هیچ نەدەترسا، بە کەیفی خۆی قسەی بە حکومەت دەگوت، جگە لە بەعسیەکان کەس نەبوو ئەو دکتۆرەی خۆشنەوێت، یاسین و عەبدوڵلا هەر زۆریان خۆشدەویست، رەنگە عەبدوڵلا لەبەر ئەوە خۆشیویستبێ کە دکتۆر ئاگای لە کورسیەکانی دواوەی پۆل نیە و حەزدەکەیت مێز بڕازێنەوە، لێرە ئیشم بە یاسینە، بە یاسینم دەگوت:

+ بۆچی هێندە دەخۆیتەوە؟

- ژیان لە عەرەقدا دەبینمەوە.

+ ئەدی کچ؟

- کچیش بە عەرەقەوە کچە.

زۆر جار دەچوومە لای، لە بەشی ناوەخۆ دەچوومە لای یاسین و شەو دەمامەوە، ئەو عەرەق و من بیرەم دەخواردەوە، شەوێك خەوم زڕا، یاسین کە بۆ میزکردن لە خەو هەستا، زانی خەوم زڕاوە، گوتی:

+ واز لە بیرەی حیز بێنە، عەرەق بخۆوە.

- چ پەیوەندی بە خەوزڕانەوە هەیە؟

+عەرەق باشترین دەرمانە بۆ خەو.

بە قسەیم کرد و بە دوو پێك تەخت بووم، بەڵام ئێستا لە کوێ عەرەق بێنم، یاسینی بە عەرەقەوە جوان! لە کوێوە دەستم بگاتە قاچاخچیە قەندیلیەکە ئەوەی دیاریەکانی خوداوەندی بۆم ژمارد.

ئەوڕۆ چاوێك گەرم نەكەم، سەرم نارنجۆك ئاسا دەتەقێتەوە، رێك وەك ئەو نارنجۆكەی بۆ یەكەم جارم بوو بیتەقێنمەوە، لە دەڤەری مەتین، ئا، جێگەیەك بوو مەتینی لێوە دیار بوو، سەر لە ئێوارەیەكی شەڕاوی، بە ترس و لەرزەوە هەلقەكەیم راكێشا و تا دەستم تێدابوو هەڵمداو لە پەنای كەڤرەكە خۆم بە بەعەرد دادا، لەوێ نەمزانی چی لێكەوتەوە، بەڵام منی لە ژیان هێشتەوە، ئەدی ئەگەر سەرم بتەقێتەوە، بۆ من پێچەوانەی نارنجۆكەكەیە، ئەو ژیان و ئەم مردنی لێدەكەوێتەوە، خوداوەندی خەو، زۆر نا، تەنها چۆڕێ خەو، تەواو ترسم لێ نیشت، ترسی ئەوەی بۆ هەتایە خەو نەبینمەوە، بیستبووم خەلكی وا هەیە، بیست ساڵ سی ساڵ نەنووستوون، ترسام منیش بە دەردی ئەوانە بچم.

پیاوی بەژن بلندی پژدەری دەیگوت:

گەنج كە خەوی دەزڕێ، چارە هەر باوەشی ژنە.

شالاو بە زار نا بە چاو گوتی:

باوەشی هێستریش دەبێت.

پیاوی بەژن بلندی پژدەریش قسەی خۆش دەكات!

مام جوامێر كە لە سەر رۆیشتن بوون و رێیان دەچووە لووتكە بەرزەكەی قەندیل، بە خێری خۆی بۆ بێ خەویەكەی من چارەی ئاسانتری دیتەوە:

هەر كەسێك دەڵێت خەو تۆراوە و نایەتەوە، با بچێت لەو لووتكە بەرزە بیهێنێتەوە، ئەگەر توانی سەرێك لەو لووتكە بدات و بێتەوە، مەرجی لەگەڵ دەكەم حەفتا كاتژمێری رێك دەخەوێت.

ئەگەر بەختیار خەرابەیی توند دەستمی نەگرتبا، لە سەر قسەی مام جوامێر بە لووتكە هەرە بەرزەكەی قەندیلدا هەڵدەگەڕام و بایی چەند كاتژمێرێك خەوم بۆ خۆم دەهێنا، دەمەو نیوەڕۆ بوو، بەختیار داینیشاندم و بە هێمنی گوتی:

+ ئەو رێگە دوورەی ناوێ، بۆ گەیشتن بە خەو، رێی زۆر نزیكتر هەیە.

- فشە مەکە، خەوم دەوێ خەو.

+ بە راستمە.

- کوا! عەرەقت لایە؟

+ راوەستە..

کۆڵەپشتەکەی کردەوە، دەستە حەبێکی دەرهێن..

+ زۆر بەهێزە، هێستر دەخەوێنێ، لە دنکێك پتر نەخۆیت.

- بە راست ڤالیۆمە؟

+ بیخوێنەوە، خۆ خوێندەواریت هەیە؟

- هەویش بێت زەحمەتە بمخەوێنێ.

+ من دەڵێم هێستری خەواندووە، تۆ دەنکێك بخۆ و لەو بن بەردە پاڵدەوە، بەڵام ئەگەر تەنگاوی بڕۆ سەر پێشاوێ، دەنا لە خەوێ خۆت پیس دەکەیت.

چ باوەڕم نەبوو حەبێك هەبێ من بخەوێنێ، بەڵام هەر دەبوو تاقیبکەمەوە، قلێکم قوت دا، دڵم ئاوی نەخواردەوە، قلێکیدیشم ئاودیوکرد، دەستمی گرت:

+ تۆ چی دەکەیت! دەتەوێت تا رۆژی حەشر بەئاگا نێیتەوە؟

- بەس چاوێك گەرم بکەم بەسمە.

+ دوای کەمێکیدی دەگەیتە قیامەتی خەو.

حەبی سێیەمیشم خستە دەممەوە، بەختیار دەستە حەبەکەی لە دەستم راپسکاند:

+ بە سەر مندا ساغدەبیتەوە.

- خەوم دەوێ، کەمێك خەو.

+ بخەوە، بابی حەفت رۆژت وەرگرت.

کاتێ بە ئاگا هاتمەوە جگە لە ئێشکگر هەموو خەوتبوون، مانگە شەو بوو، دنیا رووناك رووناك، چوومە نانەدینەکە شتێکم خوارد، خەو بەرینەدەدام، چوومەوە بن بەردەکە، دیاربوو بەتانیەکیشیان پێمدا دابوو،

ئەوجارە کە بە ئاگا هاتمەوە، هەتاو تەواوێك کەوتبوو، مام جوامێر و بەختیاریش رێی دوندە بەرزەکەیان گرتبووە بەر.

لە بیرمە رۆژی پاشی نامەیەکم بۆ بەختیار نووسی، بەڵام ئێستاش بە دەستی نەگەیشت، لە نامەکەدا شتێکی نزیك لەوەم گوتبوو:

**هەر کێ هات**
**جگە لە ئامۆژگاری چی نەهێنا**
**جگە لە خەوزڕان پتر چی جێنەهێشت**
**بەڵام تۆ**
**دەستە حەیێکی رەنگ پەڕیوت هێنا و**
**بە تەنیشت بەهەشتەوە**
**خەوێکی گوڵاویت بۆم راخست**

ئۆخەیش، خۆ خەوم دیتەوە، خەوی خەوناوی، خۆش و ناخۆش، من حەزم لە خەون بوو، ئەگەر چەند شەوێك خەونم نەدیتبا، هەستم بە بزربوونی خۆم دەکرد، باش بوو لە بیرم نەچوو، ئەو دوو سێ رۆژەی دەستەیەك ڤالیۆمم قووتدا، ساتەکانی بە ئاگاییشم هەروەك خەوتن وابوو، کوڕە شارەزووریەکە دەیگوت:

قاپێك ویسکیش هەر هێندە کاریگەریەی هەیە، خۆزگەم بە خۆت چەند جوان مەستیت.

بە قسەی ئەو کوڕە ویسکیناسە حەزم دەچووە ویسکی، بەڵام بۆ ئەوەی فرێك لەو حەزە بدەم، دەبێت ئەگەر بە سووڕانەوش بێت، خۆم بگەیەنمەوە ئێوارەیەکی پایزی.

## ویسـکی

ئەو ڕێیەی لە قووڵایی زەویەوە دەهاتە بارەگا ئاسمانیەکە و بەو دیودا دەگەیشتەوە قووڵایی زەوی، پیاوی بەژن بڵندی پژدەری دەیگوت:

هەرچی کاروانچی و قاچاخچی دەوڵەتان هەیە، ئەگەر بۆ جارێکیش بێت ڕێیان بەو ڕێیە دەکەوێت.

بە گۆتەی پیاوی بەژن بڵندی پژدەری بێت، ئێرە، ئەو ڕێیەی هەر دوو سێ سەدە هێستر لە بارەگا دوورە، ڕێترین ڕێی قاچاخچیانە، ئەوانەی زۆر لەو بارەگایە مابوونەوە، هیچ گومانیان لە گۆتەی پیاوی بەژن بڵندی پژدەری نەبوو، کەسیش هێندەی پیاوی بەژن بڵندی پژدەری لەو بارەگایە نەماوەتەوە، یەکەم بەردی بناغەی بارەگاش خۆی دایناوە، دارەڕاکەشی بە دەستی وی دانراوە، کۆچەریەك بە دەم تەور راوەشاندنەوە کە کەوتبووە گیانی کۆلکەدارێك دەیگوت:

لەو ئاسمانە، لەو ئاقارە یەکەم تەور کە راوەشابێ، تەوری پیاوی بەژن بڵندی پژدەری بوو.

شوانێك کە لە سەر ئەوە بوو شوانبەتاڵی لە شوانایەتی بکات، دەیگوت:

لەو ئاقارە ئاسمانیە یەکەم ئاگر کرابێتەوە، بە دەستی پیاوی بەژن بڵندی پژدەری بوو.

پژدەریەك، لە بیرمان بێت بارەگا پڕ لە پژدەری بوو، دەیگوت:

لەوەتەی پژدەر هەیە پێشمەرگە هەیە، لەوەتەی پێشمەرگەش هەیە، پیاوی بەژن بڵندی پژدەری پێشمەرگەیە و لێرەیە.

پژدەریەکیدی وا باگۆی پژدەریەکە دایەوە:

لەوەتەی پژدەر هەیە، جاشیش هەیە.

ئەو پیاوەی کە یەکەم تەوری راوەشاند، یەکەم ئاگری کردەوە، یەکەم بەردی بارەگای دانا، لەوەتەی پێشمەرگە هەیە پێشمەرگەیە، لە ڕێی تەقەوە پێشمەرگە و جاشی لێکدی جیادەکردەوە، دەیگوت:

ئەها، ئەوە تەقەی جاش بوو، ئەوەیان تەقەی پێشمەرگەیە.

دەیانپرسی:

کلاشینکۆف هەر کلاشینکۆفە، چ پێشمەرگە بیتەقێنێ چ جاش چ تەڕەماش، بە من نالێی چۆن لە ڕێی دەنگی تەقەوە جاش و پێشمەرگە دەناسیەوە؟!

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری بۆ سەلماندنی قسەی خۆی بەڵگەی زۆر بوون، بەڵام من ئێستا هەر یەك بەڵگەم لەبیر ماوە، دەیگوت:

گوللەی جاش زۆر دوور بە عەرد دەکەوێت، بەڵام هی پێشمەرگە نزیك زۆر نزیك...

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری لە ڕێی پێی ئەسپەوە سواری دەناسیەوە، کاروانی دەناسیەوە، بەڵام دەیگوت:

ئەو قاچاخچیانە زۆر سەختەچین، لە لباد پێڵاو بۆ وڵاخەکانیان درووست دەکەن، تا دەنگیان نەیە و ئاشکرا نەبن.

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری کە شارەزای تێکەولێکەی قاچاخچیان بوو، لە دانیشتنێکی شەوانە، پرسی:

+ کێ دەزانی ئەو قاچاخچیانە چی دێنن و دەبەن؟

- ئارد و ...

- کوتاڵ و...

- پاکەت و ...

- عەرەق و...

- فیشەك و...

- تایت و سابوون و...

- مووس و...

- تریاك و..

- شەکر و..

- مووشەك و..

- هەنگوین و...

- هێندەی من لە بارەی قاچاخچیانەوە بزانم لە باری قاچاخچیان هەموو شت هەیە.

+دەمخۆش، وایە، هەموو بەروبوومی دەوڵەتی ئێران و عێـراق بە تەڕ و وشکیەوە لە نـاو بـاری ئەو قاچاخچیـانەیە، بـڕۆ چیـت دەوێ لە نـاو بـاری قاچاخچیان ببینەوە.

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری دەیگوت:

بارەگاش بەشی هەیە لە باری قاچاخچیان.

پژدەریەکیدی شیعریشی دەگوت، من ناوم نابوو بەردەشانی، دەیگوت:

ڕێدانی بار بێ وەرگرتنی بە شی بارەگا، ناپاکییە لە حزب.

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری وەڵامی بەردەشانی دایەوە:

نا، ئەوهاش نیە.

بەردەشـانیە شـاعیرەکە سـوور بـوو لە سـەر قسـەی خـۆی و پەژیـوان نەدەبۆوە:

بە خودای ئەوهایە، چۆن وا نیە!

ئەو بەردەشـانیە شـیعری دڵداریشـی دەنووسـی، بەڵام دڵـداریەکی زۆر مەرجدار، کۆپلەیك شیعری ویم لە بیرە کە زۆری دەگوتەوە:

**کچێ، جوانێ**

**زۆر کچ هەیە بە دڵ لە من دەڕوانێ**

**بەڵام چاوی من لە سەر تۆیە.**

**تۆش گەر دەتەوێ**

**لە ئێستاوە هەتا هەتایێ**

**هەر لە دڵم بی و هەر خۆشتم بوێ،**

**لە من پتر**

**لە خۆت پتر، حزبت خۆش بوێ.**

زۆر جار دەمدیت بە دەم خوێندنەوەی ئەو شـیعرە دڵـداریە مەرجـدارە، کلاشینکۆفەکەی سواردەکرد و غاردە.

+ ها، کاروان هات؟

- گوێتان له دەنگی پێی وڵاخ نیه!

ئەو کوره زۆر وشت بوو، دەنگی پێی کیسەڵی له سەر لم دەبیست.

جارێك زۆری نەما لەگەڵ بەردەشانی پیس تێکبگیرێین، ئاخر منی خستبووه ڕیزی خایەنان، من نەك هەر ڕێم له کاروانچیان، له قاچاخچیان نەدەگرت، بارەگام له هاتنیشیان ئاگادارنەدەکردەوه، دێته بیرم سەر له ئێوارەیەکی مانگەشەوی نۆرەی نۆبەتداریی من بوو، له خوار بارەگا به دیوی ڕێی کاروانچیان له سەر بەرزاییەك پیاسەم دەکرد.

+ چیه، دەڵێی کەڕ بووی! گوێت له قاچاخچیان نیه؟

- من کەڕم، بەڵام تۆ کەری، هەی...

+ قسەی جوان بکه، هەی...

ڕاستی من کەڕ نەبووم، له بەردەشانی جوانتر گوێم له دەنگی پێی وڵاخ و هەچەهەچی قاچاخچیان بوو، بەڵام وەك پیشەی هەمیشەییم گوێی خۆم کەڕکرد، کەڕبوونم له کەربوون لا باشتر بوو، من به بەردەشانیم دەگوت:

ئەوەی تۆ دەیکەیت کەرایەتیه، ڕێگریه، کەسێك دەو له شیعر بدات، چۆن دەبێت ڕێ له ڕێبواران بگرێت؟ چۆن دەبێت کەرایەتیەکەی بگاته ئەو ئاسته که ڕێگری بکات!

بەردەشانی به تووڕەییەوه:

پێش هەموو شتێك ئەوانه قاچاخچین نەك ڕێبوار، دوایی که ڕێیان لێدەگرم بۆ خۆم نیه، بۆ هەمووانه، ئەو ڕۆژه که بزنەکەمان له جەڵەبەکه گێڕایەوه، کاممان شیشی گەورەترمان لێدەدا؟

دامه بێدەنگی، له دڵی خۆم گوتم، ئەو کێشەیه له گۆشت و گۆشتاوەکەش ئاڵۆزتره.

دەڵێی لەو کاتەوه تا ئێستا گۆشتم نەخواردووه، دوای ئەو هەموو ساڵه حەزم چووه ئەو گۆشتەی که له دەمەو عەسرانێکی ڕەنگه هاوینی بووبێت،

له شیشکەی تفەنگم دەدا، دەمخستە سەر ئەو پۆلووە ئاگرانەی دەتگوت سەر بە ئاگری دۆزەخن، لەوێوە هاتوون، بێ باوەشێنکردن هەر دەگەشانەوە و نەدەکوژانەوە، چۆن ناگەشێنەوە، خوداوەندی با بە دەستەکانی خۆی بەو دەستانەی لە هەموو وەرزێك لە وەرزەکانی قەندیل لە جوولەی هەمیشەییە و ماندوو نابێت، باوەشێنی دەکرد، پیاوی بەژن بڵندی پژدەری جارێك مەتەڵێکی گوت:

ئەو جێگەیە کوێیە ئەگەر با لە هەردوو دنیا ببڕێ، لەوێ نابڕێ؟

کەس مەتەڵەکەی هەڵنەهێنا، خۆی هەڵیدا:

ئێرە، قەندیل...

وا بوو، هەموو بایەك بارەگا ئاسمانیە قەندیلیەکەی دەگرتەوە، کەس قەندیلی بێ با نەدیتووە، کزە با، شنە با، رەشەبا جگە لە هوڕە هەر بایەکت ویستبا، وەك ئاڵا کە هیچ ئاڵایەك هەڵنەدرابوو، دەیشەکاندیەوە.

بەختیار خەرابەیی دەیگوت:

بەوەی خۆشە باوەشێنەشی ناوێ.

نەیدەویست، باوەشێنکردنی بۆچیە، بایەك هەڵیکردووە کڵاو و جەمەدانی دەبا.

بەردەشانی ئەگەر بە رێگریش بێت چاکەیەکی لەگەڵ کردووین، چ ئەسحابەیەك، چ یاوەرێکی عیسا لەگەڵ منداڵی سێوی، لەگەڵ ژنی بێ سەمیانیان نەکردووە، دەمێك بوو گۆشتم نەخواردبوو، شیشکەی تفەنگ پبڕانەدەگەیشت، لە داریش شیشکمان چێکرد، شیشی ئەوەی ئەودەم ناونرابوو شیشی سەدامی، شیشی ئەوهامان لێدەدا، ماستاویشمان هەبوو، نان و پیازیش لە مشە بوو، نازانم کێ بوو گوتی:

بخۆن گۆشتی رێگری بە حەڵاڵی بخۆن.

بەردەشانی کە پێدەچوو دوو سێ پشکە گۆشتی لە زاری بێ:

نازانم حەڵاڵە یان حەرام، بەڵام من چەتە و رێگر نیم.

منیش لە حەڵاڵ و حەرامم نەپرسی، پشتێنم شلکردەوە، بخۆ، بخۆ،

هەتا گرتی تێمکرد، پیاوی بەژن بڵندی پڕدەری هەر جارێك حەڵاڵ و حەرام دەهاتە گۆڕێ دەیگوت:

بخۆن، لە خواردن لەو دنیا پانوپۆڕە یەك شت نابینیەوە بۆ پێشمەرگە حەرام بێت.

بەڵام بە هەڵەدا نەچووبم ئەو قسەیەی لە (حەمە یوسف)ەوە وەرگرتبوو، ئەو حەمە یوسفە لە بارەی حەڵاڵ و حەرامەوە لە شێخەکانی ئەزهەر پتر فتواو لێدوانی دەدا، جارێك راوچیەك ئاژەڵێك راودەکات و بە سەربڕاوی دەیهێنێتەوە، خەڵکی گوند لە دەوری خڕدەبنەوە، دنیادیتە و ئاژەڵناسان نایناسنەوە، یەکەم جاریان بووە ئاژەڵی وا ببینن، زۆر گۆشتن و جوانیش دەبێت، بیخۆن، نەیخۆن، دەبێتە مشتومڕێکی وا وەختە بڵێم ئاژەڵە نەناسراوەکە لە بیردەچێتەوە، لەو کاتە حەمە یوسف دەڵێ:

هەی لە فسێتان بەم، ئێستا ئەگەر چەند ئەسحابەیەك لێرە بان، لەمێژ بوو کەولکرابوو، لە شیش درابوو.

ئەگەر رێم کەوتە دۆڵە کۆگە، سەرێك لە حەمە یوسف و کەوەکانی دەدەم.

هەر من نا، هیدیش هەبوون لەگەڵ بەردەشانیەکە لێیان دەبووە دەمەقڕێ.

دەمەقڕێیەکەم بە وێنە و دەنگەوە لە چاو و گوێیە، بەڵام نە وێنە نە دەنگی ئەو پیاوە ناناسمەوە کە خەریکە ئامبازی بەردەشانی بێت:

+ ئەوەی تۆ دەیکەیت کەرایەتیە.

- ئەگەر ئەوە کەرایەتی بێ، سەرلەبەری شۆڕش کەرایەتیە.

+ ناکرێ شۆڕش بکەیت و رێ لە کاروانچی و قاچاخچی و چەرچی و جەلەبوان وئەوانە نەگریت؟

- لە هەندێ کات ناکرێ، خۆ شۆڕش مار نیە بە خۆڵ بژی.

+ تۆ کە داتە کەرایەتی، کەرترین کەریش ناتگاتێ.

- کوڕە هەی لە هەموو کەران کەرتر، ئەو بارەگایە لە بنجدا

بارەگایەکی گومرگیە، گومرگ وەرگرتن کارێکی رەوایە، نە رێگریە نە کەرایەتیە.

+ من دەڵێم هەردووکیانە.

- یانی بە قسەی تۆ بێت حزب کەر و رێگرە؟!

+ حزب بۆ!

- ئێ، من بە فەرمانی حزب گومرگ وەردەگرم.

+ وا نیە.

+ ئەگەر باوەڕ ناکەیت، بپرسە، تۆ چ ئاگات لە...

- حزب دەڵێ وەك سەگ بە دوای کاروانچیان غاردە و شتیان لێ بستێنە؟!

+ نا، حزب دەڵێ وەك شۆڕشگێڕێك گومرگی خۆت وەرگرە.

بەردەشانی چونکە خۆی بەینی لەگەڵ خواردنەوە نەبوو، دەڵێی دەیەوێ ویسکیەکەم لەبیرباتەوە! بەڵام لە بارەگای ئاسمانی و لە ئێوارەیەکی پایزی و بۆ کەسێك کە هەمیشە لە بەر خۆیەوە هێمن بە هەموو دێرە شەرابیەکانیەوە بڵێتەوە:

**جا کە سەرخۆش بووم**
**بە دەنگێکی نەوی**
**بۆت دەڵێم**
**ئەو شیعرە بەرزەی مەولەوی**

---

تۆ بڵێی بادە لەبیربچێتەوە!

ئێوارە پایزیەکە لە پیاسەیەکی ئێشکگریدا کات دەتگوت تووتنی توندە، نەدەسووتا و نەدەسووتا، بارەگا مەیلەو چۆل بوو، زۆر لە پێشمەرگەکان بە پیاوە بەژن بڵندە پژدەری و بەردەشانیشەوە رەنگە بۆ کارێکی زۆر پێویست بووبێت سەردانی ئەو بارەگایەیان کردبوو کە ئەویش بە لووتکەکەی ئەو بەرەوە دەتگوت هێلانەی باڵندانە بە ئاسمانەوە

هەڵواسراوە، هێشتا ئەو پەڵە هەورانەی لە سەر کێوەکانی بەری رۆژئاوا و سەری کێوەڕەش کە دەتگوت بۆ خۆدانە بەر تاڵە رەنگینەکانی زەردەپەڕ لەوێ هەڵیاندابوو، هێشتا تاریکی نەیشاردبوونەوە، دەنگی پێی وڵاخ هاتە گوێم، پێچەوانەی هەموو جاران ئەو جارە خۆم لەگێلی نەدا، هێواش هێواش شۆڕبوومەوە، گەیشتمە دەو رێ، لە پاڵ گابەردێ وەستام، زۆری نەبرد یەکەم هێستری کاروانچیان گەیشت، دەیانویست تیژ تێپەڕن و تووشیان بە تووشی پێشمەرگەوە نەبێ.

+ ماندوو نەبن.

- سەلامەت بی، کاکە بە خولای لەو بارەگایەی ئەولا زۆریان لێسەندین.

+ من زۆرتان لێناستێنم.

پیاوێکی کەڵەگەتی باریکەلە لێم نزیککەوتەوە:

- باشە ئێمە گومرگ بدەینە چەند حیزب!

+ بە من بڵێ بارەکانتان چی تیایە؟

- .........

هەستمکرد لە هەناسەی پیاوە کەڵەگەتە رەقەڵەکەوە بۆنێکی تیژ تیژتر لەوەی چاوەڕێ دەکرێ هات و رژایە گیانمەوە، بۆنێك زۆر لەو بۆنە دەچوو کە لە زۆر دێرە شیعری هێمنەوە دەهات، لە دڵی خۆم گوتم:

خودایە، ئەو بۆنە هەر ئەو بۆنە بێ و بە هەڵەدا نەچووبم.

گۆتمە قاچاخچیەکە:

+ بۆنێکی زۆر خۆشت لێدێ.

- بڕواناکەم بۆنەکەی خۆش بێت.

+ ئەدی تامی؟

- بڕواناکەم تامیشی خۆش بێت.

+ ئەدی چی خۆشە؟

- جا چی خۆش نیە!

+ کوا، هەتە؟

- حەزت لێیە؟

شووشەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا، ئەو شووشەیە بوو کە من دەمویست، فڕێکی لێدا و خستیە گیرفانیەوە، گەڕایەوە بۆ لای هێسترەکەی، هاتەوە لام، شووشەیەکی درێژی مل باریکی بە دەستەوە بوو:

- لە منەوە بۆ تۆ.

+ چەند دەکات؟

پێکەنی، جوان پێکەنی:

- تۆ دەڵێی پێشمەرگە نیت؟

+من..!

روونینەکردەوە، لە سەری نەڕۆیشت، هەر لەوێ باسی سێ دیاریەکەی خوداوەندی بۆم کرد، ئەوەشی گوت:

- لە هەر سەفەرێك بوتڵێك بۆ تۆ.

+ تا ماوم مەمنوونتم.

کاروان رۆیشت و منیش بە گومرگی خۆمەوە گەڕامەوە بارەگا، هەر لە رێ سەری شووشەی سەر مۆرم هەڵپچڕی و قومم لێیدا.

- ها! چ بوو، باری قاچاخچی.

+ هیچ، کوتاڵ.

- بۆچی بایی دە پازدە قاتێکت نەگێڕایەوە؟

+ کوتاڵی ژنان بوو.

- بڕواناکەم لەو بارانە یەك تیلمە کوتاڵیش هەبووبێ، بەڵام چاکت کرد هیچت نەگێڕایەوە.

+ بۆچی چاکم کرد؟

- کوڕە چوونە سەر رێی کاروانچیان بە پەندچوونە، بەڵام چ بکەین ئەوە تووش بووینە.

+ دە، من شتێکم لێیان وەرگرت؟

- چی؟

+ ئەها، ئەوە.

شووشـە بەژن ژنـانیەکەم نیشـاندا، لە بـارەی شووشـە و بەژنـی ژنـانەوە، (ریاز)ێکم بیرکەوتەوە، ئەو کورە گۆتەیەکی هەبوو زۆری دەگوتەوە:

هەموو شووشەکانی بادە لە بیـرەوە تـا ڤۆدگـا و عەرەق هەر هەموویـان کـــۆپیکراو و گچکەکـــراوەی بەژنـــی ژنـــن، بەژنـــی ژن بە هەمـــوو تەرزەکانیەوە...

سەرهاتم لەگەڵ ئەو ریازەش هەیە، لێ جارێ کاتی گێڕانەوەیم نیە.

ئەو کورەی بوتڵە ویسکیەکەم نیشانی دا، پێشـەی نـاو بـوو، ئەو پێشـەیە دواتر حەفت ساڵ دواتر لە بـن کـۆیێ لەگەڵ حەمەی ئایشـەگوڵ و پـۆلە کورێکی وەك خۆی، من بە چـاوی خـۆم نەمـدیتن، بەڵام چەنـد کەسـێك دیتبوویان پێکەوە دەکەونە بۆسەی براکان و کارێکیان پێـدەکەن ئەنفـال بە گەرمیانی نەکردبـێ، ئەو حەمەی ئایشـەگوڵەش بە خـۆو بە دایـکەوە بـایی یەك کتێب تۆ بڵێ بایی نیو تەمەن سەرهاتیان لە سەرمە و لەسـەر رژانیشـە، خـودایە جـارێ زاری رژان نەکەیـتەوە، وەرنـا سـەرهات بە سـەرێکیدی سەردەکات و ناگیرێتەوە.

پێشە منداڵ بـوو، رەنـگە لە چـاوی مـنەوە منـداڵ خـۆی نیشـان دابـێ، نەیخـواردەوە، پێشـم خـۆش بـوو نەیخـواردەوە، لەبەر دوو هـۆی لە پێشـە سادەتر:

١- حەزمدەکرد ئەو بوتڵە ویسکیە هەمووی بۆ خۆم بێـت، چـونکە زۆر تینووی خواردنەوە بووم، لە بیرم نەمابوو لە کەیەوە نەمخواردبووەوە.

٢- پێشە منـداڵ بـوو، وا بـزانم قەتـیش نەیخواردبـۆوە، حەزم نەکـرد لە سەر دەستی من فێری خواردنەوە بێت.

گۆتمە پێشە:

بەڵام لە لای کەس باسی نەکەی کە من ویسکیم وەرگرتووە.

پێشە بە پێکەنینی منداڵانەوە:

حەیفت نەکرد، هێشتا منت نەناسیوە.

وا بـوو، مـن هێشـتا پێشـەم نەناسـیبوو، ئەگەر بمناسـیایە، قسـەی وام نەدەکرد.

شێتانە ویسکیم فڕدەکرد، هەندێکیم کـردە مەتـارەوە، شـێتانە مـاچێکی نەرمی شووشەکەم کرد و بە نەرمی لە پاڵ بەردێك درێژمکـرد و خسـتمە بن خۆڵەوە، ڕەنگە قسەیەکی وام کردبێ:

تۆ لێرە بخەوە منیش دوای ماوەیەکیدی لە بەهەشت دەخەوم.

ئەوەشم گوت:

بەڵام سبەی کە هاتمەوە، خۆت لێم نەشاریتەوە.

خەوتن لە بەهەشت قسەی من نیە، پێشمەرگەیەك هەبوو بە ناوی ئەبـوو ڕەشا، جارێك رووی لە من نەبوو، بەڵام مـن وا تێگەیشـتم لەگەڵ منیەتـی، ئەبوو ڕەشا گوتی::

ئەگەر بـتەوێ خەون بە بەهەشـتەوە ببینـی و لەو خەونەشـدا تێـر لە بەهەشت بخەویت: هەتا مڕ دەبیت عەرەق بخۆوە.

ئەبـوو ڕەشـا چیرۆکێکـی کارەسـاتاویە، گـۆڕەکەی لە (زەلـێ) یە، بـا جارێ لەوێ بێ، لە سەرهاتێکیدی مردنی تێدا نەبێ. سـەردانی دەکەم و بە قسەی دێنمەوە.

ئێستا دەچم بە لای مەتارەی پڕ لە ویسکیی خۆمەوە، مـن نـازانم نە لە چاوچنۆکیی خۆم بوو نە لەوەی لێم ئاشکرابێ کە ویسـکیم لە قاچاخچیـان وەرگرتووە، کەسم لە ویسکی پێکنەکرد، ئێستا بەو شـەوە پـایزیە، مەسـتم، ئەگەر دەنگم زۆر نا هەر کەمێك خـۆش بـا، پـڕ بە گەروو تێمهەڵـدەکردە گۆرانی، شتێکیشم گوت:

شەوان شەو ناڵێن

مەریەم ئامان مەریەم چاو جوان

مەریەم سابڵاخی

ڕۆژان ڕۆڕۆمە

**مەریەم ئامان....**
**هێجگار پەژارەی**
**مەریەم ئامان مەریەم چاو جوان**
**سوورە گوڵی نێو باخی**
**دووریەکەی تۆمە**
**مەریەم ئامان....**

بە دەنگی نەوی گۆرانیم گوت، بە دەنگی نەوی شیعری هێمن و مەولەویم گوت، بە دەنگی نەوی زۆرم گوت و کەس هیچی نەبیست، چ شەوە پایزیەکی ناسك و جوان بوو خودایە، من بە جوانی و ناسکیەوە گرتبووم، رەنگە بارەگا هەستی بە شتێك و گۆڕانێك لە من کردبێت، بەڵام بە سەر خۆی نەهێنابێت، ئاخر پێشە بە چرپە دەیگوت:

+ قسەت گەلەك خۆش بووە گەلەك، دە فرێکیش بدە من.

- تۆ بێ ئەوەش قسەت خۆشە.

دوو شەو و رۆژی پڕ لە خەیاڵی ناسك و جوانم بەشووشەیەك ویسکی گوزەراند، بتدیتبا، ناوە ناوە چەند دزانە، چەند بە پارێز چەند جوان و عاشقانە، بەرەو بەردەکە دەخزیم، دەچوومە ژوانی بەردا ئەو بەردەی ویسکی بۆم هەڵگرتبوو، ئەو بەردەی تا درەنگیش بۆنی ویسکی گرتبوو، لە دیدی منەوە شێوەی فرۆشگای مەی گرتبوو، ئەو ساتانەی خولیای ویسکی لە سەرم خولیدەخوارد و رووەو بەردە فرۆشگاییەکە دەچووم، ئەگەر بۆ ژوانی ژنێکیش چووبام هەر ئەوها موچڕکە بە گیانمدا دەهات، خۆزی ئەو دوو رۆژە گۆشتیش دەبوو، لە دڵی خۆم لە دڵەوە دەمگوت:

ناکا ئێستا جەڵەبێك پەیدا بێ و بەردەشانی پارێێ، جوانەگایەك بگێڕێتەوە، چەند خۆشە ویسکی بە تکەوە!

جار جارەش سەرکۆنەی خۆمم دەکرد کە کەسم لەو خەیاڵە جوان و ناسکە پێکنەکرد، رێك پێچەوانەی ئەو جەنگاوەرەی کە لە فیلمێکدا دیتم، جەنگاوەرەکە وەك من چاوچنۆك نەبوو، وەك من بەس خۆی

نەویست، لەو شووشە شەرابەی کە لە بن کەپرێك دیتیەوە، تا بەشی دوو برادەرەکەی نەدا دەوی لێنەدا، بە جەنگاوەری ناو فیلمەکە تەلەڤزیۆنم هاتە ناو چاو، بۆوەی لە بارەگا ئاسمانیەکە تەماشایەکی تەلەڤزیۆنیش بکەین، دەبێت بچینەوە زستانێ، بەڵام پێش ئەوەی بەفر دابکات، حەزم لێیە هەر لە پایزەوە باس لەو دابەشکردنەی دنیا بکەم کە لە نێوان خۆم و قاچاخچیەکە برا بەش دابەشمکرد، ئەو قاچاخچیەی ئەگەر ئەو نەبا سەرهات نە بۆنی ویسکی دەدا نە تام، لە بیرمە دنیام ئەوها دابەشکرد:

**هێی، کاروانچی**
**لە هەر سەفەرێکی قەندیلێ**
**بۆ من شووشەیەکی بەژنژنانی و بەس**
**بۆ تۆش دنیا**
**خوای دەکرد**
**دنیات دەخستە بارەوە**
**کابەت دەخستە بارەوە**
**کاروانچی،**
**شووشەیەك بۆ من و گشتی بۆ تۆ**
**باری تۆ بە من چی!**
**کاروانچی...**

نا یەکسەر ناچمەوە هاوین، دەمەوێ کانیی کچانی ببینم، بۆیە لە سەرمە لە پایز بمێنمەوە.

## کچی زار زنە

لە ئاسمانی ئەوێ جگە لە بارەگا چەند رەشماڵیش لە دەو ئەو رێیە هەڵیاندابوو کە دەچۆوە گوێژێ، رەشماڵەکان تەواوێك دووربوون لە بارەگا، لە کانیەکی دەمولێویش ئاویان دەخواردەوە، کانی نا، زنە بوو، ئەو زنەیەی دەڵێم دەتگوت دەمولێوی کچە رەشماڵیەکەیە لە ساتەکانی

پێکەنـین، ڕەنـگە چووانـدنی زنە بە دوو لێـوی کـچ لە دیـدی ئەوانەی زنەکەیـان نەدیتـووە لە جێـی خـۆی نەبـێ، بەڵام هەر کەسێك ئەگەر بـۆ جـارێکیش بـێ، ڕێـی بە زنەکەی نزیـك ڕەشـماڵان کەوتبـێ و هەنـدێك عاشقانە لێی وردبووبێتەوە، دڵنیام دەستخۆشیم لێدەکات بۆ ئەو لێکچوانـدنە ڕەوانبێژیانە.

دنیـا دەمەو پـایزە، زۆری نەمـاوە ڕەشماڵنشـینان بارگەیـان بپێچـنەوە و بارکەن، خودایە وەرز لێرە ڕاگرە و بـا هەر سـەرەتا بـێ و پـایز بە تەواوی نەگات، با کچە جوانەکەی ڕەشماڵ نەڕوات، هەر من نـا زۆر کەس نـزای مانەوەی ڕەشماڵیان دەکرد، هەبوو نـزاکەی بـۆ ژاژی و پەنیـر بـوو، هەبـوو نـزاکەی بـۆ ئەو ئەسـتووکە گەرمە بـوو کە جاروبـار ڕێـی دەکەوتە نـاو ڕەشـماڵان و بە شـەرمەوە لە دەسـتە سـپیلکە پـڕ لۆچەکـانی پـوورە فـاتێی وەردەگـرت، ئـای بە تـام بـوون، هەبـوو حەزی بە مـانەوەی ڕەشـماڵەکان دەکرد هەر لەبەر ئەوەی ئاوەدانی بوون، هەبوون بەڵام نزای من و ئەحمەد عەرەب، لەبەر خاتری مانەوەی ئەو کچە جوانە بوو کە زاری هەمیشە تەڕ و هەمیشە پڕ لە پێکەنینی لە زنەکە دەچـوو، ئەو کـانیەی هەمـوو ڕەشـماڵ لێیان دەخواردەوە، زۆر جار بە خەیاڵی لێـوی کـچە ڕەشـماڵیەکە دەوم بە زنەکەوە دەنا، کچی لێو زنەیی.

ڕۆژێـك مـن و ئەحـمەد عەرەب لە گوێزێـوە دەهـاتینەوە بـۆ بارەگـا ئاسـمانیەکە، لامـان دایە سـەر ئەو زنەیەی ڕەشـماڵی ئـاودەدا، مـن جـاری یەکەمـمە بـێمە سـەر ئەو زنەیە، زنە لە شـاخێکی ڕاکشـاوەوە هەڵـدەقولا، شاخەکە کەمێك لار خـۆی نیشـان دەدا ، شـاخێك هەر جێگەی نووسـتنی دوو ئەوینـداری لێـدەبۆوە، لە لای سـەرێ لە جێگەیەکـی شـاخ درزێکـی گچکە درزێکی لێوی، ڕێك لە شێوەی زار لەو سـاتەی هەردوو لێـوی بـۆ پێکەنین دەکاتەوە، لەو زارەوە ئاوێکی کەم زۆر کەم بە نازەوە لە جوولەدا بـوو، ئـاوەکە کەم بـوو ئەگەر تینـووێکی تینـوو، ئەو تینـووانەی لە شـەڕ دەبەزن و بە قـرچەی گەرمـایێ و بە دۆڕاوی هەورازەرێ دەبـڕن، یەکێـك

لەو تینووانە دەمی پێوە نابا، بەو هەڵقوڵینە رادەگەیشت و دڵۆپە ئاوێك بە لا لێودا لە قیس نەدەچوو.

زۆر لە کانیلەکە وردبوومەوە، ئەحمەد عەرەب گوتی:

+ دەڵێی شیعرت بۆ هاتووە؟

- ئەو زنەیە ناخرێتە شیعرەوە.

+ ئەوجا کچ نەخرێتە شیعرەوە و کانی نەخرێتە شیعرەوە، ئەدی ئەو هێسترە دەخرێتە شیعرەوە؟

هێسترێکیشمان لەگەڵ بوو، کچ نەخستنە شیعرەوە، ئەوەش جارێك هەر لەگەڵ ئەو ئەحمەد عەرەبە، لە بادینان نازانم کوێی بادینان بوو، لامان دایە گوندێك ناوەکەی ناسك بوو لە بیرم ماوە، (بناڤێ) ئا بناڤێ بوو، لەو بناڤێیە چەند کۆپلە شیعریشم نووسیوە، میوانی ماڵێك بووین کچێکی زۆر جوانیان هەبوو، ئەحمەد عەرەب بە عەرەبی گوتی:

ئەگەر شاعیر بیت، شیعرێك بۆ ئەو کچە دەنووسیت.

منیش گوتم:

ئەو کچە ناخرێتە شیعرەوە.

ئەحمەد عەرەب کچەکەی بناڤێشی لەبیر مابوو،گۆتمە ئەحمەد عەرەب:

+ دەزانی ئەو کانیەش کچە، تەماشای بکە چەند لە لێوی کچ دەچێت.

- قسەی تۆیە، پێدەچێت...

ئەوەشم لەبیرە، بۆ ئەحمەد عەرەب باسی جیاوازی کانی و زنەم کرد، ئەو چەندی لە زمانی عەرەبی گەڕا وشەیەکی لە جێی بۆ زنە نەدیتەوە.

رۆژی دواتر من و ئەحمەد عەرەب بە نیازی کڕینی پەنیر چووینە ناو رەشماڵان، کچێکی جوان لە زاری رەشماڵێ راوەستابوو، لەگەڵ ژنێك قسەیان دەکرد و پێدەکەنی، ئەحمەد عەرەب بە عەرەبی گوتی:

تەماشاکە کانیەکە پێدەکەنێ.

چاوم بڕیە کچە و گوتم:

بەڕاستی زاری هەر دەڵێی کانیەکەیە، با ناوی کچی زار زنە بێ.

کچی زار زنە کچێك بوو، شەرمن شەرمن، شەرمی لە پیاو و هەموو شت دەکرد، تەنها لە پێکەنین شەرمن نەبوو، بە هەموو شت پێدەکەنی، کچێك بوو، زۆر... چەند کەسێك هەوڵیان لەگەڵی دا و چاویان لێی دادەگرت، پەشیمانبوونەوە، کچی زار زنە چاوچاوانێی لەگەڵ کەس نەدەکرد، هیچی لەگەڵ کەس نەدەکرد، ئاوڕی لە کەس نەدەدایەوە.

من زوو زانیم هیچم لە کچی زار زنە دەستناکەوێت، بەڵام حەزم لێبوو هەمیشە لە دیارم بێ، هەمیشە تەماشای دەمولێوی بکەم و پێکەنینی ببینم و ببیستم، زۆر جار کە دەچووم نەمدەدیت، دەچوومە دیار زنەکە لە زنەوە کچەم دەدیت.

من بارەگا ئاسمانیەکەم بەجێهێشت، کانی و کچی زار زنەیشم بەجێهێشت، ژنی زار زنەیشم بەجێهێشت، رەنگە بوویێتە ژن، بەڵام دڵنیام پیریش بێ هەر زار زنەیی دەمێنێتەوە، کاتێ هاتمەوە بە سەر هەواری خاڵیدا هاتمەوە، نە رەشماڵ مابوو، نە کچ، کانیش چکی نەکردبوو، بەڵام هەر هێندە تەڕایی تێدا مابوو کە کچی زار زنە شەرمنانە بە زمان لێوە ناسکەکانی تەڕ دەکرد. جارێ هەر دەبێ لە پایز بمێنمەوە .

## ٢٧

جوان نایەتەوە بیرم بەرایی زستان بوو یان کۆتایی زستان، بەڵام ئەوەی ئێستاش وا لە بەر چاومە بەفرە، بەفر لە چۆکان بوو، ئەگەر جێگە قەندیل نەبا، بێ دوودڵی دەمگوت ساڵ لە لە ناوەندی ڕێبەندانێ ڕێی لێگیراوە، چەقیوە، نە بۆ پاش نە بۆ پێش نە تەنیشتا و تەنیشت نابزوێ، بەڵام قەندیل جیایە لە جێیان، زۆر ساڵ لە قەندیلێ ڕێبەندان لە پایزەوە دەستپێدەکات و دەگاتەوە نێرینەی بەهارێش هەر ڕێبەندانە و دوایی نایە، بارەگا سپیە زۆر سپی، بە هەر لایەکدا دەڕوانی سپیە، لە عەردەوە تا ئاسمان هەمووی سپیە، ڕۆژ سپیە، شەو سپیە، پێشمەرگە سپیە، کاروانچی سپیە، هێستر سپیە، گورگ ئەگەر هەبێ سپیە، جا لە قەندیلێ چ سپی نیە! جگە لە سپی، دنیا چ ڕەنگیدی تێدا نیە، تەنها تەلەڤزیۆنەکە ڕەشوسپیە.

ئەو ئێوارەیەی هەواڵی گەیشتنی تەلەڤزیۆن گەیشت، چەندی لە سەری خۆم هێنام و بردم، باوەڕم نەهات لەو چۆلەوانیە ئاسمانیە بە دیار تەلەڤزیۆنەوە دانیشم، ئاخر بۆ ئەودەمانێ تەلەڤزیۆن لە سەری قەندیلێ لە پەڕجوو دەچوو، لە پەرجووش هەندێ هێوەتر، کێ لە بیریەتی بۆ دوا جار کە تەلەڤزیۆنم دیتبێ کەی بووا زۆر لەمێژە، هێشتا قل قلە گوند لە ئیمپراتۆریێتی ئەنفال بە پێوە مابوون، لە ماڵێك بۆ ماوەی جگەرەخۆرێك بە دیار تەلەڤزیۆنەوە دانیشتم.

بە چوار پێنج پێشمەرگە بەردێکی گەورەیان بە غلۆرە هێنایە ژوورێ، بەردێك دەتگوت بەردتاش تایبەت بۆ ئەوەی تراشیوە کە تەلەڤزیۆنی لە سەر دانێی، شۆڕش لەگەڵ سێ چوارێك بە ئالیار بەستنەوە خەریکبوون، نەسعەد و یەك دووانێك جێگۆڕکێیان بە پاتریەکی گەورە دەکرد، پیاوی بەژن بڵندی پڕدەریش ناوە ناوە دەیگوت:

دەترسم هێندە خۆشمان ماندوو کرد، دەست لە گونانیش بمێنینەوە و هیچ جێگایەك وەرنەگرێت.

له بیرم بێ، پیاوی بەژن بڵندی پژدەری لەگەڵ هێنانی تەلەفزیۆن نەبوو بۆ بارەگا، دەیگوت:

بۆ ئەو بارەگایە نابێت، بە خودای تەلەفزیۆنمان هەبێ، ئاگامان لە قوونی خۆمان نامینێ، هەر بە دەست دەگیرێین، نابینن مۆڵگەی جاش و سەربازان چەند نزیکە...

زۆریان لەگەڵ هەوڵدا، هەتا پیاوی بەژن بڵندی پژدەری دڵی نەرم بوو، بابم ئاسا دڵی نەرم بوو، بەرد لە بن بەفری ئەستوورەوە بە زمان هات

هێند بە گەرمی سەرگەرمی رێکخستنی تەلەفزیۆن بووین، بەفر و سەرما قەندیلیان جێهێشتبوو، رەنگە لە هەمووان پتر من تامم لەو سەرگەرمیە تامکردبێ، رێك دەتگوت ئەو کاتەیە کە بابم لە قسەی مەلای بەلاشاوە دەرچوو، لە لای خۆیەوە بە نابەدڵی فتوای حەڵاڵبوونی تەلەفزیۆنی دەرکرد و من کە باخۆش ببووم، پارەم لە دایکم وەرگرت و چوومە بازاڕ و بە تەلەفزیۆنێکی گچکەی رەشوسپیەوە هاتمەوە، ئەو تەلەفزیۆنە چەند بەو دەچێ! قسەیەك لەو مەلایە نەکەم دڵم دەتەقێ، ئەو مەلایەی چەند ساڵێك منی لە ناز و نیعمەتی تەلەفزیۆن بێبەری کرد، مەلا دەیگوت:

لە دنیایێ بە فەرمانی خودای گەورە حەرام زۆرن، زۆر شت هەن ئەگەر بیانکەیت، رێ و رێ دەتگەیەننەوە دۆزەخ و دەرچوونت بۆی نیە، بۆیە لە سەرمە بە ناوی خودای گەورە ئامۆژگاری برای موسڵمان بکەم:

١- تا بۆت دەکرێ رێ نەدەیت تەلەفزیۆن بێتە ماڵتەوە و ماڵت داگیربکات.

٢- تا بۆت دەکرێ رێ نەدەیت کچ و خوشکت بچنە قۆتابخانە.

٣- تا بۆت دەکرێ رێ نەدەیت لنگ رووت لە ماڵتدا هەبێ.

خۆشیەکەی لەوەبوو خۆی تەلەفزیۆنی هەبوو، کچەکانیشی دەچوونە قوتابخانە و لنگ رووتیش بوون، لەوەش خۆشتر ئەوەبوو بابم دەروێشانە ئامۆژگاریەکانی مەلای بە سەر ماڵی خۆیدا پێڕەو دەکرد، کاتێکیش دەمانگوت:

+ بابە، مەلا بە خۆی بە قسەی خۆی ناکات تۆ بۆ بە قسەی دەکەیت؟
- مەلا دەڵێ، بە گفتارم بکەن بە کردارم مەکەن، من دەزانـم قسـەکانی مەلا راستە، بەڵام ئەوە هەیە دەسەڵاتی بە سەر ماڵی خۆیدا ناشکێ.

بابم لە هیچ شتێ دڵی ئێمەی نەدەشکاند، تەلەڤزیۆن نەبێ، ئەویـش بە تکا تکای دەکرد، کە خولیای تەلەڤزیۆن لە سـەرمان دەربکەیـن، بەڵام کە زانی بەلاشە، ملی دا.

نۆرەی ئێشکگریم هات، بە ناو بەفـردا سـووڕێکم بە دەوری بارەگـادا لێـدا، بە نـاو شـەوی سـپیدا دەنگـی چەنـد تۆپێـك هـات، چ نەبـوو دوور کەوتنەوە، چەند تۆپێکیدیش، دوورتر کەوتنەوە، بەفر دایکـردەوە، بـایەکی تونـد هەڵیکـرد، رەنـگە زریـانێکی گەورە بەڕێـوە بـێ، بەرەو بێـراییەکە هاتمەوە.

+ هات، جاش هات، چەند زۆرن زۆر.
- ئەوە تەلەڤزیۆنی کەرکووکە!

بە خۆم نەوەستام، سەرێکم بە ژوورێدا گـرت، رەوە جاشـێکم دیـت و تیژ تێپەڕین، باش بوو لەو کاتە مـاوەی ئێشـکگریم تەواو بـوو، منـداڵانە بە دیار تەلەڤزیۆنەوە دانیشتم، عادل ئیمام لەو لاوە هات و لە تەنیشت ژنێکـی جوان تا خوا حەزبکات جوان، جوان دانیشت و بێ ئەوەی شـەرم بکـات، پوختە ماچێکی قووڵی دەمـی کـرد، مـاچێکی تەڕ هێنـد تەڕ راسـتە مـاچی سینەمایی بوو، بەڵام ئەگەر لە تەنیشتیشمەوە با، هەر هێندە دەومی پڕ لە ئاو دەکرد، ئەو ژنەی عادل ئیمام ماچی کرد، لەمێژبوو دەمناسی، هەر لە باری دانیشتن و ماچەوە دەمناسی، هاتەوە بیرم کە لە کـوێم ناسـی، منـداڵ بـووم زۆر منداڵ، یەکەم جارم بوو بە دیار تەلەڤزیۆنەوە دانیشـم و ببیـنم، پێشـتر یەك دوو جـارێ بە دەم رێـوە لەو چایخـانەیەی لە سـەیداوەی هەولێـر کەوتبووە سەر جـادەی شەسـت مەتـری، چـاوێکم دابـووە تەلەڤزیـۆنەکەی چایخـانەو چەنـد وێـنەیەك تیـژ بە چاومـدا تێپەڕیـوون، بەڵام ئەو جـارەی دەیڵێم، هەر لە سەیداوە نزیك تانکی ئەو تـانکیەی گەڕەکـی ئـاودەدا، ئەو

تانکیەی لە دیدی منەوە بەشێك بوو لە ئاسمان و پەیوەندیی بە زەویەوە نەمابوو، ئەو تانکیەی گشت بەردی بەستێم هاویشتێ بەردێك نەیگەیشتێ، ئەو تانکیەی جارێك بە هۆی گوللەوە بوو یا هەر لە خۆوە کونێکی تێبوو، ئاو رژا، هەر رژا، من تا درەنگیش هەر وا تێگەیشتم ئاسمان کون بووە، لە نزیك تانکی خزممان زۆر هەبوو، جێژنانێك لەگەڵ دایکم چووینەماڵێك لەو ماڵانە حاجی رەزای ناوبوو، ئەوانیش تازە تەلەڤزیۆنیان کڕیبوو، لەو ماڵە لە تەنیشت دایکمەوە، بە چوون چووبوومە ناو تەلەڤزیۆنەکەوە و لەوێ ئەو ژنەی ماچی دایە عادل ئیمام، ماچی دایە پیاوێکیدی، ئەوکات چم لە ماچی نێوان ژن و پیاوان نەدەزانی، چ تامم لێیوەرنەدەگرت، بەڵام تامی دنیام لە بینینی تەلەڤزیۆن وەرگرت، بە من با هەر لەوێ دادەنیشتم و هەڵنەدەستام، ئێستاش، ئێستای ژوورە لە ئاسمان هەڵچنراوەکەی بارەگا ئاسمانیەکە هەمان چێژی منداڵانە و گەورانە لە بینینی تەلەڤزیۆن وەردەگرم...

نەدەبوو شەوی لە دوو سێ کاتژمێر پتر تەلەڤزیۆن کاربکات، پاتری بەرگەی نەدەگرت، من وا بزانم لەو کەژەی تەلەڤزیۆن تەنها حەفت شەو لە بارەگا ئاسمانیەکە مامەوە، ئەو حەفت شەوە لە کنە من خۆشترین شەو بوون لە شەوانی پێشمەرگایەتی، شەوی بن بەردە نەرمەکە لەوێ، ئەو بەردەی ژنی لێ روا! بەڵام پڕ لە ساتی زۆر ناخۆشیش، ناخۆشتر لەو ساتانەی بە منداڵی پێش ئەوەی بابم لە قسەی مەلا دەربچێ، دەچووینە مێوانداری و بە دیار تەلەڤزیۆنەوە دایکم گوتەنی:

دیسان دەمت بستێك بەش کردەوە

ئا، لەو ساتانەی زارم بستێك بەش دەکردەوە، دوای ((درەنگە، نا زووە، بە خودای زۆر درەنگە، دەبێت بڕۆین)) خاوەن ماڵ دەیگوتە منداڵەکانی:

پێڵاو، پێڵاو، پێڵاوەکان دانێن.

خۆزگەم دەخواست کە پێڵاو دانان کاتێکی زۆری بوێ، خۆزگەم دەخواست هەستان لە بیربچێتەوە، تا پتر تەماشای تەلەڤزیۆن بکەم، ئێستاش

که کاتی ئێشکگریم نزیك دەبێتەوە، خۆزگە دەخوازم ئێشکگر خۆی لە بیربکات و بۆ منیشی بگرێت و بانگمنەکات، بەڵام هەیهو! ئێشکگر هەیە لە قەندیلێ، قەندیلی سەهۆڵبەندان، بە تایبەتیش ئەگەر هێزی موگناتیسیی تەلەڤزیۆن راتکێشیتە ژوورەوە، کات لە بیربکات! ئێشکگر هەمیشە چرکە چرکە کات دەژمێرێ، تەلەڤزیۆنەکەی بارەگا ئاسمانیەکە هەموو لایەکی وەردەگرت، لە کەرکووکەوە بازنەیی پێدا بڕۆ تا دەگەیتەوە کەرکووك هەمووی وەردەگرت، جگە لە کەرکووکە کوردیەکە عەرەبی بە عێراق و سووریایەوە و تورکی و فارسیش، پێشمەرگەیەك دەیگوت:

دە ئالیارەکەی کەمێکیدی بادە، بەڵکو رووسیاش وەرگرێ.

پێشمەرگەیەکیدی بە لاقرتێ و تیزەوە:

زۆری با مەدەن دەنا ئەمریکاش وەردەگرێ.

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری دەیگوت:

بەراستی تەلەڤزیۆنەکی نێونەتەوەییە.

سەیر بوو هێشتا کەس ناوی سەتەلایتیشی نەبیستبوو، ئێمە لە سەری قەندیلێ بە دیار سەتەلایتەوە دانیشتبووین! لە دنیایێ، لە کێندەری دنیایێ تەلەڤزیۆن ئەو هەموو کەنالەی وەردەگرت! قسەی پیاوی بەژن بڵندی پژدەری خەریکە راست دەرچێ و بە هۆی تەلەڤزیۆنەوە ئاگامان لە قوونی خۆشمان نەمێنێ، ئێشکگریش گرفتی کەوتێ، کەس نەبوو گلەیی لە بەختی خۆی نەکات:

- دوێنێش ئێشکگریی من کەوتە کاتی تەلەڤزیۆنەوە.

- من دوێنێش گوێم لە هەواڵەکان نەبوو.

- ئەورۆش زنجیرەی.... نەبینم

- نایەکسانی زۆر هەیە لە ئێشکگری.

- پێش هاتنی تەلەڤزیۆن ئێشکگریی من هەمیشە دەکەوتە دوای نیوە شەوان، کەچی ئێستا سەر لە ئێوارەیە.

منیش نەنکم گوتەنی، زارم پڕ لە گازندە بوو، بەڵام هەموویم لە زگی

خۆم هێشتەوە و هیچیم بە گۆڕێ وەرنەکرد.

پیاوی بەژن بڵندی پڕدەری کە هیچ کێشەیەکی بارەگا نەبوو لە دەستی وی دەرچێ و چارەی نەکات، بۆ ئەو کێشەیەش چارەی دیتەوە، پرسی:

+ ئەرێ چەند کاتژمێر کار بە تەلەڤزیۆن دەکەن؟

- دەگاتە سێ و ناگاتێ.

+ باشە، چوار کەڕەت سێ دەکاتە چەند؟

- لەبەر خاتری تۆ با دوازدە بێ

+ لەم شەوەوە لە ماوەی تەلەڤزیۆن دەبێت دوازدە پێشمەرگە ئێشکگری بگرن.

- دوازدە! ئێ، کێ دەمێنێتەوە!

- بەس خۆت دەمێنیتەوە، بە تۆوە ژمارەمان سێزدەیە.

- ئەدی کاتەکانیدی کێ ئێشکگریمان لێبگرێت! جاش!

پیاوی بەژن بڵندی بڕدەری بە پێکەنینەوە گوتی:

ئەرێ گێلن، یان منتان پێ گێلە!

نازانم کێ بوو لە سەرەخۆ گوتی:

رەنگە هەردوو لا.

دوای کرببوونەوەی پێکەنین، پێکەنینێك دوور نیە گەیشتبێتە گوێی جاش و سەربازانیش، پیاوی بەژن بڵندی پڕدەری وای روونکردەوە:

دوو لیستی ئێشکگریمان دەبێت، لیستێکیان بۆ ئەو ماوەیەیە کە تەلەڤزیۆنی نێودەولەتیکەم قسەی باش و زۆرتر قسەی قۆڕ دەکات و جاروباریش وێنەی جوان نیشان دەدات، لیستەکەیدیش وەك جاران، لە ماوی تەلەڤزیۆن هەر پێشمەرگەیە یەك چارەگ ئێشکگری دەگرێت، هی منیش بخەنە ئەو کاتەی جاشەکانی پڕدەرێ دێنە سەر شاشە!

پێشە هەڵیدایێ:

ئەدی ئەگەر جاشەکان نەهاتن!

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری:

دێـن، بەڵام ئەگەر ڕێکـنەکەوت بـێن، بـخەنە ئەو کـاتەی کە بەفـر و زریان نیشان دەدات.

من پرسیم:

بۆچی کاتی زریان!

پیـاوی بەژن بلنـدی پـژدەری، وەك بلێـی خـۆی ئامادەکردبێـت بـۆ پرسیارێکی وا:

من لە زریانی قەندیلێ نەترساوم و ناترسێم، بەڵام بە دەست خۆم نیە بە دیتنی زریانی ناو تەلەفزیۆنێ ترسم لێدەنیشێ.

گوتم:

تۆ لەوە پێچەوانەی دنیای.

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری:

هەر کەسە و لە شتێك دەگەل دنیا بەرەواژە.

حەزم لێیە لە زریـانەکەی پیـاوی بەژن بلنـدی پـژدەریەوە بە پێـی خـۆم بچـمە زریـانێکی تووشـەوە، ڕەنـگە بـۆ هێنـانی پـاتری بـووبێ، دەبـوو لە ئاسمانەوە دابەزم و بچمە گوێزێ، گوێزێ لە چاو ئەو دوو دوندە ئاسـمانیە کەوتۆتە سەر زەوی، بەفر هێند بە ناز و نەرمی دەباری، پەپـوولەش حەزی دەچووە بەر بەفرێ، هەستمدەکرد ئەوە بەفر نیە دەنیشێتە سەرلەشـم، بەلکـو پەپوولەیە، باڵی پەپوولەیە لە ئاسمانەوە دێ و هەڵدەنیشێ، قەت دنیـا وا بـێ با نەبووە، بایی هەناسـەش بـای نەدەهـات، بەفـر لە کـوێی ئاسـمانەوە هەور هەڵیدەدا، زەوی لە هەمان جێوە وەریدەگرتەوە،

بەفر بستێك کەوتووە، جلەوی هێسـترم بە دەسـتەوەیە نەرم نەرم بە بـن بارینی نەرمی بەفر و بە سەر بەفری نەرمدا مـن و هێسـتر لە زەویەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەگەڕێن، دنیا سارد نەبـوو، لە سـاتی بەفـر بـارینێ ئەگەر بـای لەگەڵ نەبێ، با ڕێت لە قەنـدیلێش بێـت، هەوای مەیـلەو گەرمە، مـن زۆر جار چێژم لە بەفر وەرگرتووە، بەڵام ئەو جارەی دەیلـێم چێژێکـی تـایبەتی

بوو، ئەگەر زریانی بە دوادا نەهاتایە، رەنگە تایبەتتر و نموونەییتر و بالاتر با، دوور نیە چێژەکە پەیوەندیشی بەو فیلمەوە هەبووبێ کە شەوی پێشتر لە تەلەفزیۆنەوە دیبووم.

لەو فیلمە راوچییەك لە بەفردا رێ هەڵدەکات و هەڵەتە دەبێت و لە دنیا بزردەبێت، دوو سێ گوللەش بە دنیاوە دەنێ، کەس بە هاواریەوە ناچێ، لە جێگەیەکی وا بە دنیا دەکەوێتەوە، خۆزگە لە جیاتی ئەو من دەبووم، ئەشکەفتێکی گەورە، پیاوە بزربووەکەی لە باوەشی خۆی گەرمکردەوە، ئاگرێکی گەورەی کردەوە، خۆی وشککردەوە، هەر لەوێ بزنە کێویەك وەك ئەوەی خودا بۆی ناردبێت، پەیدابوو، کردیە قوربانی دوو گوللە و هەر هێندەی دوو جگەرە بکێشی گۆشت لە سەر پۆلووی ئاگر چزەی گەیشتە گوێم، وەختە بڵێم بۆنیشی هات، زۆری نەبرد نازانم نە بەراستی بوو نە راوچی خەونی دیت، خوداوەند کچێکی بە دیاری بە راوچی بەخشی، بەو چاوانەی خۆم دیتم چوونە باوەشی یەکەوە، بڕی، نەمدیت، لەو گرتە خوداوەندیەی کردین.

منیش کەوتبوومە خەیاڵێکی راوچیانەوە، ئەو راوچییەی خوداوەند لە خۆوە بزن و ژنی بۆی نارد، بەفر بەفر، جڵەوی هێسترم بە دەستەوە، سەرکەوە سەرکەوە، بە جڵەوی هێستر قسەیەکی خۆشی هێسترم بیرکەوتەوە، ئەو پیاوەی کە قسەی هێستری بۆم گێڕایەوە، خەڵکی بن (سەفین) بوو، ئەو پیاوە سەفینیە لە پێشەکیدا ئەوەی بۆم روونکردەوە کە هەر کاتێ هێستر هاتە قسە، لە هەموو کەس جوانتر قسە دەکات، پیاوە سەفینیەکە ئەوها قسەی هێستری بۆ من گێڕایەوە:

هێستر لە هەموو تەمەنی خۆی یەکجار بە قسە هاتووە، ئەویش چۆنی دەگێڕمەوە ئەوهابوو، شەوێکی بەفراوی باپیرم بە خۆ و بە هێسترەوە رێی دەکەوێتە ئەو بنارەی سەفینێ، وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی هێستری پێش خۆی دا و دەستی بە کلکیەوە گرت، دەبینێ هێستر جەنە دەگرێ و رێ ناگرێ، هەچەی دنیای لێدەکات، بەلاشە، بەڵام کە جڵەوی رادەکێشێ

جەنەکە بەریدەدا، ئیدی بە توندی زۆر بە توندی لە هێستر دەپرسێ:

بە من بڵێ ئەو غەزرینەت لە چیە؟ بۆچی بە پێشم ناکەویت و وەك پیاوان رێ ناگری!

وا بە توندی لە بەرد بخورێ دیتە گۆ، خۆ هێستر لە بەرد رەقتر نیە، هێستر گوتبووی:

لە رۆژ لە شەو لە تاریکایی شەو، لە باوبۆرانێ، دەست بە کلکمەوە بگرە و کێندەرێت دەوێ دەتگەیەنمێ، بەڵام هەر کاتێ بەفر دنیای داپۆشی، تۆ پێش کەوە و من کلکی تۆ دەگرم!

من و هێستر وا بە سپێتی دنیادا رووەو ئاسمان هەڵدەگەڕێین، ئەها دەڵێی با هەڵیکرد، هەڵیکرد لەو دۆڵەوە هەڵیکرد کە دەکەوێتە دەستی چەپەوە، توندتری کرد، خوداوەندی با دەرگای با نەکەیتەوە، من خۆشیم لەو بایە نایە کە لە ساتی بەفربارینا لە قەندیلێ هەڵدەکات، با ئاراستەی گۆڕا، لە راستەوە دێ، بەفر گێژدەدا، با لە ئاسمانەوە لە زەویەوە هەڵیکرد، گوێم لە لوورەیە، با دەلوورێنێ، با دەڵێی لە ناو زەویەوە لە بن بەفرەوە هەڵیکردووە، بەفر لە زەویەوە بە سەر ئاسماندا دەبارێ، ساردی کرد زۆر سارد، با دەڵێی گوێزانە دەتبڕێ، بەوەی باشە ساقۆیەکەم گەرمە، سەرکڵاوێکی تووکنی هەیە، سەربازیە، رەنگە پێشتر هی ئەفسەرێکی سەرشان پڕ لە ئەستێرە بووبێ، دەبێت هەر مەمنوونی ئەبوو سۆسەن بم، پێش چەندێك بە پێکەنینێکی شیرنەوە ئەو ساقۆیەی پێشکەشکردم، چەندی گوتم:

- نامەوێ، هاوڕێ، نامەوێ، ئەوە نیە ساقۆم هەیە.

+ ئەوە ساقۆیە لەبەرتە! هەمووی ونجڕونجڕە، بەرگەی زریانێك ناگرێ.

وابوو، بەرگەی ئەو زریانەی نەدەگرت، ئەبوو سۆسەنیش چیرۆکێکی بێ سەر و بنە، ئەگەر لە (( پایزی شینێ)) نازنازی سۆسەن زیندانیی وەرنەگرتبا، لێرە بە خزمی نیلسۆن ماندێلا ناوم دەبرد، چونکە کەمێك لەو کەمتر لە زیندانێ تەمەنی کرد.

خوداوەندی زریان ئاگـات لـێم بـێ و بمپـارێزە، مـن زراوم لە زریـان چووە، چاوم چ نابینێ خوداوەند، زریان، زریـان، بەفـر گێـژدەدا گێـژدەدا، لەگەڵ خۆیـدا گێـژ بە هەوراز دەدا، بەر پێـی خـۆم نـابینم، ئاراسـتەکان تێکەڵن و چەپ و راستم ناناسمەوە، نازانم بە کام لادا مل لە بەفر بنێم، چ وا زوو بەفر گەیشتە چۆکان، جلەوی هێسـتر هەر بە دەسـتمەوە، هێسـتر لە مـن شـپرزەتر، خوداوەنـدی روونـاکی روونـاکیەك بـخە دنیـاوە، وا بـڕوا رەقهەڵدێم، خوداوەند، کونی با داخە، با بە ئاسمانێم دێخێ، با دەمخاتە بن بەفـرەوە، بـا هەڵمـەدەدێرێتە هەڵـدێران، ئەو هەمـوو بـایە لە کوێـوە هـاتن، هەرچی با هەیە هەڵیکردووە، با لە هەموو لایەکەوە دێ، تا تەماشـای بەفـر نەکەیت، لە شەڕی با تێناگەیت، خوداوەنـد بەسـە زریـان زیـڕەی پێکـردم، ئەگەر غەزەبت لە منیش گرتووە، بیکە خاتری هێسترە رەش، ئەو گونـاهی چیە، ئای ئەو جارەش هێسـتر بە رەشـی ببینـمەوە! وا رەقهەڵاتـم هەر بـایی جوولەیەکی کیسەڵی هێز لە پێمدا مـاوە، هێـزی دەستیشـم هەر بەشـی ئەوە دەکات، جار جـارە بەفـری سـەر دەموچـاوم بمـاڵێ، مـن کەوتـوومەتە بەر غەزەبی بـا، پاشـۆل پاشـۆل بە هەمـوو هێـزی خـۆی بەفـر بە دەموچاومـدا دەکات، با لە با وەردەگرێتەوە، دەموچاوی من گۆڕەپانی یـاریە، بایەکـانی قەندیل بە بەفرەوە یـاری تێـدا دەکەن، خـودایە کەس وەك مـن و هێسـترە رەشی بە سەر نەیەت، ئەگەر بە رەشی مابێتەوە! خوداوەند، کەس نەخەیـتە ناو زریانی قەندیلەوە، خوداوەند، ئەو زریـانە سەرشـێتەت بگـرەوە، گەمەی زریان گەمە نیە، سێ گوللەی یەك لە دوای یەکم بە زریانەوە نا، گوللەی هـاوار، هـاوار بـۆ بارەگـا، رەنـگە لەو کـاتە گـوێم لە دەنگـی گـوللەی راوچـیەکەی نـاو فـیلمەکە بووێـت، بە زمانێـك کە تێـبگەن بە گوللەکـانم گوت کە بڵێن:

هاوارە، بارەگا هـاوارە، بیـانگەنێ، پێشـمەرگەیەك و هێسـترێك کەوتـنە بەر غەزەبی زریانەوە، زریان هەڵەتەی کردن، زریان بردنی، بردنی بۆ مـاڵی بزربوون و پێنەکەوتنەوە، بارەگا، هاوارە، هاوار.

ترسام، زۆریش ترسام، ڕەنگە مردن بەڕێوە بێ، ئەوەتە سینگم گیراوە و بە ئاستەم هەناسە دەدەم، سەرماش نەمکوژێت، گورگ دەمخوات، ئێستا نا ئێستا گەلەگورگێک دێن و بە هێسترەوە دەمخۆن، ڕەنگە هێسترەکە لە پێش من بخۆن! چ مردنێکی سەخت و بە ئازارە مردن لە ناو کەڵپەی گورگ، دیومە بە چاوی خۆم دیومە لە تەلەفزیۆن دیومە چۆن گورگ بەردەبێتە مرۆڤ و پارچە پارچەی دەکات، بیستوومە زۆر سەرهات و چیرۆکم لە بارەی گورگخواردووانەوە بیستووە، منیش بە دەردی ئەوان دەچم، منی ئاوگەلە بوو، بزن ئاسا گورگ دەمخوات.

نا من نابمە خۆراکی گورگ، ئەوە نیە چەکم پێیە، بایی چەند ڕەوە گورگێك فیشەکم پێیە، خۆ هەر یەك دووانێکیان بریندار بکەم، ئەوانیدی وازم لێدێنن، باپیرم وای دەگوت، باپیرم گورگناس بوو، هەزار سەرهاتی لەگەڵ گورگان هەبوو، دەیگوت:

زستانێکی بەفراوی ئەها لەو زوورگانەی ڕۆژهەڵاتی هەولێرێ، ڕەوە گورگێکم لێپەیدا بوو، زانیم نیازیان خراپە، من لەوان بە دەستوبردتر بووم، گوللەیەکم هاویشتێ، قرووسکەیەك هات، دیتم گورگێك سووڕا بە دەوری خۆیدا هەر سووڕا و کەوت، هەرچی گورگ بوو کەوتنە گیانی بریندارەکەیانەوە...

منیش دەبێت وەك باپیرم بکەم، لە جیاتی گوللەیەك حەفت گوللە دەهاوێم، حەفت گورگ لە سەر قوون دەسووڕێنم، بەڵام لەو تاریکیەی دنیا بە چ چاوێك گورگ ببینم، خۆ من لە ناو ئەو زریانە شێتە بەر پێی خۆم نابینم، تۆ بڵێی دەستم توانای گرتنی تفەنگی هەبێت، هەر چۆنێك بوو دەسرێژێکم بە دنیاوە نا، ئێ بارەگا گوێیان لێبێ و بە هاوارمەوە بێن، باشە هێشتا توانای تفەنگ ڕاگرتنم ماوە، ترسی گورگ بەرم نادا، بەڵام تۆ بڵێی لە قەندیلێ دڕندە و ئاژەڵ مابن، هەرچی تۆپ و گوللەی دنیا هەیە ڕوویان لە قەندیلە، بڕواناکەم جگە لە پێشمەرگە گیانلەبەری تێدا هەناسە بدا، ئەنفال هەمووی قڕکرد، نا بڕواناکەم گورگ قڕانی تێکەوتبێ بۆ

بەدبەختی من قەندیل ڕەوە گورگێکی لە خۆی شاردۆتەوە و هەر دیتت گەیشتن و لە پڕ پەلاماریان دام و بە دەستهەڵێنانەوە ڕاناگەم، تا ئێستا جڵەوی هێستر هەر بە دەستمەوە، لێکدانەبڕاوین، زریان لێکیدانەبڕین، من و هێستر خەریکە لە دنیا دادەبڕێین بەڵام لێکدی دانابڕێین، من کە دەستم لە جڵەوی هێستر بەرنەدەبوو ڕەنگە لە ترسەوە بوو‌بێت، ترسی تەنیایی، هێستر بۆ من ئاوەدانی بوو...

لە سەر بەفری ئەستوور، لە بەر زریانی تووش، تا لە پێ جوولە هەبێ، لە سەریش ئومێد بە ژیان دەمێنێ، من و هێستر لە ڕۆیشتن نەکەوتین، هێور هێور بەفری ئەستوور دەشکێنین و زریان زریان دەڕۆین، کێ دەزانێ ڕوو لە کوێین! ماندووین، من ماندوو، هێستر ماندوو، تا خوداوەندی زریان حەزبکات ماندووین، زریان ماندوو نابێ و نابێ، ترس، ترس لە سەرما، چەند سەختە سەرما بتکوژێت، ترس لە گورگ بێنە بەر چاوت کە گورگ دەم دەخاتە ورگتەوە، ترس لە کەوتنە دەستی جاش و سەربازانیش سەرباری ترسان، من کە نەزانم بەرەو کوێ دەکشێم، دوور نیە بە پێی خۆم بچمە باوەشی جاشان، باوەشی سەربازان، هەینێ چی دەقەومێ! دەبێت خۆزی بە مردنی باوەشی سەرما و مردنی ناو دەمی گورگ بخوازم، دایکم دوای کوژرانی عەباس قسەیەکی کێشدار و سەرواداری بۆ هات و لە زۆر بۆنە دەیگوتەوە:

**بکەویە دەوی گورگ و بەرازان**

**نەکەویە دەستی جاش و سەربازان**

ترسم لەوەبوو منیش بە دەردی عەباس بچم، عەباس وەك دەیانگوت حەزی لە پێشمەرگایەتی نەبووە، بەڵام دوژمنایەتی بە چیای ئێخست، تازە پێشمەرگە پەیدابوونەوە، ئێوارەیەك لەگەڵ دوو پێشمەرگەیدی، لە لای ڕۆژهەڵاتەوە بە نیازی نازانم چی بەست و بەست، ئەودەم بەستێکی زۆر گەورە لە هەولێری دەکردەوە، ڕووەو شار دێن، لە پەڕگەی شار دەکەونە بۆسەوە، دەڵێن مەردانە هاتبوونە دەست، دوای شەڕێکی باش بە برینداری

دەکەونە دەستی سەرباز و جاشان، دوای سێ ڕۆژ تەرمەکەی عەباس هاتەوە، لە کاتی شووشتنی بە ترسەوە چوومە سەری، تەرمشۆر بە ترسەوە دەیگوت:

خودا لە دوڕ دەویان بدا، ددانیشیان دەرهێناوە، بە گاز گۆشتیان لێکردۆتەوە، خودایە ئەو زۆرداریە هەڵنەگریت.

وا بوو قسەی تەرمشۆر بوو، ددانیان لە دەم نەهێشتبوو، لە هەموو لەشیەوە جێی گاز دیار بوو، لەو ڕۆژەوە من زراوم لە جاش و سەرباز چوو، لەو ڕۆژەوە خوێتی تۆڵە لە لەشمدا بزووت، تۆڵەی عەباس لە سەرباز و جاشان، لەو ڕۆژەوە دایکم قسە سەرواداراەکەی کرد و ڕەنگە ئێستاش هەر بیڵێ و بیڵێتەوە... خوداوەندی ڕێوبانان بەرەوکوێ هەڵمدەگری هەڵمگرە، بەس نەمبەیتەوە مۆڵگەی جاش و سەربازان و بە دەردەکەی عەباسی خزممانم نەبەیت.

من لەو ساتە لە ڕەشوێرەیەکی کەسیرە بوو دەچم، بەچکە کتکێ دەرۆستم دێ.

ڕەنگە سێ کاتژمێر بێ زریان من و هێستر گێژدەدا، بایەکان هەر هەموو بایەکان هەڵیانکردووە، بایی زستانێك بەفریان بە من وهێستردا کردووە، پێداکردنێك هەر لە سرووشتی دڵڕەق و تووڕە دەوەشێتەوە، سرووشت کە دایە تووڕەیی و هێرشی هێنا، مرۆڤ پرزەی پووشکەیەکی تێدا نامێنێ، ئەوجارەش دوو سێ گوللەم بە سرووشتی شێتەوە نا، کەس بە هاوارمەوە نەهات، زریان داناکەوێ، چۆن دەزانم مردن ناهەقە، ئەوها دەزانم مەرگی منی لە چاوە، تا بۆ خۆیم نەباتەوە قەندیل چۆلناکات و لێناکاتەوە، ماڵئاوا زۆر بە نابەدڵی ماڵئاوا ژیان، ئەوە مەرگ گەیشت، مەرگ وا گەیشت، هەر دیتت لە ناو بەفرێ ڕەقهەڵاتم، ڕەقیش هەڵنێم گورگ دەگەن و بە هێسترەوە ونجڕونجڕمان دەکەن، قەینا بەس نەکەومە دەستی جاش و سەربازان.

ڕەنگە وەك چۆن زریان گێژی پێدەدام، ئەوهاش وڕێنە لوولی دابم،

نازانم چەندی پێچوو، نازانم چەند نزام خوێندووە و چەند گۆلك و بەرانم لە خۆم گرتووە، چەند گوللەشم بە زریانەوە ناوە، بە مەرگەوە نـاوە، ئەوی لە بیرمە وەك خەون خۆی نیشـان دەدا، هێمنبـوونەوەی دنیـایە، ئەو هەمـوو بایە چۆن چوونەوە کونی خۆیان و کێ دەرگای بای داخسـت! دنیـا سـپی زۆر سپی سپێتیی وا نەبینراوە و نابینرێتەوە، دنیا کپ زۆر کپ دەنگی پێـی من و هێستری لێ دەرچێ، دنیا هیچ دەنگێکی لێوە نایە، لێیەوە نابیسـترێ، من لە کوێم! ئێرە کوێی قەندیلە! ئێرە کوێی بارەگـایە! مـاوەیەکی باشـیش لە بـاری جـێ نەناسـینەوە مـامەوە و بە هـیچ لایەکـدا پەلـم نەبـزووت، هێستریش لە من سەرسامتر چاوەکانی بە سپێتی دنیادا دەگێڕا...

دووکەڵ، دووکەڵ دەڵێی دووکەڵە، هەوە، ڕەنگە هێسترەکە پـێش مـن دووکەڵەکەی دیبێ، وەك من چاوی بڕیبووە ئەو جێگەیەی دووکەڵی لێـوە بەرز دەبۆوە، ئێـرە کـوێیە، ئەو دووکەڵە لە مـاڵی کـێ و لە سـۆبەی کێـوە بەرزدەبێتەوە، ئەوانە کێن خۆیان داوەتە بەر سۆبە! پێشمەرگەن یان جاش و سـەرباز؟ ئەو دووکەڵە بە چـی بناسـمەوە، بە چـی دووکەڵـی دۆسـت و دوژمن لێکدی جیـا بـکەمەوە؟ مـاوەیەکی باشیشـم لە ناسـینەوەی دووکەڵ کوشت، ناسیمەوە، نازانم بە چی ناسیمەوە، دووکەڵی بارەگام ناسـیەوە، لەو ساتانە جیاوازی من لەگەڵ برایمی مەلازێتدینان لە دوو شت بوو:

١- بـرایم بە سـەر ئەسـپەکەیەوە ڕەقهەڵاتبـوو، بەڵام مـن پێیەکـانم جوولەیان تێدا مابوو، لەوەیان برایم خۆزگەی بە من خواستووە.

٢-برایمیان خستە باوەشی دوو ژنەوە، ژن بە بەرکۆژەیان بۆ کردەوە، لە ناو سینگ و مەمکان زیندوو بۆوە، بەڵام منیان لە پەتووی چڵکـن لوولـداو لە ناو کێچ و ئەسپێ هاتمەوە ژیان، چۆن هەزار خۆزگە بە برایم نەخوازم.

وا بزانم دەمەو عەسران بوو کە گەیشتمەوە بارەگـا، هەرچـی شـلەمەنیی گەرمـی بارەگـا هەبـوو بە دەمیـانەوە کـردم، مـن لە بیـرم نەمـابوو بەڵام دەیانگوت، دەتگوت:

هێسـترەکە، هێسـترەکە، هێسـترەکە لە بیـرمەکەن، شـۆربا و شـیر بـدەنە هێسترەکەش.

ڕۆژی دواتر هاتمەوە سەرەخۆ، خەفەتم لە شەوی چووی دەخوارد، بەوەی ئەو زنجیرە تەلەڤزیۆنەم لە دەستچوو کە پڕپڕ و تەڕتەڕ بوو لە ماچ و راموسان، لە یادم نەچێ هێسترە ڕەش دوو سێ ڕۆژ نەخۆش کەوت، پیاوی بەژن بڵندی پژدەری دەیگوت:

هێسترەکەمان تایەکی زۆر گەرمی لێیە، ئەو تایە لە پێشمەرگە بێ شێتی دەکات.

ئەو قسەیەش لەوەوە هات، کە من لە هێسترەکە هێسترترم، بەوەی زریان ئەوی نەخۆش ئێخست و کاری لە من نەکرد، هەر لە بارەی هێستر و پێشمەرگەوە حەمە یوسف قسەیەکی هەبوو:

پێشمەرگە ئەو کاتە دەبێتە پێشمەرگە کە توانی هێستر ببەزێنێ و لە فسێی ببا.

حەزم لە دیدەنیی حەمە یوسفە، تۆ بڵێی پژدەریی ڕەسەن، ئەو دیدارەش هەر دەبێت بکەوێتە هاوینێکی کۆگەیی، بۆیە ئەگەر بە هۆی جادووشەوە بێ، دەبێ لە زستانەوە خۆم هەڵدەم و لە هاوینێ بکەومەوە.

## پژدەریی ڕەسەن

دۆڵەکۆگە قووڵترین دۆڵی دنیایێ، ئەگەر لە بارەگا ئاسمانیەکەوە بۆی شۆڕبیەوە، لە زەویەوە دەچیە ئاسمان و دێتەوە زەویش، هێشتا نەگەیشتوویتە بنی دۆڵەکۆگە، من تا گەیشتمێ و گەڕامەوە، وەك ئەوە بوو کە گەشتێك بە نێوان عەرد و ئاسماندا بکەم، بایی هەورێکی قەندیلی ئارەقەم دەردا، دۆڵەکۆگە مەملەکەتێکە کەم زۆر کەم ڕۆژی لێهەڵدێ، زۆر جێگەی دۆڵەکۆگە هەیە لەوەتەی هەیە هەتاوی بەرنەکەوتووە، هەر دەتگوت لە بن عەردە، ئەگەر بە بارەگای بن عەردی ناوی بێنین لێیدێ، چەمێك بە بن داروبارە چڕەکەیدا خوڕە دەکات، کوڕم دەوێ بەو چلەی هاوینەش جامە ئاوێك لەو چەمە بە خۆیدا بکات.

بارەگا بن عەردیەکە لە دەو چەمی هەتاونەدیتی هەڵیدابوو، لە

بەرەبەری نیوەڕۆ بۆ ماوەی سەرخەوشکانێ هەندێ جێگەی بارەگا تیشکی هەتاویان دەگەیەشتێ، لەو بەری چەمەکە شاخێکی گەورە پێدەچوو لە چیا ئاسمانیەکەی ئەوبەرەوە کەوتبێتە خوارەوە، لە سەر زەوی بە لاری خۆی راخستبوو، دەتگوت بۆ هەتاو لاربۆتەوە، ئەو دەمانەی هەتاو لێیدەدا باش گەرم دادەهات، مالی ئەوە بوو دوای خۆ بە چەم دادان بچی لە سەر شاخی رایەخی مریشك ئاسا خۆ بدەیتە هەتاوێ، بارەگا چەند کەپری پڕ لە جوولە و چەند خانووێکی نەوی نەوی، دۆلەکۆگە دەلێی کونی بایە، پژدەریی رەسەن گوتەنی:

لە فسێی بەم، بای دنیا لە ناو گەلی ئەو گەلیەوە هەلدەکات.

چوونی من وئەو برادەرەی لەگەلم بوو بۆ بارەگا بن عەردیەکە، ئەگەر تەقوتۆقی رۆژگار لە بیرینەبردبمەوە بۆ هێنانی فیشەك بوو، دەبوو بارە فیشەکێك بگەیەنینە بارەگا ئاسمانیەکە، بەرپرسی بارەگا بن عەردیەکە نازانم کێ سووریان دەگۆتێ، ئەوەم لە یادە پیرێك لە لا چەپی کەپرە گەورەکە کە جێگەی دانیشتن و نانخواردن بوو، شانی بە بەردێکی بالیفی دابوو، دارجگەرەیەکی نیو گەزی بە دەست و لێوەوە، مژی وای لێدەدا، لە لوولەی هیچ سۆبەیەکی زستانیەوە دووکەلی وا بە هەوادا نەچووە، سمێلی رەنگی تووتنی زەردی گرتبوو، هەر تووتن بوو تووتن، هێشتا کەو و رکەم نەدیتبوو، پرسیاری شوێنی بەرپرسی بارەگام لێکرد:

+ هاوڕێ، بێ زەحمەت هاوڕێ... لە کوێیە؟

- لە فسێی بەم، ئەوەتا لەو سەرەوە دانیشتووە.

هۆیێکم لە خۆم زانی، ئەو هاوڕێیە بۆچی لە فسێی ئەو هاوڕێیەی بردا! تۆ بلێی پیاوێکی ئاسایی بێ! ویستم شتێکی لێبزانم، گوتم:

+ باشە بۆچی لە فسێت برد؟

- لە فسێت بەم، بۆچی لە فسێتان نەبەم!

خراپ تێکەوتم، باشە هەقم چ بوو لەوەی لە فسێی بەرپرس دەبا، بە زمانی خۆم نەوەستام، هەتا لە فسێی منیشی برد، ئەو پیاوە پیرە سمێل

ڕەنگ تووتنیەی لە خۆوە لە فسێی خەڵکی دەبرد، ناوی حەمە یوسف بوو، پژدەری بوو، لە هەموو پژدەریان پژدەریتر، هەبوو دەیگوت:

حەمە یوسف ڕەسەنترین پژدەریە لە پژدەرێ.

ڕەسەنترین پژدەری کەس نەبوو نەیناسێ، من درەنگ ناسیم، لە پاش هەمووان ناسیم، کەس نیە لە ناسینی وی پەژیوان بووبێتەوە، خۆزی زووتر دەمناسی، خۆزی زووتر ئەو پیاوە تفەنگ لە شان و ڕکە بە دەستەم دەناسی، ئەو پێشمەرگەیەی هێندەی بە قەفەز دەناسرایەوە بە تفەنگ نەدەناسرایەوە، پیاوی بەژن بڵندی پژدەری لە بارەی چەك و قەفەزی ڕەسەنترین پژدەریەوە دەیگوت:

پێش ئەوەی چەك لە شان بکات، ڕکەی بە دەستەوە بووە.

ڕکەکەی حەمە یوسف وەك دەڵێن قەت بێ کەو نەبووە، کەوپەروەرێکی نموونەیی بوو، بیستم، نازانم تا کوێ ڕاستە، ئەو کەوپەروەرە لە تەمەنی خۆی دوو کەڕەت گریاوە، جاری یەکەم لە سەر تەرمی کوڕە شەهیدەکەی، جاری دووەمیش بە دیار پەڕوباڵی کەوە خوراوەکەی، بە گۆتەی گۆتیاری:

گریانی دیار کەوەکەی لە هی سەر کوڕەکەی بەکوڵتر بووە.

ئەوانەی دیتبوویان دەیانگێڕایەوە:

ئەو سەگە ئاخرشەڕەی بە ناخێری گیانی کەوەکەی خوارد، بە ژمار هەر گەرماو گەرم سێ و سێ گوللەی گەرمی گرتەوە و ساردی کردنەوە، فیشەکی پێنەما، دەنا پتری لێدەدا، دواتریش وازی لێنەدەهێنا، ڕۆژانە دەچووە سەر سەگە تۆپیوەکەو چەند گوللەیەکی پێوە دەنا، باش بوو چەند خێرۆمەندێك چوون سەگەکەیان خستە بن خۆڵەوە، حەمە یوسف هێشتا هەر وازی نەهێنا، ناوە ناوە فیشەکێکی بە گۆڕی سەگی کەوخۆرەوە دەنا.

هێشتا سەرهاتی سەگی ئاخر شەڕم نەبیستبوو، بەڵام بیستبووم کە پیاوی کەوپەروەر ڕقی دنیای لە سەگە، لێیم پرسی:

+ بیستوومە زۆر رقت لە سەگ دەبێتەوە؟

- لە فستێ هەموو سەگی دنیا بەم، بە خۆتی تێمەگە لە فستێ ئەوەش بەم کە پرسیاری سەگم لێدەکات.

+ دڵنیا بم کە بە خۆمی تێنەگەم!

- ئا، لەگەڵ تۆم نیە، لە فسێت بەم.

+ باشە کەس هەیە لەو دنیایە تۆ لە فسێت نەبردبێ!

- ئەوەی ماوە لە فستێ بەم.

ئەو پیاوەی لە فستێ هەموو دنیای دەبرد، لە سیما هێندەی چووبۆوە سەر ئۆمەتی مووسا، هێندە شێوەی عیسا و موحەمەدی نەدەدا، برۆکانی هەر زۆر لەو جوولەکە پیرانەی دەکرد کە من زۆر جار لە وێنە دیتبوومن، ئەو پیاوە لە سیما موساییە هەمیشە چوار وەرزەی ساڵ ساقۆیەکی درێژی لەبەر بوو، هەرکێ لێی پرسیبا:

+ ئەو ساقۆیە درێژە کەی فڕێدەدەی!

- ئەو کاتەی لە بەهەشت باران نەما.

+ مەبەستت چیە؟

- لە فستێ بەم لێیگەڕێ.

چەندی هەوڵت لەگەڵی دەدا، تکای دنیات لێی دەکرد، مەبەستی نەدەدا بە دەستەوە، نهێنیی ساقۆی ئاشکرا نەدەکرد، بە دەستی بەتاڵ دەگەڕایتەوە و بەجێتدەهێشت، ئەگەر وەك قیر و بنیشت پێوەی نووسابایت و لێنەبووبایتەوە، هەر هێندەی دەگوت:

- جارێك مەبەستەکەم روونکردۆتەوە، دووبارەی ناکەمەوە.

رۆژێك پێشمەرگەیەك ئەویش هەندێك چووبووە تەمەنەوە، نازانم کێ مینەیان دەگۆتێ، گۆتیە من:

+ من نهێنیی ساقۆی پژدەریی رەسەن دەزانم.

- چۆن دەزانی؟

+ لە زمانی خۆیەوە گوێم لێی بووە.

- ده بۆمنیشی بگێڕەوە

مینە، ڕەنگە مینە بووبێ، ئەوهای گێڕایەوە:

وەختی خۆی پڕدەریی ڕەسەن لە جوولەکەیەك دەپرسێ:

بە بۆچوونی ئێوە بەهەشت چۆن چۆنی هەڵکەوتووە؟

جوولەکە بە دڵنیاییەوە باگۆ دەداتەوە:

لە هۆدەیەکی تا موسا دەڵێ بەس گەورە و هەیوانێکی تا چاو بڕکا هەر هەیوان و حەوشەیەکی تا ئەوسەری بەهەشتیش هەر حەوشە.

پڕدەریی ڕەسەن قسە بە جوولەکە دەبڕێ:

باشە ئاوهەوای چۆنە، بەفر و باران هەیە؟

جوولەکە بە دڵنیایی پترەوە:

بەفر کەم بەڵام باران چوار وەرزەی ساڵ لێناکاتەوە، بارانی بەخوڕیش.

پڕدەریی ڕەسەن دەڵێ:

باشە حەوشەکە بۆ چیە کە بەردەوام باران بێت؟

جوولەکە وای وەڵام دەداتەوە:

دەتەوێ بزانی بەهەشت چۆن بە سەر ئوممەتی موسا و عیسا و موحەممەددا دابەشکراوە؟

پڕدەریی ڕەسەن:

دە بڵێ بزانم ئێمەی موسڵمان چیمان بەرکەوتووە.

جوولەکەی بەهەشتی بە کێش و سەرواوە دەڵێ:

**جوولەکە لە بنەبانێ**

**دیان لە بن هەیوانێ**

**موسڵمانیش لە بەر بارانێ.**

دەڵێن پڕدەریی ڕەسەن دوای ئەو دابەشکردنە جوولەکەییانەی بەهەشت، لە دڵەوە لە خودا پاڕاوەتەوە:

خودای گەورە ئەگەر منت بردە بەهەشتێ، ساقۆیەکی گەرم و گەورەشم بدێ، چم لە تۆ ناوێ.

دەڵێن لە پژدەریی رەسەن دەپرسن:

لە بەهەشت ساقۆت بۆ چیە؟

پژدەریی رەسەن دەڵێ:

زۆر رێی تێدەچێ قسەی جوولەکە راست بێ و بەر بارانەکەمان بەرکەوێ.

مینەی پژدەری بەو شێوەیە نهێنیی ساقۆی بۆمان ئاشکراکرد.

جارێك لە پژدەریی رەسەنم پرسی:

ئەو چیرۆکەی مینە لە بارەی تۆ و جوولەکە و ساقۆ و بەهەشت گێڕایەوە راستە، یان هەڵبەستراوە؟

پژدەریی رەسەن:

مینە قسە هەڵنابەستێ.

ئەوەشی گوت:

ئەگەر مردم بە ساقۆوە لە گۆڕم نێن.

ئەو چیرۆکەم لەبیرچووبۆوە، ئەوکاتیش وای تێگەیشتم کە پژدەریی رەسەن بۆ خۆی رێکیخستووە، دوای بیست ساڵێك، مامۆستایەك بە رێککەوت چیرۆکی دابەشکردنی بەهەشتی گێڕایەوە، رێك ئەو چیرۆکە بوو کە من لە مینەوە بیستبووم، ئیدی نازانم ئەو چیرۆکە...

ئەو پژدەریە رەسەنەی کە لێرەوە ساقۆی بەهەشتی لەبەرکردبوو، لە زۆر شت شتی دەزانی، بۆ پلەی گەرمی گەرمیپێوێکی داهێنابوو، هەرچی نێرینە هەیە هەیبوو، لێیانپرسی بوو:

+ ئەدی مێینە بە چی بزانن؟

- با لە نێرینەکانەوە ببینن.

گەرمیپێوەکەی پژدەریی رەسەن بە گوتەی خۆی لە هەموو گەرمیپێوان راسترە و بە موو هەڵەی تێدا نابینرێت، لێیاندەپرسی:

+ چۆن بزانین، پلەی گەرمیی دنیا گەیشتۆتە نیوە کوڵان.

- ئەو دەمەی گون قولانجێك کەمێك کورتتر شۆڕبۆتەوە.

+ ئەدی کوڵانی تەواوی دنیا؟

- بستێکی ڕێك شۆڕدەبێتەوە.

+ باشە بە چی بزانین دنیا شەختەی کردووە؟

- لە فسێی گون بەم، هەر کاتێك تەواوێك بە دوای گونتدا گەڕایت و نەدیتەوە.

ئەو پژدەریە ڕەسەنەی کە گونی کردبووە گەرمپێو و لە فسێی گونیشی دەبرد، سەدامیشی نەدەپاراست، دەیگوت:

سەدام حوسێن، لە فسێی بەم دەڵێ:

هەموو شتێك بەلاگێڕی شەر بێ

بەلام من دەڵێم:

هەموو شتێك بە سەدامیشەوە بەلاگێڕی کەو.

ئەو پژدەریە ڕەسەنەی دنیای بەلاگێڕی کەو دەکرد:

کەس بە خۆیشیەوە نەیدەزانی خۆشەویستیی بۆ کەو لە چیەوە هاتووە، زۆر کەس لێیان دەپرسی:

+بەس بزانم تۆ بۆچی هێندە عەشقە کەوی؟

- لە فسێت بەم، نازانم.

جارێك، ڕەنگە هەر بۆ ئەوەی بیهێننە قسە لێیدەپرسن:

+تۆ لە پێناوی چی چەکت لە شان کردووە؟

- بۆ پاراستنی کەو، کەوی گەردن بە خاڵ

+ واز لە گاڵتە بێنە، بە ڕاستیمان وەلام بدەوە.

- لە .... من کەی گاڵتەم کردووە، من بەرگری لە کەوەکانم دەکەم و تەواو.

+ ئەگەر وایە لەو شاخ وداخە چی دەکەیت بۆ ناچیتەوە ماڵ و لەوێ بەرگری لە کەوەکانت بکەیت؟

- کەوەکانم حەزیان لێرەیە، منیش دڵیان ناشکێنم.

+ حەزی چیان لێرەیە، قەفەز هەر قەفەزە چ لێرە چ لەوێ.

- ئەدی ئەو بایەی لە قەفەزەکە دەدا، هەمان بایە! کەو ئەگەر ئازادیش نەبێت، مادام بای ئازادی لە باڵی بدا، هەست بە ئازادی دەکات.

+ باشە بۆچی رێ لە ئازادی کەو دەگری و بەرەڵایان ناکەیت؟

- دڵم نایە، بەرەڵایان بکەم سەگ دەیانخوات.

بارە فیشەکمان بارکرد و لە بارەگای عەردیەوە سەرەو بارەگای ئاسمانی سەرکەوتینەوە، پیاوی پژدەریی رەسەن، پیاوی کەوپەروەر، پیاوی ساقۆی بەهەشت لەبەر، پیاوی سمێڵ رەنگ تووتنی، ئەو پیاوەی لە خۆوە لە فسێی هەموو دنیای دەبرد، کەسی نەدەپاراست، هەتا لە فسێی مریشك و جندۆکانیشی دەبرد، بە جێمهێشت، دواتریش چەند جارێکم دیتەوە، رکەکەی بە کەوەوە هەر لە دەستی بوو، دواتریش، چەند ساڵێك دواتر، هەواڵی پژدەریی رەسەنم لە پژدەریەك پرسی، خۆزی نەمپرسیبا، پژدەریەکە گوتی:

فیشەکێك، نازانم بە هەڵە هاویژرا یان نا، هێندە دەزانم، پژدەریی رەسەنی لە خوێن گەوزاند و چۆڕاوگەی خوێن خوێنێکی سوور سوور لە دەندووکی کەویش سوورتر گەیشتە بن قەفەز.

پژدەریەکە لە بارەی کوژرانی پژدەریە رەسەنەکەوە دیار بوو قسەی زۆری لە زاری بوو، بەڵام من بەرگەی پتر بیستنم نەبوو، بەڵام پرسیم:

+ لە کاتی کوژرانی ساقۆی...

- ئا، ساقۆکەی سەردەمی پێشمەرگایەتی لەبەر بوو.

دوور نیە ئێستا لە حەوشەی بەهەشتێ لە بەر بارانێ پیاسەی بکا!

بە بارە فیشەکەوە گەیشتینەوە بارەگا ئاسمانیەکە، من هەر جارێ دەستەواژەی بارە فیشەکم بێتە گوێ یان بە زارمدا بێ، چاوم پڕ لە وێنەی شەڕ دەبێ، ئەوەتا شەڕی بارەگا ئاسمانیەکە گرتە خۆی نیشانم دەداتەوە، با خۆم بگەیەنمەوە زستانێ بۆ ئەوەی شەڕی گەرم لە بەفر و سەرماوسۆلە نیشانبدەمەوە، بەڵام پێش ئەوەی شەڕی گەرم لە ناو بەفرێ هەڵگیرسێ، با هەر لە ناو بەفرێ ئاستێنکا ببینم.

## ناسـتینکا

لە کۆڵانە پڕ لە جادووە ئیستاتیکیەکانی (تاوان و سزا)ەوە دیستۆڤسکیم ناسی، ئێستاش هەر کاتێ ڕێگەم بکەوێتە کۆڵانەکانی ڕۆمانەوە، سەرێك لە ماڵی تاوان و سزا دەدەم، من دەمێکە چەند سێکوچکەیەکی جوانم لە جوانی دۆزیوەتەوە، یەکێك لەو سێکوچکانە (نیکۆس کازانتزاکی، دیستۆڤسکی، یەشار کەمال)ە، بە تەنیشت ئەو سێیەوەش زۆر سێتر و تریش هەن، بەڵام ئەو سێیە لە هەموو سێیان جیان و جێگەی تایبەت و جیایان لە جێ گرتووە، چەندان شەوم لە دنیای ئەو ڕۆماننووسانە کردۆتەوە، ئەوشەویش هەر لە دنیای دیستۆڤسکیم، بەڵام نە لە کۆڵانەکانی تاوان و سزا و نە هیچ جێیەکیدی، من ئەو شەو لە سەری قەندیلێ لە بارەگایەکی ئاسمانی ژوانم لەگەڵ ناستینکا هەیە.

شەوێکە، دنیا شەوی وا سپی بە خۆیەوە نەدیوە، لە کاخەزی سپی سپیتر، لە دڵی ناستینکا سپیتر، لەو بەفرەش سپیتر بوو کە شەوەکەی سپی کردووە، (شەوە سپیەکان)م لە شەوێکی ئەوها سپی وا بە دەستەوەیە، پێشتر ناویم بیستبوو، بەڵام نە خوێندبوومەوە نە هیچیشم لە بارەیەوە خوێندبۆوە، چەند جارێکیش بە دوایدا گەڕابووم، بە دوای شەوە سپیەکان گەڕابووم و دەسگیرنەبوو، ئەوەتا ئێستا لەو دووریەی دنیا لەو ئاسمانە، شەوە سپیەکان بەڕێکەوت هاتە ئەو ژوورە بەفراویە، ئەو ژوورە ئاگراویە، دەرێ بەفر تا دڵ حەز بکات هەر بەفر، ژوورێش ئاگر ئاگر، سۆبە دارینەکە دەڵێی دەندووکی کەوە سووربۆتەوە سوور سوور.

- بەسە چیدی ئاگری مەدە، با پێماندا نەتەقێتەوە.

- با بتەقێتەوە لە ناو بەفری قەندیلێ مردن بە ئاگر چێژێکە هیچ ژیانێك چێژی وا نابەخشێ.

- مردن لە ناو هەنگوینیش، هەنگوینی ژنم مەبەستە، هەر تاڵە و تامی...

- وا نیە، مردن لەگەڵ مردن جیاوازی هەیە، تامیان جودایە.

- مردن مردنه و یەك تامی هەیە ئەویش تامی مردن.
- بە چی دەزانی تامیان یەکە؟ خۆ تۆ تامی هیچ مردنێکت نەکردووە!
- تۆ بە چی دەزانی تامیان لێکدی جودایە؟
- مادام ژیانەکان تام جودا جـودان، مردنەکـانیش دەبـێ وا بـن، وا نـیە ئەدی؟
- نەخێر، تۆ هەرەی لە برەی دەرناکەیت.

تا ئێرە گوێم لەو مشتومڕەی نێـوان پیـاوی بەژن بڵنـدی پـڕدەری و ئەو یەك دوو پێشمەرگەیە بوو کە قسەیان لە تامی مردن و ژیان دەکرد، ئیـدی مـن دابـڕام لە شـەوە پـڕ لە قسـەکەی دیـار سـۆبە ئـاگرینەکەی ژوورە گچکەکەی بارەگا قەندیلیە ئاسمانیەکە، دابـڕام و تێکەڵـی شـەوە سپیەکان بووم.

هەوکە لە شەقامێکی شاری پیترسبۆرگ لە سووچێك دەستە ناسکەکانی ناستینکام لە ناو دەستەو تونـد تونـد دەیانگوشـم، زۆر تونـدتر لەو کـوڕەی دەستی ناستینکای لە دەست بـوو، ئەو کـوڕەی نەیویسـت، ڕەنـگە شـەرمی کردبێت کە بە جێناوی من سەربردەی خۆی بۆ ناسـتینکا بگێـڕێتەوە، بـۆیە پەنای بۆ کەسی سێیەمی تاك پەنای بۆ (ئەو) برد، من پـێم خـۆش بـوو ئەو کوڕە لە جێی (من) (ئەو)ی دانا، هەستمکرد چـاوی لە مـن کـردووە، مـن زۆر جار وام دەکرد، لەگەڵ ناستینکای خۆم وام دەکرد، من لە زۆر شـت خزمایەتیم لەگەڵ ئەو کوڕە هەبوو، بەڵام لە دەستگوشینی ناستینکا بە هـیچ جۆرێ نزیکایەتی و ئاشنایەتیمان نەبوو، من بە هەموو هێـزی خـۆم دەسـتی ناستینکام دەگوشی، بەڵام ئەو نەرم نەرم دەیگوشی.

لالەکە لە من نزیك بوو، سـۆبەکەش هێنـدە دوور نەبـوو، ئەو شـەوە چ پێویستم بە سۆبە نەبوو، لە دەستەکانی ناستینکاوە گەرمایی هەرچی سۆبەی چیا هەیە دەرژایە لەشمەوە، بەڵام دەبوو لالە نزیك بـا، چاوەکـانی ناسـتینکا لە لالە گەشتر بوون، بەڵام مەیلی منیان نەبوو، بـۆیە لالە پێویسـت بـوو بـۆ خوێندنەوەی شەوە سپیەکان.

شەوە سپیەکەی قەندیل پتر حەزی خوێندنەوەی (شەوە سپیەکانی) خستە دڵەوە، وام دانابوو لە شەوە سپیەکانەوە شەوی بەفراویی قەندیلیش دەبینمەوە، چەند لاپەڕەیەکیشم خوێندبۆوە، هەر چاوەڕێی ئەوەم دەکرد دیستۆفسکی دەستم بگرێ و بمباتە ناو شەوانی بەفراوی و لەوێ لە ناو بەفردا تێکەڵی ڕووداوە ئیستاتیکیانەی ڕۆمانم بکات، هەر چاوەڕێ بووم بگەمە ناو بەفر نەگەیشتم، من بە هەڵە لە ناونیشانی ڕۆمانەکە تێگەیشتبووم، دوورنیە بە هەڵە لە ڕۆمان گەیشتبم.

بەڵام کاتێ هاتمە سەر گێڕانەوەی سەرهاتی خۆم بۆ ناستینکا، ئیدی چاوەڕێی بەفرم نەکرد، بەفرم لە بیرکرد، چ بەفری قەندیل چ بەفری پیترسبۆرگ، بەڵام ئای لە ئێشکگری! دەڵێی مەرگە لە پڕ سواری سەرت دەبێ، لە خەیاڵی ئاڵوواڵای ژیانت دەپسێنێتەوە، لە بینین و تامی جوانیت دەکات، ئێشکگری منی لە دیداری ناستینکا کرد.

+ شوانە، نۆرەی تۆیە، ئێشکگری.

- من.

ئەو پێشمەرگەیەی منی لە گێڕانەوەی خۆم بۆ ناستینکا کرد، من لە جێی وی بام، وام نەدەکرد، بەڵام ئەو بە چی بزانێ من وا لە شەقامێکی پیترسبۆرگ دەستی کچێکم لە ناو دەستە و رابردووی خۆمی بۆ دەگێڕمەوە، ئەگەر بشزانێ ناهەقی نیە، گورگ بە گورگایەتی خۆی لە شەوی سەهۆڵبەندانی قەندیل هەر دەمژمێرێك دەتوانێ نۆبەتداری بگرێ، شەوی قەندیل سپیە، هەموو سپێتیی دنیا بە سپێتی بەفریشەوە ناگاتە سپێتیی شەوی قەندیل، شەوی سپیی قەندیل ساردە، ساردیی دنیا بە سیبریاشەوە وەك شەوە بەفراویەکانی قەندیل سارد نیە، ئەو سەهۆڵبەندانەی قەندیل بوو، وای لە کوڕە هیستردۆستەکە کرد لەو شەوەدا بە چۆقە چۆقی ددانەوە بڵێ:

لە جندەخانەی مووسڵێ نۆبەتداری لە جندە و حیزان بگری، نەک لە ناو بەفری قەندیلێ لە پێشمەرگە.

منیش هێندی نەما بووک بڵێم:

قسەیتی

ئێ، ئێستا لە سپێتی و ساردیی قەندیل لە هی بارەگا ئاسمانیەکە پیاسە دەکەم، بەو زستانە تووشە سایەقە و سامالێکە لە هەموو ئاسمان هێندەی ناولەپێکیش هەور نیە، مانگ لە دابەزینە، ئێستا نا ئێستا لە ناو بەفرێ دەنیشێتەوە، رەنگە لەگەڵ خۆی چەند ئەستێرەیەکیش بنیشێنێتەوە، مانگ خەریکە بنیشێتەوە، ئەگەر نەنیشتەوە ئەوە لە ترسی بە چلوورەبوونە، لە شەوە شەختەییەکانی قەندیل مانگیش دەبێتە چلوورە، ئەگەر ئەو بایە گوێزانیە نەبا، بە شەوی عاشقانە ناوم دەبرد، ئەو شەوە هی ئەوەیە لە چاوەیەکی گەرم گەرمەوە لە پەنجەرەیەکی گەورەوە تەماشای بکەیت، ناستینکا وازی لێمنەدەهێنا، گوێم لێیە دەڵێ:

مەوەستە، بگێڕەوە، رابردووی خۆتم وەك خۆی و بێ پەڕاندنی هیچ دیمەنێك بۆ بگێڕەوە.

من دەڵێم:

ناستینکای خۆم، ئارامت بێ، با ئێشکگریەکەم تەواو بێ، هەموویت بۆ دەگێڕمەوە.

ناستینکا پەلەیەتی، من لەو پەلەترم بۆ گەیشتنەوە بە شەوە سپیەکان بۆ خوێندنەوەی شەوە سپیەکان، بۆ دیداری ناستینکا، بەڵان چ دەکەی لەو دەمژمێرەی تەمەن کە دەکەوێتە دەمی ئێشکگریەوە، چ دەمژمێرێکی درێژە خودایە، ئەو دەمژمێرە تەمەنێك پترە، لە خولەکێك سێ هەتا چوار جار تەماشای دەمژمێرم دەکرد و دەم هەر لە جێی خۆی بوو شەختەی کردبوو، میل بەستبووی، بەسەتەڵەکی بارەگا ئاسمانیەکە کاتیشی لە جوولە خستبوو، منیش ئەگەر ژوانی ناستینکام لە پێش نەبا، لە دەستچووبووم.

ئۆخەیش گەیشتمەوە شەوە سپیەکان، سەرهاتی خۆم بۆ ناستینکا گێڕایەوە، ئێستا نۆرەی ویە، ناسك ناسك خۆی دەگێڕێتەوە، کاتێ گەیشتە ئەو شوێنەی کە بۆی هاتبوو، ئەو شوێنەی پێکەوە دانیشتبووین، ئەو شوێنەی جێژوان بوو بۆ ئەو و چاوەڕێی کوڕێکیدی بوو، تەزینێك تەزیم قەندیلیش وا نەتەزیوە، ئا، ناستینکا ژوانی هەبوو، من و ئەو کوڕەی

دیستۆڤسکی ناردی وگوێی بۆ سەرهاتی ناستینکا شلکردبوو، هەردووکمان دەستبەتاڵ گەڕاینەوە، دڵشکاو گەڕاینەوە، بەڵام من زووتر ناستینکام بەجێهێشت، ئەو مایەوە تا دەستگیرانەکەی ناستینکا هات لە لای مایەوە و هانی دەدا لە چاوەڕوانی بمێنێتەوە و جێژوان بەجێنەهێڵێ، بەڵام من وام نەکرد، یەکپێ هەستام و ئاوریشم لێنەدایەوە، بەڵام ئەگەر پێشتر پێش ئەوەی منیش لە یانەی کۆلیژ تووشی ناستینکا بێم، شەوە سپیەکانم بخوێندایەتەوە و ناستینکای دیستۆڤسکیم ناسیبا، دوور نەبوو منیش تا هاتنی دەسگیرانی ناستینکا ناستینکای خۆمم جێنەهێشتبا.

لە بیرمە لە کاتی خوێندنەوەی (شەوە سپیەکان) و ئاشنابوونم بە ناستینکا، حەزمدەکرد واتای وشەی (ناستینکا) بزانم، پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو، کەمێك رووسی دەزانی، لێمپرسی نەیزانی، دواتریش دوای بیستساڵ، بە ساڵ و وەرز ومانگ بیست ساڵی رێك، هەر بە یادی شەوە سپیەکەی بارەگا ئاسمانیەکە هاتم لە شەوێکی باراناویی هەولێر (شەوە سپیەکان)م خوێندەوە، ئەوجارەیان بە کوردی، جاری پێشی بە عەرەبی بوو، هەمان چێژی بیست ساڵ لەوەو پێشم لێوەرگرت، ناستینکا هەر جوان بوو، نەمر بوو وەك دیستۆڤسکی جوان و نەمر بوو، واتای ناستینکاشم هەر نەزانی.

ماڵئاوا شەوە سپیەکەی بارەگا، رەنگە ئەوە دوا شەوی سپی بێ لە ژیانی من، شەڕ لە پێشە شەڕ، دوور نیە.

پێش شەڕ ئەدی و بەدی هەیە، شەڕی ئەدی و بەدیش هەیە.

**ئەدی و بەدی**

تێگەیشتن لە ئەدی و بەدی بۆ ئەو کەسانەی لە ئەدی و بەدیان دەپرسی زەحمەت بوو، زۆریش زەحمەت، زەحمەتتر لەو هاوکێشە بیرکاریانەی کە قوتابیەکی تەمبەڵ لە بیرکاری، بە دیاریەوە خەوی لێدەکەوت و هیچیشی لێتێنەدەگەیشت، بە لای باخەوانەوە وا بوو، دەیگوت، رووی قسەی لە من بوو:

پیاوی چاك بە (بەدی)م تێبگەیەنە، من لە بیرکاری زیرەك نیم، بەڵام ئەدی و بەدی زۆر لەو (س، ص)ە تێکەڵاوترن کە چەندی دەکەم سەرەدەریان لێدەرناکەم.

ئەو کورە دەیگوت:

لە هەولێر و پەیمانگا دوو کچە هەولێری زۆر برادەرم بوون، رۆژانە لە زاری ئەو کچانەوە سەد جار پتریش گوێم لە ئەدی و بەدی دەبوو، ئێستاش پێوە لە (بەدی)یەکەیان نەگەیشتم.

گوتمە باخەوان:

لەو کچانەوە لە ئەدی و بەدی تێنەگەیشتی، تازە لە بنی تێیاناگەیت.

وا بزانم ئێستاش تێنەگەیشت.

دکتۆر هۆشەنگێك هەبوو، لە بنەچە کەرکووکی بوون، بەڵام لەوەتەی هەبوو هەر لە هەولێر بوو، دەیگوت، بەو کورەی دەگوت کە لە کچانیشەوە فێری واتای بەدی نەبوو:

تۆش سەیری ها! من منداڵی هەولێرم لە هەولێر گەورە بووم، هێشتا ئەدی و بەدی لێکجیاناکەمەوە، تۆ دەتەوێ بە دوو ساڵێك تێیانبگەیت! وازی لێبێنە.

بەڵام رێبوار عەرەب سووربوو لە سەر تێگەیشتن لە ئەدی و بەدی، ئەو کورە لە زمانی کوردی کێبڕکێی لەگەڵ هەزار موکریانی دەکرد، هێندەی وی رەنگە پتریش وشەی کوردی بە بەکارهێنان لە رستەوە دەزانی، دەیگوت:

مـن لە زمـان خـۆم بە هەزار نـاگۆڕمەوە، بەڵام سـەیرە لەو (ئەدی و بەدی)یە هەولێریە تێناگەم، تێمبگەیەنە.

دکتۆر هۆشەنگ دەیگوتە رێبوار عەرەب:

وازی لێبێنە، خۆت لەوە مەدە، لە منی وەرگرە، تێناگەیت.

رێبوار دەیگوت:

بابە، خۆ کێشەی گیان و جەستە نیە، بۆ تێناگەم!

دکتۆر هۆشەنگ:

لەویش ئاڵۆزتر و سەختترە.

رێبـــوار عەرەب وازی لە ئەدی و بەدی نەدەهێنـــا و بە پێکەنیـــنەوە دەیگوت:

پـێش هەمـوو شـتێك دەبێـت دان بەوەدا بنـێم کە زۆر جـار (ئەدی و بەدی)م لەگەڵ (نەدی و بدی) لێتێکەڵ دەبێ.

من دەمگوت:

تاهو وەە! کەواتە تۆ هەر تێناگەیت.

رێبوار عەرەب:

بە گاڵتەم بوو، لە نەدی و بدی گەڕێ، قسە لە ئەدی و بەدی بکە.

ئیـدی دەسـتمدەکرد بە لێکـدانەوەی ئەدی بەدی و بە پرسـیار و وەڵام بۆم رافەدەکرد، گۆتمە رێبوار عەرەب:

من پرسیار دەکەم و هەر خۆشم وەڵام دەدەمەوە تۆ قسە مەکە.

رێبوار عەرەب بە کوردی نیشانەی قرقەپی کێشا.

پ/ تۆ قەت کچی جوانت ماچ کردووە؟

و/ ئەدی، کوا!

پ/ تۆ قەت کچی جوانت ماچ نەکردووە؟

و/ بەدی کوا!

رێبوار عەرەب:

لە کامیان کچە جوانەکەم ماچ کردووە؟

گوتم:
لە هەردووکیان.
ڕێبوار بە کەمێك سەرسووڕمانەوە:
لە هەردووك!
گوتم:
بەڵێ لە هەردوو پرسیارەکە کچە جوانەکەت ماچ کردووە...
ڕێبوار عەرەب بە نیوە تێگەیشتنێکەوە، بە پێکەنینەوە:
ئەها! دەڵێی نزیکە لە (نەعەم) و (بەلا) عەرەبیەکە؟
ئەو لێکنزیککردنەوەیەم بە دڵ بوو، گوتم:
ئەوەی ئەگەر یەکیان لە جیاتی ئەویتر دانێی (کوفر) لەدایکدەبێ؟
ڕێبوار عەرەب بە پێکەنینەوە:
ئا، ئا
گوتم:
ڕەنگە.
گوتی:
شتێکی لێتێگەیشتم.
ئۆی، مـن خەریـکە خـۆم لە شـەڕی ئەدی و بەدی بـدزمەوە، ڕەنـگە لێترسابم، بۆیە وا ڕێبواری عەرەب و باخەوانی هەڵەبجە و هۆشـەنگی نیـوە کەرکووکیم هێنـایە نـاو (ئەدی و بەدی)یەوە، بەڵام شـەڕ هـاتۆتە پێشـێ و هەڵاتـن لێـی شـەرمە، بـۆ ئەوکـات شـەرمە، ئەو کـاتەی لە ڕێـی بارەگـا ئاسمانیەکە قەوما.

کوڕێك هەبوو ئێستاش بە تەواوی نەمزانی خەڵکی کوێیە، هەر جـارەی جێیەکی دەگوت، دوای ڕۆژێك بێتەوەی هەسـت بە خـۆی بکـات، درۆی دوێنێـی لە خـۆی سـپیدەکردەوە، ڕەنـگە درۆشـی نەکردبـێ، ئـاخر خـۆی دەیگوت:

مـن خەڵکـی هەمـوو شـوێنێکم تەنهـا هەولێـر نەبـێ، بە خەڵکـی کـوێم

دادەنێن قەیناکە، تەنها هەولێر نەبێ.

من گومانمکرد کە ئەو کوڕە ڕەنگە خەڵکی هەولێر بێ، بەڵام بە هۆی شتێکەوە لە هەولێر تووڕەیە و نایەوێ هەولێری بێ، دواتر چەندی لە شێوەی قسەکردنی وردبوومەوە لە هیچ وشەیەك، لە هیچ دەنگ و لەتە دەنگێکی هەولێرم نەدیتەوە، دوای پرسکردنیش لە چەند کەسێ تێگەیشتم نزیکایەتی لەگەڵ هەولێر نیە، ئەو کوڕە کە نازانم کێ بوو، ناوی نابوو ئەنتی هەولێر، بە گاڵتەو بە راستی گاڵتەی بە هەولێر و شێوەزاری هەولێریان دەکرد، بە تایبەتیش لە ڕێی ( ئەدی و بەدی)یەوە، وەخت و ناوەخت بە سووکایەتیپێکردنەوە (ئەدی و بەدی) دەگوتەوە و لەو دووەوە بۆ خۆی شتی درووست دەکرد، زۆر جار شتی خۆشیش:

( ئەدی) کچێکی جوان بوو، (بدی)ش کوڕێکی ناشیرین، ئەو کوڕ و کچە لە سەر دەستی مەلا (لۆ) بوونە ژن و مێرد، کچ و کوڕێکیان بوو کچەیان ناو نا (بەدی)، کوڕەش (ئەدی).

ئەو ئەنتی هەولێرە کە زۆریشی دەخوێندەوە، دەتگوت بۆ دژایەتی هەولێر چەکی لە شان کردووە و بۆتە پێشمەرگە، رقی لە هەموو شتێکی هەولێر دەبۆوە، بە قەڵات و منارە و ماست و فواد ئەحمەد و عەبدوڵا پەشێو و سوڵتان موزەفەر، بەس عەزیز محەمەد نەبێ، بە قسەی وی پەیوەندی بە هەولێرەوە نەماوە و بۆتە پیاوێکی نێونەتەوەیی... من رۆژ دوای رۆژ لەو ئەنتی هەولێرە بە رکدا دەچووم، چەند جارێك گەرم دەبووم و لێیدەهاتمە دەنگ، بەڵام ئەو سەگ بوو، بە دوو قسەی خۆش ساردی دەکردمەوە و دەیگوت:

کوڕە گاڵتە دەکەم، من هی ئەوەم سووکایەتی بە شارێك، بە جێگەیەك بکەم!

کاتێ من سارد دەبوومەوە ئەو تێهەڵدەچۆوە.

رۆژێك من و ئەنتی هەولێر، بە هێسترەوە لە گوێزێی زەویەوە بۆ بارەگا ئاسمانیەکە سەردەکەوتین، لە رێ هێسترەکە دیار بوو برسی بوو، رێی باش

دانەدەگرت، قەپالّی لەو پنچکانە دەگرت کە لە دەو رێ دەتگوت تـایبەت بۆ هێستری برسـی رووا‌ون، ئەنتـی هەولێـر لە دوای هێسـترەکە دەڕۆیشـت، منیش لە دوای وی، رستە ترسناکەکەی بە پێکەنینەوە لە دەم دەرچوو:

هەچە، دەڵێی تۆش خەڵکی هەولێری، نازانی لە رێش بڕۆی.

ئەو بە پێکەنینەوە وای گوت، بەڵام مـن بە ددانکرۆشـتنەوە، نـازانم نە نەمکردە نامەردی نە دامە کەرایەتی، قۆنداخە تفەنگم خێواندە پشتی ملـی و هێشتا هاواری لێهەڵنەستابوو، جوونێکی ئەوهام پێیدا:

چما ئەڵێرە نۆ قەد دا...

گێژ و وێژ بوو، توانای دەستکردنەوەی نەما، کلاشینکۆفەکەم لێسەند و دوو سێ مستەکۆڵەی باشم لێدا.

+کوڕە، بەسە سەگی سەگباب، منت کوشت.

- سەگبابی وەك تۆ...

دەسـتیکردەوە، لێکمـان دا، کەرایەتـیەکە باشـتر گرتمـی، کلاشـینکۆفم لێراکێشا، دیتی خوێن بەرچاومی گرتووە، بە کەرایەتی منی نەکرد، نەرمی کێشا،کەوتە مەیلەو پاڕانەوە:

+با بەس بێ من بە گاڵتە هەڵەیەکم کرد.

- هەر دەتکوژم.

+ واز بێنە، جارێکیدی ئەگەر بە باش بە خراپ ناوی هەولێـر بە سـەر زمانی مندا هات، هەقی خۆتە هەرچی بکەیت.

- چیت پێدەڵێم وا بکە، دەنا قوربانی یەك گوللەت دەکەم.

+ بڵێ

- چیم گوت بڵێ، ئەدی کوو

+ئەدی کوو

- هەولێری تۆیان گ...

+ئەدی کوو

- چیم گوت بڵێ بەدی کوو

+بەدی کوو

- هەولێری تۆیان نە گ..

+ بەدی کووا

بە مەیلەو پێکەنینەوە ئەدی کووی دەگوتەوە، تفەنگەکەم پێداوە، بەڕێکەوتین، لە ڕێ گوتم:

- حەزدەکەیت، ئەو شەڕە بۆ برادەران بگێڕینەوە؟

+ نە، پێویست ناکات.

ئیدی ئەنتی هەولێر، وازی لە هەولێر و هەولێریان هێنا، زۆری نەبرد لێکدی دابڕاین و نەمدیتەوە، ئەگەر ڕۆژێك دیتمەوە داوای لێبووردنی لێدەکەم لەو شەڕەی جگە لە من و وی کەس نەیدیت و نەیبیست.

بەر لە شەڕ حەز دەکەم جارێکیدیش نامەکان بخوێنمەوە نەبادا، نەیانبینمەوە.

## نامەکان

لە بارەگا ئاسمانیەکە، بارەگا زوقم و شەختەبەندیەکەی قەندیل، بە هیچ گەرمنەدەبووینەوە و نەدەبووینەوە، دارودڕی چیا نەما، بە دەمی سۆبەیدا نەکەین، لە هەموو بارەگاکانی زەویەوە پێخەفیان بۆ ئەو بارەگا ئاسمانیە کێشابۆوە، هێشتا گەرم نەدەبووینەوە، ئاخر لە یەك کاتژمێری ئێشکگریی شەوانە بایی زستانێك سەرما دەهاتە لەشەوە، پێشمەرگە بە سۆبە و پێخەف چۆن گەرمدەبێتەوە، پیاوی بەژن بڵندی پژدەری دەیگوت:

بەلاشە ئاگر و پەتوو، ئەو سەرمایە بەس بە باوەشی ژن لە لەش دێتە دەرێ.

ئەو کوڕەی بە دۆستی هێستر ناوی رۆیشتبوو:

نا، نا، هێستریش گەرمتدەکاتەوە.

مەحموود حاجیەك هەبوو، جارێك لە بارەی سەرما و گەرمبوونەوە

شتێکی نزیك لەمەی گوت:

باشترین شت بۆ گەرمبوونەوە، ئاگر نیە باوەڕ بوونە بە ئاگر، گرنگ ئەوەیە تۆ هەستبکەیت خۆت داوەتە ئاگر.

نازانم ئەو بە راستی بوو یان بە گاڵتە، بەڵام من بە راستیم وەرگرت، ئەو مەحموود حاجیە پیاوێکی چاو و برۆ رەشی بە هەیبەت بوو، برای ئەو عەلی حاجیە بوو کە زۆر کەس بە پیاوی ئازا ناویان دێنا.

سارده، بارەگا لە هەموو بارەگا ساردەکانی پێشمەرگە ساردترە، ئاگر دەڵێی گەرمایی نەماوە و لە ئاگرایەتی کەوتووە، سەرمای قەندیل ئاگریش لە ئاگرایەتی دەخات، بە چی خۆمان گەرمبکەینەوە؟ دەمانگۆتە پیاوی بەژن بڵندی پژدەری:

بۆچی ناوی ژنت هێنا، ئێستا سەر و ژن لە کوێ بێنین گەرمبینەوە!

دۆستی هێستر بێ خۆتێکدان دەیگوت:

هێستر، هێستر.

دەبێ کەس هەبووبێ بە قسەی هێستردۆستی کردبێ! بە چاوی خۆم چم نەدی، من نەموێرا لە هێستر نزیك ببمەوە، هاتم قسەی مەحموود حاجیم تاقیکردەوە، خۆم بە نامەکان خەریککرد، کەوتمە ناو نامەکان، نامەکان گەرماییان دەڕژاندە لەشمەوە، نامەکان هی هەندرێنی شاعیر بوون، ئەو کوڕە کە یەکەم دیدارمان لە سەر کانیەکەی کانی تەلانی هەورێ بوو، لە دوای ئەو دیدارەوە، نامە گۆڕینەوەمان وەك ئاگرکردنەوە لە قەندیل لە هەموو وەرزەکان بەردەوام بوو، بەڵام هەتا من نامەیەکم بۆی دەنارد سێ نامە لەوەوە دەگەیشتە من، نامەکانی هەندرێن نامەی ئاسایی نەبوون، زۆر لەوانەی لە هەندرێنەوە نامەیان بۆ هاتبوو وایانەدەگوت، چەتۆ سەحەریش وای دەگوت، ئەو چەتۆیە هەر زۆر سەرسام بوو بە نامەکانی هەندرێن، دەیگوت:

وەختی خۆی نامە گۆڕینەوەم لەگەڵ هەندرێن هەبووە، سێ چوار نامەی بۆ ناردووم، لە کاتی خوێندنەوەیان بە گریان گریاوم، سەیرە

توانایەکی بێ وێنەی لە نامەنووسیندا هەیە، بڕوا ناکەم کەس هەبێ بتوانێ نامەی وا بنووسێ.

چەتۆ سەحەر دەیگوت:

حەز دەکەم هەموو ئەو نامانە بخوێنمەوە کە هەندرێن دەیانووسێ، ئەوجا بۆ هەر کێی نووسیبێ، من چێژ لە دەربڕینەکانی وەردەگرم.

نامەیەکی هەندرێن کە تازە گەیشتبوو، دوای خوێندنەوەی دامە چەتۆ سەحەریش، دیتم بە تاسەوە دەیخوێندەوە و هەستمکرد چاوی پڕ لە ئاو بووە.

وایە هەندرێن لە کنە من جوانترین نامەنووسە، نامەی وا هەیە سەد جاریشم خوێندۆتەوە، لێی تێر نابم و نابم، ئێستا، ئێستای ژوورە ئاسمانیەکەی قەندیل نزیکەی بیست نامەیەکی هەندرێن لەگەڵ چەند شیعرێکی وی وا لە بەردەممە، هیچیانم نەفەوتاندووە، دوا نامەیان دوێنێ پێرێ گەیشت، رەنگە لە تارانەوە نووسیبێتی، هەندرێن دەمێکە لە ئۆردوگای خووی دەستبەسەرە، پێدەچێت، لەوێ دەرچووبێ، وایە نامە گەرمت دەکاتەوە.

لە نامەکان زۆر رستەی جوانی شیعری هەن، زۆر جار لە نامەکانی هەندرێن، رستەیەك لێرە دووان لەوێ، لە یەکم گرێداون و لەو گۆڕە شیعرێکی جوان پەیدا بووە، بەڵام شیعرەکەم دەدڕاند، دەترسام لە بیرمبچێ کە لە نامەکانی هەندرێنەوە دزیومن و نەکا بە هی خۆمی بزانم... بەڵام دێتە بیرم هەندرێن، ئەو کارەی دەکرد، شیعری لە نامەکانی خۆیەوە دەدزی، وا بوو کە شیعرێکی ویم خوێندۆتەوە، هەستمکردووە هەندێ رستە و وێنەی ناو شیعرەکە لە کنە من تازە نین، دواتر تەماشادەکەم لە نامەیەکی خۆی کە چەند مانگ پێشتر بۆمی ناردووە، دزیویەتی، بە پێچەوانەوەش زۆر جار نامەکانی لە شیعرەکانی خۆیەوە دەدزی، هەندرێن دزێکی جوان بوو.

تا رۆژی راپەڕینیش نامەکانی هەندرێن کە بایی کتێبێك دەبوون،

کتێبی نامە جوانەکان، لە ناو کۆڵەپشتەکەم بوون و زوو زوو دەمخوێندنەوە و چێـژی شـیعر و کـورتە چیـرۆکم لێـوەردەگرتن، راپەڕیـن، خۆشـی راپەڕین، نامەکان و زۆر شتیدیشی بزرکرد.

حەیـف، نامەکـان نەمـان، ئەگەر نەفەوتابـان دەمگـوت: هـا ئەو نامـانە بخوێننەوە، ئەو نامانەی هێندەی من نامەی نووسەرانم دیتبێت، نامەی کەس بە نامەی هەندرێن ناگات، نامەی هەنـدرێن دەقـی جـوان بـوون. ئێسـتا بـا بچین بە شەڕ خۆمان گەرمبکەینەوە.

## شـــەڕ

ئەو شەڕانەی بەرۆکی بارەگا ئاسمانیەکەیان دەگرت، لە ژمار نـایەن، لە دوای ئەوەی ئەنفال هەرچی چیا هەبوو گرتی، هات، ئەوەی لە دەسـتیهات کردی، ژیانی نەهێشـت، کـانی چککـرد، مامـانی کوشـت، بـۆ دەرمـانیش گیـابڕنکێکی بەو دەشـت و دەرەوە نەهێشـت. دەسـتی نەگەیشـتە ئێـرە و نەگەیشتێ، هەندێ جێگەی قەندیل هەیە جگە لە پێشـمەرگە و هەور پێـی کەس کەسی پێنەکەوتووە، سوێندی قاچاخچی ناخۆم.

بارەگا ئاسـمانیەکەی ئێمە و ئەو بارەگـایەی کەوتبـووە ئەولاتـرەوەش لەو جێگە عاسـێانەی قەنـدیلن، تـا بلێـی عاسێ و سـەختن، چەنـدان جـار جاش و جێژی ئەنفال هاتن و سەریان لە تاشـە بەردەکـان دا و پێشـمەرگە گۆتەنی:

بە سـەری شـکاو و قـوونی دڕاو قووچانـدیان و گەیشـتنەوە دەشـت و بیابانێ.

هەڵاتنی جاش، سەرباز بە بەر چاوتەوە، خۆشیەکە لە گۆتن نـایە، تەنهـا پێشمەرگە و ئەو کەسـانەی زەبـری جـاش و سـەربازیان دیتـیە، دەزانـن چ خۆشـیەکی چیـایی و پێدەشـتیە، خۆشـیەکە وەکـو فـڕین بە نـاو هەور و تێکەڵبـوون بە زەردەپەڕ و کـازیوە و تـریفەیە، وەك دەسـتبردن بـۆ سـینە و مەمك و ئەو شتانەیە، منیش سەردەمانێك ئەوهـا لە هەڵاتنـی جـاش و جێـژ

چێژم چێژدەکرد... دەبوو وا بام، مەرگ لەگەڵ جاش و سەربازان بوو، لەگەڵ ئەوان دەهات و هێرشی دەهێنا و دەمایەوە و هەڵدەهات، چەتۆ سەحەر دەیگوت:

ئەو ساتانەی بە بەر چاومەوە جاش و سەرباز هەڵدێن، وا هەستدەکەم مردن بۆ هەتایە ماڵی تێکناوە و لە جێی مردن ژیان بۆ هەمیشەیی هەڵیداوە.

**میراتگری سێوە**

چەتۆ سەحەر هەقی نەبوو ئێوارەیە یان سەحەرە، هەقی نەبوو بارەگا لە ئاشتەواییە یان لە شەڕە، هەقی نەبوو جێی قایمە یان گوللەی لە سەرە، هەقی نەبوو دنیا وشکە کزرە تەڕە، هەقی لە هیچ نەبوو، هەر کاتێ سەحەر دەهات، تێیهەڵدەکردە سەحەرێ:

هەوەل سەحەرە

سەحەر سەدایێ.

چەتۆ سەحەر خزمی سێوە دیان نەدەبۆوە، بەڵام خۆی بە میراتگری وی دەزانی، بە پێکەنینەوە دەیگوت:

سێوە لە سەرەمەرگدا لە دوای من و تایەر تۆفیق و چەند کەسێکی نارد و گۆرانیەکانی خۆی بە سەرماندا دابەشکرد، من (سەحەر)م بەرکەوت.

ئەو چەتۆیەی سەحەری لە سێوەوە وەرگرتبوو، لە بارەگا ئاسمانیەکەوە یەك بە دەنگی خۆی تێیهەڵدەکردە هەوەل سەحەرە، شەوە سپیەکان، رۆژە سپیەکان، ئێوارە و سەحەرە سپیەکانی قەندیلی پڕکردبوو لە سەحەر، لە سەحەرەوە بۆ سەحەر هەر سەحەری چەتۆ سەحەر بوو بە سەر بەفری کپدا دەستی لە دەستی با و قەندیل و قەندیل دەڕۆیشت، چەتۆ مولازمیش بوو، بەڵام کەم کەس و لە کەم جێ بە مولازم بانگیاندەکرد، لە هەموو جێیەك بە چەتۆ سەحەر ناوی رۆیشتبوو، ئەو چەتۆیە دەزانم لە کەیەوە بۆتە مولازم، بەڵام نازانم لە کەیەوە بۆتە سەحەر، ئازادێك هەبوو، خەڵکی هەرمۆتە، خزمی نزیکی سێوە بوو، دەیگوت:

+ من دەزانم چەتۆ سەحەر لە کەیەوە سەحەرە..

- دە بڵێ

+ لەو ڕۆژەوەی سێوەیان خستە گۆڕەوە.

- تۆ دەزانی سێوە لە چ ساڵێك مردووە؟

+ چۆن نازانم.

- ساڵی چەند؟

+ ئەو ساڵەی چەتۆ بووە سەحەر.

- چەتۆ کەی بووە سەحەر؟

+ ئەو ساڵەی سێوەیان لە بن گڵ نا.

ئازادی خزمی سێوە بۆ ئەوەی تێنەکەوێت، پەنای بۆ لۆجیکی هەقایەتە مێشە دەبرد و خۆی دەپەڕاندەوە.

چەتۆ سەحەر لە بن بەردیکی مەیلەو ڕاکشاو لە ناو بەفر بە سەر چیچکانەوە سەنگەری لە جاش و سەربازان گرتبوو، دەیگوت:

لێگەڕێن، تەقە نەکەن، با تەواو بێنە پێش، با نزیکبکەونەوە.

دەهاتن، جاش و سەرباز تەواو نزیکدەکەوتنەوە، تەق، تریق، تەق تەق، زرمممممم بمب بمب بمممممم.

ئێستاش زۆر جار بە دیتنی دووکەڵ، ئەو دووکەڵە دێتەوە بینایيم کە لە لوولەی کلاشینکۆفە رووسیەکەی چەتۆ سەحەرەوە دەتگوت دارجگەرەکەی منە تێکەڵی ئەو بایە دەبوو کە لە گوێزان تیژتر دەیبڕی، ئێستاش لە هەموو هەڵاتنێك، هەڵاتن و غلۆربوونەوەی ئەو جاش و سەربازانە لە چاومدا لێدەدرێتەوە کە لە بن بارەگا ئاسمانیەکە لێیان دەقەوما و دەتگوت تاوێرن بە یەکتر دەکەوتن و بەرەو قوولایی زەوی غل غل غلۆردەبوونەوە، لە غلۆربوونەوەی ئەوانیش، پێشمەرگەی تووڕە لە پێکەنینێ لە سەر پشت دەکەوتن، زۆر جار تفەنگیان لە دەست بەردەبۆوە، چەتۆ سەحەریش تێیهەڵدەکردە سەحەر، هەر سەحەر نا، سەحەر هەموو گۆرانیەکانی سێوەی دەگوتەوە، ئایشەگوڵەکەی لە هەمووان جوانتر

دەگوتەوە، من هەستمدەکرد لە گۆرانیەکانیدی سێوانەتری دەڵێتەوە:

**گەلی برادەرینە**

**ئەمن ئەستیرەکم لێ هەراتیە**

**لە لایێ رۆژهەراتی**

**قەت لە دریێ من ئاوا نابی**

**ئایشەگور دەریێ**

**سوارە سووکەلانەکەی من بزربوویتەوە و**

**قەت پەیدا نابی...**

دوو دونـدە ئاسـمانیەکە بە چـڕی تەقەیـان لە سـەرە، تـۆپ بە تـۆپ دەکەوێت، پێشـمەرگە لە نـاو تەڕوتووشـی سـەنگەریان گرتـووە، جـاش و سەرباز خدێیان بە شکان و هەڵاتـنەوە گرتـووە، ئەوە سـەری چەنـد رۆژانە هێرش لە دوای هێرش دێنن و شکان لە دوای شکان دەشـکێن و هەڵـدێن و لە هەڵاتنیشدا چەتۆ سەحەر گۆرانی گـۆرانی، سـێوە دەڵێـتەوە، ئـا سـێوە دەڵێتەوە، لە گوێی من چەتۆ وەك سێوە، سێوە دەڵێتەوە، ئەگەر بمـانەوێ لە هەڵاتنەکان ژمارەیەکمان دەستکەوێ، دەبێـت لە چەتـۆی میراتگـری سـێوە بپرسین:

ئەرێ لەو زسـتان و دەمەو بەهـارەی بارەگـا ئاسـمانیەکە کە خـۆت دابووە پاڵ بەردێکی بەفراوی، چەند جار سێوە و سەحەرت گوتۆتەوە؟!

تەق.. تەق.. تەق..

بمب.. بمب.. بمب..

تەق..تیق..

بمب..رمب..

لە یادمان بێت چەتۆ سەحەر لە زۆربەمـان ژیانـدۆسـتتر بـوو، ناچـار نەبـا رووەو مردن نەدەچوو، ناچار نەبا لە پێش مردن رانەدەوەستا...

یان کوری سیکۆتین ببینینەوەو لێی پرسین:

ئەرێ تۆ کە لە ناو سـەنگەر هەر بە پێـوە بوویـت و بە قسـەی کەسـت

نەکرد و دانەدەنیشتی، بە ئێمە نالێی چەند ئارپێجیت بە جاش و سەرباز و دنیاوە نا؟

## کوڕی سیکۆتین

ئەگەر کوڕی سیکۆتین لە یادی مابێ، لە سەنگەرە بەفراویەکانی بارەگا ئاسمانیەکە چەند گوللە ئارپێچی بە لێژایی دنیاوە ناوە، ڕەنگە منیش بێتەوە بیرم کە چەند جار هێرش کراوەتە سەر بارەگا، چاوم هەندێك وێنەی کوڕی سیکۆتینی تێدا پارێزراوە، حەزیش بە نیشاندانەوەی هەندێکیان دەکەم، کوڕی سیکۆتین مندالکارێك بوو، لە سیمادا تریاکی خۆی دەنواند، ئەو کوڕە سەرکار نا بەڵام ناوێکی وەك سەرکاری هەبوو، نازانم کێ بوو ناوی (کوڕی سیکۆتین)ی لەو کوڕە نابوو، بەڵام شتێکم لە سیکۆتینەکە دەزانی، دەیانگوت:

پێشتر حەبخۆر و سیکۆتینخۆر بووە، نەبێتە درۆ سیکۆتینی نەدەخوارد بۆنی دەکرد، ئێستاش دەستیکەوێت وەك شەکرۆکە و حەریج دەیخوات و بۆنی دەکات.

من نازانم کوڕی سیکۆتین پێشتر وا بووە یان نا، بەڵام بە چاوی خۆم دیتم، ئارپێچی دەهاویشت و شتێکی بۆن دەکرد، لێرەوە حەزم لێیە ناو لە کوڕی سیکۆتین بنێم کوڕی ئارپێچی، ئەوەتە لەو پاڵ بەردە بە پێوە شەڕ دەکات، جگە لە کوڕی ئارپێچی کەس بە پێوە نابینی، چەندی گاسی دەکەن، بە سێ دەنگا گازی دەکەن:

+دانیشە، کوڕە دانیشە، گوللەت پێدەکەوێت.

- لێمگەڕێن، با داکی هەرچی جاش و عەسکەر هەیە بگێم.

+ بە دانیشتنەوەش دەتوانی داکیان بگێی!

- نا، بە پێوە خۆشە.

+ خۆت کەر مەکە، دانیشە، با گوللەیەك ساردت نەکاتەوە

- گولله گەرمم دەکاتەوە، با گەرمبیمەوە، سەرمایە سەرما.

کوڕی ئارپێچی لە ناو بەفرێ وەها گەرم داهاتبوو، سارد نەدەبۆوە، بە قسەی کەسی نەدەکرد، دانەدەنیشت و دانەدەنیشت، هەر بە پێوە شەڕی دەکرد، نازانم کێ بوو، دوای شەڕ لە بارەی کوڕی سیکۆتینەوە گوتی:

ئەگەر قەندیل حەفتا شەڕکەری وەك ئەو کوڕەی هەبێ، نەك هەر سوپای بەغدا، هەرچی سوپای شام و قوڕەیشیانە هێرش بێنن، بە سەری شکاو و قوونی دڕاوەوە دەگەڕێتەوە.

تەق.. تەق.. تەق..

بمب.. بمب.. بمب..

تەق..تیق.. بمب..رمب..

## کوڕی حەلوا

تەماشاکەن ئەو کوڕە باڵابەرزەی بیکەیسی لە سەر شانە و ئەو سەر و ئەم سەر دەکات، ئەوە بێستوون حەلوای ناوە، رەنگە لە دوای بەردێکی وا بگەڕێت کە بەشی شاردنەوی بکات، جا چ بەردێك، چ قووچەکێک هەیە پەنای ئەو بەژن و باڵایە بدا، دەڵێی بێ ئیزنی باواجی وا گەورە بووە، پیاوی بێتەل لە چاو وی فندەگولەیە، بێستوون پێدەچوو حەلواخۆرێکی نموونەیی بووبێت، خۆی دەیگوت:

رۆژ هەبووە پێنج کیلۆ حەلوام خواردووە.

هەبوو دەیگوت:

بە حەفتەیەك یەك دوکان حەلوای خواردووە.

من نازانم ئەو قسە حەلواییانە تا چەند راست بوون، چەند شیرینی و حەلوایان پێوەکرابوو، بەڵام ئەگەر لە جێی حەلوا خورما دابنێین و ئەگەر بۆ چەند شەوێکی خورماییش بێت، بێستوون بێ حەلوا بهێڵینەوە و کۆڵەپشتەکەی پڕ لە خورما بکەین، ئەودەم تێدەگەین بێستوون خورما، چ خورماخۆرێکی پڕ لە ناوك بوو، هەر هێندەت دەدیت لە تەنیشت بێستوون

خورما، قەتارەیەك ناوكە خورما هەڵدراوەتەوە، نازانم چۆن و لە ڕێی كێوە خورما دەگەیشتە بارەگا ئاسمانیەكە و بێستوون وەردەگەڕایە سەری، كیفاحێك هەبوو، خەڵكی تكریت یان دەور وبەری تكریت بوو، وا بزانم لەگەڵ ماڵی دایكی سەدام حوسێن ئاقاریان بە سەریەكەوە بوو، ئەو كیفاحە دەیگوت، ڕووی لە بێستوون بوو:

هەموو دارخورماكانی بەسرە ساڵی دوو حەسیر خورما بگرن، هێشتا بەشی ئەو كوڕە ناكات.

كوڕی خورما گەرناس بوو، ڕەنگە بە قەت ئەو ناوكە خورمایانەی لە زاری ویەوە دەكەوتنە سەر بەفرێ، فیشەكی نابێ بە جاش و سەربازانەوە، دوور نیە ئێستاش بارەگا ئاسمانیەكە پڕ پڕ بێت لە قەوان و ناوكە خورمای كوڕی خورما، بە دەم تەقەكردن و خورما خواردنەوە، كوڕی خورما دەیگوت:

بەس خورمام هەبێت، ئامادەم یەك ساڵی ڕێك بە هەموو وەرزەكانیەوە لەو سەنگەرە بەرگری بكەم و هیچ تۆپێك، هیچ هێرشێكی جاش و سەربازان هەڵمنەقەنن.

تەق.. تەق.. تەق..

بمب.. بمب.. بمب..

تەق..تیق..

بمب..رمب..

دەشتی جارێك هەڵیدایێ:

بە خورما ساڵێك لە سەنگەر بمێنێتەوە، ئەدی ئەگەر حەلوای هەبێ! ئەوا هەتا ڕۆژی پەسلانێ هەر لەو بن بەردە دەمێنێتەوە، هەزار بیكەیسی پیر دەكات.

## کوڕی دەشت

دەشتی لە دەشتی هەولێرەوە هاتبوو، لە کن ئەو دەشتیە شەڕی دەشت و دەشتایی لە شەڕی چیاوچۆلان خۆشتر بوو، بە وی با حەفتەی حەفت جاران لە دەشت و پێدەشتان یەخەی شەڕی گەورە و شەڕی گەورە یەخەی گرتبا، بەڵام سالی جارێك لە چیاو هەوراز و نشێوان تووشی بە تووشی سووکە شەڕێکیشەوە نەهاتبا، من تەواو پێچەوانەی دەشتی بووم، هەر زراوم لە شەڕی دەشتایی چووبوو، دەشتی کەمێك ورگی هەبوو، حەزی لە هەورازە ڕێ نەبوو، دوور نیە هەر لەبەر هەندێش خۆشیی بە شەڕی چیا نەهاتبێ، هەر لە خۆشەویستی دەشتیشەوە بە هەر دوو واتاکەی دەشتەوە ناوی لە خۆی نابوو دەشتی، ئەها چاو لێکەن.

+ ناو نەما دەشتیت هەڵبژارد؟

- خەڵکی دەشتێ لە هی شاری بێ گرێوگۆڵترن، پێشمەرگایەتیش لە دەشتودەر خۆشترە وەک لە چیاو چۆل.

دەشتی خۆی داوەتە بن بەردێك، وەها بە بەردەوە نووساوە، مەگەر کیمیای عەلی کیمیاوی دەنا هێز نیە لەو بەردە مەتەرێزیەی بکاتەوە، بە چاوی خۆم دەبینم سێرەی گرتووە لە تارماییەکانی ئەنفال.

تەق.. تەق ..تەق..

بمب.. بمب.. بمب..

تەق..تبق..

بمب..رمب..

## کوڕی بەفر

دەریاش کە گەرمیانیەکی تا بڵێی جوان بوو، دوور نیە گەرمایی گەرمیان و مەتارەی بەتاڵ و چۆڕلێبڕاو وایانلێکردبێ ناو لە خۆی بنێ دەریا، لە ساتە بێ ئاوی تەریفەییەکان، لە ناوەکەی خۆیەوە و بە خەیاڵی تەڕ تەڕ تەڕایی خستبێتە سەر لێویەوە.

+ ئەرێ دەریا، دەریا بۆ؟
- لە هەڵاتنەکانی گەرمیان بپرسن.
دەریا تا بڵێی بەفردۆست و شیعرویست بوو، دەیگوت:
بەفر تینویێتی ناشکێنێ، دەنا ناوم لە خۆم دەنا بەفر.
دەیگوت:
غەدر لە شیعر دەکەم، دەنا ناوم لە خۆم دەنا شیعر
ئەویش بەردێکی کردۆتە ماڵ و سوێندی بە بەفر خواردووە کە جێینەهێڵ. ئۆی، دەریا! بە لادا هات دەریا، بەفری سوورکرد دەریا، پەلە ساچمەی کام تۆپ بوو گەیشتە دەریا، دەریا کوڕە جوانەکەی گەرمیان بریندارە، ئەو خرکەڵەیە کێیە دەریای بە شانی خۆیدا داوە و بە کەڵێنی گوللەدا دەیبا، ئەها ئەوە دەشتیەکەیە، تەماشاکەن، لە ناو بەفری قەندیلێ، دەشتیی دەشتی هەولێرێ دەریای گەرمیانی لە پشتێ کردووە و خوێنیش شەڕێکی گەرم دەنووسێتەوە.
تەق..تەق..تەق..
بمب..بمب..بمب..

ئەنتی عەرەب

ئەوەی لەو لاوە هەر ئەوەتە سەری دیارە، وا تێبگەم (ئەنتی عەرەب)ە، ئەو پیاوە پێشمەرگەیەکی عەرەب ئەو ناوەی لێنابوو، رەنگە ناهەقیشی نەبووبێ کە بە ئەنتی عەرەب ناودێری کردبوو، ئاخر رقی دنیای لە سەلاحەدینی ئەیووبی دەبۆوە

+ باشە تۆ بۆچی هێندە رقت لە سەڵاحەدین دەبێتەوە؟
- هێشتا رقم لێنەبێتەوە! ئەو شەڕەی بۆ عەرەبی کرد، ئەگەر بۆ کوردی بکردایە، کورد نهۆ دەوڵەتێ بوو، هەرچی دەوڵەتی عەرەبی هەیە دەست لە سەر سینگ بۆی رادەوەستان، ئاخر عەرەب هی ئەوەیە شەڕی بۆ بکەیت؟!

ئەنتی عەرەب رقی دنیاشی لە هیتلەر هەڵگرتبوو.

+ باشە هیتلەر بۆ، خۆ ئەو خزمەتی عەرەبی نەکردووە؟

- هیتلەر هەر زۆر سەگبابە، دەزانی بۆ؟

+ چونکە جوولەکەی قڕکرد.

- نا، چونکە عەرەبی قڕ نەکرد.

ئەنتی عەرەب، سەردەمانێك لە فەلەستین شەڕی ئیسرائیلیشی کردبوو، جارێك لێیان پرسی:

+ تۆ گلەیی لە سەلاحەدینی ئەیووبی دەکەیت، لەسەر ئەوەی شەڕی بۆ عەرەب کردووە، گلەیی لە هیتلەر دەکەیت لەسەر ئەوەی شەڕی جوولەکەی کردووە، کەچی خۆشت لە ریزی عەرەبان و شەڕی جوولەکەت کردووە، ئەوە چەندی بە چەند؟!

- واز لەوە بێنن.

تەماشاکەن ئەنتی عەرەب (موحسین ) دەسرپێژ دەسرپێژ، دەسرپێژان داوێتە جاشە کورد و سەربازی عەرەب.

تەق.. تەق.. تەق..

بمب.. بمب.. بمب..

تەق..تیق.. بمب..رمب.

## کوڕی پرتەقاڵ

ئەو پیاوەی کەمێك لە سەرەوەی ئەنتی عەرەب لە پەنای بەردێك و کۆمەڵە خۆڵێکیشی هەڵداوەتەوە، دەبینم جوولەجوولیەتی و پێدەچێ جێی خۆی خۆش بکات، عەرەبێکی باقووبەییە، لە ناو پرتەقاڵەکانی باقووبەوە هاتووە، رەنگیشی لەو پرتەقاڵانە دەچێ کە چاو بە هەڵە دەبەن و رەنگی خۆیان بە لای سوریدا دەبەن، هەر لەوەشەوە کوڕی پرتەقاڵی بە سەردا براوە.

+ ئەرێ ئەسعەد، بۆچی پێتدەڵێن کوڕی پرتەقاڵ؟

- دیارە تۆ باقووبەت نەدیوە!

+ باشە بۆچی ڕەنگی پرتەقاڵت گرتووە؟
- هەموو باقووبەییەکی ڕەسەن وەك منن.
+کە وابێ باقووبە چی وای باقووبەیی ڕەسەن تێدا نەماوە.
تەق..تەق..تەق..
بمب..بمب..بمب..
تەق..تیق..
بمب..ڕم

## کوڕی ماست

ئەوەی لە دواوەش لە پەنـــای بەردە گەورەکە دوور نـــیە لەگـــڕ دروستکردنی باژڵەی هێلکە بێ و پاش کەمێکیدی لە تەنیشتم تەپەیەك دێ و نان و هێلکەی خۆم دەخۆم، عادل کەس لەبیرناکات، ئەو کوڕە ماستخۆرێکی بێ ئامانە، مەنجەڵە ماستێك بە نانێکەوە دەخوات، یەکەم وشەی کوردیش کە فێری بوو وشەی (ماست) بوو، هێشتا هەر لە بەغدا بوو ماستی جوان گۆدەکرد، هێشتا چ ئاشنایەتیەکی لەگەڵ کورد پەیدانەکردبوو، هەولێری لە ڕێی ماستەوە ناسیبوو، دەیگوت:

بەرلەوەی ماستی هەولێر تامبکەم، هەر هێندەی تۆ حەزم دەچووە ماست، جارێك لە ماڵە دراوسێیەك تامی ماستی هەولێرم کرد، لەو ڕۆژەوە سەرم لە ناو ماست بکوڵێنن، هێشتا ئۆخەی ناکەم، باوەڕبکەن، زۆر جار لە بەغداوە تایبەت بە ماست چوومەتە هەولێر.

کوڕی ماست دەیویست فێرمان بکات چۆن ماست بخۆین، چەندی کردی فێرنەبووین:

ماست تەنها بە نانەوە دەخورێ، چایەی بەسەردا مەکەن، چایە تامەکەی دەکوژێت، هەنگوینیشی بە سەردا مەکەن، ماست بە تامی ماستەوە ماستە.

کوڕی ماست ناوە ناوە دەیگوت:

ئای بۆ حەفت مەنجەڵە ماستی هەولێرێ.

تەق..نەق.. تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تیق.. بمب..رمب..

**دژە قەندیل**

قەندیل لە لای پێشەوە وەها سەنگەری گرتووە، رەنگە قیامەتیش هەستێ، بێ ئەو بەردە چۆلنەکات، ئەو قەندیلە هەڵدەستاو دادەنیشت تفێکی لە قەندیل دەکرد، کەچی ئەوەتا لە قەندیلێ سەنگەری گرتووە، جگە لەوەش ناوی لە خۆی ناوە قەندیل.

+ تۆ هێندە رقت لە قەندیل دەبێتەوە، کەچی ناویشت لە خۆت ناوە قەندیل؟!

- ئەو دەمەی ناوم لە خۆم نا قەندیل، جگە لە گردی کلك مشك چ گرد و چیایەکم نەدیتبوو.

تەق.. تەق.. تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تیق ..بمب..رم

**بەردناس**

ئەوی سەری ئەو سەریش کە هەر ئەوەتە سەری دیارە، لە پاڵ بەردێك سەنگەری لێداوە، مووشەکی حوسێنیشی پێدا بتەقێتەوە، نایقرنجێنێ، بە هەڵە حەمە شەریفی ناوە، دەبوو ناوی بەردناس بێ، چەند جۆر بەرد هەبوو، هەمووی دەناسی و ناویانیشی دەگوت، دەشیزانی کام بەرد ناسکە و بە گوللەی دەمانچە شەق دەبا و کامیشیان حەفت تۆپیشی پێبکەوێت هێندەی کەلابەردێك بەردی لێناکەنەوە، بەردناس ئەوهایە کە خۆی دایە بێ بەردێکی بە دڵی خۆی و سێرەی لە جاش و سەربازان گرت، بەردەکە بەزێ و هەڵێ، بەردناس لە جێگەی خۆی نابزوێ.

تەق.. تەق.. تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تیق..

بمب..رمب..

## ئەکتەرە ئەمریکیەکە

پێشتر کە سمێڵی هەبوو، لەوی دەکرد، بەڵام بەو رادەیە نا کە لە توانای چاو نەبێ لێکدیان جودابکاتەوە، بەڵام ئێستا دوای ئەوەی لە سمێڵی دەهری بوو، پووختە مووسێکی پێدا هێنا، خۆی بووە ئەکتەرە ئەمریکیەکە، لە پێکەنینیش هەر ئەکتەرە ئەمریکیەکەیە، ئەوەتا گوێم لە پێکەنینیەتی، لەو وێرانبوونەی بارەگا ئاسمانیەکە بە دەم تەقەکردنەوە حریت حریت پێدەکەنێ، ئەکتەرە ئەمریکیەکەش وای دەکرد، ئەکتەرە ئەمریکیەکەی ناو فیلمەکە نەمانزانی ناوی چی بوو، بەڵام ئەکتەرە ئەمریکیەکەی بارەگا ئاسمانیەکە ناوی لە خۆی نابوو (رەنجبەر) تا نەبووە ئەکتەرە ئەمریکیەکە هەر بە رەنجۆ بانگیاندەکرد، بۆ یەکەمجاریش کەریم فەیلی کە هێندەی ئەمریکیەکیش کوردی نەدەزانی، لێکچوونە کتومتەکەی نێوان رەنجۆ و ئەکتەرە ئەمریکیەکەی دیتەوە، ئەکتەرە ئەمریکیەکە لە ناو بەفری قەندیلێ لە پاڵ بەردێ لە سەر چیچکان تەقە دەکاو پێدەکەنێ.

تەق..تەق..تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..ترق. .بمب..رمب

## کوڕە مینچێنەکان

ئەو دووەی وا لە دواوە سەریان لە بن گوێی یەکتر ناوە، گوێم لە دەنگیان نیە، بەڵام دەزانم لە بارەی چیەوە دەدوێن، لە شەڕگە و ئاقاری شەڕدا مینچێن جگە لە مین لە چی دەدوێ، ئەو دوو مینچێنە هەردووکیان

مولازمن، ئەحمەد شاهێنیان هەولێریە ماجدیش بەغدایی، ئەو دوو ملازمە پیشەی ئێستایان مین دانانەوەیە، لە چاویان دیارە چاوەڕێدەکەن تا تاریکی دابێ و دەستبەکاربن، ئەو دوو ملازمە مینچێنە دەچن لە رێی جاش و سەربازان مین دادەنێنەوە، هەر جاش و سەربازێك لەوێ لە ئاقاری بارەگا ئاسمانیەکە مینی پێدا تەقیبێتەوە، بێ هیچ گومانێك دەستی کوڕە هەولێری و بەغداییەکەی تێدابووە.

تەق.. تەق..تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تریق...بمب..رمب..

## سەنگەرەکان

چەند سەنگەرێك لە سەنگەرەکانی بارەگا ئاسمانیەکە سەنگەریان گرتبوو، هەر سەنگەرە و بە شتێك لەویدی جیادەکرایەوە و دەناسرایەوە، یەکیان بە ئاوەڵناوی سوور، یەك بە خزمایەتی لەگەڵ مەلا نەفتە، یەك بە(کەرماکەر) یەك بە... ئێستا تەنها سوورەکەیان لە من دیارە، وەك دەڵێن سۆزی بە خۆی داوە، سوێندی بە رەنگی سوور خواردووە تا سەنگەرەکەی سوور هەڵنەگەڕێ، چۆلی نەکات.

ئەو سەنگەرە سوورە نازانم ماڵی خۆیان لە کوێ بوو، بەلام ماڵە خوشکێکی لە سەیداوەی هەولێر لەو کۆلانە بوو کە من بە منداڵی بە بەردی بەردەقانی سەرم پیس شکا و ئێستاش جێگاکەی دیارە، سەنگەرە سوور سەنگەرەکەی زۆر قایمە، بەردێك لە پێشی یەك لە پشتی، هاوەنیش نایگرێتەوە.

زرمەیەك چیای هەژاند، بێ ئافاتی کەی خودایە، هاوار لە هیچ لایەکەوە بەرزنەکەیتەوە خودایە، تنۆکە خوێنێك لە پەنجەی هیچ پێشمەرگەیەك نەیە...

+ بمگەنێ بەر من کەوت.

- سەنگەر، سەنگەر...

سەنگەر سەنگەری سوورکرد، ئەو برینە بە هی ساچمە ناچێت، ڕەنگە برینی ئەو پەلە بەردانە بێت کە تۆپەکە بە سەر سەنگەرەکاندا بارانـدنی و سەنگەر بەرکەوت.

تا ئێستا بارەگا ئاسمانیەکە دوو برینداری هەیە دەریا و سەنگەر.

تەق..تەق..تەق..

بمب..بمب..بمب.. تەق..تریق..بمب..ڕمب..

## پیاوە سوورەکان

ئەوانەش پیاوە سوورەکان، بە لای چەپدا کەمێك شۆڕبیەوە دەیانگەینێ، دوو لەو پیـاوە سـوورانەم بە سـوورایی تەواوەوە لە نیگـادا مـاوە، سـەلیمە سوور و هەمزە سوور، لەوەتەی پێدەشتی پڕدەر بەهـاران گـولیلکە سـوورە دەگرێ، ئەو پیاوانە سوورن، ئەوانە کە دایانە لاملی بەردەستێش بۆیان نەرم دەبێ، پێدەچێ دابێتیانە لاملی، بۆیە شەڕ درێژەی دەبێ، شـەڕ بـێ کۆتـایە، سەنگەر چۆلکردن خەیاڵێکە مەگەر تەنها لە سەری جاش و سـەربازان بـۆ تاوێـك بـگەڕێ، گۆنـای پیـاوە سـوورەکان کە لە پـاڵ بەردی بەفـراوی سێرەیان گرتووە، دەڵێی تەماتەی بن بەفرێن.

تەق..تەق..تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تریق..

بمب..ڕمب..

## منداڵی جوامێر

منداڵە، زۆر منداڵە، تازە مووی لێدێ، بەڵام لە شەڕێ کەم پێشمەرگەی جوامێر هێندەی وی بە ئەزموونە، ئەگەر باوەڕیش ناکەن تەماشاکەن، چۆن سەنگەر دەگـرێ، لە سـاتەکانی هێرشـبردن ببیـنن، لە سـاتەکانی بەرگـری

ببینن، له پاشه‌کشێ و هه‌ڵاتنێ ببینن، ئه‌ودەم باوەڕدێنن ئه‌و منداڵه‌جوامێره ناوی پێشه‌وایه و له شه‌ڕێ له شاگردانی سمکۆی شکاکه.

ته‌ق..ته‌ق..ته‌ق..

بمب..بمب..بمب..

ته‌ق..تریق..

بمب..رمب..

## پێکی شۆڕش

ئه‌و شۆڕشه‌ش هه‌ر له شاگردانی سمکۆی شکاکه، سوێندی به شۆڕش خواردووه که هه‌تا شۆڕش مابێ ده‌بێ هه‌ر له شۆڕشدا بێ، به‌ڵام وه‌ك زۆر که‌سیش مه‌رجی هه‌بوو بۆ مانه‌وه‌ی له شۆڕش، هه‌بوو ده‌یگوت:

شۆڕش بێ چایه ناکرێ...

هه‌بوو ده‌یگوت:

شۆڕش بێ جگه‌ره ناکرێ...

هه‌بوو ده‌یگوت:

..........

به‌ڵام شۆڕش ئه‌وهای ده‌گۆ:

شۆڕش ناوه ناوه پێویستی به پێکێك عه‌ره‌قه.

ته‌ق..ته‌ق..ته‌ق..

بمب..بمب..بمب..

ته‌ق..تریق..بمب..رمب..

## پیاوی بێته‌ل

ئه‌و پیاوه‌ی دوادواوه ده‌بینن، به دانیشتنه‌وه به قه‌د به‌ژنێك به‌ژنی هه‌یه، ئه‌وه ئه‌بوو ئه‌حلام بێته‌لی ناوه، وا بزانم (ئه‌بوو وه‌حش)یشی ده‌ڵێنێ، نابینن بێته‌له‌که‌ی خستۆته بن گوێی و هه‌واڵی شه‌ڕ ده‌گوازێته‌وه، ئه‌و پیاوه به

خۆو بە بێتەلەوە بە ناو هەموو شەڕەکاندا هاتووە و هەواڵی هەموو شەڕەکان لە کن ئەو پیاوە درێژەیە کە پێیەکانی دەتگوت دار خورمان.

تەق..تەق..تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تریق..

بمب..رمب..

## پیاوی پێتچن

ئەو پیاوە دەبینن، ئەوەیان دەڵێم کە لە پیاوە بێتەلەکەش باڵابەرزترە، ئەها لە پەنای بەردەکە جێگەی نابێتەوە، دەیناسن کێیە؟ هەرچی پەڕەکاخەزی چاپکراوی حزب هەیە، پەنجەکانی ئەو کوڕەیان پێوەیە، پەنجەکانی هەمیشە بە شێوەیەك لە جوولەن دەڵێی لە سەر ئامێری رۆنیۆن، ئەها پەنجەنانی بە پەلاپیتکەی تفەنگیشەوە پیتچنییە، ئەرێ ئەو کوڕە پیتچنە تفەنگهاوێژە ناوەکەی لە چیەوە هاتبوو؟ هاوکار...

تەق..تەق

رمب..رمب..

## دەفتەرنووس

ئەو پیاوە خرکەڵە قەڵەوەی ئەو تەنیشتەش کە بەردێکی وەك خۆی خڕی کردۆتە سەنگەر، ناوی ملازم کەریمە، بەقەد مووی سەری خۆی دەشت و پێدەشت و کەند و چۆم و هەوراز و نشێوی بڕیوە تا گەیشتۆتە بارەگا ئاسمانیەکە، کەچی ئەو ورگەی گرتوویەتی داینەناو داینەنا، ئەو پیاوە لە ناو سەنگەریش دەفتەرێکی بە دەستەوەیە و ناوە ناوە شتێکی لێ دەنووسێ، ئای مەرەقم بوو بزانم لە قەڵەمەکەیەوە چی دەڕژێتە دەفتەرەکەیەوە، نەمزانی، هیچی نەدەگوت، درەنگ زۆر درەنگ، کتێبی (راونراوەکان)ی ملازم کەریمم خوێندەوە، هەندێ لەو پێشمەرگانەی لە

بارەگا ئاسمانیەکە بەرسینگی جاش و سەربازیان گرتبوو، لە ریزی راونراوەکان ریزیانگرتبوو.

تەق..تەق..تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تریق..

بمب..رمب..

## کوڕی نان

ئەو کوڕەی لاتەنیشتێکی لێم دیارە و لە بن پرووشەی بەفرێ بابۆڵەیەکی بە دەستەوەیە و وا لوولی دەدا، بەختیار خەرابەیی ناوە و پتریش بە بەخە بانگی دەکەن، ئەو کوڕە بەس برسی نەبێ، ئامادەیە تا رۆژی قیامەت هەر بە چیاوە بێ، هەر شەڕ بکات، لە خۆوە نازناوی کوڕی نانی وەرنەگرتووە، کە دەکەوێتە سەر نان ئەگەر خەمی برانی نانی نەبێ، هێندەی هەمزە پاڵەوان دەخوا، جگە لەوەش پێش ئەوەی دەست بۆ کەوچکی شیوێ ببا، دوو نان بە رووتی لوولدەدا.

- ئێ بە شیوەوە بیخۆ.

+ نا، شیو لە خورێتی خۆش نیە.

کوڕی نان پتر چێژی لە نانی رووت وەردەگرت، دەیگوت:

نان تامێکی تایبەتی هەیە، هیچ تامێک ناگاتە تامی نان، بۆیە بۆوەی تامی نان لە نان وەربگریت بە رووتی بیخۆ و بە هیچ خواردنێك تامی نان تێکمەدە، با ئەو خواردنە هەنگوینیش بێت.

کوڕی نان دەستێکی لە سەر پەلاپیتکەی کلاشینکۆفە و دەستێکیشی بە نانەوە.. کوڕی نان لەبەر خۆیەوە بەندیش دەڵێ، زۆری لەبەرە، بەندی (هەی مەشکێ) خۆش دەڵێ.

تەق..تەق..تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تریق..بمب..رمب..

## شاگردەکەی فەهد

ئەو کوڕە بەژنزراڤە دەبینن، بە کەلێنی تۆپەکاندا لە باشووکە باشووکەتر دێ و دەڕوا، لەو سەنگەر بۆ ئەو سەنگەر لە سەر دەگەڕێ و زۆر جاریش بە پێوە شەڕدەکات، ئەوە ملازم شێرزادە، لە هەڵمەتبردن شێر بە تۆزی پێی ناگات، سروودی (پێشمەرگەی بەهەڵمەتین) دەتگوت بۆ ئەو ملازمە هەڵمەتبەرە گوتراوە، لە کاتی تێکشکان و هەڵاتنی جاش و سەربازان گوێ لەو شێرزادە بگرن:

لە شاگردانی فەهدی قارەمانین، قارەمان...

هەر بە هۆی زۆر گوتنەوەی ئەو سرووده، ناونرا شاگردەکەی فەهد، ئای خۆش و پڕ خرۆش دەیگوتەوە، من کە حەزیشم لەوە نەبوو بە شاگردی فەهد ناوم بێنن، بەڵام لەو ساتانەی شاگردەکەی فەهد دەیگوتەوە، منیش دەمویست لەگەڵ وی بیڵێمەوە، دواتر بیستمەوە، جاشێك لەو جاشانەی بەشداری لە هێرشکردنە سەر بارەگا ئاسمانیەکە کردبوو، لە کاتی شکان و هەڵاتندا گوێی لە سروودەکەی شاگردی فەهد بووە و گوتوویەتی:

منیش بە دەم هەڵاتنەوە، بە بێ ئەوەی بزانم بۆ، یەك بە دەنگی خۆم دەمگوت:

لە شاگردانی فەهدی قارەمانین، قارەمان...

تەق..تەق..تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تریق..

بمب..رمب..

## کوڕەکەی ئایشەگوڵ

ئەو پیاوە باڵابەرزە چوارشانەیە دەبینن، وا لە شاگردەکەی فەهد نزیکبۆتەوە، ئەها وا پێکەوە قسەدەکەن، رەنگە شتێکی گرنگ لە بەرەی شەڕ روویدابێت، ئەو پیاوە من بزانم بە هەڵە پێیدەڵێن حەمەی حەلاق، راستیەکەی حەمەی ئایشەگوڵە و کوڕە جوانەکەی ئایشەگوڵە، ئەو ئایشەگوڵەی لە دیدی منەوە لە هەموو گوڵان گوڵتر بوو، روومەتی کوڕەش لە هی دایکی دەچێت رێك دەڵێی سێوە لاسوورەکەی ناو گۆرانیەکەیە، ئەوەی لە ناو باخچەی هیران و نازەنینێ تازە فەریکە... کوڕەکەی ئایشەگوڵ، دەڵێی هەواڵی سەرڕێژ کارەساتاویی دایکیی پێگەیشتووە، کز و تووڕە دیارە، دەیەوێ بە دوو تفەنگ شەڕبکات، تفەنگێکیان تایبەت بۆ تۆڵەی ئایشەگوڵ، من لە هەموو نیگایەکمدا کە دەیبڕمە کوڕەکەی ئایشەگوڵ، سمکۆی شکاك دەبینم، بە دەست خۆم نیە حەمەی ئایشەگوڵم لێ بۆتە سمکۆی شکاك.

تەق..تەق..تەق..

بمب..بمب..بمب..

تەق..تریق..بمب..رمب..

## تەتەری پژدەری

ئەو پیاوە پێدەچێ سەر بە تیرەی لەمەچێتران بێ، بەو باوبۆرانە، بەو بۆردومان و تۆپبارانە، بەو دنیا وێرانە چۆن گەیشتەوە ئێرە، ئەو پیاوە پێیەکی لە قەندیلە، لە چیایە و پێیەکیشی لە رانیەیە، لە شارانە و پژدەریشە، هەر کاتێکیش نیفۆی شەرواڵەکەی تەماشابکەیت، پڕە لە پەڕە کاخەزی لوولدراو، ئەو پەڕە کاخەزانە، هەمووی نهێنیی حزبن، پژدەریی رەسەن زۆر جار دەیگوت:

لە فسێی نهێنی بەم، نیوەی نهێنیی حزب لە ناو نیفۆی محەمەدە.

ئەو محەمەدە دەمێکە ناوی بۆتە تەتەری پژدەری.

تەق.. تەق..

رمب..رمب..

## کوڕانی بەو بەو

ئەها ئەو سێ چوار پێشمەرگەی لای خوارەوەتان لێ دیارە؟ ئەوانەی مەیلە و سێگۆشەیی سەنگەریان گرتووە، ئەگەر سەرچێخ نەچووبم، ئەوانە ئەو کوڕانەن کە لەبەر خۆیانەوە بەردەوام گۆرانیی ( بەو بەو) دەڵێنەوە، ئەو کوڕانە لە نزیك ئەلوەندەوە هاتوون، ئا، هەو ن،هی پێشەوە سەلوانە، ئەوی دواوە بە لای چەپ، خەسرەوە، ئەویتریان نەهرۆیە، ئەها نەهرۆیان، لە سەنگەرەکەی هاتە دەرێ، گوێم لێبوو بە نەهرۆیان گوت:

بگەڕێوە دواوە، تۆ زۆر نەخۆشی.

لە بن پرووشەی بەفرێوە دەبینم نەهرۆ ڕەنگی تێکچووە، سەرما بە نەهرۆ وێراوە، جا سەرمای قەندیل بە کێ ناوێرێ، وا گەڕایەوە دواوە، دکتۆر هۆشەنگ خۆ ئامادەکە، نەخۆش هات، بۆ ئامادەکردنی دەرزیەك دەبێ دەمژمێرێك زووتر دکتۆر ئاگاداربکرێتەوە، بە کاوەخۆترین دکتۆر لە دنیایێ دکتۆر هۆشەنگە، کاوەخۆییش لەوێ بوەستێ، لەبیرچوونەوە گرفتی گەورەی دکتۆرە و قوڕبەسەریەکەش بۆ نەخۆشەکەیە، پێت دەڵێ:

+ بوەستە هەوکە دەرزیەکت لێدەدەم.

- بەس توخوا زووبە.

+ خەمت نەبێت، هەر ئێستا.

هەر ئێستای دکتۆر هۆشەنگ ئەگەر بیرینەخەیتەوە، شەو و ڕۆژێکە، ئەوە چووە بۆ ئامادەکردنی دەرزی، دەبینی وا لە گژ خاوێنکردنەوەی تفەنگەکەیەتی.

- ئەوە چی دەکەیت؟

+ گوتم هەتا نەخۆش نەهاتووە، با تفەنگەکەم خاوێنبکەمەوە.

- ئەدی من نەخۆش نیم و تۆ نەتگوت دەرزیت لێدەدەم؟

+ ده به خودای راستده‌که‌یت.

دڵنیام تا ئێستاش نه‌هرۆ له‌ چاوه‌ڕێی ده‌رزیه‌که‌ و دکتۆر هۆشه‌نگیش ره‌نگه‌...

دکتۆر هۆشه‌نگ به‌و هێمنی و له‌بیرچوونه‌وه‌ی خۆی به‌ ناو هه‌موو شه‌ڕه‌کاندا هاتووه‌، هه‌ر له‌ گه‌رمیانه‌وه‌ تا کوێستانی قه‌ندیلێ.

ته‌ق..ته‌ق..ته‌ق..

بمب..بمب..بمب..

ته‌ق..تریق..بمب..رمب..

ئه‌وه‌ پێشمه‌رگه‌یه‌کیدیش سه‌رما بردی، پیاوی بڵندی پڕده‌ری گوته‌نی، به‌ پێکه‌نینه‌وه‌ ده‌یگوت:

هه‌موو وه‌ك کیری سه‌گ هه‌ڵده‌له‌رزین، وا بڕوا یه‌ك یه‌ك له‌ تڕێ سه‌ی ده‌چین..

له‌ بیرمان بێ پیاوی بڵندی پڕده‌ری بۆ به‌ هه‌میشه‌یی له‌ باره‌گا ئاسمانیه‌که‌یه‌ و نه‌هرۆ گوته‌نی:

بۆته‌ تاشه‌به‌ردێك به‌ قه‌ندیله‌وه‌ و خوداوه‌ندیش ناتوانێ جێی پێله‌ق بکات.

سارده‌ تا خوداوه‌ند حه‌زبکات، دنیا قه‌ت له‌وه‌ ساردتر نه‌بووه‌، به‌فر لێیکردۆته‌وه‌، بایه‌ك هه‌ڵیکردووه‌ پێستی گورگ شه‌قار شه‌قار ده‌کات، ئای بایه‌کی سارده‌ خودایه‌! ده‌بێت نزابکه‌ین، تۆپه‌کان نزیکتر بکه‌ونه‌وه‌، پێشمه‌رگه‌ خۆی به‌ گه‌رمایی تۆپه‌کان به‌ گه‌رمایی گولله‌ گه‌رمده‌کاته‌وه‌.

به‌فر تێیکرده‌وه‌، ئه‌و جاره‌ پێناچێ لێکاته‌وه‌، وا بڕوا که‌س که‌س ناناسێته‌وه‌، هێشتا پێشمه‌رگه‌ تێکه‌ڵی به‌فر نه‌بووه‌، هێشتا هه‌موو له‌ ره‌نگی به‌فر نه‌توانه‌ته‌وه‌، هێشتا هه‌ندێك له‌وانه‌ی نزیکن ده‌ناسمه‌وه‌.

ئه‌ها ئه‌و کوڕه‌ تیلاك خواره‌ باخه‌وانه‌ هه‌ڵه‌بجه‌ییه‌، به‌ ته‌نیشت ژه‌هردا گه‌یشتۆته‌ ئێره‌، له‌ بیرم نه‌چێ من به‌ سێ پارچه‌ پاکه‌ت و به‌ سێ هه‌زار تومه‌ن قه‌رداری ئه‌و باخه‌وانه‌م، که‌پره‌که‌ی گۆڕه‌شێر دیدڤانه‌ به‌ سه‌ر ئه‌و

قەردەوە.

ئەو منداڵکارە باریکەلەیەش دڵنیایە و من بە کورتەك و شەرواڵێکی جوان قەرداریم، دیدڤانیش بنە دار هەنجیرەکەی کانی تەلانی هەورێیە.

ئەو کوڕەی لە هەمووانیش ڕەشتاڵەترە و ددانیشی سپی سپی لە بەفریش سپیتر، ڕێبوار عەرەبە، تا مردن قەرد بەدەمەوە قەردی ئەو کوڕە تەواو نابێت، دەزانن بە چەند مەتارە شەراب قەرداری ئەو ڕێبوارەم؟ دەبێت لە ڕووبارەکەی نۆکان بپرسین.

ملازم ساریش کە نازانم لە کەیەوە ملازمە ئەوەتە سەنگەرەکەی نزیکە لە سەنگەری ڕێبوار بە جووتێ گۆرەویی ئەستوور قەرداریم، خۆیشی لە بیری چووبێت چەند داربەڕوویکی قژ بەفراوی لە داربەڕووەکانی چیای پێرس لە بیریانە و زوو زوو بەبیرمدێننەوە.

هەژاری کۆییش لە خوارترە، ئەو کوڕەی بە سەفەرێکی ڕێی ڕووسیا قەرداریم، هەرێمدابوو پێکەوە بچینە ڕووسیا، من لە سەرەتای ڕێ پەشیمانبوومەوە!

ئەحمەد عەرەب لە دواوەیە، قەرداری ئەو کوڕەشم، دەرزیەکەی ئەو نەبا ئەو جارەی دووپشك پێوەی دام هەر چاك نەدەبوومەوە، جگە لەوەش بە وێنەیەك قەرداریم، وەختی خۆی لە ناو بەفری گارە بە کامێراکەی خۆی وێنەیەکی گرتم، بەڵام ئێستاش نەمدیتەوە.

(ئەبوو جنان) یش دیارە، بەڵام من قەرداری (ئوم جنان)م، باشم لەبیرە لە بارەگایەکی گارەیی کانی توبەی ناو بوو، جارێك بەبێ ئەوەی کەرەستەی پێویستی دۆڵمە لەبەر دەست بێ، دۆڵمەیەکی بۆ درووستکردین لە هەولێریش بە عەنکاووەش هیچ ژنێك دۆڵمەی وا بە تامی ڕوونەکردۆتە سەر سینی.

ئەوانیتریش کێن! دکتۆر سەعد و مامۆستا رزگار، ئەوی پەرگە بە لای چەپ دڵزارە، هەموویان دەناسمەوە، شالاوە، برووسکە، کوردەیە، شەماڵە، شۆڕشە، کیفاحە، سەرهەنگی مەلا نەفتەیە.

بەفر، بەفر ئەوە بەفرە دەبارێ، یان ئاسمانە پارچە پارچە بەردەبێتەوە، پارچەی گچکە کچکە زۆر گچکە بە قەد ناو لەپی ئەو کچەی سەردەمانێك بە هەردوو ناولەپی ناسك و نەرمی سپی لە بەفر ناسکتر و نەرمتر و سپیتر، چاومی دەشاردەوە و دەیگوت:

هەر دەڵێی رووشت لە من نەبێ، چاوەکانت دەبینم و دەزانم کە داخراون یان کراوە، دە بزانە ئێستا چی دەکات!

کلوو بەفری قەندیلێ چەند لە ناولەپی ئەو کچە دەکات کە بەجێمهێشت و بەجێیهێشتم و نەمدیتەوە...

بەفر لێناکاتەوە، ئاسمان لێناکاتەوە، پێشمەرگە سپیە، شەرگە سپیە، قەندیل سپیە، دنیا سپیە، رەنگ لە دنیا نەما، ئیدی لە سپێتیی دنیادا کەس ناناسرێتەوە، دەبێ لە رێی دەنگەوە درێژە بە ئاشنایەتی بدەین، دەبێ نزا بکەین کەس لە دەنگ نەکەوێ، دەنا دەڕوا و ناناسرێتەوە، لە کپێتی بەفر دەنگی تۆپ چەند ناسازە بە دنیا، دەنگی تۆپ ناپسێتەوە لە گوێ.

پێشمەرگە زوو زوو جێگۆڕکێ دەکەن، دەستەیەك دێ و دەستەیەك دەکشێنەوە پاشێ، دەچنە ژوورە بەفریەکە خۆ گەرمدەکەنەوە، ئەگەر ئاگریش نەبێت هەر چوونە ژوورەوە گەرمبوونەوەیە، قەندیل ئەوهایە، بەوەی باشە خواردن هەیە، هێلکەی کوڵاو هەیە، قەسپ و خورما هەیە، نانیش هەتا دەخۆی هەیە، جگەرەش هەیە، زۆر جار لە شەڕەکان پێشمەرگە خۆشەویستە، پێویستی بە توتن و جگەرە پێچانەوە نیە، پاکەت هەیە پاکەت، من زۆر کەڕەت کە پاکەت دەبینم بە دەست خۆم نیە، نازانم نە لە دڵەوەیە نە سەر زاریە دەڵێم:

خودایە، بەردەوامی بە شەڕ بدە، بەردەوامی بە هەر شتێك بدە کە پاکەتی جگەرەی پێوەیە.

بەفر دادەکات، ئاسمان دادەکات، رەنگ و بێ رەنگی دادەکات، بایەك هەڵیکردووە پێدەچێ یەکە یەکە کوێستانە هەرە ساردەکانی دنیای کردبێ، سەری بە سەرجەم سەهۆڵبەندەکانی دنیادا گرتبێ، سەرمایەکە گورگ

تووشی پەسیو و بەراز تووشی زگچوون دەکات، تۆ بڵێی پێشمەرگە لە گورگ و بەراز قایمتربێ؟ شایی شایی لە کەلێنی تۆپەکانەوە شایی، ئەگەر ناوە ناوە لە کەلێنی تۆپەکانەوە پێچێ شایی دانەبەستێ، پێشمەرگە دەبێتە چلوورە بە قەندیلەوە... لە بیرمچوو بە درێژایی شەڕەکان وێنەی ئەو پێچە شاییانە نیشاندەمەوە کە پێشمەرگە لەبەر پرووشەی بەفر و ساچمە، لە بن رێژنەی باران و گولله، لە پشووی تۆپەکان، لە ناو سەنگەرەکان دایاندەبەستا، هیچ تیپێکی شایی هێندەی پێشمەرگەکانی شەڕگە ئاسمانیەکە شاییان نەکردووە و وا جوانیش شایی نازانن، من بیژۆك دەرچووم، شایی شایی، بۆ وەی نەبیە چلوورە شایی شایی، لە سەرکەوتن و دۆڕاندا هەر شایی و هەر شایی، پیاوی بەژن بڵندی پژدەری دەیگوت:

خودا شایی لەپێش شین بۆ مرۆڤ ناردووە، بۆیە شایی شایی...

پژدەریی رەسەنیش دەیگوت:

لە فسێی بەم بەفرەکە هی ئەوە نیە بە فس گەرمبینەوە، یاڵا شایی شایی.

کوڕەکەی ئایشەگوڵیش دەیگوت:

با ئارپێچی سەرچۆپی بگرێ و بیکەیسیش گاوانی، دەی شایی شایی.

تەماشاکەن ملازم شێرزاد لە هەمووان جوانتر شایی دەکات.

بمب..رمب..بمب..

رمب..بمب..رمب..

دەمەوێ کوڕەکەی ئایشەگوڵ تیکەمەوە و بە دزیەوە پێیبڵێم:

هەرچی دوند هەبوو لە دەستمان دا، مانەوەی ئەو دوندە لە دەستمان واتایەکی هەیە! بۆچی خۆمانی لە سەر بفەوتێنین.

ناوێرم بیڵێم، دەترسم بە ترسنۆکم تێبگات و بڵێ:

دەزانم ماندوو بوویت، تۆ پێویستت بە پشووە.

لە بارەی شەڕەوە قسەیەك نەکەم دەتەقم، دەبێت کەسێك ببینمەوە، واتایەك بە شەڕ ببەخشێتەوە، لە ئێستادا ئێستای بن بەفری قەندیلێ من چ واتایەك لە شەڕ نابینمەوە، با ئەو کوڕە عیسایە بدوێنم، ناوێکی وەك نازم

یان نزیك له نازمی هەیە:

+ شەڕ چ واتایەکی هەیە؟

- دەشێ هەبێ دەشێ نەبێ.

+ روونتر قسە بکە.

- واتایەکە لە دەستی خۆمانە.

+ لە دەست خۆمانە؟

- ئا، ئەگەر حەزمان لێبێ شەڕ واتای هەیە، ئەگەر نا واتای نیە.

هەستمکرد لەو قسەیەوە واتایەکی شەڕم دەستکەوت.

**بەفر..بەفر..بەفر**

**بەفر سەراپای دنیای داگرت**

**بەفر هەموو ڕێگاکانی لە سەر بارەگا داخست**

**بە ڕێگای شەڕیشەوە**

ناوە ناوە تۆپێ دێ، ئەویش هەر هێندەی بەربوونەوەی تاوێرێك لە چیا، کەمتریش ترس لەگەڵ خۆی دەهێنێ، ئێستا سەنگەرەکان چۆلن، چەند پێشمەرگەیەك لە بارەگا ئاسمانیەکە بە دیار سۆبەوە، ورد ورد شەڕ دەگێڕنەوە، شەڕ شەڕ بەبیردەهێنێتەوە، شەڕ شەڕ رادەکێشێ، یەکە یەکەی شەڕەکان دەگێڕنەوە، لە دوا شەڕەوە شەڕەکانیدی دێنەوە ناو گێڕانەوە، شەڕ و شەڕ پێدادەگەڕێتەوە، بە پشتئاشاندا دەگەڕێنەوە و بە هەنارەوە دەگەنەوە هەندرێن، شەڕەکان هەر هەموو شەڕەکان دێنەوە ناو گێڕانەوە.

ماندووم، سەرم گێژە لە گێڕانەوەی سەرهاتە شەڕاویەکان، شەڕ خۆشترە لە شەڕ گێڕانەوە، من لەوێ وابووم، بە من با لە شەڕێ بام و لە هەموو لاوە گوللەم لە سەر با، بەڵام کەس شەڕم بۆ نەگێڕێتەوە.

**بەفر..بەفر..بەفر..**

**هەور دەڵێ:**

**بگەنەوە ڕێی چوونەوە**

**ڕێبەندانێکی هەمیشەیی لە ڕێیە...**

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری لە زمانی هەور گەیشت و بە قسەیکرد، بارەگا باریکرد، ئێستا بارەگا ئاسمانیەکە چۆڵە، رەنگە ئەوە جاری یەکەم بێ ئەو بارەگایە چۆڵەوانی بە خۆیەوە ببینێ، پێشمەرگە لە ئاسمان هاتە خوارێ و بە سەر زەویدا دابەش بوو، چۆوە بن زەویش، ئەوەتا هەندێك شۆڕبوونەوە دۆڵەکۆگە، ئەو دۆڵەی کەوتۆتە بن زەوی، هەندێك بەفر و بەفر رۆیشتن و گەیشتنەوە ناوزەنگ و گۆڕەشێر و نۆکان... من لە ناوزەنگ بە دیار سۆبەیەکی هەمیشە داگیرساوەوە، خەریکم عەشق لەگەڵ ئەو نیو بوتڵ عەرەقە دەکەم کە دکتۆر هۆشەنگ بە دیاری دایمێ، دیستۆفسکیەکیش کە رێبوار عەرەبی فارسیزان لە تارانەوە هێنابووی خۆم بە خوێندنەوەی خەریککردووە، حەیف پاکەتی جگەرە نەما، پاکەت لە شەڕەوە دێ کە شەڕ چوو پاکەتیش چوو.

هەواڵێك لە پیاوی بەژن بڵندی پژدەریەوە:

هەرچی زووە بگەنەوە بارەگا ئاسمانیەکە، جاش سەرباز وا وەك بزن بە ناو بەفرێ بە چیادا هەڵدەگەڕێن، زوو پێشیان پێنەگیرێ، بارەگا لە دەستچووە.

پیاوی بەژن بڵندی پژدەری و پژدەریەکان لە کوێوە چاویان لێبوو وا جاش و سەرباز بە بارەگای ئاسمانیدا هەڵدەگەڕێن! نازانم، ئیدی لە هەموو لایەکەوە پێشمەرگە بە ناو بەفرێ، بە سەر بەفرێ بە باڵ باڵیانگرت و گەیشتنە بارەگا ئاسمانیەکە و نەیانهێشت پۆستاڵ پێ بنێتە بارەگا، شەڕ، شەڕ، دیسانەوە شەڕ، من ناچمە شەڕێ، ئەگەر بچم ئەو کوڕە نابینم کە لە ماڵی کتێبەوە هاتبوو، دەبێ لە ناوزەنگ و لە ژوورە یەك کەسیەکەی ناوزەنگ بمێنمەوە و پێشوازی لە کوڕی کتێب بکەم.

## پایزی شێنێ

لەو دەستەیە هەر ئەو پیاوە لە یادەوەریمدا دەدرەوشێتەوە کە بەژنێکی کورت و سەر و ریشێکی خورمایی هەبوو، خۆیشی لە ولاتی خورماوە هاتبوو، دەستەیەکی نازانم چەند کەسی بووین، ئەو پیاوە دوو تفەنگی بە شانەوە بوو، رەنگە هەر ئەوەش وایکردبێت تا نها لە یادەوەریمدا هەمیشە لە پێشمەوە هەڵتەك هەڵتەکیەتی، ئەو پیاوە جگە لەوەی تفەنگەکەمی هەڵگرتبوو، ناوە ناوە دەستیشمی دەگرت، جگە لەوانەش ئەو قسە خورماییانەی بۆ دەکردم کە بۆ رێگەی دوور پێویستن و کورتی دەکەنەوە، ئەو قسانەی لای کەم کەس دەستدەکەون، بیرمە هێشتا رێگە سەختەکەی نزیك (دۆڵەکۆگە)مان ئەو دۆڵەی لە دیدی منەوە قووڵترین دۆڵی دنیایە، نەبڕیبوو گوتی:

خەمت نەبێت، وا مەبینە چ بەژنم نیە، تووڕەبم دوو پیاوی وەك تۆ و زیاتریش دەخەمە سەر ملم و هەتا بنی دنیایێ راناوەستم، شەرم مەکە هەر نەتتوانی بڕۆی، قسە بکە لە پشتێت دەکەم.

بەو قسەیە دڵم خۆش دەبوو، ئەوەشم لەبیرە لە بەر خۆمەوە دەمگوت:

ئەگەر بچمە پشتی وی، چۆکم دەگاتە زەوی.

ئەو رێگەیەی باسی دەکەم، زۆر سەختە، لە دنیایێ هێ لە پێشمەرگە پێی کەس بەو رێیە نەکەوتووە، تا بڵێی سەختە، نەخاسمە لە ساتی بەفر و بارانێ، ئەمن دەڵێم بزن بە بزنایەتی خۆی چەقۆی لە سەر سەری رابگری،

ناوێرێ خۆی لەو ڕێیە بدا، باریکە ڕێیەکە خودا تەنها بۆ ئەوەی کردۆتەوە جاروبار مار پیاسەیەکی پێدا بکات، هەر پێت بڕوا، ڕۆیشتی، یان بەهەشت یان دۆزەخ، پنچکێك نیە خۆتی پێوە بگریەوە، ئەوانەی دیتیانە، دەزانن چ هەڵدێرێکە! پێشمەرگە نیە ڕێی بەو ڕێیە کەوتبێت و هەزار و یەك نزای نەخوێندبێت، بە تایبەتی ئەوانەی چیرۆکی ئەو دوو پێشمەرگەیان بیستبێت کە سەرەتای زستانێك لەو ڕێگەیە بە دوای یەکدا پێیان دەڕوا، لە ئاخر و ئۆخری بەهارێ لە بنەبانی دۆڵێ دەبینرێنەوە، ئەو کەسەی چووبووە سەر تەرمەکانیان گێڕابوویەوە:

هەردووکیان دەستیان بۆ یەکدی درێژکردبوو.

ئێستاش نازانم چۆن لەو ڕێیە سەختە پێم نەڕۆیی!

تایەکم هاتبووێ سەد سووندت دەخوارد بەر پرووشکی ئەنفال کەوتووم، گەرم گەرم، پیاوە ردێن خورماییەکە گۆتەنی:

هەوکە ئەنگوتکێکی سپی بەو ڕوومەتەوە بنێی، لە ڕەنگ و گەرمی وەك خۆی لێدەکات.

بەو تایە ئەنفالیەوە لە بەری قەندیلەوە بەرەو ناوزەنگ دەهاتین، ئەو قەندیلەی شەڕگەی براکانە، ئەو برایانەی هێندەی تەقەیان لێکدی کردووە، لەوانیدیان نەکردووە، پێش چەند ڕۆژێك لەو ڕۆژەی وا من باسی دەکەم، لەو قەندیلە کوڕانی (دیموکرات) لە ناو خۆیان کردیانە شەڕێك، گوللە بە گوللە دەکەوت، ڕاونانێك ڕاوی یەکدیان دەنا، هەرگیز پاسدارانیان وا ڕاو نەناوە، لەو شەڕەدا لەزگبوو منیش لە تڕێ سەی بچم، نیازی ناوبژیمان هەبوو، ئێستاش گیزەی ئەو گوللەی ملیوانەی کراسەکەمی گڕدا لە گوێمە، ناوزەنگیش هەمیشە کەپری حەسانەوە بووە بۆ پێشمەرگەی هەڵاتوو، بۆ پێشمەرگەی دۆڕاو، بۆ پێشمەرگەی ماندوو.

نەدەهاتەوە بیرم، پێشتر ئەو پیاوەم دیتبێت، بەڵام لە دوورەوە دەمناسی، جا کێ هەبوو نەیناسێت، ئەوەی جارێك لە جاران سەری لە شاخ دابێت، ناوی ئەو پیاوەی بیستووە، ئەو پیاوە لە سەردەمی ئەحمەد حەسەن بەکرەوە

چەکی لە شانە، زۆر کەس بە شێتەکە ناویان دەهێنا، هەندێك کەس بەو کەسەی بە هەموو شتێك پێدەکەنێ، هەندێکیدی بەو کەسەی بیست ساڵە هەر پاڵێوراوە و نەبۆتە ئەندام... بەڵام ئەو رۆژە و لەو رێوبانە بۆ من هەر سۆسەنەکە بوو، چەپك چەپك بۆنی میهرەبانیی بە سەر مندا پژاند، ئەو نەبا بەو تایەوە ئەو رێنگەیەم بۆ تەواو نەدەکرا، ئەو (ئەبوو سۆسەن) ە دواتر من ناوێکیدیشم بۆی زیاد کرد (سۆسەن زینداني) رەنگە ئەو ناوە لە هەموو ناوەکانیدی پتر لە خۆی بێت، سۆسەن زینداني فێرە کوردیەکی جوان ببوو، زۆر جار لەگەڵ عەرەبەکانیش بە کوردی قسەی دەکرد، پێیدەگوتن:

شەرم ناکەن ئەو هەموو ساڵە لە کوردستانن، کەچی فێرە کوردی نەبوونە!

وابوو، عەرەبی وا هەبوو دە ساڵ بوو پێشمەرگە بوو، بەڵام دە وشەی کوردی نەدەزانی، ئەگەر بتویستایە ئەبوو سۆسەن تووڕە بکەیت، زۆر ئاسان بوو، ماندووبوونی نەدەویست:

کوردیەکەت باش نیە!

هێندە و بەس، ئەبوو سۆسەن دۆ و دۆشاوی تێکەڵدەکرد، بە هەر سی و دوو ددانی سمێلی دەکرۆشت و سەد جوونی کوردی بۆ دەوروپشتی خۆی دەهاویشت، ئێستاش تێنەگەیشتم بۆچی بەو قسەیە تێکدەچوو، بەڵام شۆڕش کۆیی گۆتبووی هەر شێتەو بە شتێ تێکدەچێ!

بڕۆ بڕۆ، هەست دەکەم چیا و دۆڵ لە چاومدا خول دەخۆنەوە، هەستم دەکرد هەموو جوانیەکانی دنیا لەگەڵ ئەو گەڵا زەردانە هەڵدەوەرێن کە خۆیان بە سینگمدا دەدەن و دەکەونە بن پێمەوە، لەوەتەی فێرە جگەرە بووم، ئەوە جاری یەکەمە کەم و زۆر تام لە جگەرە نەکەم، ئەبوو سۆسەن ناوە ناوە هەر بە دەم رێوە جگەرەیەکی بۆ دەپێچامەوە، مژێك دوو مژ، مژی سێیەمی بە دوودا نەدەهات، فووێکم بە دارجەگەرەکەدا دەکرد... ئەبوو سۆسەن وا بزانم تاکە پیاو بوو لە هەموو دنیایێ وا بە خێرایی لە بای غارێ جگەرە بپێچێتەوە، دەیانگوت:

هیچ پیاوێکی چیایی لە جگەرە پێچانەوە نەیدەگەیشتێ.

ئەز تەنێ حەزم دەچووە یەك شت، ئەویش بە درێژایی ئەو ڕێگەیە نە لە عەرد هەبوو نە لە ئاسمانێ، لیمۆ، هەموو بیرکردنەم لە لیمۆیەکی مەیلەو خــڕ خڕکردبــۆوە، لیمــۆی زۆر جێــانم دەهــاتەوە ناوچــاو و دەوم نەدەگەیەشتێ، ئەوەتا عەرەبانەیەك لەو دیوەی ( باخی شار) سـەری زەرد و سۆر دەچتەوە لە سێو و پرتەقاڵ و هەنار و لیمۆ، بەڵام چاوی مـن هەر لە سـەر لیمۆکـانە، ئەهـا پۆلیسـێکی سـمێڵ گەورە بە خـۆ و بە دارێکـی ئەستوورەوە گەیشت، عەرەبانچی فریای هەڵاتن ناکەوێت، پۆلیس بەو پێیە زلانەی پێلەقەیەك دەخێـوێنێتە عەرەبـانە، ئۆی! مـن لە بـن دەسـت و پێیـان بەس لیمۆکان دەبینم، بە غاردان غاردەدەن، دەترسن دەسگیر بکـرێن، خـۆ دەشارنەوە، دیتم لیمۆیەك کەوتە ژێر پێی پۆلیسەوە، ئای! چ کوفرێـك بـوو خـودایە! ئـاوی لیمـۆ وا بەپـێڵاوی پۆلیسـەوە، خـۆزگە ئـاوی ئەو لیمۆیـانە دەڕژانە دەمی منەوە بەو لیمۆیەشەوە کە پێڵاوی پۆلیسەکەی تەڕکرد.

لە تامەزرۆییم بۆ لیمـۆ هەمـوو ئەو دیمەنـانەم دەهـاتنەوە نـاو چـاو کە لیمۆیـان لێـوە دیـار بـوو، ئەوەتـا لە(سـەمەرقەند) ڕێـك لە لای پەنـجەرەوە دانیشتووم، مەزەیەکی هەمەڕەنگـم لە پێشـە، بەڵام چـاوی مـن لە سـەر ئەو دوو کـوزە لیمـۆ ناسـکەیە کە وا خەریـکە دەسـتم بۆیـان درێـژ دەکەم، پەشـیمانم لە هەمـوو ئەو دانیشـتنانەی (سـەمەرقەند) کە مەزەکەم بـێ لیمـۆ بووە! لیمۆ، خودایە لیمۆ، خودایە بەر لەوەی لەو چیاو چۆلە بمکوژی زارم پڕ پڕکە لە لیمۆ، ئەبوو سۆسەن دەیگۆت:

بەرگە بگرە، لە ناوزەنگ میوەفرۆش هەیە، دڵنیام لیمۆشی هەیە.

لە دڵی خۆم دەمگۆت، خوا بکەم وابێت!

ئیـدی هێنـدە هێـزی ڕۆیشـتنەی لە پێمـدا مـابوو، هێـزی گەیشـتن بە لیمۆفرۆشەکەی ناوزەنگ بوو.

لە هەورازەیەکـی بـۆ ئەو کـات زۆر سـەخت، دەنـا لە چـاو هەورازان بەس هەورازە نەبوو، سەرکەوتین، تفەنگەکەشم هەر لای سۆسـەنی گـوڵە،

نشێو بووینەوە، گوندێك بە دیار كەوت، بە ناو گونددا یان بەلای پەڕگەی گوند چەمێكی ناسك زۆر ناسك هاتە رێ، چەمێكی ژاوەڕۆیی، هەبێ نەبێ رەنگە تایەكە كەمێك بەری دابم، دەنا ناسكیم لە چەم نەدەدیتەوە، هەر لە دەو ئەو چەمە ژنێكی جحێل تەمەنی هەر بیست سالێك دەبوو، وێدەچێ ئێستاش هەر تەمەنی بیست سال بێت! رەنگە دوای بیست سالیدیش هەر بە بیست سالی بمێنێتەوە، نازانم لە كوێوە بە دیاركەوت، ئێستاش نازانم لەگژ چی بوو، هێندە دەزانم ئەو بایەی هەڵیكردبوو چنگ چنگ گەلای زەردی پێدا دەكرد، ئەویش خۆی لە گووره نەدەبرد، دەتگوت حەز بەو گەمانەی با دەكات، گەمەیەكی جوان بوو، قەت نەمدەزانی با گەمەی وا جوان دەزانێ! با لە ئەویندار دەچوو! هەستمكرد ئەوەی تایە لە لەشی من نەمایە، گۆتمە ئەبوو سۆسەن:

- هاوڕێ، تفەنگەكەم بدەوە.

- بۆ چاك بوویتەوە؟

- تەواو، بەلام لێبڕا.

- بە شەڕەفم بەلات لێنەبڕا با، ئەتۆ جوانناس نەبووی، كوڕە تەماشا تەماشا، ئەو (رەبلحلوە) مردووش زیندوو دەكاتەوە.

- نازانم مردوو، بەلام تادار چاك دەكاتەوە.

حەزی لیمۆم لە دلی نەمابوو، لە خەیالم میوەیەك نەبوو بە ناوی لیمۆ، من و سۆسەن زیندانی چاومان لە كچە بڕی بوو، گۆتی:

+ رەنگە لەگەل ئەو جوانیەشی ناوێكی خۆشی نەبێت.

-خۆمان ناوێكی خۆشی لێدەنێین.

+ با ناوی سۆسەن بێت تۆش وەرە داخوازی و ئامادەم كچی خۆمت بدەمێ.

- سوپاس، گەیشت یا ئەبوو سۆسەن، هاوڕێ ئەو گوندە ناوی چیە؟

+ شێنێ، نەمگوت شێنێ!

- كەواتە ئەو كچە با ناوی شازادەی شێنێ بێت.

+ لەوە جوانتریشی تێدایە.

- هەر ئەوە شازادەیە.

هەر بە راستی چاك بوومەوە، ئەو جوانە منی چاك كردەوە، ئیدی لە لای خۆم ناوم لەو ژنە نا شازادەی شێنێ، هەر جارێك رێم بەوێ كەوتبا، هەموو هەولێكم دەدا، ئەگەر زۆر لە دوورەوەش بێت، چاوێكم بەو شازادەیە بكەوێت، ئەو شازادەیەی زۆرم حەزدەكرد لە نزیكەوە بۆنێكی بكەم، ئەوە راستە زۆر جار دیتنی ژن، بۆنی ژن دەردان دەپەڕێنێ، شازادەكەی شێنێ دەردی منی پەڕاند، هەتا لەو بەرزاییەش ئاودیو بووین كە شێنێ لە چاو ئاوادەكات، هەر ئاوڕم دەدایەوە لە كەلێنی درەخت و بە ناو گەڵای وەریوی دەست با، تەماشای شازادەی شێنێم دەكرد، سۆسەن گوتی:

سبەی دێینەوە، دەچینەماڵیان و جامە ماستێكی لێ دەكڕین، ئەودەم تێر تێر، بە دڵی خۆمان تەماشای دەكەین، چاومانی لێ تژی دەكەین.

نازانم سبەی هاتینەوە یان نا، بەڵام ئەوە دەزانم بە دڵی خۆم تەماشای شازادەكەی شێنێم نەكردووە.

ئەوە جارێكیدیش وا لە شێنێ لە نزیك هەمان چەم لە ناو درەختان چاو لە شازادە دەگێڕم، دەمەوێ گەمەی ئەو لەگەڵ با ببینمەوە، وەرز هەر وەرزی پایزە، بەڵام لە نێوان ئەم پایزە لەگەڵ پایزەكەیدی زستانێكی زوقمی و شەختەبەندی هەبوو، بەهارێكی گولگولی و پەلكەزێڕینەیی هەبوو، هاوینێكی مار و دووپشكیی هەبوو، رەنگە پایزێكیدی و زستان و بەهار و هاوینیدیش هەبووبێ.

ئێستا من لەگەڵ دەستەیەكیدی هاتوومەتەوە شێنێ، ئەو شێنێیەی دەڵێی منداڵە بە ئامێزی (مامەندە)ی دایكەوە، مامەندە ئەو چیایەیە كەس نازانێ چەند بڵندە، بە دیوی شێنێ و ناوزەنگدا سەخت و هەڵدێرە، دەیانگوت سەری سەرەوەی پڕ پڕە لە سەربازی بەغدایێ.

شێنێ دەنگی دابۆوە، چۆن دەنگ نەداتەوە! لە بن هەولێرەوە تا

دەگەیــتە ئەو تخــووبەی لە نێــوان رۆژهەڵات و باشــووری وڵاتێکــی گونداویان کێشابوو، ئەو شێنێیە تاقە گوند بوو بە پێوە مابێ، یان چاوی من و چـاوی زۆریـدی جـگە لەو گونـدە چ گوندیـدیان نەدەدی، لە خـوار (شێنێ)وە رووبارێك لە دۆڵێکـی تـا بڵێـی قـووڵ و گەورە چـوار وەرزەی ساڵ هاژەی دەکرد، لە رووبار پەڕینەوەش کەوشەن بەزاندن بوو.

قسـە کەوتە دۆڵ و گونـد کە نەیـارانی شـێنێ بە نیـازن هێـرش بێـنن و شێنێ بە دەردی هەموو گوندەکانیدی ببەن، ئەو دەنگۆیە لە زاری پیاوێکی بە تەمەن کەوتە ئاوایی، ئەویش لە زاری جاشێکی بیستبوو، جاشـەکەش لە زاری ئەفســەرێکی نــازانم چەنــد ئەســتێرەوە، دیــارە ئەو دەنگــۆیە لە سەرچاوەیدیشەوە هاتبوو، بەڵام لە گێـڕانەوەی ئەو هەواڵە دەنگـی پیـاوە بە تەمەنەکە لە هەمـوو دەنگەکانیـدی لە دڵ چەقیـوتر بـوو، هەر ئەو پیـاوە بە تەمەنە دەیگوت:

گۆتەی خـۆم نیە، لە خەڵـك و خـوام بیسـتووە، دەڵـێن: نـاوی (شـێنێ) هەموو دنیـای گرتـۆتەوە، لە دانیشـتنە زۆر نهێنیەکـانی بەغـدا، قسـەی لێـوە دەکرێ، لەوێ لە بەغداوە بڕیاری سڕینەوەی دراوە.

دەنگۆی پەلاماردانی شێنێ بوو، ئێمەی لە خـانووێکی لاپەڕگەی شـێنێ خڕکردبـۆوە، دەنـا جـێگەی ئـێمە ناوزەنـگ و گۆڕەشـێر بـوو ، ناوزەنـگ کەمـێ کەوتبـووە ئەو لاوەی شـێنێ، ناوەزەنـگ لە پایزانـدا جـۆگەلەیەکی زۆر بچووکی پێدا خوڕەی دەکرد، ئەگەر بە نیازی دەست بە ئاو گەیاندن لە سـەر ئەو جـۆگەلەیە روو لە مامەنـدە دانیشـتبایت، ئەوا پێـی چەپـت دەکەوتە ئاقـاری رۆژهەڵاتـی کوردسـتان، پێـی راستیشـت لە باشـووری کوردسـتان دەمـایەوە، گۆڕەشـێریش کەوتبـووە ئەوبەری رووبـارەکەوە، بـازاڕەکەی سـونێش هێنـدە دوور نەبـوو لە شـێنێ، ئەو بـازاڕەی هەرچـی سـیخوڕی دنیـایێ هەیە روویـان تێـدەکرد، لەو بـازاڕە هەمـوو شـتێك دەستدەکەوت بە هەموو جۆرەکانی خواردنەوەوەش.

دەنگۆیەکی دژ بە دەنگۆیەکەیدیش کەوتبووە گونـد و دۆڵەوە، ئەوەی

زۆر سوور بوو لە سەر ئەوە کۆلکێشێك بوو، بە کۆڵ لەو چیاو چۆڵە داری بۆ خەڵك دەهێنا، هێندەی هێسترێکی لە خۆی بار دەکرد، ئەو پیاوە دەیگوت:

لە منی وەرگرن، هیچ خەمتان نەبێت، بە خوڵای بەغدا قەت هێرش ناهێنێتە سەر شێنێ، هەتا بەغدا بمێنێ شێنێ دەمێنێ، چما ئەنگۆ نازانن نیوەی خەڵکی شێنێ دەسچێنی بەغدان ؟!

من لە خۆوە باوەڕم بە قسەی ئەو کۆلکێشە دەهێنا، هەستمدەکرد نەك هەر لە سەردەستەکەمان سیاسیترە، بەڵکو پشتی زۆر لە سیاسیەکانی دۆڵی بە عەردی داداوە.

وابوو بۆچوونێکی ئەوهاش لە ئارابوو کە بەغدا پێویستی بە مانەوەی شێنێ هەیە.

ئێمە بە دوو سەردەستەوە چواردە پازدە پێشمەرگە دەبووین، هەر شەوەی نیوەمان لەو هۆدەیە دەمایەوە، نیوەکەیدی بە چیا دەکەوتین، لەوێ لە بەرزایی بۆسەمان دەنایەوە بۆ ئەو جاش و سەربازانەی گوایە نیازیان شێنێ وێرانکردن بوو...

ڕۆژی یەکەم یەکێ لە سەردەستەکان، کوڕێکی گەنج لە تەمەنی ئەوکاتی من شتێك گەورەتر دەستی بە قسان کرد، قسەکانی قەسەی ورە وەبەردان و شۆڕشگێڕی بوون، لەو کاتەی ئەو سەردەستەیە ئەو قسانەی دەکرد (عەشایەر) کە ڕێك بەرانبەری من دانیشتبوو - بۆ تێکەڵەکردن ئەو کات لە دۆڵی پێشمەرگان دوو پێشمەرگە هەبوون بە ناوی عەشایەر من مەبەستم ئەوەیانە کە خۆی خۆی دەناسێتەوە نەك خەڵك- دیاربوو، لە ڕەنگ و رووی دیار بوو، لە لێو هەڵهێنان و چاوی دیار بوو، گاڵتەی بە قسەکانی دەهات، سەردەستە چەندی گەرمتر و شۆڕشگێڕانەتر قسەی دەکرد، هێندە لە دەمو چاوی (عەشایەر) جوولانەوەی گاڵتە پتر دەبوون، ئەو کاتەی دەیگوت:

پارێزگاریکردن لە شێنێ، پارێزگاریە لە هەموو وڵات، لە هەموومان، لەو پێناوە دەبێت سینگمان بدەینە بەر گوللە.

(عەشـایەر) کە گـوێی لەو قسـانە دەبـوو، زۆری نەدەمـا جرتـی بـۆ هەڵکیشێ، باش بوو جێی دانیشتنی ئەو دووە بە شێوەیەك بـوو، سەردەستە ڕووی عەشایەری باش لێوە دیار نەبـوو، دەنـا لەو ژوورە شـەڕێکی گەورە دەقەوما، من زۆر حەزمـدەکرد سەردەستەکە زوو قسـەکانی تەواو بکـات، دانیشتنەکە زوو کۆتایی بێت، بۆ ئەوەی زوو عەشایەر تی بکەمەوە و بـزانم مەسەلە چیە، من ئەو سەردەستەیەم نەدەناسی.

عەشایەر کوڕێکی هەتا دەست هەڵبڕی باڵا بەرز، درێژترین کەس یـاڵا سەری دەگەیشتە شانی وی، لە دنیایێ بەس یەك کەسم دیتبوو لەو درێژتر، ئەویش ئێستا یادی بە خێر ناوەکەم لە یاد نیە ، عەشایەرم تی کردەوە:

- دیار بوو فشەت بەو کوڕە دەهات!

+ وەك تۆم لێهـاتووە، فشـەم بە هەمـوو شـتێك دێـت، ئەتـو ئەو کـوڕە ناناسی؟

- نا، هەر لێرە دیتوومە، نەبێتە درۆ، جارێك لە جێگەیەکیدی یەکترمان دیتووە، هێندە و بەس.

+ ئەو کوڕە بەو زمانلووسیەی خۆی بـردوویەتیەوە، دەنـا ترسـنۆکترین کەسە، فرۆکە لە دەشتی هەولێر بۆردومانی بکردایە، ئەو لە بەسـتی شـەرغە خۆی داویشتە بن تەڕاشـان، زۆر تـووڕە بـم دەڵێم لە تەمەنـی خـۆی ئـیلا ئەگەر بۆ سووسکە یان بۆ خۆشی دەنا تفەنگی وی دەنگی لێوە نەهـاتووە، کاتێك قسەشـی بـۆ گونـدیان دەکـرد، وەکـو ئەوەی دیتـت ئەوهـا قسـەی دەکرد، یەك نەیناسێت دەڵێت بە دەست دەبابە دەگرێـت، هەمـوو ئەوانەش لە لایەك، ئەوەی من زۆر خەفەتی لێ دەخۆم، پێش ئەوەی بگـاتەوە ئێـرە، لە خوارێ سەردەستەی سـێ چـوار پێشـمەرگە بـووە، بە زۆردارەکـی و بە قسەی پان وای لەوان کردووە کە خـۆ بە دەسـتەوە بـدەن، هەر بـۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێتەوە ئێرە، ئەوەتە نـابینی، ئەوە چەنـدەمین جـارە داوا دەکـات بینێرنە رووسیا.

نـازانم قسـەی عەشـایەر تـا کـوێ لە بـارەی ئەو کـوڕەوە ڕاسـت بـوو،

بیستبووم ئەو سەردەستەیە دەو لە شیعریش دەدات، یەك دوو پارچەی نیشانی من دا، بەڵام ئەوەی تێبینیم کرد هەندێ کۆپلە شیعری عەبدوڵلا پەشێو بوون، بە تۆزێ دەسکاری و تێکدانەوە، بەدبەختیەکەش لەوە بوو هەموو شەوێك لەگەڵ ئەو سەردەستەیە بەیەکەوە بووین، جا چ لە ژوورەکەی شێنێ چ لە لە بناری چیا.

من و عەشایەر لە سەرکەوتنی چیاش هەر بە دووی یەکەوە دەڕۆیشتین، هەڵگەڕان بە مامەندەدا هەر بە قسە خۆشە، کۆتایی هەورازەیەکی رك سەرەتای هەورازەیەکی رکترە، لە سەرکەوتندا تەنها دەنگی گەڵای پایزی دەهات، زۆر جار ئەو ساتانەی هێشتا ماندوویتی چێژمی لە ناو عارەقە نەخنکاندبوو، گەڵا گەڵا چێژم لە دەنگی گەڵای دەست با وەردەگرت، هەندێ سات ئارەزووم دەکرد، هەموو تەمەنم لەبەر ئەو بایە پڕ لە گەڵایە بە سەر ببەم.

من و عەشایەر لە کاتی نووستنیش کیسە خەوەکانمان زۆر لێکدی دوور نەبوون، خەوتنی ناو کیسە خەو رەنگە هەر یەك دوو جار نەخێویتە لەشت و بە زەحمەت بتخەوێنێ، بەڵام بۆ من لەوە دەرچوو بوو بە سەد جار و دووسەد جاریش لەگەڵی رابێم، راستی ئێستاو ئێستاش لێی دەترسێم، ئەو ترسەش لەوەیە لەو چیرۆکەی کیسەی خەوەوە هاتبێت کە پێش ئەوەی زنجیرەکەیم کردبێتەوە، بۆمیان گێڕابووەوە:

ك کوڕێك لە پایزێکی سارددا رێك وەك ئەو پایزەی وا من بەو پایزە دوای ئەو ئەو هەموو پایزە هەمەڕەنگە بۆی گەڕاومەتەوە و دەمەوێ هەندێك لە سەرهاتەکانی خۆمی لێ بچنمەوە، لە کیسە خەودا دەخەوێت، وەك دەڵێن شوێنەکەش هەر دەوروبەری قەندیل بووە، زنجیرەکەی جوان دادەخات، خەوێکی قووڵ دەیباتەوە، لە ناو کیسە خەو دەسوورێ، زنجیرەکە واتە لای دەرگای کیسەکە دەکەوێتە لای پشتیەوە، ئیدی چەندی دەکات دەستی ناگاتە زنجیرەکە بیکاتەوە، پوختە ئەو کوڕە بۆ خۆی دەخنکێ.

زۆر ئاسانه له ناو کیسه خەو بخەویت و به سەلامەتیش دەربچیت، بەڵام من لێی دەترسام، قەت زنجیرەکەیم نیوەش دانەخستووە، گوتوومە قەیناکە با سەرمام ببێت، نەوەك وەك ئەو کوڕە بەستەزمانەمبە سەربێت!

ئەو شەوەی شەوی بە چیا کەوتن بوو، دەبوو بە تاریکی بە ڕێبکەوین و هەر بە تاریکیش بگەڕێینەوە، دەیانگوت:

نابێت خەڵك بە ڕێی چوون و هاتنەوە و جێگەی مەبەستمان بزانن، نەبادا لە باتی ئەوەی جاش و سەرباز بە داوی ئێمەوە بن، ئێمە بکەوینە داویانەوە.

ئیدی شەوێك لە باوەشی مامەندە، مامەندەی کیسەی خەو و ئێشکگری، شەوەکەیدی لە ژوورەکەی شێنێ، شێنێی خەوێکی بێ ترس ودەردەسەری، بۆ هەر یەکێك لە ئێمە کۆڵێك جیاوازی لە نێوان ئەو دوو جێگەیەدا هەبوو، بەڵام جاوازیەکە بۆ عەشایەر جیاوازیەك بوو وەك دواتر خۆی دەیگوت:

ئەو جیاوازیە لە تەمەنی مرۆڤ یەك جار بە دیار دەکەوێت.

جیاوازیەکە بۆ من لە سێ شتدا بوو، یەکیان ترس ئەویدی چێژ، سێیەمیش هەر چێژ، ترسەکە با لە ناو کیسەی خەودا بمێنێتەوە، هەرچی چێژەکەیە ئەوە لە مانگدا دیتمەوە... شەو تاریك تاریك، ڕەنگە بەو ڕادەیەش تاریك نەبووبێت، بەڵام لای من وا بە تاریکی خۆی نیشاندابێت، لەو تاریکیەوە کزە بایەکی دەهات، حەزی ئاگری دەخستە دڵەوە، کەچی جاروبار مەتارەم دەخستە سەر لێوەوە، لەپڕ دیتم دنیا لە ڕەشیەوە بەرەو جۆرێك لە زەردی یان ڕەنگێکی نزیك لەوە گۆڕا، لەو ساتانەی ئەو گۆڕانە بە سەر ڕەنگی دنیادا هات، چاوم لە سەر ئەو کێوەی بەردەمم بوو کە هەموو ڕەنگ گۆڕینەکە لەوەوە چاوی منی گرتەوە، تۆپەڵێ ئاگر لە کێوەکەوە بە بێ دەنگی بەرز بۆوە، ئەوە جاری یەکەمم بوو وا لە نزیکەوە زانی چیا ببینم، چیا زاو ئاگری بوو، درەنگتر زانیم چیا مانگی بوو، مانگێك جیا لە هەموو ئەو مانگانەی پێشتر دیتبوومن، مانگ ڕووناك تا

ئەودیوی رووناکی رووناك، مەگەر رووی کچەکەی شینێ هێندە رووناکیەی تێدا بووبێت، مانگ نزیك زۆر نزیك وام هەستدەکرد ئەگەر دەستەکانم کەمێك درێژتر بان دەیگەیشتنێ، هەر لە بەر دەمم بوو، تابلۆیەك بوو یەك یەك هێلەکانیت بژماردایە، تێر تێر بە دڵی خۆم تەماشای مانگم کرد، هەرچی جوانە لە مانگدا دیتم، شازادەکەی شینێشم دیت.

مانگ ورد ورد بە سەر شینێدا بۆ ئاسمان بەرز دەبۆوە، چاوی منیشی لەگەڵ خۆیدا بە ئاسمانەوە هەڵدەواسی، تا گەیشتە ئەو جێگەیەی کە زۆر جاریدیش لەوێم دیتبوو هەر چاوم لە چاوی بڕیبوو، چێژی چاو لە مانگ بڕین هەر ئەو کەسانە دەزانن چ چێژێکە کە وەك من لە نزیکەوە مانگیان دیتووە...

ئیدی زۆر شەویدی لەوێ و لە زۆر شاخ و دۆڵیدی لە دووی ئەو مانگە شینێیە گەڕام، نەمدیتەوە، بە دوای دووبارەبوونەوەیەکی جوان یان دووبارەبوونەوەی جوانیەك گەڕام نەمدیتەوە، گەیشتمە ئەوەی هەندێك جوانی هەن یەك جار خۆیان نیشان دەدەدن، مانگ ئەو شەوە جوانیەکە لە یادەوەریمدا ئاوا نابێت، جوانیەکە کات کاڵی ناکاتەوە، رەنگە ئەو مانگە هەر هەمان مانگ بێت کە پیری بەفر لە رۆمانی (درەختی کەتناوە) شەوێك لە سەر دوندی پارانەوە دیتی و بۆی گێڕاینەوە.

لە بیرتە گوتم ناوە ناوە مەتارەم دەخستە سەر دەممەوە؟ شەوەکەش شەوێکی سارد بوو، شەوی دانیشتنیش بوو نەك رێکردن، بۆیە رەنگە هەمان ئەو پرسیارە بکەیت کە نەهرۆ لێمی دەکرد، ناهەقی نەبوو، کەس مەتارەی لە بیر نەبوو، کەچی من زوو زوو تامیم دەکرد:

+ چیتە دەڵێی نەساخیت، هێندە ئاو دەخۆیتەوە؟

- وا بزانم.

+ بەلام پێتەوە دیار نیە.

- هەندێك نەخۆشی هەن بێ نیشانەن.

+ ئەوەش فۆرمێکی تازەیە لە شیعر.

ئەهرۆ لەوەبوو گومان لە من و مەتارە پەیدا بکات، بەڵام بڕوا ناکەم گومانەکەی لا درووست بووبێت، دەنا هەر چۆنێك با، تامی دەکرد، ئەو پرسیارە لە جێیانەی ئەهرۆ و وەڵامە درۆینەکانی من هەر لەو شەوەدا کران کە لە لای من تا سەردەمێکیدیش هەر بە شەوی مانگەکەی شێتی دەناسرێتەوە، بەڵام دواتر بیرم دەکردەوە باشە ئەی چۆن هەستیان بە بۆنەکەی نەدەکرد، هەر خۆم بە خۆم دەگوت ڕەنگە شەرابی ڕێبوار عەرەب بۆنی نەیە، بەڵام خۆ هەموو جارێك مەتارەی من پڕ لە شەرابی وی نەبوو، جار جارە خۆی پڕ یان نیوە دەکرد لە عەرەقی بازارەکەی سونێش، ئەو عەرەقەی دوو سێ جار (شۆڕش کۆیی) بۆی دیتام و پارەشی وەرنەدەگرت، کۆیی بۆ جیاکردنەوەی ئەو شۆڕشە بوو لەو هەموو شۆڕشەی کە ئەو کات لەوێ بێ شۆڕش مابوونەوە، دەیگوت:

پارەی تۆ هەر بەشی تووتن دەکات، من هەمە، بە حەڵاڵی بیخۆوە.

من چاکەی ڕێبوار عەرەبم هەر لە چاوە، ئەو کوڕە باشترین شەرابگرەوە بوو، هیچ شەرابگرەوەیەك شانی لە شانی وی نەدەدا، ناوە ناوە مەتارەیەك شەرابی دەدامێ، کە بۆ ئەو کات جوانترین و بە بەهاترین دیاری بوو، ئیدی من بە شەرابی ڕێبواریەوە، بە عەرەقی شۆڕشیەوە لە بن گەردنی مامەندە بە ترسەوە دەچوومە ناو کیسەی خەو و بە نەشئەوە تەماشای مانگ و ئەستێرانم دەکرد.

عەشایەر کوڕێك بوو تا ئەو پەڕی سادەیی سادە، هەرچی لە دڵ بایە، لە زاریشی بوو، لە سی ساڵی تێپەڕاندبوو، زۆر جار دەیگوت:

من وا بۆ ... ساڵی دەچم، هەتا ئێستا دەستم بە دەستی کچێك نەکەوتووە، نازانم ماچ چۆنە، توخوا ئەوە چۆن دەبێت وا بێت!

عەشایەر کوڕێکی ڕێك و جوانیش بوو، وەك دەیانگوت، کچ بە ئاسانی بۆی دەستەمۆ دەبوون، بەڵام چ بوو! کوڕێکی شەرمن بوو، لە مێینە شەرمی دەکرد، وەك دەیانگوت، عەشایەر لە هەموو مێینەیەك شەرم دەکات، جا با ئەو مێینەیە ئاژەڵیش بێت، زۆر جار لای من دەیگوت:

ئەها تەماشای سەرم بکە، پڕ بووە لە داوی سپی، چ نەگبەتیەکە سەرت سپی بێت و هێشتا کچت لە ئامێز نەگرتبێت.

لەو پێشمەرگانەی لە دۆڵی پێشمەرگان راشکاوانە و بێ شەرم باسی ژن و بێ بەشیی خۆیان لە ژن دەکرد، ئەو عەشایەرە و پێشمەرگەیەکیدی بوون، ئەو پێشمەرگەیە ناوی (ئەرکان) بوو، جارێك چووبووە پێش بەرپرسێکی گەورەو راست و رەوان پێی گوتبوو:

ئەگەر ژنمان بۆ دێنی باشە، ئەگەر نا هەموومان هێنەکەی خۆمان دەبڕین و لە پێش تۆی دادەنێین.

عەشایەر لە ناو شێنێ زۆر دەگەڕا و چاوی دەگێڕا، دەیگوت:

شەرم منی کوشت، زۆر جار ژنی زۆر جوان، بە نیازی لەگەڵ خەوتن سەیریان کردووم، شەرم، ئای شەرم! بەڵام لەمەودوا دەبێت چارەیەك لەو شەرمە بکەم، خەریکە پیری بانگم دەکات، بەسە کاکە بەسە، شەرم بەسە.

ئیدی عەشایەر وەك ئەوەی پێیان دەگوت حالۆری، بە شێنێدا دەهات و دەچوو، ئەو کوڕە شتێکی لە چاودا بوو، دانەدەسکنا، ئێوارەیەك هاتە بن گوێم:

- ئێشککگریەکەی تۆ لە دوای منە، کاتێك بانگم کردی ئیشێکی گچکەم پێتە.

+ چیە دەیقەومێنی؟!

- رەنگە، بەڵام بەینی خۆمان بێت.

شەو کاتێ بانگی کردم بۆ ئێشککگری:

- کەمێك زووتر بانگم کردی، ئەگەر درەنگم پێچوو، تکایە بانگی ئەوەی دوای خۆت مەکە.

+ خەمت نەبێت.

تفەنگەکەی لای من داناو رۆیشت، مانگ تیلمێکی بە دەرەوە بوو، رێوبان تاریك نەبوو، دیتم سووڕایەوە، ئەوەشم دیت، بە سەر دیوارێکدا ئاودیو بوو، شەو بێدەنگ، تەنها دەنگی گەڵای رژاو دەهات، چەند جوانە

ئەو ساتانەی پێشمەرگە چەکەکەی دادەنێ و ڕێی ژوان دەگرێتە بەر، ئەو شەوە ئەو دیمەنە لای من جوان بوو، ئەو شەوە عەشایەر لە هەموو شەوەکانی پێشوو پتر لای من جوان بوو، لەو ساتەوەی دیوارەکە ئاودیوی ئەو دیوی کرد و لە چاوم بزری کرد، من نزای سەرکەوتنم بۆ عەشایەری هاوڕێم کرد، نزام دەکرد، بە بۆنی ژنەوە بگەڕێتەوە، بە تامی ژنەوە بگەڕێتەوە، بە گەرمایی ژنەوە بگەڕێتەوە، زۆرم نزا بۆی کرد، ئەو ژوانە ژوانی منیش با هەر هێندە نزام تێیدا دەخوێند، نازانم بۆچی هێندەم حەزدەکرد کە عەشایەر ئەو شەوە بچێتە باوەشی ژنەوە، هەر لەبەر ئەوەی زۆر برادەرم بوو؟ یان لەبەر ئەوەبوو هەرگیز دەستی بەر دەستی هیچ ژنێك نەکەوتبوو، بای ژنی پێنەکەوتبوو؟ یانیش لەبەر ئەوەی کە دێتەوە باسی تامی لەشی ژنم بۆ دەگێڕێتەوە؟ نازانم لەبەر چی، بەڵام دەزانم زۆرم حەزدەکرد، ئەو شەوە عەشایەر تێکەڵی ژن بێت، ناوە ناوە سەیری کاتژمێرم دەکرد، هێشتا چەند خولەکێکی مابوو کاتی ئێشکگریی من تەواو بێت، دیتم عەشایەر بە هەلەداوان دێتەوە.

بە بێ دەنگی تفەنگەکەی وەرگرتەوە و بە دەنگێك وا بزانم وشەی (سوپاس)ی لە دەم دەرچوو، ئیدی چووە سەر جێگاکەی خۆی، هیچی تێنەگەیشتم، خۆزگەم دەخواست لە بەر ڕووناکی دەموچاویم دەدیت، بۆ ئەوەی بزانم تێکەڵی ژن بووە، یان هەر کوڕەکەی پێش تێکەڵ بە ژنبوونە، کاتێك چوومە سەر جێگاکەم، لە دڵی خۆم گوتم، خۆ ڕۆژ هەر دەبێتەوە و دەموچاوت دەکەوێتە بەر ڕووناکی، ئەو دەم تێدەگەم ئەوەی ئێستا وا لەو جێگەیە ڕاکشاوە، دنیا دیتەیە، یان هەر نەدیتکەکەی جارانە!

بە دەنگی عەشایەر بە ئاگا هاتم، لە سەر دەرگا بە دەنگێکی شاعیرانە شتێکی لەو بابەتەی دەگوتەوە:

زۆرم کرد چاوبازی ئێستا مەیلی دەستبازی دەکەم
مەیلی شۆخێکی باڵا بەرزی لەشولار ڕیازی دەکەم

لە دڵی خۆم گوتم، ئەو شەو تێکەڵی ژن بووە، لێی چوومە پێش،

هەرگیز عەشایەرم وا دڵخۆش نەدیتبوو، چاوەکانی دەیگوت:

من ئەو شەوە لە باوەشی ژنێك سەرلەنوێ لە دایکبوومەوە.

تیم کردەوە:

+ ها چ بوو؟

- جـا چ نەبـوو، ئەوەی بیسـت سـاڵە لە دووی دەگەڕێـم، ئەوشـەو دیتمەوە، ئەوەی بیست ساڵە لە خەونێش نەمدیتبوو، ئەو شـەو دیـتم، ئێسـتا دەزانم من ئۆندە ساڵە ژیانم بەلاش ڕۆیشتووە.

+ لەگەڵ کام ژن؟

سەری خستە بن گوێم

-...

+ ئۆی! ئەوە کوو ڕازیت کرد؟

- نازانم.

هەوبوو شازادەکەی مـن بـوو، ئەو سۆسـەنە بـوو کە ئەبـوو سۆسـەن لە قۆشمەبازیەکەی خۆیدا دەیویست بیکـاتە کچـی خـۆی و منـیش بە زاوای خۆی وەرگرێت، هەمان کچی دەو چەمەکە بـوو کە تـای ئەنفـالی لە مـن دەرکـرد، لە دڵـی خـۆم دەمگـوت ڕەنـگە نـاوی ئەو کـچە هەڵەیەکـی عەشایەری بێت و لە دەمی عەشایەر دەرچووبێـت! نـازانم بـۆچی لە خـۆوە گومانم پەیدا کرد، دووریش نیە گومانەکە لە ئیرەیی بردنەوە بووبێت، کێ دەزانێ من ئەو ڕۆژە بـایی چەنـد سـاڵ ئیـرەییم بەو عەشـایەرە سـادەو بـێ گرێیە بردبێت.

هەر لەو ڕۆژانەی شـێنێ، کەمێـك لە سـەرەوەی ئـاوایی کە هەمـووی کەندولەند و سەرتاپا داروبار بوو، لە گژ ورتکە دار خڕکـردنەوە بـووین، پەرتبووین، هەر یەکە بە لایەکدا، من چ ببینم باشە! شـازادە وا دانیشـتووە، کێی لە تەنیشت بێت باشە! نا عەشایەر نەبوو، پێشمەرگەیەکیدی، نـاوەکەیم لە یاد نیە، بەڵام ئەوەم لە بیر ماوە دواتر ناوم نا شۆڕەسـوار، هێنـدەم دیـت دەستیان لە ناو دەستی یەکتر بوو، ئەوان منیان نەدیت، منیش لێم تێکنەدان،

چاوم قووچاند و بەجێمهێشتن، نەشمپرسیەوە داخوا هەر دەستگوشین بوو یان شتیدیش.

ئیدی تێگەیشتم شازادەکەی شێتێ دڵی کەس نارەنجێنێ، پێشتر ئەوەم نەزانیبوو، بڕیارم دا منیش قسەیەك لەگەڵ ئەو شازادەیە بکەم، بەڵکو خێرێکی بۆ منیش دەبێت، بەڵام تۆ چەند قسەت لەگەڵی کرد منیش هەر هێندە، هەر لێی نزیك دەبوومەوە، زمانم لە گۆ دەکەوت و هەستمدەکرد هەموو گیانم دەلەرزێ، بەڵام لە دڵی خۆم بڕیارم دا کە رووی لێ بنێم.

لەو رۆژانە رەنگە کەس هێندەی من یادی ئەبوو سۆسەنی نەکردبێت، لە دڵەوە حەزم دەکرد لە تەنیشتم با، ئەو پایزە وەك پایزەکەیدی نەبوو، ئەبوو سۆسەن لێرە با لەمێژبوو ئەو کچەی رازیکردبوو، ئەو شەرمی لە کچ نەدەکرد، ناوە ناوە هەواڵ لە بارەی ئەبوو سۆسەنەوە دەهات، پێدەچوو زۆربەیان درووستکراو بن، هەر کەسێك دەچووە ئێران بەبێ هەواڵی ئەبوو سۆسەن نەدەگەڕایەوە، ئەو پیاوە لە بار بوو بۆ ئەوەی هەر کەسە بە دڵی خۆی چیرۆکێ بۆ گرتنەکەی درووست بکا، دووریش نەبوو هەموو ئەو چیرۆك و هەواڵانەی دەگەیشتن راست و درووست بن، یەکێك دەیگوت:

چۆن نایگرن، چۆن نایکوتن؟ لە هەر جێگەیەك دەنگی (یا عەلی) بەرز دەبۆوە، ئەبوو سۆسەن یەك بە دەنگی خۆی هاواری دەکرد: ( یا عومەر) و نەیدەبڕیەوە، باشە بڵێ تۆ چ شتێك بە عومەرتەوە دەبەستێ!

یەکێکیدی هۆی گرتنەکەی دەگەڕاندەوە بۆ:

لە هەر جادەیەك کۆمەڵە ژنێکی دەدی بە دەنگی بەرز، بە دەنگێك هەموو دەوروبەر گوێیان لێدەبوو: تەماشا تەماشا توخوا ئەوانە ژنن یان قەلەڕەشکە!

کوڕە بابە باوەڕ بەو قسانە مەکەن، با راستیی گیرانی ئەبوو سۆسەنتان بۆ بگێڕمەوە:

لە جێگەیەك، دیارە پیاوی حکومەتی لێبووە گۆتیتی:

ئەوە گورباچۆف خەریکە بوومەلەرزەیەك دەخاتە گیانی سۆڤیەتەوە،

ئێرانیش پێویستی بە لەرزینێکی ئەوها هەیە، لەرزینێک هەرچی عەمامە و لەچك هەیە بە ئاسمانی بێخێ.

بە خودای ئەو قسەیە لە هی ئەبوو سۆسەن ناچێت، با من هۆی گرتنی ئەبوو سۆسەنتان بۆ بگێڕمەوە:

لەو بازگەیەی کە لە مەهابادەوە دەچیە ناو ورمێوە، داوای ناسنامەی لێدەکەن ئەویش لە باتی (بەرگە)ەیەك دوویان دەداتێ هەر یەکەشیان هی حزبێك بووە.

کەسێکیدی وای دەگێڕایەوە:

لە جێگەیەك گوتبووی:

من زۆر لە تودەییەکان دەناسم، بارەگای ئێمە پڕی پێشمەرگەی تودەیە.

ئیدی لە بارەی گرتنی ئەبوو سۆسەنەوە چیرۆك زۆر بوو، ناوە ناوە لە ناو زیندانیشەوە، هەواڵێك، چیرۆکێکی ئەبوو سۆسەن دەکەوتە سەر زاران، ئەو قسەیەی کە زۆر دەگوترایەوە ئەوەبوو:

ئەبوو سۆسەنیان بە تەنێ لە ژوورێك کردووە، بڵندگۆیەك لەو ژوورە شەو و رۆژ بە دەنگی بەرز قورئان دەخوێنێ، بەڵکو ئێ ئەوە خوایە، خوا هیدایەتی بدا، کەچی دەڵێن ئەبوو سۆسەن فێرە کوفری وا بووە لە مێژووی ئیسلامەتی کوفری وا نەبیستراوە

یان کە خواردنێکی خراپی دەدەنێ بە پاسەوانەکان دەڵێ:

من برسیم نیە، بڕۆ بیدە منداڵەکانی کۆماری ئیسلامی، ئەوان خەریەکە لە برسا دەمرن.

پاسەوانەکانیش وەریدەگەڕێنێ، نیوە مردووی دەکەن.

وەك دەڵێن ئێستا ئەبوو سۆسەن بەس هێسك و پێست ماوەتەوە، لەگەڵ دوو چاوی تیژی بەقووڵا چوو، هەواڵی سەر و ریشی نیە.

هەر رۆژێك لەو رۆژە پایزیانەی شێنێ من و عەشایەر رێك لەو دەم چەمەی کە کاتی خۆی شازادەکەی شێنێ منی چاك کردەوە، شان بە

شانی یەك دەڕۆیشتین، عەشایەر گۆتی:

+ ئەها ئەوەتە.

- کێ؟

+.... ئەوەی ئەوە چەند شەوە خەنیم دەکات

- بە ڕاست لەگەڵ ئەوەت بوو؟

+ ئەدی خۆ....

هەو نەبوو، شازادەکەی شێنێ نەبوو، ئەوە نەبوو کە ئەوێ ڕۆژێ دەستی لە ناو دەستی شۆڕەسوار بوو، ئەوە نەبوو کە تای لە من دەرکرد و دەمویست خێری بۆ منیش هەبێت، تێگەیشتم لەو گوندە دوو ژن هەن بەو ناوە و عەشایەر خەریك بوو من سەر چیخ ببات و تووشی شتێکم بکات.

- کوڕە هەی خواگیرا ئەمن وام دەزانی لەگەڵ ئەو کچە جوانەتە کە ماڵیان ئەها لەو سەرە، چما ئەوەش ئەو ناوەی هەیە؟

+ ئەدی، ئەتو شێت بووی؟ ئەوە بە کێ ڕاو دەکرێت؟

-با، هەیە ڕاوی کردووە، شۆڕەسوارێ هەیە.

ئەو دەمەو عەسرەی خەریکی خۆکۆکردنەوە بووین و شێنێمان بەجێدەهێشت، عەشایەر خەفەتبار دیار بوو، بەڵام نەیدەویست پێوەی دیار بێت، قسەی کۆلکێشەکە دەرچوو، شێنێ بە هەموو جوانیەکانیەوە وەك خۆی مایەوە، بە چەمە ناسکەکەی و شازادەکەیەوە، ئەوەی بووە جێی ئیرەیی من هەزار خۆزگەم دەخواست لە جێگەی ئەو بام، ئەو کوڕە بوو کە لە بن درەختەکە دەستی شازادەکەی شێنێی لە ناو دەست بوو.

بەرەبەیانیەکی بەهاری یان دوا شەوەکانی زستان بوو، ئەو دەمە لەگەڵ سۆسەن زیندانی و چەند پێشمەرگەیەکیدی لە ناوزەنگی چاوەڕوانی، سەربوردەی نائومێدیمان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە، هەینێ عەشایەر لە ناومان نەمابوو، دڵی خراپ ڕەنجا، بەرەبەیانیەك ڕێی خۆبەدەستەوەدانی گرتەبەر، شەوەکەی بە منی گوت:

بەیانی دەچمەوە، هەر کەسێکیش گوتی عەشایەر بۆ خۆی

رادەستکردەوە؟ بلێ: دوو مانگ بوو بێ پێڵاو دەگەڕا، بۆیان نەکڕی، ئا پێیان بلێ: حزب پێڵاوی بۆ نەکڕی، بۆیە بە شانازیەوە خۆی رادەستکردەوە.

ئەو شەوە عەشایەر یەك پارچە تووڕەیی پڕ گریان بوو، هەرێم دایێ مەسەلەی پێڵاوەکەی لە بیر نەکەم و هەرکێ ناوی عەشایەری هێنا منیش ناوی پێڵاو بێنم، گفتەکەی خۆشم بردە سەر.

ئەو کوڕەی لە بن دارەکەش دەستی شازادەی شێتێی لە ناو دەستا بوو، لە بن گەڵای زەردی پایزی عەشقیان دەکرد، لە سنەی عاشقان پیاسەی دەکرد، شۆڕەسوار دەیگوت:

هەر کەسێك بیەوێت عەشق بکات، دەبێت لە کچانی سنەییەوە فێر بێت.

سەردەستەش دەمێك بوو گەیشتبووە رووسیا، لە نامەیەکیدا بۆ هاوڕێیەکی، گوتیان نووسیبووی:

کەرە، زوو خۆت قوتارکە، وەرە ژیان لە باوەشی کچە رووسیان ببینەوە.

ئەبوو سۆسەن تازە لە زیندان هاتبۆوە، وەك دەیانگوت شێتیەکەی زیاتر بووە، من ئەو چیرۆکانەم بۆی دەگێڕایەوە کە لە بارەی ئەوەوە هەڵبەسترابوون، هەر کامێکیانم بۆی دەگێڕایەوە دەیگوت:

سەد لە سەد راستە و من هەموو ئەو شتانەم کردووە و گوتووە و دیتووە.

بەهاری هاتنەوەی بە سەردا هات، هەر بە باڵ باڵمان گرت، من و ئەبوو سۆسەن شازادە و سۆسەنەکەی شێتێمان لە یاد نەکرد، هاتینەوە سەر هەمان چەم، ئەو چەمەی دەکرێ بە چەمی جوانی ناوزەد بکرێ، دیتمانەوە، رێکەوتێکی چەند رێکەوتیە، دیسانەوە شازادەمان دیتەوە لە پێش دەرگا وەستا بوو، لەو بەهارەش وەك پایزەکە جوان بوو، ئەو کچە لە هەموو وەرزەکان جوان بوو، دڵنیام ئێستاش وەك جاران جوانە، کە

گەیشتینە بازاڕەکەی سونێ، تەماشای شۆڕشم کرد، بزانم مەیلی عەرەقی هەیە، ڕەنگی تێکچووبوو، دەتگوت دڵی خەبەرێکی ترسناکی پێداوە...

لە بیرمە شۆڕش کۆیی لە شەوە ساردەکەی هەیبەسولتان، ئیدی من ڕێی خۆم گۆڕی و چاوم بەرایی نەدا بچمە شارەکەی شۆڕشەوە، لە هەڵاتنێ عەشایەرم دیتەوە پێڵاوێکی نوێی ئەدیدایسی لە پێ بوو، سۆسەن زیندانیش هێشتا ڕاپەڕین چلەی نەچووبوو، لە بازگەکەی حەمرین دەسگیرکرا، ئیدی هەزار و یەك چیرۆك لە بارەی گرتنەکەی سۆسەن زیندانیەوە کەوتنە سەر زاران، تا ئێستاش(ئەبوو غریب) چیرۆکی ئەبوو سۆسەن دەگێڕێتەوە.

## چادرێ
## لە سەر سینگم هەڵدراوە

بەردی خەیاڵ، چێشتخانەی قرژاڵ، سەرشۆرکی ساماڵ، خەستەخانەی مۆسکۆ، بێرایی مەمکان، هۆدەی شەراب، هۆڵی هەراوهۆریا، کۆشکی کرملین، کۆشکی سپی، چیای دارین، چادری هەناسەتەنگی...

دێتە بیرم پایزانێك لەمێژنەبوو ئەنفال راوینابووین، هەشت نۆ دە پێشمەرگەیەك بەرد و قوڕیان بۆ عەلی کوتك و خدر رووسی دەکێشا، لە ماوەی هەشت نۆ دە رۆژێك دیواریان قیتکردەوە، دارەڕا و قوڕەپەستکرا، بیرمە مام عەلی بە خدر رووسی دەگوت:

ئەو وەستاییە دەڵێی لە رووسیا لە سەر دەستی هاوڕێ لینین فێر بووی!

مام خدر بە تەوسەوە دەیگوت:

نا، لە گەڕەشێخان.

دواتر زانیم گەڕەشێخان گوندی عەلی کوتکە، ئێرە بارەگای نۆکانی خوارێیە، جەمەی دێ لە پێشمەرگە، من لێرە زستانی نۆکان و چەند گرتەیەکی دەرەوەی زستانیش نیشاندەدەمەوە:

خەستەخانەی مۆسکۆ دوو دکتۆری هەبوو، یەکیان خڕکەڵە، ئەویدی باریکەڵە، ساڵ و شتێك بوو لە مۆسکۆ هاتبوونەوە، عەرەب بوون، بەڵام زۆر جار لە نێوان خۆیان بە رووسی ئاخافتنیان دەکرد، زۆر باسی مۆسکۆشیان دەکرد، وا بزانم هەر لەبەر ئەوەش بوو ناوی بووە خەستەخانەی مۆسکۆ، خەستەخانەکە جێی دوو کەسی لێنەدەبۆوە، ساماڵی عەنکاوەییش لەوێ دەخەوت ئەویش نیوە دکتۆرێك بوو، دەیگوت:

هەر کەسێك دوو حەفتە لەو خەستەخانەیە بمێنێتەوە دەبێتە دکتۆر.

دکتۆرەکان ناوە ناوە خولی پزیشکیان بۆ پێشمەرگە دەکردەوە، کارۆخ گۆتەنی:

لاقوزە دکتۆریان دەخستە بارەگاوە.

خەستەخانەی مۆسکۆ هەمیشە جمەی دەهات، خەڵك و پێشمەرگە لە هەموو لایەکەوە روویان تێدەکرد، لە خوارەوە لە زەلێ و شێنێ و لای بێدەلان و گۆڕەشێرەوە، لە سەرەوە لە بن قاسمەڕەشەوە، لە گشت لاوە نەخۆش بە سەر بەفر و بە ناو بەفر و بە بن بەفرا بە پێ و بە سواری دەهاتنە خەستەخانەی مۆسکۆ، بە دوو دنکە حەب، بە دەرزیەك چاکدەبوونەوە، من دوو جار رێم کەوتە خەستخانەی مۆسکۆ، هەوکم هەوی کردبوو، زۆر دێشا، هەناسەم بۆ نەدەدرا، دکتۆرە باریکەڵەکە بە خڕکەڵەکەی گوت:

دە وەرە تۆش تەماشای بکە.

بە رووسی چەند رستەیەکیان گۆڕیەوە، خڕکەڵە گوتی:

بە زووترین کات دەبێت بچیتە ئێران، نەشتەرگەری بکەیت.

باریکەڵەکە گوتی:

دەبێت سبەی بەڕێبکەویت، نەشتەرگەری نەکەیت، دەتکوژێت.

گوتم:

ناتوانم بچمە ئێران، پەڕی پەڕینەوەم نیە.

ئەبوو دڵشاد گوتی:

خەمت نەبێت، هەوڵدەدەم لە رێی (سۆسیالیستەوە) شتێکت بۆ بکەم و بتنێرینە ورمێ.

ئێ، چەند رۆژێك رۆیی، هەتا ((پەڕی پەڕینەوە)) پەیدابوو، من چاکبوومەوە، ئەو پەڕی پەڕینەوەیە هەرگیز لە وادەی خۆی نەگەیشتووە، ئەو جارەی دەمویست بچمە راژان بۆ کۆنگرەی نووسەران، ئەوجاریش مامۆستا رەوەند زۆر هەوڵیدا بۆم پەیدا بکات، دەستینەکەوت و لە دەستمچوو.

ئێ، با بگەڕێینەوە خەستەخانەی مۆسکۆ، بزانین داخۆ دکتۆرەکان لەوێ ماون! پەنجە تووتەی پێم بزمارێکی لێهاتبوو، پێم لە پێڵاو جێی نەدەبۆوە، دەبێ بڵێم ئەو بزمارە کۆنە، زۆر کۆنە، هێشتا لە شار بووم، لێم هاتبوو، بەڵام گچکە بوو، ڕێی هیچی نەگرتبوو، ئێستا گەورەیە و پێڵاو دەگرێ، ئێ، لە خەستەخانەی مۆسکۆ نیشانی دکتۆرەکانم دا، سۆزیان دا:

ئێستا نا، سبەی دووەی بۆت دەبڕین.

سبەی هیچ، دووسبەی دکتۆرەکان دیار نەمان، دەنگۆیەك بڵاوبۆوە، دکتۆرەکان دیار نەماون، ئەولا دکتۆر ئەم لا دکتۆر، کەس نەیزانی عێراق قووتی دان، یان ئێران شاردنیەوە، درەنگ بیستم بە دزیەوە چوونەتەوە رووسیا.

بەر لەوەی بچمە چێشتخانەی قرژاڵ، دەبێ چارەیەك لە پەنجەم بکەم، لە بارەگای سەرێ کیفاحێك هەبوو، لە جێیەکیدی بە توفاح ناوم هێناوە، شتێکی لە برینپێچی دەزانی، ئەو کوڕە ئێزیدی بوو، بەڵام هێندەیان پێگۆتبوو، تۆ هیچت لە ئێزیدیان ناچێ، نە سمێڵت نە... گومانی لە خۆی پەیداکردبوو کە ئێزدی بێ، ئێ تەماشای پەنجەی کردم و گوتی:

+ ئەوە زۆرسانایە، نهۆ بۆت دەردێنم

- کوڕە، ئەگەر لە خۆت رانابینی، دەستی لێمەدە.

+ خەمت نەبێ، بیستی هۆسام نەشتەرگەری کردووە.

دوو سێ دەرزیی سڕبوونی لێدا و کەوتە سەری، گەیاندیە سەر ئێسك و لە کاتی نەشتەرگەریش دەیگوت:

لە هەولێرەوە ئەو بزمارەت بۆ من هێنا، بزانە چتۆ دکتۆرم!

بەڵام پێشمەرگەیەك کە لە تەنیشتمان دانیشتبوو، گوتی:

جوان ببڕە، با وەك هی من شینەبێتەوە.

دوو سێ رۆژان ژانی زۆر بوو، ئیدی تەواو، بزمار ئێستاش شینەبۆوە.

چێشتخانەی قرژاڵ بە دووکەڵەکەیەوە لە هەموو لایەکەوە دیارە، پشت لە تەلانە روو لە رووبارە، پێشی واڵایە، سێ لای دیوارە، دیواری پشتی

دەستکردی سرووشتە، بەڵام دیواری تەنیشتەکانی بە دەستی پێشمەرگە هەڵچنراوە، چێشتخانەی قرژاڵ لەوەتەی هەیە ئاگری لێ نەکوژاوەتەوە، دارستانێك داربەڕووی ئاقاری نۆکانی سەرێ لە ئاگردانی چێشتخانەی قرژاڵ بۆتە خۆڵەمێش، مەگەر سەرشۆرکەکە هێندەی وی داری سووتاندبێت، ئەگەر باوەڕناکەن، لە رووبارەکە وردبینەوە، لە راستی چێشتخانەکەوە رەنگی خۆڵەمێشی گرتووە، خۆڵەمێشی رۆخ ئاگردانیش هەمیشە بۆنی پەتاتەی لێدێ.

چێشتخانە پەتاتەی لێنەدەبڕا، من شەوان، ئەو شەوانەی ئێشکگریم دەکەوتە شەودرەنگان، یەك دوو پەتاتەم دەبرژاند و لە شەوی بەفراوی، زوقماوی خۆم بە پەتاتەی برژاو گەرمدەکردەوە، دەزانن چ تامێکی دەدا! ئێستاش هەر کاتێ بەفر دادەکات، لە بەفر نزیکدەبمەوە، حەزم دەچێتە پەتاتەی برژاو، پەتاتەی پێشاو. ئەو ساڵە بەفرێکی ئەستوورکەوت، لێنەدەکردەوە، چێشتخانەی قرژاڵ تژیە لە وردە سەرهات، ئەو پێشمەرگەیەی دزیکردبوو لە چێشتخانەی قرژاڵ لێی ئاشکرابوو، پێشمەرگە تووڕەکەش هەر لە چێشتخانەی قرژاڵەوە دەنگی هەڵبڕی:

حزب هەتا حیز هەبێ، ئێمە دەنێرێتە رووسیا؟!

پێشمەرگە شێتۆکەکەش کە لە پێشمەرگەیەك تووڕە ببوو، دەبێ ناوی هادی بووبێ، لە چێشتخانەی قرژاڵەوە بە دەم چایە خواردنەوەوە، لە چۆکی خۆی دەدا و دەیگۆ:

ئاخر کورد دەبێتە چی! تۆ بڕوانە عەرەب هادی عەلەوی هەیە، کوردیش خاوەن ئەو هادیە بەژن بەرزە!!

چەتۆ سەحەریش ئەو شەوانەی ئێشکگریەکەی دەکەوتە دەمی سەحەر، لە چێشتخانەی قرژاڵەوە تێیهەڵدەکردە (هەوەل سەحەرە..)، شەڕی دوو پێشمەرگەکەش هەر کەوتە چێشتخانەی قرژاڵەوە کە بە پەتاتە و پیاز وەرگەڕابوونە یەکتر، لەوێ گوتم:

ئەگەر هەموو شەڕەکان ئەوها دەبوون، زەوی دوژمنایەتی قووڵی بە خۆیەوە نەدەدیت.

پێشـــمەرگەیەکیش لاقـــوونی خـــراپ بە پۆلـــووی ئـــاگردانەکەی چێشـــتخانەی قـــرژاڵ ســـووتا، نـــاکۆکیەکەی مـــن و غەســـانیش کە بەفـــر نەیکوژانـدبۆوە، بە دیـار ئـاگردانی چێشـتخانەی قـرژاڵەوە سـەریهەڵدایەوە، ورده سـەرهات زۆرن، جوانترینیـان سـەرهاتی هەرەسـە، ئەوەی بە چـاوی خۆم دیتم و ئێستاش لە چاومە و ناسرێتەوە.

تەلانی پشت چێشتخانە کە بە سەر رووبارەکەدا دەیڕوانی و رووبار تـا پێچی دەکردەوە بە بن تەلانی بەرزدا و بە ناو بەفردا نەرم نەرم دەڕۆیشت، بەفر کەنارەکانی زۆر لێکدی نزیککردبـۆوە، چـی بـۆ رووبـار نەهێشـتبۆوە، ئـێ، پـێش نیـوەڕۆیە، کابـانم، لەگـژ شـیولێنانم، بە رێـکەوت لە زاری چێشتخانە روو لە تەلانی سپی کە لووس لووسە لە بەفـر راوەسـتاوم، دیـتم لەو سەرەوە دوور لە چێشتخانە، تەلان درزی برد، بەشێك لە تەلان خـزی، چیای سپی کەوتە رووبارەوە، ئا چیا بـوو، هەر کەوتنـی چیـا ئەو دەنـگەی لێـوە دێ، لە گـوێی مـن دەنـگەکە زۆر گەورە بـوو، ترسـام لە راسـتی چێشتخانەشـەوە بەفـر هەرەس بێنـێ، نەیهێنـا، بەری رووبـاری گـرت، ئـاو پەنگـی خـواردەوە، کەمێکیتـر چیـای بەفـر نەتوابـایەتەوە ئـاو دەگەیشـتە ئاگردان، ئەوە جاری یەکەمم بوو هەرەسی بەفر ببینم، هەرەسێکی گچکە، بەڵام لای مـن گەورە بـوو، لە یـادەوەری منـدا گەورەیە، پێشـتر تەنهـا لە چیرۆك و سەرهاتان هەرەسی بەفرم خوێندبۆوە، هەرەس تا بە چاوی خۆت نەبینی، هەرەس نیە، ساڵی دواتر لە قەندیل هەرەسی گەورەی بەفرم دیـت، بەڵام لە یـادەوەری مـن ئەوەی ئۆکـان گەورەتـر و دیـارترە، هەر لەوێ تێگەیشتم لە خۆڕا نیە ناویان لە تێکچوونی شۆڕش ناوە هەرەس.

نەتانپرسـی چێشـتخانەکە بـۆچی قرژاڵـی پێـوەیە؟ لە خـۆوە نـیە، بارەگـا عەرەبی زۆر بوو، هەرچـی عەرەبـیش بـوو قـرژاڵ خـۆر بـوو، سـێ چـوار کوردیش لە عەرەبەکـان بە تـامتر دەیـانخوارد، ئەوێ قرژاڵـی زۆر بـوو، لە سەرهاتی قـرژاڵ ئەگەر بە ئەرکـی نـازانی خـۆت هەڵـدە دەرەوەی وەرزی بەفـر، قـرژاڵ بە پێـی خۆیـان دەهـاتنە چێشـتخانەوە، دەتگـوت حەزیـان لە

بـرژانه، له ئـاگردانه‌كه نزيكـده‌بوونه‌وه، ئيـدی هه‌ر شيشـكه تفه‌نـگ بـوو ده‌چه‌قيه پشت قرژاڵه‌وه، هه‌ر قـرژاڵ بـوو، گه‌وره، گچـكه له سـه‌ر پشـكۆ سۆرده‌بۆوه، ئای له چێشتخانه‌ی قرژاڵه‌وه قرژاڵ برژاوه، زۆر هه‌وڵمدا تـامی بكه‌م، بێزم نه‌هات، رێبوار له كاتی قرژاڵ كرۆشتن ده‌یگوت:

وه‌ره به‌شداریمان بكه، بۆ بێزتدێ زه‌ردێنه‌ی هێلكه بخۆی، بێـزت نـایه قرژاڵ بخۆی، خۆ یه‌ك شتن.

بێزم نه‌هات، به‌شداریم نه‌كردن، به‌شداریی من له قرژاڵ هه‌ر ئه‌وه بـوو ناوم له چێشتخانه نا چێشتخانه‌ی قرژاڵ.

هــۆده‌ی شـــه‌راب هێنـــده گه‌وره نه‌بـــوو له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش له نـــاوه‌وه هـۆده‌یه‌كی بچـووكی لێكرابـۆوه و ده‌رگـا داریه ته‌نه‌كه‌یـیه‌كه‌ی هه‌میشـه كلیلدرابوو، پڕ بـوو له بڵاوكـراوه و فایـل و كتێـب، جارێـك خـاره خـوله گوتیه من:

+ هه‌ر كاتێك له‌و ده‌رگایه نـزیككه‌وتیه‌وه، چـاوت داخه و كه‌پـووت بگره.

- لۆ؟

+ هه‌رچی سڕ و تڕی حیزب هه‌یه له‌و ژووره‌یه.

- ئه‌دی ئه‌گه‌ر سووتا یان دزرا؟

+ به خودای حیزب ده‌ستی له گونم ده‌بێ.

باش بوو حیزب زوو سڕ و تڕی خـۆی له‌وێ گواسـته‌وه، نـازانم بـردیه ناوزه‌نگ یان نۆكانی سه‌رێ، هۆده‌ی شه‌راب هه‌ر ئه‌و هۆده‌یه‌یه كه رێبوار شه‌رابی لێده‌گرته‌وه و له گێڕانه‌وه‌یه‌كیدی سه‌ربرده‌ی ته‌قینه‌وه‌ی جلیكانه‌ی شه‌رابم گێڕاوه‌ته‌وه، لێره ته‌نها ئیشم به چه‌نـد مه‌تـاره‌یه‌ك شـه‌راب هه‌یه كه له هۆڵی هه‌راو هۆریا به كه‌ڵكم دێ.

هۆڵی هه‌راو هۆریا، كه جارێك له زارم ده‌رچوو گوتم:

ئێره هۆڵی گاگه‌له.

له سـه‌ر ئه‌وه له‌گه‌ڵ پێشـمه‌رگه‌یه‌كی عه‌ره‌ب تێكگیـراین و خـراپ

داڕساینە یەکتر، من ڕووی قسەم لە پێشمەرگەیەکیدی بوو، لە پەنجەرەی گاڵتەوە گوتم :

ئەو هۆڵە هۆڵی گاگەلە.

کەچی ئەو لە کاتی وەرگێڕانی ڕستەکە بۆ عەرەبی خاڵبەندە گاڵتەیەکەی بەگەڵ نەدابوو، عەرەب لە دەرگای هیدلیەوە وەڵامیدامەوە:

+ تۆ خۆت بەچی دەزانی ئەو خەڵکەت پێ ڕەشەوڵاخە؟

منیش تووڕە بووم، لە گاڵتەوە کردمە ڕاستی و پێمگوت:

- دەیلێمەوە ئێرە هۆڵی گاگەلە، ئەگەر وا نیە، تۆیان بۆچی لێرە دابەستووە؟

+ خۆت گای، هیچ و پووچ...

- خۆت و بابت گان...

پێشمەرگە زوو کەوتنە بەینەوە، دەنا دوو گا شەڕەقۆچانێیەکی گەرمیان دەکرد، دوای ساردبوونەوە، گوێم لە کارۆخ بوو بە پێکەنینەوە دەیگوت:

بە ڕاستی ئێرە هۆڵی گاگەلە، نەتاندیت ئەو دوو گایە چۆن قۆچیان لێکدی گیرکردبوو.

ئیدی چیدی هۆڵی گاگەل بە زارمدا نەهات، لە جێی گاگەل هەراوهۆریام دانا، ئێستاش هەر بە هۆڵی هەراوهۆریا ناوی دێنم، ئەو هۆڵە دوور و درێژ بوو، بە ژمار پەنجاو حەفت پێشمەرگە لەو هۆڵە دەخەوتن، بیست و نۆ لەو بەر، بیست و هەشت لەمبەر، بەری دەرگا، بەرینی هۆڵ ئەگەر هەردوو چەتۆ (سەحەر و بەڕانەتی) لە بەرانبەر یەکتر خەوتبان، پەنجەی پێیان لە یەکتر دەخشا، بەڵام من و سەرهەنگی مەلانەفتە، پێمان بە یەکتر نەدەکەوت.

دیتنەوەی من ئاسان بوو، ئەوەی لە ئێشکگری دەکەوتە پێشە من، لە دیتنەوەم هەڵەی نەدەکرد، جێی من سەر دەرگایە، کاتێ لە دەرێوە دەرگا چوارچێوە دارە نایلۆنیەکە بە لای چەپدا دەکەیتەوە، یەکەم بەتانی لای ڕاست هەڵدەوە منم، ئەگەر غەسانیشت ویست، لە دەرگا لامەدە دوو

شەقاوان باوێ، ئاگات لە سۆبەکە بێت! پێت بە پێی دەکەوێ، سەرهەنگیش لە تەنیشت غەسانە و پێی لە کن پێی منە، لە تەنیشتە من هەڵۆیە، لەو دیو هەڵۆ مام بایزە، لە ریزی من لە سەری ئەو سەر چەتۆی بەرانەتیە، بەرانبەر وی نزیك پەنجەرەکە دڵنیایە، ناوی هەندێ لە پێشمەرگەکانی هۆڵی هەراوهۆریام لە بیرماوە، بەڵام بە جێیەکانیان ناکەومەوە:

کارۆخ، ئەرکان زەردەشیان دەگوتێ، ئەبوو ئەحرار، چەتۆ سەحەر، ریاز، هاوار، بۆتان، ئەردەلان، شێرزادی رۆستێ، خارە جەمیل، خارە جەواد، هیمداد، ئەبوو زاهید...

ئەو ئەبوو زاهیدە کەمدوو بوو، رستەیەکی هەبوو رۆژی سێ جار، دوای جەمەکان دەیگوتەوە، نازانم کێ بوو ناوی لەو رستەیە نابوو (حەبی دوای نانێ)، رستەکە چ بێت باشە! هەر خواردنێکی خواردبا، رووی لە کابان دەکرد:

عاش ئیدەك، خوش سەویتە.

دەستخۆش، خۆشت لێناوە

سبەینێیەك مام بایز گوێزی داینێ، هەر کەسە و بە ژمار حەفت گوێزی خۆی وەرگرت، کوت کوت، گوێزشکاندنە، ئەبوو زاهید گوێزی دەشکاند و لوولی دا، تەواوی نەکردبوو، روو لە مام بایز رستەی خۆی گوتەوە:

عاش ئیدەك، خوش سەویتە

مام بایز گۆتیە چەتۆ سەحەر:

+ئەوە چی گۆت؟

چەتۆ بۆی کردە کوردی.

مام بایز بە پێکەنینەوە:

+ ئەرێ ئەگەر گوێزی لێبارکەیت خرەی دێ؟!

چەتۆ سەحەر:

- گوێز هیچ، ئەگەر کەلابەردا

وەرە، لە شەوی بەفراوی، بەفر چۆکێك کەوتووە، سەرێك بە هۆڵی هەراوهۆریادا بگرە، چ دەبینی! یەك هەراوهۆریایە، یەك کەرەسیسەیە، کەس گوێی لە دەنگی خۆی نیە، کەس پێی خۆی ناناسێتەوە، چرە دووکەڵێکە نە بە لامپا، نە بە لایتی دەستی پێشمەرگە رێی هاتوچۆ روونناك نابێتەوە، تۆ بیهێنە بەر چاوی خۆت، لەو هۆڵە لە پەنجاو حەفت کەس تەنها حەفتیان جگەرەکێش نین، پەنجا جگەرەکێش! کەمیشیان جگەرەی پاکەت دەکێشن، زۆربەیان کیسەی توتن لە تەنیشتیانە و جگەرەی نزیك لە هی مام بایزی دەپێچنەوە، وەك چۆن جگەرەی کاسترۆیی، جگەرەی سەدامی هەبوو، هی مام بایزیش هەبوو.

جغارەی مام بایز کورت بوو بەڵام ئەستوور، کەس نەیتوانیوە و ناتوانێ جگەرەی وا ئەستوور و توند بپێچێتەوە، لەو سەرەوە هەڵیدادەیە ئەو سەر. زۆر کەرەت بە کۆڵەگە دەکەوت، هەڵدەوەشایەوە، وای لێهات کە دەتگوت(مام بایزی) جگەرەی ئەستووری توندی دەگەیاند، جگەرەیەك ئەستوورتر لە پەنجەی گەورەی مام بایز، ئەو پەنجەیەی رەنگی تووتنی گرتبوو، هۆڵەکە دوو کۆڵەگەی ئەستووری تێدا بوو، هەر یەکەو لامپایەکی پێوە کرابوو، بەڵام هیچیان بایی خوێندنەوە رووناکیان نەدەدایە من، لە پشت سەرم لە بلندایی نیو گەز بەردێك دەتگوت ناولەپە لە دیوارەوە هاتۆتە دەرێ، کارۆخ دەیگوت:

لە گینە مام خدر لە کاتی دیوارکردن زانیبێتی جێی تۆ دەکەوێتە ئێرە، بۆیە ئەو بەردەی خستۆتە ئەو کەرخە، تا مۆمی لە سەر دانێی.

ئیدی لە ساتی خوێندنەوە مۆمم دادەگیرساند، لە هۆڵی هەراوهۆریا هەر لە سپێدەوە تا نیوەی شەوێ هەراوهۆریایە، گۆرانیە، شەرە بەندە، نوکتەیە، گێرانەوەی رۆژانی شەڕ و هەڵمەتبردن و مۆڵگە گرتن و کوشتوکوشتارە، گێرانەوەی خۆ شاردنەوە و هەڵاتن و گەیشتنە سەر سنوورە، زۆرانێ و شەقشەقانێیە، چەند رادیۆیەکیش دەنگیان دێ، لە یەکیان هەواڵ، لەویدی گۆرانی کوردی، ئەویدی گۆرانی عەرەبی، بەڵام

له هیچیان تێناگەی، تام له هیچیان وەرناگری، من پێم شك نایه له هۆڵی هەراهۆریا بۆ جارێکیش به دڵی خۆم گوێم له رادیۆکەی خۆم گرتبێ و چێژم له گۆرانیەك وەرگرتبێ، هەر ساتێك ویستبم یان زانیبێتم گۆرانیەکی ناسك هەیە، هاتوومەته دەرێ.

زۆر جار بووه نیوەی شەوێ له ناو بەفرێ له دەو رووبار، به دەم پیاسەوە گوێم له گۆرانی گرتووه، گۆرانیی (ئەرێ ئەی به زولف و رووخسار)ی فواد ئەحمەد لەوێ، لەو شەو و رووبار و بەفره، لەوێ له ساردترین شەوی ساڵ، بووه گۆرانیی من، پێشتریش زۆر حەزم لەو گۆرانیه بووه، پتر به دەنگی ماملێ، بەڵام لەو شەوەوه گۆرانیی ئەرێ ئەی به زولف و رووخسار له گوێی من له دەنگی فواد ئەحمەد نابێتەوه و هەر بەوەوه گۆرانیه، له پاشەوی کەس نەیلێ!

جارێك ئێشکگرێك دیاربوو ئێشکگرەکەی پێش خۆی پێینەگوتبوو که من خوا لێگۆڕیمه و له ناو سەهۆڵبەندانێم، دەنگیدام، ئێشکگر توند دەنگیدام و تفەنگی راکێشا:

+ کێی زەلام؟!

- من نۆبەتداری بەفرم.

وام زانی هەر دەنگم ببیستێ، دەمناسێتەوه، من ناسیمەوه، جەمیلی ناو بوو، بۆیه وام گوت، نەیناسیمەوه، به تووڕەییەوه:

+ دەڵێم کێی؟ نهێنی شەو دەزانی؟

ئای، دیاره، به راستی تووڕەیه! چوزانم نهێنی شەو چ بوو، لەبیرم نەمابوو:

- نهێنی شەو! یان گونی من بوو یان گونی خاره جەمیل.

+ کوڕه شوانه ئەوه ئەتووی؟!

بۆ گۆرانی دەچوومه دەرێ، بەر بارانێ، ناو بەفرێ، بەڵام بۆ خوێندنەوه له جێی خۆم و به دیار مۆمەوه دەمامەوه، من وابووم، ئێستاش وام، که رۆدەچمه ناو کتێبەوه، چیا بتەقێتەوه، گەڕەك و ماڵ ئاو ببا، ئاگام لێنیه، مام بایز دەیگوت:

+ باشە لەو کەربازاڕیە، لەو بەزم و ڕەزمە، چ دەچێتە مێشکتەوە؟

- لە دەمی خوێندنەوە، هیٚ لە دەنگی ڕستەکانی ناو کتێب گوێم لە هیچ دەنگێك نیە.

+ دەنگی کارۆخیش؟

هی کارۆخیش، ئەو کوڕە، هەر یەکێك دەستی لێکبدایە، پێی بە خێرایی لە زەوی بدایە، گۆرانیی خۆی دەگوت:

**ئامان میم گورجی**

**سوخمە نارنجی**

**جوتە مەمکەکەت**

**کۆتری فەرەنجی**

بە دەنگی گەورە، هەمیشە ئەو گۆرانیەی دەگوتەوە، درەنگانی شەوێك هەڵۆ پەڕە کاخەزێکی بە دەستەوە بوو، گوتی:

+ لە سبەینێوە تا ئێستا دەزانی ژمارەی (میم گورجی)یەکانی کارۆخ گەیشتە چەند؟

- نەتنووسیبێتەوە؟!

+ با، ئەوەتا، دووسەت و سی.

- بیکە سیٚ سەد.

+ لۆ؟

- شەو بایی حەفتای بە بەرەوە ماوە!

ئەردەلان هەر نەیدەبڕیەوە، دەنگی خۆش بوو، زوو لاسایی مامڵێی دەکردەوە، پاشان بایدایەوە سەر خالقی، لەو گۆڕینە دەنگی تێکچوو، گۆرانی (لە ناو ڕەشماڵی خێڵان)ی خۆش دەگوتەوە، ئەو کوڕە گۆرانی زۆر دەگوت، جاروبار دڵنیاش بۆی دەگێڕایەوە، بۆ کارۆخیشی دەگێڕایەوە، چەتۆ سەحەریش جار جارە تێیهەڵدەکردە سێوە، من تەنها لەو کاتەی ئەو سێوەی دەگوتەوە، دەستم لە کتێبەکەم بەردەبوو، بەردەبۆوە سەر دەموچاوم و گوێم دەدایە سەحەر، دیارە زۆر کەڕەتیش بەکتێبەوە

خەوم لێکەوتـووە، ئێشـکگرەکە ئەوەی بـانگمی کـردووە بـۆ ئێشـکگری، کتێبەکەی لە سـەر چـاوم یـان لە سـەر سـینگم هەڵگرتـووە، ئێشـکگری وا هەبوو دەیگوت:

لە بیرت بێ، گەیشتوویەتیە لاپەڕە...

لە هۆڵی هەراوهۆریا هەمیشە لە سەر پشت دەمخوێنـدەوە، بە گشـتیش بە دەم خوێنـدنەوەوە خەوم لێکەوتـووە، ئەگەر مـۆمەکە شـتێکی بە بەرەوە مـابووبێ، هەڵـۆ فـووێکی لێکـردووە، هەڵـۆ بە تەمەن کچـکە بـوو، چەنـد ساڵێك لە من گچکەتر، بەڵام بە کەلەش گەورە، پرچێکی جوانی هەبـوو، بتدابایەتە پووره ئایشێی نۆکان، دەیرِێسـا، لەگەڵ خـوری لێکتنەدەکـردەوە، زۆر جار دەمگوتە هەڵۆ:

بریا پرچم وەك تۆ بایە.

کەچی خۆی پرچی خۆی بەدڵ نەبوو، لە دڵەوە دەیگوت:

پرچێکی وەك تۆم هەبا، هیچم نەدەویست.

هەڵۆ کوڕێکی تا بڵێی سادە و بێگەرد، لە چاویەوە رستە رستە لاپەڕەی دڵیت دەخوێندەوە، ئەو کـوڕە هەنـدێك دەسـتقووچاو و سایەوشـک بـوو، جـگەرەی نەدەکێشـا، بەڵام جاروبـار پـاکەتی بـۆم دەکـڕی و لێشـم وەرنەگرتبا، تووڕە دەبوو، دەیخستە بن جێگاکەمەوە و دەیگوت:

+دەچـمە دەرێ، هەتـا دێـمەوە نەتشـکاندبێ، دڵـم دەشـکێ و بە هـیچ چاکنابێتەوە.

- ئەوجـارە پـاکەتەکە دەشـکێنم، بەڵام جارێکیـدی وا بکەیـت دڵـت دەشکێنم.

ئەودەمانێ ئەو پارەی وەرتدەگرت، بەشی دە رۆژ جـگەرەی نەدەکـرد، مۆمیش لەوێ بوەستێ! لە هۆڵی هەریاوهۆریا بمێننەوە، لەگەڵ هەڵۆ ئیشێکم هەیە ئێستا دێمەوە:

ئەو دەمەی هەڵۆ خۆی رادەستکردەوە، دیارە لە (ئەمن) نـازانم کـوێ، پێیانگوتبوو کە لە ناو خەڵك بە خـراپە باسـی بـاری گـوزەرانی پێشـمەرگە

بکات، ئێ، ڕۆژێك بابی پێشمەرگەیەك خەڵکی ماستاوەی بن هەولێر بوو، گەیشتە ناوزەنگ، نیوەڕۆ بوو، جەمی نیوەڕۆ هەمیشە شلە و برنجە، ئەو ڕۆژە نۆرەی گۆشتیش بوو، ئێوارەکەیشی خواردن خراپ نەبوو، بەیانیەکەشی هێلکەوڕۆن، چایەکی خۆشیش، لە هەولێر تۆچای وا خۆش دەستنەدەکەوت، ڕۆژی سەرشۆرکیش بوو، پێشمەرگە خۆیان دەشووشت، پاکوخاوێن، بیستمەوە، پیاوی ماستاوەیی گوتبووی:

+ بمزانیایە گوزەرانتان وا باشە، نەدەهاتم بۆ بردنەوەی کوڕەکەم.

- بۆ چۆنی تێگەیشتبوویت؟

+ خراپ، زۆر خراپ، وایان لە من گەیاند، پێشمەرگە لەو سەر سنوورانە وەك دەرۆزەکەر دەژین، لە برسا مردوون.

- کێ وای تێگەیاندی؟

+ کوڕێك ئەویش لێرەبوو، لەمێژ نیە هاتۆتەوە، پرسیاری کوڕەکەی خۆمم لێکرد، گوتی:

گوزەرانی خراپە، شێرە لە نزیك قاسمەڕەشێ گوڵەبەڕۆژە دەفرۆشێ؟

دەیانگوت ئەو کوڕە، هەڵۆ بووە، ئەو هەڵۆیەی بەر لەوەی بەرەو هەولێر لە باڵ بدا، لە هۆڵی هەراوهۆریا جێی بە جێی منەوە بوو، لە درووستکردنی دۆشەکەکەش بە بەرد یاری دام.

چەند شەوێك گەرم نەدەبوومەوە، ساردی لە بنەوە سەردەکەوت، هەتا تەڕی نەگەیشت، تێنەگەیشتم، ئاوی دایە، دیاربوو، لە دەرێوە لە بێراییەکەوە، ئاو هاتبوو، دیوارەکە لە بنەوە ئاوی دابوو، عەردەکە ئاوی دزیبوو، چ بکەم باشە! بۆم هات کە پارچە نایلۆنێك رابێخم و لە سەرە وی بەردی پان پان دانێم، وام کرد، من و هەڵۆ لە دەو رووبار بەفرمان هەڵدەدایەوە و بەردی ڕێك و پانمان کێشایەوە، لە بێراییەکەی مەمکانیش یەك دوو تەنەکە خۆڵ و خۆڵەکەوەم لە سەر بەردەکان رووکرد، بەتانیەکم بە دوو قەدی لە سەر راخست، ئێستا من خاوەنی دۆشەکێکی بەردینم، بڵندیەکەی بستێکە، درێژیەکەی سەد و هەشتاو یەك سانتیمەترە، واتە ڕێك

بە بەژنی خۆم، بەرینیەکەی بە قەد ناوشانی هەڵۆ، زۆر لە هی خۆم بەرینتر، هەر زوو، هێشتا جگەرەیەکم لە سەر دۆشەکی بەردین نەکێشابوو، غەسان کەوتە دژایەتی:

+ ئەو کۆسپە بڵندە ژوورەکەی تێکداوە، لە کاتی هاتوچۆ ساتمەی لێدەکەن.

- کەس نیە لایتی نەبێ.

+ لە بەلاش ئەو کۆسپەت درووستکردووە.

- تۆ نابینی؟ لە بنەوە ئاو هاتووە.

+ هەندێك پشکۆی لە سەر رووکە وشکدەبێتەوە.

- تەڕدەبێتەوە.

+ تەڕ نابێتەوە.

+ ئەگەر حەزت لە شەڕە من ئامادەم.

ئەو بە تێکەڵەیەك لە عەرەبی و کوردی، منیش بە تێکەڵ لە کوردی و عەرەبی کەوتینە هەڕوگیف، ناوبژیوان زۆر بوو، نەیانهێشت بگەینە یەك، ئەو غەسانە ئەودەم بەرپرسی ئازووقە و خواردن بوو، ئێشکگریش ئەو دایدەنا، دوای دەمەقرێیەکە، دیتم ناوی منی لە ئێشکگری لە پێش ناوی خۆی داناوە، بۆوەی ناچار بم بانگی بکەم و لەگەڵی پێکبێمەوە، بەڵام من ئەو شەوە دامە کەرایەتی، لەو شەوە زوقم و سایەقەیە کە گورگی دەبەست، ئێشکگریەکەی ئەویشم گرت، ئەوەی دوای ویم بانگکرد، ئیدی دووبارەی نەکردەوە.

هۆڵی هەراوهۆریا جاروبار گرژی و قرەقرِی دەکەوێتێ، ئاخر پەنجاو حەفت فریشتەش بخەیتە ژوورێکەوە، بەرانگژی یەکتر دەبنەوە، ئەوجا پەنجاوحەفت پێشمەرگەی تووڕە لە دنیا، پێشمەرگەی بێ ئاگا لە کەسوکار، پێشمەرگەی هەڵاتوو لە چنگی ئەنفال، پێشمەرگەی پەریوەی دۆڵ و شاخان، پێشمەرگەی ئایندە نادیار، نایەتەوە بیرم دەنا هەندێك لە وێنەی وەك ئەوەی خۆم و غەسان نیشاندەدەمەوە، ئا شتێکم بیرکەوتەوە،

شەو درەنگانێ، تا بەرەبەیان بوو، لە خەونێکی خۆش لە جێیەکی خۆش بووم، دەنگێك لە دەنگی کەس نەدەچوو:

وەی بابە گونم!

هێنامیەوە هۆڵی هەراوهۆریا، تومەز ئەو ئێشکگرەی چوو بانگی ئێشکگری دوای خۆی بکات، لە پێیەك ساتمەی کردبوو، پێی کەوتبووە سەر گونێك، هۆڵ بە ئاگاهات، لایەکان هەموو لە سەر پێشمەرگەیەکن، پێشمەرگەش دەستی بە گونیەوە و جوێن دەدا، تا ساردیانکردەوە، رۆژبۆوە، بیرمە مام بایز بەتیزەوە:

ئازاری گون بێ دەرمانە!

ئەو شەوە بە (بەزمی گون) لە هۆڵی هەراوهۆریا تۆمارکرا، کارۆخ کە پێشتر ئەگەر پێشمەرگەیەکی دیتبا لە سەر زگ خەوتووە، دەیگوت:

دنیا هەمووی نێرەکەرە، هەستە خۆت وەرسووڕێنە.

دوای بەزمی گون قسەی گۆڕی:

بۆوەی گون بە ساخی و سەربەرزی بمێنێتەوە، قوون برادەران خۆش، گوێ مەدەنێ وەرسووڕێنە سەر زگ.

ئێستا لە جێیتی، لە ڕێی مەتارەوە قسە بچێتەوە ژووری شەراب، ناوەناوە مەتارەیەك شەرابم هەبوو، لە ناو بەفرێ، هەندێك جار لە بن بەتانی دەمم بە مەتارەوە دەنا، شەراب نەبا، من لە ساتەکانی تووڕەبوون، تووڕە لە خۆم، لە دنێ، بە چی هێوردەبوومەوە! من هەمیشە منەتباری شەرابم، منەتباری ئەو مەتارەیەم کە هەموو، یەك دووانێکی لێدەرکە، هەر وا تێگەیشتبوون وەك مەتارەکانیدی تەنێ ئاوە، بەڵام مەتارەی من هەتا شەراب هەبا، قەپاخی بۆ ئاو نەدەکردەوە، ئەو زستانەی نۆکان منەتباری مەتارەی شەرابیی ڕێبواریم، شووشە عەرەقەکەشم لەبیرە.

پێشمەرگەیەك، شووشەیەك عەرەقی دامێ، ناوی ناڵێم چونکێ لە ساتی نووسینی ئەو چەند دێرە، ئەو برادەرە گەڕاوەتەوە، سەری بچێ، نوێژی ناچێ، پەشیمانە لە خواردنەوە، پەشیمانە لەو شووشەیەی کە بە منی

بەخشی، کە لە یادەوەری من وەك دیاریەکی زۆر جوان و گرانبەها پارێزراوە، بۆیە ناوی ناهێنم نەخۆ گوناهەکەی نوێبێتەوە! ئێ ئەو شووشە عەرەقە لە جێی خۆی بوو، لە دەرەوە، لە نزیك چێشتخانەی قرژاڵ لە بن بەفرێ، بەردێکی گەورەم دیتبۆوە، لە ناو نایلۆنێك لە پاڵ بەردەکە درێژمکردبوو، هەندێك کا و چیلکە و چواڵم بە سەردا کردبوو، ئەوجا بەفرەکەم وەك خۆی لێدەکردەوە، باش بوو نەیدەبەست، وا بزانم شووشەکەم لە ماوەی حەفتەیەك بە چوار جار تەواو کرد و هەمووجارێکیش داپۆشینەوەکەی وەك هی جاری یەکەم، چەند خۆش بوو شەوان لە ساتی ئێشکگری کە بەرەو لای شووشەی بن بەفرێ دەچووم، دەتگوت دەچمە ژوانی یارێ.

ئێوارە خارە خولە جێی نووستنی لە جێی من تەسکتر دەبێ، ناتوانێ شان وەرگێرێ، گێڕایانەوە:

نیوەی شەوێ هەستابۆوە، پرسیبووی:

+ ئەرێ قیبلە لە کام لایە؟!

- چیە دەڵێی خودا هیدایەتی داوی!

+ سەیە، ئەگەر نازانی قسەی حیز مەکە.

- کەمێك بە لای چەپدا بسوورێ و نوێژی خۆت دابەستە

+ یانی بەلای قوونی ئەو هاوڕێیە!

ئێ، دەڵێن خارە خولە کەمێك سووڕاوە، هەردوو دەستی بەرزکردۆتەوە و پاڕاوەتەوە:

خودایە، ئەگەر چاکەی بەندەکانی خۆت دەوێ، دەردێك بە ناو پێشمەرگە وەرکە، وانەکەیت، دەبێ لە سەر قوونی یەکتر بنووین، ئەودەم شۆڕش دەبێتە شۆڕشی زینا.

پاڕانەوەی خارە خولە جێی گرت و بەلاش نەچوو، سەدام حوسێن بە لێبووردن لە دوای لێبووردن دەردی بە ناو پێشمەرگەدا بڵاوکردەوە، دەردێك نزیك لە کۆخەڕەشە، دەردێك پێشمەرگە لە پێشمەرگەی

دەگـرتەوە، رایەخ لە رایەخـی دەگـرتەوە، پێشـمەرگە لەگەڵ تـۆ نـانی دەخوارد، چ لە گۆڕێ نەبوو، لە تەنیشتت دەخەوت، چ لە گـۆڕێ نەبـوو، سـبەی بەئاگادەهـاتی پێشـمەرگە نەمـابوو، کەس بە کەسـی نەدەگـوت دەچـمەوە، تەنهـا کۆشـکی کـرملین و ئەوانەی رایەڵیـان بەوێـوە هەبـوو دەیـانزانی، بەڵام هەبـوو دوو سـێ رۆژێ پـێش بزربـوون، لە سـیمایدا تێکردنەوە و شۆڕبوونەوە دەخوێندرایەوە.

شـێرزاد دوو سـێ رۆژ بـوو لە سـەر سـەر دەسـوورِا، دادەمـا، لە دنیـا دادەبـڕا، جـگەرەی بە جـگەرە پێـدەکرد، کـارۆخ سـێ رۆژ بـوو یەك (میمگـورجی) لە زاری نەهـاتە دەرێ، هەڵـۆ، ئێـوارەکەی دەوروسـوڕی دەدام، دەیویست شتێك بڵێ و دەیگێڕایەوە، هـۆڵی هەراوهۆریـا دەردی بە ناو وەرببوو، بەڵام چۆل نەدەبـوو، نەدەبـوو، باشـە، رۆژ نـیە پێشـمەرگەیەك تێنەکاتەوە، کەچی هـۆڵ هەر پـڕە و جێنـابێتەوە، ئەوە چـیە! شـێرزاد دەڕوا ئازاد دێ، هەڵۆ دەڕوا خەسرۆ دێ، درەنگ پـێکەوتم لە بارەگاکـانیترەوە، لە جێیترەوە پێشمەرگە دەهاتن و چەند شـەوێ دەمـانەوە و شـۆڕدەبوونەوە، نازانم کێ بوو گوتی:

رێی بەغدا لەو هۆڵەوە دەستپێدەکات.

دیارە تەنهـا پێشـمەرگەی کـورد خـۆی رادەسـتدەکردەوە، دەیـانگوت عەرەبی نەدەگـرتەوە، بەڵام لە هـۆڵی هەراوهۆریـا، نـاوە نـاوە پێشـمەرگەی عەرەبیش بزردەبـوو، دەرد بە نـاو ئەوانـیش وەرببـوو، ئەوانـیش بە دزیەوە دەڕۆیشتن، درەنگتر پێکەوتم عەرەبەکـان رووە و رووسـیا سـەرهەڵدەگرن، شێخ شوانیشم لە بیربێ، ئەو کوڕە عیسایيە چاوی تووشی نەخۆشـیەك بـوو، وای لێهـات بەردەمـی خـۆی نەدەدیـت، لە پـڕ بزربـوو، ئۆخەیش دەگـاتە رووسیاو چاوی چاکدەبێتەوە، بەڵام هـایهوو! درەنـگ پـێکەوتم، رووسـیای چـی! نەیاننـاردبوو، ئەویـش خـۆی رادەسـتکردبۆوە، بە بیسـتنی ئەو هەواڵە دنیایەك جوێنم بۆ ئەو بەرپرسـە نـارد کە کـوڕەکەی خـۆی -نـاوێکی وەك ئارامی هەبوو- سێ مانگ نەبوو، هـاتبوو، هێشـتا پێڵاوی شـاری لە پێبـوو،

یەکسەر ناردیانە رووسیا، شێخ شوانیش، فرۆشگایەك پێڵاوی لاستیك و ئەدیداسی لە چیا دڕاند، چاوی لە سەر پێشمەرگایەتی دانا، رەوانەی ناو گورگانیان کردەوە، رۆژێك (هێرش)ێك لە پشت پەنجەرەی کۆشکی کرملینەوە و بە دەنگی بڵند:

کورد بۆ دۆزەخ و عەرەب بۆ بەهەشت.

عەرەبێك پرسی:

- مەبەستت چیە؟

هێرش هێندەی نەمابوو هێرش بباتە سەر کرملین:

+ کورد بەرەو بەغدا غلۆربکەنەوە و عەرەبیش رەوانەی مۆسکۆ بکەن.

پێشمەرگە عەرەبەکە:

- تۆ بێ ئاگایت، لە رێی مۆسکۆ هەر عەرەبێك دوو کوردی لەگەڵە.

نازانم کێ بوو لە کرملین هاتە دەرێ، دەستی هێرشی گرت و لەو دیو سەرشۆرکەکە لە ناو بەفرێ کەمێك راوێچکەیان کرد، ئیدی هێرش ساردبۆوە، ئا لە بیرمنەچێ، کرملین کە ژووری بەرپرسەکانە.

رێبوار ئەو ناوەی لێنابوو، **کرملین** لە یادەوەریی مندا جێیەکی ئەوتۆی نیە، جگە لە دوو سێ وێنەی سپیات شتێکم نیە بۆ نیشاندانەوە: عەسرانێك بەرپرسێکی گەورەی پارتێك هاتە کرملین، لەگەڵ مەلا حەسەن و نازانم کێ دانیشتبوو، ئەودەمە ئەبوو دڵشاد بەرپرسێکی بارەگا بوو، دێتە بیرم نەچوو بەخێرهاتنی بکات، ئێ، دیتم مەلا حەسەن هاتە دەرێ و روو لە ئەبوو دڵشاد:

هاورێ، ئەوانە مێوانن، کەسێك نەهات بڵێ کەرتان بە چەند، چایەك شتێك، خۆ رەنگە بۆ ئێوارەش لێرە بمێننەوە.

ئەبوو دڵشاد پێشمەرگەیەکی راسپارد کە چایەیان بۆ ببات، بەڵام خۆی نەچوو، گوتیان:

ئەگەر بەرپرسیارەتی براکوژی بەش بکەیت، نیوەی لە ئەستۆی ئەو پیاوەیە، گوتیان:

ئەو پیاوە لە شەڕی براکوژی زۆر غەداربووە، ئەبوو دڵشاد کە لە هاوڕێکانی دادەبڕێ، لە ترسی ئەو پیاوە و پێشمەرگەکانی لە دەڤەری لێوژە ماوەیەکی زۆر خۆی لە ژوورێك شاردبۆوە، ئەو پیاوە فەرمانی بە پێشمەرگەکانی دابوو:

پەرێزتان پاك بێ.

واتە هەر نەیارێکت دیت بیکوژە، بۆیە ئەبوو دڵشاد ئامادە نەبووە بەخێرهاتنی بکات.

هەر ئەبوو دڵشاد نا، چ پێشمەرگەیەك خۆشیی لەو سەردانە نەهات، بەڵام بەرپرسەکان زۆر بایەخیان پێدا، وەبیرمدێ ناردیان لە بارەگای سەرێ ئەبوو سەرمەد و سەربەستیان هێنا بۆ شیولێنان، ئەو دووە بەردیان لێبنایە دەخورا، لە بارەگاکەی ئێمەش چەتۆیەک لە برنج لێنان کابان بوو، بانگیانکرد یارمەتیان بدا، بەڵام بە تووڕەییەوە گوتی:

ئێواران نازانم شیو لێنێم.

مەلا جەلالیش کە لە دەو رووبارەکە راوێچکەی دەکرد، گوتی:

لە خشتەی خواردن ئەو ئێوارەیە برنجە سۆرەیە، با مێوانەکانیش هەر ئەوە سندان بکەن.

ئێ دەمەو ئێوارەیە بە ناو پرتە و بۆڵەی پێشمەرگەدا بۆنی گۆشت بارەگاو بارەگا دەڕوات، شیو لە سەر تێکردنە، نازانم کێ بوو لەو لاوە لە لای کرملینەوە بە چەقەنە لێدانەوە هات:

لە خۆمان خەنی! مێوانەکان ڕۆیشتن.

نایەتەوە یادم مێوانەکان بۆچی نانیان نەخوارد، بەڵام دێتە بیرم، چەند پێشمەرگەیەکی لێدەرچێ کەس دەوی لە شیوەکە نەدا، هەموو بە دیار پلاوگۆشتەوە وەرگەڕانە سەر نان و تەحین و دۆشاو.

ڕۆژێك من و کارۆخ لە پشت پەنجەرەی کرملین بە دەم چایە و جگەرەوە خۆمان دابووە هەتاوێ، سەری قسە گەیشتبووەوە منداڵی، گەیشتبووەوە تۆپانێ و کەلایانێ و دارلاستیك و بەردەقانی و هەلیکانێ و

کێلەبەردانێ و غارغارانێ و زۆرانێ، کارۆخم لە منداڵیەوە کەمێک دەناسی، گەڕەکمان هێندە لێکدی دوور نەبوو، من منداڵی بەلاشاوە، ئەو هی باداوە، جوان گەڕابووینەوە منداڵی، زرمەیەک لە ژوورێوە، لە کرملینەوە لە منداڵیی پساندینەوە، کارۆخ یەکسەر گوتی:

- وا بزانم بە خۆڵ کەوت.

+ کووت زانی؟

- لە دەنگیڕا دیار بوو.

دەمانچە بوو، لە دەستی سەلیمە سوور یان کەسێکی وەک ئەو سوور دەرچوو، دەیانگێڕایەوە، پێشمەرگەیەک لە ژووری کرملین لە گژ دەمانچەیە، نازانم خاوێنی دەکاتەوە، گەمەی پێدەکات، چی... سەلیم دەڵێ:

هاوڕێ، قەت لە ناو پێشمەرگە گەمە بە دەمانچە مەکە، بیدە من بۆت خاوێنبکەمەوە.

لێیوەردەگرێت، پاش کەمێک گوللەکە لە دەستی سەلیم دەردەچێ، باشبوو لوولەی لە ئاسمان دەبێ، کەسی نەپێکا، کارۆخ دەیگوت:

مـن بە ناو ئەو هەموو شەڕەدا هاتووم، لە گوللە نەترساوم، بەلام هەمیشە زراوم لە (لەدەستدەرچوون ) چووە.

سەرهاتی دەمانچەکەی کرملینم لەبەر خاتری زیندوو راگرتنی ئەو قسەیەی کارۆخ گێڕایەوە!

حەزم لە سەر بەردی خەیاڵە، بەڵام ئەبوو دڵشاد ئیشی پێمە، بزانم چی لێمدەوێ، تی کردمەوە:

+ دەزانم تۆ خۆت رادەستناکەیتەوە و دەمێنیەوە، بۆیە بۆ خۆت باشترە ببیە ئەندام، خۆشت دەزانی گورباچۆف حزبایەتی ئاسانکردووە و وەک جاران قورس نیە.

- حەزناکەم

+ بە دڵی خۆت.

بیرمکردەوە، باشە بۆچی تاقینەکەمەوە، خۆ ئەگەر ببمە ئەندام، هەندێ شت دەزانم کە ئێستا لێمدەشارنەوە، بزانم چۆن دەبێ، هێشتا هەر پیاسەماندەکرد، گوتم:

- باشە، خۆم تاقیدەکەمەوە.

+ زۆرم پێخۆشە، داوایەك بەرزبکەوە.

- نازانم، چۆن بینووسم؟

فێری کردم، نووسیم و دامێ، وابزانم رۆژی دواتر بوو، ئەبوو دڵشاد گوتی:

+ تۆ ئێستا پاڵێوراوی بۆ ئەندامێتی.

-خێری تێدایە.

بەر لەوەی رێم بە چادرەکەی سەرێ بکەوێ، دەچمەوە لای بەردی خەیاڵ.

**بەردی خەیاڵ** بەردێکە لە دوورەوە لە دیوی بارەگاوە، ئەگەر بەفر نەیگرتبێ، لە زین دەچێ، بەردێکە بەژنی نیو بەژنێ دەبێ، لە ساتی تووڕەبوونی رووبار بەردە خەیاڵ شەپۆلان دەگریتەوە، جاری واش هەیە هێندەی نامێنێ نوقم بێ، بەردی خەیاڵ بە دیوی رووباردا جێی دانیشتنی هەیە، دەڵێی بە تەپشوو بۆ من رێکیان خستووە، زوو زوو دەچم، بە تایبەتی کە رۆژ بە دەرەوەیە، ئەگەر بەفریشی لە سەر بێ، دەیماڵم، پشتم دەدەمە زینەکە و روو لە رووبار، روو لە دارستانەکەی ئەو بەری رووبار دادەنیشم، بە زۆریش شووشەیەکی گەورەی پڕ چام لە تەنیشتە، بەردی خەیاڵ جێی چایەشی هەیە، دڵنیا ناوی لەو شووشەیە نابوو حەفت پیاڵە، ئیدی بە دەم چایە و جگەرەوە، چەند جارێکیش بە مەتارەی شەرابەوە، دەمڕوانیە رووبار، ئەو رووبارەی بە نێوان کەناری بەفردا بە نازەوە نەرمە شەپۆلانی دەدا، دەمڕوانیە دارستانی بەفرگر، من هەمیشە گەڵای سپیم لە گەڵای کەسك لا جوانتر بوو، چ گەڵایەك نازی گەڵای بەفر دەکات! لە بەردی خەیاڵەوە دەڕۆیشتم، خەیاڵ خەیاڵ دەڕۆیشتم، خۆم دەدایە رووبار،

برۆ برۆ، هەر برۆ، زۆر جار تا بن پردی پردێ نەدەوەستام، لەوێوە وەك مراویەکی ماندوو دەهاتمە دەرێ، برۆ لە وشکایی برۆ، تا هەولێر، تا کۆلانی خۆمان ئاوڕم لە کەس لە هیچ جێ نەدەدایەوە، لە سەر بەردی خەیاڵەوە نەدەگەیشتمە کوێ! دنیام دەکرد، بەردی خەیاڵ لە خۆڕا شێوەی زینی نەبوو، بەردی خەیاڵ زینی ئەسپێکی ئەفسانەیی بوو، زۆر کەرەتیش راوی وشەم دەکرد، زۆر کۆپلە زادەی بەردی خەیاڵن، لە بەردی خەیاڵەوە دەگەیشتمەوە کۆنە سەنگەر و بارەگای بە باچوو و کاولە گوند و کانیی کۆنکریتکراو و رووباری تووڕە و پردە دارینەی شکاو و شمشاڵی شوان و رەشماڵی گەرمیانی و کوێستانی، دەگەیشتمەوە برادەرە لە دەستچووەکانم، برادەری کۆن و نوێ.

ئەوەتا سلاح جەوهەر تازە گەیشتۆتە سەری کۆلانی دەلالخانەی هەولێر، هێشتا تەقەی لێنەکراوە، ئەوەتا فازیل رەیحانە، لە سەفینێ گوللەیەکی بەر چۆکی کەوتووە، بەڵام هێشتا خوێنی لە بەر ماوە، ئەوە سەردار تەقەی لە پارێزگار کردووە، ئەوە کۆچەر جارێ هەر دەکوژێ، هەولێر دەستی لە سەر دڵیەتی، هێشتا دوا گوللەی بە خۆیەوە نەناوە، کانەبی گچکە ماویەتی بە داوی شینەوە بێ، سەپان هێشتا لە پێرس ئاودیو نەبووە، ئومێد هەر چاوساغە و بە لای چەپی سینگی گوللەی نەگرتۆتەوە، هێشتا کەس گوێی لە هاواری سیامەند نەبووە، لەمێژنیە جەواد سەرگەردانە، ئارام شاهێن دڵی تریواندی، بیر لە جاشەکانی قاسماغا دەکاتەوە، دەگەمەوە چاربۆت، لە بیرمە لە ماڵێکی پەرگە برنج و ماستم خوارد، لەوێ لە جیاتی شلە ماستیان لەگەڵ برنج دادەنا، ژنەکە هێند چاو تێربوو، چەندت دەخوارد تێرنەدەبووی، پیاوەکە گوتی:

ئەو رێوبانە زۆر ترسناك بووە، بۆسە زۆرە، بن هەر بەردێك سەربازێك، جەحشکێکە.

ئێستا وا لە دۆڵی پلینگانین، تەق، تەق، قەوما، کەوتینە بۆسەوە، نازانم کێ بوو گوتی:

مەترسن، جێمان خراپ نیە.

تەق، تەق، تەقوهۆڕێکە بەرد کاس بووە، درەخت گوێی گرتووە، پۆلا دەڵێ:

دوور کەوتنەوە، دەست بە گوللەوە بگرن.

لە تاریکی دۆڵ بێ خوێن دەرچووین.. لە بەردی خەیاڵەوە رابردووی خۆم چیا چیا دەگەڕێم، ئێستا لە قەدی سەفینم، ئەها سێ گوڵە شلێرە گەش گەش، گوڵ هەیە لە شلێری سەفین گەشترا گوڵێکم قرتاند و بە لوولەی تفەنگەکەمەوە کرد، وا لە بەنەباوێ شۆڕدەبمەوە، گوڵ هەر گەشە، نزیك جادەم، گوڵ هەر گەشە، حەزدەکەم ئێستا کۆستەرێك لە هەولێرەوە بێ، کچێکی جوان لە جامەوە تەماشابکات و شلێری لوولەی تفەنگ ببینێ، رەنگە بڵێ:

ئەو پێشمەرگەیە چەند ئەویندار.

سێ کۆپتەر نەیانهێشت لە چاوەڕوانی کۆستەر بمێنمەوە، لە لای کۆیەوە زگ لە سەر عەرد دەهاتن، لەوێ سووکە شەڕێك لە نێوان عەرد و عاسمان بەرپابوو، بەنەباوێ هاتینەوە هەڵمانکێشە و بمانشارەوە.. .بەردی خەیاڵ دەمباتەوە کوێستانەکانیش، لە کوێستانی گارە و مەتینەوە بۆ کوێستانەکانی قەندیلێ، ئێستا لە سەر گۆماوی بەفراویی بێکۆدیانم، لە دنیایێ لە کوێستان و گەرمیانێ چلەی هاوینە، کەچی لێرە لە بێکۆدیان دیار ئاگر خۆشە، پەنیر و چایە بە دیار ئاگرەوە خۆشە، بایەك هەڵیکردووە دەڵێی لە زستانێوەیە، سێ چوار رەشماڵ تەواوێك دوور لە گۆمی ئاسمانێ هەڵیانداوە، ئا بێکۆدیان کەوتۆتە ئاسمانێ، چایە و پەنیرێکیان داینێ، هەر لەوێ پەنیری وام خواردووە، ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە کوێستان کوێستان دەگەڕێم، پەنیرەکەی رەشماڵی بێکۆدیانم نەدیتەوە، کانەبی گەورە دەڵێتە خانەخوێی بە تەمەنداچوو:

+ وا بزانم ئێرە ساردترین شوێنی قەندیلە.

- ساردترین شوێنی قەندیل و دنیایە.

+ دیارە دنیا زۆر گەڕاوی؟

- کوێستان نیە نەمکردبێ، بە هەر سێ دیودا، دیوی عێراق و ئێران و تورکیا.

+ تۆپ و شت نیە؟

- کەم، ناگاتە ئێرە.

لە هەستاندا تۆپێك گۆماوی بە ئاسمان ئێخست، کردیە ئاوی کەسکوسۆر، ئەوانەی هەولێرین و لە تەمەنی من و گەورەترن، دەزانن بەراوەردەکەم لە چیە، ئێ، خانەخوێ سەری داخست و تەواوێك داما، ئەوجا کەمێك لە ئاسمان راما و بە هێوری گوتی:

تەواو، کۆتاییە، تیری ئەسحابەش نەگەیشتبووە ئێرە، بەڵام دیارە سەدام دەیگاتێ.

بەردی خەیاڵ هەڵمدەداتەوە زرارەتیان، لە دەو ئەو رووبارەم کە دەیانگوت شێخ نازانم توڕابە کێیە، ئەها گۆڕەکەی لە سەر ئەو بەرزاییەیە، دەستنوێژی لە سەر هەڵگرتووە، بۆیە ئاوەکەی یەکاویەکە بۆ چاویەشە، ئێستا لە سەر رووباری شێخ لە بن دار بیەك بە ئاگری بێ دووکەڵ خەریکی چایە لێنانین، ئاگرکردنەوەی بێ دووکەڵ هەر لە دەستی پێشمەرگە دێ، من ئەو ئاگرکردنەوەیە لە مام رەسوولی بناوێ فێربووم، دەیگوت:

فێربە، هەتا کۆپتەر مابێ، هەتا جاش و سەرباز مابن، بۆ پێشمەرگە ئاگری بێ دووکەڵ وەك پێڵاو پێویستە.

لە بن سێبەری بی، بە دیار رووباری موتفەڕکەوە، لە بنە مەتارە چایەمان بە وردکە نانەوە خواردەوە، بەڵام کۆپتەر هەر پێیزانی، چەند پەلە ئاسنێکی خستە رووبارەوە، چەند دەسڕێژێکیش لە رووبارەوە رووە و کۆپتەر، دیار بوو وەختەکەی ناوەخت بوو، شەڕی عەرد و ئاسمان درێژەی نەکێشا.

ئای بەردی خەیاڵ چ لە من دەکەیت، لە رابردووم هەڵدەکێشیت و

دامـدەچۆڕێنی و رامدەوەشـێنی و لە ئێسـتام هەڵـدەخەیتەوە، ئـای بەردی خەیاڵ پیاوێکی چەند بێ ئایندەم، کارۆخ بانگدەکات:

وەرە تەنوورەکە ئامادەیە، نان ببرژێنە.

دەبێ بچم، تا نەچوومە، لە بیرمەچێ کوڕێك زمنـاکۆی نـاوبوو، نـاوی لەو بەردە نا (بەردی خەیاڵ)، منی چەند جارێ لەوێ دیتبوو، گوتبووی:

ئەو جێیە جوانترین جێیە بۆ هەڵدانی خەیاڵ، ئەو بەردە لە هەموو بەردان جیایە، بەردێکە بۆ خەیاڵ.

ئێرە **بێرایی مەمکانە**، بە سەر بانی هۆدەی شەراب و هۆڵی هەراو هۆریا و کۆشکی کرملین کە بە سەر یەکەوەن، دەڕوانێ، جێیەکەی بڵنـدە، تەنهـا چادری هەناسەتەنگی لەو بڵندترە، بێرایـی مەمکـان لە گەوەیەکە، بـانەکەی لە پشتەوە لە سەر خۆڵی هەڵکۆڵراو و رنـراو راوەسـتایە، پێشـەوەی لە سـەر دوو کۆڵەکەی هێندەی ناو قەدی بـاریکی کـچ، کە سـێ شـەقاوی پیـاوانە لێـك دوورن، تەنیشـتەکانی بە بەردی گەورە، هیشـکەکەڵەك هەڵچنـراوە، بانەکە بڵندە لە هەموو ژوورەکان بڵندتر، بان نیو چۆکە خۆڵی لە سەرە، بن بـانەکە بە تەنەکە داپۆشـراوە، ئەگەر ئـاگری تەنـوورەکە بەژنێکـیش بە ئاسـماندا بچـێ، مەترسـی نـیە، لە بێرایـی مەمکـانەوە دارسـتانی ئەو بەری رووبـارەکە، دارسـتانە بەفرگـرەکە جـوان دیـارە، لە سـاتی بەفربـارینێ دنیـا جوانیەك دەڕژێنێتە چاوتەوە، بڵێسەی ئەنفالیش نـاپڕووکێنێ، هـی ئەوەیە بە دیار ئاگری تەندوورەوە چاو لە دارستان ببڕی و ببینی، چنار، بی، هەنجیر، تووترك، چۆن گوڵی بەفر دەگرن، لە بێرایی مەمکانەوە دۆڵی نـاوزەنگی لە بەفر، لە کراسی سپی راکشاودا نازدار دیارە، مامەندەی بە پێوە راوەسـتاوی بە هەوردا چوو حەیران دیـارە، لە بێرایـی مەمکـانەوە ئەگەر کەمێـك سـەر دانوێنی، شەڕی ئەو چۆلەکانە دەبینی کە لە بـن گوێسـوانەی ئەو بێـراییەی کە بە سـەر هەر سـێ دەرگـای شـەراب و گـاگەل و کـرملینەوە، دەڵێـی کلاوی هاوینیە، جوانە، شەڕ یان گەمەی بە کۆمەڵی چۆلەکە گـافێ دەبـنە تـۆپەڵ و گـافێ پەرتـدەبنەوە، ئەو سـاتانەی زریـان بردوومـی، یـان

سەهەڵبەندان هەناسەی گرتووم، یان لە ئێشکگری بوومەتە چلوورە، نەبێ، دەنا لە بیرم نیە لە بەفر بێزاربووبم، هەمیشە چێژم لە بەفر وەرگرتووە، دەمگوتە کارۆخ:

تەماشاکە، بەفر دایکرد، گوێ لە دەنگی نەرمی بەفر بگرە.

کارۆخ کەمێك (میم گورجی)ی کزدەکرد و دەیگوت:

هەناسەی میمگورجی لە دەنگی بەفر خۆشترە.

دەمگوتە کارۆخ:

تەماشای دارستان بکە، خەریکە گوڵی بەفر دەگرێ.

کارۆخ هەناسەیەك دەدا:

چیت لە گوڵی بەفر دەوێ، تەماشای ئەو مەمکانە بکە، دە دەستیان بدێ.

لە مەمکان وردەبوومەوە، پەنجەم دەگەیاندنێ، ئەنگوتکەکانی بن پەڕۆکە سپیەکە زۆر لە مەمك دەچوون، کارۆخ ناوە ناوە لە سەر سوخمەی سپیەوە، دەستی دەگەیاندە دوو ئەنگوتکی تەنیشت یەکتر و شێوەی مەمکی دەدانێ، دەبوونە مەمك، کارۆخ لە درووستکردنی مەمك دەسترەنگین بوو، ئەنگوتکی بە ئەنگوتکی نەدەهێشتەوە، هەمووی دەکردنە مەمك، مەمکی قیت، مەمکی کەمێك داچۆڕاو، مەمکی هەمە شێوە، کارۆخ ناندینەکەی پردەکرد لە مەمك و پڕیدەکرد لە ((جووتە مەمکەکەت کۆتری فەرەنجی))، کارۆخ هێند جوان لە ئەنگوتك مەمکی درووستدەکرد، منیشی کردە هۆگری ئەنگوتك و ناویشم لە ناندینەکە نا بێرایی مەمکان، لە بیریشم نەچێ، هەر لەو سەروبەندە لە سەردانێکدا لەگەڵ کارۆخ رێمان کەوتە کۆلانێکی شاری شنۆ، کارۆخ گوتی:

ئاوڕبدەوە، ئەها ئەو هەموو ئەنگوتکە.

ئاوڕمدایەوە، چوار پێنج کچی تازە هەڵچووی سینە دەرپەڕیو راوەستابوون، ئای، مەمکی ئەو کچانە چەند لە ئەنگوتکی بێرایی مەمکان دەچوون، حەزمدەکرد لێرەوە کارۆخ بەجێبێلم نەگەڕێمەوە لای، بەڵام،

حەیف و مخابن! دواتر زۆر دواتر، بێرایی مەمکان کەوتبووە ڕیچکە نادیارەکانی یادەوەری، ڕۆژێك جێیێکی پڕ، لە شەڕ دەگەڕێنەوە، کارۆخیان تێدایە، دیارە تەقەی سەرکەوتن و خۆشی دەکەن، لوولەی تفەنگێك هەڵە دەکات، هاوڕێیەکی کارۆخ لە دەستی دەردەچێ، کارۆخ ساردەبێتەوە، حەفتەیەك پێش مەرگ، چوومە سەرتاشخانەکەی کارۆخ، وەك جاران، میم گورجی دەگوتەوە، بێرایی مەمکانیشمان یادکردەوە، ئێستاش کە لە ماڵێ یان لە نانەواخانە ئەنگوتك دەبینم، کارۆخ و بێرایی مەمکانم بیردەکەوێتەوە و لە بەر خۆمەوە گۆرانیەکە دەڵێمەوە.

ئەوشەو ڕێم بە چادرەکە دەکەوێ، بەرلەوەی بچم سەرێك لە **کۆشکی سپی** دەدەم، دوو گابەردی گەورە لە نزیك رووبارەکە بەلای پردەکەوە، دەڵێی بە دەست لەوێ داندراون، نەخشەی مام خدر و مام عەلیش با هەر بەو شێوەیان دادەمەزراند، نێوان دوو بەرد جێی هێسترە رەشی لێدەبێتەوە، بە راوەستان و پالکەوتنەوە، بەلام ئەگەر بیەوێ بسووڕێتەوە و روو لە رووبار بکات، دەبێت بە دیوی بارەگادا بێتە دەرێ، ئەوجا بچێتەوە ژوورێ، هەر وەك من، ئەدی منیش ئەگەر بمەوێ تەنیشتان بگۆڕم، دەبێ هەستمەوە و درێژبیمەوە، بە سەر دوو گابەرددا چادرێکی سپی لە رەنگی بەفر شۆڕ بۆتەوە، لە بنەوە بەچەند دارێك چادر لە شێوەی قووچەکە و هێندە بەفر ناگرێ، مەترسی تەپینی لێبکرێ، لەگەڵ ئەوەش جاروبار بەفرماڵەکە دەگاتە ئەوێش، من زۆر ئیرەیی بە ماڵی هێستر دەبەم، زۆر جار دەمگوت:

ئەگەر لەگەڵم بگۆڕێتەوە، دوو تەنەکە جۆی لە سەر دەدەمەوە.

هێستر بۆ خۆی تەنیا بوو، دوور بوو لە هەراوهۆریای کرملین و هۆدەی شەراب و هۆڵی هەراوهۆریا و خەستەخانەی مۆسکۆ و چادرەکە، ژوورەکانیدی لە ساتی بەفربارینێ سپی بوون، بەلام ماڵی هێستر بە هەمیشەیی سپی بوو، ئەرێ کێ بوو ناوی لە ماڵی هێستر نا کۆشکی سپی؟! هێشتا زووە، سەرێك لە سەرشۆرکی ساماڵیش دەدەمەوە ئەوجا دەچمە چادرەکە.

سەرشۆرکەکە کەوتبووە دەو ئەو ڕێیەی دۆڵ و ڕووباری دەگەیاندەوە چیا، نۆکانی خوارێ و بە نۆکانی سەرێ دەبەستەوە، باریکە ڕێیەکیشی بۆماڵی پاسۆک لێدەبۆوە، جارێك بۆ سەردانی هەردی، هەردیی خوداوەندی رازی تەنیایی، ئەو باریکە ڕێیەم گرتە بەر، لە ماڵ نەبوو، سەرشۆرك روو لە بارەگا پشت لە ڕێ، لە دیوی ڕێیەکەش ئاگر دەدرا کە ئاگردانەکەی بە جارێك بارەدارێکی گەورەی دەگرت، سەرشۆرك بە بەرنەدەکەوت، گەرماوی گەورەی ورمێش بەو هەموو پێشمەرگەیە راناگات، نای ئەو سەرشۆرکە داربەڕووی سووتاندووە، بەڕووی بە چیاوە نەهێشت، پایزەکەی چیایەك کۆلکەدار لە بارەگا هەڵدرابۆوە، لە دوورەوە چیای دارین دیار بوو، گوندیەك کە چاوی بە چیای دارین کەوتبوو، گوتبوویە مام بایز:

باشتان داکوتاوە، دەڵێی بە تەمان حەفت ساڵ لێرە بمێننەوە.

مام بایز گوتبووی:

جارێ، هەر بایی حەفتە دارمان کێشاوە.

سەرشۆرکی ساماڵ بێ ئاگر نەبووە، نیوە بەرمیلێك کە نیوەی کەوتۆتە ناو دیوار هەمیشە مێرووله دەکات، سۆندەیەك کە لە کانیەکەی سەرەوە هاتبوو، سەری بە شێرەوە لە ناو سەرشۆرك بوو، بنە بەرمیلێك بۆ گەرم و سارد، تەشتێك بۆ جلك شووشتن، جامێکی قوپاو، دیواری سەرشۆرك، لای ئاگر تەنەکەڕێژ، ئەوانیتر نایلۆن، عەردەکەی چەند تاتەبەردێك لە بن نایلۆنێکی ئەستوور، لە لای دەرگاوەش، لامپایەك بە دیوارەوە، سەرشۆرك تەنگ نیە، جێی خۆشووشتن و جلك شووشتنی لێدەبێتەوە، جێی خۆگۆڕینیش جێی خۆ سووڕانەوە و خۆگۆڕینی لێدەبێتەوە، هەتا لە غەسان کەرتکە سابوونێك، گۆلمە تایتێك وەردەگریت، دێتە سەرت بە گلەسوورەی بن دیواری بێرایی مەمکان خۆت بشۆیت، ڕۆژێك پێشمەرگەیەك تووڕە بوو:

+ئۆندە تایتە چیە! لە قوونم بکەم کەفێ ناکات.

- نیە، هاوڕێ، بە خودای نیە.

+ گوو بە تایبەت، دەچم بە گوو جلکەکانم دەشۆم.

من جارێك وام کرد، بە گوو نا، بە گڵ سەرم شووشت، لە سابوون پتر کەفی کرد، ئەرێ وەختایەك بارەگا جۆرە سابوونێکی هەبوو، هەرچیت دەکرد، کەفی نەدەکرد، چەتۆ سەحەر دەیگوت:

تفی لێدەن، ئەو سابوونە بە ئاو نا، بە تف کەفێ دەکات.

ئاوەڕۆی سەرشۆرك لە خوارەوە لە رووباری دەکردەوە، خارە خولە و زەردە بە ناو بەفرێدا جۆگەیەکیان بۆ هەڵبەستبوو، جۆگەیەکی هەمیشە کەفاوی، دێتە بیرم، بەفر لە هەندێ جێ رەشبۆتەوە، دنیا هەتاوە، خارە خولە خاکەناسی لە دەستەو لە گژ جۆگەی کەفاویە، چەتۆ لە پشت سەرشۆرکەکە بەلای رێیە باریکەکە، لە دەو رووبارەکە راوێچکە دەکات، سێ چوار ژن لە رێی سەرێ، نۆکانی سەرێ، بە پشتێنی شلەوە شل و مل دێتەخوارێ، دیارە نیازیان خەستەخانەی مۆسکۆیە، گوێم لێیە، خارە خولە دەڵێتە چەتۆ:

+ هاوڕێ، بەو ژنانە بڵێ بە لای جۆگەکەدا نەڕۆن.

- لۆ! سامالْ فاقی داناوەتەوە؟

+ نا، تۆ نابینی! هەر ژنێك بە لای ئەو جۆگەیە تێپەڕێ، ئاوس دەبێ.

-پێشمەرگە ئەوها بەکارە؟

+ بڕوات بێ، لێرەوە، لەو جێگەیەی ئەو جۆگەیە لە رووبار دەکاتەوە، تا لای سونێ هەر ژنێك بە ئاوی ئەو رووبارە تاراتبکات، ئاوس دەبێ.

- باوەڕدەکەم، زەردە و سامالْمان زۆرە.

زەردە کوڕێك بوو، وەك دەیانگوت، هەمیشە هەرامەکەی لە سەر دەستی بوو، ئەوە نەبوو گوتبووی:

ژنێکم بۆ دەبیننەوە باشە، دەنا لە بنەوە دەیبڕم و لە پێشتان دادەنێم.

سامالێش ئەوکوڕەی هەقی نەبوو شەوە رۆژە، بەفرە بارانە، هەورە سامالە، پێیەکی هەر لە دەرگای سەرشۆرك بوو، لە کەلێنەکانەوە، ئەوە نیە،

پێشمەرگەیەك كە لە خۆشووشتن دەبێتەوە، تا دەچێ پێشمەرگەی دوای خۆی بۆ سەرشۆرك بانگدەكات، لەو كەلێنەوە سامال خۆی بە سەرشۆركدا دەكرد و هیچ نەبا ئاوێكی بە سەریدا دەكرد، سامال رۆژانە چەند جار دەچووە سەرشۆرك، بەڵام لە جێی كەسیش نەدەچوو، كەسی لە سەرشۆرك بینەری نەدەكرد، سامال گوایە ئەگەر زوو زوو سەری نەشوات، خورشتی دێتێ، هەر لەوەشەوە بوو، سەرشۆرك بووە سەرشۆركی سامال.

چەندی خۆم گنخاند، كەلكی نیە، چادر چاوەڕێیە و ناچارم بچم، ئێوارە دوای نان لە سەر چایە هەواڵیان دامێ كە ئەوشەو لە چادرەكە كۆبوونەوەیە، كۆبۆنەوەی حزبی، ئێ، لە كاتی دیاریكراو بە نابەدڵی بە هەورازەكە، بە تەنیشت بێرایی مەمكان سەركەوتم، چادر هەر جێی سێ چوار كەسە، كەچی حەفت كەسی لە خۆی دانیشاندووە، چادر لایەكی دیوارە، سۆبەیەكی گچكە، گچكەتر لە سۆبەی ژوورەكانیتر، لە نزیك دەرگا بەلای دیوارەكەوە نیلەنێلیەتی، لوولەی سۆبە جیا لە لوولەی هەموو سۆبەكان لە دیوارەوە چۆتە دەرێ، لامپایەك لە ناوەندێ لە سەر قوتەدارێك دانراوە، ئێ، ئێرە كۆبوونەوەیە، یان كابرای بەلاشاوەیی گۆتەنی (حیزباوە)یە، ئەوجا ئەو كابرایە ئەو وشەیەی بە دوو جار گۆدەكرد (حیز ، باو) بەڵام من هەردوو بەشەكە بە یەكەوە گۆدەكەم وەك بەلاشاوە، مەمكاوە، باشە، ئێرە ئەو چادرە، حزباوەیە، حزب قسەدەكات، هەر بڕیارێك لێرە دەرچێ، بڕیاری حزبە، لێرە ریاز حزبە، هەرچی ئەو دەیڵێ قسەی حزبە، من لە خولەكەكانی بەرایی كۆبوونەوەكەوە تێگەیشتم لە حزباوەم، ریاز دەستی بە قسان كرد، كەسێك قسەدەكات و شەش كەس وەك بەرد دانیشتوون، قسەی لە (ئێستا، رابردوو، ئاینده) كرد، زۆری گوت، هەرگیز ریازم نەدیتووە، هێندە قسان بكات، نازانم كەس هەستیپێكرد یان نا، من هەر زوو تووشی كەمێك هەناسەتەنگی هاتم، سات دوای ساتیش تەنگیەكە تەنگتر دەبوو، بەڵام نەدەگەیشتە ئەو تەنگیەی كە تەنگمپێهەڵچنێ و لە چادرەكە دەرمپەڕێنێ، باس لە رابردووی پڕ

سەروەری کرا کە تا نەنووسریتەوە، خەڵك بە گەورەیی حزب ئاشنا نابێت، باســی خۆڕادەســتکردنەوە کــرا، کە زۆر هــاوڕێ بەرگەیــان نەگــرت و رووخــان، لە کــاروان دابــڕان، باســی ئەوە کــرا کە ئاینــدە هەر بــۆ کۆمۆنیستەکانە، زۆر شت گوترا، دوای لێبوونەوەی ریــاز، شــەش کەس بە نۆرە هاتنە قسە، منیش کە پاڵێورام بۆ ئەندامبوون، وەك ئەندام مافی قســە و گفتوگۆم هەیە، لە بیرنەکەم، هــاوڕێیەك پێنــووس و کــاخەزی بە دەســتەوە، دیارە سەرە قسەی قسەکان دەنووسێتەوە، تا دێ هەناسەم تەنگتــر دەبــێ، لە بیرمە یەکێك لە چەتۆیەکان، گوتی:

ئەو پێشـــمەرگانەی چـــوونەوە، حـــزب نـــاردنیەوە، راینەگـــرتن، نەیحەواندنەوە، بۆچی دەبێ بیانخەینە خانەی رووخاوەوە؟

ئــای، ئەوە چــی دەڵــێ! دەڵێــی قســە لە قســەی حــزب دەکــات! کۆمۆنیســتێکیدی پێچەوانەی وی قســەیکرد، دێتە بیــرم منــیش شــەکرێکم شکاند:

باشــە بــۆچی حــزب بە وردی رابــردووی خــۆی نانووســێتەوە، تــا سەروەریەکان بزرنەبن؟

زۆر گوترا، پرسیار زۆر کرا، حەیف هیچ وەڵامێکم لە یاد نەماوە، دەنــا شــتێکم دەگێــڕایەوە، بەڵام لە بــارەی نووســینەوەی دیــرۆك، دێــتە بیــرم (زینە)یەك هەبوو، ئەو ژنە وەك دەیانگوت هەموو مێژووی حزبــی ئەزبەرە، جارێك لە دەفەری گارە، لە دانیشتنێکی ئاسایی گوتی:

نایشارینەوە، حزب لە رابردوو هەڵەی زۆری کــردووە، ئەگەر دیرۆکــی خــۆی بنووســێتەوە، دەبــێ پــێ لە هەڵەکــانی خــۆی بنــێ، ئەوەش گــران دەکەوێت، چوونکێ کەسێك کە دەیخوێنێتەوە، دەیبیستێ، دەپرسێ:

هەڵەیەك، دوو، ســێ، دە، قەینــا، ئەو هەمــوو هەڵەیە بــۆچی؟! کە ئەو هەموو هەڵەیەی حزبی لە زمانی حزبەوە بیست، ئیدی ئامادە نیە بێتە ریزی حزبی پڕ لە هەڵەوە.

لە کۆبوونەوەکەی حزبــاوە ئەو قســەیەی زینــەم بیــرکەوتەوە، ویســتم لە

شـێوەی پرسـیار بـیخەمە روو، پەشـیمانبوومەوە، ئـێ، چـایە لە سـەرە، کۆبوونەوە لە کۆتاییە، هەناسەتەنگیم پتر دەبـێ، ویستیان چـایە دێمـکەن، پێشمەرگەیەك بە پرتاو قۆریەی چای هەڵگرت و هەڵیدایە دەرەوە:

+ چ بوو؟ ئەوە چ بوو؟

+ چ نیە، نا.

+ وەڵا مشك...

تومەز لە ناو تۆچایەکە مشك تۆپیوە، نەیدیتووە لە قۆریەکەی کـردووە، هەناسەم تەنگتربوو، ئـۆخەیش کۆبـوونەوە تەواو بـوو، لە چـادرەکە هـاتینە دەرێ، هەتا دوو سێ رۆژ چایەم نەخواردەوە، هەناسەتەنگیشـم مـاوە، سـێ رۆژ رانەبرد، دەستەیەك پێشمەرگە نێردرانە بارەگای گۆڕەشێر، من لەگەڵم، پێمخـــۆش بـــوو، لە چـــادری هەناســـەتەنگی دوورکەوتـــمەوە، بەڵام هەناسەتەنگی لێمنەبۆتەوە، ئێرە گۆڕەشـێری بـن تیچاوی جاسووسـانە، هەر چوار وەرز لە گوندە جوانەکانی کوردسـتانە، گۆڕەشـێریش هەر کەوتـۆتە دۆڵی جەنگاوەرە دۆڕاوەکانەوە، ئێ، نازانم چەندی پێچوو، حەفتەیەك، پتر، نەگەیشتە مانگێك، ئێوارەیەك لە سەر نانخواردنێ، کادرێك گوتی:

ئێوارە کۆبوونەوەی حزبیمان هەیە.

ئێی، خۆ لەبیریانەچۆتەوە، من پاڵێوراوم، هیچم نەگـوت، لە بیـرم بـێ، هەناسەتەنگی وازی لێنەهێناوم، لە کاتی دیاریکراو نەچووم، جغارەخۆرێـك دووان، تێپەڕی، نەچووم، دیتم پێشمەرگەیەك هات:

+ هاورێ، چاوەڕێتن، برۆ.

- پێیانبڵێ، نایەمە کۆبوونەوە.

+ بە راست؟

- بە راست.

بۆ سبەی، زۆر هەوڵیان لەگەڵم دا، پەشیمان ببمەوە، پەشـیمانەبوومەوە، چوومە کەلی شەیتان و نەهاتمەوە خوارەوە، ناچار گوتیان:

+ بەڵام وازهێنان ئەوهـا نـابێ، دەبـێ بە نووسـین بـێ و بـۆ سـەرەوەی بەرزبکەیتەوە.

- باشه دەنووسم.

ئەریٚ وازهێنان چۆن دەنووسریٚ؟ پرسیارم لە خۆم دەکرد، وەڵامی خۆم دەدایەوە: ما وازهێنان چیە، بنووسە وازم هێنا و ناو بێنە و دەستت بشۆ، پەڕە کاخەزێکم هێنا، چی بنووسم، وازهێنانێکی چەتۆ سەحەرم بیرکەوتەوە، چەند جارێك بۆی گێڕابوومەوە، ئەزبەرم کردبوو، بە عەرەبی بوو، سەحەر دەیگێڕایەوە:

رۆژێك خراپ لە حزب تووڕە بووم، یەکسەر نووسیم: (لقد استقلت......) ویستم بەرزیبکەمەوە، پەشیمانیانکردمەوە.

من با بینووسم، کیٚ هەیە بتوانیٚ پەشیمانمبکاتەوە! باش بوو وازهێنانەکەی چەتۆ وەك کلێشە بەکەڵکم هات، نیو لاپەڕەی لاپەڕەیەکی گچکەم بە خەتی درشت پڕکردەوە، رستەیەکم ئێستاش لە بیرە:

من کەڵکی حزبایەتیم نیە، بەڵام وەك پێشمەرگەیەك دەمێنمەوە.

ئیدی لە دوای ناردنی نامەکە هەناسە تەنگیم نەما، تا نووسینی نامەکە هەستمدەکرد، چادرەکە لە سەر سینگم هەڵدراوە، دەست و پێم بە سنگەکانیەوە داکوتراوە، هەر لەبەر هەندێش ئەو سەرهاتە، سەرهاتەکانی زستانی نۆکان ناونشانی (چادرێك لە سەر سینگم هەڵدراوە)ی هەڵبژارد.

## سورخیو
## دڵۆپە شیعریەکانی دۆڵی دۆڕان

جیایی من لە جەنگاوەرانیدی تەنێ شمشماڵێ بوو، شمشماڵێك و چیدی نا، شمشاڵ دەتگوت شۆڕشڤانێکی بەردەستکەوتووی رووخاوە، هەرچی هەیبوو دەیگوت‌و خۆی بەتاڵدەکردەوە لە نهێنی، ئەو نهێنیانەی سەردەمانێ جادوو بوون‌و نەدەبوو بکرێتەوەو نەدەکرانەوە، ئەو ئاوازانەی نەدەبوو بگەنە گوێی هەموو کەسێ، شمشاڵ پڕ بە گەرووی دەیژەندن، شمشاڵ جۆگەلەیەکی تیژبوو لە گوتن، دەڕژایە سەر ئەو پێدەشتانەی بێدەنگیەوە کە کەس نەیدەزانی چیان لێ شیندەبێت.. شمشاڵی جیایی ئەو شمشاڵە بوو سەردەمانێ لە وەرزەکانی دۆڵێکدا ناسنامەیەك بوو، وێنەی منی پێوەبوو.

**تێرە دۆڵی جەنگاوەرە دۆڕاوەکانە**
**ئەو جەنگاوەرە دۆڕاوانەی هێند بێ زاخن**
**دۆڕاوی لەبن سمێڵ دەشارنەوەو گوێ ناکەن**
**لەم نسێ هەمیشە ئاودارە**
**دەشێ لە شوێنپێ هەرەسی هەتاو بنووسرێتەوە**
**جوانیی مرۆڤ تەپ‌و تۆزەو دەتەکێ**
**دەتەکێ‌و لەگەڵ پیسایی پاسدارانداا بە ئاودا دەچێ**
**ئەوەی هەبوو بەسەرچوو جگە لە رووقایمی**
**تفەنگەکەت بێنە**
**ئەی جەنگاوەری لە جوانیی بەتاڵ**
**بیدە دەست شوانە تاقانەکەی سروشت**
**بۆ خۆی دەیکاتە شمشاڵ.**

(شمشال لە سپێدەدا)

بەدیوی گۆڕەشێر و لەبن تیچاوی جاسووسان، بەرانبەر شێنێی هەمیشە شۆڕەژن، شێنێی هەمیشە خوشك، خوشكی جمكی گۆڕەشێر، لە سێبەری درەختێكی لە ئەنفال رزگاربووی كەمێك بەهاری، پشتم دابووە تیشە بەردێكی پڕ جوولەی شاراوە، تیشە بەردێ، لە چەند جێوە جێ تیری ئەنفالی پێوە دیاربوو، بەدیار مەتارەیەك شەرابەوە، پڕ بە گەرووی دۆڵا بە شمشاڵا كۆستم دەژەند، دەمێك بوو بێ ئاگاییو هەر لە خۆوە تفەنگەكەم شێوەی شمشاڵی گرتبوو، لە پەنجەیەكەوە گۆڕابوو بۆ شەش پەنجە و ئاوازی دۆڕانم بۆ جەنگاوەرە دۆڕاوەكان دەخوێند، ئەو جەنگاوەرانەی هێندە لەگەڵ بەرد خەوتبوون، مێشكیان تەژی بوو لە تەلەزمە بەرد، من خووم بە دۆڕانەوە گرتبوو، پەنجەكانم جوان لەگەڵ ژەنینی ئاوازی دۆڕان دەهاتنەوە.

ئاوازی دۆڕان لە كچە مەلایەك فێربووم، بەڵام چەندی كردم وەك خوێندنەكەی ئەو بیخوێنم، نەمتوانی، لە گەرمەی "ئایەتی كورد" لە بزنەرێیەك بەدیداری مەلاو كچە مەلا شادبووم، مەلا هەمیشە بە كێشو سەروا، فەرموودەكانی خۆی دەردەبڕی، مەلا سەد فەرزە بانگی دەدا، بانگدانێكی جیا لە هی ناو كودیو دەرەوەی كودی، تا بزنە رێیەكەمان بە هێسترەڕێ كردەوە،حەوت جار بانگیدا:

**لە دوای چەند كەڕەت:**

**خودای گەورە خودای گەورە**

**ئەم وڵاتە هەر خوێنو هەورە**

دەیگوت:

**لە قورئان یەك هەڵە هەیە**

**ئەویش زۆر زۆر گچكەو وردە**

**بۆچی فەرمووت ئایەتی ئەنفال**

**هەو نیە ئەوە ئایەتی (كورد)ە**

سەرهاتی كچە مەلا پڕ كێشەو سەر ئێشەیە بە من نانووسرێتەوە، مەگەر

ئەو رووبــارە بیگێــڕێتەوە کە وا بــزانم لە ڕۆخیــدا لەگەڵ بــاوکە لە خــوا تۆراوەکەیدا بە ئایەتی کورد شادبوون...

لە بن درەختە ژنانیەکە قومێکم لە شـەرابی ڕێبـواری دەدا و فـووێکم دەکردە شەماڵەوە، فووێکم دەکردە شمشـاڵەوە، فـووێکی درێـژ درێژتـر لە ســاتەکانی پــێش مەســتبوون، نــامەیەك قــومی پێقلّبکــردمەوە و فــووی پێفووتدامەوە، پارچە کاخەزێك بەقەد نـاو لەپ، پەڕە گـوڵێکی زینـدوو بە تەنیشت پەپوولەیەکی مردووەوە، لە شێوەی وێنەی مانـگ لە پـایزە شـەوی چیادا، ئەم پیتانەش (خ و ر س ی) وەك ئەستێرە دەوریان دابوو.

ئاشنایەتیم لەگەڵ نامەی وادا نەبوو، لێکـدانی پیتەکـان خسـتمیانە تەمـی گومانەوە، لە نێوان سیخوڕ و سورخی چاوم دەگێڕا، تا تریفەی بیرهـاتنەوە، (سورخی)ی لە تەم ڕەوانـدەوە، نەمدەناسـی لـێ هەنـدێ سـەرهاتی ناسـکە ڕێواسیم لە بـارەیەوە، بە خـوێی باسـکردنەوە تـامکردبوو، هەر لەوێ بـۆیم نووسیەوە:

کوڕی گوڵ چۆن دەستت چووە گیانی پەپوولە؟!

لە بینـین‌و ناوهێنـانی گـوڵ‌و پەپـوولە گۆنـای هەمیشـە سـوور و چـاوی هەمیشە خەواڵووی کـچە گونـدیەکەم بیـرکەوتەوە، ئەو کـچەی بە بـۆنەی ئەوەوە ئاسمانی گوندم پڕکردبـوو لە چۆلەکەی ئـاواز، گونـد بە (مەریەم) دەخەوت‌و بە (ئامان) بەئاگادەهاتەوە.

گوڵ لە وشەوە کەی لە گوڵ دەکا
هەزار وشەی گوڵ
نە بۆنی پەڕەیەك گوڵ دەدەن‌و
نە جوانی پەڕەیەك گوڵیان پێیە..
مردنی پەپوولەش ئەو ساتەیە
کە باڵەکانی بە وشە دەبەسترێن‌و
دەخرێنە ناو ڕستەی بێ باڵەوە
شمشاڵ لە ئێوارەدا

نامەکەی سورخی نیازی دیداری کچەی پڕ نیازتر کرد، بەدەم شمشاڵ لێدانەوە، بە رووبارێك نیازەوە بەرەو گوند، مەستانە گەڕامەوە، هەرای پیرەمێردێ پێشی دیداری پێگرتمو رووباری نیازی قوڕاوی کرد:

- بە نەفرەت بن.. شاخ و داختان رووتکردەوە، هەرچی درەختی خوا هەیە بڕیتانەوە، چ جیاوازیتان هەیە لەگەڵ ئەرتەش!

+ بڕینەوەی ئەرتەش بۆ سڕینەوەیە هی پێشمەرگە بۆ گەرمبوونەوە.

- لە هەردوو لا هەر سووتانە و دەیسووتێنن.

+ئەرتەش بە پێوە دەیسووتێنێ! پێشمەرگە بە پاڵکەوتنەوە!

بە پێکەنینەوە:

- واز لەمە بێنە شمشاڵ لێدە.

دەنگی خۆش بوو، مامڵێی هەموو لەبەر بوو، لەسەر داخوازیی من گۆرانیی (مریەم سابڵاخی)ی چڕی، منیش لەگەڵیدا بە شمشاڵ، لەم ئانوساتەی حالگرتنەدا، کچ لەسەر کانی دەهاتەوە، دەتگوت شۆڕەبیەو رێدەکا، نازانم وابوو یا نا، لە چاوی منەوە لەنجەولاری رێك لەگەڵ مریەمەکەی ئێمەدا دەهاتەوە..

هاوینەکەی گۆڕەشێر فێنکترین هاوین بوو، ساڵ قەت هاوینی وای بە خۆیەوە نەدیوە، هەر کەسەو بە جۆرێ لە بارەی ئەو فێنکیەوە قسەی دەکرد، من لەو هاوینەدا یەك حەفتە هەستم بە گەرمایەکی تووش کرد، ئەو حەفتەیەش هەر ئەو حەفتەیە بوو کە کچە شمشاڵیەکە سەفەری کردبوو، کە هاتەوە هاوین وەك خۆی فێنك بۆوە..

هاوینە، لە سێبەری تەژی لە گلۆپی هەتاویی دەمەو هاوینی کەپرێ، کەپر لە تەلانێکی لە ژیان سەختتر پشتی دابووە تیشە بەردێکی لە تەلان تووڕەو بەسەر هەڵدێری مەرگدا دەیڕوانی، دەمی عەسرە چابوو، بەدیار پەرداخێکی بیرەیی پڕ چایە، لەناو چڕە دووکەڵی جگەرەی بەیەك ئاگری هەمیشە داگیرساو بیرەوەریم بەهەڵەی نەبردبم، سەرگەرمی خوێندنەوەی

وەسوەسە و ئازارەکانی مەسیح بووم، ئەو ئـازارانەی ئاشـنایەتی هەمیشـەییم لەگەڵیـان هەبـوو، ئاشـنایەتی نزیـك لە هـی شمشـاڵ و نزیکتـر لە خەمـی دووری..

کەپرەکەم لە خۆم لاچەپتر بـوو، ڕێـك لەو کـۆترە دەچـوو کە لەسـەر لقی ئازارەکان هەڵنیشتبێ، ئەو کەپرە زویرە ئازاریە، تـاقە کەپـر بـوو بـۆنی بخـووریی کتێبـی لێبـێ و میوانـداری شـیعرو چیـرۆکو ڕۆمـانو سـەرهاتە خودیەکان بکات، لە کەپرەکانی هاوسـێم- ئەوەی مـن دیـتم- تەنهـا جـزو عەمە حزبیەکان دیاربوون، کەپرەکەی من ئەو کەپرە بـوو لە سـێبەرەکەیدا تفەنگ ڕووی نەدەهات قسە لە قسەی شیعر و شمشاڵ بکات.

**لە دۆڵی دۆڕاندا**
**لاتەریکترین کەپری ئازارم،**
**تا سەحەر چرای شیعری تێدا بسووتێ...**
**لە شمشاڵ بپرسە**
**کێ بێدارترین تێشکگری شەوە!**

(شەوانەی شمشاڵ)

کەپرەکانیدی ناویان لە من نابوو کەپری هەمیشە خەوتوو، ئا لەو دەمەو عەسرەی کەپردا دەستێکی نەناسراو بە ئاستەم کەپری ڕاژەند، وامزانی بـایە ڕامدەژەنێ، ئاخر مەگەر درەختی شاخان هێندەی منی بە شاخان کەوتوو با ڕایژەنـدبێ! یـاخود لەو ڕاژانـدنە دەچـوو کە دایکـێ بە ئەسـپایی لانکـی کۆرپەکەی ڕادەژەنێ، بە دەنگێکی دارماڵ لە دڵنەوایی‌و ئاشنایەتی:

- لەبەر خـاتری تـۆ دەسـتم چـووە گیـانی پەپـوولەو لە ڕێـی دیـدارتا پێڵاوێکم لەسەردانا، تۆش واپێدەچێ نەمناسی..

+ سورخی، لە خوێنـدنەوەت کـردم، بەڵام لەبەر خـاتری پێڵاوەکانـت قەینا دەتبوورم.

سـورخی لە دوورەوە هـاتبوو لە جێگەیەکـیکەی دۆڕانەوە، سـێ چـوار

شیعری بە خەتی نزیك لە خەتی مێروولە لەسەر پارچە مقەبای تۆزاوی دەتگوت لەناو خۆڵەپۆك هەڵیگرتوونەتەوە، نووسیبووەوە، شیعرێکیان رێك حەوزی ماسی بوو بە جوولەوە، لەوانیتر جوانیی خاڵخاڵۆکە و کرمی لۆکەیی و پەپوولە و مێروولە و کراسی مانگ و گێزەری دەم کەروێشك و پێڵاوی منداڵیی نمایش دەکرد، سورخی لە شاعیرانی چیا جیابوو، دنیای ئەو باخچەی ساوایان بوو بە هەموو گەمەکانیەوە، جێی نەهێشتبۆوە بۆ سووتان و شەڕو شۆڕ و ماڵوێرانی، کەسێك بوو منداڵیی وەك خۆی هێشتبۆوەو گەورەی نەکردبوو، وەك خاڵخاڵۆکە بە سروشتەوە نووسابوو، ماڵی خۆی نەکردبوو، هەر لە ماڵی سروشتدا سرووشتی دەژیا..

تۆ (ماسیەکان پێدەکەنن) بخوێنەوە، دەزانی سورخی لە شیعردا چەند منداڵێکی سروشتیە.

شەوەکەی هێند شمشاڵی پێ ژەنیم هەوام تێدا نەما، هێند سەرهاتی پڕ ئازاری خۆی بۆم گێڕایەوە ئازارەکانی مەسیحیم بیرچۆوە، سورخی لە ئاخافتندا لە رستەیەکی پێنج وشەیی سێیان کوردی دوویان عەرەبیو تورکمانی.. دەیگوت:

ئێستا باشم پێشتر گرامەرەکەم هیندی بوو!

خۆی وتەنی:

دایکی لە پاشماوەی ئەو (ئەمیرولموئمینین)ەیە کە شێخ رەزای شاعیر (ئەمیر)ەکەی گۆڕیبوو بۆ (حەمیر) نەنکی باوکیشی دەچۆوە سەر ئەو هیندیانەی کاتی خۆی لە ژێر شمشێرەکەی تەیمووری لەنگ خوا هیدایەتی دابوون..

سورخی دەیگۆ:

منیش لەسەر قسەی باوکم کوردم، بەڵام هێندەی رێبوار عەرەبیش کوردی نازانم.

رێبوار ئەو پێشمەرگە عەرەبەی پێش هادی عەلەوی پاکانەی خۆی راگەیاندبوو.. رێبوار هێ لە ناوەکەی خۆی کە نەماندەزانی، چەند

ناوێکیدیشی هەبوو، ڕێبوار جۆکەر، ڕێبوار گوڵ، ڕێبوار شەراب...

ڕێبوار جۆکەرس چەندان زمانی دەزانی، بەسێ چوار مانگ لە ڕێی فەرهەنگەوە زمانێك فێردەبوو، خوێنەرێکی باشی شیعری کوردی بوو، زۆر شیعری ناڵی و وەفایی و گۆرانی لەبەر بوو، هێند بە پەشێو سەرسام بوو (شەو نیە خەونتان پێوە نەبینم)ی خەتم کردبوو، شیعری لە کوردیشەوە دەکردە عەرەبی.

ڕێبوار گوڵ لەهەر بارەگایەك هەڵیدابا، باخی گوڵانی چێدەکرد، باخەکەی ناوزەنگ، ناوی هەبوو، قاچاخچیەکانیش دەهاتنە تەماشای باخی ڕێبوار، هێند پڕ گوڵ بوو دەتگوت بە بچووککراوەیی، کۆپیی باخەکەی نەبوخوزنەسرە، ڕێبواری گوڵ بۆ تۆوی گوڵ دەچووە تارانێ و ناوزەنگی پڕ بۆن و بەرامەی گوڵ دەکرد، زۆر کەس دەچوونە تارانێ، هەبوو چەك و تەقەمەنی دەهێنا، هەبوو تریاکی دەهێنا، هەبوو سیاسەتی دەهێنا، هەبوو، ڕێبواریش بە گوڵەوە دەهاتەوە، ئا ڕێبواری گوڵ لە تاران و شیرازەوە تۆوی گوڵی دەهێنا و ناوزەنگی کردبووە گوڵستان. سورخی دەیگوتە ڕێبوار:

باخ بە کچەوە جوانە...

باخی ڕێبوار وەك خۆی ناوی زۆر بوو هەرکەسەو بەدڵی خۆی ناوێکی بۆ دانابوو، من دەمگوتێ باخ اینە...

ڕێبوار شەراب لە شەرابگرتنەوەدا ملەی لەگەڵ ورمێ و عەنکاوە دەکرد، دەبە لەسەر دەبەی دەگرتەوە، تەقینەوەی شەراب ناسکترین سەرهاتی دۆڵی دۆڕان بوو، کارگەی شەراب لەژێر رایەخەکەی ڕێبوار بوو، لەبیری چووبوو ناوە ناوە سەری دەبەکە شلکاتەوە- شەرابگرتنەوە وەك ڕەخنە بە نهێنی بوو - پاش نیوەڕۆیەکی هاوینی، لە نۆکانی لە دەم ڕووبار خەوتوو، نۆکان ئێستاش ئەو شۆڕە ژنەیە کە لەدەم ڕووبار خەوتووە و وەرزەکان دێن و دەڕۆن ئەو هەر لە نازی خەوێدایە، زرمەیەك هات و شەراب تەقیەوە، بووە واتەوات، لای هەندێك هیچی کەمتر نەبوو

لە تەقینەوەکەی چرنۆبلی! خەریکبوو کۆبوونەوەی لەسەر گرێدەن، سورخی لە خەمی ئەوەدابوو ئاخۆ ئەو تەقینەوەیە چەند مێرووڵەی خەوتووی لەخەو کردووە، گۆتمە سورخی:

شەرابی ڕێبوار وەك وشە دەتەقێتەوە.

کاتێ ریبـَواریش بووە ڕێبواری ڕێی رووسیا، باخ اینەی خستە سەر ناوی من.. ڕێبوار ڕۆیی، لە شەرابی کردین و گوڵی بۆ بەجێهێشتین.. ماوەیەك بوومە ئاوکێشی باخی گوڵان، ئەو باخەی لە هیچ باخێکی هەولێر هێندە جۆری گوڵ دەستنەدەکەوت.. لە یەکەم دێری یەکەم نامەیەدا ڕێبوار بۆی نووسیبووم:

ئەگەر گوڵەکان بێ ئاو نەکەی، ڤۆدگای رووسیت بۆ دەنێرم..

سورخی کە دەهاتە ناو باخی گوڵان، دەیگوت:

دەی دەستم کەلەپچە بکە...

منداڵێکی بزێو بوو، دەستت نەگرتبا، باخی لە گوڵ و گەڵا رووتدەکردەوە و هەمووی دەخستە ئامێزی خۆیەوە، چوار وەرزی ساڵ کەس سوورخی نەدیوە گوڵێکی بەدەستەوە نەبووبێ، هێند عاشقی خاڵخاڵۆکە بوو، لەناو بەفریش بۆی دەگەڕا، سورخی ماسی پەرستێکی نموونەییە، دیتوومە بەدیار ماسیی لە ئاو دابڕاوەوە، تێر تێر گریاوە، شکی کردبا وا جەنگاوەرێك بە نیازی راو بە نارنجۆکەوە وا بەرەو رووبار دەچێت، باشووکە ئاسا دەگەیشتە سەر ئاو، بە بەرد لێکدان زەنگی هەڵاتنی بۆ ماسیان لێدەدا، کە گوێت لە هاو هاواری سورخی ببا، بێ بەدواداچوون، دەمانزانی ئەوە ماسی مردووی دیوە، بە نەهرۆ خانەقینی دەگوت:

تۆ نووسەری یان دەعبای چۆن ماسی دەخۆیت؟

نەهرۆ شتی دەنووسی دواتر جوانتری دەنووسی، زۆر دواتریش لە وڵاتی نەرویژ خرایە شاری شێتانەوە، نیگای نەهرۆ پڕبوو لە موگناتیسی خەوتن، چەندان جەنگاوەری دەخەواند، خەواندنی سورخی بۆ ئەو لە ئاو

خواردنەوە ساناتر بوو، هەر بەرێوە دەیخەواند:

کورە راوەستە! مەمخەوێنە چایەم بەدەستەوەیە.

نەهرۆ چەندی کردی منی پێ نەخەوێنرا کە زۆر پێویستم بە خەو بوو.

- من هەر توانای بەشەر خەواندنم هەیە، چ لە دەعبا بکەم؟!

+ هەر بە منداڵان دەوێری ئەگەر ئازای پیاو بخەوێنە!

- یان دەبێ ببیە بەشەر یان فێری دەعبا خەواندنیش دەبم

**ئەو زستانەی بەهاری راپەڕینی**
**وێنەی لاسکە رێواس لە بەفردا حەشاردابوو**
**زستانێ بوو گورگی دەبەست**
**دۆڵی دۆڕان بە ئاقاری چۆڵەوانیدا رێیدەکرد**
**زستانێ، درەختە بەفراویەکانی**
**لکە شیعرێکیان پێوە نەمابوو**

( شمشاڵ پێش خەوتن)

زستانی خامۆش، دڵڕەق، هەتا خارە خولەشی تۆراند، ئەو جەنگاوەرەی بەردەوام گوێی لە شیعر و شمشاڵ دەگرت، ئەو نەخوێندەوارەی لەرێی نوکتە خولەییەکانیەوە، بەقەد هەموو خوێندەوارەکان رەخنەی لەجێی لە شۆڕش و شۆڕشی شیعر کوژی دەگرت.. زستانی بێ جوانی و بێ دەنگ، جوانیەکی دەنگ کە جاروبار لە نۆکانەوە بەرەو ناوزەنگ لەسەر بەفری نوستوو پرووشەی دەکرد، سەحەرەکەی چەتۆ سەحەر بوو، ئەو سەحەرەی دواتر تیرۆری هەولێر سەحەرکوژی کرد.

لەم چۆڵەوانیەی دۆڵی دۆڕان، ژوورێکی بچووك، لەناو ژوورێکی گەورەتر، دیوارەکانیم بە تابلۆکانی دالی رازاندبۆوە، بیرەوەریم فێڵی لێنەکردبم هەندێکیان هەندرێن بۆمی ناردبوو.. بەو سۆبە ئاسنینە دارینەی کە لە دۆزەخەوە هاتبوو، گەرمنەدەبوومەوە! من خۆم بەو کتێبانە

گەرمــــدەکردەوە کە لەویٚ کەس نەیدەخوێنــدنەوە، خــۆم بە نامەکـــانی هەندرێنو برادەرە تەریوەکانم گەرمدەکردەوە، دیاریش فرێبوو ئەو برادەرە گیانیەی، هەرچیەکی دەنووسـی، دەمگـوت بـاش نـیە، ئەو بـرادەرەی نیـوە تەمەنێکمان لەنێوان ئاشتبوونەوەی ناسـكو تـۆرانی ناسـك بەسـەر بـرد، لەم زووره گچکەلەوە تەنها دوو رێگە دەردەچوو: رێـگەیەك بـۆ هەلاتـن ئەویدی بۆ خۆ بەدەستەوەدان، رێگەی رووسیاو بەغـدا، مـن هەردووکیـانم لەسەر خۆم داخستبوو، داخسـتنیٚ تـۆپیش نەیـدەکردەوە بـۆ؟! وەلامـی ئەو پرسیارە ئەگەر هەبیٚ کتێبێکی دەویٚ..

من هەمیشە هەستم بە تەنیایی کردووە، لیٚ ئەو زسـتانەم تەنیـاییەکەی لە ئـایەتی کـورد بە سـامتر بـوو.. خـۆزگەم بە زسـتانی پـار دەخواسـت ئەو زسـتانەی سـورخی و مـن لەبەفـر پەیـکەری کـچە گونـدیمان دەکێشـاو شـیعرمان بـۆی دەخوێنـدنەوەو شمشـالمان بـۆی دەژەنـد.. سـورخی پـایزە کۆچی کردبوو، هەستم وابـوو دلـۆپە شیعریەکانیشـی کـۆچ پێکـردووە.. بە رۆیشـتنی، ماسـیەکان ژیانیـان کەوتە مەترسـیەوە, کەسـیٚ نەمـا خالخـالۆکە بکاتە چاوساخ:

خالخالۆکە، بابە گورگور لەکوێیە؟ مالی باوکم لەکوێیە؟

سـورخی سـووکە ئامـاژەی بەسـەفەر کردبـوو، بەلام بـیٚ دانـانی خـال لەسـەر کـات، لەدۆلـی دۆران هەلاتـن و خۆبەدەسـتەوەدان نهێنـی حـزب بوون و دەبوایە بپارێزرێن، سورخیش تەنهـا لە پاراسـتنی ئەو نهێنیە منـدال دەرنەچوو، دواتر لە نامەیەکدا وای بۆم نووسیبووم:

هەموو تەمەنم کەرایەتـیە، بەلام پاراسـتنی ئەو نهێنـیە کەرایەتـیەك بـوو مەگەر هەر کەری حزب بیگاتیٚ.. لێرە لەناو پرچی کچە رووسـیان بەدوای خالخالۆکەدا دەگەڕێم، وەفاش بۆ ماسیە بەجێماوەکان، نامیلکە شـیعریەکەم (ماسیەکان پێدەکەنن)ە.

بەچەند شەویٚ خاترانەوە، هەزارو یەك شەوم لە دۆلی دۆران کـردەوە ، هەزارویەك شەوی تەنیـایی ئـاپۆرەیی، هەزارویەك شـەوی گەنجیـی پـڕ لە

پیاسەی حەسحەسیانە.. هەزارویەك شەوی شەورێژ لە حیكایەت، حیكایەتی جەنگاوەرە دۆڕاوەكان، ئەو حەكایەتانەی لە گێڕانەوەیان، زریانو گێژەلووكە هەڵیدەكرد، هەزارویەك شەوی پڕ لە حەكایەتی هەڵاتن و خۆبەدەستەوەدان، هەزارویەك شەوی پڕ لەقسەی چوكلێتی و گوژاركی، پڕ لە تۆران و ئاشتبوونەوە، هەزارویەك شەوی سەرپۆش لە خەونی سێكسی و سەرواڵا لە بەئاگاهاتنەوەی هەواڵەكانی كوشتن.

هەزارویەك شەوی پڕ لە نهێنی شەو، شەوانێك گەڕیدەی جوانی دەشیا دڵۆپە جوانیەكان ببینێتەوە.

**زریانو گێژەلووكە**
**لەسەر سینەی ژنێ تێكدەكەنەوە**
**ژنێ هەمیشە لە ژوان**
**ژنێ لەبەر دەرگاكەی ئەودا**
**تفەنگ دەخەوت و**
**جەنگاوەر دەكەوتە رووبارێەوینەوە**
**ژنێ رووسوورانە**
**بە دۆلی دۆڕان ناودێری كردین.**

(شمشاڵ لەخەوتندا)

## ئەفسانەی کانی ژنان

کەژی کەپرانە، بارەگا لە هەڵدێرێك هەڵیداوە، هەر کەسێك پێی بڕوا، ژنانی دەو رووباریش بە سەری راناگەن، ئەو هەڵدێرە قەت هی ئەوە نیە پێشمەرگە کەپری لێ هەڵبدا، نەك لەبەر هەڵدێری، نا، بەڵکو بە هۆی دوو هۆی زۆر لە جێ، قەت نەدەبوو بارەگا لەو تەلانە بکرێتەوە:

١- ئێرە گوفەکە، تەمەنی ئەو گوفەکە هێندەی تەمەنی گوندە و هەرچی پیسی و پاشماوەی کۆن و تازەی گوندی هەیە، ئەوەتە لە پێش چاوان و لە بن لووتانە.

٢- ئێرە رێك سەر رێگەی کانی ژنانە.

بەڵام چی دەکەیت! گوێمان بە هیچ نەداو چەند کەپرێکمان هەڵدا، ئاخر ئەنگۆ ئەوە بزانن ئێرە لە دیدی سەربازیەوە باشترین جێگەیە، تۆپی هیچ دەوڵەتێك نایگرێتەوە، راستی خەڵکی گوندیش هیچیان نەگوت و لاریان نەبوو، لە بن لێوانیشەوە قسەیەکیان نەکرد، بۆنی نارەزایی بدا، بە پێچەوانەوە هەندێ نیشانەی پێخۆشبوونیان نیشاندەدا، یەك لەو نیشانانە گۆڕینی گوفەك بوو، لەو رۆژەوەی جێ کەپرمان خۆشکرد، زبڵ و زالیان فڕێ نەدایەوە ئەو گوفەکەوە، لەولاتر زۆر دوور گوفەکێکی نوێیان کردەوە، ئەوەش روونترین بەڵگەی پێخۆشبوونە، پوورە فاتم کە بە تەمەنترین ژنی گوند بوو، دەیگوت:

هیچ شتەك هێندەی گوفەك گۆڕین زەحمەت نیە، تەنەکەی زبڵ هەر هێندەی فێرە جێگەیەك بوو، ورد وردیشی بکەیت بۆ خۆ هەڵڕشتن هەر دەچتەوە جێی گۆرینێ، بەلام چ بکەین دەستی نگۆمان شکاوە.

ئیدی گوند گوفەکیان گۆڕی، بەلام کانی ژنانیان نەگۆڕی.

گوند لە ئێمەوە دیار نیە، دووریش نیە، تەنها گوفەکە کۆنەمان نێوانە، ئێمە لە هەڵدێرین و گوندیش لە سەرێ، لە ساکەگۆڕێکی گەلەك گەورە جێگەی شارێکی لێ دەبێتەوە، کانی ژنانیش لە بنی دۆڵێ، لە نێوان کانی و گوند کۆنە گوفەك و کۆمەڵە کەپرێك و کانیەکیتر و گەلەك شتیدیش، ئەو نێوانە زۆر دوورە، خۆ پوورە فاتم هەتا لە کانی ژنانەوە سەردەکەوێ و دەگاتەوە ئاوایی، رەنگە دە جار پتر بۆی دانیشێ و بە قەت کانیەکیش ئەو کانیانەی لە درەنگانی پایز لە کەژی چکبوونن، ئارەقەی دەردەدا، وا بزانم پوورە فاتم چ خۆشیەك لە خۆشووشتن و چوونە کۆڵێ نابینێ، زۆر جار نەخۆشیش دەکەوت و دەهاتە کن برووسك، ئەو برووسکە دەیگۆت:

ئەگەر حەفتەیەك حەب و دەرزی لە گوند دەبرم، دەبینن چۆن کەپرەکان بە بن زبڵ دەکەون.

ئەو کوڕە هەر لە خۆوە خۆی کردبووە دکتۆر، خولە پازدە رۆژیەکەشی تەواو نەکردبوو کە دکتۆرەکان ناوە ناوە دەیانکردەوە، لەکەپرە دەرمانخانەیەکە کە کەوتبووە سەرەوەی کەپرەکەی من، لایەك تایبەت بوو بە دەرزی، لایەکیش حەب، نەژاد ئەو کوڕەی هێشتا هەر لە نەژادی پێکەنین بوو، لێوەکانی بزەی هەمیشەییان گرتبوو، ئەو نەژادەی هێشتا سەردانی سەردەشتی نەکردبوو، هێشتا نەچووبووە پیاسەی باخ، ئەو باخەی سەر گەلای درەختەکانی پڕ لە کێشکە و بن درەختەکانیش پڕ لە منداڵ، هەندێ لەو مندالانە من نەمدی، نەژاد گوتی:

کێشکەکوژیان بە دەستەوە بوو.

هێشتا ئەو گوللەیەی کە هەر بە قەد زەنگیانەیەك دەبوو، لە جێگەی خۆی نەبزووتبوو، نا، هێشتا رێی هەڵە نەکردبوو، لە کێشکە لای نەدابوو،

نەچووبـووە چـاوی نەژادەوە، نـا، هێشـتا منـداڵەکە لە ڕێـی هەڵەیەکـی منـداڵیەوە، چـاوی نەژادی نەڕژانـدبووە بـاخەکەی سەردەشـتەوە - نەژاد ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە هەر بە دوای چاوە ڕژاوەکەیدا دەگەڕێ-

ئەو نەژادە ناوی لە لای دەرزیان نابوو، بەشی ژنـان، بە لایەکەیدیشـی دەگـوت بەشـی پیـاوان، ئـاخر برووسـك هـیچ ژنێکـی بـێ دەرزی قوتـار نەدەکـرد، ژن سـووکە پەسـیوی گرتبـا، بـێ دەرزی لە دەسـتی برووسـك دەرنەدەچـوو، حەبیش تـایبەت بـوو بە پیـاو، هەر کاتێـك نەژاد باسـی ئەو جیاوازیەی دەکرد، برووسك هاواری لێ هەڵدەستا:

وا نیە، من کەی شتی وا دەکەم، دە بڕۆن لە پووره فاتم بپرسـن، بـزانن هەتا ئێستا دەرزیەکم لێی داوە!

وا بوو، لە ناو ژنان بەس پووره فاتم بەر دەرزی برووسك نەکەوتبوو.

پێش ئەوەی پووره فـاتم لە هەڵـلا بـدا، مـن سـەرهاتی وام بیسـتبوو کە هەڵلای وێـنەی پـووره فـاتمی لـێ بەرزبـووبێتەوە، هەر لە منـداڵیەوە سـەرم سەرڕێژە لە سـەرهاتی کـانی ژنـان، سـەرهاتی وەهـا، ئەگەر بشـخنکابام لە تینوێتیدا، لام نەدەدایە سەر کانی ژنان، زۆر جـار لە دوورەوەش نەمـوێراوە ئـاوڕ لە کـانی ژنـان بـدەمەوە، ئـاخر ئەو چیرۆکـانەی مـن دەمبیسـتن سوورهەڵگەڕابوون لە خوێن، خوێن لێیانەوە دەچۆڕا، لە ئاقاری کانی ژنـان چەنـدان پیـاو خوێنیـان ڕژاوە، هەر لەبەر ئەوەی بەوێـدا تێپەڕیـوە، یـان تیچاوێکی داوەتە کـانی ژنـان، مـن بەو منـداڵیە ئەو نهێنـیەم بـۆ نەدەبـۆوە، نهێنیی کوشتنی پیاوان بە هۆی کانی ژنـانەوە، درەنگتـر زانـیم کـانی ژنـان کانیەکی ئاسایی نیە، کانیەکە بۆنی نهێنیەکانی ژنی لێدێ، کانیەکە ڕێـك بە واتای گەرماوی ژنان دێت، چ بلێی کانی ژنان چ بلێی سەرشـۆرکی ژنـان هەر یەکە، یـان بە لای کەمـی لە هەنـدێ کاتـدا یەکـن، ئەو کـانیەی کە پووره فاتمیش لێیەوە لە هەڵـلای دا سەرشـۆرکی ژنـان بـوو، سەرشـۆرکی هاوینی، کانیەکیدی کە هەر نزیکی بارەگا بـوو، ئەویـش هەر کـانی ژنـان بوو بە هەموو تایبەتمەندیەکانی ژنـانیەوە جـگە لە گەرمـاوی، ئەو کانیەیـان هیچ هەڵلایەکی لێوە بەرز نەبۆوە.

ئیدی پووره فاتم له هەڵلای دا، له گوێی من ڕێك ئەو هەڵلایە بوو كە له سەرهاتەكانی پلكە حەبیبەوە بەرز دەبوونەوە، ئەو حەبیبەیە لە سەرهاتگێڕانەوە كەس نەیدەگەیشتێ، ئەو ژنە سەرهاتی بە كێش و سەروا دەگێڕایەوە، بەندی وەهای لۆ دەگۆتی مەپرسە، سەد بەندبێژی دەبەزاند، پلكە حەبیبە سەری سەرڕێژ بوو لە سەرهاتان، گورێی كچیشی كە ئاوزەی من بوو، شتێ هەراشتر، هەرچی یاریی منداڵانە هەیە لەگەڵ ئەو كچەم كردووە، كچەش دابوویەوە سەر دایكی، بەزمی كانی ژنان لە كن پلكە حەبیبە بوو، ئەو شەڕانەی بە هۆی كانی ژنانەوە دەكەوتنە ناو بەرەبابان و نەوە لە دووی نەوە لە خوێن دەگەوزان لە كنە وی بوون، باشم لە بیرە كە دەیگۆت:

**هاواری ستی گەیشتە ناو گوندی:**
**وەرن، هۆی! وەرن، بزانن چن دی!**
**حەسەنە شەلە بە چاوی مۆنی**
**لە لەشی رووتی ژنان دەڕۆنی**
**كێ گوللەی هاویشت؟ برای ستیە**
**مەیتی حەسەنی لەوێ كەتیە**
**هە شەڕە شەڕە، هەی گەرمە شەڕە**
**دەستەك تفەنگە دەستەك خەنجەرە**
**ڕێی كانی ژنان سەرانسەر خینە**
**حەفت برینداران، حەفتیش مردینە.....**

لە دەست خۆم نەبوو، ترسام زۆریش ترسام، پووره فاتم و ستیی ناو سەرهاتی پلكە حەبیبەم لێتێكەڵاو بوو، نەمدەوێرا چاو هەڵێنم، دەمگوت ئێستا نا ئێستا لەو ڕێیە زەلام بەردەبێتەوە، خوێن دەڕژێ، پووره فاتم چەندی پتر لە بارەگا نزیكتر دەكەوتەوە، ترسیش نزیكتر دەكەوتەوە، پووره فاتم و ستی و ترس یەكانگیر بوون و بۆم لێك جیا نەدەكرانەوە، گەیشتە نزیك بارەگا:

با بزانم كامەتان بوون، بمرن باشتر نیە؟

بەرپرسی بارەگا کێیە؟ کاوەی دەڵێنێ، بەردەوامیش دەمانچەی لە نێکیە، لە کاتی چوونە سەرشۆرکێش لە خۆی نەدەکردەوە، چووە پێش پوورە فاتم و گۆتی:

+ پوورێ، هاوار مەکە، بزانم چ بووە، بە شێنەیی تێمبگەیەنە.

- چ بووە! ئەنگۆ نازانن، ئەوێ کانی ژنانە؟

+ با، دەزانین، بلێ...

- تازە پێشمەرگەك، بە چاوی خۆم دیتم، ئەگەر نەمدیتبا رەنگبوو باوەرم نەکردبا، لە کەلێنی دار و بەردانەوە، لە ناو دووکەڵێ زەق زەق، زیت زیت، تەماشای لەشولاری ژنان دەکات، هێشتا چ بووە؟!

+ پێشمەرگەکە دەناسیەوە؟

- باشی دەناسمەوە، بۆ ئەو لایەش هات.

+ دە وەرە لە ناومان بگەرێ، پەنجەی لە سەر دانێ، پیاو نەبم ئەگەر یەك گوللەی لە ناو چاو نەدەم.

زراوم رژا، گەیشتمە ئەو باوەرەی کە بەندەکەی پلکە حەبیبە جارێکیدی لەو تەلانە، لەو بارەگایەی نێوان گوند و کانی ژنان وەراست دەگەرێ و خوێن دەرژێ، ئاخر ئەو پیاوە پیاوێك بوو هەر قسەیەکی بکردایە دەیگەیاندە سەر، ئەگەر سوور بیزانیایە سەریشی تێدا دەچێت، پیاوێك بوو لە شێنەیی تا بلێی نەرم و میهرەبان، ناسك، قسە خۆش لە توورەییشدا میر غەزەب بوو بۆ خۆی، سمکۆی شکاك بە تۆزی پێی نەدەگەیشت، خوێن بەر چاوی دەگرت، لە خوێن بەولاوە چیدی نەدەدی، دەیانگۆت: جارەك لە پێشمەرگەیەك توورە بوو، یەك خوترمەی خێواندبووە پشتی، کاوەی ئاسنگەر وای نەخێواندۆتە ئەژدەهاك، تەختی عەردی کردبوو. دەیانگۆت: حەفدە مەتارە ئاویان پێدا پژاندبوو، هێشتا بە خۆنەهاتبووەوە، لە هەمووش خۆشتر کاوە لە سەری بۆی گریابوو.

ئێستاش وەك دەبینین ئەو پیاوە لە باری توورەبوونە، من دەترسام پوورە فاتم، بەو چاوە کزانەی خۆیەوە پەنجە بخاتە سەر یەکێکمان و بلێ:

ئا ئەو کوڕە بوو، لە پەنای بەردەکە، لە کەلێنی پەلکە داران، لە ناو دووکەڵێ تەماشای سینگ و مەمك و ناو گەڵی ژنانی دەکرد.

دەمگوت دووریش نیە راستەوراست و پەنجە بە هەڵە دروستبووەکانی لە سەر سینگی من راگرێ، هەر لەو کاتەش کاوەی دەمانچە لە نێك کە تووڕەیی لە چاوی دەباری، ناوچەوانی من بکاتە نیشانە، ئاخر بەو دەستوبردە، بە دەستهەڵێنانەوەش راناگەم، بە هەڵاتن و خۆشاردنەوەش رانەگەم، بە راوەستە با تێکبگەین و تێتبگەیەنمیش راناگەم، دەمگوت دوور نیە رۆژم هاتبێت، ئاخر من یەکێکم لەو کەسانەی کە زۆر جار دەبمە قوربانیی پەنجە و ئاماژە هەڵەکان، هاتەوە بیرم:

دە دوازدە کرێکار بووین، لە خانووێك ئیشمان دەکرد، ئەو کات منداڵ بووم، هەر پازدە شازدە ساڵێك دەبووم، هەر هێندەم زانی منداڵێك کە پاقلاوەی دەفرۆشت، دەستی بە گریان کرد و رۆیشت، بە دەم رۆیشتنەوە جوونی دەدا و دەیگوت:

پاقلاوە دەخۆن و پارە نادەن، باشە با لۆتان بمێنێ.

هێندەمان زانی بە خۆ و بە پۆلیسێکەوە پەیدا بوو، پۆلیسەکە گوتی:

+ دەی بزانم کامەیان بوو، خواردی و نەیدا؟

- ئەوە بوو، حەفت پاقلاوەی خوارد و پارەی نەداوە.

(ئەوە)کە من دەرچووم، چەندی گوتم:

کوڕە بە خودای من پاقلاوەیەکیشم نەخواردووە.

لەگەڵ پۆلیس کەلکی نەبوو، دەیویست بمبا بۆ پۆلیسخانە، باش بوو وەستاکە هاتە ناو کێشەکەوە و کۆتایی پێهێنا، ئیدی دەترسام پوورە فاتمیش وەك ئەو منداڵە پاقلاوەفرۆشە هەڵە بکات، ئەو جارە کێشەکە زۆر لەوە ئاڵۆزترە بە وەستایەك و سەد وەستاش چارەسەربکرێت، نابینن، کاوە دەستی لە سەر دەمانچەیە.

ئێستا هەمووومان لە بن کەپرە گەورەکەین، چاوەکانی پوورە فاتم لە سەر یەك یەکمان دەگەڕێ، بەختیاریش کە هەر بە بەخە بانگ دەکرا، بە

زمانێکی گاڵته ئامێز دەیگوت:

چاوەکانی خۆت ماندوو مەکە نایبینیەوە، یەکێك کەتنی ئەوهای کردبێت، نایەت لە پێش چاوی تۆ دانیشێت، هەستە ئەگەر نەساخیت، برۆ کن برووسك با یەك دوو دنکە حەبت بداتێ.

هەرچی کاوە بوو، بە تووڕەییەوە دەیگوت:

لێی گەڕێ، با تەماشابکات، شەرتبێت ئەگەر پەنجە لە سەر منیش دانێ، دەبێت گوللەیەك لە نێوچەوانی خۆم بدەم، بارەگای ئێمە قەت جێگەی بەدڕەوشتی لێ نەبۆتەوە، ناشبێ...

دیار بوو پوورە فاتم ئەوەی لە دووی دەگەڕا نەیدەدیتەوە.

کاوە گۆتی:

ها، بۆت روونبۆوە کە ئێمە نین، ئەوەش بزانە چەند کەسین هەموومان لێرەین، کەسمان نیە لێرە نەبێت، پێشمەرگەی ئێمە شتی وا ناکات.

پوورە فاتم گۆتی:

نا، نا خوانەخواستە ناڵێم شتی وا لە ئێوە دەوەشێتەوە، بەڵام بە خودای کە تێر تەماشای لەشولاری کردین و لێمان لە هەڵلا دا، بەو چاوانەی خۆم دیتم، بەرەو ئێرە هاتەوە...

کاوە گۆتی:

+ دە هەستە یەك یەك ناو کەپرەکان بگەڕێ.

- نا، کوڕم شتی وا ناکەم، باوەڕ بە تۆو دەکەم.

+ باشە ئەتو برۆ، هەر کاتێك ناسیتەوە، وەرە بە من بڵێ.

بەخە بە پێکەنینەوە، پێکەنینێکی وەها دۆلاودۆل دەنگی دایەوە:

دە وەڵلاهی پوورە فاتم، ئەمن بزانم ئەتو خەونت دیتووە، لە خەونێدا...

ئەو بەخەیە قەت نەمدیتبوو لە خۆوە بێتە ناو قسان، هەتا جارێك هەڵیدەدایە قسان سەد جار خۆی هەڵدەدایە ناو زێ و دەهاتەوە دەرێش، خەڵکی دەو زێی گچکە بوو.

پوورە فاتم بزەیەکی هاتێ و تەواو.

پووره فاتم وازی لێمان هێناو رۆیشت، کەچی کاوه وازی نەدەهێنا، ئەو پیاوه وا بزانم لە سەر ئایینزای مامە رەزاییش بوو، دەیگوت:
من دەبێت ئەو پێشمەرگە بێ رەوشتە ببینمەوە، ئەو ژنە لە خۆوە قسە ناکات.

دیتم لە بنەوە تەماشای برووسکی دەکرد، دەتگۆت گومانی لەوە، نا، هەر برووسك نا تەماشای هەموانی دەکرد، کێ ئاگای لەو نەبا، تەماشای دەکرد، گۆتم نەڵێ دێم دەست لە سەر دڵتان دادەنێم و ئەوی ئەو کەتنەی کردبێت، دەترسێ و دڵی خێرا لێدەدات، ئاخر کاوه بوو لە دەستی دەهات، ئەو بڕیاری دابوو ئەو کەتنکەرە ببینێتەوە، ئەو رێگەیەش، رێگەی دەست لە سەر دڵنان رەنگە لای وی باشترین رێگە بێت، من هەر لە خۆوە وام بیردەکردەوە، رەنگە کاوه ئەو رێگەیەی بە خەیاڵدا نەهاتبێت، ئەو بیرکردنەوەیەی من رەنگە لەوەوە، لەو سەرهاتەوە هاتبێت:
لە سەرەتایی بووم، لە ناو پۆلێ، قوتابیەك کە کوڕی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو، شتێکی بزر کردبوو، نازانم چی بوو، هەموو قوتابخانەیان سەرو بن کرد، نەیاندیتەوە، مامۆستای پۆلەکەی ئێمە کە وا بزانم ناوی نەجاح بوو، دیتم هەستا و یەك یەك دەستی دەخستە سەر دڵی قوتابیەکان و ناوە ناوەش دەیگوت:
ئەوەی دزیبێتی دڵی خێرا لێدەدا.
من نەك هەر دڵ هەموو لەشم هەڵدەلەرزی، لەرزینێك لە ناو بەفرێش بتبەستنەوە وا هەڵنالەرزێی، نەجاحە فەندی وا خەریکە دەگاتە من، چەندی دەمویست خۆم بەرزەفت بکەم، بەلاش بوو، گەیشت، دەستی خستە سەر دڵم، مریشکی تازە سەربڕاوتان دیوە؟ رێك لەو مریشکە دەچووم، بەو چاوانەی خۆم دەمدیت دەستی مامۆستا لە سەر سینگم دەتگوت زۆر بە توندی تووشی نەخۆشیی لەرزۆکی بووە، یەکسەر پیلمی گرت و ویستی لە رێزێم بێنێتە دەرێ، لە دەرگا درا، بەردەستەکە هەر لە سەر دەرگاوە:
مامۆستا، بەڕێوەبەر گۆتی شتەکەمان دیتەوە، لە دووی نەگەڕێ.

مامۆستا کەمێك لێم دوور کەوتەوە و گوتی:

ئەتو نەخۆشی، بڕۆ دکتۆر.

چوومە دکتۆر و نەخۆشیش نەبووم، ئێستاش لەو بن کەپرە ئەگەر کاوە بێت و دەست بخاتە سەر دڵم، دڵ هەر مریشکە سەربڕاوەکەی ناو پۆلە.

هەموو ئەو بگرەو بەردەیە لە پێش نیوەڕۆدا بوو، کاوە لە سەر رۆیشتن بوو، باش بوو رۆیشت، ئیدی لە ناو خۆمان: (( کێ بوو کێ بوو؟)) سەد جار گۆترایەوە و نەگەیشتنە هیچ، منیش وەك کاوە تەماشای چاوانم دەکرد ئێ بەڵکو شتێك بزانم، بزانم جگە لە من کەسێکیدیش هەیە شتێکی لێ بزانێت، لە چاوی کەس هیچ زانینێکم نەدیتەوە، من شتێکم لێی دەزانی لە ترسی کاوە نەك کەتنێك بەو کەتنکارە بکات، بەردێکم لە سەری دانا و ئەو بەردی شاردنەوەیەم هەڵنەدایەوە و هەڵنەدایەوە.

ئەوهای گێڕایەوە:

با بۆت بگێڕمەوە: ئەو کاتەی لە ناو گوندی تووشی تۆ بووم و لە وەڵامی پرسیارەکەتدا گوتم: تۆزێك ئیشم هەیە و دەچمەوە.

نەچوومەوە، زانیم رۆژ رۆژی کۆڵکردنە، دوور لە هەموو چاوێك شۆڕبوومەوە، لە ناو توترکان جێگەیەکم بۆ خۆم خۆشکرد، جێگەیەك هیچ پاشایەکی ئێرانی چاوی بە جێگەی وا خۆش نەکەوتووە، جێگەیەکم هەڵبژارد هیچ جەنەڕاڵێکی رووسی و ئەمریکی ناتوانن وا بە وردی جێگەی وا هەڵبژێرن، جێگەیەك راست و راست نیشان بپێکێ.

راستی من زووم زانی شتێکی لە چاودایە، بە بەر چاوی مندا شۆڕبۆوە، بەڵام حەزم نەکرد قسەی پێ ببڕم، بۆیە نەمگوت: مەڵێ دوور لە هەموو چاوێك.

ئێ، هەرچی مێینەی گوند هەیە بە رووتی رژانە ناو چاوی منەوە، چم دیت، برا چیم دیت! ئەوەی من دیتم یاخوا تۆش ببینی، تەماشا مەکە، هەر یەکەی شەرواڵێکیان لە خۆیان هەڵکێشایە و دەڵێی هەجیجین، وەرە کوڕی ئاسمان وەرە ناو توترکان و لە چاوی منەوە تەماشایان بکە،

تەماشای حۆریە رووتەکانی بەهەشت بکە، بەهەشت! دە بە خولای ئەگەر یەکێك بێت و دڵنیام بکات کە بەهەشت هەیە و ئەوهاشە، لە سەر دەستی وی تۆبە دەکەم و رۆژی هەزار نوێژ دەکەم و هەتا رۆژی بێ پارشێو بە بێ پارشێو بەرۆژی دەبم.

لە بارەی ئەو بەهەشتەوە پرسیاری پێش وەخت لە سەرم سەریان هەڵدەدا و دەهاتنە سەر زارم و شەرم دەیگەڕاندنەوە.

چم دیت، هاورێ چم دیت، هەموو جۆرە میوەیەك، ئەوە وەختی خۆی خزمێکمان هەبوو زۆر دەوڵەمەند،ماڵیان لە سنە بوو، کە دەچووینە ماڵیان هەرچی میوەی دنیا هەیە لە سەر مێز دەبینرا، میوەی وا هەبوو لە هیچ مەملەکەتێکی ئێرانی دەستنەدەکەوت، کەچی لە سەر ئەو مێزەی دەیلێم دەهاتە ناو چاوت، ئەوەی ئەمنیش لە ناو ئەو تووترکانەوە دیتم ئەوهابوو، وەك مێزەکەی ماڵە سنەییەکە، بەڵام ئەوەیان میوەی راستینە، ئا بە هەڵەدا مەچۆ، میوەی راستینەی سێو و هەنجیر و هەنار و گێلاس و پرتەقاڵ و لیمۆ و هەرمێ و شفتی و ئەو شتە بێ تام و شامانە نیە، میوەی راستینە روومەتی سێوی و نا سێوەکە لادە، روومەت و لێو و مەمك و گۆی مەمك و ئیدی بۆ خۆت ریزیان بکە، سەر بەرەو خوار، بەرەو سەرێ، تەنیشتا و تەنیشت...

لەو لایەوە، کەمەر باریکێ جلکی دەشووشت، خۆزیت دەخواست بچیە بن شۆنکی دەستی، تا گیانت دەردەچێ بتکوتێ.

ئەو کورە لە گێڕانەوە هیچ چیرۆکخوانێک نەیدەگەیشتێ، من هەرچی بکەم ناتوانم گێڕانەوەی ئەو وەك خۆی بگێڕمەوە.

چم دیت! ئەوەی من دیتم کەس نەیدیتیە، مەمك بە هەموو جۆر و قەبارەکانیەوە، بە هەموو رەنگەکانیەوە، ئەو هەموو سمت و ناوگەڵ و... هەر وازی لێبێنم باشە، ناگێردرێتەوە، بە خودای ناتوانم وێنەی ئەو بەهەشتە بە لێلی و شێواویش لە گێڕانەوەمدا بە تۆی نیشان بدەمەوە، چ جوان بوو! کەفی سابوون کە دەهاتە خوارێ بە سەر...

هاتە سەر زارم بڵێم:
دەی وردتر قسە بکە و وێنەکان روونتر و رووتتر نیشانبدەوە.
بەڵام شەرمم کرد و قسەم قووتدایەوە.
ئەتو بۆ ناپرسی چۆن ئاشکرا بووم؟
حەزم نەدەکرد زوو ئاشکرا بێت، دەمویست کات هەر کاتی پێش ئاشکرابوون بێت و بزانم کەف گەیشتە کوێ، بۆیە پرسیارەکەم نەکرد.
کاکە ئۆقرەم لێ هەڵگیرابوو، دەمویست وەکو گورگ پەلاماری ئەوەیان بدەم کە هەر زۆر لە منەوە نزیک بوو، ئەوەش ناکرێ، خۆم گرت، لە حەژمەتا جگەرەم پێکرد، جگەرەیەك دوو، سێ... گوێم لێبوو یەکیان وا بزانم پوورە فاتم بوو:
ئەوە چیە، دەڵێی دووکەڵە لە ناو ئەو تووتڕکانە؟
هەر هێندەم زانی پوورە فاتم بە مەمکە چورچەکانیەوە بەرەو لای من هات، رووتێکیدیش کە مەمکەکانی رێك لە دێمکە دەچوون لەو لایەوە هات، جگە لە هەڵاتن بیرم بۆ هیچ شتێکیدی نەچوو، دەرپەڕیم، ئیدی بووە زاك و زریك... گوێتان لێبوو، وا نیە؟
من گوێم لە قیژە قیژێك بوو، بە هەندم هەڵنەگرت، بەڵام کە لە نزیك بارەگا پوورە فاتم لە هەڵلای دا، هی ئەوە نەبوو بە هەندی هەڵنەگری.
ئەو کوڕەی ئەو کەتنەی لە کانی ژنان تۆمارکرد، خەڵکی دیوی رۆژهەڵات بوو، دەنگێکی هەبوو، کەس لە دەنگی مەزهەری خالقی جیا نەدەکردەوە، من جارێك ئەو دوو دەنگەم جوان لێتێکەڵاو بوو، ئەوە بارەگا لە بەرزایی چیایەك بوو ئەگەر لە دووربینێکی دوور دیتەوە سەیرت بکردایە، کێوی قافت دەدی، ئەو چیایە بە سەر دۆڵێکەوەیە هەرچی گوریسی دنیایێ هەیە لێکدی گرێدە ناگاتە بنی، ئەو چیایە ناوی خۆی هەبوو، چەندی بۆی دادەمێنم نایەتەوە یادم، بەڵام ئەو چیایەی شانی بە شانی وی دابوو ئەز بێژم ( بزنیك )یان دەگوتێ، دۆڵەکەش ناوێکی وەك (زێوە)ی هەبوو، لەوەیان دڵنیا نیم، بەو دۆڵەدا رووبارێك چوار وەرزەی

ساڵ هاژەی دەکرد، دەتگوت ئاسمانی رژاوەتێ، شین، شین، لە ئاسمانی شینیش شینتر، رووبار هەر ناوێکی هەبێت وەك زێی مەزن و ناویدی، من هەر بە رووباری شین ناوی دێنم، ئەو رووباری شینەش نیە کە هەموو کەس بە شینی ناسیویانە، ئێ، ئەوجا با زۆر لە مەزهەری خالقی دوور نەکەوینەوە، دەمەو زستان بوو، هێشتا لە هیچ جێگەیەك کلوو بەفرێك نەکەوتبوو، کەچی لەو بارەگایە یەك چۆك پتری تێکردبوو، بارەگا سێ چوار ژوور بوو، من تازە گەیشتبوومە ئەوێ، خۆم دابووە بەر سۆبە، لە ژوورەکەی ئەو لاوە، مەزهەری خالقی هەڵیدا لە ( شیرین تەشی دەرێسێ) بەڵام بە بێ مۆسیقا، لام سەیر بوو ئەوە یەکەم جارە بە دەنگی مەزهەری خالقی گوێم لە شیرین تەشی دەرێسێی بێ مۆسیقایە، نەشمزانیبوو مەزهەر هاتبێتە ناو پێشمەرگە، دێتە بیرم تەواو حەپەسام، باشم لە بیرە پرسیم:

+ ئەرێ بە من بڵێن، من خەون دەبینم یان تێکچوومە؟

- هیچیان، بۆ چی بووە؟

+ خالقی چ دەکات لێرە!

- ئۆی! ئەوە هەر ئەتو نی ئەوەت بەسەر دێت، خالقی دەمێکە لێرەیە و پێشمەرگەیە، بەڵام ئەوەیان مەزهەر نا ئەمیری خالقیە.

چەند شەوێك لەوێ لە بارەگای خالقی مامەوە.

پێمگۆت:

من لە جیاتی تۆ بم، لە بنی جگەرە ناکێشم.

بە حەپەساویەوە گۆتی:

لەبەرچی؟

گۆتم:

لەبەر دوو شت: رەنگە کار لە دەنگت بکات، دوایش ئەگەر جگەرەکێش نەبای لە ناو تورکان ئاشکرا نەدەبووی و لە بەهەشتیان راونەدەنای.

بە پێکەنینەوە گۆتی:

یەکەمیان گرنگ نیە، بەڵام هی دووەمیان وەیە، دەی تۆش وەك من ئازابە، من لەو بارەگایەی ئێوە بام، ئەگەر لێرەوە تا سەر کانی عەردم کون کردبا، دەبا لەگەڵ هەموو ئاگرکردنەوەیەك خۆم گەیاندبا کانی، دەی هەر پرسیارێکم لە بارەی لەشولاری کچ و ژنانی ئەو گوندەوە لێدەکەیت، بە وردی وەڵامت دەدەمەوە، دەزانم چەند خاڵیان بە لەشەوەیە، خاڵەکان کەوتوونەتە کوێ.

هەوکە وا لە نزیك ئەو گوندە پیاسە دەکەین کە چەند حەفتەیەك لەمەوپێش ئەو خالقیە کەتنێکی لە کانی ژنان نایەوە و وا بە ناسکیش بۆ منی دەگێڕێتەوە، ئەو لە بارەگایەکیدی بوو، بە سەردان هاتۆتە لای ئێمە، رەنگە ئەو جارەش بۆ نانەوەی کەتنێك هاتبێت.

لەهیکەوە خالقیانە تێهەڵکرد لە گۆرانیەك کە لەو کات و ساتە چاوەڕێی گوتنی ئەو گۆرانیەم نەدەکرد:

**هێندە دڵ پڕم حەز دەکەم بگریم**
**لە فرمێسکی چاو مەرهەمێ بگرم...**

گۆرانیەکە ئەو خولیایەی لە سەرم رەواندەوە کە لە قسەکانی ئەوەوە هاتبووە سەرم، خولیای گەیشتن بە کانی ژنان.

ئەو جۆرە خولیایانە تۆز نین نیشتبنە لچکی کراسەکەتەوە و بە پتێ بیتەکێنی و تەواو، نا، ناڕەوێتەوە، هەمیشە لە دەورت دەخولێتەوە، من لای خۆمەوە بڕیارمدا ئەگەر بە دەردەکەی ئەمیریش بچم لەویش خراپترم بەسەر بێت، دەبێت خۆم بگەیەنمە ناو تووتڕکان و ژنانی ئاوایی بە رووتی ببینم، پتریش مەبەستم ئەو کچە بوو کە بە مانگی گوندی ناوی رۆیشتبوو، وەك دەیانگوت: (...) هەمیشە مانگەشەوە، چوار وەرزەی ساڵ، سی شەوەی مانگ مانگەشەوە و مانگەشەوە.

گەیشتن بە ناو تووتڕکان پیاوی خۆی دەوێت، ئازایەتیەکی ئەفسانەیی دەوێت، شەڕکردن لەگەڵ فڕۆکە و دەبابە و ئەو شتانە فشەیە، ئازایەتیی لەو شتانە بە دیار ناکەوێت، ئەوە ئازایە کە دەگاتە ناو تووتڕکان و هەموو

ژنـانی گونـد بە رووتـی دەبینـێ ئەوە قسـەی مـام بـایز بـوو، دوای ئەوەی شتێکی لەو بـارەیەوە زانیبـوو، زۆر جـار ئەو قسـەیەی دەگـۆتەوە، ئەو مـام بایزە لەمێژ نەبوو لە رووسیا هـاتبۆوە بەردەوام و جـار لە دوای جـاریش لە دلەوەتر دەیگوت:

من لە بەهەشت هاتوومەتەوە، بەهەشت ئەگەر هەبێت رووسیایە، ئەگەر نەشبێت هەر رووسیایە.

بە گاڵتەوەش دەیگوت:

بەڵام دیارە لەو دۆڵەش بەهەشتێکیدی هەیە، نەمانزانیوە!

بە درێژایی هاوینێك هەموو ئەو رۆژانەی پێش ئەوەی ژنـان بە مەنـجەڵ و بوخچەی جلکانەوە شۆڕببنەوە بەرەو بنی دۆڵـێ و دووکەڵ بەرز ببێـتەوە، من خۆم ئامادە دەکرد و چاوم لەو رێیە دەگێڕا کە دەمباتە ناو تووترِکـان، ئێستا و ئێستاش ئەو رێیەم نەدیتەوە، ئەو کاتانەی لە کانی ژنـانەوە دووکەڵ دەگەیشتە تاقی ئاسمانێ و با بەرە و کەپرانی دەهێنا، زۆری نەدەما خـۆم لە تاوێرێك گرێدەم و غلۆری بکەمەوە، ئیدی باوەڕم بەوە هێنا کە:

گەیشتن بە کانی ژنان ئازایەتیەکی ئەفسانەیی دەوێت.

## گۆزەیێ شەراب
## گۆبەند دەنێتەوە

بەفر باری، باری، هەر باری، لەوانەیە ئێستاش بباریێ! لە هیچ زستانێ، لە هیچ بەفرانبارێ ئاسمانی جاسووسان بە سەر گۆڕەشێردا هێندە بەفرەی لێنەهاتۆتە خوارێ، لەو زستانە هەر هەر هەورێ بەری ئاسمانی گرتبا، بەفری پێوە بوو، دایدەکردە بەفر و وەک پارچە پەڕۆی سپی، سپی سپی دەهاتە خوارێ، بەفریش نەبا، شلێوە بوو، ئەو زستانە کەس تاوە بارانێکی نەدی، بەفر و بەفر.

بەفر سەردەرگای گەیاندە گوێسوانە، گەیشتە لك و پۆپەی دارێ، دنیا تەختاییەکی سپیە، تا چاو بڕدەکات چاو بدێ، لەو چیاوچۆلە لەو پێدەشت و دۆلە، چالاّییەك نابینیەوە، کەس بارەگا و بارەگا ناکات، کەس ماڵە و ماڵ ناکات، قوڕ بە سەر ئەوانەی داریان لێبڕاوە، کورم دەوێ بچێتە داران، چما داربەڕوویێك بە سەر دنیاوە ماوە؟! چما چی ما بەفر داینەپۆشێ! بۆ دڵدانەوەی خۆم گۆرانیەکەی دایکمم دەگوتەوە، کە هەر کاتێ گوێی لە لاوکی (بەفر باری) دەبوو، ئەو سترانەکەی خۆی دەگوتەوە:

**لە ئادارێ**
**بەفر بگاتە گوێی دارێ**
**نامێنێ تا ئێوارێ**

بەڵام ئێستا ئادار نیە و بەفرانبارە، ئێرەش هەولێر نیە، گۆڕەشێری بن تیچاوی جاسووسانە، ئەگەر بەفر نەبێ، لەو تەنیشتەوە بنەگوێیی بەرزایی

قەنـدیل دیـارە، ئەو بەفـرە وا ببـارێ، بەهـارێش نـاتوێتەوە، هـاوینێش دنیـا رەشنابێتەوە، بەری خۆ دێ، لەو دنیایە شتێك رەش نـاچێتەوە، سـپی سـپی، رەشایی چاو بە لای سپێتیدا دەبات، کەسـی بەفـر نەنـاس مجـرۆ دەکـات، ئەدی نەتانبیست، پێشمەرگە بەسـراییەکە چـی بە سـەرهات، مـن نەمـدیت، گێڕایانەوە:

لە تەمەنی خۆی بەفـری نەدیتبـوو، بـاوەڕی بە تەلەڤزیـۆنیش نەکردبـوو، پێوابـوو درۆیە کە لە ئاسـمانەوە شـتی سـپی دەبـارێ و زەوی دیشداشـەی سپی لەبەردەکـات، ئـێ ئەو پێشـمەرگەیە شـەو کە دەخەوێـت، زەوی هەر کراسـە کـۆنە زسـتانیەکەی لەبەرە، ئەو کراسـەی کـوڕە بەسـراییەکە پێـی ئاشنایە، سپێدە کاتێ لە خەو رادەبێ، دنیا سپی سپی، شەش قـات سـپیتر لە دیشداشە سپیەکەی کە لە بەسرا لەبەری بوو، بەفرێکی ئەسـتوور کەوتبـوو، لە بن تیشکی رۆژێ تیشکی دەدایەوە، کوڕی بەسـرایی لە بەفـر تێـر نـابێ، وەك بەچـــکە ورچ گەمەی لە نـــاو دەکـــات، پێشـــمەرگەیەکی دەڤەری خۆشناوەتی دەڵێتە پێشمەرگە بەسراییەکە:

+ بەفر پەرجووێکی ئاسمانیە، هاییدار بە لە هیکەوە بزردەبێ، دەفڕێ .

- کە وابێ، پێویستە تێر لێیبڕوانم، با لێی تێربم، نابێ چاوم داخەم.

ئیدی کوڕە بەسرایی هێند تەماشای بەفر، تەماشای دنیای سپی دەکـات، تا هەستدەکات، هیچ نابینێ، هاواردەکاتە کوڕە خۆشناوەکە:

+ من وا تێگەیشتم بە گاڵتە دەڵێی پەڕجووە، بەڵام بـووە راسـت، کـوا بەفرەکە؟ بۆ کوێ فڕی؟

- بەفرەکە پەڕجوو نەبوو، ماوە، چاوت فڕی.

ئیدی کوڕە بەسـراییەکە چـاوی لە سـەر دانـا، هیچـی نەدەدیـت، هەزار جـوێنی عەرەبیـی بە کـوڕە خۆشـناو دا، بـاش بـوو کـوڕە قەنـدیلیەك فریـا کەوت، کوڕە بەسرایی بـۆ مـاوەیەکی زۆر لە چـاوەیەکی تاریـك تـاریکی هێشتەوە، ئەوەبوو لە تاریکی بینایی بۆ چاوەکانی گەڕایەوە.

باشە کەسی بەفرنەناسمان لەگەڵ نیە، ئێسـتا پێشـمەرگە بەسـراییەکان، لە

خۆشناوەکان پتر و هێندەی قەندیلیەکان شارەزای بەفر و نهێنیەکانی بەفرن، بۆیە ترسی مجرۆبوون لە بەفرمان نیە، ئەو سەرهاتە، سەرهاتی بینایی لە بەفر لە دەستدان و بە دەستهێنانەوەی بینایی لە کونجی تاریکی یان وەك ئەوەی ناویان نابوو سەرهاتی کوڕە بەسرایی و خۆشناوەتی، کوڕێك بۆی گێڕامەوە، ئێستا، ئێستای بەفرانبار و ڕێبەندانی گۆڕەشێر وا لە تەنیشتمە و فێرە شەراب خواردنەوەی دەکەم و فێر نابێ، دەڵێ:

تاڵە، ناخورێتەوە.

دەڵێم:

بیخۆوە، ئەو تاڵیە شیرینیەکی لە دوایە، لە تەمەنت تامت نەکردووە.

دەڵێ:

ئەوە چیت گوت! لە ژنیش بەتامترە؟

دەڵێم:

نا، گووی ئەوهام نەخواردووە، لە دنیایێ چ لە ژن بەتامتر نیە؟ تۆ تامی ژنت کردووە؟

دەڵێ:

نا، جارێك ویستم تامی پیرێژنێك بکەم، پیرێژنێ هێندەی گلۆڵە بەنێکی لێ مابۆوە، کورژ بووبۆوە، بەڵام وێدەچوو گەلەک شیرن بێ، دەتگوت کەوژە بە دارەوە، خواگیران لێیانتێکدام...

دەڵێم:

هەر بۆیە گوتم تا ئێستا تامت نەکردووە، دەی وەك من قومی لێدە.

دەڵێ:

تاڵە، زۆر تاڵە، لێمگەڕێ با بە قەند بیخۆمەوە.

دەڵێم: گووی تێمەکە، دیشلەمەی شەراب دامەهێنە.

گووی تێکرد، دایهێنا، بەختیار کلۆتە شەکرێکی خستە زاریەوە و چایەی شەرابی دەخواتەوە، بەختیار بە دیشلەمەی شەراب مەستە، بەو درەنگی شەوە مەستە و کتێبێکی کردۆتە دمك و بەندی ( مەشکێ) دەڵێ،

منیش بە شمشاڵ بۆی دەگێڕمەوە، خەریکە مەست دەبم و هەستدەکەم جگەرەم جوان بۆ ناپێچرێتەوە، دەڵێی خەو دەمباتەوە، بەوەی باشە ئێشکگریەکەم کەوتبووە سەر لە ئێوارە و لە کۆڵم بۆتەوە، بەختیار وەك سۆبە دارەکە گەرمداهاتووە و ساردنابێتەوە، دەڕوانمە کاتژمێرەکەم و دەڵێمە بەختیار:

کاتی ئێشکگریت نزیکبۆتەوە، وەرەوە سەرەخۆ، ئەگەر نا من لە جیاتیت...

بەختیار دەڵێ:

خەمت نەبێ، ئەو شەو زۆر باشم، ئامادەم ئێشکگری لە هەموو دنیا بگرم.

دەڵێمە بەختیار:

کەواتە بانەکە بماڵە، بەفر زۆر کەوتووە، با بە سەرماندا نەرووخێ.

بەختیار دەڵێ:

تۆ خەوی خۆت بکە، خەونی خۆش ببینە، هەموو بانەکان هی بارەگا و گوند بە ماڵی پوورە(...)یشەوە دەماڵم.

دەڵێمە بەختیار:

نا، نا، نەکەی لە گوند نزیکبکەویتەوە، دوایی وەك سەگ دەتتۆپێنن و دەتخەنە بن بەفرەوە، تا بەهارێ تەرمەکەت نابیننەوە.

بەختیار دەڵێ:

لەوە خۆشترا شەهید دەبم.

دەڵێمە بەختیار:

پێشەوەی ئێشکگرەکە بێتە دەرگا، تۆ بڕۆ دەرێ نەوەك بۆن بکات.

بەختیار دەڵێ:

بۆنی چی دەکات؟ دیشلەمە! خۆ من دیشلەمەم خواردۆتەوە.

ئێشکگرەکە بانگیکرد و بەختیار چووە ناو بەفری رێبەندانی بارەگای گۆڕەشێرەوە، منیش لە ژوورە گچکە گەرماویەکە لە بن بەتانی مامەوە،

ژووره‌كه گچكه بوو، هه‌ر جێی پیاوێك و نیوی لێده‌بۆوه، له كه‌لاوه‌یه‌ك كه بێراییه‌كی گه‌وره بوو، دوو لا دیواری مابوو، له‌و لایه‌وه‌ش سێ چوار ئه‌ستوونی ئه‌ستوور بانه‌كه‌یان راگرتبوو، من حه‌زم له ته‌نیایی بوو، له‌و كه‌لاوه‌یه ژوورێكی گچكه‌م به به‌رد و نایلۆن قیتكردبۆوه، به‌ختیار له ژووره گه‌وره‌كه‌ی سه‌ره‌وه، ژووری سه‌رڕێژ له پێشمه‌رگه ده‌خه‌وت، به‌ڵام زوو زوو ده‌هاته لای من، ئه‌وشه‌و به سه‌ر شه‌رابدا هات، هێنده‌ی نه‌خوارده‌وه، به‌ڵام هێند مه‌ستبووه هێنده مه‌ست، وا له شه‌وی به‌فراوی له كاتژمێری ئێشكگری به‌ندان ده‌ڵێ و نایبڕێته‌وه، بۆ میز چووم ده‌رێ، دیتم له ناو به‌فرێ باوه‌شی بۆ به‌فر گرتۆته‌وه، پێیه‌كانی تا سه‌ر چۆكی له به‌فر رۆچوونه، گوتم:

+وه‌ره بن بێرایی، ده‌نا ده‌بیته كرێمستی.

- قه‌یناكه، زۆرم گه‌رمایه، حه‌ز له كرێمستی ده‌كه‌م.

+ وه‌ره خۆت كه‌ر مه‌كه، ده‌نا له ترێ سه‌ی ده‌چی.

- ئه‌دی خۆت نه‌تده‌گوت كه‌ربوون پله‌یه‌كی به‌رزه، كێ ده‌یگاتێ؟ ده‌ی شمشاڵه‌كه‌ت بێنه.

+ ئه‌گه‌ر بێیه بن بێرایی، شمشاڵ دێنم.

- هاتم

به‌ختیار زۆر حه‌زی له شمشاڵ بوو، هه‌ر كاتێ بمگوتبا شمشاڵت بۆ ده‌ژه‌نم، هه‌رچیم ویستبا بۆی ده‌كردم، هات و به‌و شه‌وه به دیار به‌فره‌وه، ئه‌و به به‌ند و من به شمشاڵ كردمانه به‌زمی خۆمان، هێستره‌كه‌ش كه له بن بێراییه‌كه به‌سترابۆوه، تێكه‌ڵ به به‌زمی ئێمه بوو، به‌و چاوانه‌ی خۆم دیتم - ئه‌گه‌ر چاوم سه‌مای نه‌كردبێ- هێستر به هه‌ر چوار پێیان سه‌مای ده‌كرد، ببینن له بن بێرایی به‌فره‌وه دوو پیاو و هێسترێك به هه‌شت پێوه چ سه‌مایه‌كی مه‌ستانه ده‌كه‌ن، ئێشكگریه‌كه‌ی به‌ختیارمان به سه‌مای هێسترانه به سه‌ر برد، دواتر ناومان له سه‌مای ئه‌و شه‌وه نا سه‌مای هێسترانه، شه‌وی دواتر به‌ختیار پرسی:

+ ئەو عارەقەت لە کوێ هێنا؟

- شەرابەکە هی ڕێبوار عەرەب بوو.

+ هیچ نەماوە؟

- بە داخەوە هەر ئەو مەتارەیە بوو.

+ بزانە مەتارەیەکیدی...

- زۆرم لێیوەرگرتووە، ڕووم نایە داوابکەم، بەڵام هەوڵدەدەم بۆ خۆم شەراب بگرمەوە.

+ دەزانی؟

زۆر تەماشای دەستی ڕێبوارم کردبوو، ئەگەر خۆم لێدەم ڕەنگە سەرکەوتووبم، هێندە زەحمەت نیە، چی دەوێ، جلیکانەیەك و هەندێك کشمیش و.

ناوی خوام لێیهێنا، ناوم لە جلیکانەکەش نا گۆزە، ئەو ڕۆژەی شەرابم گرتەوە و گۆزەم خستە چاڵەوە، ساڵ گەیشتبووە ڕەشەمێ، بەفر بە بارەگاوە نەمابوو، هەمان ڕۆژ کوڕێك گەیشتە بارەگا، گوتیان لە شارەوە هاتووە، زوو بووینە برادەر، لە هۆدەکەی خۆم جێم بۆی کردەوە.

ئەو کوڕە دەنگی خۆش نەبوو، بەڵام حەمە سالح دیلانی جوان دەگوتەوە، لە کاتی گۆرانی گوتن بنێشتی دەخستە جێگەی ددانە شکاوەکەی، وای نەکردبا، هەندێ دەنگی بە شێوەیەك گۆدەکرد لە گوێ خۆشنەدەهات، ددانی پێشەوەی هی سەرێ شکابوو، بۆ شکابووا من دەمویست توورەی بکەم، توورە نەدەبوو:

+ باشە بۆچی چوویە گژ هێستری چەمووش؟

- سەیدا، ئێ، چیبکەم هێستری دەستەمۆ دەستنەدەکەوت.

کوڕە ددان شکاوەکە کە منی بە سەیدا بانگدەکرد ناوی (ئاوات) بوو، لە هۆنینەوەی درۆی سپی دەستڕەنگین بوو، درۆیەکانی شاری بوون، تاموبۆی شاریان پێوە بوو، من چێژم لێیان وەردەگرت، ئاوات شیعریشی دەنووسی، چەند شەوێکی پڕ شیعر و گۆرانی و شمشاڵ و درۆی ناسکمان

بە یەکەوە بەسەربرد، شەوێکیش خواردمانەوە، عەرەقمان خواردەوە، (شۆڕش)ێك چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ کردین، نیو بوتڵ عەرەقی بە دیاری داینێ، مەزەمان برنجە سۆرەی ئێوارێ و سەلکە پیازێك بوو، ئاوات لە سەرخۆشیدا جوانتر گۆرانیی دەگوت، درۆی جوانتریشی دەهۆنیەوە، دەمگوتە ئاوات:

- با شەرابی خۆمان پێبگات، هەینێ وەك بەهار مەست دەبین.

+ دیارە بەهاری ئێرە زۆر بە گوڵە!

-هەرچی گوڵ هەیە لە دنیایێ، لێرە دەیبینی.

+ سەیدا، گۆزەکە زۆری ماوە؟

- چەند ڕۆژێك.

حەیف، شەڕێ هاتە پێشێ، قەندیل بانگیکردین، ڕۆیشتم و گۆزەم بە ئاوات سپارد، گوتم:

- جوان ئاگات لە گۆزە بێ، لە کاتی خۆی سەری شل و توند بکەوە، زۆر وریابە ئاشکرا نەبێ.

+ بێ خەم بە سەیدا، دایك لە کاتی شیردان بە کۆرپە چەند بە ئاگایە، منیش ئەوها دەبم بۆ گۆزە.

- ئەگەر نەهاتمەوەش وەك شیری دایکت حەڵاڵت بێ.

+ سەیدا وامەکە لەگەڵت بێم، ئەو قەمسەڵە ئەفسەریەت زۆر جوان لێدێ، ئەفسەرەکەت چۆن کوشت؟

- لە کوڕەکەی ئایشە گوڵ بپرسە.

بەر لەوەی دەستی ماڵاوایی بخەمە دەستی ئاواتەوە، دەبێت قسەیەك لە قەمسەڵەی حەمەی ئایشەگوڵ بکەم، هێشتا ئاوات نەهاتبوو، ڕۆژێك کوڕەکەی ئایشە گوڵ ئەوەی زۆر کەس بە(حەمەی حەلاق) ناوی دێنن، هاتە هۆدەکەم، دەمێك بوو نەمدیتبوو، ئەو دیدارە جیابوو لە گشت دیدارەکانیدی، ئەو کوڕە لەمێژە دەناسم، زۆر جاریدی بە دیداری گەیشتووم، لە هەڵمەت و هەڵاتن و هەڵگەڕان و داگەڕانیش دیتوومە،

بەڵام لەو دیدارە کوڕەکەی ئایشەگوڵ جیابوو، چ بە خۆی نەدەچوو، لە دیدارەکانی پێشوو قسە لە گوللە و تفەنگ و شەڕ بوو، ئێستا قسە لە وشە و وێنە و شیعرە، من پێشتر شیعرێکی ئەوم دیتبوو، کە بۆ برا گچکە شەهیدەکەی گوتبوو، بەڵام وەك بڵێی باوەڕمنەدەکرد رستەکان لە چنینی خۆی بن، ئاخر ئەو پیاوە هێند پێشمەرگە بوو هێند پێشمەرگە، هێند پڕ بوو لە گوللە، نەدەکرا جێی شیعری لێببێتەوە، هەرچەندە بیستبووم زۆر پیاوی گەورەی شەڕانی، شیعریان نووسیوە، وێنەیان کێشاوە، مۆزیقایان لێداوە، بەڵام نازانم بۆ، بۆ حەمەی ئایشەگوڵ وام بیر دەکردەوە! لەو دیدارە تێگەیشتم من چەند هەڵەم، گوتی:

راوەستە شیعرێکت بۆ دەخوێنمەوە، بزانە چۆنی دەخوێنمەوە.

یەکسەر بیرم بۆ ئەو شیعرە چوو کە بۆ براکەی نووسیبوو، بۆمی دەخوێنێتەوە، گوتم:

حەزدەکەم گوێم لە شیعر بێ.

چاوی بە لوولەی سۆبەکەدا هەڵبڕی:

چلێ نێرگز

لە بەر دەرگای ماڵتان

---

شیعرەکەی ئەزبەر بوو، جوانیشی خوێندەوە و گوتی:

من ئەو شیعرەی تۆم زۆر خۆشدەوێ.

گوتم:

جوانت خوێندەوە، دەستخۆش.

حەمەی ئایشەگوڵ، قسەی هێنایە سەر هێمن، هێند سەرسام بوو بە هێمن، مەگەر من هێندە پێی سەرسام بووبم، چەند دێڕە شیعرێکی هێمنی خوێندەوە و راڤەشی دەکردن، باسی ئەوەشی کرد، شاعیر لە کاتی شکستەکان نابێ نائومێد بێ و دەست بە خۆیدا شۆڕبکاتەوە، گوتی:

هەستدەکەم تۆ زۆر رەشبینی.

گوتم:

رەنگە، من هەمیشە جۆرێك لە رەشبینی دایگرتووم.

گوتی:

رەشبینیی زۆر، شیعر دەکوژێ.

لە کورەکەی ئایشەگوڵ پرسیاری ئایشەگوڵم کرد، ئەویش هیچی لە چارەنووسی نەدەزانی، من لە منداڵیەوە ئایشەگوڵم دەناسی، پێش کور دایکم ناسی، لە (بەفری قەندی) کۆیە دیتبووم، دەستەخوشکی پلکم بوو، من لەوێ چەند جارێ دیتم، جەژنانەشم لە دەستی وەرگرتووە، یاپراخی دەستی ویشم خواردووە، دواتریش دوور بەدووری دەمدیت، درەنگتر زانیم ئایشە گوڵ پاڵەوانە، ئێ، کورەکەی ئایشەگوڵ لە پڕ گوتی:

+ قەمسەڵەکەت داکەنە.

- لۆ؟

+ تۆ دایکەنە.

بە زۆر قەمسەڵەی خۆی بە جێهێشت و شڕە ونجڕونجڕەکەی منی بە شان دادا، گوتی:

من قەمسەڵەیەکیدیم هەیە.

گوتم:

خاوەن ئەو قەمسەڵەیەت بە دەستی خۆت کوشتووە؟ یان...

گوتی:

ئەوە سەربردەیەکی زۆر شەڕانی بوو، لێیگەڕێ، لێیگەڕێ با دانیشتنەکە بە شیعری بمێنێتەوە.

لە سەری چەکوچ و سادرێ، لە بن تۆپبارانێ، هزرم هەر نک گۆزەی شەراب بوو، کەی شەڕ تەواو دەبێ و دەگەڕێمەوە ژووری شەرابیی، ژووری گۆزەیی، ژووری ئاواتی، ژووری شمشاڵ و سترانی و درۆی سپی، ئەو شەڕە چ پێناچێ دوایی بێ، لە شەڕی هەمیشەیی دەچێ، هەر شەو و رۆژێکی ساڵێکە، هەر گوللە تۆپێکی مردنێکە کە لە نزیك

سـەنگەرەکانمان بە عەرد دەکەویٚ و دنیـایەك سـاچمەی لێـدەکەوێتەوە، نەکوژرێم و مەتارەکەم پڕ لەبادەی گۆزەکە بکـردایە! بە برینـداریش لێـی دەرچم باشـە، شـەڕ کۆتـایی نەهـات، بەڵام دەستەیەك پێشـمەرگە هـاتن و جێی ئێمەیان گرتەوە.

گەڕاینەوە، ئەوجارە بە بازگەی پاسـدارانداو بە ترومبێـل و بەو دیـودا بەرەو بارەگای گۆزەیی سووڕاینەوە، ئێستا شەراب جوان پێگەییوە، ئەوشەو هێنـد دەخـۆمەوە هەرچـی مانـدوویێتیە دەیهێـنمەوە، هێشـتا نەگەیشـتبوومە نۆکان، بیستم بارەگـای گۆڕەشـێر بـاریکردووە و هـاتوونەتەوە نۆکـان، بەو هەواڵە راچەنیم و لە چارەنووسی گـۆزە کەوتـمە گومـانەوە، دەبـێ ئـاوات دەریچوواندبێ و ئاشـکرا نەبـووبێ، نیـوەڕۆیە، زەوی وشـکە، هەوا خۆشـە، چاوەڕێی هاتنەوەی ئاوات دەکەم، ببینم و هەواڵی گـۆزەم بـداتێ، ئـاوات چووبووە بارەگاکەی سەرێ، هاتەوە، تیمکردەوە:

+ گۆزەکە؟

- سەیدا، دوایی، دوایی...

+ بۆ دوایی؟

- دوایی، داربەڕوویێك حەزی لە بادە بوو، دامێ.

+ کەواتە لە وەرزی بەڕوو دەچینە بن داربەڕووەکە و بەڕووی بـادەیی دەخۆین.

نانمان خوارد، لە بن دیـوارەکە لە سـەر بەردێ روو لە رووبـار و رێـیە گشـتیەکەی سـەر رووبـارەکە، چـایەم لە پێشـە و خەریکـی پێچـانەوەی جـگەرەم، دیـتم لە نزیـك گەرمـاوەکە ئـاوات و کادیرێـك بە دەم چـایە خواردنەوەوە خەریکی راوێچکەن، هێشتا جگەرەکەم دانەگیرساندبوو لێـان بووە قڕەقڕ، دوو مژم لێنەدابـوو، مستەکۆڵەیەك بە دەوی ئـاوات کەوت، ئیدی بووە شـەڕ، لێکیـان کـردنەوە، ئەو کـادیرە لە بارەگـاکەی گۆڕەشـێر بوو، من دەمێك بوو قسەم لەگەڵی نەبوو، دوای نیـوەڕۆیەك هەر لە بارەگـا بەفریەکەی گۆڕەشێر هێشتا ئاوات نەهـاتبوو، خـراپ تێکگیـران ئەو نـازانم

چی لە دەست بوو، بەڵام چەکی دەستی من شیشێکی سەر ئاگردانەکە کە درێژیەکەی لا باڵێك دەبوو، زوو کەوتنە نێوانمانەوە دەنا پیس لە یەکترمان دەدا، شەوەکەی جەلال دەباخ هەردووکمانی بانگکردە ژوورەکەی خۆی و لەگەڵ یەکتر تەوقەی پێکردین، بەڵام پێکنەهاتینەوە، شەڕەکەی من لە بیرم نیە لەسەر چی بوو، دەنا دەمگێڕایەوە، بەڵام شتێکم لە هی ئاوات لە بیرماوە، ئاوات ئەوهای گێڕایەوە:

+ هێشتا تۆ نەڕۆیشتبووی کێشەیەك کەوتبووە نێوانمان، دواتر لە سەروەختی بارکردن، نازانم چۆن بۆنی کرد و بە گۆزەکەی زانی، دەیویست دنیا تێبگەیەنێ کە ئاوات بۆ شەرابگرتنەوە هاتۆتە چیا، ئیدی گۆزە بووە خاڵی لاوازی من، ئەوەبوو گۆزەکەم رژاندە بن داربەڕووەکەی سەر سیلەی خانووەکە.

- کەواتە ئەو مستەی خواردت، بە هۆی گۆزەکەی منەوە بوو؟

+ نا، کێشەکە لە گۆزەکە گەورەتر بوو.

ئێستا تووڕەم، پتم لێدەن دەتەقم خواخوامە کادیرەکە قسەیەك بکات، مۆڕەیەکم لێبکات، زۆر جار بە دزیەوە شیشەیەکم دەخستە بن ساقۆکەم و ئەگەر کەس دیار نەبا چاوی تووڕەیی و شەڕاویم تێدەبڕی، بۆ ئەوەی بێتە وەڵام و شیشەیەکی بخەوێنمێ، بەڵام ئەو بە کەرایەتی منی نەدەکرد و خۆی تێکنەدەدا، زۆری نەبرد کادیرەکەیان ناردە رووسیا، پێشمەرگەیەکی تووڕە وەك بڵێی تیز بە پارت و بارەگا بکات، بە دەنگی بەرز دەیگوت:

هەر کادیرێك حەزی لە رووسیایە، با مستێك راوەشێنێ، مستەکە چەندی توندتر بێ، زووتر دەگەیێ.

دواتر، تەواوێك دواتر ئاواتیش چووە ئێران و ماوەیەك لەوێ مایەوە و لەوێشەوە بۆ رووسیا، پێشمەرگە تووڕەکە کە ئەوەی زانی دەیگوت:

هەر کادیرێك دەیەوێ مست بوەشێنێ، من ئامادەم و دەستیش ناکەمەوە.

ئیدی شەرابگرتنەوەم لێنەهات و چیدی نەمگرتەوە، دیارە لە

بارەگاكاندا مەی قەدەغە بوو، بە ئاشكرا نەدەخورایەوە، بەڵام زۆری وەك منیش هەبوون ئەگەر بەدەستیانكەوتبا لە پەنایەك یان لە درەنگانی شەو خۆیان مڕدەكرد، ئەوەی لە ناو بارەگاو لە بن جێیەكەی خۆشی دەیگرتەوە دەبوو زۆر بە نهێنی بێ، تەنها كەسە نزیكەكانی خۆی دەیانزانی، ئاخر زۆر جار مەی گۆبەندی ناوەتەوە، گۆزە گۆبەندی ناوەتەوە، گۆبەندەكەی بارەگای دۆڵەكۆگە لە هەموو قەندیل دەنگی دایەوە، لە زاری پێشمەرگەیەكەوە بیستم، وای گێڕایەوە:

ئێمە سێ برادەر لە بازاڕەكەی سونێوە دوو شووشە عەرەقمان بۆ هاتبوو، لە بن بەردی دەو چەمەكە شاردبوومانەوە، ئێوارەیەك دامانناكە شەو درەنگ بخۆینەوە، ئێ، هێشتا مەزەمان دانەنابوو، هێشتا شووشەمان دەرنەهێنابوو، دیتمان بەرپرس دوو شووشە عەرەقی وەك ئەوەی ئێمەی بە دەستەوەیە، خۆی چەند سووربوو سوورتربۆوە، تووڕە تووڕە، ئاگری لە چاو دەباری، بەردی لە زاری دەڕژا، پرسی:

+ ئەو دوو شووشەیە هی كێیە؟

-....

+ دەڵێم ئەو دوو شووشە گووە هی كێیە؟

-...

لە دڵی خۆم گوتم، ئەدی بۆچی بە دەستەوە گرتووە!

+ باشە ئەو دوو شووشەیە لە كێ بەرم؟

-...

هێندەی نەمابوو بڵێم، با بە فیڕۆ نەچن، لەو دوو برادەرەم...

بەرد بە دەنگ هات، كەس ورتەیەكی لێوە نەهات، هەر كەسێك قسەیەكی بكردایە بە ملی ئەودا دەهات.

+ باشە هی كەس نیە، هی خۆمە، ئەوە میزی خۆم بوو تێمكرد، گوتم بزانم كێ دەیخواتەوە، كەس دەیخواتەوە؟

-...

دەمویست بڵێم، ئەگەر میزی تۆ ئەوهایە، ڕۆژی شووشەیەك بۆ من!

هەرچی پرسی، کەس باگۆی نەدایەوە، هەرچی گوت، کەس نەهاتە گۆ، دیتم سەری شووشەی کردەوە و بە بەر چاومانەوە چۆڕ چۆڕ ڕژاندیە زەویەوە، پێشمەرگەکەی تەنیشتم سەری هێنایە بن گوێم:

+ چۆنە بڵێم بە سەر مندا بیرژێتە.

- نەکەی، ئاشکرا دەبین.

ئیدی بە بەر چاومانەوە ئەو عەرەقە نازدارە ڕژایە زەوی و وەك تەمەنی چوو بە فیڕۆ چوو.

گۆزە شەرابەکەی منیش بە فیڕۆ چوو، دوای ساڵانێکی زۆر ئاواتم دیتەوە، گوتی:

هەنکەش جێی مستەکەم دێشێ.

گوتم:

لە خۆم نابوورم، گۆزەکەم گۆبەندی نایەوە.

گوتی:

ڕژانی شەراب لە ڕژانی خوێن ناچێ؟!

گوتم:

ئەو داربەڕووەی شەرابی خواردبێتەوە، بەرووی شەرابی ناگرێ؟!

گوتی:

ئەو چۆلەکانەی لە سەریشی دەنیشنەوە، مەست دەبن.

گوتم:

ئەو گۆزەیەی گۆبەند بنێتەوە، دواتر ڕستەی شەرابیی لێدەکەوێتەوە...

## بارەگایەك
## بە سەر پەلکەزێڕینەوە

ئەها ئەو بارەگـایەی ئەو بەری چەمەکە کە دەڵێـی لە رووگە تـۆراوە، هەمیشـە روو لە نسـێ و پشـت لە تـاوە، تـا نەڵێـی بارەگـای لاتە کەس نایبینێتەوە، کەس نایناسێتەوە، تا لاتە نەخەمە چەنـد رستـەیەکی لاتەوە قسـە نـاچێتەوە سـەر چ کەس و جێـوڕێ و وەرزێ! نـاچێتەوە لای ئەو دارگێوژەش کە لە خۆوە شمشـاڵی دەژەنـد! لاتە پیـاوێکە کەڵەگەت زۆر کەڵەگەت، ژنە رەوندێك کە رەشماڵیان لە بن مامەندە هەڵدابوو گوتبووی:

داربەڕووێکم نەدیت، هێندەی کاك لاتە بڵند.

ژنێکیدی گوتبووی:

داربەڕووی چـی! بە خـودای شـەش حەفـت لاتـان بچـنە سـەر شـانی تێکدی، دەگەنە دوندی مامەندە.

لاتە رەقەڵە بـوو، چ نـاو قەدی نەبـوو، بـۆیە چـل پەنجـا گەز پشـتێنی دەبەست، هەندێك کەس رەقەڵەیی و قەد باریکیی لاتەیان کردبووە مەتەڵ، بە چی دەچێ، هەر یەکە بە شتێك هەڵیدا بوو، بەڵام یـاوەری پەیـامبەرەکە لە هەمووان جوانتر مەتەڵەکەی هەڵهێنابوو:

لە لوولەی سۆبە دەچێ، نابینن هەمیشە دووکەڵیشی لێ بەرزدەبێتەوە.

ئەرێ وشەی لاتە لە چیەوە هاتبوو؟

هەبوو پێیوابوو لاتە لە (لات)ی برای (رووت)ەوە هاتووە، لاتە خۆشـی

لات بــوو، بەڵام لە زاری ژنە ڕەوەنــدەکەیان بیســتبوو کە لاتە (لات)ی زەویی پێبڕاوە، ئەوە نیە کە پاڵدەکەوێ لاتە عەردێك دەگرێ، دەڵێی وایە، دە تیچاوێکی بـدەنێ ئەو سـاتانەی لە بەر بێـراییەکە رادەکشـێ، یـان لە سـەربانی پەیـامبەرەکە یـان لە دەو چەمەکە، لە گـۆڕاییەکەی بـۆ تۆپـانێ خۆشـکراوە، جـا لە کـوێ پاڵنـاکەوێ، ئەو پیـاوە خـۆ دانیشـتنی نـیە یـان ڕاوەسـتاوە یـان پـاڵکەوتووە، لە ڕاوەسـتانیش هەمیشـە دەسـتی ڕاسـتی لە کەڵەکەیەتی، یاوەرەکە دەیگوت:

چەمێك وردە بەرد لە گورجیلەی لاتەیە.

لاتە کەس لە بیری نیە لە کەیەوە پێشـمەرگەیە، تـا گەیشـتۆتە ئێـرە بە ناو هەزار شەڕ و شۆڕدا هاتووە، نازانم چەند دەبێ سۆسیالیستە، بەڵام زۆر ڕشتە لە سەری و دەڵێ:

ئەگەر سێ سۆسیالیست لە دنیایێ بمێنن، یەکیان منم.

بارەگای سۆسیالیست و کۆمۆنیستەکان چەمێکیان بەینە، چەمێك دەنگی لە چ چەمان ناچێ، بڕۆ منداڵی لە دیار بخەویتە، پوورە ئایش دەیگوت:

ژنانی ئێرە هەموویان لەو چەمەوە فێری لای لایە بوونە.

چەمــی نێــوان دوو بارەگــا ســارد ســارد، ڕوون ڕوون، لە بەفــری مامەندەوە دێ، لە کوێستانی مامەندەوە دێ، ئەگەر پەیامبەرەکە لێم تـووڕە نەبێ، دەڵێم لە مامەندەی بەهەشتەوە دێ.

ئێـرە جـگە لە مـن هەمـوو کەس بە بارەگـای نـاوزەنگی سـەرێ نـاوی دێنن، مـن لە بەهارێکـدا کە تـا ئێسـتاش بەهـاری وا بەهـاریی، لە چاومـدا کەسـك و نمـاوی خـۆی نیشـانەداوەتەوە، بەهارێـک خوسـاری سـپێدانی، دەتگۆ تەنکە سپیاوە بە ڕووخساری (سووزی)ی تازە لە شـارەوە هـاتوو، لە بەهارێکی وادا نـاوم نـا بارەگـایەك بە سـەر پەلکەزێـڕینەوە، جـار جـارەش لەبەر خـاتری بەفـر بە بارەگـای بەفـر نـاوی دێـنم، ئەگەر یەشـار کەمـال دەسـتمبگرێ و بمگەیەنێـتە ئەو جێـیە لە وەسـپ کە لەوێ وشـە جـێگەی کامێرا دەگرێتەوە، پەلکەزێڕینەکانتان نیشاندەدەمەوە، ئێستا حەزم لە بەفرە و

دەگەڕێمەوە بۆ زستان، دەچمەوە کۆلانەکانی بەفر و زوقم و سایەقە، ئەو کۆلانە تەسك و تریسکانەی بێ گلۆپ و چرا شەویان لە ڕۆژیان ڕووناکتر بوو.

ئەو زستانەی بارەگا لە هەموو زستانان زستانتر بوو، بەفر لێنەدەکردەوە، بە حەفتە لێنەدەکردەوە، پێشمەرگە ئیشوکاری ببووە باگوردان گێڕان و سۆندە کردنەوە، ئەو سۆندەیەی لە کانیەکەوە دەهات و بارەگای ئاودەدا، شەوان دەیبەست، دەبوو سبەینان بە ئاوی گەرم بیکەیتەوە، پێشمەرگە ئیشوکاری بۆتە بەفرماڵین و ڕێکردنەوە، ڕێی نێوان ژوورەکان، کۆلانی گەیشتن بە سەر بانەکان، کۆلانی شۆڕبوونەوە بۆ ئاودەستەکە، کۆلانی تەنیشتاوتەنیشتی گەرماوەکە، بەو تەنیشتەوەش کۆلانی ماڵە گچکەکەی هێستر، کۆلانی نانەدینەکەش کە هەموو کۆلانەکان لەوێیان دەکردەوە، لەوێشەوە کۆلانێك بۆ گومبەتی داران، گومبەتی چی! تەماشاکە چیایەك دار هەڵدراوەتەوە، زستانی بارەگا بە چیا داری دەوێ، تەماشاکە بەفر بەژنێك پتر هەڵدراوەتەوە، تەماشای ئەو هەموو کۆلانە بەفریە بکەن، بەفر ئەو هەموو کۆلانەی هەیە، بارەگای بەفر سێ کۆلانی بەفریشی لێوە دەبێتەوە:

کۆلانێك ئەوەتا دەچێتە بارەگای بەرانبەر، بارەگای لاتە و پەیامبەرەکە، نازانم کێ بوو ناوی لەو کۆلانە نابوو:

کۆلانی پەیامبەرەکە.

کۆلانێك بەو تەنیشتەدا دەڕوا دەڕوا، بەو پێچەدا دەڕوا و پێچدەکاتەوە و دەگاتەوە زەلێ، زەلێ ئەو گوندەیە لە شەوانی سایەقەی زستاندا دەڵێی گەرەکێکە لە ئاسمان، لە گەڕەکەکانی ئەستێران، زەلێ لە بەهاراندا چەپکە گوڵاڵەیەکە بە چیاوە، زەلێ لە هاوین و پایزاندا جگە لە زەلێ لە هیچ ناچێ، من بەو کۆلانەم دەگوت:

کۆلانی بادە.

ئاخر چەند کەڕەتێ لەو کۆلانەوە بادەم بۆ هاتبوو، کۆلانی سێیەم

ڕێـك ڕووەو قـووڵایی زەوی ڕۆدەچـێ، ڕووە و نـاوزەنگی خـوارێ، لە زستانان لە ناوزەنگی خوارێوە تا سەر دەکەویەوە، دوو کەرەت بە ئاسماندا هەڵـدەگەڕێـت و دادەگەڕێـتەوە، ئەرێ نـاوزەنگی خـوارێ بـۆچی وا کەوتبوویە قووڵایی دنیاوە، ئەو کۆڵانەش وا بزانم قاسم بوو ناوی نابوو:

کۆڵانی ئازووقە.

ئازووقە لەو کـۆڵانەوە دەهـات، تەنهـا قاسـم و هێسـترە مـاچە دەزانـن بارەگا بەفراویەکە چەند بارە ئازووقەی لرفکردووە.

بەفر لێناکاتەوە، بەفر زەوی گرتووە و ناچێتەوە، بەفر دەڵێـی نۆبەتـداریە لە پێشـمەرگە نـابێتەوە، بەفـری دنیـا بە قەندیلیشـەوە بە سـەر ناوزەنـگ و ئاقاری ناوزەنگدا دادەکا، پیـاوە ردێنپووشـیەکەی زەلـێ کە سـەراودەراوی دنیای کردبوو دەڵێ:

دنیـا بەفـری وای بە خـۆیەوە نەدیـوە، ئەمـن دەڵـێم هەڵەیەك لە ئاسـمان هەیە، هەوری قەندیلێش بە سەر ئێرەدا دادەکا.

ئەو پیاوە ردێن پووشـیە، هەر بە راسـتی ردێنـی زۆر لە دەسـکەپووش دەچوو، پووشی نەرم، ئەوەی بۆ کورتان دەبوو، ئەوەی کۆتر بۆ ناو لیسـێ دەیکێشێ، ردێنپووشی زوو زوو هاموشۆی دەکردین، مەراقی بەفر شکاندن بوو، چێژی دنیای لەوە وەردەگرت کە بە سەر بەفرێکدا بڕوا، پێی کەسـی بەرنەکەوتبێ، کەس هێنـدەی پیـاوە ردێنپووشـیەکە بە کـۆڵانە بەفـریەکەی زەلێدا نەهاتووە و نەچووە، من هەوکەشێوە تێنەگەیشتم ئەو هەموو هاتنەی بـۆچی بـووە، سـبەینان هێشـتا دنیـا لە شـەختەدا مـت بـوو، ئەو دەگەیشـتە سەرمان.

ئەو ساڵە ئەگەر بە ساڵی شەختە لە سـاڵژمێران تۆماربکرێـت، ڕەنگبـێ لە جێی خۆی بێ، ئەو زستانە تایبەتمەندیەکی جیـاواز لە هەمـوو زسـتانانی هەبـوو، تایبەتمەنـدیەك کەس وەك دایکـم نـاتوانێ بە کـێش و سـەروای فۆلکلۆریەوە بیناسێنێ، من لە ساتەکانی ئێشـکگری، ئێشـکگری لە شـەوانی شەختەبەندی، دایکمم دەهـاتەوە پـێش چـاو، لە پەنـجەرەوە دەبیـنم ئەوەتـا

هەولێر زستانیە، تەنکە بەفرێك کەوتووە، شەوێکی رووناکە، زەوی سپیاتە، ئاسمان سایەقە، رەنگی رەنگە بە لای شینی یان مەیلەو شینیدا بشکێتەوە، دووریش نیە رەنگێکیدی بداتەوە، چاوی من وای دەبینێ، دایکم لە حەوشەیە، دۆلکەیەك ئاوی بە دەستەوەیە، بە پرتاو خۆی بە ژووریدا دەکاتەوە و بە دەم هەڵلەرزینەوە، دۆلکە ئاوەکە دادەنێ و دەست هەڵدەبرێ وەك بڵێی لەگەڵ خودا بدوێ:

**ئەگەر دەتەوێ کوردان بکەی قڕ**

**بە شەو سایەقە و بە رۆژ هەوری پڕ**

پێدەچێ خودا ئەو زستانە نیازی قڕکردنی پێشمەرگەی هەبێ، کیمیاو ئەنفال قڕی نەکرد، سایەقە و هەوری پڕ قڕی بکات، من زستانی وام نەدیتووە، پیاوە ردێنپووشیەکەش نەیدیتووە، لە ئاسمان وردبنەوە، رۆژانە لەگەڵ هەڵهاتنی رۆژ کە لە کێوەکانی ئەوبەرەوە بە سەر بەفردا هەڵدێ، ببینن، تیسکی زێڕینی گزنگ ببینن، چۆن خۆی هەڵدەخات بە سەر سپێتی دنیادا، لەگەڵ ئەوەی رقی دنیام لە ئێشکگری بوو، بەڵام زۆر جار حەزمدەکرد ئێشکگریم بکەوێتە ئەو کازیوەی کاتەوە، هەرچەندە خەونە ناسکەکانیش هەر دەکەوتنە کازیوەوە، ئا هەر لەو کاتەوە، ئاسمانی تا ئاسمان هەیە هەر ساماڵ لێرەو لەوێ پەلە هەوری سپیاتی تێدەکەوت، پەلە هەوری دەگرت، تا ئاگرت دەکردەوە، پەلە هەورەکان دەستیان بۆ یەکتر درێژدەکرد، هێشتا چایە دێمی نەکێشابوو، پەلە هەورەکان دەکشان و کەلێنەکانی ئاسمان تەسکتر دەبوونەوە، هێشتا دوا پێشمەرگە دەستی بە ئاو نەگەیاندبوو، هەور کەلێنێکی نەهێشتبۆوە بۆ دیتنی ئاسمان، تا نان دەخورا بەفر دایدەکرد، ئیدی بەفر بەفر.

چاو چاو، وا کۆڵانەکانی بەفر، بەفر پڕیان دەکاتەوە، بەوەی باشە رۆژەکانی زستان کورتن، وەرنا پێشمەرگە کە بە زۆر شت رادەگەیشت، زۆر شتی رادەماڵی جار جارە بە رامالینی سەرباز و جاشیشەوە، بەڵام بە بەفر ماڵین و کردنەوەی کۆڵانەکانی بەفر رانەدەگەیشت، باش بوو رۆژانی

زستان کورت و کەم تەمەن بوون، لە بیرمان بێت هێشتا ئێشکگری یەکەمی شەویش کە پێش داهاتنی تاریکی کلاشینکۆفی ئێشکگریی دەکردە شانی، خۆی نەبەستبوو، پەلە هەورێك بە ئاسمانەوە نەدەما، نازانم چ پەرجوویەك بەو دەستوبردە ئاسمانی لە هەور پاکدەکردەوە، ئەو ئاسمانەی لە رۆژێکدا بایی زستانێك هەوری بەفریی نیشانی زەوی دەدا، دیسان ساهی، ساهی، سایەقە، سایەقە، زوقم و شەختە، تا سبەی دەمی کازیوە دنیا دەچێتە باری شەختەبەندیەوە، دایە، ئاگات لێیە، ئاسمان بە هەور و سایەوە رەنگە بریاری قڕکردنی ئێمەی دابێ.

هۆدەکەی من کەوتۆتە لای سەرێ، لە بن ئەو تەپۆلکەیە کە لە بەهاراندا گوڵی دنیا لە خۆی دەدات، بارەگا لە گوڵاو دەگرێت، تەماشای پەلکەزێرینە دەکات، ئەو دار گێوژەشی لێوە دیارە کە لە خۆوە شمشاڵ دەژەنێ، لە شێوەش ئەگەر لە دوورەوە و لە لاوە تێبڕوانی زۆر شێوەی ژنێك دەدا کە کەمێك چەمابێتەوە، ئەگەر بەفر رەقمان نەکاتەوە و بگەینەوە بەهار و (ناسکە رێواس) ببینێ ئیرەیی پێدەبات، ئێستا ئەگەر پێبڵێم:

لەو سەرە ژنێك لە ناو بەفرێ راوەستاوە و بەهاران زەرد و سوور دەچێتەوە و گوڵاو بە رووی پێشمەرگەدا دەپژێنێ...

بە پێکەنینێکی ناسکەوە و بە کوردیەکی ئاسووریەوە دەڵێ:

من زانم ئەتو شێت، بەس نەزانبووم ئەوها...

ئەو ژنە باوەڕ بەوە ناهێنێ کە لە نێوان ئێمە و بارەگاکەی ئەوبەر چەمێك هەیە، چۆن باوەڕ بە خەیاڵی شێتێك دێنێ، جارێك گوتم:

لەو دەو دۆڵە دار گێوژێك هەیە، شمشاڵ دەژەنێ.

بە دەستێك لە سەری خۆی دا و بە دەستێك رووی گرت، گوتی:

ئەتو شێت، تەواو.

ناسکە رێواس ناهەقی نیە باوەڕ بە بوونی چەمەکە نەهێنێ، دەزانن بەفر چۆنی پڕکردۆتەوە، ئەو ژنە بە خۆ و مێرد و شووبراوە لە وەرزی

بەفر و بە کۆڵانەکانی بەفردا گەیشتنە بارەگا، لە بەغداوە هاتوون، ئەو ژنە ناوی نهێنیی (سووزی) بوو، بەڵام من لەو نهێنیتر ناویم نا ناسکە ڕیواس، ئەو ناوە نهێنیەش تەنها ئەبوو سۆسەن دەیزانی و دەیگوت:

ئەو ژنە ئەگەر بزانێ ئەو ناوەت لێناوە، دڵنیام لە تەسکەرەش ناوی خۆی دەکردە ناسکە ڕێواس.

ئای مەبەستم بوو بگەمەوە بەهار و ناسکە ڕێواس لە ناو ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینەوە ببینم و بزانم لە ناو ئەو هەموو ڕەنگە خۆی چ ڕەنگێ دەبەخشێتە سرووشت.

ئەبوو سۆسەن تازە لە زیندانی کۆماری دۆزەخ هاتبۆوە، ئەو پیاوە کە زیندان گەیاندبوویە سەر لێواری شێتی، ناوی لە کۆماری ئیسلامی ئێران نابوو کۆماری دۆزەخ، ئەوەی ئەو لە زیندانەکان دیتبووی و بیستبووی و دەیگێڕایەوە، زۆر لەو دۆزەخە دەچوو کە دێرەکانی قورئان و فەرموودە لە زمانی مەلاکانەوە نیشانیان دەدایەوە، ئەبوو سۆسەن و پەیامبەرەکە تووشی یەکتر نەبوون، دەنا دوور نەبوو تووش تێکبگیرێن، ئەو پیاوەی لە کۆماری دۆزەخەوە گەڕابۆوە، ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونی کردبوویە دوژمنی بابە کوشتەی پەیامبەران و ئەوانەی خۆیان دەبردە ڕیزی پەیامبەرانەوە.

هۆدەکەی من کەوتۆتە بێرایەکی گچکەی هۆدەیەکی گەورەوە، بەشێك لە بێراییەکەم دابڕیوە، هۆدەکەی من زیادەڕۆ بوو، ئەو کوڕەی (لە ماڵی کتێبەوە هاتبوو) ئەو ژوورەی جوان ناساندبوو، بۆیە پێویست بە ناساندنەوە ناکات، ژوورە گەورەکە پەلێك پێشمەرگەی لە خۆی حەواندبۆوە، لە یادەوەریی مندا لەو پەلە خارە جەمیل لە هەموویان روونتر خۆی نیشاندەداتەوە، رەنگە بە هۆی سمێڵیەوە بێ، ئەها ئەو پیاوەی وا لە ناندینەکە روو لە دیوار و پشت لە ئاگر لە سەر چیچکان دانیشتووە ئەوە خارە جەمیلە، ئەو پیاوە لەوەتەی من دەیبینم هەر پشت لە ئاگرە، هەیە دەڵێ:

ئەو پیاوە بۆیە پشت لە ئاگرە و رووی تێناکا، چونکە چاوی بە بڵێسە هەڵنایە.

بەڵام خۆی شتێکیدی دەڵێ:

سەرماو سۆڵەی زستانێکی هێند تووش چۆتە پشتمەوە، پێویستم بە یەك ساڵ پشتدانە ئاگر هەیە.

ئیدی نازانم خۆی باشتر دەزانێ یان خەڵك! ئەو پیاوە پشت لە ئاگرە سمێڵێکی هەیە، سمێڵی مەلا جەلال لە چاو سمێڵی وی دەڵێی بڕۆی حەسەن زیرەکە، ئەو خارە جەمیلە دەیویست لە هەموو شتێك لاسایی مەلا جەلالی خزمی بکاتەوە، ئەودەمەی دەتگوت:

ئەڵاە! لە راوەستان چەند لە مەلای خزمت دەچی!

خارە جەمیل هەر لە جێی خۆی بستێك بەژنی دەکرد، خۆی جوانتر رێکدەخست و لە سەر پەنجە رادەوەستا، ئەو پیاوە دەیویست لە هەموو شت لە مەلا جەلال بچێ، لە رۆیشتن، لە دانیشتن، لە پاڵدانەوە و تفەنگ خاوێنکردنەوە، لە هەستانەوە و تفەنگ لە شانکردن، لە ژن نەهێنانیش لاسایی ئەوی کردبۆوە، جەمیل زۆر بە جەلال سەرسام بوو، پێی وا بوو لە دنیایێ تەنها دوو کۆمۆنیستی تەواو هەن، یەکیان فەهدی مردوو ئەویدی مەلا جەلالی زیندوو، هەرچی مەلا جەلالە دەیانگوت گوتبووی:

جەمیل تەنها لە سمێڵ شتێك لە من دەچێ.

جارێك پێشمەرگەیەك گوتیە خارە جەمیل:

باشە بە حەفت سمێڵی وەك هی مەلا جەلال ناگاتە لا سمێڵێکی تۆ، چۆن دەڵێ بە سمێڵ شتێك لە من دەچێ؟

کەمێك سمێڵی هەڵدایەوە:

هاوڕێ مەلا جەلال هەرچی بڵێ راستە.

خۆزیا دەتاندیت چۆن سمێڵی هەڵدەدایەوە، بە تایبەتی لە ساتی نان خواردن، بە دەستێك سمێڵی هەڵدەدایەوە و بە دەستێك پارووی دەخستە دەمی، من کە یەکەم جار دیمەنی هەڵدانەوەی سمێڵم دیت، مندال بوومەوە، گەڕامەوە هەولێر و چوومەوە نزیك سینەمای حەمرا.

لەویّ، لەو بەرە لە بـن دیـواری ئەو گۆڕسـتانەی (دلّـدار)ی لە خـۆی خەواندبوو، لە سـەر ریّ کـوپەیەکی گەورەی هەمیشە تەڕ لە ریّـی خـودا دانرا بـوو، دوو جـامیلکەی جوانیشـی بە زنجیـری باریـك پێـوە بەسـترابوو، هەرچـی ریّبـواری هاوینیـانەی ئەو ریّـیە هەیە، لێیـان دەخـواردەوە، کـێ بینیوێەتی ژنی پێچەبەسەر چۆن لەو کوپە ئاوی دەخواردەوە؟ جامە ئـاو لە دەستی راستی، بە دەستی چەپیشی پێچەکەی کەمێـك هەڵـدەدایەوە، رێـك وەك هەڵدانەوەی سمێل.

من پێشتر ئەو پیـاوە سـمێل دەسـکە قـوڕادەیەم - خـۆی حەزیـدەکرد پێبلێین سمێل دەسکە قوڕادە- دیتبوو، لە دەو بەستی شەرغە دیتبووم، بەڵام ئەودەمانێ سمێلی شتێك لە سمێلی خارە جەواد پڕتر بوو، باش بوو لە ریّی سمێلی خارە جەمیلەوە، خارە جەوادیش هاتەوە یاد.

ئەویش هەر لە ژوورە گەورەکە بوو، برادەری نزیکـی خـارە جەمـیلە، هەردووکیان هی بن هەولێرن، بەڵام ئەو دوو پیاوە جگە لە (خارە) لە هیچ شتێك پێکتر ناچن، ئەو خارەشم بۆ جاری یەکەم لە بەهاری ئاقاری بەستی شەرغە ناسی، ئێستاش وا لەو سەهۆڵبەندانە یەکترمان دیـتەوە، خـارە جەواد چەنـد سـاڵێکە بە چیـا کەوتـووە و کۆمەڵێـك منـداڵی سـەرکەوبنکەی بەجێهێشتووە و دەمێکیشە هەواڵیانی پێنەگەیشتووە و نازانێ لەو گـرانیەی بە سەر وڵاتدا هاتووە، سەری خۆیان بـۆ کـوێ هەڵگرتـووە، لە چاوەکـانیەوە دەبیـــنم کـــزەی لە جەرگـــیەوە دێ، لەگەڵ ئەوەش وەك بەرد چەقیـــوە، لێبووردنەکـانی لە بەغـداوە دەردەچـن، جـوولەی تێکـردنەوە نـاخەنە خـارە جەوادەوە، هەر ئێســـتا کوڕێکیـــدیش هەر لەو ژوورەوە لە پەنـــجەرەی یادەوەریم سەری دەرهێنا، لەمێژ نیە بە چیا کەوتووە.

وا بزانم لە (زەردك)ی ریّی کەرکوکەوە هـاتووە، کـوڕێکی تـا بڵێـی هێمنە، کەمێك شەرمنە، پێدەچێت ناوی عەدنـان بـێ، بەوە دەزانـم جارێـك قاسم کە ئەویش زەردکی بوو، زمانی هەڵەی کرد بە عەدنان بانگی کـرد، هەر ناوێکی هەبێ، لێـرە نـاوی لە خـۆی نـاوە ئاسـۆ، ئەو کـوڕە حەزی لە

خوێنـدنەوەیە، زوو زۆر زوو بـووینە بـرادەر، زۆر جـار شـەوان دەهـاتە چاوەکەی من.

شەوانی درێژی شەختەبەندیی بە چی دەتـوێتەوە، هەرچـی دەکەی ڕۆژ نـابێتەوە، شـەو نـاڕوا و ڕۆژ نـایە، شـەو لە بـن نـایە، بـێ کۆتـایە، شـەو بەستوویەتی و ناتوێتەوە، شەو ساڵە و نابڕێتەوە، شەو، شەو، هەتا کات هەیە هەر شەو، من بە خەیـاڵ دەچـوومەوە بەهـار و لە بـن ئەو دارگێـوژەی کە شمشاڵی دەژەند، دەوەستام، دەستەکانم لە ملی پەلکەزێڕینە دەکرد، شـەوی سپی شووشەیی، شەوی سایەقیی و زوقمی، شـەو ئەو شـەوانەی چیاکانیـان ڕووتاندەوە، بەڕووێـك بە پێـوە نەمـاوە، دارسـتانەکانی چیـا بە لەتـوپەتی لە بارەگان و نۆرەی خستنە سۆبەیان گرتووە، لە لوولەی سۆبەکانەوە کە شەو و ڕۆژ دووکەڵ بە ئاسـماندا دەکەن، سـووتانی دارسـتان ببیـنن، ئەوەی تەوری پێشمەرگە بە درەختی شاخانی کرد، مەگەر نەوەکـانی ئەتـاتورك بە کوردیان کردبێ، کوڕە شێنییەکە ڕەنـگە مەولـوودی نـاو بـووبێ، پیشـەی داربڕینەوە و کۆلکێشی بوو، بە کۆڵ لە شاخان بە بڕێك پارە کە هەر بایی پاکەتێك جگەرەی دەکرد، پایزان داری بۆ ئەوانە دەهێنا کە توانای چـوونە دارانیان نەبوو، یان زستانان بۆ ئەوانەی داریان لێدەبڕا، ڕۆژێك لە نزیك ئەو ڕێیەی زەلێ دەباتەوە شێنێ، ڕێـك لەو جێـیەی گـۆڕەکەی ئەبـوو ڕەشـا لە هەموو گۆڕان جوانتر دیارە، تووشی بووم، کۆڵەدارێکی لە پشت بوو، هیچ هێسترێك باری وا نابا، لە پاڵ گابەردێك وەستا و گرانیـی بـارەکەی خسـتە سەر بەردەکە، بە خێرایی دوو جگەرەم پێچـایەوە، ئەو پیـاوە مـژی وای لە جـگەرە دەدا، دەتگـوت سـۆبەی دارە دووکەڵ بە ئاسـماندا دەکـات، ئەو پیاوە دار لە کۆڵە لەو نیوە دانیشتنە قسەیەکی کرد هی لە بیر چوونەوە نیە:

ئەگەر ڕۆژێك دادگایەك بێتە گۆڕێ و لە داروباری شـاخان بپرسـێتەوە، دەزانی من و پێشمەرگە سزای هەتا هەتاییمان بۆ دەبڕێتەوە.

لە بیرمە منیش گوتم:

هەر لە داردان نەبێ!

دەبێ بڵێم پێش بیستنی ئەو قسە دادوەریە لە پیاوی دار لە کۆڵ، مـن بە دوو شتی ئەو پیاوە سەرسام بـووم، یەکیـان هەڵگرتنـی کـۆڵی گەورە کە هیچ هێسترێك باری وا نابا، دووەم هەڵوێسـتی وی، ئەو پیـاوە کە لە دۆڵـی پێشمەرگە و قاچاخچیان دەژیا، دەبوو وەك یاساو رێسـای بـاوی ئەوێ یەك لەو دووە هەڵبژێـرێ، کەچـی ئەو هەر بە کۆلکێشـی مـایەوە، نە بـووە پێشمەرگە نە قاچاخچی.

ئەگەر قسەیەك لە ئەبوو رەشا نەکەم، نـاتوانم گـۆڕەکەی بەجێبهـێلم و بگەمەوە شەوەکانی بارەگا، ئەبوو رەشام زوو لە رێی بەستی شەرغە ناسـی، ئەو پیاوە زۆر ناسك بوو، کەچی کەس ناسکیەکەی نەدەبینـی، یـان خـۆی ناسکیی خۆی نیشانی کەس نەدەدا، بەڵام لە مردنـدا نەیتـوانی بیشـارێتەوە، ئەبـوو رەشـا لە مردنـدا بە دیـارکەوت کە ناسـکترین پێشـمەرگەیە، ئەوەی شەڕوشـۆڕی بیابـان و چیـای دیـت، زرموهـۆڕی ئەرد و ئاسـمانی بیسـت، شەڕی دەبابە و کۆپتەری کـرد، کیمیـا راوی نـا، هێنـدەی نەمـابوو ئەنفـال راوی بکات، هیچی لێنەهـات، دڵـی نەوەسـتا، کەچـی لە کۆبـوونەوەیەکی حزبی لەو ناوزەنگەی خوارێ، ئەوەی کەوتـۆتە چـاڵایی دنیـاوە، لە داخـی رستەیەکی توند کە بە دەمی بەرپرسـەکەیدا هـات، بە لادا هـات و کەوت و دڵی وەستا و هەڵنەستایەوە.

شەو، شەو، بە شەو شەو، بە رۆژ هەر شەو، چ بکەین باشە!

شـەو نـابڕێتەوە، رۆژ نـابێتەوە، خەو خەو، چەنـد دەمژمێـر خەوا کەس هەیە لە شـەوێکدا سـاڵێك بخەوێـت! خوێنـدنەوە، بە خوێنـدنەوەی رۆمـانە قەبەکانیش شەو بنی نایە، پەنا بۆ هەقایەتەکـان دەبەیـن، هەقایەتەکـان شـەو دەبڕن! ئەوەتا ئەبوو سۆسـەنی لە کۆمـاری دۆزەخەوە هـاتوو، هەر جـارەی جێیەکی دۆزەخ دەگێڕێتەوە، بە پانی و درێژی دەیگێڕێتەوە، لە مەهابـادەوە دەستپێدەکات، دەگاتە تاران و دەگەڕێتەوە مەهاباد، ئەو پیاوە پتر لە حەڤدە جێگەی دۆزەخـی دیـوە، بە ئـاگری حەڤـدە دۆزەخ سـووتاوە، بە بیـرمە لە گەرمەی گێڕانەوەی دۆزەخی ورمێ بوو، پێشمەرگەیەك پرسی:

هاوڕێ، قسەی خۆت لە بیرنەچێ، لە دۆزەخ کارەبا هەیە؟
پێشمەرگەیەکیدی پێکەنی:
توخـوا، ئەوە پرسـیارە! دۆزەخ کە یەك پـارچە سـووتان و بڵێسـە بـێ، کارەبای بۆچیە؟
هەر کاتێـك قسـەیان دەپسـاند تووڕەدەبـوو، بەڵام ئەوجـارە سـەیربوو، ئەبوو سۆسەن تووڕە نەبوو، لەسەرەخۆ گوتی:
بـا، هـاوڕێ، لە دۆزەخ کارەبـا هەیە، بـا لە کـێلە بووزەکـانی دۆزەخ بیمەوە، دێمەوە لای کارەباش، دەبێ بە خـۆت بزانـی، مـادام دۆزەخ کـێلە بووزی هەبێ، بێگومان کارەباش هەیە، خۆ وەك بارەگای ئێمە نـیە بەفـری دنیای لێبارێ.
ئەبـــوو سۆســـەن دوای ئەوەی لە ســـەربردەی کێلەبـــووز بـــۆوە کە خستبوویانە سـەر سینگی، بە دووردرێژی هەقـایەتی کارەبـای دۆزەخـی بۆمان گێڕایەوە، من بە چەند دێرێك دەیگێڕمەوە:
چاومیان بەستەوە، بە تێهەڵـدان بردمیـان، بـۆ کـوێ؟ چاومیـان کـردەوە، بەڵام خـۆزگە نەیانـدەکردەوە، دنیـای دوای چـاوکردنەوە لە دنیـای دوای چاوبەسـتن و پـێش چـاوکردنەوە تـاریکتر بـوو، ئەو تاریکەسـەلاتە کـوێی دۆزەخە؟ دەی تـــاریکیەکە لە دوای کەمێـــك بەهەشـــتە، لەو تـــاریکیە هەستمکرد لە ڕاڕەوێکـی درێـژ ڕاوەسـتاوم، ڕاڕەوێـك بە درێژایـی دۆزەخ درێژ، من وام هەستکرد، هێندەی نەبـرد وەك بڵێـی لە بـن زەویەوە دێوێـك شاپێکت لە بن پێ بدا، بەرزبوومەوە، هێند بەرزبوومەوە، وا بـزانم سـەرم بە ئاسـمان کەوت، نـازانم چـۆن کەوتـمەوە سـەر زەوی، بە ڕاسـت مـن لە ئاسمانم یان زەوی! ئێستا هەستدەکەم تۆپی تێنسم، تۆپی سەبەتەم، چـوزانم ڕەنگە خۆ بە تۆپ چواندن لە جێـی خـۆی نەبـێ، درەنـگ تێگەیشـتم ئەو جێیەی دۆزەخ کارەباڕێژە، پێ لە هەر جێیەك دەنێم، دەست لە هەر جێیەك دەدەم، بە هەر جێیەك دەکەوم، کارەبا، کارەبا، لە تاریکایی دۆزەخ کارەبا، کارەبا گەمەم لەگەڵ دەکا، ئەو گەمەیە زۆری برد، درێژەی کێشـا، مەگەر

شەوی ئێرە هێندە درێژ بێ، بە هەموو هێـزی خـۆم هـاوارم دەکـرد، نـازانم هاواری کێم دەکرد، لە بیرمە  بە زمـانی فەرمیـی دۆزەخ کە فارسـی بـوو، مـن لە دۆزەخ فێـری فارسـی بـووم، پێشـتر هەر عەرەبـی و کـوردی و ئینگلیزیم دەزانی، بە زمانی دۆزەخ گوتم:

ئێوە چین؟ ئێوە خودا ناناسن، خودایە، تۆ لە کوێی؟

لەولاوە گوێم لە پاسەوانێکی دۆزەخ بوو، گوتی:

هاواری بۆ مەکە، گوێی لێنیە، لێرە نیە، مۆڵەتی وەرگرتووە.

ئیدی تێگەیشتم کۆماری دۆزەخ بێ خـودایە، لە پـڕ هەستمکرد، دنیـا کەمێـــك رووناکـــایی تێکەوتـــووە، وەك بڵێـــی لەو ســـەری راڕەوەکە نزیکبووبمەوە، تەریفەم، ئای بۆ دۆلکە ئاوێکی بەفراوی! دیـتم پاسـەوانێکی دۆزەخ بادیە ئاوێکی لە پێشم دانا، خەنی بووم، بینم پێوە نا، باشە، وادیـارە لە دۆزەخـیش پاسـەوانی بە بەزەیـی هەیە، هەسـتم بە برسـێتیەکی کوشـندە کـرد، بـڕوا نـاکەم هـیچ گورگێـك برسـێتیی وای دیتبێـت، لەو کـاتە هەر شتێکم دەستکەوتبا، لە بەرد نەرمتر با، لرفم دەکرد، ئۆی! دەبینم کابـانێکی دۆزەخ وا خەریکە بابۆڵەی هێلکە چێـدەکا، ویسـتم پەلامـاری بـدەم، دوو پاسەوان گرتمیان، زۆری نەبرد دوو پاسـەوانیتر سـەرو بابۆڵەیـان هەڵگـرت، ئای دەڵێی دەیدەنە من، دەستم درێژکرد، یەکیان گوتی:

پەلە مەکە بۆ تۆیە.

ئەو دوو پاسەوانەی گرتبوومیان، رۆیشتن، دیتم دوو لەفە بە دەستەکە کەمێك روویان وەرگێڕا و دۆخینیان کـردەوە، دوو لەفەی تەڕیـان لە سـەر مێزە شکاوەکە بەجێهێشت و یەکیان فەرمـووی لێکـردم، ئێـوە دەڵـێن چـی بیخۆم یان نا؟ برسێتی من لەوە واوەتر بوو میـزی پاسـەوانی دۆزەخ، لەفەی هێلکەم لە دەستبدا

شەوی زستانی بارەگا کوا بە هەقایەتەکانی دۆزەخ بنی دێ! با بە دیار هەقایەتەکانی ولاتێکی سووتماك، هی ئەنفال دڕ بە شـەو بـدەین، تـۆ بڵێـی چیرۆکەکانی ئەنفال زەفەر بە شەوی شەختەبەندیی بیات! ئێمە هەموومان لە

ئاقاری ئەنفالەوە هاتبووین، ئەنفال چەنگ لە سەر چەنگ راوی نابووین، بەڵام مام جوامێر لە هەمووان گریاناویتر ئەنفالی دەگێڕایەوە.

ئەو پیاوە چیرۆکی هەردوو بەری زێی گچکەی بە زمانی نزیك لە ناڵەی دەو زێ دەگێڕایەوە، دەو زێیەك مەگەر تەنها جاش و سەرباز بزانن چ قیژە و ناڵەیەکی بە ئاودا داوە، ئەو پیاوە شوان و بن هەولێر و دەشتی کۆیەی دەگێڕایەوە، چیرۆکەکانی مام جوامێر لە دەشت و گردۆلکەکانی خوارەوە دەستپێدەکرد بە خاڵخاڵاندا سەردەکەوت، دەگەیشتەوە هەیبەت سوڵتان، دەسووڕایەوە بناری کۆسرەت، چیرۆکەکانی مام جوامێر لە زێیەکان درێژتر، لە زنجیریەی چیاکان درێژترن، مام جوامێر ماندوو دەبێ لە گێڕانەوە، شل دەبێ، بەڵام شەوی بارەگا هەر سەر لە ئێوارەیە.

رەنجۆ و کوردۆ چیرۆکی ئەنفال و پارتیزانی تێکەڵ بە گێڕانەوەی مام جوامێر دەکەن، چیرۆکی ئەو دوو کوڕە سەرەتا چەند کەڕەتێ بە دەوری هەولێردا وەك چۆن من کاتی خۆی بە شەقامی شەستمەتری دەخولامەوە، ئەوان ئەوها دەخولانەوە، نازانم لە خولانەوەی چەندەم بە چاوترووکانێك دەگەیشتنە بەستی شەرغە، لەوێوە چیرۆك بە بنەباوێ دەگەیشتەوە خۆشناوەتی، بە ئاوەگرد و سەفینیشدا هەڵدەگەڕان، بە مەتارەی پڕ و چەند نووردووە نانێکەوە دەپەڕینەوە هەورێ، ماوەیەك لە دۆڵەڕەقە بزردەبوون، لە سەری کونەکۆتر بە دیاردەکەوتنەوە، ئەو دووە زوو زوو ناوی دیار و موحسین یاسین و سەنگەر و مام رەسووڵ و یەك دووانێکیتریان دەهێنا، کە لە چیرۆکی پچڕ پچڕی پارتیزانی ئاقاری ئەنفال ئەکتەری بزۆز بوونە، ئیدی قەندیل و قەندیل هاتن و گەیشتنە ئەو بارەگایەی بە سەر پەلکەزێڕینەدا دەڕوانێ کە ئێستا وا لە شەوێکی زوقمیە و رۆژی لێ نابێتەوە، ئەدی هەقایەتی فەیلیەکان!

هەقایەتی کۆچ و مەینەتیی فەیلیان لە زاری کەریم فەیلیەوە دەمێکە دەستپێکردووە، بەڵام هەر لە سەرەتایە، وەك شەوی سایەقەیی بارەگا چەندی لێیەوە چیرۆکان دەگێڕیەوە، هەر لە سەرەتایە، کەریم فەیلی دێ

بەزاراوەی بەغدایی هەقایەتی لە بن نەهاتووی فەیلی بۆ کوڕانی ناو بەفر دەگێڕێتەوە، ئەوانەی عەرەبیش نازانن گوێی بۆ هەڵدەخەن، لە ساتی گێڕانەوە، خارە جەواد وەها هەناسەی لە خۆی دەبڕی، کەسێ نەیناسیبا دەیگوت ئەو پیاوە لە هەمووان باشتر تێیدەگات، نازانم کێ بوو بە خارە جەوادی گوت:

+ باشە تۆ چ عەرەبی دەزانی ئەوها گوێت بۆی شلکردووە؟

- چەند لەو قورئانە دەگەم کە ڕۆژانە لە رادیۆوە گوێی لێدەگرم، هەر هێندەش لە هەقایەتی کەریم فەیلی دەگەم، بەڵام حەز لە بیستنی دەکەم.

هەرچی موحسین یاسینە، دەڵێن گوتوویەتی:

کوفرێك لە هەموو کوفران کوفرتر ئەو کوفرەیە کە هەقایەتی کوردی بە عەرەبی بگێڕیەوە.

وەڵا کەریم فەیلی ئەو کوفرە گەورەیەی جوان دەگێڕایەوە.

بەڵام ئومێد کە لە خۆشناوەتیی هەولێرەوە بە دنیایەك گاڵتەوە هاتبوو، دەیگوت:

سەربردەی کوردان بە تایبەتیش هی فەیلیان ئەگەر بە عەرەبی بگێڕیەوە، وەك ئەوە وایە کە حەسەن سیساوەیی سوورەتی ئەلبەقەرە بە خۆشناویی و بە لاوك بڵێتەوە.

هەرچی یاوەرەکەی ئەو بەری چەمەکەیە، لە زاری پەیامبەرەکەیەوە گوتبووی:

ئاهونزوولەکان باشترە بە عەرەبی بگێڕنەوە، چونکە کاتێ نزیکی ئاسمان دەبنەوە هەر دەبنەوە عەرەبی.

من ئەو ساڵە کۆچ و باری فەیلیانم لە سەر سنوور دیتبوو، کە پێدەچوو لە ڕێی خۆ بە هەڵەدا بردنێك لەو دیو گەڕابوونەوە و دەیانویست بە زۆر خۆ بە (لێبووردنی گشتی)یەکدا بدەن کە ناوە ناوە لە بەغداوە دەردەچوو، من ئەو هەموو ورد و درشتەی فەیلیانم دیت، چۆن لە ناو ئەو شاخ و داخە تێدامابوون، لە دنیا تێدا مابوون، تێدا مابوون لە کوێی دنیان! یاخود

له دنیان یان له جێگەیەکیدی! تێدا مابوون، له زمان تێدا مابوون، سەر بە چ زمانێکن! بە دوای ناسنامەیەکدا دەگەڕان کە پێنەدەچوو لە دنیادا دەستبکەوێ! ئەو مرۆڤانە هیچ لێبووردنێکی تایبەتی و گشتی نەیدەگرتنەوە، من ئەوانەم دیتبوو، بۆیە بە تاسەوە گوێم بۆ چیرۆکە فەیلیەکانی کەریم فەیلی هەڵدەخست، وەك چۆن گوێم بۆ نەغمەی کچە فەیلیە تەمەن چوارده پازدە ساڵیەکە هەڵدەخست، کە ناوی (لەیما) بوو، بە فارسی دەیگوت:

من نە کوردی دەزانم، نە خانەقینم دیتووە، بەڵام کوردم و خانەقینیم.

کەریم فەیلی لە خانەقینەوە دەستیپێدەکرد، دەگەیشتە بەغدا، دەهاتەوە خانەقین، بە قەسری شیریندا دەپەڕیەوە کرماشان، نازانم بە کوێدا دەهاتەوە سەر رووبارەکەی نۆکان، ئەو جێیەی لەیما خۆی تێدا دەگێڕایەوە، کەچی شەوی سایەقەیی بارەگا هەر شەوە و هێشتا نۆرە نەگەیشتۆتە ئەو ئێشکگرەی ناوی لە لیستی ئێشکگرانی شەو لە ناوەندێیە، ئیدی شەوی کورتیلە چیرۆکەکانی کچە رێواسیەکە کە زۆریان کاتەکەیان لە تاریکیەوەی..

ها، ئەوەش کورتیلە چیرۆکەکانی سووزی، زۆر کەڕەت لە بیرهێنانەوە، یان گێڕانەوە مێرد و شوبراکەی یاری دەدەن، چیرۆکەکانی سووزی هێند زۆرن لە ژمار نایەن، خۆی دەڵێ:

بەغدا لە تاریکیدا چەند نهێنی لە دڵە، من لەو پتر چیرۆکم لە سەرە.

کورتیلە چیرۆکەکانی سووزی هێندەی کوچە و کۆڵانەکانی بەغدا دەبن، ئەگەر بە تەباشیر، بە داروچکە بە دێرێکی بێ پسانەوە و بێ شکانەوەی بە ئەنقەست چیرۆکەکانی سووزی بنووسرێتەوە، ئەو دێرە چیرۆکیە لە بەغداوە دەگاتە هەولێر، لە هەولێریشەوە پێچێك بە عەنکاوەدا دەکات و دەگاتەوە ئەو بارەگایەی لە زستاندا پێشمەرگەکانی بە نیازی سپیبوونەوە لە تەقە و رقبوونەوە لە بەفردا دەشارێتەوە و بەهارانیش بە دیار پەلکەزێڕینەوە هەڵیاندەخات، چیرۆك دەستی چیرۆکی لە دەستە، لە شەوە

شـەختەبەندیەکانی بارەگـای بەفـر نەبـێ، چیرۆکەکـانی سـووزی لە هـیچ شـەوێك نـاگێڕدرێتەوە، هەزار و یەك شـەویش بەش ناکـات، ئەو کـچە ڕێواسیە لە گێڕانەوەی بەغدا زوو زوو دەگەیشتەوە سەر دێڕی گـوێ، کەم چیرۆکی ئەو کچە هەبوو بێ سەربردەی گوێ، ئەو کچە عیساییە بەغـداییە لەو ساتانەی بە وشەی کەرت کەرت، پچڕ پچڕ وێـنەی دەستەخوشـکێکی بە چاوی پڕ فرمێسکەوە نیشاندەدایەوە، دەمدیت، دڵۆپە فرمێـسکم دەدیـت بە سەر ڕوومەتیدا کە لە لاوە تیشکی کزی فانۆسەکە وەك پەلکە زێڕینە لە بینابیمی دەنەخشاند، ئێـوە لە دڵۆپە فرمێـسك پەلکەزێڕینەتـان دیتـووە! مـن دیتم، دەستەخوشکەکەی کـچە ڕێواسـیەکە لەگەڵ کوڕێـك پەیوەنـدیەکی ناسکی حەفت ساڵەیان دەبێ، کوڕە گوتبوویە کچە:

من بەهۆی چـاوی تـۆوە نەبـێ، لە سـەربازی رانـاکەم و خـۆم دەدەمە دەست خودا، بەڵام نا، من نابێ بکوژرێم، من دەبێ بـژیم، پێویسـتە بـۆ تـۆ بژیم، ئەگەر هەڵاتنم لە سەربازی تەنها حەفتەیەك لە مـردن دوورمبخـاتەوە، باشە، با حەفتەیەك پتر بۆ تۆ بژیم.

کوڕە لە سەردەمێك لە سەربازی هەڵات، خەڵک لە ترسان چەنـد ڕۆژ پێش ناو هاتنی، سـەری لە ڕاپێچخـانە دەدا، وەك دەیـانگوت تەنهـا دیـن و ئەوینداران هەڵدەهاتن، ئەو سـەردەمە هەر هەڵاتـوویەك دەسـتگیرکرابا، بـێ سێودوو گوێیان دەبڕی، کوڕەیان گرت و گوێیان بڕی.

ئێ، بابی کچە گوتبووی:

کچم بدەمە سەگ، نایدەمە گوێبڕاو.

کچە گریا گریا، فرمێسك فرمێسك، نە هەڕەشـە نە دڵنەوایـی کچەیـان گیر نەکردەوە، هێنـدەی دیجـلە فرمێسـکی ڕژانـد، ئیـدی، ڕۆژێـك دیجـلە تەرمی کچە سەر ئاو دەخاتەوە و بە کەنـاری دەبەخشـێتەوە... لە چیرۆکـی گوێبڕینەوە وێـنەی گوێبڕاوێـك وەك تارمـایی خـۆی نیشـانمدایەوە، لەمێـژە زۆر لەمێـژە، لە جـامێکی جامخـانە گەورەکەی عەبـۆ کە هێنـدە لە قەرات دوور نەبـوو، وێـنەی گوێبڕاوێـك هەڵواسـرابوو، بە خەتـی درشـت لە بنـی نووسرابوو:

ئەوە رەفتاری تێکدەر و نۆکەرانی بێگانەیە.

دواتر پێکەوتم ئەو پیاوە موختاری نازانم کوێیە، ناپاکی کردووە، لە سەر ئەوە پێشمەرگە پوختە گوێیان لە بنەوە بڕیوە! چیرۆکەکانی کچە ڕێواسیەکەش شەو بە ڕۆژ ناکەنەوە، دوای وی نۆرەی کوڕە زەردکیەکەیە.

ئاسۆیە، عەدنانە، من پێمخۆشە هەر بە کوڕە زەردکیەکە ناوی بێنم، ئەو کوڕە بە نەغمەی کەرکوکیانە مەینەتیەکانی ئەو کۆمەڵگە زۆرەملێیانەی دەگێڕایەوە کە دەوری هەولێریان دابوو، زۆر بە شێواوی لە سرووشتی هەولێر هەڵیان دابوو، کوڕە زەردکیەکە ورد ورد چیرۆکی ئەوانەی دەگێڕایەوە کە لە سەربازی هەڵاتبوون، ئەو کونانەی نیشاندەدایەوە کە لە بن بەرمیلی ئاو و ناو گەرماو و سەر گوفەك و بن سەرینی نەخۆشان لێدرابوو، ئەو کونانەی لە ئەدەبیاتی هەڵاتن و هەڵوێستدا بە ( کونە فیراران) ناسرابوو، هەرچی چیرۆکی هەڵاتن و خۆشاردنەوە و ترس و برسێتی و بێوەژنکەوتوویی و سێویی و ئەو چیرۆکانەی لەوانەش دەبنەوە، لە کن کوڕە زەردکیەکە بوو، کوڕە زەردکیەکە لە سیمایدا ئەو زەردیە دەبینرا کە ئابلۆقەی ئابووری لە سیمای نیشتمانێکی نەخشاندبوو، چیرۆکەکانی کوڕە زەردکیەکە هەموومانی تاساندبوو، هەموومانی ترساندبوو، بارەگای بەفر هەر لە شەودایە و ڕۆژی لێهەڵنایە، ئەدی سەرهاتی حەمە ڕەشاش، کێ ناترسێنێ!

حەمە ڕەشاش کوڕی دەو زێی گچکەیە، لە زمانیڕا پێدەچێ هی دەوروبەری پردێ بێ، ئەو پیاوە ئەگەر گۆشت هەبێ، ئامادەیە تا ڕۆژی قیامەت هەر چەك لە شان و پێشمەرگە بێ، ئامادەیە جارێکیدیش بچێتەوە بەردەم قەنارەی مووسڵ، بەڵام لە بیرشمان بێ، لە هەمووان پتر بەرگەی برسێتی دەگرێ، حەمە ڕەشاش بە ئاشکرا دەیگوت:

ژیان واتە گۆشت، بەهەشت واتە گۆشت...

نەهرۆ خانەقینیەك هەبوو دەیگوت:

+ هاوڕێ حەمە، ئەوە بزانە بەهەشتەکەی گاندی یەك پشکە گۆشتی تێدا نیە.

-نامەوێ.

+واتە دۆزەخت دەوێ؟

+ لە دۆزەخ ئەگەر گۆشت لە تێری بێ، ئاگر چیە با هەر بسووتێم.

ئومێدی بەڕانەتی لێی پرسی:

+ تۆ گاندی دەناسی؟

- هەندێك بیکەیتە کوردی! باشی دەناسم.

پێکەنینێك بەرزبۆوە رەنگە بۆ ساتێك شەختەبەندی شەوی بارەگا بەفراویەکەی تواندبێتەوە!

نازانم کێ بوو گوتی:

دەزانی گاندی گۆشتی نەخواردووە؟

حەمە رەشاش بە مەیلەو پێکەنینەوە:

- ئاخر بۆیە ئەوها گێژ و وێژ بوو.

+ گێژ و وێژی چی ئەو هیندستانە گەورەیەی رزگار کرد.

حەمە رەشاش لە دڵەوە گوتی:

دڵنیام ئەگەر لە تێری گۆشتی خواردبا، هەموو دنیای رزگاردەکرد بە کەرکووکیشەوە.

بووە پێکەنینێك داربەڕووەکانی کێوی مامەندە لەرینەوە!

جارێك مام ئەحمەد، ئەو پیاوەی کاتی خۆی بە هەڵە حزب چەند ساڵ لە زیندانی کرد، بە حەمەی گوت:

ئەرێ تۆ هێندە کوشتەی گۆشتی کوڵاوی، هێندەش عاشقە گۆشتی خاوی؟

حەمە رەشاش:

نە بە خوا

مام ئەحمەد:

حەیف! تەمەنت فت، دەزانی لە کنە من هەزار کیلۆی گۆشتی نەرمکی برژاو نیو چارەگ گۆشتی خاو ناهێنێ، خۆ دەزانی مەبەستم کام نیو چارەگە؟

حەمە رەشاش دەیگوت:
لە تەمەنم بە دەگمەن نەبێ لە تێری گۆشتم نەخواردووە.
هەر یەکە لە لای خۆیەوە:
- کوو وەیە!
- کوڕە سەد جار پێکەوە گۆشمتان خواردووە و لە بەرمان ماوەتەوە.
- ئەو ڕۆژە هێندەی حەفت کەست خوارد.
- خۆ ئەو جارەی لە بناری کۆسرەت نێریەکەمان سەربڕی، نیوەی تۆ خواردت.
- ئەو ڕۆژە لە سەردەشت یازدە شیش کەبابت نەخوارد!
حەمە رەشاش دەستی بە شێوەیەك بە زگیدا هێنا، وەك بلێی سێ ڕۆژ بێ، زاد بە زاری نەکەوتبێ:
وایە ئەوەی دەیلێن هەمووی وایە و کەمتان گوتووە، بەڵام تێر خواردن کوا وایە! من بەوە دەڵێم تێرخواردن کە گۆشت بنی نەیە، کەلەشێکت بە برژاوی لە پێش بێ، کەلەشێکیش لە تەنیشتەوە بە دارەوە بێ، ئەوها خەمی برانی گۆشتت نابێ.
داستانی حەمە رەشاش دوور و درێژە، چ هی پێش پێشمەرگایەتی چ هی پێشمەرگایەتی، سەرهاتی ئەو پیاوە هەمووی هەڵات هەڵات و هاتوهاوار و شەڕ و پێکدادان و بەرەنگاربوونەوەیە، ترس و تۆقانە، گریانە، سەرڕێژیش لە پێکەنین و لە سەر پشتکەوتنە، ئەو پیاوە لەو پیاوانەیە ژووری سێدارە نەیترساند، حەمە رەشاش دەگێڕێتەوە، لە شەوی زستانی ناوزەنگ دەگێڕێتەوە، چیرۆکی برینداربوون و بەردەستی دوژمن کەوتن و تێهەڵدان و دادگایی و گەیشتنە ژووری سێدارە دەگێڕێتەوە، ئەو ڕۆژە دەگێڕێتەوە کە نۆرەی بە دارەوە کردنی هاتووە، حەزیکردووە پێش بە دارەوە کردن کەلەشی جوانەگایەك ببینێ بە دارەوە و تێر گۆشت بخوات، ئەوجا لە سێدارەدان هەقە و ناهەق نیە، دێتە بیرم ڕۆژێك لە سەر نان خواردن بووین، گۆشتمان هەبوو، حەمە رەشاش پارووێکی هەر لە زاری بوو، پارووێکی ئامادەش بە دەستیەوە، گوتی:

پیاو بۆ خوا بڵێ، مـن بە لێبووردنێـك قەرزاری سـەدام حوسـێنم، ئەگەر بمێنم ئەو قەردەی دەدەمەوە، کورە خۆ ئەگەر ئەو ڕۆژە لە سێدارە درابـام، چیدی تامی گۆشتم نەدەکردا

حەمە ڕەشاش سەرهاتان دەگێـڕێتەوە، چـی نـاگێڕێتەوە بە نـاو ئەنفالـدا هاتووە، شتێك لە ئەنفال دەگێڕێتەوە، کێ دەزانێ شتێك لە ئەنفـال چەنـدە؟ ئەنفـال داسـتانێکە پشتاوپشـت چەنـد نەوە بیگێـڕنەوە، نە هەر دوایـی نـایە، بەڵکو هەمیشە لە سەرەتایە.

ئەرێ ڕەشاشەکە کەی و لە چیەوە بە حەمەوەیە؟ بۆ ئەوە سـێ چـوار قسە و گێـڕانەوە هەبـوو، بەڵام مـن قسـەیەکیانم بە دڵـدا چـوو، ئەو دەمەی حەمە بە برینداری گیرا کلاشینکۆفی هەڵدەگرت، دوای ئەوەی لە ژووری سێدارە هاتەوە و بە چیا کەوتەوە، هەر لە ڕێ گوتبووی:

کلاشینکۆفی سەگکوشـتی هـی ئەوە نـیە پشـتی پـێ ببەسـتین، لەمەودوا ڕەشاش هەڵدەگرم.

ئیدی بەرلەوەی دەستی بە ڕەشاش بکەوێ، ڕەشاش بە ناوەکەیەوە لکا.

شەوە شەختەبەندیەکان بە هەقـایەتی کـێ لە بـن دێـن! هەمـوو دێـن و دەگێـڕنەوە، جـار جـارە یـاوەرەکەش دێ و پەیـامبەرەکەی دەگێـڕێتەوە، کەچی شەو هەر شـەوە، تـا وەرزی پەلکەزێـڕینە دێـتەوە، ناچـارم پەنـا بـۆ چاوەی کەنەستەر بەم.

چاوەی کەنەستەر کەوتۆتە لای خـوارەوە، نزیـك چەمەکە، ئەو چەمەی بەفر وەهای پڕکـردۆتەوە گەیانـدوویەتیە ئاسـتی هەردوو بارەگـا، بارەگـای ئەم بەری چەم و هی ئەو بەری چەم، ئیدی لەو زستانە شتێك نیە چەم بێ، ئەو چاوەیە هەر لە سەرەتای بەفرکەوتنەوە بە ناوی چاوی کەنەستەر نـاوی ڕۆیشـت، کەس نەیزانـی لە سـەرەتا کـێ ئەو نـاوەی بە سـەر ئەو ژوورەدا بڕی، هەموو دەپرسن ئەرێ کێ بوو ناوی نا کەنەستەر؟! ژووری کەنەستەر گەیشـتە بارەگاکـانیتریش، گەیشـتە گونـدەکانیش (نۆکـان، زەڵـێ، شـێنێ، گۆڕەشـێر..) چـاوەی کەنەسـتەر گەیشـتە شـارەکانی ئێـرانیش، مـن نـامەی

برادەرێکم تا درەنگیش لا مابوو، نووسیبووی:

ئەرێ ئەوە کام ژووری بارەگایە بۆتە ژووری کەنەستەر؟

چاوەی کەنەستەر گەیشتە وڵاتی رووسیاش، برادەرێك نامەیەکی نیشانم دا لە مۆسکۆوە بۆی هاتبوو، نازانم نە بە گاڵتە بوو نە بە راستی ئەوها نووسرابوو:

گورباچۆف گووی لە رووسیا کرد، ئیدی لێرە جێم نابێتەوە، جێیەکم لەو ژووری کەنەستەرە بۆ بکەنەوە، لە سەر چۆك دێمەوە!

رووسیا بیری هێنامەوە کە کەنەستەر لە رووس جیا نابێتەوە.

ریازێك هەبوو نازانم رووسیای دیتبوو نەدیتبوو، ناشزانم قسەکەی تا چەند راستی تێدابوو، بە عەرەبی دەیگوت:

گەمەی کەنەستەر تایبەتە بە سەربازی رووس، شەوانی بەفراویی سەربازی رووسیا وەك شەوانی پێشمەرگەی ناوزەنگە، ساردە، درێژە دەڵێی رێی بەغدایە، بە گەمەی کەنەستەر نەبێ، بنی نایە، وەك چۆن رێی بەغدا بە کیلۆ گوڵەبەرۆژەی دەوێ، شەوی ئەوێش چەند گەمەیەکی کەنەستەر.

کەنەستەر گەمەیەکی کاخەزێتە، بە دەمژمێر کاتی دەوێ، وەك هیچ گەمەیەکیدی نیە، ئەگەر لە شەوی هاوین جارێك دوو نوێیبکەیتەوە، هەر هێندە دەبینی ئێوارە سپێدەی داوە، من زۆر ئێواران دوای نانخواردن، دوای هەندێك خوێندنەوە، تۆ بڵێی هەندێك جار دوای ئێشکگری، بە کۆڵانی شووشەیی بەفردا بەرەو ژووری کەنەستەر بە گۆپاڵ و بە ترس و لەرزەوە لێژ دەبوومەوە، رۆیشتن بە رێی شەختەی شووشەیی پڕ ترسە، کەوتنی وای تێدایە هەر مەپرسە، کە پێت رۆیی، هەتا کۆلانی بەفر هەیە هەر دەڕۆی و جگە لە بەفر شتێك نیە بتگرێتەوە، بەر لەوەی بتانبەمە سەر دەرگای ژووری کەنەستەر و بە چاوی خۆتان ببینن، جارێ لە دوورەوە تەماشابکەن، چتۆ خلیسکێ دەبەم! دایکم دیتبای بە هەردوو دەست لە سینگی خۆی دەدا و هاواریدەکرد:

سەید مارف بیگەیێ!

دایکم تەنها لەو ساتانەی تارمایی ئیزرائیلی دەدیت، هاواری بۆ سەید مارف دەبرد، ئیدی لەو شەوە سپیە ئاسمان سایەقەییە زەوی شەختەییە، تفەنگم لە شان، گۆپاڵ بە دەستمەوە، نازانم چ کاتی شەوە، بۆ ئێشکگری بانگمیان کردووە، هەر لە سەر دەرگای ژوورەکەی خۆمم، لە سەرەتای کۆڵانی بەفرم، بۆ پێی چەپم ناڕوا، کەوتم و رۆیشتم، کۆڵان و کۆڵان رۆیشتم، ئەرێ لە کێ بپرسم رۆشتنەکەم چۆن بوو؟ لە سەر پشت، لە سەر زگ، بە گلۆڵەیی؟ نەمزانی، ئەوە دەزانم پێشەوەی دیوارێك لە دیوارەکانی بەفر بمگرێتەوە، ئێشێك کەوتە پێی چەپم، ئێشی گوللەش هەر هێندەیە، نا، گوللە نا، من ئێشی گوللەم تام نەکردووە، دوای کەمێك وەك بلێی لە هۆش چووبم و بە هۆش هاتبمەوە، دیتم خوار چۆکم خوێنێکی زۆری لە بەر دەڕوا، خوێنێك هی ئەوە نیە بە هەندی وەرنەگری، دەستم دایێ، نزیکەی قولانجێك هەڵزڕابوو، وەك بلێی برین جێی تیشەبەردێکی تیژ، یا دەمە ئاسنێك، تەنەکەیەك بێ، شانم دێشێ، ملم دێشێ، ئانیشکم دێشێ، جا کوێم نایەشێ، دەبێ چەند جێگەم شکابێ، باش بوو دیواری بەفریی نزیك نانەدینەکە منی گرتبۆوە، خێرێکی گەورەم لە سەرە بەو کۆڵانەدا نەڕۆیشتبووم کە دەچۆوە سەربانی نانەدینەکە، خۆ بانەکەش تێیهەڵدەدامەوە ئەودیو، ئەدی ئەگەر خوانەکردە رێم بە کۆڵانەکەی ناوزەنگی خوارێ کەوتبا! ئەوەی یاوەرەکە پێیدا چوو، هاتە سەرم د. هۆشەنگ بە ئاگا بێنم، لە سەری خۆم دەرکرد و بەئاگامنەهێنا، خۆم گەیاندە نانەدینەکە، هەندێك ئاوە تەماتەم هێناو کەمێك خوێم پێدا کرد، برینەکەم بە بەفر خاوێنکردەوە، ئاوەتەماتەم خستە سەری، هێندەی نەما بوو لە بانگ بدەم، بە جەمەدانیەکەم جوان پێچام، ئیدی ئێشکگریەکەم بە کەوتن و هەستانەوە و بزرانەوە و پێچانەوەی برین و دیتنەوەی تفەنگ و گۆپاڵ بەسەر برد، بە شەلەشەل ئێشکگری دوای خۆم بە ئاگاهێناو چوومەوە سەر جێ، باش بوو زوو ژانی شکا.. بەڵام ئەگەر قسەیەك لەو جەمەدانیەی تا پێش دەمێك لە ملم بوو، ئێستا لە پێیمە نەکەم، خەوم لێناکەوێت، زستانەکەی پێشتر و لە

بارەگـايەکيتر، بەفـر چۆکێـك کەوتـووە، دنيـا لەرزی گرتـووە، بڕوانـاکەم گورگێـك بە دەرەوە بـێ، کەچـی سـێ چـوار پێشـمەرگە، خـارە جەواد گوتەنی:

هەر بۆوەی رکەبەرايەتی سەرما بکەن.

هاتن پوختە سەری خۆيان پاك تراشـی، لـووس لـووس کوديـان کـرد، يەك لەوانە نەژاد بـوو، ئەو کـوڕەی منـداڵێك بە گەمە چـاوێکی بـرد، ئەو کـوڕە لە بەدبەختـی مـن جەمەدانيشـی نەبـوو، ديـاربوو سـەرما زۆری بـۆ هێنابوو، هاتە لام:

- تۆ پرچت پڕە و درێژە، سەرمات نابێ، جەمەدانيەکەتم بدێ.

+ سەرم سەرمای نابێ، بەڵام خۆت دەزانی هەوکە هەوکم دێشێ.

- باشە نەمويست.

+ ئێ، لەبەرچی بەو سەرمايە...

ئێـدی نەمـدايێ، ئێسـتا، ئێسـتای شـەوە زوقمـيە خليسـکاويەکە کە جەمەدانيەکەم خوێناوی بووە، (نەژاد لە سەر سەرمە، چاويلکەيەکی رەشـی لە چاوە، قژی درێژ و پڕە، قژ رەش رەش لەچاويلکەکەی رەشترە، گوتی:

+ لەبەرچی جەمەدانيت لە سەر نيە؟

- نابينی لە پێمم بەستووە.

+ هەر جەمەدانيەکەی پێشانە، ئەوەی...

هێنـدەم لە خـۆم هەڵـدا، پـێم خـراپ کـولايەوە، لەوەتەی نەژاد ئێـرەی جێهێشتووە و بەرەو رووسيا رۆيشتووە، ئەوە خەونی يەکەمە بەوەوە.

چ خەونێکــيش و لە چ کاتێــك، خەو زڕا، خەو لە چــاو تــۆرا، چ پێناچێ ئەو شەو چاوم پێبکەوێتەوە، قۆريەم خستە سـەر سـۆبە و جـگەرەم لە دوای جگەرە دەپێچـايەوە، جـگەرە بـێ ئەژمـارە نـازانم چەنـد چايەشـم خواردەوە، راديۆش خەوتبوو، پێشـەوەی رۆژ بێـتەوە و بچـم پـێم دەرمـان بکەم، ناچارم هەڵوێستێکی نەژاد نيشانبدەمەوە:

چێشــتانێکی درەنــگە، لە کەپرێــك لە کەپرەکـانی دەو رووبـارەکەی

تۆکان نەژاد و ریاز خەریکی گەمەی کاخەزێنن، بە تەنیشتیان تێپەڕیم، لە رووبارەکە پەڕیمەوە ئەوبەر، بەری گوند، دارستانێکی چڕە هەمووی دارچنارە، سپینداره، بی و شۆڕە بیە، تووتڕك و تووە... چەندی دەڕۆی هەر سێبەرە و چەپکێ هەتاو ناگاتە زەوی، رووبار لەو شوێنەدا زۆر هێمنە، نەرم نەرم ، لە من هێورتر دەڕوا، ئەوەتا بەلەمێکی کاخەزیم درووستکرد و خستمە رووبارەوە، ئەها هەر ئەوەتا دەجوولێ، لەو دارستانە باڵندەکانیش دەڵێی لە رووبارەوە فێربوونە کە نەرم بخوێنن، چەندی سەر دێنم و دەبەم، لە نەرم خوێندنی باڵندە و بێ دەنگیی رووبار تێناگەم، ئیدی وا لەگەڵ رووبار و بە بن سێبەر و بە ناو جریوەدا دەڕۆم، بەرەو بن ئەو لاپاڵە دەڕۆم کە خۆم ناوم نا، لاپاڵی پەلکەزێڕینە، چیای پەلکەزێڕینە، بە نەرمی تێمهەلکردە شمشاڵ، تا لە شمشاڵ تێر نەبم ناگەڕێمەوە لای رووداوی کەپرەکە، شمشاڵ تێکەڵی رۆیینی ئاو و سەمای سێبەر و دەنگی مەلی کردم، مەلەم کرد، سەمام کرد، فڕیم، ئەگەر قڕەقڕی کەپرەکە نەبا وەها نەفڕیبووم بنیشمەوە، گەڕامەوە دەبینم نەژاد لە ریاز هەستاوەتە سەر چۆك و بە شێوەیەك دەست رادەوەشێنێ، نیشانەی شەڕی تەواوە، بە کوردی و عەرەبی جوونی پێدەدا، هەرچی ریازە رستەیەکی عەرەبی لە زارەو دەیلێتەوە:

هاوڕێ مەبەستم ئەوە نەبوو، تۆ هەڵە تێگەیشتی.

تووڕەبوونی نەژاد بە هەڵە تێگەیشتنی نەدەگەیاند، تا من لە رووبارەکە پەڕیمەوە، نەژاد هێوربۆوە و بە هێمنی دەیگوت:

جارێکیدی گوێم لە قسەی وابێ، وات لێدەکەم کەسێك بلێ زیندوو حەفت بلێن مردووە.

چەندی هەوڵمدا بزانم کێشە چیە، چ تێنەگەیشتم، هیچیان هیچیان نەگوت، درەنگ زۆر درەنگ پێکەوتم کە شەڕی بن کەپرەکە لە سەر من بووە، ئەو کاتەی من لەو بەری رووبارەکە خەریکی شمشاڵ بوومە، ریاز روو لە نەژاد و پەنجەی بۆ من درێژ کردووە:

ئەو برادەرەی تۆ تەواو رووخاوە، هەر دیتت خۆی رادەستی حکومەت کردەوە.

نەژادیش دەڵێتە ریاز:

سەدی وەك تۆ دەڕووخێن، بەڵام ئەو برادەرەی من هەر بە پێوە وەستاوە.

ئیدی هەرای بن کەپرەکە دەستپێدەکا و من لە پیاسەی شمشاڵی دەکا، زۆری نەبرد ریاز داوای چوونە رووسیای کرد، رۆیشت و گەیشت، منیش هێشتا وا لە ناو کۆڵانە بەفریەکانی ناوزەنگم.

تەمبێ نەبووم، دیسانەوە وا بە کۆڵانە شەختە شووشەییەکاندا رێدەکەم، تا سەرهاتی لابەلا بە لاڕێدا نەیانبردووم، با بگەمە ژووری کەنەستەر، ببینن ژوورێکە جێی سێ رایەخ و سۆبەیەکە، جوان لێی بڕوانن، ژوورێکە لە هەموو ژووران جوانتر و خاوێنتر، چ بە ژووری بارەگای پێشمەرگان، بارەگای شاخان ناچێ، من لە هەولێریش ژووری وا رێك و جوانم نەبووە، بنمیچ و دیوارەکانی لە جۆرە نایلۆنێك گیراون، هیچ کاشیەك و رەنگێك ئەو جوانیەی نیە، چەند تابلۆ و وێنەیەکیش زۆر ناسك و هونەریانە هەڵواسراون، رایەخەکانیش هێند خاوێنن دڵت نایە پێ بخەیتە سەریان، تا دارەکانیش ئەوانەی چاوەڕێی چوونە ناو زاری ئاگراویی سۆبەکە دەکەن، بە شێوەیەك کەڵەکەکراون لە تابلۆیەکی ناسك دەچن، لە لادیواری پشتەوە واتە دیواری بەرانبەر دەرگا وێنەیەکی گەورەی هێمن دیارە، ئەو وێنەیەی بانگی ئازادی دەدا، وێنەکەی هێمن کەوتۆتە سەر سەری ئومێد، جوانیی ژووری کەنەستەریش هەر لە سایەی ئومێدەوەیە، ئومێد تاقە پێشمەرگەی بارەگایە کە بالیفی هەبێ بالیفێك لە بالیفان بچێ، کەس نازانێ لە کوێی هێناوە، رەنگە خۆی دروستی کردبێ، بن بالیفەکەشی پڕە لە گۆڤاری ( سروە) ئەوەی هێمن دایمەزراند و دوای ویش هەر دەردەچوو، جگە لە هەندێ بڵاوکراوەی ئاڵای شۆڕش، ئومێد زوو زوو دەچووە ئێران و ئەوانەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، رەنجۆ بە پێکەنینەوە دەیگۆتە ئومێد:

ئەریّ زۆرت ماوە ببیە ئالاّ؟

سەری ڕەنجۆش کەوتبووە لای سەری ئومێد و پێشی نزیك سۆبەکە دەکەوتەوە، ڕەنجۆ بەتانیەکی کردبووە سەرین، بن سەرینەکەشی یەك دوو نـامیلکە و کۆمەڵێـك دەفـتەرە جـگەرە و دووسـێ دارجـگەرە و کیسـە تـــووتنێکی گەورەش لە تەنیشـــتی ســـەرینەکەی کە ئومێـــد زوو زوو لێیدەشاردەوە، کوردۆش بەشداری لە تووتن شاردنەوەدا دەکـرد، لای پێـی ئومێدیش جێی سەری کوردۆ بوو، بالیفی ویش بەتانیەك بوو، بنی پڕ پڕ لە وردە بڵاوکراوەی نهێنی و ئاشکرا، نهێنیەکان هی ناوەخۆی حزب بـوون و نـــاحزبی نەدەبـــوو بیـــانبینێ، بەڵام لە منیـــان نەدەشـــاردەوە، منـــیش نەمدەخوێنـدنەوە، ئومێـد رقـی دنیـای لە جـگەرە دەبـۆوە لەگەڵ ئەوەش دەسـتەیەك تەپـلە جـگەرەی زۆر جـوانی هەبـوو، ڕەنگیـان لەگەڵ ڕەنگـی رایەخەکان دەهاتەوە.

ژووری کەنەسـتەر تـا درەنگـانی شـەو جـمەی دێ، دانیشـتن لە سـەر چۆکانە، جێ نیە چوارمەشقی لێی دانیشی، گەمە گەرمە، چایەش هەمیشـە هەیە و گەرمە، لە ژووری کەنەســتەر بە قەد گەڕەکــی ســەیداوە چــایە خوراوەتەوە، ئەدی جگەرە! لە ژووری کەنەستەر هێنـدەی جادەی (بـاتە) جـگەرە کێشــراوە، بەڵام ســەیرە ژوور بەو شـێوەیەش بـۆنی جـگەرەی نەگرتووە کە جگەرە نەکێشان نەوێرن سەری پێدا بکەن، ئومێـد کـونێکی تایبەت، کونێکی دووکەڵکێشی لە دیوار کـردۆتەوە، نـا ژووری کەنەستەر بۆنی جگەرەی نەگرتـووە، نـازانم ئومێـد چ بـۆنێکی دژە جـگەرە لە ژوور دەدا، بۆنێکی خۆش، ناسك دەڵێی بۆنی ئەو کچانەیە کە لە کاتی خۆی لە جادەی بن (قەراتێ) وەك راویان نابن ئاسکانە بە تەنیشـتماندا تێـدەپەڕین و ئیدی نەماندەدیتنەوە... دیارە گەمەی کەنەستەر جـگە لە ژووری کەنەسـتەر لە یەك دوو ژووریدیش چووبووە بەرنامەی شـەو، بەڵام بە وێـنەی ژووری کەنەستەر نا، هـی ژووری کەنەسـتەر تـام و بـۆیەکی زۆر تـایبەتی هەبـوو، زۆر جار یاریزانانی ژوورەکانیتر دەهاتنە سەر دەرگای ژووری کەنەستەر و

له سەر شانی یەکەوە تەماشای گەمەیان دەکرد، خوا خوایان بوو یەکێك لە یاریزانان ناوی ئێشکگریی بێ، تا جێی بگرنەوە، چەند سەخت بوو لە گەرمەی گەمە ئێشکگری بتگاتێ، لەو ژوورە گەرمە لەو گەمە گەرمەوە بچیە ناو سەهۆڵبەندان، ژووری کەنەستەر بەو هاتوهاوارانەوە خۆش بوو کە لە ساتی سەرەو سەرکەوتن لە قوڕگی یاریزانەکانەوە بە شەوی سایەقەیی بارەگادا بڵاودەبۆوە و جوولەی دەخستە شەختەوە، بە تایبەتیش قاقای رەنجۆ و حریتەی ئەبوو سۆسەن و فیکەی ئومێد و چەقەنەی خارە جەمیل، بەو دواییە ئەوانەی زۆر گەمەی کەنەستەریان دەکرد بە کوڕانی کەنەستەر ناویان رۆیشتبوو، هەندێ لە کوڕانی کەنەستەر جگە لەوانەی ناویان هات ئەمانە بوون، ئەری ناوی خۆم هێنابوو! کوردۆ، خارە جەواد، قاسم، سالم عەرەب، کەریم فەیلی، هەڵکەوت، د.هۆشەنگ، ملازم کەریم.. ئەگەر سەرچیغ نەچووبم من لە سەر دەستی ملازم کەریم فێری گەمەی کەنەستەر بووم، ئیدی شەوی زستانی بارەگا درێژە و بە گەمەی درێژی کەنەستەر شەڕی لەگەڵ دەکەین، شەڕێکی دۆڕاو، من زۆر شەوان بە کۆڵانە بەفریەکاندا خۆم دەگەیاندە کۆڕی گەرمی ژووری کەنەستەر، زۆر جار لە بارەگاکانیترەوە تایبەت بۆ تەماشاکردنی کەنەستەری ژوورە کەنەستەریەکە دەهاتن، جاروبار یاوەرەکەی ئەوبەریش رێی سەختی شووشەیی دەبڕی و سەرێکی بە ژووری کەنەستەردا دەگرت.

یاوەری پەیامبەرەکەش جارێك پێی رۆیی، رۆیشتنێك لەوەدابوو گەڕانەوەی نەبێ، خۆی وای گێڕایەوە:

دەهاتم بۆ ژووری کەنەستەر، گەیشتمە دووڕیانەکە، ئەوەی کۆڵانێك بۆ لای ئێوە دێ و کۆڵانێك دەتباتەوە ناوزەنگی خوارێ ناوزەنگی بن عەردی، لەوێ پێم رۆیشت، رۆیشتم، نەمدەزانی چۆن چۆنی دەڕۆم، پشتاوپشت، زگاوزگ، تەنیشتاوتەنیشت، بە تەقلە، نازانم، هەر رۆیشتم، کەس نەما هاواری بۆ نەبەم، کەس بە هانامەوە نەهات، لە پڕ وەك لە دڵی نابم، پەیامبەرەکەم بیرکەوتەوە، دەستم بە دامەنیەوە گرت، ئا هات

گـرتمیەوە، لە لا دیـوارێکی بەفـر گـرتمیەوە، زۆری نەمـابوو، بـگەمە نـاو بارەگای بـن عەرد، ئیـدی پەیـامبەرەکە منـی گـرتەوە، منـی سەرخستەوە، دەزانی هەر زوو ئێشم لە لەش نەما، ئەوجا تۆ هەر فشەت بەو پیاوە بێ کە دەڵێ من پەیامبەرم!

- تۆ بە راستی پێتوایە، ئەو پیاوە شتێکی لەگەڵ ئاسمان هەیە؟!

+ بە دووری نازانم.

سـەربردەی پەیـامبەرەکەی ئەو بەری چەمەکەش دەبـووە باسوخواسـی شـەوانی زسـتانیی لە بـن نەهـاتووی ئەو بارەگـایەی لە بەهارانـدا بە سـەر پەلکەزێـڕینەوە بـوو، لە وەرزی پەلکەزێـڕینەدا لەو بەری چەمەکە پیاوێـك نازانم لە کوێوە هات، بەڵام بە شێوەزاریدا دیار بوو هی ئاقـاری مەرگە یـا پژدەرە، من بە رێکەوت گوێم لە چەند رستەیەکی تەزرەیی بوو لە زاری باری، ئەو پیـاوە تێکەڵـی خەڵـك نەدەبـوو، جـگە لە خـۆی قسـەی دەگەڵ کەس نەدەکـــرد، لە بارەگـــای ئەوبەری چەمەکە لەپەڕگە ژوورێکیـــان دابـوویێ، رێـك بەرانـبەر ژوورەکەی مـن بـوو، بڵندایيشـیان لە ئاسـتی چەمەکەوە یەك ئاســت بــوو، هەردوو بارەگـــا بە لاپـــاڵەوەن، دەڵێـــی هەڵواســـراون، دوورایيشـــمان ئەوانەی پەلاریـــان بـــاش دەڕۆیشـــت بەرد دەگەیشتێ، ژووری ئەو پیاوە هەمیشە داخراو بوو، یاوەرەکەی دەیگوت:

لە ژوورەوە وەهای دادەخات، بە فیلیش نەکرێتەوە.

پەنجەرەکەشـی هەڵچنـی بـوو، کـونێکی گچـکەی هێشـتبۆوە بە حـاڵ لەگەن و پەرداخـی پێـوە دەچـوو، لەو کـونەوە سـێ جەمە خـواردنی لە دەستی یاوەرەکەیەوە وەردەگرت، بۆ چوونە سەرئاویش، تەماشـای دەکـرد لە درزەکـانەوە تەماشـای هەردوو بارەگـای دەکـرد، هەسـتیرادەگرت، ئەو سـاتانەی کەس بەدەرەوە نەبـا، دەرگـاکەی دەکـردەوە دەخـزی، ئەوانەی چوونە سەرئاوی ئەو پیاوەیان دیتووە، بە پەنجەی دەست دەژمێرێن، یەکیان منم، منیش فێرببووم خۆم لێی دەگرت، بـۆیە چەنـد جـارێ دیـتم، هەمـوو کەس کـــاتێ نیـــازی دەســـتبەئاوگەیاندنیان هەبـــا، رووەو چەمەکە

شۆڕدەبوونەوە، ئاودەستەکان هی هەردوو بارەگا لە دەو چەمەکە بوون، بەڵام ئەو پیاوەی بانگی پەیامبەرایەتی دا، پێچەوانەی هەموو بە مەسینەوە سەرەو بەرزایی هەڵدەکشا، هێند هەڵدەکشا، لە گابەردە گەورەکەش دوورتر هەڵدەکشا، لە چاوی دووربینیش بزردەبوو، من جارێك لە دووربینەوە دیتم چووە سەر گابەردە گەورەکە و دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕیبوو، دەتگوت لەگەڵ خودا ئاخاوتن دەکات، رۆژی دوای چوونە سەر گابەرد و قسەکردن لەگەڵ ئاسمان، یەکەم پەیامی پەیامبەرەکەم دیت.

دەمی جەمی نیوەڕۆیە، پیاوێك دێتە ناو بارەگا و پەڕە کاخەزێکی بە دەستەوەیە، داینا و پەلەی بوو رۆیی، نانی نەخوارد، ئەو پیاوە دواتر ناونرا یاوەرەکە، کاخەزەکەی جێهێشت و رۆیشت، کاخەزەکە چاپی رۆنیۆ بوو، سەردێرەکەی ئەگەر بیکەیتە کوردی وای لێدێ:

پەیڤەکانی خودا.

عەرەبێك بە دەنگی بڵند خوێندیەوە، کوردێك بۆ ئەو کوردانەی کردە کوردی کە عەرەبیان نەدەزانی، پیاوی سەر گابەردەکە پەیامبەرانە ئاخاوتبوو، روونیکردبۆوە کە پەیامبەرە و خودا ناردوویەتی بۆ رزگارکردنی مرۆڤ، ئیدی نانەکە بە پێکەنین و گاڵتەوە خورا و هەر کەسە لە بارەی پەیامبەری ئەوبەری چەمەکە شتێکی گوت، من گوتەکەی ئەبوو راستیم لە بیرە:

ئای لەو وەحشیە خۆ پەیامەکەی بە عەرەبیە، ئەدی پەیامی پەیامبەرەکان بە زمانی نەتەوەکانیان نیە؟

یەکێك لە عەرەبەکانیش گوتی:

ئەو پەیامبەرە عەرەبیەکەشی تەواو نیە.

ئیدی ماوەیەکی باش لە رێی یاوەرەکەوە هەفتانە پەیاممان هەبوو، من جارێك بە گاڵتە بە یاوەرەکەم گوت:

ئاسمان رۆژنامەیەکی هەفتانە دەردەکات، سەرنووسەرەکەی پیاوی ئەو بەری چەمەکەیە.

بەڵام یاوەرەکە هێندەی نەمابوو بە راستی لێم توورەبێ، نازانم بۆچی حەزدەکەم هەر بە پیاوی ئەوبەری چەمەکە ناوی بێنم، خۆ ئەوبەری چەمەکە پتر لە چل پیاوی لێبوو، بەڵام یاوەرەکە دەیگوت:

نا، پیاوی ئەوبەری چەمەکە نا، پەیامبەری ئەوبەری چەمەکە.

من لە دوورەوە خووم بە پیاوی لە بەر خاتری یاوەرەکەی پەیامبەری ئەوبەری چەمەکە گرتبوو، چەند جارێ کە ئەو سەرەو بەرزایی هەڵدەکشا، منیش بە پشت بارەگادا هەڵدەکشام و دەچوومە سەر ئەو تەپۆلکەی لە دوورەوە وێنەی ژنی دەدا، ئەو دارگێوژەیشی جوان لێوە دیار بوو کە لە خۆوە شمشاڵی دەژنی، لە قەد تەپۆلکەکە تیشە شاخێ شێوەی گوێسوانەی هەیە، بنیشی دەڵێی بۆ من خۆشکراوە، جاروبار لەوێ دادەنیشم و بەسەر ئەو شیو و شاخانەی ئەو بەرەوە دەڕوانم، ئەو شوێنە کە دەڵێی شانشینە، تا دڵ دەڵێ زێ دڵنشینە، ئەو جارانەی مەتارەکەم پڕ لە شەراب بوو، هەستمدەکرد لە ئاسمان نزیك دەبمەوە و لەو شانشینەوە قسە لەگەڵ نادیارێك دەکەم، دەچوومە خەیاڵێکی قووڵ و چەند رستەیەکم دەنووسی، رەنگە پیاوەکەی ئەوبەری چەمەکەش هەر وای نووسیبێ، بەڵام نابێ شەرابی لا بێ، نا جگەرەشی نەدەکێشا، ئیدی هەردووکمان دەمانووسی، بەڵام ئەو لە من پتری دەنووسی و هەفتانە بە سەر هەموو بارەگاکانی ناوزەنگ و نۆکان و زەڵێ و تووژەلە و شێنێ و گۆڕەشێر و وا بزانم دەگەیشتە قاسمەڕەشیش.

لە پڕ پەیامبەرەکە بزر بوو، ئەولا پیاوی ئەوبەری چەم ئەم لا پیاوی ئەوبەری چەم، نەبوو، وەك لە بنی نەبووبێ وا بوو، کەس نەیزانی زەوی قووتی دا یان ئاسمان هەڵیکێشا، یاوەرەکەشی سۆراخی نەدەزانی، رۆژێك یاوەرەکەی گوتی:

دوو شەو پێش ئەو شەوەی بزربێ، من کە هەواڵی هاتنی ئیسلامیەکانم بۆ ئێرە بە پەیامبەرەکەم راگەیاند، ئەو لەبەر خۆیەوە گوتی:

گاورەکان گەیشتنە ئێرەش، بە دوامەوەن، دەبێت کۆچ بکەم و خۆم نەدەمە دەستی گاوران.

بە کـۆچی پیـاوی ئەو بەری چەمەکە دڵتەنـگ بـووم، بـۆ مـن لەو دوورەوە ئاوەدانی بوو، جگە لەوە رۆژنامەی هەفتانەمان چوو، ئیـدی کەس نەما بە مەسینەوە سەرەو ئاسمان هەڵکشێ، چەند رۆژێ دوای کـۆچی وی، من نەخۆش کەوتم، مانگێك پتر لە سەر جێ کەوتـم، یـاوەرەکە بە نیـوە راستیەوە:

بە کۆچی پەیامبەرەکەم دەبوایە من نەخۆش بکەوم نەك تۆ.

نەخۆشـیەکەم بە خێـرکەوتەوە، برادەرێکـی ئیسـلامیم دیـتەوە، بەڵام بەرلەوەی بە دیداری وی شـادبمەوە، ئەگەر رێمبـدەن، رێیەکـی زۆر دوور دەبڕم، لێ زوو دێمەوە، لە چاو تروو کانێك بازدەدەمە دوای راپەڕیـن، وەك گوتم زۆرم پێناچێ، چاو داخەن و بیکەنەوە بە هەواڵێکەوە لە لاتانم:

رۆژێـك بە دەوری قەراتـی هەولێـر دەسـووڕامەوە، لەمێژبـوو قەراتـم نەدیتبـوو، هەمـوو رۆژێـك جارێـك دوو بە دەوری قەرات دەسـووڕامەوە، سـووڕانەوەیەك هەر لە (تەواف) دەچـوو، برادەرێـك هەواڵـی کـوژرانی پەیـامبەرەکەی پێراگەیانـدم، نەمزانـی کـێ کوشـتی، ئەرێ هەر ئەوانە نەیانکوشت کە ناوی نابوون گاور؟ نازانم...

ئەودەمـانێ ئیسـلامی ئەگەر کۆمۆنیسـتێکی بە تەنیشـتدا تێپەڕیـا، عەرد وشك با یا تەڕ، وای هەستدەکرد پڕووشکێکی بەرکەوتـووە و گـڵاو بـووە و دەچـوو گڵاویـی لە خـۆی دەردەکرد،کۆمۆنیسـتیش ئەگەر بە رێـکەوت دوو قسـەی لەگەڵ ئیسـلامیەك کردبـا، پێیوابـوو دەسـتی کۆنەپەرسـتیی مـاچکردووە و گەزێـك لە ئاسـتی وشـیاریی دابەزیـوە، ئەودەمـانێ وابـوو، زۆربەی پێشمەرگەی هەردوو لا وا لە یەکتریان دەڕوانـی، ئیـدی لە رێبـان خۆیان لێکدی لادەدا، لە بارەگـای یەکتـر نزیکنەدەبـوونەوە، لای ئیسـلامی نزیکبـوونەوە لە مـاڵی کۆمۆنیسـت نزیکبـوونەوە بـوو لە گونـاح، لای کۆمۆنیست رۆیشتن بۆ بەردەم ماڵی ئیسلامی شـەرمە بـوو، ئەو دووە وەهـا دژ نەکەوتبوونەوە، بە یەکدی بگەنەوە.

بارەگـای ئەو دوو دژە هێنـدە لێکـدی دوور نەبـوو، بەردەقـانی

دەگەیشتێ، بەڵام هەستدەکرد لەو نێوانە سیبریایەك ڕاخراوە، لەو نێوانە بیابانی عەرەب هەڵدراوە، دوور بوو ئەو نێوانە زۆر دوور بوو، ئەو نێوانە هەمووی دەریا بوو، کێ زات دەکا لێیدا، ئەو نێوانە سەراپا ئاگر بوو، کێ ئەو شێتایەتیەی تێدایە، خۆ پێدا دا، پیاوی وا پەیدا نابێ، با، پەیدا بوو، پیاوێك پەیدا بوو ناوی وی خالیدە، ڕەنگە ناوەکەی هێندە پەیوەندی بە خالیدی کوڕی وەلیدەوە نەبێ، چوونکێ ناوی پێشمەرگایەتیی نەبوو، هی خۆی، هی ناو تەسکەرەی بوو، ڕەنگە ئەو کەسەی ئەو ناوەی لێناوە هەر گوێی لە خالیدی کوڕی وەلید نەبووبێ، کێ دەڵێ بە ناوی خاڵێکی بە ناوی مامێکیەوە نەکراوە، ئێ عەسرانێك خالید بە ماوەی جگەرەکێشانێك سیبریای بڕی، بیابانی عەرەبی لوولدا، بە سەر دەریادا فڕی، ئاگری دڕی، گوناهی لەوێ دانا و گەیشتە سەرم کە لە جێ کەوتبووم، گوتی:

+ هاوڕێ، کە زانیم لێرەیت و نەساخی، خۆم نەگرت و هاتم.

- برا، بە هاتنی تۆ من چاکبوومەوە، ئیدی نەخۆش نیم.

خالید هەرچەندە هەندێك لە من بە تەمەنتر بوو، بەڵام لە کۆلێژ ساڵی خۆنیشاندانەکان هاوپۆل بووین، دیاربوو تاقیکردنەوەی دەرەکی دابوو، بەڵام کە بە هۆی نەچوونە ریزی ((سوپای میللی))یەوە ساڵێك لە کۆلێژ دەرکراین، ئیدی ئەو نەهاتەوە کۆلێژ و لە سەر پردی سێتاقان دوکانێکی دانا، بەڵام برادەرایەتیمان هەر وەك خۆی مایەوە، دواتر لە یەکتر بزربووین، ئەوا لێرە وا یەکترمان دیتەوە، وا چایە دەخۆینەوە، ئەو جگەرەی نەدەکێشا، لەو دانیشتنە هەولێر و قەڵادزێی بە بادا ڕۆیشتوومان گێڕایەوە، خالید کوڕی قەڵادزێ بوو، لە هەستاندا، پێش هەستانی تا لەبیرمنەچووە، ماوەیەك دوای سەردانەکەی خالید، دوو بەرپرسی گەورەی بزووتنەوە سەردانی بارەگایان کرد، وا بزانم (عوسمان و عەلی)یان ناو بوو، یەکیان مەلای پێوە بوو، ئەویدی تەنها بابێ، ئیدی سەردان ئاساییە، خالید لە هەستاندا پرسی:

+ باشە حزب دنیای ناردە ڕووسیا، بۆ تۆ نانێرێ؟

- دەمنێرێ، بەڵام من ناچم.

سەری سەرسوڕمانی بادا، وا بزانم دەمنێرێ و ناچمی منی بە گاڵتە وەرگرت، بەڵام بە راستیم بوو، ئەگەر چووبام دەیانناردم، دوای ئەوەی تووشی نەخۆشیەك بووم، نازانم چی بوو، ناوە ناوە تووش دەبووم، شتێك بوو وەك فێ، دوو سێ کەڕەت بە دزیەوە هاتنە بن گوێم و بە پەنجە رێی رووسیایان نیشاندام، بەڵام من سەری نەخێرم راوەشاند، هەر کێ ئەو شێوە سەرراوەشاندنەی دیتبا، بێ سێودوو دەیگوت وای لەو شێتە! دکتۆر کامەرانیش کە زۆر پێمەوە ماندوو بوو، رووسیای لە بن گوێم خوێند، بەلاش بوو.

ئەو کامەرانە ئامێدیە وا تێبگەم یاریدەدەری پزیشك بوو، بەڵام لە پزیشکی هێندەی دە پزیشکی دەزانی، ئەو برینەی کەم دکتۆر دەوێرێ خۆی لێبدا، لە کنە وی ئاوخواردنەوەیە، لە دەستنیشانکردنی نەخۆشیش زۆر کارامە و ورد بوو، تەماشای کردبای دەیزانی چیتە، جگە لەوەش بە شێوەیەك ورەی نەخۆشی بەرزدەکردەوە کە زۆر جار دەبووە چارەسەر بۆ نەخۆشەکە و گاڵتەی هەند خۆشیشی لەگەڵ نەخۆش هەبوو، بە تۆ با هەر نەخۆش بای! دێتە بیرم پێشمەرگەیەك نەخۆشکەوت، وەها کەوت، ترساین راستنەبێتەوە، دکتۆر کامەران هەندێ لێوردبۆوە، پێکەنی و گوتی:

هاوڕێ تۆ نەخۆشیەکی ترسناکت هەیە، بەڵام چارەسەری زۆر ئاسانە، نەخۆشیەکەی تۆ (کیر)ە، چارەسەریشی سیغەیە، بۆیە بە حزب دەڵێم سێ رۆژ بتنێرێتە ئێران.

پێشمەرگەیەك دەڵێتە دکتۆر کامەران:

هاوڕێ دکتۆر، حەبێکی ژانە زگم بدێ، زگم زۆر دێشێ.

دکتۆر دەپیشکنێ، پەنجە دەگەیەنێتە هەر جێیەك لە زگی( وەی بابە وەی بابە) دەکات، دکتۆر دەڵێ:

هاوڕێ، حەبی ژانە رووسیام نەمایە.

نەخۆش دەڵێ:

دکتۆر، چی دەڵێی! ژانە زگ زگ

دکتۆر دەڵێ:

تۆ زگت نایەشێ، رووسیات دێشێ.

چەتۆیەکەی بەڕانەتی  کە لە کەسێکی دەپرسی :

لە ماڵێ چەند کۆترتان هەیە؟

مەبەستی ئەوەبوو کە چەند خوشکت هەیە، بەڵام کاتێ پرسیارەکەی لە دکتۆر کامەران دەکرد، (عەلەشیش)ی لە جێی (کۆتر)ەکە دادەنا، ئاخر کامەران لووتێکی باریکی درێژ درێژی هەبوو.

ئێ، لەوان رۆژان کێ هەبوو رێی رووسیای نیشانبدەن، ئەو روو وەرگێڕێ و نەچێ، هەبوو هەفتانە نامەی چوونە رووسیای بەرزدەکردەوە، کادیرێك بە ژمار دوازدە نامەی نووسیبوو، نامەی هەمەڕەنگ (ئاسایی، تووڕەیی، پاڕانەوە) لە گڕ نووسینی نامەی سێزدەهەم بوو، ناردیان، کادیرێك بە گژ داروبەردا دەچوو، رۆژ نەبوو شەڕێك نەکا، ناردیان و لە کۆڵی بارەگایان کردەوە!

پێشمەرگەیەك:

من یازدە ساڵە پێشمەرگەم لە هەمووان مستەهەقتری رووسیام..

پێشمەرگەیەك:

من لەویش مستەهەقترم.

پێشمەرگەیەك:

من چوار جار بریندار بوومە، ئێستاش گوللەیەك لە شانمە، لە رووسیا نەبێ لە کوێ دەردێ؟

پێشمەرگەیەك:

خاوەن سێ شەهیدم و لە سەردەمی ئەحمەد حەسەن بەکرەوە پێشمەرگەم، کەچی کوڕی (....) مانگێکە هاتۆتە چیا، ناردیان.

پێشمەرگەیەك:

من قوتابی زانکۆم، پێویستە لە رووسیا خوێندنەکەم تەواو بکەم.

پێشمەرگەیەك:

تا زمانلووس و قوون لووس هەبێ من دەنێرن!
پێشمەرگەیەك:
بە منیان گوت:
ئەوانەی دەیاننێرین بۆ تەواوکردنی خوێندنە، تۆ نەخوێندەواریت.
ناو بڵێم چەند نەخوێندەواریان ناردووە؟!
پێشمەرگەیەك::
دە بزانە یەك کوڕە بەرپرس، یەك خزمە بەرپرس ما! هەمـوو نەگەیشـتنە رووسیا؟
پێشمەرگەیەك:
کوڕە چاومان کوێر بوو، دەبا لەگەڵ کچە رووسیەك بخەوین.
پێشمەرگەیەك:
دە وەڵاهی لەو یەك دوو مانگە نەمنێرن هەمـوو پـۆخڵەواتی(...) دەخەمە روو.
پێشمەرگەیەك:
خۆزیا عەرەب دەبووم، ئێستا لە رووسیا بووم.
پێشمەرگەیەك:
من عەرەبیشم و نەشیانناردووم.
پێشمەرگەیەك:
نەمنێرن خـۆم رادەسـتدەکەمەوە، جـا تیـادەچم یـا دەمێـنمەوە بە گـونی حیزبەوە!
پێشمەرگەیەك:
بەس پەلە نەکەین، هەموومان دەگەینە رووسیا، کەس نامێنێتەوە.
لە دڵی خۆم دەمگـوت، ئەگەر وابـێ بە تـاقی تەنـێ دەمێـنمەوە، باشـە بۆچی حەزم لە چوونە دەرەوە، چوونە رووسیا نەدەکرد؟!
شـێتانە پـێم لەو بسـتە خـاکەی ناوزەنـگ داکوتیـوو، بە تـۆپی دنیـا هەڵنەدەکەنرام، عاشقانە دەستم بە لقی ئەو داربەڕووانە گرتبوو کە تـاقولۆق

به قەدپاڵەوە مابوون، ئەفسوونی رووسیا هێزی راکێشانی منی نەبوو، ئەو ئەفسوونەی لە دێری نامەی هەندێك لەوانەی گەیشتبوون، ورشە ورشەی لە چاو دەدا.. جارێك دوای دیداری خالید، هاتە سەرم واز لە شێتایەتی و عاشقایەتی بێنم و پێم لە خاك دەرکێشم و دەستم لە لق و گەڵاکان بکەمەوە، لە کەلی شەیتان هاتمە خوارەوە و لاملیم وەلانا و ملم دا.

ئێوارەکەی خۆم کۆکردەوە، چیم کۆکردەوە؟ چەند پەرە کاخەزێکی شیعراوی و هەندێ نووسراوی لابەلایی، شەش حەفت نامەیەك کە نەمدەتوانی دەستبەرداریان بم، خستمنە جانتایەکی گچکەلە، کتێبەکانم هەر لە ژوورەکەم بەجێهێشت و نەمدانە کەس، وەك بڵێی بە سەردانێکی چەند رۆژە دەڕۆم و دێمەوە.

بە نهێنی پێمیان گوت کە سبەی زوو بەرێدەکەوی، بەڵام من هەموو بارەگام تێگەیاند کە سبەی دەچمە رێی رووسیا، ئەودەم وابوو چ ئەوانەی خۆیان رادەستی بەغدا دەکردەوە، چ ئەوانەی گەشتی رووسیایان دەکرد، نەدەبوو کەس بزانێ، نهێنیەك بوو لە نهێنیەکانی حزب، من ئەو نهێنیەم بە هەند وەرنەگرت و بە گۆڕێنم وەرکرد، هەر ئەو بارەگایەی بە سەر پەلکەزێڕینەوە بوو، نا، بارەگاکانیتریشم تێگەیاند، ئێستا هەموو دەزانن من سبەی دەچمە وڵاتی گورباچۆف، لەو سەروبەندە سەری زمان و بنی زمانی دنیا گورباچۆف بوو، ئەودەمە خالید نازانم چووبووە کوێ دەنا بەویشم دەگوت، ئێ، کێ راسپاردەیەك، ئیشێکی لە رووسیا هەیە؟ با بیڵێ، شەرمنەکات و منەتی تێدا نیە.

پێشمەرگەیەکی منداڵکاری برا نەدیتە:

برایەکم لە سەردەمی عەبدوڵا پەشێوەوە لە رووسیایە، ئەو نامەیەمی بگەیەنێ.

پێشمەرگەیەکی شاعیر:

ئەو دەفتەرە شیعرەم ببە رووسیا، دەترسم لێرە بزربێ، هەوڵدە لەوێ بۆم چاپبکەی.

پێشـــمەرگەیەکی بە تەمەن کە پێدەچـــوو دەســـتی بە دەســـتی ژن کەوتبێت:

من ناگەمێ، لە باتی منیش کچە رووسیەك بگەوزێتە.

پێشمەرگەیەك کە پێشتر رووسیای دیتبوو:

سڵاوی من بگەیەنە هەموو سۆڤیەت، بە گیانلەبەر و بێ گیـانەوە، تەنهـا گورباچۆڤی تەرەس نەبێ.

پێشمەرگەیەك کە زۆری دەخوێندەوە:

سڵاوی تایبەتی من بگەیەنە نووسەری (جەمیلە)

ئێوارەیە، سبەی بە رێی رووسیادا دەڕۆم، ئەوەتا لە سەر ئەو بەردەی کە کەوتۆتە تەنیشتی ژوورەکەم، هەڵکوڕماوم، بەردەکە ئێستا لە بن بەفـرە، ئەو جـێگەیە بەو زسـتانە چیـایەك بەفـری لێهەڵـدراوەتەوە، جێـی کەپرێکـی گەورەیە، لە هاوینـان بیبیـنن گەورەتـرین کەپـری چیـایە، لە هاوینێکـدا دەیبینـین، ئـێ، لە سـەر بەردەکە خەریکـی تـاوتوێکردنی راسـپاردەی بـرادەرانم، هەوڵـدەدەم بە شـێوەیەك لە مێشـکمدا ریزبەنـدیان بـکەم، کە لە جێوساتی خۆیان  بە بیرم بێنەوە...

سەرێکم لە دار گێوژەکەش دا ئەوەی لە خـۆوە شمشـاڵی دەژەنـد، بە نیازی دیتنی پەلکەزێـڕینە روو لە لاپـاڵی پەلکەزێـڕینە تەواوێـك راوەسـتام، چوومە سـەر تەپۆلکە ژنـیەکەش، لەو گـابەردەش وردبـوومەوە کە پیـاوی ئەوبەری چەمەکە لە سـەری راوەسـتابوو، دەسـتی بـۆ ئاسـمان هەڵبڕیبـوو، داوای سرووشی لێدەکرد.

شەوە، لە سەر پشت راکشاوم، دوودڵم بچم نەچم، باشە بۆچی ملم دا! دەڵێی پەشیمانبیمەوە، هەر ئێستا دەچـم بە مـام سـالح دەڵـێم، سـوپاس، مـن ناچمە رووسیا، کەسێکیدی لە جێی من بنێرە، نا وا نـاکەم، پەشـیماننابمەوە، دەی قیڕسی دەچم، نا نەچم باشە، دەچم، ناچم، دەچـم، نـاچ، دەچ، نـاچ، دە، نا، د، ن......

رۆژ چەند باڵێك لە سەر چیا سەرکەشـەکەی سـەری ئەو سـەرەوە بەرز

بۆتەوە، بە ئاشکرا - دەبوو بە نهێنی بێ- ماڵئاواییم لە بارەگا کرد، بە ڕێی بەردەم بارەگای ئەوبەری چەمەکە، بارەگای لاتە و پەیامبەر و یاوەرەکە، ڕێیەکە تیواوتی لەگەڵ چیا دەڕوا، بە نابەدڵی ملی ڕێم گرت، دەبوو بچمە نۆکان، تا گەیشتمە ئەو پێچەی پێچت دەکاتەوە، بزرت دەکات، لە هەر دوو سێ شەقاو ئاوڕێکم لە بارەگای بە سەر پەلکەزێڕینەوە دەدایەوە، ڕێم دانەدەگرت، لە دواوە هێزێك توند رایدەکێشام، چ هێزێك بوو، ڕەنگە هێزی نیشتمانێکی ئەنفالکراو بووبێ، ڕەنگە هێزی هەمیشە پڕ هێزی کەسوکار بووبێ، کە دەمێك بوو هەواڵیانم نەدەزانی، ئیدی وا بێ ماڵئاوایی بە تەواوی لێیان دووردەکومەوە و ڕەنگە ئیدی نەیانبینمەوە، دابڕانی یەکجاری بێ، من وا لێرەوە لەو بستە ڕێیەوە سۆراخیانم نیە، ئەدی بگەمە رووسیا چ پەڕجوویێك هەواڵێك دێنێ و دەبا، وا باشە پەشیمانببمەوە، تا دوورتر نەکەوتوومەتەوە، بگەڕێمەوە، نا...

لە نۆکانەوە بەڕێکەوتین بۆ بازگەی قاسمەڕەش، ئەبوو دڵشادم لەگەڵە، کاری پەیوەندی دەکات، هاتووە لەوێوە بەرێمبکات، هەژاریش گەیشت، ئەویش هاوڕێی ڕێی رووسیایە، لە بازگە رایانگرتین، دەبێ پەڕە کاخەزی پەڕینەوە وەرگرین، دیاربوو هی من کە دەبوو ئامادەبێ، نەبوو، هەژار پەڕیەوە، تەواوێك لە بازگەکەی قاسمەڕەش لە چاوەڕوانیدا ماینەوە، ئەو بازگەیەی تاڵترین پاسەوانانی دنیا پاسەوانییان لێدەکرد، چەند تاڵ بوون خودایە، دەتگوت پاسەوانی دەرگای دۆزەخن، ئیشم بە چ بازگەیەك کەوتووە، تەواو بێزار بووم، ئەبوو دڵشاد گوتی:

پەلەت نەبێ هەر چۆنێك بێ ئاودیوت دەکەم، یەکێکیان باش دەناسم نازانم بۆ دیار نیە، با بە دیارکەوێت.

نزیك لە دڵنیایی گوتم:

ناسیارەکەت نایەت، با بگەڕێینەوە.

دیاربوو ئەویش هەستیکرد چاوەڕوانی بەلاشە:

باشە سبەی دووەی دێینەوە.

گەڕاینەوە، لە ڕێی گەڕانەوە بڕیاری پەشیمانبوونەوەم دا، ئیدی لەو بڕیارە پەشیماننەبوومەوە، کاتێ گەیشتمەوە بارەگا وام هەستدەکرد وا لە بەلاشاوەی هەولێرم و لە سەری کۆلانی خۆمان دەسووڕێمەوە:

هەلکەوت دەڵێ:

دڵم گوتی دەگەڕێیتەوە.

حەمە ڕەشاش دەڵێ:

لە ڕۆیشتن چاوم لێت بوو دەتگوت بۆ سێدارەت دەبەن، لە هاتنەوەش وەك ئەوەی بۆ سەر گۆشت...

قاسم دەڵێ:

بە خوا باوکم تۆ و چوونە رووسیایان نەگوتووە.

ڕەنجۆ دەڵێ:

تۆ بە ناوزەنگەوە جوانی.

ئەبوو سۆسەن بە پێکەنینەوە دەڵێ:

پەندێکی خۆتان هەیە، ئەوەی دەڵێ(مالی قەڵپ...) چۆنە؟

برادەرانی رووسیاش کە زانیبوویان خەریکە بەرێدەکەوم تا چەند مانگێکیش هەر چاوەڕێ بوون بگەمە لایان، نەچووم لە بارەگای بە سەر پەلکەزێڕینەوە مامەوە، لە کۆلانەکانی بەفر مامەوە، لەبن کەپرە گەورەکە مامەوە، ئەو کەپرەی لە سێبەرەکەیدا شنەبایەك لە گیانتی دەدا، کەس نەیدەزانی لە چ باخی بەهەشتێکەوە هەڵدەکا و پێ بە پێی چ جۆگەلەیەکی کوێستانی دەگاتە کەپری هاوینی و مام جوامێری هەمیشە ماندوو دەخەوێنێ و لە خەونێکی شیرین دەستی دەگرێ و دەیباتەوە دەو زێی گچکە و بە ماڵ و منداڵی شاددەکاتەوە.

هاوینە هێشتا دەمی عەسرە چا نەهاتووە، تەنها من و ئێشکگرەکە بە ئاگاین، خۆزگەم بەو کەسانەی لە رۆژی رووناك خەویان لێدەکەوێ! مام جوامێر لە نزیك من خەوێك خەوتووە کەس نیە خۆزگەی پێنەخوازێ، لە چاوی منەوە ئەو پیاوە هەمیشە پارتیزانە خەوەکەی ساوایانە بوو، بزەیەکی

ساوایانه سەر لێوی خوارەوەی گرتووە، لێوی سەرەوەی سمێڵ لە بزە بزری کردووە، نەرم هەناسە دەدا، خەوێکی ئارام، خۆزگەم بە خۆی، وەك بڵێی بە چاوم بردبێ، لە پڕ راپەڕی، راپەڕینێك هەر لە راپەڕینی نێریە کێوی دەچوو، سەرەتا وای بۆچووم دووپشك پێوەی دابێت:

+ نەیهێشت، خودا لە نێو دەمی بدا، نەیهێشت.

- کێ، چی نەهێشت؟

+ نەیهێشت ماچی بکەم..

-.....

+گەیشتمەماڵێ، لە ناویان دانیشتبووم، دەمویست منداڵەکەم ماچ بکەم، دەستێك خودا لە بنەوە بیبڕێ لە دواوە شانمی راکێشاو لە ماچی منداڵەکەمی کردم.

- دەی، وام زانی دووپشك پێوەی دایت.

+ خۆزگە نەك دووپشك مار پێوەی دەدام، بەڵام ئەو دەستە لە ماچی نەدەکردم، نەمزانی چ دەستێکە، بەڵام زۆر لە دەستی ئەنفال دەچوو.

تا چەند دووپشکێکیش نیشانەدەمەوە حەزناکەم لە بن کەپریە هاوینیەکە هەستم، بەڵام بەرلەوەی سەربردەی دووپشك بگێڕمەوە، کەمێکیتر لای مام جوامێر دەمێنمەوە و لە وێنەیەکیدی نیشانیدەدەمەوە، ئەها لە سەر ئەو بانە، بانی نانەدینەکە، شانی خستبووە سەر باگوردانەکە، خۆی دابووە هەتاوی بەهاری، ئاگای لە کەس نەبوو، کەسیش ئاگای لەو نەبوو، جگە لە من، گوێم لێبوو دەناورایەوە، ئەو پیاوە پارتیزانە کە بەرد لە بەری دەلەرزی، وەك دەیانگوت رووبار بۆی رادەوەستا، ئەوەتا بە چاوی خۆم دەبینم، ورد ورد فرمێسکان هەڵدەوەرێنێ، سەرەتا باوەڕم بە گوێ و چاوی خۆم نەکرد، نا، ئەوە مام جوامێر نیە! لەو سەر بانە دەناورێتەوە، دەگری و گوێم لە رستەی گریاناوی بوو:

ئای رۆڵەکانم، داخوا ئێستا لە پێش دەرگای چ ناکەسبەچەیەك کەوتوون؟ برسین، تینوون! ئای! باوکتان نەمێنێ! تووشی چیم کردن!

هەناسەی وای هەڵدەکێشا، یاقووب وای هەڵنەکێشاوە، بەرگەم نەگرت و لێی دوورکەوتمەوە و نەیدیتم، ئیدی لەوێ من بە رووتی مام جوامێری مرۆڤم دیت! ئەگەر ئێستا کەسێك ئەو وێنەیەی کە بێ ئاگاداری ئەو کێشاومە، نیشانی بداتەوە، دەبێ چی بیڵێ؟ دەبێ خەونی بن کەپر و گریەی سەر بانی لە بیر مابێ!

با بگەینەوە هاوین و بچینەوە بن کەپرەکە، با بایەکی تونديش هەڵبکات، ئەو بایەی لەوێ ناوی بای دووپشك بوو، بایەك دووپشكی لەگەڵ خۆی دەهێنا و بە بارەگای وەردەکرد، با دەست بە گەمەی خۆمان بکەین، دوو گەمە هەبوو بە ناوی گەمەی دووپشك:

گەمەی یەکەم:

لە بەردەم کەپرەکە ئەو کەپرەی دوو رووی هەبوو، رووە تەسکەکەی دەیڕوانیە لاپاڵی پەلکەزێڕینە، لەئاگر بازنەیەکی گچکەمان دروستدەکرد، هەر جێی بێژنگێکی لێدەبۆوە، بازنەی ئاگر شەو و رۆژی نەبوو، هەمیشە بازنەی ئاگر بوو، بازنەی ئاگر لە شەودا جوان بوو، لە تەماشاکردنی تێر نەدبووی، دووپشکمان دەهێنا و دەمانخستە ناو بازنەکەوە، لەوێ دووپشك لە جەنگاوەرێك دەچوو چواردەوری بە سوپایەك تەنراو بێ، ئەم سەرو ئەو سەری دەکرد، لە رێگەیەك لە کەلێنێك دەگەڕا لێیەوە دەرچێ، نەیدەدیتەوە، نەبوو، ئیدی دووپشك ماندووە، بێزارە، بڕیاریشی داوە خۆ بە دەستەوە نەدا، دووپشك ئەو جەنگاوەرەیە هەرچی دەبێ با ببێ، بەڵام خۆ بەدەستەوەدان نا، تا دێ سوپای ئاگر بازنەکە تەسکتر دەکاتەوە، ئێستا نا ئێستا دووپشك بە دەست دەگیرێ، نا دووپشك هی ئەوە نیە خۆ بە دەستی ئاگری سوپاوە بدا، چ بکات باشە؟ بە چاوی خۆتان ببینن. ئەها کلکی بڵند کرد، وا لە پشتی سەری خۆی نزیککردەوە، ئەها گەیشتێ، دووپشك کەوت، دووپشك بە خۆیەوە دا، دووپشك بە کلکی خۆی بە دەمانچەی خۆی خۆی کوشت، هەموو چەپڵەیان بۆ ئازایەتی دووپشك لێدەدا، بە راستی دووپشك پاڵەوان بوو، ئەبوو راستی لە هەمووان پتر بە پاڵەوانێتی

دووپشك سەرسام بوو، دەیگوت:

پێویستە پێشمەرگە لە دووپشکەوە فێر بێ.

پێشمەرگەیەکیدی ناویم لە بیرنیە دەیگوت:

دەزانن دووپشکیش لە پێشمەرگەوە فێری خۆکوشتن بووە، بە هەڵە لە بەراوردەکەم تێمەگەن، شەهید کۆچەریش ئەوها خۆی کوشت.

چەتۆ بەر لە گەشتی رووسیا، زۆر کەڕەت باسی ئەو کۆچەرەی دەکردو دەیگوت:

شەهید کۆچەر لە هەمووان پاڵەوانتر بوو.

ئەبوو راستیش دەیگوت:

نهێنی حزب ئەوەیە کە لای کۆچەر بوو، نەك پیازەکە.

بەرلەوەی گەمەی دووەمی دووپشك دەستپێبکا، سەرێك لە هەولێر دەدەمەوە و تیچاوێك دەدەمە سەری کۆڵانێك، لەوێوە ئەو ماڵە دیارە کە کۆچەر بە خوێنی خۆی نەخشاندی، نەخشاندنێك لە دەستی کەم کەس دێ، هەواڵ دەگاتە (ئەمن) ئەوەی زمانی لێدابوو ((هاوڕێ))بوو، شتێکی وەك شاخ بە ناوەکەیەوە بوو، پێشمەرگەیەك لەو ماڵەیە، لە چاو تروووکانێك شارێك چەکدار رژانە گەڕەکەوە، گەڕەکی کۆماری، من لە دوورەوە لە نزیك قوتابخانەی قازی محەمەدەوە، لە ماڵە خزمێکمان مابوومەوە، شەوە لە بیرم نیە چ کاتی شەوە، رەنگە درەنگ بێ، نازانم، بەڵام هێشتا کاتی ماڵنووستنان نەهاتووە، ماڵ بە ئاگان، ئەرێ چ وەرزی ساڵ بوو؟ وەرزیشم لە یاد نیە، لە پڕ دەبێتە تەقوتۆق، ماڵ دەشلەژێ، گەڕەك دەشلەژێ، شار دەشلەژێ، خۆم پێناگیرێ، بە دزیەوە خۆم دەگەیەنمە سەربان، بە هەڵە نەچووبم، رووی تەقە لە ماڵەکانی نزیك یاریگایە، تەقە درێژە دەکێشێ، خودایە بەو شەوە یاریگا چ گەمەیەکی پاڵەوانانە بە خۆیەوە دەبینێ! ئۆی ئەوە کۆپتەریش هەستا، ئەوە چ دەهاوێ! عەرد وئاسمانی روونا ککردەوە، کۆپتەر دەڵێی کەرتێك خۆری لە خۆی بارکردووە، دنیا بووە نوێژی نیوەڕۆ، تەقوهۆڕە، لە سەر بانەکەی پشتمانەوە گوێم لێیە یەکێك بەوانیدی دەڵێ:

وا بزانم، شەست حەفتا پێشمەرگە لەو ماڵانە دەوردراون، گوێت لێنیە، چۆن شەڕدەکەن!

ئەویدی دەیگوت:

دەبێ زۆر لەوە پتر بن سەد پێشمەرگەش دەبن.

شەڕ درێژەی هەیە، گوللە بە گوللە دەکەوێ، ترسام گوللەیەکم لە ئاسمانەوە بۆ بێت، هاتمە خوارەوە، زرم هۆڕە، لە عەرد و لە ئاسمان زرموهۆڕە، دەمژمێرەکەی دیوار خۆی لە سێی شەو دەدا، هێشتا تەقە نەبڕاوەتەوە، شەڕ نزیکەی شەش دەمژمێری خایاند، خودایە دەبێ پێشمەرگەکان چۆن رزگاریان بووبێ؟ چەندیان شەهید بوونە؟ بریندار چەندە؟ ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم، کێ خەوی لێدەکەوێ! رۆژبۆوە دەمویست، هەر من نا زۆر کەس، لەو کۆڵانە نزیکبکەومەوە کە شەو تەقەی دنیای لە سەر بوو، رێ نەبوو، گەڕەك بە جاش وچەکدار تەنرابوو، بەرەبەرە هەواڵی تازە و تازەتر بە ناو خەڵکدا بڵاو دەبۆوە، هەر کەسە و بە شێوەیەك وێنەی شەڕەکەی نیشاندەدا، درەنگتر پێکەوتم کە تەقەی ئەو شەوە هەمووی رووەو یەك ماڵ بووە، لە سەر یەك ماڵ بوو، باشە ئەو هەموو پێشمەرگەیە چۆن لە ماڵێك جێگەیان بۆتەوە؟! درەنگتر هەواڵێکی تازە گەیشت، کاتژمێر رەنگە نۆی بەیانی بووبێ، پیاوانی حکومەت تەرمێکیان لە ماڵەکە راکێشایە دەرەوە و بردیان، دیارە هەر یەك پێشمەرگە شەهید بووەو ئەوانیدی رزگار بوونە!! ئیدی گەڕەك کەم کەمە لە چەکدار چۆل دەبوو، نازانم رۆژی دواتربوو یان دوو رۆژ دواتر وێنەی شەڕەکە چۆن بووە ئەوها خۆی نیشاندا، کۆچەر بە دەمانچەیەك و سێ گوللە و یەك گوللەوە، پێشتر ناوی لەو گوللەیە نابوو (نهێنی حزب) لەگەڵ عەردو ئاسمان شەڕی کردووە، نزیکەی شەش دەمژمێر بەرگری کردووە، لەو ماوەیە هەر سێ گوللەی هاویشتووە و کەمیشیانی بە خەسار داوە، ئەوەی زوو ئاشکرابوو پێنج پیاوی حکومەتی تەختی زەوی کردووە، برینداریش زۆرە، ئیدی نۆرەی ئەو گوللەیە دێ کە ناوی نهێنی بووە، کۆچەر دوای

ئەوەی بـازنەی ئـاگری چەکـدار، ئـاگری عەرد و ئاسـمان هەر جـێگەی ژوورێکـی تێـدا دەبێـتەوە، ئیـدی پاڵەوانـانە گـوللەی نهێنـی دەتەقێنـێ و پاڵەوانانە دەکەوێ، نزیکەی حەفت دەمژمێر بە سەر تەقەی گوللەی نهێنیـدا تێـدەپەڕێ، ئەوجـا چەکـدارانی حکـومەت زاتـی ئەوە دەکەن بـگەنە سـەر تەرمـی کـۆچەر، دواتـر خەڵکـی کـۆڵان بە وردی داسـتانی کـۆچەر دەگێـڕنەوە، بیسـتمەوە لە گەرمەی شـەڕێ، پیاوێـك کە پێشـتر هـاوڕێی کۆچەر بووە و ناپاکی کردووە و بەگەڵ حکومەت کەوتـووە، لە گەرمەی شەڕێ، بە دەنگی بەرز کە کۆڵان گوێی لێبووە، دەڵێتە کۆچەر:

شەڕ مەکە و خۆت رادەست بکە، سـوێند بە شـەرەفم دەخـۆم، ژیانـت پارێزراو دەبێ و کەس دەستت لێنادا.

خەڵکـی کـۆڵان گـوێیـان لە کـۆچەرە بە دەنگێکـی لەو بەرزتـر و زۆر بێباکانە، دەڵێ:

مەمۆ، جا تۆ شەرەفت لە کوێ بوو؟

من بەو گوێیانەی خۆم دەنگی هەموو ئەو گـوللە عەردی و ئاسـمانیانەم بیست، کە بە کۆچەریانەوە نا، هیچیشی بەرنەکەوت ئەگەر بزانین ژمـارەی گوللەکان چەندە، دەبێ لە جادە و کۆڵانەکان قەوان خڕکەینەوە، ئای پیرە قەوانـم دیـت، کـاتێ تەرمەکەیـان دایەوە، بیسـتم تـازیە قەدەغەیە، بەڵام هەرچۆنێ بوو خۆم گەیاندە ئەو مـزگەوتەی خەڵـك بێ گوێـدانە تـرس و هەڕەشە لێی کۆبوونەوە، بـۆ بەڕێکردنـی پـاڵەوان کۆبـوونەوە، دواتـر زۆر دواتـر بیسـتم کە کـۆچەر چەنـد خلەکێـك پێشـەوەی گـوللەی نهێنـی بە خۆیەوە نێ، دوو سێ دێری بۆ بژاری برای و کۆچەری کوڕی نووسیوە:

من بە سەربەرزی شەهید دەبم، بۆیە خەم لە من مەخۆن.

ئەو نامەیەش بە شێوەیەك لە ملیوانەی کراسـەکەی دەشـارێتەوە، بە چـاو و دەستی ئاشنا نەبێ نەبینرێتەوە، ئیدی گەڕەك نازنـاوی پـاڵەوانی شـاری بە کۆچەر بڕی، کۆچەر پاڵەوانی شارە، شاریش ناوی لەو شـەوەی خـۆی نـا، شـەوی تـاقە پـاڵەوان، بەڵام دواتـر لە بەر نـاوی پـاڵەوانە قۆپیەکـان نـاوی

کۆچەر بزر بوو، هاوڕێکانی کۆچەر کۆچەریان لە بیرچوو، جارێك کۆمۆنیستێکی لە کۆمۆنیست تووڕە بە نیوە گاڵتەو نیوە راستیەوە گوتی:

+ دەزانی کۆچەر بە هەڵە کۆمۆنیست بوو، دەبوو یەکێتی بێ.

- ئەوە چ قسەیەکە!

+ ئەگەر یەکێتی با، شێرکۆ شیعرێکی سەد لاپەڕەیی پێدا هەڵدەگوت و لە حەفتا شیعریش وەك پاڵەوانی هەولێر ناوی دێنا.

- ئێستاش کۆچەر هەر پاڵەوانە.

+ پاڵەوانی بزر.

- هەولێر هەمیشە پاڵەوانی بزری لێهەڵدەکەوێ.

من ئەو پاڵەوانە بزرەم لە بەرگی ئاسایی نەك پاڵەوانیی دیتبوو، لە دوورەوەش دەمناسی بە کۆچەر نا بە ناوێکیدی، من منداڵ بووم ئەو پیاوەم دەناسی، بەڵام چ بزانم ئەو پاڵەوانەیە، دواتر دەستی خۆم دەشکاندەوە، بۆچی پتر لێی نزیکنەبوومەوە، دەمگوت:

حەیف پاڵەوانێك لە بەردەستم بوو، تەوقەیەکم لەگەڵی نەکرد تا بزانم گەرمایی دەستی پاڵەوان چ گەرماییەکە، حەیف پاڵەوان لە پێش چاوی خۆم بوو بە مەبەستەوە چاوم لە چاوی نەبڕی تا نهێنیەك لە چاوی پاڵەوان بخوێنمەوە.

ئیدی کۆچەر پاڵەوانێك بوو.

گەمەی دووەم:

دووپشکیان دێنا، داوێکی باڵێك درێژی باریکیان لە سەری کلکی دەبەست، بە داری کەپریانەوە دەکرد، جاری وا شەش حەفت دوو پشك بە دارەوە بوو، حەمە رەشاش دەیگوت:

ئای لە جێی ئەو دووپشکانە کەلەشی مەڕ و بزن با، چی دەبوو!

دەوجا وەرە بڕوانە سەمای دووپشکی سەرنخوون، کلك لە سەرێ، سەر لەخوارێ، هەردووکیش هەر بە ئاسمانەوە! دووپشك هەوڵدەدا سەری بەرزکاتەوە تا ئاستی کلکی، بۆوەی بە چزووێك خۆی لەو ئەشکەنجەیە

رزگاربکات، ناگاتێ، سەر و کلك بە یەك ناگەن، بەڵام دووپشك لە هەوڵی خۆکوشتن ناکەوێ، پێدەچێ شەرمی لە مردنی لەسەرەخۆ بێ، دووپشك خۆ رادەتەکێنێ، تەماشای جۆلانەی دووپشك بکەن، ئەها لە یەکتر نزیکدەبنەوە، لە یەکتر تێدەپەڕن، جار جارە بەر یەکتر دەکەون، دووپشك کە بە داوەوە، بە ئاسمانەوە سەمادەکا هەرچەندە مەرگی بە داوەیە، بەڵام شێوەیەك جوانیشی تێدایە، خارە جەمیل ناوە ناوە بە دەنگە گەورەکەی خۆی جاڕی لێبووردنێکی گشتی بۆ جرجانەوەران دەدات، بەڵام دووپشکی نەدەگرتەوە، لە کەپرە هاوینیەکە زۆر مردنی لە سەرەخۆی دووپشکەکانمان دیت، مردن بە ئەشکەنجەوە، حەمە رەشاش هەندێ کەڕەت دەهاتە سەری، دووپشکی بەستراو بکاتەوە، بۆوەی بزانێ چۆن خۆی ئازاد دەکات، حەمە رەشاش دەیگوت:

کاتێ دووپشك بەو حاڵەوە دەبینم خۆم بیردەکەوێتەوە، ئەو ساتەی بە برینداری دەستگیرکرام و نەمزانی تفەنگەکەم کەوتە کوێ و بردرام و هەڵواسرام، هەموو ئاواتم ئەوەبوو دەستم بگاتەوە تفەنگەکەم و گوللەیەکی پاڵەوانانە وەك ئەوەی کۆچەر بە نێوچەوانی خۆمەوە بنێم.

دەبێت بڵێم من چێژی زۆرم لەو دوو گەمەیە دەبینی، گەمەی خۆکوشتنی دووپشك و ئەشکەنجەی دووپشك، خۆزگە هی ماریشم دەدیت، من دەمێکە دوژمنایەتی خۆم لەگەڵ دووپشك و مار راگەیاندووە، پێکهاتنەوە نیە، دوژمنی مارم، چونکە برادەرێکمی کوشت ناوی (سیامەند)بوو، دووپشك دوژمنمە چونکە جارێك پێوەی دام، ژەهری دنیای رشتە لەشمەوە، گوناهی دووپشك ومار گەورەن و لێخۆشبوونیان نیە، پێشتر ماری (بەرەکە) و دووپشکی (کانی تەلان)م نیشانداون!! تا سیامەند بینایی لە فرمێسك نەگرتووە، دەچمە ناو پەلکەزێڕینەی بەهاری بارەگاوە، پێش پەلکەزێڕینە پایزێك هەیە هەر دەبێ خۆم بگەیەنمەوە حەفتەیەك لەو پایزە.

نازانم یەکەم باران باری بوو یان نا، نابێت باریبێ، باریبا بۆنەکەی لە یادەوەریم دەما، بۆنی بارانی یەکەم لە بیرناچێتەوە، هێندەم دیت چەند

خێزانێك لە ناو بارەگا بە عەردیان دادا، دوای کەمێك پێکەوتم کە ئەوانە لە بن ورمێ لە گوندێکی نزیك گوندی قاسملووەوە هاتوون، کەسوکاری پێشمەرگەی ئەودیون و کۆماری دۆزەخ ئەبوو سۆسەن گۆتەنی، سنووربەدەری کردوون و پێیگوتوون:

یان کوڕەکانتان بێننەوە، یان لە کۆماری ئیسلامی جێتان نابێتەوە.

ئیدی هەر هێندەی بلێی یەك و دوو لە تەنیشت بارەگا دوو سێ چادریان بۆ هەلدرا و هەندێك رایەخ و پێخەفیان پێدرا و ژنەکان لە ئامادەکردنی خواردن و نانکردن یارمەتیان دەداین، ئەو خێزانانە بەو زاراوەیە قسەیاندەکرد کە سمکۆی شکاك قسەی پێکردبوو، لە گوێی من وابوو کە پیاو بەو زاراوەیە قسەدەکات وەك ئەوە وایە لە شەڕە و برینداره و هاواری برادەرەکەی دەکات، هەرچی ژنەکانە زۆر ناسکە، دەلێی لاوانەوەیە، بە تایبەتی دوو خوشکەکە، من هەر زوو کەوتمە بەر تیری چاوی سێگۆشەی یەکێ لەو خوشکانە، بەلام بە سەر خۆم نەهێناو نەمدەهێشت نە ئەو نەکەسیدی بەو تیرە بزانن، ئەو تیرەی هەر خۆم دەزانم، چەند قوول رۆیشتووە، رۆژێك رەنجۆ بە شەرمەوە:

+ دەزانی بۆ یەکێ لەو خوشکانە ئاگرم گرتووە

- کوڕە، تیروەشێنەکە نەبێ، ئەوەی تیری لێمدا؟

باش بوو، هی من دەرنەچوو، دەنا دوور نەبوو شەڕ هەلگیرسێ! ئێ ژنە پێشمەرگەیەك کەخەلکی دەو گۆمی ورمێ بوو، ناوێکی نزیك لە پەروانەی هەبوو، مالیان هێندە لە بارەگا دوور نەبوو، ژنە شکاکیەکانیش زوو زوو سەریان لێدەدا، مێردەکەشی خزمی نزیکی رەنجۆ بوو، رەنجۆ بە خۆی نەوەستا، هانای بۆ برد و تێیگەیاند ئاگر، ئەویش رێك و رەوان ئاگر و تیرەکەی بۆ جووتە خوشك باسکردبوو، هەر رۆژی دواتر، رەنجۆ لە دوورەوە بزەی سمێلی دەهات، هاتە بن گوێم:

+ تەواو، رازین...

- هی منیش؟!

+ ئا، ئا دەبینە وەلاش زاوا.

لە سەر ئەوەبوو لە ماڵی خزمەکەی رەنجۆ لەگەڵ یەکتر دانیشین و قسە بکەین، هەر ئەو رۆژە لە بەدبەختی مـن، رێـی دۆڵەکـۆگەم کەوتە پێشـێ، کە دوو رۆژ و شەوێکم پێدەچوو، بە چوون و هاتنەوە ساڵێکم پێچـوو، ئـا ئەو شەو و دوو رۆژە لە کنە من ساڵێك دەبوو، شەوەکەی هەند درێژ بوو، شەوە شەختەبەندیەکانی بارەگای بەفـراویش هێنـدە درێـژ نـین، لە هـاتنەوە باڵم گرتبوو، بەڵام بە سەر چیدا بێمەوە، چۆل چۆل بارەگا چـۆل نە چـادر مـاوە و نە هـیـچ، خشـەی گەڵایە، وەرزی وەریـن و فـرینە، فڕیـوون شکاکییەکان فڕیبوون، جووتە خوشك لە شەقەی باڵیان دابوو، ئـاخر ئەگەر لە بەدبەختی من نەبێ، کۆماری دۆزەخ لێخۆشبوون دەزانـێ، ئیـدی مـن بە گۆرانی (کەوتمە هەواری خاڵی)م گـرت و رەنجـۆش (ئەوە تـۆ دەڕۆی..) دەگۆتەوە.. ئێستا کاتی ئەوەیە بگەمەوە بەهار.

بەهاری ناوزەنگی سەرێ بەهارێکە لە چ جێیان بەهـاری وام نە دیتبـوو، نە دیتیە، بەهـاری خـاکەکەی نـاڵێم، مەبەسـتم بەهـاری ئاسمانەکەیەتی کە تێکەڵـی زەوی دەبـۆوە، جـوانترین دەسـتلەملانێی زەوی و ئاسـمان ئەو دەستلەملانێیەیە کە لە رێی پەلکەزێڕینەوە ئاوێزانی یەکتر دەبـن، کـێ وەك مـن وێڵـی دوای پەلکەزێـڕینەیە، هەر لە منـداڵیەوە هێنـدەی لەبەر خـاتری پەلکەزێـڕینە ئاسـمانم خۆشویسـتووە نیـو هێنـدە لەبەر مانـگ و ئەسـتێران نەبـووە، مـن بەهـارم بە گیـاوگۆل و کەسـکایی نەناسـیوە، کـام بەهـار پتـر پەلـکەی زێـڕینەی بـۆم هـۆنیبێتەوە، ئەو بەهـارە لەوانیـدی بەهـارتر بـووە، دۆستایەتی من و پەلکەزێـڕینە کـۆنە بـۆ منـداڵیم دەگەڕێتەوە، بـۆ کچێـك دەگەڕێتەوە هێشتا نەیدەزانی شەرم بکات، ئەوە سەربردەیەکی ناسـکە بەڵام رۆمانێك مافی گێڕانەوەی بۆ خـۆی زەوتکـردووە، رێتـادا لێـرە بیگێـڕمەوە، رێتادا لە چ جێیەك بیگێڕمەوە.

ئەو بارەگایەی بە سەر پەلکەزێڕینەوەیە، لە بەهاری پەلکەزێڕینەیـی بـێ پەلکەزێـڕینە نـابێ، رۆژ نـیە چەنـد جـارێ پەلکەزێـڕینە بە رووی بارەگـادا

ڕەنگ هەڵنەدا، لە بیرمە ئەو ساتەی (چڵێ نێرگز)یشم دەخوێندەوە، تیچاوێکم لە سەر پەلکەزێڕینە بوو، چڵێ نێرگز نێرگزێکە لە ساتەکانی بێ نێرگزی بۆنی دەکەم، خۆشەویسترین شیعرە و هەمیشە لەگەڵمە، ئەو هەموو شیعرە هاتن و چوون، چڵێ نێرگز لە چاوی من لە دڵی من وەك خۆی مایەوە، بە نێرگزیی مایەوە، بەر لەوەی بە دیار پەلکەزێڕینەوە بیخوێنمەوە با تایپی بکەم، لە سەرەتای وەرزی داکردنی کیمیا لە ئاقاری گارە ئەو شیعرەم نووسی و کوڕێك بۆی تایپ کردم ناوی ڕاوێژ بوو، ئەو ڕاوێژە بەلاشاوەیی بوو، دواتر لە هەڵاتنە گەورەکە بە خۆی و چوار پێنج براو برازاو ئامۆزاوە، لە ناو هەولێر بەرسینگی دەبابەیان گرت و حەیف خوێنیان بە سەر یەکتردا ڕژا، هەولێریان سوورکرد، بەلاشاوە ڕەشی پۆشی، ئێی لە وەرزی پەلکەزێڕینەش، ڕەشپۆشی لێمان نابێتەوە، ئەوەتا پەڕە کاخەزێکم بە دەستەوەیە، هێشتا جێ پەنجەی ڕاوێژی پێوەیە:

چڵێ نێرگز
لە بەر دەرگای ماڵ
بە مەلوولی دەستت خستۆتە
بن کەلەکەی خەم
لە چاوەڕێی چڵێ نێرگز
نێرگزی چاوت سیسبووە
لە یاد نوقمی
بەژنت داری خەیاڵە و
باڵندەی یادی گرتووە..
منیش لێرە، لە پاڵ بەردێ
هێدی هێدی هەڵدەقرچێم
وردە وردە دەبمە گەردێ
بە ئەسپایی دەخزێمە دەم
سۆزی شنە بای غەریبی و

ڕووەو دوێنێ
ڕووەو ژوان
ڕووە و چاوت ڕامدەپێچێ..
ئاخ، ڕۆژانی گوڵاویمان
وەك تارمایی خەون وایە
چەندی بە تاو بۆ لای بچی
بازدەداو وەگیر نایە
تۆ ئەو کچەی ژیانم لە چاوتا ونبووە،
چڵێ نێرگز
لە کام لووتکە بقرتێنم
بۆت بنێرم
تا بیخەیتە گوڵدانی نوێی پەیمانەوە..
لێم ببوورە
خواستی چاوت دەستناکەوێ
لێرە لە جێی بۆنی نێرگز
هەرچی لووتکە و بنار هەیە
هەرچی کانی و ڕووبار هەیە
بۆنی کیمیای مەرگیان لێدێ..
کارەساتە
لە وڵاتی نێرگزەجاڕ
چڵێ نێرگز دەستناکەوێ!

ئەو شیعرەم پێشتریش لە کافێ خوێندبۆوە، بەڵام بە دیار پەلکەزێڕینەوە نا، بە دیار گریانیشەوە نا، ئەو دەم ئەنفالیش هێشتا نەگەیشتبوو، دنیایەك گوندیش بە پێوە مابوون، کەس هاتنەوە بۆ ناوزەنگی لە خەیاڵ نەبوو، ئەو ناوزەنگەی هەر چەند ساڵ جارێ باوەش بۆ کوڕە دۆڕاوەکانی خۆی دەگرێتەوە، ئەو دەمەی لە کافێ چڵێ نێرگزم

خوێندەوە، من نەمدیتبوو شیعر پێشمەرگە بگرێنێ، نەمبیستبوو پێشمەرگە چەپڵە بۆ نائومێدی لێبدا.

لە نزیك ئەو بارەگایەی بە سەر پەلکەزێرینەوەیە، بە لای مامەندەوە، لە دەو چەمەکە گۆڕاییەکی گچکە هەیە، جێی تۆپانێی پێشمەرگەیە، پەردەیەکی ناسك لە سەر ئاوەکە و بە دیار پەلکەزێرینەوە هەڵواسراوە، مایکرۆفۆنێك بە دارێکەوە، دۆڵێك پێشمەرگە وا بە قەدپاڵەکەوە روو لە پەردە و مایکرۆفۆنەکە لە سەر بەرد و لە پاڵ بەرد دانیشتوون، ئەودەمانێ ئەو دۆڵە مشت بوو لە پێشمەرگە، هێشتا پێشمەرگە قڕی تێنەکەوتبوو، هێشتا لێبوردنی گشتی دوای لە پێشمەرگە نەبڕیبوو، هێشتا رێی رووسیا هێندە رێبوارەی نەبوو لە رێ دەنگیان بگاتە یەکتر، ئەنفال دەمێك بوو گەیشتبوو، بەڵام پێشمەرگە هەر مابوو.

رۆژێکی نەورۆزیە، هێشتا لە سەر ئەو گردەی نۆکانی خوارێ لە نۆکانی سەرێ دەشارێتەوە، دووکەڵێکی تەنك بە شەرمەوە رووەو ئەو پەلە هەورە هەڵدەکشێ کە پێدەچێ تاوە بارانێکی پێبێ، ئێوە نەتانـدیت، دوێنێ ئێوارە ئەو گردە چ ئاگرێکی لە خۆی هەڵکرد و ناردیە ئاسمان، ئاگرێك بۆ ئەوە بوو کە بەغدا ببینێ، رەنگە دیتبێتی! پێشمەرگە لە رێی ئەو ئاگرەوە تووڕەیی خۆی نیشاندا، پێشمەرگە رۆژ و دانێك داری کێشایەوە، چیاکانی ئاقاری نۆکانی رووتکردەوە، هەمووی لە سەر گردەکەی نۆکان گرد کردەوە و ئاگری بەردایێ، شەوی دۆڵ بووە چراخان، لەگەڵ ئاگریش بە هەزاران گوللەی گڕدار لە ئاسمانێ سەمایان دەکرد، گوللەی گڕدار لە ئاسمان دەینووسی نەورۆز، پاسدارانی سەرچیاکان، پاسدارانی خومەینی هاواریان لێبەرزبۆوە، وا تێگەیشتن دۆزەخ گەیشتووە، پیرێکی گوند بە پێکەنینەوە دەیگوت:

ئەو ئاگرە تا نیوەشەو بەردەوام بێ، نسێی چ چیایەك بەفری پێوە نامێنێ.

هەر ئەو ئاگرە بوو کوڕ و کچەکەی بن بەفری دیتەوە، ئاگر نەبا پتر لە

بن بەفر دەمانەوە، ئاگر بەفری تواندەوە و کچ و کوڕی دیتەوە، ژنێکی گوند بە دوای چێڵەکەی کەوت، کچ و کوڕەی دیتەوە، هێشتا سیمای کچە پڕ لە جوانی بوو، بزە لە سەر لێوی بوو، دەتگوت خەوتووە، هێشتا چاوی کوڕە گەش گەش بوو، زەق زەق تەماشای کچەی دەکرد، چەند هەنگاوێك لێکدی دوور راکشابوون، باشە بۆچی لە باوەشی یەکتر نەخەوتبوون! ئەو دوو عاشقە لە زستانەوە لە ناو بەفر خەوتوون و بە ئاگری نەورۆز بە ئاگا هاتنەوە، دەیانگوت جێی گوللەیەك بە سەر مەمکی چەپی کچە و دوو گوللەش بە سینگی کوڕەوە دیار بوو، ئەو کچ و کوڕە پێشمەرگە بوون، حەزیان لە یەکتر دەکرد، کچە خزمی نزیکی ئەندامێکی پلە بڵندی پارتێك بوو، کوڕە چەند کەڕەتێك داخوازیی کچەی کردبوو، ئەو ئەندام بڵندەی پارت گوتبووی:

بیدەمە سەگ نایدەمە تۆ.

ئیدی کوڕە کچە هەڵدەگرێ و ماوەیەك لەو دیو خۆ دەشارنەوە، گوێبیستی لێبووردنێکی گشتیی بەغدا دەبن، دێن، بە دزیەوە بە کەناری رووبارەکەی تۆکان دا دێن، تا بگەنە بازگەکەی سونێ و خۆ رادەستی حکومەت بکەنەوە و لە دەستی پێشمەرگەی پارتەکە رزگاریان بێ، بەڵام عاشقەکان چۆن لە دەستی پارت دەردەچن! بەر لەوەی بگەنە بازگەی ((ئازادی!)) دەستگیردەکرێن، پارت چۆن چاوپۆشی لە بێناموسی دەکات! پارت بڕیاری داوە شەرەف بکڕێتەوە، کڕیەوە، لە بەفر بارینێکدا بە فەرمانی ئەندامی باڵا کوڕ و کچە دەبەنە چیاکەی پشت بارەگاکانی تۆکانەوە کە بارەگای هەموو بەرەی کوردستانی لەوێ بوون، من و زۆریدیش گوێمان لە دەنگی ئەو تفەنگە بوو کە عاشقەکانی کوشت، بەڵام ئەو دەمە بە چ بزانین دوو عاشق هەر ئێستا لە ناو بەفر خوێنیان رژا و بن بەفر کەوتن، ئیدی بە سێ گوللە ناموسی پارت دەکڕنەوە، ئەو چالاکیە ناموسیە تاقە چالاکی سیاسی و سەربازیی زستانیانەی ئەو پارتە دەبێ، ژنەی کچە و کوڕەی دیتبۆوە دەیگوت:

دەستیان لە پشتەوە بەسترابۆوە، کچە تاکە پێلاوێکی لە پێ بوو، تاکێك سێ شەقاو دوور لە خۆی کەوتبوو.

ساڵان پێشمەرگە ئاوا نەورۆزی نەدەکرد، ئاوا ئاگری نەدەکردەوە، ساڵان نەورۆز و ئاگری پێشمەرگە لە مۆڵگەی جاش و سەربازان، لە هێرشی پڕ و هەڵاتنی پڕ دا بوو، ساڵان لە نەورۆزدا چەندان مۆڵگە ئاگریان دەگرت، لەشی دوژمن ئاگری نەورۆز بوو، بەڵام ئەوساڵ پێشمەرگەی هەڵاتوو، پێشمەرگەی ماندوو، پێشمەرگەی گوند لە دەستچوو، پێشمەرگەی لە دەستی ئەنفال دەرچوو، چی لە دەستدێ! چی بە دەستەوەیە بۆ نەورۆزکردنەوە جگە لە داربەڕوو، سوڕانەوە بە دەوری ئاگر، جگە لە گۆرانی و شیعر! من تا ئێستاش سووڕانەوەی دەوری ئاگری گردەکەم لە چاوم پاراستووە، سرووتێك بوو لە سەردەمی زەردەشتیش سرووتی وا نەبوو، ئەو ئێوارەیە تا درەنگانی شەو چ پیرۆز بوو ئاگر، لەو ئێوارەیە بۆ یەکەم جار دیتم پێشمەرگە بۆتە موریدی ئاگر.

نەورۆزێکی پەلکەزێڕینەییە، ئاسمان هەور و ساماڵە، زەوی، شوێنی چەقین هێندە تەڕ نیە، لە سەر عەرد دانیشتن ئاساییە و ساردی ناکێشی، ناوە ناوە نەرمە بارانێك دادەکات، نەرم زۆر نەرم تایبەت بە پەلکەزێڕینە، لێدەکاتەوە و دادەکاتەوە، ئەو دەمەی خۆر بە دەرەوەیە دادەکا، ئەو ڕۆژە هەور و خۆر ڕێکەوتبوون لە سەر ئەوەی ئاهەنگەکە بێ پەلکەزێڕینە نەکەن، چیاکەی ئەو بەری ناوزەنگ، مەبەستم لاپاڵی پەلکەزێڕینەیە، ئەو ڕۆژە ڕەنگە هەزار پەلکەزێڕینەی گرتبێ، چەند جوانە ئاهەنگ لە پاڵ پەلکەزێڕینە، ئاهەنگ بە دیار پەلکەزێڕینەوە، ئاهەنگ لە ناو پەلکەزێڕینە.

مایکرۆفۆن بە نۆرەیە، نازانم نۆرەی من لە پێش چی و لە دوای چیە، لەو ئاهەنگە پەلکەزێڕینەییە، وتارە، درووشم لە مشەیە، سرووده، گۆرانیە، شیعرێکیشە، ئەردەلان و دلنیا سروودیان گۆ، چەتۆ سەحەر سەحەری چڕی و خەیاڵ هەڵفڕی، گۆران هات و بە تۆ بەڵێنم پێبدە تا بەرەو ژوان بیمەوە، پێشمەرگەی بردەوە سەردەمی پێش چەك و تەقە، ئێستا من بە

ساقۆیەکی زستانیەوە لەو بەهارە پەلکەزێرینەییە، لە بەردەم مایکرۆفۆن وەستاوم، سێیەم جارمە لە پێشی بوەستم، لە لای چەپم مامەندەی سەر بە بەفر، هێشتا سپی دەچێتەوە، تازە لێرە و لەوێ رەشایی تێکەوتووە، لای راستم چیای پەلکەزێرینە، لاپاڵی پەلکەزێرینەیە کە خۆی و ئێمەش لە پەلکەزێرینە دەگرێ، پشتیشم ئەو چیایەی کە پەیامبەرەکە بە مەسینەوە پێیدا هەڵدەگەڕا، بەرانبەریشم یەك دۆڵ پێشمەرگەی پیاو دانیشتوون، کۆمەڵە ژنێکیشم لێوە دیارە لە لای پێشەوە بە دەوری بەردێکی گەورە نیوە بازنەیەکیان بەستووە، ئیدی کاتی خوێندنەوەی (چلێ نێرگز)ە.

تیچاوێکم لە پەلکەزێرینەیە، کەم تەماشای پەڕەکاخەزەکەی دەستم دەکەم، ناوە ناوەش چاوێك بە دانیشتوانان‌دا دەگێرم، بەرێکەوت چاوم کەوتە سەر رووی مەلا حەسەن، کە لە پێشەوە دانیشتبوو، فرمێسکم دیت، دیتنی فرمێسك لە چاوی وی بۆ من ئاسایی بوو، ئاخر ئەو پیاوە بە زۆر شت دەگریا کە کەم کەس گریانیان پێدەهات، بەڵام نائاسایی لای من لەوە بوو کە ئەو پیاوە لە ساتی بڕیاردان زۆر توند بوو، بڕیاری زۆر سەختی دەدا، چاوم لە سەر پیاوی بڕیار سەختی چاو بە فرمێسك هەڵگرت، نازانم چاو بۆ گەیشتە سەر ئەو بەردەی کۆمەڵێك کچ و ژن دەوریان دابوو، خۆزگە نیگا لەوێ نەدەنیشتەوە، دیتم ئەوانیش دەگرین، منیش گریانم هات، بە زۆر رامگرت، گریان رادەگیرێ! من وام، کاتێ گریانی ژن دەبینم، بە خۆم ناوەستم و لەگەڵ ژن دەگریم، ئێ، ئەوجارە دەنگێك بەرزبۆوە کە گریانێکی بە جۆشی لە خۆی هەڵگرتبوو، چاوم لە جێی دەنگەکە گێڕا، دیتمەوە ناسیمەوە، ئەوە (حاجی جەمال) بوو، هەستابۆوە سەر چۆك دەستی رادەوەشاند:

هاورێ، دووبارە، دووبارە ئەم کۆپلەیە دووبارە بکەوە.

باشە من گەیشتوومەتە کام کۆپلە! ئا ئەوەی ( لێم ببوورە...) دووبارەم کردەوە، بەڵام وا بزانم حاجی جەمال نەیبیست، گریان دەنگمی گرتبوو، ئەو گرینۆکانە! منیشیان گریاند، چەند پێشمەرگەیەك ئەو دەم (چلێ

نێرگز)یان لا جوان بوو لەوانە: (نەهرۆ خانەقینی، زمناکۆ، ئەبوو دڵشاد، سورخی، هەندرێن، موحسین یاسین، دەریا، رێبوار عەرەب، سیار، کاوە چاوشین، دیار، رزگار حەساری، ئاشتی، کوردۆ، مام بایز، ئاوات، نەژاد، شۆڕش، هێرش، حەمە حەلاق، عەولا پۆلا) مەلا حەسەنیش زۆر جار کە لە کۆبوونەوەکان باسی ستەمی بەعس و وێرانکردنی کوردستانی دەکرد، دەیگوت:

وەك شیعرەکە دەڵێ: (لە ولاتی نێرگزەجاڕ چڵێ نێرگز دەستناکەوێ).

رەنگە چڵێ نێرگز شیعر نەبێ، بەڵام من ئێستاش بە شیعریی هەڵمگرتووە و خۆشمدەوێ.

سەربردەی پەلکەزێڕینەی لاپاڵی پەلکەزێڕینە نە لە نەورۆز دەستپێدەکا و نە لە نەورۆزیش بە کۆتا دێ، بەستنەوەی نیگای من بەو لاپاڵەوە سەرهاتێکە سەری هەیە بنی نیە، ئێستاش کە وەرزی پەلکەزێڕینە دێ، من دەگەمەوە ئەوێ ، چیاکان، دوورایییەکان، هیچ هیچ رێی بینایيم ناگرن و چاوم لەوێیە، ئەوەتا لە بن دار گێوژە خرکەڵەکە، ئەو دارگێوژەی لە کەلێنی بەردێکی گەورە روابوو، دەتگوت چەترە بە سەر بەردەکەوە، تەڕایی لێدەچۆڕێ و بەرانبەر لاپاڵی پەلکەزێڕینە رادەوەستم، لاپاڵێکی تا بڵێی رك دەڵێی دیوارە هەڵچنراوە، دیوارێك هەتا ئاسمان دەڵێ بەس بڵندە، بەری درەختە چەتریەکەش بڵندە، بەڵام هەر بە قەد نیوەی بەری پەلکەزێڕینەیە، دۆڵێکی تا بڵێی قووڵ، لە نێوانمانە، خۆت هەڵدەیتە ناوی مەولوود کۆلکێش گوتەنی ((رەنگە رۆژە رێیەك بێ)) ، دۆڵەکە هێند تەنگ و تەسکە هاوارێك هەبوو، لە بازبازێنێ کەس بە بازی نەدەگەیشت، دەیگوت:

ئەو دۆڵە سێ پێ تەنگتر با، دەمتوانی بازبدەم و لەو بەر خۆم بەو بنە قەرەقاجە دەگرتەوە.

ئەرێ ئەو بنەدارە خڕکەلەی ئەو بەر قەرەقاجە! من ئێستا خۆم داوەتە بەر تەڕایی درەختەکە، چەند لە گیان خۆشە لە نمە بارانی بەهارانەوە،

تەڕایی لە درەختەوە بە سەر لەشتدا بڕژێ، هەر دەڵێی دەست و پەنجەی یارە دەتشێلێ، وای دانێ من لە بن دارگێوژەکە رووتبوومەتەوە و یار دەمشێلێ، نەرمە بارانێکە خودایە لەو قایدەی راگری، ئاگام لێنیە رۆژ لە کام کەلێنەوە چاوی کردۆتەوە و تەماشای نمە باران دەکا، ئێ، لە پڕ نازانم چ هونەرکاریێ، چ رەنگڕێژێ، رەنگی دنیای بە سەر لاپاڵەکەی ئەو بەردا رژاند، سەرەتا رەنگەکان لە شێوەی نیوە بازنە رژانە لاپاڵەکەوە، پێدەچوو لە بنی دۆڵێ بازنەی تەواوی رەنگ تەواو بووبێ، ئەوە چیە ئەو هەموو رەنگە ئاڵوواڵایە، ئەو لاپاڵە چی بەسەر هات! رەنگ چی بەسەرهێنا! ئەو هەموو داوە قژە لە کوێوە هات، هەر داوەی لە رەنگێ، ئەگەر ئەو کچەی دەیڵێم لە بەر هەتاو قژی بکاتەوە و منیش مستە ئاوێکی پێدا بپژێنم، دڵنیام رەنگەکانی ئەو لاپاڵە دەگرێ، راستی من سەرەتا وام بە خەیاڵدا هات، پرچی کچانی دنیا، پرچی هەمەڕەنگ رژاوەتە دۆڵەوە، ئیدی تێکەڵی پرچی کچان بووم، رەنگەکان لە شێوەی بازنەیی نەمانەوە، شێوەیتریان گرت، شێوەی رەنگاوڕەنگ وەك رەنگەکان رەنگاورەنگ، رەنگەکان تا دێ نزیکدەبنەوە، ئەوەتا گەیشتنە پەنجەکانم، دەستم لە رەنگ گیرا، لە قژ گیرا لە پەلکەزێڕینە گیرا، رەنگ گەیشتە برژانگم، من تێکەڵاوی رەنگم و چ رەنگ نابینم، بەڵام هەستدەکەم لە ئاسمانم، دەستی بام لە دەستا و هەور دەمبا، ئەوەتا لە سەر دەرگای حەوشە راوەستاوە، پێدەچێ چاوەڕێی نێرگز بکا، بە دەستی راستم گوت:

کوا چەپکە نێرگزەکە؟

دەستی راست ئاماژەی دا کە بە دەستی چەپەوەیە.

بە دەستی چەپم گوت:

کوا چەپکە نێرگزەکەی یار؟

ئەویش ئاماژەی بە دەستی راست دا، دیتم هەردوو دەست بە سەرسامی و پرسیارەوە پەنجە بۆ یەکتر رادەکێشن.

ئۆی، بە دیار پەلکەزێڕینەوە خەونم دیت، باش بوو بە ئاگاهاتمەوە،

هێشتا پەلکەزێڕینە بە لاپاڵی پەلکەزێڕینەوە مابوو، بەڵام لە برژانـگ دەسـت و بەرپێم دوورکەوتبۆوە، ئیدی لەو ڕۆژەوە مـن بەو جـێگەیەم گـرت، نەك هەر بەهاران، هاوینانیش بە نیازی دیتنەوەی ڕەنگان دەچـوومەوە ئەو جێـیە و چاوم دەبڕیە لاپاڵی پەلکەزێـڕینە، لە بیرنـاچێتەوە ئەو پەلکەزێـڕینەیە هەر دەڵێـی مـاچی یەکەمە لەبیرنـاچێتەوە، زوو زوو دەچـوومە بـن دار گێـوژە چەتریەکە، هێندە جگەرەم لەو سەر بەرد وبن دارە پێچـاوەتەوە و کێشـاوە، بەردەکە ڕەنگی تووتنی گرتبـوو، هێنـدە لە بـن ئەو دارە شمشـاڵم ژەنیـوە، شۆڕەژنێکی زەلێبی گوتبووی:

گوێم لێیە دارگێوژەکە بەرەبەیانان لە خۆوە شمشاڵ دەژەنێ.

## لەماڵی کتێبەوە هاتبوو

چۆنی دەڵێم ئەوهایە، پەنجە بشکێت، ئەگەر هێندەی سێبەری گەردێك زیندەڕۆیی لە خۆی هەڵگرتبێت، زوور جێی من و سۆبەی لێنابێتەوە، کەچی چوار کەسی لە خۆی دانیشاندووە، کاتێ سۆبە دادەگیرسێنم،دەبێ وەك پشیلەی ئاگر بۆ هاتوو خۆم لە قوژبنەکەی ئەوسەر گرمۆڵە بکەم، ناشکرێ سۆبە نەسووتێ، زستانی ناوزەنگ زستانێکە ساردترین سۆبە چیایەك دار دەسووتێنێ، زستانێکە تف بۆ ئاسمانێ هەڵدەی، بە تفایەتی بۆ خۆت ناگەڕێتەوە، دەیکاتە پرووشە بەفر، زستانێکە بەس ناوزەنگدیتیان دەزانن چ سەهۆڵبەندانێك، زوور زوورێکە ئەگەر لە چاوی ئەندازەوە تەماشای بکەیت، جارێك بە چوار لایی خۆی نیشاندەدات، جارێکیدی بە سێ لایی...

دانا گوتی:

دەمەوێ تێبگەم ئەو زوورە چۆن چۆنی هەڵکەوتووە؟

واحێد بە نیازی راستکردنەوە:

بڵێ ئەو گۆڕە چۆن چۆنی هەڵکەوتووە؟

راسکۆ بۆ هەردووکیانی راستکردەوە:

لە ژیانم زووری وا رێکم نەدیوە، رێکیەکەی لەوەدایە لە هیچ رێکیەك ناکات.

ئەو راسکۆیەی لەوێ لە زوورە کەمدووەکەی ناوزەنگ لە قوژبنێ

دانیشتبوو، پیشەی راستکردنەوەی رستان بوو، ناوی وا رۆیشتبوو، بەڵام هەشبوو دەیگۆت:

ئەو کوڕە خۆی پێ راستەڕێ ناکرێ، چۆن...

دانیشتنێکی شیرینە، چایە، ژوور هەمیشە بۆنی چایەی لێدێ، هەر کاتێك، نیوەی شەوێ، پێش بەرەبەیان، هەر وەختێك کە ناوەختە، ئەگەر حەزت چووە چایە، وەرە ئێرە چایەك تێکە و بڕۆ، ئەو کوڕەی رزگار حەساریی ناوە کە دەبوو ناوی رزگار چایی با، زۆر عەشقە چایە، دڵنیام ئەگەر لە سەردەمی پێش پەیدابوونی چا لە دایك بایە، سێ رۆژ نەدەژیا، ئەو کوڕە هەرجارێك رێی بەو بارەگایە بکەوێت سەرێك لە ژووری چای دەدا، جارێك گوتی:

ئەو دوو بۆنە پێکەوە جێگەیان نابێتەوە، یان چایە یان جگەرە، گوناهە ئەو دوو بۆنە تێکەڵاوی یەکتر بکرێن.

ئەو کوڕە چایە رقی دنیای لە جگەرە دەبۆوە، لە کنە وی جگەرە و چایە نەك هەر خزمایەتیان لەگەڵ یەکدی نەبوو، بەڵکو رێك بەهەشت و دۆزەخ بوون.

منیش گوتم:

ئەو دوو بۆنە تەواوکەری یەکترن.

دانیشتنێکی خۆشە ئەگەر لێمان تێکنەچێت، سێ برادەری کۆن زۆر کۆن، برادەری منداڵی مێوانن ئەوڕۆ، دانیشتنێکە شارێك یادەوەری خۆ نیشاندەدەن، شارێك یادەوەری هاتوونەتە قسە، زوو زوو بێ رووخسەتخوازی، مێوانەکان بەجێدێلم و درەنگ درەنگ دەگەڕێمەوە لایان، دوور دەڕۆم زۆر دوور، هەتا ناو هەولێر گیر نابم، دوا وانە ناکەم، بە سەر دیواری قوتابخانەدا بازدەدەم، پیاسەیەکی درێژ بە بن دیواری قەڵات و دادگادا دەکەم، دەچمە ناو کتێبان، دەیانبینمەوە ئەوانە و زۆر برادەریدی دەبینمەوە، واحێد هاوپۆل یان هاو قوتابخانەم بوو، لەگەڵ راسکۆ منداڵی گەڕەکێکین، دوو برای ئەو دانایە زۆر برادەرم بوون،

برادەریم لەگەڵ سەرتیپیان بەهێزتر بوو، بەڵام لە یادەوەریمدا سەرداریان زیندووترە، هەر کتێبێکی مارکس، مارکسیەتت بویستایە، لە کن سەرتیپ دەستدەکەوت، زۆر کەس پێیاندەگوت:

لینینیش هێندەی تۆ مارکسی نەخوێندۆتەوە.

خوێنەرێك بوو کەس شانی لە شانی وی نەدەدا، مەگەر راسکۆ، ئەو راسکۆیەی لە چاوی دیارە ئەمڕۆ لەو ژوورە کولانکەییە شتێك دەقەومێنێ... ئەودەمانێ لە هەولێرێ دوو کەس لە کتێب کڕین ناویان هەبوو، راسکۆ و سەردار، بە داوای لێبووردن لە عەزیز گەردی، یەکەمیان کتێبخانەیەکی هەبوو، لە کتێبخانەی گشتیش دەوڵەمەندتر، هەرچی دەشیکڕی دەیخوێندەوە، زۆر جار دەیگوت:

ئەوڕۆ پشتی لینینم شکاند، هەژدە دەمژمێری رێك خوێندمەوە.

لە جێگەیەك خوێندبوومانەوە کە لینین شەو و رۆژی وا هەبووە حەڤدە دەمژمێر سەری لە سەر کتێب هەڵنەگرتووە وخوێندوویەتیەوە، وابوو من لە نزیکەوە ئاگاداری راسکۆ بووم زۆری دەخوێندەوە، لە ناو هەموو گەنجانی گەڕەکی بەلاشاوە یەك چاویلکە لە چاوت دەدی ئەویش راسکۆ بوو، دکتۆر جارێك پێیگوتبوو:

کەم بخوێنەوە، وەرنا...

راسکۆ گۆتبوویە دکتۆر:

چاو بۆ خوێندنەوەی کتێب درووستکراوە.

هەرچی سەردارە لە راسکۆ پتر کتێبی دەکڕی، رۆژ نەبوو کتێبێك نەکڕێ، قەردی دەکرد و بە کتێبی دەدا، لەگەڵ ئەوەش بڕوا ناکەم دە کتێبی هەبووبێت، کەمیشی دەخوێندەوە، سەردار هەندێك لەو کتێبانەی دەیکڕین نەیدەبردنەوە ماڵێ، لە رێ دەیفرۆشتنەوە، بەردەوامیش لەو کڕین و فرۆشتنە زیانی پێدەکەوت، کتێبی وا هەبوو دوای لێکردنەوەی چەند لاپەڕەیەك بە نیوەی نرخی کڕین دەیفرۆشتەوە، کتێب هەبوو نەیدەفرۆشتەوە دەیسووتاند، زۆر هەوڵم لەگەڵی دا، بێ کەڵك بوو، وازی لەو تێکەولێکەیەش نەدەهێنا، سەردار دەیگۆت:

من پێچەوانەی تۆم، پێچەوانەی راسکۆم، پێچەوانەی سەرتیپی برامم، پێچەوانەی دنیام، ئێوە کتێبی باش دەکرن، بەڵام من کتێبی خراپ دەکرم.
باشم لەبیرە کتێبی شەرەفنامەی چاپی ئەودیوی کری، چەند لاپەڕەیەکی لێکردەوە، بە زەرەر فرۆشتیەوە، سەردار ناوە ناوە بزر دەبوو، بە کۆمەڵێ کتێبەوە بە دیار دەکەوتەوە، دەڕۆیی دەچووە سەر سنوور، دەچووە ئاقاری پێشمەرگە، دەچووە هەموو جێگەیەك، ترس لە کن شێر هەبوو لە کن ئەو کوڕە نەبوو، سەردار زۆر جار دەیگوت:
هەندێك کتێب هەیە زۆر باشە، بەڵام چەند لاپەڕەیەکی ئەو کتێبە زۆر خراپن دەبێت لێیانبکەمەوە، ئەو لاپەڕانە خەڵك بە هەڵەدا دەبەن، هەندێك کتێبیش هەن دەبێت بسووتێنرێن.
من دەمگوت، سەرتیپی براشی پێیدەگوت:
واز لەو ئیشە قوڕە بێنە، چەندی دەدڕێنی، چەندی دەسووتێنی؟ خۆ...
دەیگوت:
هەر باشە خۆ کەمتر دەبنەوە.
سەردار قسەیەکی هەبوو زۆر و هەموو جارێکیش بەیەك ئاوازە دەیگوتەوە:
شێرکۆ بێکەس و کۆمەڵە و مام جەلال لە سەرەوەی قسە و قسەڵۆکن
هەندێك لە برادەران ناویان لەو قسەیە نابوو (( ئایەتی سەرداری سەعید سۆفی))
ئیدی سەردار هەر کتێب و بڵاوکراوەیەکی دیتبا قسە و قسەڵۆکن لە سەر ئەو سێیە، دەیکڕین و دوای لادانی قسە و قسەڵۆکەکان دەیفرۆشتەوە، بەڵام ئەگەر برادەرێکیش داوای لێکردبا کە فلان کتێبی بۆ بێنێ و پەڕیشی لێنەکاتەوە، دڵی نەدەشکاند، جارێك (بۆ کوردستان) ی هەژاری بۆ من هێنا، کە لێیم وەرگرت:
- لاپەڕەکانی تەواون؟
+ حەیفت نەکردا!

لەو ژووره گچكه نازانم چەند لایيەوە، لە تەك ئەو سێ مێوانە جوانەوە بە دەم چایە و جگەرەوە، خەیاڵ خۆش بێت هەموو هەولێرم دەکرد و دەهاتمەوە و کەسیش بەو سەفەرانەی نەدەزانی، دانیشتنەکەمان لە کەناری رۆشنبیری و شیعر بوو، لە بیرم نیە هێندە لە سیاسەت نزیك كەوتبینەوە، زۆر نزیك بكەوتینایەتەوە یالا دەگەیشتینە تخووبی (پاكانە)كەی هادی عەلەوی.

کەمتر قسە و باسی ئەو دانیشتنەم لە بیرە، ئەوەی لە بیرم مابێت، وەڕینی سەگەکان و زرمەی هەرەسەکان دەهاتنە ناو قسانەوە، کۆچی سووریشم دیت بە پێش دەرگای دانیشتنماندا تێپەڕی، لە ناو زرینگەی چا تێکدانیشدا گوێم لە دەنگی پەشێو و ڕەفیق سابیر و شێرکۆ بێکەسیش بوو، شاملۆ و فرووغیش سڵاوێکیان کرد، زۆریدیش، سورخیش شیعرەکانی دەهاتنە ناو قسانەوە، وا بزانم دانا بوو گوتی:

جوانیی سورخی لەوەدایە وەك ئەوانیدی نانووسێت.

هەر جارێك تەماشای دانام دەکرد، سەرتیپ و سەرداری برای بە جووتە دەهاتنە ناو چاومەوە و دانا وندا دەبوو.

سەردار شیعریشی دەنووسی، لە بیرمە شیعرێکی لە سەر گیڤارا نووسیبوو، کۆپلەیەك یان پتری لە رۆژنامەی هاوکاری بڵاوكردبۆوە، لە چاخانەی عەبۆ، رۆژنامەکەی بە دەستەوە گرتبوو، بۆمی خوێندەوە، سەرتیپیشمان لەگەڵ بوو، قسەیەکی کرد ئێستاش بە ئاوازەی خۆیەوە وا لە گوێمە:

من کە شیعر لەسەر گیڤارا دەنووسم، دەبێت چەکەکەی ئەویش لە شان بکەم.

سەردار ئازابوو، زۆریش ئازابوو، لە چاوی بەعس نەدەگەڕاوە، لە خۆپیشاندانەکان جێی وی هەمیشە پێشی پێشەوە بوو، واحێدیشی لەگەڵ بوو، سەردار پێش ئەوەی ببێتە پێشمەرگە، پێشمەرگە بوو، ئەو ساتەی هەواڵی مەرگیم بیست تەواوێك بۆی گریام.

لەو دانیشتنە راسكۆ چووبووە بێدەنگیەكی سوارەوە، من درەنگ تێگەیشتم كە ئەو بێدەنگیە تەقینەوەیەكی ترسناكی بە دواوەیە، چاوەكانی ئاسایی نەبوون، جوولانەوەی پێڵوو و برژانگەكانی لە كۆمەڵە چەكدارێكی سەر لێشێواو دەچوون، ناوە ناوە كۆخەیەكی دەكرد، كۆخەی قورگ خاوێنكردنەوە، خاوێنكردنەوە بۆ قسە... دوای ئەوەی هەستم بە نائاسایی راسكۆ كرد، چیدی خۆم بە باڵی خەیاڵەوە نەكرد و نەهاتمەوە شار، بۆ ئەوەی بیهێنمە قسە پرسیارێكم لێیكرد، بە (ئا) یەك دەمكوتی كردم، پرسیارێكیدیشم كرد، بە (نا)یەك كە هەر لە (ئا)یەكە دەچوو جوانتر دەمكوتی كردم، چەند پرسیارێك بە دووی یەكدا هاتن، (ئا) و (نا)یەكانیش سەریان لە دووی یەكدی نا، هەر خەریكی هەوك خاوێنكردنەوە بوو، وازم لێیهێنا.

لە هەستاندا، دەنگێك تۆ بڵێی هاوارێك بەرز بۆوە:

بڕۆن، من نایەمەوە، ئێرە ماڵی منە، زوو بڕۆن دەی.

واحێد بە سەرسامیەوە گوتی:

نایتەوە كەیفی خۆتە، بەڵام بۆ وا بە تووڕەیی؟!

من راست لە جێگەی خۆم تەزیم، تەماشای دووەكەیدیشم كرد ئەوانیش تاسا بوون، بە بێدەنگی تەماشای یەكترمان دەكرد، بە چاو لە یەكترمان دەپرسی چ بووە؟ بە ئاماژە، بە ئاماژەی لێو و دەست (نازانم، چ نازانم)مان بۆ یەكدی دەهاویشت، بە جۆرێك لە دڵشكاوی رۆیشتن، رەنگە من لەوان پتر نیگەران بووبم، هەتا خوار بارەگا لەگەڵیان چووم، دیار بوو هیچ كامێكمان هیچمان لە تووڕەبوون و مانەوەی راسكۆ نەزانی، بەڵام دانا هێندەی گوت:

من دوێنێ كە دیتم هەستمكرد ئاسایی نیە.

كە گەڕامەوە ژوورەكە دەبینم راسكۆ چاوی لە تابلۆكان بڕیوە و پێدەكەنێ، ژوورەكەم پڕكردبوو لە تابلۆ.

+ ها بە چی پێدەكەنی؟

- بە زەمەن، برا، بە زەمەن.

چاویشی هەر بە تابلۆکانەوە هەڵواسراوە، کە لێی وردبوومەوە دیتم چاوی لە تابلۆی کاتژمێرەکە بڕیوە، کاتژمێرە تێکشکاوەکە یان تەواوەکە، یەکیینەش پێدەکەنێ، ویستم لێیبپرسم بۆچی لەگەڵ ئەو بڕادەرانە نەچوویتەوە؟ بۆچی تووڕەتکردن؟ پێکەنین، پێکەنین، هەر پێکەنین.

- ئەگەر زەحمەت نیە چایەکی مارکسیانەم بۆ تێکە.

+ چای مارکسیانە کووە؟

- تڕحێو بە خۆشی دەڵێ مارکسی.

چایەکم بۆی تێکرد، پێدەچوو مارکسیانە بوو بێت، چونکە زۆر بە جوانی و چێژەوە دەیخواردەوە، ناوە ناوەش پێکەنینێکی شیرین لە چایەکە شیرینتری بۆ دەکرد، من زۆر بە وردی لێیڕامابووم، هەموو هزر و هۆشی خۆم بەکارهێنا بۆ ئەوەی بزانم ئەو کوڕە ئاساییە، یان شتێك هەیە، دەتگوت تێگەیشت کەوتۆتە ناو نیگای تاقیگە و تاقیدەکرێتەوە:

- با پێتبڵێم من زۆر ئاساییم، لە تۆش و لەوانەی لەگەڵ من هاتن و بێ منیش ڕۆیشتنەوە ئاساییترم.

+ ئەوجا کێ گۆتیتی ئاسایی نیت؟

- ئەرێ ئەتو ڤاگنەرت خوێندۆتەوە؟

+ نا، شتێکی ئەوتۆشی لە بارەوە نازانم.

- حەیف! ئەو پیاوە مەزنە ناناسی، گەورەترین نووسەرە لە دنیایێ، نا لە مەکسیم گۆرگی گەورەتر نیە، کەس لە مەکسیم گۆرگی گەورەتر نیە.

ڕاسکۆ هاتە سەر نووسەران، نووسەرانی گەورەی دنیایێ، هەند بە وردی و لەسەرەخۆ باسی دەکردن، ئەو گومانەی لە بارەی نائاسایی ئەوەوە لە سەرم بوو ڕەویەوە، لە بیرمە لە بارەی هادی عەلەویەوە گۆتی:

+ منیش وەك ئەو پاکانەیەك دەنووسم.

- ئەتو لۆ؟ خۆ عەرەب نیت!

پێکەنینێك پێکەنی کتری سەر سۆبەکە لەریەوە، گومانەکەم لا درووست بۆوە، بە نەرمیەوە گۆتی:

+ مـن پاکـانه له کوردبـوون دەکەم، ئەدی نـازانی کـورد چیـان له یۆنانیەکان کرد؟

- یۆنانیەکان یان ئەرمەنیەکان؟

+ یۆنانیەکان دەڵێم، له ئەرمەنیەکان گەڕێ.

- شتی وام نەزانیوە.

+ دیارە زۆربات نەخوێندۆتەوە؟

- زۆربا! با، خوێندوومەتەوە، لێ...

ئەگەر ئەو رۆمـانە بخـوێنیتەوە، تێـدەگەیت کـورد چەنـد غەدریـان له یۆنانیەکان کردووە، راویان ناون، هەر مێژوونووسێك ئەوەی گۆتبـا بـاوەڕم نەدەکرد، بەڵام کـازانتزاکی وای گوتـووە، تێگەیشـتی! بـۆیە مـن پاکـانەی خۆم دەنووسم، بۆ زۆربای دەنێرم، هەه ها ها...

وا بـزانم شـتێکی بیـرمکەوتەوە کە له رۆمـانی زۆربـا چـاوم بە وشـەی (ئەکراد) کەوتووە، بەڵام نەدەهاتەوە بیرم وشەکە له چ رستەیەکدا هـاتبوو، جگە لەوەش له بیرمە لەکاتی خوێندنەوەی ئەو رۆمانەدا لەو بـاوەڕە بـووم، ئەو وشەیە هەڵەی چاپ بێت و راستیەکەی (ئەتراك)ە.

راسـکۆ پێکەنینێکیدیکەشـی کـرد، بەڵام زۆر نەرمتـر لەوەی پێشـوو، گوتی:

نزیك لەوەم گوت:

ئەگەر واش بێت، هەر دەستی تورکی تێدا بووە.

له زۆرباوە بازی دەدایە ناو (تاوان و سزا)، دەیگۆت:

خۆ پیرێژنەکەی دیستۆفسکی دەناسی؟ من هێنـدە لەگەڵ کوشـتن نـیم، بەڵام لەگەڵ کوشـتنی ئەو جـۆرە کەسـانەم، دەك دەسـتت خـۆش بێـت راسـکۆلنیکۆف، نـازانی چەنـد رەشـوڕووت لەو دنیـایە بە پێخواسـی دەسـووڕێنەوە، چەنـد برسـی له پەنـا دیوارەکـانی دنیـا، دنیـای کەلاوە سەردەنێنەوە، لەو لاوەش ئەو جۆرە کەسانە پارە گلدەدەنەوە پاشانیش... ئـا مـن دەستخۆشـی له پـاڵەوانەکەی تـاوان و سـزا دەکەم کە ئەو پیرێـژنەی

کوشت، هەزار جار دەڵێم دەستەکانت خۆش بێت، ئەی راسکۆلنیکۆفی پاڵەوان.

من هەڵمدایێ:

+ بەڵام وا بزانم پاڵەوانەکە لەو کوشتنە پەشیمانبۆوە.

- پەشیمانبۆوە نەبۆوە، کەیفی خۆیەتی، من ئەو راسکۆلنیکۆفەم کە تەوری بە دەستەوەیە.

لە تاوان و سزاوە چووە ناو (دادگا) و زۆر سەیر، زۆر هونەرمەندانە ویتەکانی دادگای نیشانی من دەدا، باشم لە بیر نیە چی دەکرد و زۆر رستەی ناو دادگای چۆن دەگوتەوە، هێندەم لە بیرە چاوی لە چاوی من بڕیبوو، گوناهەکانی خۆی دەژمارد، باسی ئەوەی دەکرد، کە ئەویش دادگایەکی وەك ئەوەی کافکا دەنووسێت و دەیگوت:

من یۆنانیم کوشتووە، من پیرێژنەکەی ناو تاوان و سزام کوشت.

لە هیکرا دەنگی دەگۆڕا و بێژەریانە دەنگی هەڵدەبڕی:

منیش حەمەدۆکم، تۆش حەمەدۆکی، دانا و واحێدیش حەمەدۆکن، سەرداریش حەمەدۆك بوو، سپارتاکۆس بوو، ئێمە لە ستەم یاخی بووین، هەمووشمان لە چاوەڕوانیداین، وا نیە ئەدی؟ بۆ قسە ناکەیت؟

منیش گوتم:

با، وایە...

گریان هەوکی گرت، لەوە دەچوو تاوانێکی گەورەی کردبێت و پەشیمانی دایگرتبێت، یان خەریکی کێشانی نەخشەی تاوانێك بێت و پەشیمانیەکی پێشوەختە لێی هەڵوەشێنێتەوە، هەر لەو ئان و ساتەدا هەستمکرد تووشم بە تووشی راسکۆلنیکۆفی تاوان و سزا بووە، هەر بۆیەش لەم گێڕانەوەدا ئەو کوڕەم بە راسکۆ ناودێر کردووە، (راسکۆ لە راسکۆلنیکۆفەوە هاتووە و لە راستگۆش دوور نیە) دەنا ناوی خۆی نەجاتی قیربەند بوو.

ئەو جارە بە دەستی خۆی چایەکی تێکرد:

+ چای ئەو ژووره زۆر مارکسیانەیە، بە من بڵێ وەخت نیە (گۆدۆ) بگات؟ دەمێکە مرۆڤایەتی چاوەڕوانی ئەو ژنە جوانەیە، ئەتو زانیوتە گۆدۆ ژنە؟

- لە کێ بزانم!

دەزانی باشت نەخوێندۆتەوە دەنا دەتزانی.

+ دە بۆم روون بکەوە بزانم...

- لەوە گەڕێ، کەمێك سەرم دێشێ، پێویستم بە خەوە، بە یارمەتی سلڤادۆر دالی و پیکاسۆ سەرخەوێك دەشکێنم.

لە سەر پشت راکشا، سەیرمکرد زۆر سەیر چاوی بە بنمیچەکەدا دەگێڕا، چاوی لە سەر کلاشینکۆفەکە راگرت، کلاشینکۆفەکەم بە دیوارەوە هەڵواسیبوو، لە خۆوە ترس دایگرتم، یەکپێ هەستام و کلاشینکۆفەکەم هێنا خوارێ، بۆ وەی هەست بە هیچ نەکات، کەوتمە خاوێنکردنەوەی، مەخزەنەکەی سەریم بەتاڵ کرد و لە جێگەی خۆیم هەڵواسیەوە، راسکۆ هەر راکشاوە و چاو دەگێڕێ، بانگمکرد:

+ هەستە بچین نان بخۆین، درەنگە.

- ئا، ببوورە، من تۆم ماندوو کرد، کاکە نازانی ژیان چەند منی ماندوو کردووە، ئەرێ بە هاوڕێیان بڵێ من هاتوومە ببمە پێشمەرگە.

+ خەمت نەبێت.

لە ژوورێك جێگەیان بۆ کردەوە، بەڵام مەگەر بۆ نووستنەکە دەنا هەر لای من بوو، خەریکی ئەو چەند کتێبە بوو کە لەولاو لەم لا دەستمکەوتبوون، ئەو کوڕە کە قسەی دەکرد هەمیشە دەتگوت گریان لە هەوکیەتی، لە دەنگیەوە هەستدەکرد دنیا غەدری لێکردووە.

لە قسەکردن دەمژمێر دوای دەمژمێر لە کورتی دەدا، بەڵام ئەوەش نەبوو لە قسە بکەوێت، هێشتا هێندەی من و حەوتی وەکو من قسەی دەکرد، قسەکانیشی هی ئەوە نەبوون لێی بێزار بیت، من لێیان بێزار نەدەبووم، ئەو چەند رۆژە باسی یەك گەڕەك رۆمانووس و چیرۆکنووسی

بۆ کردم، هی وای دەگۆت و باسی دەکردن من هەر ناویانم نەبیستبوو، لە خـۆوەش نەیـدەدا بەرێ، هەمـوو ئەوانەی خوێنـدبۆوە کە بـۆ منـی باسـدەکردن، بەوەش دەمزانـی کە خوێنـدبوونیەوە کـاتێ باسـی ئەوانەی دەکرد کە من خوێندبوومنەوە یان شتێکم لە بارەیـانەوە دەزانـی، هەڵەی لە ناوەکـان یـان لە نـاوەڕۆکی ڕۆمانەکـان نەدەکـرد، ئەو کـوڕە بە شـێوەیەك باسی لە کەسایەتی نـاو ڕۆمانەکـان دەکـرد، هیچ چـارت نەدەمـا جـگە لە گـوێ شـلکردن، دەسـتبەرداری قـووڵترین و جـوانترین خەیـاڵی خـۆت دەبوویـت و خـۆت رادەسـتی جـووله و قسـەی راسـكۆ دەكـرد، ئەو راسکۆیەی رێك دەتگوت ئەو پاڵەوانە یان ئەو کەسایەتیەیە کە قسەی لێوە دەکات، بریا وەك من چاوتان لێبایە کاتێ دەچووە نـاو (کـاتژمێر بیسـت و پێنج)ەکە، چۆن جلی پاڵەوانەکەی لەبەر دەکـرد و شـێوەی دەنگـی خـۆی وەك بڵێی وەك هی وی لێدەکات و دەیگوت:

نا، من ئەو ئیشە ناکەم چاڵ بۆ هاوڕێ کۆمۆنیستەکانم هەڵناکەنم.

یـان ئەو دەمەی خـۆی دەکـردە ئەو کـوڕە شـەرمنەی کە لە دوورەوە تەماشای (گوڵی رەش)ی دەکـرد، راسـکۆ لەوێ ئەکتەرێکـی جـوان بـوو، دەرهێنەرێکی بە توانا بوو، لە ژووره بە نـاو ژوورەکەی ناوزەنـگ بە تـاقی تەنێ گوڵی رەشی هێنایە سەر شانۆ، منیش تـاقە تەماشـاکەر، راسـکۆ دوای ئەوەی شانۆکەی تەواو کرد، پرسی:

- گوڵی رەش کتێبێکی جوانە، دیوتە؟

+ کتێبە یان ناوی چیرۆکێکە، خوێندوومەتەوە...

- ناوی چیرۆکەکە و ناوی کتێبەکەشە.

زۆر دڵم بەوە خۆش بـوو کە شـێرزاد حەسـەن کـۆمەڵە چیرۆکێکـی بە (گوڵی رەش) ناودێر کـردووە، دەمویسـت لە نـاوزەنگەوە بە هـاوار هـاوار بکەم و سوپاسـی بـکەم بۆ هەڵبژاردنـی ئەو نـاوە، وام هەسـتدەکرد لەبەر خـاتری مـن ئەو وای کـردووە، ئـاخر چیرۆکـی گـوڵی رەش لە کـنە مـن دەقێکی پیرۆز بوو، لە کنە من سووڕەتێکی جوان بوو، زۆر ئـایەتیم لەبەر بوو.

- بوزورگی عەلەویت خوێندۆتەوە؟
+ نا، بەس ناویم بیستووە، هیچیم نەخوێندۆتەوە.
- دەزانی ... رۆمانی هەیە.
ئەو ژمارەیەی گوتی ئێستا لە بیرم نەماوە.
+ هیچی کراوەتە عەرەبی، کوردی؟
- نازانم، من بە فارسی خوێندوومنەتەوە.
+ دیارە فارسیەکەت باشە، لە ئێران بوویت؟
- دەزانی لە کوێ فێرە فارسی بووم؟ لە کونە فیراران، هەر لە بەلاشاوە لە حەوشەی خۆمان کونەکم لێدابوو، ئەمما کون! سەدام هەرچی سەگی دنیا هەیە بە دوو پێ و چوار پێوە بە مالی مەی وەرکردبا، نەیاندەدیتمەوە، لە جێگەیدیش کونم هەبوو، لە (گردیش) هەمبوو، لە جێیدیش...
بە باسکردنی بەلاشاوە هەستمکرد راسکۆ بۆنی بەلاشاوەی لێدێت، ئەو بەلاشاوەیەی منداڵیمی لە خۆیدا وەك خۆی و بێ هیچ گەچلاتێك پاراستووە، ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵەی نێوان ئێستام و منداڵی کە سەردانی دەکەمەوە، وا دەزانم منداڵەکەی جارانم و ئەو دارتێلانە جوان دەناسمەوە کە پێیاندا هەڵدەگەڕام.
+ بە تاریکی، ئەدی کونی فیراران تاریك نیە؟
راسکۆ چاوەکانی شێتانە هەڵگێڕ و وەرگێڕ کرد:
- بەرێوەڵلا هەند تاریکە هەند تاریکە، دەڵێی شەوی ناو شەوە، بەڵام برات یەك لایتی هەڵدەکرد، بەڵام لایت! کونی فیراری لە کۆشکی کۆماری رووناکتر دەکردەوە، ئەوجا تۆ قسەکانم لەبیر مەبەوە، من لەو کونانەوە فێرە فارسی بووم، ئەو رۆمانانەی وا باسیان دەکەم، زۆریانم لەو کونانەوە خوێندۆتەوە، دەزانی سەرمایەکەی مارکس ئەو سەرمایەی وا بزانم کەم کۆمۆنیست خوێندوویەتیەوە، هەر لە کونی فیراران، لە کونەکەی (گردیش) خوێندمەوە.
هەستێکی وام لا درووست بوو کە بەرانبەر راسکۆ نەخوێندەوارم، لە

خۆم گەیشتم کە ئەو چەند ساڵە چەندم لە پاش داوە، چەند لە کتێب دابڕاوم، وا بزانم خۆزگەم بۆ کونە فیراران خواست.

نیگاکانی راسکۆ نیگای ئاسایی نەبوون، چاوەکانی سەیر لە دەوروبەریان دەڕوانی، خۆ ئەو ساتانەی چاوی لە چەك دەبڕی، زۆر ترسناك خۆی نمایشدەکرد، بارەگا هەموو هەستیان بەو ترسناکیە کردبوو، من نەمدەوێرا لە تفەنگەکەم ببمەوە، لەگەڵ خۆمم دەگێرا، یان فیشەکدانەکانم دەشاردەوە و ئەوەی سەریشیم لە فیشەك بەتاڵ دەکرد، ئەو کوڕە خەریکبوو شێتم بکات، زۆربەی کات زۆر ئاسایی و لە سەرەخۆ بوو، بە تایبەتی ئەو کاتانەی باسی کتێبی دەکرد، جاروباریش سەد سووندت دەخوارد لەوەتەی هەیە شێتە.

- ئەرێ بۆچی تفەنگێکم نادەنێ؟

+ تفەنگت لۆ چیە؟ خەریکە سەردەمی تفەنگ بە سەربچێت.

- قسەی وا مەکە، من پێشمەرگەم، پێشمەرگەش بێ تفەنگ نابێت، سەردەمی تفەنگ بەسەر ناچێت، شۆڕشێکی خوێناویمان لە پێشە، شۆڕشێکی لینینی، دەزانی باوەڕم بەخوێن رشتن نیە، بەڵام ئەو خوێنەی کە لە (تاوان و سزا) رژا، بە لامەوە ئاساییە، ئەوەش بزانە مەبەستم رشتنی خوێنی پیرێژنێکی بێچارە نیە.

قسەکەی تەواو نەکرد، بە هەموو هێزی دەستی ناولەپێکی لە ناوچەوانی خۆی دا و زرچەی هات و ئاخێکی وەهاشی هەڵکێشا نەبێتەوە، تەماشاکردنێك تەماشای کردم وەك ئەوەی قەت منی نەدیتبێت و بە لایەوە سەیربێت لە تەکیەوە دانیشتووم، تەواوێك لێم راما، وەك بڵێی ناسیبێتمیەوە بزەیەکی دۆستانەی بۆم کرد و راکشا، متەقی لە خۆی بڕی، پێدەچوو نەیەوێت کەس هەست بە هەناسەشی بکات، جگەرەکەیم کوژاندەوە، پێدەچوو تازە فێرە جگەرە بووبێت، لە جگەرە گرتنیڕا دیار بوو، بە دیاریەوە دانیشتم و جگەرەم بە جگەرە پێدەکرد.

زۆری نەبرد راسکۆ لە دیدی بارەگاوە بووە جێی مەترسی، جێی

گومان، جێی بێزاری، جێی...جێی شتێك لەوانە یان تێکەڵەیەك لەوانە، لە پەناوە گوێم لێدەبوو هەر یەکەی قسەیەکی دەکرد، قسەکان لە چەند رستەیەك یەکیان دەگرتەوە:

رستەیەك:

ئەو کوڕە کەتنێکی لە چاوە! نابێت لە بارەگا بمێنێت.

دەمویست بێمە قسە و بڵێم:

ئەو کوڕە بە قەت بەژنی هەمووومان کتێبی خوێندۆتەوە، لێی مەترسن.

پەشیمان دەبوومەوە، راسکۆلنیکۆفی تاوان و سزام بیردەکەوتەوە، ئەو کوڕەی راسکۆ هەمیشە باسی دەکرد.

رستەیەکیدی:

دوور نیە لە لە ئەمنەوە هاتبێت.

دەمویست بڵێم:

نا، ئەو کوڕە لە کونە فیرارانەوە هاتووە، لە ماڵی کتێبەوە هاتووە.

نەمدەگوت، چاوە ترسناکەکانی زەمانمیان لە گۆ دەبرد، دەترسام کەتنێك بکات.

رستەیەکیدیش:

ئەو کوڕە بە ئەنقەست وەك شێتان خۆی نیشان دەدات، پێویستە دارکاری بکرێت تا...

ئیدی خۆم پێڕانەگیرا:

نا، وا نیە، ئەو کوڕە پێویستی بە خەستەخانە هەیە، خەستەخانە.

ئەو قسەیەم سەرنجی کەسی رانەکێشا، نازانم نە من بە دەنگێکی زۆر نزم گۆتم و نەگەیشتە گوێی کەس، نە بە ئەنقەست گوێی خۆیان گرانکرد!

سەرو ریشێکی تۆزاوی دەتگوت قەت ئاو و سابوونی نەدیتووە، سەر و ریشێکی ئاڵۆزکاو پێنەدەچوو شانە بناسێت، جلکەکانی چڵکن، چەند جار هەوڵم لەگەڵی دا گەرماوێك بکات نەیکرد، کوڕێك کە ناوێکی وەکو

(پێشپێش)ی هەبوو بەژنێکی دارتێلیشی هەبوو، لەبەر راسکۆ هەڵدەهات، بیانکوشتبا ئامادەنەبوو جێیەکی بە جێیەکی وی بکەوێت، ئەو پێشپێشە زۆر واسواس بوو، بێزی لە هەموو شتێك دەبۆوە، دەستی بە ئەر شتێك بکەوتایە تا حەفت دەستە سابوونی لە دەستی نەدایە دڵی ئاوی نەدەخواردەوە، تا بۆی بکرایە خۆی لە تەوقەکردن لا دەدا، بەڵام کە تووش دەبوو، سابوونێکی خەرجدەکرد، زۆر کات پەنجەوانەی لە دەست دەکرد، بەڵام لە پەنجەوانەکەیشی بە گومان بوو، ئەگەر کەوچکە چای لێوەرگرتبای جوان جوان دەیشووشت، ئەوجا دەیخستە پیاڵەکەی خۆیەوە، کلوو بەفر چەند بێگەردە! دە لە بەری هەڵدەهات دەیگوت پیسم دەکات، ئەو کوڕە گومانی لە سابوون و تایتیش هەبوو، بە گوێی خۆم گوێم لێبووە گوتوویەتی:

خۆزگە لە دنیا سابوونی خاوێن دەبوو.

نەبێتە قسەهەڵبەستن، کاتێك دەستەکانی خۆی بەر یەك دەکەوتن تا جوان نەیشووشتبان لە خۆی نزیك نەدەخستەوە، لە بارەی ئەو پێشپێشەوە چەند قسەیەك لە سەر زاران بوو، یەکیان وا بزانم لە داهێنانی کوڕێك بوو (کوردۆ)یان دەگوتێ:

تەماشای دەستی بکەن، رۆژ بە رۆژ دەچێتە ئاوێ، ئەوها بڕوا ساڵ وەرناسووڕێتەوە بێ دەست دەمێنێتەوە.

مام جوامێریکیش هەبوو گوتبووی:

مـن خەمی ئێستام نیە، ئەو دەمەی ژنی هێنا، چ دەقەومێ، ئەوا پەنجەکانی بە پەنجەوانە پاراست، ئەی جێگاکانیتری بە چی دەپارێزێت؟!

قسەی سێیەم لە زاری ئیداریەکەی بارەگا وا بزانم هەڵکەوتی ناو بوو، کەوتبووە سەر زاران:

ئەو کوڕە بە قەد حزبێك سابوون خەرجدەکات.

لە خۆڕا نیە ئەو پێشپێشەم هێنا ناو ناوانەوە و واسواسیەکەیم خستە روو، بۆ تەواو کردنی سەرهاتی ئەو کوڕەی لە ماڵی کتێبەوە هاتبوو پێویستمان

بەو پێشپێشـــە و بە کورێکیـــدیش کە نـــاوێکی وەك ( هـــۆ هـــۆ)ی هەیە، دەبێت..

ویستیان راسکۆ بەرێکەن، کەچـی پێـداگری لە مـانەوە دەکـرد، لەوەوە پتر بووە جێی گومانی بارەگا، لە پەناوە پێیم گوت:

+ بە قسەی من دەکەیت، بڕۆوە کن واحێد و..

- وا مەڵێ، ئێرە جێگەی مـنە، ئێـرە پـێش ئەوەی بارەگـای ئێـوە بێـت، بارەگای منە، من مارکسیم، ئەوانە لادەرن، دەبێت بێنەوە سەر خەت.

+ تۆ واز لەو قسانە بێنە، ئەو بارەگایە تۆیـان ناوێـت، کە ئەوان تۆیـان نەوێت، تۆش ئەوانت نەوێت.

- نا ناچمە هیچ جێگەیەك و لێرە دەمێنمەوە...ناچم..ناچم...

+ ئەگەر من لە جێی تۆ بم دەچمە ئێران.

ویستم بڵێم سەر لە دکتۆر بدە.

بە غەزەبەوە تەماشـــایەکی کـــردم، چـــاوی بە دەر و دیـــواردا گێـــڕا، پێدەچوو لە دووی تفەنگەکە بگەڕێ، رەنگە واش نەبووبێت، زۆر ترسام.

ئێ، چەند جارێك بانگیان کرد و ویستیان بە قسـەی خـۆش بەرێـیکەن، سـەرینەگرت، ترسـام لەوەی ئەو کـوڕە کەتێکـی گەورەی لە چـاو بێـت، زۆر لەگەڵی هەوڵمـدا بـڕوا، نەڕۆیشـت، ئـاخر بە شـێوەیەك چـاوی دەبـڕیە تفەنگەکان بە جارێ زراوەمی بردبو..

بە هەڵەدا نەچـووبم خەریکـی خوێنـدنەوەی (دونـی ئـارام) بـووم، ئەو رۆمانە کاتی خۆی لە بناری پێرس هەندێکیم لێی خوێندبۆوە، پێش ئەوەی بە چیاش بکەوم، هەر ئەو راسکۆیەی وا وەك کەتیرە بە بارەگاوە نووسـاوە و لێی نابێتەوە، بۆمی هێنا، بەڵام خۆشـاردنەوەیەکی بە دوودا هـات، تەواوم نەکرد.

گوێم لە هاوارێك بوو، هاوار چ هاوارا یەك بە دۆڵی ناوزەنگ دەنگـی دایەوە، هاوارێك گریانی گەڕەکێکی لێوە بەرز دەبۆوە، تۆ لە بیـرت بێـت، دەنگی ئاسایی راسکۆ پڕ لە گریان بوو، ئەدی دەبێت دەنـگە هـاواریەکەی

چۆن بێت، زوو ناسیمەوە، هاواری راسکۆم زوو ناسیەوە، یەکپێ هاتمە دەرێ.

ناوزەنگ لە دەمی رۆژئاوابووندا بوو، چ ببینم! ئەوە راسکۆیە لە خوارەوە، لە دەو چەمەکە بە بەینی گابەردە گەورەکان غاردەدا، نەمدیت کەسی بە دواوە بێت، چوومە سەر ئەو گابەردەی کەمێك لەولای دەرگای ژوورەکە دەتگوت بەرانی دەشتی بەڕانەتیە قیت وەستابوو، بەر لەوەی دیمەنیدی ببینین و هەندێ قسە ببیستینەوە با گوێ لە هەندێ درووشمەکانی راسکۆ بگرین:

بژی مارکس، بژی لینین... کرێکارانی دنیا و قیامەت یەکگرن... هەر شەکاوە بێت ئاڵای سووری کۆمۆنیزم... بژی زۆربا، زۆربا... پایەدار بێت راسکۆلنیکۆف... بژی حزبی شیوعی...

لەو بەر چەمەکە لە سەر بەردێك رووە و بارەگا راوەستا و درووشمەکانی خۆی دەگوتەوە، دیتم دابەزی و دەیویست بەرەو بارەگا بێتەوە، چوار شەقاوی گەڕانەوەیی نەهاویشتبوو، دوو پێشمەرگە غاریان داپێ، هەڵات، کەوتنە دووی، هەڵاتنەکەی بازنەیی بوو، بە دەوری بارەگا، دوو پێشمەرگەکە رادەوەستان ئەویش رادەوەستا، دەکەوتنە دووی، غاری دەدا، بارەگا پشتی چیا بوو پێشی چەم، ئیدی ئەو گەمەیە بەو هەوراز و لێژیەدا بە ناو ئەو هەموو گابەردەیە درێژەی کێشا، بزر دەبوون بە دیار دەکەوتنەوە، کەمێك درەنگ بیستمەوە ئەو دوو پێشمەرگەیە پێشپێش و یۆیۆن، بەڵام دواتر کەسێکیدی گوتی:

نا، یۆ یۆ نەبوو، هۆ هۆ بوو.

ئێ، هەر کێ بێت، نەمناسینەوە، ئاخر من چاوی ناسینەوەم تەنها لە سەر راسکۆ بوو، هەموو بیرکردنەوەشم هەر لە کنە وی، ئیدی تا نزیك دڵنیایی دڵنیابووم لەوەی یەك لەو دووە لێیانداوە یان هەردووکیان پێکەوە.

کاتێ هاوارەکەی راسکۆم دەهاتەوە گوێ ئەو هاوارەی گەیشتە سەری مامەندە، دەگەیشتمە ئەوەی هەردووکیان پێکەوە لێیان داوە، بەڵام نزیکیم

له دڵنیـــایی له گومــانێکیش دووری نەدەخســـتمەوە، دەمگـــوت ڕەنــگە هاوارەکەی لێکەوتەوەی لێدان نەبێـت و تەقینەوەی ئەو تـووڕەییە بووبێـت کە دەمێك بوو کەڵەکەی دەکرد، دەمگوت باشە ئەگەر دەستی پێشپێش بە جێگەیەکی ڕاسکۆ کەوتبێت، خۆ بە ڕووبارێك ئاو و کـارگەیەك سـابوون خاوێن نابێتەوە، یان ئەگەر یۆیۆ لێیدابێت دەبێت چ پەشـیمانیەك دایگرێـت، پەشیمانیەك تا سنووری هەڵقرچان و توانەوە، هەر خۆم بە خـۆمم دەگـوت نا ڕەنگە لەوەیان پەشیمان نەبێتەوە، ئەوەیان جیایە لەوەی گۆرین.

باشم لە بیرە تووڕەیی یۆیۆم هاتەوە ناو چاو، ئەو کوڕە لە کاتی شـەڕ و تووڕەبوونـدا دەتگـوت ئـامۆزای فیـرعەونە، مـن جارێـك لە قەنـدیلێ جێگەیەك هەبـوو وابـزانم (گوێژێ)یـان دەگـوتێ، لەو گـوێژەش بە هەڵەدا مەچۆ نەك هەر گوێژ دەنکە بەڕوویەکیشت لێی نەدەدیـتەوە، ئـێ لەوێ ئەو یۆیۆیە هەڵەم نەکردبێت پێشپێشیش لەوێ بـوو، دەمەو عەسـرانێکی هـاوین، یـــان دەمەو پـــایزی لەگەڵ پێشـــمەرگەیەکی عەرەب بـــووە قرەقرپـــان، هەرچۆنێك بوو لێکیان کردنەوە و شەڕ نەکەوتەوە، بەڵام دیارە یۆیـۆ بـۆی لە ناو نانێکی گەرم هەڵگرتبوو، شەو نیوەی شەو، بووە هاتوهاوارێـك، مـن هەر زراوم چوو، هەتا درەنگیش هەر وا تێگەیشتم کە بە سـەرماندا دراوە، ئێ، ئەو یۆیۆیە لە کاتی ئێشـکگریی خـۆی و لە شـیرنەی خەوێـی ئەو، بە سەری داداوە، دەیانگوت بە ئاگاداری پێشپێشیش، چووەتە سـەر سینگی و وەریگەڕاوەتێ، ئەگەر ئەو پیاوە خەوتووە دەنگی گەورە نەبـایەو بارەگـای وەئاگـا نەهێنـایە، ئەوا بـێ هـیچ گومانێـك یۆیـۆ دەبـووە عیزرائیلـی ئەو پێشمەرگە عەرەبە و بێ ئیزنی خوداوەند گیانی دەکێشا، دوایی نازانم چۆن ئاشـتبوونەوە، بەڵام ئەوەم لە یـاد مـاوە کە ئەو یۆیـۆیەی لە تووڕەبوونـدا فیرعەون بوو، پەشیمانیەك دایگرت گوێت لە هەڵقرچانی دەبوو، توانەوەیت دەدیـت.. .مـن کە ئەو وێـنەیەی یۆیـۆ و پێشپێشـم دەهـاتەوە پـێش چـاو، دەمگوت دەبێت چیان لەو ڕاسکۆیە کردبێت و چی لێبکەن!

ناوزەنـگ خەریـکە بچێـتە تـاریکیەوە، غارغـارێتەکەش درێـژەی هەیە، گوێم لێیە دەڵێن:

کاکە برۆ وازمان لێبێنە، ئێ چیت لێمان دەوێ؟!
دەنگی راسکۆ بەرزتر و گریاناویتر دێتە گوێ:
دێمەوە، دێمەوە بە ئالای سوورەوە دێمەوە، ئەوەتا ئالای سووری کۆمۆنیزم لە سەر گردەکەی (گردیش) لە سەر مزگەوتەکەی(بەلاشاوە) دەچەقێنم و هەتا دنیا دنیایە دەبێت بشەکێتەوە.
بیرمە ئەو وشە گریاناویانەی راسکۆ گریاندمیان، پرزەیان لێمبڕی، کەمێك پێشتر دەمویست بچمە لای و دەستی بگرم و بیبەمەوە بۆ بارەگاکەی واحێد، ئیدی نەمتوانی، گردیش و بەلاشاوەکەی راسکۆ هێزی بە پێوە راوەستانیان لێ وەرگرتمەوە، تا ئەو کات لە سەر بەردەکە راوەستابووم و وەك میلی دەمژمێر دەخولامەوە، لەگەڵ راسکۆ دەخولامەوە، ئەو تەوافی بارەگای دەکرد و منیش تەماشاکەر...
ئەوانەی ئەوێ کەسیان لە واتای گردیش نەدەگەیشتن، بە چی بزانن، گردیش گوندێکە کەوتۆتە ناو ئەو زوورگانەی ئەگەر لە سەر قەلاتی هەولێرەوە رووەو رۆژهەلات بڕوانی جوان دیارن، گردیش گوندی باوکی راسکۆیە، گردیش ئەو گوندەیە کە لە بن عەردەکەی لە کونێك لە کونەکانی ئەو عەردە لە لایەن ئەو کوڕەی وا راوی دەنێن، سەرمایەی مارکس خوێندراوەتەوە، بەلاشاوەش گەڕەکە لاچەپەکەی هەولێر ئەو گەڕەکەی رێك دەکەوتە سەر ئەو رێگایەی بۆ گردیش دەچوو، بەلاشاوە گەڕەکەکەی راسکۆ، ئەو راسکۆیەی لە حەوشەی ماڵێ و لە بن بەرمیلی ئاوێ کونێکی لێدابوو، زوو زوو بە خۆو کتێب و لایتەوە دەچووە ناوی و لە دنیا بزر دەبوو.
تەقەیەك بە ئاگای هێنامەوە، ئا، من لەوێ نەمابووم، بە رێی گردیشەوە گەیشتبوومەوە بەلاشاوە و لە دووی کونە فیرارەکەی راسکۆ دەگەڕام، تەقەکە منی هەڵدایە سەر بەردێکی بەرزتر، بەردێك لە هاوینان و وەختی عەسران بەشێك لە باخەکەی رێبوار عەرەبی لە سێبەر دەگرت، ئەو دەمەی تەقەکە منی بە ئاگاهێنایەوە و هەڵیدامە سەر بەردی سەر باخەکە، ناوزەنگ

خەریکبوو بچێتە تاریکیەوە، بەڵام هێشتا گابەرد و بەران لێکجیا دەکرانەوە، هێشتا بینایی راسکۆی تێکەڵی پێشپێش و یۆ یۆ نەدەکرد.. گوێم لێبوو، گوتیان:

چ نیە هەر بۆ ترساندنیەتی.

لە دوای تەقەکە راسکۆم دیت لەو پێچە دەسووڕایەوە کە ناوزەنگی دەگەیاندەوە زەڵێ، راسکۆ بزر بوو، ئەو کوڕەی لە ماڵی کتێبەوە هاتبوو، لە تاریکی بزر بوو، بەڵام دەنگی هەر دەهات، دیار بوو درووشمەکانی خۆی دەگوتەوە، دواتریش هەموو سەر لە ئێوارانێك گوێم لە هاواری راسکۆ دەبوو، لە گوێی من دۆڵی ناوزەنگ بووە دۆڵی هاوار، جارێك برادەرێك گوتی:

گوێی خۆت لەو هاوارە بەتاڵنەکەیتەوە، دڵنیابە سەر لە ئێوارەیەك شێت دەبیت و بە دەردەکەی نەجات دەچیت.

پێدەچوو ماوەیەکی باش لە سەر بەردی گەورە بە هەڵتووتکاوی مابمەوە، لە بیرمە دەستێك ئێستا لە بیرم نیە کێ بوو، منی بردەوە ژووری، ئەوەشم لە بیرە ئەو شەوە خەوم لێنەکەوت، هەر ئەو شەوە نا شەوی دواتریش، دواتر پێکەوتم کە راسکۆ پەڕیوەتە ئێران، راستی من سەرەتا وای بۆ چووم کە خۆی رادەستی حکومەت کردبێتەوە، راسکۆ هەڵات و بێخەوی بە بڕژانگمەوە هەڵواسی، راسکۆ هەڵات و هاوارێکی ترسناکی رژاندە گوێی منەوە، راسکۆ هەڵات و لە گێڕانەوەی سەرهاتەکانی راسکۆلنیکۆف و ئەوانیدی کردم، راسکۆ هەڵات و بۆنی گولاویی بەلاشاوەشی لەگەڵ خۆی برد، ئەو کوڕەی لە ماڵی کتێبەوە هاتبوو، ئەو کوڕەی رەنگە هەر کتێب ئەوەی بەسەرهێنابێت کە بەسەری هات، راویان نا، هەڵات، هەڵات...

باش بوو کۆڵەپشتەکەی دکتۆر هۆشەنگ فریام کەوت، ئەو کۆڵەپشتەی لەوەتەی هەیە حەبی خەوی لێنەبڕاوە، ئەو دکتۆرە هەر بە حەب نا بە نیو بوتڵ عەرەقیش بە هانامەوە هات.

لە بیرمە رقم لە دونی ئارام هەستا، هاتەوە بیرم ئەوە سێیەم جارە هەر جارەی لە جێگەیەك دەست بە خوێندنەوەی بکەم، هەر جارەی شتێك بووە هۆی ئەوەی دەستبەرداری بم، ئەوەشم لەبیرە گوتم:

ئیدی دونی ئارام ناخوێنمەوە.

دوای ئەوەی دنیای سیاسەت لە هیکرا سەرمەقولاتیکی خواردو هاتینەوە شار، برایەکی راسکۆ هاتە لام و دەیویست ئەو کەسانە بناسێت کە ئەزیەتی براکەیان داوە، چاوی سوور و رەنگی رەشهەڵگەرابوو لە تۆڵە، منیش سەرهاتی راسکۆم لە نووکەوە وەك خۆی بۆی گێرایەوە، بێجگە لە پەراندنی پێشپێش و هۆ هۆ دێرێك چیە نەمپەراند، پێش ئەوەی ماڵئاوایی بکات دیتم رەشی و سووریەکەی تۆڵەی کاڵبوونەوە، دواتر بیستم راسکۆ کتێبخانەیەکی کردۆتەوە، لە دڵی خۆم گوتم رەنگە ناوی لێنابێت کتێبخانەی زۆربا یان راسکۆلنیکۆف، کاتێ کتێبخانەکەیم دیتەوە، لە دوورەوە پیتە گەشەکانی (مەم و زین) لە چاو دەدرەوشانەوە، تەماشای چاویم کرد هێشتا...

## دوو شەو لە مێوانداریی ئیمام

دوایوەی ئەنفال هەڵیداین و خۆمان بە بنەگوێتیەکانی قەندیل گرتەوە و سەنگراینەوە، لەوێ لە سەهۆڵبەندانی ئەوێ، لە بن تاشەبەردەکان وەك بەراز غەزریین و تا بەهاری رابوونی گەورە ماینەوە، لەو ماوەیە من سێ جار ئاودیوی دیوی رۆژهەلات بووم، هەر جارەی سێ شەو لە شارەکانی رۆژهەڵاتی ژێر عەبای ئاخوندان مامەوە، لەو نۆ شەوە دوو شەو مەبەستە و بەو گێڕانەوەیە پەیوەستە.

درەنگە، جادە کەسی پێوە نەما، ماڵنووستنانە، شار کشومات، دەڵێی لە بن بەفر خەوتووە، چی بکەم! کێ پەنام دەدات؟ چەندی سەر دێنم و دەبەم رێی سێیەم شکنابەم، تەنێ دوو رێم لە پێشە، یەکیان رووەو سەرێ، تا دەگەیتێ کۆڵانی تەنگ دەتداتە کۆڵانی تەنگتر و پێ بە پێش بلندتر، رێگای دووەمیش بەو خوارەدا، بەو جادەیە وەك بیستم هێندە شۆڕنابیتەوە.

ئێستا لە پێش دەرگای مزگەفتێکم، ئیدی چار نیە، درەنگە با پێ هەڵێنم، یان سەرێ یان خوارێ، کامیان؟

+ دەڵێی تۆش وەك ئێمە جێی شەوت نیە؟

- ئێوەش! وا دیارە ئەو شارە پەنامان نادات.

لەو سەروبەندەی دەمویست رێیەك هەڵبژێرم، تووشی ئەو دوو رێبوارە بێ جێوڕێیە بووم، لە خۆم بێ جێوڕێتر، ئەوەتا سێ پیاوی لە ماڵ و وڵات

راونراو، له درەنگانی شەوێکی بەهاری، له بەر دەرگای مزگەفتێکی شاری سەردەشت، دەڵێی دەرۆزەکەرین له بەردەم قاپیی ماڵی خودا و دیاره خودا دەرگامان لێناکاتەوە.

له سەر ئەوە بووین ڕێی خواریّ بگرینه بەر، بووە تەقوتۆق و زرموهۆڕ، له ئاسمانی سەردەشت گولله به گولله دەکەوت، گیزەی گولله مەرگی پێیه، ترس دێنیّ، وا دیاره به سەر سەردەشتیان دادا، توندتر له دەرگای ماڵی خودامان دا، نەیکردەوە، دیواری حەوشەی ماڵی خوداش هێند نەوی نیه، بتوانی به سەریدا ئاودیو بیت، گولله به جاده و کۆلانانـدا دیّ، تەق، تەپ.. دەڵێی شەڕی گەورە کەوتۆتە ئەو کۆلانەوە، گولله بوار نادا جێگۆڕکیّ بکەین، به پێوە پشتمان به دواری ماڵی خودا داوە، لەگەڵ دیوار خۆمان کردۆتە یەك، پیاوێکیان که کەتەی قەڵەوە به هەردووکمان هێندەی وی نابین، پێدەچیّ پتر بترسیّ، گوێم لێیه له خودا دەپاڕێتەوە:

خودایه بمانپارێزە، خودایه هانامان بۆ ماڵت هێناوە، دەرگا بکەوە، چەپارەمان بدە.

من زۆریش دەترسام لەگەڵ ئەوەش گوتم:

مەترسیّ، جێمان خراپ نیه، گولله نایگرێتەوە.

پتر ترسا:

خودایه، ئەو دیوارەمان بۆ بڕووخێنه.

پیاوەکەیدی که کورتیلەی ڕەقەڵەیه به پێکەنینەوە:

خودا به دەستی خۆی ماڵی خۆی ناڕووخێنیّ، توند قوونی لێدە دەڕووخیّ!

چەند سەختە مردن له بن دیواری ماڵی خودا له ختوخۆڕا، چ پووچگەراییه مردن به گوللەیەك نازانی له کێوە و بۆ کیّ دیّ، له کوێوە و بۆ کویّ دەچیّ، تۆ بەریّ خۆ دیّ، من به ناو ئەو هەموو شەڕو شۆڕەدا هاتم، نەمردم، سەنگەرم له سێبەری کۆپتەر بوو، نەمردم، چەند شەقاویّ دوور له زنجیری دەبابە دەست له سەر پەلاپیتکە و هەناسەم له خۆم

بڕیبوو، نەمردم، بە کەلێنی تۆپەکاندا گورگەلۆقەم دەکرد، نەمردم، بە سەر میندا بازم دەدا و خۆم لە ساچمە لادەدا، نەمردم، لە شەڕەکان لە بۆسەکان گوللە وەك تەزرە دایدەکرد، نەمردم، کەچی هەوکە لە درەنگانی شەو، لە بن دیواری مزگەفتی سەردەشت گوللەیەك کە پەیوەندی بە منەوە نیە، جێم دەکاتە ئەو جێ و ساردم دەکاتەوە، ئای چ کەرایەتیەکم کرد کە زوو ڕێی سەرێم نەگرت.

تەقە کەمێك کەمبۆتەوە، گیزەی گوللە نایە، نەما، تەقە نەما، پیاوە قەڵەوەکە دەڵێ:

سوپاس خودایە، سوپاس سەگتۆپت نەکردین.

هەر بە دیوارەوە نووساوین، پیاوە ڕەقەڵەکە گوتی:

دەی تا تەقە دەستپێنەکردۆتەوە با بڕۆین.

کەتەی قەڵەو:

بە تەمایە دەستپێبکاتەوە؟

من هەر لە خۆوە گوتم:

نا، بڕواناکەم.

کەتەی قەڵەو پرسی:

بچینە کوێ؟

دوا دەنگی پرسیارەکە تێکەڵی دەنگی سێ چوار چەکدار بوو، بە فارسی لێیان خوڕین و دەستیان پێبەرزکردینەوە و ڕاپێچیان داین، ڕووە جادەکەی خوارێ، بۆ کوێ؟ چەندی گوتمان:

چرا چرا؟ کوجا کوجا؟

کەڵکی نەبوو لوولەی تفەنگیان لە سەر پشتی ملمان دانابوو، بەخورتی بە غار غاریان پێدەداین، قیرسی لەوە، هەر هەڵە نەکەن و بیتەقێنن! گەیشتینە سەرە کۆلانێك، سووڕاینەوە و لە پێش خانوویەکی کەمێك گەورە وەستاین، بە پۆلیسخانە دەچوو، پازدە بیست چەکدارێك دەست لە سەر چەك تێکدەسووڕان، لە ناویان دووان یان سێیان بە جلکە کوردیەکەیان

زانیم جاشن، ئێمەیان لەو گۆڕە ڕاگرت، جاشێکیان کە خرکەڵەیەك بوو هاتە بن گوێم و گوتی:

ئێوە خەڵکی کوێن؟

گوتم:

ئێمە هی ئەو دیوین.

جاش گوتی:

ئەدی بۆچی گیراون؟

گوتم:

لە خۆڕا، لە جادە بووین، جێمان نەبوو.

جاش گوتی:

کەس ئاگای لێتان نیە، دەتوانن خۆ بدزنەوە و خۆ بزربکەن.

من گوتم:

بەڵام ئێمە هیچمان نەکردووە.

جاش گوتی:

بە قسەی من دەکەن، بڕۆن و خۆ بدەنە پەنایەك.

من گوتم:

بەڵام لەو نزیکانە چ پەنایەکمان نیە و دەمانگرنەوە، دە تۆ پەنایەك...

قسەکەم تەواو نەکردبوو، چوار پێنجێك هاتن و رایانپێچاین، خۆمان لە ژوورێکی گچکە کە هەر گەزێك بە گەزێك دەبوو دیتەوە و لەو دیویشەوە دەرگاگەیان کلیل دا، پیاوە رەقەڵەکە گوتی:

کوڕە خۆ لە ئاودەستیان کردین.

کەتەی قەڵەو گوتی:

ترحێو لەو کۆماری ئیسلامیە!

منیش گوتم:

لە دەستمچوو بە قسەی جاشەکەم نەکرد.

جاری یەکەممە لە ئاودەست بکرێم، زۆرم لە بارەی ئاودەستەوە

بیستبوو، زۆر کەس شەویان لە ئاودەست کردۆتەوە، زۆر برادەر و ناسیار دەیانگێڕایەوە:

گرتمیان، لە ئاودەستیان کردم، شەو و ڕۆژێك لە ئاودەستیان هێشتمەوە، بۆنی گووی دنیام گرت، ئێستاش لێمنەبۆتەوە

ئەوشەو بە پێوە لە ئاودەستمان نەهێلنەوە، ئەو جێیە جێی پێنج کەسی لێنابێتەوە، ئاخر پیاوە کەتە قەڵەوەکە بە قەد سێ کەس دەبێ، پیاوە کورتیلە ڕەقەڵەکە بە قەڵەوەکە دەڵێ:

کەمێك ورگت لادە، پانبوومەوە.

کەتەی قەڵەو بە هێواشی دەڵێ:

ئێ بیخەمە کوێی کۆماری ئیسلامیەوە؟!

من دەڵێم:

کوا چ ورگی هەیە! هەر بایی یەك حەفتەی زیندانە.

ڕەقەڵەکە:

بۆ پێتوایە حەفتەیەك دەمانهێلنەوە؟

قەڵەوەکە:

ئێمە کەوتووینەتە کۆماری ئاودەستەوە، ئەگەر بە حەفتە لێی دەربچین مەمنوونین.

ڕەقەڵەکە:

کۆماری ئاودەست چیە؟

قەڵەوەکە:

لە کنە من کۆماری ئیسلامی گۆڕا بۆ کۆماری ئاودەست، ئێران کەی کۆماری ئیسلامیە!

من:

هێدی قسەبکە، گوێیان لێبێ شلوکوتت دەکەن.

قەڵەوەکە:

ئاخر ئێمە چیمان کردووە، وا لە ئاودەستیان کردووین! ئێوە بۆن

ناکەن؟ چ بۆنێکی لێدێ!
من:
بۆنی کۆماری ئیسلامی لێدێ؟
قەڵەوەکە:
دەق وایە.
ڕەقەڵەکە:
کوڕینە من دەترسم، زۆر دەترسم بەرگەی لێدان ناگرم.
من:
بەڵام کێ دەڵێ لێماندەدەن، ڕەنگە لێکۆڵینەوەمان لەگەڵ بکەن و بەرەلامان بکەن، ئێمە نە ئێرانین و نە هیچمان لە سەرە.
ڕەقەڵەکە:
پێناچێ وا بە ئاسانی لێدەرچین.
قەڵەوەکە:
ئێ، با قامچیەك و دوو زللە و پێلەقەت لێبدەن.
ڕەقەڵەکە:
بە خوا یەك قامچیم لێدەن دان بە هەموو شتێکدا دەنێم.
لەو دەمە دەرگایان کردەوە، ڕایانکێشاینە دەرەوە و هەر لەوێ دەستیان لە پشتەوە بەستین، پێشەوەی سواری ماشێنمان بکەن، چاویشیان بەستین، پیاوە قەڵەوەکە بەتووڕەیی:
لۆ وامان لێدەکەن، چیمان کردووە؟
وا بزانم قۆنداخە تفەنگێکیان خێواندێ، تەق و تۆق نەمایە، دەنگ هەر دەنگی چەند ماشێنێکە کە زۆر بە توندی ئیستاپ دەگرن و بۆنی تایە بە شاردا بڵاودەکەنەوە، ئێستا لە ناو ماشێنێکین، هێند خێرا دەڕوا بە سەر یەکدا دەکەوین، دەبێ بۆ کوێمان ببەن؟ لە ترێ سەی نەچین! ڕەنگە بیست سی پێچی کردبێتەوە، لە هەر پێچێك سەراوبن دەبین، ئێستا بە هەورازەیەك هەڵدەگەڕێ، هەبێ نەبێ بەرەو شوێنە ترسناکەکەمان دەبەن،

پێشتر جارێك كاوەی كەلكەسماق گوتی:

ئەها ئەو سەرە وا بزانم شوێنی لێكۆڵینەوە و ئەشكەنجەدانە.

دەق وایە بــۆ ئەوێمــان دەبەن، دایانبەزانــدین، چەنــد پێــبلقەیەك سەركەوتین، تەواوێك ڕۆیشتین، دەمانپشكنن، كاتژمێرەكەیان لە دەستم كردەوە، سووم لێنەبۆوە، پاكەت و چەرخەكەمیان برد، ماڵم كاول بوو، دەستی خستە ئەو گیرفانەی نزیكەی چوار سەد تومەنێك و پەڕە كاخەزی پەڕینەوەی تێدا بوو، وا بزانم نەیانبرد، چ لە چاوبەستن ناخۆشترە! من جاری یەكەممە تووشی چاوبەستنی بە ڕاستی ببم، بەڵام جاری دووەممە چاوبەستن بمترسێنێ، لە بیرمە منداڵ بووم، زۆر منداڵ، هێند منداڵ لە چاوبەستنی بە قەستیش هەترەشم دەچوو، خوشكێكم دوو سێساڵێ لە من گەورەتر، هەر من و ئەو لە ماڵ بووین، گوتی:

وەرە گەمەی دەست و چاوبەستن بكەین.

بە خۆشیەوە گوتم:

دەی! خۆشە.

دوای ئەو هەمــوو ســاڵە هەر دەڵێــی ئێســتایە، چــوو دۆخینــی لە شەرواڵەكەی بابم دەرهێناو هات لە پشتەوە توند دەستمی بەست، دیتم، چوو چەفیەكەی دایكمی هێنا، هات چاومی بەستەوە، بە دەنگێك چ لە دەنگی خوشك نەدەچوو، زۆر ترسناك هاتە گوێم:

ئەوجا چ دەكەی؟ من دەڕۆم.

بە تۆقین تۆقیم، زیڕاندم، دنیام بە سەردا كاول بوو، نەمتوانی لە جێی خۆم بجوولێم، پێموابوو پێشم بەسترایە، بۆ چەند ساتێك هەستم بە بزربوونی تەواو كرد، بزربوون لە دنیا، وا تێگەیشتم كۆتایی دنیایە و ئیدی بە دنیا ناكەومەوە.

هەوكە بە دەست و چاوی بەستراوەوە پێبلكە پێبلكە شۆڕدەبینەوە، بۆ چەند ساتێك هەمان هەستی بە دنیا نەكەوتنەوە لام زیندوو بۆوە، نازانم چەنــد شــۆڕبووینەوە، زلــە و پــێلەقەش نــاژمێردرێ، مــن كەوتــم و

قیتیانکردمەوە، رایانوەستاندین، دەڵێی دەستم دەکەنەوە! کردیانەوە، لە دەرگایەکیان ئاودیو کردم، گوێم لە دەنگی کلیلدان بوو، چاوم کردەوە، لە بیرم چووبوو بڵێم چاومیان بە پشتێنەکەی خۆم بەستبوو، ژوورەکە بێ گلۆپە، بەڵام رووناکایی راڕەوەکە ترووسکاییەك دەداتە ژوورەکە، باشە دوو برادەرەکەشم لەگەڵە، لەگەڵ چوار کەسیدی، ژوورەکە هەر جێی سێ جێی لێدەبێتەوە، پیاوێکی پیر خانەخوێیانە بەخێرهاتنی کردین، قەڵەوەکە گوتی:

تۆ دەمێکە لێرەی؟

خانەخوێ گوتی:

نا، حەفتەیەکە.

ئێمە شەش کەس تازە مێوانین، سێ باشووری و سێ رۆژهەڵاتی، خانەخوێ خۆی نەناساند، چەندی پرسیان نە ناو نە جێ خۆی نەگوت، بۆ ناوەکەی دەیگوت:

ناوم ناوێکی خودایە.

بەڵام چوزانین لەو هەزار ناوە کامیانە، بۆ شارو گوندەکەشی دەیگوت:

خۆتان هەڵیدەن و بزانن.

ئەوەش زەحمەتە، هەر جارەی بە شێوەزارێك قسەی دەکرد، یان رستەکانی تێکەڵەیەك بوون لە شێوەزارەکان، بەڵام لە جۆری دەنگ و گۆکردنی پێدەچوو لە خزمەکانی سمکۆی شکاك بێت، خۆ لە سیماش هەر لەوی دەکرد، لەوێ ناوی کەتەی قەڵەو و کورتیلەی رەقەڵەم زانی، بەڵام حەیف زوو ناویان لە یادەوەریم سڕایەوە، چەندی دەگەڕێم پێتێکیش لە ناوەکانیان، ناوی سێ رۆژهەڵاتیەکەش لە یادەوەریم نابینمەوە، منیش هەر بەو ناوە خۆم ناساند کە لە (پەڕی پەڕینەوە) نووسرابوو.

ئای، لە گیرفانم نەماوە، بردوویانە، ئەوەی دەستی لێنەدراوە، پارەکەیە، تەزبێحە قەزوانیەکەشم نەماوە، من چی بکەم بێ جگەرە و بێ تەزبێح، تەزبێحەکەم دیاریی مام بایز بوو، پێشمەرگەیەکی کەمێك بە تەمەن بوو،

هاوینی ئەولاتر لە بەرانبەر کلکەی قەندیلێ ماڵە رەبەنیەکەی لە بن دارقەزوانێ بوو، هەر قەزوانی لێدەکردەوە و بە دەم پێچانەوەی جگەرە تەزبێحی دروستدەکرد، ئای بۆ جگەرەیەکی مام بایزی، چ مەینەتیەکە زیندان بێ جگەرە، دوو مێوانیدیش هاتن، ئەوانیش خەڵکی رۆژهەڵاتن.

ئێستا رەنگە بەرەبەیان بێ، خەوێکی قورس دایگرتووم، ئای ئێستا چەند خۆشە لێی راکشێی، بەڵام جێی دانیشتن نیە، هی راکشان لە کوێ بوو! خەوەنووتکەم دەبردەوە، دەبۆرژام لاربوونەوەی سەرم بە ئاگای دەهێنامەوە، زیندان مەیلە و کپە، وا دیارە مێوان نەما، دەنگی پێی پاسەوانانیش هەستی بۆ رانەگریت ناگاتە گوێ، لە پڕ هاوارێك دەرگا و دیواری ژوور ژوور ژوورەکانی زیندانی بڕی، هاوارێك هاواری نەپساوەی بە دوادا هات، خانەخوێ گوتی:

چ نیە، خۆتان لەگەڵی رابێنن.

پیاوە کورتیلە رەقەڵەکە کە لە تەنیشت من لە سەر چۆك دانیشتبوو، بە لە سەرەخۆ گوتی:

زۆر دەترسم من بەرگەی لێدان ناگرم.

گوتم:

مەرج نیە لێتبدەن.

پیاوە کەتە قەڵەوەکە کە لە پێش هەردووکمانەوە دانیشتبوو:

چ نیە، لە منت نەکەوێ، مەترسێ.

کورتیلەی رەقەڵە:

دەترسێم، پێشەوەی لێمدەن هەموو شتێ وەگۆڕێکەم.

کەتەی قەڵەو:

باشە، چ بە گۆڕێ وەردەکەی، چیت لە سەرە؟

کورتیلەی رەقەڵە:

هیچ، بەڵام هەموو شت دەڵێم.

کەتەی قەڵەو:

تێناگەم، هێندەی من بتناسم هیچت لەگەڵ ئێران نیە، بە من نالێی تۆ چی دەڵێی؟!

کورتیلەی رەقەڵە:

وایە، نازانم، بەڵام لێمدەن دەمرم، بۆیە بەر لەوەی بەکوتەک لێم دەربێنن، بە خۆشی، هەرزوو پێیلێدەنێم و ناوی سەد کەس دەڵێم.

گوتم:

ناوی کێ و بۆچی دەڵێی؟

کورتیلەی رەقەڵە:

نازانم، نا، دەیلێم، هەرچیان لێم بوێ دەیلێم.

کەتەی قەڵەو:

ئەگەر هیچیان لێت نەوێ؟

کورتیلەی رەقەڵە:

هەر دەیلێم، لێمدەن دەیلێم.

گوتم:

باشە ئەگەر ناوی منت گوت، دەڵێی چی کردووە؟

کورتیلەی رەقەڵە:

نازانم، بەڵام دەیلێم، ئەرێ ناوت چی بوو؟

کەتەی قەڵەو:

بە راستی تۆ شێت بوویت و قسەت لەگەڵ ناکرێت.

کەمێك لەو پیاوە کەوتمە گومانەوە، تۆ بلێی دەستی لە شتێك نەبێ، باشە بۆچی هێندە جەخت لە دانپێدانان دەکاتەوە، نا بڕوا ناکەم هیچی لە هیچدا هەبێ، هەبێ نەبێ ترساوە و چیدی لە گۆڕێ نیە، بلێم چی! تێناگەم.

ئەشکەنجە بنی نایە، هاوار و پاڕانەوە بێ کۆتایە، ئیدی زیندانە و زیندانیش دیارە ئاوایە، جاری یەکەمە بکەومە زیندانەوە، کاتی خۆی لە هەولێر دوو دەمژمێرێ لە بنکەیەکی پۆلیس دەستبەسەر مامەوە، هێندە و

تەواو، چیم لە خۆم کرد، لە هیچوخۆڕا تووش بووم، بە دەستی خۆم خۆم تووش کرد، تۆ بڵێی منیش ئەشکەنجە بدەن! چیم کردووە! هیچم لە سەر نیە، ئەوجا چیە، زینـدان ئەوە دەزانـیێ! زۆر کەس لە ختوخـۆڕا گیـراون و شـتی گەورەیـان دراوەتە پـاڵ و لە سـێدارەش دراون، یـان چەنـد سـاڵ لە کـونجی زینـدان مـاونەتەوە، ئەشـکەنجە! مـن لە پیـاوە رەقەڵەکە پتـر لە ئەشـکەنجە دەترسـم، بەڵام ئەوەیە باسـی نـاکەم و بە سـەرخۆمی نـاهێنم، ئەگەر لێمدەن، دەبێ منـیش وەك ئەوکەسـە بپـاڕێمەوە کە ئەوەتـا زینـدانی مشتکرد لە پاڕانەوە؟ نا، شەرمە من ناپاڕێمەوە، نابێ بپاڕێمەوە، جگە لەوەی پاڕانەوە بەلاشە، شەرمیشە، بۆ پێشمەرگە شەرمە پاڕانەوە، پیـاوە قەڵەوەکە بە رستەیەك دەستمی گرت و لە ئەندێشەی ئەشکەنجەیی دەرهێنام:

چیە سەرمات بووە، یان هی بێ جگەرەییە هێندە دەکۆخی؟

ئاگام لە کۆخەی خۆم نەبوو:

من! کوا زۆر دەکۆخم؟

گوتی:

هێشتا! وا بزانم سینگت لە قیر خاوێتبۆوە.

خانەخوێکە بە دەنگێکی نێرانە:

ئەوشەویشمان لە ماڵی ئیمام کـردەوە، خۆتـان بیڵـێن چـۆن مێوانـداریەك بووا!

کەتەی قەڵەو:

ئەو مێوانداریە ببڕاییبڕ لە بیرناچێتەوە.

ئەشـکەنجەدان راوەسـتاوە، ناڵەنـاڵ کەمبـۆتەوە، سـەر و سـەبکەیان بـۆ هەڵداینە ژووریێ، سەموونەکە هەر لە سـەبکەی سـەگ دەچـوو، بریـا وەك ئەو سەبکەیەش گەرم ونەرم با کە دەدرێـتە سـەگ، دێـتە بیـرم نەنکـم لە کەپەك و ئەو شتانە سەبکەی دەخستە سـەر سـێرەوە و خـاوەبرژی دەکـرد، من جارێك پێش سەگەکە گەزەیەکـم لێـدا، نەرم و گەرم و بە تـام بـوو، بەڵام سـەبکەی زینـدانی سەردەشـت، پرمـان دایـێ، رەق رەق لە دڵـی

پاسەوانی زینـدان رەقتـر، لە قسـەی پاسـەوانی زینـدان ساردوسـڕتر، لەگەڵ ئەوەش خواردمان، خانەخوێ گوتی:

بیخۆن، ئیمام هەر ئەوەی هەیە، گلەیی مەکەن.

کەتەی قەڵەو:

وایە، مێوانی ناوەخت، گلەیی لە سەر خۆیتی.

نـازانم بـۆچی کە خـانەخوێ قسـەیەکی دەکـرد جـگە لە کەتەی قەڵەو کەس بـاگۆی نەدەدایەوە، کەس ورتەیەکـی لێـوە نەدەهـات، کـورتیلەی رەقەڵە هەر هەڵـدەلەرزی، ئەوانیـدیش قرِوقەپیـان لێکردبـوو، منـیش هەروا، ئای بۆ جگەرەیەك لە دوای سەبکەی سەگ دایگیرسێنی! خۆ ئەگەر پێشتر چایەکیشـی بە سـەردا بکەیـت ئەوە هەر مەپرسـە! حەیـف، رۆیشـت ئەو سـاتانەی هەر ویسـتت دەسـت بـۆ جـگەرەی ببەیـت و دووکەڵ بە دنیـادا بکەیت...

دەرگایان کردەوە، تێگەیشتم بۆ دەسـت بە ئاوگەیانـدنە، خـانەخوێ بە ئەسپایی هەر ئەوەتە گوێم لێبوو:

چوون لێ لێیە، گەڕانەوە لۆ لۆ.

کەتەی قەڵەو گوێی لێنەبوو، دەنا قسـەیەکی هەر دەکـرد، ئەوە خۆشـە! تا دەگەیتە ئاودەسـتەکە دوو سـێ قۆنـداخە تفەنـگ و سـێ چـوار شـەقت پێدەکەوێ، پێمکەوت، کـات لە لای پاسـەوانانی زینـدان زۆر بە نـرخە! بە تایبەتی لە ئاودەست،، نابێت لە دوو سێ خولەك پتر بمێنیەوە، باش بوو من لە وادەی خۆی تەواو بووم، گوێم لە پیاوی کەتەی قەڵەو بوو، دەیگوت:

ئەنگۆ ئیسلام نین! ناهێلن گووەکەش بکەین! بە مـن نـاڵێن لـۆ وە لە مە دەکەن، خودا ناناسن، خودا خودا؟!

دوو سێ پاسەوان کەوتنە سەری، نازانم تێگەیشتن یان نا، گوێم لێـوو یەکیان بە فارسی گوتی:

کوڕی قاحپە، لێرە بە دوای خودا مەگەڕێ.

لە گەڕانەوەش یەك دوو شـەقم خـوارد، بەڵام قۆنـداخم بەر نەکەوت،

چاوێکم بە ڕاڕەوەکەدا گێڕا، دوور و درێژ بوو، دەرگاکانم بۆ نەژمێردرا نەمزانی زیندان چەند ژوورە، پیاوە کورتیلە ڕەقەڵەکە دەتگوت لە ناو بەفری قەندیلە، هەڵدەلەرزی:

بە خوا باوکم، من چیتر بەرگەناگرم، قۆنداخێك و شەقێکم خوارد.

کەتەی قەڵەو بە پێکەنینەوە:

بەرگە ناگری، گونم بگرە، دەتەوێ چ بکەیت؟

کورتیلەی ڕەقەڵە:

ئێستا کاتی گاڵتەیە؟!

کەتەی قەڵەو بە گاڵتەوە:

بە ڕاستیمە، گاڵتە ناکەم.

من لەوە تێنەگەیشتم ئەودەمەی خۆمان دەخیلی دیواری ماڵی خودا کردبوو، گوللە دەباری، قەڵەو زراوی چووبوو، تۆقیبوو، ڕەقەڵە گاڵتەی دەکرد، کەچی لە ژووری زیندانێ پێچەوانە بۆتەوە، خانەخوێ گۆتیە کورتیلەی ڕەقەڵە:

مێوانی ئازیز دەڵێی جاری یەکەمتە سەردانی زیندانێ بکەیت؟

کورتیلەی ڕەقەڵە فووێکی توندی لە دەستی کرد، ڕێك دەتگوت قوتابیی سەرەتاییە و مامۆستا دووسێ ڕاستەی لە سەر تی لێداوە:

نا، کاتی خۆی لە بازگەکەی سلێمانی_کەرکوك گیرام.

کەتەی قەڵەو:

ئێ، لەوێش دانت بە تاوانەکانتدا نا؟

کورتیلەی ڕەقەڵە:

زللەیەکیان لێدام، لە سەر سەر سووڕام، زللەیەکیتری بە دوادا هاتبا، هەموو شتم دەگوت.

خانەخوێ:

چیت دەگوت؟ دەتگوت من پاسدارم بردە ناو هەڵبجە!

کەتەی قەڵەو:

نا، دەیگوت من بووم تەقەم لە پاریزگاری هەولیر کرد.

کەس تیکەڵـی قسـەی کـورتیلە و کەتە و خـانەخوێ نەبـوو، قسـە درێژبـۆوە، دەرگـا کـرایەوە، دەنـا قسـە وا زوو نەدەبـڕایەوە، پاسـەوانەکە چـاوێکی خێـرای بە ژوورە نـۆ کەسـیەکەدا گێـڕا، نیگـای لە سـەر مـن گیرکردو ئاماژەی کرد کە بچمە دەرێ، چـووم، چـاو و دەسـتمی بەسـت، قەوما! ئەوەی لێیدەترسام گەیشـت، دەبێ بەرگەی ئەشـکەنجە بگـرم! زۆر ترسام، خۆزگە کەسێك چاوی لێم دەبوو بۆ ئەوەی ئێستا پێمبڵێ، پێیەکانت زەویان دەگـرت! راسـتی نـایەتەوە بیـرم لەرزی بـم یـان نـا، دەنـا ئێسـتا بە ئازایەتیەوە ترس و لەرزینی خۆم دەنووسـیەوە، چەنـد دێرێکیـدیم دەخسـتە سەر ئەو دێرانە.

ئێ، پیلی گرتم و بردمی، جیـڕەی دەرگـایەك هـات، بـردمیە ژوورێ، ئێسـتا لە سـەر کورسـی دانیشـتووم، سـێ چـوار خولەکێـك هەستوخوسـت نەبوو، چاوەڕێم لە پڕ زللەیەك، مستێك، پێلەقەیەك، قۆنـداخێك، قـامچیەك، هاوارم لێبەرزبکاتەوە، تۆ بڵێی ئەو کورسیەی لە سـەری دانیشـتووم، کارەبـا نەبێ! ئیدی وا چاوەڕێی ئەشکەنجەم، خودایە زوو بـێ، چ لەو چـاوەڕوانیە ناخۆشـترە! دەی میـرغەزەب، قـامچیەکەت بەگەڕبـێخە و وەدەنگـم بێـنە، بێدەنگیی ئەو ژوورە کوشتمی، خشەخشێك هات، هەسـتدەکەم کەسێك لە بەرانبەرم دانیشتووە:

+ئیسمێ شوما چیست؟

- من فارسی نازانم.

ئەو بە فارسی هەندێ قسە و چەند پرسیارێکی کـرد، بەڵام مـن هەر بە (نازانم، فارسی نازانم)ی کـوردی وەڵامـم دەدایەوە، مـن نەمدەویسـت ئەو بزانێ فارسی دەزانم (برۆکەک فارسیم دەزانی)، بۆ من باشـتر بـوو فارسـی نەزانم، لەوێ وا تێگەیشتم چەندی نائێرانیتر بیت، بارت سووکترە، دەترسام ئەگەر بزانێت کەمێك فارسی دەزانم، بە ئێرانیم دابنێـت، ئـێ، کـابرا ناچـار بوو ببێتەوە کورد، بە کوردیەکی کرماشانی تێکەڵ بە سنەیی پرسی:

+ ناوت چیە؟

- ناوم، شوان. ئە.خ

ناوی سەر (پەڕی پەڕینەوە)م گوت، ئەو ناوەی تایبەت بوو بۆ چوونە ئێران.

+ ئیشت چیە؟

- پێشمەرگەم.

+ لە چ پارتێکی؟

- پارتی کۆمۆنیستی ئێراق.

+ سەرۆکتان ناوی چیە؟

- عەزیز محەمەد

+ ئێستا لە کوێیە؟

- نازانم.

- ناوی پێنج لە سەرکردایەتی پارتەکەت بڵێ.

+ کەریم ئەحمەد، ئەبوو... ئەبوو...

چەند ئەبوویکم گوت، زوو لەوە گەیشتم ئەو دەیەوێت بزانێت کە بە راستی من پێشمەرگەی پارتی کۆمۆنیستم یان نا، دیارە ئەگەر بتوانم بیسەلمێنم کە درۆناکەم بۆ من باشترە، ئەودەم پارتی کۆمۆنیست پەیوەندیی هاتوچۆی لەگەڵ ئێران هەبوو، من دوو جاری پێشوو بە (پەڕی پەڕینەوە)ی سۆسیالیست سەردانی ئێرانم کردبوو، بەڵام ئەو جارە بە هی کۆمۆنیستان، لای هەردوو لاش هەر ئەو ناوەم هەبوو کە ئێستا بە کابرای لێکۆلەرم گوت.

+ لە ریزی پێشمەرگەکانتان هەندێ کەسی ئێرانیش هەیە، وایە؟

- لەو بارەیەوە هیچ نازانم.

+ باشە پێمبڵێ بەو درەنگانی شەوە چیت دەکرد لە ناو بازاڕ؟

- درەنگ گەیشتمە سەردەشت، مێوانخانە داینەکردم.

+ ئەدی ئەو دوو کەسەی لەگەڵت بوون چیتن؟

- نایانناسم، بەڕێکەوت لە بن دیواری مزگەفتەکە تووشیان بووم.

لێکۆلەرەکە پرسیار لە دوای پرسیاری لێدەکردم، نەیدەهێشت وەلامی پرسیارێك تەواو بدەمەوە، پرسیارێکیدی دەکرد، ئیدی وەلامەکان پس پس دەمانەوە، بەلام دیارە ئەو لای خۆی لێکدی گرێدەدانەوە، ئێستا لە کونجی زیندانێ ئەو سەرهاتەی بە سەرەدێر و کورتی بۆ لێکۆلەرم گێرایەوە، وا بە دلوداو بۆ خۆمی دەگێرمەوە:

دەمەو نیوەڕۆیە، لای بابۆلەفرۆشێ هەر بە پێوە دوو بابۆلەم ئاودیوکرد، سواری شڕە ماشێنێك بووم، پێدەچوو هی سەردەمی بابی حەمە رەزا شابێ، لە سەر جادەی قیر تەقوهۆڕیەتی، ئەگەر بکەوێتە سەر خۆل داخوا چ دەنگێکی لێوە دێ، نێوان خانە و سەردەشت هێندە نیە شەوت بە سەر دا بێت، بازگەکان زۆریان رادەگرتین، گێچەلیان بە سەرنشینان دەکرد، هەر دەتگوت بازگەکانی نێوان هەولێر و کەرکووکن، هێندە لە بازگەی یەکەم دوورنەکەوتبووینەوە، ماشێن دەنگێکی گەورەی لێوە هات:

+ چ بوو؟

- چ نیە، تایەی تەقی.

تایە گۆڕین هێندەی کات ناوێ، بەلام ئەوەی ئێمە زۆری ویست، ئێ، کەوتینەوە رێ، لە دۆلاییەك سەرکەوتین، لە بەرزاییەکە بازگەیەك قیتبۆوە، بە چ حال لە چەنگیان رزگاربووم، باوەڕیان بە (پەڕی پەڕینەوە)ی بەرکم نەدەکرد و پێیان وابوو ساختەیە، زۆری برد، تا باوەڕیانکرد، لە بازگەیەکیدی یەخەی ژن و پیاوێکیان گرت کە لە تەنیشت یەکتر دانیشتبوو، ژن و پیاوە هاواریان دەکرد کە ژن و مێردن، تا بازگە باوەڕی بە ژن و مێردایەتی ئەو دووە هێنا، بێوەژنێك بە بووك دەچوو، ئێستا وا لە لێژاییەك لێژدەبینەوە، ماشێن لە پڕ دەوەستێ:

- ها، ئەو جارە چیە؟

+ گرفتێکی گەورەیە، تایە پەنچەرە.

تاهو واە! ئەوە خۆشە، لەو دەشت و دەرە بەو درەنگانی عەسرە،

شــوفێرەکە دابەزی و مــۆرەیەکی لە ئاســمان کــرد، لە بەری قەنــدیلەوە هەورێکــی هێنــا، پێــدەچێت بــارانی پێبــێ، گەیشــت، دنیــای داگــرت، دەپرووشــێنێ، شــوفێرەکە دەســتی پــاڕانەوە نــا، هــی تــووڕەیی بــۆ ئاســمان هەڵبڕی:

بەڵا بەڵا، لە زەوی و ئاسمانەوە بەڵا...

باران لێیکردەوە، چ نەبوو هەر بایی نان تەڕکردنێ بـاری، دنیـا چ زوو روونبۆوە، هەڵیبرینگاند، ئاسمان تیلمە هەورێکـی پێـوە نەمـا، سێبەری چیـا گەیشتە سەرمان، سێبەر کشا، ئەها زۆری نەمـا بگـاتە گونـدەکەی ئەو بەر، ئەوبەری رووبارەکە، پیرێك کە هەر لە پیری بەفری ناو رۆمـانی (درەختـی کەتناوە) دەچوو، لەسـەر بەردێـك دانیشـتبوو، ردێـنە بەفـریەکەی خسـتبووە کۆشیەوە، بە گۆچانە گرێگرێییەکەی گەمەی خەتخەتۆکەی لەگەڵ زەوی دەکرد، شـتێکی لە زەوی دەنووسـی و رەشـیدەکردەوە، چـاوم لە گۆچـانە پێنووسـیەکەی بڕیـوو، دەمویسـت پـێش رەشـبوونەوە خەتـی سـەر زەوی بخوێنمەوە، پێڕانەدەگەیشتم، خێراتـر لەوەی دەینووسـی رەشـیدەکردەوە، بە خۆم نەوەستام:

+ رەشیمەکەوە، دەمەوێ بیخوێنمەوە.

- چی!

ردێن بەفری هەستایەوە، روو لە گوندەکە خۆی بە سـەر گۆچانەکەیـدا دادا، بە نەرمە کۆخەیەکەوە، گوتی:

درەنگە سێبەر بە سەر مەمکاوە کشا.

رستەیەکی ورووژێنەر بوو، رسـتەیەکی خەیـاڵی بـوو، خەیاڵێـك هەر لە سێبەری دەمەو ئێوارەی چیا دەچوو، چۆلەکە ئاسا باڵم گـرت و پەڕیـمەوە بەری مەمکـاوە، لە شـێوەی پەپـوولەیەك بە سـەر سـوخمەیەکی پەمبەیـدا نیشتمەوە، لە مەمکاوە ئەو ئێوارەیە ئەگەر گڕەی ترومبێلەکە نەیـدەهێنامەوە، لە نێوان دوو مەمکی هەرمێیی دەمـامەوە، درەنـگە تـا گونـدی مەمکـاوە لە چاو بزربـوو، لە ئاوڕدانـاوەیەکی تـامەزرۆیی هەر چـاوم لە سـەر مەمکـاوە

بوو، مەمکاوە لە دوورەوە و لە ئێوارەی بەهاری گوندێکی جوانە، زۆر جوان، بە شەرمەوە و بە ئەسپایی لە پیری ردێن بەفریم پرسی:

+ بۆچی ئەو گوندە ناوی مەمکاوەیە؟

- سەربردەیەکی دووورودرێژە رێگا بەشی گێڕانەوە ناکات.

+ بە کورتی زۆر بە کورتی.

- تامی نابێ .

گەیشتمە سەردەشت و سەربردەی مەمکاوەی نەگێڕایەوە، درەنگانی شەوە بە پەیژەی مێوانخانەیەکدا سەردەکەوم:

+ جێمان نەماوە.

- پەنایەکیش بێت دەحەوێمەوە.

+ نیە

وا بە دوای مێوانخانەیەکیدی دەگەڕێم، نازانم چەند گەڕام، دیتمەوە، سەرکەوتم، دەڵێی مێوانخانەی گۆڕینە، هەوە، هەو نیە:

- جێگا هەیە؟

+ نیە

- تکایە جێگەیەکم بۆ بکەوە

+ باشە بڕۆ ڕەزامەندی ... بێنە

ئێستا لە سەری ئەو سووچەم کە دیواری ماڵی خودای لێوە دیارە، ئەو ماڵەی پەنای نەدام و لە پیاوە تووڕەکانی ئیمام نەیپاراستم، دەمەوێ ڕێی خوارێ بگرم و بچمە فەرمانگەی ئاسایش و پەڕە کاغەزێکی جێکردنەوە بۆ مێوانخانە بێنم، نا، ناچم، دەترسم لە خۆوە شتێکم بدەنە پاڵ، تووشی بەڵایەك بم، خۆ جارەکەی مەهابادم لە بیرنەچۆتەوە، لەوێ لەو دەمەوعەسرانێك پیاوە تووڕەکانی ئیمام هێندەی نەمابوو بمخەنە کونڕەشەوە بکەن، ئەوانەی ئێرەش هەر لە توخمی ئەوانن، گوجیلەی یەك کۆریتن، ناچمە ڕێی خوارێ، ڕێی ئاسایش ناگرم، باشترە شەرم وەلانێم و بە ڕێی سەرێدا سەرکەوم، ڕێی ماڵی کاوەی مامەڕەزایی، ئەو ماڵەی پێشتر دوو

جار سەردانیم کردووە، شەوێکیش لێی ماومەتەوە، ئەو ماڵەی حزبێکی بە سەرەوەیە، هەر کۆمۆنیستێ دێتە سەردەشت، سەرێك بەو ماڵەدا دەکات، نا، ناچم، بەو نیوەشەوە لە خەویان ناکەم، جێیان تەنگتر ناکەم، ناچم، رووم نایە لە دەرگای ماڵی کاوە بدەم، باشترە کەمێکیتر لە بەر دەرگای ماڵی خودا بمێنمەوە.

رووداوەکانی زیندان خەیاڵ دەپسێنێ، خەیاڵی دەرەوەی زیندان، دەرگا کرایەوە، مردووێکیان فڕێدایە ناومان، سەرەتا مردبوو، دوای کەمێك هاتەوە دۆخی نیوە مردوویی، خانەخوێ میهرەبانانە بە دەوریەوە بوو، باوکانە سەری خستە سەر رانی و دایکانە دەستی بە سەر و روویدا دەهێنا، دکتۆرانە، دکتۆری نەخۆشدۆست نەك دکتۆری تووڕە، نەك ئەو دکتۆرانەی زراوی نەخۆش دەبەن، دەیگوت:

چ نیە، هەر هیچ نیە، لە منت کەوێ، لە من لەشساختری، ئەها هەنکە قیتدەبیەوە.

نازانم چەندی پێچوو، قسەی خانەخوێ راستکەوتەوە، یان بڵێم پیاوی نیوە مردوو بە قسەی خانەخوێی کرد، راستبۆوە و گەڕایەوە دۆخی زیندوویتی، لێیانپرسی:

+ تۆ لە سەر چی گیرای؟

-....

+ ئەورۆ گیرای یان...

-....

+ وازی لێبێنن، وەڵامناداتەوە، وایە؟

-....

+ باشە نەتزانی تەقو تۆقەکەی دوێ شەو چی بوو؟

- بیستم پێشمەرگە بە سەر شاری داداوە.

+ ئەها، نەمگوت.

هەر وا دەرچوو.

زۆر دەوروسورپیان دا و پرسیان، مێوانی تازە هـاتوو لەو رستـەیەی لە زاری دەرچـوو بتـرازێ، زاری هەڵنەهێنـایەوە کەس کەرتە دەنگێکـی لـێ نەبیست، نەرمە کۆخەیەکم گرتبوو بەرینەدەدام، کەتەی قەڵەو گوتی:

هی بێ جگەرەییە، قەیناکە باش بکۆخە، سینگت خاوێندەبێتەوە؟

خانەخوێی ناو زیندانێ هەڵیدایێ:

وا دیارە جگەرەکێشێکی پیسی!

گوتم:

شەو و رۆژ حەفتا جگەرەیەك دەکێشم

خانەخوێ بە بزەوە:

سینگت بۆتە سۆبەیەکی زستانی قەندیلێ!

قەنـدیلی زاری خـانەخوێ وشـە نەبـوو، ئەسـپێکی باڵـداری ئەفسـانەیە، خۆی گەیاندە ناو زیندانی سەردەشـتێ، کەس نەیـدیتم، خـۆم هەڵـدا سـەر زینـێ، پـێم لە ئـاوزینگێ نـاك جـڵەوم شـۆڕکرد، بردمـی، بـاڵی گـرت، کوێسـتان، کوێسـتان قەنـدیلی پێکـردم، لە کوێسـتانی (بنشـاخۆکە)وە بـۆ کوێسـتانی (سـەربەردە)، لە کوێسـتانی (کـۆدەلان) سـەرکەوە و کوێسـتانی (خرندۆڵ) لەبیرمەکە و بچۆوە (چۆمە)ی هەمیشە کوێستان.

زۆر تینووم، تینوێتی زینـدان بە کـانیی (مـزکەوتە) ناشـکێ، لە گشـت کانیەکـانی قەنـدیل دەخـۆمەوە، لە کـانیەکەی (گـوێزێ)وە پێـدا دێـم، لە کانیی (بناوان) مەتارەکەم پردەکەم، چۆك بـۆ (سـپی) دادەدەم و گیرنـابم، دەگەمەوە (پرژە)، زۆر تینـووم، زینـدان تەڕایەتـی لە لەشـم نەهێشـت، هەر دەبێت خۆم بخەمە گۆماوەکەی (بێکۆدیان) و زگاو بم.

برسیم، زۆر برسیم، دەبێت خـۆم بگەیـنمە نـاو ئەو رەشـماڵانەی کە لە هەڵاتنێکدا رێی شەوێکم کەوتە ئەوێ، شـەو چ شـەو! ئەو شـەوەی بەهەڵە ژنێکی زۆزانیی بەژن زراف هاتە ئامێزم، لە شێوەی مراویی کێوی خـۆم بە گەرمکێ دادەدەم، ئەوەی لەگینە ژنی بن بەردە نەرمەکەش! پا و پـووزی لێ شووشـتبێ، لەوێ حەفـت نـانی تیـری بە حەفـت چـایە و نیـو مەنـجەڵ

ماسـتەوە دەخـۆم، بـۆ جـگەرە دەچـمەوە بارەگـای سـەری (چەکـوچ) بە جگەرەی مام بایز نەبێ برم ناشکێ.

ئێستا لە ناو کەسکایی و تەڕایی کوێسـتانان رووتـدەبمەوە، لە زینـدانی ئیمـام گلاوبـووم، بە چەمەکەی دۆڵە کـۆگە نەبـێ، گـلاوی لە لەشـم دەرناچێ، ئەسپی باڵـدار هەڵمـدەگرێ، دونـدی (شـێخ شـەرۆ) لە کەلێنـی هەوری بەهـاریەوە لە دونـدی (کەوگەز) وەرمـدەگرێ و هەر لە کەلێنـی هەورەوە دەمداتە دوندی (پیرخێلەند)، ئەسپی باڵدار دوند دونـد دەمگێـڕێ، ئێسـتا لە هەرە بڵنـدایی قەنـدیلێ کە چ جـێ لەو بڵنـدتر نـابینم، هەر لەبەر بڵندیشە نـاویم نەزانـی! لەوێ لە هەرکەوێ مەتـارەکەم پڕکـردەوە، ئەهـا بە دیوی هەولێرێ لە سەر تاتەبەردێ خۆم داوەتە تـاوێ، دوای تـاوێ، خەوم دێ، زیندان رێی نەدا چاوێ گەرمبکەم، دەبێت بخەوم، لە ئازادی بـخەوم، ئەرێ بۆرژابووم یان نا!

دەنگی دەرگا نەبا، چی منی لە بەرزایی قەنـدیلەوە دەهێنـایەوە زینـدانی سەردەشت، دیارە کاتی چوونە سەر تاراتە، حەزمـدەکرد بەر لەوەی بچـمە ئاودەسـت، قسـەیەکی خـانەخوێ لە بـارەی جـگەرەوە بگێـڕمەوە، بەڵام لە کاتی چوونە سەر پێشاو کوا کات بـۆ گێـڕانەوە! کـات هەر بەشـی چـۆڕە میزێك دەکات، بەڵام ئەگەر ئەوەی لە دڵمە هاتەدی، چاکەی خانەخوێ بە گێڕانەوە دەدەمەوە، گەیشـتمە سـەر دەرگـای ئاودەسـت، سـەیرە، پاسـەوان دەست ناوەشێنێ، دەڵێی لە بیریچۆتەوە پاسەوانی بەندیانی بەندیخانەیە، هەل لەدەست نەدەم باشە، داوادەکەم زۆر زۆر تێهەڵدانێکی مزر دەخۆم، دەیڵێم، رسـتە ترسـناکە دووکەڵاویەکە دەڵـێم، بە نیـوە مـردوویش بگەڕێـمەوە باوەشی خـانەخوێ، هەر دەیڵـێم، هـاتە سـەرم بە فارسـی بیڵـێم، بـاش بـوو هۆشم هاتەوە سەر کە فارسی نەزانم، نەدەبوو بزانم، چـۆن بیڵـێم، ئـێ خـۆ پاسەوان کوردی نازانێ، بە چ زمانێك تێبگەیەنم! نا، گرفتێکی ئەوتـۆ نـیە، کوردی و فارسی هێندە لێکدی دوور نین، ئامۆزانە، بە کوردی دەیڵێم، نـا باشترە بە زمانی ئاماژە قسەبکەم، ئەو زمـانە جیهـانیە، کەس نـیە تێنەگـات،

دەی بیڵێ، غیرەت سەگ بتخوات، من کەی هێندە بێ زاخ بووم، دەی بە تێکەڵەیەك لە زمانی ئامازە و کوردی پاسەوان لە مەبەست تێبگەیەنە، سەرتان نەیەشێنم خۆم ئامادەکرد بۆ تێهەڵدان، بە زمان و بە دەست گوتمە پاسەوان:

ئەگەر جگەرەیەکم بدەیتێ، چەندت دەوێ دەتدەمێ.

پاسەوان کەمێك لێم موور بۆوە، لە سەر دەرگای ئاودەستەوە، دەرگا نەبوو شتێك وەك دەرگا، نەوی، بە دەنگی نەوی گوتی:

+ جگەرەیەك بە دوو سەد تومەن.

- سەد تومەن؟

خودا خێری بنووسێ، مامەڵەی خۆش بوو، گرانجان نەبوو، تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، جگەرەیەکی بە پێکراوی لە سەر دەرگاکەوە بۆ راگرتم، سەد تومەنەکەی خۆی وەرگرت، جگەرە چ جگەرە، ئەو جگەرەیەی من کێشام، ڤیدل کاسترۆش جگەرەی وای نەکێشاوە، ئەو تام و بۆیەی من لەو جگەرەیەم وەرگرت، مام بایزی هاوڕێشم لە هیچ جگەرەیەکی تام نەکردووە، لە بیریشمان بێ، ئەو جگەرەیەی بە سەت تومەنم کڕی و لە ئاودەستەکەی زیندانی سەردەشت کێشام، لە جگەرە هەرە پیسەکانی ئەوسای ئێران بوو، ناوێکی وەك (ویژە)ی هەبوو، پاکەتی بە حەفت هەشت تومەنێك بوو، ویستم جگەرەیەکیدیش لە پاسەوانەکە بکڕم، کات نەما، هەر لە سەر دەرگاوە خانەخوێ لە سیمام خوێندیەوە کە نەخشەکەی سەریگرتووە:

+ باشت کێشا؟

- هەموویم هەڵمژی و هیچم نەهێنایەوە.

+ رەنگت هاتەوە بەر.

- سوپاس بە هۆی تۆوە بوو.

+ سوپاسی پارە بکە، پارە لە دۆزەخەوە دەتباتە بەهەشت.

دوو سێ زیندانی بە یەکەوە:

ئەستەغفیروللا، ئەستەغفیرۆڵلا.

خانەخوێ بە پێکەنینەوە:

چیتانە! لە تەنیشت شەیتان نوێژم کردووە؟

نوێژی تەنیشتی شەیتان کوفرێکی نوێ بوو، پێشتر لە کەسم نەبیستبوو، بەڵام خانەخوێ ئەگەر تەمەنی زنجیرەیەك کوفری نەپساوەبێ و گوناهەکانی کەتیرەیی بن لێنەبنەوە، من هێندە بۆی پاڕاومەتەوە بە دووری مەبینن، وەك بەفری قەندیل وەك ڕێواسی بن بەفر پاکبوویێتەوە و هیچی لە سەر نەمابێ، دەزانی ئەو پیاوە چ چاکەیەکی لەگەڵ من کرد، چاکەیەك چ چاکەکارێك چاکەی وای لەگەڵ کەس نەکردووە، چ ڕێیەکی نیشانی من دا، ڕێیەك چ ڕێنیشاندەرێ، چ پیرێ ڕێی وای پیشانی کەس نەداوە، ئەو پیاوە نەبا، من لە زیندانێ جگەرەم دەستدەکەوت، با بە پارەی خۆشم بێ، ئەو نەبا، بە چیم دەزانی پاسەوان جگەرەفرۆشە! ئەو بوو گوتی:

پارە نیشانی پاسەوانە کەپوو خوارە چاو خێلە ورگنەکە بدە، ئەوە کە زار دەکاتەوە لە دوورەوە هەژارەکەی دەردەکەوێ، نەك جگەرە ژنیشت بۆ دێنێ.

خانەخوێ دەیگۆت:

ئەو پاسەوانە خوازۆکی کوڕی خوازۆکە...

هاوارێك، هاوار نا، لە بانگدانێك، مەگەر مامم سالانێکی زۆر پێشتر لە سەر تەرمی کچە تازە بە شوودراوەکەی وای لە بانگدابێ، مەگەر من سالانێك دواتر لە سەر تەرمی برا بیست بەهاریەکەم نزیك لەوە لە بانگمدابێ، زیندان لەرزی، ئەوە کێ بوو لە ژوورێکی زیندانی سەردەشت بەو دەنگە خوێناویە لە بانگی دا؟ من لە دەنگی ئەو پیاوەوە هەستم بە ڕژانی خوێن کرد، بە چاوی ئەندێشە دیتم خوێن دەستی دەنگی گرتووە و تێکەڵی هەوا بووە، دەرگاو دیوار دەبڕێ و ڕێی گرتووە، خانەخوێ ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

ئەو دەنگە دەناسمەوە.

کەتەی قەڵەو لەو قووڵتر ئاهی هەڵکێشاو پرسی:
-دەنگی کێیە؟
+ دوو برا بوون، دەمێکە مێوانی ئێرەن، ئەوە دەنگی برا گەورەکە بوو، دیارە بەڵایەکی ئیمامی بە سەر برا گچکەدا هاتووە.
کەتەی قەڵەو ویستی زارهەڵێنێ، رەنگە ویستبێتی هەر ئەوە بپرسێ کە من پرسیم:
- بەڵای ئیمامی واتە مردن، یان...
+ بە داخەوە..
برا گەورە دەنگی نەما، نەمانزانی لە خۆچوو، یان دەمیان داخست!
کورتیلەی رەقەڵە هەڵدەلەرزی، کەڕ گوێی لە چۆقەچۆقی ددانی دەبوو:
بەرگەی لێدان ناگرم، هەرچی هەیە، هەرچی نیە، هەمووی دەڵێم.
کەتەی قەڵەو:
ئەو لەرزین و قرچە قرچە چیە؟ دەڵێی برێشکەی سەر سێڕی.
خانەخوێ بە پێکەنینێکی شیرنەوە:
نا، هەڵیانداوەتە سەرمای قەندیلێ، کوا دەستت بێنە.
دیتم، دەستی رەقەڵە لە ناو دەستی خانەخوێیە و لە چاوێڕا دیاربوو بە قسەی خۆش گەرمی دەکردەوە، بەڵام من گوێم لە قسەکانی نەبوو، چونکێ گەیشتمە سەرمای قەندیلێ، سەیرە لە زیندانی سەردەشتێ، هەر ناوی قەندیل هاتبا، من دەفڕیم و لە سەر قەندیل دەنیشتمەوە.
ئەوەتا لە بارەگایەکی بەفراویی قەندیلی، تفەنگم لە شانە، بنە مەتارەیەك چایەم بە دەستەوە، جگەرەیەك بە لێومەوە، دەڵێی نۆبەتداری لە بەفر دەگرم، ئازادی چ دیاریەکی سرووشتی ئاسمانیە، بە من دراوە؟ دەنگی دەرگا لە زیندانی کردمەوە، بەس ئەو جارە بگەمەوە قەندیل، بگەمەوە چیای ئازادی، تۆبە، هەرگیز روو لە کۆماری ئیسلامی، کۆماری زیندان ناکەمەوە، مرۆڤ لە زیندان چ زیندەوەرێکی نابووتی بێ کەڵکە، زیندان لێکردنەوەی مرۆڤایەتیە لە مرۆڤ، تا زیندانی نەکرێت، نازانی

ڕێزی ئازادی بگرێت، تێناگەی لە بەهای ئازادی، ئازادی تام نادات، ئازادی نانەخشێت، هەژی گۆتنیە من زۆر کەم، ئەگەر کوو، دەنا رستەی ناو کتێبانم بە بیرنایەتەوە، بەڵام لەوێ لە کونجی زیندان قسەیەکی ژان ژاك رۆسۆم لە سەرەخۆ لە بەر خۆمەوە گوتەوە:

کە لە قەڵاتی باستیل زیندانی بکرێم، دەتوانم ئازادی بنەخشێنم.

وا بزانم لە یادەوەریەکانیدا(دانپێدانان) وای گوتووە، منیش لە زیندانی سەردەشتەوە ئازادیم جوان دەنەخشاند، نەخشاندنێك نە پێشتر و نە دواتر وا جوانم نەنەخشاندووە.

پاسەوانەکە رستێك جوێنی کۆماریی هاویشت و مەسینەیەکی بەجێهێشت، جوێنی کۆماری دەستەواژەیەکە خانەخوێ دایهێناوە، ئەو جوێنانە دەگرێتەوە کە دایك و خوشك و ژنیان تێدایە (داك حیز، خوشك قەحپە، ژنت بگێم)، مەسینەیەکی باغە، پیس، لە چەند جێ وەکو بلێی گڕووبووە، بیدەیتە دەست گرۆو بێزی نایە بیباتە سەر تارات، کەچی ئەوەتا ئێمە ریزمان بۆ مەسینە گرتووە، دەوی پێوە دەنێین، دەزانن چی تێدایە! چایە، لە زیندانێ کەس نیە حەزی نەچێتە چایە، گۆتمە خانەخوێ:

+ چ ناوێکت لەو مەسینە ناوە؟

خانەخوێ کەمێك داما، زوو گوتم:

+چۆنە ناوی (قۆریەی ئیمام) بێ؟

- جوانە، لێیدێ.

وا بزانم دوو سێ جار لە قۆریەی ئیمام چایەمان خواردەوە، لە بیرمە کەتەی قەڵەو بە ئەسپایی زۆر ئەسپایی لە من بترازێ کەس نەیبیست، رەنگە خۆشی نەیبیستبێ! گوتی:

+ ئای بە چاوی خۆم ئەو قۆریەم بەسەر لێوی ئیمامی گەورەوە دیتبا!

- بە دووری مەبینە، دنیا دەوران دەورانە.

نازانم چ کاتە، کاتی دەست بە ئاوگەیاندنە، بەر لەوەی بچم و بێمەوە و خۆم بگێڕمەوە، با کەتەی قەڵەو بگێڕمەوە، چوو ساخ لە گوێز ساختر،

هاتەوە خۆی لە سەر قوون رانەدەگرت، شلوکوت، هێندەیان تێهەڵدا، خۆی گوتەنی:

هیچ تۆپێك هێندە پێیەی پێنەکەوتووە.

لە سەر پشت راکشابوو، هەموومان بە پێوە راوەستابووین، ئاخر چاوەکە هەر بەشی راکشانی کەتەی قەڵەوی دەکرد، خانەخوێ گوتی:

+ چیت کرد وایان لێکردی؟

- بە زمانی سووتاوم داوای پیاسەم کرد.

+ پیاسە!

- بە پاسەوانەکەم گوت: خێرت دەگاتێ با کەمێك لەو بن دیوارە راوێچکە بکەم، کوڕی قاحپە گوتی:

نا، دەتبەم لە ناو رانی دایکت راوێچکە بکە.

گوتم:

چما تۆ دایکت نیە قسەی وا دەکەیت؟!

ئیدی کەوتنە سەرم بە دوو پاسەوان مارکوژیان کردم.

بەڵام خۆ شێت نیم داوای راوێچکەکردن بکەم، من جگە لە جگەرە، بە پارەی خۆشم، هیچم لە کۆماری ئیسلامی ناوێ، هەمان پاسەوان، هەمان تاس و حەمام، سەر تارات و سەد تومەن و جگەرەیەك، هێشتا دوا مژم لە جگەرەی (ویژە) جگەرەی سەد تومەنی نەدابوو، دیتم پاسەوان، جگەرەیەکیدی بۆ راگرتووم، دەستم بۆ گیرفانم برد، پاسەوان بە سەر ئاماژەی دا کە پارەی ئەو جگەرەیەی ناوێ، سوپاسم کرد، بە کێشانی جگەرەی دووەم هێوربوومەوە، هێور هێور، ئەگەر جێیەك بۆ پێی چەپم بکەمەوە، رایکێشم، دێشێ، سەرخەوێك دەشکێنم، دوو شەوە نەخەوتووم، بە بیرم نایە خەوم لێکەوتبێت، دەبێت چاوێك گەرم بکەم، خانەخوێ گوتی:

پێت بە لای مندا درێژبکە، بخەوە.

دەرگا نەیهێشت دەنا دەخەوتم، دەرگایان کردەوە و کورتیلەی

رەقەڵەیان راپێچکرد، دیتم دەلەرزی، گوێم لێبوو:

بەرگە ناگرم، هەموو دەڵێم.

خانەخوێ لە بن لێوانەوە گوتی:

پێدەچێت ئازادی بکەن.

کەتەی قەڵەو گوتی:

خوابکەم ئەو شێتەمان لە کۆڵ بێتەوە.

گۆتمە خانەخوێ:

بە چی دیارە ئازادی دەکەن؟

خانەخوێ بە پێکەنینەوە:

هیچ، دڵم تریواندی!

بە گەمە گوتم:

دە بزانە دڵت بۆ منیش ناتریوێنێ؟

بە دڵنیاییەوە گوتی:

نۆرەی تۆش نزیکە.

پیاوێکی چوارشانەی برۆ پانی لووت بەرانی، کڵاوێکی مەیلەو گیایی لە سەرە، قاتێکی رەنگ کایی لە بەرە، بۆینباخی نەبەستووە، دوو دوگمەی یەخەی دانەخستووە، مووی سینگی پڕە، لە تەنکە ردێنەکەی پتر داوی سپی تێکەوتووە، مێزەکەی هێندە گەورە نیە، دەفتەرێکی گەورە و چەند پەڕە کاخەز و سێ چوار پێنووسی لە پێشە، تەپلەی جگەرەش، هەردوو دەستی گیراوە، دەستێك بە پەرداخەوە، دەستێك بە چاویلکەوە، لە بەرانبەر وی لە سەر کورسیەك دانیشتووم، تازە چاوم کراوەتەوە، پێدەچێ ئەو ژوورە هەمان ئەو ژوورە بێ کە دوێنێ بە چاوی بەستراوەوە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردم، کێ دەڵێ ئەو پیاوەش هەر پیاوە کرماشانیەکە نیە! با قسە بکات رەنگە دەنگی بناسمەوە، بەڵام دەڵێی بە تەما نیە قسە بکات، پێنج شەش خولەکێ دەبێ لە بەر دەمی دانیشتووم قسەیەکی نەکرد، جاروبار تیچاوێکم دەداتێ، دەی پیاوی پشت مێز شەکرێ بشکێنە، دڵم تەقی،

ئەگەر قسەش ناکەی، پیاوەتیت لە دەست بێ و جگەرەیەکم بدێ، قسە مەکە، بە دەم جگەرە کێشانەوە ئامادەم تا ئێوارە لێرە دانیشم و نەشپرسم بۆچی لێرەم! پیاوی پشت مێز پێدەچوو لە چاومەوە دڵمی خوێندبێتەوە، جگەرەیەکی بۆم راگرت، هەستام و لێم وەرگرت، ئاگرەکەشی دامێ، ویستم بە فارسی سوپاسی بکەم، باش بوو هاتەوە بیرم کە فارسی نازانم! بە کوردی سوپاسم کرد، دانیشتمەوە بە زمانی ئاماژە گوتی:

کە تەپلەی جگەرەکە ببەم.

رەنگە زۆر بە تامەزرۆییەوە جگەرەکەم کێشابێ، بیرمە ویستم ئازایەتیەك تۆ بڵێ کەرایەتی پیشانی پیاوی پشت مێز بدەم، چتۆ ئازایەتیەك! هاتە سەرم سەد تومەنی بدەمێ، ترسام و نەمکرد، ئێستا کە سەرهاتەکە دەنووسمەوە، دەڵێم بریا وام کردبا، دیارە ئەگەر منی ناو سەرهات، منێکی ناو چیرۆك، رۆمان با، دەبوو پەنجا تومەنەکە لە پێش پیاوی پشت مێزەکە دابنێم، پێبڵێم:

ئەوە هەقی جگەرەکە.

بێگومان هۆی ئەوەی دەپرسی، لە وەڵام دەمگوت:

ئەدی ئێوە جگەرەیەك بە سەد تومەن نافرۆشن!

حەیف! کەسایەتی ناو رۆمانەکانم مەرج نیە کتومت کەسایەتی یادەوەریەکانم بن! هاتە قسە:

+ فارسی بەلەدی؟

- فارسی نازانم.

کردیە کوردی، هەو بوو، پیاوە کرماشانیەکە بوو، کۆمەڵێك پرسیاری کرد، زۆریان دووبارە بوون، بەڵام دووبارەیەکی لێکدی دوور، هی دوێنێ، دوێنێی تاریکی، دوێنێی چاو بەستراوی، گوتن و بیستن لە باری چاوبەستراوی چەند جیاوازن لەوەی لە باری چاو کراوەیی بیت، تا نەتخەنە باری چاوبەستنەوە پەیبردن بەو جیاوازیە سانا نیە.

پاسەوانەکە هات و چاومی بەست و بردمی، گەیشتمەوە ژوورەکە، چ

ببینم باشە! ژوور چۆل و هۆل، پاسەوان دەرگای کلیل دا، ئای من کەوتمە ژووری تاکەکەسی! باشە خانەخوێ، کەتە، رەقەڵە، ئەوانیدی چیان بەسەرهات! لە بیرمە بە کلکی کەوچکە چایە، نازانم چۆن گەیشتبووە ژووری زیندان! نووسیم لە دیواری زیندان نووسیم:

چ سەختە تەنیایی زیندان .

زۆری نەبرد، دەرگا کرایەوە، نا، بەرلەوەی بێن، دەبێ گوێ لە چریکەکە:

**بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر دەبێ**

**قوڕ بە سەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە**

ئەوە حەمە جەزا چ دەکات لەو ژوورەی تەنیشتم! دەنگی ئەوە، کاسێتە؟! نا، خۆی لێرەیە، ئەها پاسەوانەکان غاریان دایێ، وەریگەڕانێ، گوێم لە دەنگی قامچیە، پیس لێیاندا، قیڕەبڕیان کرد، لە کونی دەرگاوە دیتم رایانکێشا، دەموچاویم دیت، نەمدیتبا، ئێستاش دەمگوت ئەوەی لە زیندانی سەردەشت گۆرانیەکەی حەمە جەزای گوتەوە، جگە لە حەمە جەزا کەسیدی نەبوو، چەند دەنگی لەو دەچووا من ئەو شیعرەی قانعم هەمووی لە بەر بوو، لە زیندانێ لە بەر خۆمەوە گوتمەوە.

چاومی بەست و پێش خۆی دام، ئەوجارە بۆ کوێ؟ ئەها دەڵێی دەچمەوە سەر زەوی، هەر جگەرەکێشانێکی کێشا، سواری ماشێنێکیان کردم، چاوم بە پشتێنەکەی خۆم بەسترایە، بەڵام دەستم کراوەیە، پێش دابەزین، چاومیان کردەوە، ئێستا لە ژوورێکم دەڵێی پرسگەیە، ئێرە بە بنکەی پۆلیس دەچێ، لە لای دەرگا رایانگرتووم، نیو دەمژمێرێکی پێچوو، رێیاندام، دابنیشم، دەمژمێرێك پتر دانیشتم، لەوێ هەر هێندەم لە بیرە گوتیان:

ئێستا، فەرموو دەتوانی بڕۆیت.

پرسیاری (پەڕی پەڕینەوە)کەمم کرد، داوامکرد بمدەنەوە، گوتیان:

سبەی وەرە وەریبگرەوە.

سبەی بێمەوە ئێرە! هاتمە دەرێ، پێم هەڵێنا، پێ هەڵێنانێك مەگەر لە ترسی ئەنفال وام هەڵێنابێ، ئۆی، خۆ ئێرە ناو بازاڕە، پاکەتێکی هەرزانم بە ئاگرەوە کرێ، ئۆخەیش گەیشتمەوە جگەرە، دوو کۆڵان سووڕامەوە، ئەوەتا ماڵی خودا، دەرگا کراوەیە، لە دڵی خۆم گوتم:

لە کاتی پێویست نەتکردەوە، مەرج بێت ئیدی سەرت پێدا نەکەم

دوو سێ بابۆڵەی نازانم پەتاتە بوو، چ بوو، خواردم، لە چایخانەیەك دانیشتم، ڕەنگە قۆریەك چایەم بە جگەرەوە خواردبێتەوە، چاودەگێڕم، ورد چاو بە شەقامدا دەگێڕم، ئێ برادەرێکی زیندانیم ببینمەوە، ئەوانەی زیندان بە تایبەتی خانەخوێ و کەتە و ڕەقەڵە هەستمدەکرد دەمێکە دەیانناسم و برادەرمن، ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە حەزدەکەم بیانبینمەوە...

ماوەیەتی بۆ نیوەڕۆ، لەوێوە ڕێی سەرێم گرت، ئەو ڕێیەی ئەگەر بە کەرایەتی خۆم نەکردایە، زوو بمگرتایە تووشی ئەو هەموو تێهەڵدان و سووکایەتیەی کۆماری ئیسلامی دەبووم! لە ڕێ بیرم لە خانەخوێ دەکردەوە، لەوانیدی، نەمدیتنەوە، ماڵی کاوە کە سەربردەی ئەو دوو شەوەی منیان بیست، هێندە سەرکۆنەیان کردم، ئەگەر باوەڕم بە تۆبەکردن هەبا، لە سەر دەستی ژنە خانەدانەکەی کاوە تۆبەم دەکرد.

ئێ، چ بکەم! سبەی بچم بۆ هێنانەوەی (پەڕی پەڕینەوە) یان نا، درەنگ کاتژمێر و تەزبێحی قەزوانیم بیرکەوتەوە، ئەگەر نەچم چۆن بگەمەوە قەندیل، قەندیلی هەمیشە ئازاد، ئەو قەندیلەی لە خەونیش ناکەوێتە ژێر ڕکێفی تورك و عەرەب و فارس، ئەو قەندیلەی ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە لە دیدی من هەر هێمای مانەوە و ئازادیە، حەزیش ناکەم بچم، نامەوێ سەر بەو جێیەدا بکەم کە تێیدا سووکایەتیم پێکراوە، بەڕێکەوت شاهێنم دیت، سەربردەمی بیست، گوتی:

وێنەیەك لە سەر تۆ، ئەویدی لە سەر من.

وێنەیەکم گرت، دەمژمێرێکی پێنەچوو، ناسنامەیەکی دامێ، کاتی خۆی لە عێراقیش ناسنامەی وام نەبووە، یەکسەر چوومە گەراج، سواری

قوته جێبێك بووم، باژۆ بەرەو دەڤەری (قاسمە رەش)، تا گەیشتمە دوا بازگەی کۆماری ئیسلامی لە هیچ بازگەیەك داوای ناسنامەیان لێم نەکرد، دوا بازگە گرنگە، لە بیرم نیە چ بوو، بەڵام دەزانم لە سەر سنوور گێوەلێژەیەك هاتە گۆڕێ، لەم دیو و لەو دیوی تەلبەندی سنوور کۆمەڵێك خەڵك چاوەڕوانی پەڕینەوەیان دەکرد، ئیدی بێ گێرمەوکێشە لە تەلی سنوور پەڕیمەوە، لە پەڕینەوەدا سیەکانم بۆ بای ئازادی کردەوە، ئەو بایەی لە ئاراستەی قەندیلەوە هەڵیکردبوو.

## پۆلێ گوڵەستێرە هەڵنایە

ساڵ لە دوا رۆژەکانی ڕێبەنـدانە، هەر دیتـت بە پێیە بەفراویەکانیەوە هەنگاوی نایە بەری رەشـەمێوە، دەروازەکە هێشتا لەخەونیشـدا خـۆی بە رووی ڕاپەڕینـدا والآ نەکـردووە، هێنـدەی بەڕووی داربەڕووێکـی بە ساڵداچووی کەم بەر، پێشـمەرگە بە شاخە سنووریەکانەوە نەمـاونەتەوە، ئەنفـال وەرزی وەرینـی پێشـمەرگە بـوو، پێشـمەرگەی وەك گەڵای پـایز هەڵوەراند، رەشەبایەك هەڵیکرد و هەمووی بە ئاراستەی بەغدا ڕامالی، چی وای نەهێشـتەوە، رەشـەبایەك هەڵیکـرد و بە شـارەکانی ئێرانـدا پەرتەوازەی کردن، چی مایەوە! رەشەبایەك هەڵیکرد و بە ڕێی رووسیادا بردنـی، چی دەمێنێتەوە! بەڵام ئەو کەمە پارتیزانەی لە بەرد رووقایمترن و خۆیـان لە بـن بەفری بارەگاکـان شـاردۆتەوە، خولیـای پـارتیزانی لە سـەریان هەر دەڵێی لاسکە ڕێواسی بن بەفرە و چاوەڕێی...

هەر دیتت ژەنگ لێدام، بە تفەنگەوە ژەنـگ لێـدام، ئەرێ تفەنـگ لە کەنگێوە بێ دەنگە، من لە کەنگێوە لێرەم! ئەگەر گـوێی خـۆم لەو چەنـد تەقەیەی بەو دوایەی سەری قەندیل، سەری چەکوچ و سادر کەڕ بکەم و چاوم داخەم لەو وێنە راکەڕاکیەی دیـوی نسێی مامەنـدە، مـن و تفەنـگ دەمـێکە بـێ جـووڵە و دەنگـین، هێشـتا شـەیتان دەسـتی لە خـومەینی

نەشووشتبوو، بەرێ ژەهرەکەی فڕکردبوو، لەوەدەمەوە، لە دەمی نێوان ژەهر و مەرگی خومەینیەوە من و تفەنـگ بـێ جـووڵە و دەنگـین، ئیـدی سـاتی ژەنـگ هـاتووە، لەو دۆڵە نەك هەر تفەنـگ و پێشـمەرگە، زێـڕ هێنـدە بمێنێتەوە ژەنگ هەڵدێنێ، ئیدی ئەو دۆڵە دۆڵی ژەنگە، پارتیزانێـك مـلازم شێرزادی ناوە، دەڵێ:

هەر ئێستا دەبێ تفەنگ بێتە دەنگ.

ئەبوو راستی کە هەرگیز نەمدیتبوو، نەمبیستبوو، سـەری رەزامەنـدی بـۆ قسەی ملازمەکان بلەقێنێ، لەقاندی و گوتی:

شێرزاد راست دەکات، تفەنگ تفەنگ...

من بەو دوابیە لە پێش خۆمەوە، دێڕە شیعرێکی خۆم دەگوتەوە، پێشـتر بڵاومکردبۆوە و تەواوێك درێژبوو، ملازم شێرزاد هەمووی لەبەرکردبوو:

**پۆلێ گوڵەستێرە هەڵتایە**

**بە کۆنە سەنگەرێ بکەومەوە...**

ملازم شێرزاد بەرێکەوت گوێی لێم بوو، گوتی:

هەڵدێت، هەڵدێت، هەر دیتت پۆلێ گوڵەستێرە هەڵهـات، خۆشـت لە ناویانی.

کوا بۆ ئەو رۆژە! لە دوا رۆژە تەزیوەکانی رێبەندانـدا، بێـزاری گەیشـتە ئاستی لە سەر رژان، چوار پێنج پێشمەرگە رێکەوتین داوابکەین کە رێمان بدەن بە کۆنە سەنگەرەکان بکەوینەوە و تفەنگ بە دەنگ بێنینەوە.

مام جوامێر ئەو پیاوەی تفەنگەکەی لە بێـدەنگی رانەدەهـات، هەر زوو لەگەڵ بەختیـار و سـەعید و یەك دووانێکیـدی خۆیـان بەسـت و بەرەو کۆنەسەنگەرەکان کەوتنە رێ، ئەبـوو راسـتیش ئەو پیـاوەی کە قسـەیەکی دەکرد دەیبردە سەر، دەشتی و شـەماڵ و یەك دووانێکیـدی بەگەڵ خـۆی داوە و وا بزانم بەشداریشیان بەشدارێکرد، لە سەر رۆیشتن.

سەردەسـتەی ئـێمەش وا لە هـاتوچۆی بە دەسـتهێنانی رەزامەنـدیە، تـا بەرەو کۆنە سەنگەرەکان بەرێکەویـن، رەزامەنـدی لە دەسـتی دەسـتەیەکی

سێ چوار کەسیە، لە ناوزەنگی خوارێ دادەنیشن، یەکیان کانەبی گەورەی ناوە، لە سەر ئاو و ئاگرین، کەی دەستەی رەزامەندی، رەزامەندی دەفەرمووێ، سەردەستەی ئێمە سەنگەری ناوە، کوری کۆڕێی سەر رێی هەولێری سەر بە هەولێرە، عەسرانێك سەنگەر بە هەڵەداوان هاتەوە، لە سیمایدا بزە دەڕژا، بەڵام دەیوست نیشانی منی نەدا و لێمبشارێتەوە، گوتی:

+ بە داخەوە رازی نەبوون تۆ لەگەڵمان بێی.

- لۆ؟

+ گوتیان نەساخە وپارتیزانی زەحمەتە، بەڵام وا بزانم بڕیاری کۆتایی نیە، رەنگە...

- پێیانبڵێ ئەگەر بە تاقی تەنێش بێت دەڕۆم.

سەنگەر روونیکردەوە کە لە ناو لیژنەکە تەنها کانەبی گەورە لەگەڵ ئەوەیە کە تۆ لەگەڵمان بی، بۆیە دوور نیە ئەوانیدیش بێنە سەر قسەی وی، دواتر بیستمەوە کانەبی گەورە ئەوهای بە دەستەکە گوتبوو:

رێیبدەن با لەگەڵیان بچێ، لێیمەترسن، وەك من بیناسم پارتیزانی پێدەکرێ، من لە تەنگانە دیتوومە، من لە هەڵگەڕان و داگەڕان دیتوومە، لە پێکداداان و خۆشاردنەوە دیتوومە، لە هەڵمەت و هەڵاتندا دیتوومە، رێیبدەن.

رۆژی دواتر سەنگەر هاتەوە لام، ئەوجارە سیمای پڕ لە بزەی خۆی نەشاردەوە:

+ بە تەنیا مەڕۆ، لەگەڵ ئێمە دێی.

- رازی بوون؟

+ کانەبی گەورەت لە پشتە.

لە دڵەوە سوپاسی کانەبی گەورەم کرد، دەمێك بوو ئەو پیاوەم دەناسی، لە ساتی زۆر ترسناك بە تەنیشت یەکەوە بووینە، لە یەك مەتارە ئاومان خواردۆتەوە، بە سەری سێ پەنجە وردکە نامان لە نێوان خۆمان دابەشکردووە، لە بن یەك بەرد پشتمان بە پشتی یەکتر داوە و بە یەکەوە

لەبەر گوللە و ساچمە خۆمان نەویکردووە، هەر بە تەنیشت یەکەوە تەق تەق تەقەمان لە ئەرد و ئاسمان کردووە، زۆر چیا و چۆل، دەشت و دۆل، زۆر کانی و رووبار، بەرد و دار گەواهی بە سەر لێکنزیکی کانەبی گەورە و منەوە دەدەن، جگە لەو رێیە هەزاربەهەزاریەی هەورێ دەگەیەنێتە قەندیل، لە زۆر رێوبانیدیش، هاورێ بووینە، کۆپتەر راوی ناوین، رەوە جاش دەوری داوین، سەرما تەزاندووینی، گەرما برژاندووینی، سوپاس کانەبی گەورە تۆ نەبای، منیان بە پارتیزان وەرنەدەگرت، من بە تەنێ دەمامەوە.

هات پێڵاوی تازە هات، پێیەکانم لەمێژە لە کۆنە پێلاو بەجێماون و تامەزرۆی هەنگاوی گەورەی رێی دوورن بە پێلاوی تازەوە، پێلاو چ پێلاو، هەموو ئەو بەر و ئەم بەری بەستی شەرغە و دۆلی بالیسان و خۆشناوەتی پێبکە، هێشتا هەر نرتونوێیە،کراسێکی دەق نەشکاویشم بۆ هات، لەشم بە کراسی تازە وەك بلێی تووشی گرمژە هات، دیارە لەشی من دەقی بە کۆنە کراسەوە گرتووە و رانایە لەگەڵ هی تازە، بارانگیرێکم بۆ هات، زۆر کەیفم پێهات، هەرگیز بارانگیرم نەبووە، بارانگیرێك ئیدی خەمی تەربوونم نیە، هەرچی هەوری سەر سەفین و هەورێ هەیە بە سەرمدا داکا تەڕ نابم، ئاو دانادا، گۆلمێ تایتم پەیداکرد و کۆلەپشتەکەم جوان شووشت، چلك و ژەنگی سالێکی لێچوو، کۆلەپشت ئەگەر لێتزانیبا لە بوخچەکەی دایکم پتری دەگرت، جارێك گوتمە دایکم:

ئەرێ ئەو هەموو شتە چۆن لەو بوخچەیە جێی دەبێتەوە؟

دایکم بە دەم لوولدانی پرێسکەو دەقکردنی جلکەوە گوتی:

کوڕم ئەگەر بە لێزانینەوە بێ، لەوەش پتر شت دەگرێ.

جەمەدانیەکیشم بۆ هات، دەمێکە بێ جەمەدانیم، پووزەوانەیەکیشم پەیداکرد، پووزەوانەیەك بەناو دڕکودالی دۆلی سماقوولی بکەوە، پێت تا چۆکت پارێزراوە، کیسەی خەوم کە بە بن ساپیتەوە هەلواسیبوو، بە پەرۆکی تەڕ تۆزی هاوین و دووکەلی زستانم لێ سڕی، کیسە خەوێکە

برۆ بە هەفتە لە ناو بەفری قەندیل بخەوە، مەتارەیەکی گەورەترم دیتەوە دواتر بابم کە دیتی گوتی:

خۆ ئەوە جەرە ئاوێك دەگرێ.

دوو مەخزەنیترم بە تاخمەکەمەوە کرد و بوون بە شەش، ئەوە سەد و هەشتا گوللە ئەگەر حەفتاو پێنجیەکیش پەیدابکەم، وا لە دوای دەگەڕێم، زۆر دەکا، بۆ پارتیزان کەم نیە، ردێنم پوختە تراشی، مووی سالێکی پێوە بوو، ئیدی ئەوە خەریکی خڕکردنەوەی وردەوالەین، نەینۆك، نینۆکبڕ، مووکێش...

نۆرەی تفەنگە، هێنام جوان جوان لە چاویلکە جوانتر خاوێنمکردەوە، ئێستا روون روونە، دەڵێی چاوی قرژاڵە، وا باشە بەو تەپۆلکەی سەرەوەدا هەڵگەڕێم ئەوەی لە دوورەوە لە ژنێك دەچوو کەمێك خۆی چەماندبێتەوە، هەڵگەرام کلاشینکۆف تاقیدەکەمەوە، دەمێکە تەقەی نەکردووە، مـن پێچەوانەی زۆر پێشمەرگە حەزم لە تەقەی لە خۆوە نەکردووە، بە بیرم نایە لە شەوی نەورۆز جگە لە جارێك تەقەیەکم بە ئاسمانەوە نابێ، لەو شەوەدا ئاسمان ئاگری دەگرت، دەتوانم سوێند بخۆم لە هەموو تەمەنم فیشەکێکم بە باڵدارێکەوە، بە ئاژەڵە کێویەکەوە نەناوە، لە ناو پێشمەرگان گوللە نان بە ئاژەڵ و باڵندانەوە هێند باو و ئاسایی بووە، وەك ئەوەی سەگێکی دڕت بۆ بێ و تۆش چەغەیەکی لێبکەیت و بەردێکی تێگری.

بەڵام دەستم لە مار و دووپشك نەپاراستووە، فیشەکی دنیا لە تەپلی سەری مار و کلکی دووپشك بتەقێنم، هێشتا تۆخەی ناکەم، دیتەبیرم لە بن چوندێکی قەندیلێ بە فیشەکێ تیرە مارێکی زەردم وەك عەگالی عەرەب لوولدا، وازم لێنەهێنا بیست و نۆ گوللەیدیم پێوە نا، هەر پشکێکی پەڕیە بەردێك، هێشتا دڵم دانەکەوتبوو، ئا من ئەگەر ماری زیندووم دەستنەکەوتبا، رقم بە سەر ماری مردوو دەڕشت، جارێك لە نزیك گوندی قولەهەرمێ مارێکی درێژ شتێك کورتر لە بەژنی من، ئەستوور هێندەی باسکم لە دەو رێ راکشابوو، پێدەچوو بە بەرد کوژرا بێ، کەمێك

لێدووركەوتمەوە سێرەم لێگرت، شەش فیشەكم هاویشتێ مار بووە حەفت مار، لەو دەمە وا بزانم مام حەمەدی گۆڕەشێر بوو پەیدابوو، دوای چاكوچۆنی گوتی:

خۆ ئەو مارە من كوشتبووم، دەڵێی بە ماری مردوو خۆت فێرە ماركوشتن دەكەی؟

نەمزانی چ بڵێم:

نا، مار ئەگەر بە گوللە نەمرێ، ئەگەری زیندووبوونەوەی هەیە.

حەزمدەكرد دووپشكیش هەر بە گوللە بكوژم، زۆر جار سێ گوللەم بە یەك دووپشكەوە ناوە، ئەو جارەی لە ئاقاری نازەنین لەگەڵ مام بایزی تازە لە بەهەشتەوە هاتوو، ئا، مام بایز لەمێژ نەبوو لە رووسیا گەڕابۆوە، كاتی خۆی بە تەنیشت عەولا پۆلاوە گوللەیەكی رووسی بە دەستی براكانی چەقیبووە سینگی و چووبوو لە رووسیا دەربێنێ، دەیگوت:

من ئەو چەند ساڵە لە بەهەشت بووم، رووسیا بەهەشتە من لە بەهەشتەوە هاتوومەتەوە.

لەگەڵ ئەو پیاوە بەهەشتیە لە سێبەری درەختێكی هێندەی چیایەك گەورە دانیشتبووین، دیتم شینە دووپشكێك بە قەدی پیرەداردا هەڵدەگەڕێ، بێ یەكدوو بێ ئاگاداركردنەوە، سێ گوللەم پێوەنا، بووە هەزار پارچە و هەر پشكێكی چووە جێیەك، مام بایزیش تفەنگی سواركرد، وا تێگەیشت بە سەرماندا دراوە، توورە بوو، دوای هێوربوونەوە، گوتی:

ئەگەر بۆ جاش و سەربازیش ئەوها ئازا بیت، قەیناكە .

لە زاری پۆلاوە سەرهاتێكی رووسی لە مام بایز دەگێڕمەوە، ئەوجا دێمەوە سەر خەتی گێڕانەوە:

مام بایز لە فرۆكەخانەیەكی رووسیایە، خۆی گوتەنی لە سەر رێی فرۆكە ئامێرێكی حەیابەر هەیە، هەموو كەس بۆ پشكنین دەبێت بچێتە ناو زاری ئامێرەكە، هەر كەسێك تەلە تیلێك، تەلەزمە ئاسنێكی پێبێت ئامێر

ئاشکرای دەکات، ئـێ نـۆرەی مـام بـایزە، پـێ دەخـاتە نـاو زاری ئـامێر و نایخاتێ، ئامێر دەقیژێنێ، پۆلیس غـاردەدەنە مـام بـایز، قۆڵبەسـتی دەکەن و ورد لە بنی پێی تا تەوقی سەری دەیپشکنن، چ نابیننەوە، دەیـخەنەوە زاری ئامێرەکە، ئامێری حەیابەر دەڵێی مام بایز گونی رادەکێشـێ، دیسـان یەك بە دەنگی خۆی دەقیژێنێ، ئای! پۆلیسەکان سـەریان سـووڕدەمێنێ، دێـن، نـاو زاری مام بایز دەپشکنن، لەو ساتە مام بایز گوتبووی:

چیە! من ئەسپم تەماشای ددانم دەکەن، ها، شیلەم هاتووە!

پۆلیس لە زاری مام بایز چ نابیننەوە، نە ددانی زێڕ نە هیچ، بەڵام دیـارە ئامێر شتێك لە مام بایز شکدەبات، بـۆیە بـۆ جـاری سـێیەمیش دەقیژێنـێ و نایەڵێت مام بایز بە ناو زاریدا تێپەڕێت، مام بایز دەڵێتە پۆلیسەکان:

ئەو ئامێرەی ئێوە ترسنۆکە، لە من دەترسێت.

لە بیرمان بێت، مام بایز رووسی نازانێ، دیارە وەرگێڕێك هەیە، پـۆلیس بە گاڵتەوە دەڵێتە مام بایز:

بۆ تۆ چیت تا ئامێر لێت بترسێت!!

مام بایز دەڵێت:

کوردم و پێشمەرگەی پارتی کۆمۆنیستی...

پۆلیس قسەی پێدەبڕێ و دەپرسێ:

تۆ چ جار بریندار بووی؟

مام مایز دەڵێ:

بەڵێ، ئێستایش گوللەیەك هەر لە تەنیشت دڵمە.

پۆلیس دەڵێ:

دە زووتر وات گوتبا.

مام بایز:

چوزانم ئەو ئامێرە حیزەی ئێوە لە گوللەی ساردبۆوەش دەترسێ؟!

وا بزانم ئەوە جاری یەکەم و دوا جـار بـوو گـوللە بە درەختەوە بـنێم، هەرگیـز حەزمنەکـردووە گـوللە بچێـتە گیـانی درەخـتەوە، هەرچەنـدە

گەمەیەکی خۆشیشە، دەبێ بڵێم گوللەم بە دووپشکی مردووشەوە ناوە، کانەبی گەورە جارێك لە بارەگایەکی قەندیلی دیتی و بە پێکەنینەوە گوتی:

دەستخۆش، کەم کەس بە دووپشکی مردوو دەوێرێ.

خۆزگە ئێستا، لەو تاقیکردنەوەی تفەنگدا مارێك سێ چوار دووپشك پەیدا دەبن، بۆوەی گوللەم بە فیڕۆ نەدەدا، پێشمەرگەیەك هەبوو دەیگوت:

هەر فیشەکێ بتەقێنی ئەگەر چەند دڵۆپە خوێنێك نەڕژا، ئەوا ئەو گوللەیە بە فیڕۆ چووە، گرنگ نیە خوێنەکە هی چیە، سەربازە، جاشە، مارە، کەوە، نێریەکێویە...

لەو تەڕوتووشی و ساردوسۆلە دووپشك و مار چ دەکەن، ئیدی چەند گوللەیەکم بە فیڕۆ دا، تەواوێك دوور دارجگەرەم کردە نیشانە و نیشانەم لێگرت و سێ گوللەم تێگرت، یەکەم کەمێك کورتی کرد، دووەم تۆزێك سەر، گوللەی سێیەم دارجگەرەی بە ئاسمان ئێخست، باشە، خراپ نیم، لە خۆم رادەبینم، ئەگەر جاش و سەرباز بۆم راوەستن دەیانپێکم! بەرلەوەی سێ چوار دەسڕێژیش بە ڕەوەزەکەی سەرەوە بنێم، جوان لێیمروانی نەوەك کەسێك، بزنێك، سەگێك، درندەیەکی پێوە بێ، گەڕامەوە بەرەو بارەگا، باشە تفەنگەکەم بێ کەموکورتیە، ماڵی ئەوەیە بە شانی پارتیزانەوە بێ.

ئیدی لە خۆ خڕکردنەوەداین، وا دەفتەری شیعرم بە دەستەوەیە، لە ترسی بزربوون دەمەوێ دانەیەکیدی لە سەر بنووسمەوە، ئێستاش ڕەنگی بەرگی دەفتەرەکە لە چاومە ڕەنگەکەی مۆرە، لە لاپەڕی دووەمی کۆپلەیەك لە (کاروانە)کەی ماملێی لێ نووسراوەتەوە، ئەوەشم لە بیرە ئەو دەفتەرەم کەی و لە کوێ کڕی، لە مەهاباد لە فرۆشگایەکی سەر ڕێی ماڵی مامڵێ کریم، دووسێ برادەر ویستمان بچینە دیداری مامڵێ، بەڵام هەر لە ڕێ گەڕاینەوە، بەڕێکەوت پرسیاری ماڵی مامڵێمان لە کەسێك کرد لە ماڵی ئەوان دەگەڕایەوە:

+ بۆ سەردانی مامڵێ هاتووین، بیستمانماڵیان لێرەیە.
- بەڵێ، لەو سەرە کۆڵانە بسوورێیتەوە، دەگەیتێ، بەڵام لە ماڵێ نیە.

حەیف، بە دیداری شاد نەبووین، لە فرۆشگایەکی نزیکەوێ ئەو دەفتەرەم کڕی و لە چایخانەیەك کە دەیڕوانیە باخە جوانەکەی ناو مەهاباد، دەستم بە نێرگەلەوە بوو، دەنگی (کاروانە)کەی مامڵێ هات، منیش نازانم بۆ! هەر لەوێ کۆپلەیەکم لە کاروانە نووسیەوە:

**کاروانە هەی کاروانە**
**خەمگین و پەرێشانم**
**ئارامم نیە ساتێ**
**سەفەرێکم کەوتە بەر**
**رێێ هات و نەهاتێ**
**چاوەڕێمە لە رێگا**
**با کاروان بێ و بمگاتێ**
**یارم دەگەڵ کاروانێ و**
**قەولە دوو ماچم داتێ**
**کاروانە هەی کاروانە**
**کاروان ڕۆیی بە بێ هەستی**

---

ئەگەر بیکەم، نووسینەوەم زۆرە، کۆمەڵێك وردە نووسین پێویست بە پێداچوونەوەن، خۆ هیچ نەبێ، دەبێ پاکنووسی (کچێك لە سووتاندا)بکەم، ئەو نووسینە شتێك بوو وەك شانۆگەری، باسی لە کچێك دەکرد کە لە نەورۆزی پێشتر و لە سەردەمێك کە ئاگرکردنەوە لەو رۆژەدا کوفرێك بوو بە رووی پیرۆزیی ئەتاتورك، بە جەستەی خۆی ئاگری نەورۆزی کردەوە و لەرزی خستە دڵی تورکەوە، ئەو کچە ناوێکی وەك زەکیە ئالکانی هەبوو، لەو شانۆگەریە بە هەڵە نەچووبم ئاگرێکم نیشان دابوو، ژنی کورد لەو ئاگرەیان نەدیتبوو، زەکیە ئالکان بۆ یەکەم جار ئەو ئاگرەی دیتەوە،

شتێکی وام خستبووه روو، ئیدی له سەرمه ئەو شانۆگەریه پاکنووس بکەم و ئەگەر منیش ئاوه و ئاو چووم، ئەو له کەناری یادگاری ئەگەر جوانیەکی ئەوتۆش نەبێ، بمێنێتەوه، بەو پەلەپرووزێیه ئەو هەموو نووسینه چۆن دەکرێ! وا بزانم واز بێنم باشتره.

ئێستا له هەوڵی دیتنەوەی نیوه دکتۆرێکن، پێشمەرگەیەك هەر شتێك له پزیشکی بزانێت، ئاخر بۆ پارتیزان نیوه دکتۆرێك وەك چەك و فیشەك و مەتاره و من دەڵێم جگەرەشی بەگەڵ بده، پێویسته، پێشمەرگه مەیلەو دکتۆرەکانیش لەو دەمەی ئەوێ ژمارەیان هێنده نەبوو، له ژماردنیان پەنجەی دەستێك بخەیته گەڕ، پەنجەیدی ناوێ، دکتۆر دیتنەوه پەیوەست به سەنگەره، دەڵێ:

من دەبینمەوه، نەشبینمەوه خۆم شتێکی لێدەزانم

رەنجۆ خۆی پێناگیرێ:

شیڕڕڕ، حەبی سەرئێشه ناناسیەوه، دەتەوێ...

ئومێد هەر له سەر پشت کەوت، نازانم به راستی بوو یان درووستیکرد:

سەنگەر، ئەو جارەت دێته بیر که دەتویست دەرزی له پیاوەکه بدەیت؟ دەستت چۆن دەلەرزی بڕواتان بێ، تا دەرزیەکەی لێدا من به هەردوو دەست دەستی دکتۆرا سەنگەرم گرتبوو، هەههاههه ...

ئیدی وا به دوای به دەردی ئەبوو راستی گۆتەنی کەرتکه دکتۆرێکدا دەگەڕێن.

لەو سەروبەنده نامەیەکی یەك لاپەڕەیم له رووسیاوه پێگەیشت، له بیرم نیه نامەی کامه برادەر بوو، له دێرێکی ناوەندا نووسیبووی:

..تا زووه ئەو کونه شاخانه بەجێبهێله، هەوڵده به هەر رێگەیەك بێ خۆت بگەیەنه ئێره، ئەو تەمەنه جوانه له دنیای بن بەرد و پنچکان به فیڕۆ مەده، وەره برا دنیای گەوره ببینه، خۆت بۆ به کوشت دەدەی؟ وەره لێره کەمێك بژین، بحەسێنەوه، بزانه سەنگەرێك نەما ئەوه بێنێ دوو فیشەکی لێوه بتەقێنی، وەره لێرەوه دۆراویی سەنگەرەکان جوان دیارن.

تاهو واه، من وا له چاوەڕێی هەڵاتنی پۆلێك گوڵەستێرەم تا به كۆنه سەنگەرەكان بكەومەوە، ئەویش دەڵێ چی! نا برا من رووسیام ناوێ، خولیای دیتنەوەی كۆنه سەنگەرەكان، سەنگەرە دۆڕاوەكانم له سەرە و دەبێ بیانبینمەوە، من دەزانم لێرە له دۆڕاوی رۆژ دەكەمەوە، دەزانم له دۆڕاوی رووە و سەنگەرە كۆنەكان دەبمەوە، دەزانم كەرایەتیە و گرتوومی، بەڵام دەنگێك نازانم دەنگی چیە له سەنگەرە كۆنەكانەوە بانگمدەكات، له سەفین و هەورێ و هەندرێن و پێرس و شیرین و گارە و مەتین و سووورداشەوە بانگمدەكات، دەنگێكه به ئاشكرا دەبیسترێ... نامەی برادەرەكه كه دوو مانگ و شتێك بوو بەڕێوە بوو به كراوەیی گەیشتە دەستم، ئەو دەم دەیانگوت:

ئێران نامەی دەرەوەی ئێرانی دەكردەوە، به تایبەتیش ئەو نامانەی له رووسیاوە دەهاتن.

بەڵام پێشمەرگەیەك سوێندی دەخوارد كه هەندێ لەو نامانه له پۆستی ئێرانی به داخراوی دێن، بەرێ كه دەگەنه دەستی حزب دەكرێنەوە، تا نهۆش تێنەگەیشتم نامەكان به دەستی كێ دەكرانەوە! پێشمەرگەیەكیدی دەیگوت:

حزب هەر له سەردەمی پێش گورباچۆڤدا دەژی و هەر له كەشی پارتیزانیدا هەناسه دەدا، بۆیه دەبێ نامەكان هەر هەموو نامەكان به بن برژانگی خۆیدا بێن و بڕۆن، من كاتی خۆی هەر نامەیەكم بۆ ماڵەوە دەنارد، حزب بۆی دەپێچامەوە، هەر نامەیەكیشم بۆ دەهات حزب بۆی دەكردمەوە و دەیگوت: هاوڕێ بیده من تۆ ئەزیەت مەكێشه!

سەنگەر وای وەڵام دایەوە:

گورباچۆڤ لەوێ، بەڵام ئێمه ئێستا وا دەچینەوە ژیانی پارتیزانی پێچانەوە و كردنەوەی نامه به دەستی حزب ئاساییه.

رەنجۆ به پێكەنینەوە:

ئاگاداربن سەنگەریش حزبه!

نازانم چۆن بوو بۆ فشه هەڵمدایێ:

پیاوم دەوێ نامەی من بپێچێتەوە و بکاتەوە.

سەنگەر بە شێوەیەك پێکەنین گرتی لە سەر پشت کەوت:

ئەوجا چ حزبێك لە نامەی تۆ تێدەگات، هەمووی شیعر و...

نامە نامەم پێدەنووسێ، لە باسی حزب و ئێران و نامە خولیای نامە نووسین کەوتە سەرم، دێتە بیرم ئەو رۆژە شەش حەفت نامەم بۆ برادەرانی رووسیا نووسی، بۆ دیار، هەندرێن، سورخی، نەژاد، باخەوان، ئاوات، هۆگر، هێشتا هەواڵی سەرگومبوونی هۆگرم نەزانیبوو.

ئەو کورە کە لەگەڵ مەلا جەلال هاوڕێی رێی رووسیا بوون، لە پڕ لە دەو ئاوی ئاراس دیار نامێنێ، دیارە ئاو نەیبردووە چونکێ ئاراس لەو وەرزەی هۆگر لێی پەڕیوەتەوە ئەوە نەبووە کە پیاو ببات، ئەو جێیە وەك باس دەکەن هەڵدێریش نیە تا گومان بۆ هەڵدێران بچێ، لێرەواریش نیە، لە پاسەوانی سەر سنوورانیش دوورە، جێگەیەکە دەڵێن لەوەتەی هەیە کەسی بە ئاودا نەداوە، کەسی هەڵنەدێراوە، کەسی گورگان خوارد نەکردووە، کەسی رادەستی پاسەوانان نەکردووە، جێگەیەکە خوێنی مرۆڤی نەدیتووە، ئەدی هۆگر چی بە سەرهات! زەوی قوتیدا، ئاسمان هەڵیکێشا! کەس نازانێ، دەڵێن مەلا جەلالیش حەپەساوە و چ نالێ، من ئەو هۆگرەم چەند جارێ دیتبوو، زۆرم خۆشویستبوو، نامەیەکم بۆ ئەویش نووسی، ئێستا نامەکان ئامادەن، پێشەوەی بەڕێبکەوین بەڕێیان دەکەم.

لە سەر رۆیشتنین، هەر دیتت کۆڵەپشتمان لە پشتێ کردو دەستی ماڵئاواییمان بۆ ناوزەنگی ماڵ، ماڵی پێشمەرگە هەڵبڕی، ئێستا لەو دەمی ماڵئاواییە، ناوزەنگ خەریکە سیمای ژنێکی بە تەمەنداچوو وەردەگرێ، ژنێك هەوکی پڕ گریانە، هەنسك دەدات، هەر دیتت لە بەڕێکردنی کورەکەی لە پرمەی گریانی دا، ئەو ژنە تا دێ سیمای لە سیمای دایکم دەچێ، سالانی شووم بینایمی پەرتەکردبێ، ئەو رۆژەی دایکمم جێهێشت، سیمای زۆر لەو ژنە دەچوو، لە ناوزەنگی ژن دەچوو، لە بیرمە

که پشتم له دایکم کرد و ڕێی چیام گرت، هەستمکرد کەزیی دایکم له پێم ئاڵاوە، بەڵام هێزی چیا بەهێزتر بوو له هێزی کەزی.

ئێستاش دەترسم ناوزەنگ کەزیەکانی بڵاوبکاتەوە، سرووشتێکی له سرووشت سەیرترم هەیە، ڕەنگ نیە خوو بە جێیەکەوە بگرم، لێنابمەوە، دەبێتە دایکم و دەستبەرداری نابم، چەندی زووتر بەڕێکەوین درەنگە، دەترسم سیمای گریاویی ناوزەنگ کە هەر کتومت سیمای دایکمە، بمگرێنێ و ئیدی ڕێی پارتیزانی دانەگرم، دەبێ ڕەنجۆ بووبێ سیمای منی خوێندەوە و گوتی:

ناوزەنگ له رووسیای کردی، له پارتیزانیشت دەکات.

گوتم:

نا، ناوزەنگ له دوورکەوتنەوەی کردم، بەڵام له نزیکبوونەوە، نا.

ئیدی ئەوڕۆ سبەی بە ڕێی نزیکبوونەوە شۆڕدەبینەوە و گیرنابین، تا کۆنە سەنگەرەکانی هەورێ و سەفین گیرنابین و لەوێوە له شەوەزەنگی ئەو شاخ و دۆڵ و پێدەشتانەوە پۆلێ گوڵەستێرە هەڵدێن و هەڵدەبنەوە، ملازم شێرزاد گۆتەنی:

وڵاتی بە ئەنفالچوو ڕووناك و ئاوەداندەکەنەوە.

سەنگەر دەیگوت:

با زوو بڕۆین قۆدیە گۆشت، گونیە ئاردەکان بیبینەوە.

ئومێد شیرێکی لێبەردا ویستی بڵێ، ڕەنجۆ له جیاتی وی گوتی:

پێتوایە ماون؟

سەنگەر:

وەهام تەقەت نەکردوون، بیبنرێنەوە، هیچ جاشێك نایبینێتەوە

ئومێد:

کوڕە هەی کەرماکەر، خۆ ئێستا بوونەتە ژەهر، هەر بۆنیان بکەین دەتۆپین.

ڕەنجۆ:

بەر کیمیای ئاسمانیِ نەکەوتین، دەیەوێ بە کیمیای قۆدیە گۆشتی بن عەردی بمرین.

سەنگەر:

بڕواتان بێ، بەڵایان نەگەیشتوتێ، جێگەیان نییە، ساردە، دڵنیام وەك خۆیان ماونەتەوە.

ئومێد بە پێکەنینەوە:

لە ناو بەفری قەندیل هەڵیگرتوون.

ڕەنجۆ:

نا، لە ناو بەفرگرەکەی نەنکی..

لەو دوورەوە چاوم لە سەر ئەو جێیانەیە کە ئازووقەیان لە خۆیاندا بۆ پێشمەرگە شاردۆتەوە، پاراستووە، لەو باوەڕەم ئەگەر بە تەنێش بم بە یەکە یەکەی ئەو جێیانە بکەومەوە، بە هەڵدانەوەی بەردێك لە سێبەر، بە هەڵکەندنی بن گابەردێکی نسێ، بە لادانی پنچکێکی زاری کونێکی تەلانێکی عاسێ، ئارد و نیسك و نۆك و قۆدیە گۆشت و ئاوەتەماتە و شەکر و چا و خوێ دەبینمەوە..ئاخر...

+ هاوڕێیان، تەواو سبەی دەڕۆین.

- بەراست؟

+ سبەی زۆر زوو بەڕێدەکەوین.

ئامادەین، ماڵئاوا ناوزەنگ، هەر ئەوڕۆ لێرەم، ڕەنگە ئیدی نەتبینمەوە، هەورێ و سەفین هاتین، کونە گورگ و دەعباکانتان بۆمان بکەنەوە هاتین، سەرما وسۆلەتان کەم بکەنەوە هاتین، وەك سالانی پێش ئەنفال بمانگرنەوە، هاتین، پۆلێ گولەستێرە هەڵدێن.

هاهێ هههاااااا وااا ههێ ئا ئائا ئۆئۆ هیییی

+ چیە؟ چ بووە؟ چ قەومایە؟

- رانیە...

+ چی؟

- ئازادە.

+ بە ترومبێل دەچینەوە.

## لە هەر نیشتنەوەیەك
## جێ باڵێك لە یادەوەری

**مووڕتکە**

ئێرە مووڕتکەیە، بەڵام نە مووڕتك نە هیچ درەختێ نابینم، نازانم تەور چەپ و راست بە ناویان وەربووە، یاخود ئاوری شەڕ گەیشتووە و سووتاندوونی! دووریش نیە لە بنی لە درەختێکی بە خۆیەوە نەدیتبێ، وەك زۆر گوندیدی ئاشنای سێبەر و بەر و کەسکایی درەخت نەبێ، لەو دەشتی هەولێرە زۆر گوند هەیە لە گەڕەکێکی شار بە ئاوترە، کەچی دەڵێی لە بیابان هەڵیانداوە، ئەو خۆشناوەی قەرتاڵەکەی وا بزانم ترێ بوو دەیگوت:

بە چاوی گورگ چاو بگێڕی، بۆ هێستر بەستنەوەش درەختێك نابینیەوە.

مام عجیلیش کە بە دەگمەن نەبا، تفەنگەکەی یان لە شان بوو یان لە سەر چۆکی، دەیگوت:

لەو دەشتە بۆ تفەنگ پێوەکردن، لقە دارێ نیە.

رۆژ ئاوابووە، زەردەی ماوە، پێشمەرگە لە پشت گوند لە ناو پووشوپەڵاش خۆیان حەشار داوە، ئەوشۆ شتێکیان لە چاوە، ئەگەر چ روونەدا، خۆ بە مۆڵگەیەکدا دەدەن و رەنگە نەخش بێنن، هەوکە مێوانی گوندن، دوو دوو بە سەر ماڵاندا دابەش بوون، لە هەندێك ماڵ مێوانی خوێن شیرنن، لە هەندێ ماڵیش تاڵ تاڵ، لە تامی گووژارک. تاڵترین مێوان.

دەبێ هەڵەیەك لە نەخشەکەدا هەبووبێ، یان دواتر تێکەوتبێ، نا، ڕووداوێك لە دەرەوەی نەخشە ڕوویدا و نەخشەی تێکوپێك دا، باش بوو تێکچوو، دوور نەبوو تێدا بچم، یان دەستم بە خوێنی جاشێك، سەربازێك سووربا، دواتر، دوای چەند شەوێك پێشمەرگە کەمێك لەولاتر، کانەبی گچکە گوتەنی:

نەخشێکی هێنا، مێژوو ئەگەر ناکەس نەینووسێتەوە، لە لاپەڕەیەکی خۆیدا جوان دەینەخشێنێ.

من لەوێ نەمابووم، هەڵفڕیبووم، دەزانن لە کوێ نیشتبوومەوە!؟

**ئاخوڕە**

ئەها، بەیان ئەنگوت، لەو بڵندایيە، لەگەڵ نیشتنەوەی من، بەیان ئەنگوت، وا بەو لێژاییەدا لێژدەبینەوە، ئەبوو ڕەشا دەناسمەوە، لە پێشە من لێژدەبێتەوە، پێی ڕۆیی، خۆی بە لقە دارێ گرتەوە، وەبیرمان بێ، لەو ناوە چەند بنە دارێك بە پێوە مابوونەوە، هێمان بۆ گڕی جەنگ نەنووشتابوونەوە.

ئێرە ئاخوڕەیە، ڕێی مووورتکە بۆ ئاخوڕە بە ترومبێل هەر بایی داڵغەیەکی کورتی منە، بەڵام بە پێی پێشمەرگە کاتژمێرم نەگرتەوە، نەمزانی چەندە، پێشتر لە بابمم بیستبوو کە:

ئاخورە لە (ئاخوڕ)ەوە هاتووە و خەڵکی لایدە ئەو ناوەیان بە سەردا بڕیوە، بەوەی کە ئاخوڕی زۆریان لەو جێیە دیوە، ئاخوڕی بەرزە و ڕەشەوڵاخ، ئاخوڕی ڕەشیان و سپیان...

هەوکە ئاخوڕەی پڕ ئاخوڕ تاکە ئاخوڕێکی نیە، بێ ئاخوڕ، بێ کا و جۆ، لە دەو بیرە ئاوەکانی کۆڵێکی ئاو نابینرێ، ئاخوڕە چ گوندێکی نا گوندە! نە قۆڕەی چێڵێ، نە قاڕەی بزنێ، نە حیلەی ماینێ، نە زەڕەی کەرێ، نە قووقەی کەڵەبابێ، نە گارەگاری مریشکێ، ئاخوڕە چەند نا گوندە، نە کوندە و کوندەڵان، نە کۆڵێتی مریشکان، چەند ناگوندە! لە

وەرزی دۆ لە ئـاخورە کـۆتکە دۆیەك دەسـتناکەوێ، دوو سـەگە کلـك لە سەرپشتەکان لە وەڕین نـاکەون، پیاوێـك کە کـۆڵێکی گەورەی لە پشـتێیە، بەڵام رەنگە سووك بێ، کلاشینکۆفێکی قۆنـداخەداری بە شـانەوە، لە سـەر رۆیشتنە، دەڵێ:

دەمێکە ئاخورە بێ ماڵاتە، ئەوەی هەبـوو، سـەربازی عـارەب بە تـاڵان بردی، تەواو ژیان لێرە نەما، گوند سەری خۆی هەڵدەگرێ.

ئەبوو رەشا لێپرسی:

تۆ بۆ کوێ؟

کابرای کۆڵ لە پشت:

قوزی داکی عارەب

ئەبوو رەشا بە کوردیەکی خۆش و پێکەنیناوی:

من عوربی، تۆ قوزت داکم چوو.

کابرای ئاخورەیی:

تۆ عارەب نی.

ئەبوو رەشا بە پێکەنینەوە:

وەڵلا من عەرەب.

کابرای تفەنگ لە شان:

باشە دەچمە قوزی داکی سەدام، خۆ ناڵێی سەدامم.

ئەبوو رەشا:

نا، بچوو، بەس دربالەك، لە رێی قوز داك سەدام جاش مەوجود.

کابرای کۆڵ لە پشتی تفەنگ لە شانی ئاخورەیی دەستی لە ملی ئەبـوو رەشا کرد و بە گریانەوە رۆیشت.

هێشتا لە ئاقاری ئاخورەین، دەنگی فڕۆکە دێ، دەبێ خۆ بشارینەوە.

**باواجی**

سەرهەڵبڕە،(باواجی)یە، دیوی لای شاری دیار نیە، بەڵام دیـوی دۆڵـی،

دۆڵی سماقووڵی لە بن سێبەری چەند پەلە هەورێ، لە بەهاردا ڕاکشاوە، ئەو تەنکێشەی باواجی کە لەمنەوە جوان دیارە، لەو بەهارەدا دەڵێی کەوێ کەسکەکەی نەنکمە بە سەر ڕستەوە.

کەوێکەی من تیلمێکە لە باواجیم هەڵبڕیوە.

ئەو ڕستە شیعریە هی نەنە ئایشەی نەخوێندەوارە، پتر لە بەهاراندا دەیگوتەوە، نەنکم ژنێکی باواجیی بوو، دەیگوت:

من کۆیی نیم، باواجییم.

دایکم زۆر جار دەڵێ:

نیوەی باواجی هی باپیری من بوو، بەڵام لە بن دەستیان دەرهێنا و ئێستا جێی گۆڕێکیشمان لەوێ نیە.

تۆپێك منی هێنایەوە ناو پێشمەرگە، دەنا لە سەر دەرگای ماڵێ لە نێوان نەنکم و دایکم دانیشتبووم، بیرم لە نیوەی لە دەستچووی باواجی و کەوێی باواجی دەکردەوە، من وام، هەر جێگەیەك ببینم یان ناوی بێ، ئەگەر لە منداڵی دیتبێتم یان باسیان کردبێ، یەکسەر دەگەڕێمەوە منداڵی.

تۆپ، تۆپ، دیسان تۆپ، ڕێی پێگۆڕین تۆپ.

ڕووە و کەندەکە شۆڕبووینەوە، باواجی بزر بوو، تۆپ نەیهێشت تێربم لەو جوانیەی باواجی کە لە کەوێکەی نەنکم دەچوو، کۆپتەریش گەیشت، زرمەزۆڕە، ئیدی باواجی هەر نیوەی نا، هەمووی لە دەستچوو، لە بیرمە حەمەی ئایشەگوڵ دەیگوت:

ڕۆژێك دێت لە سەری باواجی خانووێك چێدەکەین، جار جارە لە بەهاران لێی دەمێنینەوە، سەرهاتی ڕۆژانی پێشمەرگایەتی تێدا دەگێڕینەوە.

بەڵام ساری دەڵێ:

لە خەونێ!

ساری پێشمەرگەیێ بوو، کەمدوو، هەرچی دەگۆ، دەهاتە دی.

**کانی شیلانە**

مانگەشەوێکی هاوینیە، لە دوورەوە جاش و سەرباز لێکدی

جیـــادەکریتەوە، تینـــویتی نەبـــا، لەو ســـەر کـــانیە نەدەنیشـــتینەوە، لەگینە(شۆڕش)ێکی خۆشناویی بووبێ، گوتی:

ئەوەش کانی شیلانە، ئای چەند تامەزرۆتم.

ئێـرە کـانی شـیلانەیە؟ زۆرم خـواردەوە، بەڵام نەگەیشـتە زگـاوبوون، مەتارەکەم پڕ کرد، بە راست ئەوە کـانی شـیلانەیە؟ پێشـتر جارێـك کـانی شیلانەم دیتووە و ئاوم لێی خـواردۆتەوە و تێـر شیلانەکانیشـم بـۆنکردووە، بەڵام دەڵێـی گـۆڕاوە! نـا، ئەو کـانی شـیلانەی مـن لە بەر تیشـکی خـۆر سـەردانیم کـرد، کـانی شـیلانەی بەر تـریفەی مانگەشـەو نـیە، پێـدەچێ ئەودەمەی مانگ بە سەر جێگەیەکـدا هەڵـدێ، هەنـدێ سیمای رۆژ و بەر خۆری لێبکاتەوە و سیمای تریفەیـی بـداتێ، بە شـێوەیەك چـاو بە سـانایی نەیناسـێتەوە، (ئازاد)ێـك لە تەنیشـتمە، بە ئەسـپایی هەر ئەوەتە دەبیسـتم، گۆرانی دەڵێ:

**کانیەکی روونی بەر تریفەی مانگەشەو**

**لە بنیا بلەرزێ مرواری زیخ و چەو**

)کامەران)ێك دەڵێی بۆ من قسەدەکات:

ئەو رێگایەی بە شەو پێـدا دەڕۆی، کـاتێ بە رۆژیـش بە هەمـان رێگـا دەڕۆی، زۆر جیایە، هەر ئەوەتە دەیناسیتەوە، بە پێچەوانەوەش.

کوڕێك لە یادەوەریمدا نە رەنگی ماوە نە ناوی، بەڵام ئەو رستـەیە وەك خۆی لە گوێم دەزرینگێتەوە:

دەڵێی رێت هەڵە کردووە، بەوە خۆت دەپەڕێنیتەوە، چاوساغ!

لەو رستە یادەوەریە، تەنها وشەی (دەلیل)م گۆڕی بە چاو ساغ.

کامەران لە دڵەوە و بە دڵنیاییەوە دەڵێ:

لە هەمـوو جێـیەك بـزربم، لە سـەفین و ئاقـاری سـەفین نـا، دەزانـم لەو سـەفینە چەنـد کـانی و تەڕایـی هەیە، چەنـد رێ و رێچـکە هەیە، چەنـد گابەرد و بنەدار هەیە، چ رەوەزێ ناوە ناوە تاوێری لێـدەبێتەوە ، تـا بـك دۆڵێ گیرنابێ، جێی تەمۆخ و بەردەستێیانیش پێـدەزانم، دەزانـم لە نـاو چ

پووشوپالاشی چێنکە هەیە، چەند گوڵی بێ بۆن و هی بۆندار هەیە، دەزانم سیپەی راوچیان لە کوێیە و لە کوێ چەشکە رۆدەکەن، رێ نیە رێم پێنەکەوتبێ، لە تاریکەشەوی بارانـاوی بە هەموو ئەو جێیانە دەکەومەوە، لە بن بەفرێ، بە وانە و بەو جێیانە دەکەومەوە.

یەك یەك، بە دووی یەکدا، دوور لە یەکتر، بە بناردا خۆش خۆش دەڕۆین، لەوانەیە پێشمەرگەی بەر تریفەی مانگەشەو ئەگەر لە تەلەفزیۆن نیشانبدرێ، لە چاودا جوان خۆ بنوێنێ، من لەو بنارە تریفەییە، لە گڕ وێنەیەکم، دەمەوێ بە وشە بیکێشم، وشە لە پێشمەرگە یاخیترە، دەستەمۆ نابێ، دەسرێژەك هێنامیەوە ریزی پێشمەرگان، چەند دەسرێژەك رۆیشتنی پێشمەرگەی پساندەوە، خۆم داوەتە پەنای بنە دارەك، چاو لە بەرد دەگێرم، نـابینم، تەقە گەرمە، هی ئەوە نیە، وا بمێنیەوە، دەبێ دەستبکەیتەوە، تەقوهۆڕە، چارەگێکی نەبرد، دەرچووین، لە بەختی من، ئەوەی نەخشەی بۆسەکەی کێشابوو، یان نەزان بووە یان نەوێرۆک.

ئەوجارەش هۆیهامان لە مردن کرد! کانی شیلانە، هەمیشە بە گوڵ و ئاوەوە، بە وێنەی شووشە گوڵاوێ، لە سەر سینەی دیوی نسێی سەفینێ بتبینم.

## ماکۆك

گۆتەکم بیستیە، نازانم کێ دایڕشتیە:

سەفین بە هەر لایەکدا هەڵتدا، هەڵدانەکە حێل بێ یان هێدی، چیایەك دەتگرێتەوە و لە دەشتایی و دۆڵ ناکەویەوە.

ئەو گۆتە بۆ من راستکەوتەوە، لە سەفینەوە هەڵفڕیم، لە لاپاڵێك نیشتمەوە، گوتیان:

سەرهەڵبڕە، ئەها ئەوە چیای ماکۆکە.

لە سەفینەوە لۆ ماکۆك تەنها دوو رێ هەیە، رێی سێیەم ئەگەر هەشبێ بە خەیاڵدا خەیاڵ و خەیاڵ دەڕوات، ئەو دوو رێیە یەکیان رێی

پێشمەرگەیە، ئەویدی ڕێی فڕۆکە و کۆپتەرە، کۆپتەر تا دەیگاتێ خەوەنووچکە دەباتەوە، بەڵام پێشمەرگە ئەگەر مەتارەکەی پڕ و لە کوڵەپشتەکەشی چەند نوردووە نانێك و دوو مستە قەسپ هەبێ، ئەوا ڕەنگە لە ڕێیێ هەر جارێك دەست بە ئاو بگەیەنێ، مام مەجیدی برا گچکە بە دەنگی نزم بۆ یەك دوو پێشمەرگەی دەگێڕایەوە:

بەو دەستنوێژەی لە کانی شیلانەی سەفین هەڵمگرت، لە بناری ماکۆك نوێژم کردووە، دەستنوێژ سووك بووبوو، بەڵام نە شکا.

مام بایزی برا گەورە بۆ گوێی لێنابێ! پفێك بە دارجگەرەکەیدا دەکات، گوللەی دەمانچەش هەر هێندە تۆز و خۆڵە بەرزدەکاتەوە:

مەجە، بیبڕەوە، زۆری نەماوە منیش باوەڕبکەم!

حاجی بەختیار دەڵێ:

دوای رزگاری و چوونەوە، پێویستە مام مەجید ببێتە سەرقافڵەی حاجیان.

]بەڵام دوای هاتنەوە، لە سەروبەندی گرانیەکە من بە چاوی خۆم چەند جارێ مام مەجیدم لە کۆلانان بە دوای ترومبێلی زبڵڕێژەوە دیت[

دەستەیەك پێشمەرگەی هەتاوگەستە بەو دەمەو عەسرە هاوینیە دەڵێی قەتێن بە ماکۆکەوە، هێند خۆیان داوەتە تاو، ڕەنگی قەتێیان گرتووە، هەر بە ڕاستی لە چاوی منەوە زۆر لە قەتێ دەچن، مام هیدایەت کە تەمەنێکە پێشمەرگەیە، زوو فەرمووبووی:

خودا ئەگەر لە پیاو بگۆڕێ، دەبێتە پێشمەرگە، ئەگەر لە پێشمەرگەشی گۆڕی دەبێتە قەتێ.

جێیەکەمان بێ داروبار نیە، بەڵام دیوی سێبەری دار قەرەقاج، لە دیوی هەتاوەکەی گەرمترە، کەم مەتارەش ماوە چۆڕبڕ نەبووبێ.

لێرەوە، لەو دوورەوە، لە دووربینەوە، بێتواتە لە چەند هێشووە ترێیەکی ڕەشی خۆڵاویی ناو قەرتاڵە دەچێ، ئەرێ چی وای کرد بێتواتە لە بۆڵووە ترێ بچێ، حەزی چوونە ترێ!

تینویێتی ئاوی سەندووە، ماکۆکیش هێشتا زۆری ماوە رۆژی لێ ئاوابێ، تا ماکۆك نەچێتە باوەشی تاریکیەوە، بێ ئەو چەند بنە دار و گابەردە ماڵی پێشمەرگەیە و بۆی نیە پێ ئاودیوی دەرێی ماڵ بکات، ئێرە خوا دەزانی چاوی چەند جاش و سەربازی لە سەرە، خوا دەزانی لە ناو سێرەی چەند تۆپ و دۆشکە و تفەنگە، میزی خۆمان خواردبێتەوە، تا تاریك دانێ هەر لێرەین.

حاجی بەختیار پێدەچێ زۆری تینوو بێ، بۆیە چیرۆکی رووبار دەگێڕێتەوە:

لەو پێچە بسووڕێیتەوە، سەرشاخانە، رووبارەکەیە، ئەو رووبارەی لە دڵی ماکۆکەوە هەڵدەقوڵێ، سارد سارد کەللەتەزێن، ئەو ئاوە هەمیشەییە، کانی دنیا چك بکات، رووباری دنیا وشك بکات، رووباری ماکۆك هەر رووبارە.

هاتەوە بیرم، پێشتر لە رێی خاڵێکمەوە(شەفیق) ماکۆك و کانیەکانی ماکۆکم بە شێوەیەك بیستبوو، وەك ئەوەی بە چاوی خۆم دیتبێتم، ئەو شەفیقە لە پێشمەرگایەتی کەم چیا هەیە نەیدیتبێ، ئەوە بوو کە کوڕێکی بوو لە ناو چیایان (ماکۆك)ی بۆ هەڵبژارد، بەڵام من لەو عەسرە هاوینیە، گەرما و تینویێتی ماکۆك وای لێنەکردم هیچ جوانیەکی لێ ببینمەوە، لە بەرخۆمەوە دەمگوت:

کوڕی خۆم بە بیابان ناودێربکەم، ناوی نانێم ماکۆك.

تۆخەیش وا ماکۆك کەوتە تاریکیەوە، رەنگە گوتبێتم:

ماکۆك، هەر لە تاریکی بتبینم!

شۆڕبووینەوە، گەیشتینە ئاو، دەرچووین، بەڵام بەو رێیە نا کە دەچۆوە سەر ئاوەکەی دڵی ماکۆك.

دواتر، زۆر دواتر، نە حاجی بەختیار مابوو، نە پێشمەرگایەتی، ساڵ لە وشکەساڵی وەرزەکانی دەسووڕاندەوە، سەر لە سپێدەیەك بە ترومبێل رێم کەوتەوە بێتواتە، لە چاوی من هەر لە هێشووە ترێ دەچوو، بەڵام لە ناو

قەرتاڵە نا، بە دارەوە، سەرم بە بەژنی ماکۆکدا هەڵبڕی، چ چیایەکە ماکۆك! چوومە سەرشاخان و خۆم خستە رووبارەکەیەوە، چ ئاوێکە، ئاوی دڵی ماکۆك! راستی گۆ حاجی بەختیار، شەفیقیش جواناس بوو.

**هەندرێن**

کوڕێك هەیە بە چیایەك دڵی دانەکەوت، ناوی دوو چیای لە خۆی ناوە (هەندرێن پێرس)، تێنەگەیشتم بۆ جیاکردنەوەی لە هەندرێنەکانیدی پێرسێکیشی بە خۆیەوە ناوە، یان شتێك هەیە لەو دووە کەس بەلایدا نەچووە، (ئەبوو لاوك)ێکمان لەگەڵە لە رۆژەکانی بەچیادا هەڵگەڕان، کە ئارەقە لە قوونیەوە دەهاتە خوارەوە، گوتم رۆژەکان نەمگوتە ساتەکان، چونکێ چیا هەبووە چەند رۆژی ویستووە تا لێی ئاودیو بووی، ئەوجا ئەو ئەبوو لاوکە دەست بە بنەدارێکەوە دەگرێ، بێنێ دەدات، دوو قوم لە مەتارەکەی دەدات، دوای لێبوونەوە لە لاوکەکەی، روو لە دوو چیا، بە عەرەبی دەڵێ:

پێشمەرگە دوو گون لە خۆی نێ، لەوە باشترە ناوی دوو چیا لە خۆی نێ.

دوو چیا دەڵێ:

گونم! لۆ خۆت لاوکی چیایی بڵێ.

ئەو ئەبوو لاوکە، بابی شتێکیدیە، بابی لاوك نیە، بەڵام هێند لاوکی گۆ، بووە ئەبوو لاوك، چ لاوکێکیش! هەمووی شەش (لێ) و حەفت (لۆ)یەك، وشەیدی نەدەگۆ: (( لێ لێ لێ لێ لێ لێ، لۆ لۆ لۆ لۆ لۆ لۆ لۆ)) هێندە و بەس، بەڵام ئەگەر بێ مەترسی با، هێندەی دەگۆتەوە مێشکی دەبردی، ئەبوو لاوك دەپرسێ:

ئەرێ ئەو چیایە ناوی چیە، وا نازانم لە کەنگێوە بە دەوریا خولدەخۆینەوە؟

دوو چیا دەڵێ:

ئەوە منم

ئەبوو لاوك دەپرسێ:

کام لات؟

دوو چیا وەڵامدەداتەوە:

لای گونم

ئەبوو لاوك دەیویست شتێك بڵێ، بەڵام پێکەنین رێی نەدا کەس گوێی لە وشەیەك بێ...

شێرزاد دەڵێ:

لەو خوارە کانیەك هەیە، مەتارەکانمان پردەکەین.

نەمزانی کێ بوو:

لە پێشمان کانی نیە؟

شێرزدا وەك ناولەپی خۆی شارەزای هەندرێنە دەڵێ:

نیە، هەندرێن کانی کەمە.

ئەو قسەیە منی گەڕاندەوە لای خاڵم کە چیا نەبووە شەڕی لێنەکردبێ، دەیگوت:

لە بیابان لێت بقەومێ لە هەندرێن لێت نەقەومێ، چیایەکە بێ کانی.

کانەبێ گەورە کە خزمایەتی لەگەڵ هەرچی شاخ و دونـد هەیە، هەیە و بە خـوێنیش لەگەڵ هەنـدرێن دەگەنەوە یەك، سـەیر بـوو لەو خـولانەوە هەندرێنیە لە بارەی هەندرێنەوە ورتەی لێوە نەهات.

ئۆخەیش ئاقاری هەندرێنمان بڕی و لێمان نەقەوما.

### قەڵاتی دوین لە بن درەختێکەوە

لەو جێیەی قەندیلی دەڵێنێ، قەندیلی هەورگری بە ئاسـمانداچوو نـاڵێم، قەندیلی ئاوایی دەوزێی گەورە، ئەو جێیەی کە پێشمەرگە بە شڕە بەلەمێك بادینانی بە سۆرانەوە گرێدەدا، لەو قەندیلە، لەو پنتە پەیوەنـدیەوە، تـا ئێـرە نیو شەوی پایزی ویست، لە سەر زێ بەرێکەوتین نیوە شەو بوو، ئەوە لێـرە

لەو سـەر بسـتووە، لەو بـن دارە بە تەمەنـداچووە، سـپێدەی دا، بە پێـی پێشـمەرگە نەبـا بە شـەو و ڕۆژێکـیش ئەو هەمـوو ئاقـارە نەدەبـڕا، ئاقـاری قوڕەبەگ و ڕك و هاڕەش و گڕاو و نازانم چی و چی...

سپێدەیەکی بە واتا سپێدەییە، گزنگ تاڵ تاڵ لە سەر و قـژی درەخـت ئـاڵاوە، درەختێکـی تـا بڵێـی بڵنـد و پـان و پـۆڕ، چ بە تـاکە درەخـت نەدەچوو، دەتگوت چەندان درەخت لق و پۆیـان لێکـدی ئاڵۆزکـاوە، مـام ڕەسووڵ پێشتر گوتبووی:

لە چلەی هاوینێ نیوەی خێڵی خەیلانیان لەو بن دارە دانیشن، کەسـیان لە سێبەر بێبەری نابێ و جێیەکی لە بەر هەتاو نامێنێتەوە.

ئەگەر ئەو قسـەم نەبیسـتبا، بە قەڵەمبـڕ لە قەدی نیـوە کلـۆری درەخـت نەمدەنووسـی (داربەڕووی خەیلانـی)، هەر لە بـارەی داربەڕووی خەیلانـی سەفینێکی سەر لە سەفین بڵندتر دەیگوت:

بیسـتمە لەو نـاوە داری مەسـرەتی هەیە، وا بـزانم هەر ئەو داربەڕووەیە، دەڵـێن هەر کێشـەیەك بکەوێـتە نێـوان خەیلانـی و زراریـان لەو بـن دارە دادەنیشن و دارەك بە بەینیاندا دێنن.

دەمویست بە دوای داربەڕووی خەیلانی بنووسـم (بـۆ مەسـرەتی) بەڵام قسەیەکی جاسم خەیلانی پەشیمانیکردمەوە:

کە خین ڕژا، داری مەسرەتی چی! داربەڕووەکـانیش دەبـنە تفەنـگ و بە ڕووی یەکتردا دەتەقنەوە.

داربەڕوو تـاقە دار نـیە، لە دەوروبەری هەشـت نـۆ دە داربەڕوویـدی هەڵچوونە، بەڵام لە چاو خەیلانیەکە لە بنە گـوێتی دەچـن، بـۆیە جـوانی و گرنگیی تاقەداری پێوەیە، لە چاوی منەوە هەر تاقەدارە، ئێستا لە بنە مەتارە و بە ئـاگری گچـکە چـایە لێـدەنێین، پێشـمەرگە دەبـێ بـێ دووکەڵ بـێ، دووکەڵ لە هەر جێ بێ، تۆپ دەیبینێ و دەیگاتێ، کێ بوو؟ گوتی:

ئەها لە قەڵاتی دوینەوە دووکەڵێکی گەورە بەرزبۆوە.

ئـای، چمـا ئەوە قەڵاتـی دویـنە؟ نەمزانیبـوو، لێـرەوە بە دووربـین ڕوون

دیاره، هەوە بە شەو لەو دیوەوە لە دیوی ئاوایی (دوین)ەوە، لە دیوی گۆڕستانە پڕ کێلەکەیەوە، لە قەڵاتی دوین نزیکبوومەتەوە، وەك دەڵێن دنیایەك سەرباز و جاشی بە سەرەوەیە، قەڵات بە دیوی دویندا هەندێك شوڕبیەوە، مێرگ و زەنوێرە، بەڵام بە دیوی ئێمەدا لە رووبارەوە تا سەری رژد و هەڵدێرە، کەس نایگاتێ، هەرچی پێشمەرگەیە پەلاماردەن، ناگیرێ، سێ چەکدار لەو قەڵاتەوە دەتوانن شەڕی لەشکرێك بکەن.

سەفین چاوی لە دوین بڕیوە:

ئەو قەراتە بە دەستی هەر کێوە بێ، ناگیرێ

خەیلانی دەڵێ:

ئەگەر لە تێری نان و ئاویان هەبێ و فیشەکیان لێنەبڕێ.

مام رەسووڵ ئاهێك هەڵدەکێشێ:

یەك ناپاك قەڵاتەك بە چۆکدادێنێ.

بە دیار دوینی ناو گزنگەوە، چایە دەخۆینەوە، بە هەڵە نەچووبم، کوڵەپشت جگە لە نوردووی نان هێلکەی کولاویشی تێدایە.

درەنگە، خۆر کەوت، ئەها، پشت لە دوین بە چیایەکی رکدا دەڵێی نێریە کێوین هەڵدەگەڕێن، تەق تەق، بمب بمب، دەی ئەگەر لە ئاسمانیشەوە پەلامارنەدرێن، زەوی فشەیە، ترسم نیە، ناپاکمان تێدا نیە، دیسان نیشتنەوە بە سەفینەوە و هەڵفڕینێکیتر.

## کێلەشین

ئێرە بناری حەسەنبەگە، چیایەکە پێدەچێ سەری لە لە ئاسمان بسوێ، دەڵێن سەری سەرەوەی ساکەگۆڕێکی وایە جێی چەند رۆژە جووتێکە، بیستبووم جێی پشووی کۆپتەرە، کە لە شاخ و دۆڵان ماندوو دەبێ، دەچێ لەوێ دەنیشێتەوە، پشوودەدات، خۆی پردەکاتەوە و بە ئاسمان وەردەبێتەوە، دەڵێن ئەو حەسەنبەگە بە قەد چەندان مێگەڵ بزن سەرباز و جاشی پێوەیە، ئەوەتا دوو کۆپتەر بە سەرماندا سەرە و ئاسمان سەرەو حەسەنبەگ رێیان

گرتووە، ئەها سێ کۆترەیش لە ئاسمان دابەزین، ئەگەر ماندوویتی ئاراستەکانی لێ نەئالۆزاندبم، بە ئاراستەی لۆلان باڵیانگرت، دەڵێی نیازی دڵی ئێمەیان خوێندۆتەوە، ئێمەش هەر لۆلانمان مەبەستە، لێرەوە بۆ لۆلان کێ دەزانێ چەند رۆژە رێیە، دەبێ شەو جێی هەندێ لە رۆژەکان بگرێتەوە، مالاوا حەسەنبەگ، دەمویست بە دەستی خۆم لاسکە رێواسێکی بەرۆکت بقرتێنم، با پیریش بووبێ، هەر بەتامە، بەلام تۆ بە مەرگ دەوردراوی و کەلکی نیە لەوە پتر لێتنزیکبکەومەوە، بەو دەستە بچووکەوە هی (( شەڕی حەسەنبەگ))نین، مالاوا...

بڕۆ، بڕۆ، پشوو، دیسان رۆیشتن، لادانە ئاواییەك، رەشماڵێك، شلە ساوارێك، ژاژی، پەنیر، جامە دۆیەك، دیسان رۆیشتن، رۆیشتنی پێچاوپێچ، هەوراز و نشێو، کەم راستوڕاست، لەمێژە بە ئاسماندا هەڵدەگەڕێین، بەلام بە رێیەك کە هەستمنەکرد رکیم بێتە رێ، ئێرە کوێیە؟ دەڵێی هەڵەیەك هەیە، نا رەنگە هەواڵێك رێی پێگۆڕیبین، لە بیرم نیە، نازانم چی بوو، شتێك هاتە پێشێ، لۆلانم نەدیت، بەلام لە جێیەك خۆمان دیتەوە، ئەگەر دەستی هەڵەی تێدابووبێت، حەزدەکەم هەمیشە هەڵە دەستی هەبێ و من دەست بخەمە دەستی هەڵەوە، رزگار دەڵێ:

ئێرە کێلەشینە.

کێلەشین! دەمێکە ناوم بیستووی و نەمدیتووی، کێلەشین چ کێلەشین! کوێستانێکە لە ئاسمان، لەو چلەی هاوینە تەڕ تەڕ، بەهارێکە لە جێیان لە بەهاریش بەهاری وا نیە، فێنك فێنك، شنە بایەك هەڵیکردووە، نازانم تا گەیشتۆتە ئێرە پەنجەی بە رووی چەند بەفر کەوتووە، با نەرم نەرم دەڵێی لە لاولاوە و بارێزەوە هاتووە، خودایە کێلەشین ئەو هەموو کەسکاییەی، ئەو هەموو رەنگەی لە کوێ هێناوە، ئەو هەموو گوڵەی لە کوێ چنیوە و لە یەخەی خۆی داوە، کێلەشین مێرگێکە بە ئاسمانەوە...

رەشماڵ هۆبە هۆبە لە کوێستانی کێلەشینێ، لە ئاسمانێ هەڵیانداوە، هێندە پەیوەندیان بە کێشەکانی زەویەوە نەماوە، رەشماڵنشینەك هەر لە

زارکی رەشماڵێ دەڵێ:

بەخێربێن بۆ کێلەشینێ، بڵندترین کوێستانێ.

ئازاد دەڵێ:

ئێرە بڵندترین کوێستانە؟

رەشماڵنشین:

بڵندترین کوێستانی کوردستانە، کۆچەری لە هەموو لایەکەوە رووی تێدەکەن.

دابەشبووینە رەشماڵان، ژاژی هات، هەندێك پێشمەرگە ناویان نابوو (تیئێنتی)، ئاخر هەرچیت بە سەردا دەکرد، نەدەچووە خوارێ، کە دەشچوو گەدەی سەروبن دەکرد، من چەند جارێ بە ژاژی وام لێهات، بەڵام چ دەکەی، دەخۆی ژاژیە، ناخۆی هەر ژاژیە، دەڵێی ئەو ژاژیە رەنگوبۆی جودایە لەو ژاژیانەی پێشتر لە پێشم دانراوە، ژنە قۆڵ و باسك بەفریە چاو رەژگوڵیە گەردنکێلەکە چایەی تێکرد، ئای! ئەوە ژاژی نیە، چ تامێکی هەیە! قەت ژاژی وام تام نەکردووە، سەرەتا پێموابوو، برسێتی، یان قسە خۆشی و جوانیی ژنە، ژاژیە تیئێنتیەکەی بە تام کردووە، نا، لە جێیدیش، لە سەر برسێتی و بە دیار ژنی لەوە جوانتریشەوە ژاژیم خواردووە، بەڵام هەر ژاژی بووە، دەمویست بپرسم، شێرزاد پێشدەستیکرد:

ئەو ژاژیە زۆر خۆشە، لە ژاژی جێیان ناچێ، چۆنی درووستدەکەن؟

ژنە کوێستانی وا بزانم ناوی فاتم بوو:

هەموو ژاژی کوێستانێ ئەوهایە، بەڵام ئەوەی لە جێیان لە پێشەنگۆیان دانایە، ژاژی نیە، هەر ناوی ژاژیە

بیرم نەچی لەوێ یەک دوو کەفچک فرۆشم خوارد، چ فرۆیێ!.

لە پیاوەکەم پرسی:

ئەرێ ئەو کێلەشینە، هەر ئەو کێلەشینە نیە کە حەسەن زیرەك باسی دەکات؟

پیاوەکە بە پێکەنینەوە:

دەبێ هەو بێ، گۆرانی فاتمۆکێ دەڵێی!

له رۆیشتنی هەندێك پەنیر و ژاژیان بۆ له كوڵەپشتی كردین، لەوێ بۆ چەند ساتێ هێندەی ئەو وردە گیایەی له ژاژیەکەدا بوو، هیچ واتـایەکم لە پێشـمەرگایەتی نەدیـتەوە، دەمگـوت چەنـد خـۆش بـوو کـۆچەریەك بـام، وەرزی جارێك بۆنی گەردنـی کێلگەردنێکـی وام کردبـا، چیم دەویسـت! لەوێ لە کوێسـتانی کێلەشـێنێ چەنـد تـامەزرۆبووم گـوێم لە گـۆرانی (فاتمۆکێ)ی حەسەن زیرەك با، قسەیەك لەو گۆرانیە نەکەم لە کوێسـتانی کێلەشینێ نایەمە خوارێ.

پێشـمەرگەیەك، مەیـلەو نووسـەریش بـوو، بەو بـا گـوێی لە دەنگـی حەسەن زیرەك نەبـا، جـگە لەوەش پێیوابـوو گۆرانیەکـانی زۆر قـۆڕ و بـێ واتـان، نـاوە نـاوە دێرێـك، کـۆپلەیەکی بـۆ نمـوونەی قـۆڕی دەهێنـایەوە، جارێك بەو نیوە دێرەی گرت:

**فاتمۆکێ، کێلگەردن، بەهار بڕوا هاوینە.**

گوتی:

دە لەو نیـوە دێـرە وردبـنەوە، چ واتـایەکی هەیە، کەس هەیە نەزانـی دوای بەهار هاوینە؟!

بە خۆم نەوەستام، هەڵمدایێ:

واتای ئەو نیوە دێرە بە نیوەکەیترەوە بەندە، تەواوی بکە.

گوتی:

نیوەکەیتر هەرچی بێ، ئەو نیوەیان هیچ نیە.

گوتم:

وا نیە، چیرۆکێکی ناسك لە پشت ئەو دێرەوە هەیە.

نەیسەلماند، بەڵام من پێموایە، نیوەی دووەم، نیوەی یەکەمی پڕبڕ واتـا کردووە:

**فاتمۆکێ، بۆت مردم، کوێستانمان کێلەشینە...**

تا کوێستانی کێلەشینم نەدیت، مێوانی ڕەشماڵی فاتمۆکێی کـێلگەردن نەبووم، هێندە پەلەم نەبوو لە زەردبوونی بەهار و هـاتنی هـاوین، ئـاخر تـا

هاوین نەیە، ماڵی فاتمۆکێ ناچنە کوێستانی کێلەشینێ، منیش جگە لە هەواری کێلەشینێ ڕێناکەوێ لە چ جێیان فاتمۆکێ ببینم، ئێستاش زۆر جار لە بەر خۆمەوە فاتمۆکێی حەسەن زیرەك دەڵێمەوە:

**فاتمۆکێ، کێلگەردن، بەهار بڕوا هاوینە**

**فاتمۆکێ، بۆت مردم، کوێستانمان کێلەشینە**

**مەتین**

مەتین هێمنە، لە پایزیشدا لەو دەمەی پەلکی داران بە دەست باوە پەنایەك نیە خۆیان لێبشارنەوە، هەر هێمنە، بەهارانیش کە باڵندەی دنیای پێوەو بۆ کەسکاییەکەی دەخوێنن، هەر هێمنە، هاوینان کە جارویار هوڕەبا رووی تێدەکات و تاشە بەردەکانی بە شێوەیەك داخ دەبن، پووشوپەڵاشیان بەرکەوێ گڕدەگرن، هەر هێمنە، زستانانیش لە بەر بەفر و بارانێ هەر هێمنە، مەتین لە هەر چوار وەرزەی تۆپبارانێ هێمنایەتی خۆی لە دەست نادا، من دیتمە مەتینم لە بن تۆپباراندا دیتیە، لە زەوی و ئاسمانەوە ئاگر و ئاسنی بۆ دەهات، بەڵام هەڵنەدەشاخا و هەر بە هێمنی مایەوە.

ئێرە نازانم کوێی مەتینە، لووتکەی چەندەمی مەتینە، دەگەیتە هەر لووتکەیەك، لووتکەیەکیدی لە سەر سەرتە، ئێمە هەر لە بنارین، وایە دیوی ئامێدی ئەو شارەی مەگەر کچەکانی هێندە جوان بن، ڕێدەکەین، دەستەیەکین خوا لێی گۆڕیوین، دەنا بەو زستانە کەس بە مەتین دەکەوێ.

هەورێکی هێنا، حەیدەر بە عەرەبی دەڵێ:

من بزانم ئەو هەورە بەفرێکی ئەستووری پێیە

بەرەڤان بە کوردی دەڵێ:

هێشتا زووە بۆ بەفر

حەیدەر دەڵێ:

حەفت ساڵە لە سەر چیاو ناو هەورم، لە نیازی هەور بە هەڵەدا ناچم.

یاخوا حەیدەر بە هەڵەدا چووبێ، ئاخر ڕێمان زۆر دوورە، لە ئێستاوە بەفر دابکات، ناگەینە چ ئاواییەکی بێ مەترسی، هەور یان بە دەردی

بەرەڤان گۆتی (سوپای ئاسمان)، وا دەوری مەتینی دا، دەبێ پێ هەڵێنین، ئەها هەور مەتینی داپۆشی، ئای، دەپرووشێنێ، هەوە، بەفر پرووشە دەکات، حەیدەر بە هەڵەدا نەچوو، بەفر کلوو کلوو، نەرم نەرم دەبارێ، عەردی سپیکرد، ڕێچکەکان بزربوون، ترسمان نیە، چاوساخمان کوڕە ئامێدیەکەیە، بەفر بەژنێك بکەوێ، ڕێ بزرناکات، قاسم دەڵێ:

زریان هەڵنەکات، بەفر چ نیە ، با چۆکێك بکەوێ.

ترسی زریانیش سەربار، نا، من مەتین بناسم، نایکاتە زریان و هێمنیی خۆی دەپارێزێ، پاراستی، لە مەتین دابەزین، بەفرێکە چاو چاو نابینێ، بەفر نزیکەی بستێك کەوتووە، حەفت هەشت پێشمەرگەی سپی لە ناو بەفرێ هێشتا تیژ دەڕۆن و ماندوویێتی پێی نەگرتوون، بڕۆ، بەفر لێناکاتەوە، پێشمەرگە لە ڕۆیشتن شل بووە، ماندووە، بەوەی باشە کۆڵەپشت نان و قەسپی تێدایە، بەفر لێیکردەوە، دوو بستێك باریوە، دنیا ساردە، ڕەنگە عەسرانێکی درەنگ بێ، لەوێوە تا ئێرە دوو سێ کەڕەتێ پشوومان داوە، کەڕەتێ لە بن ئەشکەفتێکی گچکە، کەڕەتێك لە پاڵ دوو سێ گابەردی گەورە کە سەریان بە یەکتر کردبوو، کەڕەتێکیش لەبن چەتری دوو بنەدار کە لق وپۆیان هەند پڕ و چڕ بوو، بەفریان دەگێڕایەوە، ئەو دوو بنە دارە لە دوورەوە لە چەترێکی زۆر گەورەی سپی دەچوون، کوڕە ئامێدیەکە دەڵێ:

زۆر نەماوە بۆ ڕۆژاوا دەگەینە بناڤێ.

بناڤێ خۆت نزیکبکەوە، ماندووین، تەزیوین، پێشمەرگەیەك بە پێکەنینەوە:

تەماشاکەن، سێ هاوڕێی تریش هاتن

ئای، خۆ گورگن، بۆچی بە دوامانەوەن! ویستم تفەنگ سوار بکەم، کوڕە ئامێدیەکە حەیف ناویم لە یاد نیە، گوتی:

نا، تەقە نەکە

قاسم دەڵێ:

دیاره ڕێی گوند پێنازانن، بە شوێنپێی ئێمەدا دێن.

+ دەبێ لە کوێوە بە دوامانەوە بن؟

- ڕەنگبێ لە مەتینەوە.

پێدەچێت ڕۆژ لە سەر ئاوابوون بێ، ئۆخەیش دووکەڵ، لە لوولەی سۆبەی ماڵانەوە، حوسێن دەڵێ:

باشترە گورگەکان بکوژین، دەنا بە ئاژەڵی گوند وەردەبن.

کوڕە ئامێدیەکە دەڵێ:

نا، بۆ سەگەکانی بە جێبێڵە.

هێشتا قسەکەی تەواونەکردبوو، سەگ وەڕی، سەگ وەڕین و گورگ دەرپەڕین، باش بوو لەبەر گورگەکان سەگ ئاگایان لە ئێمە نەما و بێ دەردەسەری سەگ، بە سەر ماڵە گەرمەکانی بناڤێدا دابەشبووین.

لە شەوی سپی بناڤێ، شەوی گەرمی بناڤێ، بناڤێی پڕ لە خۆشەویستی و مێواندۆستی، شتێك هەیە لە بیرمناچێتەوە، سەر لە ئێوارەکەی نووستم، خەونێك بەئاگای هێنامەوە، خەوم زڕا و نەنووستمەوە، لەوێ دوو کورتیلە شیعرم نووسی، دواتر بڵاومکردنەوە، لە شیعرێکیان شتێکم لە بیرە:

کپیی من و
کپیی بەفر و
کپیی شەو
لە پاڵ یەکدی ڕاکشابوون،
لە پڕ قژی گزنگ لەگەڵ دەنگی باران هات
بەفر و شەو جێیانهێشتم
ماڵیان ئاوا
لە دوای خۆیان کپیی خۆیان بۆ ڕاخستم...

## چەند کەپرێ بە کوێستانەوە

بە بـن هەتـاودا گەیشـتمە ئێـرە، هەتاوێـك گەرمیـانیش هەتـاوی وای لێنەداوە، ئەو چیاوچۆلە هاوینەکەی بۆ وا گەرمە! گەرم گەرم، جۆگەلەیەك ئـارەقەی پێرشـتم، ئەگەر کانیەکـانی رێ زوو زوو مەتـارەی بەتاڵیـان لـێم وەرنەگرتبا، وەك ئەو ئاومالکانەی ناو چەمـی هەڵپرووکـاو وشـکدەبوومەوە کە دەڵێی لە بنی ئاویان نەدیوە و ئاو نەیهێنـاون، ئێرە لە هـیچ لە دەرەوەی ئێرە ناچێ، ئێرە دۆلێکی گچکە، تۆ بلـێ دەربەنـدێکە، هەمـووی داروبـارە، چنار و سپیندار و بی و مێو، تووترك، پڕ و چڕ، سێبەر سێبەر، لە جێ جێ، جێی کەپرێکی گچکە هەتاو، لێرەو لەوێ کەپر کەپـر، بە ریـز کەپـر، ئەو کەپرانە دەبێ بـۆ گێـڕانەوەی جیقـنەی مەل بـن، نەك بـۆ سـێبەر، ئێـرە یەك پارچە جووکە و جریوەی باڵندەیە، ئێرە ئەگەر ناوی (دەربەندی مەل) بـێ، لە هەموو ناوێك جوانتری لێدێ، دەربەندی مەل کەوتۆتە نێوان دوو چیـای بڵند، لە کەلێنی درەختەکانەوە دیـارە کە چیایەکیـان زۆر بڵنـدەوە، ئێـرە لە کەلێنی گەڵای درەختەکانەوە رووناکی وەردەگـرێ، بـڕوانن، تیشـکی نـاو پەلکی داران چ تابلۆیەکی نەخشاندووە.

باوەشێك ئاو بە پێش کەپرەکاندا دەڕوات، ئاوێك دەڵێی لە کوێسـتانەوە هەڵدەقووڵێ، نەمزانـی ئەو ئـاوە سـەرچاوەکەی لە کـوێیە، لە دەرەوە ئێـرە، یان هەر لێرە، بای ئێرە فێنك فێنك دەڵێی لە سەر بەفـرەوە دێ، ئەرێ ئێـرە کوێیە؟ بە چ بزانم ئێـرە کـوێیە، ئەودەمـانێ نەمزانـی، ئێسـتا بە چـی بـزانم! بەڵام ئەگەر بمەوێت پێیکەومەوە، دەبێت بچمەوە گارە، لە بیرمە لە گارەوە رێیەك بـردمیە دەربەنـدی پەڕە کـاخەزان، کـاخەزەکە هـی کـوڕێکە نـاوی (دارا) یە، لێیم پرسی:

ئێرە کوێیە؟ ناوی چیە؟

بە پێکەنینەوە:

نابینی! ئێرە دەربەندی پەڕە کاخەزانە.

دەڵێی وایە، کەپرەکان پڕ لە کتێب و بڵاوکراوەن، پڕ لە پەڕە کاخەزن،

وا دیاره راگەیاندن لێرەیە، نازانم چۆن بوو ڕێم کەوتە دەربەندی پەڕە کاخەزان، بەڵام دیدارێکی خۆش بوو، دەبوو ئەو دیدارە زووتر با، کوڕێکی رەشتاڵە، تفەنگ بە شان، ردێنی لە سەر سینگ، لە سەرەوەی دوا کەپر، ئەو کەپرەی ژنێك دەڵێی (ئەستێرە)ەیە لە ناو جلکی پیاوان خۆی نیشاندەدات، کوڕە راوەستاوە، دیارە ئێشکگرە، دیتم ورد لێم دەڕوانی، ئەو کوڕە! وێنای دەکەم، بەڵام نایناسمەوە، ئەو کوڕە ئاشنایە، کێیە، بە پرتاو هات، منی ناسیوەتەوە، من هێشتا نایناسمەوە، بە خێرهاتنی کردم:

+ تۆ...نیت؟

- بەڵێ، تۆش...

ناسیمەوە، برادەری منداڵیم بوو، لەوێ ناوی لە خۆی نابوو(راوێژ)، گوتی:

+لەمێژە لە چیای؟

- نزیکەی ساڵێکە.

ئیدی لە دەربەندی پەڕە کاخەزان دابڕاین و چووینەوە منداڵی و بە ناو کۆڵانەکانی بەلاشاوە کەوتینە پیاسە، تۆپانێمان کرد، کەلایانێ.... نانی نیوەڕۆ نەبا هەر لە منداڵی دەماینەوە و نەدەگەڕاینەوە ناو کەپران، ئەو کەپرانەی بە راوێژەوە جوانتر خۆیان نیشاندەدا، پرسی:

+ چ دەنووسی؟

- شیعر.

داوای شیعری کرد، لە کۆڵەپشتەکەم چەند شیعرێ هەبوو، شیعرێکم نیشانیدا، تەماشایکرد، گوتی:

+ ئای من ( چلێ نێرگز)م  بە دەستنووس لای برادەرێك دیوە، چما هی تۆیە، بلاوتنەکردۆتەوە؟

- نا، بەڵام لە ئاهەنگی نەورۆز خوێندمەوە.

+ بلاویبکەوە.

- نا، ڕەنگە دەستکاری بوێ.

+ بەڵام بێنە بۆت تایپ دەکەم.

- باشە.

زانیم ئێرە بارەگایەکی هاوینیە و ڕاگەیاندنیشی لێیە، ڕاوێژ ناوی دوو سێ کەسی هێنا کە کاری نووسین دەکەن و لێرەن، ناوێکیانم بیستبوو، پێشتر چیرۆکیم خوێندبۆوە، لە دوورەوە نیشانیدام، لە ساتی چای خواردنەوە، لێی نزیککەوتمەوە و سڵاوێکی گەرمم لێکرد، باوەڕناکەم لە تەمەنم سڵاوی وا گەرمم لە کەس کردبێ، بەڵام ئەو بە ساردی وەریگرتەوە، وەك بڵێی کێشەیەکی هەبێ، هێندە ئاگای لە خۆی نەبێ، نازانم، سەلامم لێنەکردەوە، دواتریش چەند جارێك دیتم هێندە لێنزیك نەبوومەوە، ئیدی نەبووینە برادەر.

**بڕشتی نیە**

سۆسیالیستێ هەیە، دەمێکە لە زیادە دەژی، لە سێبەری سێدارە هاتۆتەوە، ئەو پیاوە نازانم کێ جەرگەی دەڵێنێ، جەرگە، بەو بێ ئیزرائیل چاکوچۆنی لەگەڵ بکات، بەڵام عەرەبێك بە بەر دەمیدا تێنەپەڕێ، لە دنیایێ کەس نیە بە قەد جەرگە ڕقی لە عەرەب بێتەوە، جەرگە گوتبووی:

ئیزارئیلیش لە تیرەی عەرەبە، بەڵام لەوەتەی لێیان دوورکەوتۆتەوە هەندێك بە بەزەییتر و جوانتر بووە..

لە جەرگەیان پرسیبوو:

بە چی دەزانی ئیزرائیل لە تیرەی عەرەبە؟

گوتبووی:

ئەو جارەی لە ژووری سێدارە بۆم هات، چەفیە و عەگالی لە سەر بوو.

نێوان سۆسیالیست و کۆمۆنیستەکان چەمێکی ئاوێتەیە، یەکتری تێدا دەبیننەوە، جەرگە لەو بەری چەمەوە دادەمێنێ، سەر دێنێ و دەبات، لێی دەبڕێ و تێی دەبڕێتەوە، باوەڕناهێنێ، باوەڕ بە چاوی خۆی ناکات، چۆن دەبێت، عەرەب پێشمەرگە بێت، دەڵێنە جەرگە:

له ناو كۆمۆنيستان كورد و عەرەب برانە.

جەرگە لێو هەڵدەقرچێنێ و دەڵێت:

بڕشتی نیە.

ئەو پیاوە هەر قسەیەکی بە دڵ نەبێت بە (بڕشتی نیە) وەڵامدەداتەوە، بۆیە هەندێ کەس بە (بڕشتی نیە) بانگیدەکەن، بڕشتی نیە، تا بڵێی لە عەرەب داخ لە دڵە، بەو بێ بە ساڵ لەگەڵ سەگ بکەوێتە چاڵێ، بەڵام بۆ ساتێ لە گەڵ عەرەب دانەنیشێ لە ماڵێ، جەرگە ناوەکەی بە خۆیەوە، یەك پارچە جەرگە، ترسنۆك نیە، بەڵام لە عەرەب ترساوە، مسی بە سەردا بتاوێتەوە عەرەب دەردەچێت، جەرگە دەڵێ:

ئیمامی عەلیش لە جێی من بێت، هەمزە پاڵەوانیش لە جێی من بێت، سمکۆی شکاکیش لە جێی من بێت لە عەرەب دەترسێت، ئەوەی بە تووڕەیی داوای ناسنامەی لێکردم عەرەب بوو، ئەوەی بە زللە و پێلەقە و قۆنداخە تفەنگ دایەزاندم عەرەب بوو، ئەوەی راپێچی زیندانی کردم عەرەب بوو، ئەوەی ئەشکەنجەی دۆزەخیانەی دام عەرەب بوو، ئەوەی بردمیە ژووری سێدارە عەرەب بوو، ئیزرائیلەکەش هەر عەرەب.

ئەحمەد عەرەب کە لە رێی تەور و داربەڕووەوە بووە برادەری جەرگە، دەڵێتە جەرگە:

جەلگە منیش عەرەبم!

جەرگە سەرەتا باوەڕی نەدەکرد ئەحمەد عەرەب، عەرەب بێت، ئاخر ئەو عەرەبە لە جەمەدانی هەرکی بوو، لە پشتێن کاوێس ئاغایی، لە قسەکردن کە کەمێك زمانی دەگرت و زمانیشی وا هەڵکەوتبوو کە دەنگی (ر)یشی دەگۆڕی بۆ (ل) دەتگوت خەڵکی خۆشناوەتیە، جەرگە تا باوەڕی هێنا ئەو کاوێسە هەرکیە خۆشناوە، عەرەبە، زۆری برد، ئەو عەرەبە دەماری تووڕەیی جەرگەی دیتبۆوە، زوو زوو دەیگرت و دەیگوت:

داکم کولدە بابم عەلەبە.

جەرگە بەوە تێکدەچوو، سوورهەڵدەگەڕا، لە چۆکی خۆی دەدا:

ئەوە چ کوردێکی کەر کچی خۆی داوەتە بابە عەرەبەکەی تۆ؟!

ئەحمەد عەرەب بە پێکەنینەوە:

نەژاد دەیناسێت!

جەرگە کاتێ زانی ئەحمەد عەرەب، عەرەبە، کەوتە دژایەتی دەست و تەوری، جەرگە دەڵێ:

هەر کاتێ دەبینم ئەو عەرەبە تەور رادەوەشێنێ و داربەڕوو وەلادا دێ، وا هەستدەکەم لە سێبەندەم دەدا، گازەرەی پشتم دەشکێنێ..

نەژاد دەڵێ:

باشە، چ کورد چ عەرەب دار ببڕێتەوە، جیاوازی چیە؟!

جەرگە دەڵێ:

جیاوازیەکەی ئەوەیە کورد کوردە، عەرەب عەرەبە، بەڵام تۆ چ لەو جیاوازیە تێدەگەیت! ئەوان داگیرکەرن داگیرکەر، هەر کاتێك لە حەمرین ئاودیو بوون و گەڕانەوەماڵی خۆیان من هیچم لە دڵ نامێنێ و برایەتیان دەکەم.

جەرگە سەرهاتی زۆرە، دەڵێن بە قەد ژمارەی ئەو عەرەبانەی لە تەمەنی بینیونی لە بارەی عەرەبەوە سەرهاتی هەیە، بەڵام کەس نیە بیاننووسێتەوە، دوا وێنەی جەرگەم لە نیگام پاراستووە، پایزە، باران بە سەر تەرمی پێشمەرگەیەکی عەرەبدا نم نم دادەکات، دارەبازە لە ڕێی گۆڕستانە، ئەوەتا جەرگە بە تەنیشت منەوە دەستی بە دارەبازەوەیە، دەبینم چاوەکانی تەڕ تەڕ، لە هەور تەڕتر، گریا، بۆ عەرەب گریا، دواتر ئەحمەد عەرەب لە جەرگەی دەپرسی:

تۆ بۆ عەرەب گریای!

جەرگە دەڵێ: داخ لەوە دەخۆم کەس تێمناگات.

**باخی ورمێ**

بە رانکوچۆخە و پشتێن و پێڵاوی پێشمەرگایەتیەوە، لە مێوانخانەی (حافز) دابەزیم، جاری یەکەممە بێمە ورمێ، بە فارسی پرسیم:

جێ هەیە؟

بە کوردی باگۆیداوە:

هەمانە.

وەك بڵێی بە سەر خۆمدا شکامەوە، ژوورەکە بە سەر شەقامدا دەڕوانێ، پێش نیوەڕۆیە، ژنی جوان بە جادەوە، ئای لەمێژە شارم نەدیوە، رەنگە رۆیشتنی شاریم لە بیرچوویێتەوە، حەزم لە پیاسەی شارە، بەڵام هەندرێن لە خوویەوە دێ، هەرێمان دایە لێرە یەکتر ببینین و بچینە ماڵی بێستوون، نابێ دەرچم، درەنگ داهات، برسیمە هەر نەهات، لە دەرگا درا، رەنگە هەندرێن بێ، لە کەپرەکەی هەورێوە نەمدیتووە، دەبێ زۆر گۆڕا بێ! بە گەرمی دەرگام کردەوە، ساردبوومەوە، کوڕێکە نایناسم، پرسی:

+ تۆ شوانەی؟

- هەوم، تۆ؟

+ هەندرێن نەیتوانی بێ، ئەو نامەی بۆ ناردووی.

لە نامەکەی شتێکی وای نووسیبوو:

داخی گرانم، تەلبەندی خووی دەرگای نەکردەوە، نەگەیشتم لە باخی ورمێ دیدارێ بیەستین، بەڵام برۆ دەڤ بێستوون و پشوویێك بدە.

ناونیشانەکەی بێستوونی نووسیبوو، چووم بێستوون و خێزانەکەیم لە گوندێکی دەوروبەری راژان دیتەوە، نازانم لە کوورە بوو لە چی ئیشی دەکرد، بێستوون کوڕە ناسکەکەی قەرەچووخ، مێوانداریەکیان کردم، گەرموگوڕ، لە بیرناچێتەوە، زۆر هەوڵیدا پتر بمێنمەوە، نەمامەوە، نامەیەکم بۆ هەندرێن لای وی بەجێهێشت، ئا، هەتا ورمێ لەگەڵم هاتەوە.

لە بازاڕی شاری سمکۆی شکاك، کێ بوو ئەو ناوەی لێنا! نەك هەر جلکی کوردی، کوردیشت نەدەدیتەوە، تەنها لە ناو تووتنفرۆش و

تەزبێحان ئەو شتانە تاق و لۆق پیرێکت دەدی بە جلکی کوردیەوە، لە جادەو فرۆشگاکانیش چەندی گوێم هەڵدەخست ئەگەر کوو دەنا گوێم لە رستەی کوردی نەدەبوو، لەوانە گەڕێ، ناخۆش ئەوەیە تۆ بە فارسی بپرسی بە ئازەریە، تورکیە، چیە! وەڵامت بدەنەوە، سەرەتا وا تێگەیشتم رقیان لە فارسیە، درەنگ پێکەوتم، حەز بە چارەی من ناکەن.

ئێ، چوومە گەرماوێکی گەرم، جلکی پێشمەرگایەتیم لە خۆم کردەوە، هێشتا لێنەبووبوومەوە، کێشەیەکی کارەبایی کەوتە گەرماوەوە و بە پرەپڕ خۆم لەبەرکردەوە و دەرپەڕیم، بۆ پشتم سەرێکم لە دکتۆر دا، نازانم کێ عێراقیان دەگوتێ، گوتی:

چ نیە، خۆی چاك دەبێ.

ئێستا بە تەنێ لە باخێکی ورمێ پیاسەدەکەم و لەبەر خۆمەوە:

هەرمێ وەی وەی هەرمێ

سینگوڵەت باخی ورمێ...

دەڵێمەوە، ئەو گۆرانیە لە ناو ورمێ چێژێکی تایبەتی هەیە، باخ پڕ لە ژن و کچی جوانە، حەیف، خۆیان وەها پێچابۆوە، چاوت بە هەرمێی بن پەلکانیش نەدەکەوت، لە باخی ورمێ جگەرە بە دەم پیاسەوە تامی میوە دەدات، ئێستا لە بن درەختێکی سەر پڕ چۆلەکە دانیشتووم، چاوم لە سەر ژنانی چەفیە بە سەرە.

+ ئەوە چ دەکەیت لێرە؟ تۆ...

-تۆ ئەبوو بەکر...

دیتمەوە، ئەبوو بەکر خۆشناوم دیتەوە، ئەو خۆشناوەم لە ساڵی دەست لە ناو دەستی نەیار لە بن قەرات لە ناو کتێبفرۆشان ناسی، زوو یەکترمان ناسیەوە، لە باخی پڕ ورشە و جریوەی ورمێ یەکترمان دیتەوە، بە خۆشناوم گوت:

پێش ناسین، تۆم لە ڕێی (گیڤارای شۆڕشگێڕ)ەوە ناسی.

گوتی:

زۆر کەس لە رێی ئەو کتێبەوە منیان ناسیوە.
گوتم:
دوای ناسین، لە رێی ((هەڵوێستی ئەدەبی)) جوانترم ناسیت.
گوتی:
وا بزانم ئەو گۆڤارە ئەدەبیە، پێویست بوو.

خۆشناو لە زێوەی بن ورمێوە گۆڤاری (هەڵوێستی ئەدەبی) دەردەکرد، یەك دوو شیعری منیشی بڵاوکردەوە، هەڵوێستی ئەدەبی وەستا و (بانگ) جێی گرتەوە، لەگەڵ خۆشناو قسەمان لە هەڵوێستی ئەدەبی و بانگ و شیعر و ئەدەب کرد، بەڵام پەنجەیەك بە لای تفەنگ و بستێك چیە بەلای سیاسەتدا نەچووین.

خۆشناو پرسی:
+تا کەی لە ورمێ دەمێنیەوە؟
- چەندی زووتر بەجێبێڵم باشترە.
+ بیری قەندیل دەکەیت؟!
- لەگەڵ شار رابێمەوە، لە چیا ناحەوێمەوە.



## وشەدان

هەنـدێ لەو وشـانە لە واتـایەک پتریـان هەیە، مـن تەنهـا ئەو واتـایەم نووسیوە کە لەو کتێبەدا هاتووە.

ئـ

**ئاوگەلە:** ئاژەڵی لە مێگەل دابڕاو.

**ئاومالک:** ئەو دار و دڕ و پووش و پەلاشەیە کە لافاو دەیهێنێ، لە دەو کەنار گیر دەبن.

**ئەزئەزی:** منانی، خۆپەرست، ئەنانی(ع)

**ئەمەک:** وەفا

ب

**بـاداک:** ئەو درەخـت و گیـایەی کە بە دار و دیـواردا هەڵـدەگەڕێن، وەک مێو و لاولاو و...

**باسک:** نێوان مەچەک و ئانیشک

**باسک:** زوورگی باریک و درێژ و بڵند

**باشار:** پێوەستان، پێوێران، خۆراگری

**باگۆ:** وەڵام، بەرسڤ

**باخۆش:** گەورە، گەشەکردوو.

**بابۆڵە:** لەفە

**بادی:** جام

**بارەنگێو:** لە دەو ڕێـی باریـک، بەرد و دار هەیە، بـاری وڵاخـی لێگیـر دەبێ.

**باوێژە:** ئەو میوەی کە با لە داری وەراندووە و کەوتۆتە سە زەوی.

**باوێلکە:** باپشیلە، پشیلۆکە، سپی و سووکە پایزان با بڵاوی دەکاتەوە

**بای وادە:** ئەو بایەی لە دوا دوایی مانگی رەشـەمێ هەڵـدەکات و بەفـر دەست بە توانەوە دەکات

**بای وەشت:** ئەو کزە بایەی کە نەرمە بارانێکی دەگەڵە.

**بای داراوس:** ئەو بایەی لە کاتی گۆپکە و چرۆکردنی دار و درەخـت هەڵدەکات.

**بای شەماڵ:** بایەکی فێنکە لە بەری رۆژاواوە هەڵدەکات.

**بایی:** نرخ، بەها. کتێبەکە بایی چەندە؟

**بایی:** بەش. ئەو ئالیکە بایی کەرەکە ناکات.

**بایی:** هێندە. بایی سەرە دەرزیەک لە تفەنگ نەدەترسا.

**بیراییر:** هەرگیزاوهەرگیز

**بریا:** خۆزی ، خۆزگە، خۆزیا، کاشکێ

**برۆکەک:** کەمێک، پیچەک

**بۆر:** پڕ، چڕ

**بەرانپیل** : بەرهەڵێنە، پەرۆیەکی گەورەیە، تەنیشتاو تەنیشت دوو لچکـی لە مل دەکری و بە سەر سینگ و بن کەلەکەی چەپتـا شـۆڕدەبێتەوە، دوو لچکەکەیتر بە دەستەوە، بۆ خڕکردنەوە و گواستنەوەی قشـپڵ و دار و درو شت بە کار دێت، تایبەتە بە ژن و کچ

**بەرێ:** بەڵام، لێ، وەلێ

**بەرێ:** پێشان

**بەدەو:** جوان

**بە دەو:** قسەزان

**بەردە ستێ:** بەردێکە بە یەکتر لێکدان ئاگری لیدەکەوێتەوە

**بەرکۆژە:** دوگمە و بەرۆکی ژنان

**بەرزە:** ئەسپ و مایین و هێستر

**بەخورتی:** بەزۆر

**بەفرخۆرکە:** بەفرێکی وردە، بەفر دەتاوێنێتەوە.

**بەکوتەک:** بە زۆر، بە خورتی

**بەهاریەند:** تەویلەی گەورەی سەر نەگیراو، لە کاتی بەهار و هاوینان ماڵاتی تێدەکرێ.

**بێ روو:** بێ شەرم

**پێن:** هەناسە، پشوو

## پ

**پایزەبرا:** ئەو هاوڕێیەی درەنگ درەنگ ببینی.

**پرزە:** تین، شنگ، هێز، تاقەت، توانا

**پنت:** خاڵ

**پەڕەتیر:** بزگوڕ، ماڵیان سووتا پەرەتیرێکان دەرنەچوو

**پەرتەک:** هێز، شنگ، تین، تاقەت

**پەلەک:** جوولە

**پەسارگە:** حەشارگە

**پەریوە:** پەراکەندە، تەرە، ئاوارە

**پشتی:** لە دوای، لە پاشی

**پوشتی:** کەسی ناکەس، حیزگەواد

**توتە:** پەنجەی گچکە

**پیرۆزەیی:** ڕەنگێکە تێکەڵەیێ لە کەسک و شین

## ت

**تانۆک:** تەیمان، پەرژین

**تاوێر:** ئەو تاشە بەرد و کەپکە شاخانەی لە چیا دەکەونە خوارەوە

**تاین :** گۆڕین

**تفەنگهاوێژێک:** ئە نێوانەی کە گوللەی تفەنگ دەیگاتێ. (نێوان جاش و پێشمەرگە تفەنگهاوێژێ کەمتر بوو.)

**تریواندن:** خەبەردانی پەنهان (دڵم تریواندی: دڵم خەبەری دا)

**تەپرەک:** خانووی بان لە پووش

**تەرە:** هەڵەتە

**تەنکێش:** لە لای تەنیشتەوە

**تەس:** داوا کردن لە وڵاخ تا پشتاو پشت بکشێتەوە.

**تەپکە:** شێوەیەکی راوکردنی باڵندەیە، سوێسکە و..... شێوەیەکی بەو شێوەیەیە: قۆرتێکی چوار گۆشەیی و چوار بەرد بۆ لایەکانی و بەردێکی پانی تەنک بۆ سەری و دارێک لە شێوەی ستوون بۆ راگرتنی لایەکی بەردە پانەکە، داروچکەیکی دوو فلیقەش لە بن دارە ستوونیەکەوە ئاسۆیی بۆ ناو قۆرتەکە، مەلەکە لە خۆشی ئەو گۆلمە دانەی لە ناو قۆرتەکە رووکراوە خۆ هەڵدەداتە سەر دارەکە، ئیدی بەردەکەی سەرێ دەکەوێ و رێی لێ دەگیرێ.

**تەژە:** کەتە، زرتە زەلام، زەبەلاح

**تەمۆخ:** شاخی داهێزراو، دەست لیدەی هەڵدەوەرێ ، زیخی بە تۆپەلە بوو

**تووک:** دووعا، نزای خراپ

**تووک:** موو

**تیتلەکناچە:** نەورەس

**تیسک:** داو، تال

**تیز:** گاڵتە

**تیرۆژ:** تیشک

**تیلەکێش:** ئەون ژنەیە لە دوای سەپان، بە قەرانگ مەڵۆ هەڵدەگریتەوە، دەیانکاتە گەلاوێژ یان گیشە

**تیختیخە:** هاندان، دنەدان

**جـ**

**جنده:** قاحپه

**جندەخانە:** قاحپەخانە

**جواناو:** ئارەقەی سەرەمەرگ

**جەنە:** غەزرین

**چـ**

**چاوە:** هۆدە، دیو، ژوور

**چاو چاو:** چاودێ، سەیری بکە

**چاڵە:** داری بە سەر جۆگەدا رایەڵکراو بۆ بە سەردا پەڕینەوە.

**چک** : وشک

**چتۆ:** چۆن، کوو، چەوا

**چتۆیی:** چۆن چۆنی

**چێتکە:** جێی کەسکایی لە ناو پووش و پەڵاش

**چەشکە:** ئەو خواردنەی نێچیروان بۆ نێچیری رووده‌کات، تا بەهۆیەوە بیخاتە داوی خۆیەوە.

**چەپارە:** پاراستن، پەنادان

**حـ**

**حالۆری:** نێری و بەران و... کاتێ حەزی پەرینی هەڵدەستێ و

**خـ**

**خەفتی:** لە خۆی خەفتی: گرنگی بە شێوەی خۆی دا، خۆی جوان و رێکخست

**خدێ:** خوو

**خۆدیک:** نەینۆک، ئاوێنەی گچکە

**خۆرەچەرە:** جوێنێکی سووکە، پتر ژن دەیدات. (دەک خۆرەچەرەت لێکەوێ)

**خۆ لە گەزدان:** راکشان لە سەر گازەرەی پشت.

**خۆلەکەوە:** خۆلەمێش، مشکی

**خوازۆک:** سەرسوالکەر، ئەو کەسەی داوای زۆر شت دەکات.

خوسار: زوقم

**خویا:** ئاشکرا

**خورت:** گەنج

**خوێڕسک:** شوێنی خوێدانی مەڕ و بزن

**د**

**دارتێلێک:** مەودای نێوان دوو دارتێل (نێوانمان هەر دارتێلێک دەبوو)

**دامیاو:** ئاویک لە توانەوەی بەفرەوە بی.

**دارماڵ:** سەرڕێژ، مشت.

**دژوون:** چلکن

**دەبێسا:** رەنگ زەرد و لاواز دەبوو، لە کورتی دەدا

**دەڤ:** کن ، نک ، لای ، جەم

**دەڕی:** دەڕیخێنێ، بە خۆدا دەکات

**دەرۆست:** دەرەقەت

**دەمدەمی:** میزاجی

**دەسکیس:** جاسووس، ئەو کەسەی رێ بۆ دز خۆش دەکات

**دەمەلاسکە:** لاسایی

**دەنا:** ئەگینا، وەرنا

**دیدڤان:** گەواهیدەر، شایەد

**دنێ:** دنیا، جیهان

**دین:** شێت

**دین:** ئایین

**ر**

**راپێچخانە: فەرمانگەی تەجنید**

**رادەست:** تەسلیم

**راوێچکە:** بە دەم بیرکردنەوە هاتوچۆکردن لە شوێنێکی سنووردار

**رکە:** قەفەز

**رکە:** لاملی، عینادی

**رەوەز:** ئەو ریزە بەرد و شاخانەی بە قەد چیاوە بە تەنیشت و سەر یەکەوەن

**رەشوێرە:** رەشۆڵە

**رەوەک:** سرک

**رەشیان:** بزن و ئەوەی لە بزنە: کار و گیسک و نێری

**رێوان:** چاودێری رێگا

**ز**

**پێ لە زگ:** مخەنەت

**زگاو:** لە سەر تینوێتی زۆر ئاو خواردنەوە تا وای لێدێ ورگت گەورە دەبێت، کەچی هەر هەست بە تینوێتی دەکەیت

**زەندۆڵ:** کەلێنی ناو تاشەبەردان و قلیشی گەورەی زەوی

**زەنوێر:** شوێنی تەڕ و سازگاری کوێستانان

**زنە :** کانیی زۆر گچکە

**زیت:** وریا

## س

**سا:** ساماڵ

**ساکەگۆڕ:** گۆڕەپان

**ساهی:** سا، سامال

**سانا:** ئاسان

**سایەقە:** لە شەوی زستانان، ئاسمان سامال بێت و سووی زۆر سارد بێت، زوقم و بەستن و زوقمی بە دوادا بێت.

( ئەگەر دەتەوێ کوردان بکەی قڕ    بە شەو سایەقە و بە رۆژ هەوری پڕ)

**سایە وشک:** دەستقووچاو، رژد، چڕدۆ، ڕەزیل

**ساوە:** ئەستێرەیەکی گەڕۆکە، عەتارد

**ساوە:** سستی، تەوەزەلی

**سپیان** : مەڕ و ئەوەی لە مەڕە: بەرخ و کاوڕ و بەران و..

**ستێ:** دش، خوشکی مێرد

**سەرقەتار:** ئەو مەلەیە کە لە کۆچی مەلان لە پێشی پێشەوەیە، بۆ کاروانیش بەکاردێت( کاروانێ وا دێ گەوهەر باریەتی خورشیدەی خاوەر سەر قەتاریەتی)

**سەرۆ:** سرووش، ئیلهام

**سەپان:** ئەو کەسەی بە داس گەنم و جۆ دەدوورێتەوە.

**سۆزڤان:** خاوەن بەڵێن، خاوەن هەرێ و گفتی خۆت

**سەرشۆرک:** گەرماو

**سەخۆڕ:** کای ناو ورگی ئاژەڵ

**سەخۆڕکە:** گوفەک، سەرانگوێلک

**سەهۆڵان:** بەفرگر، سەلاجە

**سۆنگە:** هۆ

**سەمیان:** سەرپەرشتیار (منداڵەکان بێ سەمیان ماونەتەوە)

**سەبارەت:** بە هۆی، بە سەبەبی، سەبارەت بە تۆ لەو شارە وێڵم

**سەبارەت:** لە بارەی، لە مەڕ

**سەپستێکە:** کەرویشکێکی بە غار و بە فێڵە

**سەرتا:** سەرقەرتارە، ئەو میوە باش و جوانانەی لە سەرەوەو لە بەر چاوان دادەنرێن

**سەرتلی:** پارچە تەنۆکەیە لە درووماانکردنێ لە سەری پەنجە دەکرێ، بۆوەی لە کاتی پاڵدانی دەرزیەکە سەری پەنجە ئێشی پێنەگات.

**سەراورد:** تخووب، نێوان دوو پارچە زەوی

**سەرەتی:** ئەفزەلیەت

**سەنگرانەوە:** گیرسانەوە

**سەیار:** چاوەڕوانی و هاییداریی دڵ، کاتێ کەسێک کەسێکی نزیکی بزردەبێ، دەڵێ: دڵم هەمیشە سەیارە.

**سوارە:** ئەو برە لاسکە گەنم ۆ جۆیەی دەکەویتە بەر داسی سەپان و دەکەویتە نێوان پەنجەکانی کە قەرانگیان تێدایە، بە دوو سێ سوارە دەستی پڕدەبێت و دایدەنێتە زەوی و دەبێتە مەلۆ، ئەگەر سەپانێک سوارەی گەورە بێت، دەڵێن: هەر سوارەیەکی مەلۆیەکە.

**سوێدار:** خەمبار

**سوێس:** تارمایی

**سوێرەلووک:** سوێر و تاڵ

**سوێندگر:** کەسێ بە درۆ سوێند بخوات و سوێندەکەی لێبکەوێ و تووشی شتێ بێت

**سوێ:** سوو، خەفەت، سوێ لێبوونەوە: خەفەت لێخواردن

**سوێ:** سوو، تاسە، ئارەزوو،

**سوێ:** سوو، هەوا . ئەوڕۆ سووی ساردە.

**سێیەندە:** نێوان کەمەر و سمت

سێبەندی: بێ شەرم و...

**سێوی:** منداڵی بێ دایک و باوک

**سیڤان:** چەتری بەر هەتاو

**سیپە:** بۆسەی راوکەر

## ش

**شانشین:** بانیژە، بەلەکۆن (سێوە و کاوێژاغاش ئەو وشەیان بەکارهێناوە)

**شرتوشۆی شکاند:** شەرەفی شکاند

**شلێوە:** شلۆڤە، بەفر و باران وێکڕا

**شۆنک:** ئەو کوتە دارەیە کە ژن لە کاتی کۆلکردنێ جلکی شووراوی پێ دەکوتێ.

**شەرغە:** شەڵخە، پوورەی هەنگ، ناوی بەستی شەرغەش هەر لەوەوە هاتووە

**شەپرە:** جەڵتە

**شنگ:** هێز، تین، پرزە، تاقەت

## ع

**عەرد** : هەرد، زەوی

**غەزرین:** جەنەگرتن،راوەستانی ولاخ لە شوێنی خۆی

## و

**وشت:** وریا، هەستیار

**وندا:** ون ، بزر

**وەکات:** یەکسەر، دەمودەست

## ف

**فرچک**: یەکەم قومە شیر کە لە مەمکەوە دەڕژێتە زاری زارۆی تازە لە دایکبووەوە،

**فرۆ**: شیری مالاتی تازەزەن تا یەک دوو رۆژ خەستە و پێی دەلێن ژەک، کاتێ ژەک دەخرێتە سەر ئاگرێکی کز، دەبێتە فرۆ.

**فندەگولە**: کورتە بنە، شەموولە

## ق

**قسەیتی**: راست دەکەیت، قسەی تۆیە (ئەو دەستەواژەیە لە شێوەدا وا خـۆ نیشـاندەدات کە روو لە کەسـی سـێیەمی تـاک(ئەو)ە، بەڵام لەگەڵ کەسی دووەمی تاک(تۆ)یە، تی: تۆ)

**قووچەک**: بە بەرد یان بە خۆڵ بەرزاییەک هەڵبنێی جا گەورە بێ یـان گچکە، هەرەم

**قوڕش** : کوڕیش، بۆ گازکردنی کەر و بەرزە بەکار دێ

**قونجڕکە**: د هێندەی دەنکە فاسۆلیایەکە، هەر جوار دەوری دڕکە

**قووچاندن**: هەڵاتن، جاشەکە قووچاندی

**قووچاندن**: نووقاندن، داخستن، چاوی قووچاند

## ک

**کس کس**: بۆ تێبەردانی سەگ بەکاردێت.

**کەوژ**: هێشووی ترێ بە دارەوە وشک بووبێ.

**کابۆک**: کەڤۆک

**کلکایی**: لای باریکی شوێنێکی دیاریکراو

**کەستەک**: تۆپەڵە قوڕی وشکبۆوە

**کۆتک**: تاسی لە دار درووستکراو، جـامی دار، بـادیی دار، پتـر بـۆ دۆ خواردنەوە بەکاردەهات

**کووز:** قاش

**کوشتنەوە:** سەربڕینی ئاژەڵ و پەلەوەر

**کونەڕەشە:** بەندیخانە، شوێنێکی تاریک

**کوڕی:** داواکردن لە کەر و بەرزە تا نەیەتە پێش و بگەڕێتەوە

**کوێرکێش:** ئەو کەسەی دەستی نابینا دەگرێت و دەیگێڕێ، چاوساغ

**کەپەنک:** قاپووتی شوانان. لە لباد درووستدەکرێ

**کەپەنکە:** گەنم وجۆ کە تازە دێن گوڵ بکەن

**کەروێشکە:** گەنم و جۆ و گیای رسکاو کاتێ با لێیدەدا و دەجوولێنەوە

**کەڕەپوو:** ئەو بەفرەی کە ساتی سەرماوسۆڵەیەکی بێ رەزا، وشک و مەیلەو ورد بباریێ

**کەڕەسیسە:** لە ساتی راوەستانی بارینی بەفر، بایەکە توند بەفری سەر شاخان هەڵدەگرێ و دەیخاتە ناو دۆڵ و چاڵاییەوە.

کەڕەسیسە: ئاپۆرا، خڕبوونەوەی کۆمەڵە کەسێک بە دەوری شتێکدا.

**کڕێوە:** بارینی بەفر بە باوە

**گلێرە:** بەفری زۆر ورد کە لە شێوەی تەزرەی وردیلەیە

**زریان:** بەفر و بایەکی توند بە یەکەوە، بە شیوەیەک کە بەرپێی خۆت نابینی. بە باو و بۆرانیش دێ.

**پرووشە:** وردە بەفر، نەرمە باران

**کەژۆک:** ئاوریشمی خاو

**کەسیرە:** باڵدار کاتێ لە سەرما خۆی کورژ دەکاتەوە

**کەما:** جۆرە کوارگێکە

**کەمروو:** شەرمن، رووتەنک

**کەمەند:** ئەو پەتەی کە بۆ گرتنەوەی راکردوو بەکاردێت

**کەمەندهاوێژ:** ئەو سوارەی کە پەت هەڵدەدات بۆ گرتنی راکردوو، یان نەیار

**کەوبوار:** ڕێی کوێستان و گەرمیانکردنی کەو.

**کتک:** پشیلە

**کەرانە:** ئەو بڕە پارەیەی کە لە کاتی پەژیوانبوونەوە لە سەودا و تێکەولێکە، کڕیار دەیداتە فرۆشیار

**کەڤۆک:** باڵدارێکە شتێ لە کەو گچکەترە

**کەوچکە:** گۆمیلکەی گچکەیە، شوێنی دەستنوێژ هەڵگرتنە لە مزگەفتێ.

**کەوە ڕۆژ:** ڕۆژێکی هەوراوی، ڕۆژ(خۆر) ناوە ناوە لە کەلێنی هەورانەوە دەرکەوێت و زوو بزر ببێتەوە

**کۆنێ:** حیزی پێشان، کاتی پیاوێ بە پیاوێ دەڵێ: کۆنێ. واتە پێشتر شتێکی وای لەگەڵی هەبووە

**کێماڵ:** گەرانی بە کۆمەڵ، گەڕانێکی ورد بۆ دۆزینەوەی شتێک

## گ

**گزرە:** داری پارچە پارچەکراوی ئامادەکراو بۆ سووتان

**گۆتیار:** قسەگێڕەوە

**گڤەم دێ:** زۆر باشم

**گوڵەستێرە:** ستێرۆک، کلک بە ئاگرۆکە، فرندەیەکی گچکەیە، شەوان دەبریسکێتەوە

**گوڕاح:** کەیف، میزاج

**گورگەزێ:** باران و تاو پێکەوە

**گورگەمێش:** ئەو سەگەی ناپاکی لە شوان و خاوەنەکەی دەکات، دەسکیسی بۆ گورگ دەکات و دەیهێنێتە ناو مێگەل. سەگی دووڕەگ لە گورگ و سەگ

**گۆری:** بەلاگێری، قوربانی، سەدەقە

**جانگۆری:** گیانفیدا، خۆبەختکەر

**گوێتی:** درەختێکی کورتە بنەیە، لە کوێستانی شین دەبێ

**گۆزەگۆز:** جێگۆڕکێ

**گۆرانەڕێ:** ڕێی دزان، ڕێیەکی بزر، لە بەر چاو نەبێ

**گەڕناس:** ئازا، بوێر، مێرخاس

**گەناور:** جانەوەری ورد، حەشەرات

**گەور:** ڕەشتارە، ئەسمەر. بەڵام لە هەندێ جێ بە سپی ڕەنگیش دێ (یار یار گەورێ...)

**گەوە:** بەرزایی، هەورازێک سەخت نەبێت

**گەرمک:** ئەو گۆماوەیە کە زستانان نایبەستێ و قاز و مراوی تێیدا مەلە دەکەن

**گەلاوێژ:** شارا، گەنمی دووراوە لە ناو پەرێزێ بە دەستی تێلەکێش دەکرێتە قۆمەتێکی درێژ، لای گوڵەکەی لە دەرێیە.

**گەلاوێژ:** ناوی ئەستێرەیەکە، ناوی مانگێکە

**گەلۆز:** ناوگەڵ

گیابڕنک: ئەو کەسەی لە دەشت و دەر بە دوای گیادەرماندا دەگەڕێ.

**گیشە:** جۆی دووراوە لە ناو پەرێزێ بە دەستی تێلەکێش دەکرێتە قۆمەتی درێژ لای گوڵەکەی لە ناوەوە، چوونکێ جۆ هەڵناوەرێ.

**ل**

**لانەولان:** جێگۆڕینی کەرویشک لە ترسان

**لێرەوار:** دارستان

**لیژنە:** قۆمەتە دار کە بۆسووتان دانرابێ

**لیس:** هێلانەی دەستکرد بۆ کۆتر

**لەزگە:** وەختە

**لە زگ** : لەگژ، خەریک.

**لەگینە:** لەوانیە، ڕەنگە، وێدەچێ

**لە بن گوێ خوێندن:** هاندان بۆ کاری خراپ

**مـ**

**ماخرا:** ماڵ خراپ، ماڵ کاول

**مشت بوو:** پڕبوو، تژی بوو

**مشکی:** هەوری

**مشکی:** خۆڵە کەوە، خۆڵەمێش

**مگێز:** حەز

**مەرپەند:** ئەو سنگ و زنجیرەی وڵاخی پێ دەبەسترێتەوە.

**مەمکەکێژە:** گوڵێکی گوڵ وردیلەی سپیی پایزانەیە.

**مینا:** شووشە، جامخانە

**مینا:** وەکوو، وێنەی، چەشنی

**نـ**

**ناپرینگێتەوە:** سل ناکاتەوە

**نازیمۆک:** منداڵێک کە نازی هەڵگیرابێت و زۆر بەناز بێت.

**نانۆکە:** کێک، پسکویت...

**نەبان:** خۆ نەناسکردن، کەسێ خۆی لە ناسیارێ نەناس بکات، دەنگی خۆی بگۆڕێت و..... ( یاری خۆمە و لێم نەبانە)، وشەکە لە بنجدا لەوە هاتوو کە ماڵاتێکی شیردەر بێچووی خۆی نەناسێتەوە و ناهێڵێ لێی نزیک بکەوێتەوە و دەم بە گوانیەوە بنێ. دەگوترێ: لێی نەبانە.

**نەترە:** نەتە، ورە

**نەخۆ:** نەوەک، نەبادا

**نووردووە نان:** چەند نانێکی بەسەر یەکەوە دەقونووشتکراو

**نەپرژان:** پێرانەگەیشتن

**نەوێرۆک:** ترسنۆک

**نەخاسمە:** بە تایبەتی

**نێرینەی بەهار:** ئەو کاتەی کە بەهار دەگاتە ئەوپەری کەسکی و تەڕی

**نێله** : دەنگی ئاگر. سۆبەکە نێله نێلەتی

**نیمدەره:** پارچە رایەخێ بۆ لەسەر دانیشتن

**نێسکه:** لەنجەولاری بەرزە

**و**

**وێکرا:** پێکەوە

**وتو وریا:** وریا و ئاگادار

**وەرنا:** ئەگەرنا، دەنا، ئەینا، ئەگینا

**هـ**

**هایی:** ئاگا

**هەڵبرینگانـدن:** بـۆ نەمـان و رەویـنەوەی هەور بەکـار دێ. (هەورێکـی تیری هێنا، بەڵام هەڵیبرینگاند)

**هەنگینێ:** ئەوکات، ئەوسا، ئەودەمانێ

**هەڵەت:** گرد و دۆڵی سەخت

**هەڵەته:** تەرە، بە ئاقار کەوتن. بکوژەکە هەڵەتە بووە ناگیرێت.

**هەڵتەک هەڵتەک:** رۆیشتنێک کە خۆ نزم و بەرزکردنەوەی لەگەڵ بێ.

**هۆبڕان:** نائومێدبوون، لە دیتنەوەی باپیرم هۆبڕاو بووم.

**هۆش:** بۆ راوەستانی کەر و بەرزە بەکاردی.

**هۆش:** عەقڵ

**هۆدە:** دیو، چاوە، ژوور

**هۆسا:** ئەوها، وەها، وا، بەو شێوە

**هیربال:** قاپ و قاچاخ

**هەرێ:** بەڵێن، سۆز، گفت

**هەرکەو:** گۆمیلکەی گچکەی خۆکردی سەر بەرد و شاخ، بە باران پڕ دەبن و باڵدار وگیانەوەر لێی دەخۆنەوە.

**هەو:** ئاوسان، ئیلتیهاب

**هەوک:** گەروو، قورگ

**هەوکە:** ئێستا، نها، نووکە، هەنکە، نهۆ، هەنووکە، ئێستێ، ئەمێستا

**هێ:** بێجگە، جگە

**هـێ:** لە شـێوەی پاشـگر، کـاتێ بە وشـەوە دەلکـێ، واتـای دوورتـری پێدەبەخشێ، کاتێ دەگوترێ: ئەو ماڵێهێ. واتە ماڵە دوورەکە.

**هێژ:** هێشتا، هێمان

**هێمان:** هێشتا

**هەژهار:** ددانی زیادە

**هەژی:** شایان، هەژی گۆتنێیە: شایانی باسە

**هەڵشە:** سەرەڕۆ

**یـ**

**یاری دەدەن:** یارمەتی دەدەن، هاریکاری دەکەن

**یال:** بژ

**یاوەر:** هاوڕێ، ئەسحابە

**یەکلاق:** ئەو کلاشینکۆفەی قۆنداخەکەی ئاسنێکی درێژکۆلەیە

# گوڵەستێرەکان کوژانەوە

کەم بیرەوەریی خەباتگێڕانی کوردم خوێندۆتەوە لە ڕستە و هەواڵیان بەگومان نەبم و باوەڕی تەواو بە هەواڵەکانیان بکەم. بۆ دۆزینەوەی ڕاستیی تویێی هەندێ کتێبی سیاسەتکاران، دەبێ نێوان دێڕەکان بخوێنینەوە. بەڵام ڕستە و هەواڵێکم لە کتێبەکەی کەریم کاکەدا نەدی جێی گومان بێ. چەند لە هەستەوە نزیکە ئەم نووسینە! ڕاستگۆیی چ نیعمەتێکە خوا بە کتێب و خوێنەری داوە!

کە دەستم بە خوێندنەوەی (گوڵەستێرەکان کوژانەوە) کرد، نەمتوانی دەستی لێ هەڵگرم و بچمە سەر کارێکی تر. ئەو نووسینە، لە هەندێ جێدا بۆنی دووکەڵ و بارووتی لێ دێ و لە هەندێ جێی دیکەیدا، بۆنی بەهار و ژن، بۆنی تەگەوڕی نێرەوز پەخش دەبێ. لە هەندێ جێدا دیمەنی بەهەشتی تێدا دەبینی و لە هەندێ جێی تریش دۆزەخ. دۆزەخ، بە خۆی و (ئەسفەلەسسافلین)ەوە دەورت دەدا. چ ژیانێکە ئەو پێشمەرگایەتییەی کەریم کاکە باسی دەکا!

**حەکیم کاکەوەیس**





دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAM PUBLICATION
+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub
FAMpublication